# فقه السنة

# بەکوردی

سید سابق

وەرگێرانی

حەمەئەمین ئەحمەد بەرزنجی

پێشەکی و تعلیق

محمد ناصر الدين الالباني

تمام المنة في تعليق على فقه السنة

شەهید حەسەن بەننا پێشەکی بۆ نوسیوە

کڕین و فرۆشتن

دادوەری

بەشە دانراوەکان

چاپی سێیەم

٢٠١٣

# فقه السنة

## بەکوردی

سید سابق

وەرگێڕانی

حەمەئەمین ئەحمەد بەرزنجی

پێشەکی و تعلیق

محمد ناصرالدین الالباني

تمام المنة في تعليق علي فقه السنة

شەهید حەسەن بەننا پێشەکی بۆ نوسیوە

بەرگی دووەم

چاپی سێهەم
٢٠١٣

بسم الله الرحمن الرحيم


**ناسنامەی کتێب**

- ناوی کتێب : فقه السنة بە کوردی
- نـوسـیـنـی : سید سابق
- وەرگـێڕنی : حەمەئەمین ئەحمەد بەرزنجی
- نۆرەی چاپ: سێیەم ٢٠١٣
- تیراژ : ٢٠٠٠ دەورە

لەبەڕێوەبەرایەتی کتێبخانە گشتیەکان ژمارەی سپاردنی (٧٧٤)ی ساڵی ٢٠٠٧ ی پێدراوە

**ناوەندی ڕۆشنبیر بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە**

# باسی شاردنەوەی مردوو (جنائز)

**ئەدەب و رەوشتی سوننەت لە نەخۆشی و پزیشکی دا:**

**نەخۆشی:-**

فەرموودەی صەریح هاتووە کە نەخۆشی ئەبێتە بریتی گوناح و تاوانەکانی پێ ئەسڕێتەوە. وا هەندێکیان باس ئەکەین:-

١-بوخاری‌و موسلیم لە ئەبی هورەیرەوە ئەگێڕنەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (مَن يُرِدِ اللهُ بِهِ خيراً يُصِب مِنهُ) واتە: کەسێ کە خوا بیەوێ توشی خێری بکات، نەخۆشی ئەخات.

٢- هەروەها لێیەوە ئەگێڕنەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (مَا يُصِيبُ المُسلِمَ مِن نَصَبٍ وَلا وَصَبٍ، وَلا هَم، وَلا حَزَنٍ، وَلا أذى، حتى الشَّوكَةَ يُشَاكُهَا إلا كَفَر اللهُ بِهَا مِن خَطَايَاهُ). واتە: هەرچی توشی موسڵمان بێت لە ماندویەتی و نەخۆشی و غەم‌و پەژارە و ئازار هەتا دڕکێکیش بچێت بە شوێنێکیدا خوا ئەیکاتە کەفارەت و بریتی خراپەکانی.

٣-بوخاری لە ئیبنومەسعودەوە ئەگێڕێتەوە فەرمویەتی: چوم بۆلای پێغەمبەر ﷺ زۆر نەخۆش بوو منیش پێم ووت: ئەی نێرراوی خوا تۆ زۆر تات لێ هاتووە فەرمووی: بەڵێ (إنِّي أُوعَكُ كَمَا يُوعَكُ رَجُلانِ مِنكُم). واتە: من ئەوەندەی دوو پیاو لە ئێوە تاو ئازارم ئەبێت. ئەڵێ: ووتم: بەوە دوو پاداشتیش وەرئەگریت؟ فەرمووی: بەڵێ: (ذلِكَ كَذلِكَ، مَا مِن مُسلِمٍ يُصِيبُهُ أذى شَوكَةٍ فَمَا فَوقَهَا إلا كَفَّرَ اللهُ بِهَا سَيِّئَاتِهِ كَمَا تَحُطُّ الشَّجَرَةُ وَرَقَهَا). واتە: بەڵێ: هەر بەو شێوەیەیە، هیچ موسڵمانێك نیە ئەوەندەی دڕکێك و زیاتر لەوە ئازاری تووش ببێت ئیللا خوا ئەیخاتە بریتی تاوانەکانی، وەك چۆن درەخت گەڵاکانی ئەوەرێنی بەو شێوەیە گوناهی لێ هەڵئەوەرێنێ.

٤- لە ئەبوهورەیرەوە ئەگێڕنەوە کە فەرمویەتی: پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (مَثَلُ المُؤمِنِ كَمَثَلِ الخَامَةِ مِنَ الزَّرعِ مِن حَيثُ أتتها الرِّيحُ كَفَأتها، فَإذَا اعتَدَلَت تُكفَأ بِالبَلاءِ، وَالفَاجِرُ كَالأرزَةِ صَمَّاءُ مُعتَدِلَةٌ حتى يَقصِمَها اللهُ إذَا شَاءَ). واتە: موسڵمان وەك گژوگیاو شینایی وایە هەرکاتێك لە هەر شوێنێکەوە با لێیدا لاری ئەکاتەوە، وە کەڕاست بوەوە بەهۆی بەڵاوە ئەشکێتەوە، وە تاوانبارو فاجریش وەك داری کاژ وایە بە راست و ڕێکی ئەمێنێتەوە هەتا خوا تێکی ئەشکێنێت هەرکاتێك ویستی.

**ئارام گرتن لەکاتی نەخۆشی دا:**

نەخۆش لەسەری پێویستە ئارام بگرێت بەرامبەر ئەو ئازارانەی توشی دێت، چونکە لە ئارام گرتن خێرترو فراوانتر بە ئادەمی زاد نەدراوە.

١-موسليم ئەگێڕێتەوە لە صوهەیبی کوڕی سینانەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (عَجَباً لأمرِ المُؤمنِ إنَّ أمرَهُ كُلَّهُ خيرٌ -وَلَيسَ ذَلكَ لأحَدٍ إلا للمُؤمنِ- إن أصابَتهُ سَرَّاءَ شَكَرَ فكَانَ خيراً لَهُ، وَإن أصَابَتهُ ضَرَّاءَ صَبَرَ فكَانَ خيراً لَهُ). واتە: کاری موسڵمان سەیرە, چونکە کارەکانی هەمووی خێرن — وە ئەمە بۆ موسڵمان نەبێت بۆ کەسی تر نیە- ئەگەر توشی خۆشی بوو سوپاسی خوای کرد ئەوە خێرە بۆی، وە ئەگەر توشی زیانو ناخۆشی بوو ئارامی گرت لەسەری هەر خێرە بۆی.

٢- بوخاری ئەگێڕێتەوە لە ئەنەسەوە فەرمویەتی: گوێم لە پێغەمبەر ﷺ بووە ئەیفەرمو: (إنَّ اللهَ تعالی قَالَ: إذَا ابتَلَيتُ عَبدي بِحَبِيبَتَيهِ فَصَبَرَ، عوَّضتُهُ مِنهُمَا الجَنَّةَ). واتە: خوای گەورە فەرمویەتی: ئەگەر بەندەکەی خۆمم بە هەردو چاوی تاقی کردەوە و کوێرم کردن، ئەویش ئارامی گرت، ئەوە لەبری ئەو چاوانەی بەهەشتی لەپاداشتدا بۆ ئەنوسم.

بوخاری و موسلیم ئەگێڕنەوە لە عەطائی کوری ئەبی رەباحەوە لە ئیبنو عەبباسەوە فەرمویەتی: (ئافرەتێکی بەهەشتیت نیشان بدەم؟ ووتم: بەڵێ: نیشانم بدە، فەرموی: ئەو ئافرەتە ڕەش پێستەیە. هاتە لای پێغەمبەر ﷺ ووتی: من توشی فێ ئەبم جا کاتێ ئەبورێمەوە خۆم ڕوت ئەکەمەوە و خۆم دەرئەخەم، بۆم بپاڕێرەوە لە خوا کە چاکم بکاتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ئەگەر ئەتەوێ ئارام بگریت لەسەر ئەوە خوا بەهەشتت پێ ئەبەخشێت، وە ئەگەر ئەتەوێت لە خوا ئەپاڕێمەوە چاکت بکاتەوە، ئەویش ووتی: ئارام ئەگرم. پاشان ووتی: من لەوکاتەدا خۆم دەرئەخەم دە بۆم بپاڕێرەوە خۆم وا لێ نەکەم- ئەویش ﷺ بۆی پاڕایەوە.

**سکاڵا و دەرخستنی نەخۆشی:**

دروستە بۆ نەخۆش لای هاورێ یا پزیشك حاڵی خۆی ڕوون بکاتەوە لەو ئازارو نەخۆشیەی کە توشی بووە مادام بەشێوەی نارەزایی‌و تورەیی و دەرخستنی نائارامی نەبێت، وە لەپێشەوە فەرموودەکەی پێغەمبەرمان ﷺ باس کرد کە فەرموی: (إنِّي أُوعَكُ كَمَا يُوعَكُ رَجُلانِ مِنكُم) وە عائیشە لای پێغەمبەر ﷺ سکاڵای کردووەو فەرمویەتی: ئای سەرم ئەویش ﷺ فەرموویەتیێ من ئای سەرم، وە عبداللەی کوڕی زوبەیر بە ئەسمائی ووت: - کاتێ نەخۆش بوو- حاڵت چۆنە؟ ووتی: ئازارم زۆرە - وە لەسەر نەخۆش پێویستە کە سوپاسی خوا بکات پێش ئەوەی باسی نەخۆشیەکەی بکات.

ئیبنومەسعود فەرمویەتی: ئەگەر سوپاس گوزاریەکە پێش بخات ئەوە بێزاری دەرنەبڕیوە، وە سکاڵا کردن بۆلای خوا مەشروعە.

یەعقوب (علیه السلام) ئەیفەرموو: ﴿إِنَّمَآ أَشۡكُواْ بَثِّي وَحُزۡنِيٓ إِلَى ٱللَّهِ﴾ (یوسف/٨٦). واتە: هاواری غەمو پەژارەم تەنها بۆ خوا دەرئەبڕم.

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (اللَّهُمَّ إِلَيكَ أشكُو ضَعفَ قُوَّتِي...) تا دوایی دوعاکە. واتە: خوایە کەم توانیم و لاوازیم بۆ تۆ دەردەبڕم...

**نەخۆش ئەو ئەجرەی بۆ دەنوسرێت کە لەکاتی لەش ساغیدا بە ئەنجامدانی دەستی دەکەوێ:**

بوخاری لە ئەبوموسای ئەشعەریەوە دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (إذَا مَرِضَ العَبدُ أو سَافَرَ، كُتِبَ لَهُ مِثلُ مَا كَانَ مُقِيماً صَحِيحاً). واتە: کاتێك بەندەی موسڵمان نەخۆش کەوت یان سەفەری کرد، ئەو خێرو پاداشەی بۆ دەنوسرێ کە بە ساغی لە غەیری سەفەردا دەستی دەکەوێ.

**سەردانی نەخۆش**

لە ئاداب و ڕەوشتی ئیسلامیەیە کە موسڵمان سەر لە نەخۆش بدات و ئەحواڵی بپرسێت بۆ دڵ خۆش کردنی و وەفا بە مافی ئەو نەخۆشە. ئیبنو عەبباس فەرمویەتی: سەردانی نەخۆش یەکەم جار سوننەتە وە لەدوای ئەوە پەسەندە.

بوخاری لە ئەبو موساوە ئەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (أطعِمُوا الجَائِعَ، وَعُودُوا المَرِيضَ، وَفُكُّوا العَانِيَ). واتە: برسی تێر بکەن، سەردانی نەخۆش بکەن، وە دیل ئازاد بکەن.

بوخاری و موسلیم ڕەحمەتی خوایان لەسەر بێت ئەگێڕنەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (حَقُّ المُسلِمِ على المُسلِمِ سِتٌّ: قِيلَ: وَمَا هُنَّ يَا رَسُولَ اللهِ؟ قَالَ: إذَا لَقِيتَهُ فَسَلِّم عَلَيهِ، وَإذَا دَعَاكَ فَأجِبهُ، وَإذَا استَنصَحَكَ فَانصَح لَهُ، وَإذَا عَطَسَ فَحَمِدَ اللهَ فَشَمِّتهُ، وَإذَا مَرِضَ فَعُدهُ، وَإذَا مَاتَ فَاتَّبِعهُ). واتە: مافی موسڵمان لەسەر موسڵمان شەشە، وتیان: چین ئەی نێرراوی خوا؟ فەرمووی: کاتێ لە شوێنێکدا پێت گەیشت سڵاوی لێ بکە. ئەگەر دەعوەتی کردی بچۆ بە دەمیەوە، ئەگەر داوای ڕێنمایی لێ کردی ئامۆژگاری بکە، ئەگەر پژمی و سوپاسی خوای کرد (ووتی: الحمدلله) دوعای بۆ بکە بڵێ (يرحمك الله)، ئەگەر نەخۆش کەوت سەری لێ بدە، ئەگەر مرد شوێن تەرمەکەی بکەوە بۆ گۆڕستان.

**فەزڵ و چاکێتی سەردانی نەخۆش:**

١- ئیبنوماجە لە ئەبوهورەیرەوە ئەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (مَن عَادَ مَرِيضاً نَادَى مُنَادٍ مِنَ السَّمَاءِ طِبتَ وَطَابَ مَمشَاكَ وَتَبَوَّأتَ مِنَ الجَنَّةِ مَنزِلاً). واتە: هەرکەس سەردانی نەخۆشێك بکات بانگ بێژێك لە ئاسمانەوە بانگ ئەکات ئەڵێت: خۆش بیت و هەنگاوەکانت خۆش بن، وە لە بەهەشتدا جێی خۆت بگری.

٢- موسلیم لە ئەبوهورەیرەوە ئەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (إنَّ اللهَ عَزَّوَجَل يَقُولُ يَومَ القِيَامَةِ: يَا ابنَ آدَمَ! مَرِضتُ فَلَم تَعُدنِي. قَالَ: يَارَبِّ! كَيفَ أعُودُكَ وَأنتَ رَبُّ العَالَمِينَ؟ قَالَ: أمَا عَلِمتَ أنَّ عَبدِي فُلَاناً مَرِضَ فَلَم تَعُدهُ, أمَا عَلِمتَ إنَّكَ لَو عُدتَهُ لَوَجَدتَنِي عِندَهُ؟ يَا ابنَ آدَمَ! استَطعَمتُكَ فَلَم تُطعِمنِي. قَالَ: يَارَبِّ! كَيفَ أُطعِمُكَ وَأنتَ رَبُّ العَالَمِينَ؟ قَالَ: أمَا عَلِمتَ أنَّهُ استَطعَمَكَ عَبدِي فُلَانٌ فَلَم

تُطعِمهُ, أمَا عَلِمتَ أنَّكَ لَو أطعَمتَهُ لَوَجَدتَ ذَلِكَ عِندي؟ يَا ابنَ آدَم! استَسقَيتُكَ فَلَم تَسقِنِي؛ قَالَ: يَارَبِّ! كَيفَ أسقِيكَ وَأنتَ رَبُّ العَالَمِين؟ قَالَ: استَسقَاكَ عَبدِي فُلان فَلَم تُسقِهِ, أمَا عَلِمتَ أنَّكَ لَو سَقَيتَهُ لَوَجَدتَ ذَلِكَ عِندِي). واتە: خوای گەورە لە ڕۆژی دواییدا ئەفەرموێت: ئەی ئادەمیزاد نەخۆش کەوتم سەرت لێ نەدام. ئەڵێت: ئەی پەروەردگارم چۆن سەرت لێ بدەم و تۆ پەروەردگاری جیهانیانی؟ ئەفەرموێ: ئەی نازانیت فلانە بەندەم نەخۆش بوو سەرت لێ نەدا؟ ئەگەر سەرت لێ بدایە منت ئەبینی لەلای؟ ئەی ئادەمیزاد داوای خواردنم لێ کردیت خواردنت نەدامێ؛ ئەڵێت: ئەی پەروەردگار چۆن خواردنت بدەمێ تۆ پەروەردگاری جیهانیانی؟ ئەفەرموێت: ئەی نازانیت فلانە بەندەم داوای خواردنی لێ کردی نەت دایە؟ ئەگەر خواردنت بدایە ئێستا لای من ئەت دیەوە؟ ئەی ئادەمیزاد داوای ئاوم لێ کردی ئاوت پێ نەدام؟ ئەڵێ: ئەی پەروەردگار چۆن ئاو بدەم بە تۆ کە پەروەردگاری جیهانیانی ئەفەرموێت: فلانە بەندەم تینوی بوو داوای ئاوی لێ کردی ئاوت پێ نەدا، ئەی نازانی ئەگەر ئاوت پێ بدایە ئێستا لای من ئەت بینی.

٣-لە ثەوبانەوە هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (إنَّ الُمسلِمَ إذَا عَادَ أخَاهُ الُمسلِمَ لَم يَزَل فِي خُرْفَةِ الجَنَّةِ حَتَّى يَرجِعَ، قِيلَ: يَا رَسُولَ اللهِ وَمَا خُرفَةُ الجَنَّةِ؟ قَالَ: جَنَاهَا). واتە: موسڵمان ئەگەر سەری لە برای موسڵمانیدا هەتا ئەگەڕێتەوە میوەی بەهەشت ئەچنێ.

٤- لە عەلیەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتووە فەرمویەتی: گوێم لە پێغەمبەر ﷺ بووە ئەیفەرموو: (مَا مِن مُسلِمٍ يَعُودُ مُسلِماً غُدوَةً إلا صَلَّى عَلَيهِ سَبعُونَ ألفَ مَلَكٍ حَتَّى يُمسِيَ، وَإن عَادَهُ عَشِيَّةً صَلَّى عَلَيهِ سَبعُونَ ألفَ مَلَكٍ حَتَّى يُصبِحَ، وَكَانَ لَهُ خَرِيفٌ فِي الجَنَّةِ) رواه الترمذي وقال: حديث حسن. واتە: هیچ موسڵمانێك نیە کە بەڕۆژ سەر لە برای موسڵمانی بدات ئیللا هەفتا هەزار فریشتە بۆی ئەپاڕێنەوە هەتا ئێوارە، وە ئەگەر بەشەو سەریدا حەفتا هەزار فریشتە هەتا بەیانی بۆی ئەپاڕێتەوە، وە لە بەهەشتدا میوەی گەیشتوی چنراوی بۆ ئامادە ئەکرێت.

**ئاداب و ڕەوشتی سەردانی نەخۆش:**

پەسەندە بۆ ئەوکەسەی کە سەر لە نەخۆش ئەدات بۆی بپاڕێتەوە کە خوا شیفای بۆ بنێرێتو چاکی بکاتەوە وە نەخۆشەکە ئامۆژگاری بکات کە ئارام بگرێ و خۆی لە ژێر باری نەخۆشیەکەدا بگرێت، وە قسەی خۆشی لەگەڵ بکات بۆ ئەوەی دەرونی پێی گەش ببێتەوە و هێز و تینی بێتەوە بەر.

چونکە ریوایەت کراوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ کە فەرمویەتی: (إذَا دَخَلتُم عَلَى الَمرِيضِ فَنَفِّسُوا لَهُ فِي الأجَلِ فَإنَّ ذَلِكَ لا يَرُدُّ شَيئاً، وَهُوَ يُطَيِّبُ نَفسَ الَمرِيضِ). واتە: ئەگەر چونەلای نەخۆش ئومێدی مانەوە و تەمەن درێژی بخەنە بەر، هەرچەندە ئەو قسانە هیچ ناگێڕنەوە، بەڵام نەخۆشەکە دڵخۆش ئەبێت پێی.

وە پێغەمبەر ﷺ کاتێ بچوایە بۆلای نەخۆشێك پێی ئەفەرمو: (لا بأس طهور إن شاء الله) واتە: قەیناکە، (إن شاء الله) پاکەرەوەی گوناهە.

وە پەسەندە بۆ ئەوکەسەی کە سەردانی نەخۆش ئەکات کەم بمێنێتەوە بەپێی توانا، هەتا نەبێتە بارێکی گران بەسەر نەخۆشەکەوە، مەگەر نەخۆشەکە خۆی حەز بکات.

سەردانی پیاوان لەلایەن ژنانەوە:

بوخاری لە بەشی سەردانی پیاوان لەلایەن ژنانەوە ئەفەرموێت: ئوممودەرداء سەری داوە لە پیاوێکی ئەهلی مزگەوت لە ئەنصار.

ئەگێڕنەوە لە عائیشەوە کە فەرمویەتی: کاتێ پێغەمبەر ﷺ گەیشتە مەدینە ئەبوبەکر نەخۆش کەوت لەگەڵ بیلالدا. منیش چوم بۆ سەردانیان ووتم: بابە حاڵت چۆنەو ئەی بیلال تۆ حاڵت چۆنە؟ عائیشە ئەفەرموێت: ئەبوبەکر کاتێ لەرزوتاکەی ئەگرت ئەیفەرموو:

كُلُّ امرئٍ مُصَبَّحٌ فِي أهلِهِ        وَالموتُ أدنى مِن شِرَاكِ نَعلِهِ

واتە: هەموو کەسێك کە ڕۆژ ئەکاتەوە لەناو کەس وکارەکەیدا، مردن لە قەیتانی نەعلەکەی لێی نزیکترە.

بیلالیش کاتێ لەرزوتاکەی لا ئەچوو ئەیفەرموو:

ألا لَيتَ شِعرِي هَل أبِيتَنَّ لَيلَةً        بِوَادٍ وَحَولِي إذخِرٌ وَجَلِيلُ
وَهَل أرِدَنْ يَوماً مِيَاه مِجنَّةٍ        وَهَل يَبدُونَّ لِي شَامَةٌ وَطُفَيلُ

واتە: خۆزگە ئەمزانی ئایا ئەتوانم شەوێك لە دۆڵێکدا بمێنمەوە و لە دەوروبەرم (إذخر) جۆرێك گیایە و جەلیل هەبێت. وە ئایا ئەتوانم ڕۆژێك بێمە سەر ئاوەکانی (مجنة) و لەوێوە هەزی شامە و (طفیل)م لێ دیار بێت. (مجنة) شوێنێکە.

عائیشە ئەفەرموێت: هاتمەوە بۆلای پێغەمبەر ﷺ و پێم ڕاگەیاند فەرمووی: (اللَّهُمَّ حَبِّب إلَينَا المَدِينَةَ كَحُبِّنَا مَكَّةَ أو أشَدَّ، اللَّهُمَّ وَصَحِّحهَا وَبَارِك لَنَا فِي مُدِّهَا وَصَاعِهَا، وَانقُل حُمَّاهَا فَاجعَلهَا بِالجُحفَةِ). واتە: خوایە مەدینەمان لا خۆشەویست بکە وەك مەککە، یان زیاتر لەویش، خوایە بەرەکەت بخەرە (مد) و صاعی مەدینە، خوایە خۆشی بکەو لەرزوتاکەی بگوێزەرەوە بۆ جوحفە.

سەردانی بێ باوەڕ لەلایەن موسڵمانەوە:

قەیناکە موسڵمان سەر لەنەخۆشی بێ باوەڕ بدات. بوخاری لە (باسی سەردانی بێ باوەڕ لەلایەن موسڵمانەوە) ئەگێڕێتەوە لە ئەنەسەوە فەرمویەتی: غوڵامێکی یەهودی خزمەتی پێغەمبەری ﷺ ئەکرد، نەخۆش کەوت، پێغەمبەر ﷺ سەردانی کرد و پێی فەرموو: (موسڵمان بە) ئەویش موسڵمان بوو.

سەعیدی کوڕی موسەییب لە باوکییەوە ئەگێڕێتەوە ووتویەتی: کاتێ ئەبوطالیب لە سەرەمەرگدا بوو پێغەمبەر ﷺ هات بۆلای.

**سەردانی کەسێك چاوی ژان بکات**

ئەبو داود لە زەیدی کوڕی ئەرقەمەوە ئەگێڕێتەوە ووتوویەتی: چاوم ژانی ئەکرد پێغەمبەر ﷺ بەو بۆنەیەوە هات بۆلام.

**داوای دوعا کردن لە نەخۆش:**

ئیبنو ماجە لە عومەرەوە خوا لێی ڕازی بێت ئەگێڕێتەوە فەرمویەتی: پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (إِذَا دَخَلتَ عَلَى مَرِيضٍ فَمُرهُ فَلْيَدعُ لَكَ. فَإِنَّ دُعَاءَهُ كَدُعَاءِ المَلائِكَةِ). قال في الزوائد وإسناده صحيح ورجاله ثقات إلا أنه منقطع.

واتە: ئەگەر چوویتە لای نەخۆشێك پێی بڵێ: با بۆت بپاڕێتەوە چونکە پاڕانەوەکەی وەك پاڕانەوەی فریشتەیە.

**تەداوی کردن:**

پێغەمبەر ﷺ فەرمانی داوە بە تەداوی کردنی نەخۆش لە زیاد لە چەند فەرموودەیەکدا:

١- ئەحمەدو خاوەن سونەنەکان ئەگێڕنەوەو (ترمذي)ش بە صەحیحی داناوە لە ئوسامەی کوڕی شورەیکەوە فەرمویەتی: هاتمە لای پێغەمبەر ﷺ و یارەکانی وەك باڵندە بەسەر سەریانەوە بێت وا بوون، سڵاوم لێ کردن و دانیشتم، عەرەبی دەشتەکی لێرە و لەوێ هاتن پرسیاریان ئەکرد ئەیان ووت: ئەی نێرراوی خوا! نەخۆشەکانمان دەرمان بکەین؟ ئەویش فەرمووی: (تَدَاوَوا فَإِنَّ اللهَ تَعَالى لَم يَضَع دَاءً إلا وَضَعَ لَهُ دَوَاءً غَيرَ دَاءٍ وَاحِدٍ، الهَرَمُ). واتە: نەخۆشەکانتان تەداوی بکەن چونکە خوا دەردی بێ دەرمانی دانەناوە، جگە لە دەردی پیری.

٢- نەسائیو ئیبنوماجەو حاکم کە بە صحیحی داناوە لە ئیبنومەسعودەوە ئەگێڕنەوە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (إِنَّ اللهَ لَم يُنزِل دَاءً إلا أَنزَلَ لَهُ شِفَاءً فَتَدَاوَوا). واتە: خوا دەردێکی نەناردووە شیفاکەشی لەگەڵدا نەناردبێت، لەبەر ئەوە نەخۆشەکانتان تەداوی بکەن.

٣-موسلیم لە جابیرەوە ئەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (لِكُلِّ دَاءٍ دَوَاءٌ، فَإِذَا أُصِيبَ دَوَاءُ الدَّاءِ بَرِيءَ بِإِذنِ اللهِ). واتە: هەموو دەردێك دەرمانی خۆی هەیە جا ئەگەر دەرمانەکە پێکای چاك ئەبێتەوە بە ئیزنی خوا.

**تەداوی کردن بە شتی حەرام:**

جومهوری زانایان بۆ ئەوە چون کە حەرامە تەداوی کردن بە ئارەق و غەیری ئەو لە شتە حەرام کراوەکان، وە بەڵگەیان ئەم فەرموودانەی لای خوارەوەیە:

١- موسليم‌و ئه‌بوداوودو (ترمذي) له‌ وائيلی كوڕی حیجری حه‌ضره‌مي‌یه‌وه‌ ئه‌گێڕنه‌وه‌ كه‌ طاریقی كوڕی سوه‌ید پرسیاری له‌ پێغه‌مبه‌ر ﷺ كرد ده‌رباره‌ی ئه‌و ئاره‌قه‌ی بۆ ته‌داوی دروستی ئه‌كرد؟ فه‌رمووی: (إِنَّهَا لَيسَت بِدَوَاءٍ وَلَكِنَّهَا دَاءٌ) واته‌: ئه‌وه‌ ده‌رمان نیه‌، به‌ڵكو ئه‌وه‌ ده‌رده‌.

ئه‌م فه‌رمووده‌یه‌ ئه‌وه‌ ده‌گه‌یه‌نێت كه‌ ته‌داوی به‌ ئاره‌ق حه‌رامه‌، بۆیه‌ پێی ڕاگه‌یان كه‌ عاره‌ق خۆی ده‌رده‌ نه‌ك ده‌رمان‌و ته‌داوی پێ بكرێت.

٢- به‌یهه‌قی ئه‌گێڕێته‌وه‌ و ئیبنوحیببان به‌ صه‌حیحی داناوه‌ له‌ ئومموسه‌له‌مه‌وه‌ كه‌ پێغه‌مبه‌ر ﷺ فه‌رمویه‌تی: (إنَّ اللهَ لَم يَجعَل شِفَاءَكُم فِيمَا حَرَّمَ عَلَيكُم) ذكره البخاري عن ابن مسعود. واته‌: خوا شیفای نه‌خۆشه‌كانتانی نه‌خستۆته‌ شتێكه‌وه‌ كه‌ لێی حه‌رام كردوون.

٣- ئه‌بو داود له‌ ئه‌بی ده‌ردائه‌وه‌ وه‌ ئه‌گێڕێته‌وه‌ كه‌ پێغه‌مبه‌ر ﷺ فه‌رمویه‌تی: (إِنَّ اللهَ أَنزَلَ الدَّاءَ وَالدَّوَاءَ، وَجَعَلَ لِكُلِّ دَاءٍ دَوَاءً فَتَدَاوَوا وَلَا تَتَدَاوَوا بِحَرَامٍ). واته‌: خوا ده‌رد و ده‌رمانی ناردۆته‌ خواره‌وه‌، وه‌ بۆ هه‌رده‌ردێك ده‌رمانێكی داناوه‌، ئێوه‌ش ته‌داوی نه‌خۆشه‌كانتان بكه‌ن به‌ڵام به‌ شتی حه‌رام ته‌داوی‌یان مه‌كه‌ن.

به‌ڵام ئه‌م فه‌رمووده‌یه‌ له‌ سه‌نه‌ده‌كه‌یدا ئیسماعیلی كوڕی عه‌ییاش هه‌یه‌، كه‌ لای شامیه‌كان جێی باوه‌ڕه‌، به‌ڵام لای حیجازی‌یه‌كان لاوازه‌.

٤-ئه‌حمه‌دو موسلیم‌و (ترمذي)و ئیبنو ماجه‌ له‌ ئه‌بو هوره‌یره‌وه‌ ئه‌گێڕنه‌وه‌ كه‌ پێغه‌مبه‌ر ﷺ ده‌رمانی پیسی قه‌ده‌غه‌ كردووه‌ ـ واته‌ ژه‌هری قه‌ده‌غه‌ كردبوو ته‌داوی پێ بكرێت ـ .

به‌ڵام چه‌ند دڵۆپێكی عاره‌ق كه‌ دیار نه‌بێت به‌ شته‌كه‌وه‌ یاكه‌س سه‌رخۆش نه‌كات، ئه‌گه‌ر تێكه‌ڵی ده‌رمانێكی پێكهاته‌ بكرێت حه‌رام نابێت وه‌ك كه‌مێ حه‌ریر له‌ناو قوماشێكی تردا - ئه‌مه‌ش له‌ (المنار)دا هاتووه‌.

**پزیشكی بێ باوه‌ڕ**

له‌ كتێبی (الآداب الشرعية)ی (ابن مفلح) دا هاتووه‌ ئه‌ڵێت: (شێخی ئیسلام ووتویه‌تی: ئه‌گه‌ر جووله‌كه‌یه‌ك یا گاورێك له‌ پزیشكایه‌تیدا پسپۆڕ بێت و لای خه‌ڵك جێی باوه‌ڕ بێت، دروسته‌ كاری پزیشكی بكات وه‌ك چۆن دروسته‌ شتی به‌ ئامانه‌ت له‌لا دابنرێت و مامه‌ڵه‌ی له‌گه‌ڵدا بكرێت.

وه‌ك خوای گه‌وره‌ فه‌رمویه‌تی: ﴿وَمِنْ أَهْلِ ٱلْكِتَـٰبِ مَنْ إِن تَأْمَنْهُ بِقِنطَارٍ يُؤَدِّهِۦٓ إِلَيْكَ وَمِنْهُم مَّنْ إِن تَأْمَنْهُ بِدِينَارٍ لَّا يُؤَدِّهِۦٓ إِلَيْكَ إِلَّا مَا دُمْتَ عَلَيْهِ قَآئِمًا﴾ (آل عمران/٧٥). واته‌: له‌ خاوه‌ن كتێبه‌كاندا هه‌یه‌ بارێ شتی لادا بنێی ئه‌یداته‌وه‌ ده‌ستت، وه‌ هه‌یه‌ دینارێكی لادابنێ نایداته‌وه‌ ده‌ستت هه‌تا به‌سه‌ریه‌وه‌ نه‌وه‌ستیت.

لە صەحیح دا هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ کاتێ کۆچی کرد بۆ مەدینە پیاوێکی بێ باوەڕی بەکرێ گرت بۆ ئەوەی ڕێگایان نیشان بدات، چونکە پیاوێکی شارەزاو ووریا بوو، وە بە ئەمینی دانا بەرامبەر بەخۆی و سامانی.

بەنو خوزاعە موسڵمان و گاوریان جاسوس و چاو بوون بۆ پێغەمبەر ﷺ - وە ئەگێڕنەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمانی دا بە حارثی کوڕی کلدە پزیشکی بکات کە بێ باوەڕیش بوو - .

بەڵام ئەگەر بتوانرێت لای موسڵمان چارەسەر بکرێت، ئەوە وەك ئەوە وایە توانیبێتی سپاردەی لا دابنێ یا مامەڵەی لەگەڵدا بکات، کەواتە نابێت لە موسڵمانەکە لا بدات، بەڵام ئەگەر کەسێك وا پێویست بوو سپاردە لای کیتابی دابنێت یا پێویستی بە پزیشکی کیتابی هەبوو ئەوە بۆی دروستە.

وە ئەمە لە بەشی دۆستایەتی کردن لەگەڵ جولەکەو گاوردا نی‌یە کە قەدەغە کراوە، بەڵام ئەگەر بە قسەی خۆش لەگەڵیاندا بجووڵێنەوە ئەوە چاکە، چونکە خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿وَلَا تُجَـٰدِلُوٓاْ أَهْـلَ ٱلْكِتَـٰبِ إِلَّا بِٱلَّتِى هِىَ أَحْسَنُ﴾ (العنکبوت/٤٦). واتە: دەمە قاڵێ لەگەڵ خاوەن کتێبە ئاسمانی‌یەکان مەکەن بەچاکترین شێواز نەبێت -تەواو-.

ئەبو خەطاب ئەگێڕێتەوە ئەڵێت: لە ڕووداوی ڕێکەوتنی حودەیبیەداو ناردنی پێغەمبەر ﷺ یەکێکی خوزاعەیی بۆ هەواڵی دەورو پشت و قەبول کردنی هەواڵەکەی. بەڵگەی ئەوەی تێدایە کە پزیشکی بێ باوەڕ ئەگەر دڵنیا بوویت لێی هەرچی ووت باوەڕت پێی هەبێت دەربارەی نەخۆشیەکە و شێوەی چارەسەرکردنی، بەمەرجێك ئەو پزیشکە تۆمەتی خراپی نەدرابێتە پاڵ لەو بارەیەوەو بەدگومانی پێ نەکرابێت.

**تەداوی کردنی ئافرەت دروستە:**

دروستە پیاو تەداوی ئافرەت بکات وە هەروەها دروستە ئافرەت تەداوی پیاو بکات لە کاتی پێویستیدا. بوخاری ووتوویەتی: ئایا پیاو تەداوی ئافرەت ئەکات‌و ئافرەت تەداوی پیاو ئەکات؟ پاشان لە ڕوبەییعی کچی (معوذ)ی کوڕی عەفراوە ئەگێڕێتەوە کە فەرمویەتی: لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ غەزامان ئەکرد ئێمە ئاومان ئەدا بە جەنگاوەرەکان و خزمەتمان ئەکردن و کوژراوو بریندارەکانمان ئەبردەوە بۆ مەدینە.

(حافظ) ئیبنوحەجەر لە (فتح) دا ووتوویەتی: دروستە تەداوی کرنی بێگانە لەکاتی پێویستدا، وە دروستە سەیرکردن و دەست لێدانی بەپێی پێویست.

ئیبنوموفلیح لە کتێبی (الآداب الشرعیة)دا ووتویەتی: ئەگەر ئافرەتێك نەخۆش بوو کەس دەست نە ئەکەوت لە پیاو زیاتر فەحسی بکات، دروستە ئەو پیاوە چەندی پێویست کرد سەیری بکات هەتا بۆی هەیە سەیری عەورەتیشی بکات، هەروەها پیاو لەگەڵ پیاودا بەوشێوەیە.

ئیبنوحەمدان ووتوویەتی: ئەگەر لە پزیشکی ئافرەت بەو لاوە پزیشك دەست نەکەوت بۆی هەیە هەرشوێنێکی پیاو پێویست بوو سەیری بکات، هەتا عەورەتیشی.

قازی ووتوویەتی: دروستە پزیشکی پیاو سەیری ئافرەتی نەخۆش بکات هەتا بۆی هەیە سەیری عەورەتیشی بکات کاتی پێویست، بەمەبەستی چارەسەر کردنی، وە هەروەها پزیشکی ئافرەت بۆی هەیە سەیری عەورەتی پیاو بکات کاتی پێویست بەمەبەستی چارە سەرکردنی.

**چارەسەر کردن بە دوعا:**

مەشروعە چارەسەر کردن بە دوعا بەمەرجێك بریتی بێت لە یادی خوا، وە ئەبێت بەزمانی عەرەبی بێت و مانای هەبێت، چونکە شتێك مانای نەبێ دڵنیایی لێ ناکرێ کە هاوبەش دانانی بۆ خوا تێدا نەبێت، لە عەوفی کوڕی مالیکەوە هاتووە ووتوویەتی: ئێمە لەسەر دەمی نەزانیدا دۆعامان ئەکرد جا لە پێغەمبەرمان پرسی ڕات چیە لەسەر ئەوە؟ فەرمووی ئادەی دوعاکانتانم بۆ بڵێن ئەو دوعایە خراپ نیە کە هاوبەش پەیدا کردنی بۆ خوا تێدا نەبێت. موسلیمو ئەبو داوود گێڕاویانەتەوە.

ڕەبیع ووتوویەتی دەربارەی دۆعا پرسیارم کرد لە شافیعی ووتی: قەیناکە دوعا کردن بە قورئان یان بەوەی کە ئەیزانی لە زیکری خوا، ووتم: ئایا خاوەن کتێبەکان ئەتوانن دوعا بۆ موسڵمان بکەن؟ ووتی: بەڵێ ئەگەر بەشتێك بێت زانراو بێت لە کتێبی خوادا و زیکری خوا بێت.

**هەندێ لەو دوعایانەی لەو بارەیەوە هاتوون:**

١- بوخاری و موسلیم لە عائیشەوە ئەگێڕنەوە کە پێغەمبەر ﷺ دوعای ئەکرد بۆ هەندێ لە کەس‌وکاری دەستی ڕاستی ئەهێنا بەسەریاو ئەیفەرمو: (اللَّهُمَّ رَبَّ النَّاسِ أذهِبِ البَأسَ إشفِ وَأنتَ الشَّافِي، لاشِفَاءَ إلا شِفَاؤُكَ، شِفَاءً لايُغَادِرُ سَقَماً). واتە: خوایە پەروەردگاری ئادەمیزاد، ئێش و ئازار لابەرە، و شیفای بۆ بنێرە چونکە هەر تۆ شیفا دەری، بێ شیفای تۆ ئیتر شیفا نیە، و بەشێوەیەك شیفای بدە کە دەردی نەهێڵێت.

٢-موسلیم ئەگێڕێتەوە لە عوسمانی کوڕی ئەبی عاصەوە ووتوویەتی: ئازارێکی توندم تووش هات، هاوارم بردە لای پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (ضَع يَدَكَ عَلَى الَّذِي يَألَمُ مِن جَسَدِكَ وَقُل: بِسمِ اللهِ، وَقُل: سَبعَ مَرَّاتٍ: أعُوذُ بِعِزَّةِ اللهِ وَقُدرَتِهِ مِن شَرِّ مَا أجِدُ وَأُحَاذِر). واتە: دەست بخەرە سەر ئەو شوێنەی کە ئازاری هەیە لە لاشەتداو بڵێ: (بسم الله). پاشان حەوت جار بڵێ: (أعُوذُ بِعِزَّةِ اللهِ وَقُدرَتِهِ مِن شَرِّ مَا أجِدُ وَأُحَاذِر). واتە:پەنا بەگەورەیی و تواناو دەسەڵاتی خوا ئەبەم لە زیانی ئەم ئازارەی کە هەستی پێ ئەکەم وە لێی ئەترسم. ئەڵێ: چەند جار ئەوەم کرد خوا ئازارەکەی لەکۆڵ خستم لەو کاتەوە بەکەس‌و کارو خەڵکی تر ئەڵێم کاتێ ئازاریان هەبوو وەها بکەن.

٣- (ترمذي) له موحەممەدی كوڕی سالمەوە ئەگێڕێتەوە ووتوویەتی: سابیتی بەنانی پێی ووتم: ئەی محمد ئەگەر شوێنێکت توشی ئازار هات دەستت بخەرە سەر ئەو شوێنەی ئازارەکەی هەیە و بڵێ: (بِسمِ اللهِ أعُوذُ بِعِزَّةِ اللهِ مِن شَرِّ مَا أجِدُ مِن وَجَعِي هَذَا). واتە: بڵێ بەناوی خوا پەنا ئەگرم بە گەورەیی خوا لە زیانی ئەو ئازارەی هەستی پێ ئەکەم، پاشان دەستت بەرز بکەرەوە پاشان دووبارەی بکەرەوە بەمەرجێك تاك بێت، چونکە ئەنەسی کوڕی مالیك بۆی گێڕامەوە که پێغەمبەر ﷺ ئەوەی پێ فەرمووە.

٤- له ئیبنو عەبباسەوە هاتووە کە پێغەمبەر فەرموویەتی: هەرکەس سەردانی نەخۆشێکی کرد لە سەرەمەرگدا نەبوو لە ژوور سەریەوە حەوت جار بڵێت: (أسألُ اللهَ العَظِيمَ رَبَّ العَرشِ العَظِيمِ أن يَشفِيَكَ. إلا شَفَاهُ اللهُ مِن ذَلِكَ المَرَضِ). واتە: داوا لە خوای گەورە و پەروەردگاری عەرشی گەورە ئەکەم شیفات بۆ بنێرێت، ئەگەر ئەوەت ووت ئەو نەخۆشە خوا شیفای بۆ ئەنێرێت و لەو نەخۆشیە چاك ئەبێتەوە. ئەبو داوودو (ترمذي) کە ووتوویەتی: حەسەنە گێڕاویانەتەوە، وە حاکم ووتویەتی: صەحیحە لەسەر مەرجی بوخاری.

٥- بوخاری لە ئیبنو عەبباسەوە ئەگێڕێتەوە فەرمویەتی: پێغەمبەر ﷺ دوعای پەناگرتنی بۆ حەسەنو حسین ئەکرد و ئەیفەرموو: (أُعِيذُكُمَا بِكَلِمَاتِ اللهِ التَّامَّةِ مِن كُلِّ شَيطَانٍ وَهَامَّةٍ وَمِن كُلِّ عَينٍ لامَّةٍ). وە ئەی فەرموو: باوکە ئیبراهیمتان ئەی خوێند بەسەر ئیسماعیل و ئیسحاقدا. واتە: پەناتان پێ ئەگرم بە ووشە تەواوەکانی خوا لە شەڕی شەیتانو جانەوەران کە زەهریان هەبێ و لە هەموو چاوێکی پیس.

٦- موسلیم لە سەعدی کوڕی ئەبی وەققاصەوە ئەگێڕێتەوە فەرمویەتی: نەخۆش بووم پێغەمبەر ﷺ سەری لێ دام وفەرمووی: (اللَّهُمَّ اشفِ سَعداً، اللَّهُمَّ اشفِ سَعداً، اللَّهُمَّ اشفِ سَعداً). واتە: خوایە شیفای سەعد بدە، خوایە شیفای سەعد بدە، خوایە شیفای سەعد بدە.

### قەدەغە کردنی نوشتە نوسین

پێغەمبەر ﷺ نوشتە نوسین و هەڵواسینی نوشتەی قەدەغە کردووە.

١-لە عوقبەی کوڕی عامیرەوە هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی (مَن عَلَّقَ تَمِيمَةً فَلا أتَمَّ اللهُ لَهُ، وَمَن عَلَّقَ وَدَعَةً فَلا أودَعَ اللهُ لَهُ) رواه أحمد و الحاكم وقال: صحيح الإسناد. واتە: هەرکەس مەتو موورو بە ملیا هەڵواسێ خوا کاری تەواو نەکات، وە هەرکەس نوشتەیەك بەملیا هەڵواسێت خوا نەیپارێزێت.

تەمیمە: ئەو مەتو موورووانە بوون کە عەرەبەکانی سەردەمی نەفامی بە منداڵەکانی خۆیاندا هەڵدەواسی بۆ ئەوەی بە گومانی خۆیان لە چاوەزار بەدوور بن، جا ئیسلام پوچەڵی کردەوە و قەدەغەی کرد، وە پێغەمبەر ﷺ دوعای کردووە لەوکەسەی هەڵی دەواسێ کە مەبەستەکەی نەیەتەدی.

٢- لە ئیبنو مەسعودەوە هاتووە کە ئەو جارێك ئەچێتە ماڵەوە ئەبینێت ژنەکەی پەتێکی گرێدراوی لە ملدایە، ڕای ئەکێشێو ئەی پچڕێنێ لەملیا، پاشان ئەفەرموێت: کەسوکاری عەبدوڵڵا وایان لێهاتووە کە ئیتر دوربن لەوەو بێئیحتیاج بن کە هاوبەش بۆ خودا پەیدا بکەن، ئەو هاوبەشانەی کە خوا هیچ

بەلگەیەکی لەسەر نەناردون، پاشان فەرمووی: گوێم لە پێغەمبەر ﷺ بووە فەرموویەتی (إنَّ الرُّقَى وَالتَّمَائِمَ وَالتِّوَلَةَ شِركٌ). واتە: (تِوَلَة) و نوشتە و متەومور هاوبەش بۆ خوا پەیدا کردنە. ووتیان: ئەی ئەبو عبدالله ئەوە نوشتە و متەومورمان زانی. ئەی (تولة) چییە؟ فەرمووی: شتێکە ژنان دروستی ئەکەن بۆ ئەوەی لای مێردەکانیان خۆشەویست بن. حاکم و ئیبنو حیببان کە بە صەحیحیان داناوە گێراویانەتەوە.

٣- لە عیمرانی کوڕی حوصەینەوە هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ بازنەیەکی مسی لە قۆڵی پیاوێکدا بینی فەرمووی: (وَيحَكَ مَا هَذِهِ؟ قَالَ: مِنَ الوَاهِنَةِ؛ قَالَ: أمَا إنَّها لاتَزِيدُ إلا وَهناً، انبذهَا عَنكَ، إنَّكَ لَو مِتَّ وَهِيَ عَلَيكَ، مَا أفلَحتَ أبَداً). رواه أحمد. واتە: فەرمووی: ماڵ خراپ ئەوە چییە؟ ووتی: بۆ باداری لە دەستم کردووە، فەرمووی: ئەو جۆرە شتانە باداری نەبێت هیچ زیاد ناکەن، فڕێی دە، چونکە ئەگەر بمریت و ئەوەت لە قۆڵدا بێت هەرگیز ڕزگار نابیت.

(واهنة) : دەمارێکە لە شان و قۆڵدا هەڵئەوێستی، وە ووتراوە واهنە دەردێکە توشی قوڵ دەبی، جا ئەو پیاوە هەڵقەیەکی مسی هەڵگرتبوو پێی وابوو لە ئازار دەیپارێزێ، پێغەمبەر ﷺ نەهی لێ کرد و ئەوەی بە تەمیمە دانا.

٤- ئەبو داود لە عیسای کوڕی حەمزەوە ئەگێڕێتەوە ووتوویەتی: چووم بۆ ماڵی عبدوڵلای کوڕی حەکیم سورکەی توش بوو بوو، منیش پێم ووت: ئەوە بۆچی نوشتەیەك یا متەوموورویەك ناکەیتە ملت؟ ووتی: پەنا ئەگرم بەخوا لەو جۆرە شتانە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (مَن عَلَّقَ شَيئاً وُكِلَ إلَيهِ). واتە: هەرکەس شتێکی هەڵواسی بەخۆیدا، ئەدرێتەوە دەست ئەو شتەو بەو دەسپێردرێ.

**ئایا دروستە ئەو دوعایانەی کە لە کیتاب و سوننەتدا هاتوون هەڵواسرێن بە خۆدا؟:**

عەمری کوڕی شوعەیب لە باوکییەوە لە باپیرەیەوە کە عەبدوڵلای کوڕی عەمری کوڕی عاصە ئەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (إذَا فَزِعَ أحَدُكُم فِي النَّومِ فَليَقُل: أعُوذُ بِكَلِمَاتِ اللهِ التَّامَّةِ مِن غَضَبِهِ وَعِقَابِهِ وَشَرِّ عِبَادِهِ، وَمِن هَمَزَاتِ الشَّيَاطِينِ وَأن يَحضُرُون فَإنَّها لَن تَضُرَّهُ). واتە: ئەگەر کەسێکتان بەترسەوە لە خەو ڕاپەڕی با بڵێت: پەنا ئەگرم بە ووشە تەواوەکانی خوا لە ڕق و کینە و سزای خوا و لە شەڕی بەندەکانی و وەسوەسەی شەیتانەکان وە هەروەها پەنا ئەگرم لە ئامادەبونیان ئیتر زیانی پێ ناگەیەنێت. وە عەبدوڵلای کوڕی عەمر ئەو مندالانەی کە فامیان هەبو پێی لەبەر ئەکردن، وە ئەوانەی فامیان نەبوو، لە پارچەیەکدا ئەینوسی و ئەی کردە ملیان. ئەبو داود و نەسائی گێڕاویانەتەوە و (ترمذي) ووتوویەتی (حسن غريب).

هەروەها حاکم گێڕاویەتییەوە ووتوویەتی: ئیسنادەکەی صەحیحە، وە عائیشەو مالیك و بەشی زۆری شافیعیەکان بۆ ئەوە چوون.

بەڵام ئیبنوعەبباس و ئیبنومەسعودو حوزەیفە و حەنەفییەکان و هەندێك لە شافیعیەکان و ڕیوایەتێکی ئەحمەد بۆ ئەوە چوون، کە دروست نیە هیچ شتێك هەڵواسرێت یا بکرێتە مل بە پێی ئەو قەدەغەییە گشتیەی کە لە فەرموودەکانی پێشەوەدا هاتوون.

**مەنع کردنی نەخۆش لە مانەوە لەگەڵ ساغەکاندا :**

هەرکەس تووشی نەخۆشی گیرەوە بوبێت، دروستە ڕێی نەدرێت لەگەڵ ساغەکاندا دا بنیشێت و قسەیان لەگەڵدا بکات و نزیکیان بکەوێتەوە. چونکە پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: (لا يُورِدَنَّ مُمرِضٌ عَلَى مُصِحٍ) واتە: با نەخۆش نەچێتە ناو ساغەکانەوە، وە ڕێی نەئەدا وشتری نەخۆش تێکەڵ بە ساغەکان بکرێت هەرچەندە ئەیفەرموو (لاعَدوَى وَلا طِيَرَةَ)، واتە: نە گرتنەوە هەیە و نە بەدبوومی و بەدشومی.

هەروەها ئەگێڕنەوە کە پیاوێکی گەر ویستی بێت بۆ مەدینە موبایەعەی بکات، پێغەمبەر بەیعەتەکەی بۆ نارد و ڕێیی پێ نەدا بێتە ناو مەدینەوە.

**هەڵنەهاتن لە تاعون و نەچوونە ناو شاری تاعون لێ دراو:**

پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی کردبوو کەسێك لەو شوێنە بچێتە دەرەوە کە نەخۆشی تاعونی تێدا بڵاو بۆتەوە یان بچێتە ناو ئەو شارەوە کە ئەو نەخۆشییەی تێدایە، چونکە ئەوە خۆ خستنە بەر ئەو بەڵایەیە، وە بۆ ئەوەی ئەو نەخۆشیە لەو شوێنەدا بمێنێتەوەو وەبا بڵاو نەبێتەوە، ئەمەش ئەمڕۆ پێی ئەڵێن (الحِجْرُ الصِّحِّيّ).

(ترمذي) ئەیگێڕێتەوە و پلەی (حسن صحيح) ی بۆ داناوە.

لە ئوسامەی کوڕی زەیدەوە هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ باسی تاعونی کردو فەرمووی: (بَقِيَّةُ رِجزٍ أو عَذَابٍ أُرسِلَ عَلَى طَائِفَةٍ مِن بَنِي إسرَائِيلَ، فَإذَا وَقَعَ بِأرضٍ وَأنتُم بِهَا فَلا تَخرُجُوا مِنهَا، وَإذَا وَقَعَ بِأرضٍ وَلَستُم بِهَا فَلا تَهبِطُوا عَلَيهَا). واتە: ئەوە پاش ماوەی سزایەکە کە بۆ سەر کۆمەڵێکی بەنی ئیسرائیل نێرراوە، جا ئەگەر لە زەوییەکدا بڵاو بۆوەو ئێوە لەو شوێنە بوون دوور مەکەونەوە و لەو شوێنە مەڕۆن، وە ئەگەر لە شوێنێك دا کەوتەوەو ئێوە لەو شوێنە دا نەبوون مەچنە ئەو شوێنە.

بوخاری لە ئیبنو عەبباسەوە ئەگێڕێتەوە کە: عومەری کوڕی خەطاب بەرەو شام ڕۆیشت هەتا گەیشتە شوێنێك پێی ئەڵێن سەرغ لەوێ ئەمیری سوپاکانی پێ گەیشت، کە ئەبو عوبەیدە و هاوەڵەکانی بوون، پێیان ووت کە تاعوون کەوتۆتەوە لە شام، ئیبنوعەبباس ئەڵێت: عومەر فەرموی: کۆچ کەرانی یەکەم جارم بۆ بانگ بکە، ئینجا بانگی کردن و ڕاوێژی پێ کردن و پێی ڕاگەیاندن کە تاعون لە شام کەوتۆتەوە، ئەوانیش لەناو خۆیاندا جیاوازیان هەبوو، هەندێکیان ووتیان ئێمە بۆ کارێك هاتووین ڕامان نیە لێی بگەڕێینەوە، وە هەندێکی تریان ووتیان: یارەکانی پێغەمبەرو پاشماوەی ئەو خەڵکەمان لەگەڵدایە ڕامان وا نیە بەرەو ئەو دەردەیان بەرین، عومەریش فەرمووی: لام چۆڵ بکەن، پاشان فەرموی: یارمەتی دەرەکانم

(أنصار) بۆ بانگ بکە، کاتێ بانگی کردن و پێی ڕاگەیاندن دوو نەفەر لە کۆمەڵەکەدا لەگەڵ یەك جیاوازیان نەبوو، وە هەموویان وتیان: ڕامان وایە بگەڕێیتەوەو ئەو خەڵکە بەرەو ئەو دەردە نەبەیت. جا عومەر لەناو خەڵکەکەدا هاواری کرد: من بەرەو دووا ئەگەڕێمەوە ئێوەش بگەڕێنەوە، ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەڕڕاح وتی: ئایا لە قەدەری خوا هەڵدێی؟ عومەر فەرمووی: خۆزگە کەسێکی تر ئەوەی بوتایە؟ بەڵێ لە قەدەری خوا هەڵدێین بۆ قەدەری خوا. ئایا ئەگەر تۆ کۆمەڵێك وشترت هەبوو لە دۆڵێکدا بوون دوولای هەبوو لایەکیان پڕ لەوەڕو لاکەی تریان بێ لەوەڕ، ئەگەر لەلا پڕ لەوەڕەکەدا بیان لەوەڕێنی لە قەدەری خوا نییە؟ وە ئەگەر لە لا بێ لە وەڕەکەدا بیان لەوەڕێنی هەر لە قەدەری خوا نەت لەوەڕاندووە؟ پاشان (عبدالرحمن)ی کوڕی عەوف هات کەلەکاتی ئەو ڕاوێژ کردنەدا لەوێ نەبوو، وە بۆ پێویستی خۆی چوو بوو، وتی: من لەو بارەیەوە شتێك ئەزانم، گوێم لە پێغەمبەر ﷺ بووە فەرمویەتی: (إذَا سَمِعتُم بِهِ فِي أرضٍ فَلا تُقدِمُوا عَلَيهَا، وَإذَا وَقَعَ بِأرضٍ وَأنتُم بِهَا فَلا تَخرُجُوا فَراراً مِنهُ). واتە: ئەگەر بیستان وەبا لە شوێنێکدا کەوتووە مەچنە ناوی، وە ئەگەر لە شوێنێکدا کەوتەوە و ئێوەی تێدا بوون دەر مەچن لەو شوێنەو هەڵبێن لە دەردەکە. ئەڵێ: ئەمجار عومەر سوپاسی خوای کردو گەڕایەوە.

**پەسەندیەتی یادی مردن و خۆ ئامادەکردن بۆی:**

دانەری یاسای ئیسلام هانی داوە بۆ بیر کردنەوە لە مردن و خۆ ئامادە کردن بۆی بە کردەوەی چاك، وە ئەوەی بە دەلیلی خێر حساب کردووە.

لە ئیبنو عومەرەوە هاتووە فەرمویەتی: دەیەم کەس بووم هاتم بۆ لای پێغەمبەر ﷺ پیاوێك لە ئەنصاریەکان هەستاو وتی: ئەی نێرراوی خوا کێ هۆشیارترین و چاکترین کەسە؟ فەرمووی: (أكثَرُهُم ذِكراً لِلمَوتِ، وَأكثَرُهُم استِعدَاداً لِلمَوتِ، أولَئِكَ الأكيَاسُ ذَهَبُوا بِشَرَفِ الدُّنيَا وَكَرَامَةِ الآخِرَةِ). واتە: ئەوانەیان کە زۆر یادی مردن ئەکەن و خۆی بۆ ئامادە ئەکەن، ئەوانە هۆشیارن بە سەربەرزی دونیاو کەرامەتی ڕۆژی دوایی یەوە ڕۆیشتوون.

هەر لەوەوە هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (أكثِرُوا مِن ذِكرِ هَاذِمِ اللَّذَاتِ) رواه الطبراني بإسناد حسن.

واتە: زۆر یادی بڕەرەوەی خۆشیەکان بکەن کە مردنە.

لە ئیبنو مەسعودەوە هاتووە فەرمویەتی: پێغەمبەر ﷺ دەربارەی ئایەتی ﴿فَمَن يُرِدِ ٱللَّهُ أَن يَهۡدِيَهُۥ يَشۡرَحۡ صَدۡرَهُۥ لِلۡإِسۡلَٰمِ﴾ (الأنعام/١٢٥). واتە: هەرکەس خوا بیەوێ ڕێنمایی بکات سنگی فراوان ئەکات بۆ ئیسلام. فەرمویەتی: (إذَا دَخَلَ النُّورُ القَلبَ انفَسَحَ وَانشَرَحَ). واتە: کاتێ ڕۆشنایی کەوتە دڵەوە، بەرین و فراوان ئەبێ، وتیان: بۆ ئەوە نیشانەیەك هەیە هەستی پێ بکرێت؟ فەرمووی: (الإنَابَةُ إلَى دَارِ

الخُلودِ، وَالتَّنحِي عَن دَارِ الغُرُورِ، والإستعدادُ لِلمَوتِ قَبلَ لِقَاءِ المَوتِ) رواه ابن جرير، وله طرق مرسلة و متصلة يشد بعضها بعضاً. واته: گەڕانەوە بۆ خانەی هەمیشەیی و واز هێنان لە خانەی سەرکەشی و غرور، وخۆ ئامادە کردن بۆ مردن پێش گەیشتن بە مردن.

**خراپی ئاوات خواستنی مردن:**

خراپە کەسێك مردن بە ئاوات بخوازێ و بپاڕێتەوە کە بمرێت بەهۆی هەژاری یا نەخۆشی یا ناڕەحەتی‌یەك یا هەرچی شتێکی ناخۆش.

بەپێی ئەوەی جەماعەت لە ئەنەسەوە ئەگێڕنەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (لايَتَمَنَّيَنَّ أحَدُكُمُ المَوتَ لِضُرٍّ نَزَلَ بِهِ فَإِن كَانَ مُتَمَنِّياً لِلمَوتِ فَلْيَقُل: اللَّهُمَّ أحيِنِي مَا كَانَتِ الحَيَاةُ خَيراً لِي، وَتَوَفَّنِي إذَا كَانَتِ الوَفَاةُ خَيراً لِي). واته: کەستان مردن بە ئاوات نەخوازێت، لەبەر زیانێك کە تووشی ببێت، ئەگەر هەر بە ئاواتی خواست با بڵێت: خوایە ئەگەر ژیان خێری تێدایە بۆم بژێنە، وە ئەگەر مردن خێری تێدایە بۆم بمرێنە.

وە حیکمەتی قەدەغەبوونی ئاوات خواستن بۆ مردن ئەوەیە: کە لە حەدیسی (أم الفضل)دا هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ چوو بۆ لای عەبباسی مامی کە نەخۆش بوو مردنی بە ئاوات ئەخواست. فەرموی ﷺ: (يَا عَبَّاسُ! يَا عَمَّ رَسولِ الله! لاتَتَمَنَّ المَوتَ إن كُنتَ مُحسِناً تَزدَادُ إحسَاناً إلى إحسَانِكَ خَيرٌ لَكَ، وَإن كُنتَ مُسِيئاً فإن تُؤَخَّر تَستَعتِب خَيرٌ لَكَ. فَلا تَمَنَّ المَوتَ) رواه أحمد والحاكم وقال: صحيح على شرط مسلم. واته: ئەی عەبباس ئەی مامی پێغەمبەر ﷺ! مردن بە ئاوات مەخوازە، چونکە ئەگەر چاکەکار بیت چاکەی تر ئەخەیتە سەرچاکەکانت، جا خێرە بۆت، وە ئەگەر خراپەکاریش بیت ئەوە ئەگەر مردنت دوا بخرێت و هەوڵی ڕەزامەندی خوا بدەیت، ئەوەش هەر خێرە بۆت لەبەر ئەوە مردن بە ئاوات مەخوازە.

بەڵام ئەگەر کەسێك ترسی هەڵگەڕانەوەی لە ئایین هەبوو، ئەوە دروستە حەز لە مردن بکات بێ ئەوەی کەراهەتی هەبێت، وە ئەوەی بیستراوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ ئەوەیە کە لە پاڕانەوەکانیدا ئەیفەرموو: (اللَّهُمَّ إنِّي أسألُكَ فِعلَ الخَيرَاتِ وَتَركَ المُنكَرَاتِ وَحُبَّ المَسَاكِينِ، وَأن تَغفِرَ لِي وَتَرحَمَنِي، وَإذَا أَرَدتَ فِتنَةً فِي قَومِي فَتَوَفَّنِي غَيرَ مَفتُونٍ، وَأسألُكَ حُبَّكَ وَحُبَّ مَن يُحِبُّكَ وَحُبَّ عَمَلٍ يُقَرِّبُ إلى حُبِّكَ) رواه الترمذي وقال حسن صحيح. واته: خوایە داوات لێ دەکەم یارمەتیم بدەیت کاری خێر بکەم و واز لە خراپە کاری بهێنم و هەژارانم خۆش بوێت، وە داوات لێ ئەکەم لێم ببوریت و بەزەییت پێمدا بێتەوە، وە ئەگەر ویستت نەتەوەکەم توشی فیتنەیەك بکەیت من بمرێنە بێ ئەوەی توشی فیتنە ببم، وە داوات لێ ئەکەم خۆشەویستی خۆت بخەیتە دڵمەوە، وە ئەوانەم خۆش بوێت کە تۆیان خۆش ئەوێت، وە کارێکم خۆش بوێت کە نزیکم بکاتەوە بۆ خۆشەویستی تۆ.

له (الموطأ) دا هاتووه كه عومەر خواى لىٚ ڕازى بيٚت ئەپاڕايەوە ئەىفەرموو: خوايە تەمەنم زۆر بووە و توانام لاواز بووە و ژێر دەستەكانيشم بلاّو بوونەوە، جا گيانم بكێشە بۆ لاى خۆت بىٚ ئەوەى هيچم لەكيس خۆم دابێت و كەمتەرخەميم كردبێت.

**چاكێتى تەمەن درێژى لەگەلّ كردەوەى چاكدا:**

١- له عبد الرحمن ى كوڕى ئەبى بەكرەوە هاتووە ووتوويەتى: باوكم ووتى: پياوێك هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ ووتى: ئەى نێرراوى خوا چاكترين كەس كىٚيە؟ فەرمووى (مَن طَالَ عُمُرُهُ وَحَسُنَ عَمَلُهُ). واتە: ئەو كەسەى تەمەنى درێژ بێت و كردەوەى چاك بێت. ووتى: ئەى خراپ ترين كەس كىٚيە؟ فەرمووى: (مَن طَالَ عُمرُهُ وَسَاءَ عَمَلُهُ) رواه أحمد والترمذي، وقال: حسن صحيح. واتە: ئەو كەسەى تەمەنى درێژ بێت‌و كردەوەى خراپ.

٢- له ئەبى هورەيرەوە هاتووە كه پێغەمبەر ﷺ فەرمويەتى: (ألا أُنَبِّئُكُم بِخَيرِكُم؟ قَالُوا: نَعَم يَا رَسُولَ الله! قَالَ: خِيَارُكُم أَطوَلُكُم أعمَاراً وأحسَنُكُم أعمَالاً) رواه أحمد وغيره بسند صحيح. واتە: ئايا پێتان بلێم چاكترينتان كامانەن؟ ووتيان: بەلىٚ پێمان بلىٚ ئەى نێرراوى خوا، فەرمووى: چاكترينتان ئەوانەن كه تەمەنيان درێژتر بێت‌و چاكترين كردەوە بكەن.

**كردنى كردەوەى چاك پێش مردن بەلگەى عاقيبەت خێرىيە:**

ئەحمەدو حاكم‌و ئيبنوحيببان له ئەنەسەوە ئەگێڕنەوە كه پێغەمبەر ﷺ فەرمويەتى: (إذَا أرَادَ اللهُ بِعَبدٍ خَيراً استَعمَلَهُ) واتە: ئەگەر خواى گەورە چاكەى بەندەيەكى بوێت بەكارى ئەهێنێت.

ووتيان: چۆن بەكارى ئەهێنێت؟ فەرمووى: (يُوَفِّقهُ لِعَمَلٍ صَالِحٍ قَبلَ المَوتِ، ثُمَّ يَقبِضهُ عَلَيهِ). واتە: پێش ئەوەى بمرىٚ يارمەتى ئەدات بۆ كردەوەى چاك پاشان گيانى ئەكێشێت.

**پەسەندى گومانى چاك بە خوا:**

پێويستە نەخۆش بيرى فراوانى ڕەحمەتى خوا بكاتەوە و گومانى چاكە بە پەروەدرگارى خۆى ببات بە پێى ئەوەى موسليم له جابيرەوە ئەگێڕێتەوە فەرمويەتى: گوێم له پێغەمبەر ﷺ بوو پێش ئەوەى كۆچى دوايى بكات بەسىٚ شەو ئەىفەرموو: (لايَمُوتَنَّ أحَدُكُم إلا وَهُوَ يُحسِنُ الظَّنَّ بِالله). واتە: پێش ئەوەى كەسێكتان بمرێت با گومانى چاك بە خوا ببات.

له فەرموودەكەدا پەسەندى ڕەجا كردنى زۆر له خواو هيواى لىٚ بوردنى تێدايە، تاوەكو بگات بە خوا لەسەر ئەو شێوەيە كه خۆشەويست ترين شێوەيە لاى خوا، چونكە ئەو ڕەحمان و ڕەحيمەو سەخىيەو بەرێزە، لێبوردن و تكاى پىٚ خۆشە، وە له فەرموودەدا هاتووە ئەفەرموێت: (يُبعَثُ كُلُّ أحَدٍ عَلَى مَا مَاتَ عَلَيهِ) واتە: هەركەس لەسەر چى مردبێت لەسەر ئەوە زيندو ئەكرێتەوە.

ئیبنوماجەو (ترمذي) بەسەندێکی (جید) ئەگێڕنەوە لە ئەنەسەوە فەرمویەتی: پێغەمبەر ﷺ چووە لای کوڕێکی گەنج کە لە سەرەمەرگدا بوو فەرمووی: (کیف تجدك) واتە: خۆتت لا چۆنە لەم کاتەدا، ووتی: هیوام بە خوا هەیەو لە گوناهەکانم ئەترسم، پێغەمبەر ﷺ فەرموی: (لایَجتَمِعَانِ فِي قَلبِ عَبدٍ مِثلَ هَذَا المَوطِنِ إلا أعطَاهُ اللهُ مَایَرجُوهُ وَأمَّنَهُ مِمَّا یَخَافُ). واتە: ئەو دوو شتە لەم کاتانەدا لە دڵی هیچ بەندەیەکدا کۆنابنەوە ئیللا خوا ئەوەی ئەداتێ کە بەهیوایەتی و هێمنی ئەکاتەوە لەوەی لێی ئەترسێت.

**پەسەندی پاڕانەوە و یادی خوا لە لایەن ئەو کەسانەوە کە ئامادەن لای کەسێك کە لە سەرەمەرگدا بێت:**

پەسەندە پیاوچاکان حازری لای ئەوکەسانە بن کە لەسەرەمەرگدان و خەریکن گیان ئەدەن، بۆ ئەوەی یادی خوایان لەلا بکەن.

١- ئەحمەدو موسلیمو خاوەن سوننەکان لە ئومموسەلەمەوە ئەگێڕنەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (إذَا حَضَرتُمُ المَرِیضَ، أوِ المَیِّتَ فَقُولُوا خَیراً، فَإنَّ المَلائِکَةَ یُؤَمِّنُونَ عَلَى مَا تَقُولُونَ). واتە: ئەگەر ئامادەی لای نەخۆش یان کەسێك کە لە سەرەمەرگدایە بوون، قسەی خێر بکەن چونکە فریشتەکان ئامین دەکەن لەسەر ئەوەی ئەیڵێن.

ئوموسەلەمە فەرمویەتی: کاتێ ئەبو سەلەمە کۆچی دوایی کرد، هاتمە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ پێم ووت: ئەی نێرراوی خوا ئەبوسەلەمە کۆچی دوایی کرد. فەرموی بڵێ: (اللَّهُمَّ اغفِر لِي وَلَهُ، وَأعقِبنِي مِنهُ عُقبى حَسَنَةً). واتە: خوایە لەمن و لەویش ببوورە و لەوم باشتر بۆ بکە بە جێنشین.

ئەڵێ: ئەو دوعایەم ووت جا خوا لەو چاکتری بۆ دانام کە پێغەمبەر بوو ﷺ.

٢- لە صەحیحی موسلیمدا هاتووە هەر لە ئوموسەلەمەوە کە پێغەمبەر ﷺ هاتە لای ئەبوسەلەمە مردبوو چاوەکانی کرابونەوە، پێغەمبەر ﷺ چاوەکانی بە دەستی پیرۆزی داخستەوەو پاشان فەرموی: (إنَّ الرُّوحَ إذَا قُبِضَ، تَبِعَهُ البَصَرُ) واتە: کاتێ گیان کێشرا چاویش بە دوایدا ئەڕوات. کەس‌وکاری دەستیان کرد بە هاوارو گریان: پێغەمبەر ﷺ فەرموی: (لاتَدعُوا عَلَى أنفُسِکُم إلا بِخَیرٍ، فَإنَّ المَلائِکَةَ یُؤَمِّنُونَ عَلَى مَاتَقُولُونَ) واتە: بە چاك نەبێت دوعا لە خۆتان مەکەن چونکە ئێوە چی بڵێن فریشتەکان ئەڵێن: (آمین)، پاشان فەرموی: (اللَّهُمَّ اغفِر لأبِي سَلَمَةَ وَارفَع دَرَجَتَهُ فِي المَهدِیِّینَ، وَأخلِفهُ فِي عَقِبِهِ الغَابِرِینَ، وَاغفِر لَنَا وَلَهُ یَارَبَّ العَالَمِینَ وَافسَح لَهُ فِي قَبرِهِ، وَنَوِّر لَهُ فِیهِ). واتە: خوایە لە ئەبی سەلە ببورە و پلەی لەناو ڕێنمون کراوەکاندا بەرز بکەرەوە و جێنشینی بە لەناو کەس‌وکارە بەجێ ماوەکانی و چاکیان بکە ئەی پەروەردگاری جیهانیان و لە ئێمە و لەویش خۆشبە، و گۆڕەکەی بۆ فراوانو ڕوناك بکە.

**ئەوەی سوننەتە لە کاتی سەرەمەرگدا:**

سوننەتە کاتێك کەسێك گەیشتە سەرەمەرگ ئەو کەسانەی بەدیاریەوەن چاودێری ئەم سوننەتانەی خوارەوە بکەن:

١- ووشەی (لا إله إلا الله)ی فێر بکرێت: بە پێی ئەوەی موسلیمو ئەبوداودو (ترمذي) لە ئەبوسەعیدی خودرییەوە ئەگێڕنەوە کە پێغەمبەر فەرمویەتی: (لَقِّنُوا مَوتَاكُم لا إِلَهَ إلا الله). واتە: ئەو نەخۆشانەتان کە ئەکەونە سەرە مەرگەوە فێری (لا إله إلا الله) یان بکەن.

ئەبوداود ئەگێڕێتەوەو حاکم بە صحیحی داناوە لە موعاذی کوڕی جەبەلەوە خوا لێی ڕازی بێت وتوویەتی پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (مَن كَانَ آخِرُ كَلامِهِ لا إِلَهَ إلا الله دَخَلَ الجَنَّةَ). واتە: هەرکەس دووا قسەی (لا إله إلا الله) بێت ئەچێتە بەهەشتەوە.

ئەو فێرکردنە کە پێی ئەووترێت (تلقین) بۆ کەسێکە لەو کاتەدا شایەتمان نەهێنێ. ئەگینا ئەگەر کەسێك خۆی ئەو ووشەیە بڵێت ئیتر فێرکردنی بێ مانایە.

تەلقینیش بۆ کەسێکە کە ئاگای لە خۆی مابێت و قسە بکات، چونکە کەسێکی بێ هۆش کە ئاگای لەخۆی نەبوو ناتوانرێت فێر بکرێت، بەڵام ئەگەر تەنها زمانی شکابوو ئەتوانێ لە دڵی خۆی دا ئەو ووشەیە بڵێت.

زانایان ئەڵێن: نابێت زۆری لێ بکرێت بۆ ووتنی، وە نابێ پێی بوترێت بڵێ (لا إله إلا الله) نەك ماندوو ببێت و قسەیەکی نادروست بکات، بەڵکو ئەبێت بەشێوەیەك بێت خۆی لە بەر خۆیەوە ووشەی (لا إله إلا الله) بڵێت و بیدات بە گوێ دا، بۆ ئەوەی مردووەکە تێ بگات کە مەبەستیان ئەوە و بتوانێت بیڵێت، وە ئەگەر جارێك ووتی زۆری لێ نەکرێت بۆ دووبارە کردنەوەی، ئەگەر لە دوای ئەوە قسەی تری نەکرد، بۆ ئەوەی دووا ووشەی ئەوە بێت.

جومهوری زانایان لەسەر ئەوەن کە ئەوکەسەی لەسەرە مەرگ دا بێت تەنها فێری ووتنی: (لا إله إلا الله) ئەکرێت بە پێی ڕواڵەتی فەرموودەکە.

بەڵام کۆمەڵێك لە زانایان ئەڵێن ئەبێ شایەتومانی تەواوی فێر بکرێت چونکە یادی یەکتاپەرستی و باوەڕ لەسەر ئەو دووانە وەستاوەتەوە واتە: فێری (لا إله إلا الله، محمد رسول الله) بکرێت.

٢- ڕووی بکرێتە قیبلە و لەسەر لای ڕاست ڕابکێشرێت: بەپێی ئەوەی بەیهەقیو حاکم کە بە صەحیحی داناوە ئەگێڕنەوە لە ئەبی قەتادەوە کە پێغەمبەر ﷺ کاتێ هاتە مەدینە هەواڵی بەرائی کوڕی مەعروری پرسی؟ ووتیان: نەماوەو وەسێتی کردووە سێ‌یەکی ماڵەکەی بدرێت بە تۆ، وەکاتی سەرەمەرگ ڕووی بکرێتە قیبلە، جا پێغەمبەر ﷺ فەرموی: (أَصَابَ الفِطرَةَ وَقَد رَدَدتُ ثُلُثَ مَالِهِ عَلَى وَلَدِهِ). واتە: سروشتی خۆی پێکاوە، وا منیش سێ‌یەکی ماڵەکەیم دایەوە بە منداڵەکانی. پاشان چوو نوێژی لەسەر کردو فەرموی: (اللَّهُمَّ اغفِر لَهُ وَارحَمهُ وَأَدخِلهُ جَنَّتَكَ وَقَد فَعَلتَ). واتە: خوایە لێی ببورە و میهرەبان بە لەگەڵیا وە بیخەرە بەهەشتەکەتەوە، وا دوعا کەشت وەرگرتم.

حاکم ئەڵێت: دەربارەی ڕوو بەرەو قیبلەکردنی مردوو لەوە زیاتر هیچی تر نازانم.

ئەحمەد ئەگێڕێتەوە کە فاطمەی کچی پێغەمبەر ﷺ لە کاتی سەرەمەرگدا ڕووی کردبووە قیبلەو لەسەر لای ڕاست ڕاکشابوو.

ئەمەش ئەو شێوە ڕاکشانەیە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمان ئەکات بەخەوتو کە لە سەر ئەو شێوە بخەوێت، هەروەها مردوش لە گۆڕدا لەسەر ئەو شێوەیە ئەبێت.

لە ریوایەتێکدا لە شافیعیەوە هاتووە کە مردوو لەسەر پشت ڕا ئەکێشرێت و قاچەکانی بەرەو قیبلە ئەکرێت، وەنەختێ سەری بەرز ئەکرێتەوە بۆ ئەوەی ڕووی لە قیبلە بێت، بەڵام ئەو شێوەیەی جەماوەر یەکەم جار بۆی چووە، لەپێشترە کە کاری پێ بکرێت.

٣-خوێندنی سورەتی یاسین: بە پێی ئەوەی ئەحمەد و ئەبوداوود و نەسائی و حاکم و ئیبنوحیببان لە مەعقەلی کوڕی یەسارەوە ئەگێڕنەوە، وە ئیبنوحیببان و حاکم بەصەحیحیان داناوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی (يس، قَلبُ القُرآنِ، لايَقرَؤُهَا رَجُلٌ يُرِيدُ اللهَ وَالدَّارَ الآخِرَةَ إلا غَفَرَ لَهُ. وَاقرؤُوهَا عَلَى مَوتَاكُم). واتە: سورەتی یاسین دڵـی قورئانە و هەرکەس بەمەبەستی ڕازی بوونی خوا و پاداشتی ڕۆژی دوایی خوێندی، خوا لێی خۆش ئەبێت، جا ئێوەش لەسەر مردووەکانان بیخوێنن.

ئیبنوحیببان ووتویەتی: مردووەکان لێرەدا مەبەست ئەوانەن کەلەسەرە مەرگدان، چونکە ئەوکەسەی لەسەرەمەرگدا بێت قورئانی بەسەردا ئەخوێندرێت. (ابن القطان) ئەم حەدیثەی بە عیللەتدار داناوە بەوەی (إضطراب) و (وقف) و (جهالة)ی هەندێك لە گێڕەرەوەکانی، وە لە (دارقطني)یەوە ئەگێڕنەوە ووتوویەتی: حەدیسێکە ئیسنادەکەی (مضطرب) تێکەڵوپێکەڵەو مەتنەکەی مەجهولەو صەحیح نییە.

وە ئەوەی پشت گیری ئەو واتایە ئەکات ئەوەیە کە ئەحمەد ئەگێڕێتەوە لە موسنەدەکەیدا لە صەفوانەوە کە زانایان ئەیان ووت: ئەگەر سورەتی یاسین لە کاتی سەرەمەرگدا لای مردووەکە خوێنرا، گیان کێشانەکەی لەسەر ئاسان ئەبێت.

خاوەنی (مسند الفردوس) ئیسنادەکەی ئەگێڕێتەوە بۆ ئەبودەرداءو (أبوذر) کە ووتوویانە: پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (مَا مِن مَيِّتٍ يَمُوتُ فَتُقرَأُ عِندَهُ يس إلا هَوَّنَ اللهُ عَلَيهِ). واتە: هەر مردویەك سورەتی یاسینی لەسەر بخوێنرێت خوا گیان کێشانی لەسەر ئاسان ئەکات.

٤- چاو بەستنی مردو ئەوکاتەی گیانی دەر ئەچێت: بۆ ئەوەی بەمردویی چاوەکانی نەکرێتەوە، بە پێی ئەوەی موسلیم ئەگێڕێتەوە ئەڵێت: پێغەمبەر ﷺ چووە بۆ لای ئەبی سەلەمە مردبوو چاوەکانی کرابوونەوە ئەویش ﷺ چاوی نیشاند و فەرمووی: (إنَّ الرُّوحَ إذَا قُبِضَ تَبِعَهُ البَصَرُ). واتە: گیان کەدەر چوو چاویش شوێنی ئەکەوێت.

**٥- داپۆشینی بۆ ئەوەی شوێنی عەورەتی دەرنەکەوێت و دیمەنە گۆڕاوەکەی کاتی مردنی نەبینرێت:** عائیشە خوای لێ ڕازی بێت فەرمویەتی: پێغەمبەر ﷺ کاتێ گیانی دەرچوو بە قوماشێکی خەت خەت دایان پۆشی. بوخاری و موسلیم گێڕاویانەتەوە.

وە دروستە مردوو ماچ بکرێت بەڕای هەموو زانایان، چونکە عوسمانی کوڕی (مظعون) پێغەمبەری ماچ کردووە بەمردوویی، وە ئەبوبەکر خۆی داوە بەسەر پێغەمبەردا بەمردوویی و نێوچاوانی ماچ کردووەو فەرمویەتی: ئەی پێغەمبەر ئەی هەڵبژاردەی خوا.

**٦- پەلە کردن بۆ ئامادە کردنی مردو، کاتێك مردنەکەی بە تەواوەتی زاندرا:** جا ئەبێ خێرا سەرپەرشتی کەری دەست بکات بە شتنی و ناشتنی لە ترسی گۆڕان و بۆن کردنی، وە نوێژی لەسەر بکرێت بە پێی ئەوەی ئەبو داوود گێڕاویەتەوەو بێدەنگ بوە لەسەر ئیسنادەکەی لە حوصەینی کوڕی وەحوەحەوە کە (طلحە)ی کوڕی بەراء نەخۆش کەوت، جا پێغەمبەر ﷺ هات سەردانی کردو فەرموی: (إِنِّي لا أَرَى طَلحَةَ إلا قَد حَدَثَ فِيهِ المَوتُ، فَآذِنُونِي بِهِ، وَعَجِّلُوا، فَإنَّهُ لايَنبَغِي لِجِيفَةِ مُسلِمٍ أن تُحبَسَ بَينَ ظَهرَي أَهلِهِ). واتە: من وائەزانم کە (طلحة) ئەمرێت، جا کاتێ مرد خێرا ئاگادارم بکەن و خێرا ئامادەی بکەن، چونکە دروست نی‌یە لاشەی موسڵمان بەمردوویی لەناو کەس‌وکاریا ڕابگیرێت.

وە نابێت چاوەڕوانی هاتنی کەس بکرێت جگە لەسەر پەرشتی کارەکەی، ئەویش ئەوەندە چاوەڕوانی ئەکرێت کە ترسی بۆن کردنی نەبێت.

ئەحمەدو (ترمذي) لە عەلی‌یەوە خوا لێی ڕازی بێت ئەگێڕنەوە کە فەرمویەتی: پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (يَا عَلي! ثَلاثٌ لا تُؤَخِّرهَا: الصَّلاةُ إذَا أَتَت، وَالجَنَازَةُ إذَا حَضَرَت، وَالأَيِّمُ إذَا وَجَدَت كُفئاً). واتە: ئەی عەلی سێ شت هەرگیز دووا مەخە، نوێژ کە کاتی هات، جەنازە کاتێ ئامادە کرا، بێوەژن کە هاوتای خۆی دۆزی‌یەوە.

**٧- دانەوەی قەرزەکانی:** بەپێی ئەوەی ئەحمەدو ئیبنوماجەو (ترمذي) گێڕاویانەتەوەو (ترمذي) بە حەسەنی داناوە لە ئەبوهورەیرەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (نَفسُ المُؤمِنِ مُعَلَّقَةٌ بِدَينِهِ حَتَّى يُقضَى عَنهُ). واتە: گیانی باوەڕدار بەستراوە بە قەرزەکانی‌یەوە هەتا بۆی ئەدرێتەوە. واتە: ئەو باوەڕدارە کاری ئەوەستێت، فەرمان نادرێت بە ڕزگار بوونی یا بە فەوتانی، یاخود ڕائەگیرێ لە چونە بەهەشتەوە.

ئەمە بۆ کەسێکە کە ماڵی بەجێ ماوی هەبور لەو ماڵە قەرزەکەی بۆ بدرێتەوە، بەڵام ئەگەر کەسێك ماڵی بەجێ ماوی نەبوو، وە لە ژیاندا نیازی دانەوەی ئەو قەرزەی هەبوو، ئەوە سابت بوە کە خوای گەورە قەرزەکەی بۆ ئەداتەوە، هەروەهایە کەسێکیش کە ماڵی هەبوە وە حەزی کردووە قەرزەکانی بداتەوە، بەڵام فریا نەکەوتووەو میراتگرەکانیشی لە ماڵە بەجێ ماوەکەی قەرزەکەی بۆ نەدەنەوە.

لەلای بوخاری هەیە لە حەدیسی ئەبی هورەیرەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (مَن أخَذَ أموالَ النَّاسِ يُرِيدُ أدَاءَهَا أدَّى اللهُ عَنهُ، وَمَن أخَذَهَا يُرِيدُ إتلافَهَا أتلَفَهُ اللهُ). واتە: هەرکەس ماڵی کەسێکی وەرگرت بە نیازی دانەوەی ئەوە خوا بۆی ئەداتەوە، وە هەرکەس وەری بگرێت بەنیازی لەناوبردنی خوا لەناوی ئەبات.

ئەحمەدو ئەبونوعەیم و بەززارو (طبراني) ئەگێڕنەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (يُدعَى بِصَاحِبِ الدَّينِ يَومَ القِيَامَةِ حَتَّى يُوقَفَ بَينَ يَدَي اللهِ عَزَّوَجَل، فَيَقُولُ: يَا ابنَ آدَم! فِيمَ أخذتَ هَذَا الدَّينَ، وَفِيمَ ضَيَّعتَ حُقُوقَ النَّاسِ؟ فَيَقُولُ: يَارَبِّ إنَّكَ تَعلَمُ أنِّي أخَذتُهُ فَلَم آكُل وَلَم أشرَب وَلَم أُضَيِّع، وَلَكِن أتَى عَلَيَّ إمَّا حَرقٌ، وَإمَّا سَرقٌ، وَإمَّا وَضِيعَةٌ، فَيَقُولُ اللهُ: صَدَقَ عَبدِي، وَأنَا أحَقُّ مَن قَضَى عَنكَ، فَيَدعُوا اللهُ بِشَيءٍ فَيَضَعُهُ فِي كَفَّةِ مِيزَانِهِ، فَتَرجَحُ حَسَنَاتُهُ عَلَى سَيِّئَاتِهِ، فَيَدخُلُ الجَنَّةَ بِفَضلِ رَحمَتِهِ). واتە: کەسێك بمرێت و قەرزاری کەسێك بێت لە ڕۆژی دوایی بانگ ئەکرێت و ئەوەستێنرێت لەبەینی دوو دەستەی خوای گەورەدا، جا خوا ئەفەرموێت: ئەی ئادەمیزاد ئەو قەرزەت بۆچی وەرگرتووە؟ وە بۆچی مافی خەڵکت لەناو بردوە؟ ئەویش ئەڵێت: ئەی پەروەردگار خۆت ئەزانی من ئەو ماڵەم وەرگرت نەمدا بە شتێ بیخۆم و نەمدا بە شتێ بیخۆمەوە، وە خۆشم لەناوم نەبرد، بەڵکو سوتا یادزرا یا لەناو چوو، خوای گەورە ئەفەرموێت: ئەم بەندەیەم ڕاست ئەکات، لەبەر ئەوە من لە هەموو کەس لە پێش ترم ئەو قەرزەت بۆ بدەمەوە، ئینجا خوا داوای شتێك ئەکات و ئەیخاتە ناو تای ترازووەکەیەوە و لای چاکەکانی قورس تر ئەبێت لە خراپەکانی، و ئەچێتە بەهەشتەوە بە میهرەبانی خوا.

پێغەمبەر ﷺ لە پێشدا نوێژی لەسەر مردوویەك نە ئەکرد کە قەرزاری خەڵك بوایە بەڵام کاتێ خوا سەری خست و وڵاتانی بۆ کردەوەو سامانی دەوڵەتی ئیسلامی زیاد بوو، نوێژی لەسەر ئەکردو خۆی قەرزەکەی بۆ ئەداوە، وە لە بوخاریدا هاتووە پێغەمبەر ﷺ فەموویەتی: (أنَا أولَى بِالمُؤمِنِينَ مِن أنفُسِهِم، فَمَن مَاتَ وَعَلَيهِ دَينٌ، وَلَم يَترُك وَفَاءً، فَعَلَينَا قَضَاؤُهُ، وَمَن تَرَكَ مَالاً فَلِوَرَثَتِهِ). واتە: من بۆ باوەڕداران لە خۆیان بۆ خۆیان لە پێشترم، جا هەرکەس بمرێتو قەرزێکی بەسەرەوە بێت و هیچی بەجێ نەهێشتبێت بۆ دانەوەی، ئێمە بۆی ئەدەینەوە، وە هەرکەس ماڵێکی بەجێ هێشت دانەوەی بۆ میرات بەرەکانی ئەبێت.

بە پێی ئەو بەڵگەیە هەرکەس بە قەرزداری مرد مافی ئەوەی هەیە کە لە خانەی دارایی موسڵمانان (بيت المال) قەرزەکەی بۆ بدرێتەوە، وە لەبەشی (الغارمين) کە یەکێکن لەوانەی زەکاتیان پێ ئەشێت ئەبێ قەرزەکەی بۆ بدرێتەوە، چونکە بە مردن مافەکەی لەناو ناچێت.

## پەسەندی پاڕانەوەو ووتنی (إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعُونَ) لەکاتی مردنەکەدا

پەسەندە موسڵمان کاتێك کەسێکی بمرێت لە خوا بپاڕێتەوەو بڵێت: (إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعُونَ) واتە: ئێمە بەندەی خواین و هەر بۆ لای ئەو ئەگەڕێینەوە، بەم شێوەیەی خوارەوە:

١- ئەحمەدو موسلیم لە ئوموو سەلەمەوە ئەگێڕنەوە خوا لێی ڕازی بێت فەرمویەتی: گوێم لە پێغەمبەر ﷺ بوو ئەیفەرمو: (مَا مِن عَبدٍ تُصِيبُهُ مُصِيبَةٌ فَيَقُولُ: (إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعُونَ) اللَّهُمَّ أجُرنِي فِي مُصِيبَتِي وَأخلِف لَهُ خَيراً مِنهَا، إلا آجَرَهُ تَعَالَى فِي مُصِيبَتِهِ، وَأخلَفَ لَهُ خَيراً مِنهَا). واتە: کەسێك نی‌یە توشی موسیبەتێك و ناخۆشیەك ببێت و بڵێت: (إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعُونَ) وە بڵێ: خوایە پاداشتی ئەم موسیبەتە و ناخۆشیەم بدەرەوە و لەوە چاکترم بۆ قەرەبوو بکەرەوە. ئیللا خوا پاداشتی ئەداتەوەو لەو باشتری بۆ قەرەبو ئەکاتەوە.

ئوموسەلەمە دەفەرموێت: کاتێ ئەبو سەلەمە مرد ئەوەی پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێ کردم ووتم، جا خوا لەو باشتری بۆ قەرەبو کردمەوە کە پێغەمبەر بوو ﷺ.

٢- لە (ترمذي)دا هاتووە لە ئەبی موسای ئەشعەری‌یەوە خوا لێی ڕازی بێت کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (إذَا مَاتَ وَلَدُ العَبدِ، قَالَ تَعَالَى لِمَلائِكَتِهِ: قَبَضتُم وَلَدَ عَبدِي؟ فَيَقُولُونَ: نَعَم، فَيَقُولُ: قَبَضتُم ثَمَرَةَ فُؤَادِهِ؟ فَيَقُولُونَ: نَعَم، فَيَقُولُ: مَاذَا قَالَ عَبدِي؟ فَيَقُولُونَ: حَمِدَكَ وَاستَرجَعَ؛ فَيَقُولُ اللهُ تَعَالَى: ابنُوا لِعَبدِي بَيتاً فِي الجَنَّةِ وَسَمُّوهُ بَيتَ الحَمدِ) قال حديث حسن. واتە: ئەگەر کەسێك کوڕێکی مرد خوای گەورە بە فریشتەکانی ئەفەرموێت: گیانی ڕۆڵەی بەندەکەمتان کێشا؟ ئەڵێن: بەڵێ: ئەفەرموێت: بەربومی دڵێتان لێ کردەوە؟ ئەڵێن: بەڵێ، ئەفەرموێت: ئەی بەندەکەم چی ووت؟ ئەڵێن: سوپاسی تۆی کردوو ووتی: (إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعُونَ)، ئینجا خوای گەورە ئەفەرموێت: دە ئێوەش خانوویەکی لە بەهەشت بۆ دروست بکەن و ناوی بنێن خانوی سوپاس.

٣- لە بوخاریدا هاتووە لە ئەبو هورەیرەوە کە ووتویەتی: پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (يَقُولُ اللهُ تَعَالَى مَا لِعَبدِي المُؤمِنِ عِندِي جَزَاءٌ إذَا قَبَضتُ صَفِيَّهُ مِن أهلِ الدُّنيَا، ثُمَّ احتَسَبَهُ إلا الجَنَّةَ). واتە: لە بەهەشت بەولاوە پاداشتی ترم نی‌یە بۆ ئەو بەندە باوەڕدارەم کاتێ خۆشەویستێکی لە دونیا ئەمرێت و پاداشتی لە من داوا ئەکات.

٤- لە ئیبنو عەبباسەوە هاتووە لە تەفسیری: ﴿ٱلَّذِينَ إِذَآ أَصَٰبَتۡهُم مُّصِيبَةٞ قَالُوٓاْ إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّآ إِلَيۡهِ رَٰجِعُونَ ۝ أُوْلَٰٓئِكَ عَلَيۡهِمۡ صَلَوَٰتٞ مِّن رَّبِّهِمۡ وَرَحۡمَةٞۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُهۡتَدُونَ﴾ (البقرة/١٥٦-١٥٧). فەرمویەتی: خوای گەورە پێمان ڕا ئەگەیەنێت کە باوەڕدار کاتێك خۆی سپارد بەخوا لەکاتی

موسیبەت و ناخۆشیداو ووتی: ئێمە بەندەی خواین‌و هەر بۆلای ئەو ئەگەڕێینەوە سێ جۆر خێری بۆ هەیە: مەدح کردن و میهرەبانی لەلایەن خواوەو بەدی هێنانی ڕێی ڕاست.

**پەسەندی ئاگاداری کردنی خزم و کەسی مردوو هاوڕێکانی سەبارەت بە مردنی**

زانایان لایان پەسەندە خزم‌و کەسی مردووەکەو هاوڕێکانی و پیاوچاکان ئاگادار بکرێن لە مردنی بۆ ئەوەی پاداشتی هاوبەشی بونیان لە ئامادە کردن‌و ناشتنی دەست بکەوێت، بە پێی ئەوەی کە جەماعەت لە ئەبوهورەیرەوە ئەگێڕنەوە کە فەرمویەتی: پێغەمبەر ﷺ مردنی نەجاشی بە خەڵك ڕاگەیاند ئەو ڕۆژەی کە مرد ، وە خەڵکەی برد بۆ جێگەی نوێژی جەژن، و ڕیزی کردن و چوار (الله أكبر)ی کرد لەسەری.

ئەحمەدو بوخاری ئەگێڕنەوە لە ئەنەسەوە کە پێغەمبەر ﷺ هەواڵی مردنی زەید و جەعفەر و ئیبنورەواحەی بە خەڵك ڕاگەیاند پێش ئەوەی هەواڵەکەیان پێ بگات.

(ترمذي) ئەڵێت: قەیناکە پیاو خزم و براو کەسی ئاگادار بکات لە مردنی کەسێکیان. وە بەیهەقی ووتویەتی: لە مالیکی کوڕی ئەنەسەوە پێم گەیشتووە فەرمویەتی: حەز لە هاوار ناکەم لەبەردەم مزگەوتەکاندا بۆ مردنی کەسێك، بەڵام ئەگەر کەسێك بووەستێت لەبەردەم دانیشتوانی مزگەوتدا و مردنی کەسێکی پێ ڕاگەیاندن، ئەوە قەیناکە.

بەڵام ئەوەی ئەحمەدو (ترمذي) ئەگێڕنەوەو (ترمذي) بە (حسن)ی داناوە، لە حوزەیفەوە کە ووتوویەتی: ئەگەر مردم بە کەس مەڵێن، من لەوە ئەترسم ببێتە بانگەواز بۆم، چونکە خۆم گوێم لە پێغەمبەر ﷺ بووە ڕاگەیاندنی قەدەغە ئەکرد کە پێی ئەوترێت (نعي) ئەمە حەمل ئەکرێتە سەر ئەو شێوە بانگەوازەی کە لە سەردەمی نەفامیدا کردویانە، چونکە لەسەردەمی نەفامیدا عادەتیان وابووە ئەگەر پیاوێکی بەدەسەڵات بمردایە سواریان بەم لاو لادا بۆ ناو هۆزەکان ئەنارد و هاواریان ئەکردو ئەیان ووت: فلانەکەس مرد عەرەبیش مرد بەمردنی فلانە کەس، ئیتر لەگەڵ ئەوەشدا هاوار هاواریان ئەکرد و ئەشگریان.

**گریان لەسەر مردوو**

زانایان هەموویان کۆن لەسەر ئەوەی کە گریان لەسەر مردوو دروستە بەمەرجێك شیوەن و لاواندنەوەو هاوار هاواری تێدا نەبێت، لەصحیح دا هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (إنَّ اللهَ لايُعَذِّبُ بِدَمعِ العَينِ وَلا بِحَزَنِ القَلبِ، وَلَكِن يُعَذِّبُ بِهَذَا أَو يَرحَم! وَأَشَارَ إِلى لِسَانِهِ). واتە: خوا سزای کەس نادات لەسەر فرمێسکی چاوو پەژارەی دڵ، بەڵکو لەسەر ئەمەیان سزا ئەدرێت یا ڕەحمی پێ ئەکرێت؛ و ئاماژەی کرد بۆ زمانی.

پێغەمبەر ﷺ بۆ مردنی ئیبراهیمی کوڕی گریاوەو فەرمویەتی: (إنَّ العَينَ تَدمَعُ، وَالقَلبَ يَحزَنُ، وَلا نَقُولُ إلا مَا يُرضِي رَبَّنَا، وَإنَّا بِفِرَاقِكَ يَا إبرَاهِيمُ لَمَحزُونُونَ). واتە: بەڕاستی چاو فرمێسك ئەڕێژێت و دڵ

تەنگ ئەبێت، بەڵام هیچ ناڵێین مەگەر ئەوەی کە پەروەردگارمان پێی ڕازی بێت، وە ئێمە بە جیابونەوەت غەمبارەین ئەی ئیبراهیم.

هەروەها کاتێ ئومەیمەی کچی زەینەبی کچی مردووە بۆی گریاوە، سەعدی کوڕی عوبادە پێی ووت: ئەی نێرراوی خوا ئەوە ئەگریت؟ ئەی تۆ نەهیت نەئەکرد لە زەینەب کە بگری؟ فەرموی: (إِنَّمَا هِيَ رَحْمَةٌ جَعَلَهَا اللهُ فِي قُلُوبِ عِبَادِهِ، وَإِنَّمَا يَرحَمُ اللهُ مِن عِبَادِهِ الرُّحَمَاءَ). واتە: ئەو گریانە بەزەیییەکە خوا خستویەتییە دڵی بەندەکانییەوە، وەخوا لەناو بەندەکانیدا تەنها ڕەحم بەوانە دەکات کە بەبەزەیی‌و میهرەبانن.

(طبراني) لە عەبدوڵلای کوڕی زەیدەوە ئەگێڕێتەوە کە: ڕێ دراوە بە گریان بە بێ شیوەن کردن. بەڵام ئەگەر گریانەکە هاوارو شیوەن کردن بوو، ئەوە ئەبێتە هۆیەك لە هۆیەکانی ئازار و سزای مردوەکە.

لە ئیبنو عومەرەوە هاتووە فەرمویەتی: کاتێ عومەر خوای لێ ڕازی بێت خەنجەرکەی لێ درا بورایەوە و بێ هۆش بوو، دەستکرا بە گریان‌و هاوار بەسەریەوە، کاتێ هاتەوە هۆش خۆی فەرموی: ئەی نەتان زانیوە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (إِنَّ المَيِّتَ لَيُعَذَّبُ بِبُكَاءِ الحَيِّ) واتە: بەڕاستی مردوو بە گریانی زیندوو سزا ئەدرێت.

لە ئەبو موساوە هاتووە فەرمویەتی: کاتێ عومەر بریندار کرا صوهەیب هاواری ئەکردوو ئەی ووت: برا ڕۆ، عومەریش پێی فەرموو: ئەی صوهەیب نەتزانیوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (مَن نِيحَ عَلَيهِ فَإِنَّهُ يُعَذَّبُ بِمَا نِيحَ عَلَيهِ) واتە: هەرکەس شیوەنی لەسەر بکرێت سزا ئەدرێت بەو شیوەنەی کە لەسەری کراوە) ئەم فەرموودانە بوخاری و موسلیم گێڕاویانەتەوە.

واتای فەرموودەکە ئەوەیە ئەو مردووە لای ناخۆشە و توشی ئێش و ئازار ئەبێت بە گریانی کەس‌وکاری، چونکە گریانەکەیان ئەبیستێ و کردەوەکانیان نیشانی ئەدرێت، وە واتای فەرموودەکە ئەوە نییە کە بەهۆی خودی گریانی ئەوانەوە سزا بدرێت، چونکە کەس تاوانی کەسی نادرێت بەسەردا.

ئیبنوجەریر لە ئەبو هورەیرەوە ئەگێڕێتەوە کە فەرمویەتی: کردەوەکانتان نیشان مردوەکانتان ئەدرێت، جا ئەگەر بینیان خێرە دڵ خۆش ئەبن پێی، وە ئەگەر بینیان شەرە دڵ تەنگ ئەبن پێی.

ئەحمەدو (ترمذي) ئەگێڕنەوە لە ئەنەسەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (إِنَّ أَعمَالَكُم تُعرَضُ عَلَى أَقَارِبِكُم وَعَشَائِرِكُم مِنَ الأَموَاتِ، فَإِذَا كَانَ خَيراً استَبشَرُوا بِهِ، وَإِن كَانَ غَيرَ ذَلِكَ قَالُوا: اللَّهُمَّ لاتُمِتهُم حَتَّى تَهدِيَهُم كَمَا هَدَيتَنَا). واتە: کردەوەکانتان نیشانی خزم‌و کەس‌و هۆزە مردووەکانتان ئەدرێت، جا ئەگەر چاك بوو دڵشاد ئەبن پێی، وە ئەگەر چاك نەبوو ئەپاڕێنەوە ئەڵێن: خوایە مەیان مرێنە هەتا هیدایەتیان ئەدەیت وەك چۆن ئێمەت هیدایەت داوە.

له نوعمانی کوڕی بەشیرەوە هاتووە ووتوویەتی: کاتێ عەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحە بورایەوە عەمرەی خوشکی ئەگریاو ئەی لاواندەوە: ئەی بۆ کێوەکەم ڕۆ، بۆ ئەوەو ئەوەم ڕۆ، جا کاتێ هۆشی هاتەوە ووتی: هەرچیت پێ ئەوتم پێم ئەوترا ئایا تۆ وایت؟. بوخاری گێڕاویەتی‌یەوە.

## شیوەن (النیاحة)

نیاحة: لە (نَوح)ەوە هاتوە کە بە مانای گریان بەدەنگی بەرزو ڕۆ ڕۆیە.

چەند فەرموود هاتووە کە بە ئاشکرا ڕائەگەیەنن شیوەن کردن بۆ مردوو حەرامە، لە ئەبو مالیکی ئەشعەری‌یەوە هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (أربعٌ مِن أمرِ الجَاهِلِيَّةِ لايَترُكُونَهُنَّ: الفَخرُ فِي الأحسَابِ، وَالطَّعنُ فِي الأنسَابِ، وَالاستِسقَاءُ بِالنُّجُومِ، وَالنِّيَاحَةُ). واتە: چوار شتە لەناو ئوممەتی منایە خوی سەردەمی نەفامی‌یەو هەرگیز وازی لێ ناهێنرێت: شانازی کردن بە باو باپیرانەوە، و تانە و توانج لە ڕەچەڵەك و ڕەگەزی باوو باپیران، و داوای باران بەهۆی ئەستێرەکانەوە (کە پێیان وایە باران بارین بە تەئسیری ئەستێرەکانەوە ئەبێت)، و شیوەن کردن بۆ مردوو.

وە فەرموویەتی: (النَّائحَةُ إذَا لَم تَتُب قَبلَ مَوتِهَا، تُقَامُ يَومَ القِيَامَةِ وَعَلَيهَا سِربَالٌ مِن قَطِرَانٍ، وَدِرعٌ مِن جَرَبٍ) رواه أحمد و مسلم. واتە: شیوەن کەر ئەگەر پێش مردن تۆبە نەکات لەو کارەی، لە ڕۆژی قیامەتدا ڕاست ئەکرێتەوەو کراسی قەتران و پۆشاکی گولی بەبەردا ئەکرێت.

(أم عطية) فەرمویەتی: (پێغەمبەر ﷺ پەیمانی لێ وەرگرتین شیوەن نەکەین بۆ مردوو). بوخاری‌و موسلیم گێڕاویانەتەوە.

بەززار بەسەندێك کە گێڕەرەوەکانی جێی باوەڕن، ئەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (صَوتَانِ مَلعُونَانِ فِي الدُّنيَا وَالآخِرَةِ، مِزمَارٌ عِندَ نِعمَةٍ، وَرَنَّةٌ عِندَ مُصِيبَةٍ). واتە: دوو دەنگ لە دونیاو ئاخیرەتدا نەفرینیان لێ کراوە جوزەلە لەکاتی خۆشی، و شیوەن لەکاتی ناخۆشی.

لە صەحیحەیندا لە ئەبو موساوە هاتووە کە فەرمویەتی: من بەریم لەو کەسانەی پێغەمبەر ﷺ خۆی لێ بەری کردوون، پێغەمبەر ﷺ خۆی بەری کردووە لەو کەسەی بۆ مردوو شیوەن ئەکات‌و پرچی ئەبڕێت و جلی خۆی دا ئەدڕێنێت.

ئەحمەد لە ئەنەسەوە ئەگێڕێتەوە فەرمویەتی: پێغەمبەر ﷺ پەیمانی لە ئافرەتان وەرگرت کاتێك بەیعەتی پێ کردن کە شیوەن بۆ مردوو نەکەن، ئەوانیش ووتیان: چەند ئافرەتێك لەسەردەمی نەفامیدا شیوەنیان لەگەڵ گێڕاوین، ئایا لە ئیسلامدا شیوەنیان لەگەڵدا نەگێڕینەوە؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (لا إسعَادَ فِي الإسلامِ) واتە: لە ئیسلامدا یارمەتی دان نی‌یە لە شیوەن کردندا.

## ماتەمی گرتن بۆ مردوو (الإحداد على الميت)

دروستە بۆ ئافرەت سێ ڕۆژ ماتەمی بگێڕێ بۆ کەسێکی مردووی، بەمەرجێك مێردەکەی ڕێی پێ بدات وە لەوە زیاتر حەرامە لەسەری، بەڵام ئەگەر مردووەکە مێردی بوو پێویستە لەسەری کە ماوەی عیددەکەی ماتەمی بگێڕێت، کە چوار مانگ و دەڕۆژە.

بە پێی ئەوەی خاوەنی شەش سونەنەکان جگە لە (ترمذی) ئەگێڕنەوە لە (أم عطية)وە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (لاتَحُدُّ امرأةٌ عَلَى مَيِّتٍ فوقَ ثلاثٍ، إلا عَلَى زَوجٍ، فَإنَّها تَحُدُّ عَلَيهِ أربَعةَ أشهُرٍ وَعَشراً؛ وَلا تَلبَسُ ثَوباً مَصبُوغاً، إلا ثَوبَ عَصبٍ، وَلا تَكتَحِلُ، وَلاتَمَسُّ طِيباً، وَلاتَختَضِبُ، وَلاتَمتَشِطُ، إلا إذَا طَهُرَت، تَمَسُّ نَبذَةً مِن قُسطٍ أو أظفَارٍ). واتە: نابێت هیچ ژنێك لە سێ ڕۆژ زیاتر بۆ مردووەیەکی ماتەمی بگرێت جگە لە مێرد کە ئەبێت چوار مانگ‌و دەڕۆژ ماتەمی بۆ بگرێت، لەو ماویەدا نابێت جلی ڕەنگاو ڕەنگ لەبەر بکات جگە لە بوردی یەمانی، وە نابێت چاوی برێژێت و بۆن لە خۆی بدات و خەنە بگرێتە سەری و شانەی بکات کاتی پاك بوونەوە لە بێ نوێژی نەبێت، کە بۆی هەیە کەمێك بۆنی خۆش بە کار بهێنێ بۆ لابردنی بۆنی ناخۆش.

ماتەمی گرتن ئەوەیە ئافرەت واز لەو شتانە بهێنێت کە ژن خۆی پێ ئەڕازێنێتەوە لە خشڵ و کل و حەریر و بۆنی خۆش و خەنە، وە ئەمەش لەسەر ژنی مێرد مردو پێویست کراوە لەماوەی عیددەکەیدا لەبەر وەفای بەرامبەر بە مێردو چاودێری مێرد.

## پەسەندی‌یەتی خواردن دروست کردن بۆ کەس‌و کاری مردووەکە

لە عەبدوڵلای کوڕی جەعفەرەوە هاتووە فەرمویەتی: پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (إصنَعُوا لآلِ جَعفَرَ طَعَاماً، فَإنَّهُ قَد أتَاهُم أمرٌ يُشغِلُهُم) رواه أبو داود و ابن ماجة و الترمذي وقال حسن صحيح. واتە: خواردن دروست بکەن بۆ کەس‌وکاری جەعفەر، چونکە شتێکیان بۆ پێش هاتوە کە سەرقاڵی کردون.

یاسادانەری ئیسلام ئەو کردەوەیەی بۆیە پەسەند کردوە چونکە کارێکی چاکەو خۆ نزیك کردنەوەیە لە کەس‌وکارو بەرو دراوسێدا.

شافیعی ڕەحمەتی خوای لێ بێت ووتوویەتی: من وام پێ خۆشە خزمەکانی مردووەکەخواردن دروست بکەن بۆ خێزان و کەسی مردووەکە بۆماوەی شەوو ڕۆژێك، خواردنێکی وابێت تێریان بکات، چونکە ئەوە سونەتە و کاری ئەهلی چاکەیە.

زانایان لایان پەسەندە زۆر بکرێت لە کەس‌و کاری مردووەکە خواردن بخۆن بۆ ئەوەی لاواز نەبن بەبێ خواردن، جا لە ڕویان نەیەت خواردن بخۆن، یا لەبەر زۆری پەژارە خواردنیان بۆ نەخورێت.

وە ووتوویانە: دروست نىیە خواردن بۆ ئەو ژنانە بكرێت كە شیوەن ئەكەن لەبەر ئەوەى ئەبێتە یارمەتى دانیان بۆ ئەو سەرپێچى‌یە.

وە پێشەواكانى ئیسلام لەسەر ئەوە رێكن، كە كەراهەتى هەیە خاوەن مردوو خواردن بۆ خەڵك دروست بكات تا كۆ ببنەوە لەسەرى، چونكە ئەبێتە هۆى زیاد كردنى موسیبەتەكە و سەرقاڵ كردنیان سەرەڕاى كاروبارى خۆیان، هەروەها ئەو كارە لە كارى ئەهلى سەردەمى نەفامى ئەچێت، بەپێى ئەو حەدیسەى كە جەریر ئەیگێڕێتەوە ئەفەرموێت: بەلاى ئێمەوە كۆبونەوە لەلاى كەسوكارى مردوو سازكردنى خواردن پاش ناشتنى مردوەكە بە نیاحە دائەنرا. وە هەندێ لە زانایان بە حەرامیان داناوە.

ئیبنوقودامە ووتوویەتى: ئەگەر خواردن دروست كردن زۆر پێویست بوو، ئەوە دروستە چونكە لەوانەیە كەسانێك لە لادێكان و دووری‌یەوە هاتبن و لایان بمێننەوە، جا لەوكاتەدا چار نىیە ئەبێ میوان دارى بكرێن.

**ئامادەكردنى گۆڕو كفن پێش مردن دروستە :**

بوخارى لە باسى ئەوكەسەى كە كفنى بۆ خۆى ئامادە كردووە پێش مردنى لەسەردەمى پێغەمبەردا ﷺ، وە كەسیش ئینكارى لەو كارەى نەكردووە ئەڵێت:

لە سەهلەوە ئەگێڕێتەوە كە ئافرەتێك بوردێكى چنراوى هێنا بۆ پێغەمبەر ﷺ چوار دەورى چنرابوو. سەهل ئەڵێت: ئەزانن بوردە چى‌یە؟ ووتیان: كەوایە، ووتى: بەڵێ.

ئەڵێت: ژنەكە ووتى: بەدەستى خۆم چنیوومە هێناومە لە بەرى بكەیت، پێغەمبەر ﷺ لێى وەرگرت چونكە پێویستى پێى هەبوو، هاتە دەرەوە كردبووى بە بەركۆشى، فلانەكەس بە جوانى زانى‌و ووتى: بیدە بەمن، چەند جوانە، خەڵكەكە ووتیان: چاكت نەكرد، چونكە پێغەمبەر ﷺ پێویستى پێ‌ى هەبوو، بۆیە لەبەرى كرد، ئینجا تۆ داوات لێ كرد و ئەشت زانى كە دەست نانێت بەڕوتەوە، ئەویش ووتى: سوێند بەخوا بۆ ئەوە داوام لێ نەكرد كە لەبەرى بكەم، بەڵكو بۆ ئەوەى دایبنێم بیكەم بە كفن، سەهل ووتوویەتى: كاتێ مرد كردیان بە كفنى.

(حافظ) لە تەعلیق لەسەر ئەو باسەى ئیمامى بوخارى ووتویەتى: بۆیە بوخارى باسەكەى بەستووە بەوەوە، واتە: ئەوە كە ووتوویەتى: كەس ئینكارى لێ نەكردووە تاوەكو ئاماژە بكات كە ئەو ئینكاریەى صەحابەكان كردیان لەبەر ئەوە بوو كە صەحابى‌یەكە داواى بوردەكەى كرد، جا كاتێك پێى ڕاگەیاندن كە هەڵى ئەگرێت بۆ كفن، ئیتر كەس ئینكارى ئەو كارەى نەكردووە، ئەمەش سوودى ئەوەى لێ وەر ئەگیرێت كە دروستە بەجێ‌هێنانى ئەو شتانەى كە پێویستە بۆ مردو، وەكو كفن و شتى تر، لە كاتى ژیانى ئەو كەسەدا، وە ئایا ئامادەكردنى گۆڕیش ئەبەسترێت بەوەوە؟ پاشان ووتوویەتى: (ابن بطال) ووتوویەتى: ئەوە

دروستی ئەوەشی تێدایە کە شت پێش کاتی پێویستی ئامادە بکرێت، وە ووتوویەتی: کۆمەڵێك لە پیاو چاکان گۆڕیان بۆ خۆیان ئامادە کردووە پێش مردن.

زەینی کوڕی مونیر بە شوێن ئەمەدا ووتوویەتی: ئەو کارە لەلایەن هیچ کەسێك لە صەحابەکانەوە نەکراوە کە گۆڕ بۆخۆیان ئامادە بکەن، وە ئەگەر ئەوە پەسەند بوایە، زۆر ئەبوو لەناویاندا.

عەینی ووتوویەتی: بەوەی صەحابە نەی کردووە نابێتە هۆی نادروستی بەتایبەتی ئەگەر کۆمەڵێك لە زانایان کردبێتیان، چونکە ئەوەی موسڵمان بەچاکی بزانن ئەوە لای خواش چاکە.

ئەحمەد ووتوویەتی: خراپ نییە پیاو شوێنی گۆڕەکەی بکرێت و وەسێتیان پێبکات کاتێ مرد لەو شوێنەدا بنێژرێت. وە ئەگێڕنەوە کە عوسمان و عائیشە و عومەری کوڕی عەبدولعەزیز خوا لێیان ڕازی بێت ئەوەیان کردووە.

**پەسەندە داوا لە خوا بکرێت کە لە یەکێ لە دوو حەرەمەکەدا بیمرێنێت:**

پەسەندە کەسێك داوا لە خوا بکات کەلەیەکێ لەدوو حەرەمەکەدا (حەرەمی مەککە، یا حەرەمی مەدینە) بمرێت، بە پێی ئەوەی بوخاری لە حەفصەوە ئەگێڕێتەوە فەرمویەتی: عومەر خوا لێی ڕازی بێت ئەیفەرموو: خوایە شەهیدیم پێ ببخشە لە ڕێگای تۆدا، وە مردنەکەشم لە شارەکەی پێغەمبەرەکەتدا بێت، ئەڵێت: ووتم: ئەوەت لەکوێوە پێ ئەبەخشرێت؟ ووتی خوای گەورە پێم ئەبەخشێت. إن شاء الله.

(طبراني) لە جابیرەوە ئەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (مَن مَاتَ فِي أَحَدِ الحَرَمَينِ بُعِثَ آمِناً يَومَ القِيَامَةِ). واتە: هەرکەس لەیەکێ لەو دوو حەرەمەدا بمرێت، ڕۆژی دوایی بەبێ ترس زیندوو ئەکرێتەوە.

بەڵام لە سەنەدی ئەم حەدیسەدا موسای کوڕی (عبدالرحمن)ی تێدایە، ئیبنوحیببان لەناو ئەوانەدا باسی کردوە کە جێی باوەڕن، وە هەروەها عەبدوڵڵای کوڕی موئەمەلی تێدایە کە ئەحمەد بە لاوازی دائەنێت و ئیبنوحیببان بە جێی باوەڕ.

## مردنی کوتوپڕ

ئەبوداوود ئەگێڕێتەوە لە عوبەیدی کوڕی خالیدی سولەمیەوە ـ کە صەحابە بووە ـ ووتوویەتی: جارێك ئەڵێ کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی و جارێك ئەڵێ کە عوبەید ووتویەتی: (مَوتُ الفَجأةِ أَخْذَةُ آسَفٍ). واتە: مردنی کوتو پڕ جێی نیگەرانی و داخە.

وە ئەم فەرموودەیە لە عەبدوڵڵای کوڕی مەسعودو ئەنەسی کوڕی مالیك و ئەبیهورەیرە و عائیشەوە ئەگێڕنەوە بەڵام لەسەر هەر ڕێگایەکیان قسە هەیە.

هەروەها ئەزدی ووتوویەتی: ئەم فەرموودەیە ڕێگای زۆرە بەڵام هیچ ڕێگایەکی صەحیحی تێدا نیيە لە پێغەمبەرەوە بێت. وە حەدیسەکەی عوبەید کە ئەبوداوود تەخریجی کردووە پیاوەکانی ئیسنادەکەی جێی باوەڕنو (وقف) وەستانی لەسەر صەحابی کار لە ڕاستێتی ناکات، وە وێنەی ئەم حەدیثە بە ڕاو بۆچوون وەرناگیرێت، جا چۆن وائەبێت لەکاتێکا گێڕەرەوەکەی یەك سەر ئیسنادی بۆ داناوە.

**پاداشتی ئەوکەسەی منداڵی مردبێت:**

١- بوخاری لە ئەنەسەوە ئەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (مَا مِنَ النَّاسِ مِن مُسلِمٍ يُتَوَفَّى لَهُ ثَلاثَةٌ لَم يَبلُغُوا الحِنثَ، إلا أدخَلَهُ اللهُ الجَنَّةَ بِفَضلِ رَحمَتِهِ إِيَّاهُم). واتە: لەناو خەڵكدا موسڵمانێك نیيە سێ منداڵیِ نابالقی مردبێت خوا نەی خاتە بەهەشتەوە، بەفەزڵی ئەو میهرەبانی‌یەی کە بەرامبەریان هەیەتی.

٢- بوخاریو موسلیم لە ئەبوسەعیدی خودرییەوە ئەگێڕنەوە کە ئافرەتە موسڵمانەکان ووتیان بە پێغەمبەر ﷺ: ڕۆژێکیش بۆ ئێمە دابنێ ووتارمان بۆ بدە. ئەویش لەو ڕۆژەدا کە بۆی دانابوون ئامۆژگاری کردنو فەرمویِ: (أَيُّما امرَأَةٍ مَاتَ لَهَا ثَلاثَةٌ مِنَ الوَلَدِ كَانُوا لَهَا حِجَاباً مِنَ النَّارِ، قَالَتِ امرَأَةٌ: وَاثنَانِ. قَالَ: وَاثنَانِ. واتە: هەرژنێك سێ منداڵی بمرێت لە ڕۆژی دوواییدا بۆی ئەبن بە دیوارێك دووری ئەخەنەوە لە ئاگر، ژنێك ووتی: ئەی دوو منداڵ فەرمووی: دوو منداڵیش.

**تەمەنی ئادەمیزادەکانی نەتەوەی ئیسلام:**

(ترمذي) لە ئەبی هورەیرەوە ئەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (أَعمَارُ أُمَّتِي مَا بَينَ السِّتِّينَ إِلَى السَّبعِينَ وَأَقَلُّهُم مَن يَجُوزُ ذَلِكَ). واتە: تەمەنی ئادەمیزادی نەتەوەکەم لە نێوان شەست و حەفتا ساڵیدایە، و کەم کەسیان لەوە تێ ئەپەڕێت

**مردن حەوانەوەیە.**

بوخاری و موسلیم لە ئەبی قەتادەوە خوا لێی ڕازی بێت ئەگێڕنەوە کە پێغەمبەر ﷺ تەرمێکی بەلادا تێپەری فەرمووی: (مُستَرِيحٌ وَمُستَرَاحٌ مِنهُ) واتە: خۆی حەواوەتەوەو ئیکەش لە دەستی حەواونەوە؟ ووتیان: ئەی نێرراوی خوا خۆی حەواوەتەوەو ئیکەش لە دەستی حەواونەوە مانای چیيە؟ فەرمووی: (العَبدُ المُؤمِنُ يَستَرِيحُ مِن نَصَبِ الدُّنيا، وَالعَبدُ الفَاجِرُ يَستَرِيحُ مِنهُ العِبادُ وَالبِلادُ وَالشَّجَرُ وَالدَّوَابُّ). واتە: بەندەی موسڵمان لە ماندوویەتی دونیا ئەحەوێتەوە، وە بەندەی خراپەکاریش بەندەکانی خوا و وڵات و دار و درەخت و ئاژەڵ ئەحەوێنەوە لە دەستی.

## ئامادەكردنی مردوو بۆ شاردنەوە

پێویستە مردوو ئامادە بكرێت، چونكە ئەبێ بشۆرێت و كفن بكرێت و نوێژی لەسەر بكرێت پاشان بشاررێتەوە، وە درێژەی ئەم باسە بەم جۆرەی خوارەوەیە:-

**١- شۆردنی مردوو:**

**حوكمەكەی:**

جومهوری زانایان ڕایان وایە كە شۆردنی مردوو فەرزی كیفایەتە ئەگەر هەندێك پێی هەڵسان لە كۆڵ ئەوانی تریش ئەكەوێ، بە پێی ئەوەی پێغەمبەر ﷺ فەرمانی داوە بە شۆردنی مردوو، وە بە پێی ئەوەی موسڵمانان لەسەری ڕۆیشتوون و پاراستویانە.

**٢- كام مردووە پێویستە بشۆرێت و كامە پێویست نیيە:**

ئەو موسڵمانەی خۆی بمرێت و شەهید نەكرێت بە دەستی بێ بڕوایان لە جەنگدا، پێویستە بشۆرێت.

**٣- شۆردنی پارچەی مردوو:**

زانایان جیاوازیان هەیە لە شۆردنی پارچەی موسڵمانی مردوو، شافیعیو ئەحمەدو ئیبنو حەزم بۆ ئەوە چوون ئەو پارچەیەی لە موسڵمانی مردوو ئەبێتەوە ئەبێ بشۆرێتو كفن بكرێت و نوێژی لەسەر بكرێت، وە شافیعی ووتوویەتی پێم گەیشتووە، لە مەككە دەستی مرۆڤێك لە دەمی باڵندەیەك بەر بۆتەوە لە كاتی شەڕی (جمل)دا، بە ئەنگوستیلەكەیدا ناسیویانەتەوە دەستی كێ بووە، شۆردوویانەو نوێژیان لەسەر كردووە ئەم كارەش بە ئامادە بوونی صەحابە كراوە.

ئەحمەد ووتوویەتی: ئەبو ئەییوب نوێژی لەسەر لاقێكی پەڕیو كردوە، وە عومەر لەسەر ئێسكی ئادەمیزاد نوێژی كردووە، وە ئیبنو حەزم ووتوویەتی: نوێژ ئەكرێت لەسەر هەموو پارچەی لەشی موسڵمانی مردوو وە ئەشۆرێت و كفن ئەكرێت، بەڵام پارچەی شەهید پێویست ناكات، وە ووتوویەتی كاتێ كەسێك نوێژ لەسەر پارچەكە ئەكات ئەبێ نیيەتی وابێت لەسەر هەموو لاشەكە ئەیكات.

ئەبو حەنیفەو مالیك ووتوویانە: ئەگەر لە نیوەی لەش زیاتر دۆزرایەوە ئەشۆرێت و نوێژی لەسەر ئەكرێت، ئەگینا لەوە كەمتر نە ئەشۆرێت و نە نوێژی لەسەر ئەكرێت.

**٤- شەهید ناشۆرێت:**

ئەو شەهیدەی بەدەستی بێ بڕوا لە جەنگدا بكوژرێت شۆردنی پێویست نیە، ئەگەر چی لەشیشی گران بوویێت، وە هەر بە جلەكانی خۆی كەلەبەریا بووە كفن ئەكرێت ئەگەر بەكاری كفن بێت، وە ناتەواوی كفنەكەی بەشتی تر بۆ تەواو ئەكرێت، وە ئەوەی لە جلەكانی لەكفنی سوننەت زیاد بوو لیّی كەم ئەكرێتەوە، وەهەر بەخوێنەكەیەوە ئەنێژرێت و هیچی لێ ناشۆرێت، ئەحمەد ئەگێڕێتەوە كە پێغەمبەر ﷺ

فەرمویەتی: (لاتُغَسِّلُوهُم فَإِنَّ كُلَّ جُرحٍ أو كُلَّ دَمٍ يَفُوحُ مِسكاً يَومَ القِيَامَةِ). واتە: مەیان شۆرن، چونکە هەر برینێك یان هەر دڵۆپە خوێنێك لە ڕۆژی قیامەتدا بۆنی میسك بڵاو ئەکەنەوە، وە پێغەمبەر ﷺ فەرمانی بە دفن کردنی شەهیدەکانی ئوحود کرد بەخوێنەکانیانەوە، نە شۆردران و نە نوێژی‌یان لەسەر کرا.

شافیعی ئەڵێت: لەوانەیە واز هێنان لە شۆردن و نوێژ کردن لەسەر شەهیدان، لەبەر ئەوە بێت کە بە برینەکانیانەوە بگەن بە خوا خوای خۆیان، چونکە حەدیس هاتوە کە خوێنەکەیان بۆنی میسك ئەدات، وە ئەوان بەو ڕێز لێنانەی خوا بۆیان پێویستی‌یان نی‌یە نوێژیان لەسەر بکرێت، لەگەڵ ئەوەشدا کە بارسوکی‌یە بۆ ئەو موسڵمانانەی ماون، چونکە ئەوانە یا برینداارن یاترسی گەڕانەوەی دوژمنیان هەیە، وە هەروەها ئومێدی ئەوەیان هەیە کە بگەڕێنەوە بۆ ناوکەس‌وکاریان، و کەس‌وکاریشیان ئومێدیان پێ‌یان هەیە.

وە ووتراوە: حیکمەت لە نەکردنی نوێژ لەسەر شەهید ئەوەیە: نوێژ لەسەر مردوو ئەکرێت، خۆ شەهید زیندووە، یان لەبەرئەوەی نوێژ کردن شەفاعەتە بۆ مردوو، وە شەهید پێویستی بەوە نی‌یە چونکە بۆخۆیان شەفاعەت بۆ خەڵکی تر ئەکەن.

**٥- ئەو شەهیدانەی ئەشۆرێن و نوێژیان لەسەر ئەکرێت:**

ئەمما ئەو شەهیدانەی کە بە دەستی بێ باوەڕان لە جەنگدا نەکوژران و پێغەمبەر ﷺ هەر بە شەهید ناوی بردوون، ئەمانە ئەشۆرێن و نوێژیان لەسەر ئەکرێت، چونکە پێغەمبەر هەر لە ژیانی خۆیدا ئەگەر کەسێك لەوانە بمردایە ئەی‌شۆری، وە هەروەها موسڵمانەکانی دەوری پێغەمبەر ﷺ عومەر و عوسمان و عەلی‌یان شۆردووە، هەرچەندە هەموشیان شەهید بوون، وا لە خوارەوە ئەو شەهیدانە باس ئەکەین:

١- لە جابیری کوڕی عوتەیکەوە هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (الشَّهَادَةُ سَبعٌ سِوَى القَتلِ فِي سَبِيلِ اللهِ: المَطعُونُ شَهِيد، وَالغَرِقُ شَهِيد، وَصَاحِبُ ذَاتِ الجَنبِ شَهِيد، وَالمَبطُونُ شَهِيد، وَصَاحِبُ الحَرِقِ شَهِيد، وَالَّذِي يَمُوتُ تَحتَ الهَدمِ شَهِيد، وَالمَرأَةُ تَمُوتُ بِجَمعٍ شَهِيدَةٌ) رواه أحمد وأبوداود والنسائي بسند صحيح. واتە: شەهید حەوت جۆرە جگە لە شەهیدی ڕێگای خوا: ئەوکەسەی بە تاعون بمرێت شەهیدە، وە خنکاو لەناو ئاودا شەهیدە، وە ئەوەی بە سیل مردوە شەهیدە، وە ئەوەی بەسك ئێشە مردووە شەهیدە، وە ئەوەی بەهۆی سوتانەوە مردوە شەهیدە، وە ئەوکەسەی لە ژێر شتی ڕوخاودا بمرێ شەهیدە، و ئەوژنەی بەسەر منداڵەوە بروات شەهیدە.

٢- لە ئەبو هورەیرەوە هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: ئێوە کێ لە خۆتان بە شەهید دائەنێن؟ ووتیان ئەی نێرراوی خوا هەرکەس لە ڕێی خوادا بکوژرێ ئەوە شەهیدە، فەرمووی: کەواتە شەهیدی ئۆممەتەکەی من کەمن: ووتیان: ئەی شەهید کامانەن؟ فەرمووی: هەرکەس بکوژرێت لە ڕێی خوادا ئەوە شەهیدە، وە هەرکەس بمرێت لە ڕێگای خوادا واتە: لە فەرمانبەری و گوێڕایەڵی خوادا ئەوەش شەهیدە، وە

هەرکەس بە تاعون بمرێت شەهیدە، هەرکەس بە سكێ ئێشە بمرێت شەهیدە، وە هەرکەس بە خنكان لە ئاودا بمرێت شەهیدە). موسلیم گێڕاویەتی‌یەوە.

٣- لە سەعیدی کوڕی زەیدەوە هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (مَن قُتِلَ دُونَ مَالِهِ فَهُوَ شَهِيدٌ، وَمَن قُتِلَ دُونَ دَمِهِ فَهُوَ شَهِيدٌ، وَمَن قُتِلَ دُونَ دِينِهِ فَهُوَ شَهِيدٌ، وَمَن قُتِلَ دُونَ أهلِهِ فَهُوَ شَهِيدٌ). رواه أحمد والترمذي و صححه. واتە: هەرکەس لە پێناوی سامانەکەیدا بکوژرێت شەهیدە، وە هەرکەس لە پێناوی گیانی خۆیدا بکوژرێت شەهیدە، وەهەرکەس لە پێناوی دینەکەیدا بکوژرێت شەهیدە، وە هەرکەس لە پێناوی کەسوکاریا بکوژرێت شەهیدە.

**٦- بێ بڕوا شۆردنی ناوێت:**

واجب نی‌یە لەسەر موسڵمان بێ باوەڕ بشوات کاتێ بمرێت، بەڵام هەندێ لە زانایان ڕێیان داوە بە شۆردنی بێباوەڕ.

لای مالیکی و حەنبەلی‌یەکان موسڵمان بۆی نی‌یە بێ باوەڕی خزمی خۆی بشوات‌و کفن‌و دفنی بکات، مەگەر ترسی ڕوون بوونی هەبێت، ئەو کاتە پێویستە لەسەری بیشارێتەوە.

بەپێی ئەوەی ئەحمەد و ئەبوداود و نسائی و بەیهەقی ئەگێڕنەوە کە عەلی خوای لێ ڕازی بێت فەرمویەتی: بە پێغەمبەرم ووت: مامە گومڕاکەت مرد، فەرموی: (بچۆ باوکت بکە بە ژێر گڵەوە، وە هیچ قسەم لەگەڵ مەکە هەتا ئەگەڕێیتەوە لام، ئەڵێ: چووم کردم بە ژێر گڵەوەو هاتمەوە خزمەتی، پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێ کردم خۆم شۆری، ئینجا بۆم پاڕایەوە و دوعای بۆ کردم. ئیبنوموندیر ووتوویەتی: بۆ شۆردنی مردوو سوننەتێك نیە خەڵك لەسەری بڕوات.

## چۆنی‌یەتی شۆردنی مردوو

ئەوەی واجبە لە شۆردنی مردوودا ئەوەیە کە یەك جار ئاو بکرێت بەسەر هەموو لاشەکەیدا، با لەشیشی گران بووبێت یا بێ نوێژی بوبێت، وە ئەوەی پەسەندە لە مردوو شۆردندا ئەوەیە کە مردووەکە بخرێتە سەر شوێنێکی بەرز و جلەکانی لەبەردا دابماڵێنرێت[1] و شتێکی بدرێت بەسەردا شوێنی شەرمی داپۆشێت بەمەرجێك مردووەکە منداڵ نەبێت، ونابێت کەس لای بمێنێتەوە جگە لەوکەسانەی کە پێویستە لەوێ بن، وە ئەبێ مردو شۆرەکە ئەمین و بڕوا پێکراوو چاك بێت بۆ ئەوەی هەرچی شتێکی چاکی لێ بینی بڵاوی بکاتەوە وە هەرچی شتێکی خراپی لێ بینی بیشارێتەوە.

---

(١) شافیعی ڕای وایە کە لە کراسەکەی خۆیدا بشۆردرێ باشترە بە مەرجێك ناسك بێت و ڕێگر نەبێت لەوەی کە ئاو بگات بە لەشی، چونکە پێغەمبەر ﷺ لە کراسەکەی خۆیدا شۆردرا، بەڵام ڕاستتر وایە کە ئەوە تایبەت بوە بە پێغەمبەرەوە ﷺ، چونکە ڕووت کردنەوەی مردو جگە لە شوێنی شەرمی بەناوبانگ بوە.

چونکە لای ئیبنوماجە هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (لِيَغسِل مَوتَاكُم المَأمُونُونَ) واتە: با دەست پاك مردووەکانتان بشۆرن. وە پێویستە ئەو کەسە نیەتی شۆردنی ئەو مردووە بهێنێت، چونکە ئەو غوسڵەکە ئەکات، پاشان بە هێواشی دەست بهێنێت بە سکی ئەو مردووەدا بۆ ئەوەی ئەگەر پیسی تێدا بێت بێتە دەر، وە هەرچی پیسی‌یەك بەسەر لەشی مردووەکەوە بوو لای بەرێت بەمەرجێك دەست کێش یان پارچەیەکی لە دەستدا بێت بۆ ئەوەی عەورەتی پێ بسڕێت، چونکە دەست دان لە عەورەت بە ڕووتی حەرامە، پاشان دەست نوێژێکی بۆ بگرێت وەك دەست نوێژی نوێژ کردن، لەبەر فەرمودەی پێغەمبەر ﷺ کە فەرمویەتی: (إبدَأنَ بِمَيَامِنِهَا وَمَواضِعِ الوُضُوءِ مِنهَا). واتە: لە لای ڕاستی‌یەوە دەست پێ بکەن وە ئەو شوێنانەی کە بۆ دەست نوێژ ئەشۆرین، وە لەبەر تازە کردنەوەی سیمای موسڵمان لە دەرکەوتنی شوێنی (غرة و تحجيل) -کە لە حەدیسدا هاتووە- لە ڕۆژی قیامەتدا بە هۆی دەست نوێژەوە دەدرەوشێتەوە، پاشان سێ جار بە ئاوو سابوون ئەی شۆرێت و لە لای ڕاستی‌یەوە دەست پێ ئەکات، جا ئەگەر ئەو سێ جارەی بە کەم زانی و پێی پاك نەبۆوە یا پێنج یا حەوت جار بیشۆرێت.

چونکە لە صەحیحدا هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (إغسِلنَهَا وَتراً، ثَلاثاً أو خَمساً أو سَبعاً أو أكثَرَ مِن ذَلِكَ إن رَأيتُنَّ). واتە: با شۆردنەکەی تاك بێت، سێ جار، پێنج جار، حەوت جار و زیاتر ئەگەر بە پێویستتان زانی.

ئیبنو مونذیر ووتوویەتی: بۆیە ڕای داوەتە دەست ئەوان بەو مەرجەی باسکرا کە ئەبێ جاری شۆردنەکان تاك بێ (سێ، پێنج، حەوت).

جا ئەگەر مردووەکە ئافرەت بوو سوننەت وایە پرچەکانی بکرێتەوە و بشۆرێت لەپاشاندا بکرێتەوە بە پرچ و لە پشتەوە بەر بدرێتەوە، لە حەدیسەکەی (أم عطية)"دا هاتووە کە ئەوان قژی کچەکەی پێغەمبەریان ﷺ کرد بە سێ پرچ، ئەڵێ، ووتم: پرچەکانتان کردەوە پاشان کردتانەوە بە پرچ بۆی؟ ووتی: بەڵێ.

لە زاراوەکەی لای موسلیمدا ئەڵێت: قژەکەیمان کرد بە سێ پرچ لە تەنیشتی سەریەوە و لەنێوچەوانی‌یەوە، وە لە صەحیحی ئیبنو حیببان دا هاتووە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (واجعلن لها ثلاثة قرون) واتە: سێ پرچی بۆ بکەن. وە ئەمەش فەرمان کردنە.

جا کاتێ لە شۆردن بووەوە بە قوماشێکی خاوێن لاشەکەی ووشك ئەکاتەوە بۆ ئەوەی کفنەکە تەڕ نەبێت، پاشان بۆنی خۆشی ئەکرێت بەسەردا، پێغەمبەر فەرمویەتی: (إذَا أجمَرتُمُ المَيِّتَ فَأوتِرُوا). رواه البيهقي والحاكم وابن حبان وصححاه. واتە: کاتێ بۆنی خۆشتان کرد بەسەر مردودا با تاك بێت.

ئەبو وائیل ووتویەتی: لەلای عەلی هەندێك میسك هەبوو، وەسێتی کرد کاتێ مرد لێی بدەن وە ئەی‌فەرموو: ئەوە لە کاتی شۆردنەکەی پێغەمبەردا ﷺ بۆمان بەکار هێناوە و ئەو زیادەیە مابۆوە هەڵم گرتوە.

جومهوری زانایان لەسەر ئەوەن کە نینۆك کردن و بەر سمێڵ کردن و توکی بن باڵ و نێوان دوو قاچی مردووەکە کەراهەتی هەیە بکرێت، بەڵام ئیبنوحەزم ڕێی پێ داوە.

زانایان لەسەر ئەوە ڕێکن کە ئەگەر لە دوای شۆردن شتێك لەناو زگی مردووەکە هاتەدەر پێش ئەوەی کفن بکرێت ئەبێت ئەو شوێنەی کە پیسی‌یەکەی بەرکەوتووە بشۆرێت، بەڵام جیاوازیان لەوەدایە کە ئایا ئەبێت هەموو لاشەکەی دووبارە بشۆرێتەوە یان نا، هەیە ئەڵێت: پێویست ناکات، وە هەیە ئەڵێت: پێویستە دەست نوێژەکەی تازە بکرێتەوە، وە هەیە ئەڵێت: پێویستە لەسەرەوە بشۆرێتەوە.

ئەو بنەمایەی کە زانایان ئیجتیهادەکەیان لەسەر داناوە لە چۆنیەتی شۆردنی مردودا ئەوەیە کە (جماعة) گێڕاویانەتەوە لە ئومو عەطییەوە کە فەرمویەتی: پێغەمبەر ﷺ کاتێ کچەکەی کۆچی دوایی کردبوو هات بۆ لامان فەرمووی: سێ جار، یان پێنج جار، یان زیاتر بیشۆرن ئەگەر بە پێویستتان زانی، و بە ئاوو سیدر بیشۆرن، و لە دووا جاردا کافوری تێ بکەن –یاشتێك لە کافور- جا کاتێ لێ بونەوە بانگم بکەن. ئەڵێت: کاتێ لێ بوینەوە بانگمان کرد هات و بەرکۆشەکەی خۆی پێداین فەرمووی: لە پێشدا ئەوەی تێوە پێچن ئینجا کفنی بکەن بە بەردا.

حیکمەتی کافور تێ کردنەکەش ئەوەیە کە زانایان باسیان کردووە کە بۆ بۆن خۆش کردنە، چونکە ئەوکاتە کاتێکە فریشتە ئامادە ئەبێت لەلای. هەروەها کافور بۆ سارد کردنەوەی لاشەکەیەو هەڵمژینی-یەتی، بەتایبەتی بۆ ڕەق کردنی لاشەی مردوەکە، هەروەها بۆ دوروخستنەوەی کرم و جڕوجانەور لە لاشەکەو دووا خستنی تێك چونیەتی، جا ئەگەر کافور نەبوو دروستە شتێکی تری تێ‌بکرێت کە جێی کافور بگرێتەوە لە هەموو ئەو سیفەتانەدا یان لە هەندێکیدا.

## تەیەموم کردن بۆ مردوو، لە کاتی نەبوونی ئاودا

ئەگەر ئاو نەبوو مردووەکە تەیەمومی پێ ئەکرێت بە پێی فەرموودەی خوای گەورە کە ئەفەرموێت: ﴿فَلَمۡ تَجِدُواْ مَآءٗ فَتَيَمَّمُواْ﴾ (المائدة/٦). واتە: ئەگەر ئاوتان دەست نەکەوت تەیەموم بکەن.

وە بە پێی فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ کە فەرموویەتی: (جُعِلَت لِيَ الأرضُ مَسجِداً وَطُهُوراً). واتە: زەوی بۆ من کراوەتە جێگەی نوێژو پاك کەرەوە.

هەروەها ئەگەر لاشەکە بۆ ئەوە نەشێت ئاوی بەرکەوێت بە جۆرێك ئەگەر بشۆررێت دابڕزێ. یا مردووەکە ئافرەت بوو وە ئەوانەی لەوێ بوون پیاوی بێگانە بوون، یا پیاو بوو وە ئەوانەی دەوری ئافرەتی بێگانە بوون، ئەبێت تەیەمومیان بۆ بکرێت.

ئەبوداوود لە حەدیسە مورسەلەکانیدا ئەگێڕێتەوە، وە بەیهەقی لە مەکحولەوە: کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (إذَا مَاتَتِ المَرأةُ مَعَ الرِّجَالِ لَيسَت مَعَهُم امرأةٌ غَيرُها، وَالرَّجُلُ مَعَ النِّسَاءِ وَلَيسَ مَعَهُنَّ رَجُلٌ

غَيرُهُ، فَإنَّهُمَا يُيَمَّمَانِ وَيُدفَنَانِ وَهُمَا بِمَنزِلَةِ مَن لَم يَجِدِ المَاءَ). واته: ئەگەر ئافرەتێك لەگەڵ كۆمەڵێك پیاودا بوو مردو لەو زیاتر ئافرەتی تری تێدا نەبوو، یا پیاوێك لەناو كۆمەڵێك ئافرەتدا مردو لەو زیاتر پیاوی تری تیا نەبوو، ئەوانە تەیەمومیان پێ ئەكرێت و ئەنێژرێن، چونكە حاڵی ئەمانە وەك حاڵی ئەوانە وایە كە ئاویان دەست نەكەوێت.

ئافرەت مەحرەمی خۆی بە دەستی خۆی تەیەمومی بۆ ئەكات، جا ئەگەر ئەو مەحرەمە دەست نەكەوت بێگانەیەك بۆی ئەكات و ئەبێ پارچەیەك لە قوماش بناڵێنێ لە دەستی. ئەمە مەزهەبی ئەحمەد و ئەبوحەنیفەیە. وەلای مالیك و شافیعی: ئەگەر ئەو ئافرەتە كۆمەڵێك پیاوی مەحرەم بەخۆی لەگەڵدا بوو یەكێ لەو مەحرەمانە ئەیشۆرێت، چونكە ئەو ئافرەتە بەگوێرەی ئەوەوە وەك پیاو وایە لە تەنیایی و عەورەتدا.

لە (المسوی)دا هاتوە لە ئیمامی مالیكەوە كە ووتوویەتی: خۆی گوێی لە زانایان بووە ووتوویانە: ئەگەر ئافرەتێك لەناو كۆمەڵێك پیاودا مردو ئافرەتی تری لەگەڵدا نەبوو بیشۆرێت، یاكەسێكی مەحرەمی لەگەڵدا نەبوو، سەرپەرشتی شتنی بكات، یامێردی لەگەڵدا نەبوو بۆ سەرپەرشتی كردنی، ئەوە ئەبێت تەیەمومی پێ بكرێت و دەست و دەموچاوی بەگڵ مەسح بكرێت.

وە ووتوویەتی: ئەگەر پیاوێك مردو لە ژن زیاتر كەسی تری لەگەڵ نەبوو ئەبێ ئەو ئافرەتانە تەیەمومەكەی بۆ بكەن[1].

**شۆردنی ژن و مێرد بۆ یەكتری:**

زانایان لەسەر ئەوە رێكن كە دروستە ژن مێردی خۆی بشۆرێت.

عائیشە فەرمویەتی: ئەگەر وەكو ئێستا بمزانیایە ئەم ئەهێشت جگە لە خێزانەكانی پێغەمبەر كەسی تر پێغەمبەر ﷺ بشۆرێت. ئەحمەد و ئەبوداوود و حاكم گێراویانەتەوە و حاكم بە صەحیحی داناوە.

بەڵام جیاوازن لەوەدا كە ئایا دروستە پیاو ژنی خۆی بشوات یان نا، جومهور رێیان بەوە داوە، بە پێی ئەوەی عەلی فاطمەی خێزانی خۆی شۆردووە خوایان لێ رازی بێت. بەیهەقی و (دارقطني) گێراویانەتەوە.

وە بە پێی فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ كە بە عائیشەی فەرمووە: (لَو مِتِّ قَبلِي لَغَسَّلتُكِ وَكَفَّنتُكِ) رواه ابن ماجة. واتە: ئەگەر پێش من بمردیتایە ئەم شۆردیەو كفنم ئەكردی.

---

(١) ئیبنوحەزم رای وایە ئەگەر پیاو مرد و لە ئافرەت بەلاوە پیاوی لەگەڵ نەبوو، یا ئافرەت مردو لە پیاو بەو لاوە ئافرەتی لەگەڵدا نەبێ، ئەبێ ئافرەتەكان پیاوەكە بشۆرن، و پیاوەكان ئافرەتەكە بشۆرن، بەڵام جلێكی ئەستوری بۆ لەبەر بكەن و لەسەر ئەو جلەوە ئاوی بكەن بە سەردا، وە لە مردو شۆردندا تەیەموم دروست نی یە مەگەر ئاو نەبێت

حەنەفیەکان ئەڵێن: دروست نیە پیاو ژنی خۆی بشوات، وە ئەگەر جگە لە مێردەکەی کەسی تری لا نەبوو، ئەبێ تەیەمومی بۆ بکات، بەڵام فەرموودەکان بەڵگەن بەسەریانەوە.

**شۆردنی ئافرەت بۆ منداڵی نێرینە:**

ئیبنومونذیر ووتوویەتی: زانایان هەموو لەسەر ئەوەن کە دروستە ژن منداڵی نێرینەی بچوك بشۆرێت.

## کفن کردن

**١- حوکمی کفن کردن:**

کفن کردنی مردوو بە شتێك کە هەموو لەشی داپۆشێت باتەنها کراسێکیش بێت فەرزی کیفایەتە.

بوخاری لە خەبباببەوە خوا لێی ڕازی بێت ئەگێڕێتەوە فەرمویەتی: لەگەڵ پێغەمبەردا کۆچمان کرد لەبەر ڕەزامەندی خوا، وە خوای گەورە پاداشتی داینەوە، جا هەندێکمان مرد و لەو پاداشتەی نەخوارد، لەوانە موصعەبی کوڕی عومەیر بوو کە لە جەنگی ئوحوددا کوژرا هیچمان دەست نەکەوت پێی کفن بکەین، بوردەیەك نەبێت کاتێ سەریمان پێ دا ئەپۆشی قاچەکانی دەرئەکەوت، وە کاتێ قاچەکانیمانم پێ دائەپۆشی سەری دەرئەکەوت، جا پێغەمبەر فەرمانی پێ کردین سەری داپۆشین و (إذخر)[1] بدەین بەسەر قاچەکانیدا.

**٢- ئەوەی پەسەندە لە کفندا:**

پەسەندە لە کفن کردندا پەیڕەوی ئەمانەی خوارەوە بکرێت:-

أ- کفنەکە پاك‌و چاك بێت و لاشە داپۆشێت، بەپێی ئەوەی ئیبنوماجەو (ترمذي) کە بە (حسن)ی داناوە لە قەتادەوە گێڕاویانەتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (إذَا وَلِيَ أَحَدُكُم أَخَاهُ فَلْيُحسِن كَفَنَهُ). واتە: ئەگەر کەسێکتان کرا بە سەرپەرشتی کەری برا موسڵمانەکەی باکفنی چاکی بۆ بکات.

ب- ئەبێ کفنەکە سپی بێت، بە پێی ئەوەی ئەحمەدو ئەبو داوودو (ترمذي) کە بە صەحیحی داناوە ئەگێڕنەوە لە ئیبنوعەبباسەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (إلبَسُوا مِن ثِيَابِكُمُ البِيضَ فَإنَّها مِن خَيرِ ثِيَابِكُم، وَكَفِّنُوا فِيهَا مَوتَاكُم). واتە: لەناو پۆشاکەکانتاندا سپیەکانیان لەبەر بکەن، چونکە پۆشاکی سپی لە چاکترین پۆشاکتانن، وە مردووەکانیشتانی پێ کفن بکەن.

ج- ئەبێ بخور و بۆنی خۆشی بەسەردا بکریت، بە پێی ئەوەی ئەحمەد و حاکم کە بە صەحیحی داناوە ئەگێڕنەوە لە جابیرەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (إذَا أَجمَرتُمُ المَيِّتَ فَأَجمِرُوهُ ثَلاثاً). واتە: ئەگەر بۆنتان دا لە مردوو با سێ جار بێت.

(١) (إذخر) گیایەکی بۆن خۆشە کە لەسەر تەختە بەندی خانودا دائەنرێت.

ئەبو سەعیدو ئیبنوعومەرو ئیبنوعەبباس خوایان لێ ڕازی بێت وەسیێتیان کردوە کاتێ مردن، کفنەکانیان بە عود بۆن خۆش بکرێت.

د- ئەبێ سێ پێنج بێت بۆ پیاوو پێنج پێنج بێت بۆ ئافرەت، بە پێی ئەوەی خاوەنی شەش صیحاحەکان لە عائیشەوە ئەگێڕنەوە فەرمویەتی: پێغەمبەر ﷺ لە سێ کراسی ئاودامانی سپی تەنکی ناسکی تازەدا کفن کرا، کە نە کراسی کورتی لەگەڵدا بوو نەمێزەر.

(ترمذي) ووتوویەتی: بەو پێڕیە کار کراوە لای بەشی زۆری زانایان و صەحابە و کەسانی تریش، وە ووتوویەتی: سوفیانی ثەوری ووتوویەتی: پیاو لە سێ کراسی ئاودامانداا کفن ئەکرێت، جا ئەگەر حەز ئەکەیت باکراسێك و دووپارچە قوماش بێت بۆ تێوە ئاڵاندن، وە ئەگەر حەز نەکەیت هەر با سێ پارچە بێت.

وە کراسێك دروستە ئەگەر دووکراسی دەست نەکەوت، وە دوو کراسیش هەر دورستە، بەڵام زانایان حەزئەکەن ئەگەر کەسێك دەسەڵاتدار بوو سێ کراسی بۆ بکرێت بەکفن، ئەمەش قسەی شافیعی و ئەحمەد و ئیسحاقە. وە ووتوویانە: کفنی ئافرەت ئەبێت پێنج کراس بێت.

وە لە ئومموعەطییەوە هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ بەرکۆشێك و کراسێك و سەرپۆشێك و دووکراسی ئاودامانی دایە بۆ کفن.

ئیبنومونذیر ووتوویەتی: زۆربەی ئەوکەسانەی زانیاریمان لێ وەرگرتوون لە زانایان ڕایان وابوە کە ئافرەت لە پێنج کراسدا کفن ئەکرێت.

**٣-کفن کردنی کەسێك کە لە ئیحرامدایە:**

ئەگەر کەسێك ئیحرامی بەست و مرد ئەبێ وەك مردووی تر بشۆرێت و بەکراسی ئیحرامەکەی کفن بکرێت، بەڵام سەری داناپۆشرێت و بۆنی لێ نادرێت بۆ ئەوەی حوکمی ئیحرامی پێوە بمێنێت، بەپێی ئەوەی جەماعەت لە ئیبنوعەبباسەوە ئەگێڕنەوە فەرمویەتی: پیاوێك لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ لە عەرەفە وەستا بوو لە ووشترەکەی کەوتە خوارەوەو ووشترەکە ملی شکاند، بە پێغەمبەریان ڕاگەیاند فەرمووی: (إغسِلُوهُ بِمَاءٍ وَسِدرٍ، وَكَفِّنُوهُ فِي ثَوبَيهِ، وَلا تُحَنِّطُوهُ، وَلا تُخَمِّرُوا رَأسَهُ، فَإِنَّ اللهَ تَعالَى يَبعَثُهُ يَومَ القِيَامَةِ مُلَبِّياً). واتە: بە ئاوو سیدر بیشۆرن و بە بەرکۆشەکەی خۆی و کراسەکەی کفنی بکەن، بەڵام بۆنی لێ مەدەن و سەری دامەپۆشن، چونکە خوای پەروەردگار ڕۆژی دوایی زیندووی ئەکاتەوە ئەو هەر ئەڵێت: (لبيك اللهم لبيك).

حەنەفیەکان و مالیکیەکان بۆ ئەوە چوون ئەگەر موحریم مرد ئیحرامەکەی ئەشکێت وە بە پچڕاندنی ئیحرامەکەی وەك کەسێکی تر کفن ئەکرێت و کفنەکەی ئەدورێت و سەری دائەپۆشرێت و بۆنی لێ

ئەدرێت، وە ووتویانە: بەسەر هاتی ئەو پیاوە شتێکی تایبەت بووە بۆ گشت کەس نیە، بەڵام ئەوەی کە زیندوو ئەکرێتەوە ڕۆژی دوایی ئەو هەر (لبیك) ئەڵێت وا دەرئەکەوێت ئەوە بۆ هەموو موحرێمێکە.

وە ئەصل ئەوەیە کە هەرچی بۆ کەسێك بچەسپێت لە حوکمی ئیسلامیەدا ئەوە بۆ هەموو کەسە بەمەرجێك بەڵگەیەکی وەها نەبێت کە ئەو شتە تایبەت بکات بۆ ئەو کەسە.

٤- زیادەڕەوی کردن لە کفندا کەراهەتی هەیە:

پێویستە کفن چاك بێت بێ ئەوەی لەنرخەکەیدا زیادەڕەوی بکرێت و شتی گران بەهای بۆ بکڕێت، وە نەبێ لە عادەت بەولاوە تەکلیفی بۆ نەکرێت.

شەعبی ووتوویەتی: عەلی خوای لێ ڕازی بێت فەرمویەتی: کفنی گران بەهام بۆ مەکەن چونکە خۆم گوێم لە پێغەمبەر ﷺ بووە فەرمویەتی: (لاتُغَالُوا فِي الكَفَنِ فَإِنَّهُ يُسلَبُ سَلباً سَرِيعاً) رواه أبوداود وفي إسناده أبو مالك وفيه مقال. واتە: کفنی گران بەها مەکەن چونکە زوو لەبەریان دائەماڵرێ و ئەڕزێ.

لە حوزەیفەوە هاتووە کە فەرمویەتی: زیادەڕەوی لە کفندا مەکەن، دوو کراسی پاکم بۆ بکڕن بەسە.

ئەبو بەکر ﷺ فەرمویەتی: هەر ئەم کراسەی لەبەرمایە بیشۆرن و دووکراسی تر بخەنە سەری و کفنم بکەن پێی، عائیشە فەرموی: ئەو کراسە کۆنە، ئەویش فەرموی: زیندوو لەپێشترە بۆ بەرگی تازە لە مردوو، ئەوە هەر بۆ کێم و زوخاوە کە لەلاشە دەبێتەوە.

٥- کفنی حەریر (ئاوریشم) :

دروست نیە پیاو لە قوماشی ئاوریشم کفنی بۆ بکرێت، بەڵام بۆ ئافرەت حەڵاڵە بە پێی فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ کە دەربارەی ئاوریشم و زێڕ فەرمویەتی: (إنَّهُمَا حَرَامٌ عَلَى ذُكُورِ أُمَّتِي حِلٌ لإنَاثِهَا). واتە: ئەو دووانە بۆ نێرینەی ئوممەتەکەم حەرامەو بۆ مێینەکانی حەڵاڵە.

زۆر لە زانایان بە خراپی ئەزانن بۆ ئافرەتیش چونکە دەست بڵاوی و بە فیڕۆ دانە، وە ئەو زیادەڕەوییەیە کە قەدەغەیە لە ئیسلامدا، وە ئەوەیان جیا کردۆتەوە کە ئاوریشم لە ژیاندا بۆ خۆڕازاندنەوەو جوانی بێت بۆ ئافرەت، لەگەڵ ئەوەی کاتێ مرد بکرێت بە کفنی.

ئەحمەد ووتویەتی: پێم خۆش نیە ئافرەت کفنی لە ئاوریشم بۆ بکرێت، هەتا حەزناکەم پارچەیەکی کەمیش بە کفنەکەیەوە بێت، هەروەها حەسەن و ئیبنوموبارەك و ئیسحاق بەخراپیان داناوە.

ئیبنومونذیر ووتوویەتی: پێچەوانەی ئەو قسەی ئەوانم لە کەسەوە لەبەر نیە.

٦- کفن کردن لەماڵی مردووەکە:

ئەگەر کەسێك مردوو ماڵی بەجێ هێشتبوو، ئەوە ئەبێ لەو ماڵە کفنی بۆ بکڕێت، بەڵام ئەگەر ماڵی نەبوو بەجێی بهێڵێت، ئەوە پارەی کفنەکەی لەسەر ئەوکەسەیە کە نەفەقەی لەسەریەتی، بەڵام ئەگەر کەسی نەبوو، ئەوە لە خانەی دارایی (بیت المال) کفنی بۆ ئەکڕێت، ئەگینا ئەبێ موسڵمانان پارەکەی بۆ کۆ بکەنەوە و کفنی بۆ بکڕن.

ئافرەتیش لەمەدا وەکو پیاو ڕەفتاری لەگەڵ ئەکرێت.

ئیبنوحەزم ووتوویەتی: کفن و هەڵکەندنی گۆڕی ئافرەت ئەبێ لەو ماڵە بێت کە بەجێی هێشتووە و لەسەر پیاوەکەی پێویست نییە، چونکە سامان و ماڵی موسڵمانان پارێزراوە بەدەقی ئایەت و حەدیث نەبێت، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (إِنَّ دِمَاءَكُم وَأموَالَكُم عَلَيكُم حَرَامٌ) واتە: خوێن و ماڵەکانتان بۆیەك حەرامە لەسەرتان کە بەناهەق بخورێت.

وە ئەوەی خوا پێویستی کردووە لەسەر مێرد نەفەقە و پۆشاك و جێ و شوێنە، وە بەو زمانەی کە خوا ووتووێژی لەگەڵ کردووین بەکفن ناڵێن پۆشاك و بەگۆڕ ناڵێن جێ و شوێن.

## نوێژ لەسەر مردوو

**١-حوکمی نوێژی مردوو:**

ئەوەی پێشەوا ئایینی‌یەکان لەسەری ڕێکن ئەوەیە کە نوێژ کردن لەسەر مردوو فەرزی کیفایەتە بە پێی فەرمانی پێغەمبەر ﷺ بە کردنی ئەو نوێژە، وە بەپێی ئەوەی موسڵمانان پاراستویانە و بەجێیان هێناوە.

بوخاری و موسلیم لە ئەبی هورەیرەوە ئەگێڕنەوە، کە پێغەمبەر ﷺ کاتێ پیاوێکی مردوویان ئەهێنا بۆ ئەوەی نوێژی لەسەر بکات پرسیاری ئەکرد ئەگەر قەرزار بوایە ئەی فەرموو: ئایا ئەم مردووە ئەوەندەی بەجێ هێشتووە قەرزەکەی لێ بدرێتەوە؟ ئەگەر پێیان ڕابگەیاندایە کە ئەوەندەی بەجێ هێشتووە نوێژی لەسەر ئەکرد، ئەگینا بە موسڵمانەکانی ئەفەرموو: (صَلُّوا عَلَى صَاحِبِكُم) واتە: نوێژ لەسەر هاوەڵەکەتان بکەن.

**٢- فەزڵی نوێژی مردوو:**

أ- جەماعەت لە ئەبو هورەیرەوە ئەگێڕنەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (مَن تَبِعَ جَنَازَةً وَصَلَّى عَلَيهَا، فَلَهُ قِيرَاطٌ، وَمَن تَبِعَهَا حَتَّى يُفرَغَ مِنهَا، فَلَهُ قِيرَاطَانِ أصغَرُهُمَا مِثلَ أُحُد. أو أحَدُهُمَا مِثلَ أُحُد). واتە: هەرکەس شوێنی جەنازەیەك بکەوێت و نوێژی لەسەر بکات کۆمەڵێك خێری بۆ ئەنوسرێت، وە ئەگەر شوێنی بکەوێت هەتا ئەنێژرێت و لێ ئەبنەوە، ئەوە دوو کۆمەڵە خێری بۆ ئەنوسرێت، چکۆلەکەیان، یان هەریەکەیان ئەوەندەی کێوی ئوحود دەبێت.

ب- موسلیم له خەببابەوە ئەگێڕێتەوە خوا لێی ڕازی بێت فەرمویەتی: ووتم: ئەی عەبدوڵلای کوڕی عومەر! گوێت لێ نی‌یە ئەبو هورەیرە چی ئەڵێت؟ ئەڵێت: گوێم له پێغەمبەر ﷺ بووە فەرمویەتی: (مَن خرَجَ مَعَ جَنازَةٍ مِن بَيتِهَا وَصَلَّى عَلَيهَا ثُمَّ تَبِعَهَا حَتَّى تُدفَنَ كَانَ لَهُ قِيرَاطَانِ مِن أجرٍ، كُلُّ قِيرَاطٍ مِثلَ أُحُدٍ. وَمَن صَلَّى عَلَيهَا ثُمَّ رَجَع كَانَ لَهُ مِثلَ أُحُد). واته: هەرکەس لەگەڵ تەرمێکدا بێت کاتێ له ماڵەکەی ئەیهێننە دەرەوە و نوێژی لەسەر بکات پاشان لەگەڵیا بڕوات هەتا ئەشارڕێتەوە، ئەوە دوکۆمەڵ پاداشتی بۆ ئەنوسرێت، هەر کۆمەڵێکی ئەوەندەی کێوی ئوحود ئەبێت، وە هەرکەس نوێژی لەسەر بکات و بگەڕێتەوە هەر ئەوەندەی کێوی ئەوحودی پاداشت بۆ هەیە.

ئیبنوعومەر خەببابی نارد بۆ لای عائیشە دەربارەی قسەکەی ئەبی هورەیرە پرسیاری لێ بکاتو بگەڕێتەوە هەرچی ووت بۆی بگێڕێتەوە، ئەڵێ عائیشە فەرموی: ئەبوهورەیرە ڕاست ئەکات، ئیبنوعومەر خوا لێی ڕازی بێت فەرموی: چەندەها کۆمەڵە پاداشتمان له دەست داوە.

۳- مەرجەکانی نوێژی مردو:

نوێژی مردوو زاراوەی نوێژ ئەی گرێتەوە، لەبەر ئەوە مەرجەکانی نوێژی فەرزی تێدا بە مەرج گیاوە، له پاکیەتی تەواوو پاکی له لەشگرانی و بێ‌دەستنوێژی و ڕو کردنە قیبلەو داپۆشینی عەورەت.

مالیك له نافیعەوە ئەگێڕێتەوە کە عەبدوڵلای کوڕی عومەر فەرمویەتی: پیاو نابێت نوێژ بکات لەسەر مردو ئیللا بە پاکی نەبێت.

وە نوێژی مردوو بەوە له نوێژە فەرزەکان جیا ئەکرێتەوە کە کاتی دیاری کراوی نی‌یە، بەڵکو لەهەموو کاتێکدا ئەکرێت هەرکاتێك تەرمێك ئامادە بوو، با لەو کاتانەشدا بێت کە نوێژی تێدا قەدەغەیە، لای حەنەفی‌یەکان و شافیعی‌یەکان.

بەڵام ئەحمەد و ئیبنوموبارەك و ئیسحاق ئەڵێن: کەراهەتی هەیە نوێژ کردن لەسەر مردوو کاتێ ڕۆژ هەڵدێ و کاتێ ئەکەوێتە ناوەڕاستی ئاسمان و کاتێ خۆر ئاوا ئەبێت، مەگەر ترسی تیك چوونی ئەو تەرمە هەبێت.

٤- پایەکانی نوێژی مردوو:

نوێژی مردوو چەند ڕوکن و پایەی خۆی هەیە کەلەسەریان وەستاوە، جا ئەگەر یەکێك لەو پایانە بەجێ نەهات ئەو نوێژە پوچەڵە و بەپێی شەرع بە هیچ ناژمێرێت. وا له خوارەوە ئەو پایانە باس ئەکەین:

أ- نی‌یەت هێنان: بە پێی فەرموودەی خوای گەورە کە فەرموویەتی: ﴿وَمَآ أُمِرُوٓاْ إِلَّا لِيَعۡبُدُواْ ٱللَّهَ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ﴾ (البينة/٥). واتە: تەنها شتێك کە فەرمانیان پێ کرابوو ئەوە بوو کە خوا بپەرستن و دینیان خالص بۆ خوا بێت.

وه به پێی فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ كه فەرموویەتی: (إِنَّمَا الأعمَالُ بِالنِّيَّاتِ، وَإِنَّمَا لِكُلِّ أمرِىءٍ مَا نَوَى). واته: پاداشتی كردەوەكانتان به پێی نیەتەكانتانه، وه هەركەس لەسەر نیەتی خۆی پاداشتی ئەدرێتەوه.

له پێشەوه باسی حەقیقەتی نیەت كرا، هەروەها ئەوه كه جێگای نیەت دڵەو تەلەففوز پێ كردنی شەرعی نیە.

**ب- وەستان بۆ كەسێك كه توانای وەستانای هەبێت:** ئەوەش روكنه لای جومهوری زانایان، جا هەركەس بەسەر شتێكەوه بێت یا دانیشتبێت بەبێ بەهانه و نوێژ لەسەر مردوو بكات نوێژەكەی دروست نیه.

له موغنی دا هاتووه: نوێژ كردن لەسەر مردوو لەكاتی سواریدا دروست نیه، چونكه بەپێوه وەستان كەواجبه له دەست ئەچێت، ئەمەش قسەی ئەبی حەنیفه و شافیعی و ئەبوثەوره، وه نازانم لەم بارەیەوه خیلاف هەبێت لەنێوان زانایاندا.

وه پەسەندە دەستی ڕاست بخرێته سەر دەستی چەپ له كاتی نوێژەكەدا وەك چۆن له نوێژدا ئەكرێت، وه ووتراوه پەسەند نیه : بەڵام ڕای یەكەم له پێشتره.

**ج- ووتنی چوار (الله أكبر)** : به پێی ئەوەی بوخاریو موسلیم له جابیرەوه ئەگێڕنەوه كه پێغەمبەر ﷺ نوێژی لەسەر نەجاشی كردو چوار (الله أكبر)ی كرد.

(ترمذي) ووتوویەتی كار لەسەر ئەوه كراوه لەلایەن بەشی زۆری زانایان له یارەكانی پێغەمبەرو دووای ئەوانیش، وه ڕایان وا بووه كه (الله أكبر) كردن لەسەر مردوو چوار (الله أكبر)ه ئەمەش قسەی سوفیان و مالیك و ئیبنوموبارەك و شافیعی و ئەحمەد و ئیسحاقه.

**دەست بەرز كردنەوه كاتی (الله اكبر) كردن :**

سوننەت ئەوەیه دەست بەرز نەكرێتەوه كاتی (الله أكبر)كردن له نوێژی مردودا، له یەكەم جاردا نەبێت كه (الله أكبر)ی نوێژ دابەستن ئەكرێت.

چونكه له پێغەمبەرەوه ﷺ نەهاتووه كه دەستی بەرز كردبێتەوه له هیچ كام له (الله أكبر)كاندا كاتێ نوێژی لەسەر مردوو كردووه ئیللا له یەكەم (الله أكبر)دا نەبێت.

شەوكانی ـ لەپاش باس كردنی جیاوازیەكانی نێوان زانایانو لێكۆڵینەوەیان ـ ووتوویەتی: خولاسه جگه له (الله أكبر)ی یەكەم شتێك سابت نەبوه كه بەكاری بەڵگه بێت له پێغەمبەرەوه ﷺ. وه قسەی صەحابی و كردەوەیان نابێته بەڵگه، كەواته پێویسته كه تەنها له تەكبیرەی یەكەمدا دەست بەرز بكرێتەوه، چونكه له تەكبیرەكانی تردا مەشروع نیه. مەگەر لەكاتێكدا نەبێت له شێوەیەكی نوێژەوه بچێته شێوەیەكی تر، وەكو له نوێژەكانی تردا هەیه، بەڵام خۆ نوێژی مردوو ئەو گواستنەوه و گۆڕینەی تیا نیه.

د-هـ- خوێندنی سورەتی (الفاتحة) بە نهێنی و سڵاوات دان لەسەر پێغەمبەر ﷺ، بە پێی ئەوەی شافیعی لە موسنەدەکەیدا دەگێڕێتەوە لە ئەبی ئومامەی کوڕی سەهلەوە ووتوویەتی: یەکێك لە یارەکانی پێغەمبەر ﷺ پێی ڕاگەیاندم کە سوننەت لە نوێژی جەنازەدا ئەوەیە: ئیمام (الله أكبر) بکات، و دووای ئەو تەکبیرەی یەکەمە بەنهێنی سورەتی (الفاتحة) بخوێنێ، پاشان سڵاوات بدات لەسەر پێغەمبەر ﷺ، پاشان بە ئیخلاصەوە بۆ ئەو مردووە بپاڕێتەوە لە کاتی تەکبیرەکاندا، وە نابێت لە هیچیاندا سورەتی تری قورئان بخوێنێت، پاشان سڵاو بداتەوە بەبێ دەنگی و بە نهێنی[1]. (حافظ) لە (الفتح)دا ووتویەتی: ئیسنادەکەی صەحیحە.

بوخاری لە طەلحەی کوڕی عەبدوڵلاوە خوا لێی ڕازی بێت ئەگێڕێتەوە ووتوویەتی: لەگەڵ ئیبنو عەبباسدا نوێژم لەسەر تەرمێك کردووە (فاتحة)ی خوێندووە و ووتوویەتی: ئەوە سوننەتە.

(ترمذي)ش هەر ئەوەی گێڕاوەتەوە و ووتوویەتی: هەندێ لە زانایانی صەحابە بەوە کاریان کردووە، و جگە لەوانیش زانایانی تریش هەر لەسەر ئەوە ڕۆیشتوون، وە ئەوەیان هەڵبژاردووە کە سورەتی فاتیحە دووای تەکبیرەی یەکەم بخوێنرێت. ئەمەش قسەی شافیعیو ئەحمەدو ئیسحاقە. وەهەندێکیان ووتویانە: سورەتی فاتیحە لە نوێژی مردوودا ناخوێنرێت، بەڵکو نوێژی مردوو بریتییە لە ستایش کردنی خوا و سڵاوات دان لەسەر پێغەمبەر ﷺ و پاڕانەوەیە بۆ مردووەکە، ئەمەشیان قسەی ثەوری و چەند کەسێکی ترە لە کوفییەکان.

لە بەڵگەکانی ئەوانەی ووتوویانە خوێندنی سورەتی فاتیحە فەرزە: ئەوەیە کە پێغەمبەر ﷺ ناوی ناوە نوێژ فەرمویەتی: نوێژ لەسەر هاوەڵەکەتان بکەن وە فەرموویەتی: ئەو نوێژەی سورەتی فاتیحەی تێدا نەخوێنرێت نوێژ نیە.

**شێوەی سڵاوات دان لەسەر پێغەمبەر ﷺ و جێگەکەی:**

بە هەرشێوەیەك لە شێوەکانی سڵاوات، سڵاوات بدرێت لەسەر پێغەمبەر ﷺ دروستە، هەتا ئەوەش بەسە کە بوترێت: (اللهم صل علی محمد).

بەڵام شوێن کەوتنی ئەوەی کە لە پێغەمبەرەوە ﷺ بۆمان ماوەتەوە چاکترە، وەك ئەوەی بوترێت: (اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ وَعَلَى آلِ مُحَمَّد كَمَا صَلَّيتَ عَلَى إبراهِيمَ وَعَلَى آل إبراهِيمَ، وَبَارِك عَلَى مُحَمَّدٍ وَعلى آلِ مُحَمَّدٍ كَمَا بَارَكتَ على إبراهِيمَ وَعَلى آل إبراهِيمَ فِي العَالَمِينَ إنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيد). ئەمەش وا

---

(١) جومهوری زانایان ڕایان وایە کە قورئان خوێندنەکەو سڵاوات دانەکەو پاڕانەوەکە سوننەتە بەنهێنی بێت، بەڵام ئیمام سوننەتە (الله اكبر) کردنەکانی و سڵاودانەوەی بە دەنگی بەرز بێت بۆ ئەوەی پێی بزانرێت چی ئەکات.

دەرئەکەوێت دوای ووتنی (الله اکبر)ی دووەمە هەرچەندە بەڵگەی دیاری کردنی شوێنەکەشی لە پێغەمبەرەوە ﷺ نەهاتووە.

و- پاڕانەوە: پاڕانەوەش یەکێکە لە پایەکانی نوێژی مردوو بەڕێکەوتنی زانایان بە پێی فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ کە فەرموویەتی: (إذَا صَلَّيتُم عَلَى المَيِّتِ فَأخلِصُوا لَهُ الدُّعَاءَ). واتە: ئەگەر نوێژتان کرد لەسەر مردوویەك بە ئیخلاصەوە بۆی بپاڕێنەوە، ئەبوداوود و بەیهەقیو ئیبنوماجە وە ئیبنو حیببان کە بە صحیحی داناوە گێڕاویانەتەوە.

دوعا هەرچەندە کەمیش بێت دێتە دیو بەجێ دێت. بەڵام وا پەسەندە بەیەکێ لەم دۆعایانە بێت کە لە حەدیثدا هاتووە:

١- ئەبو هورەیرە فەرمویەتی: پێغەمبەر ﷺ لە نوێژێکی مردودا ئەپاڕایەوە ئەی فەرموو: (اللَّهُمَّ أنتَ رَبُّهَا، وَأنتَ خَلَقتَهَا وَأنتَ رَزَقتَهَا، وَأنتَ هَدَيْتَهَا للإسلامِ، وأنتَ قَبَضتَ رُوحَهَا، وَأنتَ أعلَمُ بِسِرِّهَا وَعَلانِيَّتِهَا، جِئنَا شُفَعَاءَ لَهُ، فَاغفِر لَهُ ذَنبَهُ). واتە: خوایە خۆت پەروەردگاری ئەم مردووەی، وە خۆت دروستت کردووە، وە خۆت ڕزقت داوە، وە خۆت ڕێنمایت کردووە بۆ ئیسلام وە خۆت گیانت کێشاوە وەتەنها خۆت ئاگاداری بەسەر نهێنیو ئاشکراکانیدا، وا ئێمەش هاتووین بە تکاکاری بۆی، خوایە لە گوناهەکانی ببورە.

٢-لە واثیلەی کوڕی ئەسقەعەوە هاتووە ووتوویەتی: پێغەمبەر ﷺ نوێژی لەسەر تەرمی پیاوێك ئەکرد پێمان، گوێم لێ بوو ئەپاڕایەوەو ئەیفەرموو: (اللَّهُمَّ إنَّ فُلانَ ابنَ فُلان فِي ذِمَّتِكَ وَحَبلِ جِوَارِكَ، فَقِهِ مِن فِتنَةِ القَبرِ وَعَذابِ النَّارِ، وَأنتَ أهلُ الوَفَاءِ وَالحَقِّ، اللَّهُمَّ فَاغفِر لَهُ وَارحَمهُ، فَإنَّكَ أنتَ الغَفُورُ الرَّحِيم). رواهما أحمد و أبوداود. واتە: خوایە فلانی کوڕی فلان لە پەنای تۆدایە، بیپارێزە لە فیتنەی ناوگۆڕو سزای ئاگر، وە هەر خۆت شیاوی وەفاو ڕاستیت، خوایە لێی ببورە و ڕەحمی پێ بکە، چونکە بەڕاستی هەر تۆ لێبوردەو میهرەبانی.

٣- لە عەوفی کوڕی مالیکەوە هاتووە فەرمویەتی: گوێم لە پێغەمبەر ﷺ بووە نوێژی لەسەر مردوویەك ئەکرد ئەیفەموو: (اللَّهُمَّ اغفِر لَهُ وَارحَمهُ، وَاعفُ عَنهُ وَعَافِهِ وَأكرِم نُزُلَهُ، وَوَسِّع مُدخَلَهُ وَاغسِلهُ بِمَاءٍ وَثَلجٍ وَبَرَدٍ، وَنَقِّهِ مِنَ الخَطَايَا كَمَا ينقى الثَّوبُ الأبيَضُ مِنَ الدَّنَسِ، وَأبدِلهُ دَاراً خَيراً مِن دَارِهِ وَأهلاً خَيراً مِن أهلِهِ وَزَوجاً خَيراً مِن زَوجِهِ، وَقِهِ فِتنَةَ القَبرِ وَعَذابَ النَّارِ) رواه مسلم. واتە: خوایە لێی ببورە و میهرەبان بە لەگەڵیا و ئاسوودە و سەلامەتی بکە و ڕێزی لێ بگرە و گۆڕەکەی بۆ فراوان بکە، وە بیشۆرە بە ئاوو بە فر و تەرزە، وە لە تاوان پاکی بکەرەوە وەك چۆن پۆشاکێکی سپی پاك ئەکرێتەوە لە چڵك و پیسی، خوایە خانوو کەس‌وکارو خێزانی چاکتری پێ ببەخشە و بیپارێزە لە فیتنەی گۆڕ و سزای ئاگر.

٤- له ئەبو هورەیرەوە هاتووە فەرمویەتی: پێغەمبەر ﷺ لەسەر تەرمێك نوێژی ئەكرد ئەیفەرموو: (اللَّهُمَّ اغفر لِحَيِّنَا وَمَيِّتِنَا، وَصَغِيرِنا وَكَبِيرِنَا، وَذَكَرِنَا وَأُنثَانَا، وَشَاهِدِنَا وَغَائِبِنَا اللَّهُمَّ مَن أحيَيتَهُ مِنَّا فَأحيِهِ عَلَى الإِسلامِ، وَمَن تَوَفَّيتَهُ مِنَّا فَتَوَفَّهُ عَلَى الإِيمَانِ، اللَّهُمَّ لاتَحرِمنَا أجرَهُ، وَلا تُضِلَّنَا بَعدَهُ) رواه أحمد وأصحاب السنن. واته: خوایە لە زیندوو مردوو گەورەو بچوكو نێرو مێو حازرو غائیبمان ببورە، خوایە هەر كەسێكت لە ئێمە ژیاند لەسەر ئیسلام بیژێنە، وە هەركەست مراند لەسەر باوەڕ بیمرێنە، خوایە لە پاداشتی بێ بەشمان مەكە و دووای ئەو گومڕامان مەكە.

جا ئەگەر ئەو كەسەی نوێژی لەسەر دەكرێ منداڵ بوو واپەسەندە نوێژكەرەكە بڵێ: (اللَّهُمَّ اجعَلهُ لَنَا سَلَفاً وَفَرطاً وَذُخراً). ئیمامی بوخاری و بەیهەقی لە قسەی حەسەنی بەصرییەوە ریوایەتیان كردووە.

نەوەوی ووتویەتی: ئەگەر مردوەكە منداڵ بوو نێر بێ یا مێ ئەوە هەر ئەو دوعایەی بۆ ئەكرێ كە لەناو ئەم فەرمودەیەدا هەیە: (اللهم اغفر لحينا وميتنا...الخ). ئەمەش زیاد بكات: (اللَّهُمَّ اجعَلهُ فَرطاً لأبوَيهِ وَسَلَفاً وَذُخراً وَعِظَةً وَاعتِبَاراً وَشَفِيعاً، وَثَقِّلهُ بِهِ مَوَازِينَهُمَا، وَأفرغِ الصَّبرَ عَلَى قُلُوبِهِمَا، وَلا تَفتِنهُمَا بَعدَهُ وَلا تَحرِمهُمَا أجرَهُ). واته: خوایە بیكەیت بە پێشڕەو بۆ دایك و باوكی و زەخیرە بۆیان، و بیبێتە پەند و ئامۆژگاری و تكاكار بۆیان و تای ترازوویانی پێ قورس بكە و ئارامی بڕژێنە بەسەر دڵیانا، و دووای ئەو توشی فیتنەیان مەكە و لە پاداشتی بێ بەشیان مەكە.

**شوێنی ئەو دوعایانە:**

شەوكانی ووتوویەتی: بزانە شتێكی وا نەهاتووە كە شوێنی ئەو دوعایانە دیاری بكات، جا ئەگەر ئەو نوێژخوێنە ئارەزووی كرد، ئەتوانێ ئەوەی خۆی هەڵی بژاردووە لەو دوعایانە بە یەك كەڕەت بیخوێنێ، جا یان دووای ووتنی: (الله أكبر)ەكان ئەیڵێت، یادووای تەكبیرەی یەكەم یا دووەم یا سێیەم، یا ئەو پاڕانەوە ئەكات بە دوو بەشەوە لەنێوان دوو تەكبیرەدا ئەیانڵێت، یا لەنێوان هەردوو تەكبیرەدا یەكێ لەو دوعایانە ئەڵێت، ئەمەش بۆ ئەوەی هەموو ئەو دوعایانە بڵێت كە لە پێغەمبەرەوە ﷺ هاتووە.

وە ووتوویەتی: ئەوەی ئاشكرایە ئەوەیە كە ئەبێت بەو لەفزانە بپاڕێتەوە كە لە حەدیسەكانا هاتوون، جا ئەو مردووە نێر بێت یا مێ وەك یەكە، و نابێت ضەمیرەكان بگۆڕێت بۆ نێرو مێ، چونكە ضەمیرەكان بۆ مردووەكە ئەگەڕێنەوە، مردووش بە نێرو بە مێ ئەووترێت.

**٧- پاڕانەوە دووای تەكبیرەی چوارەم:**

پەسەندە دووای ووتنی (الله أكبر) ی چوارەم ئەو كەسە بپاڕێتەوە بۆ مردووەكە هەرچەندە دوای (الله أكبر)ی سێیەم پاڕابێتەوە، بەپێی ئەوەی ئەحمەد لە عەبدوڵڵای كوڕی ئەبی ئەوفاوە گێڕاویەتییەوە كە كچێكی ئەمرێت چوار (الله أكبر)ی لەسەر ئەكات، پاشان دووای چوارەم ئەوەندەی نێوان دوو تەكبیرەكە وەستاوە و پاڕاوەتەوە. ئینجا ووتوویەتی: پێغەمبەر ﷺ لە نوێژی مردودا ئەو شێوەیەی كردووە.

شافیعی ڕەحمەتی خوای لەسەر بێت وتویەتی: دوای تەکبیرەی چوارەم دەڵێ: خوایە لەپاداشتی بێ بەشمان مەکە، وەدووای ئەو تووشی فیتنەمان مەکە.

ئیبنوئەبی هورەیرە وتوویەتی: پێشینان دووای تەکبیرەی چوارەم ئەیان ووت: (اللَّهُمَّ رَبَّنَا آتِنَا فِي الدُّنيَا حَسَنَةً وَفِي ألآخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ النَّار). واتە: خوایە لە دونیاو ڕۆژی دواییدا چاکەمان پێ ببەخشە و لە سزای ئاگر بمان پارێزە.

**٨- سڵاودانەوە:**

زانایان هەموو لەسەر ئەوە ڕێکن کە سڵاودانەوە فەرزە لە نوێژی مردوودا جگە لە ئەبو حەنیفە، کە ئەڵێت: هەردوو سڵاودانەوەکە بەلای ڕاست و چەپدا واجبن، بەڵام ڕوکن نین لە نوێژەکە، وە ئەوانەی بە فەرزیان داناوە بەڵگەیان ئەوەیە کە نوێژی مردوو نوێژە ونوێژیش بە سڵاودانەوە کۆتایی دێت.

ئیبنومەسعود فەرمویەتی: سڵاودانەوە لە نوێژی مردوودا وەك سڵاودانەوەیە لە نوێژی تردا لای کەمی سڵاودانەوەکەش ووتنی: (السلام علیکم) یان (سلام علیکم)ە.

ئەحمەد بۆ ئەوە چووە کە یەك سڵاودانەوە سوننەتە، ئەو کەسە بەلای ڕاستدا سڵاوئەداتەوە، وە قەیناکە ئەگەر بە بەردەم خۆیدا سڵاو بداتەوە، بە بەڵگەی کردەوەی پێغەمبەر ﷺ و صەحابەکانی کە یەك سڵاویان ئەدایەوە، وە نەزاندراوە کەسێك پێچەوانەیان بوو بێت لەو زەمانەدا.

شافیعی بە پەسەندی داناوە دوو سڵاودانەوە بووترێت یەکەم جار بە لای ڕاستدا سڵاو ئەداتەوە، و دووەم جار بەلای چەپدا.

ئیبنوحەزم وتوویەتی: سڵاودانەوەی دووەم ذیکرە و کارێکی چاکە.

**چۆنیەتی نوێژ کردن لەسەر جەنازە:**

ئەوەیە کە نوێژکەر بە پێوە ئەوەستێت دوای تەواو کردنی مەرجەکانی نوێژ بەنیازی ئەوەی نوێژ بکات لەسەر ئەو تەرمەی حازر کراوە، جا هەردوو دەستی بەرز ئەکاتەوەو ئەڵێت: (الله أکبر) پاشان دەستی ڕاستی ئەخاتە سەر دەستی چەپو دەست بە خوێندنی سورەتی فاتیحە ئەکات، پاش ئەوەی لە خوێندن بووەوە (الله أکبر) ئەکاتەوە و سڵاوات لەسەر پێغەمبەر ﷺ ئەدات، لە پاش ئەوە (الله أکبر) ئەکاتەوەو ئەپاڕێتەوە بۆ مردووەکە، پاشان (الله أکبر) ئەکاتەوەو ئەپاڕێتەوە بۆ مردوەکە، پاشان سڵاو ئەداتەوە.

**شوێنی وەستانی ئیمام لەسەر تەرمی پیاوو ژن:**

سوننەتە ئیمام لای سەری پیاوەوە بوەستێ، و لەلای ناو قەدی ژنەوە بوەستێ، بەپێی ئەوەی هاتووە لە ئەنەسەوە کە لەسەر تەرمی پیاوێك نوێژی کردووە و لای سەریەوە ڕاوەستاوە، کاتێك تەرمی ئەو پیاوەیان هەڵگرت، تەرمی ئافرەتێکیان هێنا نوێژی لەسەر کرد و لەلای ناو قەدیەوە ڕاوەستا، جا کاتێ لەو بارەیەوە پرسیاریان لێ کردو وتیان: ئایا پێغەمبەر ﷺ بەو شێوەیە ڕا ئەوەستا لەسەر پیاوو ژن وەك تۆ

که وەستایت؟ فەرموی: بەڵێ. ئەحمەدو ئەبوداودو ئیبنوماجەو (ترمذی) کە بە حەسەنی داناوە گێڕاویانەتەوە.

(طحاوي) ووتوویەتی: ئێمەش ئەوەمان پێ خۆشترە ، چونکە ئەم بۆ چوونە ئەو ئەسەرانە بەهێزی ئەکەن کە لە پێغەمبەرەوە ﷺ ڕیوایەتمان کردووە.

**نوێژ کردن لەسەر زیاتر لە یەك تەرم :**

ئەگەر چەند تەرمێك لەیەك کاتدا کۆبوونەوە نێر بوون یامێ، یەك بەدووای یەکدا ڕیز ئەکرێن لەبەردەم ئیمامدا بەرەو قیبلە بۆ ئەوەی هەموویان بکەونە بەردەم ئیمامەوە، جا کامیان پیاوچاکتر بوو لە پێشەوە دائەنرێت وە لەسەر هەموویان یەك نوێژ ئەکرێت.

نافیع ئەگێڕێتەوە ئەڵێت: ئیبنوعومەر خوایان لێ ڕازی بێت لەسەر نۆ تەرمی ژن و پیاو نوێژی کردووە پیاوەکانی لە بەردەم ئیمامەوە داناوە و ژنەکانیشی لای قیبلە، وە بەیەك ڕیز ڕیزی کردون.

وە تەرمەکەی ئوموکولسومی کچی عەلی خێزانی عومەر ڕەزای خوایان لێ بێ لەگەڵ کوڕێکیدا —کە ناوی زەید بووە- دانرا، ئیمامەکەش ئەوکاتە سەعیدی کوڕی عاص بوو، وە لەناو خەڵکەکەدا ئیبنوعەبباس و ئەبوهوڕەیرە و ئەبو سەعید و ئەبیقەتادە ئامادە بوون، جا منداڵەکە لە بەردەم ئیمامدا دانرا.

پیاوێکیش ووتی: نینکاریم لەو کارە کرد سەیرێکی ئیبنو عەبباسو ئەبی هوڕەیرەو ئەبی سەعیدو ئەبی قەتادەم کردو ووتم: ئەوە چیە؟ ووتیان: سوننەت وایە. نسائیو بەیهەقی گێڕاویانەتەوە. (حافظ) ووتویەتی ئیسنادەکەی صەحیحە.

لەو حەدیسەدا ئەوە دەرئەکەوێ ئەگەر ژنو منداڵ نوێژیان بەیەکەوە لەسەر کرا ئەبێ منداڵەکە لە بەردەم ئیمامەوە دابنرێت و ژنەکە لەلای قیبلەوە، بەمەرجێك منداڵەکە نێرینە بێت.

بەڵام ئەگەر تەرمەکان تەرمی منداڵ و پیاو ژن بوو، منداڵەکان لە دووای پیاوەکانەوە ڕیز ئەکرێن.

**پەسەندیەتی سێ ڕیز و ڕێك وپێك کردنیان:**

پەسەندە کە نوێژکەرەکان لەسەر جەنازەکە بکرێن بە سێ ڕیز و ڕێكو پێك بوەستن، بە پێی ئەوەی مالیکی کوڕی هەبیرە گێڕاویەتیەوە ووتوویەتی: پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (مَا مِن مُؤمِنٍ يَمُوتُ فَيُصَلِّي عَلَيهِ أُمَّةٌ مِنَ المُسلِمِينَ يَبلُغُونَ أن يَكُونوا ثَلاثَةَ صُفُوفٍ إلا غُفِرَ لَهُ) رواه أحمد وأبوداودو ابن ماجة والترمذي وحسنه والحاكم وصححه. واتە: هیچ برِوادرێك نیە کە کۆمەڵێك لە موسڵمانان نوێژی لەسەر بکەن و بگەن بە سێ ڕیز، خوا لە تاوانەکانی ئەبورێت.

لەبەر ئەوە مالیکی کوڕی هەبیرە ئەگەر ژمارەی نوێژکەرەکان کەم بونایە هەوڵی ئەدا ئەی کردن بەسێ ڕیزەوە.

ئەحمەد ووتوویەتی: من پێم خۆشە بکرێن بە سێ ڕیزەوە هەرچەندە کەمیش بن، ووتیان: ئەگەر چوار کەس لە دواوەی بوون چۆن بیکات بەسێ ڕیز؟ ووتی: با بیکات بە دوو ڕیز هەر ڕیزەی دوو کەس، وەلای خراپ بوو بیکات بە سێ ڕیز هەر ڕیزەی پیاوێك.

**پەسەندی‌یەتی کۆبوونەوەی خەڵکی زۆر:**

پەسەندە کە کۆمەڵێکی زۆر لەسەر تەرمەکە نوێژ بکەن بە پێی ئەوەی عائیشە گێڕاویەتی‌یەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (مَا مِن مَيِّتٍ يُصَلِّي عَلَيهِ أُمَّةٌ مِنَ المُسلِمِينَ يَبلُغُونَ مِائَةً، كُلُّهُم يَشفَعُونَ لَهُ، إلا شُفِّعُوا) رواه أحمد ومسلم والترمذي. واتە: هیچ مردویەك نیە سەد موسڵمان نوێژی لەسەر بکەن و هەمویان تکای بۆ بکەن خوا تکاکەیان قبوڵ نەکات.

لە ئیبنو عەبباسەوە هاتووە فەرمویەتی: گوێم لە پێغەمبەر ﷺ بووە فەرمویەتی: (مَا مِن رَجُلٍ مُسلِمٍ يَمُوتُ، فَيَقُومُ عَلَى جَنَازَتِهِ أربَعُونَ رَجُلاً، لايُشرِكُونَ بِاللهِ شَيئاً إلا شَفَّعَهُمُ اللهُ فِيهِ) رواه أحمد ومسلم و أبوداود. واتە: هیچ موسڵمانێك نیە کاتێك بمرێت چل پیاو لەسەر تەرمەکەی نوێژ بکەن، کە هاوبەش بۆ خوا پەیدا نەکەن ئیللا خوا تکاکەیان وەرنەگرێت و لە مردووەکە خۆش ئەبێت.

**کەسێك لە نوێژی جەنازەدا دووا کەوێ:**

ئەگەر کەسێك لە نوێژی مردودا لە یەکێ لە (الله أكبر) کردنەکاندا دوا کەوت، وا پەسەندە دووبارەی بکاتەوە بەدوای یەکدا، جا ئەگەر دووبارەشی نەکاتەوە قەیناکە، وە ئیبنوعومەرو حەسەن و ئەییوبی سەختیانی و ئەوزاعی ووتویانە: هەر تەکبیرەیەك فریانەکەوت نەیکاتەوەو لەگەڵ ئیمامدا سڵاو بداتەوە.

ئەحمەد ووتوویەتی: ئەگەر قەزاشی نەکاتەوە گوێی نەداتێ.

خاوەنی کتێبی (المغني) ئەو بۆ چوونەی تەرجیح داوەو ووتوویەتی: بۆ ئەوە قسەکەی ئیبنو عومەرمان هەیە کەلەناو صەحابەکاندا موخالفی نەبووە.

لە عائیشەوە ئەگێڕنەوە کە فەرمویەتی: ووتم: ئەی نێرراوی خوا من لە نوێژی مردودا هەندێ تەکبیرەم لێ تێك ئەچێت و گوێم لێ نابیت فەرمووی: (مَا سَمِعتِ فَكَبِّرِي، وَمَا فَاتَكِ فَلا قَضَاءَ عَلَيكِ). واتە: هەرچیت گوێ لێ بوو بیڵێ، و هەرچیت گوێ لێ نەبوو قەزای مەکەرەوە.

ئەمە شتێکی ئاشکراو صەریحە چونکە ئەو تەکبیرانە یەك بەدووای یەکدان ئەوەی کە ڕۆیشتن پێویست نیە دووبارە بکرێتەوە، وەك تەکبیرەکانی نوێژی جەژن.

**ئەوانەی نوێژیان لەسەر ئەکرێت و ئەوانەی نوێژیان لەسەر ناکرێت:**

زانایان لەسەر ئەوە ڕێکن کە موسڵمان نێر بێت یا مێ گەورە بێت یا بچووك کاتێ بمرێت نوێژی لەسەر ئەکرێت، ئیبنو مونذیر ووتوویەتی: زانایان هەموویان لەسەر ئەوەن کە کۆرپەلە ئەگەر کیانی بە بەردا کرابێت و جوڵەیەك بکات کە بزاندرێ ژیانی تێدایە، نوێژی لەسەر ئەکرێت.

له موغیرەی کوڕی شوعبەوە هاتووە لە پێغەمبەرەوە ﷺ کە فەرمویەتی: (الرَّاكِبُ خَلفَ الجَنَازَةِ وَالمَاشِي أَمَامَهَا قَرِيباً مِنهَا عَن يَمِينِهَا أو عَن يَسَارِهَا، وَالسَّقطُ يصلى عَلَيهُ وَيُدعى لِوَالِدَيهِ بِالمَغفِرَةِ وَالرَّحمَةِ) رواه أحمد وأبوداود. واتە: سوار ئەبێت لەدووای جەنازەوە بڕوات، پیادەش لە بەردەمو لای ڕاستەو لای چەپیەوە نزیك لێیەوە ئەڕوات، وە منداڵێ لەبارچوو نوێژی لەسەر ئەکرێت وە بۆ دایكو باوکی دوعای خێر ئەکرێت، وە لە ڕیوایەتەکەی ئەبوداوددا هاتوە کە: پیادە لەدواوە و لە پێشەوە لەڕاست و لە چەپەوە لە نزیکەوە ئەڕوات.

لە ڕیوایەتێکی تردا ئەفەرموێت: (الرَّاكِبُ خَلفَ الجَنَازَةِ، وَالمَاشِي حَيثُ شَاءَ مِنهَا، وَالطِّفلُ يصلى عَلَيهِ) رواه أحمد والنسائي والترمذي وصححه. واتە: سوار لەدوای جەنازەوە ئەڕواتو پیادە ئارەزووی خۆیەتی، منداڵیش نوێژی لەسەر ئەکرێت.

نوێژ کردن لەسەر منداڵی لەبارچوو (سقط) :

منداڵی لەبارچوو ئەگەر چوار مانگی بەسەردا تێ نەپەڕی بوو ناشۆرێت و نوێژی لەسەر ناکرێت، تەنها ئەپێچرێت لە قوماشێکەوەو ئەشاردرێتەوە، ئەمە زانایان خیلافیان لەسەری نیە.

بەڵام ئەگەر چوار مانگو بەرەو ژووری بەسەردا تێ پەڕی بێت و دەنگی لێوە هاتبێ ئەوە ئەشۆرێت و نوێژی لەسەر ئەکرێت بەڕای هەموو زانایان.

بەڵام ئەگەر دەنگی لێوە نەهاتبو و نەجوڵاو نەپژمی ئەوە نوێژی لەسەر ناکرێت لای حەنەفیەکان و مالیك و ئەوزاعی و حەسەن.

بە پێی ئەوەی (ترمذي) و نەسائی و ئیبنوماجە و بەیهەقی ئەگێڕنەوە لە جابیرەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (إذا استَهَلَّ السقطُ صُلِّيَ عَلَيهِ وَوُرِّثَ). واتە: ئەگەر منداڵێ لە بار چوو دەنگی لێوە هات و جوڵایەوە نوێژی لەسەر ئەکرێو میراتیش ئەگرێت.

لە فەرموودەکەدا ئەبینین مەرجی نوێژ لەسەر کردن جوڵاندن و دەنگ لێ هاتنە.

ئەحمەد و سەعید و ئیبنوسیرین و ئیسحاق بۆ ئەوە چوون کە منداڵی (سقط) ئەشۆرێت و نوێژی لەسەر ئەکرێت بە پێی فەرموودەکەی پێشوو کە ئەفەرموێت: (سقط) نوێژی لەسەر ئەکرێت، چونکە گیانێکە و گیان کراوە بە بەریا، جا نوێژی لەسەر ئەکرێت وەك جوڵاوو دەنگ لێوە هاتو.

وە لە بەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ ڕای گەیاندووە کە کۆرپەلەی چوار مانگە گیانی ئەکرێت بە بەردا، جا وەڵامی ئەوەیان داوەتەوە کە کۆمەڵەی یەکەم کردویانەتە بەڵگە بەوەی کە ئەو حەدیثە (مضطرب) تێکەڵ وپێکەڵەو لەگەڵ حەدیسێکی لەو بەهێزتر بەرەنگاری بۆتەوە، کەواتە بە کاری ئیش پێ کردن نایەت.

نوێژ کردن لەسەر شەهید:

شەهید کەسێکە کە بە دەستی بێ باوەڕ لە جەنگدا کوژرابێت، وە فەرموودەی ڕاستو ڕێك هاتووە دەربارەی ئەوەی کە نوێژی لەسەر ناکرێت.

١- بوخاری ئەگێڕێتەوە لە جابیرەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمانی دا کوژراوەکانی ئوحود بەخوێنەوە بنێژرێن و نەیشۆردن و نوێژی لەسەریان نەکرد.

٢- ئەحمەدو ئەبو داوودو (ترمذي) لە ئەنەسەوە ئەگێڕنەوە فەرمویەتی: شەهیدەکانی ئوحود نە شۆران و نە نوێژیان لەسەر کرا، وە هەر بەخوێنەکەیانەوە نێژران.

بەڵام فەرموودەی تری صەحیح هاتووە کە نوێژیان لەسەر ئەکرێت:-

١- بوخاری لە عوقبەی کوڕی عامیرەوە ئەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ ڕۆژێك چوو نوێژی کرد لەسەر شەهیدەکانی ئوحود لەدوای هەشت ساڵ، هەروەك کەسێك ماڵ ئاوایی لە زیندووان بکات.

٢- لە ئەبی مالیکی غیفاریەوە هاتووە ووتوویەتی: کوژراوەکانی ئوحودیان نۆ نۆ ئەهێنا، و بەحەمزەوە ئەبوون بە دە، پێغەمبەر ﷺ نوێژی لەسەر ئەکردن پاشان ئەوانە لا ئەبران و نۆی تریان ئەهێنا، حەمزە هەر ئەمایەوە و لانەئەبرا، بەو شێوەیە پێغەمبەر ﷺ نوێژی لەسەر هەموویان کرد. بەیهەقی گێڕاویەتی-یەوە و وتوویەتی: ئەمە صەحیحترین فەرموودەیە کە لەم بابەدا هاتووە. وە حەدیسەکە مورسەلە.

ڕای زانایان بەپێی جیاوازی ئەم فەرموودانە جیاوازە، جا هەندێکیان هەردوو شێوەی فەرموودەکان وەرئەگرن.

هەندێکیان تەرجیحی هەندێ لەو فەرموودانە ئەدەن بەسەر هەندێکی تریاندا.

لەوانەی بەهەردوو جۆری فەرموودەکە کار ئەکەن ئیبنوحەزمە کە کردن و نەکردنی بە دروست داناوە، وە ووتویەتی: ئەگەر نوێژی لەسەر بکرێت چاکترە، وە ئەگەر نەشکرێت هەر چاکە، کە ئەمەش یەکێکە لە ڕیوایەتەکانی ئەحمەد.

ئیبنو قەییم ئەو ڕایەیی بەڕاست داناوەو ووتوویەتی: ئەوەی ڕاست بێت لەم کێشەیەدا ئیمام ئارەزووی خۆیەتی نوێژی لەسەر بکات یا نەیکات، چونکە ئەسەرو ڕیوایەت بەهەردوو شێوەکە هاتووە، ئەمەش یەکێکی ترە لەڕیوایەتەکانی ئەحمەد، ئەوەش گونجاوترە بە بنەمای مەزهەبەکەیەوە.

وە ووتوویەتی: ئەوەی دەر ئەکەوێت دەربارەی شەهیدەکانی ئوحود ئەوەیە کە پێغەمبەر ﷺ کاتی ناشتنیان نوێژی لەسەر نەکردوون، چونکە حەفتاکەس لە ئوحود شەهیدکران و نابێت شتێوا بشارێتەوەو نەزانرێ ئەگەر نوێژی لەسەر کردبن.

وە حەدیسەکەی جابیری کوڕی عەبدوڵلا کە فەرمویەتی: نوێژیان لەسەر نەکرا صەحیح و صەریحە، لەکاتێکا عەبدوڵلای باوکیشی یەکێك بوو لە کوژراوەکان، کەواتە ئەو لەو بارەیەوە ئاگادارترە لە کەسێکی تر.

ئەبو حەنیفەو ثەوریو حەسەن و ئیبنو موسەییب ئەو ڕیوایەتانە تەرجیح ئەدەن کە ئەڵێن: نوێژیان لەسەر کراوە، وە ووتوویانە پێویستە نوێژ لەسەر شەهید بکرێت، بەڵام مالیكو شافیعیو ئیسحاقو ڕیوایەتێك لە ئەحمەدەوە پێچەوانەی ئەوانن، وە ووتویانە: شەهید نوێژی لەسەر ناکرێت.

شافیعی لە (الأم)دا ڕای خۆی تەرجیح ئەدات و ئەڵێت: ڕیوایەتەکان بە ئاشکرا واهاتوون وەك ئەوەی بە چاو ببیندرێن لە چەند ڕویەکی موتەواتیرەوە کە پێغەمبەر ﷺ نوێژی لەسەر کوژراوەکانی ئوحود نەکردووە، وە ئەوەی ئەیگێڕنەوە کە نوێژی لەسەر کردوون و لەسەر حەمزە حەفتا (الله أکبر)ی کردووە صەحیح نییە.

ئەوانەی بەم ڕیوایەتە بەرەنگاری ئەو حەدیسە صەحیحانەیان کردووە ئەبو شەرم بیانگرێت، بەڵام حەدیسەکەی عوقبەی کوڕی عامیر ئەوە هەر لە حەدیسەکەدا باس ئەکات کە دوای هەشت ساڵ چووە. ئەڵێت: لەوە ئەچێت پێغەمبەر ﷺ چووبێت بۆیان بپاڕێتەوە و داوا لە خوا بکات لێیان خۆش بێت، کاتێك زانیویەتی ئەجەلی نزیك بۆتەوە، وە بەو کارەی ماڵ ئاوایی لێ کردون، ئیتر نابێتە بەڵگەی نەسخ و سڕینەوەی حوکمێکی سابت.

**کەسێك لە جەنگدا بریندار بکرێتو بمێنێتەوە:**

ئەگەر کەسێك لە جەنگدا بریندار کراو پاشان چاك بۆوەو بە ئاسودەیی ژیا، پاشان مرد، ئەوە هەرچەندە بە شەهید دائەنرێت بەڵام ئەبێ بشۆرێتو نوێژی لەسەر بکرێت.

چونکە پێغەمبەر ﷺ سەعدی کوڕی موعاذی شۆریو نوێژی لەسەر کرد دوای ئەوەی کە مرد بەهۆی تیرێك کە درا لە دەماری قۆڵیو بڕی. جا بردیان بۆ مزگەوت و چەند ڕۆژێك مایەوە، پاشان برینەکەی دەمی کردەوەو بەشەهیدی مرد، خوا لێی ڕازی بێت.

بەڵام ئەگەر بە برینداری مایەوەو ژیانێکی نا ئاسودەی بردە سەر، هەر ئەوەندە قسەی کرد یا ئاوی خواردەوە، پاشان مرد. ئەوە ئەوکەسە ناشۆرێت و نوێژی لەسەر ناکرێت.

خاوەنی (مغني) ئەڵێت: لەکاتی فەتحەکانی شامدا، پیاوێك ئەگێڕێتەوە ئەڵێت: بە ئومێدی ئەوەی ئامۆزاکەم گیانی تیادا مابێت ئاوم بۆ برد تا بیدەمێ؛ حاریسی کوڕی هیشامم بینی بە برینداری. ویستم ئاوەکە بدەم بەو بیخواتەوە. لەو لاوە پیاوێك سەیری ئەکرد، ئیشارەتی بۆ کردم کە ئاوەکە بدەم بەو، چووم بیدەم پێی، کەچی پیاوێکی تر لەو لاوە سەیری ئەکرد، ئەویش ئیشارەتی بۆ کردم کەبیدەم بەو، ئەڵێ: چووم بیدەمێ کەچی یەکێکی تر لەو لاوە سەیری ئەکرد ئەویش ئیشارەتی بۆ کردم بیدەم بەو یەکە. بەو شێوەیە هەموویان مردن کەسیان لە ئاوەکەیان نەخواردەوە لە بەر ئەوی تریان ئەڵێت: کەسیان نە شۆران و نە نوێژیان لەسەر کرا، هەرچەندە دووای جەنگەکە مردن.

**نوێژ کردن لەسەر کەسێك کە لە (حد)دا بکوژرێت :**

کەسێك کە لە (حد) تۆڵەدا بکوژرێ ئەشۆرێت و نوێژی لەسەر ئەکرێت، بە پێی ئەوەی بوخاری لە جابیرەوە ئەگێڕێتەوە کە پیاوێك لە هۆزی ئەسلەم هات بۆ لای پێغەمبەر ﷺ دانی بەوەدا نا کە زینای کردووە، پێغەمبەر ﷺ رووی لێ وەرگێڕا تا چوار جار لەسەر خۆی ئیعترافی کرد پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ئایا تۆ شێتی؟ کابرا ووتی نە، فەرمووی ژنت هێناوە کابرا ووتی: بەڵێ. پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کرد بردیان بۆ شوێنی نوێژی جەژن لەوێ ڕەجمیان کرد، لەوکاتەدا بەردەبارانیان ئەکرد زۆری بۆ هات و هەڵهات، پاشان گرتیانەوە هەتا مرد بەردە بارانیان کرد، پێغەمبەر دەربارەی بە باشی دووا و نوێژی لەسەر کرد.

ئەحمەد ووتوویەتی: نازانین کە پێغەمبەر ﷺ نوێژی نەکردبێت لەسەر هیچ کەسێك جگە لە خۆکوژو ئەوکەسەی لە غەنیمەت دزی کردبێت.

**نوێژ کردن لەسەر دزی تالآنی و خۆکوژ و سەرپێچی کەرانی تر:**

جومهوری زانایان بۆ ئەوە چوون کە نوێژ ئەکرێت لەسەر تەرمی ئەوکەسەی دزی لەو سامان و ماڵە بکات کەلە جەنگدا ئەگیرێت (غەنیمەت)، وە ئەوەی خۆی بکوژێت، هەروەها ئەوانەی کە سەرپێچی فەرمانی خوا ئەکەن و ئەمرن.

نەوەوی ووتوویەتی: قازی ووتوویەتی: بۆچونی تێکڕای زانایان لەسەر ئەوەیە کە نوێژ بکرێت لەسەر هەموو موسڵمانێك لەتۆڵەدا کوژرا، یا ڕەجم کرا، یا خۆی کوشت، یا منداڵی زۆڵ بوو.

وە ئەوەی لە پێغەمبەرەوە ﷺ ئەگێڕنەوە کە نوێژی لەسەر غەنیمەت دزو خۆکوژ نەکردووە لەوانەیە بۆ سەرزەنشت بووبێت، بۆ ئەوەی کەس ئەو کارە نەکات، وەك چۆن نوێژی لەسەر قەرزدار نەکردوە، وە فەرمانی داوە بە صەحابە نوێژی لەسەر بکەن.

ئیبنوحەزم ووتوویەتی: نوێژ لەسەر هەموو موسڵمانێك ئەکرێت، چاك بێت یان خراپ، لە تۆڵەدا کوژرابێت یا لە شەڕی نێوان دوو موسڵماندا، یا لەسەر ستەم کردن و دەست درێژی، جا ئیمام و کەسانی تر نوێژی لەسەر ئەکەن، وە هەروەها نوێژ لەسەر بیدەعە چی ئەکرێت بەمەرجێك بەو بیدعەیەی نەگەیشتبێتە سنوری کوفر، هەروەها کەسێك خۆی کوشتبێت یا کەسێکی تری کوشتبێت هەرچەندە خراپترین کەس بێت لەسەر زەویدا، بەمەرجێك بەموسڵمانی مردبێت هەر نوێژی لەسەر ئەکرێت، بەپێی فەرمانە گشتی‌یەکەی پێغەمبەر ﷺ کە فەرمویەتی: (صَلُّوا عَلَى صَاحِبِكُم). واتە نوێژ لەسەر هاوەڵەکەتان بکەن، موسڵمانیش هاوەڵی ئێمەیە، خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ﴾ (الحجرات/١٠). واتە: بەڕاستی باوەڕدارەکان هەموو برای یەکن.

خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَٱلْمُؤْمِنُونَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتُ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَآءُ بَعْضٍ﴾ (التوبة/٧١). واتە: پیاوان و ژنانی بڕوادار دۆست و یاریدەدەری یەکترن.

وە هەرکەس بەرگری نوێژ کردن بکات لەسەر موسڵمان ئەوە تاوانێکی گەورە ئەکات، وە تاوانبار زیاتر پێویستی بە پاڕانەوەی برا موسڵمانەکانی هەیە وەك لە پیاو چاك!!

بە صەحیحی هاتووە کە پیاوێك لە خەیبەر ئەمرێت، پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێت: (صَلُّوا عَلَى صَاحِبِكُم إنَّهُ قَد غَلَّ فِي سَبِيلِ الله). واتە: نوێژ لەسەر هاوەڵەکەتان بکەن ئەوە دزی لەو شتانە کردووە کە لە جەنگی ڕێی خوادا گیراوە.

ئەڵێ: کاتێ کەل و پەلەکەی گەڕاین مووروویەکمان دۆزیەوە تێیدا کە دوو درهەمی نەئەهێنا، وە بە صەحیحی هاتووە لە عەطائەوە کە نوێژ ئەکرێت لەسەر منداڵی زۆڵ، وە هەروەها لەسەر دایکی، وە لەسەر نەفرین کەران (المتلاعنين)، وە لەسەر ئەو کەسەی لەتۆڵەدا ئەکوژرێت، وە لەسەر ڕەجم کراو، وە لەسەر ئەوەی لە جەنگدا هەڵدێت و دوایی ئەکوژرێت.

(عطاء) ووتویەتی: وازناهێنم لە نوێژ کردن لەسەر کەسێك کە ووتبێتی (لا إله إلا الله) خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿مِنۢ بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُمْ أَصْحَٰبُ ٱلْجَحِيمِ﴾ (التوبة/١١٣). واتە: لەدوای ئەوەی بۆیان دەرکەوت کە بەڕاستی ئەوان دۆزەخین.

بەصحیحی هاتووە کە ئیبراهیمی نەخەعی ووتویەتی: هەرگیز موسڵمانە پێشوەکان لە صەحابەو تابعین ڕێگرییان نەئەکرد لە نوێژکردن لەسەر هیچ کەسێك لە ئەهلی قیبلە، وە ئەو کەسەش کە خۆی بکوژێت نوێژی لەسەر ئەکرێت؛ هەروەها ووتوویەتی: سوننەت وەهایە نوێژ لەسەر ڕەجم کراو بکرێ.

وە بە صەحیحی هاتووە لە قەتادەوە ووتویەتی: کەس نازانم لە زانایانی ئیسلام دووری کردبێ لەوەی نوێژ لەسەر کەسێك بکات کە ووتبێتی: (لا إله إلا الله).

بە صحیحی هاتووە لە ئیبنوسیرینەوە ووتوویەتی: بە کەس نەگەیشتووم کە نوێژکردن لەسەر ئەهلی قیبلەی بەلاوە گوناه بوبێت.

لە ئەبوغالیبەوە هاتووە ووتوویەتی: بە ئەبی ئومامەی باهیلیم ووت: پیاوی عارەق خۆر نوێژی لەسەر ئەکرێت؟ ووتی: بەڵێ: بە ئومێدی ئەوەی ڕۆژێك لەسەر پێخەفێك ڕاکشابێت و ووتبێتی: (لا إله إلا الله) و خوا لێی خۆش بوبێت.

بە صحیحی هاتووە کە حەسەن ووتویەتی: نوێژ ئەکرێت لەسەر هەرکەسێك کە ووتبێتی (لا إله إلا الله) و نوێژی بەرەو قیبلە کردبێت، چونکە نوێژ بۆ خۆی شەفاعەتە.

**نوێژ کردن لەسەر کافر:**

دروست نىيە بۆ هيچ موسلمانێك كە نوێژ بكات لەسەر هيچ بێباوەڕێك، بە پێى فەرموودەى خواى گەورە: ﴿وَلَا تُصَلِّ عَلَىٰٓ أَحَدٍ مِّنْهُم مَّاتَ أَبَدًا وَلَا تَقُمْ عَلَىٰ قَبْرِهِۦٓ إِنَّهُمْ كَفَرُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ﴾ (التوبة/٨٤). واتە: هەرگيز نوێژ لەسەر كەسيان مەكە كاتێ كە ئەمرێت وە لەسەر گۆڕەكەى مەوەستە ـ بۆ ئەوەى كە دوعاى بۆ بكەى ـ چونكە ئەوانە باوەڕيان بەخواو پێغەمبەركەى نەبووە.

هەروەها فەرمويەتى: ﴿مَا كَانَ لِلنَّبِىِّ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ أَن يَسْتَغْفِرُوا۟ لِلْمُشْرِكِينَ وَلَوْ كَانُوٓا۟ أُو۟لِى قُرْبَىٰ مِنۢ بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُمْ أَصْحَٰبُ ٱلْجَحِيمِ ۝ وَمَا كَانَ ٱسْتِغْفَارُ إِبْرَٰهِيمَ لِأَبِيهِ إِلَّا عَن مَّوْعِدَةٍ وَعَدَهَآ إِيَّاهُ فَلَمَّا تَبَيَّنَ لَهُۥٓ أَنَّهُۥ عَدُوٌّ لِّلَّهِ تَبَرَّأَ مِنْهُ﴾ (التوبة/١١٣-١١٤). واتە: نەئەبو بۆ پێغەمبەر ﷺ و ئەوانەى باوەڕدار بوون، داواى لێ بوردن بكەن بۆ هاوبەش دانەرەكان بۆ خوا، باخزمى نزيكيشيان بووبن، پاش ئەوەى بۆيان دەركەوت كە بەڕاستى ئەهلى دۆزەخن، وە ئەو داواى لێ خۆش بوونەى كە ئيبراهيم كردى بۆ باوكى تەنها لە لەبەر ئەو بەڵێنە بوو كەپێى دابوو، بەڵام كاتێ بۆى ئاشكرا بوو كە دوژمنى خوايە، خۆى لێ بەرى كرد.

هەروەها نوێژ لەسەر منداڵەكانيشيان ناكرێت، چونكە ئەوانيش حوكمى باوكيان بۆ دائەنرێت، مەگەر يەكێكيان نەبێت كە ئێمە خۆمان حوكم بدەين بە ئيسلامەتى، بەم جۆرە كە يەكێك لە دايكو باوكى موسلمان بووبێت، يا بمرێت، يا بە ديل بگيرێت بە تەنها لە باوكو دايكى، يا لە يەكێكيان، ئەوە نوێژى لەسەر ئەكرێت.

**نوێژ كردن لەسەر مردووى ناو گۆڕ:**

دروستە نوێژ بكرێت لەسەر مردوو دواى ناشتن لە هەركاتێكدا بێت، با لە پێش ناشتنيشيا نوێژى لەسەر كرابێت.

لە پێشەوە باس كرا كە پێغەمبەر ﷺ لەسەر شەهيدەكانى ئوحود لە دواى هەشت ساڵ نوێژى كردووە.

لە زەيدى كورى سابتەوە هاتووە فەرمويەتى: لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ چووينە دەر كاتێ گەيشتينە گۆڕستانى بەقيع گۆڕيكى تازەمان بينى، پێغەمبەر ﷺ پرسيارى كرد ئەمە گۆڕى كێيە؟ ووتيان: گۆڕى فلان ئافرەتە، ئەويش ناسىيەوە فەرمووى: ئەوە بۆچى پێتان ڕانەگەياندم كە مردووە؟ ووتيان: ئەى نێرراوى خوا بەڕۆژوو بويت و خەوتبويت و لە نيوەڕۆدا بوو، حەزمان نەكرد ئازارت بدەين، فەرمووى: (لاتَفعَلُوا لايَمُوتَنَّ فِيكُم مَيِّتٌ مَاكُنتُ بَينَ أظهُرِكُم إلا آذنتُمُونِي بِهِ فَإنَّ صَلاتِي عَلَيهِ رَحمَةٌ). واتە: وامەكەن، هەتا

من لەناوتاندا بم و کەسێکتان مرد ئیللا ئاگادارم بکەن لێی چونکە نوێژکردنی من ڕەحمەتە لەسەری.
ئەڵێت: پاشان هاتە سەر گۆڕەکەو ئێمەشی لە دوایەوە ڕیز کردو چوار (الله أكبر)ی لەسەر کرد.

ئەحمەدو نسائیو بەیهەقیو حاکمو ئیبنوحیببان گێڕاویانەتەوە، وە ئەم دوانە بە صەحیحیان داناوە. (ترمذي) ووتویەتی: لای بەشی زۆری زانایان لە صەحابەو کەسانی تر عەمەل بەوە کراوە، ئەوەش قسەی شافیعیو ئەحمەد و ئیسحاقە.

لە فەرموودەدا هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ نوێژی لەسەر گۆڕ کردووە دوای ئەوەی کە یارەکانی پێش ناشتنی نوێژیان لەسەر کردووە، چونکە ئەوان کەسیان نە ئەناشت هەتا نوێژیان لەسەر نەکردایە.

وە لەوەدا کە یارەکانی نوێژیان کردووە لەگەڵیا لەسەر گۆڕ بەڵگەی ئەوە هەیە کە ئەو نوێژ کردنە لەسەر گۆڕ تایبەت نی‌یە بە پێغەمبەرەوە ﷺ.

ئیبنوقەییم ووتوویەتی: ئەم سوننەتانە کە (محكم)ن ڕەد کراونەتەوە بەم حەدیسە (متشابە)ە کە دەفەرموێت: (لا تَجلِسُوا عَلَى القُبُورِ وَلا تُصَلُّوا إِلَيهَا). واتە: لەسەر گۆڕ دامەنیشنو نوێژی بەرەو ڕوومەکەن.

ئەمە فەرموودەیەکی صەحیحە، وە ئەو کەسەی کە ئەو قسەیەی فەرمووە هەرخۆی نوێژی لەسەر گۆڕ کردووە، جا ئەوەیان ووتەکەیەتی و ئەوەشیان کردەوەکەی، لەگەڵ ئەوەشدا هیچیان لەگەڵ ئەوی تریان دژایەتی نی‌یە، چونکە ئەو نوێژەی کە قەدەغەی کردووە بەرەو گۆڕ بکرێت، ئەو نوێژە نی‌یە کە لەسەر گۆڕ ئەکرێت.

چونکە ئەمەیان نوێژی جەنازەیەو تایبەت نی‌یە بەشوێنێکەوە، بەڵکو کردنی دوور لە مزگەوت چاکترە لەوەی کەلە مزگەوتدا بکرێت، کەواتە ئەو نوێژەی کە لەسەر مردوەکە ئەکرێت لەناو گۆڕەکەدا هەر لە جۆری ئەو نوێژەیە کە لەسەر دارمەیتەکەی ئەکرێت، چونکە هەر ئەو نوێژە مەبەستە لە هەردوو جێگاکەدا، ئیتر جیاوازی نی‌یە لەنێوان ئەوەی کە ئەو مردوە لەناو دارمەیتەکەدا بێت لەسەر زەوی‌یەکە، یاخود لەناو سکی زەوی‌یەکەدا بێت، بە پێچەوانەی نوێژەکانی ترەوە، چونکە ئەوان دانەنراون بەرەو گۆڕ و لەناو گۆڕستان بکرێن، چونکە ئەو کارە ئەبێتە هۆی ئەوەی کە گۆڕستان بکرێتە مزگەوت. لەکاتێکدا پێغەمبەر ﷺ نەفرینی لەوانە کردووە کە گۆڕستان ئەکەنە مزگەوت. ئیتر ئەوە لە کوێ‌یە کە نەفرینی کردوە لەو کەسەی ئەو کارە ئەکات و ترساندویەتی؟ وە ڕایگەیاندوە کە ئەوەی ئەوە بکات خراپترینی خەلکە وەك ئەفەرموێت: (إِنَّ مِن شِرارِ النَّاسِ مَن تُدرِكُهُمُ السَّاعَةُ وَهُم أحياءُ، وَالَّذِينَ يَتَّخِذُونَ القُبُورَ مَسَاجِدَ). واتە: خراپترینی خەڵك ئەوانەن کە ڕۆژی دوایی‌یان بەسەردا دێت و ئەوان زیندوون، هەروەها ئەوانەی کە گۆڕەکان ئەکەنە مزگەوت، وە ئەمە لە کوێ کە خۆی چەندین جار ئەو کارەی کردوە؟

نوێژ کردن لەسەر نادیار (غائب) :

دروسته نوێژ بکرێت لەسەر نادیار لە وڵاتێکی ترەوە، جا وڵاتەکە دوور بێت یا نزیك وەك یەکە، وە ئەبێت نوێژ کەرەکە بەرەو قیبلە بوەستێت با ئەو وڵاتەی کە نادیارەکەی تێدایە لەلای قیبلەشەوە نەبێت، پاشان ئەوکەسە نیەت ئەهێنێ و (الله أکبر) ئەکات، وەك ئەوەی لەسەر مردوی حازر ئەیکات. بە پێی ئەوەی (جماعة) لە ئەبو هورەیرەوە ئەگێڕنەوە کە پێغەمبەر ﷺ هەواڵی مردنی نەجاشی بە خەڵك ڕاگەیاند، ئەوڕۆژەی کە مردبوو، وە خەڵکەکەی هێنایە دەر بۆ نوێژگە و ڕیزی کردن و چوار (الله أکبر)ی کرد.

ئیبنوحەزم ووتوویەتی: نوێژ لەسەر مردووی نادیار (غائب) بە جەماعەت و تاك ئەکرێت، وە پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ یارەکانیدا بە جەماعەت نوێژی لەسەر نەجاشی کردووە خوا لێی ڕازی بێت لە کاتێکدا ئەو لە سەرزەوی حەبەشە مردبوو، هەروەها یارەکانیشی بەڕیز لەدوایەوە نوێژیان کردوە، ئەم کارەش ئیجماعێکە لەوانەوە کە دروست نیە کەس لێی لابدات، بەڵام ئەبوحەنیفەو مالیك پێچەوانەی ئەوەن، و بەڵگەیەکیشیان نیە پشتی پێ ببەسترێت.

**نوێژ کردن لەسەر مردوو لە مزگەوتدا:**

قەیناکە نوێژ لەسەر مردوو بکرێت لە مزگەوتدا ئەگەر مەترسی پیس بوونی مزگەوتەکە نەبێت، بەپێی ئەوەی موسلیم لە عائیشەوە ئەگێڕێتەوە فەرمویەتی: پێغەمبەر ﷺ لە مزگەوتدا نەبێت نوێژی نەکرد لەسەر سوهەیلی کوڕی بەیضاء.

صەحابە نوێژیان لەسەر ئەبی بەکرو عومەر کردووە لە مزگەوتدا، بێ ئەوەی کەس ئینکاری ئەو کارەی کردبێت، چونکە ئەویش نوێژێکە وەك نوێژەکانی تر.

بەڵام ئەوەی کە مالیك و ئەبی حەنیفە ئەڵێن کەراهەتی هەیە و بەڵگەشیان ئەو فەرموودەیە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (مَن صَلَّى عَلَى جَنَازَةٍ فِي المَسجِدِ فَلا شَيءَ لَهُ). واتە: هەرکەس لە مزگەوتدا نوێژ لەسەر تەرمێك بکات هیچ پاداشتی بۆ نیە.

ئەم فەرموودەیە لەلایەکەوە بە کردەوەی پێغەمبەر ﷺ و ئەصحابەکان بەرەنگاری کراوەو لەلایەکی تریشەوە زەعیفە.

ئەحمەدی کوڕی حەنبەل ووتوویەتی: ئەم فەرموودەیە لاوازە چونکە صالحی مەولای تەوئەمە بەتەنیا هێناویەتی، کە ئەویش لاوازە.

زانایان ئەم فەرموودەیان بە صەحیح داناوەو ووتوویانە: ئەوەی لە نوسخە صەحیحە بەناوبانگەکەی سوننی ئەبی داوودا هاتووە بەم لەفزەیە: (فَلا شَيءَ عَلَيهِ) واتە: هیچی لەسەر نابێت لە تاوان، نەك ئەوەی هیچ پاداشتی بۆ نابێت.

ئیبنوقەییم ووتوویەتی: نوێژ کردن لەسەر مردوو لە مزگەوتدا لە ڕەفتاری پێغەمبەر ﷺ نەبووە، بەڵکو لە دەرەوەی مزگەوتدا نوێژی لەسەر مردوو کردووە، مەگەر مەعزەرەتێك بوبێت.

هەندێك جار نوێژی لەسەر مردو کردوە لە مزگەوتدا، وەك چۆن لەسەر ئیبنو بەیضاء کردویەتی. وە هەردوو کارەکەش دروستن، بەڵام چاکتر وەهایە لە دەرەوەی مزگەوتدا بکرێت.

**نوێژ کردن لەسەر تەرم لەناو گۆڕستاندا:**

جومهوری زانایان ئەڵێن: کەراهەتی هەیە نوێژ لەسەر تەرم لە ناو گۆڕستاندا بکرێت. وە ئەو قسەیە لە عەلیو عەبدوڵڵای کوڕی عەمرو ئیبنو عەبباسەوە گێڕراوەتەوە.

(عطاء) و نەخەعی شافیعی و ئیسحاق و ئیبنومونذیریش بۆ ئەوە چوون. بە پێی فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ کە فەرمویەتی: (الأرضُ كُلُّهَا مَسجِدٌ، إلا المَقبَرَةَ وَالحَمَّامَ). واتە: زەوی هەمووی مزگەوتەو نوێژی تێدا ئەکرێت جگە لە گۆڕستان و گەرماو.

لە ریوایەتێکی ئەحمەددا: نوێژ کردن لەسەر مردوو لە گۆڕستاندا قەیناکە، چونکە پێغەمبەر ﷺ نوێژی لەسەر گۆڕ کردووە لە گۆڕستاندا، وە ئەبو هورەیرە نوێژی لەسەر عائیشە کردووە لە ناو گۆڕستانی بەقیعدا، ئیبنو عومەریش ئاگادار بووە، وە عومەری کوڕی عەبدولعەزیزیش کردوویەتی.

**دروستی نوێژی ئافرەت لەسەر تەرم:**

دروستە بۆ ئافرەت نوێژ بکات لەسەر جەنازە وەك پیاو، جا بەتەنها بیکات یا لەگەڵ کۆمەڵدا وەك یەکە.

عومەر خوای لێ ڕازی بێت چاوەڕوانی ئومو عەبدوڵڵای کرد هەتا نوێژی لەسەر عوتبە کرد، وە عائیشە فەرمانیدا سەعدی کوڕی ئەبی وەققاص بهێنن بۆ ئەوەی نوێژی لەسەر بکات. وەنەوەوی ووتوویەتی: وە ئەبێت جەماعەتیش سوننەت بێ بۆیان وەك نوێژەکانی تر.

حەسەنی کوڕی صالحو سوفیانی ثەوری و ئەحمەدو حەنەفییەکانیش ئەو ڕایەیان هەیە، وە مالیك ئەڵێت: ئەبێ بەتەنها نوێژەکە بکەن نەك بەجەماعەت.

**لەپێشترین کەس کە لەسەر مردوو نوێژ بکات:**

زانایان جیاوازیان هەیە لەوەدا کە کێ لە پێشترە بە ئیمامەت لە نوێژی مردوودا، جا ووتراوە: لەپێشترین کەس بۆ ئیمامەت سەرپەرشتی کەری مردووەکەیە، پاشان ئەمیر، لەپاشاندا باوك و باپیران، لەپاشاندا کوڕو کوڕەزاو بەرەوخوار، پاشان نزیکترین خزمی پشتی، مالیکی و حەنبلییەکانیش بۆ ئەوە چوون، وە ووتراوە لەپێشترین کەس باوکە، پاشان باپیرە، پاشان کوڕ پاشان کوڕەزا، ئینجا برا. لە پاشاندا برازا لە پاشاندا مام، پاشان ئامۆزا، بە پێی تەرتیبی خزمایەتی. ئەمەش بۆچونی شافیعی و ئەبو یوسفە.

بۆچونی ئەبو حەنیفە و موحەممەدی کوڕی حەسەن ئەوەیە کە والی لە پێشترین کەسە ئەگەر ئامادە بوو پاش ئەو قازی، پاش ئەو ئیمامی ئەو شوێنە، پاش ئەو سەرپەرشتی کەری ژنی مردووەکە، پاشان بە پێی نزیکی خزمایەتی، جگە لە باوك کە دەبێت پێش کوڕی مردووەکە بخرێت ئەگەر هەردووکیان ئامادە بوون.

**هەڵگرتنی تەرمو بردنی بۆ گۆڕستان**

لە هەڵگرتن و بردنی جەنازەدا چەند شتێکی شەرعی هەیە باسیان ئەکەین:

١- بەرێ کردنی مردوو هەڵگرتنی بۆ گۆڕستان کارێکی مەشروعە، وە سونەت وەهایە هەڵگر بەدەوری تابوتەکەدا بسوڕێتەوە و لە هەموو لایەکەوە هەڵی بگرێت. ئیبنوماجەو بەیهەقیو ئەبوداودی طەیالیسی لە ئیبنومەسعودەوە ئەگێڕنەوە فەرمویەتی: هەرکەس تەرمێکی هەڵگرت با هەر جارە شان بداتە ژێر لایەکی، چونکە ئەو کارە سونەتە[1]، پاشان ئەو کەسە ئارەزووی خۆیەتی دوای ئەوەی لەهەموو لاکانییەوە هەڵی گرت دووبارەی ئەکاتەوە یا وازی لێ ئەهێنێ، وە لە ئەبی سەعیدەوە هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (عُودُوا الْمَرِيضَ، وَامشُوا مَعَ الجَنَازَةِ تُذَكِّرُكُمُ الآخِرَةَ) رواه أحمد ورجاله ثقات. واتە: سەر لەنەخۆش بدەن و لەگەڵ جەنازەدا برۆن چونکە ڕۆژی دواییتان بیر ئەخاتەوە.

٢- پەلە کردن لە بردنەکەی، بە پێی ئەوەی جەماعەت لە ئەبی هورەیرەوە ئەگێڕنەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (أسرِعُوا بِالجَنَازَةِ فَإن تَكُ صَالِحَةً فَخَيرٌ تُقَدِّمُونَهُ إلَيهِ، وَإن تَكُ سِوَى ذَلِكَ فَشَرٌّ تَضَعُونَهُ عَن رِقَابِكُم). واتە: پەلە لە جەنازە بکەن ئەگەر چاك بێت چاکەی لە گەڵدا ئەکەن، و ئەگەر وانەبوو شەڕێك لەکۆڵ خۆتان ئەخەن.

ئەحمەد و نەسائی و جگە لەوانیش ئەگێڕنەوە لە ئەبی بەکرەتەوە کە ووتوویەتی: ئەگەر چاوت لێمان ئەبوو چۆن لەگەڵ پێغەمبەردا ئەڕۆیشتین بە پەلە، هەروەك لۆقەمان بە تەرمەکە بکردایە وابوو.

بوخاری لە (التأريخ الكبير)دا ئەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ ئەوەندە پەلەی کرد هەتا نەعلەکانمان بچڕا ئەو ڕۆژەی سەعدی کوڕی موعاذ مرد.

خاوەنی (فتح) ووتوویەتی: سەرئەنجام ئەوەیە کە پەسەندە پەلە لە تەرم بکرێت بۆ بردنی بەرەو گۆڕستان، بەڵام بەمەرجێك خێراییەکە وانەبێت شتێکی خراپ بە سەر مردووەکەدا بێنێت یا ببێتە بارێکی گران بەسەر شانی هەڵگرەکانەوە، یا ئەوانەی لەگەڵیا ئەڕۆن، هەتا ئەوەی مەبەستە لە پاکو خاوێنی و ئەزیەت نەکردنی موسڵمان لەدەست نەچێت.

(قرطبي) ووتوویەتی: مەبەستی فەرموودەکە ئەوەیە کە مردوەکە لە ناشتن دوا نەخرێت، چونکە لەسەر خۆ ڕۆیشتن لەوانەیە ببێتە هۆی شانازی کردنو دەمار زلی.

---

(١) ئەگەر صەحابی بڵێت: ئەو شتە سونەتە حوکمی (رفع) بەرزکردنەوەی هەیە بۆ پێغەمبەر ﷺ.

٣- ڕۆیشتن لە بەردەم و دوواو لای ڕاست و لای چەپی تەرمەکەوە نزیك بوونەوە لێی. وە زانایان جیاوازیان هەیە لەسەر ئەوەی لە کام لایانەوە ئەبێت.

بەشی زۆری ئەهلی عیلم ئەوەیان هەڵبژاردووە کە ڕۆیشتن لە پێش تەرمەوە چاکترە، چونکە پێغەمبەر ﷺ و ئەبوبەکرو عومەر لە پێش تەرمەوە ئەڕۆیشتن. ئەحمەدو خاوەن سوننەکان گێڕاویانەتەوە.

حەنەفی‌یەکان ڕایان وایە کە مردو نێژەکان لە دووای تەرمەکەوە بڕۆن باشترە، چونکە لە فەرمانی پێغەمبەرەوە ﷺ وا دەردەکەوێت، وە شوێن کەوتوو ئەوکەسەیە کە لە دوایەوە ئەڕوات.

ئەنەسی کوڕی مالیك ڕای وایە کە هەموو لایەکان وەك یەکن، بە پێی ئەوەی لە پێشەوە باس کرا کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (الرَّاكِبُ يَسِيرُ خَلفَ الجَنَازَةِ، وَالمَاشِي يَمشِي خَلفَهَا وَأَمَامَهَا وَعَن يَمِينِهَا وَعَن يَسَارِهَا؛ قَرِيباً مِنهَا). واتە: سوار لە دوای تەرمەوە ئەڕوات، پیادەش لەدواوەو لە پێشەوە و لای ڕاستەوەو لای چەپەوەو نزیك لـێـیەوە ئەڕوات.

وا دەرئەکەوێت هەموو ڕایەکان جێیان ئەبێتەوە، وە ئەوە لەو جیاوازی‌یە ڕەوایانەیە کە پێویستە بەسەختی نەگیرێت.

لە (عبدالرحمن)ی کوڕی ئەبزاوە هاتووە کە ئەبوبەکرو عومەر پێش ئەکەوتن، بەڵام عەلی دوای تەرم ئەکەوت، پێیان ووت: ئەوان پێش ئەکەوتن، فەرموی: بەڕاستی هەردووکیان ئەیان زانی کە ڕۆیشتن لە دوای تەرمەوە چاکترە لە ڕۆیشتن لە پێشی‌یەوە، وەك چاکێتی نێوان نوێژی جەماعەت و تاك، بەڵام ئەوان کارئاسانن و لەبەر کارئاسانی بۆ خەڵك ئەمەیان ئەکرد. بەیهەقی‌و ئیبنوئەبی شەیبە گێڕاویانەتەوە. (حافظ) ووتوویەتی: سەنەدەکەی (حسن)ە.

بەڵام جومهوری زانایان بەڕێ کردنی مردو بە سواری بە کەراهەت دائەنێن، مەگەر مەعزەرەت هەبێت، بەڵام دوای ناشتنی و کاتی گەڕانەوە بەدروستیان داناوە بەبێ کەراهەت، بە پێی ئەوەی ثەوبان ئەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ تەرمێکدا بوو وڵاغێکیان بۆ هێنا سواری بێت، سواری نەبوو بەڵام کاتێ گەڕانەوە وڵاغێکیان بۆ هێنایەوە سواری بوو، لەو بارەیەوە پرسیاریان لـێ کرد فەرمووی: (إِنَّ المَلَائِكَةَ كَانَت تَمشِي فَلَم أَكُن لأَركَبَ وَهُم يَمشُونَ، فَلَمَّا ذَهَبُوا رَكِبتُ) رواه أبوداود والبيهقي والحاكم وقال: صحيح على شرط الشيخين. واتە: بەڕاستی فریشتەکان بە پیادەیی ئەڕۆیشتن نە ئەبوو من سوارم و ئەوان پیادە، بەڵام کاتێ ڕۆیشتن سواری وڵاغەکە بووم.

هەروەها پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ تەرمی ئیبنو دەحداحدا بە پیادە ئەڕۆیشت، کاتێ گەڕانەوە سوار ئەسپێك بوبوو. (ترمذي) گێڕاویەتی‌یەوە وە ووتویەتی: (حسن صحيح).

ئیتر ووتنی ئەوەی کە سورای کەراهەتی هەیە پێچەوانەی ئەو فەرموودەیە نییە کە ئەفەرموێت: (سوار لە دوای تەرمەکەوە بڕوات) چونکە ئەبێت پێغەمبەر بۆ ئەوەی فەرموبێت کەسورایش دروستە بەڵام کەراهەتی هەیە.

حەنەفی‌یەکان ڕایان وایە کە سواری خراپ نییە هەرچەندە بەپێ ڕۆیشتن چاکترە، ئەگەر هۆیەك نەبێت، وە سوننەتە سوار لەدوای جەنازەوە بڕوات لەبەر ئەو حەدیسەی باس کرا.

(خطابي) دەربارەی سواری ووتوویەتی: نەمزانیوە زانایان جیاوازی‌یان هەبێت لەوەدا کە ئەبێت سوار لە دوای تەرمەوە بڕوات.

**ئەو شتانەی کەراهەتی هەیە لەگەڵ تەرمدا بکرێت:**

کەراهەتی هەیە لەکاتی ئامادەبوونی تەرمێکدا یەکێك لەم کارانەی خوارەوە بکرێت:-

١- بەرزکردنەوەی دەنگ بەیادی خواو قورئان خوێندنو شتی تر، ئیبنو مونذیر ووتوویەتی: لە قەیسی کوڕی عوبادەوە ریوایەتمان کردوە کە ووتوویەتی: یارەکانی پێغەمبەر ﷺ بەرزکردنەوەی دەنگیان لە سێ کاتدا لا ناخۆش بوو: کاتی ئامادەبوونی تەرم، کاتی یادی خوا، وە کاتی جەنگ.

سەعیدی کوڕی موسەییبو سەعیدی کوڕی جوبەیرو حەسەن و نەخەعی و ئەحمەدو ئیسحاق لایان ناخۆش بووە کەسێك لە دوای تەرمێکەوە بوایەو بی‌ووتایە: داوای لێ خۆش بوونی بۆ بکەن.

ئەوزاعی ووتوویەتی: ئەوە (بدعة)ە داهێنراوە.

(فضیل)ی کوڕی عەمر ووتوویەتی: ئیبنو عومەر لە دوای تەرمێکەوە ئەڕۆیشت گوێی لێ بوو کابرایەك ئەی ووت: داوای لێ خۆش بوونی بۆ بکەن، ئیبنوعومەر پێی فەرمو: خوا لە تۆ خۆش نەبێت.

نەوەوی ووتوویەتی: بزانە ڕاست ئەوەیە کە پێشینان لەسەری بوون، ئەویش بێ‌دەنگی‌یە کاتی ڕۆیشتن بەدوای تەرمەوە، وە نابێت دەنگ بەرز بکرێتەوە بە خوێندنی قورئان و یادی خوا کردن، چونکە ئەو شێوەیە بۆ دڵی ئەو کەسەو ئارامترە و زیاتر بیری لای ئەو شتانە ئەبێت کە پەیوەندی بە جەنازەکەوە هەیە، وە هەر ئەوەش پێویستە لەوحاڵەتەدا، جا ئەم قسەیەش هەق‌و ڕاستە، ئیتر بە زۆری ئەو کەسانە کە پێچەوانەی ئەکەن فریو مەخۆ.

ئەوەی کە نەزانەکان ئەی کەن بەوەی کە قورئان ئەخوێنن لەسەر جەنازەو درێژی ئەکەنەوەو مانای ووشەکان ئەگۆڕن، ئەوە حەرامە بە ئیجماعی زانایان.

شێخ محمد عبده فەتوایەکی هەیە، دەربارەی بەرزکردنەوەی دەنگ بەیادی خوا، ووتویەتی: یادی خوا کردن بە دەنگی بەرز لە بەردەم تەرمەکەدا لە (الفتح) دا هاتووە لە بابی جەنائیزدا: کە کەراهەتی هەیە کەسێك لە دووای تەرمەوە بڕوات و دەنگی بە یادی خوا بەرز بکاتەوە، وە ئەگەر کەسێك ویستی یادی خوا بکات با لەبەر خۆیەوە بێ دەنگ هەڵبڕین یادی بکات، چونکە ئەو دەنگ هەڵبڕینە کارێکی تازە داهێنراوە

نه لەسەردەمی پێغەمبەردا ﷺ کراوە، نەلەسەردەمی یارەکانیدا، وە نە لەسەردەمی شوێن کەوتوانی لە صەحابی و تابیعیندا، لەبەر ئەوە پێویستە بەری ئەم کارە بگیرێ.

**٢-نابێت ئاگر دووای جەنازە بخرێت:**

چونکە ئەو کارە کاری سەردەمی نەفامییە.

(ابن المنذر) ووتویەتی: هەرچی زانستی لێوە لەبەر کراوە لە زانایان ئەو کارەیان لا خراپە.

بەیهەقی ووتویەتی: لە وەسیەتی عائیشەو عوبادەی کوڕی صامت و ئەبوهورەیرەوەو ئەبوسەعیدی خوردی و ئەسمائی کچی ئەبو بەکردا ڕەزای خوایان لێ بێت هاتووە کە فەرمویانە: شوێن تەرمەکەم مەکەون بە ئاگرەوە، وە ئیبنو ماجە ریوایەتی کردوە کە ئەبو موسای ئەشعەری کاتێك لە سەرەمەرگدا بووە فەرمویەتی: بە ئاگرو بخور شوێنم مەکەون بۆ سەر قەبران. ووتیان: شتێکتان لەو بارەیەوە بیستووە؟ فەرموی: بەڵێ لە پێغەمبەرم ﷺ بیستووە[1].

بەڵام ئەگەر ناشتنەکە لە شەودا بوو پێویستی بە ڕوناکی هەبوو ئەو کاتە خراپ نیيە.

(ترمذي) لە ئیبنوعەبباسەوە ئەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ شەوێك بۆ ناشتنی تەرمێك چووە ناو گۆڕێکەوە چرایەکیان بۆ داگیرساند، وە ووتوویەتی: حەدیسەکەی ئیبنو عەبباس (حسن)ە.

**٣- دانیشتنی شوێن کەوتوانی پێش دانانی تەرمەکە لەسەر زەوی:**

بوخاری ووتوویەتی: هەرکەس شوێن تەرمێك بکەوێت بادانەنیشێت هەتا تەرمەکە لەسەر شانی پیاوەکان دائەنرێت، وە ئەگەر کەسێك دانیشتبوو نەبێ هەڵبسێنرێت.

پاشان لە ئەبی سەعیدی خودرییەوە ئەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (إذَا رَأَيْتُمُ الجَنَازَةَ فَقُومُوا. فَمَن تَبِعَهَا فَلا يَقعُد حَتَّى تُوضَعَ). واتە: ئەگەر تەرمێکتان بینی هەڵسنە سەرپێ، جا هەرکەس شوێنی کەوتبێت هەتا دائەنرێت با دانەنیشێت.

ریوایەت کراوە لە سەعیدی مەقبورییەوە لە باوکی ووتویەتی: بەدوای تەرمێکەوە ئەڕۆیشتین کاتێ گەیشتینە گۆڕستانەکە ئەبو هورەیرە دەستی مەروانی گرت و دانیشتن پێش ئەوەی تەرمەکە دابنرێت، ئەبو سەعید خوا لێی ڕازی بێت هات و دەستی مەروانی گرت و پێی فەرموو: هەڵسە، سوێند بە خوا ئەبو هورەیرە ئەزانێت کە پێغەمبەر ﷺ ئەوەی لێ قەدەغە ئەکردین، ئەبوهورەیرە فەرموی: ڕاست ئەکات. حاکم گێڕاویەتیەوە و ئەمەشی بۆ زیاد کردووە ئەڵێت: کاتێ ئەبو سەعید بەمەروانی ووت هەڵسە، هەڵساو ووتی: بۆچی هەڵت ساندم؟ ئەویش حەدیسەکەی بۆ باس کرد، پاشان مەروان بە ئەبو هورەیرەی فەرموو: چی ڕێی لێ گرتی پێم ڕابگەیەنیت؟ فەرموی: تۆ پێشەوا بویت و دانیشتی، منیش دانیشتم

(١) لە ئیسنادەکەی ئەبو حەریزی مەولای موعاوییە هەیە کە نەناسراوە.

لەگەڵتا؛ ئەمەش بۆچونی بەشی زۆری صەحابەو تابیعی‌یەکان و حەنەفی‌یەکان و حەنبەلی‌یەکان و ئەوزاعی و ئیسحاقە.

شافیعی‌یەکان ئەڵێن: دانیشتن بۆ مردونێژەکان پێش دانانی تەرمەکە کەراهەتی نی‌یە. بەڵام لەسەر ئەوە ڕێکن کە هەرکەس پێش تەرمەکە بکەوێت و هەتا ئەگەنە لای دابنیشێت قەیناکە، (ترمذي) ووتوویەتی: لە هەندێ لە زانایانی صەحابەوەو لە کەسانی تریشەوە گێڕدراوەتەوە کە ئەوان پێش تەرمەکە ئەگەیشتنە سەر گۆڕەکەو دائەنیشتن.

ئەمەش قسەی شافیعی‌یە: کاتێك تەرمەکە هات و ئەو دانیشتبوو با لە بەری هەڵنەسێت. وە لە ئەحمەدەوە هاتوە کە ووتوویەتی: ئەگەر هەڵسا عەیبی لێ ناگرم، ئەگەر هەڵیش نەسا ئەوە قەیناکە.

٤- هەڵسان لەبەر جەنازە لە کاتی تێپەڕبوونیدا:

بە پێی ئەوەی ئەحمەد ئەگێڕێتەوە لە واقیدی کوڕی عەمری کوڕی سەعدی کوڕی موعاذەوە کە ووتوویەتی: حازری تەرمێکی بەنی سەلەمە بووم، جا کە تەرمەکەیان هێنا هەڵسام، نافیعی کوڕی جوبەیر ووتی: دانیشە من ئێستا شتێکت لەم بارەیەوە بۆ ئەگێڕمەوە کە بەڵگەیە: مەحمودی کوڕی حاکمی زورقی بۆی گێڕامەوە کە گوێی لە عەلی کوڕی ئەبی طالب بووە خوا لێی ڕازی بێت فەرمویەتی: پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێ ئەکردین کە لە بەر تەرم هەڵسین ئێمەش هەڵئەساین. پاشان خۆی وازی لەوە هێناو هەڵنەئەستا، وە فەرمانی بە ئێمەش کرد کە هەڵنەستین. موسلیم بەم لەفزە هێناویەتی: بینیمان پێغەمبەر ﷺ هەڵئەستا ئێمەش هەڵساین، جا ئەو دانیشت ئێمەش دانیشتین، واتە: لەبەر جەنازە.

(ترمذي) ووتوویەتی: حەدیسەکەی عەلی حەسەن و صەحیحە، چوار تابیعی تێدایە یەك لە یەکی ئەگێڕنەوە، وە لای هەندێ لە زانایان کار بەوە ئەکرێت.

شافیعی ئەڵێت: ئەوە ڕاسترین شتە کە لەو بارەیەوە هاتووە.

ئەم حەدیسە ناسخی حەدیسەکەی یەکەمە کە ئەفەرموێت: (إِذَا رَأَيْتُمُ الْجَنَازَةَ فَقُومُوا). واتە: کاتێ تەرمێکتان بینی لەبەری هەڵسن.

ئەحمەد ووتوویەتی: ئەو کەسە ئارەزوی خۆیەتی هەڵئەسێت یان نا، وە بەڵگەشی ئەوەیە کە لە پێغەمبەرەوە گێڕاویانەتەوە کە لە پێشەوە هەڵئەسا پاشان هەڵنەئەسا. ئیسحاقی کوڕی ئیبراهیمیش وەهای ووتوە، وە لەگەڵ ئەحمەدو ئیسحاقی کوڕی حەبیب و ئیبنوماجیشون لە مالیکی‌یەکان ڕێکن لەسەر ئەوە.

نەوەوی ووتوویەتی: هەڵبژێرراو لەوبارەیەوە ئەوەیە کە هەڵسان لە بەر تەرم پەسەندە، خاوەن مەزهەب و (متولی)ش هەر ئەوە ئەڵێن.

ئیبنوحەزم ووتوویەتی: هەرکەس تەرمێکی بینی پەسەندە لە بەری هەڵسێت، ئەگەر تەرمی بێ بڕوایەکیش بێت هەتا دائەنرێت یا تێ ئەپەڕێت، یان دوای کەوێت، جا ئەگەر هەڵیش نەسێت قەیناکە، ئەوانەی ئەڵێن پەسەندە بەڵگەیان ئەوەیە کە جەماعەت لە ئیبنوعومەرەوە لە عامیری کوڕی رەبیعەوە ئەگێڕنەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (إذَا رَأيتُمُ الجَنَازَةَ فَقُومُوا لَهَا حَتَّى تُخَلِّفَكُم أو تُوضَعَ). واتە: ئەگەر تەرمێکتان بینی لە بەری هەڵسن هەتا تێ ئەپەڕێ لێتان یا دائەنرێت.

لە لای ئەحمەد هاتووە: ئیبنو عومەر هەر تەرمێکی ئەبینی لە بەری هەڵئەسا هەتا تێئەپەڕی، وە بوخاریو موسلیم لە سەهلی کوڕی حونەیف و قەیسی کوڕی سەعدەوە ئەگێڕنەوە کە هەردوکیان لە قادسیە دانیشتبوون، تەرمێکیان بەلایاندا تێپەڕاند، ئەوانیش هەڵسان، پێیان ووترا: ئەو جەنازەیە لە ئەهلی زیمە بوو. ووتیان: پێغەمبەر ﷺ تەرمێکی بەلادا تێپەڕی هەڵسا، وتیان: ئەوە تەرمی جوولەکە بوو. فەرمووی: (أوَلَيسَت نَفساً) ئایا ئەویش نەفسێك نەبووە؟

لە لای بوخاری لە ئەبی لەیلاوە هاتووە ووتوویەتی: ئیبنومەسعودو قەیس لە بەر تەرم هەڵئەسان، وە حیکمەت لە هەڵسان ئەوەیە: کە لە ریوایەتی ئەحمەدو ئیبنوحیببان و حاکیم دا هاتووە لە حەدیسی عەبدوللای کوڕی عەمرەوە بەمەرفوعی: (إنَّمَا تَقُومُونَ إعظَاماً لِلَّذِي يَقبِضُ النُّفُوسَ). واتە: تەنها بۆیە هەڵئەسن لەبەر گەورەیی ئەوەی گیانەکان ئەکێشێ، وە لە ڕیوایەتەکەی ئیبنو حیبباندا هاتووە ئەفەرموێت : (إعظَاماً للهِ تَعَالَى يَقبِضُ الأروَاحَ). واتە: لەبەر گەورەیی خوای گەورە کە گیانەکان ئەکێشێت.

بەکورتی ئەڵێین: زانایان لەم کێشەیەدا جیاوازییان هەیە هەندێکیان بۆ ئەوە چوون کە کەڕاهەتی هەیە هەڵسان لەبەر تەرم، وە هەندێکی تریان بۆ ئەوە چون کە پەسەندە، وە هەندێکی تریان ڕایان وایە هەرکەس ئارەزووی خۆیەتی هەڵئەسێت یان نا، وە هەریەکەیان بەڵگەو بۆچونی خۆی هەیە.

موکەللەفیش بەرامبەر ئەم ڕایانە چی پێی دڵنیا بو ئەتوانێت هەڵی بژێرێت. –وە خواش زاناترە–.

**٥- ڕۆیشتنی ئافرەتان بە شوێن تەرمدا:**

بەپێی حەدیسی ئوموعەطیە کە ووتویەتی: لێمان قەدەغەکرابوو شوێن تەرم بکەوین، بەڵام زۆریان لێ نە ئەکردین[١]، ئەحمەدو بوخاری و موسلیم و ئیبنوماجە گێڕاویانەتەوە.

---

(١) حافظ لە (فتح)دا ئەڵێت: واتە زۆریان لێ نەکردین کە نەچین، وەك چۆن لە شتە قەدەغەکراوەکانی تردا زۆریان لێ ئەکردین، وەك ئەوەی بڵێت بە کەڕاهەتیان دائەنا شوێن تەرم بکەوین بێ ئەوەی حەرامی بکەن، وە (قرطبي) ووتوویەتی: ڕواڵەتی قسەکەی ئومو عەطیە ئەوەیە ئەو کەڕاهەتە کەڕاهەتی تەنزیهە، وە جەماوەری زانایانیش هەر ئەوە ئەڵێن.

لە عەبدوڵڵای کوڕی عەمرەوە هاتوە ووتوویەتی: جارێك لە خزمەتی پێغەمبەردا ﷺ ئەڕۆیشتین، ئافرەتێکی بینی باوەڕناکەین ناسیبێتی، کاتێ بەرەو ڕێگاکە ڕۆیشتین پێغەمبەر ڕاوەستا هەتا پێمان گەیشت، سەیرمان کرد فاتیمەیە خوای لێ ڕازی بێت، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: فاتیمە چی تۆی لەماڵەوە هێناوەتەدەر؟ ووتی: هاتم بۆ ئەم ماڵە بەزەییم پێیاندا هاتەوە سەرەخۆشیم لێ کردن، فەرموی: لەوانەیە گەیشتبیتە گۆڕستانەکە؟ ووتی: پەنا بەخوا من لەوانە بم مردووەکەم گەیاندبێتە گۆڕستان لەگەڵیاندا، چونکە گوێم لێت بووە لەو بارەیەوە چیت باس کردووە، فەرمووی: ئەگەر بگەیشتیتایە گۆڕستان بەهەشتت نەئەدی هەتا باپیرەی باوکت ئەی دیبایە. ئەحمەدو حاکمو نسائی و بەیهەقی گێڕاویانەتەوە.

زانایان تانەیان لەم حەدیسە داوە ووتوویانە ڕاست نیە چونکە لە سەنەدەکەیا ڕەبیعەی کوڕی یوسف هەیە حەدیسی لاوازەو حەدیثی مونکەری لا هەیە.

ئیبنوماجە و حاکم ئەگێڕنەوە لە موحەممەدی کوڕی حەنەفیەوە لە عەلیەوە خوایان لێ ڕازی بێت ووتوویەتی: پێغەمبەر ﷺ هاتە دەر بینی کۆمەڵێك ئافرت دانیشتوون فەرمووی: چی ئێوەی دانیشاندووە لێرە؟ ووتیان: چاوەڕوانی تەرمێك ئەکەین، فەرمووی: ئێوە ئەی شۆرن؟ ووتیان: نەء، فەرمووی: ئەی هەڵی ئەگرن؟ ووتیان: نەء، فەرموی: ئەی ئەی نێژن لەگەڵیان؟ ووتیان: نەء، فەرمووی: دە بە گوناهەوە بگەڕێنەوە نەك بە پاداشتەوە.

لە ئیسنادەکەیدا دیناری کوڕی عومەر هەیە ئەبو حاتیم ووتوویەتی: پیاوێکی مەشهورو ناسراو نیە، ئەزدی ووتویەتی: واز لێ هێنراوە: خەلیلی لە ئیرشادا ووتویەتی: درۆزنە.

ئەوەش مەزهەبی ئیبنومەسعودو ئیبنوعومەرو ئەبوئومامەو عائیشەو مەسروق و حەسەن و نەخەعی و ئەوزاعی و ئیسحاق و حەنەفیەکان و شافیعیەکان و حەنبەلیەکانە.

---

مالیك بەلای ئەوەوە مەیلی هەیە کە دروستە، ئەمەش قسەی خەڵکی مەدینەیە، وە بەڵگەی دروستی ئەوەیە: کە ئیبنوئەبی شەیبە لە ڕێگای (محمد)ی کوڕی عەمری کوڕی عەطائەوە لە ئەبی هورەیرەوە ئەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر لەگەڵ تەرمێکدا بوو، عومەر ژنێکی بینی دەنگی دا، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: وازی لێ بهێنەی ئەی عومەر... ئەم حەدیسە ئیبنوماجەو نسائی لەم ڕووەوە تەخریجیان کردووە، وە ڕێگایەکی تری هەیە لە محمدی کوڕی عەمری کوڕی عەطائەوە لە سەلەمەی کوڕی ئەزرەقەوە لە ئەبی هورەیرەوە، وە پیاوەکانی سیقەن، موهەللەب ووتوویەتی: حەدیسەکەی ئومو عەطیە ئەوە ئەگەیەنێت کە قەدەغەکردن لەلایەن یاسادانەرەوە بە چەند پلە بوە. -تەواو-.

له لای مالیك هاتووه كه چوونی پیرەژنی بۆ گۆڕستان بەخراپ دانەناوه، وه هەروەها چونی ئافرەتی گەنج لەگەڵ جەنازەی كەسێك كه موسیبەتەكەی گەوره بێت بۆی، به مەرجێك داپۆشراو بێت و بەدەرچوونەكەی تووشی فیتنه نەبێت.

ئیبنو حەزم ڕای وایه: ئەوەی جومهور لەم بارەیەوه كردویانەته بەڵگه ڕاست نییه، وه دروسته ئافرەت شوێن تەرم بكەوێت.

وه ئەڵێت: بەخراپی نازانین ئافرەت شوێن تەرم بكەوێت، وه بەرگری ئەوەیان لێ ناكەین؛ وه دەربارەی قەدەغەیی ئەوه چەند ئەسەرێك هاتووه هیچیان ڕاست نین، چونكه یا مورسەله یا له نەناسراوەوەیه، یا له كەسێكەوەیه كه ناكرێته بەڵگە؛ پاشان حەدیسەكەی ئومو عەطییەی پێشەوەی باس كردووه و دەربارەی ووتوویەتی: ئەگەر به سەندیش صەحیح بێت هیچ بەڵگەی قەدەغەیی تێدا نیه، بەڵكو تەنها لەبەر كەراهەت بووه، وه پێچەوانەی ئەمه ڕیوایەتی صەحیح هاتووه، وەك گێڕاومانەتەوه له ڕێگای شوعبەوه: له وەكیعەوه له هیشامی كوڕی عورووەوه له وەهبی كوڕی كەیسانەوه له موحەممەدی كوڕی عەمری كوڕی عەطائەوه له ئەبی هورەیرەوه كه پێغەمبەر ﷺ ئامادەی ناشتنی تەرمێك بوو، عومەریش ئافرەتێكی لەگەڵدا بینی، هاواری لێ كردو دەنگی دا، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (دَعهَا يَاعُمَرُ فَإنَّ العَينَ دَامِعَةٌ، وَالنَّفسَ مُصَابَةٌ، وَالعَهدَ قَرِيب)[1]. واته: وازی لێ بهێنه ئەی عومەر، چونكه چاو پڕ له فرمێسكەو دڵو دەروون بریندارە، كارەساتەكەش تازەیه.

هەروەها ئەڵێت: له ئیبنو عەبباسەوه به صحیحی هاتووه كه به خراپی دانەناوه ئافرەت دوای تەرم بكەوێت.

**تەرم بەجێ هێشتن لەبەر بوونی كارێكی (مونكەر) خراپ:**

خاوەنی كتێبی (المغني) ووتوویەتی: ئەگەر كەسێك لەگەڵ تەرمێكدا ڕۆیشت و كارێكی خراپی بینی یا بیستی، ئەوه ئەگەر توانای بەرگری لێ كردنو لابردنی هەبوو با نەیەڵێت بكرێت، بەڵام ئەگەر توانای لابردنی نەبوو، ئەوه دوو ڕووی هەیه:-

یەكەمیان: با لای ناخۆش بێتو ئینكاری لێ بكات و بەجێی نەهێڵێت و هەر بەشوێنییەوه بێت، جا ئەوەی لەسەری فەرزه به ئینكاری كردنەكە لەسەر خۆی لای ئەبات، و حەقێك واز لێ نەهێنێ بۆ شتێكی باتڵ.

(١) ئیسنادی ئەم حەدیسه صەحیحه.

دووەم: ئەو کەسە ئەگەڕێتەوە لەگەڵ ئەو تەرمەدا ناڕوات، چونکە چوونی ئەبێتە هۆی بیستن و بینینی خراپە، لەگەڵ ئەوەدا کە ئەتوانێ ئەوە واز لێ بهێنێت و نەچێت.

## ناشتنی مردوو (دفن)

### ١-حوکمەکەی:

موسڵمانان کۆن لەسەر ئەوەی کە مردو ناشتن و شاردنەوەی لاشەکەی فەرزی کیفایەتە، ئەگەر چەند کەسێك پێی هەڵسان لە کۆڵ ئەوانی تر ئەکەوێت، خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿أَلَمۡ نَجۡعَلِ ٱلۡأَرۡضَ كِفَاتًا ۝ أَحۡيَآءٗ وَأَمۡوَٰتٗا﴾ (المرسلات/٢٥-٢٦). واتە: ئایا زەویمان نەکردۆتە جێی کۆبونەوەی بەشەر بۆ زیندوان و بۆ مردوان.

### ٢- ناشتنی مردوو بەشەو :

جومهوری زانایان ڕایان وایە کە ناشتنی مردوو بە شەو بێت یا بەڕۆژ وەك یەکە، چونکە پێغەمبەر ﷺ ئەو پیاوەی کە دەنگی بە زیکری خوا بەرز ئەکردەوە لەشەودا ناشتی، وەعەلی فاطمەی لە شەودا ناشت خوا لێی ڕازی بێت، وە هەروەها ئەبوبەکرو عوسمان و عائیشەو ئیبنو مەسعود بەشەو نێژراون.

لە ئیبنو عەبباسەوە هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ شەوێك چووە ناو گۆڕێکەوە و چرایان بۆ داگیرساند، پاشان لاشەکەی لای قیبلەوە وەرگرت و فەرموی: (رَحِمَكَ اللهُ إن كُنتَ لأوّاهاً تلّاءً لِلقرآنِ) واتە: خوا ڕەحمەت پێ بکات، چونکە پیاوێکی زۆر لە خوا ترس و زۆر قورئان خوێن بووی، وە چوار (الله اكبر)ی لەسەر کرد. (ترمذي) گێڕاویەتیەوە و ووتوویەتی: حەدیسێکی (حسن)ە. وە ووتوویەتی: بەشی زۆری زانایان ڕێیان داوە مردو بەشەو بنێژرێت.

ئەو ناشتنەش کاتێك دروستە کە هیچ مافێکی ئەو مردووە لە دەست نەچێت و نوێژی لەسەر بکرێت، بەڵام ئەگەر بەو ناشتنە لەو کاتەدا مافەکانی بەجێ نەهات و نوێژی لەسەر نەکرا، ئەوە دانەری یاسای ئیسلام نەهی لێ کردوەو بەکەراهەتی داناوە.

موسلیم ئەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ ڕۆژێك ووتاری داوە باسی یەکێك لە یارەکانی کردوە کە کاتێ خۆی مردووە و کفن کراوە بە کفنێکی ناتەواو بەشەو نێژراوە، جا پێغەمبەر ﷺ مەنعی ئەوەی کرد کە پیاو بەشەو بنێژرێت مەگەر کەسێك ناچار بێت ئەو کارە بکات.

ئیبنوماجە لە جابیرەوە ئەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (لاتَدفِنُوا مَوتَاكُم بِاللَّيلِ، إلا أن تُضطَرُّوا). واتە: مردووەکانتان بەشەو مەنێژن مەگەر لەبەر ناچاری نەبێت.

**٣- ناشتن له كاتى خۆر هەڵاتن و كاتى (إستواء) و خۆر ئاوا بووندا:**

زانایان لەسەر ئەوە رێك كەوتوون كە ئەگەر ترسی تێك چوونی مردووەكە هەبوو لەو سێ كاتەدا ئەنێژرێت بێ ئەوەی كەراهەتی هەبێت، بەڵام ئەگەر ترسی تێك چوونی لە ئارادا نەبوو، ئەوە هەر دروستە لەو كاتانەدا بنێژرێت لای جومهوری زانایان، بەمەرجێك قەستی تێدا نەبێت، چونكە ئەگەر بەقەستی بوو ئەوە كەراهەتی هەیە.

بەپێی ئەوەی ئەحمەدو موسلیم و خاوەن سونەنەكان ئەگێڕنەوە لە عوقبەوە كە ووتویەتی: سێ كات پێغەمبەر ﷺ لێی قەدەغە ئەكردین نوێژی تێدا بكەین و مردووەكانمانی تێدا بنێژین: كاتێ خۆر هەڵدێ هەتا تەواو بەرز ئەبێتەوە، وە كاتێ خۆر ئەگاتە ناوەڕاستی ئاسمان هەتا لائەبێتەوە بەلای خۆرئاوادا، و كاتێ خۆر بەرەو ئاوا بوون ئەچێت هەتا ئاوا ئەبێت.

حەنبەلی‌یەكان ووتویانە: كەراهەتی هەیە مردوو لەم كاتانەدا بنێژرێت بە موتڵەقی لەبەر ئەو فەرموودەیەی كە باس كرا.

**٤- پەسەندی قوڵ كردنی گۆڕ:**

مەبەست لە ناشتنی مردو ئەوەیە كە بشاررێتەوە لە چاڵێكدا بۆ ئەوەی بۆنەكەی نەیەتە دەرەوە، وە رێ گری باڵندەو دڕندە بێت لەو مردووە.

جا بەهەر شێوەیەك ئەو مەبەستە بەجێ هات ئەوە فەرزەكەی پێ هاتۆتە دی و واجبی پێ تەواو بووە، بەڵام ئەبێ گۆڕ ئەوەندەی باڵا پیاوێك قوڵ بكرێت، بەپێی ئەوەی نسائی و (ترمذي) كە بە صەحیحی داناوە ئەگێڕنەوە لە هیشامی كوڕی عامیرەوە ووتوویەتی: لە كاتی جەنگی ئوحودا هاوارمان برد بۆ لای پێغەمبەر ﷺ، ووتمان ئەی نێرراوی خوا هەڵكەندنی گۆڕێك بۆ هەر شەهیدێك بارێكی گرانە لەسەرمان، ئیتر پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (أُحفُرُوا، وَأَعمِقُوا، وَأَحسِنُوا وَادفِنُوا الإِثنَينِ وَالثَّلاثَةَ فِي قَبرٍ وَاحِدٍ). واتە: گۆڕ هەڵكەنن و قوڵی بكەن بەچاكی و دوو دوو سێ سێ بخەنە گۆڕێكەوە. ووتیان: كامیان پێش بخەین ئەی نێراوی خوا فەرمووی: (قدموا أكثرهم قرآناً) واتە: كامیان قورئانی زۆر تر لەبەر بوو ئەوەیان پێش بخەن، ئەڵێت: باوكم سێهەم كەس بوو لە گۆڕێكا.

ئیبنوئەبی شەیبەو ئیبنومونذیر ئەگێڕنەوە لە عومەرەوە كە فەرمویەتی: ئەوەندەی باڵای پیاوێك كە دەست بەرز بكاتەوە گۆڕەكە قوڵ بكەن و ئەوەندەی مردووەكەش فراوانی بكەن.

لە لای ئەبی حەنیفەو ئەحمەد گۆڕ ئەوەندەی نیو باڵای پیاو قوڵ ئەكرێت، وە ئەگەر لەوە زیاتر بێت چاكترە.

**٥- لادڕ چاكترە لە هەڵكەندن:**

لادرِ (اللحد) ئەو هەڵکەندنەیە لە تەنیشتی گۆڕەکەوە لەلای قیبلەوە ئەکرێت، و بە خشت هەڵ ئەچنرێت، جا وەك خانووی سەرگیراوی لێ دێت، بەڵام چاڵ کردن (الشق) چاڵێکە لە ناوەڕاستی گۆڕەکەداو ئەم لاولای بەخشت هەڵئەچنرێت و مردووەکەی تێ ئەخرێت و پاشان سەری بۆ ئەکرێت بە بەرد یا بەشتی تر (وەك گۆڕی لای خۆمان)، جا هەردوو شێوەکە دروستە، بەڵام لادرِ چاکترە.

بەپێی ئەوەی ئەحمەدو ئیبنو ماجە لەئەنەسەوە ئەگێڕنەوە فەرمویەتی: کاتێ پێغەمبەر ﷺ کۆچی دوایی کرد کابرایەك هەبوو لادرِی ئەکرد و کابرایەکی تر هەبوو چاڵی ئەکرد ووتیان: (إستخارة) داوائەکەین لە پەروەردگاری خۆمان کامەیان چاکە ئەوەیانمان بۆ جێبەجێ بکات، ئێمە جواب بۆ هەردوکیان ئەنێرین جا کامیان زووهات ئەوەیانی بۆ ئەکەین، کاتێ ناردیان ئەوەی لادرِەکەی ئەکرد زووتر گەیشت ئیتر لادرِیان بۆ کرد.

ئەمەش ئەوە ئەگەیەنێت کە هەردوو شێوەیەکە دروستە، بەڵام لادرِ لەپێشترە، بەڵگەش ئەوەیە کە ئەحمەدو خاوەن سونەنەکان ئەگێڕنەوە لە ئیبنوعەبباسەوە ووتوویەتی: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (اللَّحدُ لَنَا، وَالشَّقُّ لِغَيرِنَا) واتە: لادرِ هەڵکەندنی گۆڕ هی ئێمەیە –واتە موسڵمانان– و (شق) چاڵ کردن هی غەیری ئێمەیە. (ترمذی) ئەم حەدیسەی بە (حسن) داناوە.

٦- شێوەی مردوو خستنە ناو گۆڕ:

ئەوەی سوننەت بێت بۆ مردوو خستنە ناو گۆڕ، ئەوەیە کە لەپێش دا قاچەکانی دابهێڵرێتە ناو گۆڕەکەوە ئەگەر توانرا، بەپێی ئەوەی ئەبو داوودو ئیبنو ئەبی شەیبەو بەیهەقی ئەگێڕنەوە لە عەبدوڵڵای کوڕی زەیدەوە کە مردوویەکی خستە ناو گۆڕەوە لە پێشدا قاچەکانی بردە ناو گۆڕەکەوەو فەرموی: ئەمە سوننەتە، بەڵام ئەگەر نەتوانرا چۆن لوا وا بخرێتە ناو گۆڕەکەوە.

ئیبنوحەزم ووتوویەتی: چۆن لوا وەها مردوو ئەخرێتە ناو گۆڕەوە، یالای قیبلەوە یا لە پاش قیبلەوە، یا لای سەریەوە، یا لەلای قاچییەوە، چونکە دەقێك نەهاتووە لەو بارەیەوە.

٧- پەسەندی روو پێ کردنی مردوو بۆلای قیبلە لە گۆڕەکەیداو پاڕانەوە بۆیو کردنەوەی گرێی کفنەکە:

ئەو سوننەتەی کە کاری لەسەر ڕۆیشتووە ئەوەیە کە مردووەکە لە گۆڕەکەدا لەسەر لای ڕاست دائەنرێت و ڕوی ئەکرێتە قیبلە، وە دانەر ئەڵێت: (بِسمِ اللهِ وَعَلَى مِلَّةِ رَسُولِ اللهِ، أو: وَعَلَى سُنَّةِ رَسُولِ الله). پاشان گرێی کفنەکە ئەکرێتەوە، چونکە لە ئیبنوعومەرەوە خوا لێیان ڕازی بێت هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ: هەرکاتێك مردو بخرایەتە ناوگۆڕ ئەیفەرمو: (بِسمِ اللهِ وَعَلَى مِلَّةِ رَسُولِ اللهِ، أو: وَعَلَى سُنَّةِ رَسُولِ الله). رواه أحمد وأبوداود والترمذي وابن ماجة، ورواه النسائي مسنداً وموقوفاً.

**٨-خراپی دانانی پۆشاك لەناو گۆڕدا:**

جەماوەری زانایان بە خراپیان داناوە دانانی پۆشاك یا سەرین و ئەو جۆرە شتانە بۆ مردوو لەناو گۆڕدا، وە ئیبنو حەزم ڕای وایە: کە قەیناکە جل ڕابخرێت لەژێر مردو لەناو گۆڕدا.

بە پێی ئەوەی موسلیم لە ئیبنو عەبباسەوە ئەگێڕێتەوە کە فەرمویەتی: لەناو گۆڕەکەی پێغەمبەر ﷺ قەتیفەیەکی سور ڕاخرا، وە فەرمویەتی: خوا وازی لەوکارە هێنا کاتی ناشتنی پێغەمبەرە مەعصومەکەی و لێی قەدەغە نەکرد، وە چاکترین کەسانی سەرزەوی لەوکاتەدا ئەو کارەیان کردووە بە ڕای هەموویان و کەسیان ئینکاریان لێ نەکرد.

زانایان بە پەسەندی دائەنێن کە خشتێك یا بەردێك بخرێتە ژێر سەری مردووەکە یا کۆمەڵێك گڵ و ڕومەتی ڕاستی بخرێتە سەر خشتەکەیا ئەو شتەی لە ژێر سەریا دانراوە، پاش ئەوەی کفنەکە لەسەر ڕومەتی لائەبرێت و ئەخرێتە سەر گڵ.

عومەر فەرمویەتی: ئەگەر منتان خستە ناو گۆڕەوە، ڕومەتم بخەنە سەر گڵەکە، وە (ضحاك) وەسیەتی کرد و ڕای سپارد کەگرێ کانی کفنەکەی بکەنەوەو دەموچاوی لە کفنەکەوە دەربهێنن.

وە بەپەسەندیان داناوە پاڵپشتێکی بۆ دابنرێت بە خشت یان یا بە گڵ، بۆ ئەوەی نەکەوێتە سەر پشت.

مالیك و ئەحمەد و ئەبوحەنیفە بە پەسەندیان داناوە پۆشاکێك بەسەر گۆڕەکەدا بدرێت ئەگەر هاتوو مردوەکە ئافرەت بوو، بەڵام بۆ پیاو پێویست ناکات، وە شافیعیەکان بە پەسەندیی‌یان داناوە ئەو کارە بکرێت بۆ ژن و پیاو.

**٩- پەسەندیەتی کردنی سێ مشت گڵ بە سەر گۆڕەکەیدا:**

پەسەندە بۆ ئەو کەسەی ئامادەی ناشتنی مردوەکە ئەبێت سێ مست گڵ هەڵدات بۆ گۆڕەکە لای سەری مردووەکەوە، بە پێی ئەوەی ئیبنوماجە ئەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ نوێژی لەسەر جنازەیەك کرد، پاشان هات بۆلای گۆڕەکە و سێ مست گڵی هەڵدا بۆ سەر گۆڕەکە، کەلای سەری مردوەکەوە بوو.

سێ پێشەوا ئاییینی‌یەکان بە پەسەندیان داناوە کاتی مستی یەکەم بڵێت: ﴿مِنْهَا خَلَقْنَاكُمْ﴾ واتە: لەو گڵە دروستمان کردوون، وەلە دووەمدا بڵێت: ﴿وَفِيهَا نُعِيدُكُمْ﴾ واتە: وە بۆ ناو گڵ ئەتان گێڕینەوە، وە لە سێیەمدا بڵێت: ﴿وَمِنْهَا نُخْرِجُكُمْ تَارَةً أُخْرَى﴾ واتە: وە هەر لەو گڵە جارێکی تر دەرتان ئەهێنینەوە، چونکە پێغەمبەر ﷺ وای فەرموو کاتێ ئومو کەلسومی کچی ناشتووە. ئەحمەد ووتوویەتی: پێویست نیە هیچ بوترێت کاتی هەڵدانی گڵەکە لە بەر لاوازی حەدیسەکە.

**١٠- پەسەندی‌یەتی پاڕانەوە بۆ مردووەکە دوای ناشتنی:**

پەسەندە دوای ئەوەی کە مردووەکە ئەنێژرێت داوای لێ خۆش بوونی بۆ بکرێت، وە هەروەها داوای سابت بوون‌و چەسپاوی لە وەڵامدا بۆ بکرێت، چونکە لەوکاتەدا لێی ئەپرسرێتەوە (دوای ناشتنی).

لە عوسمانەوە خوای لێ ڕازی بێت هاتوە کە پێغەمبەر ﷺ کاتێ لە ناشتنی مردوو ئەبوەوە لەسەری ئەوەستاو ئەیفەرموو: (إستَغفِرُوا لأخِيكُم وَسَلُوا لَهُ التَّثبِيتَ، فَإِنَّهُ الآنَ يُسألُ). واتە: داوای لێ بوردن‌و چەسپاوی بکەن بۆ براکەتان، چونکە ئێستا پرسیاری لێ ئەکرێت. ئەبو داودو حاکم گێڕاویانەتەوە، وە حاکم بەصەحیحی داناوە، وە هەروەها بەززار ڕیوایەتی کردووە و ووتویەتی: لەم ڕووەوە نەبێت کەس لە پێغەمبەرەوە ئەی گێڕاوەتەوە.

ڕوزەین ئەگێڕێتەوە لە عەلی‌یەوە خوا لێی ڕازی بێت کە ئەو کاتێ لە ناشتنی مردوو ئەبوەوە ئەیفەرموو: خوایە ئەوە بەندەی خۆتە بۆتە میوانت، وە تۆ چاکترین خاوەنماڵێت ڕێز لە میوان ئەگریت، خوایە لێی ببورەو شوێنەکەی بۆ فراوان بکە.

ئیبنو عومەر بە پەسەندی داناوە کە سەرەتاو کۆتایی سورەتی (البقرة) لەسەر گۆڕەکەی بخوێنرێت، دووای ناشتنی، بەیەقی بەسەنەدێکی حەسەن گێڕاویەتی‌یەوە.

**١١- حوکمی تەلقین دوای ناشتنی مردووەکە:**

هەندێ لە زانایان‌و شافیعی بە پەسەندی دائەنێن کە مردووی گەورە نەك منداڵی بچوك تەلقین بکرێت. دوای ناشتنی، بەپێی ئەوەی سەعیدی کوڕی مەنصور گێڕاویەتی‌یەوە لە ڕاشیدی کوڕی سەعدو ضەمورەی کوڕی حەبیب‌و حەکیمی کوڕی عومەیرەوە کە ووتویانە: کاتێ کە مردوو خرایە ناو گۆڕەوەو گڵی بەسەردا کرایەوەو خەڵك بەجێ‌یان هێشت، حەزیان ئەکرد لای گۆڕەکەیەوە بەمردووەکە بووترێت: ئەی فلانەکەس بڵێ: (لا إله إلا الله؛ أشهد أن لا إله إلا الله) سێ جار، ئەی فلانەکەس بڵێ: پەروەردگارم خوایەو ئاینم ئیسلامە و پێغەمبەرم موحەممەدە، پاشان بەجێی بێڵێت.

(حافظ) ئەو باسەی لە (تلخيص)دا باس کردووە، بەڵام بێدەنگ بووە لەسەری. وە (طبراني) لەحەدیسی ئەبوئومامەوە ئەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: ئەگەر کەسێکتان مرد و گڵەکەتان کردەوە بەسەریدا، با یەکێکتان لای سەری مردووەکە بوەستێت وە بڵێت: ئەی فلانەکەسی کوڕی فلانەکەس بەناوی دایکی‌یەوە، چونکە مردووەکە ئەی بیستێ بەڵام وەڵامی ناداتەوە، پاشان بڵێتەوە ئەی فلانی کوڕی فلان مردوەکە ڕاست ئەبێتەوە، پاشان بڵێتەوە: ئەی فلانی کوڕی فلان مردوەکە ئەڵێت: ڕێنماییمان بکە خوا میهرەبانیت بەسەردا بڕژێنێت، بەڵام ئێوە هەست ناکەن، ئینجا با ئەو کەسە بڵێت: لە بیرت بێ لە دونیا لەسەر چی دەرچوویت ئەویش: (شهادة لا إله إلا الله وأن محمداً عبده ورسوله). وە بیرت بێ کە تۆ ڕازی

بویت خوا پەروەردگارت بێت، وە ئیسلام ئاینت بێت، وە موحەممەد ﷺ پێغەمبەرت بێت، وە قورئان پێشەوات بێت. چونکە کە ئەمەی ووت مونکەرو نەکیر دەستی یەك ئەگرنو ئەڵێن: با بڕۆین چی دامان ئەنیشێنێ لای کەسێك کە فێری وەڵامەکەی کرابێت. جا پیاوێك ووتی: ئەی نێرراوی خوا ئەی ئەگەر دایکی نەناسێت چی؟ فەرمووی: با بەناوی حەواوە بانگی بکات، بڵێت ئەی فلانی کوڕی حەووا.

(حافظ) لە (تلخیص)دا ووتویەتی: ئیسنادەکەی (صالح)ە، وە (ضیاء) لە ئەحکامەکەیدا بە (قوي) داناوە، وە لە ئیسنادەکەیدا عاصمی کوڕی عەبدوڵڵا هەیە کە ئەویش لاوازە، (هیثمي) دوای هێنانی ئەو فەرموودەیە ووتوویەتی: لە ئیسنادەکەیدا کۆمەڵێك هەیە نایان ناسم.

ئەوەی ووتوویەتی: ئەو فەرموودەیە هەرچەندە لاوازە بەڵام دڵ پێی خۆش ئەبێت.

زانایانی فەرموودەو جگە لەوانیش ڕێکەوتوون لەسەر ئەوەی کە حەدیسەکانی (فضائل) و (ترغیب) و (ترهیب) زۆر بەتوندی نەگیرێن.

ئەو فەرموودەیە بەهێز بوە بە چەند شاهیدێك وەك حەدیسی: (واسألُوا لَهُ التَّثبِيتَ)، واتە: داوای چەسپاوی بۆ بکەن. وە وەك وەسیەتەکەی عەمری کوڕی عاص کە هەردووکیان صەحیحن.

ئەهلی شام لەو سەردەمەوە هەتا ئێستا هەر لەسەر ئەو کارە بەردەوامن، وە مالیکی‌یەکان لە بۆچونە بەناوبانگەکەیانداو هەندێ لە حەنبەلی‌یەکان بۆ ئەوە چوون کە تەلقین کەراهەتی هەیە.

(أثرم) ئەڵێت: بە ئەحمەدم ووت: ئەوەی خەڵك ئەیکەن کاتێك کەسێك ئەنێژن، یەکێکیان لە ژوور سەریەوە ئەوەستێتو ئەڵێت: ئەی فلانی کوڕی فلان...هتد، چیە؟ ووتی: کەسم نەبینیوە شتی وەها بکات خەڵکی شام نەبێت لەوکاتەوە ئەبو موغیرە مردووە. وە لە ئەبی بەکری کوڕی ئەبی مەریەمەوە ئەگێڕنەوە ئەویش لە مامۆستاکانی‌یەوە کە شتی وەهایان کردووە، وە ئیسماعیلی کوڕی عەییاشیش ئەیگێڕایەوە. ئیشارەتی ئەکرد بۆ حەدیسەکەی ئەبی ئومامە.

## ئەوەی سوننەتە لە دروست کردنی گۆڕەکاندا

سوننەتە گۆڕ ئەوەندەی بستێك لە زەوی‌یەوە بەرز بکرێتەوە بۆ ئەوەی بزانرێت کە قەبرە، بەڵام لەوە زیاتر حەرامە.

بەپێی ئەوەی موسلیمو جگە لەو ئەگێڕنەوە لە هارونەوە کە ثومامەی کوڕی شوفەی بۆی گێڕاوەتەوەو ووتویەتی: لەگەڵ (فضالة)ی کوڕی عوبەیدا بوین لە خاکی ڕۆم (رودس) هاوەڵێکمان مرد (فضالة) فەرمانی کرد گۆڕەکەیان تەخت کرد، پاشان ووتی: گوێم لە پێغەمبەر ﷺ بووە فەرمانی ئەکرد گۆڕ تەخت بکرێت.

له ئەبوهەییاجی ئەسەدیەوە ئەگێڕنەوە ووتوویەتی: عەلی کوڕی ئەبی طالب پێمی ووتم: وەك چۆن پێغەمبەر ﷺ منی نارد منیش ئاوا تۆ بنێرم؟ کە واز مەهێنە لە هیچ پەیکەرێك هەتا لەناوی ئەبەی، وە لە هیچ گۆڕێکی بەرزەوە بوو هەتا ڕێکی ئەکەیت.

(ترمذي) ووتوویەتی: کار بەوە کراوە لەلایەن هەندێ زانایانەوە، وە بەخراپیان داناوە کە گۆڕ لە زەوییەوە بەرز بکرێتەوە، ئەوەندە نەبێت پێی بزانرێت و بناسرێتەوە کە ئەوە گۆڕەو بەس، بۆ ئەوەی کەس بەسەریا نەڕوات و کەس لەسەری دانەنیشێت.

والیەکان ئەو خانوانەیان ئەڕوخاند کە لەسەر گۆڕەکان دروست کرابون –ئەوانەی لەو ڕادەیە زیاتر بوون کە شەرع دایناوە – بۆ ئەوەی کار بە سوننەتی صەحیح بکرێت.

شافیعی ووتوویەتی: من را حەزئەکەم گۆڕ لە گڵەکەی خۆی زیاتری نەکرێت بەسەردا، وە هەر ئەوەندەم پێ باشە کە بستێك لە زەوی بەرز بکرێتەوە، هەروەها هەڵنەبەسترێتو گەچ کاری نەکرێت، چونکە ئەوە بۆ جوانی و شانازی کردنە، وە مردن جێی هیچ یەك لەم دوانە نییە، وە گۆڕی هیچ کام لە موهاجیرین و ئەنصارم نەبینیوە گەچ کاری کرابێت.

وە هێندێك لەوالیەکانم بینیوە کە بینای سەر گۆڕەکان تێك ئەدەن، وە نەشم بینیوە کە زانایان ڕەخنەیان لێ بگرن.

شەوکانی ووتوویەتی: وادەرئەکەوێت بەرزکردنەوەی گۆڕەکان زیاتر لەوەی کە ڕوخسەت دراوە حەرامە، وەیارانی ئیمام ئەحمەد و کۆمەڵێك لە یارانی شافیعی و یارانی مالیك، ئەمەیان بە صەراحەت ووتوە.

وە ئەو قسەیەی کە ووتراوە حەرام نییە چونکە لە لایەن سەلەفو خەلەفەوە کراوە و ئینکار نەکراوە ــ وەك ئیمامی یەحیاو (مهدی) لە (الغیث)دا ووتوویانە ــ صەحیح نیە، چونکە ئەو پەڕی ئەوەی کە هەیە ئەوەیە کە ئەوان لێی بێدەنگ بوون، وە بێدەنگ بونیش بەڵگە نیە ئەگەر لەو شتانەدا بێت کە جێی گومانە، وە حەرام بونی بەرز کردنەوەی گۆڕەکانیش گومانە. جا ئەم گومەزانەی سەر قەبرەکان و ئەم گۆڕی شەهیدانە کە ئاوەدان کراونەتەوە، حەدیسی بەرز کردنەوەی گۆڕەکان هەر لە سەرەتاوە ئەوان ئەگرێتەوە، وە دیسانەوە ئەو کارە لە بەشی کردنی گۆڕەکانە بە مزگەوت، کە پێغەمبەر ﷺ ئەو کەسانەی نەفرین کردووە کە ئەو کارە ئەکەن.

بەڕاستی بەهۆی بەرز کردنەوەو ڕازاندنەوەی گۆڕەکانەوە خراپەو فەسادی وەها دروست بووە کە ئیسلام بۆیان ئەگری، لەوانە بیروباوەڕی نەفامەکانە پێیان کە وەك بیرو باوەڕی کافرەکان وایە بەرامبەر بە بتەکان، وە ئەوەندە بە گەورەیان زانیون کە پێیان وایە ئەمانە توانایان هەیە قازانج بگەیەننو زیان دورخەنەوە، ئیتر کردوویانە بەجێگەی مەبەست، بۆ داواکردنی نیازو پێویستیەکانیان وە بە پەناگەیەك بۆ بەدیهێنانی داواکاریەکانیان، شتی وا داوا ئەکەن لەم قەبرانە کە بەندەکان لە خوای داوا ئەکەن، وە بۆ سەفەرکردن

بۆلایان بارگەو بنە ئەپێچنەوەو دەستی پیادێنن و هاوار ئەکەن لێیان، خولاصە: هیچ شتێکیان نەهێشتۆتەوە لەو کارانەی خەڵکی سەردەمی نەفامی لەگەڵ بتەکانیاندا دەیانکرد کە نەیکەن. (إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعُونَ).

لەگەڵ ئەم کردەوە ناشیرین ئەم کوفرە ترسێنەرەدا کەست دەست ناکەوێ بۆ خوا تورە ببێت و غیرەتی بۆ دینی حەنیف بجولێت، نە زاناو نە قوتابی و نە پاشاو نە وەزیر، بەراستی بیستوومانەو پێمان گەیووە کە ئەو قەبرپەرستانە هەموویان یا زۆربەیان کاتێ سوێند ئەخۆن بەخوا بەدرۆ هیچ باکیان لێی نیە، بەلاَم کاتێك پێیان بڵێن ئەگەر ڕاست ئەکەی بە فلاَن شێخ و فلاَن وەلی کە باوەڕت پێیەتی سوێندم بۆ بخۆ، ناچێتە ژێری و سوێند ناخوات، وە ئیعتراف بەراستی ئەکات، ئەمەش ڕۆشنترین بەلگەیە لەسەر ئەوەی کە شیرکی ئەوان گەییوەتە پشت شیرکی ئەو کەسەی کە ئەڵێ خوا دوو کەسە یا سێ کەسە!! (واتە: جولەکە و گاورەکان).

جا ئەی زانایانی دین، ئەی پاشایانی ئیسلام، چ موسیبەتێك بۆ ئیسلام سەختترە لە کوفر، وە چ بەلاَیەك بۆ ئەم دینە زیان بەخشترە لە پەرستنی غەیری خوا؟ وە چ غەم و ناخۆشی‌یەك کە موسلّمانان دوچاری بوبێتن بە ئەندازەی ئەمەیە؟ وە کام تاوان و مونکەر واجبە بەری لێ بگیرێ و ئینکاری بکرێ ئەگەر ئینکاری ئەم شیرکە ئاشکرایە واجب نەبێت؟.

لَقَد أَسْمَعتَ لَو نَادَيتَ حيّاً    وَلَكِن لا حَيَاةَ لِمَن تُنَادِي

وَلَو نَاراً نَفَختَ بِهَا أَضَاءَت    وَلَكِن أَنتَ تَنفُخُ فِي رَمَادِ

واتە: بەڕاستی ئەو ئامۆژگاری‌یەت بە گوێچکەی گەیاندوە ئەگەر بانگی زیندوت کردبێ، بەلاَم خۆ تۆ ئەو کەسەی بانگی ئەکەیت ژیانی تێدا نی‌یەو زیندو نی‌یە، وە ئەگەر ئەو پشکۆیەی کە ئێستا فوی تێ ئەکەیت بۆ ئەوەی ببوژێتەوە پاشماوەی ئاگری تێدا بمایە، ئێستا ئەبوژایەوە، بەلاَم خۆ تۆ لە جیاتی ئەوەی فو بە ئاگردا بکەیت فو بە خۆڵەمێشدا ئەکەیت.

وە زانایان فەتوایان داوە بە ڕوخاندنی ئەو مزگەوتانەو ئەو گومەزانەی کە لە سەر گۆڕەکان کراوە.

ئیبنو حەجەر لە (الزواجر)دا ووتوویەتی: پێویستە دەست پێشکەری بکرێ بۆ ڕوخاندنی مزگەوتو گومەزی سەر گۆڕەکان چونکە لە مزگەوتی (ضرار) زیانیان زۆرترە، وە لەبەر ئەوەی لەسەر پێچەوانەی فەرمانی پێغەمبەر ﷺ دروستکراون، ئەمانەش کە دروستکراون هەر لە سەر پێچەوانەی فەرمانی ئەون ﷺ، چونکە پێغەمبەر ﷺ نەهی لەوە کردوەو فەرمانی داوە بە ڕوخانی گۆڕە بەرز بووەکان، هەروەها پێویستە هەموو ئەو چراو چراخانەی سەرگۆڕەکان لابرێت، وە دروست نی‌یە وەقف بکرێت یا نەزر بکرێت.

**بەرزکردنەوەی گۆڕ ئەوەندەی بستێك وەك پشتی ووشتر یان تەخت کردنی:**

زانایان لە سەر ئەوەن کە دروستە گۆڕ وەك پشتی ووشتر بەرز بکرێتەوە یا تەخت بکرێ.

(طبري) ووتوویەتی: من حەزناکەم کە گۆڕ لەم دوو واتایە تێ بپەڕێ، یا تەخت بکری لەگەڵ زەویدا یاوەك پشتی ووشتری لێ بکرێ ئەوەندەی بستێك، وەك ئەوەی موسڵمانانی ئەو کاتە لە سەری بوون.

وە ڕێك کردنی گۆڕ تەخت کردنی نیە.

زانایان جیاوازییان هەیە لەوەدا کە کامەیان چاکترە، قازی (عیاض) لە بەشی زۆری زانایانەوە ئەگێڕێتەوە کە ووتوویانە: چاکتر ئەوەیە کەوەك پشتی ووشتری لێ بکرێ و ئەوەندەی بستێك بەرز بکرێتەوە، چونکە سوفیانی تەممار بۆی گێڕاوەتەوە کە گۆڕی پێغەمبەری ﷺ بینیوە وەك پشتی ووشتر بووە. بوخاری ئەوەی ڕیوایەت کردووە.

ئەمەش ڕای ئەبی حەنیفەو مالیكو ئەحمەدو موزەنی و بەشی زۆری شافیعییەکانە. وە شافیعی بۆ ئەوە چووە کە تەخت کردنی چاکترە، بە پێی ئەوەی کە پێغەمبەر ﷺ فەرمانی داوە بە تەخت کردنی.

**نیشان کردنی گۆڕ بە نیشانەیەك:**

دروستە نیشانەیەك بخرێتە سەر گۆڕ، بەرد بێت یا تەختە، بۆ ئەوەی بناسرێتەوە پێی، بەپێی ئەوەی ئیبنوماجە ئەگێڕێتەوە لە ئەنەسەوە کە پێغەمبەر ﷺ گۆڕی عوسمانی کوڕی (مظعون)ی نیشانە کرد بە بەردێك. واتە: بەردێکی خستە سەر بۆ ئەوەی دیاربێت.

لە کتێبی (الزوائد)دا هاتووە ئەو حەدیسە ئیسنادەکەی (حسن)ە ئەبو داود لە حەدیسی (مطلب)ی کوڕی ئەبو وەداعەوە ڕیوایەتی کردووە.

وە تێیدا هاتوە کە پێغەمبەر ﷺ بەردێکی هەڵگرت و لای سەریەوە دایناو فەرمووی: (أتَعَمُّ بِهَا قَبرَ أخِي، وَأدفِنُ إلَيهِ مَن مَاتَ مِن أهلِي). بەم بەردە گۆڕی براکەم ئەناسمەوە، وە هەرچی کەسێکم مرد لایەوە ئەی نێژم.

وە لە حەدیسەکەدا ئەوە دەرئەکەوێ کە پەسەندە ئەو مردووانەی کە خزمن کۆ بکرێنەوەو لە یەك جێگادا بنێژرێن، چونکە ئاسانترە بۆ سەردانیان وە بۆ زیاتر داوای لێخۆشبون بۆ کردنیان.

**داکەندنی پێڵاو لە گۆڕستاندا:**

بەشی زۆری زانایان بۆ ئەوە چوون کە ڕۆیشتن قەیناکە بە پێڵاوەوە بەناو گۆڕستاندا.

جەریری کوڕی حازیم ووتوویەتی: حەسەن و ئیبنو سیرینم بینیوە بە پێڵاوەوە بەناو گۆڕستاندا ئەڕۆیشتن.

بوخاریو موسلیمو ئەبو داودو نەسائی لە ئەنەسەوە ئەگێڕنەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (إنَّ العَبدَ إذَا وُضِعَ فِي قَبرِهِ وَتَوَلَّى أصحَابُهُ، إنَّهُ لَيَسمَعُ قَرعَ نِعَالِهِم). واتە: مردو کە ئەخرێتە ناو گۆڕەکەیەوەو هاوەڵەکانی بەجێی ئەهێڵن، گوێی لە دەنگی پێڵاوەکانیانە.

زانایان ئەم فەرموودەیان کردووە بە بەڵگەی ئەوەی کە دروستە بە پێڵاوەوە بە ناو گۆڕستاندا هاتوچۆ بکرێت، چونکە دەنگی نابیسترێ هەتا هاتو چۆی پێوە نەکرێ.

ئیمامی ئەحمەد هاتوو چۆکردنی بەناو گۆڕستاندا بە پێڵاوی سەبتیەوە بە خراپ داناوە [1] بە پێی ئەوەی ئەبو داودو نەسائیو ئیبنو ماجە ئەگێڕنەوە لە بەشیرەوە کەخزمەت کاری پێغەمبەر بووە ﷺ کە پێغەمبەر ﷺ پیاوێکی بینی بەناو گۆڕستاندا هاتوو چۆی ئەکرد بە پێڵاوەوە فەرمووی: (يَا صَاحِبَ السَّبتِيَّتَينِ وَيحَكَ ألقِ سَبتِيَّتَيكَ). واتە: ئەی سەبتی لەپێ سەبتیەکانت داکەنە ماڵ وێران، کابراش سەیرێکی کرد کە زانی پێغەمبەر بوو دایکەنی و فرێی دان.

(خطابي) ووتوویەتی: لەوە ئەچێت پێغەمبەر ﷺ لەبەر خۆ بەزل زانینی ئەو کەسە پێی ناخۆش بووبێ، چونکە پێڵاوی سەبتی ئەوانەی کە لەدونیادا ئەهلی ڕابواردن و خۆش گوزەرانی بون لەپێیان ئەکرد، پاشان ووتویەتی: لەبەر ئەوەیە پێغەمبەر ﷺ حەزی کردووە کە بچێتە ناو گۆڕستانەوە بە پۆشاکی مام ناوەندو جلی ئەوکەسانەی کە خۆ بە کەم ئەگرن.

وە کەراهەتەکەی ئەحمەد بۆ کەسێکە کە بەبێ بەهانە لەپێیان بکاتو بچێتە ناو گۆڕستانەوە، بەلام ئەگەر بەهانەیەك هەبوو کە ئەو کەسە نەتوانێ پێڵاوەکانی لابەرێ وەك دڕك و شتی پیس ئەوە ئەو کەراهەتە نامێنێ.

**قەدەغە کردن لە داپۆشینی گۆڕ:**

دروستە نیە گۆڕ داپۆشرێ (بەقوماش و شتی وا) چونکە سامان بە فیڕۆ دانە بۆ شتێکی نا شەرعی و گومڕا کردنی خەلکە، بوخاری و موسلیم لە عائیشەوە ئەگێڕنەوە کە پێغەمبەر ﷺ چوو بۆ غەزایەك منیش پارچە فەرشێکی بچوکم هێناو گرتم بە دەرگاکەوە، کاتێ تەشریفی هاتەوە فەرشەکەی بینی ڕای کێشاو هەڵی کێشا، لەپاشاندا فەرمووی: (إنَّ اللهَ لَم يَأمُرنَا أن نَكسُوَ الحِجَارَةَ وَالطِّينَ) واتە: خوا فەرمانی پێ نەداوین کە بەردو قوڕ داپۆشین.

**حەرامیەتی دروست کردنی مزگەوت و چرادانان لەسەر گۆڕستان:**

چەند فەرمودەی صەحیح و صەریح هاتوون دەربارەی حەرامی دروستکردنی مزگەوت لەناو گۆڕستانداو داگیرساندنی چرا لەسەریان.

١- بوخاریو موسلیم ئەگێڕنەوە لە ئەبی هورەیرەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (قَاتَلَ اللهُ اليَهُودَ اتَّخَذُوا قُبُورَ أنبِيَائِهِم مَسَاجِدَ). واتە: خوا جورولەکە لەناوبەرێ گۆڕی پێغەمبەرەکانیان ئەکردە مزگەوت.

٢- ئەحمەدو خاوەن سونەنەکان جگە لە ئیبنو ماجە ئەگێڕنەوە و (ترمذي) بەحەسەنی داناوە. لە ئیبنوعەبباسەوە کە پێغەمبەر ﷺ نەفرینی کردووە لەو ئافرەتانەی ئەچنە سەر گۆڕو ئەوانەی مزگەوتی لە سەر دروست ئەکەن و ئەوانەی چرای لەسەر دا ئەگرسێنن.

---

(١) جۆرێك نەعلە کە لە پێستە دروست ئەکرێت و پێستەکەی بە جۆرێك گەڵای دار دەباغ ئەکرێت.

٣- له صەحیحی موسلیمدا هاتووه له عەبدوڵڵای بوجەلیەوه که فەرمویەتی: گوێم له پێغەمبەر ﷺ بوو پێش ئەوەی کۆچی دوایی بکات به پێنج ڕۆژ ئەی فەرموو: (إنِّي أبرأُ إلى اللهِ أن يَكُونَ لِي منكُم خَلِيلٌ؛ فَإنَّ اللهَ عَزَّوَجَل قَدِ اتَّخَذَنِي خَلِيلاً، كَمَا اتَّخَذَ إبراهِيمَ خَلِيلاً، وَلَو كُنتُ مُتَّخِذاً خَلِيلاً لاتَّخَذتُ أبَابَكرٍ خَلِيلاً، وَإنَّ مَن كَانَ قَبلَكُم كَانُوا يَتَّخِذُونَ قُبُور أنبِيَائِهِم وَصَالِحِيهِم مَسَاجِدَ، ألا فَلا تَتَّخِذُوا القُبُورَ مَسَاجِدَ، إنِّي أنهَاكُم عَن ذَلكَ). واته: من پاکانەی خۆم ئەکەم بۆ خوا که له ئێوه خەلیلم هەبێت، -خەلیل به خۆشەویستی تایبەت ئەوترێت- چونکه خوای گەوره منی کردۆته خەلیلی خۆی وەك چۆن ئیبراهیمی کردبووه خەلیلی خۆی، جا ئەگەر من خەلیلم بگرتایه، ئەبوبەکرم ئەکرده خەلیلی خۆم، وه ئەوانەی پێش ئێوه گۆڕی پێغەمبەرکانیان و پیاوچاکانیان ئەکرده مزگەوت، جا ئاگاتان لێ بێت نابێ ئێوه شتی وا بکەن و گۆڕەکان بکەنه مزگەوت، بەڕاستی من ئەوەتان لێ قەدەغەئەکەم.

٤- وه هەر له صەحیحی موسلیمدا هاتووه، له ئەبی هورەیرەوه که پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (لَعَنَ اللهُ اليَهُودَ وَالنَّصَارَى اتَّخَذُوا قُبُورَ أنبِيَائِهِم مَسَاجِدَ). واته: خوا نەفرینی له جولەکەو گاور کردووه که گۆڕی پێغەمبەرکانیان کردووه بەمزگەوت.

٥- بوخاری و موسلیم ئەگێڕنەوه له عائیشەوه که ئومموحەبیبه و ئوموسەلەمه باسی کەنیسەیەکیان ئەگێڕایەوه بۆ پێغەمبەر ﷺ که له حەبەشه بینیبویانو وێنەی تێدا بوو، ئەویش فەرموی: (إنَّ أولَئِكَ إذَا كَانَ فِيهِمُ الرَّجُلُ الصَّالِحُ فَمَاتَ. بَنَوا على قَبرِهِ مَسجِداً وَصَوَّرُوا فِيهِ تِلكَ الصُّوَرَ، أولَئِكَ شِرَارُ الخَلقِ عِندَ اللهِ يَومَ القِيَامَةِ). واته: ئەوانه نەتەوەیەکن که ئەگەر پیاو چاکێکیان تێدا بوایه و بمردایه لەسەر گۆڕەکەی مزگەوتیان دروست ئەکردو ئەو وێنانەیان تێدا ئەکێشا، جا ئەوانه خراپترین کەسن لای خوا له ڕۆژی دواییدا.

خاوەنی کتێبی (المغني) ئەڵێت: نابێت مزگەوت له سەر گۆڕ دروست بکرێ به پێی ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەر ﷺ که فەرموویەتی: خوا نەفرینی کردووه لەو ئافرەتانەی کەزۆر ئەچنه سەر گۆڕستان و ئەوانەی دەیکەنه مزگەوت چرای له سەر دائەنێن. ئەبو داود و نەسائی گێڕاویانەتەوه و زاراوەکەی نەسائیش بەم شێوەیه: پێغەمبەر ﷺ نەفرینی کردووه...هتد.

جا ئەگەر ڕەوا بوایه پێغەمبەر ﷺ نەفرینی نەئەکرد لەو کەسانەی ئەوه ئەکەن، وه لەبەر ئەوەی سامان بەفیڕۆدانی تێدایه بەبێ سود، و زیادەڕەوییه له ڕێزلێنانی گۆڕ که له ڕێزلێنانی بت ئەچێت، وەنابێت مزگەوت له سەر گۆڕ دروست بکرێ به پێی ئەو فەرموودەیه، وەلەبەرئەوەی پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (لَعَنَ اللهُ اليَهُودَ اتَّخَذُوا قُبُورَ أنبِيَائِهِم مَسَاجِدَ) متفق عليه. واته: نەفرینی خوا له جولەکه

بێت کە گۆڕی پیغەمبەرکانیان ئەکردە مزگەوت. پێغەمبەر ﷺ ئەیان ترسێنێ لە وێنەی ئەوەی کە ئەوان کردویانە.

عائیشە فەرمویەتی: گۆڕی پێغەمبەر ﷺ بۆیە بەرز نەکرایەوە بۆ ئەوەی نەکرێتە مزگەوت، وە لەبەر ئەوی تایبەت کردنی گۆڕ بەوەی نوێژی لەسەر بکرێت، هەروەك خۆ نزیك کردنەوەو ڕێز لێنانی بتەکان وەهایە، وە لەپێشا گێڕامانەوە کە سەرەتای بت پەرستی لە ڕێز لێ نانی مردووەوە و دەست پێدا هێنانیان و نوێژ کردن لەسەریان پەیدا بووە[1].

قەدەغەیی سەربڕین لەسەر گۆڕ:

یاسا دانەری ئیسلام قەدەغەی کردووە کە شت لە سەر گۆڕ سەر ببڕێ، لەبەر خۆلادان لەوەی نەفامەکانی سەردەمی نەزانی ئەیان کرد، وە لەبەر دور کەوتنەوە لە شانازی کردن‌و خۆ بەزل زانین.

ئەبو داود ئەگێڕێتەوە لە ئەنەسەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (لا عَقرَ فِي الإسلامِ) واتە: لە ئیسلامدا شت لە سەر گۆڕ سەربڕین نیە، (عبدالرزاق) ووتوویەتی: لە سەردەمی نەفامیدا مانگا یا مەڕیان سەر ئەبڕی لای گۆڕ.

(خطابي) ووتویەتی: نەفامەکانی سەردەمی نەزانی ووشتریان لە سەر گۆڕی پیاوی چاك و سەخی سەر ئەبڕی و ئەیان ووت: پاداشتی کردەوەکەی ئەدەینەوە، چونکە خۆی لە ژیاندا بۆخەڵکی سەر ئەبڕی و دەرخواردی میوانەکانی ئەدا، وە ئێمەش لە سەر گۆڕەکەی سەری ئەبڕین بۆئەوەی دڕندە و باڵندە بیخۆن و خۆراك دەربێ دوای مردنیشی، وەك چۆن لە ژیانیدا خواردنی ئەدا.

شاعیرەکەیان ئەڵێت:

عَقرتُ على قَبرِ النَّجَاشِيِّ نَاقَتِي ... بَأبيَضَ عضبٍ أخلَصَتهُ صَيَاقِلُهُ

على قَبرِ مَن لو أنَّنِي مِتّ قَبلَهُ ... لَهَانَت عَلَيهِ عِندَ قَبرِي رَوَاحِلُهُ

---

(١) ئەمە ئیشارەتە بۆ ئەوەی کە بوخاری لە ئیبنوعەبباسەوە ئەگێڕێتەوە، لەبارەی قەومی نوح کە چۆن کەوتنە پەرستنی بتەکان: (وەددو سواع و (یغوث) و یەعوق و نەسر)، کە ئەمانە ناوی چەند پیاو چاکی سەردەمی خۆیان بوون کاتێ مردن بۆ یادگار پەیکەریان بۆ دروست کردن بۆ ئەوەی چاویان لێ بکەن، جا کاتێ خەڵك نەفام بوون شەیتان هانی دان بۆ پەرستنی ئەو پەیکەرانە بەوەی کە ڕێزیان لێ ناون و دەستیان پێدا هێناون و خۆیان لە خوا نزیك کردۆتەوە بەوکارانە. جا خەڵکیش هەر وایان کرد لە گۆڕی پیاوچاکان، وە ئەم کارە لە بت پەرستەکانەوە هاتۆتە ناو ئەهلی کیتابەوە، لەپاش ئەوانیش هاتۆتە ناو موسڵمانانەوە، جا بت پەرستیش لەگەڵ ئەم کارەدا یەکسانە.

واته ووشترەكەم لەسەر گۆڕی نەجاشی سەربڕی، بە شمشێرێكی سپی تیژ كە شمشێر تیژكەرەكان باش تیژیان كردبو، جا من ئەم كارەم لەسەر قەبری كەسێك كردووە ئەگەر من پێشی بكەوتمایە و بمردمایە ئەوە بەلایەوە كەم و بێ نرخ بوو كە ووشترە چاك و بەهێزەكانی لەلای قەبری من دابنایە.

وە هەندێكیان باوەڕیان وەهابوو ئەگەر وولاغەكەی لە سەر گۆڕەكەی سەر ببڕێ ڕۆژی دوایی بە سواری ئەچێ بۆ مەیدانی مەحشەر، وە هەركەس وولاغەكەی سەر نەبڕرا لەلای، ئەوە بەپێ ئەچێ بۆ مەحشەر، ئەمە لەسەر مەزهەبی ئەوانەی كە باوەڕیان وا بوو زیندوو بوونەوە هەیە دوای مردن.

**قەدەغە كردنی دانیشتن لە سەر گۆڕ و پاڵپێوە دانو بەسەرا ڕۆیشتنی:**

دروست نیيە لە سەر قەبر دانیشتن و پاڵ پێوەدانیو بەسەرا ڕۆیشتنی، بە پێی ئەوەی عەمری كوڕی حەزم گێڕاویەتیەوە ووتوویەتی: پێغەمبەر ﷺ چاوی لێم بوو پاڵم دابۆوە بە گۆڕێكەوە فەرمووی: (لاتُؤذِ صَاحِبَ هَذَا القَبرِ أو لا تُؤذِهِ) رواه أحمد بإسناد صحيح. واتە: ئازاری خاوەنی ئەو گۆڕە مەدە.

هەروەها لە ئەبو هورەیرەوە هاتووە كە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (لأن يَجلِسَ أحَدُكُم على جَمرَةٍ فَتَحرِقَ ثِيَابَهُ فَتَخلُصَ إلى جِلدِهِ خَيرٌ لَهُ مِن أن يَجلِسَ عَلَى قَبرٍ) رواه أحمد ومسلم وأبوداود والنسائي وابن ماجة. واتە: لەسەر پشكۆیەك دابنیشن و جلەكانتان بسوتێ و بگاتە سەر پێست، چاكترە بۆتان لەوەی كە لەسەر گۆڕێك دابنیشن.

وە بە حەرام دانان مەزهەبی ئیبنوحەزمە لەبەر ئەو هەڕەشەیەی كە لەوبارەیەوە هاتووە.

ئیبنو حەزم ووتوویەتی: ئەمە قسەی كۆمەڵێكیشە لە سەلەف، لەوانە ئەبو هورەیرەیە.

وە مەزهەبی جمهور ئەوەیە: كە دانیشتن لە سەر گۆڕ كەراهەتی هەیە.

نەوەوی ووتوویەتی: عیبارەتەكەی شافیعی لە (الأم)دا و بەشی زۆری یارانی شافیعی دوای ئەویش ئەوەیە: كە دانیشتن كەراهەتی هەیە، وە مەبەستیان كەراهەتی تەنزیهە، وەك لە بەكارهێنانی زانایاندا بەناوبانگە، وە زۆریان بە صەراحەت ووتوویانە. وە ووتوویەتی: جومهوری زانایان هەموو ئەوە ئەڵێن لەوانە: نەخەعی و (لیث)و ئەحمەد و داوود، وە ووتویەتی: پاڵ پێوە دانیش هەر بەو شێوەیە كەراهەتی هەیە.

ئیبنو عومەر لە صەحابەو ئەبوحەنیفەو مالیك بۆ ئەوە چوون كە دانیشتن لەسەر گۆڕ دروستە.

لە (الموطأ) دا ئەڵێت: ئەو قەدەغە كردنەی دانیشتنی سەر قەبر (وەك ئێمە بزانین) كە مەبەستی دانیشتنە بۆ دەست بە ئاو گەیاندن، وە لەو بارەیەوە فەرمودەیەكی لاوازی باس كردووە، وە ئەحمەدیش ئەو لێك دانەوەیەی بەلاواز داناوە، ووتویەتی: ئەو قسەیە هیچ نیيە، وە نەوەوی ووتوویەتی: ئەو لێكدانەوەیە لاوازە یا باتڵە، وە هەروەها ئیبنوحەزم بە باتڵی داناوە لە چەند ڕوویەكەوە.

ئەم جیاوازیيە لەسەر ئەوەیە كە دانیشتنەكە دانیشتنی سروشتی بێت، نەك بۆ دەست بە ئاو گەیاندن، بەڵام ئەگەر بۆ دەست بە ئاو گەیاندن بێت ئەوە هەموو زانایان ڕێكن لەسەر ئەوەی كە حەرامە، هەروەك

چۆن ڕێکن لەسەر ئەوەی کە ڕۆشتن بەسەر گۆڕدا دروستە ئەگەر بۆ پێویست بوو. وەك ئەوەی نەگاتە گۆڕی مردوەکەی خۆی بەوەنەبێ کە بەسەر گۆڕی تردا بڕوات.

**نەهی لە گەچ کردنی گۆڕو نوسین لەسەری:**

لە جابیرەوە هاتوە کە پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی کردبوو گۆڕ گەچ کاری بکرێو لە سەری دابنیشرێ و خانوی بەسەروە بکرێ، ئەحمەد و موسلیم و نەسائی و ئەبوداوودو (ترمذي) کە بە صەحیحی داناوە ڕیوایەتیان کردووە.

وە ڕیوایەتەکەی (ترمذي) ئەڵێت: پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی کردبوو کە گۆڕ گەچ کاری بکرێ و لە سەری بنوسرێ و خانوی بەسەروە بکرێ و پێی لێ نرێ.

وە ڕیوایەتی نەسائی ئەڵێت: قەدەغەی کردبوو خانووی بەسەرەوە بکرێ یان لێی زیاد بکرێ یان گەچ کاری بکرێ یان لە سەری بنوسرێ.

جومهوری زانایان ئەو قەدەغەیەشیان بە قەدەغەی کەراهەت داناوە، بەڵام ئیبنوحەزم بەحەرامی داناوە.

وە ووتراوە: حیکمەت لەوەدا ئەوەیە کە گۆڕ بۆ لەناوچونە نەك بۆ مانەوە، وە گەچ کاری کردنی، جوانییێکی دونیایی‌یە، ئەو مردووە هیچ پێویستی پێی نیە.

هەندێکیان ووتوویانە حیکمەتی قەدەغە کردنەکەی گەچ کاری کردن بۆ گۆڕ ئەوەیە کە گەچ بە ئاگر ئەسوتێنرێ، ئینجا دروست ئەکرێ، وە ئەوەی پشت گیری ئەو ڕایە ئەکات ئەوەیە کە لە زەیدی کوڕی ئەرقەمەوە ئەگێڕنەوە کە بەو کەسەی ووت کەئەی‌ویست گۆڕی کوڕەکەی هەڵبەستی بەگەچ: شتێکی خراپ و پوچەڵ ئەکەی، نابێ شتێکی لێ نزیك بکەرێتەوە کە ئاگری بەرکەوتبێ.

**قوردانی گۆڕ قەیناکا:**

(ترمذي) ووتوویەتی: هەندێ لە زانایان ڕێیان داوە — لەوانە حەسەنی بەصری- کە گۆڕ قوڕ بدرێ.

شافیعی ووتوویەتی: قوڕدانی گۆڕ قەیناکە.

لە جەعفەری کوڕی موحەمەدەوە هاتوە لە باوکی‌یەوە فەرمویەتی: گۆڕەکەی پێغەمبەریان ﷺ بستێك بەرز کردەوە لە زەوی‌یەوە و قوڕێکی سوریان پێدا داو چەویان کردە سەر.

ئەبوبەکری نەججاد گێڕاویەتیەوە، وە (حافظ) لێی بێدەنگ بووە لە (التلخيص)دا.

جا وەك چۆن زانایان ئەڵێن هەڵبەستنی گۆڕ کەراهەتی هەیە، ئاواش بە کەراهەتیان داناوە کە بە خشتی سورو قسڵ یا تەختە دروست بکرێت، یا ناشتنی مردووەکە بە تابوتەکەوە ئەگەر زەویەکە شێ دار و تەڕنەبێت، بەڵام ئەگەر بەو شێوەیە بوو دروستە دروستکردنی گۆڕو هەڵبەستنی بە قسڵ و چیمەنتۆ وە دروستیشە کە بە تابوتەوە بنێژرێ بێ ئەوەی کەراهەتی هەبێ.

له موغیرەوە هاتوە لە ئیبراهیمەوە کە ووتوویەتی: پێشینان حەزیان لە هەڵبەستن ئەکرد بە خشتی قوڕ بەڵام بە قسڵ لایان کەراهەتی هەبووە، وە بە قامیش پەسەند بوو لایان و بەتەختە کەراهەتی هەبووە، وە لە فەرموودەکەدا هاتووە کە قەدەغەی نوسینی کردووە لەسەر گۆڕ، جا لە ڕواڵەتدا جیاوازی نیە لە نێوان نوسینی ناوی مردووەکە یا نوسینی شتی تر لە سەری.

حاکم دوای تەخریج کردنی ئەم فەرموودەیە ووتوویەتی: ئیسنادەکەی صەحیحە، بەڵام کاری پێ ناکرێ، چونکە پێشەوا موسڵمانەکان لە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوادا ناویان نوسراوە لە سەر گۆڕەکانیان ئەمەش کارێکە بەرودووا لەیەکیان وەرگرتووە.

(ذهبي) بەدوای ئەو دا دەڵێت: ئەوە شتێکی تازە داهێنراوەو ئەوەیان پێ نەگەیشتووە کە قەدەغەیە.

بۆچونی حەنبەلی ئەوەیە کە ئەو نەهیەیە بۆ کەراهەتە، جا چ نوسینی قورئان بێت یا ناوی مردووەکە بێت یەکسانە.

شافیعی‌یەکان ڕێکەوتوون لەگەڵیاندا، بەڵام ووتوویانە: ئەگەر گۆڕەکە گۆڕی زانایەك بێت یا پیاوچاکێك، پەسەندە کە ناوەکەی لە سەر بنوسرێ بۆ ئەوەی لە کەسانی تر جیا بکرێتەوە، وەمالیکیەکان ڕایان وەهایە نوسینەکە ئەگەر قورئان بێت حەرامە نوسینی، بەڵام ئەگەر بۆ دیاری کردنی ناوی مردووەکە و بەرواری مردنەکەی بوو ئەوە کەراهەتی هەیە.

حەنەفیەکان ئەڵێن: نوسین لە سەر گۆڕ کەراهەتی تەحریمە، بەڵام ئەگەر ترسی وون بوونی گۆڕەکەی هەبوو قەیناکە.

ئیبنوحەزم ئەڵێت: ئەگەر ناوی مردووەکە لە سەر بەردێك هەڵبکەنرێت ئێمە بەخراپی نازانین، وە لە فەرموودەکەدا قەدەغەی ئەوە ئەکات کەلە گڵەکەی خۆی زیاتر بکرێ بەسەریا.

وە دەربارەی ئەو زیادەیە بەیهەقی باسێکی هەیە کە ئەڵێت: (بَابٌ لايُزَادُ عَلَى القَبرِ أكثَرَ مِن تُرَابِهِ لِئَلا يَرتَفِعَ). واتە: ئەمە باسێکە دەربارەی ئەوە کە لە سەر گۆڕ لە گڵەکەی خۆی زیاتر ناکرێ بە سەریا بۆ ئەوەی بەرز نەبێتەوە.

شەوکانی ووتوویەتی: وادیارە مەبەست لەو زیادەیە ئەوەیە کە لە گڵەکەی خۆی زیاتر نەکرێ بەسەریا.

وە ئەڵێن: مەبەست لەو زیادەیە ئەوەیە کە لەسەر گۆڕی مردویەکی تر گۆڕی بۆ هەڵبکەندرێ، بەڵام شافیعی واتای یەکەم تەرجیح ئەدا وە ووتوویەتی: پەسەندە کە گۆڕەکە لەگڵەکەی خۆی زیاتر نەکرێ بەسەریا، وە بۆیە ئەوەی لاپەسەندە تا گۆڕەکە زۆر بەرز نەبێتەوە ئەگینا ئەگەر زیادیش کرا خراپ نیە.

**ناشتنی زیاتر لە یەك مردوو لە گۆڕێکدا:**

ئەو ڕێ‌وڕەوشتەی کە سەلەف لەسەری ڕۆیشتون و کاری پێ کراوە، ئەوەیە کە تەنها کەسێك لە گۆڕێکدا بنێژرێت، چونکە ناشتنی چەند مردوویەك لە گۆڕێکدا بەکەڕاهەت دانراوە، مەگەر کارەکە گران بێت کە

هەرمردویەك گۆڕێکی بۆ هەڵکەندرێ، لە بەر زۆری مردووەکان و کەمی ئەوانەی دەیان نێژن، یالاواز بونیان، جا ئەگەر وابوو ئەوە دروستە لە مردوویەك زیاتر لە گۆڕێکدا بنێژرێ، بە پێی ئەوەی ئەحمەدو (ترمذی) کە بە صەحیحی داناوە ئەگێڕنەوە کە ئەنصارەکان ڕۆژی ئوحود هاتنە لای پێغەمبەر ﷺ وتیان: ئەی نێرراوی خوا ماندوو برینداریـن چ فەرمانێکمان پێ ئەکەی دەربارەی شەهیدەکان؟ فەرمووی: (إحفِروا وأوسعُو وَأعمِقُوا وَاجعَلُوا الرَّجُلَينِ وَالثَّلاثَةَ فِي القَبرِ. قَالُوا: فَأيُّهُم نُقَدِّمُ؟ قَالَ: أكثَرهم قُرآناً). واتە: گۆڕەکان فراوانو قوڵ هەڵکەنن هەر دووان و سیان بخەنە گۆڕێکەوە، وتیان: کامەیان پێش بخەین؟ فەرمووی: ئەوەیان کە قورئانی زۆرتر لەبەرە.

(عبدالرزاق) ئەگێڕێتەوە بە سەنەدێکی حەسەن لە واثیلەی کوڕی ئەسقەعەوە کە ژنێكو پیاوێك ئەخرایە ناو گۆڕێکەوە، جا پیاوەکە پێش ئەخراو ژنەکەش لەدواوەیەوە دائەنرا.

**مردووی دەریا:**

لە (المغني)دا ووتوویەتی: ئەگەر کەسێك لە ناو کەشتییەکدا لەناو دەریایەکدا مرد، ئەحمەد ووتوویەتی: چاوەڕوانی ئەکرێت بەهیوای ئەوەی شوێنێك بدۆزنەوە تێیدا بنێژن، بەو شێوە ڕۆژێك یان دوو ڕۆژ ئەیهێڵنەوە، ئەگەر ترسی تێك چوونی نەبوو، جا ئەگەر جێگەیان نەدۆزیەوە ئەشۆرێ و کفن ئەکرێ و نوێژی لە سەر ئەکرێ و شتێکی قورسی پێوە ئەبەسترێ و ئەخرێتە ناو ئاوەکەوە، ئەوەش قسەی (عطاء) و حەسەنە.

حەسەن ووتوویەتی: لە سەبەتەیەکدا دا ئەنرێتو ئەخرێتە دەریاوە.

شافیعی ووتوویەتی: ئەخرێتە نێوان دولەوح و ئەبەسترێ بۆ ئەوەی ئاو بیبات بۆ کەناری دەریا، چونکە لەوانەیە دەست کۆمەڵێك بکەوێت و بینێژن، وە ئەگەر بشی خەنە ناو ئاوەکەوە تاوانبار نابن، بەڵام ئەو شێوەی یەکەم باشترە، چونکە ئەو شاردنەوەی کە مەبەستە بە دەست دێت، بەڵام بەستنەوەی لەنێوان دوو لەوح و تەختە لەوانەیە تێك بچێت و توشی ئەتك بێت، وە لەوانەیە لە سەر کەناری دەریاکە بەڕوتی و ئەتك کراوی بێنێتەوە، وە لەوانەیە بکەوێتە دەستی کۆمەڵێك موشریك، جا لەبەر ئەوە ئەوەی کە باسمان کرد باشترە.

**گەڵاو پەلکە دار خستنە سەر گۆڕ:**

شەرعی نییە کە گەڵاو پەلکە دارو گوڵ بخرێتە سەر گۆڕ، وە ئەوەی بوخاریو کەسانی تر ئەگێڕنەوە لە ئیبنوعەبباسەوە کە پێغەمبەر ﷺ بەلای دوو گۆڕدا تێ پەڕی و فەرمووی: (إنَّهُمَا يُعَذَّبَانِ، وَمَا يُعَذَّبَانِ فِي كَبِيرٍ، أمَّا هَذَا فَكَانَ لايَستَنزِهُ مِنَ البَولِ، وَأمَّا هَذَا فَكَانَ يَمشِي بِالنَّمِيمَةِ، ثُمَّ دَعَا بِعَسِيبٍ رُطَبٍ، فَشَقَّهُ بِاثْنَينِ، ثُمَّ غَرَسَ عَلَى هَذَا وَاحِداً، وَعَلَى هَذَا وَاحِداً وَقَالَ : لَعَلَّهُ يُخَفِّفُ عَنهُمَا مَا لَم يَيْبَسَا). واتە: ئەم دوانە ئێستا سزا ئەدرێن و لەسەر تاوانی گەورەش سزا نادرێن، ئەمەیان خۆی نەئەپاراست لە میز و

خۆی خاوێن نەدەکردەوە، وە ئەوەیان دوو ڕویی ئەکرد لەنێوان خەڵکدا، لەپاشاندا داوای لقە هێشوبەکی خورمای تەڕی کرد، لقەکەی کرد بە دوو بەشەوە و هەر بەشێکی لە سەر گۆڕێك چاند و فەرمووی: بە ئومێدی ئەوەی خوا سزایان لە سەر سوك بکات. هەتا ئەم شوڵانە ووشك ئەبن.

(خطابي) وەڵامی ئەوەی داوەتەوەو وتوویەتی: چاندنی نیوە شولکەکەو ئەوەی کە فەرمویەتی: (بە ئومێدی ئەوەی خوا سزایان لەسەر سوك بکات هەتا ووشك ئەبن)، ئەوە لەڕووی تەبەڕڕوك بە شوێنەواری پێغەمبەرەوە بووە، وە هەروەها بە پاڕانەوەکەی کە لەسەریان سوك بێت، وەك ئەوەی پێغەمبەر ﷺ ماوەی تەڕێتی داناوە بۆ سنوری پاڕانەوەکەی کە لەماوەی ئەوەندەدا خوا سزایان لە سەر سوك بکات.

نەك لە بەر ئەوەی لە پەلکی داری تەڕدا شتێك هەبێت کە لە ووشکدا نەبێت، وە عامەی خەڵك لە زۆربەی وولاتەکاندا ئەچن گەڵا و پەلکە داری تەڕ ڕائەخەن لەناو گۆڕی مردووەکانیان، من واتێ ئەگەم کە بۆ ئەوە چووبن کە سزا لەسەر مردوو لابەرن، بەڵام بەهیچ شێوەیەك وەها نییەو هیچ پەیوەندییەکی نییە بەسەر کارەکەی پێغەمبەرەوە ﷺ.

ئەوەی (خطابي) ووتویەتی ڕاستە، وە یارەکانی پێغەمبەر هەر بەوشێوەیەی تێگەیشتوون، چونکە لە کەسیانەوە نەقڵ نەکراوە کە لق‌و گەڵای دارو گوڵیان لەسەر گۆڕ دانابێ، جگە لە بورەیدەی ئەسلەمی کە ڕای سپارد دولق دار بخەنە ناو گۆڕەکەیەوە، بوخاری ڕیوایەتی کردووە.

ئەمەش دورە کە دانانی لق و گەڵای شتێکی مەشروع بوبێت و لە هەمو صەحابەکان شاراوە بێتو جگە لەبورەیدە کەسی تر نەیزانیبێ.

(حافظ) لە (فتح)دا ووتوویەتی: لەوە ئەچێ بورەیدە فەرموودەکەی لەسەر گشتێتی و عموم دانابێت، وە ئەوەی بەتایبەت نەزانیبێت بەو دووانەوە.

ئیبنوروشد ووتویەتی: وا دەرئەکەوێ لە تەصەروفی بوخارییەوە کە ئەوە تەنها تایبەت بووە بەو دوو کەسەوە، لەبەر ئەوە بەدوای دا قسەکەی ئیبنوعومەر ئەهێنی کاتێ بینی فەرشێك لەسەر گۆڕی (عبدالرحمن) ڕاخرابوو فەرمووی: کوڕە لێی بکەرەوە چونکە هەر کردەوەکانی ئەبنە سێبەری.

لە قسەکەی ئیبنو عومەردا دەرئەکەوێ کە هەرچی بخرێتە سەر گۆڕ هیچ کارێك ناکات بەڵکو کردەوەی چاك کار ئەکات.

**ژنێك بمرێ و منداڵێکی زیندو لە زگیدا بێت:**

ئەگەر ژنێك مردوو لە زگیدا کۆرپەلەیەکی زیندوو هەبێت پێویستە زگی هەڵدڕێ بۆ ئەوەی منداڵەکە دەربهێنرێ ئەگەر هیوای ژیانی لێ بکرێ، ئەوەش بەهۆی پزیشکی پسپۆڕی جێی باوەڕەوە ئەزانرێ.

**ئافرەتی کیتابی بمرێ و زگی پڕ بێت لە موسڵمانێك بەتەنها ئەنێژرێت:**

بەیهەقی ئەگێڕێتەوە لە واثیلەی کوڕی ئەسقەعەوە کە خۆی ژنێکی نەصرانی ناشتووە کە منداڵی موسڵمان لە زگی دا بووە لە شوێنێکدا کە نە گۆڕستانی موسڵمانان بووە نە گۆڕستانی گاور.

ئیمامی ئەحمەد ئەوەی هەڵبژاردوە، چونکە ئافرەتەکە خۆی کافرەو لە گۆڕستانی موسڵماناندا نانێژرێ، چونکە کاتێك ئەو سزا ئەدرێ موسڵمانانی دەوروپشتی تۆشی ئازار ئەبن، وە نابێ لە گۆڕستانی کافراندا بنێژرێ، چونکە منداڵەکەی موسڵمانەو توشی ئازار ئەبێت بە سزادانی کافرەکان.

**پەسەندیەتی ناشتنی مردوو لە گۆڕستاندا:**

ئیبنوقودامە ووتویەتی: مردوو ناشتن لە گۆڕستاندا باشتر بووە لای ئیمام ئەحمەد لەوەی کە لە ماڵدا بنێژرێ، چونکە زیانی کەمترە بو میراتگرە زیندوەکانی پاش خۆی، وە قەبری گۆڕستان زیاتر لە خانەی رۆژی دوایی ئەچێت، وە زیاتر پاڕانەوەی بۆ ئەچێت، وە بەردەوام صەحابەکان و تابیعیەکان وکەسانی پاش ئەوانیش لە بیاباندا نێژراون.

جا ئەگەر ووتیان: خۆ پێغەمبەر ﷺ لەماڵەکەیدا نێژراوە هەروەها ئەبوبەکر و عومەریش لەگەڵیدا نێژراون لە وەڵامدا ئەڵێین: عائیشە فەرمویەتی: ئەوەیان بۆیە کرد نەوەك گۆڕەکەی بکەنە مزگەوت. بوخاری گێڕاویەتیەوە.

هەروەها لەبەر ئەوە کە پێغەمبەر ﷺ خۆی یارەکانی لە بەقیع ئەناشت، جا کردەوەی پێغەمبەر ﷺ لە پێش ترە لە کردەوەی کەسانی تر، وە یارەکانی ڕایان وا بوو کە ئەو کارە تایبەتە بۆ پێغەمبەر ﷺ، چونکە ڕیوایەت کراوە کە فەرمویەتی: (يُدفَنُ الأنبِيَاءُ حَيثُ يَمُوتُونَ). واتە: پێغەمبەران لە کوێ کۆچی دواییان کرد لەوێ ئەنێژرێن.

ئەوەش زیاتر گۆڕەکەی ئەپارێزێ لە زۆری چونە سەری، وە بۆ ئەوەی لە خەڵکیش جیا بکرێتەوە.

پرسیار کرا لە ئەحمەد دەربارەی ئەو پیاوەی کە وەسیەت ئەکات لە ماڵەکەی خۆیدا بینێژن؟ ئیمام ئەحمەد فەرموی: لە گۆڕستانی موسڵماناندا ئەنێژرێ.

**قەدەغەیی جوێن دان بە مردوو:**

دروست نی یە جوێن دان بە مردووانی موسڵمان و باس کردنی خراپەکانیان، بە پێی ئەوەی بوخاری لە عائیشەوە ئەگێڕێتەوە خوا لێی ڕازی بێت کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (لاتَسُبُّوا الأموَاتَ فَإنَّهُم قَد أفضَوا إلَى مَا قَدَّمُوا). واتە: جوێن بە مردووان مەدەن، چونکە چوون بەرەو ئەوکارو کردەوەی کە پێش خۆیان ڕەوانەیان کردووە.

ئەبوداوودو (ترمذي) ئەگێڕنەوە بەسەنەدێکی لاواز لە ئیبنوعومەرەوە خوایان لێ ڕازی بێت کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (أُذكُروا مَحَاسِنَ مَوتَاكُم وَكُفُّوا عَن مَسَاوِيهِم). واتە: باسی چاکەکانی مردووەکانتان بکەن و لە خراپەکانیان مەدوێن.

بەڵام ئەو موسڵمانانەی بە ئاشکرا لە فەرمانی خودا دەرئەچوون یا بە ئاشکرا بیدعەیان ئەکرد، یان کاری خراپەیان ئەکرد، یادکردنەوەی خراپەی ئەوانە ڕەوایە ئەگەر بەرژەوەندی تێدا بوو، وەك ئەوەی بۆ ئاگادار کردنەوەو دورکردنەوی خەڵك بێت لە کارەکانیانو لە ووتەکانیان وە بۆ چاو لێ نەکردنیان، بەڵام ئەگەر هیچ بەرژەوەندی تێدا نەبوو ئەوە دروست نیيە باس بکرێن.

بوخاری و موسلیم لە ئەنەسەوە ئەگێڕنەوە خوا لێی ڕازی بێت فەرمویەتی: تەرمێکیان بەلاماندا برد خەڵکەکە بەباشی باسیان کرد. پێغەمبەر ﷺ فەرموی: (وَجَبَت) واتە پێویست بوو، لە پاشاندا تەرمێکی تریان برد بە خراپی باسیان کرد هەر فەرموی: (وَجَبَت) عومەر خوای لێ ڕازی بێت، ووتی چی پێویست بوو؟ فەرموی: (هَذَا أَثنَيتُم عَلَيهِ خَيراً فَوَجَبَت لَهُ الجَنَّةُ، وَهَذَا أَثنَيتُم عَلَيهِ شَرّاً فَوَجَبَت لَهُ النَّارُ، أَنتُم شُهَدَاءُ اللهِ فِي الأَرض). واتە: ئەوەیان کە بەچاکە باستان کرد بەهەشتی بۆ پێویست بوو، وئەوەیان کە بە خراپە باستان کرد ئاگری بۆ پێویست بوو، ئێوە شایەتی خوان لە سەر زەوی.

جوێن دان بە مردووی کافران و نەفرین لێ کردنیان دروستە، خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿لُعِنَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنۢ بَنِىٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ﴾ (المائدة/٧٨). واتە: نەفرین لەو بێ بڕوایانەی بەنی ئیسرائیل کراوە.

هەروەها فەرموویەتی: ﴿تَبَّتۡ يَدَآ أَبِى لَهَبٍ﴾ (المسد/١). دەستەکانی ئەبولەهەب لەناو چێ.

نەفرین کردن لە فیرعەونو هاو شێوەکانی، وە قسە پێ ووتنی بەناو بانگە لەناو کتێبەکەی خوادا وەك: ﴿أَلَا لَعۡنَةُ ٱللَّهِ عَلَى ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ (هود/١٨). واتە: ئاگادار بن نەفرینی خوا لەسەر ستەمکارانە.

**قورئان خوێندن لەسەر گۆڕ:**

زانایان جیاوازیان هەیە لە حوکمی قورئان خوێندن لەسەر گۆڕ، شافیعی و موحەممەدی کوڕی حەسەن بە پەسەندیان داناوە بۆ ئەوەی ئەو مردووە لە پیرۆزیەتیيەکەی خێری دەست بکەوێ، وە (قاضي عياض) و قەرافی لە مالیکیيەکان لەسەر ئەوەن، وە ئەحمەد ڕای وایە کە خراپ نیيە.

بەڵام مالیكو ئەبو حەنیفە بە کەراهەتیان داناوە، چونکە لە پێغەمبەرەوە ﷺ هیچ نەهاتووە لەو بارەیەوە.

**هەڵدانەوەی گۆڕ:**

زانایان لە سەر ئەوە ڕێکن کە ئەو شوێنەی موسڵمانێکی تێدا نێژرا ئەبێ بە شوێنی خۆی مادام گۆشت و ئێسقانی بمێنێ، جا ئەگەر شتێکی کەمیشی بمێنێتەوە بەتەووای لەناو نەچێ حەرامێتی ئەو شوێنە بۆ کەسێکی تر هەر بەردەوام ئەبێت، بەڵام ئەگەر لەناوچوو، و بۆوە بە گڵ ئەوە دروستە لەوشوێنەدا مردوویەکی تر بنێژرێ، یاسود لە زەویەکەی وەربگیرێ بۆ چاندن و خانو لەسەر کردن و شتی تر، جا ئەگەر گۆڕێك هەڵدرایەوە و پارچە ئێسکێکی تێدا مابو نابێت هەڵکەندنەوەکەی تەواو بکرێ، جا ئەگەر لە هەڵکەندنەکەی بووبۆوە لەپاشاندا چەن پارچە ئێسقانێکی دیەوە ئەبێ کۆی بکاتەوە لەلایەکی گۆڕەکەوە دای بنێت ئینجا دروستە مردوویەکی تری تێدا بنێژرێ، وە ئەگەر کەسێك پێش ئەوەی نوێژی لەسەر بکرێ لە گۆڕ خرا، ئەگەر گڵی بەسەردا نەکرابوو دەردەهێنرێتەوە نوێژی لەسەر دەکرێ، بەڵام ئەگەر گڵی بەسەردا کرابوو بەلای حەنەفی‌یەکان و شافیعی‌یەکان و ڕیوایەتێك لە ئیمام ئەحمەد حەرامە گۆڕەکەی هەڵکەندرێتەوە، وە هەر بەو شێوە بە نوێژی لەسەر دەکرێ، بەڵام لە ڕیوایەتێکی ئیمام ئەحمەدا گۆڕەکەی هەڵدەکەنن و لەدەرەوە نوێژی لەسەر دەکرێ.

هەرسێ پێشەوای ئیسلام بە دروستی دائەنێن کە گۆڕ هەڵبدرێتەوە لەبەر مەبەستێکی صەحیح، وەك ئەوەی شتێك لە گۆڕەکەدا بەجێ مابێ هەڵبدرێتەوە بۆ دەرهێنانی، یان ئەگەر مردووەکە ڕووی نەکرابووە قیبلە هەڵئەکەندرێتەوەو ڕووی ئەکرێتە قیبلە، یا شۆردنی ئەوەی نەشۆرابێت، یا بۆ چاك کردنی کفنەکەی، مەگەر ترسی لێك هەڵوەشانی هەبێت، ئەوە وازی لـێ‌ئەهێنرێ.

بەڵام حەنەفی‌یەکان پێچەوانەی ئەمانن لە هەڵدانەوەی گۆڕدا بۆ ئەوشتانە، و بەئەتك کردنی دائەنێن وە ئەتك کردنیش لە ئیسلامدا قەدەغەیە، ئیبنوقودامە ووتویەتی: ئەتك کردن تەنها بۆ کەسێکە کە تێك چووبێت ئەوەش هەڵئادرێتەوە.

وە ووتویەتی: ئەگەر بەبێ کفن نێژرا بوو دوو لایەنی هەیە: یەکەمیان وازی لـێ ئەهێنرێ، چونکە مەبەست لە کفن کردن داپۆشرانیەتی ئەو مەبەستەش بە خۆڵەکە بەجێ هاتوە، دووەمیان هەڵئەدرێتەوە چونکە کفن کردنی مردوو پێویستە، و وەك شۆردن وەهایە.

ئەحمەد ووتوویەتی: ئەگەر گۆڕ هەڵکەن خاکەنازەکەی لە گۆڕەکەدا بەجێ مابوو دروستە هەڵی بداتەوە بۆی، وە دەربارەی شت کەوتنە ناو گۆڕ وەك -پاچ و پارە- ووتویەتی هەڵئەدرێتەوە بۆ ئەو شتانە ئەگەر نرخیان هەبوو.

ووتیان: ئەی ئەگەر خاوەن مردووەکە حەقی ئەو شتانەی دا بە و کەسە؟

ووتی: جا ئیتر کابرا چی تری ئەوێت!؟

لەو بارەیەوە بوخاری لە جابیرەوە ئەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ هاتە سەر عەبدوڵلای کوڕی ئوبەی دووای ئەوەی خرابووە گۆڕەکەیەوە، فەرمانی دا دەریان هێناوە و خستیە سەر ڕانی و (نفث) فوی بە کەمێك تفەوە کرد بە سەریا و کراسێکی بۆ لەبەر کرد.

هەروەها ئەگێڕنەوە لێیەوە کە ووتویەتی: پیاوێك لەگەڵ باوکما نێژرا دڵم ئارامی نەگرت هەتا دەرم هێناوە و بەتەنها لە گۆڕێکدا ناشتم.

بوخاری بۆ ئەم دوو فەرموودەیە بابێکی داناوە کە نوسیویەتی: بابێك: ئایا مردوو لە گۆڕ یا لەلا دڕدا دەر ئەهێنرێتەوە لە بەر هۆیەك.

ئەبو داود لە عەبدوڵلای کوڕی عەمرەوە ئەگێڕێتەوە کە فەرمویەتی: گوێم لە پێغەمبەر ﷺ بووە کاتێ ئەچوین بۆ طائف و بەلای گۆڕێکدا تێ ئەپەڕین فەرموویەتی: (هَذَا قَبْرُ أَبِي رُغَالٍ وَكَانَ بِهَذَا الْحَرَمِ يَدفَعُ عَنهُ، فَلَمَّا خَرَجَ أَصَابَتهُ النِّقمَةُ الَّتِي أصابَت قَومَهُ بِهَذَا الْمَكَانِ فَدُفِنَ فِيهِ، وَآيَةُ ذَلِكَ: أَنَّهُ دُفِنَ مَعَهُ غُصنٌ مِن ذَهَبٍ، إن أَنتُم نَبَشتُم عَنهُ أَصَبتُمُوهُ مَعَهُ، فَابتَدَرَهُ النَّاسُ فَاستَخرَجُوا الغُصنَ). واتە: ئەوە گۆڕی ئەبو روغالە کە لەم حەرەمەدا ئەپارێزرا، کاتێ لێی دەرچوو توشی ئەو بەڵایە بوو کە خەڵکی ئەم شوێنە تووشی بوون لەم شوێنەدا، وە هەر لێرەش نێژراوە، نیشانەکەشی ئەوەیە کە پارچەیەك ئاڵتون لەگەڵیا نێژراوە ئەگەر هەڵی بدەنەوە ئەی دۆزنەوە، ئەڵێ خێرا خەڵکەکە دەستیان کرد بە هەڵدانەوەی و پارچەکەیان دەرهێنا.

(خطابي) ووتوویەتی: ئەو فەرموودەیە ئەبێتە بەڵگەی ئەوەی کە دروستە گۆڕی بێ بڕوایان هەڵبدرێتەوە ئەگەر شتێکی تێدا بێ موسڵمانان سودی لێ وەربگرن، چونکە حورمەتیان وەك حورمەتی موسڵمانان نیيە.

**گواستنەوە مردوو:**

لای شافیعی حەرامە مردوو لە شارێکەوە ببرێ بۆ شارێکی تر مەگەر ئەو شوێنە نزیك بێت لەمەککە و مەدینە و قودسەوە، ئەو کاتە دروستە ببرێ بۆ یەکێ لەم سێ شوێنە لەبەر پیرۆزییان.

بەڵام ئەگەر ئەو کەسە وەسیەتی کرد بوو کە ببرێ بۆ شوێنێکی تر جگە لەو سێ شوێنە، نابێت ڕاسپاردەکەی بەجێ بێت، چونکە ئەبێتە هۆی دواکەوتنی ناشتنی و تێك چوونی لاشەکەی.

هەروەها حەرامە گواستنەوەی لە گۆڕەکەیەوە مەگەر بۆ بەمەبەستێکی صحیح بێت.

وەك ئەوەی بێ شۆرین نێژرابێت یا ڕووی نەکرابێتە قیبلە، یا گۆڕەکەی ئاوەزێ بێت یا بەر لافاو کەوتبێ.

له (المنهاج) دا ووتوویەتی: هەڵدانەوەی گۆڕ و گواستنەوەی دوای ناشتنی حەرامە بۆ پێویستی نەبێت، وەك ئەوەی نێژرابێت بێ ئەوەی بشۆرێت، یالەزەوی داگیر كراودا نێژرابێت، یا بە دوو قوماشی داگیركراو كفن كرابێت، یا شتێك كەوتبێتە ناو گۆڕەكەوە، یاڕووەو قیبلە نەنێژرابێت.

لە لای مالیكی یەكان: دروستە مردوو لە گۆڕێكەوە بگوێزرێتەوە بۆ گۆڕێكی تر پێش ناشتن و دوای ناشتنی، وەك ئەوەی ترسی هەبێت ئەو گۆڕە ئاو دای‌بپۆشێ، یادڕندە مردووەكە بخوات، یا بۆ ئەوەی نزیكی بكاتەوەو كەس‌وكاری بتوانن سەردانی بكەن، یا بۆ ئەوەی ببرێتە گۆڕستانی كەس‌وكاری‌یەوە، یا بەهیوای پیرۆزی ئەو شوێنەی كەبۆی ئەگوێزرێتەوە، جا ئەگەر بەو شێوەیە بوو ئەوە گواستنەوەی دروستە بەمەرجێ نەبێتە هۆی ئەوەی زیان بەلاشەكەیان بگات و ئەتكیان پێ نەكرێت. وەك ئەوەی بتەقێت، یا تێك بچێت، یا ئێسقانەكانی بشكێت.

وە لای حەنەفی یەكان كەراهەتی هەیە مردوو لە شارێكەوە بگوێزرێتەوە بۆ شارێكی ترو پەسەندە هەر كەسە لە كوێدا مرد لە گۆڕستانی ئەو شارە بنێژرێ، وەخراپ نی‌یە پێش ناشتنی ماوەی میلێك یا دوو میل بگوێزرێتەوە، چونكە جاری وایە ماوەی نێوان شارو گۆڕستان ئەوەندە ئەبێت، وە حەرامە گواستنەوەی دووای ناشتن لەبەر هۆیەك نەبێت وەك لە پێشەوە باسكرا.

ئەگەر ئافرەتێك كوڕێكی مردو لە شارەكەی نەنێژرا ئەویش نەیئەتوانی ئارام بگرێ وە ویستی بیگوێزێتەوە، وەڵامی نادرێتەوە لەو بارەیەوە.

حەنبلی یەكان ووتویانە: وا پەسەندە شەهید لە هەرجێگایەك كوژرابێت لەو شوێنەدا بنێژرێ.

ئەحمەد ووتویەتی: كوژراوی جەنگ لە سەر حەدیسەكەی جابیر نەبێت كە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (إدفنوا القتلى في مصارعهم) واتە: كوژراوەكانی جەنگ لە شوێنی كوشتنیان بنێژن.

ئیبنو ماجە ئەگێڕێتەوە كە پێغەمبەر ﷺ فەرمانی‌دا كوژراوەكانی شەڕی ئوحود بگێڕنەوە شوێنی كوشتنیان، بەڵام جگە لەوان ئەڵێن مردو لە شارێكەوە ناگوێزرێتەوە بۆ شارێكی تر بۆ مەبەستێكی دروست نەبێت ئەوەش مەزهەبی ئەوزاعی و ئیبنومونذیرە.

عەبدوڵڵای كوڕی مەلیك ووتویەتی عەبدولڕەحمانی كوڕی ئەبوبەكر لە حەبەشە كۆچی دوایی كرد، تەرمەكەی هێنرایەوە مەككە و لەوێ نێژرا، كاتێ عائیشە هاتەوە چووە سەر گۆڕەكەی، وە فەرموی: سوێند بە خوا ئەگەر ئامادە ئەبووم لەلات لەكوێ مردی هەر لەوێ ئەبوایە ئەئەنێژرای، وە ئەگەر ئامادەی مردنت بومایە ئێستا نەئەهاتمە سەر گۆڕەكەت. چونكە ناشتنی مردو لە شوێنی مردن بار سوك ترو سەلامەتترە لەوەی كە تێك بچێت.

بەڵام ئەگەر مەبەستێكی دروستی تێدا بێت گواستنەوەی دروستە.

ئەحمەد ووتوویەتی: دەربارەی گواستنەوەی مردوو لە شارێكەوە بۆ شارێكی تر هیچ خراپی نازانم.

له زوهری پرسیار کرا دەربارەی ئەو کارە؟ ووتی: سەعدی کوڕی ئەبی وەققاص و سەعیدی کوڕی زەید لە عەقیقەوە گوێزرانەوە بۆ مەدینە.

**پرسە و سەرەخۆشی**

پرسە و سەرەخۆشی ئەوەیە کە بە چەند ووشەیەك بە کەس‌وکاری مردوو هەندێ لە ئازار و ماتەمیان کەم کرێتەوەو کارەساتەکەیان لەسەر سوك بکرێتەو وایان لێ بکرێ ئارام بگرن لە سەر ئەوەی کە توشی بون.

**حوکمەکەی:**

پرسە پەسەندە هەتا ئەگەر مردوەکە کافری زیمیش بێت، بەپێی ئەوەی ئیبنوماجە و بەیهەقی بە سەندێکی حەسەن لە عەمری کوڕی حەزمەوە ئەگێڕنەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ کە فەرمویەتی: (مَا مِن مُؤمِنٍ يُعَزِّي أخَاهُ بِمَصِيبَةٍ إلا كَسَاهُ اللهُ عَزَّوَجَل مِن حُلَلِ الكَرَامَةِ يَومَ القِيَامَةِ). واتە: باوەڕدار نىیە سەرەخۆشی لە برایەکی بکات ئیللا خوا خشڵی زێڕی بۆ لەبەر ئەکات لە ڕۆژی دواییدا. پرسەش لە جارێك زیاتر پەسەند نىیە.

وە پێویستە پرسە لەهەموو کەس‌و کاری مردوو بکرێ گەورەو بچوك و ژن و پیاو، جا ئەو پرسەیە چ پێش ناشتن بێت یا دوای ناشتن، هەتا سێ ڕۆژ، مەگەر پرسەکەر یا خاوەن مردووەکە ئەو کاتە ئامادە نەبێت، ئەو کاتە قەیناکە دوای سێ ڕۆژەکە سەرەخۆشی لێ بکرێت.

**زاراوەی سەرخۆشی:**

پرسە بەهەر ووشەو زاراوەیەك بەجێ دێت کە باری گرانی خاوەن مردووەکە سوك بکات و هەڵی بنێت لەسەر ئارام گرتن و دڵ چاك کردنەوەی، بەڵام ئەگەر لەسەر ئەو شێوەیە بێت کە لە ڕیوایەتدا هاتووە ئەوە باشترە، بوخاری ئەگێڕێتەوە لە ئوسامەی کوڕی زەیدەوە خوا لێیان ڕازی بێت ووتویەتی: کچێکی پێغەمبەر ﷺ کەسێکی نارد بۆ لای پێغەمبەر ﷺ پێی ڕاگەیەنێ کە کوڕێکمان مردووە بێت بۆ لامان. پێغەمبەریش ﷺ وەڵامی ناردەوە کە سڵاوی لێ بێت و ئەڵێت: (إنَّ للهِ مَا أخَذَ وَلَهُ مَا أعطَى وَكُلُّ شَيءٍ عِندَهُ بِأجَلٍ مُسَمَّى فَلتَصبِر وَلتَحتَسِب). واتە: ئەوەی خوا بردویەتی هی خۆیەتی، وە ئەوەشی کە ئەیدات هەر هی خۆیەتی، و هەموو شتێك لای خۆی کاتێکی دیاری کراوی هەیە، جا با ئارام بگری و بەهیوای پاداشت بێت.

(طبراني) و (حاكم) و ئیبنومەردەویە بەسەندێك ئەگێڕنەوە کە پیاوێکی لاوازی تێدایە لە موعاذی کوڕی جەبەلەوە خوا لێی ڕازی بێت کە کوڕێکی مرد، جا پێغەمبەر ﷺ نامەیەکی بۆ نارد تێیدا پرسەی کوڕەکەی لێ کردبوو، نوسی بووی: (بِسمِ اللهِ الرَّحمَنِ الرَّحِيمِ. مِن مُحَمَّدٍ رَسُولِ اللهِ إلَى مُعَاذِ بنِ جَبَلٍ. سَلامٌ عَلَيكَ، فَإنِّي أحمَدُ إلَيكَ اللهَ الَّذِي لا إلَهَ إلا هُوَ، أمَّا بَعدُ: فَأعظَمَ اللهُ لَكَ الأجرَ وَألهَمَكَ الصَّبرَ، وَرَزَقَنَا وَإيَّاكَ الشُّكرَ، فَإنَّ أنفُسَنَا وَأموَالَنَا وَأهلَنَا مِن مَوَاهِبِ اللهِ الهَنِيئَةِ وَعَوَارِيهِ المُستَودَعَةِ، مَتَّعَكَ اللهُ

بِهِ فِي غِبطَةٍ وَسُرُورٍ، وَقَبَضَهُ مِنكَ بِأَجرٍ كَثِيرٍ، الصَّلاَةَ وَالرَّحمَةَ وَالهُدَى، إِن احتَسَبتَهُ فَاصبِر، وَلا يُحبِط جَزَعُكَ أجرَكَ فَتَندَم، وَاعلَم أنَّ الجَزَعَ لايَرُدُّ مَيِّتاً، وَلايَدفَعُ حَزَناً، وَمَا هُوَ نَازِلٌ فَكَأنْ قَد، وَالسَّلام). واته: بەناوی خوای ڕەحمان و ڕەحیمەوە. لە موحەممەد نێرراوی خواوە بۆ موعازی کوڕی جەبەل، سەلامەت لێ بێت، پاشان من لەسەر تۆ سوپاسی ئەو خوایە ئەکەم کە هیچ پەرستراوێك نی یە بە حەق شایستەی پەرستن بێت جگە لە الله، دوای ئەوە: خوای گەورە پاداشتت بۆ زیاد بکات و ئارام گرتنت پێ ببەخشێ، وشوکرانەبژێری بەخشێ بە ئێمە و تۆش، چونکە خۆمان و ماڵمان و کەس‌وکارمان لەو بەخششە فراوانەی خوای گەورەیە، و لە سپاردەکانی‌یەتی کە وەری ئەگرێتەوە، خوای گەورەش لەکاتی شادی و خۆشیدا بەتۆی بەخشیون، وە بە پاداشێکی زۆرەوە لی‌ی وەرگرتویتەو.

جا نوێژ بکە و داوای لێ بوردن و بەزەیی بۆ بکە، جا ئەگەر لەسەر ئەو موصیبەتە بە ئومێدی پاداشتیت ئەوە ئارام بگرە، وە با بێ‌سەبری و دان بەخۆدا نەگرتنەکەت پاداشتەکەت هەڵ نەوەشێنێتەوە و پەشیمان ببیتەوە، بشزانە کە دان بەخۆدا نەگرتن مردو ناگێڕێتەوە، و خەفەتیش لانابات، وە ئەوەش کەدێتە خوار لە بەڵا ئەوە بزانە کە نزیکە ڕوو بدات. ئیتر سەلامەت لێ بێت[1].

شافیعی لە موسنەدەکەیدا ئەگێڕێتەوە لە جەعفەری کوڕی موحەممەدەوە لە باوکی‌یەوە لە باپیری‌یەوە فەرمویەتی: کاتێ پێغەمبەر ﷺ کۆچی دوایی کرد و پرسەکەی هات گوێیان لێ بوو کەسێك ئەی ووت: بەڕاستی لەلای خواوەیە پرسە و سەرەخۆشی بۆ هەموو لێ‌قەوماوێك، وە لەلایەن خواوەیە دانانی جێ‌نشین بۆ هەموو مردوویەك، وە پێ‌دا گەیشتن بەهەموو لەناوچویەك، جا ئێوەش برواتان بە خوا بێت و بە ئومێدی ئەوە بن، چونکە لێ‌قەوماوو موسیبەت بار کەسێکە کە لە پاداشت بێ بەری بێت. ئەمەش ئیسنادەکەی لاوازە.

زانایان ووتویانە: جا ئەگەر سەرەخۆشی لە موسڵمانێك کرد بە هۆی مردنی موسڵمانێك، با پێی بڵێ: خوا پاداشتت بداتەوەو ئارامیت پێ ببەخشێتەو لە مردووکەتان خۆش بێت.

ئەگەر سەرەخۆشی لە موسڵمانێك کرد بە مردنی کافرێك ئەڵێت: خوا پاداشتت بداتەوەو ئارامیت پێ ببەخشێت.

وە ئەگەر سەرەخۆشی لە کافرێك کرد بە مردنی موسڵمانێك، پێ‌ی بڵێت: خوا ئارامیت پێ ببەخشێ و لە مردووەکەت خۆش ببێت، وە ئەگەر سەرەخۆشی لە کافرێك کرد بە مردنی کافرێك پێ‌ی بڵێت: خوا جێ‌نشین بۆ مردووەکەتان دابنێ.

---

(١) ئەم ڕیوایەتە لاوازە و سابیت نی‌یە چونکە کوڕەکەی موعاذ دوای کۆچی دوایی پێغەمبەر ﷺ بە دوساڵ مردووە.

بەڵام وەڵامی سەرەخۆشی لێ کراو ئەمەیە کە بڵێت خوا پاداشتت بداتەوە و دوعاکەت وەربگرێت.

لەلای ئەحمەد ئارەزووی خۆیانە ئەوقە لەگەڵ یەك بکەن، وە ئەگەر ویستی نەیکات.

ئەگەر کەسێك کەسێکی بینی جلو بەرگی خۆی دادڕی بوو لەسەر لێ قەومانەکە ئەبێ هەر سەرەخۆشی لێ بکات و نابێ بۆ شتێکی پوچەڵ واز لە مافێك بهێنێ، وە ئەگەر بەرگری ئەوکارەی لێ بکات ئەوە چاك ترە.

## دانیشتن بۆ پرسەو سەرەخۆشی

سوننەت وەهایە کە کەسو کاری مردوو سەرەخۆشی یان لێ بکرێ و هەرکەس بەلای کاری خۆیدا بڕوات بێ ئەوەی کە دانیشن بۆی، ئائەوەیە ڕێو ڕەوشتی پێشینە چاکەکان. (سەلەفی صالح).

شافیعی لە (الأم)دا ووتوویەتی: پرسەی بە کۆمەڵم لا ناخۆشە، ئەگەر چی گریان و شیوەنیشی تێدا نەبێت، چونکە ئەوە غەمو پەژارە تازە ئەکاتەوە و مەسرەفیشی ئەوێ، لەگەڵ ئەو ئەسەرانەشدا کە لەمەوبەر باس کرا.

نەوەوی ووتوویەتی: شافیعیو هاوەڵەکانی ڕەحمەتی خوایان لێ بێت ووتوویانە: کەراهەتی هەیە دانیشتن بۆ پرسەو سەرەخۆشی، وە ووتویانە: مەبەست لە دانیشتن ئەوەیە کە کەسوکاری مردوو لە ماڵێکدا کۆ ببنەوە بۆ ئەوەی خەڵك بێت بۆ لایان سەرەخۆشیان لێ بکات، بەڵکو پێویستە لەسەریان بڕۆن بەلای کارو پێویستییەکانیانەوە، وە لەنێوان ژن و پیاودا جیاوازی نییە لە دانیشتندا، و بۆ هەردوکیان هەر کەراهەتی هەیە.

موحامیلی دانی بەوەدا ناوەو لە دەقی شافیعییەوە نەقڵی ئەکات خوا لێیان ڕازی بێت، وە ئەوەش کەراهەتی تەنزیهە ئەگەر شتی تازە پەیدابوی تێدا نەبوو، بەڵام ئەگەر شتی تری لەگەڵدا کرا وەك ئەو بیدعەتانەی کە حەرامن ـ وەك بەزۆری ڕوو ئەدات ـ ئەو کاتە دانیشتنەکەش حەرامێکە لە حەرامە خراپەکان، چونکە شتێکی تازە داهێنراوە، وەلە فەرموودەشدا هاتووە کە ئەفەرموێ: (أنَّ كُلَّ مُحدَثَةٍ بِدعَةٌ وَكُلَّ بِدعَةٍ ضَلالَةٌ). واتە: هەموو داهێنراوێکی تازە لە دیندا بیدعەیە، وە هەموو بیدعەیەکیش گومڕاییـ یە.

ئەحمەد و بەشی زۆری زانایانی حەنەفی ئەوە ڕاو بۆچوونیانە.

بەڵام حەنەفییە پێشینەکان بۆ ئەوە چوون کە دانیشتنی سێ ڕۆژ قەیناکە، بەمەرجێ لە مزگەوت دا نەبێت و حەرامیشی تێدا نەکرێ.

بەڵام ئەوەی ئێستا ئەکرێت لە تەعزیەدا کە سێ ڕۆژ کۆ ئەبنەوە لە مزگەوتدا یا چادرو دەوار هەڵئەدەن و فەرش ڕا ئەخەن و پارەو پولێکی زۆر بۆ شانازیو خۆ هەڵکێشان سەرف ئەکەن ئەوە لەکارە

تازەداهێنراوەکانە کە پێیان ئەڵێن بیدعە، و پێویستە لەسەر موسڵمانان خۆی لێ بپارێزن، ئەو کارەش حەرامە لەسەریان، بەتایبەتی کە ئەبینین زۆر شتی تێدا ئەکرێ پێچەوانەی قورئان و سوننەتەکانی تری پێغەمبەرن ﷺ، بەڵکو پەیڕەوی خورەوشتی سەردەمی نەفامی ئەکرێ وەك قورئان خوێندن بە گۆرانی‌یەوەو و ئیلتیزام نەکردن بە ئادابی قورئان خوێندن و گوێ نەگرتن لێ‌ی و خۆ خەریك کردن بە قسەکردن و جگەرە کێشان و گەلێ شتی تر، وە ئەوکەسانەی کە خاوەن هەواو ئارەزون بەمەشەوە نەوەستاون و زۆر لەوەش تێ پەڕیون ئەبینین خەڵکەکە بەو سێ ڕۆژە وازناهێنن لە ڕۆژی چل هەمیتیشدا ئەو بەزمە تازە ئەکەنەوە و ئەو بیدعە و خراپەیە دووبارە ئەکەنەوە، لەپاشاندا ساڵگەردی بۆ دائەنێن بە بۆنەی تێ پەڕبوونی ساڵێك بەسەر مردنیدا، بەم جۆرە شتی وەها ئەکرێ کە نە عەقڵ و نەشەرع وەری ناگرێ.

## سەردانی گۆڕستان

سەردانی گۆڕستان بۆ پیاوان موستەحەببە، بەپێی ئەوەی ئەحمەدو موسلیم و خاوەن سونەنەتەکان لە عەبدوڵڵای کوڕی بوریدەوە ئەگێڕنەوە ئەویش لە باوکی‌یەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (كُنتُ نَهَيتُكُم عَن زِيَارَةِ القُبُورِ، فَزُورُوهَا، فَإِنَّها تُذَكِّرُكُمُ الآخِرَةَ). واتە: لەوەپێش لێم قەدەغە کردبوون کە سەردانی گۆڕستان بکەن، جا بچن چونکە بیری ڕۆژی دوایی‌تان ئەخاتەوە.

ئەو قەدەغە کردنەش لە سەرتاوە بووە کە خەڵك تازە موسڵمان بوون‌و لە سەردەمی نەفامی‌یەوە نزیك بوون، چونکە لەو سەردەمەدا خەڵکەکە خۆیان نە ئەپاراست لە قسەی نابەجێ وناشرین، بەڵام کاتێ هاتنە ناو ئاینی ئیسلام وە بەتەواوی دڵنیا بوون لێی و فێری ئەحکامەکان بوون، پێغەمبەر ﷺ ڕێ‌ی دان کە بچن بۆ سەردانی گۆڕی مردووەکانیان.

لە ئەبو هورەیرەوە هاتوە کە پێغەمبەر ﷺ سەردانی گۆڕی دایکی کرد و لەسەر گۆڕەکەی گریاو ئەوانەشی هێنایە گریان کە بە دەوری‌یەوە بون، ئینجا فەرموی: (إستَأذَنتُ رَبِّي أن أستَغفِرَ لَهَا، فَلَم يُؤذَن لِي، وَاستَأذَنتُهُ أن أزُورَ قَبرَهَا فَأذِنَ لِي، فَزُورُوهَا فَإنَّهَا تُذَكِّرُ المَوتَ) رواه أحمد ومسلم وأهل السنن إلا الترمذي. واتە: داوام لە پەروەردگارم کرد کە ڕێم بدات داوای لێ خۆش بوون بکەم بۆ دایکم ڕێی نەدام، وە داوام لێ کرد کە ڕێم بدات بچمە سەر گۆڕەکەی جا ڕێی دام، ئێوەش بچن بۆ سەر گۆڕستان چونکە بیری مردنتان ئەخاتەوە.

جا کاتێ مەبەست لە سەردانی گۆڕستان ئەوەبێ کە یادی مردن‌و پەندی لێ وەربگیرێ، ئەوە دروستە چونە سەر گۆڕی بێ‌باوەڕیش هەر بەومەبەستە، بەڵام ئەگەر ستەمکار بوبن، و خوا بە ستەمەکەی خۆیان لەناوی بردبن، ئەوە وەها پەسەندە بە گریان و ملکەچی‌یەوە لەشوێنی گۆڕستان و شوێنی لەناوچونیاندا تێ

بپەڕێ، بە پێی ئەوەی بوخاری ئەگێڕێتەوە لە ئیبنو عومەرەوە کە پێغەمبەر ﷺ بە یارەکانی فەرموو ـ کاتێ گەیشتنە (حجر) دیاری ثمود ـ (لاتدخُلُوا عَلَى هَؤلاءِ المُعَذَّبِينَ إلا أن تَكُونُوا بَاكِينَ فَإن لَم تَكُونُوا بَاكِينَ فَلا تدخُلُوا عَلَيهِم، لايُصِيبُكُم مَا أصَابَهُم). واتە: مەچنە ناو ئەو سزادراوانەوە بەگریانەوە نەبێت، جا ئەگەر گریانتان نەهات مەچنە سەریان با ئێوەش توشی ئەوە نەبن کە ئەوان توشی بوون.

## شێوازی چونە سەر گۆڕ

ئەگەر کەسێك بیەوێت بچێتە سەر گۆڕێك ئەبێ کاتێ گەیشتە سەر گۆڕەکە ڕوبکاتە گۆڕەکە بۆلای قیبلەوە و بۆی بپاڕێتەوە لە خوا، لەم بارەیەشەوە گەلێ فەرمووده هاتووە:-

١- لە بورەیدەوە هاتوە فەرمویەتی: پێغەمبەر ﷺ فێری هاوەڵەکانی ئەکرد کاتێ بچنە سەر گۆڕستان چی بڵێن: ئەیفەرموو بڵێن: (السَّلامُ عَلَيكُم أهلَ الدِّيَارِ مِنَ المُؤمِنِينَ وَالمُسلِمِينَ، وَإنَّا إن شَاءَ اللهُ بِكُم لاحِقُونَ، أنتُم فَرَطُنَا وَنَحنُ لَكُم تَبَعٌ، وَنَسألُ اللهَ لَنَا وَلَكُمُ العَافِيَةَ) رواه أحمد و مسلم و غيرهما. واتە: سلاوتان لێ بێت ئەی دانیشتوانی ئەم جێگایە لە باوەڕدار و موسڵمانان، ئێمەش خوا بیەوێ پێتان ئەگەین، ئێوە پێش ئێمە کەوتون ئێمەش بەدواتانا دێین، داواکارین لە خوا عافیەتو سەلامەتی بەئێمە و ئێوە ببەخشێ.

٢- لە ئیبنو عەبباسەوە هاتوە کە پێغەمبەر ﷺ تێ پەڕی بەلای گۆڕستانی مەدینەدا و رووی تێ کردن و فەرموی: (السَّلامُ عَلَيكُم يَا أهلَ القُبُورِ، يَغفِرُ اللهُ لَنَا وَلَكُم؛ أنتُم سَلَفُنَا وَنَحنُ بِالأثرِ) رواه الترمذي. واتە: سلاوتان لێ بێت ئەی دانیشتوانی گۆڕستان، خوا لە ئێمەو لە ئێوەش ببورێ، ئێوە پێشمان کەوتون و ئێمەش واین لە شوێنتانەوە.

٣- لە عائیشەوە هاتوە کە فەرمویەتی: پێغەمبەر ﷺ کاتێ سەرەی ئەو ئەهات شەو لای بێت لە کۆتایی شەودا ئەچووە دەر بۆ گۆڕستانی بەقیع و ئەیفەرموو: (السَّلامُ عَلَيكُم دَارَ قَومٍ مُؤمِنِينَ، وَأتَاكُم مَا تُوعَدُونَ غَداً مُؤَجَّلُونَ، وَإنَّا إنْ شَاءَ اللهُ بِكُم لاحِقُونَ، اللَّهُمَّ اغفِر لأهلِ بَقِيعِ الغَرقَد) رواه مسلم. واتە: سلاوتان لەسەربێ ئەی نەتەوەی باوەڕداران، سبەینێ ئەوەی پەیمانتان پێ دراوە پێتان ئەگاتەوە و دوا خراوە، ئێمەش خوا بیەوێ پێتان ئەگەین، خوایە لە دانیشتوانی بەقیعی غەرقەد ببورە.

٤- هەر لە عائیشەوە ئەگێڕنەوە کە فەرمویەتی: ووتم: ئەی نێرراوی خوا! چیان پێ بڵێم کە چوومە سەر گۆڕیان؟ فەرمووی: بڵێ: (السَّلامُ عَلَى أهلِ الدِّيَارِ مِنَ المُؤمِنِينَ وَالمُسلِمِينَ، وَيَرحَمُ اللهُ المُستَقدمِينَ مِنَّا وَالمُستَأخِرِينَ، وَإنَّا إن شَاءَ اللهُ بِكُم لاحِقُونَ). واتە: بڵێ سلاو لە دانیشتوانی ئەم جێگایە لەباوەڕدارو موسڵمانان، خوا ڕەحم بکات بە پێش کەوتو دواکەوتوماں وە ئێمەش خوا بیەوێت پێتان ئەگەین.

بەڵام ئەوەی کە هەندێ نەزان دەیکەن لە دەست هێنان بە گۆڕو ماچ کردن و سوڕانەوە بەدەوریا ئەوە حەرامەو لە بیدعە خراپەکانە کە پێویستە مرۆڤی موسڵمان لێی دور بکەوێتەوە، چونکە ئەو کارە تەنها بەرامبەر کەعبە ئەکرێت خوای گەورە ڕێزی زیاتر بکات، وە نابێ گۆڕی هیچ کەسی تری لە سەر پێوانە بکری نەگۆڕی هیچ پێغەمبەرێك و نەگۆڕی هیچ پیاوچاکێك، وە هەموو خێر لە شوێن کەوتنی ڕەفتاری پێغەمبەردایە ﷺ وە هەموو شەڕیش لە (إبتداع) تازەداهێنانادایە.

ئیبنوقەییم ووتوویەتی: پێغەمبەر ﷺ کە بچوایە سەر گۆڕستان بۆ ئەوە ئەچوو بپاڕێتەوە بۆ مردووەکان و بەزەیی بە حاڵیان بێتەوە و داوای لێ بووردنیان بۆ بکات، بەڵام موشریکەکان بە پێچەوانەوە بوون، بۆ ئەوە ئەچونە سەر گۆڕستان کە لێیان بپاڕێنەوەو سوێندیان پێ بخۆن و داوای بەجێهێنانی کاریان لێ بکەن و پەنایان بۆ ببەن و ڕویان تێ بکەن، پێچەوانەی ڕێ و ڕەوشتی ڕاستی پێغەمبەر ﷺ.

چونکە ڕێو ڕەوشتی ڕاستی پێغەمبەر ﷺ ڕێی یەکتاپەرستیەو چاکە کردنە لەگەڵ مردوواندا، بەڵام ڕێو شوێنی ئا ئەوانە هاوبەش دانانە بۆ خواو خراپە کردنە لەگەڵ خۆیان و مردوواندا.

ئەوانەی بۆ سەرگۆڕ ئەچن سێ بەشن:

یا بۆ مردووەکە ئەپاڕێنەوە، یان بە خاتری مردووەکە ئەپاڕێنەوە، یان لای مردووەکە ئەپاڕێنەوە، وە وائەزانن کە پاڕانەوە لای ئەو مردووە چاکترە لە پاڕانەوەی ناو مزگەوت.

جا هەرکەس باش سەرنج بداتە ڕێو ڕەوشتی پێغەمبەر ﷺ و یارەکانی بۆی دەرئەکەوێت چەندە جیاوازی هەیە لەنێوان ئەو دوو ڕێگایەدا.

## چوونە سەر قەبرستان بۆ ئافرەتان

مالیكو هەندێ لە حەنەفییەکان و ڕیوایەتێکی ئەحمەد و بەشی زۆری زانایان ڕێیان داوە کە ئافرەت بچێتە سەرگۆڕستان، بە پێی حەدیسەکەی عائیشە کە فەرموی: چیان پێ بڵێم ئەی نێرراوی خوا ـ واتە کاتی سەردانی گۆڕستان ـ .

لە پێشەوە باسکرا لە عەبدوڵلای کوڕی ئەبی مولەیکەوە کە عائیشە ڕۆژێکیان ئەهاتەوە لە گۆڕستان، ووتم: ئەی دایکی موسڵمانان لە کوێ هاتیتەوە؟ فەرموی: لە سەر گۆڕی (عبدالرحمن)ی برام بووم، ئەڵێ: منیش پێم ووت: ئەی پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی نەکردبوو چونە سەر گۆڕستان؟ فەرموی: با، لەپێشەوە قەدەغەی کردبوو، دوایی فەرمانیدا بە چوونە سەر گۆڕ. حاکم و بەیهەقی گێڕاویانەتەوە، وە بەیهەقی ووتوویەتی: بەتەنها (بسطام)ی کوڕی موسلیمی بەصری ئەم حەدیسەی باس کردووە؛ بەڵام ئیمامی ذەهەبی ووتوویەتی صەحیحە.

له صەحیحەیندا هاتووە لە ئەنەسەوە کە پێغەمبەر ﷺ بەلای ئافرەتێکدا تێپەڕی کە ئەگریا لەسەر گۆڕی منداڵێکی، جا پێی فەرموو: (إتَّقِي اللهَ واصبِرِي، فَقَالَت: وَمَا تُبَالِي بِمُصِيبَتِي). واتە: لە خوا بترسە و ئارام بگرە، ژنەکەش ووتی: تۆ چ دەربەستی کارەساتی منی؟.

ئەڵێ: کاتێ پێغەمبەر ﷺ ڕۆیشت بە ئافرەتەکەیان ووت: ئەوەپێغەمبەر بوو ﷺ. ژنەکە وەك مردووی لێ هات، پاشان هاتەوە دەرگای ماڵی پێغەمبەر ﷺ لە بەردەگاکەیدا پاسەوانی ماڵی نەبینی، چووە ژوورەوە ووتی: ئەی نێرراوی خوا نەم ناسیت، فەرموی: (إنَّمَا الصَّبرُ عِندَ الصَّدمَةِ الأُولَى). واتە: لەیەکەم جاری لێ قەومانەکەدا ئەبێت خۆت بگری و ئارام بیت.

جا ئەوەی بکرێتە بەڵگە لەم حەدیسەدا ئەوەیە کە پێغەمبەر ﷺ کاتێ ئافرەتەکەی بینی لەسەر گۆڕەکە ئینکاری لێ نەکرد.

وە لەبەر ئەوەی چونە سەر گۆڕ بۆ ئەوەیە یادی ڕۆژی دوایی بکرێتەوە، ئەوەش و کارێکە ژن‌و پیاو تێیدا هاوبەشن، وە پیاو لە ئافرەت زیاتر پێویستی بەوە نی‌یە کە بیری مردن و ڕۆژی دوایی بکاتەوە.

وە کۆمەڵێك بە کەراهەتی دائەنێن چونە سەر گۆڕستان لەلایەن ژنانەوە، لەبەر کەم ئارامی و زۆر دڵ تەنگ بونیان، وە لەبەر فەرمودەی پێغەمبەر ﷺ کە فەرمویەتی: (لَعَنَ اللهُ زُوَّارَاتِ القُبُورِ) رواه أحمد و ابن ماجة و الترمذي وصححه. واتە: نەفرینی خوا لەو ئافرەتانە بێت کە زۆر ئەچنە سەر گۆڕستان.

(قرطبی) ووتویەتی: ئەو نەفرینە کە کراوە لە فەرمودەکەدا بۆ ئەو ئافرەتانەیە کە زۆر ئەچنە سەر گۆڕستان، لەبەر ئەوەی زاراوەی حەدیسەکە واتەگەیەنێت. وە لەوانەشە هۆکەی ئەوە بێت ئەو ئافرەتە ئەگەر ئەوەندە بچێتە سەر گۆڕستان خۆی ئەڕازێنێتەوە و مافی مێردەکەی ئەفەوتێنێ، هەروەها لەو شین‌و شەپۆڕەی کە ئافرەت ئەیکات وە گەلێ شتی تر، وە ووتراوە: ئەگەر چوونە سەر گۆڕستان لەوانە دور بوون، ئیتر لاری لە ڕێ دانیان نی‌یە، چونکە یادی مردن بۆ ژن و پیاو پێویستە.

شەوکانی تەعلیقی لەسەر قسەکەی (قرطبی) داوەو ووتوویەتی: ئەوە ئەو قسەیەیە کە پێویستە پشتی پێ ببەسترێ بۆ کۆ کردنەوەو ڕێك خستن لەنێوان حەدیسەکانی ئەم بەشە کە بە ڕواڵەت پێچەوانەی یەکن.

### ئەو کردەوانەی سوود بە مردوو ئەگەیەنن

ئەوەی زانایان لە سەری ڕێك کەوتوون ئەوەیە کە مردوو سود لەو کارە خێرانە وەرئەگرێ کە خۆی هۆیەك بووە لە ژیانیا بۆ دروست بونیان. بە پێی ئەوەی موسلیم‌و خاوەن سوننەکان ئەگێڕنەوە لە ئەبی هورەیرەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمورویەتی: (إذَا مَاتَ ابنُ آدَمَ انقَطَعَ عَمَلُهُ إلا مِن ثَلاثٍ: صَدَقَةٍ جَارِيَةٍ، أو عِلمٍ يُنتَفَعُ بِهِ، أو وَلَدٍ صَالِحٍ يَدعُو لَهُ). واتە: ئەگەر ئادەمیزاد بمرێ کاری لە دونیا ئەبڕێ ئیللا لە سێ شتدا

نەبێت: صەدەقەیەکی بەردەوام، یا زانستێك کە سوودی لێ وەر بگیرێ، یا کوڕێکی صالح و چاك کە بۆی بپارێتەوە.

ئیبنوماجە لە ئەبوهورەیرەوە ئەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (إنَّ مِمَّا يَلحَقُ المُؤمِنَ مِن عَمَلِه وَحَسَنَاتِه بَعدَ مَوتِه عِلماً عَلَّمَهُ وَنَشَرَهُ، أو وَلَداً صَالِحاً تَرَكَهُ، أو مُصحَفاً وَرَّثَهُ، أو مَسجِداً بَنَاهُ، أو بَيتاً بَنَاهُ لابْنِ السَّبِيلِ، أو نَهراً أكرَاهُ، أو صَدَقَةً أخرَجَهَا مِن مَالِه فِي صِحَّتِه وَحَيَاتِه تَلحَقُهُ مِن بَعدِ مَوتِه). واتە: ئەوەی ئەگات بە باوەڕدار لە کردارو چاکەکانی پاش مردنی، زانستێکە فێری بوو بێت و بڵاوی کردبێتەوە، یا کوڕێکی چاکی بەجێ هێشتبێ، یا قورئانێکی نوسیبێتەوە و بەجێی هێشتبێ بۆ وەرسەکانی، یا مزگەوتێك کە خۆی دروستی کردبێ یا خانویەك خۆی دروستی کردبێ بۆ ڕێبواران، یا ڕوبارێکی هەڵبەستبێ، یا خێرێك کە لە ژیانیدا لەو سامانەی بویەتی جیای کردبێتەوەو دوای خۆی کرابێت بە خێر، ئەویش پێی ئەگات لە دوای مردنەکەی.

موسلیم لە جەریری کوڕی عەبدوڵڵاوە ئەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (مَن سَنَّ فِي الإسلامِ سُنَّةً حَسَنَةً، فَلَهُ أجرُهَا وَأجرُ مَن عَمِلَ بِهَا مِن بَعدِهِ مِن غَيرِ أن يُنقَصَ مِن أُجُورِهِم، وَمَن سَنَّ فِي الإسلامِ سُنَّةً سَيِّئَةً، كَانَ عَلَيهِ وِزرُهَا وَوِزرُ مَن يَعمَلُ بِهَا مِن بَعدِهِ مِن غَيرِ أن يُنقَصَ مِن أوزَارِهِم شَيءٌ). واتە: هەرکەس لە ئیسلامدا ڕەفتارێکی چاك دابنێ، ئەوە خێری ئەو کارەی بۆ هەیەو هەروەها خێری ئەو کەسانەی کە لەسەر ئەو ڕەفتارە ئەڕۆن، بێ ئەوەی لە پاداشتی ئەوان کەم بکات، وە هەرکەس لە ئیسلامدا ڕەفتارێکی ناشیرین دابنێ، ئەوە تاوانی ئەو کارەی لەسەرە لەگەڵ تاوانی ئەوکەسانەی کە لەسەری ئەڕۆن، بێ ئەوەی لە تاوانی ئەمان کەم بکاتەوە.

بەڵام ئەو کارە چاکانەی کە کەسێکی تر بیانکات و مردوەکە سودیان لێ وەربگرێت، بەم جۆرەی خوارەوەیە:

١- پاڕانەوەو داوای لێ بوردن بۆی، ئەمەش ئیجماعی لەسەرە بە پێی فەرمودەی خوای گەورە کە ئەفەرموێ: ﴿وَالَّذِينَ جَاءُو مِنْ بَعْدِهِمْ يَقُولُونَ رَبَّنَا اغْفِرْ لَنَا وَلِإِخْوَانِنَا الَّذِينَ سَبَقُونَا بِالْإِيمَانِ وَلَا تَجْعَلْ فِي قُلُوبِنَا غِلًّا لِلَّذِينَ آمَنُوا رَبَّنَا إِنَّكَ رَءُوفٌ رَحِيمٌ﴾ (الحشر/١٠). واتە: ئەوانەی دێن لە دوای ئەوانەوە ئەڵێن: پەروەردگارمان لە گوناهی ئێمەو ئەو برایانەمان خۆش ببە کە لە پێشمانەوە باوەڕدار بوون، وە هیچ کینەیەك مەخەرە دڵمانەوە بەرامبەر ئەوانەی باوەڕدارن، پەروەردگارمان بەڕاستی تۆ ڕەئوف و ڕەحیمی.

لە پێشەوە باسکرا کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (إذَا صَلَّيتُم عَلَى المَيِّتِ فَأخلِصُوا لَهُ الدُّعَاءَ). واتە: ئەگەر نوێژتان لە سەر مردوویەك کرد بە ئیخلاصەوە بۆی بپاڕێنەوە.

لە پاڕانەوەکانی پێغەمبەردا ﷺ هاتووە کە ئەفەرموێ: (اللّٰهُمَّ اغفِر لِحَيِّنَا وَمَيِّتِنَا) ـ خوایە لە زیندوو مردومان ببورە ـ .

بەردەوام پێشینان و کە سانی دوای ئەوانیش هەر پاڕاونەتەوەو ئەپاڕێنەوە بۆ مردووان و داوای میهرەبانیو لـێ بوردنی خوایان بۆ ئەکەن بەبێ ئەوەی کەس ئینکاری ئەو کارە بکات.

۲- صەدەقە کردن:

ئەوەوی ئیجماعی هەموو زانایان لە سەر ئەوە ئەهێنێتەوە، کە خێر بری مردو ئەکەوێت و پاداشتەکەشی پێ ئەگات، چ لە کوڕەوە بێت یا لە کەسێکی ترەوە، بە پێی ئەوەی ئەحمەد و موسلیم و جگە لەوان ئەگێڕنەوە لە ئەبی هورەیرەوە کە پیاوێك هاتە لای پێغەمبەر ﷺ و پێی ووت: باوکم مردووە و سامانی بەجێ هێشتووە و وەسیەتی نەکردووە، ئایا لە جێی ئەو خێر لەو سـامـانە بکەم بۆی ئەبێت‌و ئەبێتە کەفارەت بۆی؟ فەرمووی: بەڵـێ.

لە حەسەنەوە هاتوە لە سەعدی کوڕی عوبادەوە کە ئەو کاتێ دایکی مرد، ووتی: ئەی نێرراوی خوا: دایکم کۆچی دوایی کردووە لە جێی ئەو خێری بۆ بکەم؟ فەرمووی: بەڵـێ، ئەڵـێ: ووتم: چ خێرێك باشترە؟ فەرمووی: ئاودان بە خەڵك.

حەسەن ووتویەتی: ئەوە بوو خێراوەکەی ئالی سەعد لە مەدینەدا. ئەحمەدو نەسائیو کەسانی تر گێڕاویانەتەوە.

وە دروست نی‌یە خێر کردن لەسەر گۆڕستانەکان، وە کەراهەتی هەیە لەکاتی ڕۆیشتنی جەنازەدا بکرێ:

۳- ڕۆژو:

بەپێی ئەوەی بوخاری و موسلیم لە ئیبنو عەبباسەوە ئەگێڕنەوە فەرمویەتی: پیاوێك هاتە لای پێغەمبەر ﷺ و ووتی: ئەی نێرراوی خوا دایکم مردووەو ڕۆژووی مانگێك قەرزارە، ئایا من بۆی بگرمەوە؟ فەرموی: (لَو كَانَ عَلَى أُمِّكَ دَينٌ أَكُنتَ قَاضِيَهُ عَنهَا؟ قَالَ: نَعَم. قَالَ: فَدَينُ اللهِ أَحَقُّ أَنْ يُقضَى). واتە: ئایا ئەگەر دایکت قەرزداری کەسێك بوایە بۆت ئەداوە؟ کابرا ووتی: بەڵێ فەرمووی: دە قەرزی خوا لەپێشترە بدرێتەوە.

٤- حەج :

بەپێی ئەوەی بوخاری لە ئیبنو عەبباسەوە ئەگێڕێتەوە کە ژنێك لە هۆزی جوهەینە هاتە لای پێغەمبەر ﷺ ووتی: دایکم نەزری کردووە بچێتە حەج، بەڵام کۆچی دوایی کردو حەجەکەی نەکرد، ئایا من لە جێی ئەو حەج بکەم؟ فەرمووی: (حُجِّي عَنهَا، أَرَأَيتَ لَو كَانَ على أُمِّكِ دَينٌ أَكُنتِ قَاضِيَتَهُ؟ اقضُوا، فَاللهُ أَحَقُّ بِالقَضَاءِ). واتە: لە جێی دایکت حەجەکە بکە، ئایا ئەگەر دایکت قەرزێکی لەسەر بوایە بۆت ئەداوە؟ قەرزەکان بدەنەوە، چونکە خوا لە پێش ترە قەرزی بدرێتەوە.

٥- نوێژ:

بەپێی ئەوەی (دارقطني) ئەگێڕێتەوە کە پیاوێك ووتی: ئەی نێرراوی خوا من دایكو باوکم کاتێ لە ژیاندا بوون چاکەم لەگەڵدا ئەکردن ئێستا چۆن ئەتوانم لەپاش مردنیان چاکەیان لەگەڵدا بکەم؟ پێغەمبەر ﷺ فەرموی : (إنَّ مِنَ البِرِّ بَعدَ المَوتِ أن تُصَلِّيَ لَهُمَا مَعَ صَلاتِكَ، وَأن تَصُومَ لَهُمَا مَعَ صِيَامِكَ). واتە: لە چاکە کردنی دوای مردنە کە لەگەڵ نوێژەکانتدا نوێژیش بۆ ئەوان بکەی و لەگەڵ ڕۆژووەکانتدا ڕۆژوش بۆ ئەوان بگری.

٦- قورئان خوێندن:

ئەمەش ڕای جومهوری زانایانە لە ئەهلی سوننەت، ئەوەی ووتوویەتی: ئەوەی بەناوبانگە لەمەزهەبی شافیعیدا ئەوەیە کە قورئان خوێندن ناگات بە مردوو.

وە ئەحمەدی کوڕی حەنبەل و کۆمەڵێك لە هاوەڵانی شافیعی بۆ ئەوە چون کە قورئان خوێندن ئەگات بە مردوو، جا وا باشە ئەو خوێنەرە کە لێ بووەوە بڵێ: خوایە پاداشتی ئەوەی خوێندوومە بگەیەنە بە فلان.

لە موغنی ئیبنوقودامەدا هاتووە: ئەحمەدی کوڕی حەنبەل ووتویەتی: مردوو هەرچی شتێکی خێری بۆ بکرێ پێی ئەگات، بەپێی ئەو فەرموودانەی لەو بارەیەوە هاتووە، وە چونکە موسڵمانان لە هەموو وڵاتێکدا کۆ ئەبنەوەو قورئان ئەخوێنن و هەدیەیەی ئەکەن بە مردوان بێ ئەوەی کەس ئینکاری ئەوە بکات، ئەمەش بوو بە ئیجماع.

بەڵام ئەوانەی کە ئەڵێن پاداشتی قورئان خوێندن ئەگات بەمردوو، ئەڵێن: بە مەرجێك پێی ئەگات کە ئەو قورئان خوێنە کرێ وەرنەگرێ، چونکە ئەگەر ئەوکەسە کرێی وەرگرت لەسەر ئەو خوێندنە، ئەوە حەرام ئەبێت لەسەر خوێنەرو کرێ دەر، وە ئەو خوێنەرە کە کرێکەی وەرگرت ئیتر پاداشتی نامێنێ لە سەر خوێندنەکە هەتا پێش کەشی بکات بە مردووەکە، بەپێی ئەوەی ئەحمد و (طبراني) و بەیهەقی لە (عبدالرحمن)ی کوڕی شیبلەوە ئەگێڕنەوە کە پێغەمبەر فەرمویەتی: (اقرَؤا القُرآنَ، وَاعمَلُوا... وَلا تَجفُوا عَنهُ، وَلا تَغفِلُوا فِيهِ، وَلا تَأكُلُوا بِهِ، ولا تَستَكثِرُوا بِهِ). واتە: قورئان بخوێنن و کردەوەی پێ بکەن... و لێی دور مەکەونەوە و لێی بێ ئاگا مەبن، وە بە قورئان خۆتان مەژێنن و خۆتان دەوڵەمەند مەکەن.

ئیبنوقەییم ووتویەتی: خوا پەرستی دوو بەشە: ماڵیو بەدەنی، وە پێغەمبەر ﷺ ئاگاداری کردووینەوە کە لەناو هەموو عیبادەتە سامانیەکاندا پاداشتی صەدەقە ئەگات بە مردوو، وە لەناو هەموو عیبادەتە بەدەنیەکاندا پاداشتی ڕۆژوو ئەگات بە مردوو، وە پێی ڕاگەیاندوین کە پاداشتی حەج کە عیبادەتێکی ماڵی و بەدەنیە ئەگات بە مردوو، جا ئەم سێ جۆرە سابت بوون بە دەق و ئیعتیبار.

**مەرجی نیەت هێنان:**

ئەبێ ئەو کارەی بۆ مردوو ئەکرێ نیەتی لێ بهێنرێ، ئیبنوعەقیل ووتوویەتی: ئەگەر کەسێك شتێکی کرد بۆ مردوو لە نوێژو ڕۆژوو قورئان خوێندن و بەخشینی بە مردوو، وەك ئەوەی بڵێ: پاداشتەکەی ئەبەخشم بە فلانە مردووی موسڵمان، ئەوە پێی ئەگات و سودی لێ وەرئەگرێت، بەمەرجێ نیەتی بەخشینەکە پێش تاعەتەکە بکەوێ و لەگەڵیدا بێت. ئیبنوقەییمیش ئەوەی تەرجیح داوە.

**چاکترین شت کە ببەخشرێ بە مردوو**

ئیبنوقەییم ووتوویەتی: ئەڵێن چاکترین شت ئەوەیە کە لە خۆیدا سودی زۆرتر بێت، بۆ نمونە بەندە ئازاد کردن لە بری مردو، پاشان خێرو صەدەقە چاکترە لە ڕۆژووگرتن بۆی، وە چاکترین صەدەقەش ئەوەیە کە ڕێ بکەوێت لەگەڵ پێویستی خێر پێ کراوەکەو بەردەوام و هەمیشەیی بێت، لەم بارەیەوە فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ کە فەرموویەتی: (أفضَلُ الصَّدَقَةِ سَقيُ المَاء) واتە: چاکترین صەدەقە خێراوە، ئەمەش لە شوێنێکا ئەبێت کە ئاوی کەم و ڕێبواری تینوی زۆر پێدا بڕوات، ئەگینا خێراو لە شوێنێکی پڕئاودا چاکتر نابێت لە خواردن بەخشین بۆ ئەو کەسانەی پێویستیان پێیەتی، هەروەها پاڕانەوە و داوای لێ خۆش بوون بۆی چاکترە ئەگەر ئەو کەسە بەدڵ و مل کەچیەوە بۆی بپاڕێتەوە، چونکە لە شوێنی خۆیدا لە صەدقە چاکترە بۆی، هەروەك نوێژ کردن لەسەری کاتێ جەنازەیەو نەنێژراوە چاکترە لە وەستان بۆ دوعاو پاڕانەوە بۆی لەسەر گۆڕەکەی.

بەگشتی چاکترین شت کە ببەخشرێ بەمردوو، بەندە ئازادکردنە، پاشان صەدەقە، پاشان پاڕانەوەو داوای لێ خۆش بون بۆی، پاشان حەج کردنە لەجیاتی.

**بەخشینی پاداشت بۆ پێغەمبەر ﷺ**

ئیبنوقەییم ووتوویەتی: ئەڵێن: لە زانایانی ئەم دواییەدا هەیە کە ئەڵێ پەسەندە، وە هەشیانە بە پەسەندی نازانێ و بە بیدعەی ئەزانێ، چونکە صەحابە شتی وەهایان نەئەکرد، وە پێغەمبەر ﷺ پاداشتی هەموو ئەو خێرانەی پێ ئەگات کە نەتەوەی ئیسلام ئەیکەن بێ ئەوەی لە پاداشتی ئەوان هیچ کەم بێتەوە، چونکە هەر ئەو بوو کە هەمو خێرێکی نیشان نەتەوەکەی دا، وە بانگی کردن بۆی، وە هەرکەس بانگەواز بکات بۆ ڕێی هیدایەت ئەوەندەی خێری شوێن کەوتوانی پێ ئەگات، بێ ئەوەی لە پاداشتیان کەم بێتەوە، جا هەموو ڕێ نمایی‌و زانستیەك نەتەوەکەی هەر لەسەر دەستی ئەوەوە پێیان گەیشتووە، لەبەر ئەوە ئەوەندەی پاداشتی ئەوان خێری پێ ئەگات، پێی ببەخشرێ یا پێی نەبەخشرێ.

**منداڵی موسڵمان و منداڵی موشریك :**

هەرمنداڵێك لە منداڵانی موسڵمانان کە بالغ نەبوبێ بمرێ ئەوە ئەچێتە بەهەشتەوە، بە پێی ئەوەی بوخاری ریوایەتی کردوە لە عەدی کوڕی ثابیتەوە کە گوێی لە بەراء بووە خوا لێی ڕازی بێت فەرمویەتی:

کاتێ ئیبراهیمی کوڕی پێغەمبەر ﷺ مرد پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (إِنَّ لَهُ مُرضِعاً فِي الجَنَّةِ) واتە: دایەنێکی هەیە لە بەهەشتدا شیری بداتێ.

(حافظ) لە (فتح الباري) دا ئەڵێت: بوخاری ئەوەی بۆیە کردووە بە بابێك چونکە وای دەرخستووە کە منداڵانی موسڵمانان ئەگەر مردن ئەچنە بەهەشتەوە.

ئەگێڕنەوە لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (مَا مِنَ النَّاسِ مُسلِمٌ يَمُوتُ لَهُ ثَلاثَةٌ مِنَ الوَلَدِ لَم يَبلُغُوا الحِنثَ، إلا أدخَلَهُ اللهُ الجَنَّةَ بِفَضلِ رَحمَتِهِ إِيَّاهُم). واتە: هیچ موسڵمانێك نیە سێ کوڕی نەبالغی مردبێ ئیللا کەمرد خۆشی ئەچێتە بەهەشتەوە بەهۆی سۆزو بەزەیی خواوە بەو منداڵانەدا.

ئەوەی کەلەم فەرموودەیەوە وەرئەگیرێ ئەوەیە کە هەرکەس ببێتە هۆی چونە بەهەشتی کەسێك خۆی لە پێش ترە بۆ چون چونکە ئەصلی ڕەحمەت و هۆیەکەیەتی. بەڵام منداڵانی موشریك و بێ باوەڕان ئەوانیش وەك منداڵی موسڵمانانن لە چونە بەهەشتدا.

نەوەوی ئەڵێت: ئەوە مەزهەبی ڕاست و هەڵبژێراوە لەلایەن لێ کۆڵەرەوانی ئیسلامەوە بە پێی فەرموودەی خوا کە ئەفەرموێ: ﴿وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّىٰ نَبْعَثَ رَسُولًا﴾ (الاسراء/١٥). واتە: ئێمە سزادەری کەس نین هەتا پێغەمبەری بۆ نەنێرین.

جا ئەگەر خوا سزای بالغو خاوەن ئاوەز نەدات هەتا نێرراوی بۆ نەنێرێ، چۆن سزای کەسێکی بێ ئاوەز ئەدات کە ئازار نەدانی ئەم لەپێشترە.

وە بە پێی ئەوەی ئەحمەد لە خەنسای کچی موعاویەی کوڕی صەریمەوە ئەگێڕێتەوە کە پوری ووتوویەتی: ووتم: ئەی نێرراوی خوا کێ ئەچێتە بەهەشتەوە؟ فەرمووی: (النَّبِيُّ فِي الجَنَّةِ، وَالشَّهِيدُ فِي الجَنَّةِ، وَالمَولُودُ فِي الجَنَّةِ) قال الحافظ إسناده حسن. واتە: پێغەمبەران ئەچنە بەهەشتەوە و شەهیدان ئەچنە بەهەشتەوەو منداڵان ئەچنە بەهەشتەوە.

## لێپرسینەوەی ناو گۆڕ

ئەهلی سونەت و جەماعەت لەسەر ئەوە ڕێکن کە هەموو مرۆڤێك لێی ئەپرسرێتەوە دوای مردنی، جا ئەو کەسە بخرێتە گۆڕەوە یان نەخرێتە گۆڕ، هەتا ئەگەر دڕندەش خواردبێتی یا سوتابێو بوبێ بە خۆڵەمێش یا بە هەوادا بڵاو بوبێتەوە، یا خنکابێ و لە ئاودا بێت، هەر پرسیاری لێ ئەکرێتەوە دەربارەی کردەوەکانی و پاداشتی ئەدرێتەوە بەخێر ئەگەر خێری کردبێ و بەشەڕ ئەگەر خراپەی کردبێ، وە سزادانو پاداشت دانەوە لەسەر گیانو لاشە ئەبێت بەیەکەوە.

ئیبنوقەیم ووتوویەتی: مەزهەبی پێشینەی نەتەوەی ئیسلام و پێشەواکانی ئەوەیە ئەگەر کەسێك مرد یا لە خۆشیدا ئەبێت یالە سزاو ناخۆشیدا، وە ئەمە خۆشی ناخۆشیەیە بۆ گیان و لاشەی روو ئەدات، وە گیان کە لە لاشە جیابۆوە، یا لە خۆشیدا ئەبێت یا لە ناخۆشیدا، وە جاری وائەبێت ئەگەڕێتەوە ناو لاشەکە و بەهەردووکیان ئازارو خۆشیەکەی ئەچێژن، لەپاشاندا کە ڕۆژی دوایی هات هەموو گیانەکان ئەگێڕرێنەوە ناو لاشەکان و لە گۆڕەکانیان هەڵئەسن بەرەو پەروەردگاریان ئەڕۆن. وە زیندوکردنەوەی لاشەکان شتێکە کە موسڵمان و جولەکەو گاور لە سەری ڕێکن.

مەروەزی ووتوویەتی: باوکی عەبدوڵلا ـ واتە ئیمام ئەحمەد ـ ووتوویەتی: سزادانی ناو گۆڕ حەقە گومڕا و گومڕاکەر نەبێ کەس ئینکاری ئەوە ناکات.

حەنبەل ئەڵێت: دەربارەی سزای ناو گۆڕ پرسیارم لە ئەبی عەبدوڵلا کرد ووتی: ئەو فەرموودانەی لەو بارەیەوە هاتوون ڕاستن‌و باوەڕمان پێیان هەیەو دانیان پێدا ئەنێین، وە هەرچی لە پێغەمبەرەوە ﷺ بە ئیسنادێکی (جید) هاتبێ قەبولی ئەکەین، چونکە ئەگەر ئێمە بڕیار لە سەر ڕاستی ئەو شتانە نەدەین کە لە پێغەمبەرەوە هاتوون مانای ئەوەیە فەرمانەکانی خوامان ڕەت کردۆتەوە، چونکە خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿وَمَآ ءَاتَىٰكُمُ ٱلرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَىٰكُمْ عَنْهُ فَٱنتَهُوا۟ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَۖ إِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ﴾ (الحشر/۷). واتە: پێغەمبەر ﷺ هەرچی بۆ هێناون وەریبگرن و لە سەری بڕۆن، وە هەرچی لێی قەدەغە کردن لێی دور بکەونەوە و دەستی لێ هەڵبگرن، وە لە خوا بترسن چونکە بەڕاستی خوا سزای توندە.

ئەڵێ پێم ووت: کەواتە سزای ناو گۆڕ هەقە؟ ووتی: هەقە، لە گۆڕدا مردوو سزا ئەدرێ.

وە ئەڵێت: گوێم لە ئەبا عەبدوڵلا بووە ئەی ووت: باوەڕمان بە سزای ناوگۆڕ هەیەو بەمونکیرو نەکیریش، وە بەوەی مردوو لە گۆڕدا پرسیاری لێ ئەکرێ: ﴿يُثَبِّتُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِٱلْقَوْلِ ٱلثَّابِتِ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَفِى ٱلْـَٔاخِرَةِ﴾ (ابراهیم/۲۷). واتە: خوای گەورە باوەڕداران جێگیر ئەکات لە ژیانی دونیاو ئاخیرەتدا لەسەر ئەم ووتە دامەزراوەی کە فێری بوون.

ئیمام ئەحمەد ئەڵێ: ئەمە لەناو گۆڕدا ئەبێت.

ئەحمەدی کوڕی قاسم ووتویەتی: ووتم ئەی ئەباعەبدوڵلا! دان ئەنێی بە بوونی مەنکیرو نەکیرو ئەوەی کە ئەگێڕرێتەوە دەربارەی سزای ناو گۆڕ؟ ووتی: سبحان الله... بەڵێ دانی پێدا ئەنێین و ئەشیڵێین؛ ووتم: بەم شێوەیە ئەیڵێیت: مونکیر و نەکیر، یا ئەڵێیت دوو فریشتە؟. ووتی: مونکیر و نەکیر.

ووتم: ئەڵێن لە فەرموودەکەدا مونکیرو نەکیر نەهاتووە، ووتی: هەروان. ـ واتە: مونکیر و نەکیرن ـ .

حافظ لە فەتحدا ئەڵێت: ئەحمەدی کوڕی حەزم و ئیبنوهەبیرە بۆ ئەوە چوون کە پرسیار لە (روح) گیانەکە ئەکرێ بێ ئەوەی بگێڕرێتەوە ناولاشەکەی، بەڵام جومهوری زانایان پێچەوانەی ئەمانن و ئەڵێن:

(گیان ئەگێڕرێتەوە ناولەش، یان ناو هەندێك لەش، وەك لە فەرموودەكەدا سابتە، جا ئەگەر پرسیار كردن تەنها لەسەر گیانەكە بوایە لاشە هیچ پەیوەندی نە ئەبوو، ئەمەش بەرگری ئەوە ناكات كە لاشەكە پارچە پارچەو بلاو بوبێتەوە، چونكە خوا دەسەلاتی ئەوەی هەیە ئەو گیانە بگێڕێتەوە ناو بەشێكی لاشەكەو پرسیارەكەی لێ بكرێ، وەك چۆن توانای ئەوەشی هەیە هەموو پارچەكان كۆ بكاتەوە و بیان كاتەوە بەیەك. وە ئەوانەی ئەلێن لێپرسینەوە تەنها لە (روح) گیانە بەوە وائەلێن كە جاری وا هەیە مردو ببیندرێ لە گۆڕەكەیدا، یا لەوكاتەدا هیچ نیشانەیەكیش دەرنەكەوێ، نە دانیشتنی لە گۆڕدا نەفراوان بوونی نەتەسك بوونەوەی، وە هەروەها كەسێك كە لە گۆڕ نەنرابێ هیچ نیشانەیەكی پێوە دەرناكەوی وەك كەسێك كە كرابێت بەدارا و هەر پێوەی مابێتەوە.

لە وەلامیاندا ئەلێین: ئەوە شتێك نیە لە دەسەلاتو توانای خوا دەربچێ، وە وێنەشی لە دونیادا هەیە كە نوستوە خەو ئەبینێ، توشی خۆشی و ناخۆشی ئەبێت بێ ئەوەی تەنیشتی كە نەنوستووە هەستی پێ بكات، وە هەروەها بە ئاگاش، كە هەست بەخۆشی یا ناخۆشی ئەكات لەدەرونیدا كاتێ بیر لە شتێك ئەكاتەوە یا ئەیبیستێ، بێ ئەوەی كە لە تەنیشتیەوە هەستی پێ بكرێت، جا هەلەكە لەوەدایە كە شتی نادیار لەسەر شتی دیار قیاس ئەكەن، و حالی دوای مردن لە سەر ئەو شێوەی پێش مردن قیاس ئەكەن. وە وادەرئەكەوێت خوای گەورە چاوو گوێی بەندە زیندووەكانی بەستووە لە بینین و بیستنی ئەوەو لێی شاردوونەتەوە ئەوەك یەكتر ئەنێژن.

وە ئەندامەكانی هەستی دونیایی توانای هەست كردنی كاروباری (ملكوت) یان نیە، مەگەر كەسێك كە خوا خۆی بیەوێ.

وە فەرموودەكان ئەوە سابت ئەكەن كە جومهور بۆی چوون وەك فەرمودەی: (إِنَّهُ لَيَسمَعُ خَفقَ نِعَالِهِم) واتە: مردو گوێی لە تەپەی نەعلەكانیانە.

وە ئەوەی ئەفەرموێ: (تَختَلِفُ أضلاعَهُ لِضَمَّةِ القَبرِ). واتە: پەراسوەكانی تێك ئەچرژێن بە كۆبونەوەی گۆڕەكە.

وە ئەوەی كە ئەفەرموێ: (يُسمَعُ صَوتَهُ إذَا ضَرَبَهُ بِالمِطرَقِ). واتە: دەنگی هاواری ئەبیسترێ كە بەو چەكوشە لێی بدەن.

وە كە ئەفەرموێ: (يُضرَبُ بَينَ أُذُنَيهِ) واتە: لەنێوان هەردوو گوێی ئەدەن.

وە ئەوەی ئەفەرموێ: (فَيُقعِدَانِهِ) واتە: دای ئەنیشێنن.

ئەمانە هەموی صیفەتی لاشەن.

ئێمەش باسی هەندێ لەو فەرمودە صەحیحانە ئەكەین كە لەوبارەیەوە هاتوون:

١- موسليم له زەیدی كوڕی ثابیتەوە ئەگێڕێتەوە كه فەرمویەتی: لەكاتێكدا پێغەمبەر ﷺ لەناو باغێكی بەنی نەججاردا بوو، بەسواری ئێسترەكەیەوە، ئێمەشی لەگەڵدا بوین، لەپڕ ئێسترەكەی راپەڕی خەریك بوو بیخاتە خوارەوە، سەیرمان كرد پێنج شەش گۆڕ لەوناوەدا بوون، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: كێ مردووی ئەم گۆڕانە ئەناسێ؟ كابرایەك ووتی: من ئەیان ناسم. فەرمووی: ئەمانە كەی مردوون؟ كابرا ووتی: لە سەردەمی نەفامیدا، فەرمووی: ئەم كۆمەڵە دوچاری سزا بون لە گۆڕەكەیاندا، جا ئەگەر لە بەر ئەوە نەبوایە كەئەوەك یەكتر نەنێژن داوام لەخوا ئەكرد ئەو سزای گۆڕەی من ئەی بیستم بیدایە بە گوێی ئێوەشدا، لەپاشاندا ڕووی تێ كردین و فەرمووی: پەنا بگرن بە خوا لە سزای ئاگری دۆزەخ، ووتیان: پەنا ئەگرین بەخوا لە سزای ئاگر.

فەرمووی: پەنا بگرن بەخوا لە سزای ناو گۆڕ، ووتیان: پەنا ئەگرین بە خوا لە سزای ناو گۆڕ، فەرمووی: پەنا بگرن بە خوا لەفیتنەی ئاشكراو نادیار ووتیان: پەنا ئەگرین بەخوا لە فیتنەی ئاشكراو نادیار، فەرمووی پەنابگرن بەخوا لە فیتنەی دەججال، ووتیان: پەنا ئەگرین بە خوا لە فیتنەی دەججال.

٢- بوخاری و موسلیم لە قەتادەوە ئەگێڕنەوە ئەویش لە ئەنەسەوە كە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (إنَّ العَبدَ إذَا وُضِعَ فِي قَبرِهِ وَتَوَلَّى عَنهُ أصحَابُهُ، وَإنَّهُ لَيَسمَعُ قَرعَ نِعَالِهِم، أتَاهُ مَلَكَانِ فَيُقعِدَانِهِ، فَيَقُولانُ لَهُ: مَا كُنتَ تَقُولُ فِي هَذَا الرَّجُلِ؟ ـ لِمُحَمَّد ـ فَأمَّا المُؤمِنُ فَيَقُولُ: أشهَدُ أنَّهُ عَبدُ اللهِ وَرَسُولُهُ؛ قَالَ: فَيَقُولانِ: أُنظُر إلَى مَقعَدِكَ مِنَ النَّارِ قَد أبدَلَكَ اللهُ بِهِ مَقعَداً مِنَ الجَنَّةِ، فَيَرَاهُمَا جَمِيعاً. وَأمَّا الكَافِرُ، وَالمُنَافِقُ، فَيُقَالُ لَهُ: مَاكُنتَ تَقُولُ فِي هَذا الرَّجُلِ؟ فَيَقُولُ: لا أدرِي، كُنتُ أقُولُ مَا يَقُولُ النَّاسُ. فَيَقُولانِ: لا دَرَيتَ وَلا تَلَيتَ، وَيُضرَبُ بِمَطَارِقَ مِن حَدِيدٍ ضَربَةً فَيَصِيحُ صَيحَةً فَيَسمَعُهَا مَن يَلِيهِ، غَيرَ الثَّقَلَينِ). واته: كاتێ مردوو ئەخرێتە ناو گۆڕەوەو خەڵكەكە بەجێی ئەهێڵن. ئەو گوێی لەدەنگی نەعلەكانیانە، دوو فریشتە دێنە سەری و داینەنیشێنن و پێی ئەڵێن: تۆ چیت ئەوت لەبارەی ئەو پیاوەوە ـ موحەممەد ﷺ ـ جا بڕوادار ئەڵێت: شایەتی ئەدەم كە ئەو بەندەو نێرراوی خوا بوو، پێی ئەڵێن: سەیری شوێنەكەت بكە لەناو ئاگردا خوا بۆی گۆڕیت بە شوێنێك لە بەهەشتدا، ئەویش هەردوو شوێنەكە ئەبینێ. بەڵام كافرو دوو ڕوو كە پێی ئەڵێن: تۆ چیت ئەووت لەبارەی ئەو پیاوەوە؟ ئەڵێ: نازانم، خەڵك چی ئەووت منیش هەروەهام ئەوت، پێی ئەڵێن: یاخوا هەر نەزان و نەخوێنەر بیت، بەكوتەكێكی ئاسن ئەكێشن بەسەریا هاوارێك ئەكات جگە لە جنۆكەو ئادەمیزاد هەمووشتێكی تر ئەی بیستێ.

٣- بوخاریو موسلیم و خاوەن سوننەكان لە بەرائی كوڕی عازیبەوە ئەگێڕنەوە كە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (المُسلِمُ إذَا سُئِلَ فِي قَبرِهِ فَشَهِدَ أن لا إلَه إلا اللهُ وأنَّ مُحَمداً رَسُولُ اللهِ، فَذَلِكَ قَولُ اللهِ: ﴿يُثَبِّتُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱلۡقَوۡلِ ٱلثَّابِتِ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا وَفِي ٱلۡأٓخِرَةِ﴾ (ابراهیم/٢٧). واته:

موسڵمان ئەگەر لە گۆڕدا پرسیاری لێ کراو شایەتیدا کەهیچ خوایەك نییە بەحەق شایستەی پەرستن بێت جگە لە (الله)، وە موحەممەد ﷺ نێرراوی خوایە، تا ئەوەیە کە خوا لە قورئاندا ئەفەرموێ: خوا باوەڕداران سابت ئەکات لەسەر ووتەی دامەزراو لە ژیانی دونیا وە لە ڕۆژی دواییدا.

وە لە لەفزێکدا ئەفەرموێ: (نَزَلَت فِي عَذَابِ القَبرِ يُقَالُ لَهُ: مَن رَبُّكَ؟ فَيَقُولُ: اللهُ رَبِّي، وَمُحَمَّدٌ نَبِيي، فَذَلِكَ قَولُ اللهِ: ﴿يُثَبِّتُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱلْقَوْلِ ٱلثَّابِتِ فِي ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَفِي ٱلْءَاخِرَةِ﴾ (إبراهيم/٢٧). واتە: ئەمە دەربارەی سزای ناو گۆڕ هاتۆتە خوارەوە بە مردووەکە ئەوترێ: پەروەردگارت کێیە؟ ئەویش ئەڵێت: خوا پەروەردگارمەو پێغەمبەرم محمدە، ئەوەش فەرموودەی خوای گەورەیە کە فەرمویەتی: خوا باوەڕداران سابت ئەکات لەسەر ووتەی دامەزراو لە ژیانی دونیا وە لە ڕۆژی دواییدا.

٤- لە موسنەدی ئیمام ئەحمەد و صەحیحی ئەبی حاتەمدا هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (إنَّ المَيّتَ إذَا وُضِعَ فِي قَبرِهِ إنَّهُ يَسمَعُ خَفقَ نِعَالِهِم حِينَ يُوَلُّونَ عَنهُ. فَإن كَانَ مُؤمِناً كَانَتِ الصَّلاةُ عِندَ رَأسِهِ، وَالصِّيَامُ عَن يَمِينِهِ، وَالزَّكَاةُ عَن شِمَالِهِ، وَكَانَ فِعلُ الخَيرَاتِ مِنَ الصَّدَقَةِ، وَالصِّلَةِ، وَالمَعرُوفِ والإحسَانِ عِندَ رِجلَيهِ، فَيُؤتَى مِن قِبَلِ رَأسِهِ، فَتَقُولُ الصَّلاةُ: مَا قِبَلِي مَدخَلٌ. ثُمَّ يُؤتَى مِن يَمِينِهِ، فَيَقُولُ الصِّيَامُ: مَا قِبَلِي مَدخَلٌ، ثُمَّ يُؤتَى مِن يَسَارِهِ، فَتَقُولُ الزَّكَاةُ: مَا قِبَلِي مَدخَلٌ، ثُمَّ يُؤتَى مِن قِبَلِ رِجلَيهِ، فَيَقُولُ فِعلُ الخَيرَاتِ مِنَ الصَّدَقَةِ وَالصِّلَةِ وَالمَعرُوفِ وَالإحسَانِ: مَا قِبَلِي مَدخَلٌ. فَيُقَالُ لَهُ: اجلِس فَيَجلِسُ، قَد مُثِّلَت لَهُ الشَّمسُ وَقَد أخَذَت لِلغُرُوبِ فَيُقَالُ لَهُ: هَذَا الرَّجُلُ الَّذِي كَانَ فِيكُم مَا تَقُولُ فِيهِ؟ وَمَاذَا تَشهَد بِهِ عَلَيهِ؟ فَيَقُولُ: دَعُونِي حَتَّى أُصَلِّي، فَيَقُولانِ: إنَّكَ سَتُصَلِّي، أخبِرنَا عَمَّا نَسألُكَ عَنهُ؟ أرَأيتَكَ هَذَا الرَّجُلَ الَّذِي كَانَ فِيكُم مَا تَقُولُ فِيهِ؟ وَمَا تَشهَدُ بِهِ عَلَيهِ؟ فَيَقُولُ: مُحَمَّدٌ؟ أشهَدُ أنَّهُ رَسُولُ اللهِ جَاءَ بِالحَقِّ مِن عِندِ اللهِ، فَيُقَالُ لَهُ: عَلَى ذَلِكَ حَيِيتَ، وَعَلَى ذَلِكَ مِتَّ، وَعَلَى ذَلِكَ تُبعَثُ إنْ شَاءَ اللهُ، ثُمَّ يُفتَحُ لَهُ بَابٌ إلَى الجَنَّةِ. فَيُقَالُ لَهُ: هَذَا مَقعَدُكَ وَمَا أعَدَّ اللهُ لَكَ فِيهَا. فَيَزدَادُ غِبطَةً وَسُرُوراً، ثُمَّ يُفسَحُ لَهُ فِي قَبرِهِ سَبعُونَ ذِرَاعاً وَيُنَوَّرُ لَهُ فِيهِ، وَيُعَادُ الجَسَدُ لِمَا بُدِيءَ مِنهُ، وَتُجعَلُ نَسمَتُهُ فِي النَّسِيمِ الطَّيِّبِ. وَهِيَ طَيرٌ مُعَلَّقٌ فِي شَجَرِ الجَنَّةِ، قَالَ: فَذَلِكَ قَولُ اللهِ تَعَالَى: ﴿يُثَبِّتُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱلْقَوْلِ ٱلثَّابِتِ فِي ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَفِي ٱلْءَاخِرَةِ﴾ (إبراهيم/٢٧).

واتە: مردوو کە خرایە گۆڕەکەیەوە گوێی لە تەقەی نەعلی نێژەرەکانیەتی کە ئەڕۆنەوە، جا ئەگەر ئەو کەسە موسڵمان بێت نوێژ لە ژوور سەریەوە ئەوەستێ و ڕۆژوو لەلای ڕاستیەوە و زەکات لەلای چەپیەوە و کردەوە چاکەکان وەك صەدەقە و سیلەی ڕەحم بەجێهێنان و چاکە لای خواریەوە ئەوەستێ. کەلای سەریەوە بۆی دێن نوێژ ئەڵێت: لای منەوە ڕێگا نییە. لەپاشاندا لای ڕاستیەوە بۆی دێن، ڕۆژوو ئەڵێت: لای

مەنەوە ڕێ نىیە. لە پاشاندا لای چەپیەوە بۆی دێن، زەکات ئەڵێت: لای مەنەوە ڕێ نىیە. لە پاشاندا لای خوارەوە بۆی دێن، کردەوەی چاك وەك صەدەقەو سیلەی ڕەحم بەجێ هێنان و چاکە کردن، ئەڵێت: لای مەنەوە ڕێ نىیە. ئیتر پێی ئەڵێن: دانیشە. ئەویش دائەنیشێ و ڕۆژی بۆ والێ ئەکەن کە لە ئاوابوندا بێت پێی ئەڵێن: ئەو پیاوەی لەناوتانا بوو تۆ چی ئەڵێیت دەربارەی؟ وە شایەتی چی لەسەر ئەدەی؟ ئەویش ئەڵێت: وازم لێ بهێنن با نوێژەکەم بکەم، پێی ئەڵێن: لەدواییدا نوێژ ئەکەی چیت لێ ئەپرسین وەڵامان بدەرەوە؟ هەواڵی ئەو پیاوەمان بدەرێ کە لەناوتانا بوو؟ شایەتی چی لەسەر ئەدەی؟ ئەڵێ: موحەممەد؟ شایەتی ئەدەم کە نێرراوی خوایەو لەلایەن خواوە ڕاستی هێناوە، پێی ئەڵێن: تۆ لە سەر ئەوە ژیایت و لەسەر ئەوە مردی لەسەر ئەوەش زیندو ئەکرێیتەوە ئەگەر خوا بیەوێ، لەپاشاندا دەرگایەکی بۆ گوشاد ئەکرێت کە بەسەر بەهەشتدا ئەڕوانێ پێی ئەوترێ: ئەوە شوێنەکەتەو ئەوەی خوا بۆی ئامادە کردووی تێیدا. ئەویش زیاتر دڵخۆش و شادومان ئەبێت، لە پاشاندا گۆڕەکەی بۆ فراوان ئەکرێ حەفتا باڵ وە بۆی ڕووناك ئەکرێتەوە، وە لاشەکەی ئەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی لێیْ دروست کراوە، و گیانەکەی ئەخرێتەوە ناو شەماڵێکی بۆن خۆش. کە ئەویش باڵندەیەکە خۆی هەڵواسیوە بەداری بەهەشتدا، لەپاشاندا فەرمووی: ئەوەیە کە خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿يُثَبِّتُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱلۡقَوۡلِ ٱلثَّابِتِ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا وَفِي ٱلۡأٓخِرَةِۖ﴾ (ابراهيم/٢٧).

وە دەربارەی کافر پێچەوانەی ئەوەی باس کرد هەتا فەرموی: (ثُمَّ يُضَيَّقُ عَلَيهِ فِي قَبرِهِ إِلَى أن تَختَلِفَ فِيهِ أضلاعُهُ، فَتِلكَ مَعِيشَةُ الضَّنكِ الَّتِي قَالَ اللهُ تَعَالَى: ﴿فَإِنَّ لَهُۥ مَعِيشَةً ضَنكًا وَنَحۡشُرُهُۥ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ أَعۡمَىٰ﴾ (طـه/١٢٤). واتە: لەپاشاندا گۆڕەکەی لێ دێتەوە یەك، هەتا پەراسوەکانی لێك تێ ئەپەڕێ، ئەوەیە ئەو ژیانە ناخۆشەیە کە خوا ئەفەرموێ: ژیانێکی ناخۆش و تەسکی توش ئەبێت، وە لە ڕۆژی دواییدا بە کوێری حەشر ئەکرێ.

٥- لە صەحیحی بوخاریدا هاتووە لە سەمورەی کوڕی جوندوبەوە فەرمویەتی: پێغەمبەرﷺ کە نوێژی ئەکرد ڕووی تێ ئەکردین و ئەی فەرموو: کێ لە ئێوە ئەمشەو خەوێکی بینیوە؟ ئەڵێ: هەرکەسێ خەوێکی دی بوو بۆی ئەگێڕاوە، ئەویش ئەیفەرموو: (ماشاء الله) جا ڕۆژێك پرسیاری لێ کردین و فەرمووی: ئایا کەس لە ئێوە خەوی بینیوە؟ ووتمان: نەخێر. فەرمووی: دە من ئەمشەو لە خەومدا دوپیاو هاتن دەستیان گرتم و بردمیان بۆ خاکی پیرۆز) (الأرض المقدسة) سەیرم کرد پیاوێك دانیشتبوو. وە پیاوێکیش بە پێوە وەستاوە قولاپێکی ئاسنی بەدەستەوەیە، ئەیخاتە لا لیفاوەی ئەو پیاوە دانیشتووە ڕای ئەکێشێ هەتا

لیغاوەکەی ئەهێنێتە پشتی سەری، لەپاشان لا لیغاوەکەی تریشی وەها لێ ئەکات، هەتا ئەم لای وا لێ ئەکرد ئەو لای چاك ئەبوەوە ئەویش دوبارە وای لێ ئەکردەوە، منیش ووتم: ئەوە چی‌یە؟

ووتیان برۆ، ڕۆیشتین هەتا گەیشتینە لای پیاوێك لەسەر پشت ڕا كشا بوو پیاوێکیش لە ژوور سەریەوە وەستابوو بەردێکی پڕ بەدەستی بەدەستەوە گرتبوو ئەی کێشا بەسەریا، کاتێ پیا ئەکێشا بەردەکە گلۆر ئەبۆوە، ئەویش ئەچوو بەردەکەی ئەهێناوە، کە ئەگەیشتەوە لای سەری چاك ئەبۆوە، دووبارە پیا ئەکێشاوە، ووتم: ئەوە چی‌یە؟ ووتیان: برۆ، ڕۆیشتین هەتا گەیشتینە لای چاڵێك وەك تەنور وابوو، سەرەوەی تەسك و بنەکەی فراوان بوو، ئاگری لەژێردا کرابۆوە. سەیرم کرد ژن و پیاوی ڕوتی تێدایەو گڕی ئاگر بۆیان دێت لە ژێرەوە. کە گڕەکەی لێیان نزیك ئەبۆوە خۆیان بەرز ئەکردەوە هەتا خەریك بوو ئەهاتنەدەر، کە گڕەکە ئەکوژاوە ئەگەڕانەوە- وتم: ئەوە چی‌یە؟ ووتیان: برۆ، ڕۆیشتین هەتا گەیشتینە سەر ڕوبارێکی خوێن، پیاوێك بە پێوە لەناو ڕوبارە خوێنەکەدا وەستابوو، وەلە ناوەڕاستی ڕوبارەکەدا پیاوێك ڕاوەستابوو کۆمەڵێك بەردی لە بەردەمدا بوو، ئەو پیاوەی لەناو ڕوبارەکەدا بوو کاتێ ئەهاتە پێشەوەو ئەی‌ویست بچێتە دەرەوە، کابرا بەردێکی ئەدا بەناو دەمیداو ئەی‌گێڕایەوە شوێنەکەی خۆی، سەیرم کرد هەرکاتێ بیویستایە بچێتە دەر بەردێکی ئەکێشا بەناو دەمیاو ئەی گێڕاوە، ووتم: ئەی ئەوە چی‌یە؟ ووتیان: برۆ هەتا بردمیانە ناو باغێکی سەوز کە دارێکی گەورەی تێدا بوو لە بن دارەکەدا پیرێکیشی لێ بوو لەگەڵ منداڵێکدا، لە نزیك دارەکەوە پیاوێك دانیشتبوو ئاگرێکی خۆش ئەکرد، بەدارەکەیا بردمیانە سەرێ، بردمیانە خانویەك هەرگیز خانووم لەوە خۆشتر نەدیبوو، پیرو گەنجی تێدا بوو، پاشان سەریان خستم بۆ خانوویەك لەوەی پێشوو خۆشتر بوو، ووتم: ئەمشەو زۆرتان سوڕانومەتەوە دە پێم بڵێن ئەوانە چی بوو بینیمن؟ ووتیان: بەڵێ باشە، ئەوەی کە لغاوەیان هەڵئەقڵیشاند ئەوە درۆزن بوو لە ژیانیدا بە درۆ قسەی ئەکرد، جا ئەو درۆیەی لێ هەڵئەگیرا هەتا ئەگەیشت بە گۆشەو کەنارەکانی ئاسمان، جا ئەوە هەتا ڕۆژی دوایی ئاوای پێ ئەکرێ.

وە ئەوەی سەریان بە بەردەکە ئەشکاند ئەوە پیاوێ بوو خوا فێری قورئانی کردبوو کەچی بەشەو ئەنوست و قورئانی نەئەخوێندو بەڕۆژیش کردەوەی پێ نەئەکرد، ئەوەش هەتا ڕۆژی دوایی هەر ئاوای پێ ئەکرێ.

وە ئەوانەی لەناو چاڵەکەدا بینیتێ ئەوە ئەوانەن کەزینا ئەکەن لە دونیادا.

وە ئەوەش لەناو ڕووبارەکەدا بوو سوود خۆر بوو لە دونیادا.

وە ئەو پیرەی لە بن دارەکەدا بوو ئیبراهیم بوو منداڵەکانیش منداڵی خەڵك بوون بەدەوریەوە، وە ئەوەی ئاگرەکەی ئەکردەوە (مالك) پاسەوانی ئاگر بوو، وە خانوەکەی یەکەمین خانووی عامەی باوەڕدارانە، بەڵام ئەم خانووەیان خانووی شەهیدانە، منیش جوبرەئیلم و ئەوەش میکائیلە. سەرت بەرز بکەرەوە ئەفەرموێ: کە سەرم بەرزکردەوە سەیرم کرد کۆشکێك وەك پەڵە هەور بەئاسمانەوە بوو، ووتیان: ئەوەش کۆشکەکەی

تۆیە، ئەفەرموێ: ووتم: دەوازم لـێ بێنن با بچمە کۆشکەکەمەوە، ووتیان: هێشتا تەمەنت ماوە لە دونیادا تەواوت نەکردووە، جا هەرکاتێ تەواوت کرد دێیت بۆ کۆشکەکەت.

ئیبنوقەییم ووتویەتی: ئەمە دەقێکە دەربارەی سزای بەرزەخ، چونکە خەوی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) وەحی یەو بەرامبەرە لەگەڵ حەقیقەتی شتەکەدا.

٦- (طحاوي) لە ئیبنو مەسعودەوە ئەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (أُمِرَ بِعَبدٍ مِن عِبَادِ اللهِ أن يُضرَبَ فِي قَبرِهِ مِائَةَ جَلدَة، فَلَم يَزَل يَسأَلُ اللهَ وَيَدعُوهُ حَتَّى صَارَت وَاحِدَةً، فَامتَلأَ قَبرُهُ عَلَيهِ نَاراً فَلَمَّا ارتَفَعَ عَنهُ أفَاقَ، قَالَ: عَلامَ جَلَدتُمُونِي؟ قَالُوا: إنَّكَ صَلَّيتَ صَلاةً بِغَيرِ طُهُورٍ وَمَرَرتَ عَلَى مَظلُومٍ فَلَم تَنصُرهُ). واتە: خوا فەرمانیدا یەکێ لە بەندەکانی سەد قامچی لـێ بدرێ لە گۆڕەکەیدا، ئەوەندە پاڕایەوە هەتا بۆی کرایە قامچی یەك، لە پاشاندا گۆڕەکەی پڕبوو لە ئاگر کاتێك ئاگرەکەی لە سەر لابرا هۆشی هاتەوەو ووتی: بۆچی قامچی ڕێژتان کردم ؟ ووتیان: تو نوێژت بێ دەست نوێژ ئەکردو بەلای ستەم لـێ کراویشدا تێ ئەپەڕیت کەچی یارمەتیت نەئەدا لە دونیادا.

٧- لە ئەنەسەوە هاتوە کە پێغەمبەر ﷺ گوێی لە دەنگێك بوو لە گۆڕێکەوە ئەهات فەرمووی: ئەمە کەی مردووە؟ ووتیان: لە سەردەمی نەفامی دا مردووە، ئەڵـێ: پێغەمبەر ﷺ دڵـێ خۆش بوو وە فەرمووی: (لَولا أن لا تَدَافَنُوا لَدَعَوتُ اللهَ أن يُسمِعَكُم عَذَابَ القَبرِ) رواه النسائي و مسلم. واتە: ئەگەر ترسی ئەوەم نەبوایە کە یەکرتی نەنێژن، لە خوا ئەپاڕامەوە کە دەنگی سزاي ناو گۆڕ بدات بە گوێتاندا.

٨- لە ئیبنوعومەرەوە خوا لـێیان ڕازی بێت هاتوە کە پێغەمبەر فەرموویەتی: (هَذَا الَّذِي تَحَرَّكَ لَهُ العَرشُ، وَفُتِحَت لَهُ أبوَابُ السَّمَاءِ وَشَهِدَهُ سَبعُونَ ألفاً مِنَ المَلائِكَةِ، لَقَد ضُمَّ ضَمَّةً ثُمَّ فُرِّجَ عَنهُ) رواه البخاري ومسلم والنسائي. واتە: ئا ئەوکەسەی کە عەرشی بۆ لەرزی و دەرگای ئاسمانەکانی بۆ کرایەوە، و حەفتا هەزار فریشتەی لەگەڵدا بوو کە نێژرا، گۆڕەوشارێك درا، پاشان وازی لـێ هێندرا، گۆڕەکەی کۆبۆوەو لەپاشاندا بەری دا) واتە: سەعدی کوڕی موعاذ.

## ئارامگای گیانەکان

ئیبنوقەییم بەشێکی داناوە باسی ڕای زانایان ئەکات دەربارەی ئارامگای گیانەکان، لەپاشان ڕاسترین ڕای باس کردووە ووتوویەتی : ئەڵێن: گیانەکان جێگاکانیان زۆر جیاوازە لە بەرزەخدا، چونکە گیانی وا هەیە لە بەرزترین شوێنە لە عالەمی (أرواح)دا کە ئەویش گیانی پێغەمبەرانە (علیهم الصلاة والسلام) وە ئەوانیش جێگاکانیان جیاوازە، وەکو پێغەمبەر ﷺ لە شەوڕەوی یەکەیدا کە پێی کراو چوو بۆ میعراج چاوی پێیان کەوت.

هەندێك لەو گیانانە لە چیكلدانی باڵندەی سەوزدان كە بەناو بەهەشتدا ئەگەڕێن بە ئارەزووی خۆیان، ئەویش گیانی هەندێ لە شەهیدانن، نەك هەمویان، بەڵكو هەندێك شەهید هەیە گیانەكەی بەند ئەكرێ لە چونە بەهەشت، بەهۆی قەرزاری یا شتی ترەوە، وەك لە موسنەددا هاتووە لە محمدی كوڕی عبداللهی كوڕی جەحشەوە كە پیاوێك هاتە لای پێغەمبەر ﷺ وەتی: ئەی نێرراوی خوا چیم بۆ هەیە ئەگەر لەڕێی خوادا بكوژرێم؟ فەرمووی: بەهەشت، كاتێك كابرا ڕۆیشت، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (إلا الدَّينَ، سَارَّنِي بِهِ جبريلَ آنِفاً). واتە: بەمەرجێك قەرزار نەبێت، ئێستا جوبریل چرپاندی بە گوێمدا.

هەندێكی كەیان لەبەر دەرگای بەهەشتدا بەند كراوە وەك لە فەرمودەیەكی تردا هاتووە كە فەرمویەتی: (رَأيتُ صَاحِبَكُم مَحبُوساً عَلَى بَابِ الجَنَّةِ). واتە: هاوەڵەكەتانم بینی كە بەندە لە بەردەرگای بەهەشت.

وە گیان هەیە لە گۆڕەكەیدا بەندە وەك ئەو پیاوەی كە پارچە قوماشێكی دزی بوو لە غەنیمەت، لەپاشاندا شەهید كرا، خەڵكەكە وتیان: لێی پیرۆز بێت لە بەهەشتدایە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (وَالَّذِي نَفسِي بِيَدِهِ إنَّ الشَّملَةَ الَّتِي غَلَّهَا لَتَشتَعِلُ عَلَيهِ نَاراً فِي قَبرِهِ). واتە: بەو زاتەی گیانی منی بە دەستە عەباكەی كە دزی لە غەنیمەت، لە گۆڕەكەیدا بووە بە ئاگرو تێی بەر بووە.

وە گیان هەیە: جێگاكەی دەرگای بەهەشتە وەك لە حەدیسەكەی ئیبنوعەبباسدا هاتوە: (الشُّهَدَاءُ عَلَى بَارِقِ نَهرٍ بِبَابِ الجَنَّةِ فِي قُبَّةٍ خَضرَاءَ، يُخرَجُ عَلَيهِم رِزقُهُم مِنَ الجَنَّةِ بُكرَةً وَعَشِيّاً) رواه أحمد. واتە: شەهیدەكان لە سەر ڕوبارێكن لە دەرگای بەهەشتدا لە گومەزێكی سەوزدا بەیانی و ئێوارە لە بەهەشتەوە ڕۆزیەیان بۆ دێ.

ئەمانە بە پێچەوانەی جەعفەری كوڕی ئەبو تالیبەوەیە كە خوا قۆڵەكانی بۆ ئەگۆڕێ بە دوباڵ لە بەهەشتا پێیان ئەفڕێ بە ئارەزووی خۆی.

وە گیان هەیە هەر لە زەویدا بەندە، وە بەرز نابێتەوە بۆلای عالەمی ڕۆحەكان، چونكە ئەو گیانانە خۆیان نزم و زەمینین، وە گیانە زەمینی‌یەكانیش تێكەڵ بە گیانە ئاسمانی‌یەكان نابن وەك چۆن لە دونیادا یەكیان نەئەگرت.

جا ئەو گیانەی لە دونیا هەوڵی نەداوە كە پەروەرگاری بناسێ و خۆشی بوێ و یادی بكاو لێی نزیك ببێتەوە، ئەوە گیانی زەمینی نزمە، كە لە لاشە جیابۆوە هەر لەوێ ئەبێت.

هەروەك چۆن گیانی بەرز لە دونیادا هەر خەریكی خۆشەویستی خواو یاد كردنی و هەوڵی نزیك بوونەوە بوە لێی، ئەو گیانە كەلە لاشەش جیابۆوە بەرز ئەبێتەوە بۆ لای گیانە ئاسمانی‌یەكان، چونكە پیاو لەگەڵ ئەوەدا ئەبێت كە خۆشی ویستووە لە بەرزەخ و ڕۆژی دواییدا.

خوای گەورەش گیانەکان جوت ئەکات بە یەکەوە لە بەرزەخ و ڕۆژی دواییدا، وەگیانی باوڕداران لەگەڵ گیانە پاکەکان یەك ئەخات، چونکە گیان کە جیابۆوە خۆی ئەگەیەنێتە ئەو گیانانەی کە لە خۆی ئەچن ئیتر لەگەڵیانا ئەمێنێتەوە.

جا هەندێ گیان هەیە کە لە تەنوری زیناکەراندایە، وە گیان هەیە لە ڕوباری خوێن دایە مەلەی تێدا ئەکات و بەرد قوت ئەدات، جا ڕۆحەکان —خۆش بەخت و بەدبەخت- یەك شوێنیان نیەیە، بەڵکو گیان هەیە لە شوێنە هەرە بەرزەکاندایە، وە گیانیش هەیە هەر لە زەوی دایەو بەرز نابێتەوە.

وە تۆ ئەگەر باش لە سوننەت و ئەسەرەکان کە لەم بارەیەوەن ووردبیتەوە وە زیاتر پەرۆش بیت پێیەوە ئەوە بەڵگەی ئەوەت دەست ئەکەوێ، وە گومانی ئەوە نەبەی کە ئەو ئەسەرە ڕاستانەی ناو ئەم بەشە هیچیان بەرهەڵستی هیچیان بکەن، چونکە ئەوانە هەموویان هەقن و یەکتری بەڕاست ئەگێرن، بەڵام ئەوەی کە گرینگە زانین و تێگەیشتنی ئەو سوننەت و ئەسەرانەیە، وە هەروەها ناسینی ڕۆح ـ گیان ـ و حوکمەکانی و ئەمە کە ڕۆح حاڵەتی وەهای هەیە کە جیاوازە لەگەڵ حاڵەتی لاشەدا، وە ئەو لەگەڵ ئەوەدا کە لە بەهەشتە لە ئاسمانیشە وە پەیوەندی ئەکات بەناو قەبرەکەو لاشەکە کە لەوێدایە، وە ئەو خێراترین شتە لە جموجۆڵ و گواستنەوەو سەرکەوتن و دابەزیندا، وە ڕۆح ئەکرێت بە چەند بەشی ئازادو بەند کراوو، بەرزو نزمەوە، وە ڕۆح دوای جیابونەوەشی لە لاشە حاڵەتی تەندروستی و نەخۆشی و خۆشی و خۆش گوزەرانی هەیە، هەروەها حاڵەتێکی ئازاری سەختی هەیە کە زۆر گەورەترە لە ئازاری ئەو کاتەی کە پەیوەست بو بە لاشەکەوە، جا لەو لاشەیەدا بەند کردن و ئازارو سزاو نەخۆشی و غەم خواردن هەیە، وە لەوێدا خۆشی وەرگرتن و ئاسایش و خۆش گوزەرانی و ڕەهایی هەیە، وە چەندە حاڵی ڕوح لە لاشەدا لە حاڵی لاشە ئەچێ لە سکی دایکیدا!! وە حاڵی جیابونەوەشی لە لاشە، لە حاڵی لاشە ئەچێت پاش دەرچونی لە سکی دایك بەرەو ئەم ماڵی دونیایە.

جا ئەم ڕۆحانە چوار ماڵیان هەیە، هەر ماڵێکیان گەورەترە لەوەی پێش خۆی.

ماڵی یەکەمیان: زگی دایکە ئەویش بریتییە لە تەسکی و تەنگەبەری و سێ تاریکییەکە.

ماڵی دووەمیان: ئەم دونیایەیە کە تێیدا گەورە ئەبێت و تێیدا ڕادێت و هەوڵی خێرو شەڕو هۆیەکانی بەختەوەری و بەدبەختی تێدا ئەدات.

ماڵی سێهەمیان: ماڵی بەرزەخە[1] کە گەورەترو فراوانترە لەم ماڵی دونیایە، وە ڕادەی نێوانیشیان وەك ڕادەی ماڵی یەکەم ـ زگی دایك ـ و ئەم دونیا وەهایە.

ماڵی چوارەمیان: ماڵی قەرار گرتنە ئەویش بەهەشتو جەهەننەمە ئیتر دوای ئەم دوانە ماڵی تر نیەیە.

---

(١) بەرزەخ: ئەو ماڵەیە کە لە نێوان دنیاو ڕۆژی دواییدایە، لەکاتی مردنەوە هەتا کاتی زیندو بونەوە.

خوای گەورە ئەو ڕۆحانە ئەگوێزێتەوە لەو ماڵانە، چین لە دوای چین، تاوەکو ئەیانگەیەنێت بەو ماڵەی کە جگە لەو هیچ ماڵێکی تری بۆ ناگونجێ و شیاوی نی‌یە، وە ئەو ڕۆحەش هەر بۆ ئەو جێگەیە دروست کراوەو ئامادە کراوە، تا ئەو کردەوەیە بکات کە بەوێی ئەگەیەنێت.

جا ڕۆح لە هەر ماڵێك لەو ماڵانە کارو فەرمانێکی هەیە، کە جیاوازە لەگەڵ کاروفەرمانەکەی تر، کەواتە پاك و بێگەردی بۆ الله کە لە نوێ دروست کەری ئەو ڕۆحانەیەو پەروەردەکەریانەو مرێنەریانەو ژیێنەریانەو خۆشبەخت کەریانەو بەدبەخت کەریانە، ئەو خوایەی کە جیاوازی خستۆتە نێوان ئەم ڕۆحانەوە لە پلەکانی بەختەوەری و بەدبەختیاندا، هەروەك چۆن جیاوازی خستۆتە نێوانیان لە پلەو پایەی زانستیان و کاروباریان و هێزو تواناکانیان و خوو ڕەوشتیان، جا هەرکەسێ ڕۆحی ناسی بەو جۆرەی کە ئەبێ بناسرێت، ئەوە شایەتی ئەدات کە هیچ پەرستراوێکی بە حەق نی‌یە جگە لەو خوایە بە تەنهاو بێ هاوبەشە، کە حوکمڕانی هەمووی بۆ ئەوەو سوپاس و ستایش هەمووی بۆ ئەوە، وە هەرچی خێر هەیە لە دەستی ئەودایە، وە هەرچی کارو فەرمان هەیە ئەگەڕێتەوە بۆلای ئەو، وە هێزو تواناو دەسەڵات و عیززەت و حیکمەت و کەمالی موتڵەق لە هەمو ڕویەکەوە هەمووی هی ئەوە، وە بە هۆی ناسینی گیانی خۆشی‌یەوە ڕاستی پێغەمبەرەکان و ڕەوانەکراوەکانی ئەزانێت، هەروەها ئەزانێت ئەوەی کە ئەو پێغەمبەرانە هێناویانە ئەو ڕاستەقینەیە کە عەقڵەکان شایەتی بۆ ئەدەن و سروشتی مرۆڤایەتیش ئیعتیرافی پێ ئەکات، وە هەر شتێك پێچەوانەی ئەوە بێت ئەوە پوچە... وە سەر کەوتنیش هەر لە خواوەیە.

## یادی خوا (الذکر)

زیکر: ئەوەیە کە بەسەر زمان و دڵدا تەڕوات لە یاد کردنی خوا بە پاك و بێگەردی و سوپاس و ستایشی و وەصف کردنی بە صیفەتەکانی کەماڵ و گەورەیی و جوانی.

١- خوای گەورە فەرمانی داوە کە زۆر یادی خوا بکرێت وەك ئەفەرموێت: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱذْكُرُواْ ٱللَّهَ ذِكْرًا كَثِيرًا ۝ وَسَبِّحُوهُ بُكْرَةً وَأَصِيلًا﴾ (الأحزاب/٤١-٤٢). واتە: ئەی ئەو کسانەی کە باوەڕتان هێناوە! زۆر یادی خوا بکەن و لە بەیانیان و ئێوارانیدا تەسبیحی بکەن.

٢- خوای گەورە پێی ڕاگەیاندوین هەرکەس یادی خوا بکات خواش یادی ئەکات وەك ئەفەرموێت: ﴿فَٱذْكُرُونِىٓ أَذْكُرْكُمْ﴾ (البقرة/١٥٢) واتە: یادم بکەن ـ بە تاعەت و عیبادەت ـ منیش یادی ئێوە ئەکەم ـ بە فەزڵ و لێخۆشبون ـ .

لە حەدیسێکی قودسی دا کە ئیمامی بوخاری و موسلیم گێراویانەتەوە ئەفەرموێت: (أَنَا عِندَ ظَنِّ عَبدِي بِي وَأَنَا مَعَهُ حِينَ يَذكُرُنِي، فَإِن ذَكَرَنِي فِي نَفسِهِ ذَكَرتُهُ فِي نَفسِي، وَإِن ذَكَرَنِي فِي مَلأٍ ذَكَرتُهُ فِي مَلأٍ خَيرٍ مِنهُ، وَإِنِ اقتَرَبَ إِلَيَّ شِبراً تَقَرَّبتُ إِلَيهِ ذِرَاعاً، وَإِنِ اقتَرَبَ إِلَيَّ ذِرَاعاً اقتَرَبتُ إِلَيهِ بَاعاً، وَإِن أَتَانِي يَمشِي أَتَيتُهُ هَروَلَةً). واتە: بەندەکەم چۆن بە دڵیا هات من بەو شێوەیەم، وە کاتێ یادم ئەکات لەگەڵیام، جا ئەگەر لە دڵی خۆیدا یادم بکات، منیش لەبەر خۆمەوە یادی ئەکەم، وە ئەگەر لەناو کۆمەڵێکدا یادم بکات لەناو کۆمەڵێکی لەوان چاکتردا یادی ئەکەم، وە ئەگەر بستێك لێم نزیك بێتەوە، من زیراعێك لێی نزیك ئەبمەوە، وە ئەگەر زیراعێك لێم نزیك بێتەوە، من باعێك[1] لێی نزیك ئەبمەوە، وە ئەگەر بەرۆیشتن بەرەو پیرم بێت ئەوە من بە ڕاکردن و بەپەلە ئەچم بەرەو پیری[2].

٣- خوای پاك و بێ گەرد یادکەرانی خۆی تایبەت ئەکات بە پێش کەوتن و تاکیەتی لە چاکەدا، جا پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (سَبَقَ المُفَرِّدُونَ قَالُوا: وَمَا المُفَرِّدُونَ يَا رَسُولَ اللهِ؟ قَالَ: الذَّاكِرُونَ اللهَ كَثِيراً وَالذَّاكِرَاتُ) رواه مسلم. واتە: تاکەکان پێش کەوتن، ووتیان: تاکەکان کێن ئەی نێراوی خوا؟ فەرمووی: ئەو ژن و پیاوانەن کە زۆر یادی خوا ئەکەن.

---

(١) باع: ئەندازەی درێژی بەینی دو دەستە کە بە هەردولادا بکرێنەوە.

(٢) واتە هەرچەندێك ئەو بەندەیە زیاتر بەرەو خوا بڕوات و ڕووی تێ بکات، خوای گەورە لە هەموو خێرێکدا بۆی خێراترە.

٤- بەڕاستی یادکەران زیندوی ڕاستەقینەن, لە ئەبی موساوە هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (مَثَلُ الَّذِي يَذكُرُ رَبَّهُ وَالَّذِي لا يَذكُرُ رَبَّهُ مَثَلُ الحَيِّ وَالمَيِّتِ) رواه البخاري. واتە: وێنەی کەسێك کە یادی خوا بکات و کەسێك یادی خوا نەکات وەك زیندوو مردو وایە.

٥- یادی خوا سەری هەموو کردەوەیەکی چاکەیە، جا هەرکەس سەرکەوت تێیدا پسولەی خۆشەویستی و دۆستی خوای ئەدرێتێ، هەربۆیە پێغەمبەر ﷺ لە هەموو کاتەکانیدا یادی خوای ئەکرد.

وە ئامۆژگاری ئەو پیاوەی کرد کە پێی ووت: شەریعەتەکانی ئیسلام زۆر بوون لەسەرم، شتێکم پێ بڵێ: دەستی پێوە بگرم؟ پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: (لا يَزَالُ فُوكَ رَطباً مِن ذِكرِ الله) واتە: با هەمیشە دەمت پاراو بێت بەیادی خوا.

وە بەهاوەڵەکانی ئەفەرمو: (ألا أُنَبِّئُكُم بِخَيرِ أعمَالِكُم وَأزكَاهَا عِندَ مَلِيكِكُم، وَأرفَعِهَا فِي دَرَجَاتِكُم، وَخَيرٌ لَكُم مِن إنفَاقِ الذَّهَبِ وَالوَرِقِ وَخَيرٌ لَكُم مِن أن تَلقَوا عَدُوَّكُم، فَتَضرِبُوا أعنَاقَهُم وَيَضرِبُوا أعنَاقَكُم؟ قَالُوا: بَلَى يَا رَسُولَ الله! قَالَ: ذِكرُ الله) رواه الترمذي وأحمد والحاكم وقال: صحيح الإسناد. واتە: ئایا پێتان نەڵێم کام کردەوەتان چاکە و خاوێن ترە لای پەروەردگارتان و پلەتان زیاتر پێی بەرز ببێتەوە و چاکتر بێت لە بەخشینی زێڕ و زیوو چاکتر بێت لەوەی بگەن بەدوژمنەکانتان، جا لە ملیان بدەن و لەملتان بدەن؟ ووتیان: بەڵێ پێمان بڵێ ئەی نێراوی خوا فەرمووی: یادی خوایە.

٦- یادی خوا ڕێگای ڕزگاریە, لە موعازی کوڕی جەبەلەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (مَا عَمِلَ آدَمِيّ عَمَلاً قَطُّ أنجَى لَهُ مِن عَذَابِ اللهِ مِن ذِكرِ اللهِ عَزَّوَجَل) رواه أحمد. واتە: ئادەمیزاد هەرگیز کردەوەیەکی نەکردووە کە ڕزگاری بکات لە سزای خوا ئەوەندەی یادی خوای گەورە.

٧- لە لای ئەحمەد هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (إنَّ مَا تَذكُرُونَ مِن جَلالِ اللهِ عَزَّوَجَل مِنَ التَّهلِيلِ وَالتَّكبِيرِ وَالتَّحمِيدِ يَتَعَاطَفنَ حَولَ العَرشِ، لَهُنَّ دَوِيٌّ كَدَوِيِّ النَّحلِ، يُذَكِّرنَ بِصَاحِبِهِنَّ، أفَلا يُحِبُّ أحَدُكُم أن يَكُونَ لَهُ مَا يُذَكِّرُ بِهِ). واتە: ئەو (لا إله إلا الله) و (الله أكبر) و (الحمد لله)یەی دەیکەن بەرز ئەبنەوە و بە دەوری عەرشی خوادا ئەسوڕێنەوە بەریزەوریز وەك ویزە ویزی هەنگ خاوەنەکانیان بیر ئەخەنەوە، جا کەس هەیە لە ئێوە حەز نەکات شتێکی هەبێت پێی یاد بکرێتەوە؟!

## سنوری یاد کردنی زۆر

خوای گەورە فەرمانی داوە یادێکی زۆری بکرێت وە وەصفی ئەو خاوەن ئاوەزانە ئەکات کە سوود لە تەماشاکردنی نیشانەکانی خوا وەر ئەگرن وە ئەفەرموێت: ﴿ٱلَّذِينَ يَذۡكُرُونَ ٱللَّهَ قِيَٰمٗا وَقُعُودٗا وَعَلَىٰ جُنُوبِهِمۡ﴾ (آل عمران/١٩١). واتە: ئەوانەی بە پێوە و بە دانیشتنەوە و بە ڕاکشانەوە یادی خوا ئەکەن.

وه ئەفەرموێت: ﴿وَٱلذَّٰكِرِينَ ٱللَّهَ كَثِيرًا وَٱلذَّٰكِرَٰتِ أَعَدَّ ٱللَّهُ لَهُم مَّغْفِرَةً وَأَجْرًا عَظِيمًا﴾ (الأحزاب/٣٥). واتە: ئەو ژن و پیاوانەی زۆر یادی خوا ئەکەن، خوا لێ بوردن و پاداشتی گەورەی بۆ ئامادە کردون.

موجاهید ووتویەتی: کەس نابێت بەزۆر یادکەری خوا، هەتا بە پێوەو بە دانیشتنەوە و بە ڕاکشانەوە یادی خوا نەکات و هەمیشە خوای لە بیر نەبێت.

لە ئیبنو صەلاحیان پرسی: ئەو ڕادەیە چەندە کە ئادەمیزاد پێی ئەبێتە زۆر یادکەری خوا, ووتی: هەرکاتێك بەردەوام بوو لەسەر ئەو یادانەی کە لە سوننەتەوە بۆمان ماونەتەوە سابتن لە بەیانی و ئێوارەو هەموو کات و حاڵەتە جیا جیاکان، بە شەوو بە ڕۆژ، ئەوە ئەو کەسە لەوکەسانەیە کە زۆر یادی خوا ئەکەن.

عەلی کوڕی ئەبی طەلحە ووتویەتی: ئیبنو عەبباس دەربارەی ئەو ئایەتانە فەرمویەتی: خوا لەسەر بەندەکانی شتێکی فەرز نەکردووە کە سنوری دیاری بۆ بەجێ هێنانی دانەنابێت، وە بەهانەی ڕەوای بەهانەدارەکانی وەرنەگرتبێت لە بەجێ هێنانیاندا، تەنها یادی خوا نەبێت کە سنوری بۆ دانەناوەو بەهانەی کەسیش وەرناگرێت لە بەجێ هێنانی‌دا مەگەر ئەو کەسەی هیچ توانای نەمابێ, وە ئەفەرموێت: ﴿أُذْكُرُوا اللهَ قِيَاماً وَقُعُوداً وَعَلى جُنُوبِكُم﴾ واتە: بە پێوە و بە دانیشتنەوە و لەسەر تەنیشت یادی خوا بکەن، بە شەوو بە ڕۆژ لە ووشکانیداو لە بەحردا، وە لە کاتی سەفەرو نیشتەجێیی دا، لە کاتی دەوڵەمەندی و هەژاریدا و لە نەخۆشی و لە ساغیدا, بە ئاشکراو بە نهێنی، و لە هەموو حاڵەتێکدا.

## یادی خوا هەموو خواپەرستی‌یەکان ئەگرێتەوە

سەعیدی کوڕی جوبەیر ووتویەتی: هەرکەسێك کار بە فەرمانی خوا بکات و گوێ ڕایەڵ بێت ئەوە یادی خوای کردوە، وە هەندێ لە پێشینەکان ویستویانە ئەو گشتی‌یەتی‌یە تایبەت بکەن, جا یادی خوا بە هەندێ لە جۆرەکانی تاعەت دائەنێن، لەوانە (عطاء)ە کە ووتویەتی: کۆڕی یادی خوا کردن کۆڕی حەڵاڵ و حەرامە، چۆن مامەڵەی کڕین و فرۆشتن ئەکەیت، وە نوێژو ڕۆژوو ئەکەیت، وە ژن ئەهێنی و تەلاق ئەدەیت وە چۆن حەج ئەکەیت و ئەو جۆرە شتانەیە.

(قرطبی) ووتویەتی: کۆڕی یادی خوا مانای کۆڕی زانستی و بیرکردنەوەیە، وەك ئەو کۆڕانەی کە باسی فەرموودەکانی خوای گەورە و سوننەتەکانی پێغەمبەری ﷺ تێدا ئەکرێت، وە ئەو کۆڕانەی باسی پیاوچاکان و پێشینانیان تێدا ئەکرێت، وە هەروەها باسی قسەی ئیمامە لە خوا ترسەکانی پێشووی تێدا ئەکرێت کە دووربون لە خۆ دەر خستن و بیدعە و دوور بون لە مەبستی بێ نرخ و تەماع کاری.

## ئادابی ياد كردنی خوای گەورە

مەبەست لە يادی خوا كردن دەروون و دڵ خاوێن كردنەوەيە و زيندو كردنەوەی ويژدانە، وە ئەم ئايەتەش بۆ ئەوە ئيشارەت ئەكات كە ئەفەرموێت: ﴿وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ إِنَّ ٱلصَّلَوٰةَ تَنْهَىٰ عَنِ ٱلْفَحْشَآءِ وَٱلْمُنكَرِ وَلَذِكْرُ ٱللَّهِ أَكْبَرُ﴾ (العنكبوت/٤٥). واتە: نوێژ بەجێ بهێنە چونكە نوێژ ڕێگری تاوان و گوناهە، وە ياد كردنی خوا ـ لە نوێژو لە غەيری نوێژدا ـ گەورەترە لە نوێژ كردن ـ بۆ ڕێ گرتن لە تاوان و خراپە ـ .

چونكە كاتێ يادكەری خوا دڵی ئەكاتەوە بۆ پەروەردگاری و زمانی ئەجوڵێنێت بە يادی ئەوەوە خوا يارمەتی ئەدات بە ڕۆشنايی خۆی، پاشان بڕواو دڵنيايی زياتر ئەبێت و دڵی دائەمەزرێنێت لەسەر حەق و پێی دڵنيا ئەبێت ﴿ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَتَطْمَئِنُّ قُلُوبُهُم بِذِكْرِ ٱللَّهِ أَلَا بِذِكْرِ ٱللَّهِ تَطْمَئِنُّ ٱلْقُلُوبُ﴾ (الرعد/٢٨). واتە: ئەوانەی كە باوەڕيان هێناوەو دڵنيا ئەبن بەيادی خوا، ئاگادار بن دڵەكان هەر بەيادی خوا دڵنيا ئەبن.

جا ئەگەر دڵ بە حەق ئاسودەو دڵنيا بوو بەرەو ڕەوشتی بەرز ئەچێت و ئەو ڕێگايە ئەگرێت بێ ئەوەی هەواو ئارەزوو لای پێ بكاتەوە. ئالێرەوە پلەو پايەی (ذكر) گەورە ئەبێت وگرينگیيەكەی دەرئەكەوێت لە ژيانی ئادەميزاددا، جا مەعقول نيە كە ئەم ئەنجامانە تەنها بە ووتەيەك بێتە دی كە زمان ئەيڵێت، چونكە جوڵانی زمان كەم سودە ئەگەر جێی خۆی لە دڵدا نەكردبێتەوە ولەگەڵيا نەگونجابێت.

خوا ڕێنمايی كردوين بۆ ئەو ڕەوشتەی كە پێويستە ئادەميزاد لەسەری بێت كاتێ يادی خوا ئەكاتەو ئەفەرموێت: ﴿وَٱذْكُر رَّبَّكَ فِى نَفْسِكَ تَضَرُّعًا وَخِيفَةً وَدُونَ ٱلْجَهْرِ مِنَ ٱلْقَوْلِ بِٱلْغُدُوِّ وَٱلْآصَالِ وَلَا تَكُن مِّنَ ٱلْغَٰفِلِينَ﴾ (الأعراف/٢٠٥). واتە: يادی پەروەردگارت بكە بەدڵ و بە ترس و ملكەچیيەوە، وە بە زمانيش يادی بكە بێ ئەوەی بێ ئەوەی دەنگ هەڵبڕيت لە بەيانيان و ئێوارانداَ، وە لە بێ ئاگايان مەبە.

ئايەتەكە دەست نيشانی ئەوەمان بۆ ئەكات كە موستەحەببە يادی خوا بەنهێنی بێت و دەنگی پێ بەرز نەكرێتەوە. پێغەمبەر ﷺ لەسەفەرێكدا گوێی لە كۆمەڵێك بوو بە دەنگی بەرز يادی خوايان ئەكردو ئەپاڕانەوە فەرمووی: (يَا أيُّهَا النَّاسُ أربِعُوا عَلَى أنفُسِكُم، فَإنَّكُم لا تَدعُونَ أصَمَّ وَلا غَائِباً، إنَّ الَّذِي تَدعُونَهُ سَمِيعٌ قَرِيبٌ، أقرَبُ إلَى أحَدِكُم مِن عُنُقِ رَاحِلَتِهِ). واتە: ئەی خەڵكينە لەسەر خۆ بن ئێوە هاواری كەڕ و ناديار ناكەن، بەڵكو ئەوەی ئێوە هاواری ئەكەن بيسەر و نزيكە، هەتا لە ملی ووشترەكانتان لێتانەوە نزيكترە.

هەروەها دەست نيشانی ئەوەمان بۆ ئەكات كە ئەبێت بەترس و ڕەغبەتەوە يادی خوا بكەين كە جوانترە ئادەميزاد بەو شێوەيە يادی خوا بكات.

هەر لە ڕەوشتی بەرز و ئەدەبە کە یادکەر لاشەو جل و بەرگی خاوێن و بۆن خۆش بێت، چونکە ئەمانە دەرون گورج و گۆڵ تر ئەکەن، وە ئەبێ ئەوکەسە بەپێی توانا ڕوو لە قیبلە بێت، چونکە باشترین کۆڕ ئەو کۆڕیە کە ڕووی پێ بکرێتە قیبلە.

## پەسەندی کۆبونەوە لە کۆڕەکانی یادی خوادا

دانیشتن بە کۆمەڵ بە شێوەی بازنەیی بۆ یادی خوا پەسەندە، وەلەم بارەیەوە ئەمانەی خوارەوە هاتووە:-

١- لە ئیبنوعومەرەوە خوا لیێان ڕازی بێت هاتووە کە دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (إِذَا مَرَرتُم بِرِيَاضِ الجَنَّةِ، فَارتَعُوا، قَالُوا: وَمَا رِيَاضُ الجَنَّةِ يَا رَسُولَ اللهِ؟ قَالَ: حِلَقُ الذِّكرِ، فَإِنَّ للهِ سَيَّارَاتٍ مِنَ المَلَائِكَةِ يَطلُبُونَ حِلَقَ الذِّكرِ. فَإِذَا أَتَوا عَلَيهِم حَفُّوا بِهِم). واتە: کاتێ بەلای باغچەی بەهەشتدا تێپەڕین لابدەن. ووتیان: ئەی نێرراوی خوا باغچەی بەهەشت چیە؟ فەرمووی: هەڵقەکانی یادی خوایە، چونکە خوای گەورە فریشتەی گەڕۆکی هەیە ئەگەڕێن بە شوین حەڵقەی یادی خوادا، جا کاتێ ئەیان دۆزنەوە چوار دەوریان ئەگرن.

٢- موسلیم لە موعاویەوە ئەگێڕێتەوە فەرمویەتی: پێغەمبەر ﷺ بەلای کۆڕێك لە یارانی کە بە حەڵقە دانیشتبون تێپەڕی و فەرموی: چی ئێوەی دانیشاندووە لێرەدا؟ ووتیان: دانیشتوین یادی خوای گەورە ئەکەین و سوپاس گوزاری ئەکەین لەسەر ئەوەی کە هیدایەتی داوین بۆ ئیسلام، فەرمووی: توخوا ئێوە بۆ ئەوە نەبیت بۆ هیچی تر دانەنیشتون؟ ئەڵێ: لەپاشاندا فەرمووی: بۆ ئەوە سوێندتان نادەم خراپەتان کردبێت، بەڵکو ئێستا جبریل هات بۆلام و پێی ڕاگەیاندم کە خوای گەورە شانازی بە ئێوەوە ئەکات لای فریشتەکان.

٣- دیسانەوە ریوایەت کراوە لە ئەبوسەعیدی خودری و ئەبوهورەیرەوە خوایان لێ ڕازی بێت کە شایەتی ئەدەن پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (لا يَقعُدُ قَومٌ يَذكُرُونَ اللهَ تَعَالَى إلا حَفَّتهُمُ المَلَائِكَةُ، وَغَشِيَتهُمُ الرَّحمَةُ، وَنَزَلَت عَلَيهِمِ السَّكِينَةُ، وَذَكَرَهُمُ اللهُ فِيمَن عِندَهُ). واتە: هیچ کۆمەڵێك نیە دابنیشن و یادی خوای گەورە بکەن کە فریشتە دەوریان نەدا و میهرەبانی خوا دایان نەپۆشێت و ئارامی نەبارێ بەسەریاندا و خوا لای ئەوانەی کەلای خۆیەتی باسیان نەکات.

**فەزڵی ئەوکەسەی بە ئیخلاصەوە بڵێت: (لا إله إلا الله) :**

١- لە ئەبوهوریرەوە هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (مَا قَالَ عَبدٌ: لا إِلَهَ إلا اللهُ قَطُّ مُخلِصاً إلا فُتِحَت لَهُ أَبوَابُ السَّمَاءِ حَتَّى يُفضِيَ إِلَى العَرشِ مَا اجتُنِبَتِ الكَبَائِرُ). واتە: قەت هیچ بەندەیەك بە ئیخلاصەوە نەی ووتوە: (لا إله إلا الله) ئیللا دەرگاکانی ئاسمانی بۆ کراوەتەوە هەتا ئەو دەنگە ئەگات بە عەرشی پەروەردگار، بە مەرجێك خۆی لە تاوانە گەورەکان بە دور گرتبێت.

٢- هەر لە ئەبوهورەیرەوە هاتووە كە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (جَدِّدُوا إِيمَانَكُم، قِيلَ: يَا رَسُولَ الله! وَكَيفَ نُجَدِّدُ إِيمَانَنَا؟ قَالَ: أَكثِرُوا مِن قَولِ: لا إِلَهَ إِلا الله) رواه أحمد بإسناد حسن. واتە: باوەڕەكەتان نوێ بكەنەوە، وتیان: ئەی نێرراوی خوا چۆن باوەڕەكەمان نوێ بكەینەوە؟ فەرمووی: زۆر بڵێن: (لا إله إلا الله).

٣- لە جابیرەوە هاتووە دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (أَفضَلُ الذِّكرِ لا إِلَهَ إِلا الله، وَأَفضَلُ الدُّعَاءِ الحَمدُ لله). رواه النسائي وابن ماجه والحاكم و وقال: صحيح الإسناد. واتە باشترین (ذكر) (لا إله إلا الله) یە، وە باشترین دوعا و پاڕانەوە (الحمد لله) یە.

**فەزڵی ووتنی (سبحان الله) و (الحمد لله) و (لا إله إلا الله) و (الله أكبر) و جگە لەوانیش**

١- لە ئەبو هورەیرەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتووە كە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (كَلِمَتَانِ خَفِيفَتَانِ عَلَى اللِّسَانِ، ثَقِيلَتَانِ فِي المِيزَانِ، حَبِيبَتَانِ إِلى الرَّحمَنِ، سُبحَانَ اللهِ وَبِحَمدِهِ، سُبحَانَ اللهِ العَظِيمِ) رواه الشيخان والترمذي. واتە: دوو ووشە لەسەر زمان سوكن و لە تەرازوودا قورسن و لای پەروەردگار خۆشەویستن، ئەوانیش ووتنی: (سبحان الله وبحمده، سبحان الله العظيم). واتە: پاك و بێ گەردی و سوپاس و ستایش بۆ خوا، پاك و بێ گەردی بۆ خوای گەورەیە.

٢- لە ئەبو هوریرەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتووە كە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (لأَن أَقُولَ سُبحَانَ اللهِ، والحَمدُ للهِ، وَلا إِلَهَ إِلا اللهُ، وَاللهُ أَكبَرُ، أَحَبُّ إِلَيَّ مِمَّا طَلَعَت عَلَيهِ الشَّمسُ) رواه مسلم والترمذي. واتە: ئەگەر بڵێم (سبحان الله والحمد لله ولا إله إلا الله والله أكبر) لام خۆشترە لە هەرچیەنەوەی كە ڕۆژی لێ هەڵهاتووە ئەگەر پێم ببەخشن.

٣- وە لە ئەبو ذەڕەوە هاتووە خوا لێی ڕازی بێت كە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (أَلا أُخبِرُكَ بِأَحَبِّ الكَلامِ إِلَى اللهِ؟ قُلتُ: أَخبِرنِي يَا رَسُولَ الله! قَالَ: إِنَّ أَحَبَّ الكَلامِ إِلى اللهِ: سُبحَانَ اللهِ وَبِحَمدِهِ). رواه مسلم والترمذي، ولفظه (أَحَبُّ الكَلامِ إِلى اللهِ عَزَّوَجَل مَا اصطَفَى اللهُ لِمَلائِكَتِهِ: (سُبحَانَ رَبِّي وَبِحَمدِهِ، سُبحَانَ رَبِّي وَبِحَمدِهِ). واتە: پێت بڵێم خۆشترین قسە لای خوا چیە؟ ووتم: بەڵێ پێم بڵێ ئەی نێرراوی خوا! فەرمووی: (خۆشترین ووتە لای خوا: (سبحان الله وبحمده)یە.

وە لە زاراوەیەكی (ترمذي)دا هاتووە فەرمویەتی: خۆشترین ووتە لای خوای گەورە ئەوەیە كە خۆی هەڵی بژاردووە بۆ فریشتەكان ئەویش (سُبحَانَ رَبِّي وَبِحَمدِهِ، سُبحَانَ رَبِّي وَبِحَمدِهِ) یە.

٤- لە جابیرەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتووە كە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (مَن قَالَ: سُبحَانَ اللهِ العَظِيمِ وَبِحَمدِهِ، غُرِسَت لَهُ نَخلَةٌ فِي الجَنَّةِ) رواه الترمذي وحسنه. واتە: هەركەس بڵێت: (سبحان الله العظيم وبحمده) دارخورمایەكی لە بەهەشتدا بۆ ئەڕوێندرێت.

٥- لە ئەبو سەعیدەوە هاتووە كە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (اِستَكثِرُوا مِنَ البَاقِيَاتِ الصَّالِحَاتِ، قِيلَ: وَمَا هُنَّ يَا رَسُولَ الله؟ قَالَ: (التَّكبِيرُ، وَالتَّهلِيلُ، وَالتَّسبِيحُ، وَالحَمدُ لله، وَلا حَولَ وَلا قُوَّةَ إِلا بِالله)

رواه النسائي والحاكم وقال: صحيح الإسناد. واته: (الباقيات الصالحات) زۆر بكەن، واتە: ئەو زیكرە چاكانەی كە هەمیشە ئەمێننەوە. ووتیان: (الباقيات الصالحات) چین ئەی نێرراوی خوا؟ فەرمووی: (الله أكبر) و (لا إله إلا الله) و (سبحان الله) و (الحمدلله) و (لا حول ولا قوة إلا بالله) یە.

٦- لە عبدالله وە خوا لێی رازی بێت هاتووە كە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (لَقِيتُ إبرَاهِيمَ لَيلَةَ أُسرِيَ بِي فَقَالَ: يَا مُحَمَّد أقرِىء أُمَّتَكَ مِنِّي السَّلامَ، وَأخبِرهُم أنَّ الجَنَّةَ طَيِّبَةُ التُّربَةِ، عَذبَةُ المَاءِ، وَإنَّهَا قِيعَان، وَإنَّ غِرَاسَهَا سُبحَانَ الله، وَالحَمدُ لله، وَلا إلَهَ إلا الله، والله أكبَرُ) رواه الترمذي والطبراني وزاد: (وَلا حَولَ وَلا قُوَّةَ إلا بِالله). واتە ئەو شەوەی شەو ڕەویم پێ كرا، گەیشتم بە ئیبراهیم (عليه الصلاة والسلام) فەرموی: ئەی موحەممەد سڵاوی من بگەیەنە بە ئەتەوەكەت و پێیان بڵێ : بەهەشت ئاوەكەی سازگار و خاكەكەی بۆن خۆشە، وە دەشتێكی پان و بەرینە، درەختەكانی (سبحان الله، والحمد لله، ولا إله إلا الله، و الله أكبر) وە لە لای (طبراني) (ولا حول ولا قوة إلا بالله)یشە.

٧- لە لای موسلیم هاتووە كە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (أحَبُّ الكَلامِ إلى الله أربَعٌ- لا يَضُرُّكَ بِأيِّهِنَّ بَدَأتَ- سُبحَانَ الله، وَالحَمدُ لله، وَلا إلَهَ إلا الله، وَالله أكبَر). واتە: خۆشەویست ترین قسە لای خوا چوارە: زیانی نیيە بە هەر كامیان دەست پێ بكەیت، ئەوانیش (سبحان الله، والحمد لله، ولا إله إلا الله، والله أكبر)ە.

٨- لە ئیبنومەسعودەوە خوا لێی رازی بیت هاتووە كە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (مَن قَرَأ بِالآيَتَينِ مِن آخِرِ سُورَةِ البَقَرَةِ فِي لَيلَةٍ كَفَتَاهُ) رواه البخاري ومسلم. واتە: هەركەس دوو ئایەتەكەی كۆتایی سورەتی (البقرة) بخوێنێت لە شەوێكدا بەسیەتی.

مەبەست ئەوەیە بەسیەتی لە جیاتی شەو نوێژی ئەو شەوە، وە ووتراوە بەسیەتی بۆ بەرهەڵستی لە بەڵاو موصیبەتی ئەو شەوە. وە ئیبنو خوزەیمە لە صەحیحەكەیدا هێناویەتی لەژێر باسی (كەمترینی ئەوەی كە بری قورئان خوێندن ئەكەوێ لە شەونوێژدا).

٩- لە ئەبو سەعیدەوە خوا لێی رازی بێت هاتووە كە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (أيَعجَزُ أحَدُكُم أن يَقرَأ ثُلُثَ القُرآنِ فِي لَيلَةٍ؟ فَشَقَّ ذَلِكَ عَلَيهِم وَقَالُوا: أيُّنَا يُطِيقُ ذَلِكَ يَا رَسُولَ الله؟ فَقَالَ ﷺ (الله الوَاحِدُ الصَّمَدُ ثُلُثُ القُرآنِ) رواه البخاري ومسلم والنسائي. واتە: هەریەكە لە ئێوە توانای نیيە كە سێیەكی قورئان بخوێنێت لە شەوێكدا؟ هاوەڵەكانی ئەوەیان بەشان گران بوو وتیان: جا كێمان ئەتوانێت ئەوە بكات ئەی نێرراوی خوا؟ فەرموی: قل هو الله أحد الله الصمد...) سێیەكی قورئانە. واتە: سورەتی (الإخلاص).

١٠- لە ئەبو هورەیرەوە خوا لێی رازی بێت هاتووە كە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (مَن قَالَ: لا إلَهَ إلا الله وَحدَهُ لا شَرِيكَ لَهُ، لَهُ المُلكُ وَلَهُ الحَمدُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيءٍ قَدِير، فِي يَومٍ مِائَةَ مَرَّةٍ كَانَت لَهُ عَدلُ

عَشرِ رِقَابٍ، وَكُتِبَت لَهُ مِائَةُ حَسَنَةٍ، وَمُحِيَت عَنهُ مِائَةُ سَيِّئَةٍ وَكَانَت لَهُ حِرزاً مِنَ الشَّيطَانِ يَومَهُ ذَلِكَ حَتَّى يُمسِيَ، وَلَم يَأتِ أَحَدٌ بِأَفضَلَ مِمَّا جَاءَ بِهِ، إِلا أَحَدٌ عَمِلَ أَكثَرَ مِن ذَلِكَ) رواه البخاري ومسلم والترمذي والنسائي وابن ماجه. واتە: هەرکەس لە ڕۆژێکدا سەدجار بڵێت: (لا إله إلا الله وحده لاشريك له، له الملك وله الحمد وهو على كل شئ قدير) وەك ئەوە وایە دە بەندەی ئازاد کردبێت، وە سەد چاکەی بۆ ئەنوسرێت و سەد خراپەی لەسەر لا ئەبرێت، وە ئەبێت بە پەرژین بۆی لە شەیتان ئەو ڕۆژە هەتا ئێوارەو کەسیش لەو چاکتر ناکات مەگەر کەسێك لەو زیکرە زیاتر بڵێت.

مسلمو تیرمذی نسائی ئەم زیادەیەشیان هێناوە کە فەرمویەتی: (وَمَن قَالَ: سُبحَانَ اللهِ وَبِحَمدِهِ فِي يَومٍ مِائَةَ مَرَّةٍ، حُطَّت خَطَايَاهُ وَلَوكَانَت مِثلَ زَبَدِ البَحرِ). واتە: هەرکەس سەد جار لە ڕۆژێکدا بڵێت: (سبحان الله وبحمده) گوناهەکانی دائەوەرێن ئەگەر ئەوەندەی کەفی دەریاش بن.

### فەزڵ و چاکی وتنی (أستغفر الله)

لە ئەنەسەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتووە فەرمویەتی: گوێم لە پێغەمبەر ﷺ بووە ئەیفەرموو: خوای گەورە ئەفەرموێت: (يَا ابنَ آدَمَ! إِنَّكَ مَا دَعَوتَنِي وَرَجَوتَنِي إِلا غَفَرتُ لَكَ عَلَى مَا كَانَ مِنكَ وَلا أُبَالِي، يَا ابنَ آدَمَ! لَو بَلَغَت ذُنُوبُكَ عِنَانَ السَّمَاءِ ثُمَّ استَغفَرتَنِي غَفَرتُ لَكَ وَلا أُبَالِي، يَا ابنَ آدَمَ! إِنَّكَ لَو أَتَيتَنِي بِقُرَابِ الأَرضِ خَطَايَا ثُمَّ لَقِيتَنِي لا تُشرِكُ بِي شَيئاً لأَتَيتُكَ بِقُرَابِهَا مَغفِرَةً) رواه الترمذي وقال: حديث حسن غريب. واتە: خوای پاك‌وبێ گەرد ئەفەرموێت: ئەی ئادەمیزاد! هەرکاتێك بپاڕێیتەوە و تکام لێ بکەیت هەر لێت خۆش ئەبم ـ هەرچیت کردبێت ـ وگرینگ نی‌یە بەلامەوە، ئەی ئادەمیزاد! ئەگەر تاوانەکانت بگەنە بەرزی ئاسمان لەپاشاندا داوای لێ بوردنت لێ کردم هەر لێت ئەبورم و گرینگ نی‌یە بەلامەوە، ئەی ئادەمیزاد! ئەگەر بە ئەندازەی پڕی زەوی تاوانەوە پێم بگەیت بە مەرجێك هاوبەشت بۆ دانەنابم، بە ئەندازەی لێواولێوی زەوی لێ بوردنەوە بەرەو ڕووت دێم.

لە عبداللەی کوڕی عەبباسەوە خوایان لێ ڕازی بێت هاتووە دەفەرموێت: هەرکەس خوی گرت بە ووتنی (أستغفر الله) خوا لە هەموو غەمێك ڕزگاری ئەکات و لە هەموو تەنگانەیەك دەری ئەهێنێ، وە بەشێوەیەك ڕۆزی ئەدات کە خۆشی نازانێ چۆن بووە و بە بیریدا نایەت). ئەبوداود و نسائی و ئیبنو ماجە وحاکم کە ووتویەتی: ئیسنادەکەی صەحیحە گێڕاویانەتەوە.

### ئەو (ذکر)انەی پاداشتیان چەند بەرامبەرەو بە ووشەی پڕمەعنا ووتراون

١- لە جوەیریەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتووە فەرمویەتی: پێغەمبەر ﷺ بەیانی لەلای ئەوەوە چوەتە دەرو پاشان بۆ چێشتەنگاو گەڕایەوە بینی هێشتا دانیشتوم فەرموی: (مَا زِلتِ عَلَى الحَالِ الَّتِي فَارَقتُكِ عَلَيهَا؟ قَالَت: نَعَم، قَالَ النَّبِيُّ ﷺ : لَقَد قُلتُ بَعدَكِ أَربَعَ كَلِمَاتٍ ثَلاثَ مَرَّاتٍ، لَو وُزِنَت بِمَا قُلتِ مُنذُ اليَومَ لَوَزَنَتهُنَّ: سُبحَانَ اللهِ وَبِحَمدِهِ، عَدَدَ خَلقِهِ وَرِضَاءَ نَفسِهِ، وَزِنَةَ عَرشِهِ وَمِدَادَ كَلِمَاتِهِ) رواه مسلم

وأبوداود. واتە: ئەوە چۆنم بەجێ هێشتوی هەروا دانیشتوی؟ ووتم بەڵێ، فەرمووی: دەمن چوار ووشەم سێجار ووتوە ئەگەر لەگەڵ ئەوەی ووتوتە لەو ساوە بکێشرێن هاوتان: ئەوانیش (سبحان الله وبحمده، عدد خلقه ورضاء نفسه وزنة عرشه ومداد كلماته). واتە: پاك و بێ گەردی بۆ خوا و سوپاس و ستایش هەر بۆ خوایە، ئەوەندەی دروست کراوەکانی و ئەوەندەی بۆ خۆی پێی رازییە و بە کێشی عەرشەکەی و بەئەندازەی مەرەکەبی ووشەکانی خۆی.

٢- پێغەمبەر ﷺ ئافرەتێکی بینی کۆمەڵێك چەوی لەبەر دەستدا بوو (سبحان الله)ی پێ ئەکردن، فەرموی: (أُخبِرُكِ بِمَا هُوَ أيسرُ عَلَيكِ مِن هَذَا، أو أفضَلُ. فَقَالَ: سُبحَانَ اللهِ عَدَدَ مَا خُلِقَ فِي السَّمَاءِ، وَسُبحَانَ اللهِ عَدَدَ مَا خُلِقَ فِي الأرضِ، وَسُبحَانَ اللهِ عَدَدَ مَا خُلِقَ بَينَ ذَلِكَ، وَسُبحَانَ اللهِ عَدَدَ مَا هُوَ خَالِقٌ، وَاللهُ أكبَرُ مِثلَ ذَلِك، وَالحَمدُ للهِ مَثلَ ذَلِكَ، وَلا إلَهَ إلا اللهُ مثلَ ذَلِك، وَلا حَولَ وَلا قُوَّةَ إلا بِاللهِ مِثلَ ذَلِك) رواه أصحاب السنن والحاكم، وقال: صحيح على شرط مسلم. واتە: شتێکت پێ ئەڵێم لەوە ئاسانتر بێت بۆت و چاکتر بێت. فەرمووی: بڵێ: بەقەدەر ژمارەی دروست کراوەکانی خوا لە ئاسمان (سبحان الله)، وە بە قەدەر ژمارەی دروست کراوەکانی خوا لە زەویدا (سبحان الله)، وە بە قەدەر ژمارەی ئەوەی کە خوا دروستی کردوون لەنێوانیاندا (سبحان الله)، و (الله أكبر)یش ئەوەندە، (الحمد لله)ش ئەوەندە، و (لا إله إلا الله)یش ئەوەندە، و (لا حول ولا قوة إلا بالله)یش ئەوەندە.

٣- لە ئیبنو عومەرەوە خوا لێیان رازی بێت هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ بۆی گێرانەوە فەرمووی: بەندەیەك لە بەندەکانی خوا ووتی: (يَا رَبِّ لَكَ الحَمدُ كَمَا يَنبَغِي لِجَلالِ وَجهِكَ وَلِعَظِيمِ سُلطَانِكَ). واتە: ئەی پەروەردگار سوپاس ستایش بۆ تۆ وەك چۆن شایستەیە بە رووی بەرزی تۆدا و گەورەیی دەستەڵاتدا.

جا گران و سەخت بوو لەسەر ئەو دوو فریشتەیە و نەیان ئەزانی چۆنی بنوسن, بەرز بونەوە بۆ ئاسمان و ووتیان: ئەی پەروەردگارمان بەندەیەکت شتێکی ووت نازانین چۆنی بنوسین؟ خوا فەرمووی: ـ هەرچەندە بۆخۆشی چاکی ئەزانی چی ووتوە ـ بەندەکەم چی ووت؟ ووتیان: ووتویەتی: (يارب لك الحمد كما ينبغي لجلال وجهك ولعظيم سلطانك) خوای گەورە پێی فەرموون: چۆنی ووتوە هەربەو شێوەیە بینوسن، تا ئەگات بە من، جا خۆم پاداشتی ئەدەمەوە لەسەری). ئەحمەد و ئیبنو ماجە گێراویانەتەوە.

### یادی خواکردن و ژماردنی بە پەنجە چاکترە لە تسبیح

١- لە بوسەیرەوە خوا لێی رازی بێت هاتوە فەرمویەتی: پێغەمبەر ﷺ ئەیفەرموو: (عَلَيكُنَّ بِالتَّسبِيحِ وَالتَّهلِيلِ وَالتَّقدِيسِ، وَلا تَغفَلنَ فَتَنسَينَ الرَّحمَةَ، وَاعقِدنَ بِالأنَامِلِ فَإنَّهُنَّ مَسئُولاتٌ، وَمُستَنطَقَاتٌ) رواه أصحاب السنن والحاكم بسند صحيح. واتە: ئەی ئافرەتان! ئێوەش (سبحان الله) و (لا إله إلا الله) بکەن و خوا بەگەورە بزانن و بێئاگا مەبن و میهرەبانی خواتان لەیاد بچێت، وە بەسەری پەنجەکانتان بیان ژمێرن چونکە پەنجەکان پرسیاریان لێ ئەکرێت و ئەهێنرێنە قسە).

٢- عبد الله ی کوری عومەر خوا لێیان ڕازی بێت فەرمویەتی: پێغەمبەرم ﷺ بینیوە بە پەنجە (سبحان الله)ی ئەکرد. خاوەن سونەنەکان گێڕاویانەتەوە.

**ترساندنی ئادەمیزاد لەوەی لە کۆڕێکدا دابنیشێت کە یادی خوای تێدا نەکات و سڵاوات نەدات لەسەر پێغەمبەر ﷺ (١)**

لە ئەبو هورەیرەوە هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (مَا قَعَدَ قَومٌ مَقعِداً لَم يَذكُرُوا اللهَ عَلَيهِ وَلَم يُصَلُّوا عَلَى النَّبِـيِّ إلا كَانَ عَلَيهِم حَسرَةً يَومَ القِيَامَةِ) رواه الترمذي وقال: حديث حسن. واتە: کۆمەڵ نیەیە کە کوڕێکیان گرتبێت‌و یادی خوایان نەکردبێت تێیداو سڵاوتیان نەدابێت لەسەر پێغەمبەر ﷺ ئیللا لە ڕۆژی دواییدا نەبێتە حەسرەت بۆیان.

وە ئەحمەد بەم زاراوەیە هێناویەتی: (مَا جَلَسَ قَومٌ مَجلِساً لَم يَذكُرُوا اللهَ فِيهِ إلا كَانَ عَلَيهِم تِرَةً، وَمَا مِن رَجُلٍ يَمشِي طَرِيقاً فَلَم يَذكُرِ اللهَ تَعَالَى إلا كَانَ عَلَيهِ تِرَةً، وَمَا مِن رَجُلٍ أوَى إلى فِرَاشِهِ فَلَم يَذكُرِ اللهَ عَزَّوَجَلَ إلا كَانَ عَلَيهِ تِرَةً). وَفِي رِوايَةٍ (إلا كَانَ عَلَيهِم حَسرَةً، وَإن دَخَلُوا الجَنَّةَ لِلثَّوَابِ). واتە: هیچ کۆمەڵێك نیە لە کۆڕێکدا دانیشن و یادی خوا نەکەن لە دواییدا نەبێتە حەسرەت بۆیان، وەکەس نیە بە ڕێگایەکدا ڕۆیشتبێت و یادی خوای نەکردبێت نەبێتە حەسرەت بۆی، وە هیچ کەس نیەیە چوبێتە ناو جێگاکەی و یادی خوای نەکردبێت نەبێتە حەسرەت بۆی). وە لە ریوایەتێکی تردا هاتوە: ئەوکارە حەسرەتە بۆیان ئەگەر بشچنە بەهەشتیشەوە لەبەر پاداشت هەر حەسرەت ئەکێشن.

لە کتێبی (فتح العلام)دا هاتووە ئەڵێت: فەرموودەکە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی پێویستە یادی خوا بکرێت و سڵاوات لەسەر پێغەمبەر ﷺ لە کۆڕو مەجلیسدا بدرێت. بە تایبەتی ئەگەر مانای (الترة) بە ئاگر و سزا لێك بدرێتەوە.

وە بەهەردوکیشیان لێك دراوەتەوە. جا سزادان و تۆڵەسەندن نابێت بۆ کەسێك نەبێت واجبێکی واز لێ‌هێنابێت یا کارێکی نارەوای کردبێت. ڕواڵەتی فەرمودەکە ئەوەیە کە (ذکر) کردن و سڵاواتەکە بەیەکەوە واجبن.

## ذیکری کەفارەتی مەجلیس

١- لە ئەبو هورەیرەوە هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (مَن جَلَسَ مَجلِساً فَكَثُرَ فِيهِ لَغَطُهُ، فَقَالَ قَبلَ أن يَقُومَ مِن مَجلِسِهِ: سُبحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمدِكَ، أشهَدُ أن لا إلَهَ إلا أنتَ، أستَغفِرُكَ وَأتُوبُ إلَيكَ، إلا كَفَّرَ اللهُ لَهُ مَا كَانَ فِي مَجلِسِهِ ذَلِكَ). واتە: هەرکەس لە کۆڕێکدا دانیشتبوو، وە قسەی بێ هودەی زۆر

(١) دورترە لەوەی ووتویەتی چونکە خولگەی حەدیسەکە لەسەر سەعیدی ئەبی هیلالە لە خوزەیمەوە، وە سعید أحمد دەربارەی ئەڵێت: شتی تێکەڵ‌و پێکەڵ ئەکرد، وە خوزەیمە (ذهبي) و عەسقەلانی ئەڵێن: نەناسراوە. (ألباني).

تێدا کرا، ئەویش پێش ئەوەی هەڵسێ بڵێت: (سبحانك اللهم وبحمدك، أشهد أن لا إله إلا أنت، أستغفرك وأتوب إليك). واتە: خوایە پاك و پێ گەردی و ستایش هەر بۆ تۆیە، شایەتی ئەدەم جگە لە تۆ پەرستراوێکی بە حەقی تر کە شایستەی پەرستن بێت نیە و داوای لێ بوردنت لێ ئەکەم و ئەگەڕێمەوە بۆلای تۆ) خوا ئەو وتەیە ئەخاتە بریتی ئەوەی لەو کۆڕەدا ڕوی داوەو ووتویەتی:

## کەسێك پاش ملە باسی برایەکی موسڵمانی بکات دەبێ چی بڵێ.

ئەگێڕنەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ کە فەرمویەتی: (إِنَّ كَفَّارَةَ الغِيبَةِ أن تَستَغفِرَ لِمَنِ اغتَبتَهُ، تَقُولُ: اللَّهُمَّ اغفِر لَنَا وَلَهُ). واتە: کەفارەتی باس کردنی خەڵك لە پاشمەلە ئەوەیە داوای لێ بوردن بۆ ئەو کەسە بکەیت کە باست کردووە و بڵێی: خوایە لە ئێمە و لەویش خۆش ببە

مەزهەبی هەڵبژێردراو ئەوەیە کە داوای لێ خۆش بوون بۆ ئەوکەسەی غەیبەت ئەکرێت و باس کردنی چاکەکانی ئەبێتە کەفارەتی ئەوغەیبەتە، ئیتر پێویست ناکات ئەوکەسەی غەیبەت کراوە ئاگادار بکرێت و داوای لێ خۆشبوونی لێ بکرێت.

## دوعا کردن

**(١) فەرمان کردن بە دوعا:**

خوای گەورە فەرمانی بە خەڵك کردووە کە لێی بپاڕێنەوە و ڕوو لەو بکەن، وە پەیمانی داوە کە وەڵامی پاڕانەوەکەیان بداتەوە و داواکاریەکەیان بۆ بهێنێتە دی.

١- ئەحمەدو خاوەن سوننەکان لە نوعمانی کوڕی بەشیرەوە ئەگێڕنەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (إِنَّ الدُّعَاءَ هُوَ العِبَادَةُ) واتە: دوعا کردن خۆی خوا پەرستیە.

پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە ﴿ٱدۡعُونِيٓ أَسۡتَجِبۡ لَكُمۡۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَسۡتَكۡبِرُونَ عَنۡ عِبَادَتِي سَيَدۡخُلُونَ جَهَنَّمَ دَاخِرِينَ﴾ (غافر/٦٠). واتە: تەنها لە من بپاڕێنەوەو دوعا بکەن تا دوعاکەتان گیرا بکەم و وەڵامتان بدەمەوە، چونکە بەڕاستی ئەو کسانەی کە خۆیان لە پەرستنی من بە زل ئەزانن، بە سەرشۆڕی ئەچنە ناو دۆزەخەوە.

(عبدالرزاق) لە حەسەنەوە ئەگێڕێتەوە کە هاوەڵەکانی پێغەمبەر ﷺ لە پێغەمبەریان پرسی خوامان لە کوێیە؟ جا خوای گەورە ئەم ئایەتەی نارده خوارەوە: ﴿وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِي عَنِّي فَإِنِّي قَرِيبٌۖ أُجِيبُ دَعۡوَةَ ٱلدَّاعِ إِذَا دَعَانِۖ﴾ (البقرة/١٨٦). واتە: ئەگەر بەندەکانی من پرسیاریان لێ کردی دەربارەی منەوە، پێیان بڵێ: کە من نزیکم لێیانەوە، بانگەوازی ئەو کەسەی کە لێم ئەپاڕێتەوە وەڵام ئەدەمەوە ئەگەر داوام لێ بکات و لێم بپاڕێتەوە.

٣- (ترمذي) و ئیبنوماجه له ئەبو هورەیرەوە ئەگێرنەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (لَيسَ شَيءٌ أكرَمَ على اللهِ مِنَ الدُّعَاءِ) واتە: هیچ شتێك لە لای خوا لە دوعا بەرێزتر نییە.

٤- (ترمذي) لە ئەبو هورەیرەوە ئەگێرێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (مَن سَرَّهُ أن يَستَجِيبَ اللهُ تَعَالى لَهُ عِندَ الشَّدَائِدِ وَالكُرَبِ، فَلْيُكثِرِ الدُّعَاءَ فِي الرَّخَاءِ). واتە هەرکەس پێی خۆشە کە خوای گەورە دوعاکەی وەربگرێت لەکاتی نارەحەتی و تەنگ و چەڵەمەدا با لەکاتی ئاسایش و فراوانیدا دوعا زۆر بکات.

٥- ئەبو یەعلا لە ئەنەسەوە ئەگێرێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ لە خوای گەورەوە ئەگێرێتەوە کە فەرمویەتی: (أربَعُ خِصَالٍ: وَاحِدَةٌ مِنهُنَّ لِي، وَوَاحِدَةٌ لَكَ، وَوَاحِدَةٌ فِيمَا بَينِي وَبَينَكَ، وَوَاحِدَةٌ فِيمَا بَينَكَ وَبَينَ عِبَادِي، فَأمَّا الَّتِي لِي، لاتُشرِكُ بِي شَيئاً، وَأمَّا الَّتِي لَكَ فَمَا عَمِلتَ مِن خَيرٍ جَزَيتُكَ عَلَيهِ، وَأمَّا الَّتِي بَينِي وَبَينَكَ، فَمِنكَ الدُّعَاءُ وعَلَيَّ الإجَابَةُ، وَأمَّا الَّتِي بَينَكَ وَبَينَ عِبَادِي، فَارضَ لَهُم مَا تَرضَي لِنَفسِكَ). واتە: چوار خەصڵەت هەیە: یەکێك لەو خەصڵەتانە تایبەتە بە منەوە و هی منە، و یەکێکیان هی تۆیە و بۆ تۆیە، وە یەکێکیان لە نێوان من و تۆدایە، وە یەکێکیان لەنێوان تۆ و بەندەکانی خوای گەورەدایە، جا ئەوخەصڵەتەی کە تایبەت بە منە ئەوەیە کە نابێت هیچ شتێك بکەیتە هاوتا و شەریکی من، وە ئەو خەصڵەتەی تایبەتە بە تۆوە ئەوەیە کە هەرکارێکی چاك بکەیت پاداشتت ئەدەمەوە لەسەری، وە ئەو خەصڵەتەی کە لە نێوان من و تۆدایە ئەوەیە کە لەسەر تۆ دوعایە و لەسەر من گیرا کردنە، وە ئەو خەصڵەتەی کە لەنێوان تۆ و بەندەکانم دایە، ئەوەیە کە هەرچی بۆ خۆت پێت خۆشە بۆ ئەوانیش پێت خۆش بێت.

٦- وە سابتە لە پێغەمبەرەوە ﷺ کە فەرمویەتی: (مَن لَم يَسألِ اللهَ يَغضَب عَلَيهِ). واتە: هەرکەس لە خوا نەپاڕێتەوە خوا لێی تورەیە.

٧- لە عائیشەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتووە وتویەتی: پێغەمبەر ﷺ ئەیفەرموو (لا يُغنِي حَذَرٌ مِن قَدَرٍ، وَالدُّعَاءُ يَنفَعُ مِمَّا نَزَلَ وَمِمَّا لَم يَنزِل، وَإنَّ البَلاءَ لَيَنزِلُ فَيَلقَاهُ الدُّعَاءُ فَيعتَلِجَانِ إلى يَومِ القِيَامَةِ) رواه البزار والطبراني والحاكم وقال: صحيح الإسناد. واتە: خۆ پاراستن بێ سوودە بەرامبەر قەدەری خوا، وەپاڕانەوە سوودی هەیە بۆ ئەوەی هاتۆتە خوارەوە و ئەوەی هێشتا نەهاتووە، چونکە کاتێ بەڵا دێتە خوارەوە پاڕانەوە بەرەنگاری ئەبێت و کێشمە کێشمیانە هەتا ڕۆژی دوایی.

٨- لە سەلمانی فارسیەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (لا يَرُدُّ القَضَاءَ إلا الدُّعَاءَ، وَلا يَزِيدُ فِي العُمُرِ إلا البِرُّ) رواه الترمذي وقال: حديث حسن غريب. واتە: هیچ شتێك قەزا ناگێڕێتەوە پاڕانەوە نەبێت، وە هیچ شتێك تەمەن درێژ ناکات چاکە کردن نەبێت.

٩- ئەبو عوانەو ئیبنوحیببان ئەگێڕنەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (إذَا دَعَا أحَدُكُم فَلِيُعَظِّمِ الرَّغبَةَ فَإنَّهُ لا يَتَعَاظَمُ عَنِ اللهِ شيءٌ). واتە: ئەگەر کەسێکتان پارایەوە با داوای شتی گەورە بکات، چونکە هیچ شتێ لای خوا زۆرو گەورە نیە.

**(٢) ئاداب و ڕەوشتی پاڕانەوە:**

پاڕانەوە ئاداب و ڕەوشتی خۆی هەیە کە ئەبێ چاودێری بکرێن. وا لە خوارەوە باسیان ئەکەین.

**١- گەڕان بە شوێن حەڵاڵ دا:**

(حافظ)ی کوڕی مەردەوەیە لە ئیبنوعەبباسەوە تەخریجی کردووە فەرمویەتی: ئەم ئایەتە لای پێغەمبەر ﷺ خوێندرایەوە: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلرُّسُلُ كُلُوا۟ مِنَ ٱلطَّيِّبَـٰتِ وَٱعْمَلُوا۟ صَـٰلِحًا ۖ إِنِّى بِمَا تَعْمَلُونَ عَلِيمٌ﴾ (المؤمنون/٥١). واتە: ئەی نێردراوەکان لە شتە پاك و حەڵاڵەکان بخۆن و کردەوەی چاك بکەن، چونکە بەڕاستی من بەوەی کە ئێوە دەیکەن ئاگادارم و زانام. سەعدی کوڕی ئەبی وەققاص هەڵساو ووتی: ئەی نێرراوی خوا! داوام بۆ بکە من لەوانە بم کە پاڕانەوەیان گیرا ئەبێت، ئەویش فەرموی: (يَا سَعدُ! أَطِب مَطعَمَكَ تَكُن مُستَجَابَ الدَّعوَةِ، وَالَّذِي نَفسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ إنَّ الرَّجُلَ لَيَقذِفُ اللُّقمَةَ الحَرَامَ فِي جَوفِهِ مَا يُتَقَبَّلُ مِنهُ أربَعِينَ يَوماً، وَأيُّمَا عَبدٍ نَبَتَ لَحمُهُ مِنَ السُّحتِ وَالرِّبَا، فَالنَّارُ أولَى بِهِ). واتە: ئەی سەعد با خواردنت حەڵاڵ بێت، پاڕانەوەت گیرا ئەبێت, بەوزاتەی گیانی محمدی بەدەسە هەرکەس پارویەکی حەرام هەڵداتە ناو سکیەوە چل ڕۆژ هیچی لێ وەناگیرێت، وە هەر بەندەیەك بە حەرام و سوودو ڕیبا گۆشتی گرتبێت، ئاگر بۆ ئەوکەسە باشترە.

لە موسنەدی ئیمام ئەحمەدو صەحیحی موسلیمدا هاتووە لە ئەبو هورەیرەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (يَا أيُّهَا النَّاسُ إنَّ اللهَ طَيِّبٌ لا يَقبَلُ إلا طَيِّباً وَإنَّ اللهَ أمَرَ المُؤمِنِينَ بِمَا أمَرَ بِهِ المُرسَلِينَ، فَقَالَ: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلرُّسُلُ كُلُوا۟ مِنَ ٱلطَّيِّبَـٰتِ وَٱعْمَلُوا۟ صَـٰلِحًا ۖ إِنِّى بِمَا تَعْمَلُونَ عَلِيمٌ﴾ (المؤمنون/٥١) وقَالَ: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ كُلُوا۟ مِن طَيِّبَـٰتِ مَا رَزَقْنَـٰكُمْ﴾ (البقرة/١٧٢). ثُمَّ ذَكَرَ الرَّجُلَ يُطِيلُ السَّفَرَ، أشعَثَ أغبَرَ، وَمطعَمُهُ حَرَامٌ، وَمَلبَسُهُ حَرامٌ، وَغُذِّيَ بِالحَرَامِ يَمُدُّ يَدَيهِ إلَى السَّمَاءِ: يَا رَبِّ يَا رَب، فَأنَّى يُستَجَابُ لِذَلِكَ؟!). واتە: ئەی خەڵکینە خوا خۆی پاکە و پاکیش نەبێت وەری ناگرێت، وە خوا چ فەرمانێکی داوە بە پێغەمبەران ئەو فەرمانەشی داوە بە باوەڕداران، ئەفەرموێت: ئەی فرستادەکان! لە شتە پاك و حەڵاڵەکان بخۆن و کردەوەی چاك بکەن، چونکە من ئاگاداری کردەوەکانتانم. وە ئەفەرموێت: ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە لەو خواردنە پوخت و حەڵاڵانە بخۆن کە پێمان بەخشیون. پاشان باسی پیاوێکی کرد کە سەفەری درێژخایەن ئەکات و قژ ئاڵۆزو خۆڵاوی، وە خواردنی حەرام و پۆشاکی حەرام

بووه وه بە حەرام پەروەردە کراوه، دەستەکانی بەرز ئەکاتەوە بۆ ئاسمان و ئەڵێت: ئەی پەروەردگارا ئەی پەروەردگارا جا چۆن وەڵامی ئەو جۆرە کەسانە ئەدرێتەوە؟!.

٢- وەستان بەرەو قیبلە بەپێی توانا:

چونکە پێغەمبەر ﷺ کاتێ چوو بۆ نوێژی باران بارین و داوای باران بارینی کرد ئەپاڕایەوە، و رووەوقیبلە وەستابوو.

٣- ئاگاداربوون لە کاتە چاکەکان و حاڵەتە پیرۆزەکان بۆ دوعا کردن.

وەك رۆژی عەرەفە و مانگی رەمەزان و رۆژی هەینی و سێیەکی بەشی دوایی شەو، و کاتی باران بارین و نێوانی بانگ و قامەت، و کاتی تێك هەڵپرژانی سوپای ئیسلام و سوپای کافر، و کاتی ترس و دڵ نەرم بوون.

أ- لە ئەبو ئومامەوە هاتووە فەرمویەتی: لە پێغەمبەریان ﷺ پرسی ووتیان: ئەی نێرراوی خوا! کام پاڕانەوە گیرا ئەبیت؟ پێغەمبەریش فەرموی: (جَوفُ اللَّيلِ الآخِرِ، وَدُبُرَ الصَّلَوَاتِ المَكتُوبَاتِ). رواه الترمذي بسند صحیح. واتە: لە کۆتایی شەوو دوای نوێژە فەرزەکان.

ب- لە ئەبو هورەیرەوە هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (أقرَبُ مَا يَكُونُ العَبدُ مِن رَبِّهِ وَهُوَ سَاجِدٌ، فَأكثِرُوا الدُّعَاءَ فَقَمِنٌ أن يُستَجَابَ لَكُم) رواه مسلم. واتە: بەندەی خوا کاتێ زۆر نزیکە لە پەروەردگاریەوە کە سەری لە کڕنوشدا بێت، جا ئێوە لەو کاتانەدا زۆر بپاڕێنەوە چونکە شایەنی ئەوەیە وەڵامتان بدرێتەوە.

لەو بارەیەشەوە حەدیسی زۆر هاتووە کە لەناو کتێبەکاندا هەیە.

٤- دەست بەرزکردنەوە هەتا رێکی شان:

بە پێی ئەوەی ئەبوداود لە ئیبنو عەبباسەوە ئەگێڕێتەوە فەرمویەتی: پاڕانەوە ئەوەیە دەستەکانت هەتا رێکی شانت بەرز بکەیتەوە، یان نزیکی شان، وە داوای لێ خۆش بوون ئەوەیە کە بە پەنجەیەك ئیشارەت بکەیت، وە ئیبتیهال ئەوەیە کە هەردوو دەستت تەواو بەرز بکەیتەوە.

لە مالیکی کوڕی یەسارەوە ئەگێڕنەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (إذَا سَألتُمُ اللهَ فَاسألُوهُ بِبُطُونِ أكُفِّكُم، وَلَا تَسألُوهُ بِظُهُورِهَا). واتە: کاتێ ئەپاڕێنەوە لە خوای گەورە بە بەری دەستەکانتان بپاڕێنەوە و بەرزی بکەنەوە بەرەو ئاسمان، نەك بە پشتی دەستەکانتان.

لە سەلمانەوە ئەگێڕنەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (إنَّ رَبَّكُم تَبَارَكَ وَتعالى حَيِيٌّ كَرِيمٌ، يَستَحِي مِن عَبدِهِ إذَا رَفَعَ يَدَيهِ إلَيهِ أن يَرُدَّهُمَا صِفراً). واتە: پەروەردگاری بەرزو پیرۆزتان بە حەیاو بەرێزە شەرم ئەکات ئەگەر بەندەیەکی دەستەکانی بۆ بەرز بکاتەوە و بە خاڵی بیان گێڕێتەوە.

٥- له پێشەوە دەست بکرێت بە سوپاس و ستایش و بە گەورە دانانی خوا پاشان سڵاوات دان لەسەر پێغەمبەر ﷺ:

بە پێی ئەوەی ئەبوداود و نەسائی و (ترمذي) کە بە صەحیحی داناوە لە فضالەی کوڕی عوبەیدەوە ئەگێڕنەوە کە پێغەمبەر ﷺ گوێی لە پیاوێك بوو ئەپاڕایەوە لە نوێژەکەیدا نەستایشی خوای کرد و نە سڵاواتی لەسەر پێغەمبەر ﷺدا، فەرمووی: (عَجِّلَ هَذَا) واتە ئەو پیاوە پەلەی کرد، پاشان بانگی کردو پێی فەرموو یان بە کەسێکی تری فەرمو: (إذَا صَلَّى أحَدُكُم فَلِيَبدَأ بِتَمجِيدِ رَبِّهِ عَزَّوَجَل، وَالثَّنَاءِ عَلَيهِ، ثُمَّ يُصَلِّي عَلَى النَّبِيِّ ﷺ، ثُمَّ يَدعُو بَعدُ بِمَا يَشَاءُ). واتە: ئەگەر کەسێکتان ویستی بپاڕێتەوە لەخوا با لە پێشدا ستایش و سوپاس گوزاری پەروەردگاری بکات و سڵاوات بدات لەسەر پێغەمبەر ﷺ، پاشان بۆچی ئەپاڕێتەوە با بپاڕێتەوە.

٦- بە دڵ پاڕانەوە و دەرخستنی بێ دەسەڵاتی و داماوی بۆ خوای گەورەو دەنگ نزم بکاتەوە لەنێوان سرکە و هێواشی و ئاشکراییدا:

خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَلَا تَجۡهَرۡ بِصَلَاتِكَ وَلَا تُخَافِتۡ بِهَا وَٱبۡتَغِ بَيۡنَ ذَٰلِكَ سَبِيلٗا﴾ (الإسراء/١١٠). واتە: کاتێ ئەپاڕێیتەوە لە خوای خۆت، دەنگ بەرز مەکەرەوە وە زۆریش دەنگ نزم مەکەرەوە بەڵکو ڕێی ناوەندی ئەو دوانە بگرە.

وە فەرمویەتی: ﴿ٱدۡعُواْ رَبَّكُمۡ تَضَرُّعٗا وَخُفۡيَةًۚ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُعۡتَدِينَ﴾ (الأعراف/٥٥). واتە: لە پەروەردگاری خۆتان بەترس و ملکەچی و پەنامەکییەوە بپاڕێنەوە، بەڕاستی خوا دەست درێژکەرانی خۆش ناوێ.

ئیبنوجەریر ووتویەتی: ﴿تضرعاً﴾ سەرکز و ملکەچ بۆ فەرمانەکانی، وە ﴿خفية﴾ : ملکەچی بە دڵ و یەقینی ڕاست بە تاك و تەنهایی خوا لەنێوان خۆتان و خوای خۆتاندا، نەك بە دەنگی بەرز کە ڕیا کردن و شانازی بگەیەنێت.

لە صەحیحەیندا هاتووە لە ئەبو موسای ئەشعەرییەوە فەرمویەتی: کاتێ خەڵکەکە ئەپاڕانەوە دەنگیان بەرز ئەکردەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (ئەی خەڵکینە لەسەر خۆ بن، چونکە ئێوە لە کەڕ و نادیار ناپاڕێنەوە، بەڵکو ئێوە لە خوایەکی بیسەر و بینا ئەپاڕێنەوە، ئەو خوایەی ئێوە لێی ئەپاڕێنەوە لە هەریەکەتان نزیکترە لە ملی وڵاغەکەیەوە. ئەی عبدالله ی کوڕی قەیس فێری ووشەیەکت نەکەم کە لە گەنجی بەهەشتە؟ ووتنی (لاحول ولا قوة إلا بالله) یە.

ئەحمەد لە عبدالله ی کوڕی عومەرەوە ئەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (القُلُوبُ أوعِيَةٌ, وَبَعضُهَا أوعَى مِن بَعضٍ، فَإذَا سَألتُمُ اللهَ -أيُّهَا النَّاسُ- فاسألُوهُ وَأنتُم مُوقِنُونَ بِالإجَابَةِ، فَإنَّهُ لا

يَستَجِيبُ لِعَبدٍ دَعَاهُ عَن ظَهرِ قَلبٍ غَافِل). واته: دڵەکان زەرفن، وە هەندێکیان ووریاترن و زیاتر شت وەرئەگرن لە هەندێکیان، جا خەڵکینە ئەگەر لە خوا پاڕانەوە دڵنیا بن کە گیرا ئەبێت، چونکە خوا پاڕانەوەی کەسێك وەرناگرێت کە بە دڵێکی بێ ئاگاوە پاڕابێتەوە.

٧- پاڕانەوە تاوانی تێدا نەبێت و سیلەی رەحم بچڕاندنی تێدا نەبێت:

بەپێی ئەوەی ئەحمەد لە ئەبی سەعیدەوە ئەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (مَا مِن مُسلِمٍ يَدعُوا اللهَ عَزَّوَجَل بِدَعوَةٍ لَيسَ فِيهَا إثمٌ وَلا قَطِيعَةُ رَحِمٍ، إلا أعطَاهُ اللهُ بِهَا إحدَى ثَلاثِ خِصَالٍ: إمَّا أن يُعَجِّلَ لَهُ دَعوَتَهُ، وَإمَّا أن يَدَّخِرَهَا لَهُ فِي الآخِرَةِ، وإمَّا أن يَصرِفَ عَنهُ مِنَ السُّوءِ مِثلَهَا، قَالُوا: إذاً نُكثِرُ؟ قَالَ: الله أكثر). واته: هیچ موسڵمانێك نییە لە خوای گەورە بپاڕێتەوە و پاڕانەوەکەی تاوانی تێدا نەبێت و سیلەی رەحم بچڕاندنی تێدا نەبێت، خوا یەکێ لەم سیانەی پێ نەدات: یا پاڕانەوەکەی زوو لێ وەرئەگرێت، یا بۆی هەڵئەگرێت بۆ ڕۆژی دوایی، یان بە ئەندازەی ئەو دوعایە شەڕو خراپەی لێ دوور ئەکاتەوە، ووتیان: کەواتە زۆر ئەپاڕێینەوە؟ فەرمووی: خواش بۆتان زۆرتر ئەکات.

٨- پەلە نەکردن بۆ گیرا بوون:

بەپێی ئەوەی مالیك لە ئەبو هورەیرەوە ئەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (يُستَجَابُ لأحَدِكُم مَا لَم يَعجَل يَقُولُ: دَعَوتُ فَلَم يُستَجَب لِي). واته: خوا پاڕانەوەی کەسێك گیرا ئەکات بەمەرجێك بەپەلە نەبێت بۆ ئەنجامەکەی و نەڵێت: پاڕامەوە و پاڕانەوەکەم گیرا نەبوو.

٩- پاڕانەوە لەگەڵ تەئکید بوون لەوەی کە هەر گیرا ئەبێت:

بەپێی ئەوەی ئەبوداود لە ئەبو هورەیرەوە ئەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (لا يَقُولَنَّ أحَدُكُم اللَّهُمَّ اغفِر لِي إن شِئتَ، اللَّهُمَّ ارحَمنِي إن شِئتَ، لِيَعزِمِ المَسألَةَ فَإنَّهُ لا مُكرِهَ لَهُ). واته: کاتێ ئەپاڕێنەوە مەڵێن خوایە ئەگەر ویستت لێم ببورە، خوایە ئەگەر ویستت رەحم پێ بکە، با بە ئیرادەو سەباتەوە بپاڕێتەوە چونکە کەس زۆر لە خوا ناکات.

١٠- هەڵبژاردنی ووشە پڕماناکان: ﴿رَبَّنَآ ءَاتِنَا فِى ٱلدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِى ٱلْءَاخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ﴾. واته: خوایە لە دنیادا چاکەمان بدەرێ و لە ڕۆژی دواییشدا چاکەمان بدەرێ و لە سزای ئاگر بمانپارێزە. چونکە پێغەمبەر ﷺ ئەو جۆرە دوعایانەی کە کۆکەرەوە بوون لای پەسەند بوو، وە وازی لەو دوعایانە ئەهێنا کە کۆکەرەوە نەبوو.

لە سونەنی ئیبنو ماجەدا هاتووە کە پیاوێك هاتەلای پێغەمبەر ﷺ ووتی: ئەی نێرراوی خوا چ پاڕانەوەیەك چاکە؟ فەرمووی: (سَل رَبَّكَ العَفوَ وَالعَافِيَةَ فِي الدُّنيَا وَالآخِرَةِ). واته: داوای لێ بووردن و لەش ساغی و سەرفەرازی لە دونیا و ئاخیرەتدا بکە لە پەروەردگارت.

ڕۆژی دووەم و سێیەمیش هاتەوە هەر ئەو پرسیارەی لێ کرد ئەویش ﷺ هەربەو شێوەیە وەلامی دایەوە. لە پاشاندا فەرمووی: (فإذا أُعطيْتَ العفوَ وَالعافِيَةَ فِي الدُّنيَا وَالآخرَةِ فَقَد أفلَحتَ). واتە: ئەگەر لێ بوردن و لەش ساغی و سەرفرازیت پێ درا لە دونیاو ئاخیرەتدا ئەوە سەرکەوتوی.

هەر لە سونەنی ئیبنو ماجەدا هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (مَا مِن دَعوَةٍ يَدعُو بِهَا العَبدُ أفضَلَ مِن: اللّهُمَّ إنِّي أسألُكَ المُعَافَاةَ فِي الدُّنيَا وَالآخِرَةِ). واتە: پاڕانەوە نی یە چاکتر بێت لەوەی بەندەیەك بلێت: خوایە داوای لێخۆشبون و سەلامەتی دونیا و ڕۆژی دوایی لە تۆ ئەکەم.

۱۱- دووربێت لە دوعا کردن لە خۆی و کەسوکار و ماڵی:

لە جابیرەوە هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (لا تَدعُوا عَلَى أنفُسِكُم، وَلا تَدعُوا عَلَى أولادِكُم، وَلا تَدعُوا عَلَى خَدَمِكُم، وَلا تَدعُوا عَلَى أموَالِكُم، لا تُوَافِقُوا مِنَ اللهِ تَبَارَكَ وَتَعالَى سَاعَةَ نَيلٍ فِيهَا عَطَاءٌ فَيُستَجَاب لَكُم). واتە: دۆعا مەکەن لە خۆتانو منداڵتانو خزمەتکارتان و ماڵ و سامانتان، نەك ڕێکەوتی ئەوکاتە بکات کە خوا پاڕانەوە گیرا ئەکات و دوعاکەتان گیرا بێت.

۱۲- سێ جار ووتنەوەی پاڕانەوەکە:

لە عبدالله ی کوڕی مەسعودەوە هاتووە فەرمویەتی: پێغەمبەر ﷺ حەزی ئەکرد سێ جار بپاڕێتەوە وە سێ جار داوای لێ بوردن بکات. ئەبوداود گێڕاویەتی یەوە.

۱۳- ئەگەر بۆ کەسێکی تر پاڕایەوە لە خۆیەوە دەست پێ بکات:

خوای گەورە ئەفەرموێت ﴿رَبَّنَا ٱغۡفِرۡ لَنَا وَلِإِخۡوَٰنِنَا ٱلَّذِينَ سَبَقُونَا بِٱلۡإِيمَٰنِ﴾ (الحشر/۱۰).

واتە: ئەی پەروەردگارمان لە ئێمە و برا باوەڕدارەکانی پێش ئێمەش خۆش ببە.

لە توبەی کوڕی کەعبەوە هاتووە فەرمویەتی: پێغەمبەر ﷺ ئەگەر یادی کەسێکی بکردایە و بۆی بپاڕایەوە لەپێشدا بۆخۆی ئەپاڕایەوە پاشان بۆ ئەو. (ترمذي) بە ئیسنادێکی صەحیح گێڕاویەتی یەوە

۱٤- دەست هێنان بە ڕوودا لە دوای پاڕانەوەو سوپاس و ستایشی خواکردن و سڵاوات دان لەسەر پێغەمبەر ﷺ.

لەبارەی دەست هێنان بە ڕوودا لەدووای پاڕانەوە چەند ڕوایەتێك ئەگێڕنەوە کە هەموویان لاوازن وە حافظ ئیشارەتی بەوە کردووە کە بە هەموویان ئەگەنە پلەی (حسن).

## پاڕانەوەی باوك و ڕۆژووان و ڕێبوار و ستەم لێکراو

ئەحمەدو ئەبوداودو (ترمذي) بە سەنەدێکی حەسەن ئەگێڕنەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (ثَلاثُ دَعَوَاتٍ مُستَجَابَاتٍ، لا شَكَّ فِيهِنَّ: دَعوَةُ الوَالِدِ وَدَعوَةُ المُسَافِرِ وَدَعوَةُ المَظلُومِ). واتە: سێ کەس پاڕانەوەکانیان گیرایە بێ گومان: دوعای باوك و موسافیر و ستەم لێکراو.

(ترمذي) به سەنەدێکی (حسن) ئەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (ثلاثٌ لا تُرَدُّ دَعوَتُهُم: الصَّائِمُ حِينَ يُفطِرُ، والإمَامُ العَادِلُ، ودَعوَةُ المَظلُومِ يَرفَعُهَا اللهُ فَوقَ الغَمَامِ ويُفتَحُ لَهَا أبوَابُ السَّمَاءِ. ويَقولُ الرَّبُّ: وَعِزَّتِي لأنصُرَنَّكَ وَلَو بَعدَ حِينٍ). واتە: سێ‌کەس پارانەوەیان گێڕانەوەی نییە: ڕۆژووان کاتێ کە ڕۆژوو ئەشکێنێت، وە پێشەوای دادپەروەر، وە پاڕانەوەی ستەم لێ‌کراو، خوای گەورە بەرزی ئەکاتەوە بۆسەر هەورەکان و دەرگاکانی ئاسمانی بۆ ئەکاتەوە. جا پەروەردگار ئەفەرموێت: بە عیززەتی خۆم سەرت ئەخەم هەرچەندە ماوەیەکەیشی پێ بچێت.

## پاڕانەوەی موسڵمان بۆ برای موسڵمان بێ ئەوەی ئاگای لێ بێ

١- موسلیم و ئەبوداود لە صەفوانی کوڕی عبداللە وە خوا لێی ڕازی بێت ئەگێڕنەوە فەرمویەتی: چووم بۆ شام بۆلای ئەبو دەرداء، بەڵام لە ماڵەوە نەبوو، تەنها ئومو دەرداء لە ماڵ بوو. ووتی: ئەمساڵ ئەچیت بۆ حەج؟ ووتم بەڵێ، ووتی: بۆمان بپاڕێرەوە لە خوا بە چاکە. چونکە پێغەمبەر ﷺ ئەیفەرموو: (دَعوَةُ المُسلِمِ لأخِيهِ بِظَهرِ الغَيبِ مُستَجَابَةٌ، عِندَ رَأسِهِ مَلَكٌ مُوَكَّلٌ كُلَّمَا دَعَا لأخِيهِ بِخَيرٍ قَالَ المَلَكُ المُوَكَّلُ بِهِ: آمِين وَلَكَ بِمِثلٍ). واتە: پاڕانەوەی موسڵمان لە پاشە ملە بۆ برای موسڵمان گیرایە. لای سەری ئەو کەسەوە فریشتەیەك دائەنرێت هەرکاتێ پاڕایەوە بۆ برا موسڵمانەکەی فریشتەکە ئەڵێت: ئامین منیش ئەوەندە دوعات بۆ ئەکەم.

صەفوان ئەفەرموێ: پاشان چوم بۆ بازاڕ توشی ئەبودەرداء بووم. ئەویش هەر ئەوەی پێ ووتم لە پێغەمبەرەوە ﷺ.

٢- لای ئەبوداودو (ترمذي) هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (أسرَعُ الدُّعَاءِ إجَابَةً دَعوَةُ غَائِبٍ لِغَائِبٍ). واتە: خێراترین پاڕانەوە بۆ گیرابوون پاڕانەوەی موسڵمانە بۆ برای موسڵمانی لە پاشەملە.

٣- وە هەر ئەودوانە لە عومەرەوە ئەگێڕنەوە کە فەرمویەتی: داوام لە پێغەمبەر ﷺ کرد ڕێم بدات بچم عەمرە بکەم، ئەویش ڕێگای داو فەرمووی: (لا تَنسَنَا يَا أُخَيَّ مِن دُعَائِكَ). واتە: براکەم لە بیرمان نەکەی کە بۆمان بپاڕێیتەوە. عمر ئەفەرموێت: ئەگەر لە جێی ئەو قسەیە هەموو دونیام ببوایە ئەوەندە دڵ خۆش نەئەبوم.

## هەندێ لەو ئەزکارانەی کە هاتوون و ئەبێت لە سەرەتای پاڕانەوەوە بووترێن بەو ئومێدەی دوعاکە گیرابێت

١- لە بورەیدەوە هاتووە: کە پێغەمبەر ﷺ گوێی لە پیاوێك بوو ئەپاڕایەوە ئەیووت: (اللَّهُمَّ إنِّي أسألُكَ بِأنِّي أشهَدُ أنَّكَ أنتَ اللهُ لا إلَهَ إلا أنتَ الأحَدُ الصَّمَدُ الَّذِي لَم يَلِد وَلَم يُولَد وَلَم يَكُن لَهُ كُفواً أحَدٌ). واتە: خوایە من داوا لە تۆ ئەکەم بەخاتری ئەوەی کە شایەتی ئەدەم کە هیچ پەرستراوێکی بەهەق

نی‌یه که شایسته‌ی په‌رستن بێت جگه له تۆ، که تاك و بێ نیازیت و نه له دایك بویت و نه منداڵیشت لێ نه‌بێت، وه هیچ شێوه‌ت نی‌یه و بێ وێنه و تاکی). پێغه‌مبه‌ر ﷺ فه‌رمووی: (لَقَد سَألتَ اللهَ بِالاسمِ الأعظمِ، الَّذی إذا سُئِلَ بِهِ أعطَی وَإذا دُعِیَ بِهِ أجَابَ). رواه أبوداود والترمذي وحسنه). واته: تۆ به ناوه‌گه‌وره‌که‌ی خوا داوات له خوا کرد، ئه‌و ناوه‌ی هه‌رکه‌س داوای شتێکی پێ بکات ئه‌ی درێتێ وه هه‌رکه‌س پێ‌ی بپاڕێته‌وه پارانه‌وه‌که‌ی گیرا ئه‌بێت.

(منذري) ووتویه‌تی: ئه‌بو حه‌سه‌نی مه‌قدیسی مامۆستامان ووتویه‌تی : ئیسنادی ئه‌م فه‌رموده‌یه که‌سێکی تێدا نی‌یه که عه‌یبداری کردبێت، وه له‌م باره‌یه‌وه فه‌رموده‌یه‌ك نه‌هاتوه سه‌نه‌ده‌که‌ی له‌م چاکتر بێت.

٢- له موعازی کوڕی جه‌به‌له‌وه هاتووه که پێغه‌مبه‌ر ﷺ گوێ‌ی لێ بوو پیاوێك ئه‌پاڕایه‌وه ئه‌یووت: (یاذا الجلال والإکرام) واته: ئه‌ی گه‌وره و خاوه‌ن شکۆی خاوه‌ن ڕێز. فه‌رمووی: (قَد استُجِیبَ لَكَ فَسَل). واته: دوعاکه‌ت گیرابوو که‌واته بپاڕێره‌وه، (ترمذي) گێراویه‌تی‌یه‌وه و ووتویه‌تی: (حسن)ه.

٣-له ئه‌نه‌سه‌وه هاتووه فه‌رمویه‌تی: پێغه‌مبه‌ر ﷺ به‌لای ئه‌بو عه‌ییاشدا تێ په‌ڕی که ناوی زه‌یدی کوڕی صامتی زوره‌قی‌یه، نوێژی ئه‌کردو ئه‌ی‌ووت: (اللّٰهُمَّ إنّي أسألُكَ بِأنَّ لَكَ الحَمدُ لا إلَهَ إلا أنتَ، یَا حَنَّانُ، یَا مَنَّانُ، یَا بَدِیعَ السَّمَوات وَالأرضِ، یَاذَا الجَلالِ والإکرَامِ، یَا حَيُّ یَا قَیُّوم). واته: خوایه من دوات لێ ئه‌که‌م چونکه ئه‌زانم سوپاس‌و ستایش هه‌ر بۆ تۆیه و هیچ په‌رستراوێك نی‌یه که شایسته‌ی په‌رستن بێت به حه‌ق جگه له تۆ، ئه‌ی میهربانی به‌خشنده، به‌دی هێنه‌ری ئاسمانه‌کان و زه‌وی، ئه‌ی گه‌وره‌ی خاوه‌ن شکۆی خاوه‌ن ڕێز، ئه‌ی زیندوی هه‌میشه و ڕاگری بونه‌وه‌ر.

پێغه‌مبه‌ر ﷺ پێ‌ی فه‌رموو: (لَقَد سَألتَ اللهَ بِاسمِهِ الأعظَم الَّذي إذا دُعِيَ بِهِ أجَابَ، وَإذا سُئِلَ بِهِ أعطَي). رواه أحمد وغیره، وقال الحاکم: صحیح علی شرط مسلم. واته: به‌ناوه گه‌وره‌که‌ی خوا پاڕایته‌وه به‌و ناوه‌ی ئه‌گه‌ر که‌سێك پێ‌ی بپاڕێته‌وه دوعاکه‌ی گیرا ئه‌کات، وه ئه‌گه‌ر داوای شتێکی پێ بکات ئه‌ی داتێ.

٤- له موعاویه‌وه هاتووه فه‌رمویه‌تی: گوێم له پێغه‌مبه‌ر ﷺ بووه ئه‌یفه‌رموو: (مَن دَعَا بِهَؤُلاءِ الکَلِمَاتِ الخَمسِ، لَم یَسألِ اللهَ شَیئاً إلا أعطَاهُ : لا إلَه إلا اللهُ، واللهُ أکبَرُ، لا إلَهَ إلا اللهُ وَحدَهُ لا شَرِیكَ لَهُ، لَهُ المُلكُ وَلَهُ الحَمدُ وَهُوَ عَلَی کُلِّ شيءٍ قَدِیر، لا إلَهَ إلا اللهُ وَلا حَولَ وَلا قُوَّةَ إلا بِاللهِ) رواه الطبراني بأسناد حسن. واته: هه‌رکه‌س به‌م پێنج ووشانه بپاڕێته‌وه ئه‌وه هه‌رچی له خوای بوێت پێ‌ی ئه‌به‌خشێت (لا إله إلا الله..... هتد).

## زیکرەکانی بەیانیان و ئێواران

زیکرەکانی بەیانیان وتنیان لە دەرکەوتنی کازیوەی بەیانەوە دەست پێ ئەکات هەتا خۆر هەڵاتن، وە ذیکرەکانی ئێوارە لە نێوان عەسرو خۆر ئاوا بوندایە.

١- موسلیم ئەگێڕێتەوە لە ئەبی هورەیرەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (مَن قَالَ حِينَ يُصبِحُ وَحِينَ يُمسِي سُبحَانَ اللهِ وَبحمدِهِ مِائةَ مَرَّةٍ، لَم يَأتِ أحَدٌ يومَ القِيَامَةِ بِأفضَلَ مِمَّا جَاءَ بِهِ إلا أحَدٌ قَالَ مِثلَ مَا قَالَ أو زَادَ عَلَيهِ). واتە: هەرکەس بەیانیان و ئێواران سەد جار بڵێت: (سبحان الله وبحمده)-لە ڕۆژی داوییدا کەس لەو چاکتر ناهێنێت کەسێك نەبێت کە وەك ئەوی ووتبێت یا زیاتری ووتبێت.

٢- هەروەها لە ئیبنومەسعودەوە ئەگێڕنەوە فەرمویەتی: پێغەمبەر ﷺ کاتێ ئەگەیشتە ئێوارە ئەیفەرموو: (أمسَينَا وَأمسى المُلكُ للهِ، وَالحَمدُ للهِ، لا إلَهَ إلا اللهُ وَحدَهُ لا شَرِيكَ لَهُ، لَهُ المُلكُ وَلَهُ الحَمدُ وَهُوَ على كُلِّ شَيءٍ قَدير، رَبِّ أسألُكَ خَيرَ مَا فِي هَذِهِ اللَّيلَةِ وَخَيرَ مَا بَعدَهَا وَأعُوذُ بِكَ مِن شَرِّ مَا فِي هَذِهِ اللَّيلَةِ وَشَرِّ مَا بَعدَهَا، رَبِّ أعُوذُ بِكَ مِنَ الكَسَلِ وَسُوءِ الكِبَرِ، رَبِّ أعُوذُ بِكَ مِن عَذَابٍ فِي النَّارِ وَعَذَابٍ فِي القَبرِ). و کاتێ بەیانی ئەهات ئەی فەرموو: (أصبَحنَا وَأصبَحَ المُلكُ للهِ). واتە: کەوتینە ئێوارەوەو هەر خوا خاوەنی مولکە، و سوپاس و ستایش بۆ خوا، هیچ خوایەك نیيە شایستەی پەرستن بێت جگە لە الله، ئەو خوایە تەنهایە و هاوتای نی‌یە، موڵك هەر هی ئەوە و سوپاس و ستایش هەر بۆ ئەوە، وە هەرئەویش بەسەر هەموو شتێکدا بەتوانایە. پەروەردگار! داوای ئەو خێرەت لێ ئەکەم کە لەم شەوەدا هەیە و داوای خێری دووای ئەوەشت لێ ئەکەم، پەنا ئەگرم بەتۆ لەو شەڕەی کە لەم شەوەدا هەیە و پەنا ئەگرم بە تۆ لە شەڕی دوای ئەوەش، پەروەردگار! من پەنا ئەگرم بەتۆ لە تەمەڵی و سەرەنجامی خراپ، پەروەردگار! پەنا ئەگرم بەتۆ لە سزای ناو ئاگر و سزای ناوگۆڕ). وە کاتێ ڕۆژی ئەکردەوە دیسان ئەیفەرموو: (کەوتینە بەیانی‌یەوەو هەر خوا خاوەنی مولکە...).

٣- ئەبوداود لە عبدالله ی کوڕی حەبیبەوە ئەگێڕێتەوە فەرمویەتی: پێغەمبەر ﷺ پێی فەرمووم: بڵێ. ووتم: بڵێم چی ئەی نێرراوی خوا؟ فەرمووی: بڵێ: (﴿قُلۡ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ﴾، وَالمُعَوِّذَتَينِ حِينَ تُمسِي وَحِينَ تُصبِحُ ثَلاثَ مَرَّاتٍ تَكفِيكَ مِن كُلِّ شَيءٍ) قال الترمذي حديث حسن صحيح. واتە: ﴿قُلۡ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ﴾ و ﴿قُلۡ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلۡفَلَقِ﴾ و ﴿قُلۡ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلنَّاسِ﴾ بەیانیان و ئێواران سێ‌جار بخوێنە لە شەڕی هەموو شت ئەپارێزرێی.

٤- هەروەها لە ئەبو هورەیرەوە ئەگێڕنەوە کە پێغەمبەر ﷺ یارەکانی فێر ئەکردو ئەیفەرمو: کاتێ کەسێکتان ڕۆژ ئەکاتەوە با بڵێت: (اللَّهُمَّ بِكَ أصبَحنَا وَبِكَ أمسَينَا، وَبِكَ نَحيَا وَبِكَ نَمُوتُ، وَإلَيكَ النُّشُورُ). و کاتێ ئێوارەی کردەوە بڵێت: (اللَّهُمَّ بِكَ أمسَينَا وَبِكَ أصبَحنَا، وَبِكَ نَحيَا وَبِكَ نَمُوتُ، وَإلَيكَ

المَصِير). قال الترمذي حديث حسن صحيح. واتە: خوایە بە یارمەتی تۆ ڕۆژمان کردەوەو گەیشتینە ئێوارە، خوایە بە یارمەتی تۆ ئەژین و ئەمرین زیندووبونەوەش هەر بۆلای تۆیە. وە کاتێ ئێوارە هات بڵێت: خوایە بە یارمەتی تۆ گەیشتینە ئێوارە و گەیشتینە بەیانی وە بە یارمەتی تۆ ئەمرین و گەڕانەوەش هەر بۆلای تۆیە

٥- لە صەحیحی بوخاری دا هاتووە لە شەددای کوڕی ئەوسەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (سَيِّدُ الإستِغفَارِ: اللَّهُمَّ أنتَ رَبِّي لا إلَه إلا أنتَ خَلَقتَنِي وَأنَا عَبدُكَ، وَأنَا عَلَى عَهدِكَ وَوَعدِكَ مَا استَطَعتُ، أعُوذُ بِكَ مِن شَرِّ مَا صَنَعتُ، أبُوءُ لَكَ بِنِعمَتِكَ عَلَيَّ، وَأبُوءُ بِذَنبِي فَاغفِر لِي، فَإنَّهُ لايَغفِرُ الذُّنُوبَ إلا أنتَ). هەرکەس ئەوە بڵێت کاتێ گەیشتە ئێوارە ئەگەر ئەو شەوە بمرێت ئەچێتە بەهەشتەوە، وە هەرکەس ڕۆژی کردەوە ئەوە بڵێت و ئەو ڕۆژە بمرێت ئەچێتە بەهەشتەوە. واتە: سەردارو گەورەترین دُوعای لێ بووردن ئەمەیە: خوایە تۆ پەروەردگاری منی، جگە لەتۆ پەرستراوی بە حەق نیە، تۆ منت دروست کردەوە و من بەندەی تۆم، وە لەسەر پەیمان و بەڵێنەکەی تۆم بەپێی توانام، خوایە پەنا ئەگرم بەتۆ لەشەڕی ئەوەی کە کردومە، خوایە دان ئەنێم بەو نیعمەتانەی پێت بەخشیوم، وەدان بە تاوانەکانما ئەنێم، خوایە لێم ببورە چونکە جگە لە تۆ کەس نیە لە تاوان ببورێت.

٦- لە (ترمذي)دا هاتووە لە ئەبو هورەیرەوە کە ئەبوبەکری (صدیق) بە پێغەمبەری ﷺ ووت: شتێکم پێ بڵێ ئێوارە و بەیانی بیڵێم، فەرموی: بڵێ: (اللَّهُمَّ عَالِمَ الغَيبِ وَالشَّهَادَةِ فَاطِرَ السَّمَوَاتِ وَالأرضِ، رَبَّ كُلِّ شَيءٍ وَمَلِيكَهُ، أشهَدُ أن لا إلَه إلا أنتَ، أعُوذُ بِكَ مِن شَرِّ نَفسِي وَشَرِّ الشَّيطَانِ وَشِركِهِ، وَأن نَقتَرِفَ سُوءاً عَلَى أنفُسِنَا أو نَجُرَّهُ إلَى مُسلِمٍ. قُلهُ إذَا أصبَحتَ وَإذَا أمسَيتَ وَإذَا أخَذتَ مَضجَعَكَ) قال الترمذي حديث حسن صحيح. واتە: ئەی خوای زانا بە شاراوەکان و ئاشکراکان، بەدی هێنەری ئاسمانەکان و زەوی، پەروەردگارو خاوەنی هەموو شت، شایەتی ئەدەم کە جگە لە تۆ پەرستراوێکی بەحەقی تر نیە، پەنا ئەگرم بەتۆ لە شەڕی نەفسی خۆم و لە شەڕی شەیتان و هاوتادانانی، وە پەنا ئەگرم بەتۆ لەوەی کە کارێکی خراپە بکەین بەرامبەر خۆمان، یا خراپەیەك بدەین بەسەر موسڵمانێکدا، ئەفەرموێت: ئێوارە و بەیانی و کاتێ چویتە جێگای خەوتن ئەوە بڵێ.

٧- هەروەها لە (ترمذي)دا هاتووە لە عشمانی کوڕی عەففانەوە خوا لێی ڕازی بێت کە پێغەمبەر فەرمووی: (مَا مِن عَبدٍ يَقُولُ فِي صَبَاحِ كُلِّ يَومٍ وَمَسَاءِ كُلِّ لَيلَةٍ: بِسمِ اللهِ الَّذِي لا يَضُرُّ مَعَ اسمِهِ شَيءٌ فِي الأرضِ ولا فِي السَّمَاءِ وَهُوَ السَّمِيعُ العَلِيمِ، ثَلاثَ مَرَّاتٍ فَيَضُرُّهُ شَيءٌ). قال الترمذي: حديث حسن صحيح. واتە: هەرکەس بەیانی و ئێوارەی هەموو ڕۆژ و شەوێك بڵێ: بەناوی ئەو خوایەی کە لەگەڵ ناوی

ئەودا هيچ شتێك زيان ناگەيەنێت، نە لە زەویدا و نەلە ئاسماندا هەر ئەوە بيستەر و زانا. سێ جار. هيچ شتێك زيانی پێ ناگەيەنێت.

٨- هەروەها (ترمذي) لە ثەوبان و جگە لەوەوە ئەگێڕێتەوە كە پێغەمبەر ﷺ فەرمويەتی: هەركەس بەيانی و ئێوارە بلێت: (رَضِيتُ بِاللهِ رَبّاً، وَبالإسلامِ دِيناً، وَبِمُحَمَّدٍ ﷺ نَبِياً، كَانَ حَقّاً على اللهِ أن يُرضِيَهُ) واتە: ڕازی بوم بە الله كە پەروەردگارم بێت، و ڕازيم بە ئيسلام كە ئاينم بێت، و ڕازی بوم بە موحەممەد ﷺ كە پێغەمبەرم بێت، ئەوە هەقە لەسەر خوا كە ڕازی بكات. (ترمذي) ئەڵێت ئەم حەدیسە حەسەن و صەحیحە.

٩- هەر لە (ترمذي)دا هاتووە لە ئەنەسەوە كە پێغەمبەر ﷺ فەرمويەتی: هەركەس ڕۆژی كردەوە و ئێوارەی بەسەردا هات بلێت: (اللَّهُمَّ إنِّي أصبَحتُ أُشهِدُكَ وَأُشهِدُ حَمَلَةَ عَرشِكَ وَمَلائِكَتِكَ وَجَمِيعِ خَلقِكَ أنَّكَ أنتَ اللهُ لا إلَهَ إلا أنتَ وَحدَكَ لا شَرِيكَ لَكَ، وَأنَّ مُحَمَّداً عَبدُكَ وَرَسُولُكَ). خوا چارەكێكی لە ئاگر ئەپارێزێت و هەركەس دووجار وا بلێت نیوەی لە ئاگر ئەپارێزێت، وەهەركەس سێ جار وا بلێت سێ چارەكی لە ئاگر ئەپارێزێت، وە هەركەس چوار جار وابلێت خوا لە ئاگر ڕزگاری ئەكات.

واتە: خوايە من ڕۆژم كردەوە، تۆ و هەڵگرەكانی عەرشەكەت و فريشتەكان و هەموو خەڵك بە شايەت ئەگرم كە هيچ پەرستراوێكی بە حەق نی‌یە شايستەی پەرستن بێت جگە لە تۆ، وە تۆ تەنها و بێ هاوەڵی، هيچ شەريكت نىيە، وە شايەتی ئەدەم كە موحەممەد ﷺ نێردراوو بەندەی تۆيە.

١٠- لە سونەنی ئەبوداودا هاتووە لە عبد الله ی كوڕی غەننامەوە كە پێغەمبەر ﷺ فەرمويەتی: هەركەس كەوتە بەيانی و بلێت: (اللَّهُمَّ مَا أصبَحَ بِي مِن نِعمَةٍ أو بِأحَدٍ مِن خَلقِكَ فَمِنكَ وَحدَكَ لا شَرِيكَ لَكَ، لَكَ الحَمدُ وَلَكَ الشُكرُ). ئەوە سوپاس گوزاری ئەو ڕۆژەی بەجێ هێناوە، وە هەركەس ئێوارەش وا بلێت ئەوە سوپاس گوزاری ئەو شەوەی بەجێ هێناوە.

واتە: خوايە لەم بەيانی‌یەدا ئەو نيعمەتەی دراوە بە من يا بەكەسێك لە دروست كراوەكانت هەر لە تۆی تاك و تەنهاو بێ شەريكە، وە سوپاس‌و ستايش هەر بۆتۆيە.

١١- لە سونەنەكان و صەحيحی حاكم دا هاتووە لە عبدالله ی كوڕی عومەرەوە فەرمويەتی: پێغەمبەر ﷺ هەرگيز وازی لە وتنی ئەم چەند وشەيە نەهێناوە لە بەيانی و ئێوارەدا: (اللَّهُمَّ إنِّي أسأَلُكَ العَافِيَةَ فِي الدُّنيَا والآخِرةَ, اللَّهُمَّ إنِّي أسأَلُكَ العَفوَ وَالعَافِيَةَ فِي دِينِي وَدُنيَايَ وَأهلِي وَمَالِي, اللَّهُمَّ استُر عَورَاتِي وَآمِن رَوعَاتِي، اللَّهُمَّ احفَظنِي مِن بَينِ يَدَيَّ وَمِن خَلفِي وَعَن يَمِينِي وَعَن شِمَالِي، وَمِن فَوقِي، وَأعُوذُ بِعَظَمَتِكَ أن أُغتَالَ مِن تَحتِي) قال وكيع: يعني الخسف. واتە: خوايە من داوای تەندروستی ئەواوت لێ ئەكەم لە دونيا و ڕۆژی دوايیدا, خوايە من داوای تەندروستی و لێ بوردنت لێ ئەكەم لە ئاين و دونيا و لە كەس‌وكار و ماڵمدا, خوايە عەيب نەنگيەكانم داپۆشە و ترسەكانم هێمن بكەرەوە، خوايە لە پێش‌و دواوەو

لای راست و لای چەپ و لای سەرمەوە پارێزگاریم بکە، خوایە پەنا بە گەورەیی تۆ ئەگرم لەوەی کە بە ڕۆچوون بە زەوی دا لەناو بچم.

١٢- لە (عبدالرحمن) ی کوڕی (أبي بكرة) هاتوە فەرمویەتی: بە باوکم ووت: بابە گوێم لێتە هەموو بەیانیەك ئەڵێیت: (اللَّهُمَّ عَافِنِي فِي بَدَنِي، اللَّهُمَّ عَافِنِي فِي سَمعِي، اللَّهُمَّ عَافِنِي فِي بَصَرِي، لا إِلَهَ إِلا أَنتَ). واتە: خوایە لاشە و گوێ و چاوم ساغ بکە، پەرستراوێکی بە حەقی تر نی‌یە شایستەی پەرستن بێت جگە لە تۆ، بەیانی و ئێوارە سێ جار سێ جار ئەی‌ڵێتەوە، ئەویش فەرموی: گوێم لە پێغەمبەر ﷺ بووە ئەم دوعایانە ی فەرمووە، وە منیش حەز ئەکەم لەسەر ڕێ و شوێنی ئەو برۆم. ئەبوداود گێڕاویەتی‌یەوە.

ئیبنوسوننی لە ئیبنو عەبباسەوە ئەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: هەرکەس ڕۆژی کردەوەو ووتی: (اللَّهُمَّ إِنِّي أَصبَحتُ مِنكَ فِي نِعمَةٍ وَعَافِيَةٍ وَسترٍ, فَأَتِمَّ نِعمَتَكَ عَلَيَّ وَعَافِيَتَكَ وَستَرَكَ فِي الدُّنيَا وَالآخِرَةِ). سێ جار بەیانی و سێ جار ئێوارە، ئەوە لەسەر خوایە ئەوشتانەی بۆ تەواو بکات.

واتە: خوایە ئەم بەیانی‌یە بەهۆی تۆوە لە نیعمەت و لەش ساغی و داپۆشراوی دام, خوایە نیعمەت و لەش ساغی و داپۆشراوی‌یەکەم لە دونیا و ئاخیرەتدا بۆ بەردەوام بکە.

لە ئەنەسەوە ئەگێڕرێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: ئایا ئێوە ناتوانن وەك (أبي ضمضم) بکەن؟ ووتیان: ئەی نێرراوی خوا (أبي ضمضم) کێ‌یە؟ فەرمووی: بەیانیان ئەی ووت: (اللَّهُمَّ وَهَبتُ نَفسِي وَعِرضِي لَكَ). واتە: خوایە من خۆم و ئابڕوم ئەبەخشم بەتۆ. جا هەرکەس جوێنی پێ بدایە جوێنی پێ نەئەداوە، وە هەرکەس ستەمی لێ بکردایە ستەمی لێ نەئەکردەوە، وە هەرکەس لێی بدایە لێی نەئەدایەوە.

لە ئەبو دەرداوە خوا لێی ڕازی بێت ئەگێرنەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: هەرکەس هەموو بەیانی و ئێوارەیەك بڵێت: (حَسبِيَ اللهُ لا إِلَهَ إِلا هُوَ عَلَيهِ تَوَكَّلتُ، وَهُوَ رَبُّ العَرشِ العَظِيم). حەوت جار، خوا لە غەمی دونیا و ئاخیرەت ئەی پارێزێت. واتە: تەنها خوام بەسە و پشت بەو ئەبەستم، هەر ئەویش پەروەردگاری عەرشی گەورەیە.

وە لە طەلقی کوڕی حەبیبەوە ئەگێڕنەوە فەرمویەتی: پیاوێك هات بۆلای ئەبو دەرداء پێی ووت: ئەی ئەبی دەرداء ماڵەکەت سوتا. ئەویش ووتی: ماڵی من نەسوتاوە —خوای گەورە ئەوە ناکات- بەهۆی ئەو چەند ووشەیەوە کە لە پێغەمبەرم ﷺ بیستووە، هەرکەس سەر لە بەیانی بیانڵێت هەتا ئێوارە توشی هیچ بەڵایەك نابێت، وە هەرکەس سەر لە ئیوارە بیانڵێت هەتا بەیانی توشی هیچ نابێت کە ئەمانەن: (اللَّهُمَّ أَنتَ رَبِّي لا إِلَه إِلا أَنتَ، عَلَيكَ تَوَكَّلتُ وَأَنتَ رَبُّ العَرشِ العَظِيم، مَا شَاءَ اللهُ كَانَ، وَمَا لَم يَشَأ لَم يَكُن، لا حَولَ وَلا قُوَّةَ الا بِاللهِ العَلِيِّ العَظِيم، أَعلَمُ أَنَّ اللهَ عَلَى كُلِّ شَيءٍ قَدِير وَأَنَّ اللهَ قَد أَحَاطَ بِكُلِّ شَيءٍ عِلماً، اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِن شَرِّ نَفسِي وَمِن شَرِّ كُلِّ دَابَّةٍ أَنتَ آخِذٌ بِنَاصِيَتِهَا، إِنَّ رَبِّي عَلَى صِرَاطٍ

مُستَقِيم)[1]. واتە: خوایە تۆ پەروەردگاری منی هیچ پەرستراوێکی بەحەق نیيە شایستەی پەرستن بێت تۆ نەبیت، پەنام هەر بەتۆیە، و هەر تۆ پەروەردگاری عەرشی گەورەی، ئەوەی خوا ویستویەتی بووە، وە ئەوەی نەیویستوە نەبوە. هیچ هێزو توانایەك بە دەست كەس نیە جگە لەو هێزەی كە لەلای خوای گەورەوەیە، ئەزانم خوا بە توانایە بەسەر هەموو شتێكدا، وە زانستی ئەو دەوری هەموو شتێكی داوە، خوایە من پەنا ئەگرم بەتۆ لە شەڕی خۆم و شەڕی هەموو ئەو زیندەوەرانەی تۆ بەدیت هێناون. بە ڕاستی پەروەردگارم لەسەر ڕێی ڕاستە.

لە هەندێ ریوایەتدا هاتووە ئەبودەرداء ووتویەتی: هەڵسن لە گەڵما وەرن ئەوانیش هەڵسان لەگەڵیا ڕۆیشتن هەتا گەیشتنە ماڵەكەی، سەیریان كرد چوار دەوری ماڵەكەی سوتاوە بەڵام ماڵەكەی نەسوتاوە.

## زیکرەکانی کاتی نوستن

١- بوخاری لە حوزەیفە و ئەبو ذەڕەوە ئەگێڕێتەوە خوا لێیان ڕازی بێت فەرمویانە: كاتێ پێغەمبەر ئەچووە ناو پێ خەفەكەی بۆ خەوتن ئەی فەرموو: (بِاسمِكَ اللَّهُمَّ أحيَا وَأمُوتُ). واتە: خوایە بەناوی تۆوە ئەژیم و ئەمرم، وە كە هەڵئەسا لە خەو ئەیفەرموو: (الحَمدُ للهِ الَّذِي أحيَانَا بَعدَ ما أمَاتَنَا وَإلَيهِ النُّشُور). واتە: سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایەی ئێمەی ژیاندەوە لەدوای ئەوەی كە مراندینی و زیندوو بونەوەشمان هەر بۆلای ئەوە.

پێغەمبەر ﷺ كاتێ خەوتووە دەستی ڕاستی خستۆتە ژێر ڕوومەتیو فەرموویەتی: (اللهم قني عذابك يوم تبعث عبادك) سێ جار واتە: خوایە لە سزای خۆت بم پارێزە ئەو ڕۆژەی كە بەندەكانت زیندو ئەكەیتەوە.

هەروەها ئەی فەرموو: (اللَّهُمَّ رَبَّ السَّمَوَاتِ وَرَبَّ الأرضِ وَرَبَّ العَرشِ العَظِيمِ، رَبَّنَا وَرَبَّ كُلِّ شَيءٍ، فَالِقَ الحَبِّ وَالنَّوَى، مُنَزِّلَ التَوراةِ والإنجِيلِ وَالقُرآنِ، أعُوذُ بِكَ مِن شَرِّ كُلِّ ذِي شَرٍّ أنتَ آخِذٌ بِنَاصِيَتِهِ، أنتَ الأوَّلُ فَلَيسَ قَبلَكَ شَيءٌ، وَأنتَ الآخِرُ فَلَيسَ بَعدَكَ شَيءٌ، وَأنتَ الظَّاهِرُ فَلَيسَ فَوقَكَ شَيءٌ، وَأنتَ البَاطِنُ فَلَيسَ دُونَكَ شَيءٌ، إقضِ عَنَّا الدَّينَ وَأغنِنَا مِنَ الفَقرِ). واتە: خوایە پەروەردگاری ئاسمانەكان و زەوی و عەرشی گەورە، پەروەردگاری هەموو شتێك و تەقێنەری دانەوێڵەو ناوكەكان، نێرەرە خوارەوەی تەورات و ئینجیل و قورئان, پەنا ئەگرم بەتۆ لە شەڕی هەموو ئەو شتانەی كە تۆ دروستت كردون و شەڕیان لێ ئەوەشێتەوە, و ناوچاوانیان لە دەستی تۆدایە، تۆ سەرەتایت و هیچ شتێكت لە پێشدا نەبووە، وە تۆ كۆتاییت و هیچ شتێكت لە دووادا نایات، وە تۆ بەرز و بڵندی بەسەر هەموو شتێكدا و هیچ شتێك لە

(١) لاوازە، ئیبنوسوننی بە ژمارە (٥٥) تەخریجی كردووە، وە ئەغلەبی كوڕی تەمیمی تێدایە، بوخاری و كەسانی تریش ووتویانە: حەدیسەكانی مونكەرە. (ألباني).

پشت تۆوە نی‌یە، وە تۆ شاراوەی‌و هیچ شتێك لەتۆ شاراوە نی‌یە، خوایە قەرزەکانمان بۆ بدەرەوەو دەوڵەمەندمان بکە لە هەژاری.

هەروەها ئەی فەرموو: (الحَمدُ للهِ الَّذي أطعَمَنا وَسَقانا وَكَفانا، وَآوانا، فَكَم مِمَّن لا كَافِيَ لَهُ وَلا مُؤوِي) واتە سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە خۆراکی پێ داین و تێر ئاوی کردین و هەر ئەو بەس بوو بۆ ئێمە، وە شوێنی حەوانەوەی بۆ داین کردین، چونکە چەندەها کەس هەن کە بێ‌شوێنی حەوانەوە و بێ‌کەسن.

وە کاتێ ئەچووە ناو پێخەفەکەیەوە هەموو شەوێك فوی ئەکرد بە دەساتەکانیدا و ﴿قُلۡ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ﴾ و ﴿قُلۡ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلۡفَلَقِ﴾ و ﴿قُلۡ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلنَّاسِ﴾ ی ئەخوێند بەسەر هەردوو دەستیداو هەتا توانای هەبوو ئەیهێنان بە خۆیا، لە پێشەوە ئەی هێنان بەڕوخسار و لەشی و لای پێشەوەیدا، سێ جار ئەوکارەی ئەکرد.

وە فەرمانی ئەدا کە هەرکەس ڕاکشێت با بڵێت: (باسمِكَ رَبِّي وَضَعتُ جَنبِي، وَبِكَ أرفَعُهُ، إن أمسَكتَ نَفسِي فَارحَمهَا، وَإن أرسَلتَهَا فَاحفَظهَا بِمَا تَحفَظُ بِهِ عِبَادَكَ الصَّالِحِين). واتە: ئەی پەروەردگارم بەناوی تۆوە لاتەنیشتم داناوە و بەناوی تۆوە بەرزی ئەکەمەوە، ئەگەر گیانمت کێشا بەزەییت پێیدا بێتەوە، وە ئەگەر ڕەهات کرد بیپارێزە بەوەی کە بەندە چاکەکانتی پێ ئەپارێزی.

وە بە (فاطمە)ی کچی ئەفەرموو: (سَبِّحِي اللهَ ثَلاثاً وَثَلاثِينَ، وَاحمَدِيهِ ثَلاثاً وَثَلاثِينَ، وَكَبِّرِيهِ أربَعاً وَثَلاثِين). واتە: سی‌وسێ جار (سبحانَ الله) بکەو سی‌وسێ جار (الحمد لله) و سی‌وچوار جار (الله أكبر).

وە ئامۆژگاری کردوە لەکاتی ڕاکشاندا بۆ خەوتن بە خوێندنی ئەو پاڕانەوەیە کە لە پێشەوە باس کراوە: (اللّٰهُمَّ فَاطِرَ السَّمَوَاتِ والأرضِ...)، هەروەك ئامۆژگاری کردوە بە خوێندنی (آية الكرسي) و ڕای گەیاندووە هەرکەس ئەوانەی خوێند ئەوە بەردەوام خوا ئاگاداری ئەکات.

وە بە بەڕائی فەرمووە: کاتێ ویستت بخەویت دەست نوێژ بگرە وەك چۆن دەست نوێژ ئەگریت بۆ نوێژ کردن، پاشان لەسەر لای ڕاست ڕابکێشێ و بڵێ: (اللّٰهُمَّ أسلَمتُ نَفسِي إلَيكَ وَوَجَّهتُ وَجهِي إلَيكَ، وَفَوَّضتُ أمرِي إلَيكَ، وَألجَأتُ ظَهرِي إلَيكَ، رَغبَةً وَرَهبَةً إلَيكَ، لا مَلجَأ وَلا مَنجَى مِنكَ إلا إلَيكَ، آمَنتُ بِكِتَابِكَ الَّذِي أنزَلتَ، وَبِنَبِيِّكَ الَّذِي أرسَلتَ). واتە: خوایە خۆم سپارد بە تۆ و ڕوم کردە تۆو کارەکانم سپارد بەتۆ، و پەنام بردە بەرتۆ، بە ڕەغبەت و ترسەوە، خوایە هیچ پەناگەو جێی ڕزگاری‌یەك نیە لە تۆ مەگەر لای تۆ نەبێت، باوەڕم بەو کتێبە هەیە کە ناردوتە خوارەوە، وە بەو پێغەمبەرەی کە ڕەوانەت کردوە). لە پاشاندا فەرمووی: ئەگەر بمریت ئەوە لەسەر سروشت ئەمرێت. وە با ئەو دوعایەت دواقسەت بێت.

## دوعای لە خەو هەڵسان

پێغەمبەر ﷺ فەرمانی داوە بەوکەسەی لە خەو هەڵئەستێ کە بڵێت: (الْحَمدُ للهِ الَّذِي رَدَّ عَلَيَّ رُوحِي، وَعَافَانِي فِي جَسَدِي وَأَذِنَ لِي بِذِكْرِهِ)[1]. واتە: سوپاسو ستایش بۆ ئەو خوایەی گیانمی گێڕایەوەو لاشەمس سەلامەت کردو ڕێی پێ دام یادی بکەم.

پێغەمبەر ﷺ کاتێ لە خەو هەڵئەسا ئەیفەرموو: (لا إِلَهَ إلا أَنتَ سُبحَانَكَ، اللَّهُمَّ أَستَغفِرُكَ لِذَنبِي، وَأَسأَلُكَ رَحمَتَكَ، اللَّهُمَّ زِدنِي عِلماً، وَلا تُزِغ قَلبِي بَعدَ إِذ هَدَيتَنِي، وَهَب لِي مِن لَدُنكَ رَحمَةً، إِنَّكَ أَنتَ الوَهَّابُ)[2]أخرجه أبوداود. واتە: ئەی پەروەردگاری پاکو بێ گەرد جگە لە تۆ هیچ پەرستراوێکی بەحەق نیيە شایستەی پەرستن بێت تۆ نەبیت، خوایە داوای لێ بووردنت لێ ئەکەم و داوای میهرەبانیت لێ ئەکەم، خوایە زانستم زیاد بکە و دڵم لە ڕێی ڕاست لامەدە دوای ئەوەی ڕێنماییت کردم، خوایە سۆزو بەزەیی خۆتم پێ ببەخشە چونکە هەر تۆ زۆر بەخشندەی.

وە فەرموویەتی: هەرکەس شەو خەوی لێ زڕا بڵێت: (لا إِلَهَ إلا اللهُ وَحدَهُ لا شَرِيكَ لَهُ، لَهُ المُلكُ وَلَهُ الحَمدُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيءٍ قَدير، الحَمدُ للهِ، وَسُبحَانَ اللهِ، وَلا إِلَهَ إلا اللهُ، وَاللهُ أَكبَرُ، وَلا حَولَ وَلا قُوَّةَ إلا بِاللهِ) پاشان بڵێت: (اللَّهُمَّ اغفِر لِي)، یان دوعا بکات خوا گیرای ئەکات، وەئەگەر دەست نوێژ بگرێت و نوێژێك بکات خوا نوێژەکەی قبوڵ ئەکات.

## زیکری خوا لە کاتی ترس و خەو زڕان و تەنهایی

لە عەمری کوڕی شوعەیبەوە لە باوکیەوە لە باپیریەوە هاتوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: ئەگەر کەسێکتان ڕاپەڕی لە خەو بە ترسەوە، با بڵێت: (أَعُوذُ بِكَلِمَاتِ اللهِ التَّامَّاتِ مِن غَضَبِهِ وَعِقَابِهِ وَشَرِّ عِبَادِهِ، وَمِن هَمَزَاتِ الشَّيَاطِينِ، وَأَن يَحضُرُونِ، فَإِنَّهَا لَن تَضُرَّهُ). واتە: پەنا ئەگرم بەووشە تەواوەکانی خوا لە تووڕەبون و سزای خوا وە لە شەڕی بەندەکانی، هەروەها لە وەسوەسەی شەیتانەکان کە ئامادە بن، ئەوە زیانی پێ ناگەیەنن.

گێڕەرەوەی ئەم فەرموودەیە ووتویەتی: ئیبنو عومەر ئەم دوعایەی فێری منداڵەکانی ئەکرد کە باڵغ بونایە، وە ئەوەش کە باڵغ نەبوایە لەسەر پارچە کاغەزێك ئەینوسی و بە ملیا هەڵی ئەواسی. ئیسنادەکەی پلەی (حسن)ی هەیە.

---

(١) شێخ ئەلبانی دەفەرموێت ئەم حەدیسە (جید)ە.

(٢) لاوازە، عبداللە ی کوڕی وەلیدی میسری لە سەنەدەکەیدا هەیە (دارقطني) ووتویەتی: ئیعتباری پێ ناکرێت. (ألباني).

له خالیدی کوڕی وەلیدەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتووە فەرمویەتی: شەوێك خەوم لێ زڕابوو پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئایا چەند ووشەیەکت فێرنەکەم ئەگەر خوێندتن خەوت لێ بکەوێت؟ بلێ: (اللّٰهُمَّ رَبَّ السَّمواتِ السَّبعِ وَمَا أظلَّت، وَرَبَّ الأرَضِينَ وَمَا أقَلَّت، وَرَبَّ الشَّيَاطِينِ وَمَا أضَلَّت، كُن لِي جَاراً مِن شَرِّ خَلقِكَ كلِّهم جَمِيعاً. أن يفرُطَ عَليَّ أحَدٌ مِنهُم، أو أن يَبغِيَ عَليَّ. عَزَّ جَارُكَ، وَجَلَّ ثَنَاؤُكَ وَلا إلَه غَيرُكَ. أو لا إلَه إلا أنتَ)[1]. واتە: خوایە پەروەردگاری حەوت ئاسمانەکان و ئەوانەی سێبەریان بەسەرەوە کردووە، وە پەروەردگاری زەوی‌یەکان و ئەوانەی لەخۆیان گرتووە، وە پەروەردگاری شەیتانەکان و ئەوانەی گومڕایان کردوون، پەنام بدە لە شەڕی هەموو دروست کراوەکانت، کە کەسێك لەوانە تەجاوز بکاتە سەرم، یان ستەمم لێ بکات، بەڕاستی پەنای تۆ گەورەیە و ستایشت بەرزە، وە هیچ پەرستراوێك نی‌یە کە بە حەق شایستەی پەرستن بێت جگە لە تۆ.

ئەم فەرموودەیە (طبراني) لە (الكبير) و (الأوسط)دا گێڕاویەتی‌یەوە، وە ئیسنادەکەی پلەی (جيد)ی هەیە، بەلام (عبدالرحمن) ی کوڕی (سابط) هیچی لە خالید نەبیستووە, (حافظ منذري) واتەڵێت.

(طبراني) و ئیبنوسوننی لە بەرائی کوڕی عازیبەوە ئەگێڕنەوە کە پیاوێك هانای هێنا بۆ پێغەمبەر ﷺ ووتی: توشی غەم و تەنهایی بووم و هەست بە دڵتەنگی ئەکەم، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بڵێ: (سُبحَانَ اللهِ المَلِكِ القُدُّوسِ، رَبِّ المَلائِكَةِ وَالرُّوحِ، جَلَلتَ السَّمَوَاتِ والأرضَ بِالعِزَّةِ وَالجَبَرُوتِ) ئەڵێ: کابرا سێ جار ئەوەی ووت، خوا وەحشەتەکەی لە دڵدا دەرکرد.

واتە: پاك و بێ گەردی بۆ ئەو خوایەی پاشایەکی بێ گەرد و پیرۆزە، و پەروەردگاری فریشتە و جوبرائیلە، بە عیززەت و جەبەروتی خۆت ئاسمانەکانت شکۆدار کردووە.

### کەسێك خەوێکی ناخۆش ببینێت چی بکات و چی بڵێت

١- لە جابیرەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر کەسێکتان خەوێکی ناخۆشی بینی، با سێ جار تف بەلای چەپیدا بکات پاشان بڵێت: (أعوذ بالله من الشيطان الرجيم) وە هەڵگەڕێتەوە سەر لایەکەی تری. موسلیم و ئەبوداود و نەسائی و ئیبنوماجە گێڕاویانەتەوە.

٢- لە ئەبو سەعیدی خودریەوە هاتووە فەرمویەتی: گوێم لە پێغەمبەر ﷺ بووە فەرمویەتی: (إذَا رَأى أحَدُكُمُ الرُّؤيَا يُحِبُّهَا فَإنَّمَا هِيَ مِنَ اللهِ، فَليَحمَدِ اللهَ عَلَيهَا، وَليُحَدِّث بِمَا رَأى. وَإذَا رَأى غَيرَ ذَلِكَ مِمَّا يَكرَهُ، فَإنَّمَا هِيَ مِنَ الشَّيطَانِ فَليَستَعِذ بِاللهِ مِن شَرِّهَا وَلا يَذكُرهَا لأحَدٍ فَإنَّها لا تَضُرُّهُ) رواه

(١) ترمذی لە (٤:٢٦٦)دا ووتویەتی: ئەم حەدیسە ئیسنادەکەی بەهێز نییە، حەکەمی کوڕی زەهیر لە ئیسنادەکەیدایە، زانایانی حەدیس حەدیسەکانیان وەرنەگرتووە. (حافظ) ووتویەتی مەترووکە، هەروەها ئیبنومەعین گومانی پێ بردوە، وە زۆر لاوازە. (ألباني).

الترمذي وقال: حديث حسن صحيح. واتە: ئەگەر کەسێکتان خەوێکی خۆشی بینی با بزانێت ئەوە لە خواوەیە و سوپاس و ستایشی خوای لەسەر بکات‌و باسی بکات، بەڵام ئەگر خەوێکی ناخۆشی بینی ئەوە لە شەیتانەوەیە با پەنا بگرێت بەخوا لە شەڕی ئەو خەونە ناخۆشە، و لای کەس باسی نەکات، ئەوە زیانی نابێت بۆی.

## زیکری پۆشاك لەبەر کردن

١- ئیبنوسوننی ئەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ کاتێ جلێك یا کراسێکی یا مێزەرێکی لەبەر بکردایە ئەی فەرموو: (اللَّهُمَّ إِنِّي أَسأَلُكَ مِن خَيرِهِ وَخَيرِ مَا هُوَ لَهُ، وَأَعُوذُ بِكَ مِن شَرِّهِ وَشَرِّ مَا هُوَ لَهُ). واتە: خوایە داوات لێ ئەکەم لە خێری ئەو پۆشاکەو خێری ئەوەی کە پۆشاکەکە بۆ ئەوە، وە پەنا ئەگرم بە تۆ لە شەڕی ئەو پۆشاکەو لە شەڕی ئەوەش کە پۆشاکەکە بۆ ئەوە.

٢- وە لە موعازی کوڕی ئەنەسەوە ئەگێڕنەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: هەرکەس جلێکی تازەی لەبەر کرد بڵێت: (الحَمدُ للهِ الَّذي كَسَانِي هَذَا، وَرَزَقَنِيهِ مِن غَيرِ حَولٍ مِنِّي وَلا قُوَّة) خوا لە گوناهی ڕابوردوی ئەبورێت.

واتە: سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایەی بەم بەرگە منی پۆشی و پێی بەخشیم بێ ئەوەی هیچ هەوڵ و تەقەلایەك لەلایەن منەوە هەبێت.

هەروەها پەسەندە کە (بسم الله) بکات، چونکە هەر شتێك بە (بسم الله) دەست پێ نەکرێت ئەوە ناتەواوە.

## دوعای لەبەر کردنی بەرگی تازە

١-لە ئەبی سەعیدی خودریەوە هاتووە فەرمویەتی: پێغەمبەر ﷺ هەرکاتێك بەرگێکی تازەی لەبەر بکردایە ناوی ئەو شتەی ئەبرد ـ مێزەر بوایە یان کراس یان شتی تر ـ . پاشان ئەی فەرموو: (اللَّهُمَّ لَكَ الحَمدُ أَنتَ كَسَوتَنِيهِ, أَسأَلُكَ خَيرَهُ وَخَيرَ مَا صُنِعَ لَهُ، وَأَعُوذُ بِكَ مِن شَرِّهِ وَشَرِّ مَا صُنِعَ لَهُ) رواه أبوداود والترمذي وحسنه. واتە: خوایە سوپاس و ستایش بۆ تۆ کە ئەم بەرگەت پێ بەخشیم، داوای خێرەکەی و خێری ئەوەی کە بۆی دروست کراوە لێت ئەکەم، وە پەنات پێ ئەگرم لە شەڕەکەی و شەڕی ئەوەی بۆی دروست کراوە.

٢- (ترمذي) لە عومەرەوە ئەگێڕێتەوە فەرمویەتی: گوێم لە پێغەمبەر ﷺ بووە ئەی فەرموو: هەرکەس پۆشاکێکی نوێ لەبەر بکات‌و بڵێت: (الحَمدُ للهِ الَّذِي كَسَانِي مَا أُوَارِي بِهِ عَورَتِي، وَأَتَجَمَّلُ بِهِ فِي حَيَاتِي) واتە: سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایەی ئەم پۆشاکەی پێ بەخشیم کە عەورەتی خۆمی پێ دائەپۆشم و لە ژیانما خۆمی پێ ئەڕازێنمەوە. پاشان بەرگە کۆنەکەی بکات بە صەدەقە، ئەوە ئەو کەسە لە

ژێر سایە و پاراستنی خوادا ئەبێت، وە ئەو بەخشینەی هەر لە ڕێی خوادا ئەبێت، ئیتر لە ژیانا بێت یا بمرێت.

## ئەگەر هاوەڵەکەت بینی بەرگێکی تازەی لەبەردابوو چی پێ ئەڵێیت

١- بە صەحیحی هاتووە کە ئومو خالید کاتێك پێغەمبەر ﷺ بەرگێکی تازەی ئەداتێ و لەبەری ئەکات پێغەمبەر ﷺ پێی ئەفەرموێت: (أبلي وأخلفي) واتە: کۆنی بکەیت و بەرگێکی تازەی بێنیتە جێ، وە هاوەڵەکانی پێغەمبەر ﷺ ئەیان ووت: (تُبلِي وَيُخلِفُ اللّهَ) واتە: بیدڕێتەوە و خوا بەرگێکی تازەی تری بخاتە جێ.

٢- جارێکیان پێغەمبەر ﷺ بەرگێکی تازەی لەبەر عومەردا بینی پێی فەرمو: (إلبَس جَدِيداً، وَعِش حَمِيداً، وَمُت شَهِيداً سَعِيداً) رواه ابن ماجة وابن السني. واتە: بەرگی نوێ لەبەر بکەیت و بەبەختیاری بژیت، و بە شەهیدی و خۆش بەختیەوە بمریت.

## دوعای داکەندنی جلوبەرگ

ئیبنوسوننی لە ئەنەسەوە ئەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: پەردەی نێوان عەورەتی ئادەمی و چاوی جنۆکە ئەوەیە کاتێ موسڵمان جلەکانی داکەند بڵێت: (بِسمِ اللهِ الَّذِي لا إلَهَ إلا هُوَ).

## ئەزکاری چونە دەر لە ماڵ

١- ئەبوداوود لە ئەنەسەوە ئەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: هەرکەس لە ماڵ چووە دەرەوە بڵێت: (بِسمِ اللهِ تَوَكَّلتُ على اللهِ، وَلا حَولَ وَلا قُوَّةَ إلا بِاللهِ) واتە: بەناوی خوا پشتم بەخوابەست، هیچ هەوڵ و دەسەڵات و هێزێك نیە بە خوا نەبێت. پێی ئەوترێت: بەستە پارێزراوی‌و ڕێنمایی کراوی. وە شەیتان خۆی لێ لا ئەدات و بە شەیتانێکی تر ئەڵێت: (چۆن دەسەڵاتت بەسەر کەسێکدا ئەبێت خوا ڕێنمایی کردبێت و پاراستبێتی).

٢- وە لە موسنەدی ئیمام ئەحمەددا لە ئەنەسەوە بەم جۆرە هاتووە: (بِسمِ اللهِ آمنتُ بِاللهِ، اعتَصَمتُ بِاللهِ، تَوَكَّلتُ عَلَى اللهِ، لا حَولَ وَلا قُوَّةَ إلا بِاللهِ) حديث حسن. واتە: بەناوی خوا، باوەڕم بەخوا هەیەو پەنای پێ ئەبەم و پشتی پێ ئەبەستم، کەس دەسەڵات و توانا و هێزی هیچی نیە خوا نەبێت.

٣- خاوەن سونەنەکان لە ئومو سەلەمەوە ئەگێڕنەوە فەرمویەتی: هەرگیز پێغەمبەر ﷺ لە ماڵی من نەچۆتە دەرەوە سەری بەرز نەکردبێتەوە بۆ ئاسمان و نەیفەرموبێت: (اللّهُمَّ إنِّي أعُوذُ بِكَ أن أضِلَّ أو أُضَلَّ، أو أزِلَّ أو أُزَلَّ، أو أظلِمَ أو أُظلَمَ، أو أجهَلَ أو يُجهَلَ عَلَيَّ) قال الترمذي حديث حسن صحيح. واتە: خوایە پەنا ئەگرم بەتۆ لەوەی کە خەڵك گومڕا بکەمم یا گومڕا بکرێم، یا خەڵك توشی هەڵە بکەم یا هەڵەم پێ

بکرێت، یا ستەم بکەم یا ستەمم لێ بکرێت، یا نەفامی بەرامبەر بە خەڵك بکەم یا نەفامیم بەرامبەر بکرێت.

## زیکرەکانی چوونە ناو ماڵ

١- لە صەحیحی موسلیمدا هاتووە لە جابیرەوە فەرمویەتی: گوێم لە پێغەمبەر ﷺ بووە ئەیفەرموو: (إذَا دَخَلَ الرَّجُلُ بَيتَهُ فَذَكَرَ اللهَ تَعَالى عِندَ دُخُولِهِ، وَعِندَ طَعَامِهِ، قَالَ الشَّيطَانُ: لا مَبِيتَ لَكُم وَلا عَشَاءَ. وَإذَا دَخَلَ فَلَم يَذكُرِ اللهَ تَعَالى عِندَ دُخُولِهِ، قَالَ الشَّيطَانُ: أدرَكتُمُ المَبِيتَ، فَإذَا لَم يَذكُرِ اللهَ تَعالى عِندَ طَعَامِهِ، قَالَ: أدرَكتُمُ المَبِيتَ وَالعَشَاءَ). واتە: ئەگەر کەسێك چووە ماڵەوە، کاتی چوونە ژوورەوە و کاتێك نانی خوارد ناوی خوا بەرێت و بڵێت: (بسم الله)، شەیتان بە دارو دەستەی خۆی ئەڵێت: نە شوێنی حەوانەوەتان هەیە نە نانی ئێوارە، بەلام ئەگەر کاتێ چووە ماڵەوە ناوی خوای نەبرد، شەیتان ئەڵێت: گەیشتین بەشوێنی حەوانەوە، وە ئەگەر لەکاتی خواردنیشدا هەر ناوی خوای نەبرد، شەیتان ئەڵێت: گەیشتن بە شوێنی حەوانەوەو خواردنی ئێوارە.

٢- لە سونەنی ئەبو داودا هاتووە لە ئەبو مالیکی ئەشعەرییەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (إذَا وَلَجَ الرَّجُلُ بَيتَهُ فَليَقُل: اللَّهُمَّ إنّي أسألُكَ خَيرَ المَولِجِ وَخَيرَ المَخرَجِ، بِسمِ اللهِ وَلَجنَا، وَبِسمِ اللهِ خَرَجنَا، وَعَلَى اللهِ رَبِّنَا تَوَكَّلنَا، ثُمَّ لِيُسَلِّم عَلَى أهلِهِ). واتە: ئەگەر کەسێك چووە ماڵەوە با بڵێت: خوایە خێرو چاکەی ئەو شوێنەی کە ئەچمە ناوییەوە لە تۆ داوا ئەکەم، وە هەروەها خێر و چاکەی ئەو شوێنەی کە لێی دێمە دەرەوە لە تۆ داوا ئەکەم، بەناوی خوا ئەچینە ژوورەوە و بەناوی خوا دێینەدەر، وە پشت بە پەروەردگارمان ئەبەستین. پاش ئەمانە سلاو لە کەس‌وکاری بکات.

٣- لە (ترمذي)دا هاتووە لە ئەنەسەوە فەرمویەتی: پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموم: (يَا بُنَيَّ إذَا دَخَلتَ على أهلِكَ فَسَلِّم تَكُن بَرَكَةً عَلَيكَ وَعلى أهلِ بَيتِكَ) قال الترمذي: حديث حسن صحيح. واتە: کوڕەکەم کاتێ چوویتە ماڵەوە سلاو لە کەس و کارت بکە ئەبێتە بەرەکەت بۆ تۆ و کەس‌وکارت.

## زیکری بینینی ئەوەی کە دڵ خۆش کەرە لە ماڵەکەی

پێویستە لەسەر ئادەمیزاد کاتێ شتێکی بینی کە دڵخۆشی ئەکات لە کەسوکاریدا، یا لە ماڵی خۆیدا، بڵێت: (ماشاء الله لا قوة إلا بالله) چونکە ئەگەر وابڵێ خراپی بەو ماڵەیەوە نابینی.

وە ئەگەر شتێکی بینی دڵی پێ خۆش نەبوو با بڵیت: (الحَمدُ للهِ عَلَى كُلِّ حَالٍ).

خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَلَوْلَآ إِذْ دَخَلْتَ جَنَّتَكَ قُلْتَ مَا شَآءَ ٱللَّهُ لَا قُوَّةَ إِلَّا بِٱللَّهِ﴾ (الكهف/٣٩). واتە: ئەوە بۆ کاتێ چویتە ناو باغەکەتەوە نەت ووت:(مَا شَاءَ اللّهُ لا قُوَّةَ إلّا بِاللّه).

ئیبنوسوننی لە ئەنەسەوە ئەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (مَا أنعَمَ اللهُ على عَبدٍ نِعمَةً، فِي أهلٍ وَمَالٍ وَوَلَدٍ، فَقَالَ: مَا شَاءَ اللهُ لا قُوَّةَ إلا بِاللهِ، فَيَرى فِيهَا آفَةً دُونَ المَوتِ). واتە: ئەگەر خوا نیعمەتی دا بە بەندەیەك لە کەس‌وکارو ماڵو منداڵدا، ئەویش بڵێت: (ما شاء الله لا قوة إلا بالله) لە مردن بەولاوە ئافەتێکی تر نابینێت تیایاندا.

هەروەها لە پێغەمبەرەوە ﷺ ئەگێڕنەوە کە ئەگەر شتێکی دڵخۆش کەری بدیبایە ئەیفەرموو: (الحَمدُ للهِ الَّذِي بِنِعمَتِهِ تَتِمُّ الصَّالِحَاتُ). واتە: سوپاس بۆ ئەو خوایەی بە نیعمەتەکانی ئەو چاکەکان تەواو ئەبن.

وە ئەگەر شتێکی بدیبایە کە پێی ناخۆش بێت ئەیفەرموو: (الحَمدُ للهِ على كُلِّ حَالٍ) واتە: سوپاس بۆ خوا لەسەر هەموو حاڵێك. ئیبنوماجە گێڕاویەتیەوە، وە حاکم ووتویەتی: ئەم فەرموودەیە سەنەدەکەی صەحیحە.

## زیکرکردن لە کاتی سەیر کردنی ئاوێنەدا

١- ئیبنوسوننی لە عەلیەوە ئەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ کاتێ سەیری ئاوێنەی ئەکرد ئەی فەرموو: (الحَمدُ للهِ. اللَّهُمَّ كَمَا حَسَّنتَ خَلقِي فَحَسِّن خُلُقِي). واتە: سوپاس بۆ خوا، خوایە وەك چۆن شێوەمت جوان کردوە ڕەوشتیشم جوان بکە.

لە ئەنەسەوە ئەگێڕنەوە کە پێغەمبەر ﷺ کاتێ سەیری خۆی ئەکرد لە ئاوێنەدا ئەی فەرموو: (الحَمدُ للهِ الَّذِي سَوَّى خَلقِي فَعَدَلَهُ، وَكَرَّمَ صُورَةَ وَجهِي فَحَسَّنَهَا، وَجَعَلَنِي مِنَ المُسلِمِينَ). واتە: سوپاس بۆ ئەو خوایەی شێوە و بەدەنمی ڕێك و ڕاست کردووەو شێوەی ڕوخسارمی بەڕێز کردووە و جوانی کردووە، وە کردوومی بە یەکێ لە موسڵمانان.

## لەکاتی بینینی ئەو کەسانەدا کە توشی بەڵا و موصیبەت بون چی ئەوترێت

(ترمذي) لە ئەبی هورەیرەوە ئەگێڕێتەوە و پلەی (حسن)ی بۆ داناوە کە : پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: هەرکەس کەسێکی بینی کە دەردو بەڵای توش بووە، بڵێت: (الحَمدُ للهِ الَّذِي عَافَانِي مِمَّا ابتَلاكَ بِهِ، وَفَضَّلَنِي على كَثِيرٍ مِمَّن خَلَقَ تَفضِيلا). ئەو بەڵایەی توش نابێت.

واتە: سوپاس بۆ ئەوخوایەی منی پاراستووە لەو بەڵایەی کە تۆی پێوە دوچار کردوە، وە فەزڵی داوم بەسەر زۆر لە دروست کراوەکانیدا.

ئەوەی وتویەتی: زانانیان ئەڵێن: ئەبێ ئەو کەسە لە دڵی خۆیدا ئەوە بڵێت بە جۆرێك خۆی نەبێت کەسی تر نەیبیستێ، و دەردەدارەکەش گوێی لێ نەبێت، بۆ ئەوەی دڵی ئازاری پێ نەگات، مەگەر ئەو دەردەی بەهۆی تاوانەوە بێت، ئەوکاتە خراپ نیە دەردەدارەکەش گوێی لێ بێت، بە مەرجێ ترسی خراپە لێ کەوتنەوەی نەبێت لەوەدا.

## زیکر کردن لە کاتی بیستنی دەنگی کەڵەباب و زەڕەی کەرو وەڕەی سەگ

بوخاری و موسلیم لە ئەبی هورەیرەوە ئەگێڕنەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (إِذَا سَمِعتُم نَهِيقَ الحَمِيرِ فَتَعَوَّذُوا بِاللهِ مِنَ الشَّيطَانِ، فَإِنَّهَا رَأَت شَيطَاناً، وَإِذَا سَمِعتُم صِيَاحَ الدِّيكَةِ فَسَلُوا اللهَ مِن فَضلِهِ، فَإِنَّهَا رَأَت مَلَكاً). واتە: ئەگەر زەڕەی گوێ درێژتان بیست بڵێن: (أعوذ بالله من الشيطان الرجيم) چونکە ئەوە شەیتانی بینیوە، وە ئەگەر قوقەی کەڵەبابتان بیست، داوای فەزڵ و چاکە لە خوا بکەن، چونکە ئەوە فریشتەی بینیوە.

لە لای ئەبی داود ئاوا هاتووە: (إِذَا سَمِعتُم نُبَاحَ الكِلَابِ وَنَهِيقَ الحَمِيرِ بِاللَّيلِ، فَتَعَوَّذُوا بِاللهِ مِنهُنَّ، فَإِنَّهُنَّ يَرَينَ مَالا تَرَونَ). واتە: کاتێ وەڕەی سەگ و زەڕەی گوێ درێژتان لە شەودا بیست، پەنا بەخوا بگرن لێیان، چونکە ئەمانە شتێك ئەبینن کە ئێوە نایبینن.

## زیکر کردن لە کاتی هەڵکردنی ڕەشەبادا

ئەبوداود بە ئیسنادێکی (حسن) لە ئەبی هورێرەوە ئەگێڕێتەوە فەرمویەتی: گوێم لە پێغەمبەر ﷺ بووە فەرمویەتی: (الرِّيحُ مِن رَوحِ اللهِ تَعَالى، تَأتِي بِالرَّحمَةِ وَتَأتِي بِالعَذَابِ، فَإِذَا رَأَيتُمُوهَا فَلا تَسُبُّوهَا، وَسَلُوا اللهَ خَيرَهَا، وَاستَعِيذُوا بِاللهِ مِن شَرِّهَا). واتە: با لە ڕەحمەتەکانی خوای گەورەیە، ڕەحمەت ئەهێنێ و سزاش ئەهێنێ، جا کاتێ با هەڵئەکات جوێنی پێ مەدەن، وە داوای ئەو خێر و چاکەیە بکەن کە پێوەیەتی، وە پەنا بگرن بە خوا لەشەڕەکەی.

لە صەحیحی موسلیمدا هاتووە کە عائیشە فەرمویەتی: کاتێ بایەکی توند هەڵی ئەکرد پێغەمبەر ﷺ ئەیفەرموو: (اللَّهُمَّ إِنِّي أَسأَلُكَ خَيرَهَا وَخَيرَ مَا فِيهَا وَخَيرَ مَا أُرسِلَت بِهِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِن شَرِّهَا وَشَرِّ مَا أُرسِلَت بِهِ) واتە: خوایە من دوای خێری ئەم بایەت لێ ئەکەم وە خێری ئەوەی تێیدایە، وە خێرەی ئەوەش کە بۆی نێرراوە، وە پەنا ئەگرم بەتۆ لە شەڕی ئەم بایەو شەڕەی ئەوەش کە بۆی نێرراوە.

## ئەوەی ئەوترێت لە کاتی هەورەگرمە و چەخماخەدان

(ترمذي) لە ئیبنوعومەرەوە ئەگێڕێتەوە فەرمویەتی: کاتێ پێغەمبەر ﷺ گوێی لە دەنگی هەورە گرمە ئەبو ئەیفەرموو: (اللَّهُمَّ لا تَقتُلنَا بِغَضَبِكَ، وَلا تُهلِكنَا بِعَذَابِكَ، وَعَافِنَا قَبلَ ذَلِكَ) وسنده ضعيف. واتە خوایە بە توڕەیی خۆت نەمان کوژیت، وە بە سزای خۆت لەناومان نەبەیت، وە پێش ئەوە سەلامەتمان بکە.

## زیکری بینینی مانگی یەك شەوە

١- (طبراني) لە عبداللە ی کوڕی عومەرەوە ئەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ کاتێ مانگی تازەی ئەبینی ئەی فەرموو: (اللهُ أَكبَرُ, اللَّهُمَّ أَهِلَّهُ عَلَينَا بِالأَمنِ والإِيمَانِ، وَالسَّلامَةِ وَالإِسلامِ, وَالتَّوفِيقِ لِمَا

تُحِبُ وَتَرضَى، رَبُّنَا وَرَبُّكَ اللهُ)[1]. واتە: الله اكبر، خوایە بە ئاسایشو باوەڕەوە، وە بەسەلامەتی و ئیسلامەوە مانگی تازەمان بەسەردابێنەوە، خوایە یارمەتیمان بدە بۆ بەجێ هێنانی ئەو شتانەی خۆت لات خۆشە و پێی ڕازیت، ئەی مانگ! پەروەردگاری ئێمە و تۆ هەر خوای گەورەیە.

٢- لای ئەبو داود بە مورسەلی هاتوە لە قەتادەوە کە پێغەمبەر ﷺ کاتێ مانگی نوێی ئەبینی سێ جار ئەی فەرمو: (هِلال خَيرٍ وَرُشدٍ، هِلال خَيرٍ وَرُشدٍ، آمَنتُ بِاللهِ الَّذِي خَلَقَكَ). واتە: مانگی نوێی خێر و ڕێنمونی، مانگی نوێی خێر و ڕێنمونی، باوەڕم بەوخوایە هەیە کە تۆی دروست کردووە. لەپاشاندا ئەیفەرمو: (الحَمدُ للهِ الَّذِي ذَهَبَ بِشَهرِ كَذَا، وَجَاءَ بِشَهرِ كَذَا). واتە: سوپاس بۆ ئەو خوایەی فلانە مانگی ڕەوانە کرد و فلانە مانگی هێنا.

## زیکری ناخۆشی و غەم و پەژارە

١- بوخاری و موسلیم لە ئیبنو عەبباسەوە ئەگێڕنەوە کە پێغەمبەر ﷺ کاتێ تەنگو چەڵەمەو ناخۆشی توش ئەبو ئەیفەرموو: (لا إِلَهَ إِلا اللهُ العَظِيمُ الحَلِيمُ، لا إِلَهَ إِلا اللهُ رَبُّ العَرشِ العَظِيم، لا إِلَه إِلا اللهُ رَبُّ السَّمَوَاتِ وَرَبُّ الأَرضِ وَرَبُّ العَرشِ الكَرِيم). واتە: هیچ خوایەك نی‌یە کە بە حەق شیاوی پەرستن بێت جگە لە الله، کە حەلیم و لێبوردەیەو گەورەو پایەبەرزە، پاك و بێگەردی بۆ الله کە پەروەردگاری منە، و پاك و بێگەردی بۆ الله کە پەروەردگاری حەوت ئاسمانەکان و پەروەردگاری عەرشی گەورەیە.

٢- لە ریوایەتی (ترمذي)دا هاتووە کە ئەنەس فەرمویەتی: پێغەمبەر ﷺ ئەگەر شتێکی لێ بقەومایە ئەی فەرموو: (يَا حَيُّ يَا قَيُّوم بِرَحمَتِكَ أَستَغِيثُ)[2]. واتە: ئەی ئەو زاتەی کە زیندویت و بەخۆتەوە بەندی، هاوار بۆ سۆز و میهرەبانیت ئەهێنم.

٣- هەر لە (ترمذي)دا هاتووە لە ئەبوهوڕەیرەوە کە پێغەمبەر ﷺ ئەگەر توشی پەژارەیەك بوایە سەری بەرز دەکردەوە بۆ ئاسمانو ئەی فەرمو: (سُبحَانَ اللهِ العَظِيم). وە ئەگەر زۆر دوعای بکردایە و تێ بکۆشیایە ئەیفەرموو: (يَا حَيُّ يَا قَيُّوم)[3].

٤- لە سونەنی ئەبوداودا هاتووە لە (أبي بكرة)وە کە پێغەمبەر فەرموویەتی: پاڕانەوەی لێقەوماو ئەمەیە: (اللَّهُمَّ رَحمَتَكَ أَرجُو فَلا تَكِلنِي إِلَى نَفسِي طَرفَةَ عَينٍ، وَأَصلِح لِي شَأنِي كُلَّهُ، لا إِلَهَ إِلا أَنتَ).

---

(١) حەدیسێکی صەحیحە بەهۆی شەواهیدەکانی‌یەوە، ئیبنوحیببان بە صەحیحی داناوە. وە (ترمذي)ش بە حەسەنی داناوە. (ألباني).

(٢) فەرمودەیەکی حەسەنە لای (ترمذي) (٤/٢٦٧) ڕەقاشی تیایە، ناوی زەیدە، لای ئیبنوسوننی بە ژمارە (٣٣٢) لاوازە، بەڵام لە (المستدرك)دا (١:٦:٥) شایەتی هەیە.

(٣) زۆر لاوازە. (ألباني).

واتە: خوایە ڕەجا و ئومێدم بە بەزەیی و میهرەبانی تۆیە، کەواتە ئەوەندەی چاوترکانێکیش بەخۆمم مەسپێرە، خوایە کاروبارم هەموو بۆ ساز بکە، هیچ پەرستراوێکی بە حەق نییە کە شایستەی پەرستن بێت تۆ نەبێت.

٥- دیسانەوە لە سونەنی ئەبوداوودا لە ئەسمائی کچی عومەیسەوە هاتووە فەرمویەتی: پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: ئایا چەند ووشەیەکت فێر نەکەم کە لە تەنگانەدا بیانڵێیت: فەرمووی: بڵێ: (اللهُ اللهُ رَبِّي لا أُشرِكُ بِهِ شَيئاً) وە لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە فەرمویەتی: حەوت جار بووترێت.

٦- لە (ترمذي)دا هاتوە لە سەعدی کوڕی ئەبی وەققاصەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: پاڕانەوەی یونس پێغەمبەر کاتێ لەناو سکی نەهەنگەکەدا ئەپاڕایەوە، ئەمە بوو: (لا إِلَهَ إلا أنتَ سُبحَانَكَ إِنِّي كُنتُ مِنَ الظَّالِمِين). هەرکەس بەم دوعایە پاڕابێتەوە ئیللا خوا گیرای کردوە.

لە ڕیواتێکی تردا هاتووە فەرمویەتی: (من پاڕانەوەیك ئەزانم هەر لێقەوماوێك بیلێت خوا ڕزگاری ئەکات، ئەویش پارانەوەکەی یونسی برامە سڵاوی خوای لەسەر بێت).

٧- لە لای ئەحمەد و ئیبنوحیببان هاتووە لە ئیبنومەسعودە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: هەرکەس توشی غەم و پەژارەیەك بوو، پاڕایەوەو ووتی: (اللَّهُمَّ إِنِّي عَبدُكَ ابنُ عَبدِكَ ابنُ أَمَتِكَ، نَاصِيَتِي بِيَدِكَ، مَاضٍ فِيَّ حُكمُكَ، عَدلٌ فِيَّ قَضَاؤُكَ، أسأَلُكَ بِكُلِّ اسمٍ هُوَ لَكَ، سَمَّيتَ بِهِ نَفسَكَ، أو أنزَلتَهُ فِي كِتَابِكَ، أو عَلَّمتَهُ أحَداً مِن خَلقِكَ، أو استَأثَرتَ بِهِ فِي عِلمِ الغَيبِ عِندَكَ، أن تَجعَلَ القُرآنَ رَبِيعَ قَلبِـي، وَنُورَ صَدرِي، وَجَلاءَ حُزنِي، وَذَهَابَ هَمِّي) خوا غەمو پەژارەکەی لا ئەبات و خۆشی لە جێی بۆ ئەهێنێ.

واتە: خوایە من بەندەی تۆو ڕۆڵەی بەندەو کەنیزی تۆم، نێوچاوانم بەدەستی تۆیە، حوکمی تۆ بەسەرما دابڕاوە، حوکم و فەرمانی تۆ بۆ من عەدڵو ڕاستن، داوات لێ ئەکەم بە هەموو ئەو ناوانەی خۆتت پێ ناو ناوە، یان لە کتێبەکەتدا ناردوتەتە خوارەوە، یان فێری کەسێك لە بەندەکانت کردوە، یان تایبەتت کردوە بەخۆتەوە لە عیلمی غەیبدا لەلات، کە قورئان بکەیتە بەهاری دڵم و ڕۆشنایی سینەم و ڕەوێنەرەوەی غەمم و دەرکەری پەژارەم.

## زیکری گەیشتن بە دوژمن و ترسان لە فەرمان ڕەوا

ئەبوداودو نەسائی لە ئەبی موساوە ئەگێڕنەوە فەرمویەتی: پێغەمبەر ﷺ کاتێ لە کۆمەڵێ بترسایە ئەیفەرمو: (اللَّهُمَّ إنَّا نَجعَلُكَ فِي نُحُورِهِم، وَنَعُوذُ بِكَ مِن شُرُورِهِم). واتە: خوایە تۆ ئەخەینە گەردنیانو پەنا ئەگرین بەتۆ لە شەڕەکانیان.

ئیبنوسوننی ئەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ لە جەنگێکدا بوو ئەی فەرموو: (يَا مَالِكِ يَومِ الدِّينِ إِيَّاكَ أَعبُدُ وأَيَّاكَ أَستَعِين). واتە: ئەی خاوەنی ڕۆژی دوایی هەر تۆ ئەپەرستم و داوای یامەرتیش هەر لە تۆ ئەکەم.

ئەنەس فەرمویەتی: ئەم بینی هەر پیاوبوو مەلائیکەکان لەبەردەمی یەوەو لە دوایەوە ئەیاندا بە زەویدا[1].

هەروەها لە ئیبنو عومەرەوە ئەگێڕنەوە فەرمویەتی: پێغەمبەر ﷺ ئەیفەرموو: کاتێ لەکار بەدەستێك ترست هەبوو یا لە هەرکەسێکی تر بلێ: (لا إِلَهَ إلا اللهُ الحَلِيمُ الكَرِيم، سُبحَانَ اللهِ رَبِّي، سُبحَانَ اللهِ رَبِّ السَّمَوَاتِ السَّبعِ وَرَبِّ العَرشِ العَظِيم، لا إله إلا أَنتَ عَزَّ جَارُكَ وَجَلَّ ثَنَاؤُكَ)[2]. واتە: هیچ خوایەك نی یە کە بە حەق شایستەی پەرستن بێت جگە لە الله، کە حەلیم و لێبوردەیەو گەورەو پایەبەرزە، پاك و بێگەردی بۆ الله کە پەروەردگاری منە، پاك و بێگەردی بۆ الله کە پەروەردگاری حەوت ئاسمانەکان و پەروەردگاری عەرشی گەورەیە، هیچ خوایەك بێجگە لە تۆ شیاوی پەرستن نی یە، پەناگەت بەهێزەو ستایشت بەرزە.

بوخاری لە ئیبنوعەبباسەوە ئەگێڕێتەوە فەرمویەتی: ئیبراهیم کاتێ فڕێ درایە ناو ئاگرەکەوە، وە محمد ﷺ کاتێ پێ یان ووت: خەلك خۆیان بۆ ئامادە کردوون: فەرموویانە: (حَسبُنَا اللهُ وَنِعمَ الوَكِيل). واتە: خوامان بەسەو خوایش باشترین وەکیل و یارمەتیدەرە.

لە عەوفی کوڕی مالیکەوە هاتووە ووتویەتی: دوو پیاو کێشەی قەرز کەوتە نێوانیان، هاتنە لای پێغەمبەر ﷺ، پاشان ئەوکەسەی حوکمەکەی بەسەردا درا کاتێ هەڵسا بۆ ڕۆیشتن ووتی: (حَسبُنَا اللهُ وَنِعمَ الوَكِيل) پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: خوا لۆمە لەسەر تەمەڵی ئەکات، بەڵام تۆ لەسەرتە کە کارو کاسبی بکەیت جا کاتێك کە شتێکی گرانت هاتە پێش ئەوسا بلێ: (حَسبِيَ اللهُ وَنِعمَ الوَكِيل)[3].

### کەسێك کارێکی لێ گران بێتەوە چی بلێت؟

ئیبنوسوننی لە ئەنەسەوە ئەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ ئەیفەرموو: (اللَّهُمَّ لا سَهلَ إلا مَا جَعَلتَهُ سَهلاً. وَأَنتَ تَجعَلُ الحَزنَ سَهلاً). واتە: خوایە هیچ کارێك ئاسان نیە ئەگەر تۆ ئاسانت نەکردبێت، وە خوایە تۆ زەوی ڕەقەڵان ئەکەیتە دەشت.

---

(١) لاوازە، لە (عبدالسلام) ی کوڕی هاشمەوە هاتووە و بەهێز نی یە حەنبەل ووتویەتی: ابن عبد الله نەناسراوە.

(٢) زۆر لاوازە لەبەر محمدی کوڕی سلیمان، (حافظ) لە (التقريب)دا ووتویەتی: لاوازە، وە ئیبنوعەدی ووتویەتی: لاوازە. (ألباني).

(٣) ئیسنادەکەی لاوازە زەهەبی ئەڵێت: نەناسراوە. (ألباني).

## کەسێك باری ژیانی گران بێت چی بڵێت

ئیبنوسوننی لە ئیبنو عومەرەوە ئەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: چی ڕێتان لێ ئەگرێت ئەگەر باری ژیانتان گران بوو کاتێ لەماڵ چوونە دەر بڵێن: (بِسمِ اللهِ عَلَى نَفسِي وَمَالِي وَدِينِي، اللّهُمَّ رَضِّنِي بِقَضَائِكَ، وَبَارِكْ لِي فِيمَا قُدِّرَ حَتَّى لا أُحِبَّ تَعجِيلَ مَا أخَّرتُ، وَلا تَأخِيرَ مَا عَجَّلتُ). واتە: ناوی خوا لەسەر گیان و ماڵ و ئاییینم بێت، خوایە ڕازیم بکە بەوەی بۆت دانـاوم, وە ئەوەی بۆم دانراوە لێم پیرۆز بکە تاوەکو حەز نەکەم لە هاتنی بە پەلەی ئەوەی تۆ بۆت دواخستوم، وە لە دووا نەکەوتنی ئەوەی بە پەلە بۆت داناوم.

## زیکری قەرزداری

١- (ترمذي) ئەگێڕێتەوە و پلەی (حسن)ی بۆ داناوە، لە عەلییەوە خوا لێی ڕازی بێت کە بەندەیەکی (مکاتب) هاتە لام ووتی: توانای دانی ئەوەم نیە کە بۆم نوسراوە یارمەتیم بدە. فەرمووی: بۆچی چەند وشەیەکت فێر نەکەم کە پێغەمبەر ﷺ فێری کردووم, ئەگەر ئەوەندەی کێوی صەبرت قەرز لەسەر بێت خوا بۆت ئەداتەوە، بڵێ: (اللّهُمَّ اكفِنِي بِحَلالِكَ عَن حَرَامِكَ، وَاغنِنِي بِفَضلِكَ عَمَّن سِوَاكَ). واتە خوایە بە حەڵاڵەکانت لە حەرام کراوەکانتم دوور بخەرەوەو بێ ئیحتیاجم بکە، وە بە فەزڵی خۆت بێ نیازم بکە لە کەسانی تر جگە لە تۆ.

٢- ئەبو سەعید فەرمویەتی: پێغەمبەر ﷺ ڕۆژێك هاتە مزگەوت پیاوێکی مەدینەیی بینی ناوی ئەبی ئومامە بوو فەرمووی: ئەی ئەبا ئومامە ئەوە چیتە لە مزگەوتدا دانیشتوی بێ ئەوەی کاتی نوێژ بێت؟ ووتی: پەژارەو قەرزداری دای گرتوم ئەی نێرراوی خوا، فەرمووی: ئەی بۆ چەند ووشەیەکت فێر نەکەم کاتێ بیانڵێیت خوا پەژارە و قەرزەکەت لەسەر لا ئەبات؟ ووتی: بۆچی نا، فێرم بکە ئەی نێرراوی خوا، فەرمووی: بەیانیانو ئێواران بڵێ: (اللّهُمَّ إنِّي أعُوذُ بِكَ مِنَ الهَمِّ وَالحَزَنِ، وَأعُوذُ بِكَ مِنَ العَجزِ وَالكَسَلِ، وَأعُوذُ بِكَ مِنَ الجُبنِ وَالبُخلِ، وَأعُوذُ بِكَ مِن غَلَبَةِ الدَّينِ وَقَهرِ الرِّجَالِ) پیاوەکە ئەڵێ: منیش ئەوانەم ووت، خوای گەورە پەژارەو قەرزەکەی لەسەر لابردم.

واتە: خوایە پەنا ئەگرم بەتۆ لە غەم و پەژارە، وە پەنا ئەگرم بەتۆ لە تەمەڵی و بێ توانایی، وە پەنا ئەگرم بەتۆ لە ترسنۆکی و بەخیلی، وە پەنا ئەگرم بەتۆ لە قەرزاری زۆرو زاڵ بونی پیاوان.

## کەسێك شتێکی ناخۆشی توش ببێت یان دابمێنێت چی بڵێت:

ئیبنوسوننی لە ئەبی هورەیرەوە ئەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (لِيَستَرجِع أحَدُكُم فِي كُلِّ شَيءٍ حتى فِي شِسعِ نَعلِهِ، فَإنَّهَا مِنَ المَصَائِبِ). واتە با هەرکەس لە ئێوە لە هەرشتێکدا کە پێی ناخۆش

بێت داوای گەڕانەوە بۆلای خوا بکات، تەنانەت لە قەیتانی نەعلەکەشیدا کاتێك پچڕا چونکە ئەوەش هەر موصیبەتە.

داوای گەڕانەوەش بۆلای خوا ئەوەیە بڵێت: (إنا لله وإنا إليه راجعون) واتە: ئێمە هەموو هەر هی خواین و هەربۆلای ئەویش ئەگەڕێینەوە.

موسلیم لە ئەبی هورەیرەوە ئەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (المُؤمِنُ القَوِيُّ خَيرٌ وَأحَبُّ إلى اللهِ مِنَ المُؤمِنِ الضَّعِيفِ، وَفِي كُلٍّ خَيرٍ، إحرِص عَلَى مَا يَنفَعُكَ، وَاستَعِن بِاللهِ وَلا تَعجَز، وَإذَا أصَابَكَ شَيءٌ، فَلا تَقُل: لَو أنِّي فَعَلتُ كَذَا. كَانَ كَذَا وَكَذَا، وَلَكِن قُل: قَدَّرَ اللهُ وَمَا شَاءَ فَعَلَ، فَإنَّ لَو تَفتَحُ عَمَلَ الشَّيطَانِ). واتە: باوەڕداری بەتوانا لای خوا چاکترو خۆشەویست ترە لە باوەڕداری لاواز, وە هەموو هەرچاکن, جا پەرۆشت هەبێت بۆ ئەوەی سودت پێ ئەبەخشێت و پشت بەخوا ببەستە و ناتەوان مەبە، وە ئەگەر توشی بەڵایەك بووی مەڵێ: ئەگەر ئەوەم بکردایە وائەبوو وا ئەبوو، بەڵکو بڵێ: خوا وای داناوە و هەرچی بیەوێت ئەیکات، چونکە (ئەگەر) کاری شەیتان واڵا دەکات.

## کەسێك توشی گومان بوو چی بڵێ

١- بوخاري و موسلیم لە ئەبیهورەیرەوە ئەگێڕنەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: شەیتان دێتە لای کەسێکتان ئەڵێت: کێ ئەوەی دروست کردووە؟ کێ ئەوەی دورست کردووە؟ هەتا ئەڵێت: کێ پەروەردگاری تۆی دروست کردووە؟ جا کە گەیشتە ئەوە با ئەو کەسە بڵێت: (أعوذ بالله من الشيطان الرجيم) واتە: پەنا ئەگرم بە خوا لە شەیتانی نەفرین لێ کراو. وە با واز لەو بیر کردنەوەیە بهێنێ.

٢- لە صەحیح دا هاتوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (لا يَزَالُ النَّاسُ يَتَسائَلُونَ حَتَّى يُقَالَ: خَلَقَ اللهُ الخَلقَ فَمَن خَلَقَ اللهَ؟ فَمَن وَجَدَ مِن ذَلِكَ شَيئاً فَلِيَقُل: آمَنتُ بِاللهِ وَرُسُلِهِ). واتە: خەڵك ئەوەندە ئەپرسن هەتا ئەڵێن: خوا ئەم خەڵکەی دروست کردووە ئەی کێ خوای دروست کردووە؟ جا هەرکەس شتێکی وەهای هات بە دڵدا با بڵێت: (آمنت بالله ورسله) واتە: باوەڕم بەخوا و نێرراوەکانی هەیە.

## کەسێك ڕقی هەڵسا و توڕە بوو چی بڵێت

بوخاري و موسلیم لە سلیمانی کوڕی صوردەوە ئەگێڕنەوە فەرمویەتی: لە خزمەت پێغەمبەردا دانیشتبوم دوپیاو قسەیان بەیەك ئەوت، یەکێکیان سور هەڵگەرابوو، دەمارەکانی لا ملی ئەستور بوو بوو، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ووشەیەك ئەزانم ئەگەر بیڵێت ئەو توڕەیییە لائەچێت، ئەویش ئەوەیە: (أعوذ بالله من الشيطان الرجيم).

## له دوعا پڕماناکانی پێغەمبەر ﷺ

١- عائیشە فەرمویەتی: پێغەمبەر ﷺ ئەو پاڕانەوەیەی پێ خۆش بوو کە پڕمانا بوایە، وە وازی لە شێوە پاڕانەوەکانی تر ئەهێنا. وا ئێمەش هەندێ لەو پاڕانەوانە باس ئەکەین کە کەس ناتوانێت لێیان بێ‌نیاز بێت.

لە ئەنەسەوە هاتووە ووتویەتی: بەشی زۆری پاڕانەوەکانی پێغەمبەر ﷺ (اللَّهُمَّ رَبَّنَا آتِنَا فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِي الآخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ النَّار) بووە. واتە خوایە ئەی پەروەردگارمان خێرو چاکەی دونیاو قیامەتمان بدەرێ و لە سزای دۆزەخ بمانپارێزە.

٢- موسلیم ئەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ چووە سەردانی موسڵمانێك بینی لاواز بووە وەکو جوجەڵەیەکی ماوە، فەرمووی: ئایا تۆ هەرگیز پاڕاویتەوە لە خواو شتت لێ داوا کردووە؟ پیاوەکە ووتی: بەڵێ پاڕاومەوەو ووتومە: خوایە ئەگەر ڕۆژی دوایی سزام ئەدەی لەسەر تاوانێك کە لەم دونیایەدا کردوومە، ئێستا سزام بدە لەسەری) پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: سبحان الله بەرگەی ناگریت، ئەی بۆ نەت ئەوت: (اللَّهُمَّ آتِنَا فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِي الآخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ النَّار).

٣- ئەحمەد و نەسائی ئەگێڕنەوە کە سەعد گوێی لە کوڕێکی خۆی ئەبێت ئەپاڕێتەوە ئەڵێت: خوایە من داوات لێ ئەکەم بەهەشتێکم پێ ببەخشیت ژوورەکانی وابێت و وابێت، وە پەنا ئەگرم بەتۆ لە ئاگرو کۆت‌و زنجیری) سەعد فەرمووی: داوای خێرێکی زۆرت کرد لە خواو پەنات پێ گرت لەشەڕێکی زۆر، من خۆم گوێم لە پێغەمبەر ﷺ بووە ئەیفەرموو: (کۆمەڵێك دێن زیادەڕەوی ئەکەن لە پاڕانەوەدا).

ئەوەندەت بەس بوو بڵێیت: (اللَّهُمَّ إِنِّي أَسأَلُكَ مِنَ الخَيرِ كُلِّهِ مَا عَلِمتُ مِنهُ وَمَا لَم أَعلَم. وَأَعُوذُ بِكَ مِنَ الشَّرِّ كُلِّهِ مَا عَلِمتُ مِنهُ وَمَا لَم أَعلَم). واتە: خوایە داوای هەموو خێرێکت لێ ئەکەم ئەوەی خۆم ئەیزانم و ئەوەی نایزانم وە پەنا ئەگرم بەتۆ لە هەموو شەڕێك ئەوەی خۆم ئەی زانم و ئەوەی نایزانم).

هەر ئەو دووانە لە ئیبنوعەبباسەوە ئەگێڕنەوە فەرمویەتی: پێغەمبەر ئەپاڕایەوە ئەی فەرموو: (رَبِّ أَعِنِّي وَلا تُعِن عَلَيَّ، وَانصُرنِي وَلاَ تَنصُر عَلَيَّ، وَامكُر لِي وَلا تَمكُر عَلَيَّ، وَاهدِنِي وَيَسِّرِ الهُدَى لِي، وَانصُرنِي عَلَى مَن بَغَى عَلَيَّ، رَبِّ اجعَلنِي لَكَ شَكَّاراً، لَكَ ذَكَّاراً، لَكَ رَهَّاباً، لَكَ مِطوَاعاً، لَكَ أَوَّاهاً، إِلَيكَ مُنِيباً، رَبِّ تَقَبَّل تَوبَتِي، وَاغسِل حَوبَتِي، وَأَجِب دَعوَتِي وَثَبِّت حُجَّتِي، وَسَدِّد لِسَانِي، وَاهدِ قَلبِي، وَاسلُل سَخِيمَةَ صَدرِي). واتە: خوایە یارمەتیم بدە و یارمەتی کەس دژی من مەدە، و سەرم بخەو کەس سەر مەخە بەسەرما، خوایە مەکرم بۆ بکە مەکرم بەسەردا مەکە، خوایە ڕێنماییم بۆ ئاسان بکە، خوایە سەرم بخە بەسەر ئەوانەدا کە ستەمم لێ ئەکەن، خوایە وام لێ بکە هەمیشە سوپاس گوزارت بم‌و زۆر یادت بکەم و زۆر لە تۆ بترسم و زۆر مل کەچت بم، خوایە وام لێ بکە شکایەتی حاڵم هەر لای تۆ بکەم، وە زۆر بۆلای تۆ

بگەڕێمەوە، پەروەردگار تۆبەکەم لێ وەربگرە و تاوانەکانم بسڕەوە و پاڕانەوەکانم لێ قبوڵ بکەو بەڵگەکانم بچەسپێنە و زمانم ڕاست وێژ و دڵم ڕێنمایی بکە، خوایە ڕق و کینەی سینەم لابەرە.

موسلیم لە زەیدی کوڕی ئەرقەمەوە ئەگێڕێتەوە فەرمویەتی: لەوەی کە پێغەمبەر ﷺ پێی ئەوتین زیاتر هیچی ترتان پێ ناڵێم. ئەی فەرموو: (اللَّهُمَّ إنِّي أعُوذُ بِكَ مِنَ العَجزِ وَالكَسَلِ، وَالجُبنِ وَالبُخلِ وَالهَرَمِ، وَعَذَابِ القَبرِ، اللَّهُمَّ آتِ نَفسِي تَقوَاهَا، وَزَكِّهَا أنتَ خَيرُ مَن زَكَّاهَا، إنَّكَ وَلِيُّهَا وَمَولاهَا، اللَّهُمَّ إنِّي أعُوذُ بِكَ مِن عِلمٍ لا يَنفَع، وَمِن قَلبٍ لا يَخشَع، وَمِن نَفسٍ لا تَشبَع، وَمِن دَعوَةٍ لايُستَجَابُ لَهَا). واتە: خوایە من پەنا ئەگرم بەتۆ لە بێتوانایی و تەمەڵی و ترسنۆکی و بەخیلی و پیری و سزای ناو گۆڕ. خوایە تەقوا بە نەفسم بدە و پاکی بکەرەوە، چونکە تۆ چاکترین پاك کەرەوەی دەرونەکانی، وە هەر تۆ سەرپەرشتیار و گەورەیانی، خوایە پەنا ئەگرم بە تۆ لە زانستێك کە بێسوودە، وە لە دڵێك کە ڕەقە و ناترسێ، وە لە دەرونێك کە چاو برسی بێ و تێر نەبێت، و لە پاڕانەوەیەك کە گیرا نەبێت.

لە صەحیحی حاکمدا هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (أتُحِبُّونَ أيُّهَا النَّاسُ أن تَجتَهِدُوا فِي الدُّعَاءِ؟ قَالُوا: نَعَم يَا رَسُولَ اللهِ! قَالَ: قُولُوا: اللَّهُمَّ أعِنَّا عَلَى ذِكرِكَ وَشُكرِكَ وَحُسنِ عِبَادَتِكَ). واتە: ئەی خەڵکینە ئایا ئێوە حەز ئەکەن کۆشش بکەن لە دوعا کردندا؟ ووتیان: بەڵێ ئەی نێراوی خوا، فەرمووی: بڵێن: (اللهم أعنا على ذكرك وشكرك وحسن عبادتك) واتە: خوایە یارمەتیمان بدە لەسەر یاد کردنت و سوپاس کردنت و بە چاکی پەرستنت.

لە لای ئەحمەد هاتووە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (ألِظُّوا بِيَا ذَا الجَلالِ والإكرَام). واتە: هەمیشە بەبەردەوامی بڵێن: (یا ذا الجلال والإکرام).

دیسان لای ئەحمەد هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ ئەی فەرموو: (يَا مُقَلِّبَ القُلُوبِ ثَبِّت قَلبِي عَلَى دِينِكَ) واتە: ئەی گۆڕەری دڵان دڵم لەسەر ئاینەکەت بچەسپێنە. وە ئەیفەرموو: تەرازووەکە بە دەست خوای ڕەحمانە، هەندێك سەرئەخات و هەندێکیش نزم ئەکاتەوە.

لە ئیبنوعومەرەوە خوا لێیان ڕازی بێت هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ ئەی فەرموو: (اللَّهُمَّ إنِّي أعُوذُ بِكَ مِن زَوَالِ نِعمَتِكَ، وَتَحَوُّلِ عَافِيَتِكَ، وَفَجأةِ نَقمَتِكَ وَجَمِيعِ سَخَطِكَ). واتە: خوایە پەنا ئەگرم بەتۆ لە نەمانی نیعمەتەکانت بۆم و گۆڕانی سەلامەتییەکانت بۆم، وە پەنا ئەگرم لە تۆڵەی کوتوپڕت و هەمو تورە بونەکانات.

(ترمذي) ئەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (اللَّهُمَّ انفَعنِي بِمَا عَلَّمتَنِي، وَعَلِّمنِي مَا يَنفَعُنِي، وَزِدنِي عِلماً، وَالحَمدُ للهِ عَلَى كُلِّ حَالٍ، وَأعُوذُ بِاللهِ مِن حَالِ أهلِ النَّارِ). واتە: خوایە سودم پێ بگەیەنە بەوەی کە فێرت کردوم، وە فێری ئەوەم بکە کە سودبەخشە بۆم و زانستیم زیاد بکە، وە سوپاس بۆ خوا لەسەر هەموو حاڵەتێك، وە پەنا ئەگرم بە خوا لە حاڵی دۆزەخییان.

موسلیم گێڕاویەتیەوە کە (فاطمە) هاتە لای پێغەمبەر ﷺ داوای خزمەتکار بکات پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: بڵێ: (اللَّهُمَّ رَبَّ السَّمَوَاتِ السَّبعِ وَرَبَّ العَرشِ العَظِيمِ، رَبَّنَا وَرَبَّ كُلِّ شَيءٍ، مُنَزِّلَ التَّورَاةِ وَالإنجِيلِ وَالقُرآنِ، فَالِقَ الحَبِّ وَالنَّوَى، أعُوذُ بِكَ مِن شَرِّ كُلِّ شَيءٍ أنتَ آخِذٌ بِنَاصِيَتِهِ، أنتَ الأوَّلُ فَلَيسَ قَبلَكَ شَيءٌ، وَأنتَ الآخِرُ فَلَيسَ بَعدَكَ شَيءٌ، وأنتَ الظَّاهِرُ فَلَيسَ فَوقَكَ شَيءٌ، وَأنتَ البَاطِنُ فَلَيسَ دُونَكَ شَيءٌ، إقضِ عَنِّي الدَّينَ، وَأغنِنِي مِنَ الفَقرِ).

هەروەها ئەگێڕنەوە وکە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (اللَّهُمَّ إنِّي اسألُكَ الهُدَى وَالتُّقَى وَالعَفَافَ وَالغِنَى). واتە: خوایە من داوای ڕێنمایی و پارێزگاری و داوێن پاکی و دەوڵەمەندیت لێ ئەکەم.

(ترمذي) ئەگێڕێتەوە و بە (حسن)ی داناوە، هەروەها حاکم، لە ئیبنو عومەرەوە فەرمویەتی: کەم جار بوە پێغەمبەر ﷺ کۆڕی بەجێ هێشتبێت و ئەم دۆعایەی بۆ یارەکانی نەکردبێت: (اللَّهُمَّ اقسِم لَنَا مِن خَشيَتِكَ مَا تَحُولُ بِهِ بَينَنَا وَبَينَ مَعصِيَتِكَ، وَمِن طَاعَتِكَ مَا تُبَلِّغُنَا بِهِ جَنَّتَكَ، وَمِنَ اليَقِينِ مَا تُهَوِّنُ بِهِ عَلَينَا مَصَائِبَ الدُّنيَا، وَمَتِّعنَا بِأسمَاعِنَا وَأبصَارِنَا وَقُوَّتِنَا مَا أحيَيتَنَا، وَاجعَلهُ الوَارِثَ مِنَّا، وَاجعَل ثَأرَنَا عَلَى مَن ظَلَمَنَا، وَانصُرنَا عَلَى مَن عَادَانَا، وَلَا تَجعَل مُصِيبَتَنَا فِي دِينِنَا، وَلَا تَجعَلِ الدُّنيَا أكبَرَ هَمِّنَا، وَلَا مَبلَغَ عِلمِنَا، وَلَا تُسَلِّط عَلَينَا مَن لَا يَرحَمُنَا). واتە: خوایە ئەوەندە ترسی خۆت بخەرە دڵمان کە ببێتە ڕێگر لە سەرپێچی فەرمانەکانت، وە ئەوەندە ملکەچی و گوێڕایەڵی خۆت بخەرە دڵمانەوە کە بمان گەیەنێت بە بەهەشت، وە ئەوەندەش دڵنیاو بێگومانمان بکە کە کۆسپ و تەگەرەی دونیامان لەبەر چاو ئاسان بکات، خوایە سودمەندمان بکە بە گوێ و چاومان و هێزو توانامان هەتا ماوین، وە ئەوانە بکە بە میراتگر لە ئێمە، خوایە تۆڵەمان لەوانە بسێنیت کە ستەمیان لێ کردووین، وە سەرمان بخە بەسەر ئەوانەدا کە دژمان ئەوەستن، خوایە با موصیبەتمان لە ئاییینەکەماندا نەبێت، وە دونیاش مەکە بە خواست و ئامانجی گەورەمان کە هەرچاومان لە دونیا بێتو زانینمان هەر لەبارەی دنیاوە بێتو هیچی تر، خوایە کەسیکێش زاڵ مەکە بەسەرمانا کە بەزەیی پێماندا نەیەتەوە.

## سڵاوکردن و سڵاوات دان لەسەر پێغەمبەر ﷺ

خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ وَمَلَٰٓئِكَتَهُۥ يُصَلُّونَ عَلَى ٱلنَّبِيِّۚ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ صَلُّواْ عَلَيۡهِ وَسَلِّمُواْ تَسۡلِيمًا﴾ (الأحزاب/٥٦). واتە: بەڕاستی خوا و مەلائیکەکانی درود ئەنێرنە سەر پێغەمبەر ﷺ، ئەی ئەوانەی کە بڕواتان هێناوە! ئێوەش درودی بۆ بنێرن و سەڵات و سەلامی لەسەر بدەن, وە تەسلیمی فەرمانی ئەو بن.

**ماناى سلاوات دان لەسەر پێغەمبەر ﷺ:**

بوخاری ووتویەتی: (أبو العالیة) فەرمویەتی: سلاَواتی خوا لەسەر پێغەمبەر ﷺ ستایشی‌یەتی لەلای فریشتەکان، وە سلاَواتی فریشتەکان لەسەری پاڕانەوەیە بۆی.

ئەبوعیسای (ترمذي) ووتویەتی: وە لە سوفیانی (ثوري)و چەند زانایەکی ترەوە ئەگێڕێتەوە کە: سلاَواتی پەروەردگار میهرەبانی‌یە، وە صلاَواتی فریشتەکان داوای لی‌خۆش بوونە بۆ پێغەمبەر ﷺ.

ئیبنوکەثیر ئەڵێت: مەبەست لەم ئایەتە ئەوەیە کە خوای گەورە بە بەندەکانی ڕائەگەیەنێت کە پلەو پایەی پێغەمبەر ﷺ و بەندەکەی چەندەیە لای خۆی لە عالەمی ژوورو، بەوەی کە خۆی ستایشی ئەکات لای فریشتە نزیکەکانی و فریشتەکانیش سلاَواتی لەسەر ئەدەن، لەپاشاندا خوای گەورە فەرمان ئەدات بە بەندەکانی لە عالەمی خوارەوە کە سلاَوات بدەن لەسەری و سلاَوی لیَ بکەن تاوەکو بوونەوەری هەموو عالەمەکان سوپاس و ستایشی بکەن، لەسەرەوەو لە خوارەوە.

وە لەم بارەیەوە فەرموودەی زۆر هاتووە وا هەندێکیان ئەهێنینەوە:

١- موسلیم لە عبد الله ی کوڕی عەمری کوڕی عاصەوە ئەگێڕێتەوە خوا لێیان ڕازی بێت ووتویەتی: خۆم گوێم لە پێغەمبەر ﷺ بووە فەرمویەتی: (مَن صَلَّى عَلَيَّ صَلاةً صَلَّى اللهُ عَلَيهِ بِهَا عَشراً). واتە: هەرکەس یەك جار سلاَواتم لەسەر بدات خوا بە هۆی ئەوە دە جار لەسەر ئەوکەسە سلاَوات ئەدات.

٢- (ترمذي) لە ئیبنو مەسعودەوە ئەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (أولَى النَّاسِ بِي يَومَ القِيَامَةِ أكثرُهُم عَلَيَّ صَلاةً) قال الترمذي (حديث حسن). واتە: لە پێش ترین کەس لای من لە ڕۆژی دوایی‌دا ئەوانەن کە زۆرتر سلاَواتیان داوە لەسەرم.

٣- ئەبوداود بە ئیسنادێکی صەحیح لە ئەبو هورەیرەوە ئەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (لا تَجعَلُوا قَبرِي عِيداً، وَصَلُّوا عَلَيَّ فَإنَّ صَلاتَكُم تَبلُغنِي حَيثُ كُنتُم). واتە: گۆڕەکەم مەکەنە عیبادەتگە و لەسەری کۆببنەوە, وە سلاَواتم لیَ بدەن چونکە سلاَواتەکانتانم پیَ ئەگات لە هەرکوێ بن.

٤- ئەبوداود ونەسائی لە ئەوسەوە خوا لیَی ڕازی بێت ئەگێڕنەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (إنَّ أفضَلَ أيَّامِكُم يَومَ الجُمُعَةِ، فَأكثِرُوا عَلَيَّ مِنَ الصَّلاةِ فِيهِ، فَإنَّ صَلاتَكُم مَعرُوضَةٌ عَلَيَّ). واتە: چاکترین ڕۆژتان ڕۆژی هەینی‌یە، ئێوەش لە ڕۆژی هەینی‌دا زۆر سلاَوات بدەن لەسەرم، چونکە سلاَواتەکانتانم نیشان ئەدرێت. ووتیان: چۆن سلاَواتەکانت نیشان ئەدرێت ئەی نێرراوی خوا، کە تۆ پواویو ڕزیوی؟ فەرموی: (إنَّ اللهَ حَرَّمَ عَلَى الأرضِ أن تَأكُلَ أجسَادَ الأنبِيَاءِ). واتە: خوا حەرامی کردووە لەسەر زەوی کە لاشەی پێغەمبەران بڕزێنێ.

٥- له سونەنی ئەبوداوودا هاتووە لە ئەبو هورەیرەوە بە ئیسنادێکی صەحیح کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (مَا مِن أحَدٍ يُسَلِّمُ عَلَيَّ إلا رَدَّ اللهُ عَلَيَّ رُوحِي حَتَّى أرُدَّ عَلَيهِ السَّلَامَ). واتە: هیچ کەس نییە سڵاواتم لەسەر بدات ئیللا خوا گیانم ئەکاتەوە بە بەرما، هەتا وەڵامی ئەدەمەوە.

٦- ئیمام ئەحمەد لە ئەبی طەلحەی ئەنصارییەوە ئەگێڕێتەوە کە فەرمویەتی: ڕۆژێك پێغەمبەر ﷺ زۆر دڵشاد بوو بەشێوەیەك لە ڕوخساریدا دیار بوو- ووتیان: ئەی نێرراوی خوا ئەمڕۆ خۆشحاڵی لە ڕوتا مژدەی خۆشی دەرئەکەوێت فەرمووی: بەڵێ لەلایەن خواوە پێم ڕاگەیەنرا هەرکەس لە ئەتەوەکەت یەك سڵاواتت لەسەر بدات خوا دە چاکەی بۆ ئەنوسێت و دە خراپەی ئەسڕێتەوە و پلەو پایەی دە ئەوەندە بەرز ئەکاتەوە، وە ئەو چی ووتوە ئاوا وەڵامیشی ئەداتەوە. ئیبنو کەثیر ووتویەتی: ئەمە ئیسنادەکەی (جید)ە.

٧- لە ئەبوهورەیرەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: هەرکەس حەز ئەکات بە تەرازوی زۆرتر و باشتر خێری بۆ پێوانە بکرێت -هەرکە سڵاواتی دا لەسەر ئێمە- با بڵێت: (اللّهُمَّ صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ النَّبِيِّ وَأزوَاجِهِ أُمَّهَاتِ المُؤمِنِينَ وَذُرِّيَّتِهِ وَأهلِ بَيتِهِ كَمَا صَلَّيتَ عَلَى آلِ إبرَاهِيمَ إنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيد) رواه أبوداود والنسائي. واتە: خوایە میهرەبانی برژێنە بەسەر محمدی پێغەمبەر ﷺ و خێزانەکانی کە دایکانی موسڵمانانو هەروەها نەوەکانی و کەسوکاری وەك چۆن ڕژاندوتە بەسەر ئالی ئیبراهیمدا خوایە بەڕاستی تۆ سوپاس کراوی هەمیشە زیندوی.

٨- لە ئوبەی کوڕی کەعبەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتووە فەرمویەتی: پێغەمبەر ﷺ کاتێ دووسێ یەکی شەو ئەڕۆیشت هەڵئەسا ئەی فەرموو: (يَا أيُّهَا النَّاسُ أُذكُرُوا اللهَ. أذكُرُوا اللهَ. جَاءَتِ الرَّاجِفَةُ تَتبَعُهَا الرَّادِفَةُ. جَاءَ المَوتُ بِمَا فِيهِ، جَاءَ المَوتُ بِمَا فِيهِ). واتە: ئەی خەڵکینە یادیخوا بکەن یادی خوا بکەن. وا ئەو بومەلەرزەی کە هەموو شت ئەخاتە لەرزە هات، وە دووا بەدووای ئەوەش ڕووداوی دووەم ڕوو ئەدات کە قیامەتە، وە مردن هات بەوەوە کە لەگەڵیایەتی، مردن و ئەوەی کە لەگەڵیەتی هات, ئوبەی ئەڵێت: ووتم: ئەی نێراوی خوا من زۆر سڵاوات لەسەر تۆ ئەدەم، چەندەی دانیشتنەکانم بە سڵاوات دان لەسەر تۆ بەرمەسەر؟ فەرمووی: ئارەزوی خۆتە. ووتم: چواریەکی؟ فەرمووی: ئارەزوی خۆتە. هەتا زۆر بێت خێری زیاترە ئەڵێ ووتم: نیوەی؟ فەرمووی: ئارەزووی خۆتە ئەگەر زیادی کەی ئەوە بۆ تۆ باشترە, ووتم دووسێ یەکی؟ فەرموی: ئارەزووی خۆتە تا زۆرتر بێت بۆتۆ باشترە و خێرترە، ئەڵێ: منیش ووتم: هەموو دانیشتنم دائەنێم بۆ سڵاوات دان لەسەر تۆ. فەرمووی: (إذَن تُكفَى هَمَّكَ وَيُغفَرُ لَكَ ذَنبُكَ) رواه الترمذي. واتە: ئیتر بێ پەژارە ئەبێت و خوا لە تاوانەکانت ئەبورێت.

**ئایا هەر کاتێ باسی پێغەمبەر بکرێت پێویستە سڵاوات لەسەری لێ بدرێ؟**

کۆمەڵێك لە زانایان بە واجبیان داناوە کە هەرکاتێك ناوی پێغەمبەر ﷺ هێنرا سڵاوات لەسەری بدرێت. لەوانە: (طحاوي) و حولەیمی، و بەڵگەشیان ئەوەیە کە (ترمذي) گێڕاویەتییەوە بە (حسن)ی

داناوه له ئەبی هورەیرەوه كه: پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (رَغِمَ أنفُ رَجُلٍ ذُكِرتُ عِندَهُ فَلَم يُصَلِّ عَلَيَّ، وَرَغِمَ أنفُ رَجُلٍ دَخَلَ عَلَيهِ شَهرُ رَمَضَانَ ثُمَّ انسَلَخَ قَبلَ أن يُغفَرَ لَهُ، وَرَغِمَ أنفُ رَجُلٍ أدرَكَ عِندَهُ أبواهُ الكِبَرَ فَلَم يُدخِلاهُ الجَنَّةَ). واته: ئەو پیاوەی ناوی من ئەهێنرێت لای و سڵاوات نادات لەسەرم لوتی له زەوی بدرێ, وه ئەو پیاوەی رەمەزان دێت‌و دەڕوات كارێك ناكات له گوناهەكانی ببوررێت لوتی له زەوی بدرێت, وه ئەو پیاوەی دایك و باوكی لای ئەو پیر ئەبن و ئەوەنده خزمەتیان ناكات بیخەنه بەهەشتەوه لوتی له زەوی بدرێت.

وه به پێی حەدیسەكەی ئەبوذەر كه پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (إنَّ أبخَلَ النَّاسِ مَن ذُكِرتُ عِندَهُ فَلَم يُصَلِّ عَلَيَّ). واته: بەخیل ترین كەس ئەوكەسەیە كه ناوی منی لەلا ئەهێنرێت و سڵاواتم لەسەر نادات.

كۆمەڵێكی تر بۆ ئەوه چوون كه له كۆرێكدا یەك جار واجبه سڵاوات بدرێت لەسەر پێغەمبەر ﷺ كاتێ ناوی هێنرا، ئیتر لەو جاره به دوواوه واجب نیه؛ بەڵكو پەسەنده. بەپێی حەدیسەكەی ئەبی هورەیره كه پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (مَا جَلَسَ قَومٌ مَجلِساً لَم يَذكُرُوا اللهَ فِيهِ وَلَم يُصَلُّوا عَلى نَبِيِّهِم، إلا كَانَ عَلَيهِم تِرَةً يَومَ القِيَامَةِ، فَإن شَاءَ عَذَّبَهُم، وَإن شَاءَ غَفَرَ لَهُم) رواه الترمذي وقال: حسن. واته: هیچ كۆمەڵێك له كۆرێكدا دانەنیشتون كه یادی خوایان تێدا نەكردبێ‌و سڵاواتیان نەدابێ لەسەر پێغەمبەرەكەیان ئیللا له رۆژی دواییدا به حەسرەت و كەم‌و كوری بۆیان ئەنوسرێت, جا خوا ئارەزوی خۆیەتی یا سزایان ئەدات یا لێیان ئەبورێت.

**پەسەندی نوسینی سەڵات و سەلام هەركاتێك ناوەكەی نوسرا:**

زانایان سڵاوات دانیان لەسەر پێغەمبەر ﷺ بەپەسەند داناوه هەرچەند ناوەكەی نوسرا، بەڵام فەرموودەی ڕاستی لەسەر نەهاتووه كه بۆ بەڵگەهێنانەوه دەست بدات.

وه خەتیبی بەغدادی ئەڵێت: نوسراوی ئیمام ئەحمەدم بینیوه رەحمەتی خوای لەسەر بێت كه زۆر ناوی پێغەمبەری ﷺ نوسیوه بەبێ ئەوەی سەڵات و سەلامەكە بنوسێت، ئەڵێت: بەڵام پێم گەیشتووه كه ئەو بەدەم سڵاواتی لەسەر ئەدا.

**كۆ كردنەوەی سڵاوات و سەلام و بەسەریەكەوه :**

ئەوەوی رەحمەتی خوای لەسەر بێت ووتویەتی: ئەگەر كەسێك سڵاواتی دا لەسەر پێغەمبەر ﷺ، با صەڵات و سەلام بەیەكەوه كۆ بكاتەوه و به تەنها یەكێكیان نەڵێت، با نەڵێت: (صلى الله عليه) و بەس یا نەڵێت: (عليه السلام) وبەس، بەڵكو بڵێت: (صلى الله عليه وسلم).

**سڵاوات دان لەسەر پێغەمبەران:**

پەسەندە سڵاوات دان لەسەر پێغەمبەران و فریشتەکان بە سەربەخۆ. بەڵام جگە لە پێغەمبەران دروستە سڵاواتیان لەسەر بدرێت بەدووای ئەواندا بەپێی ئیجماعی ڕای زانایان. وە لە پێشەوە باسی ئەوەکرا کە پێغەمبەر ﷺ ئەیفەرموو: (اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ النَّبِيِّ وأزوَاجِهِ أُمَّهَاتِ المُؤمِنِينَ...هتد) بەڵام کەراهەتی هەیە سەربەخۆ سڵاواتیان لەسەر بدرێت بۆ نمونە ناوترێت: عمر (صلى الله عليه وسلم).

**زاراوەی سڵاوات دان لەسەر پێغەمبەر ﷺ**

موسلیم لە ئەبی مەسعودی ئەنصاریەوە ئەگێڕێتەوە کە بەشیری کوڕی سەعد ووتی: ئەی نێرراوی خوا! خوا فەرمانمان پێ ئەدات کە سڵاوات لەسەر تۆ بدەین. چۆن سڵاواتت لەسەر بدەین؟ ئەڵێ: پێغەمبەر ﷺ بێ دەنگ بوو هەتا بە ئاواتمان ئەخواست ئەو قسەیەی نەکردایە، پاشان پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بڵێن: (اللَّهُمَّ صَلِّ على مُحَمَّدٍ وعلى آلِ مُحَمَّد، كَمَا صَلَّيتَ على آل إبرَاهِيمَ، وَبَارِك على مُحَمَّدٍ وعلى آلِ مُحَمَّد، كَمَا بَارَكتَ على آلِ إبرَاهِيمَ فِي العَالَمِينَ إنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيد) وە سڵاویش هەروەك ئەزانن وایە.

ئیبنوماجە لە عبداللە ی کوڕی مەسعودەوە خوا لێی ڕازی بێت، ئەگێڕێتەوە فەرمویەتی: ئەگەر سڵاواتتان دا لەسەر پێغەمبەر ﷺ بە جوانترین شێوە بیدەن ئێوە ئاگاتان لێ نیە لەوانەیە نیشانی بدرێت. پێیان ووت: فێرمان بکە چۆن بێت. ووتی: بڵێن: (اللَّهُمَّ اجعَل صَلَوَاتِكَ وَرَحمَتَكَ وَبَرَكَاتِكَ على سَيِّدِ المُرسَلِينَ، وَإمَامِ المُتَقَدِّمِينَ وَخَاتَمِ النَّبِيِّينَ مُحَمَّدٍ عَبدك ورسولكَ إمَامُ الخَيرِ وَقَائدَ الخَيرِ، وَرَسُول الرَّحمَةِ. اللَّهُمَّ ابعَثهُ مَقاماً يَغبِطُهُ بِهِ الأوَّلُونَ. اللَّهُمَّ صَلِّ على مُحَمَّدٍ وَعلى آلِ مُحَمَّدٍ كَمَا صَلَّيتَ على إبراهِيمَ وَآلِ إبرَاهِيمَ إنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيد، اللَّهُمَّ بَارِك على مُحَمَّدٍ وَعَلى آلِ مُحَمَّدٍ كَمَا بَارَكتَ على إبرَاهِيمَ وَآلِ إبرَاهِيمَ، إنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيد). واتە: خوایە سۆز و بەزەییت و میهرەبانیت و پیرۆزیت بڕژێنە بەسەر سەرداری پێغەمبەران و پێشەوای پێش کەوتەکان و کۆتایی پێغەمبەران (محمد) بەندەو نێرراوت کە پێشەواو سەرکردەی خێرە، وە نێرراوی ڕەحمەتە. خوایە زیندوی بکەرەوە لە پلەو پایەکەیدا کە پێغەمبەرانی تر ئاواتی بۆ بخوازن. خوایە میهرەبانیت بڕژێنە بەسەر محمد و ئالی محمد دا وەك چۆن میهرەبانیت ڕژاندووە بەسەر ئیبراهیم و ئالی ئیبراهیم دا، چونکە تۆ خوایەکی سوپاس کراوو هەمیشە زیندوی، خوایە پیرۆزی بکە لە محمد و ئالی محمد وەك چۆن پیرۆزت کردووە لە ئیبراهیم و ئالی ئیبراهیم، چونکە بەڕاستی تۆ خوایەکی سوپاس کراوو هەمیشە زیندوی.

**ئەوەی کە دەربارەی سەفەر هاتوە**

لە ئەبو هورەیرەوە هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (سَافِرُوا تَصَحُّوا وَاغزُوا تَستَغنُوا) رواه أحمد، وصححه المناوي. واتە: گەشت بکەن تەندروست ئەبن، وە غەزا بکەن دەوڵەمەند ئەبن.

**دەرچون بۆ شتێك كە خوا پێی خۆش بێت:**

لە ئەبی هورەیرەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتووە كە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (مَا مِن خَارِجٍ يَخرُجُ مِن بَيتِهِ إلا بِبَابِهِ رَايَتَانِ: رَايَةٌ بِيَدِ مَلَك، وَرَايَةٌ بِيَدِ شَيطَانٍ، فَإن خَرَجَ لِمَا يُحِبُّ اللهُ -عز وجل- اتَّبَعَهُ المَلَكُ بِرَايَتِهِ، فَلَم يَزَل تَحتَ رَايَةِ المَلَكِ، حَتَّى يَرجِعَ إلى بَيتِهِ، وَإن خَرَجَ لِمَا يُسخِطُ اللهَ اتَّبَعَهُ الشَّيطَانُ بِرَايَتِهِ، فَلَم يَزَل تَحتَ رَايَةِ الشَّيطَانِ، حَتَّى يَرجِعَ إلى بَيتِهِ) رواه أحمد والطبراني، وسنده جيد. واتە: هیچ كەسێك نیە لە ماڵ دەرچێت ئیللا لە بەردەم دەرگای ماڵەكەیدا دوو ئاڵا هەیە: یەكێكیان بە دەستی فریشتەیەكەوەیە، ئەوی تریان بە دەستی شەیتانەوە, جا ئەگەر بۆ شتێك دەرچوو كە خوای گەورە پێی خۆش بوو ئەوە فریشتەكە بە ئاڵاكەیەوە شوێنیدەكەوێت، ئیتر لەژێر ئاڵای ئەو فریشتەیەدا ئەبێت هەتا ئەگەڕێتەوە ماڵەوە، بەڵام ئەگەر بۆ شتێك هاتبووە دەر كە خوا لای ناخۆش بێت، ئەوە شەیتانەكە بە ئاڵاكەیەوە شوێنی ئەكەوێت، ئیتر هەر لە ژێر ئاڵای شەیتاندا ئەبێت هەتا ئەگەڕێتەوە ماڵەوە.

## ڕاوێژكردن و داوای خێر كردن (إستخارة) لە خوا پێش هاتنەدەر لە ماڵ

پێویستە لەسەر ئەوكەسەی بەتەمای سەفەرێك ئەبێت كە ڕاوێژی كەسانی ژیرو پیاو چاكان بكات پێش ئەوەی دەرچێت بۆ سەفەرەكەی، بە پێی فەرموودەی خوای گەورە: ﴿وَشَاوِرْهُمْ فِى ٱلْأَمْرِ﴾ (آل عمران/١٥٩). واتە: لەكاروبارەكاندا ڕاوێژیان پێ بكە.

هەروەها -لەبارەی وەصفی موسڵمانانەوە- فەرمویەتی: ﴿وَأَمْرُهُمْ شُورَىٰ بَيْنَهُمْ﴾ (الشورى/٣٨) واتە: كارو بارەكانیان لەنێوان یەكتردا بە پرس و ڕای یەكترە.

قەتادە ووتویەتی: كۆمەڵ نیە ڕاوێژ لە ناویاندا هەبێت وەمەبەستیان بەو ڕاوێژە ڕەزامەندی خوای گەورە بێت، ئیللا بەرەو باشترین كار هیدایەت ئەدرێن.

هەروەها ئەبێ ئەوكەسە داوای خێر بكات لە خوا. لای ئیمامی ئەحمەد هاتووە، لە سەعدی كوڕی ئەبی وەققاصەوە خوا لێی ڕازی بێت كە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (مِن سَعَادَةِ ابنِ آدَمَ استِخَارَةُ اللهِ، وَمِن سَعَادَةِ ابنِ آدَمَ رِضَاهُ بِمَا قَضَى اللهُ، وَمِن شَقوَةِ ابنِ آدَمَ تَركُهُ إستِخَارَةَ اللهِ، وَمِن شَقوَةِ ابنِ آدَمَ سَخَطُهُ بِمَا قَضَى اللهُ). واتە: لە بەختەوری ئادەمیزادە داوای خێركردن لە خوا، وە لە بەختەوەری ئادەمیزادە ڕازی بونی بە قەزای خوا، وە لە نەگبەتی ئادەمیزادە وازهێنان لە داوای خێركردن لە خوا، وە لە نەگبەتی ئادەمیزادە ڕازی نەبونی بە قەزای خوا.

ئیبنو تەیمیەیە ووتویەتی: كەسێك پەشیمان نەبۆتەوە كە داوای خێری لە خوا كردبێت و ڕاوێژی بە بەندەكانی خوا كردوە.

**شێوازی (إستخارة) :**

ئەبێ ئەوکەسە لە پێشدا دوو ڕکات نوێژ بکات بەڵام نوێژی فەرز نەبێت. با ئەو دوو ڕکاتە لە سوننەتە ڕاتیبەکانیش بێت، یا نوێژی سڵاوی مزگەوت (تحیة المسجد) بێت، لە هەرکاتێکدا شەو بێت یان ڕۆژ بێت. جا دوای خوێندنی سورەتی فاتیحە بە ئارەزووی خۆی چی ئەخوێنێ لە قورئان بیخوێنێ، پاشان سوپاس و ستایشی خوا بکات و سڵاوات بدات لەسەر پێغەمبەر ﷺ، پاشان بەو پاڕانەوەیەی کە بوخاری ئەیگێڕێتەوە بپاڕێتەوە. لە حەدیسی جابیر خوا لێی ڕازی بێت کە ووتویەتی: پێغەمبەر ﷺ فێری (إستخارە)ی ئەکردین لە هەموو کارەکانماندا وەك چۆن سورەتێك لە قورئانی فێر ئەکردین و ئەی فەرموو: ئەگەر کەسێکتان ویستی کارێك بەجێ بهێنێت با دوو ڕکات نوێژ بکات بەڵام نوێژی فەرز نەبێت، پاشان بڵێت: (اللَّهُمَّ إِنِّي أَستَخِيرُكَ بِعِلمِكَ، وَأَستَقدِرُكَ بِقُدرَتِكَ، وَأَسأَلُكَ مِن فَضلِكَ العَظِيمِ، فَإِنَّكَ تَقدِرُ وَلا أَقدِرُ، وَتَعلَمُ وَلا أَعلَمُ، وَأَنتَ عَلامُ الغُيُوبِ. اللَّهُمَّ إِن كُنتَ تَعلَمُ أَنَّ هَذَا الأَمرَ خَيرٌ لِي فِي دِينِي وَمَعَاشِي وَعَاقِبَةِ أَمرِي -أو قَالَ: عَاجِلِ أَمرِي وَآجِلِهِ- فَاقدُرهُ لِي، وَيَسِّرهُ لِي، ثُمَّ بَارِك لِي فِيهِ؛ وَإِنْ كُنتَ تَعلَمُ أَنَّ هَذَا الأَمرَ شَرٌّ لِي فِي دِينِي وَمَعَاشِي وَعَاقِبَةِ أَمرِي، -أو قَالَ: عَاجِلِ أَمرِي وَآجِلِهِ- فَاصرِفهُ عَنِّي وَاصرِفنِي عَنهُ، وَاقدِر لِيَ الخَيرَ حَيثُ كَانَ، ثُمَّ أَرضِنِي بِهِ). واتە: خوایە بەهۆی زانستی خۆت داوای خێرت لێ ئەکەم وە بەهۆی هێزو تواناییتەوە خۆت داوای هێز و توانات لێ ئەکەم، وە لە فەزڵ و گەورەیی خۆت داوات لێ ئەکەم، چونکە تۆ بە توانایت و من بێ توانا، وە تۆ ئەزانیت و من نازانم، وە تۆ زانیاریت زۆرە بە نادیارەکان، خوایە ئەگەر ئەزانیت ئەم کارەم[1] خێری تێدایە بۆ ئایین و ژیان و پاشەڕۆژم -یان بۆ ئێستام و لەمەودوام- ئەوە بۆم ڕێك بخەیت و بۆم ئاسان بکەیت. و پاشان لێم پیرۆز بکەیت. وە ئەگەر ئەزانیت کە ئەم کارەم شەڕی تێدایە بۆ ئایین و ژیانم و پاشەڕۆژم -یان ئێستام و لەمەودوام- ئەوە لام بدە لەسەری و ئەوکارەش لەسەر من لابدە، وە خێرێکی ترم بۆ ڕێك بخە لە هەر شوێنێك بێت پاشان ڕازیم بکە بەو خێرە).
جابیر ئەفەرموێ: جا پێویستیەکەی ناوئەبات کە ووتی: (اللهم إن كان هذا الأمر).

وە دوای سورەتی فاتیحە خوێندنی سورەتێکی تایبەتی بە صەحیحی نەهاتووە بۆ ئەو پاڕانەوەیە، وەك چۆن شتێکی صەحیح نەهاتوە بۆ پەسەندی دوبارە کردنەوەی[2].

---

(١) لێرەدا ناوی پێویستیەکەی ئەبات.

(٢) شەوکانی ووتویەتی: لە حەدیسەکەدا کە ئەفەرموێت (في الأمور كلها) بەڵگەیە لەسەر گشتێتی، وە ئادەمیزاد نابێت هیچ کارێك بەکەم بزانێت بچوك بێت یان گەورە، بەتایبەتی ئەگەر شتەکە بچووك بوو گوێ نەداتێ و واز لە داوای خێر کردن بهێنێت بۆی، چونکە زۆر کاری وا ئەبێت ئەگەر بکرێت یا واز لە کردنی بهێنرێت ئەگەر زیانێکی

ئەوەی ووتویەتی: پێویستە دووای ئەو پاڕانەوەیە دڵی لەسەر چی دڵنیا بوو ئەوە بکات و نابێت لەسەر دڵنیاییەکەی پێش ئیستیخارەکە کار بکات، بەڵکو پێویستە لەسەر ئەو کەسە واز لە هەڵبژاردنی خۆی بهێنێت ئەگینا ئەگەر وا نەبێت ئەوە داوای خێری نەکردووە لە خوا، وە لەو داوا کردنەدا ڕاست ناکات و لەوەدا ڕاست ناکات کە خۆی لە توانا و زانین بەری کردووە و سابتی کردوون بۆ خوا، چونکە ئەگەر لەو قسەیەدا ڕاست بکات ئەبێت تەواو خۆی لە هەوڵ و تەقەلا دابڕێت وە هەروەها لە هەڵبژرادنی خۆی.

**پەسەندیەتی سەفەر لە ڕۆژانی پێنج شەممەدا:**

بوخاری ئەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ کەم ڕێ ئەکەوت ئەگەر بیویستایە سەفەر بکات لە ڕۆژانی پێنج شەمماندا سەفری نەکردایە.

**پەسەندیەتی نوێژ کردن پێش دەرچوون:**

لە (مطعم)ی کوڕی میقدامەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (مَا خَلَّفَ أَحَدٌ عِندَ أَهلِهِ أفضَلَ مِن رَكعَتَينِ يَركَعُهُمَا عِندَهُم حِينَ يُرِيدُ سَفَراً) رواه الطبراني وابن عساكر وسنده معضل، أو مرسل. واتە: کەس لە کردنی دوو رکات نوێژ چاکتر بەجێ ناهێڵێت لەناو کەس وکاریدا، کاتێ بیەوێت سەفەرێك بکات[1].

**پەسەندیەتی هاوڕێ پەیدا کردن بۆ سەفەر:**

١- ئەحمەد ئەگێڕێتەوە لە ئیبنو عومەرەوە خوا لێیان ڕازی بێت فەرمویەتی: پێغەمبەر ﷺ بە تەنهایی سەفەر کردن و بە تەنها مانەوەی شەوی قەدەغە کردووە.

٢- لە عەمری کوڕی شوعەیبەوە لە باوکیەوە لە باپیرەیەوە هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (الرَّاكِبُ شَيطَانٌ، وَالرَّاكِبَانِ شَيطَانَانِ، وَالثَّلَاثَةُ رَكبٌ). واتە: سوارێك بە تەنها بچێتە سەفەرەوە یەك شەیتانە، و دووسوار دوو شەیتانە، و سێ سوار کۆمەڵە سوارن.

**پەسەندی ماڵ ئاوایی کردن لە کەس وکار و خزمان و داوای دوعا کردن لێیان و دوعاکردنی خۆشی بۆیان:**

١- ئیبنوسوننی و ئەحمەد گێڕاویانەتەوە لە ئەبو هورەیرەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (مَن أَرَادَ أَن يُسَافِرَ فَلْيَقُل لِمَن يُخلِف: أستَودِعُكُمُ اللهَ الَّذِي لا تَضِيعُ وَدَائِعُهُ)[2]. واتە: هەرکەس سەفەر بکات با

---

گەورەی بەدراوەیە، هەربۆیە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (لِيَسأَل أَحَدُكُم رَبَّهُ حَتَّى شِسعَ نَعلِهِ). هەتا بۆ پەتی نەعلەتەکانیشتان داوا لە خوا بکەن.

(١) ئەم حەدیسە لاوازە.

(٢) ئەم حدیسە ئیسنادەکەی حەسەنە (ألباني).

بەوکەسانەی بەجێیان ئەهێڵێت بڵێ: ئەتان سپێرم بەو خوایەی کە سپاردەی لای ئەو هیچی لێ نایەت و لەناو ناچێ.

٢- ئەحمەد لە عومەرەوە خوا لێی ڕازی بێت ئەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (إنَّ اللهَ اذا استُودِعَ شَيئاً حَفِظَهُ)[1]. واتە: بەڕاستی خوا هەرچی پێ بسپێردرێت ئەیپارێزێت.

٣- ئەگێڕنەوە لە ئەبوهورەیرەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (إذَا أَرَادَ أَحَدُكُم سَفَراً فَلْيُوَدِّعْ إِخوَانَهُ، فَإِنَّ اللهَ تَعالَى جَاعِلٌ فِي دُعَائِهِم خَيراً). واتە: ئەگەر کەسێکتان ویستی سەفەرێك بکات با ماڵ ئاوایی لە براکانی بکات، چونکە خوای گەورە لە دوعای ئەواندا خێری داناوە.

٤- سوننەتە بۆ کەس‌وکار و هاوڕێکانی و ئەوانەی خواحافیزی لێ ئەکەن کە بپارێنەوە بۆ موسافیر بەم دوعایانە:

سالم ووتویەتی: ئیبنوعومەر خوا لێیان ڕازی بێت ئەگەر کەسێك بیویستایە سەفەر بکات پێی ئەفەرمو: وەرە پێشەوە با ماڵ ئاواییت لێ بکەم وەك چۆن پێغەمبەر ﷺ ماڵ ئاوایی لە ئێمە ئەکرد، ئینجا ئەیفەرموو: (أَستَودِعُ اللهَ دِينَكَ وَأَمَانَتَكَ وَخَوَاتِيمَ عَمَلِكَ). واتە: ئایین و سپاردەکانتو کۆتایی کارەکانت بەخوا ئەسپێرم.

لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە: پێغەمبەر ﷺ ئەگەر ماڵ ئاوایی لە پیاوێك بکردایە دەستی ئەگرتو دەستی بەر نەئەدا هەتا پیاوەکە دەستی پێغەمبەری ﷺ بەرنەدایە، وە بەو شێوەیەی سەرەوە ماڵ ئاوایی لێ ئەکرد) (ترمذي) ووتویەتی ئەم فەرموودەیە حەسەن و صەحیحە.

٥- لە ئەنەسەوە هاتووە فەرمویەتی: پیاوێك هاتە لای پێغەمبەر ﷺ ووتی: ئەی نێرراوی خوا ئەمەوێ سەفەر بکەم توێشەی ڕێگام بدەرێ. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (زَوَّدَكَ اللهُ التَّقوَى) واتە: خوا توێشوی لە خوا ترساندنت بۆ بپێچێتەوە.

کابرا ووتی: لەوەزیاتر، فەرمویی: (وَغَفَرَ ذَنبَكَ) وەلە گوناهەکانیشت ببورێت. کابرا ووتی: لەوەش زیارت فەرموی: (وَيَسَّرَ لَكَ الخَيرَ حَيثُمَا كُنتَ) خوا کارت بۆ ئاسان بکات لە هەر کوێ بیت. (ترمذي) ووتویەتی: فەرموودەیەکی (حسن)ە.

٦- لەئەبوهورەیرەوە هاتووە فەرمویەتی: پیاوێك ووتی: ئەی نێرراوی خوا ئەمەوێت سەفەر بکەم ئامۆژگاریم بکە فەرموی: (عَلَيكَ بِتَقوَى اللهِ عَزَّوَجَل، وَالتَّكبِيرِ عَلَى كُلِّ شَرَفٍ، فَلَمَّا وَلَّى الرَّجُلُ قَالَ: اللَّهُمَّ اطوِ لَهُ البُعدَ وَهَوِّن عَلَيهِ السَّفَرَ) قال الترمذي: حديث حسن. واتە: ئامۆژگاریت ئەکەم لە خوا بترسە

---

(١) حديث صحيح الإسناد عند أحمد. ورواه ابن حبان من طرق أخرى بسند صحيح أيضاً (ألباني)

و کە گەیشتیتە سەر هەر شوێنێکی بەرز (الله أکبر) بکە. ئەڵێت: کاتێ کابرا پشتی هەڵکرد فەرمووی: خوایە دووری بۆ نزیك بکەرەوە و سەفەرەکەی بۆ ئاسان بکە.

**داوای دوعا کردن لە موسافیر لە شوێنی پیرۆزدا:**

عمر خوا لێی ڕازی بێت فەرمویەتی: داوام لە پێغەمبەر ﷺ کرد ڕێم بدات بچم بۆ عەمرە، جا ڕێی دام و فەرمووی: (لا تَنسَنَا یَا أُخَيَّ مِن دُعَائِكَ). واتە: براکەم لە بیرمان نەکەی لە دوعاکانتا.

عومەر دەفەرموێت: ئەو ووشەیە لە هەموو دونیا لام خۆشتر بوو. ئەبوداودو (ترمذي) گێراویانەتەوە (ترمذي) ووتویەتی: فەرمودەیەکی حەسەن و صەحیحە.

## دوعاکانی سەفەر

پەسەندە بۆ موسافیر -کاتێ لە ماڵ دەرچوو- بڵێت: (بِسمِ اللهِ، تَوَکَّلتُ عَلَى اللهِ، وَلا حَولَ وَلا قُوَّةَ إِلا بِاللهِ، اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ أَن أَضِلَّ أَو أُضَلَّ، أَو أَزِلَّ أَو أُزَلَّ، أَو أَظلِمَ أَو أُظلَمَ، أَو أَجهَلَ أَو يُجهَلَ عَلَيَّ). واتاکەی لە پێشەوە ڕون کراوەتەوە.

پاشان یەکێ لەدوعایانەی کە لە پێغەمبەرەوە ﷺ سابت بووە و پێی خۆشە هەڵبژێرێ و بیڵێ: وا هەندێ لەوانە دێنینەوە.

١- لە ئیبنو عەبباسەوە خوا لێیان ڕازی بێت هاتووە فەرمویەتی: ئەگەر پێغەمبەر ﷺ بیویستایە سەفەرێك بکات ئەی فەرموو: (اللَّهُمَّ أَنتَ الصَّاحِبُ فِي السَّفَرِ، وَالخَلِيفَةُ فِي الأَهلِ، اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الضُّبنَةِ فِي السَّفَرِ، وَالکَآبَةِ فِي المُنقَلَبِ، اللَّهُمَّ اطوِ لَنَا الأَرضَ، وَهَوِّن عَلَينَا السَّفَرَ). واتە: خوایە تۆ هاوەڵی لەسەفەردا و جێ نشینی لەناوکەس‌وکاردا، خوایە من پەنا ئەگرم بەتۆ لە هاوڕێی بێ کەڵك و پەژارەیی گەڕانەوە، خوایە زەویمان بۆ نزیك بکەرەوە و سەفەرەکەمان لەسەر ئاسان بکە.

وە کاتێ ئەگەڕایەوە ئەی فەرموو: (آيِبُونَ تَائِبُونَ عَابِدُونَ لِرَبِّنَا حَامِدُونَ). وە کاتێ ئەگەیشتە ماڵەوە ئەیفەرموو: (تَوباً تَوباً لِرَبِّنَا أَوباً، لا يُغَادِرُ عَلَينَا حَوباً) رواه أحمد والطبراني والبزار بسند رجاله رجال الصحيح. واتە: پەشیمانین لە گوناهەکانمان و ئەگەڕێینەوە بۆلای پەروەردگارمان بەشێوەیەك تاوانمان لەسەر نەمێنێ.

٢- لە عبدالله ی کوڕی سورجوسەوە هاتووە فەرمویەتی: پێغەمبەر ﷺ ئەگەر بچوایە بۆ سەفەر ئەی فەرموو: (اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِن وَعثَاءِ السَّفَرِ وَکَآبَةِ المُنقَلَبِ، وَالحَورِ بَعدَ الکَورِ، وَدَعوَةَ المَظلُومِ، وَسُوءِ المَنظَرِ فِي المَالِ وَالأَهلِ). واتە: خوایە پەنا ئەگرم بەتۆ لە گرانی و ناخۆشی سەفەر و پەژارەی گەڕانەوە، وە پەنا ئەگرم بەتۆ لەسەر لێ شێوان دووای ڕێنمایی، وە لە دوعای ستەم لێ کراو، وە لە شێوەی ناشرین لە ماڵ و کەس‌وکاردا.

وە كاتێك ئەگەڕایەوە هەر بەوشێوەی دەفەرموو: بەڵام پێچەوانەی دەكردەوە واتە ووشەی (أهل)ی لەسەرەتادا دەوت: (في الأهل والمال) رواه أحمد ومسلم.

**ئەوەی موسافیر ئەیڵێت لەكاتی سواربوندا:**

لە عەلی كوڕی رەبیعەوە هاتووە فەرمویەتی: عەلیم بینیوە وولاغیان بۆ هێناوە كاتێ پێی خستە ئاوزەنگەكەوە فەرموی: (بسم الله) -بەناوی خوا- كاتێ چووە سەر پشتی ووتی: (الحمدُ لله، ﴿سُبۡحَـٰنَ ٱلَّذِی سَخَّرَ لَنَا هَـٰذَا وَمَا كُنَّا لَهُۥ مُقۡرِنِینَ ۝ وَإِنَّآ إِلَىٰ رَبِّنَا لَمُنقَلِبُونَ﴾ (زخرف/١٣-١٤)، واتە: سوپاس و ستایش بۆ خوا، پاك و بێگەردە ئەو خوایەی كە ئەمانەی بۆ ئێمە ڕام كردوە وە ئێمە توانای ئەوەمان نەبو، وە بەڕاستی ئێمە دوای مردن بۆلای پەروەردگارمان ئەگەڕێینەوە، پاشان سێ جار (الحمد لله) ی كرد و سێ جار (الله أكبر) ی كرد، ئینجا فەرموی: (سُبحَانَكَ لا إلَهَ إلا أنتَ، قَد ظَلَمتُ نَفسِي فَاغفِر لِي، إنَّهُ لا يَغفِرُ الذُّنُوبَ إلا أنتَ). واتە: پاك و بێگەردی بۆ تۆ خوایە، هیچ خوایەك نیە شایستەی پەرستن بێت بە حەق جگە لە تۆ، بەڕاستی من ستەمم لەخۆم كردوە لێم خۆش ببە، چونكە بەڕاستی كەس نیە لە گوناهەكان خۆش ببێت جگە لە تۆ!

ئەڵێ: لە پاشاندا پێ‌كەنی، پێم ووت: بۆچی پێ ئەكەنیت ئەی ئەمیری باوەڕداران؟ فەرمووی: من چیم كرد پێغەمبەرم ﷺ بینیوە كردویەتی، پاشان پێ‌كەنی. منیش پێم ووت: بۆچی پێ ئەكەنیت ئەی نێرراوی خوا؟ فەرمووی: خوا سەیری دێ لە بەندەكەی كە بڵێت: خوایە لێم ببورە. وە ئەفەرموێت: ئەو بەندەیەم ئەزانێت كە لە من زیاتر كەس لە گوناە خۆش نابێت. ئەحمەدو ئیبنوحیببان و حاكم گێڕاویانەتەوە وە حاكم ووتویەتی: ئەم فەرموودەیە صەحیحە لەسەر مەرجی موسلیم.

لە ئەزدیەوە هاتووە ووتویەتی: ئیبنو عومەر پێی ڕاگەیاندم فەرمووی: پێغەمبەر ﷺ كاتێ سوار ووشترەكەی ئەبوو بۆ سەفەر سێ جار ئەی فەرموو: (الله أكبر) پاشان ئەی فەرموو: ﴿سُبۡحَـٰنَ ٱلَّذِی سَخَّرَ لَنَا هَـٰذَا وَمَا كُنَّا لَهُۥ مُقۡرِنِینَ ۝ وَإِنَّآ إِلَىٰ رَبِّنَا لَمُنقَلِبُونَ﴾، اللَّهُمَّ إنَّا نَسألُكَ فِي سَفَرِنَا هَذَا البِرَّ وَالتَّقوَى، وَمِنَ العَمَلِ مَا تَرضَى، اللَّهُمَّ هَوِّن عَلَينَا سَفَرَنَا هَذَا وَاطوِ عَنَّا بُعدَهُ، اللَّهُمَّ أنتَ الصَّاحِبُ فِي السَّفَرِ، وَالخَلِيفَةُ فِي الأهلِ، اللَّهُمَّ إنِّي أعُوذُ بِكَ مِن وَعثَاءِ السَّفَرِ، وَكَآبَةِ المُنقَلَبِ، وَسُوءِ المَنظَرِ فِي الأهلِ وَالمَالِ) أخرجه أحمد ومسلم. وە كاتێ ئەگەڕایەوە ئەوانەی ئەوت و ئەمەشی بۆ زیاد ئەكرد: (آيِبُونَ، تَائِبُونَ، عَابِدُونَ، لِرَبِّنَا حَامِدُونَ) أخرجه أحمد ومسلم.

**موسافیر کاتێ شەوی بەسەرداهات چی بڵێت:**

لە ئیبنو عومەرەوە خوا لێیان ڕازی بێت هاتووە فەرمویەتی: پێغەمبەر ﷺ ئەگەر سەفەرێك یا غەزایەکی بکردایە و شەوی بەسەردا بهاتایە ئەیفەرمو: (يَا أرضُ! رَبِّي وَرَبُّكِ اللهُ، أعُوذُ بِاللهِ مِن شَرِّكِ وَشَرِّ مَا فِيكِ وَشَرِّ مَا خُلِقَ فِيكِ، وَشَرِّ مَا دَبَّ عَلَيكِ، أعُوذُ بِاللهِ مِن شَرِّ كُلِّ أسَدٍ وأسود، وَحَيَّةٍ وعَقرَبٍ، وَمِن شَرِّ سَاكِنِ البَلَدِ، وَمِن شَرِّ وَالِدٍ وَمَا وَلَد) رواه أحمد وأبوداود. واتە: ئەی زەوی! پەروەردگاری منو پەروەردگاری تۆ خوایە، پەنا ئەگرم بە خوا لەشەڕی تۆو لەشەڕی ئەوەی لەسەرتە و شەڕی ئەوەی تیاتدا دروست کراوەو لە شەڕی ئەوەی بەسەرتا ڕۆیشتووە، وە پەنا ئەگرم بەخوا لە شەڕی شێرو ئەژدەها و لەشەڕی مار و دوپشك، وە لە شەڕی ئەوانەی لە شاراندا نیشتەجێن وە لەشەڕی باوك و لە دایك بووان.

**موسافیر کاتێ لە شوێنێکدا لایدا چی بڵێت:**

لە خەولەی کچی حەکیمی سەلەمییەوە هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (مَن نَزَلَ مَنزِلاً ثُمَّ قَالَ: أعُوذُ بِكَلِمَاتِ اللهِ التَّامَّاتِ كُلِّهَا مِن شَرِّ مَا خَلَقَ، لَم يَضُرُّهُ شَيءٌ حَتَّى يَرتَحِلَ مِن مَنزِلِهِ ذَلِكَ) رواه الجماعة إلا البخاري وأباداود. واتە: هەرکەس لە شوێنێکدا لای داو پاشان ووتی: پەنا ئەگرم بە هەموو ووشە تەواوەکانی خوا لەشەڕی هەموو دروست کراوێك کە دروستی کردووە، هیچ شتێك لەو شوێنەدا زیانی پێ ناگەیەنێت هەتا لەوێ ئەڕوات.

**موسافیر کاتێ هات بەرەو شارێك یان جێگایەك و ویستی بچێتە ناوی چی بڵێت**

لە (عطاء)ی کوڕی ئەبی مەڕوانەوە لە باوکییەوە هاتوە ووتویەتی: کەعب سوێندی خوارد بەو زاتەی دەریای بۆ موسا دووبەش کرد, کە صوهەیب بۆی گێڕاوەتەوە فەرمویەتی: پێغەمبەر ﷺ دێیەکی نەبینیوە و ویستبێتی بچێتە ناوی ئەی فەرمووبێت: (اللَّهُمَّ رَبَّ السَّمَواتِ السَّبعِ وَمَا أظلَلنَ، وَرَبَّ الأرَضِينَ السَّبعِ وَمَا أقلَلنَ، وَرَبَّ الشَّيَاطِينِ وَمَا أضلَلنَ، وَرَبَّ الرِّيَاحِ وَمَا ذَرَينَ، أسألُكَ خَيرَ هَذِهِ القَريَةِ وَخَيرَ أهلِهَا وَخَيرَ مَا فِيهَا، وَنَعُوذُ بِكَ مِن شَرِّهَا وَشَرِّ أهلِهَا وَشَرِّ مَا فِيهَا). رواه النسائي وابن حبان، والحاكم وصححاه. واتە: خوایە پەروەردگاری حەوت ئاسمانو ئەوانەی سێبەریان کردووە بەسەریاندا، وە پەروەردگاری حەوت زەوی و ئەوانەی بەسەریەوە ئەژین، وە پەوەردگاری شەیتانەکانو ئەوانەی گومڕایان کردون، وە پەوەردگاری ڕەشەباکان و ئەوەی بڵاویان کردۆتەوە، داوای خێری ئەم گوندەو خێری دانشیتوانی و ئەوەی تێیدایە لێت ئەکەم. وە پەنا ئەگرم بەتۆ لە شەڕی ئەم گوندەو شەری دانیشتوانی و شەڕی ئەوەی تێیدایە.

لە ئیبنوعومەرەوە خوا لێیان ڕازی بێت هاتووە فەرمویەتی: کاتێ ئێمە سەفەرمان ئەکرد لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ ئەگەر گوندێکی ببینیایە و بیویستایە بچێتە ناوی ئەی فەرموو: (اللَّهُمَّ بَارِك لَنَا فِيهَا -ثلاث مرات- اللَّهُمَّ ارزُقنَا جَنَاهَا، وَحَبِّبنَا إلَى أهلِهَا، وَحَبِّب صَالِحِي أهلِهَا إلَينَا) رواه الطبراني في الأوسط بسند جيد. واتە: خوایە! چونەناو ئەم گوندەمان لێ پیرۆز بکە، سێ جار وای ئەفەرموو، پاشان

ئەیفەرموو: خوایە بەروبومی ئەم گوندەمان پێ ببەخشە، وە خۆشەویستمان بکە لای دانیشتوانی، و پیاوچاکانیمان لا خۆشەویست بکە.

لە عائیشەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتووە فەرمویەتی: پێغەمبەر ﷺ کاتێك لە سەفەرێکدا ئەچوو بەسەر جێگایەکداو بیویستایە بچێتە ئەو شوێنەوە ئەیفەرموو: (اللَّهُمَّ إنِّي أسألُكَ مِن خَيرِ هَذِهِ وخَيرِ مَا جَمعتَ فِيهَا، وَأعُوذُ بِكَ مِن شَرِّهَا وَشَرِّ مَا جَمعتَ فِيهَا؛ اللَّهُمَّ ارزُقنَا جَنَاهَا وَأعِذنَا مِن وَبَاهَا، وَحَبِّبنَا إلَى أهلِهَا، وَحَبِّب صَالِحِي أهلِهَا إلَينَا) رواه ابن السني. واتە: خوایە داوای خێری ئەم شوێنەت لێ ئەکەم و خێری ئەوەی تێیدا کۆت کردۆتەوە، وە پەنا ئەگرم بە تۆ لە شەڕی ئەم شوێنەو شەڕی ئەوەی تێیدا کۆت کردۆتەوە، وەلای دانیشتوانی خۆشەویستمان بکەو پیاو چاکانیشی خۆشەویست بکە لە لامان.

ئەوەی کە موسافیر ئەیڵێت لەکاتی پارشێودا:

لە ئەبوهورەیرەوە هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ ئەگەر بچوایەتە سەفەرو بگەیشتایەتە کاتی پارشێو ئەیفەرموو: (سَمِعَ سَامِعٌ بِحَمدِ اللهِ وَحُسنِ بَلائِهِ عَلَينَا، رَبَّنَا صَاحِبنَا وَأفضِل عَلَينَا، عَائِذاً بِاللهِ مِنَ النَّار) رواه مسلم. واتە: شایەتێك شایەتی ئەدا بەوەی کە سوپاس گوزاری خوامان کرد لەسەر ئەوەی نیعمەتەکانی ڕژاندووە بەسەرمانا، ئەی پەروەردگار هاوەڵمان بە لەم سەفەرەداو چاکەمان بەسەردا بڕژێنە، خوایە لە ئاگر بمان پارێزە.

ئەوەی کە موسافیر ئەیڵێت کاتێ گەیشتە شوێنێکی بەرز یا نزم بۆوە بۆ دۆڵێك، یا کاتێ گەڕایەوە:

١- بوخاری لە جابیرەوە ئەگێڕێتەوە فەرمویەتی: ئێمە کاتێ لە سەفەری حەج و عومرەدا ئەگەیشتینە بەرزاییەك (الله أكبر)مان ئەکرد، وە کە بگەیشتینایە شوێنێکی نزم (سبحان الله) مان ئەکرد.

٢- بوخاری لە ئیبنو عومەرەوە ئەگێڕێتەوە خوا لێیان ڕازی بێت کە پێغەمبەر ﷺ کاتێ ئەگەڕایەوە لە حەجو عەمرە (ومن وابزانم ورتی غەزاش) ئەگەر بگەیشتیایە بەرزاییەك یا شوێنێکی سەخت سێجار (الله أکبر) ی ئەکرد و ئەیفەرموو: (لا إلَهَ إلا اللهُ وَحدَهُ لا شَرِيكَ لَهُ، لَهُ المُلكُ وَلَهُ الحَمدُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيءٍ قَدِير، آيِبُونَ تَائِبُونَ، عَابِدُونَ، سَاجِدُونَ، لِرَبِّنَا حَامِدُونَ، صَدَقَ اللهُ وَعدَهُ، وَنَصَرَ عَبدَهُ، وَهَزَمَ الأحزَابَ وَحدَهُ).

ئەوەی موسافیر ئەیڵێت لە کاتی سواری کەشتیدا :

١- ئیبنوسوننی لە حوسەینی کوڕی عەلیەوە ئەگێڕێتەوە خوا لێیان ڕازی بێت کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (أمانُ أُمَّتِي مِنَ الغَرَقِ-إذا رَكِبُوا- أن يَقُولُوا: ﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ مَجۡرٜىٰهَا وَمُرۡسَىٰهَآۚ إِنَّ رَبِّي لَغَفُورٞ رَّحِيمٞ﴾ (هود/٤٣). واتە: ئەمانی ئوممەتەکەم لە نقوم بوون کاتێ سواری کەشتی بوون خوێندنی

ئەم ئایەتەیە ﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ مَجۡرٜىٰهَا وَمُرۡسَىٰهَآۚ إِنَّ رَبِّي لَغَفُورٞ رَّحِيمٞ﴾. واتە: بەناوی خوا بەسەر ئاودا بڕوات و بەناوی خوا لەنگەر بگرێت، چونکە پەروەردگارم لێخۆش بوو بەبەزەییە.

هەروەها ﴿وَمَا قَدَرُواْ ٱللَّهَ حَقَّ قَدۡرِهِۦ وَٱلۡأَرۡضُ جَمِيعٗا قَبۡضَتُهُۥ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ وَٱلسَّمَٰوَٰتُ مَطۡوِيَّٰتُۢ بِيَمِينِهِۦۚ سُبۡحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يُشۡرِكُونَ﴾ (زمر/٦٧). واتە: ـ ئەو موشریکانە ـ ئەو جۆرەی شیاوە بە خواوە خوایان نەناسیوە, لەحاڵێکدا هەموو زەوی لە ڕۆژی دواییدا بەدەست ئەوەو ئاسمانەکان پێچراوەی دەستی ڕاستی ئەون (وە هەردوودەستی پەروەردگار ڕاستن)، پاك و بەرز و بەریە لەوەی کە دەیکەنە هاوبەشی.

## سواربونی کەشتی لەکاتی شەپۆل و تێکچونی دەریادا

دورست نیە کەس بچێتە ناو دەریاوە کاتی شەپۆل‌و تێك چوونی.

بە پێی حەدیسی ئەبی عیمرانی جەونی کە فەرمویەتی: هەندێ لە یارەکانی پێغەمبەر ﷺ بۆیان گێڕامەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (مَن بَاتَ فَوقَ بَيتٍ لَيسَ لَهُ إجَارٌ فَوَقَع فَمَاتَ، فَقَد بَرِئَت مِنهُ الذِّمَّةُ، وَمَن رَكِبَ البَحرَ عِندَ ارتِجَاجِهِ فَمَاتَ، فَقَد بَرِئَت مِنهُ الذِّمَّةُ) رواه أحمد بسند صحيح. واتە: هەرکەس لەسەر بانێك خەوت و ستارە و شتێکی وای نەبوو ڕێگە لە کەوتنە خوارەوە بگرێ، وە کەوتە خوارەوە و مرد ئەوە مافی بە گەردنی کەسەوە نییەوە، وە هەرکەس سواری دەریا بوو کاتی تێك چوونیو مرد ئەوە مافی بە گەردنی کەسەوە نییەوە.

# حەج

خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ أَوَّلَ بَيْتٍ وُضِعَ لِلنَّاسِ لَلَّذِي بِبَكَّةَ مُبَارَكًا وَهُدًى لِّلْعَالَمِينَ ۝ فِيهِ آيَاتٌ بَيِّنَاتٌ مَّقَامُ إِبْرَاهِيمَ وَمَن دَخَلَهُ كَانَ آمِنًا وَلِلَّهِ عَلَى النَّاسِ حِجُّ الْبَيْتِ مَنِ اسْتَطَاعَ إِلَيْهِ سَبِيلًا وَمَن كَفَرَ فَإِنَّ اللَّهَ غَنِيٌّ عَنِ الْعَالَمِينَ﴾ (آل عمران/٩٦-٩٧) واتە: بەڕاستی یەکەم خانەیەك کە بۆ خەڵك دانراوە ئەو خانەیە کە لە مەککەیەو پیرۆزە، وە هۆی ڕێنمایی جیهانیانە، لەو شوێنەدا نیشانەی ڕون و ئاشکرای خودای تێدایە، ئەویش شوێنی وەستانی ئیبراهیم (علیه السلام)ە، وە هەرکەس بچێتە ناوی لە ئەمن و ئاسایشدا ئەبێت، وە خوا لە سەر خەڵك دایناوە چوون بۆ ئەو خانەیە بۆ حەج هەرکەس کە لە تواناییدا هەبێت، وە هەرکەس باوەڕی بەوە نەبێت و کافر بێت، بەڕاستی خوای گەورە دەوڵەمەندەو بێ‌نیازە لە جیهانیان.

**پێناسەی حەج:**

حەج چوون بۆ مەککەیە بەمەبەستی بەجێهێنانی عیبادەتی (تەواف) سوڕانەوە بەدەوری کەعبە، و (سعي)، و عەرەفەو هەموو کردەوەو عیبادەتەکانی تری حەج، بۆ وەڵام دانەوەو بەجێهێنانی فەرمانی خواو هەوڵدان بۆ ڕەزامەندی ئەو.

حەج یەکێکە لە پێنج پایەکانی ئیسلام و فەرزێکە لەو فەرزانەی کە لە ئاییندا بە پێویست و بەواجب زانراوە.

جا هەرکەس ئینکاری پێویست بوونی بکات ئەوە کافر ئەبێت و هەڵئەگەڕێتەوە لە ئیسلام.

ئەوەی جومهوری زانایان هەڵیان بژاردووە ئەوەیە کە حەج ساڵی شەشی کۆچی واجب بووە، چونکە لەو بارەوە ئایەتی: ﴿وَأَتِمُّوا الْحَجَّ وَالْعُمْرَةَ لِلَّهِ﴾ (البقرة/١٩٦) هاتۆتە خوارەوە. واتە: حەجو عەمرە بە تەواوی بۆ خوا جێ بەجێ بکەن.

وە ئەو واجب بونەش دامەزراوە لەسەر ئەوەی کە مەبەست لە تەواو کردن دەست پێ کردنی فەرز بێت.

وە ئەوەی پشت گیری ئەوە ئەکات قیرائەتی عەلقەمەو مەسروق و ئیبراهیمی نەخەعیە کە (وأتموا) یان بە (وأقيموا) خوێندۆتەوە، (طبراني) بە سەنەدێکی صەحیح ریوایەتی کردووە.

بەڵام ئیبنوقەییم ئەمەی بە بەهێز داناوە کە فەرز بوونی حەج لە ساڵی نۆیەم یان دەهەمی کۆچی بوە.

**فەزڵو گەورەیی حەج:**

یاسا دانەری ئیسلام زۆر هانی داوە بۆ بەجێهێنانی فەریزەی حەج، ئەوەش هەندێك لەوەی لەوبارەوە هاتووە.

**ئەوەی هاتووە کە حەج چاکترینی کردەوەکانە:**

لە ئەبوهورەیرەوە هاتوە فەرمویەتی: پرسیارکرا لە پێغەمبەر ﷺ کە کام کردەوە چاکترینە؟ فەرموی: (إِيمَانٌ بِاللهِ وَرَسُولِهِ). واتە: باوەڕ هێنان بەخواو پێغەمبەر، ووتیان: دوای ئەو چی تر؟ فەرموی: (ثُمَّ جِهَادٌ فِي سَبِيلِ اللهِ). واتە: پاشان جیهاد کردن لە ڕێگەی خوادا، ووتیان: لە پاشاندا چی؟ فەرمووی : (ثُمَّ حَجٌّ مَبْرُورٌ) واتە: لە پاشاندا حەجێکی وەرگیراو، حەجی مەبرووریش ئەوحەجەیە کە گوناهی تێکەڵ نەبێت.

حەسەن ئەڵێت: حەجی مەبرور ئەوەیە ئەو کەسە کە گەڕایەوە بێ مەیل بێ لە دنیاو ڕووی لە ڕۆژی دوایی بێت و ڕەغبەتی بۆی هەبێ.

ئەگێڕنەوە بە مەرفوعی بە سەنەدێکی حەسەن کە: حەجی مەبرور خواردن دانە بەهەژاران‌و قسەی نەرم‌و نیانە.

**ئەوەی هاتووە کە حەج جیهادە:**

١- لە حەسەنی کوڕی عەلیەوە خوا لێیان ڕازی بێت هاتوە کە پیاوێك هاتە لای پێغەمبەر ﷺ پێی ووت: من پیاوێکی ترسنۆك‌و لاوازم، پێغەمبەر ﷺ فەرموی: (هَلُمَّ إِلَى جِهَادٍ لاشَوْكَةَ فِيهِ: الحَجُّ) رواه عبدالرزاق و الطبراني ورواته ثقات. واتە: دەبچۆ بۆ جیهادێك کە سەختی‌و ئازاری تیا نەبێ ئەویش: حەجە.

٢- لە ئەبوهورەیرەوە هاتوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (جِهَادُ الكَبِيرِ، وَالضَّعِيفِ، وَالمَرْأَةِ: الحَجُّ) رواه النسائي بإسناد حسن. واتە: جیهادی پیرو لاوازو ئافرەتان حەجە.

٣- لە عائیشەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتوە کە ـ بە پێغەمبەری ﷺ ـ ووتوە: ئەی نێرراوی خوا وەك ئەزانی جیهاد چاکترین خوا پەرستیە، ئەی بۆ ئێمەش جیهاد نەکەین؟ فەرموی: (لَكِنَّ أَفْضَلَ الجِهَادِ: حَجٌّ مَبْرُورٌ) رواه البخاري ومسلم. واتە: بۆ ئێوە ئافرەتان چاکترین جیهاد حەجی مەبرورە.

٤- دیسانەوە بوخاری و موسلیم لە عائیشەوە ئەگێڕنەوە کە فەرمویەتی: ووتم: ئەی نێرراوی خوا! ئایا ئێمەی ئافرەتان جیهادو غەزاتان لەگەڵدا نەکەین؟ فەرموی: (لَكِنَّ أَحْسَنَ الجِهَادِ وَأَجْمَلَهُ. الحَجُّ، حَجٌّ مَبْرُورٌ). واتە: بۆ ئێوەی ئافرەتان چاکترین و جوانترین جیهاد: حەجە حەجێکی مەبرور.

عائیشە فەرمویەتی: لەو کاتەوە ئەوەم لە پێغەمبەر ﷺ بیستووە وازم لە حەج کردن نەهێناوە

**ئەوەی هاتوە دەربارەی ئەوەی کە حەج گوناه لائەبات:**

١- لە ئەبوهورەیرەوە هاتوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (مَن حَجَّ فَلَم يَرفُث وَلَم يَفسُق رَجَعَ كَيَومَ وَلَدَتهُ أُمُّهُ). رواه البخاري ومسلم. واتە: هەرکەس حەجی کردو کاتی حەجەکەی نەچووە لای خێزانی و سەرپێچی فەرمانی خوای نەکرد کە گەڕایەوە وەك ئەو ڕۆژە وائەبێت کە تازە لە دایك بووە.

٢- لە عەمری کوڕی عاصەوە هاتوە فەرمویەتی: کاتێ خوا ئاینی ئیسلامی خستە دڵمەوە، هاتم بۆ لای پێغەمبەر ﷺ ووتم: (دەست بێنە با پەیمانت بدەمێ، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ دەستی ڕاخست و بەڵام من دەستم قوچاندەوە، فەرمووی: ئەوە چیتە ئەی عەمر؟ ئەڵێ: ووتم : مەرجم هەیە، فەرمووی: مەرجەکەت چیە؟ ووتم: ئەوەیە کە گوناهم عەفو بکرێ؟ فەرموی: (أمَا عَلِمتَ أنَّ الإسلامَ يَهدِمُ مَاقَبلَهُ، وَأنَّ الهِجرَةَ تَهدِمُ مَا قَبلَهَا، وأنَّ الحَجَّ يَهدِمُ مَا قَبلَهُ) رواه مسلم. واتە: ئەی نەت زانیوە کە ئیسلام پێش خۆی ئەڕوخێنێ، وە کۆچ کردن پێش خۆی ئەڕوخێنێ، و حەج پێش خۆی ئەڕوخێنێ. ـ واتە: چی تاوان کراوە لە پێش ئەوانەدا ئەسڕێتەوە ـ .

٣- لە عەبدوڵلای کوڕی مەسعودەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (تَابِعُوا بَينَ الحَجِّ وَالعُمرَةِ، فَإنَّهُمَا يَنفِيَانِ الفَقرَ وَالذُّنوبَ، كَمَا يَنفِي الكِيرُ خَبَثَ الحَدِيدِ، وَالذَّهَبِ، وَالفِضَّةِ، وَلَيسَ لِلحَجَّةِ المَبرُورَةِ ثَوابٌ إلا الجَنَّةَ) رواه النسائي، والترمذي وصححه. واتە: حەجو عەمرە بەدوای یەکدا بەجی بهێنن چونکە ئەو دوانە هەژاری و گوناه ناهێڵن، وەك چۆن کورە پیسی ئاسنو زێڕو زیو ناهێڵێ، وە پاداشت نیە بۆ حەجی مەبرور بەهەشت نەبێت.

**ئەوەی هاتووە کە حاجیەکان وەفدی خوای گەورەن:**

لە ئەبو هورەیرەوە هاتوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (الحُجَّاجُ، وَالعُمَّارُ، وَفدُ اللهِ إن دَعَوهُ أجَابَهُم، وَإن استَغفَرُوهُ غَفَرَ لَهُم). واتە: حاجی و ئەوانەی عەمرە ئەکەن وەفدی خوان، جا ئەگەر لێی بپاڕێنەوە وەڵامیان ئەداتەوە، وە ئەگەر داوای لێبوردنی لێ بکەن لێیان ئەبورێ. نەسائیو ئیبنوماجە ڕێوایەتیان کردووە.

هەروەها ئیبنوخوزەیمەو ئیبنوحیببان لە صەحیحەکانیاندا ڕیوایەتیان کردووە بە لەفزی (وَفدُ اللهِ ثَلاثَةٌ: الحَاجُّ، وَالمُعتَمِرُ، وَالغَازِي). واتە: وەفدی خوا سێ جۆرن : حاجی و عەمرەکەرو غەزاکەر.

**ئەوەی هاتووە کە حەج پاداشتەکەی بەهەشتە:**

١- بوخاری و موسلیم لە ئەبو هورەیرەوە ئەگێڕنەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (العُمرَةُ إلى العُمرَةِ كَفَّارَةٌ لِمَا بَينَهُمَا، وَالحَجُّ المَبرُورُ لَيسَ لَهُ جَزَاءٌ إلا الجَنَّةَ). واتە: لە عەمرەیەکەوە هەتا عەمرەیەکی تر چی گوناه بکرێ لە نێوانیان ئەیسڕێتەوە، وەحەجی مەبرور پاداشتی نیە بەهەشت نەبێت.

٢- ئیبنوجورەیج -بە ئیسنادێکی حەسەن- لە جابیرەوە ئەگێڕێتەوە خوای لێ ڕازی بێت کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (هَذَا البَيتُ دَعامَةُ الإسلامِ، فَمَن خَرَجَ يَؤُمُّ هَذَا البَيتِ مِن حَاجٍّ أو مُعتَمِرٍ كَانَ مَضمُوناً عَلَى اللهِ، إن قَبَضَهُ أن يُدخِلَهُ الجَنَّةَ، وَإن رَدَّهُ، رَدَّهُ بِأجرٍ وَغَنِيمَةٍ). واتە: ئەم خانەیە پایەی ئیسلامە، جا هەرکەس بەمەبەستی چون بۆ حەج یا عەمرە ڕووی کردە ئەم خانەیە، لە سەر خوایە ئەگەر گیانی کێشا بیخاتە بەهەشتەوە، وە ئەگەر بەسەلامەتی گێڕایەوە بە پاداشتو خێرەوە بیگێڕێتەوە.

**فەزلی سەرف کردنی ماڵ لە حەجدا:**

لە بورەیدەوە هاتوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (النَّفَقَةُ فِي الحَجِّ كَالنَّفَقَةِ فِي سَبِيلِ اللهِ. الدِّرهَمُ بِسَبعِمائَةِ ضِعفٍ) رواه ابن أبي شيبة، وأحمد، والطبراني، و البيهقي، وإسناده حسن. واتە: ماڵ سەرف کردن لەڕێی حەجدا وەك سەرف کردن وەهایە لە ڕێی خوادا، هەر درهەمێك خێرەکەی حەوت سەد بەرانبەرە.

**حەج لە ژیاندا یەك جار واجبە:**

زانایان هەموویان کۆن لەسەر ئەوەی کە حەج دوبارە ناکرێتەوە، و لە تەمەندا یەکجار واجبە، مەگەر کەسێك نەزر بکات، ئەوە ئەبێت نەزرەکەی بەجێ بهێنێ، وە لە یەکجار زیاتر ئەوە (تطوع)ە.

لە ئەبو هورەیرەوە هاتوە کە پێغەمبەر ﷺ ووتاری بۆ ئەدان و ئەیفەرمو: (يَا أيُّهَا النَّاسُ، إنَّ اللهَ كَتَبَ عَلَيكُمُ الحَجَّ فَحُجُّوا). واتە: ئەی خەڵکینە خوا حەجی لەسەر فەرز کردون، حەج بکەن.

پیاوێك لەو لاوە ووتی: هەموو ساڵێك ئەی نێرراوی خوا؟ پێغەمبەر بێدەنگ بوو، کابرا سێ جار ووتیەوە، لەپاشاندا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەگەر بڵێم بەڵێ، ئەوە واجب ئەبوو لە سەرتان وە نەشتان ئەتوانی، لەپاشاندا فەرموی: (ذَرُونِي مَا تَرَكتُكُم، فَإنَّمَا أهلَكَ مَن كَانَ قَبلَكُم كَثرَةُ سُؤالِهِم، وَاختِلافُهُم عَلَى أنبِيَائِهِم، فَإذَا أمَرتُكُم بِشَيءٍ فَأتُوا مِنهُ مَا استَطَعتُم، وَإذَا نَهَيتُكُم عَن شَيءٍ فَدَعُوهُ). رواه البخاري ومسلم. واتە: لە سەر هەرشتێك کە پێتان ناڵێم لێم گەڕێن، چونکە ئەوانەی پێش ئێوە بەهۆی زۆری پرسیارو جیاوازییان لەگەڵ پێغەمبەرەکانیان لەناو چون، جا ئەگەر فەرمانی شتێکم پێدان چەندەتان لە تواناتادا بوو بەجێی بهێنن، وە ئەگەر شتێکم لێ قەدەغە کردن بە تەواوی وازی لێ بهێنن.

لە ئیبنو عەبباسەوە خوا لێیان ڕازی بێت هاتوە فەرمویەتی: پێغەمبەر ﷺ ووتاری بۆ ئەداین فەرموی: (يَا أيُّهَا النَّاسُ كُتِبَ عَلَيكُمُ الحَجُّ). واتە: ئەی خەڵکینە حەجتان لەسەر فەرز کراوە.

ئەقرەعی کوڕی حابیس هەڵسا ووتی: هەموو ساڵێك ئەی نێرراوی خوا؟ فەرمووی: ئەگەر بڵێم ووتایە ئەوە هەموو ساڵێك واجب ئەبوو، وە ئەگەر هەموو ساڵێکیش بوایە نەتان ئەکردو نەتان ئەتوانی، حەج یەك جارە، هەرکەس زیاتر بکات ئەوە (تطوع)ە. ئەحمەدو ئەبو داوود و نەسائیو حاکم کە پلەی (صحيح)ی بۆ داناوە گێراویانەتەوە.

واجب بوون ئەبێ خێرا بەجێ بێت یان لەسەر خۆ؟:

شافیعی و ثەوری و ئەوزاعی و موحەممەدی کوڕی حەسەن بۆ ئەوە چوون کە حەج واجبی فەوری نییە، کەواتە بەجێ دێت لە هەرکاتێکی تەمەندا کە بۆی کرا، وە ئەو کەسەی لەسەری پێویست بووە بەدوا خستنی گوناهبار نابێت، هەرکاتێك بەجێی بهێنێ لەپێش مردندا، چونکە پێغەمبەر ﷺ حەجەکەی دوا خست هەتا سالّی دەیەمی کۆچی‌و خێزانەکان‌و ژمارەیەکی زۆر لە صەحابەکانی لەگەڵدا بوو، لەگەڵ ئەوەشدا کە حەج سالّی شەشەم واجب بوو، جا ئەگەر خێرا بەجێ بهاتایە ئاوا دوای نەئەخست ﷺ.

شافیعی ووتوویەتی: بەڵگەمان هەیە کە حەج لە ژیاندا یەکجار فەرزە سەرتاکەی بالّغی‌یەو دوایی‌یەکەشی ئەوەیە کە پێش مردن بەجێی بهێنێ.

ئەبو حەنیفە و مالیك وئەحمەد و هەندێ لە شوێنکەوتوانی شافیعی و ئەبویوسف بۆ ئەوە چوون کە حەج ئەبێ خێرا بەجێ بهێنرێت.

بە پێی ئەوەی ئیبنوعەبباس ئەگێڕێتەوە خوا لێیان ڕازی بێت کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (مَن أرَادَ الحَجَّ فَليُعَجِّل، فَإنَّهُ قَد يَمرَضُ المَرِيضُ، وَتَضِلُّ الرَّاحِلَةُ، وَتَكُونُ الحَاجَةُ) رواه أحمد، والبيهقي، والطحاوي، وابن ماجة. واتە: هەرکەس ویستی حەج بکات با پەلە بکات، چونکە لەوانەیە ئەو کەسە توشی نەخۆشی بێت یا وەسیلەی سواری لە دەست بچێ، یا هەژار بکەوێت و نەتوانێ.

هەر لە ئیبنوعەبباسەوە هاتوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی : (تَعَجَّلُوا الحَجَّ -يَعنِي الفَرِيضَةَ- فَإنَّ أحَدَكُم لايَدرِي مَا يُعرَضُ لَهُ) رواه أحمد والبيهقي (وقال: مَا يُعرَضُ لَهُ مِن مَرَضٍ أو حَاجَةٍ). واتە: بە پەلە حەج بکەن کاتێ واجب بوو لەسەرتان، چونکە کەس نازانێ چی بەسەر دێت. وەبەیهەقی دەڵێ: (مایعرض له) واتە: نەخۆشی، یان پێویستی و فەقیری.

زانایانی پێشوو ئەم فەرمودانەیان بە (ندب) داناوە، چونکە پەسەندە پەلە بکرێ هەرکاتێ موکەللەف توانای بەجێهێنانیان بوو.

### مەرجەکانی واجب بوونی حەج

زانایان بۆ واجب بونی حەج لەسەر ئەم مەرجانەی خوارەوە ڕێك کەوتون:-

١- ئیسلام

٢- بالّغ بوون.

٣- ئاوەز -عەقڵ-.

٤- ئازادی.

٥- توانایی.

جا هەرکەس ئەو مەرجانەی تێدا نەبوو حەجی لەسەر پێویست نابێ.

چونکە، ئیسلام‌و بالغی‌و ئاوەز مەرجی بەدی هێنانی ئەو شتانەیە کە خوا لەسەر بەندەکانی داناوە لە هەموو خوا پەرستیەکدا.

لە فەرموودەدا هاتووە: پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (رُفِعَ القَلَمُ عَن ثَلاثٍ: عَنِ النَّائِمِ حَتَّى يَستَيقِظَ، وَعَنِ الصَّبِيِّ حَتَّى يَشِبَّ، وَعَنِ المَعتُوهِ حَتَّى يَعقِلَ). واتە: پێنوس لە سەر سێ کەس هەلگیراوە؛ لەسەر نوستو هەتا هەلئەسێ، وە لە سەر منداڵ هەتا گەورە ئەبێت، وەلەسەر شێت هەتا هۆشی دێتەوە. وە ئازادیش مەرجە بۆ واجب بونی حەج، چونکە حەج خواپەرستی‌یە پێویستی بەکات هەیە، وە بە مەرج گیراوە تێیدا کە ئەوکەسە بتوانێ، بەلاّم خزمەتکارو کۆیلە مەشغوڵە بە کاری گەورەکەیەوە، کەواتە توانای نیە.

ئەما توانایی بەپێی ئەم فەرمودەیەی خوای گەورەیە: ﴿وَلِلَّهِ عَلَى ٱلنَّاسِ حِجُّ ٱلْبَيْتِ مَنِ ٱسْتَطَاعَ إِلَيْهِ سَبِيلًا﴾ (آل عمران/٩٧). واتە: حەجی خانەی خوا واجبە لەسەر خەڵکی کە بەجێی بهێنن ئەوانەی کە توانای ئەوەیان هەیە.

**توانای حەج کردن بەچی دێتە دی؟**

توانا کە مەرجێکە لە مەرجەکانی واجب بوونی حەج بەمانەی خوارەوە بەجێ دێت:-

١- ئەو کەسەی حەجی لەسەر واجب ئەبێت ئەبێ ساغ و تەندروست بێت، جا ئەگەر نەتوان بوو لە بەجێ‌هێنانی حەج بەهۆی پیری، یان لەدەست دانی یەکێك لە ئەندامەکانی، یان نەخۆشی بەردەوام کە هیوای چاك بوونی لێ ناکرێ، ئەوە دەبێت کەسێکی تر بگرێت حەجەکەی بۆ بکات ئەگەر ماڵی هەبێ. کە ئەم باسە لە (باسی حەج کردنی لە جێی کەسێکی تر)دا دێت.

٢- ئەبێت رێگاکە بێ ترس بێت بەشێوەیەك حاجی لە گیان و ماڵی ترسی نەبێت.

چونکە ئەگەر ترسی هەبێت، لە خۆی لە جەردەو رێگر، یا ترسی نەخۆشی‌یەك کە بلاّوبوبێتەوە یاترسی ماڵەکەی هەبێت کە رووتی بکەنەوە، ئەوە ئەو کەسە لەوانەیە کە توانای حەجیان نی‌یە.

وە زانایان جیاوازیان هەیە لەوەدا کە ئەگەر لەرێگا گومرگ و سەرانەی لێ بسەندرێ، ئایا ئەمانە بە بیانوو دا ئەنرێ و حەجی واجب لەسەری لا ئەبەن یا نا؟

شافیعی و کەسانی تر بۆ ئەوە چوون کە ئەوانەش بەهانەن و حەج لائەبەن با ئەوەی کە لێی ئەسەنرێ کەمیش بێت.

لای مالیکی‌یەکان ئەوانە بە بەهانە دانانرێت مەگەر کابرا مافی پایەماڵ بکرێ، یا زۆر جار لێی بسێنرێ‌و دوبارە بێتەوە.

٣،٤- ئەبێ خواردنی رێگای پێ بێت‌و وولاّغی سواری هەبێت یا شتێکی هەبێت سواری بێت.

خواردنیش وا دانراوە، کە ئەوەندەی پێ بێت پێی بژیو تەندروست بێت وە ئەوەندەی هەبێت کە بەشی ئەوانەش بکات کە بەجێیان ئەهێڵێ، هەتا ئەگەڕێتەوە، لە پێویستیە بنەڕەتیەکان وەك: جلوبەرگ و خانوو شتی سواری و ئامێری تیش هەتا فەرزی حەجەکەی بەجێ ئەهێنێت و ئەگەڕێتەوە.

شتی سواریش: شتێك بێت بتوانێ پێی بچێت و پێی بگەڕێتەوە بەڕێگای ووشکانیدا بێت یا بە ئاودا بێت یا بەهەوادا.

ئەوەش بۆ ئەو کەسانەی کە ناتوانن بە پێ بچن لەبەر دوورییان لە مەککەوە، بەڵام بۆ ئەوانەی کە ئەتوانن بەپێ بگەنە مەککە، ئەوە بوونی شتێك کە سواری بێت مەرج نابێت بۆ پێویست بوونی حەج، چونکە ماوەکە نزیکە و ئەتوانێ بە پێ بڕوات

لە هەندێ ڕیوایەتدا هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ (السبیل)ی بە خواردن و شتی سواری لێك داوەتەوە. لە ئەنەسەوە هاتوە فەرمویەتی: ووتیان: بە پێغەمبەر ﷺ مەبەست لە (السبیل) چیە لە ئایەتەکەدا؟ فەرموی: (الزَّادُ وَالرَّاحِلَةُ) خواردەمەنیو شتی سوارییە. (دارقطني) گێڕاویەتیەوەو پلەی (صحیح)ی بۆ داناوە.

بەڵام (حافظ) ووتویەتی: ئەوەی بەهێزە ئەوەیە کە مورسەلە، وە (ترمذي)ش لە حەدیسی ئیبنوعومەرەوە تەخریجی کردووە بەڵام لە ئیسنادەکەیدا لاوازی هەیە.

(عبدالحق) ووتویەتی: ڕێگاکانی ئەم فەرموودەیە هەموویان لاوازن، ئیبنومونذیر ئەڵێت: حەدیسێك لەوبارەیەوە نییە کە سەنەدەکەی سابت بێت، وە ئەوەی ڕاست بێت ڕیوایەتەکەی حەسەنە کە بە مورسەلی هاتوە.

لە عەلیەوە خوای لێی ڕازی بێت هاتوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (مَن مَلَكَ زَاداً وَرَاحِلَةً تبلُغُهُ إلَى بَيتِ اللهِ وَلَم يَحُجَّ، فَلا عَلَيهِ أن يَمُوتَ إن شَاءَ يَهُودياً، وإن شَاءَ نَصرَانِياً، وَذلِكَ أنَّ اللهَ تَعالَى يَقُولُ: ﴿وَلِلَّهِ عَلَى ٱلنَّاسِ حِجُّ ٱلْبَيْتِ مَنِ ٱسْتَطَاعَ إِلَيْهِ سَبِيلًا﴾ (آل عمران/٩٧). واتە: هەرکەس ئەوەندە خواردەمەنی هەبێتو وڵاغێکی هەبێت بیگەیەنێتە خانەی خواو حەجی نەکرد، ئەوە ئارەزوی خۆیەتی کە مرد بە جولەکەیی ئەمرێت یا بە گاوری ئەمرێ، چونکە خوای گەورە ئەفەرموێ: حەجی خانەی خوا لەسەر خەڵك دانراوە بۆ ئەوکەسانەی توانایان هەیە. ئەم فەرموودەیە (ترمذي) ڕیوایەتی کردووە، وە لە ئیسنادەکەیدا هیلالی کوڕی عەبدوڵڵا هەیە نەناسراوە وە حارس هەیە کەشەعبی و چەند کەسی تر ئەڵێن درۆزنە.

فەرموودەکان هەرچەندە هەموویان لاوازن بەڵام زۆر لە زانایان لە پێویست بوونی حەجدا مەرجی بوونی خواردەمەنیو شتی سواریان داناوە بۆ ئەوانەی ماڵیان دوور بێت، کەواتە ئەوکەسەی خواردەمەنیو شتی سواری نەبوو حەجی لە سەر نیە.

ئیبنو تەیمیەیە ووتوویەتی: ئەم فەرموودانە سەنەدیان هەیە لە چەند ڕێگەیەکی حەسەن و مورسەل و مەوقوفەوە، وە ئەوە ئەگەیەنن کە بۆ واجب بوونی حەج مەرجی بوونی خواردەمەنی و شتی سواری هەیە. لەگەڵ ئەوەشدا کە پێغەمبەر ﷺ زانیویەتی زۆر کەس هەن توانای ڕۆیشتنیان هەیە بە پێ.

دیسانەوە خوای گەورەش فەرمویەتی: ﴿مَنِ ٱسْتَطَاعَ إِلَيْهِ سَبِيلًا﴾ (آل عمران/٩٧).

جا ئەوە یان مەبەستی ئەو توانینەیە کە دانراوە بۆ هەموو خواپەرستییەکان —کە ئەوەش توانایە بە ڕەهایی- یا توانایییەکی زیادەیە کە خوا بۆ حەجی داناوە، جا ئەگەر ئەوەی یەکەم ئیعتیباری هەبێت بێت ئەوە پێویست بەو بەستنەوەیە ناکات، وەك چۆن لە ئایەتی نوێژ و ڕۆژودا پێویستی نەبووە پێی، کەواتە دەر ئەکەوێت کە ئیعتیبار پێکراو ئەو توانایییە زیادەیە کە دانراوە لەو خوا پەرستییەدا، ئەویش ماڵ نەبێت هیچی تر نیە.

هەروەها حەج کردن خوا پەرستییە کە پێویستی بە بڕینی ماوەیەك لە ڕێگا هەیە، لەبەر ئەوە واجب بوونەکەی پێویستی بە بوونی خواردەمەنیو شتی سواری ئەبێت، وەك جیهاد.

بەڵگەی بنەڕەتی ئەو قیاسەش کە حەج قیاس کراوەتە سەر جیهاد فەرموودەی خوای گەورەیە کە ئەفەرموێ: ﴿وَلَا عَلَى ٱلَّذِينَ لَا يَجِدُونَ مَا يُنفِقُونَ حَرَجٌ﴾ تاوەکو ﴿وَلَا عَلَى ٱلَّذِينَ إِذَا مَآ أَتَوْكَ لِتَحْمِلَهُمْ قُلْتَ لَآ أَجِدُ مَآ أَحْمِلُكُمْ عَلَيْهِ﴾ (التوبة/٩١-٩٢). واتە: هیچ تاوانێك نییە لەسەر ئەوکەسانەی کە شتێك شك نابەن سەرفی بکەن، وە هەروەها ئەوانەش کە ئەهاتن بۆ لات شتێکیان بدەیتێ سواری ببن تۆش ووتت هیچ شك نابەم وهیچم نییە کە بتان دەمێ پێی بچن.

لە کتێبی (المهذب) دا هاتووە: ئەگەر کەسێك ئەوەندەی هەبووە کە خواردەمەنیو وولاغ و شتی سواری پێ بکڕێ، بەڵام خۆی پێویستی بوو وەقەرزار بوو، ئەوە حەجی لەسەر واجب نابێت، جا ئەو قەرزە ئەبێ بە پەلە بداتەوە یان لەسەرخۆ، چونکە قەرزی بە پەلە ئەبێ خێرا بدرێتەوە، بەڵام حەج لەسەر خۆو بەهێواشی ئەکرێ، لەبەر ئەوە قەرزەکە پێش حەجەکە ئەخرێ، وە قەرزە دوا خراوەکەش هەر لەسەریەتی، جا ئەگەر بۆ حەجەکە هەموو پارەکەی سەرف بکات، ئەوەندەی پێ نامێنێ قەرزەکەی پێ بداتەوە.

وە ووتوویەتی: وە ئەگەر پێویستی بەو پارەیە هەبوو بۆ خانویەك کە پێویست بو هەبێت، یا بۆ خزمەتکارێك بۆ خزمەت کردنی خۆی پێویست بوو، ئەوە حەجی لەسەر نابێت.

وە ئەگەر پێویستی بەژن هەبوو وە ترسی تووش بوونی گوناهی بوو، ئەوە ئەبێ ژن هێنانەکە پێش بخات، چونکە پێویستی بەوشتانە ئەبێت یەکسەر بەجێ بێت، وە ئەگەر پێویستی بوو بازرگانی پێوە بکات بۆ ئەوەی خۆی پێ بژێنێ، ئەوە ئەبوعەبباسی ئیبنوصەریح ئەڵێت: حەجی لەسەر واجب نابێت، چونکە خۆی پێویستی پێی هەیە، وە ئەمەش وەك خانوو خزمەتکارە.

لە کتێبی (المغني) دا هاتووە: ئەگەر کەسێکی باوەڕ پێ کراوی دەوڵەمەند بەقەرز ئەوەندەی دایە کە پێی بچێ بۆ حەج، ئەوە لەسەری واجب ئەبێ، چونکە ئەم لەم کاتەدا توانای هەیە، بەڵام ئەگەر کەسێکی کەم دەست بوو یا نەیتوانی بیداتەوە ئەوە حەجی لەسەر واجب نابێت.

لە لای شافیعی‌یەکان ئەگەر کەسێك وولاغێکی هەبوو بەخۆڕایی دای بە کەسێك کە پێی بچێت بۆ حەج ئەو کەسە لە سەری نیە وەری بگرێ، چونکە لەوەرگرتنی ئەوەدا منەتی کەسێکی دێتە سەر، وە هەڵگرتنی منەتی کەسێك کارێکی گرانە، بەڵام ئەگەر کەسێك کوڕەکەی ئەوەندەی بداتێ بتوانێ پێی بچێ بۆ حەج، ئەوە حەجی لەسەر واجب ئەبێت، چونکە لێرەدا منەت هەڵگرتنی تێدا نابێت.

حەنبەلی‌یەکان ووتوویانە: ئەو کەسەی کەسێکی تر ماڵی بداتێ حەجی پێ بکات حەجی لەسەر نابێت، چونکە بەوە نابێت بە (مستطيع - خاوەن توانا) جا ئەو کەسە کەسێکی نزیکی بێت یا بێگانە، شتی سواری و خواردەمەنی بداتێ، یا پارەی بداتێ وەك یەکە.

٥- شتێك نەبێت ڕێ لەخەڵك بگرێ بۆ چون بۆ حەج، وەك گرتن و ترس لە کاربەدەستێکی ستەمکار کە ڕێ لە خەڵك بگرێت لە حەج.

**حەجی منداڵ و کۆیلە:**

منداڵ و کۆیلە حەجیان لە سەر نیەیە، بەڵام ئەگەر چوون بۆ حەج حەجەکەیان دروستە، بەڵام بریتی حەجی فەرز ناکەوێ.

ئیبنوعەبباس خوایان لێ ڕازی بێت فەرمویەتی: پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (أَيُّمَا صَبِيٍّ حَجَّ ثُمَّ بَلَغَ الحِنثَ، فَعَلَيهِ أن يَحُجَّ حَجَّةً أخرى؛ أَيُّمَا عَبدٍ حَجَّ ثُمَّ أُعتِقَ، فَعَلَيهِ أن يَحُجَّ حَجَّةً أُخرَى) رواه الطبراني بسند صحيح. واتە: هەر منداڵێك بە منداڵی حەج بکات کە گەورە بوو ئەبێ حەجێکی تر بکاتەوە، وە هەر کۆیلەیەك حەجی کرد لەپاشاندا ئازاد کرا ئەبێ حەجێکی تر بکاتەوە.

سائیبی کوڕی یەزید ووتویەتی: باوکم لە حەجی ماڵ ئاواییدا لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ چو بۆ حەج، منیش تەمەنم حەوت ساڵ بوو. ئەحمەد و بوخاری و (ترمذي) گێڕاویانەتەوە.

(ترمذي) ووتوویەتی: ئەهلی عیلم ئیجماعیان هەیە لەسەر ئەوەی ئەگەر منداڵێك بە منداڵی حەج بکات کاتێ پێ گەیشت و گەورە بوو ئەبێ حەج بکاتەوە، وە هەروەها بەندەو کۆیلە ئەگەر حەجی کرد لە کاتی بەندایەتیدا لە پاشاندا ئازاد کرا ئەبێ حەج بکاتەوە ئەگەر توانای حەج کردنی هەبوو.

لە ئیبنوعەبباسەوە خوا لێیان ڕازی بێت هاتوە کە ئافرەتێك منداڵێکی بەرز کردەوە بۆ پێغەمبەر ﷺ و ووتی: ئەمە حەجی بۆ هەیە؟ فەرمووی: بەڵێ تۆش پاداشتت بۆ ئەنوسرێ.

لە جابیرەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتوە فەرمویەتی: لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ حەجمان ئەکرد ژن و منداڵمان لەگەڵدا بوو، لە جێی منداڵەکان تەلبیەمان ئەکردو ڕەمیمان ئەکرد. ئەحمەد و ئیبنوماجە گێڕاویانەتەوە.

پاشان ئەگەر منداڵەکە ئاوەزی بەشت ئەشکاو توانی ئیحرام ببەستێ و کارەکانی حەج بەجێ بهێنێ ئەتوانێ ئیحرام ببەستێ و عیبادەتەکانی حەج بەجێ بهێنێ، ئەگینا ئەبێ سەرپەرشتی کەری لە جێی ئەو ئیحرامی بۆ ببەستێ و تەلبیەی لە بری بکات و تەواف و ڕاکردنی نێوان سەفاو مەروەی پێ بکات، وە وەستان لە عەرەفەو ڕەمی لەجێی ئەو بکات.

بەڵام ئەگەر پێش ئەوەی بگاتە عەرەفە باڵغ بوو یا لەعەرەفەدا ئەوە حەجەکەی ئەکەوێتە بریتی حەجی فەرز بۆی، هەروەها کۆیلەش ئەگەر لەو شوێنانەدا ئازاد بکرێت هەر ئەوحوکمەی هەیە.

مالیك و ئیبنومونذیر ووتویانە: ناکەوێتە بریتی حەجی فەرز بۆیان، چونکە کاتێ ئیحرامی بەستووە بە (تطوع) بووەو بۆ حەجی فەرزی نەبەستووە، لەبەرئەوە ئەوە ناگۆڕێ بە فەرز بۆی.

حەج کردنی ئافرەت:

حەج لەسەر ئافرەتیش واجبە هەروەك چۆن لەسەر پیاو واجبە، ئەگەر مەرجەکانی واجب بوونی حەجی تێدا هاتەجێ، وە ئافرەت ئەوەشی زیاترە کە ئەبێ مێرد یا مەحرەمێکی خۆی لەگەڵدا بێت لەو سەفەرەدا.

لە ئیبنوعەبباسەوە خوا لێیان ڕازی بێت هاتوە فەرمویەتی: گوێم لە پێغەمبەر بووە ﷺ فەرمویەتی: (لایَخلُوَنَّ رَجلٌ بِامرَأةٍ إلا وَمَعَهَا ذُو مَحرَمٍ، ولا تُسافِرُ المَرأةُ إلا مَعَ ذِي مَحرَمٍ، فَقَامَ رَجلٌ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ! إنَّ امرَأتِي خَرَجَت حَاجَّةً، وَإنِّي اكتُتِبتُ فِي غَزوَةِ كَذَا وَكَذَا فَقَالَ: إنطَلِق فَحُجَّ مَعَ امرَأتِكَ) رواه البخاري ومسلم، واللفظ لمسلم. واتە: کەس بەتەنها لەگەڵ ئافرەتی بێگانەدا دانەنیشی ئیللا مەگەر مەحرەمی لەگەڵدا بێت، وهیچ ئافرەتێك سەفەر نەکات هەتا مەحرەمی لەگەڵدا نەبێ، پیاوێك لەو لاوە هەڵساو ووتی: ئەی نێرراوی خوا ژنەکەم بەتەنها چووە حەج بکات، منیش ناوم نوسراوە بۆ غەزای فلان و فلان، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بڕۆ لەگەڵ ژنەکەتدا حەج بکە.

لە یەحیای کوڕی عەببادەوە هاتوە ووتوویەتی: ئافرەتێکی خەڵکی ڕەی نامەیەکی نوسی بۆ ئیبراهیمی نەخەعی: کەمن هەتا ئێستا حەجی ئیسلامم نەکردووە وە دەوڵەمەندیشم، بەڵام کەسێکی مەحرەمم نیە: ئەویش بۆی نوسیەوە تۆ لەو کەسانەی کە خوا ڕێی پێ نەداون بچن بۆ حەج.

ئەبوحەنیفە و هاوەڵانی و نەخەعی و حەسەن‌و ثەوری‌و ئەحمەدو ئیسحاق بۆ ئەوە چوون کە ئەوەش مەرجێکە لەمەرجەکانی واجب بوونی حەج لەسەر ئافرەت، وبەکێکە لەوشتانەی کە توانایان پێ دروست ئەبێت.

(حافظ) ووتوویەتی: ئەوەی لای شافیعی بەناوبانگە ئەوەیە کە مەرجە ئافرەت مێرد یا کەسێکی مەحرەم یا کۆمەڵێ ئافرەت کە جێی باوەڕ بن لەگەڵیدا بچن.

لە ڕایەکدا ئەڵێت: ئەگەر ژنێك بێت بەڵام جێی باوەڕ بێت بەسە، وەلە ڕایەکی تردا کە کەرابیسی نەقڵی ئەکات‌و لە کتێبی (المهذب)دا بەصەحیحی داناوە ئەڵێت: ئەگەر ڕێگا ئاسایش و بێ‌ترس بێت ئەتوانێ بەتەنها بچێت بۆ حەج.

ئەمانەش هەموو لە حەج و عەمرەی واجبدان.

لە کتێبی (سبل السلام)دا هاتووە: کۆمەڵێ لە پێشەوایان ووتوویانە: دروستە پیرە ژن بەبێ مەحرەم بچێتە سەفەر.

وە ئەوانەی ڕێیان داوە ئافرەت سەفەر بکات بە بێ مەحرەم یا بێ مێرد -ئەگەر هاوڕێی ئەمینی دەست کەوت، یاڕێگا ئاسایش و بێ ترس بوو- بەڵگەیان ئەوەیە کە بوخاری ئەگێڕێتەوە لە عەدی کوڕی حاتەمەوە کە فەرمویەتی: جارێکیان لە خزمەتی پێغەمبەردا بووم، پیاوێك هاتە لای سکاڵای بوو لەدەست هەژاری، پاشان یەکێکی تر لەدەست دزو جەردەو ڕێگر، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەی عەدی حیرەت بینیوە؟ ئەڵێ: ووتم: نەء، بەڵام باسیان بۆ کردووم فەرمووی: (فَإِن طَالَت بِكَ حَياةٌ لَتَرَيَنَّ الظَّعِينَةَ تَرتَحِلُ مِنَ الحِيرَةِ حَتَّى تَطُوفَ بِالكَعبَةِ، لاتَخَافُ إلا اللهَ). واتە: ئەگەر تەمەنت درێژ بوو کەژاوە ئەبینی لە حیرەوە دێ بۆ مەککە و تەوافی کەعبە ئەکات، لەخوا نەبێ لەهیچ ناترسێ.

هەروەها بەڵگەیان ئەوەیە کە خێزانەکانی پێغەمبەر ﷺ چوونە حەج دوای ئەوەی عومەر ڕێی پێدان لە دووا حەجیدا، وە عوسمانی کوڕی عەففان و (عبدالرحمن)ی کوڕی عەوفی لەگەڵدا ناردن.

عوسمان هاواری ئەکرد: کەس نەچێ بەلایاندا و سەیریان نەکات، لەکاتێکدا کەلەناو کەژاوەدا بوون لەسەر پشتی ووشترەکە بوون.

ئەگەر ئافرەتێك سەرپێچی کردوو چوو بۆ حەج بی ئەوەی مێرد و مەحرەمی لەگەڵدا بێت حەجەکەی دروستە.

لە (سبل السلام)دا هاتووە ئیبنو تەیمیەیە ووتوویەتی: حەجی ئافرەتێك دروستە بێ مەحرەم‌و بێ ئەوەی تواناشی هەبێت.

خولاسە ئەمەیە: ئەگەر کەسێك حەجی لەسەر نەبوو لەبەر نەتوانین وەك نەخۆشیو هەژاری و نەخۆشی‌یەك کە جوڵەی لێ بڕیێ، یا لەبەر ڕێ گیران یا ئافرەتی بێ مەحرەم و ئەو شتانە، ئەگەر زۆریان لەخۆیان کردو حەجیان بەجێ هێنا حەجەکەیان بری ئەکەوێت.

جا لەوانە هەیە چاکی کردووە، وەك کەسێك بەپێ بچێ بۆ حەج، وە هەیانە خراپی کردووە وەك ئەوەی کە بە سواڵ کردن بچێ بۆ حەج، یا ژنێك کە بێ مەحرەم حەج بکات.

وە بۆیەشە حەجەکەیان دروستە چونکە شایستەیی‌یان تەواوە، وە ئەگەر سەرپێچی لە ڕێگادا ڕووی دابێ لەخودی مەبەستەکەدا ڕوی نەداوە.

لە کتێبی (المغني)دا هاتووە: ئەگەر کەسێکی نەتوانا ڕەنجی کێشاو بەبێ خواردەمەنی و وولاغ و شتی سواری ڕۆی بۆ حەج، ئەوە حەجەکەی ڕاست و دروستە.

**ئیزن وەرگرتنی ئافرەت لە مێردەکەی بۆ حەج کردن :**

پەسەندە بۆ ژن کە ئیزن لە مێردەکەی وەربگرێ کاتێ بیەوێ بچێت بۆ حەجی فەرز، جا ئەگەر ڕێی پێدا ئەوە ئەبێ بچێت بەڵام ئەگە ڕێی پێ نەدا ئەبێ هەر بچێت بەبێ ئیزنی مێردەکەی، چونکە بۆ مێرد نیە ڕێی حەجی فەرز بگرێ لە ژنەکەی، چونکە حەج خواپەرستی‌یەکە لەسەری واجب کراوە، بۆ کەس نی‌یە گوێڕایەڵی کەسێك بکات لە سەرپێچی فەرمانی خوادا، وە ئەو ژنە بۆی هەیە پەلە بکات لەحەجەکەی بۆئەوەی لە ئەستۆیدا نەمێنێ وەك چۆن بۆی هەیە کە لەسەرەتای کاتەوە نوێژ بکات و مێردەکەی بۆی نیە ڕێی لێ بگرێ، هەروەها حەجی نەزر کراویش هەر بەو شێوەیە نەبێت، چونکە واجبە لەسەری وەك حەجی فەرز.

بەڵام لە حەجی سوننەتدا بۆی هەیە ڕێی لێ بگرێ، بە پێی ئەوەی (دارقطني) ئەگێڕێتەوە لە ئیبنوعومەرەوە خوا لێیان ڕازی بێت لە پێغەمبەروە ﷺ دەربارەی ژنێك کە مێردی هەبێت و ماڵی هەبێت، بەڵام مێردەکەی ڕێی پێ نادات بۆ حەج، فەرمویەتی: (لَيسَ لَهَا أن تَنطَلِقَ إلا بِإذنِ زَوجِهَا). واتە: بۆی نیە بەفەرمانی مێردەکەی نەبێت دەربچێت.

**کەسێك بمرێت و حەجی لەسەر بێت:**

هەرکەس مردو حەجی فەرز یا حەجی نەزری لەسەر بێت، واجبە لەسەر سەرپەرشتی کەری لەو ماڵەی بەجێی هێشتووە کەسێك ئامادە بکات کە لە جێی ئەوحەج بکات، وەك چۆن ئەگەر قەرزاری کەسێك بێت قەرزەکەی بۆ ئەدرێتەوە.

لە ئیبنوعەبباسەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتوە کە ژنێکی جوهەینەیی هاتە لای پێغەمبەر ﷺ ووتی: دایکم نەزری کرد بچێتە حەج، بەڵام حەجەکەی نەکرد هەتا کۆچی دوایی کرد، ئایا من لە جێی ئەو حەجەکە بکەم؟ فەرموی: (نَعَم حُجِّي عَنهَا. أرَأيتِ لَوكَانَ عَلَى أُمِّكِ دَينٌ أكُنتِ قَاضِيَتَهُ؟ إقضُوا اللهَ، فَاللهُ

أَحَقُّ بِالوَفَاءِ). رواه البخاري. واتە: بەڵێ لە جێی دایکت حەجەکە بکە، ئایا ئەگەر دایکت قەرزێکی لەسەر بوایە بۆت نەئەداوە؟ قەرزی خوا بدەنەوە، چونکە خوا زیاتر شیاوی ئەوەیە قەرزی بدرێتەوە.

ئەم حەدیسە بەڵگەی ئەوەی تێدایە کە واجبە لە جێی مردووەکە حەج بکرێ، جا وەسیەتی کردبێ یان نا، چونکە قەرز بە گشتی هەر ئەبێت بدرێتەوە، وە هەروەها هەموو مافە سامانی‌یەکان وەك کەفارەت یان زەکات یان نەزر.

ئیبنوعەبباس و زەیدی کوڕی ثابت و ئەبو هورەیرە و شافیعی ڕەزای خوایان لێ بێ بۆ ئەوە چوون.

وە لە لای ئەوان ئەبێت کرێی ئەو حەجە لەسەر مایەکەی بدرێ، وە لە ڕواڵەتدا ئەبێ پێش قەرزی خەڵك بخرێ ئەگەر ئەوەی بەجێی هێشتووە بەشی قەرزەکەو حەجەکە بەیەکەوە نەکات، بەپێی فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ کە ئەفەرموێ: (فالله أحق بالوفاء) چونکە خوا لە پێش ترە بە قەرز دانەوە.

مالیك ئەڵێت: تەنها ئەگەر وەسیەتی کردبوو حەجی لە جێ ئەکرێ.

بەڵام ئەگەر وەسیەتی نەکردبوو نابێ حەجی لە بریتی بکرێ، چونکە حەج خواپەرستی‌یەکە لایەنی لاشەیی تێی‌دا زۆرترەو جێ‌نشینی تێدا وەرناگیرێ

وە ئەگەر وەسیەتی کردبوو ئەبێ لە سێ‌یەکی ماڵەکەی ئەو حەجە بکرێ.

حەج کردن لە جێی کەسێکی تر :

هەرکەس حەجی لەسەر واجب بوو توانای حەج کردنی هەبوو لەپاشاندا نەتوان بوو بەهۆی نەخۆشی‌یەوە یا بەهۆی پیری‌یەوە، واجبە لەسەری کەسێك بگرێت لە جێی خۆی حەجەکەی بۆ بکات چونکە خۆی هیوا براوە بەهۆی نەتوانایی‌یەوە، وە وەکو مردووی لێ دێت ئەبێ جێگرێکی بۆ بگیرێ.

وە بە پێی حەدیسەکەی (فضل)ی کوڕی عەبباس کە ژنێکی (خثعمي) ووتی: ئەی نێرراوی خوا، خوا حەجی فەرز کردووە لەسەر بەندەکانی، و باوکیشم پیر بووە ناتوانێ خۆی بەسەر ووڵاغەوە بگرێ، ئایا من لە جێی ئەو حەج بکەم؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بەڵێ، ئەمەش لە کاتی حەجی ماڵ ئاواییدا بووە. (جماعة) گێڕاویانەتەوەو (ترمذي) ووتوویەتی: (حسن صحيح).

هەروەها (ترمذي) ئەڵێت: لەم بارەیەوە چەند فەرموودەیەکی صەحیح هاتووە، وە زانایانی صەحابەش هەر لەسەر ئەوە کاریان کردووەو ڕایان وا بووە کە حەج لە جێی مردو ئەکرێت.

(ثوري) و ئیبنوموبارەك و شافیعی و ئەحمەد و ئیسحاقیش هەر ڕایان وەهایە.

مالیك ووتوویەتی: ئەگەر ئەو کەسە وەسیەتی کردبوو کە کەسێك لە جێی خۆی حەج بکات ئەوە حەجی لەجێ ئەکری.

وە هەندێ لە زانایان ڕێ یان داوە کەلە جێی زیندووش حەج بکرێ ئەگەر ئەوکەسە ئەوەندە پیر بوو نەیتوانی بەهیچ شێوەیەك حەج بکات، ئەوەش ڕای شافیعی و ئیبنومویارەکە[1].

وە حەدیسەکە ئەبێتە بەڵگەی ئەوەی کە ئافرەت ئەتوانێ لەجێی پیاوو ژن حەج بکات، هەروەها پیاویش ئەتوانی لە جێی ئافرەت و پیاو حەج بکات. دەقێکی وەهاش نەهاتووە پێچەوانەی ئەوە بێت.

**ئەگەر پەك کەوتە چاك بووەوە:**

ئەگەر نەخۆش لەدوای ئەوەی حەجەکەی لە جێی کرا چاك بووەوە، ئەوە فەرزەکەی لە کۆڵ ئەکەوێت و لەسەری نیە دوبارەی بکاتەوە، بۆ ئەوەی نەبێتە هۆی واجب بوونی دوو حەج، ئەمەش بۆچونی ئەحمەدە.

جومهوری زانایان ئەڵێن: حەجەکەی لەکۆڵ ناکەوێت، چونکە دەرکەوت کە ئەو لێی هیوا بڕاو نەبوون وە ئیعتیباریش بەسەرئجام و کۆتاییەکە ئەکرێ.

ئیبنوحەزم ڕای یەکەم تەرجیح ئەدا و ئەڵێ: کاتێك پێغەمبەر ﷺ فەرمانی دا بە حەج کردن لەبری ئەوکەسەی کە ناتوانێ حەج بکات نە بەسواری و نە بە پیادەیی، وە ڕای گەیاند کە قەرزی خوا لەجێی کەسێکی تر ئەدرێتەوە، بێگومان ئەوکەسە قەرزەکەی داوەتەوەو بری کەوتووە.

وە بێگومان ئەگەر شتێك لە کۆڵ کەوت و دروست بوو، ئیتر دروست نیە دوبارە بکرێتەوە بەدەقێك نەبێت لە قورئان و حەدیس، وە لێرەدا ئەسڵەن هیچ دەقێك نیە بۆ دوبارە کردنەوە.

ئەگەر دووبارە بکرایەوە پێغەمبەر ﷺ ڕوونی ئەکردەوە، چونکە جاری وا ئەبێت پیرێکی پەك کەوتە توانا پەیا ئەکاتەوەو ئەتوانێ سواری وولاغ ببێت.

جا مادام پێغەمبەر ﷺ ئەوەی ڕا نەگەیاندبێ دروست نیە ئەو فەرزە دووبارە بکاتەوە دوای ئەوەی کە بە دروستی بەجێ هاتووە.

**مەرجەکانی حەج کردن لە جێی کەسانی تر:**

مەرجە ئەو کەسە کە لە جێی کەسێکی تر حەج ئەکات لەپێشەوە بۆ خۆی حەجی کردبێ.

بە پێی ئەوەی ئیبنو عەبباس خوا لێیان ڕازی بێت ئەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ گوێی لێ بوو پیاوێك ئەی ووت: (لبیك عن شبرمة) فەرمووی: (أَحَجَجتَ عَن نَفسِكَ؟ قَالَ: لا. قَالَ: فَحُجَّ عَن نَفسِكَ، ثُمَّ حُجَّ عَن شِبرِمَةَ) رواه أبو داود، و ابن ماجة. واتە: پیاوێك ئەی ووت: (لبیك) لە جێی (شبرمە)، پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: بۆ خۆت حەجت کردووە، کابرا ووتی: نە، فەرمووی: جارێ بۆ خۆت حەج بکە پاشان لە جێی (شبرمە) حەج بکە.

---

(١) وە هەروەها قەولی ئەحمەدو ئەحنەفە.

بەیهەقی ووتوویەتی: ئەم فەرموودەیە ئیسنادەکەی صەحیحە، لەو بارەیەوە لەم فەرموودەیە صەحیح تر نىیە.

ئیبنوتەیمیەیە ووتوویەتی: ئەحمەد —لەو ریوایەتەدا کە صالحی کوڕی لەوەوە هێناویەتی- حوکمی داوە کە مەرفوعە، وە ئەگەر مەوقوفیش بێت ئیبنوعەبباس لەمەدا موخالیفی نىیە.

ئەمەش ڕای بەشی زۆری زانایانە: کە دروست نىیە کەسێك لە جێی کەسێکی تر حەج بکات کە خۆی بۆ خۆی حەجی نەکردبێ بەرەهایی، چ توانای هەبێ یان نا، چونکە وازهێنان لە شیکردنەوەو جیاکردنەوەی ئەحوالی ئەوکەسانە ئەوە ئەگەیەنێت کە حوکمێکی گشتىیە.

**کەسێك حەجی نەزر بکات و حەجی فەرزی لەسەر بێت:**

ئیبنوعەبباس و عیکرمە فتوایان داوە کە ئەگەر کەسێك حەج بکات لە بەر ئەوەی نەزری کردووە، بەڵام حەجی فەرزی نەکردبوو ئەوە هەردوو حەجەکەی لە کۆڵ ئەکەوێ.

بەڵام ئیبنو عومەرو (عطاء) فتوایان داوە؛ ئەبێ لە پێشەوە حەجە فەرزەکە بکات، ئینجا نەزرەکە.

**(صرورة) لە ئیسلامدا نىیە:**

لە ئیبنوعەبباسەوە خوا لىیان ڕازی بێت هاتوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی‌ەتی: (لا صرورة في الإسلام)

واتە: خۆ دابڕین نیە لە ئیسلامدا.

(خطابي) ووتوویەتی: (صرورة) بەدوو شێوە لێك ئەدرێتەوە.

یەکەم: (صرورة) بەو پیاوە ئەوترێ خۆی دابڕێ لە ژن هێنان و گۆشە نشین بێت لە سەر ڕێچکەی ڕەهبانىیەتی گاورەکان.

دووەم: (صرورة) بەو پیاوە ئەوترێ کە هەرگیز حەجی نەکردبێ.

لەسەر ئەو شێوەیە واتای فەرموودەکە وا ئەوبەخشێ کە: سوننەتی ئاین وەهایە کە نابێ کەس بمێنێ توانای حەجی هەبێ‌و حەج نەکات، کەواتە (صرورة) لە ئیسلامدا نىیە.

وە هەندێ کردویانەتە بەڵگەو ئەڵێن: (صرورة) ئەوەیە کە دروست نىیە کەس لە جێی کەس حەج بکات. وە مانای ئەو قسەیە بەو شێوەیە دائەنرێ لایان کە (صرورة) کاتێ دەستی کرد بە حەج کردن لە جێی کەسێکی تر ئەوە بری حەجی خۆی ئەکەوێت، وە ئەگەرێتەوەو بری فەرزی خۆی ئەکەوێت تا مانای نەفی تیا بەدی بێت، کەواتە بەو شێوەیەش (صرورة) نىیە.

ئەمەش بۆچونی ئەوزاعی و شافیعی و ئەحمەد و ئیسحاقە.

مالیك‌و ثەوری ووتوویانە: حەجەکەی بە پێی نیێتەکەی ئەبێت. وە خاوەنانی ڕەئیش بۆ ئەوە چوون.

وە هەر ئەوەش لە حەسەنی بەصری و (عطاء) و نەخەعىیەوە ئەگێڕنەوە.

**قەرز کردن بۆ حەج:**

لە عەبدوڵڵای کوڕی ئەبی ئەوفاوە هاتوە کە فەرمویەتی: پرسیم لە پێغەمبەر ﷺ ئەگەر پیاوێك حەجی نەکردبوو، ئایا قەرز بکات و بچێت بۆ حەج؟ فەرمووی: (نەء). بەیهەقی گێڕاویەتی‌یەوە.

**حەج کردن لە ماڵی حەرام :**

حەج بری ئەکەوێت هەرچەندە لەماڵی حەرامیش بێت، بەڵام ئەو کەسە گوناهبار ئەبێت لای بەشی زۆری زانایان.

ئیمامی ئەحمەد وتوویەتی: بری ناکەوێ، ئەمەش ڕاست ترینە بە پێی ئەوەی لە فەرموودەی پێغەمبەردا ﷺ هاتووە کە فەرمویەتی: (إنَّ اللهَ طَيِّبٌ لايَقبَلُ إلا طَيِّباً). واتە: خوا پاكوخاوێنە و شتێك پوخت و خاوێن نەبێت وەری ناگرێ.

لە ئەبو هورەیرەوە ئەگێڕنەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (إذَا خَرَجَ الحَاجُّ حَاجاً بِنفَقَةٍ طَيِّبَةٍ، وَوَضَعَ رِجلَهُ فِي الغَرزِ فَنَادَى: لَبَّيكَ اللَّهُمَّ لَبَّيكَ، نَادَاهُ مُنَادٍ مِنَ السَّمَاءِ: لَبَّيكَ وَسَعدَيكَ زَادُكَ حَلالٌ، وَرَاحِلَتُكَ حَلالٌ، وَحَجُّكَ مَبرُورٌ غَيرُ مَأزُورٍ، وَإذَا خَرَجَ بِالنَّفَقَةِ الخَبِيثَةِ فَوَضَعَ رِجلَهُ فِي الغَرزِ، فَنَادَى : لَبَّيكَ، نَادَاهُ مُنَادٍ مِنَ السَّمَاءِ: لالَبَّيكَ وَلا سَعدَيكَ، زَادُكَ حَرَامٌ وَنَفَقَتُكَ حَرَامٌ، وَحَجُّكَ مَأزُورٌ غَيرُ مَأجُورٍ). واتە: کاتێك کەسێك بەنیازی حەجەوە بچێتە دەرەوە بەماڵێکی حەڵاڵەوە قاچی نایە ناو ئاوزەنگەوەو هاواری کرد: (لبيك اللهم لبيك) -واتە: خوایە بەدەنگ بانگەوازەکەی تۆوە هاتووم- لە ئاسمانەوە هاواری لێ ئەکرێ: (لبيك وسعديك) خواردنەکەت حەڵاڵەو وولاغەکەت حەڵاڵەو حەجەکەشت وەرگیراوەو بێ‌گوناهە، بەڵام ئەگەر کەسێك بەماڵێکی پیس و حەرامەوە بچێت بۆ حەج کاتێ قاچی ئەخاتە ئاوزەنگ‌و ئەڵێت: (لبيك) لە ئاسمانەوە بانگ ئەکرێ: (لا لبيك ولاسعديك) خواردنەکەت حەرامەو وولاغەکەت حەرامەو حەجەکەشت وەرنەگیراوەو پڕتاوانەو بێ‌پاداشت.

(منذري) ئەڵێت: ئەم فەرموودەیە (طبراني) لە (الأوسط)دا گێڕاویەتی‌یەوە، وە ئەصبەهانی لە حەدیسی ئەسلەمەوە بە مورسەلی‌و بە کورتی گێڕاویەتی‌یەوە. (ئەسلەمیش خزمەتکاری عومەری کوڕی خطاب بووە).

**کامیان چاکترە لە حەجدا بەسواری یان بە پیادەیی:**

(حافظ) لە (فتح)دا ئەڵێت: (ابن منذر) ووتوویەتی: بۆچوونەکان جیاوازن لەوەدا کە کامیان چاکترە بۆ حاجی بە سواری یا بە پیادەیی؟

جومهوری زانایان ووتویانە: بەسواری چاکترە، چونکە پێغەمبەر ﷺ بەسواری حەجی کردووە، وە لەبەر ئەوەی زیاتر یارمەتی دەرە بۆ دوعا کردن‌و پاڕانەوە، وە لەبەر ئەوەی لە سواری‌یا سودی تێدایە.

ئیسحاقی کوڕی راهەوەیە وتوویەتی: بە پیادەیی چاکترە، چونکە ئەو کەسە زیاتر ماندوو ئەبێت.

لەوانەشە بووترێ: ئەوە بە پێی حاڵەت‌و نەفەرەکان ئەگۆڕێ.

بوخاری لە ئەنەسەوە خوا لێی ڕازی بێت ئەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ پیرێکی بینی دوو کوڕەکەی چوو بوونە بن باڵی فەرمووی: (مَا بَالُ هَذَا؟ قَالُوا نَذَرَ أن يَمشِيَ، قَالَ إنَّ اللهَ عَزَّوَجَل عَن تعذِيبِ هَذَا نَفسَهُ لَغَنِيٌّ، وَأَمَرَهُ أن يَركَبَ). واتە: ئەوە چی‌یەتی؟ ووتیان: نەزری کردووە بەپێ بڕوات، فەرمووی: خوای گەورە پێ ویستی بەوە نی‌یە کە ئەو ئازاری گیانی خۆی بدات، لەپاشاندا فەرمانی پێدا سواری وولاغێك بێت.

**کاسبی کردن و کرێ وەرگرتن لە حەج:**

قەیناکە حاجی بازرگانی بکات و بەکرێ ئیش بکات و کاسپی بکات لەو کاتانەدا کە کردەوەکانی حەج و عومرە بەجێ ئەهێنێ.

ئیبنوعەبباس فەرمویەتی: خەڵك لە سەرەتای ئیسلامەوە کە حەجیان ئەکرد کڕین‌و فرۆشتنیان ئەکرد لە میناو لە عەرەفە، وە لە بازاڕی (ذي المجاز) و لە کاتی حەج دا، جا ترسان لەوەی کە بە ئیحرامەوە کڕین‌و فرۆشتن بکەن. ئیتر خوای گەورە ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە: ﴿لَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَن تَبْتَغُواْ فَضْلًا مِّن رَّبِّكُمْ﴾ (البقرة/١٩٨) رواه البخاري، ومسلم، والنسائي. واتە: تاوان نیە لەسەرتان هەوڵی پەیداکردنی ڕۆزی بدەن لە لایەن پەروەردگارتانەوە بە هۆی قازانجی بازرگانی.

هەروەها فەرمویەتی: ئەم ئایەتە کە هاتە خوارەوە لەپێشەوە حەڵك کاری بازرگانیان نەئەکرد لە مینا، پاشان فەرمانیان پێ درا کە کاتی هاتنە خوارەوەیان لە عەرەفات کاری بازرگانی بکەن. ئەبو داوود گێڕاویەتیەوە.

ئەبوئومامەی تەیمی‌یەوە هاتوە کە بە ئیبنو عومەری ووتوە: من وولاغم هەیە ئەیدەم بەکرێ بۆ کاتی حەج، کەچی هەندێك ئەڵێن: حەجەکەت دروست نیە، ئیبنو عومەر فەرمووی: ئەی تۆ ئیحرام نابەستی‌و تەلبی‌یە ناکەیت و بەدەوری کەعبەدا ناسوڕێیتەوەو لە عەرەفات نایەیتە خوارەوەو ڕەمی جەمەرات ناکەیت؟ ئەڵێ: ووتم : با، فەرمووی: کەواتە حەجت بۆ هەیە، چونکە پیاوێك هاتە لای پێغەمبەر ﷺ ئەو پرسیارەی لێ کرد کە تۆ لێت کردم ئەویش لێی بێ دەنگ بوو هەتا ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە: ﴿لَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَن تَبْتَغُواْ فَضْلًا مِّن رَّبِّكُمْ﴾ (البقرة/١٩٨). جا پێغەمبەر ﷺ ناردی بەدوای کابراداو ئەو ئایەتەی بۆ خوێندەوەو فەرمووی: (حەجەکەت بۆ هەیە). ئەبو داودو سەعیدی کوڕی مەنصور گێڕاویانەتەوە. (حافظ منذري) ووتوویەتی: (ئەبو ئومامە نەناسراوەو ناوی نازانرێ).

لە ئیبنو عەبباسەوە خوا لێیان ڕازی بێت هاتوە کە پیاوێك پرسیاری لێ کرد کە بەکرێ لەگەڵ ئەمانەدا دێم و کارەکانی حەجیشیان لەگەڵدا ئەکەم ئایا پاداشتم بۆ هەیە؟ ئیبنو عەبباس ووتی: بەڵێ:

﴿أُوْلَـٰٓئِكَ لَهُمۡ نَصِيبٞ مِّمَّا كَسَبُواْۚ وَٱللَّهُ سَرِيعُ ٱلۡحِسَابِ﴾ (البقرة/٢٠٢). واتە: ئەوانەی ـ کە ئەو دوعایەیان کردوە ـ پاداشتی گەورەیان بۆ هەیە، بە هۆی ئەو کردەوە چاکانەوە کە کردویانە. وە خوا حیسابی خێرایە.

## حەجەکەی پێغەمبەر ﷺ

موسلیم ئەگێڕێتەوە ئەڵێ: ئەبی بەکری کوڕێ ئەبی شەیبە و ئیسحاقی کوڕی ئیبراهیم بۆیان گێڕامەوە، هەروەها لە (حاتم)ەوە، کە ئەبوبەکر ووتوویەتی: حاتەمی کوڕی ئیسماعیلی مەدەنی لە جەعفەری کوڕی موحەممەدەوە لە باوکییەوە بۆی گێڕامەوە کە ووتویەتی: چووین بۆ لای جابیری کوڕی عەبدوڵلا خوا لێی ڕازی بێت، لە یەك یەکی ئەو کۆمەڵەی پرسی، هەتا گەیشتە من ووتم: من موحەممەدی کوڕی عەلی کوڕی حوسەینم، دەستی هێنا بەسەرمداو قۆپچەی سەرەوەی کراسەکەمی ترازاند، پاشان قۆپچەکەی خوارەوە، پاشان دەستی خستە سەر سنگم، نێوان دو مەمکم، وە ئەو کاتە من لاوێکی تازە پێگەیشتوو بووم، ووتی: مەرحەبات لێ بێت برازا، بە ئارەزووی خۆت پرسیار بکە؟

منیش پرسیارم لێ کرد - ئەوکاتە ئەو کوێر ببو- لەو کاتەدا بانگی دا، هەڵسا شاڵێکی لە خۆیەوە پێچابوو، کە ئەی دا بەشانیدا لەبەر تەسکی ئەچۆوە شوێنی خۆی، وە کراسەکەشی لەولاوە هەڵواسی بوو بەسێ پایەیەکدا، جا نوێژی بۆ کردین لەپاشاندا ووتم: حەجەکەی پێغەمبەرم ﷺ بۆ بگێڕەرەوە دەستی بەرز کردەوە هەتا نۆی ژمارد- لەپاشاندا ووتی: پێغەمبەر ﷺ نۆ ساڵ لەمەدینە مایەوە بێ ئەوەی حەج بکات.

لە دەیەم ساڵیدا بانگەوازی دا بەناو خەڵکیدا کە پێغەمبەر ﷺ ئەچێ بۆ حەج، جا خەڵکێکی زۆر هاتنە مەدینە هەموو بەهیوای ئەوەی کە لەگەڵ پێغەمبەردا بچن و ئەو چی ئەکات ئەوانیش بیکەن.

پاشان بۆ حەج چوینە دەر لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ هەتا گەیشتینە (ذو الحليفة)، لەوێ ئەسمائی کچی عومەیس موحەممەدی کوڕی ئەبیبەکری بوو، ناردی بۆ لای پێغەمبەر ﷺ کە چی بکات؟ ئەویش فەرمووی (إغتَسِلِي وَاستَثفِرِي بِثوبٍ وأحرِمِي). واتە: خۆت بشۆو پەڕۆیەك هەڵگرەو کراسێك بۆ ئیحرام لەبەر بکە.

جا پێغەمبەر ﷺ لەو مزگەوتەدا نوێژی کردوو سواری ووشترەکەی بوو کە ناوی (القصواء) بوو، کاتێ ووشتر ڕاست بووەوە سەیرم کرد بەهەر چوار دەوریا هەتا چاو بڕکات زەلام بوو لە سوارەو پیادە.

پێغەمبەریش ﷺ لەناوماندا بوو قورئانی بۆ ئەهاتە خوارەوە، وە ئەو واتاکەی ئەزانی، ئیتر هەرچی کردەوەی بەو قورئانە بکردایە ئێمەش کردەوەمان پێ ئەکرد.

پاشان پێغەمبەر ﷺ بە دەنگی بەرز تەوحیدی دەست پێ کردو فەرمووی: (لَبَّيكَ اللَّهُمَّ لَبَّيك، لَبَّيكَ لاشَرِيكَ لَكَ لَبَّيك، إنَّ الحَمدَ وَالنِّعمَةَ لَكَ وَالمُلك، لاشَرِيكَ لَكَ). خەڵکەکەش بەو شێوەیە تەلبیەیان ئەکردو پێغەمبەر ﷺ هیچی ڕەد نەئەکردەوە لە تەلبیەکەی ئەوان، ئیتر پێغەمبەر ﷺ خەریکی تەلبیەکەی خۆی بوو.

جابیر خوا لێی ڕازی بێت فەرموی: لە حەج بەولاوە نیەتی هیچی ترمان نەهێنا و نەمان ئەزانی عومرە چییە، هەتا گەیشتینە خانەی خوا (كعبة) لەگەڵیا، دەستی بەسەر ڕوکنی یەمانیدا هێنا، جا سێ دەور لۆقەی کردوو چواریش بە ڕۆیشتن، لە پاشاندا چووە مەقامی ئیبراهیم (عليه السلام) ئەمەی خوێندەوە: ﴿وَٱتَّخِذُواْ مِن مَّقَامِ إِبۡرَٰهِـۧمَ مُصَلًّىۖ﴾ (البقرة/١٢٥). واتە: مەقامەکەی ئیبراهیم بکەنە نوێژگە.

مەقامەکەی خستە نێوان خۆی و کەعبەوە. دوورکات نوێژی کرد لە ڕکاتێکیاندا ﴿قُلۡ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ﴾ ی خوێندو لەوی تریاندا ﴿قُلۡ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلۡكَٰفِرُونَ﴾. پاشان گەڕایەوە بۆلای ڕوکن و دەستی بەسەردا هێنایەوە، لەپاشاندا لە دەرگاکەوە هاتە دەرەوەو چوو بەرەو صەفا.

کاتێ لە صەفا نزیك بووەوە ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿إِنَّ ٱلصَّفَا وَٱلۡمَرۡوَةَ مِن شَعَآئِرِ ٱللَّهِۖ﴾ (البقرة/١٥٨) ـ صەفاو مەروە لە دروشمەکانی خوایە ـ فەرمووی: خوا بە چی دەستی پێ کردووە منیش بەوە دەستی پێ ئەکەم.

ئیتر لە صەفاوە دەستی پێکرد چووە سەر صەفا هەتا کەعبەی لێوە دەرکەوت، جا ڕووی کردە قیبلە (لا إله إلا الله) و (الله اكبر)ی کردو فەرمووی: (لا إِلَهَ إلا اللهُ وَحدَهُ لاشَرِيكَ لَهُ، لَهُ المُلكُ وَلَهُ الحَمدُ، وَهُوَ على كُلِّ شَيءٍ قَدِير، لا إله إلا اللهُ وَحدَهُ، أنجَزَ وَعدَهُ، وَنَصَرَ عَبدَهُ، وَهَزَمَ الأحزَابَ وَحدَهُ). واتە: هیچ پەرستراوێکی بەحەق نییە کە شایستەی پەرستن بێت جگە لە (الله) کە هاوبەشی نیە، خاوەنی هەموو شتە، سوپاس و ستایش هەر بۆ ئەوە، وە بەسەر هەموو شتێکدا توانای هەیە، هیچ پەرستراوێك نییە بە حەق شایستەی پەرستن بێت جگە لە الله ی تاك و تەنها، ئەو خوایەی کە پەیمانەکەی بەجێ هێنا، وبەندەکەی سەرخست و هەر خۆی حیزبەکانی تێك شکاند.

پاشان لەنێوان ئەوانەدا لەخوا پاڕایەوە — سێ جار ئەوەی دووبارە کردەوە، پاشان چووە خوارەوە بۆ مەروە، هەتا پێی توند کرد لە سکی شیوەکە پەلەی کرد بە ڕۆیشتن، و ڕۆیشت هەتا چوینە سەرەوە، تا گەیشتە مەروە لە سەر صەفا چی کرد لەسەر مەروەش وەهای کردەوە، تاوەکو لەدوا تەوافیدا لەسەر مەروە فەرمووی: (لَو أنِّي استَقبَلتُ مِن أمرِي مَااستَدبَرتُ لَم أسُقِ الهَديَ، وَجَعَلتُهَا عُمرَةً، فَمَن كَانَ مِنكُم لَيسَ

مَعَهُ هَديٌ فَلِيَحِلَّ، وَلِيَجعَلهَا عُمرَةً). واتە: ئەگەر ئەوەی ئێستە ئەمزانی ئەو سا بمزانیبایە ئەم هەدیانەم ـ وشترو قوربانی‌یانەم ـ لەگەڵ خۆمدا نەئەهێناو ئەمکرد بە عومرە، جا هەرکەس هەدیی پێ نی‌یە با ئیحرام بشکێنێ و بیکات بە عومرە.

سوراقەی کوڕی مالیکی کوڕی جوعشوم هەڵساو ووتی: ئەی نێرراوی خوا ئەمە بۆ هەموو ساڵێکە، یان هەر ئەمساڵ وەها ئەبێت، پێغەمبەر ﷺ پەنجەکانی یەك یەك خستە ناو یەکو فەرمووی: (دَخَلَتِ العُمرَةُ فِي الحَجِّ مَرَّتَينِ، لا بَل لأَبَدِ أَبَد). واتە: بەشێوەی پەنجەکانم عەمرە چووە ناو حەجەوە، دوجار، بۆ هەتا هەتایە.

لەوکاتانەدا عەلی لەیەمەنەوە هاتەوە بەووشترە هەدی‌یەکانەوە کە بۆ پێغەمبەری هێنا بوو ﷺ سەیری کرد (فاطمە) لەو کۆمەڵەیە کە ئیحرامیان شکاندووەو خۆیان کردۆتەوە و کراسێکی ڕەنگاو ڕەنگی لەبەر کردووە و چاوی ڕشتووە، عەلی نەهی لەو کارەی کردو بە هەڵەی دانا. ئەویش فەرمووی: باوکم فەرمانی پێداوم وەها بکەم.

جابیر ئەفەرموێت: عەلی لە عێراق ئەی فەرمو: ئەو کاتە چووم بۆ لای پێغەمبەر ﷺ بۆ ئەوەی کارێك بکەم کە پێغەمبەر ﷺ (فاطمة) سەرزەنشت بکات لەسەر ئەو کردەوەیە، وە بۆ ئەوەی پرسیاری لێ بکەم لەبارەی ئەوەی کە (فاطمة) لە پێغەمبەرەوە باسی ئەکات و ئەوە کە من ئینکاریم لێ کردووە، فەرمووی: ڕاست ئەکات ڕاست ئەکات. تۆ چیت ووت کاتێ حەجت لەسەر خۆت فەرز کرد؟

ئەفەرموێ: ووتم: خوایە پێغەمبەرکەت ﷺ چۆن تەلبی‌یە ئەڵێت منیش بەو شێوەیە تەلبی‌یە ئەڵێم، پێغەمبەر فەرمووی: ئێمە هەدیمان پێ‌یەو ئیحرام ناشکێنین.

جابر ئەفەرموێ: ئەو هەدیانەی عەلی لەیەمەنەوە هێنابووی و ئەوانەی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ خۆیدا هێنا بووی هەمووی سەد ووشتر بوون.

ئەفەرموێ: خەڵکەکە هەموویان خۆیان کردەوەو قژیان کورت کردەوە، ئیللا پێغەمبەر ﷺ و ئەوانەی کە هەدی‌یان پێ بوو.

کاتێ ڕۆژی هەشتەم هات کە پێی ئەڵێن (یوم الترویة) بەرەو مینا ڕۆیشتن و بەحەج دەنگیان بەرز کردەوە (واتە: ووتیان: لبیك اللهم حجة)، وە پێغەمبەر ﷺ سوار بوو، ئەمجار نوێژی نیوەڕۆو عەسرو ئێوارەو خەوتنان و بەیانی لە مینا کرد.

لە پاشاندا کەمێك مایەوە هەتا ڕۆژ دەرکەوت، جا فەرمانی‌دا چادرێکی لە موو دروستکراویان بۆ هەڵدا لە (نمرة).

لەپاشاندا پێغەمبەر ﷺ بەرەو (مشعر الحرام)[1] ڕۆیشت وەك چۆن قورەیش لەسەردەمی نەفامیدا ئەچوون بۆ (مشعر الحرام) و قورەیش گومانیان وابوو کە پێغەمبەر ﷺ لەوێ ئەوەستێ و تێناپەڕێ وەك چۆن ئەوان تێ نە ئەپەڕین لەسەردەمی نەفامیدا.

بەڵام پێغەمبەر ﷺ لە (مزدلفة) تێ پەڕی هەتا گەیشتە عەرەفە سەیری کرد دەوارێکی بۆ هەڵدرابوو لە (نمرة)، جا دابەزی چووە ناوی هەتا ڕۆژ لە ناوەڕاستی ئاسمان لای دا، فەرمانی دا (قصواء)یان بۆ ئامادە کرد، جا ڕۆیشت هەتا گەیشتە ناو دۆڵی عەرەفە، لەوێ ووتارێکی بۆ خەڵك خوێندەوە و فەرمووی:

خوێن و سامانتان لە سەر یەك حەرامە وەك حەرامی ئەم ڕۆژەتان لەم مانگەتانداو لەم شارەتاندا، ئاگاداربن هەموو شتێك لە کاروباری سەردەمی نەفامی لە ژێر پێمدایەو پوچەڵ بۆتەوە، وە ئەو خوێنانەی لە سەردەمی نەزانی‌دا ڕژاوە پوچەڵ بۆتەوە، یەکەم خوێنیش کە من لای ئەبەم لە ئێمەیە، ئەویش خوێنی ئیبنورەبیعەی کوڕی حاریسە- کە درابو بە دایەن لە بەنی سەعد، جا هۆزی (هذیل) کوشتیان- وە (ربا) سوی سەردەمی نەفامی پوچەڵ کرایەوە، وە یەکەم (ربا) سوو کە پوچەڵی ئەکەمەوە سووی خۆمانە سووی عەبباسی کوڕی (عبد المطلب)ە، ئەویش پوچەڵە هەمووی، وە لە خوا بترسن لە ئاستی ئافرەتاندا، چونکە ئێوە بە پەیمانی خوا هێناوتانن، وە بە ووشەی خوا حەڵاڵتان کردون.

حەقی ئێوە لەسەر ئەوان ئەوەیە کە نەیەڵن کەسێك ئێوە خۆشتان نەوێت بێتە ماڵتان، جا ئەگەر ئەوەیان کرد ئێوە لێیان بدەن بە لێدانێك کە زیانیان پێ نەگەیەنێت، وە مافی ئەوانیش لە سەر ئێوە ئەوەیە کە بیان ژێنن و جلو بەرگیان بۆ بکەن بە گوێرەی عورف و عادەت، وە من لەناوتاندا شتێکم بەجێ هێشتوە کە دوای ئەوە گومڕا نابن، بەمەرجێ دەستی پێوە بگرن و لەسەری بڕۆن، ئەویش: کتێبەکەی خوایە، وە ئێوەش دەربارەی من پرسیارتان لێ ئەکرێ، جا ئێوە چی ئەڵێن؟ ووتیان: شایەتی ئەدەین کەتۆ کتێبەکەی خوات گەیاندووە و بەجێت هێناوەو ئامۆژگاری خەڵکت کردووە، جا بە پەنجەی شەهادە ئیشارەی ئەکرد: بەرزی ئەکردەوە بۆ ئاسمان‌و دای‌ئەنەوانەوە بۆ لای خەڵکەکەو ئەی‌فەرموو: خوایە تۆ شایەت بە، خوایە تۆ شایەت بە، سێ جار.

پاشان بانگ درا، ئەمجار قامەت کراو نوێژی نیوەڕی کرد، دووای ئەوە قامەت کرایەوەو نوێژی عەسری کرد، ئیتر نوێژی نەکرد لەنێوانیاندا[2].

(١) (مشعر الحرام) کێوێکە لە (مزدلفة) پێی ئەوترێ (قزح)، وە ووتراویشە کە (مشعر الحرام) بریتی‌یە لە هەموو (مزدلفة).

(٢) لەمەدا بەڵگەی ئەوە هەیە کە کۆ کردنەوەی نوێژی نیوەڕۆو عەسر لەوشوێنەداو لەو ڕۆژەدا مەشروعە، وە ئومەت ئیجماعی هەیە لەسەر ئەوە، بەڵام جیاوازن لەسەر ئەوەی کە هۆی ئەو کۆکردنەوەیە چی‌یە؟: ووتراوە: بەهۆی

لەپاشاندا پێغەمبەر ﷺ سوار بووەوە، هەتا گەیشتە شوێنی وەستان، جا سکی ووشترەکەی برد بۆلای بەردەکانەوە، وە خەلکەکە هەموو لە بەردەمیا بوون و ڕووی کردبووە قیبلە، ئیتر هەر وەستا هەتا زەردە نەماو ڕۆژ ئاوا بوو؛ وە ئوسامەی خستە دوای خۆیەوە.

لەپاشاندا ڕۆیشت ﷺ لغاوی قەصوائی ئەوەندە توند کردبوو هەتا سەری ئەیدا لە ئاستی ناوەڕاستی پێشەوەی کۆپانەکەی[1]، وە بە دەستی ڕاستی ئیشارەتی ئەکردوو ئەی فەرموو: (خەلکینە لەسەر خۆ بن، خەلکینە لەسەر خۆ بن).

کە ئەگەیشتە کێوێك لە کێوەکان دەستی بۆ شل ئەکردەوە هەتا سەرئەکەوت، هەتا گەیشتە موزدەلیفە، لەوێ نوێژی ئێوارەو خەوتنانی کرد بەیەك بانگ و دوو قامەت، وە لەنێوانیاندا هیچ تەسبیحێکی نەکرد.

لە پاشاندا پێغەمبەر ﷺ ڕاکشا هەتا بەرەبەیان، کاتێ بەیانی بۆ ڕوون بۆوە، نوێژی بەیانی کرد بە بانگێك و قامەتێك.

لە پاشاندا سواری قەصوا بووەوە هەتا گەیشتە (المشعر الحرام) ڕووی کردە قیبلەو پاڕایەوەو (الله أکبر)ی کردو (لا إله إلا الله)ی کردوو هەر بە پێوە مایەوە هەتا دونیا تەواو ڕووناك بووەوە، ئینجا کەوتە ڕێ، پێش ئەوەی ڕۆژ هەلبێ.

فەزلی کوڕی عەبباسی خستە پاشکۆی، جا فەزلّ پیاوێکی جوانو ڕێکوپێك و سپی پێست بوو، کاتێ پێغەمبەر ﷺ ئەڕۆیشت ئافرەتێك بەسواری کەژاوەیەکەوە لای دا تێ پەڕیو فەزلیش سەیری ئەکرد، پێغەمبەر ﷺ بەدەستی ڕووی فەزلی وەرگێڕا لە سەیر کردن، فەزلیش لەولای پێغەمبەرەوە ﷺ سەری دەرئەهێناو سەیری ئەکرد، بەوشێوەیە لەم لایەوە لای ئەبرد لەو لایەوە سەیری ئەکرد، هەتا گەیشتە دۆلی (محسر) ئەختێ پەلەی کرد لەپاشاندا لە ڕێگەی (وسط) ناوەندەوە ڕۆیشت کەلە (جمرة الکبری) وە کۆتایی ئەهات، هەتا گەیشتە جەمرەکەی لای درەختەکە، جا حەوت بەردی تێ گرت (الله أکبر)ی ئەکرد لەگەلّ هەربەردێکدا، وبەردەکان وەك چەوی وورد وەهابوون، لەناو سکی کێوەکەوە بەردەکانی تێ ئەگرت[2].

لە پاشاندا چوو بۆ شوێنی ئاژەلّ سەر بڕینەکە و بەدەستی خۆی شەستوسێ ووشتری سەر بڕی، ئەوەی مابۆوە دای بە عەلی سەری بڕین، وەلە قوربانی‌یەکانی‌دا کردی بەشەریك، ئینجا فەرمانی دا هەموویانیان

---

خواپەرستی (نسك)ەوەیە (واتە: عیبادەتێکە)، ئەمەش بۆچوونی ئەبوحەنیفەو هەندێك لە هاوڕێیانی شافیعی‌یە. وە بەشی زۆری هاوڕێیانی شافیعیش ئەلێن: بەهۆی سەفەرەوەیە.

(۱) ئەو شوێنەی کە سوار قاچی ئەنوشتێتەوە لەسەری.

(۲) مەبەستی ئەوەیە مینا و عەرەفات و موزدەلیفە کەوتبوونە لای ڕاستی و مەککە لای چەپی.

پارچە پارچە کرد، لە هەریەکێکیان پارچەیەکیان هێناو خستیانە ناو مەنجەڵێکەوە، هەتا کوڵا، جا هەردووکیان لە گۆشتەکەیان خواردو لە گۆشتاوەکەشیان خواردەوە.

لە پاشاندا پێغەمبەر ﷺ سوار بووەوە بەرەو کەعبە هاتەوەو تەوافی (إفاضة)ی کرد، وە لەوێ نوێژی نیوەڕۆی کرد.

پاشان هاتەلای بەنی (عبدالمطلب) لەسەر ئاوی زەم زەم ئاویان ئەدا بە خەڵك، فەرمووی: (انزِعُوا بَنِي عَبدِ المُطَّلِبِ، فَلَولا أن يَغلِبَكُمُ النَّاسُ عَلَى سِقَايَتِكُم لَنَزَعتُ مَعَكُم). واتە: ئاو دەربهێنن ئەی بەنی (عبد المطلب) لە ترسی ئەوە نەبوایە کە خەڵك بە کاری حەجیان بزانیایە و بهاتنایە بە کۆمەڵ لێیان بسەندنایە ئێستا من لەگەڵتان دەرم ئەهێنا، لەبەر ئەوەی ئەوەندە خێرە ئەو ئاو دەرهێنانە. ئەوانیش جەوەنەیەکیان دایەو لێی خواردەوە.

زانایان ووتوویانە: بزانە ئەم فەرموودەیە زۆر گەورەیەو کۆمەڵێك شتی بەسوودی تێدایەو چەند قاعیدەی گرینگ و بەنرخی تێدایە.

(قاضی عیاض) ووتویەتی: خەڵك زۆر قسەیان کردوە لەبارەی ئەو فیقهەی کە لەم حەدیسەدا هەیە، وە کتێبی زۆریان داناوە، وە (أبوبکر ابن المنذر) جوزئێکی گەورەی داناوە لەو بارەیەوە کە زیاتر لە سەدو پەنجا جۆر فیقهی تێدا دەرهێناوە، وە ووتویەتی: ئەگەر حسێب بکرێ نزیکەی ئەوەندەی تری فیقهی شەرعی تێدایە.

وە ووتوویانە: ئەم حەدیسە ئەبێتە بەڵگەی ئەوەی کە خۆ شتن بۆ ئیحرام سوننەتە بۆ زەیستان و بێنوێژ، وە کەسانی تر لەپێش ترن بۆ ئەو خۆشتنە، وە بەڵگەیەکە لەسەر ئەوەی کە زەیستانو بێ نوێژ ئەبێ پەڕۆ هەڵبگرن وە ئیحرامەکەشیان دروستە، وە ئەبێ ئیحرام بەستن دوای نوێژبێ، نوێژەکە فەرز بێت یاسوننەت. وە بەڵگەیە لە سەر ئەوەی کە ئەبێ دەنگ بەرز بکرێتەوە بە تەلبیەوە.

پەسەندیشە کە پێغەمبەر ﷺ چی ووتووە لە تەلبیەدا هەر ئەوە بوترێ، وە ئەگەر لەوە زیاتر یش بووترێ خراپ نیە.

چونکە عومەر ئەمەشی لەسەر زیاد کردوە: (لَبَّيكَ ذَا النَّعمَاءِ وَالفَضلِ الحَسَنِ، لَبَّيكَ مَرهُوباً مِنكَ وَمَرغُوباً إلَيكَ). واتە: بەپیر بانگەوازەکەتەوە هاتوم ئەی خاوەنی نیعمەتەکان و فەزڵی جوان، هاتوم بەپیر بانگەوازەکەتەوە لەبەر ترس لەتۆو ئارەزو بۆلای تۆ.

وە پێویستە لەسەر حاجی کە لە پێدا بێت بۆ مەککە و تەواف بەدەوری کەعبەدا بکات، کە پێی ئەوترێ: (طواف القدوم)، وە دەست بدات لە —روکن و بەردە ڕەشەکەوە- پێش تەوافەکەی، وە بە (رمل) لۆقە کردن بڕوات، لە سێ دەوری یەکەمدا، لۆقە کردنیش ڕۆیشتنێکی خێراترە لە ڕۆیشتنی سروشتی لەگەڵ نزیکی هەنگاوەکاندا، کە پێشی ئەوترێ (خبب).

ئەم لۆقەیش جگە لە ئاستی دوو ڕوکنە یەمانی‌یەکان لەوانی تردا بیانکات. پاشان بە شێوەی سروشتی بڕوات لە چوار خولەکەی تردا، لەپاش ئەوەی تەوافەکەی تەواو کرد بچێتە (مقام إبراهیم) ئەم ئایەتە بخوێنێ: ﴿وَٱتَّخِذُواْ مِن مَّقَامِ إِبْرَٰهِـۧمَ مُصَلًّى﴾ (البقرة/١٢٥). لەپاشاندا بە شێوەیەك بوەستێ (مقام)ەکە بخاتە نێوان خۆی‌و کەعبەوە، و دوورکات نوێژ بکات لە ڕکاتی یەکەمدا دوای سورەتی فاتیحە سورەتی (الکافرون)، وە لە دووەمدا سورەتی (الإخلاص) بخوێنێ.

هەروەها حەدیسەکە ئەبێتە بەڵگەی ئەوەی کە ئەو کەسە بۆی هەیە دەست بدات لە بەردە ڕەشەکەوە، کاتێ لە مزگەوتەکە دێتە دەرەوە، وەك چۆن کاتی چوونە ژوورەوەش دەستی لێ بدات.

زانایان لە سەر ئەوە ڕێکن کە ئەو دەست لێ دانە سوننەتە، وە ئەبێ لە دوای تەوافەکە سەعی بکات، وە ئەبێ لە صەفاوە دەست پێ بکات‌و سەرکەوێتە سەری، وەنەختێ لە سەری بوەستی بەرەو قیبلە، و یادی خوای گەورە بکات بەو یادەی کە پێغەمبەر ﷺ کردی، وە سێ جار بپاڕێتەوە لەخوا، وە ئەبێ لەناو شێوەکەدا لۆقەی بۆ بکات لە ڕۆیشتنەکەیدا، لەو شوێنەی کە پێی ئەڵێن: (بین المیلین)، وە ئەو لۆقە کردنەش مەشروعە بکرێ لەهەر حەوت خولەکاندا، نەك لە سێ جاری یەکەمدا، وەك لە تەوافی (قدوم)دا وەهایە، وە ئەبێت بچێتە سەر مەروەش یادی خوا بکات و دوعا بکات وەك چۆن چووە سەر صەفاو وای کرد.

کە ئەمانە هەمووی تەواو بوو، عومرەکەی تەواو ئەبێت، جا ئەگەر سەری تاشی یا کورتی کردەوە ئەوە ئیحرامی شکاندووە.

صەحابە خوایان لێ ڕازی بێت بەو شێوەیان کرد کاتێ پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێدان کە حەجەکەیان هەڵبوەشێننەوەو بیکەن بە عومرە.

بەڵام هەرکەسێك (قارن) بوو واتە نی‌یەتی حەج‌و عومرەی هێنابوو بەیەکەوە، ئەوە نابێ نەسەری بتاشێ و نەکورتی بکاتەوە، و هەر لە ئیحرامدا ئەمێنێتەوە، لەپاشاندا ڕۆژی هەشتەمی (ذي الحجة) کە پێی ئەڵێن: (یوم الترویة) ئەوەی کە بیەوێ حەج بکات، لەوانەی کە لە عومرەکەیان ئیحرامیان شکاندووە دووبارە ئیحرام ببەستێتەوەو بڕوات بۆ مینا لەگەڵ ئەوانەی کە (قارن) بون، وە سوننەت وەهایە کە پێنج فەرزە نوێژەکە لە مینا بەجێ بهێنێ وە ئەو شەوە کە شەوی نۆیەمە لەوێ بمێنێتەوە.

سوننەتە کە ڕۆژی عەرەفە لەمینا دەرنەچێ هەتا ڕۆژ هەڵدێ و دوای ڕۆژ هەڵهاتن بڕوات وە نەچێتە (عرفات) هەتا ڕۆژ لە ناوەڕاستی ئاسمان لانەدات؛ وە دوای ئەوەی کە پێغەمبەر ﷺ نوێژی نیوەڕۆو عەسری بەیەکەوە کردووە لە عەرەفات، لە نەمیرە دابەزیوە کە بەشێك نی‌یە لە عەرەفات.

وە لە دوای هەر دوو نوێژەکە نەبێت نەچێتە (الموقف)ەوە، وە سوننەتە نوێژ کردن لە نێوانیاندا (لەنێوان دوو نوێژەکەدا) وە سوننەتە ئیمام ووتار بخوێنێ بۆ خەڵك پێش نوێژ، ئەمەش یەکێکە لەووتارە سوننەتەکانی حەج.

دووەم: لە ووتارە سوننەتەکان: ڕۆژی حەوتەمە لە (ذي حجة) لای کەعبە دوای نوێژی نیوەڕۆ، ئیمام ووتار ئەخوێنێتەوە.

سێیەم: لە ووتارە سوننەتەکان- ڕۆژی قوربانی کردنەکەیە (یوم النحر).

چوارەم: لە ووتارە سوننەتەکان- ڕۆژی (نەفری) یەکەمە[1].

وە لە حەدیسەکەدا چەند سوننەت و ئاداب هەیە لەوانە:-

چوون بۆ (الموقف) دوای لێ بوونەوە، لە دوو نوێژی فەرز.

وە ڕاوەستانە لە (عرفات) و ئەگەر بەسواری بێت چاکترە.

وە ڕاوەستانە لای بەردە گەورەکان لەو شوێنەی کە پێغەمبەر ﷺ لێی ڕاوەستاوە، یا نزیك لەو شوێنەوە.

بە شێوەیەك ڕا بوەستێت ڕووەو قیبلە بێت.

(الموقف)دا بمێنێتەوە هەتا خۆر ئاوا دەبێت.

لە وەستانەکەیدا بپاڕێتەوە لە خوای گەورە و دەستەکانی بەرز بکاتەوە تا لای سنگی، لە پاش ئەوەی کە دڵنیا بوو ڕۆژ ئاوا بووە لە سەر خۆو بێ دەنگ بجوڵێ بەرەو موزدەلیفە، و بەزمانیش ئەمر بەخەڵکەکە بکات ئەگەر گوێڕایەڵ کراو بوو.

کە گەیشتە موزدەلیفە دابەزێ‌و نوێژی ئێوارە و خەوتنان بکات، بەسەریەکەوە بە بانگێك‌و دوو قامەت، بێ ئەوەی نوێژی سوننەت لە نێوانیاندا بەجێ بهێنێ.

ئەم کۆ کردنەوەش زانایان لەسەری ڕێکن، بەڵام لە هۆی ئەو بەسەریەکەوەکردنەدا جیاوازیان هەیە.

ئەڵێن: ئەو نوێژ بەسەریەکەوە کردنە بەوشێوەیە خوا پەرستییە، وە ئەڵێن لەبەرئەوەیە موسافیرن واتە: سەفەرەکە بۆتە هۆی ئەو کۆکردنەوەیە.

هەروەها لەو شتانەی کە سوننەتن: شەو مانەوەیە لە موزدەلیفە، وە ئەو مانەوەیە هەموو زانایان کۆن لەسەر ئەوەی کە خوا پەرستییە، بەڵام جیاوازن لەوەدا کە ئایا ئەو شەوە مانەوەیە سوننەتە یا (واجب).

---

(١) ڕۆژی (نفر): ڕۆژی سیانزەهەمە لە جەژنی قوربان، ئەو ڕۆژەیە کە خەڵکەکە لە میناوە بەرەو مەککە ئەگەڕێنەوە.

سوننەتە لە موزدەلیفە نوێژی بەیانی بکات، لەپاشاندا بجولێ بەرەو مەشعەری حەرام، ئینجا لەوێ ڕابوەستێت و دوعا بکات.

ڕاوەستان لە (مشعر الحرام) لە (مناسك) خوا پەرستییەکانی حەجە.

پاشان کە بەتەواوی دونیا زەرد بوو لە بەیانیدا ئەجولێ بەرەو (بطن محسر) و بەخێرایی ئەڕوا پیێدا، چونکە لەو شوێنەدا خوا ڕق و کینەی لە (أصحاب الفیل) گرت و لەناوی بردن، جا نابێ لەسەرخۆ ڕۆیشتن بکرێت تێیدا یامانەوە لەوێدا.

جا کاتێ حاجی گەیشتە (الجمرة) -جمرة العقبة- دێتە ناو سکی شیوەکەوەحەوت بەردی تێ ئەگرێ هەمووبەردێك ئەوەندەی دەنکە پاقلەیەك ببێت، ئەبێ لەگەڵ هەر بەردێکدا (الله أکبر)ێك بکات.

لەپاش ئەوە بەرەو شوێنی قوربانی کردن ئەچێت و قوربانی خۆی ئەکات، ئەگەر شتی سەربڕینی پێ بێت، لەپاش ئەوە سەری ئەتاشێ، لەپاشاندا ئەگەڕێتەوە بۆ مەککەو (طواف الإفاضة) ئەکات، ئەویش ئەو تەوافەیە کە تەوافی زیارەتی پێ ئەڵێن.

لەدوای ئەو تەوافە ئیحرام ئەشکێنێ و هەرچی لەسەر حەرام بووە لەسەری حەڵاڵ ئەبێتەوە هەتا چوونە لای خێزانیش.

بەڵام ئەگەر حەوت بەردەکانی هاویشتە (جمرة العقبة) و تەوافەکەی نەکردبو ئەوە هەموو شتێکی بۆ حەڵاڵ ئەبێت جگە لە ئافرەت.

ئا ئەوەیە ڕێ‌وڕەوشتی پێغەمبەر ﷺ لە حەجدا کە ئەبێ خەڵك لەسەری بڕوات بە پێی ئەو فەرموودەیە کە فەرموویەتی: (خُذُو عَنِّي مَنَاسِكَكُم). واتە: کارو بارەکانی حەج لە منەوە وەر بگرن.

ئەو کەسەی کە بەم شێوەیە حەج ئەکات ئیقتیدای بەو کردەوەو فەرمانەکەی بەجێ هێناوەو حەجەکەی صەحیحە.

وا لەخوارەوە ئەو کارو بارانە ڕوون ئەکەینەوە و ڕاو بۆچونی زانایانیش لەسەریان دەهێنین:

## کات و شوێنی ئیحرام بەستن (المواقیت)

(مواقیت) دوو بەشە (المواقیت الزمانیة) کات بۆ ئیحرام بەستن، وە (المواقیت المکانیة) شوێن بۆ ئیحرام بەستن:

### (المواقیت الزمانیة) :

کۆمەڵە کاتێکە کە کردەوەکانی حەج لەو کاتانەدا نەبێت دروست نیە، خوای گەورە ئەو کاتانەی دیاری کردووە لەو ئایەتەدا کە ئەفەرموێ: ﴿يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْأَهِلَّةِ قُلْ هِيَ مَوَٰقِيتُ لِلنَّاسِ وَٱلْحَجِّ﴾

(البقرة/١٨٩). واتە: پرسیارت لێ ئەکەن دەربارەی مانگ و گۆڕانی شێوەکانی، تۆش بڵێ ئەوانە نیشانەن بۆ دیاری کردنی کاروباری خەڵکەو بۆ کاتی حەجە.

هەروەها ئەفەرموێ: ﴿ٱلْحَجُّ أَشْهُرٌ مَّعْلُومَٰتٌ﴾ (البقرة/١٩٧). واتە: کردەوەکانی حەج لە چەند مانگێکی دیاری کراودایە.

زانایان ئیجماعیان هەیە لەسەر ئەوەی کە مەبەست لە مانگەکانی حەج شەووال و (ذو القعدة)ن، بەڵام جیاوازیان لەوەدا هەیە کە ئایا (ذي الحجة) بە تەواوی لەو مانگانەیە یا دەیەکی لەو مانگانەیە.

ئیبنوعومەرو ئیبنوعەبباس و ئیبنومەسعودو حەنەفیەکان و شافیعیو ئەحمەد بۆڕای دووەم چوون.

بەڵام مالیك بۆ ڕای یەکەم چووە.

ئیبنوحەزم ڕای یەکەمی تەرجیح داوە و ئەڵێت: خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿ٱلْحَجُّ أَشْهُرٌ مَّعْلُومَٰتٌ﴾ ﴿أَشْهُرٌ﴾ لە زمانی عەرەبیدا بە دوومانگو هەندێکی مانگێکی تر ناوترێ، بەڵکو بە سێ مانگ و بەرەو ژوور ئەوترێ، وە هەروەها ڕەمی جەمەرات -کە لە کردەوەکانی حەجە- ڕۆژی سیانزەهەمی ذي الحجة بەجێ دێت، وە تەوافی دوایی- کەلە فەرزەکانی حەجە – لە هەموو مانگی (ذي الحجة) دا بەجێ دێت، بە بێ جیاوازی لەنێوان زانایان. کەواتە ئەوە ڕاستە کە ئەو کاتانە سێ مانگن.

وە بەرهەمی جیاوازی نێوانیان لەو کردەوانەدا دەر ئەکەوێ کەدوای قوربانی بەجێ دێت.

ئەوانەی ئەڵێن: مانگی ذي الحجة هەمووی لە مانگەکانی حەجە، ئەڵێن: خوێنی دواکەوتنی ناکەوێتە سەر، واتە: پێویست نییە ئاژەڵ سەربڕێت لە بریتیدا.

بەڵام ئەوانەی ئەڵێن: دە ڕۆژی ئەو مانگە نەبێت لەمانگەکانی حەج نییە، ئەڵێن: خوێنی دواکەوتنی ئەکەوێتە سەر.

**ئیحرام بەستن بۆ حەج پێش مانگەکانی خۆی:**

ئیبنوعەبباس و ئیبنوعومەر و جابیر و شافیعی بۆ ئەوە چوون کە ئیحرام بەستن دروست نییە لە مانگەکانی حەجدا نەبێت[1].

بوخاری ووتویەتی: ئیبنوعومەر خوایان لێ ڕازی بێت فەرمویەتی: مانگەکانی حەج (شوال)و (ذي القعدة)و دە ڕۆژی یەکەمی مانگی (ذي الحجة) یە، وە ئیبنوعەبباس (خوا لێیان ڕازی بێت) فەرمویەتی: سوننەتە کە ئیحرام بە حەج نەبەسترێ ئیللا لە مانگەکانی حەجدا نەبێت[1].

---

(١) ئەڵێن ئەو کەسەی کە پێش مانگەکانی خۆی ئیحرامی بەست، ئەوە ئیحرامی بە عومرە بەستوەو بری ئیحرامی حەجی ناکەوێت.

ئیبنوجەریر لە ئیبنو عەبباسەوە ئەگێڕێتەوە کە فەرمویەتی: دروست نیە کەس ئیحرام ی حەج ببەستێ لە مانگەکانی حەج دا نەبێت.

حەنەفیەکان و مالیك و ئەحمەد ڕایان وایە کە ئیحرام بەستن پێش مانگەکانی حەج دروستە بەلاّم کەراهەتی هەیە.

شەوکانی ڕای یەکەم تەرجیح ئەدات و ئەڵێت: ئەوەی کە بەرگری کردن لە ئیحرام بەستن لەپێش مانگەکانی حەجدا بەهێز ئەکات ئەوەیە کە خوای گەورە بۆ کردەوەکانی حەج چەند مانگێکی دیاری کردووە، وە ئیحرام بەستنیش لە کردەوەکانی حەجە، جا هەرکەس بڵێت: دروستە ئیحرام بەستن پێش ئەو کاتانە ئەبێ بەڵگە بهێنێتەوە.

(المواقيت المكانية) :

شوێنەکانی ئیحرام بەستن ئەو شوێنانەن کە ئەوکەسەی نیازی حەج کردن یا عومرە کردنی هەیە ئیحرامی تێدا ئەبەستێ.

ئیتر دروست نیە بۆ حاجی یا عومرەکەر لێیان تێ پەڕێت، بێ ئەوەی ئیحرام ببەستێت، وە پێغەمبەر ﷺ ئەو شوێنانەی دیاری کردووە:

جا بۆ خەڵکی مەدینە (ذالحليفة)ی دانا، (شوێنێکە کەوتۆتە باکوری مەدینەوەو (٤٥٠) کیلۆمەتر دوورە لە مەککەوە).

بۆ خەڵکی شام (الجحفة)ی دیاری کردووە (شوێنێکە ١٨٧کیلۆمەتر دوورە لە مەککەوە کەوتۆتە باکوری ڕۆژئاوای مەککەو نزیکە لە (رابغ)ەوە. (رابغ)یش (٢٠٤) کیلۆمەتر دوورە لە مەککەوە. ئیتر (رابغ) بووە بە شوێنی ئیحرام بەستن بۆ خەڵکی میسرو شام، وە بۆ ئەوانەی بەوێدا تێئەپەڕن لە دوای ئەوەی کە (جوحفة) ئەسەر و شوێنی نەما.

وە بۆ خەڵکی نەجد (قرن المنازل) (شاخێکە کەوتۆتە ڕۆژ هەلاّتی مەککەوە ئەڕوانێ بەسەر کێوی عەرەفاتدا، (٩٤) کیلۆ مەتر لە مەککەوە دوورە.

وە بۆ خەڵکی یەمەن (يلملم) (شاخێکە ئەکەوێتە لای باشوری مەککەوە، (٥٤) کیلۆمەتر دوورە لە مەککەوە.

وە بۆ خەڵکی عێراق (ذات عرق) (شوێنێکە لە باکوری ڕۆژهەلاّتی مەککەوەیە، (٩٤) کیلۆمەتر دوورە لە مەککەوە.

هەندێك بە هەڵبەست و شیعر ووتویانە:

---

(١) صەحابی کە ووتی: سوننەتە حوکمی مەرفوعی بۆ لای پێغەمبەر ﷺ.

عِرقُ العِرَاقِ يَلملَمُ اليَمَنِ     وَبِذِي الحُلَيفَةِ يُحرِمُ المَدَنِي
وَالشَّامُ جُحفَةُ إن مَرَرتَ بِهَا     وَلأهلِ نَجدِ قَرنُ فَاستَبِنِ

واتە: (عرق) بۆ عیراقە و (یلملم) بۆ یەمەن، ولە (ذو الحليفة) ش خەڵکی مەدینە ئیحرام ئەبەستن، وە بۆ خەڵکی شامیش (جحفة)یە ئەگەر هات و بەویدا هاتی، وە بۆ خەڵکی نەجدیش (قرن المنازل)ە جا ئاگاداربەو بۆت ڕوون بێتەوە.

ئەوە ئەو شوێنانەیە کە پێغەمبەر ﷺ دیاری کردوون، کە شوێنی ئیحرام بەستنن بۆ هەمو ئەوکەسانەی لەو شوێنەوە تێ ئەپەڕن، جا چ خەڵکی ئەو شوێنانە بن، یان لەلای ترەوە هاتبن[1].

پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (هُنَّ لَهُنَّ وَلِمَن أتى عَلَيهِنَّ مِن غَيرِهِنَّ لِمَن أرَادَ الحَجَّ أوِ العُمرَةَ). واتە: ئەو شوێنانە بۆ ئەو وڵاتانەیەو بۆئەو کەسانەیە بەوێدا تێ ئەپەڕن، با خەڵکی ئەو وڵاتانەش نەبن و ئوفوقیان جیاواز بێت جا بۆ ئەوکەسانەی ئەیانەوێ بچن بۆ مەککە حەج بکەن یا عومرە بەجێ بهێنن لەوێوە ئیحرام ئەبەستن.

جا ئەگەر کەسێك لەناو مەککەدا بوو، ویستی حەج بکات ئەوە ئەبێ لەناو خانووەکانی مەککەوە ئیحرام ببەستێ.

بەڵام ئەگەر بیەوێ عومرە بکات ئەبێ لە (الحل)ەوە ئیحرام ببەستێ دێتە دەرەوە بۆی و لەوێ ئیحرام ئەبەستێ وە لەوێش نزیك تر (التنعیم)ە.

هەرکەس لەنێوان شوێنی ئیحرام بەستن و مەککەدا بوو، ئەوە ئەبێ لە خانوەکەی خۆیەوە ئیحرام ببەستێ.

ئیبنوحەزم ووتوویەتی: هەرکەس ڕێی بەسەر ئەو شوێنانەوە نەبوو، بە ئارەزووی خۆی لەکوێدا ئیحرام ئەبەستێ، بیبەستێ لە دەریادا بێت یالەزەوی دا.

**ئیحرام بەستن پێش (مواقیت) شوێنەکانی:**

ئیبنومونزیر ووتوویەتی: زانایان هەمویان لە سەر ئەوەن کە ئەو کەسەی پێش شوێنی ئیحرام بەستن ئیحرام ببەستێ ئیتر موحریمە، بەڵام ئایا کەراهەتی هەیە؟ ئەڵێن: بەڵێ، چونکە قسەی صەحابەکان کە ووتوویانە: پێغەمبەر ﷺ (ذا الحليفة)ی داناوە بۆ خەڵکی مەدینە ئەوە ئەگەیەنێت کە (إهلال) لەو

---

(١) بۆ نمونە ئەگەر کەسێك لە خەڵکی شام ویستی حەج بکات و هاتە ناو مەدینەوە، ئەوە شوێنی ئیحرام بەستنەکەی (ذوالحليفة)یە، چونکە بەسەر ئەوێدا تێئەپەڕێ، وە نابێت ئیحرامەکەی دووا بخات تا ئەگاتە (رابغ) کە شوێنی ئیحرام بەستنی خۆیەتی، وە ئەگەر دوای بخات ئەوە خوێنی ئەکەوێتە سەر بە ڕای هەمو جومهور.

شوێنەوە ئەکرێت، وە ئەوە ئەگەیەنێت کە لەو شوێنەوە زیادو کەمی نیە، جا ئەگەر شتی زیادە حەرامیش نەبێت هیچ نەبێ وازلێ هێنانی باشترە.

## ئیحرام بەستن

**پێناسەی ئیحرام:**

ئیحرام: نیـیەت هێنانە بۆ بەجێ هێنانی یەکێ لەم دوو خوا پەرستیـیە (حەج یا عومرە) یا نیـیەتی هەردوکیان بەسەریەکەوە، کە ئەمەیش پایەیەکی حەجە بەپێی فەرمودەی خوای گەورە کە ئەفەرموێ: ﴿وَمَآ أُمِرُوٓاْ إِلَّا لِيَعۡبُدُواْ ٱللَّهَ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ﴾ (البينة/٥). واتە: فەرمانیان پێ نەکراوە ئیللا بەوە نەبێت کە خوا بە ئیخلاصەوە بپەرستن‌و ئایینیان هەر بۆخوا بێت.

هەروەها بە پێی فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ کە فەرموویەتی: (إِنَّمَا الأَعمَالُ بِالنِّيَّاتِ وَإِنَّما لِكُلِّ امرِيءٍ مَا نَوَى). واتە: کردەوەکان بە پێی نیـیەتەکانیانن، جا هەرکەس نیازی چی بێت پاداشتی ئەوەی بۆ ئەبێت.

لە پێشەوە لە (باسی دەست نوێژدا) باسی چۆنیەتی نیـیەت کرا کە شوێنەکەی دڵە،

کەمالی کوڕی هومام ووتوویەتی: لەوانە کە حەج و عەمرەو خوا پەرستیـیەکەی پێغەمبەریان ﷺ ڕیوایەت کردووە، یەکێکیان نازانین گێڕابێتیـیەوە کە گوێی لە پێغەمبەر بووبێت ﷺ فەرموبێتی (نويت العمرة، أو نويت الحج). واتە: نیـیەتم هەیە عومرە وەیا نیـیەتم هەیە حەج ئەکەم.

**ئاداب و ڕەووشتەکانی ئیحرام بەستن:**

بۆ ئیحرام بەستن چەند ڕەوشتێك هەیە کە ئەبێت ئاگاداری بکرێن، واله خوارەوە ڕوونیـیان ئەکەینەوە:

١- پاك‌و خاوێنی: کە ئەم کارەش بەجێ دێت بە نینۆك کردن، سمێڵ کورت کردنەوە، مووی بن باڵ هەڵکەندن، مووی بن ڕان تاشین، دەست نوێژگرتن یان خۆ شۆردن -کە لەهەموویان چاکترە- قژ داهێنان و ڕیش داهێنان.

ئیبنوعومەر خوا لێیان ڕازی بێت فەرمویەتی: سوننەتە ئەو کەسە خۆی بشۆرێ کاتێ ویستی ئیحرام ببەستێ و بچێتە ناو مەککەوە. بەززار و (دارقطني) و حاکم کە بەصەحیحی داناوە گێڕاویانەتەوە.

لە ئیبنوعەبباسەوە خوا لێیان ڕازی بێت هاتوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (إِنَّ النُّفَسَاءَ وَالحَائِضَ تَغتَسِلُ وَتُحرِمُ وَتَقضِي المَنَاسِكَ كُلَّهَا، غَيرَ أَنَّهَا لاتَطُوفُ بِالبَيتِ حَتَّى تَطهُرَ) رواه أحمد وأبوداود والترمذي وحسنه. واتە: زەیستان و ئافرەتی بێ نوێژ ئەبێ خۆی بشۆرێ‌و ئیحرام ببەستێ و هەموو کردەوەکانی حەج بەجێ بهێنێ ئەوە نەبێ کە تەوافی خانەی خوا ناکات هەتا پاك ئەبێتەوە.

٢- خۆ داماڵین:

خۆ داماڵین لە هەموو ئەو بەرگ‌و پۆشاکانەی بە تەقەڵ دورابن، وە لەبەر کردنی بەرگی ئیحرام، ئەویش دوو پارچە قوماشە، یەکێکیان ئەپێچرێ لە بەشی سەرەوەی لەش و ناگاتە سەر، ئەوی تر پەشتە ماڵێکە کە ئەپێچرێ لە نیوەی خوارووی لەشەوە، وە پێویستە هەردوو پارچەکە سپی بێت چونکە بەرگی سپی خۆشەویست ترین بەرگە لای خوا.

ئیبنوعەبباس خوا لێیان ڕازی بێت فەرمویەتی: پێغەمبەر ﷺ کاتێ سەری خۆی شانە کردو چەوری کرد، پەشتەماڵ و سەرشانەکەی ئالاند لە خۆیەوەو بەرەو مەککە کەوتە ڕێ، خۆی و هاوەڵەکانی. (الحديث رواه البخاري).

٣- بەکار هێنانی بۆنی خۆش:

بۆنی خۆش لە لەش‌و بەرگ دان هەرچەندە پاشماوەی ئەو بۆنەش بمێنێتەوە هەتا دوای ئیحرام[١].

لە عائیشەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتوە فەرمویەتی: ئەڵێی ئەڕوانمە بریقەی بۆنی تەوقی سەری پێغەمبەر ﷺ کاتێ کە ئیحرامی بەستبوو، بوخاری‌و موسلیم گێڕاویانەتەوە.

هەروەها بوخاری‌و موسلیم لە عائیشەوە گێڕاویانەتەوە فەرمویەتی: من خۆم بۆنی خۆشم ئەدا لە پێغەمبەر ﷺ بۆ ئیحرام بەستن پێش ئەوەی ئیحرام ببەستێ، وە بۆ ئیحرام شکاندن[٢] پێش ئەوەی تەوافی خانەی خوا بکات.

هەروەها فەرمویەتی: کاتێ لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ بەرەو مەککە ئەڕۆشتین ناوچەوانمان بە میسک ئەپرژاند، جا کاتێ عارەقمان ئەکردەوە بە دەم‌و چاوانماندا ئەهاتە خوارەوەو پێغەمبەر ﷺ ئەیبینی‌و ڕێی لێ نەئەگرتین، ئەحمەدو ئەبو داود گێڕاویانەتەوە.

٤- کردنی دوو ڕکات نوێژ:

ئەبێ ئەو کەسەی ئەیەوێ ئیحرام ببەستێ دوو ڕکات نوێژ بکات بە نیەتی سوننەتی ئیحرامەوە لە ڕکاتی یەکەمدا دوای فاتیحە ﴿قُلۡ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلۡكَـٰفِرُونَ﴾ بخوێنێتەوە، وە لە ڕکاتی دووەمدا دوای فاتحە (الإخلاص).

ئیبنوعومەر خوا لێیان ڕازی بێت فەرمویەتی: پێغەمبەر ﷺ لە (ذي الحليفة) دوو ڕکات نوێژی ئەکرد, موسلیم گێڕاویەتەوە.

---

(١) هەندێ لە زانایان بە کەڕاهەتی ئەزانن، بەڵام فەرموودەکە ئەبێتە حوججە بەسەریانەوە.

(٢) مەبەستی ئیحرام شکاندنی دوار ڕەمی‌یە :ە بۆنی خۆش و شتی تری پێ حەڵاڵ ئەبێ ، وە تەنها لە ژن مەنع ئەکرێ.

وە ئەتوانێ دوو ڕکاتی فەرزیش لەجیاتی بکات، وەك چۆن نوێژی فەرز لە جیاتی (تحية المسجد) یش ئەبێت.

## جۆرەکانی ئیحرام

ئیحرام سێ جۆرە:

١- (قران) ئەوەیە کە لە میقاتەوە ئیحرام ببەستێ بە حەج و عومرە بەسەر یەکەوە.

٢- (تمتع) عومرە کردنە لە مانگەکانی حەجدا، پاشان حەج کردنیش هەر لەو ساڵەدا.

٣- (إفراد) ئەوەیە کە لە میقاتەوە تەنها بە حەج ئیحرام ببەستێ.

زانایان کۆن لەسەر ئەوەی کە هەر سێ جۆرەکە دروستە.

لە عائیشەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتوە فەرمویەتی: لە ساڵی حەجی ماڵئاواییدا لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ چوین بۆ حەج، جا هەبو تەلبیەی بە عومرە ئەکرد، هەبوو بە حەج وعومرە، وە هەبوو هەر بە حەج، وە پێغەمبەر ﷺ هەر بە حەج تەلبیەی کرد.

جا ئەوانەی کە ئیهلالیان بە عومرە کردبوو، لەکاتی گەیشتنیاندا ئیحرامیان شکاند، وە ئەوانە کە ئیهلالیان بە حەج کردبوو یا بەحەج‌و عومرە بەسەر یەکەوە، ئیحرامیان نەئەشکاند هەتا ڕۆژی (نەحر) سەر بڕین. ئەحمەد و بوخاری و موسلیم و مالیك ڕیوایەتیان کردووە.

**واتای (قران) چی‌یە؟**

ئەوەیە کەسێك لە شوێنی دیاری کراوەوە بەنیازی حەج‌و عومرە ئیحرام ببەستێ، وە لە کاتی تەلبی‌یەدا بڵێت: (لبيك بحج وعمرة) واتە: خوایە بەدەم بانگەوازەکەتەوە هاتووم حەج‌و عومرە ئەکەم بەسەریەکەوە، هەر کەسیش وەهای کرد ئەبێ بە ئیحرامەکەوە بمێنێتەوە هەتا لە هەموو کردەوەکانی عومرەو حەج ئەبێتەوە.

یاخود ئیحرام ئەبەستێ بەعومرە، وحەجیش بخاتە ناو عومرەوە پێش تەواف کردن[1].

**واتای (تمتع) چی‌یە؟**

ئەوەیە کەسێك لە مانگەکانی حەجدا عومرە بکات لەپاشاندا هەر لەوساڵەدا حەجیش بکات، وە بۆیە پێی ئەڵێن تەمەتتوع چونکە سوود لە دووکردەوەی حەج‌و عومرە وەرئەگرێ لەمانگەکانی حەجدا، لە یەك ساڵدا بێ ئەوەی بگەڕێتەوە بۆ وڵاتی خۆی.

وە لەبەر ئەوەی ئەو کەسە کاتێك ئیحرام ئەشکێنێ بەهرە ئەگرێ لەو شتانەی کە غەیری موحریم بەهرەیان لێ وەرئەگرێ وەك: جل گۆڕین و بۆنی خۆش لەخۆدان و شتی تر.

---

(١) ئەمەیان بە زاراوەی تەمەتتوع ناو ئەبرێت لە قورئان و سوننەتدا.

**شێوەی (تمتع):**

ئەمەیە ئەو کەسە لە شوێنی دیاریکراوەوە ئیحرام ئەبەستێ تەنها بە عومرە، وە لەکاتی تەلبیەیدا ئەڵێت: (لبیك بعمرة) ئەمەش ئەوەی لەسەر پێویست ئەکات کە بەو شێوەیە ـ واتە بە ئیحرامەوە ـ بمێنێتەوە هەتا حاجی ئەگەنە مەککە و طەوافی خانەی خوا ئەکات و سەعی صەفاومەروە ئەکات، ئینجا ئەم سەری ئەتاشێ یا کورتی ئەکاتەوەو ئیحرام ئەشکێنێ و جلی ئیحرام لا ئەباو جلی تر لەبەر ئەکات، وە هەرچی لە کاتی ئیحرامەکەدا لەسەری حەرام بووە بۆی دروست ئەبێتەوە هەتا ڕۆژی تەرویەیە دێت (ڕۆژی هەشتەم) ئیتر ئەم لە مەککەوە ئیحرام ئەبەستێ بە حەج.

لە (فتح)دا هاتووە: ئەوەی جەماوەری زانایان بۆی چوون ئەوەیە (تمتع) بەوە ئەوترێ کە کەسێك لەسەفەرێکدا لە مانگەکانی حەجدا حەج‌و عومرە بەجێ ئەهێنێ لە یەك ساڵدا، وە ئەبێ عومرەکە پێش بخات، وە ئەبێ لە مەککەشەوە بێت.

جا هەرکاتێك مەرجێك لەو مەرجانەی تێدا نەبوو ئەوە نابێت بە موتەمەتتیع (واتە: حەجەکەی حەجی تەمەتتوعی پێ ناڵێن).

**واتای (إفراد) :**

ئیفراد ئەوەیە ئەوکەسەی ئەیەوێ حەج بکات لە شوێنی دیاری کراوەوە ئیحرام ببەستێ تەنها بە حەج، وە لە تەلبیەیەکەدا بڵێت: (لبیك بحج) وە لەسەر ئەو ئیحرامە ئەمێنێتەوە هەتاوەکو کارەکانی حەج تەواو ئەبێت، جا ئەگەر پێی خۆش بوو لەدوای ئەوە عومرە ئەکات.

**کام جۆرەیان چاکترە؟**

زانایان جیاوازیان هەیە لەوەدا کە کامیان چاکترینە[1]، شافیعی‌یەکان بۆ ئەوە چوون کە ئیفراد و تەمەتتوع چاکترن لە قیران، چونکە ئەوکەسەی کە ئیفراد ئەکات یان تەمەتتوع ئەکات، هەردوو کردەوەکە بە تەواوی بەجێ ئەهێنێ، بەڵام ئەوکەسەی کە قیران ئەکات تەنها کاری حەج بەجێ ئەهێنێ.

هەروەها دەربارەی ئیفراد و تەمەتتوع دوو قسەیان هەیە یەکەمیان ئەوەیە کە تەمەتتوع چاکترە، دووەمیان ئەوەیە کە ئیفراد چاکترە.

حەنەفی‌یەکان ئەڵێن: قیران چاکترە لە تەمەتتوع، وە قیران‌و تەمەتتوع چاکترە لە ئیفراد.

مالیکی‌یەکان بۆ ئەوە چوون کە ئیفراد چاکترە لە تەمەتتوع و قیران. وە حەنبەلی‌یەکان بۆ ئەوە چوون کە تەمەتتوع چاکترە لە ئیفرادو قیران .

---

(١) ئەم جیاوازی‌یە لەسەر جیاوازی حەجەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ دامەزراوە. وەئەوەی ڕاستە ئەوەیە کە پێغەمبەر ﷺ قیرانی کردبو، چونکە هەدی لەگەڵ خۆی بردبو.

ئەمەش نزیکترە لە ئاسانکاریەوە، چونکە بۆ خەڵك ئاسانترە کە ناتوانن لەگەڵ خۆیاندا هەدی بیەن، هەرئەمەش بوو کە پێغەمبەر ﷺ بە هیوای بوو بۆ خۆیو فەرمانی دا بە صەحابە وەها بکەن.

موسلیم لە (عطاء)ەوە ئەگێڕێتەوە کە ووتویەتی: گوێم لە جابیر بووە خوا لـێی ڕازی بێت فەرمویەتی: ئێمە -هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ- ئیهلالمان بە حەجێکی خالیص کرد بە تەنها

پێغەمبەر ﷺ کە چوارەم بەیانی لە (ذي الحجة) ڕۆیشت هات فەرمانی پێداین کە خۆمان بکەینەوەو فەرموی: (حُلوا وَأصِيبُوا النِّسَاءَ) واتە: خۆتان بکەنەوەو بچنە لای ژنەکانتان، بەڵام زۆری لـێ نەکردن، وە هەر بۆی حەڵاڵ کردن.

ووتمان: پێنج ڕۆژ نەبێت نەمان ماوە بۆ عەرەفە، فەرمانی پێداین لای ژنەکانمان بین. پێغەمبەر ﷺ ووتاری بۆ داین و فەرمووی: (ئەزانن من لە هەمووتان زیاتر لە خوا ئەترسمو لە هەمووتان ڕاستگۆ ترم وە لە هەمووتان چاکترم، ئەگەر هەدیم لەگەڵ خۆم نەهێنابایە منیش خۆم ئەکردەوە وەك چۆن ئێوە خۆتان ئەکردەوە، وە ئەگەر ئەوەی ئێستا ئەمزانی لە پێشەوە بمزانیبایە هەدیم لەگەڵ خۆم نەئەهێنا، جا خۆتان بکەنەوە)، ووتی: ئێمەش خۆمان کردەوەو مل کەچی فەرمانەکانی بووین.

**دروستە ئیحرام بە موطلەقی ببەستریَ:**

ئەگەر کەسێك ئیحرامی بە موطلەقی بەست، و مەبەستی تەنها بەجێ هێنانی ئەو فەرزە بێت کە خوا لەسەری داناوە بێ ئەوەی جۆرێك لەو سێ جۆرانە دیاری بکات لەبەر زانیاری نەبونی بەم ڕون کردنەوەیە، ئەوە ئیحرامەکەی دروستەو صەحیحە.

زانایان ئەڵێن: ئەگەر ئیهلال بکات و تەلبیە بکات، وەك چۆن خەڵك ئەیکەن و مەبەستی خوا پەرستی بێت و ناوی هیچ نەبات نە بە زاراوەی خۆی وە نە مەبەستێکی دیاری کراو لە دڵیا بێت، نە تەمەتتوع نە ئیفراد نە قیران، دیسانەوە حەجەکەی دروستەو یەکێ لەو سیانەی بەجێ هێناوە.

**طواف کردن و سەعی کردنی قارین و موتەمەتتیع، و ئەوەی کە بۆ خەڵکی حەرەم تەنها ئیفراد ئەبێت :**

لە ئیبنوعەبباسەوە هاتووە کە پرسیاری موتعەی حەجیان لێ‌کرد؟ ئەویش فەرموی: کۆچ کەران و یارمەتی دەران (المهاجرون والأنصار)و خێزانەکانی پێغەمبەر ﷺ لە حەجی ماڵ ئاوایی‌دا ئیهلالیان کرد، (واتە: دەنگیان بەرز کردەوە بە تەلبیەیە ووتن) وە ئێمەش ئیهلالمان کرد، جا کاتێ هاتینە مەککە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (إجعَلُوا إهلالَكُم بِالحَجِّ عُمرَةً إلا مَن قَلَّدَ الهَديَ). واتە: ئیهلالەکانتان کە بۆ حەج ئەیکەن بۆ عومرە بیکەن، ئیللا کەسێك نەبێت کە هەدی ئامادە کردوە، ئێمەش بە دەوری کەعبەدا تەوافمان کردو سەعی صەفاو مەروەمان کرد، وە چوینە لای ژنەکانمان و جلی ترمان لەبەر کرد.

وە فەرمووی: (مَن قَلَّدَ الهَديَ فَإنَّهُ لا يَحِلُّ له حتى يَبلُغَ الهَديُ مَحِلَّهُ). واتە: هەر کەس قوربانی ئامادە کردووە بۆی نییە خۆی بکاتەوە هەتا قوربانی ئەگەیەنێتە جێی خۆی.

لە پاشاندا ئێوارەی ڕۆژی تەروییە فەرمانی پێداین کە ئیهلال بۆ حەج بکەین، جا کاتێ لە کردەوەکانی حەج بوینەوە هاتین طەوافی کەعبەمان کردو سەعی نێوان صەفاو مەروەمان کرد.

ئیتر کاری حەجەکەشمان تەواو بوو ئەوەی لەسەرمان ئەمێنێتەوە (هدي)یە وەك خوای گەورە ئەفەرمووێ: ﴿فَمَن تَمَتَّعَ بِٱلْعُمْرَةِ إِلَى ٱلْحَجِّ فَمَا ٱسْتَيْسَرَ مِنَ ٱلْهَدْيِ ۚ فَمَن لَّمْ يَجِدْ فَصِيَامُ ثَلَـٰثَةِ أَيَّامٍ فِى ٱلْحَجِّ وَسَبْعَةٍ إِذَا رَجَعْتُمْ﴾ (البقرة/١٩٦). واتە: هەر کەس ئیحرامی شکاند لە عومرەکەداو لە پاشاندا ئیحرامی بەستەوە بۆ حەج، با چی بۆ هەڵئەسوڕێ لە قوربانی بیکات. بەڵام ئەگەر کەسێك هیچی بۆ هەڵنەسوڕا با سێ ڕۆژ لە حەجەکەدا بەڕۆژوو بێت و حەوتیش کە گەڕانە شوێنی خۆتان.

کاریش ئەبێت بۆ قوربانی، جا ئەوان دو نوسوکیان لە یەك ساڵدا کۆ کردەوە، ئەویش کۆ کردنەوەی نێوان حەج و عومرە بوو. چونکە خوای گەورە لە کتێبەکەیدا باسی کردووەو لە سوننەتی پێغەمبەرەکەیدا ﷺ هەیە، وە خوای گەورە ئەوەی ڕەوا کردووە بۆ ئەو کەسانەی کە خەڵکی مەککە نین وەك ئەفەرمووێ: ﴿ذَٰلِكَ لِمَن لَّمْ يَكُنْ أَهْلُهُۥ حَاضِرِى ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ﴾ (البقرة/١٩٦). واتە: ئەمە بۆ کەسێکە کە خۆی و کەسوکاری دانیشتووی شاری مەککە نەبن. وە ئەو مانگە حەجانەی کە خوای گەورە باسی کردوون: (شەووال، ذو القعدة، ذو الحجة)ن، (جا هەرکەس ئیحرامی تەمەتوعی بەست لەم مانگانەدا ئەوا یا خوێنی لەسەرە بیڕێژێ یا بەڕۆژوو بێت)، بوخاری گێڕاویەتی‌یەوە.

١- لەم فەرموودەیەدا بەڵگەی ئەوە هەیە کە خەڵکی حەرەم نە تەمەتتوعیان بۆ هەیەو نە قیران[1]، ئەبێ یان حەجی تەنیا بکەن، یان عومرەی تەنیا، ئەمەش بۆچونی ئیبنوعەبباس و ئەبوحەنیفەیە، بەپێی فەرمودەی خوای گەورە کە فەرمویەتی: ﴿ذَٰلِكَ لِمَن لَّمْ يَكُنْ أَهْلُهُۥ حَاضِرِى ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ﴾ (البقرة/١٩٦).

زانایان جیاوازیان هەیە لە دیاری کردنی ئەوەدا کە کێن ئەوانەی دانیشتووی مەسجیدی حەرامن. مالیك ووتویەتی: ئەوانە تەنها خەڵکی خودی شاری مەککەن، ئەمەش قسەی ئەعرەجە، وە (طحاوي)ش هەڵی بژاردووەو تەرجیحی داوە.

(١) ئیمامی مالیك و شافیعی و ئەحمەد ڕایان وایە کە مەککەیی بۆی هەیە تەمەتتوع و قیران بکات، بەبێ ئەوەی کەراهەتی ببێت، و هیچیشی لەسەر نییە.

ئیبنوعەبباس‌و (طاوس) و کۆمەڵێك ووتویانە: دانیشتوانی حەرەمن‌و بەس، (حافظ) ووتویەتی: لە ڕواڵەتدا وەهایە. شافیعی ووتویەتی: ئەو کەسەیە کە بەئەندازەی کەمترین ماوە کە نوێژی تێدا کورت دەکرێتەوە دور بێت لە مەککەوە. ئەم ڕایەش ئیبنوجەریر هەڵی بژاردووە.

حەنەفی‌یەکان ووتویانە: ئەوکەسەیە کە کەس‌وکاری لەو شوێنانە بێت کە ئیحرامی تێدا ئەبەسترێ یان نزیکتر بێت، جا بەوانە ئەووترێ ئەهلی حەرەم، وە عیبرەتیش بە شوێنی نیشتەجێ بوونە نەك بە شوێنی لە دایك بون و گەورە بوون.

٢- هەروەها بەڵگەی ئەوە هەیە کە ئەوکەسەی تەمەتتوع ئەکات ئەبێ لە پێشەوە (طواف) و (سعي) بکات بۆ عومرەکەی، ئیتر پێویستی بەطەوافی قودوم نابێت کە طەوافی سڵاوە، لەپاشاندا طەوافی (إفاضة) ئەکات دوای وەستانی عەرەفە، وەهەروەها دوای وەستانی عەرەفە سەعی نێوان صەفاو مەروە ئەکاتەوە.

بەڵام ئەوکەسەی کە قیران ئەکات ئەوە بەشی زۆری زانایان بۆ ئەوە چوون: کە تەنها کارەکانی حەجی بەسە، یەك طەواف و یەك سەعی ئەکات بۆ حەج و عومرەکەی، هەروەك ئەو کەسەی حەجی ئیفراد ئەکات.

١- لە جابیرەوە خوای لـێ ڕازی بێت هاتوە فەرمویەتی: پێغەمبەر ﷺ حەج و عومەرکەی بەسەریەکەوە کردو یەك طەوافی بۆ کردن. (ترمذي) گێڕاویەتی‌یەوەو پلەی (حسن) ی بۆ داناوە.

٢- لە ئیبنوعومەرەوە هاتوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (مَن أهَلَّ بِالحَجِّ وَالعُمرَةِ، أجزَأهُ طَوَافٌ وَاحِدٌ وَسَعيٌ وَاحِدٌ) رواه الترمذي وقال حسن صحيح غريب، وأخرجه الدارقطني وزاد (وَلا يَحِلُّ مِنهُمَا حَتَّى يَحِلَّ مِنهُمَا جَمِيعاً). واتە: هەر کەس ئیهلالی بۆ حەج و عومرە کرد طەوافێکی بەسەو یەك سەعی نێوان صەفا ومەروەی بەسە، وە لە زیادەکەی (دارقطني) دا هاتووە: نابێ خۆی بکاتەوە لە هیچیاندا هەتا لە هەردوو کیان ئەبێتەوە.

٣- موسلیم ئەگێڕێتەوە: کە پێغەمبەر ﷺ بە عائیشەی فەرمووە: (طَوافُكَ بِالبَيتِ، وَبَينَ الصَّفَا وَالمَروَةِ يَكفِيكَ لِحَجِّكَ وَعُمرَتِكَ). واتە: یەك طەوافت بە دەوری بەیت داو یەك سەعی نێوان صەفاو مەروەت بەسە بۆ حەج و عومرەکەت.

ئەبوحەنیفە بۆ ئەوە چووە کە ئەبێ ئەو کەسە دوو طەواف و دوو سەعی صەفاومەروە بکات. بەڵام ڕای یەکەم لە پێش ترە لەبەر بەهێزی بەڵگەکەی.

٤- هەروەها لە حەدیسەکەدا بەڵگە هەیە لەسەر ئەوەی کە موتەمەتیع و قارین قوربانیان لەسەرە، وە بچوکترین شتیش کاوڕێکە، وە هەرکەس قوربانی نەبوو ئەبێ سێ ڕۆژ لە حەج بەڕۆژوو بێت، وە حەوتیش کە گەڕایەوە ناو کەس‌وکاری. وە چاکتر وایە ئەو سێ ڕۆژە لەسەرەتای دە ڕۆژەکەی مانگی ذی الحجة دا بە

ڕۆژووبێت، پێش ڕۆژی عەرەفە. وە هەندێ لە زانایان هەیە ڕێ ئەدا کە لەسەرەتای مانگی شەووالەوە دروستە ئەو کەسە بە ڕۆژوو بێت. لەوانە (طاوس) و موجاهید.

ئیبنوعومەر خوایان لێ ڕازی بێت ڕای وەهایە کە ڕۆژێك پێش تەرویەو ڕۆژی تەرویەو، و ڕۆژی عەرەفە بە ڕۆژوو بێت. بەڵام ئەگەر کەسێك لەو ڕۆژانەدا بە ڕۆژوو نەبوو یا هەندێکی گرت پێش جەژن، ئەوە بۆی هەیە ڕۆژانێك کە پێی ئەڵێن (أيام التشريق) بەڕۆژوو بێت. بە پێی ئەوەی کە عائیشەو ئیبنوعومەر خوایان لێ ڕازی بێت فەرمویانە: ڕێ نەدراوە کەس لە (أيام التشريق)دا بەڕۆژوو بێت ئیللا کەسێك نەبێت کە قوربانی پێ نەبوو (بوخاری گێڕاویەتیەوە).

وە ئەگەر ڕۆژوی ئەو سێ ڕۆژەی چوو لە حەجدا ئەبێ دوایی بیان گێڕێتەوە.

بەڵام حەوت ڕۆژەکە: ئەڵێن: کە گەڕایەوە وڵاتی خۆی بەڕۆژوو ئەبێت، وە ئەڵێن: کە گەڕایەوە لای بارەگاکەی. جا لەسەر ڕای دوایی لە ڕێگاشدا بە ڕۆژوو بێت صەحیحە. ئەمەش بۆچونی موجاهید و عەطائە، وە پێویست نیە ئەو دە ڕۆژە بەسەر یەکەوە بگیرێ. وە ئەگەر کەسێك نیێتی هێناو ئیحرامی بەست بۆی هەیە تەلبیە بکات.

## (التلبية) لبيك ووتن:

**حوکمەکەی:**

زانایان هەموو لەسەر ئەوەن کە تەلبیە مەشروعە. لە ئومو سەلەمەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتوە فەرمویەتی: گوێم لە پێغەمبەر ﷺ بووە ئەیفەرموو: (يَا آلَ مُحَمَّدٍ! مَن حَجَّ مِنكُم فَلْيُهِلَّ فِي حَجِّهِ أو حَجَّتِهِ) رواه أحمد وابن حبان. واتە: ئەی ئالی محمد! هەر کەس لە ئێوە حەجی کرد با بەدەنگی بەرز لەبەیك بکات.

بەڵام زانایان جیاوازیان هەیە لە حوکمەکەیدا، وە هەروەها لە کاتەکەیدا، وە لە حوکمی ئەوەدا کە کەسێك دوای بخات، جا شافیعیو ئەحمەد بۆ ئەوە چوون کە سوننەتە، وە پەسەندە لەگەڵ ئیحرام بەستندا بووترێ، وە ئەگەر کەسێك نیێتی حەجی هێناو لەبەیکی نەوت، کارەکانی حەجی دروستە، بێ‌ئەوەی هیچ کەفارەتێکی بکەوێتە سەر، چونکە ئیحرام بەنیێتی ڕوتیش ئەبەسترێ.

حەنەفیەکان ڕایان وەهایە کە تەلبیەو ئەوەی جێی تەلبیە ئەگرێتەوە —لەو شتانە کە لە واتای ئەودان وەك تەسبیحات و هێنانی قوربانی- مەرجێکن لە مەرجەکانی ئیحرام، جا ئەگەر کەسێك ئیحرامی بەستو (لبيك)ەی نەووت یا تەسبیحاتی نەکرد، یا قوربانی نەهێنا ئیحرامەکەی دروست نیە.

ئەمەش لەسەر ئەوە دانراوە: کە ئیحرام بەستن لای ئەمان پێك هاتووە لە نیێتو کارێك لە کارەکانی حەج؛ جا ئەگەر کەسێك نیێتی ئیحرامی حەجی هێناو کارێك لە کارەکانی حەجی بەجێ هێنا، (سبحان

الله)ی کرد یا بە دەنگی بەرز لەبەیکی ووت یا قوربانی لەگەڵ خۆیدا هێناو (لبیك)ی نەووت، ئەوە ئیحرام بەستنەکەی دروستە و بە نەوتنی (لبیك) خوێنی دێتە سەر.

وە ئەوەی بەناوبانگە لە بۆچونی مالیکدا ئەوەیە کە تەلبیەیە (واجبە)، هەرکەس وازی لێ بهێنێ و نەیلێت یا درەنگ دوای ئیحرام بیلێت خوێنی لەسەر ئەبێت.

**شێوەی ووتنی (تلبية) :**

مالیك لە نافیعەوە ئەگێڕێتەوە کە ئیبنوعومەر خوایان لێ ڕازی بێت کە تەلبیەی پێغەمبەر ﷺ: (لَبَّيكَ اللَّهُمَّ لَبَّيك، لَبَّيكَ لاشَرِيكَ لَكَ لَبَّيكَ، إنَّ الحمدَ وَالنِّعمَةَ لَكَ وَالمُلك، لاشَرِيكَ لَك) بووە.

نافیع ووتویەتی: عبدالله ی کوڕی عومەر ئەمەشی پێ زیاد ئەکرد: (لَبَّيكَ، لَبَّيكَ، لَبَّيكَ وَسَعدَيكَ، وَالخَيرُ بِيَدَيكَ، لَبَّيكَ وَالرَّغبَاءُ إلَيكَ وَالعَمَل) واتە: خوایە وەڵامی بانگەوازەکەت ئەدەمەوە سێ جار، و جار لە دووای جار وەڵامت ئەدەینەوە، وە خێر هەمووی بەدەست تۆیەو داوا کردن و پاڕانەوە هەربۆلای تۆیە، وە کردەوەش هەر بۆتۆ ئەنجام ئەدرێت.

زانایان لایان پەسەندە کە هەر ئەو تەلبیەیەی پێغەمبەر ﷺ بوترێ و زیاتر نەبێت، وە لە زیاد کردنیدا جیاوازن، جومهور بۆ ئەوە چوون کە زیاد کردنیش خراپ نییە، وەك چۆن ئیبنوعومەر و صەحابە لێیان زیاد ئەکرد و پێغەمبەریش ﷺ گوێی لێیان بو، وە هیچی نەئەووت. ئەبوداود و بەیهەقی ئەمە ئەگێڕنەوە. بەڵام لای مالیك و ئەبویوسف لە تەلبیەکەی پێغەمبەر ﷺ زیاتر ووتن کەراهەتی هەیە.

**فضل و چاکی تەلبیە:**

١- ئیبنوماجە لە جابیرەوە ئەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (مَا مِن مُحرِمٍ يُضَحِّي يَومَهُ يُلَبِّي حَتَّى تَغِيبَ الشَّمسُ، إلا غَابَت ذُنُوبُهُ فَعَادَ كَمَا وَلَدَتهُ أُمُّهُ). واتە: هەر موحریمێك ئەو ڕۆژە تا ئێوارە تەلبیە بکات گوناهی لەسەر نامێنێ و وەك ئەو ڕۆژەی لێ دێتەوە کە تازە لە دایك ئەبێت.

٢- لە ئەبو هورەیرەوە هاتوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (مَا أَهَلَّ مُهِلٌّ قَطُّ. إلا بُشِّرَ، وَلا كَبَّرَ مُكَبِّرٌ قَطُّ إلا بُشِّرَ) رواه الطبراني وسعيد بن منصور. واتە: هەرکەس بە دەنگی بەرز تەلبیەی کردبێت ئیللا مژدەی پێ دراوە، وە کەس نەبوە (الله أكبر)ی کردبێت ئیللا مژدەی پێ دراوە، ووتیان: ئەی پێغەمبەری خوا بە بەهەشت؟ فەرمووی: بەڵێ.

٣- لە سەهلی کوڕی سەعدەوە هاتوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (مَا مِن مُسلِمٍ يُلَبِّي إلا لَبَّى مَن عَن يَمِينِهِ وَشِمَالِهِ، مِن حَجَرٍ، أو شَجَرٍ، أو مَدَرٍ، حَتَّى تَنقَطِعَ الأرضُ مِن هَا هُنَا وَهَا هُنَا) رواه ابن ماجة والبيهقي والترمذي والحاكم وصححه. واتە: هیچ موسڵمانێك نیە لەبەیك بکات ئیللا چی دارو بەردو چەو هەیە، لەلای ڕاست و چەپیەوە لەبەیك ئەکات هەتا زەوی لێرەو لەوێ ئەپچڕێ.

**پەسەندیەتی ئاشکرا ووتنی:**

١- لە زەیدی کوڕی خالیدەوە هاتوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (جَائَنِي جِبرِيلُ (عليه السلام) فَقَالَ: مُر أصحَابَكَ فَليَرفَعُوا أصوَاتَهُم بِالتَّلبِيَةِ، فَإنَّها مِن شَعَائِرِ الحَجِّ). رواه ابن ماجه، وأحمد، وابن خزيمة، والحاكم، وقال: صحيح الإسناد. واتە: جوبرائیل هاتەلام و پێی ووتم: بە هاوەڵەکانت بڵێ: با دەنگیان بەرز بکەنەوە لە کاتی تەلبیەیە کردندا چونکە تەلبیەیە لە دروشمەکانی حەجە.

٢- لە ئەبو بەکرەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتوە کە لە پێغەمبەر ﷺ پرسیار کرا چ بەشێکی حەج چاکترینە؟ فەرموی: (العَجُّ والثَّجُّ) رواه الترمذي، وابن ماجه. واتە: دەنگ بەرز کردنەوە بە تەلبیەیەو قوربانی کردن.

٣- لە ئەبی حازمەوە هاتوە کە یارەکانی پێغەمبەر ﷺ کە ئیحرامیان ئەبەست نەئەگیشتنە (الروحاء) تاوەکو دەنگیان ئەنوساو (گرِ ئەبوو).

جومهوری زانایان دەنگ بەرز کردنەوەیان بەلاوە پەسەندە لەبەر ئەو فەرمودانە.

مالیك ووتویەتی: ئەوکەسەی تەلبیە ئەکات نابێت لە مزگەوتی جەماعەتدا دەنگ بەرز بکاتەوە بەڵکو ئەبێ هەرخۆی و ئەوەی کە لە تەنیشتی‌یەتی بیبیستێ، ئیللا لە مزگەوتی میناو مزگەوتی حەرامدا نەبێت، چونکە ئەو دوانە دەنگیان تێدا بەرز ئەکرێتەوە بۆ تەلبیەیە. ئەمەش بە نیسبەت پیاوانەوەیە، بەڵام ئافرەتان تەنها خۆیان ئەیبیستن‌و ئەوکەسانەی وا لەدوایانەوەن، وە کەراهەتی هەیە لەوە زیاتر دەنگ بەرز بکەنەوە، عەطاء ووتویەتی: پیاوان دەنگیان بەرز ئەکەنەوە، بەڵام ژنان بۆ خۆیان ئەبێت، وە نابێت دەنگ بەرز بکەنەوە.

**ئەو شوێنانەی پەسەندە تەلبیەیەی تێدا بکرێت:**

**تەلبیەیە پەسەندە لەم شوێنانەدا:**

لەکاتی سوار بوون، یا دابەزین، وە هەر کاتێك چووە شوێنێکی بەرز یا دابەزیەیە دۆڵێك، یا کە گەیشتە کۆمەڵێك سوار، وە لە دوای هەموو نوێژێك‌و پارشێوان. شافیعی ووتویەتی: ئێمە لە هەموو حاڵەتێکدا بە پەسەندی ئەزانین.

**کاتی ووتنی تەلبیەیە:**

ئەوکەسەی کە ئیحرام ئەبەستێ ئەبێ لەو کاتەوە کە ئیحرامەکەی ئەبەستێ دەست بکات بە (لبیك) ووتن هەتا یەکەم بەرد ئەهاوێتە جەمرەی عەقەبە لە ڕۆژی قوربانی‌دا، ئەمجار واز لە ووتنی ئەهێنێت، چونکە پێغەمبەر ﷺ هەتا گەییوە بە کۆمەڵە بەردەکە هەر (لبیك)ی فەرمووە. (جماعة) ڕیوایەتیان کردووە. ئەمەش بۆچونی ثەوری و حەنەفی‌یەکان‌و شافیعی‌و جومهوری زانایانە.

ئەحمەدو ئیسحاق ووتویانە: ئەبێ حاجی هەتا هەموو کۆمەڵە بەردەکان ڕەمی ئەکات هەر تەلبیەیە بکات، پاشان واز بهێنێت، مالیك ووتویەتی: ئەبێ حاجی (لبیك) بکات هەتا ڕۆژ لەنیوەی ئاسمان لا

ئەدات لە ڕۆژی عەرەفەدا، ئینجا تەلبیەیە ئەبڕێت، ئەمە بە نیسبەت حەج کردنەوەیە، بەڵام ئەوانەی عومرە ئەکەن ئەبێ هەتا بەردە ڕەشەکە دەست لێ ئەدەن هەر تەلبیەیە بکەن.

لە ئیبنوعەبباسەوە خوا لێیان ڕازی بێت هاتوە کە: پێغەمبەر ﷺ لە عومرەدا کاتێ بەردە ڕەشەکەی ئیستیلام ئەکرد لە تەلبیەیە ئەوەستا، (ترمذي) گێڕاویەتیەوەو وتویەتی: (حديث حسن صحيح) وە بەشی زۆری زانایانیش کار بەم حەدیسە ئەکەن.

**پەسەندیەتی سڵاوات دان لەسەر پێغەمبەر ﷺ لە پاشاندا پاڕانەوە:**

لە قاسمی کوڕی محمدی کوڕی ئەبی بەکرەوە هاتوە کە پەسەندە بۆ پیاو —کاتێ تەلبیەکەی تەواو کرد— سڵاوات بدات لەسەر پێغەمبەر ﷺ. وە پێغەمبەر ﷺ کاتێ لە تەلبیەیە ئەبۆوە داوای لێ‌خۆش بوون و ڕازی بوونی خوای ئەکرد، و داوای لێ‌خۆشبونی بۆ خەڵکیش ئەکرد، (طبراني)و جگە لەو گێڕاویانەتەوە.

**ئەوەی کە ڕەوایە بۆ موحریم**

**١- خۆشۆردن و گۆڕینی جل و بەرگی ئیحرام:**

لە ئیبراهیمی نەخەعیەوە هاتوە وتویەتی: هاوەڵانی ئێمە کە ئەگەیشتنە بیری مەیمون خۆیان ئەشۆری وە چاکترین جلیان کە هەیان بوو لەبەر ئەکرد، وە لە ئیبنوعەبباسەوە خوا لێیان ڕازی بێت ئەگێڕنەوە کە چۆتە گەرماوی جوحفەوە بە موحریمی، پێیان وت: ئەچیتە گەرماوەوە بە جلی ئیحرامەوە؟ ووتی: خوا هیچ لە چڵك و پیسی ئێمە ناکات.

لە جابیرەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتوە کە فەرمویەتی: موحریم ئەتوانێ خۆی و جلەکانی بشوات، لە عبداللەی کوڕی حونەینەوە هاتوە: کە ئیبنوعەبباس و میسوەری کوڕی مەخرەمە لە ئەبواء کێشەیان لێ پەیا بوو، چونکە ئیبنوعەبباس ئەیووت: موحریم بۆی هەیە سەری بشوات میسوەریش ئەیوت موحریم بۆی نیە سەری بشوات، عبد الله ئەڵێت: ئیبنوعەبباس منی نارد بۆ لای ئەبو ئەییوبی ئەنصاری. سەیرم کرد خۆی ئەشوات لەسەر بیرێك، قوماشێکی کردبوو بە پەردە، منیش سڵاوم لێ‌کرد ووتی: ئەوە کێیە؟ ووتم: من عبداللەی کوڕی حونەینم. ئیبنوعەبباس ناردومی بۆ لات ئەپرسێ: پێغەمبەر ﷺ کاتێ موحریم بوو چۆن خۆی ئەشۆری؟ ئەڵێ: ئەبو ئەییوب بە دەست پەردەکەی لادا هەتا سەری دەرکەوت، ئەمجار بەو کەسەی ووت کە ئاوی بەسەریا ئەکرد: ئاوبڕێژە بەسەرما، ئەویش ئاوی ئەکرد بەسەریاو بۆخۆشی سەری هەڵئەگلۆفی، بۆ پێشەوەو بۆ دواوە، ئینجا ووتی: پێغەمبەرم ﷺ بینیوە، ئاوهای کردووە، جەماعەت گێڕاویانەتەوە جگە لە (ترمذي).

بوخاری لە ڕیوایەتێکی تردا ئەمەی لێ زیاد کردووە: گەڕامەوە بۆلایان پێم ڕاگەیاندن. میسوەر بە ئیبنو عەبباسی ووت هەرگیز موجادەلەت لەگەڵ ناکەم.

شەوكانی ووتویەتی: حەدیسەكە ئەبێتە بەڵگەی ئەوەی كە موحریم دروستە خۆی بشۆریو كاتی خۆشتنەكە بە دەست سەری داپۆشێ.

ئیبنومونذیر ووتویەتی: زانایان هەموو كۆن لەسەر ئەوەی كە واجبە موحریم كاتی لەش گرانی خۆی بشوات، وە لەسەر كاتی تر جیاوازیان هەیە.

مالیك لە (الموطأ)دا لە نافیعەوە ئەگێڕێتەوە: كە ئیبنوعومەر خوایان لێ ڕازی بێت بە موحریمی سەریشی نەئەشۆری، مەگەر ئیحتیلام ببوایە. وە لە مالیكەوە ئەگێڕنەوە كە بە كەراهەتی ئەزانی موحریم سەری نقوم بكات لەناو ئاودا.

وە دروستە صابونو ئەو شتانەی چڵك لائەبەن بەكاربهێنێ وەك (أشنان) و (سدر) و (خطمي) (كە ئەمانە چەند جۆرە گیایەكن بۆ پاك و خاوێنی بەكار ئەهاتن).

لە لای شافیعی‌یەكانو حەنبەلی‌یەكان دروستە بە صابونێك خۆی بشوات كە بۆنی هەبێ، وە هەروەها قژكردنەوەو شانەكردنی دروستە. وە پێغەمبەر ﷺ فەرمانی بە عائیشە ئەكرد ئەی فەرموو: (أَنقِضِي رَأْسَكِ وَامتَشِطِي) رواه مسلم. واتە: پرچەكانت بكەرەوەو سەرت دابهێنە بە شانە.

نەوەوی ووتویەتی: پرچ كردنەوەو شانە كردنی لای ئێمە كاتی ئیحرام دروستە، بەشێوەیەك كە موەكان هەڵنەكەندرێت، بەڵام بەبێ هۆ شانە كردن كەراهەتی هەیە، وە قەیناكە كەڵوپەلەكەی بەسەری هەڵبگرێت.

٢- لەپێ كردنی دەرپێی كورت:

بوخاری و سەعیدی كوڕی مەنصور لە عائیشەوە ئەگێڕنەوە كە فەرمویەتی: قەیناكە موحریم دەرپێی كورت لەپێ بكات[١].

٣- دەمو چاو داپۆشین:

شافیعیو سەعیدی كوڕی مەنصور لە قاسمەوە ئەگێڕنەوە كە فەرمویانە: عثمانی كوڕی عەففانو زەیدی كوڕی ثابت و مەروانی كوڕی حەكەم دەمو چاویان دائەپۆشی لە ئیحرامیشدا بوون. وە لە طاووسەوە هاتوە كە: كە موحریم بۆی هەیە لەبەر تەپوتۆز دەمو چاوی داپۆشێ، وە لە موجاهیدەوە هاتوە كە كاتێ بایەكی توند هەڵی ئەكرد دەمو چاویان دائەپۆشیو لە ئیحرامیشدا بوون.

٤- كاڵە لەپێ كردن بۆ ژنان (خفین) :

بەپێی ئەوی ئەبوداودو شافیعی لە عائیشەوە ئەگێڕنەوە كە پێغەمبەر ﷺ ڕێی دابوو ژنان كاڵە لەپێ بكەن.

---

(١) (حافظ) ووتویەتی: ئەوە ڕای عائیشە خۆیەتی چونكە لای بەشی زۆری زانایان جیاوازی نییە لە نێوان شەرواڵو دەرپێی كورتدا كە نابێت موحریم لەپێیان بكات.

٥- سەرداپۆشین بە لە بیرچوون:

شافعی‌یەکان ووتویانە: ئەو کەسەی لەبیری چوو کە موحریمە و سەری داپۆشی، یا کراسی لەبەر کرد هیچ کەفارەتی لەسەر نیە.

عەطاء ووتویەتی: هیچی لەسەر نابێت، بەڵام (أستغفر الله) بکات.

حەنەفی‌یەکان ئەڵێن: قوربانی‌یەکی ئەکەوێتە سەر، وە هەر بەوشێوەیە جیاوازی هەیە لەوەدا کە کەسێك لەبیری بچێت یا بە نەزانی بۆنی خۆش لەخۆی بدات، وە شافعی‌یەکان ڕایان وایە کە نەزانی‌و لە بیر چونەوە بە هانەن و ڕێی ئەوە ئەگرن کە فیدیە واجب بکات لەسەر ئەو کەسانەی کە شتی قەدەغە کراو ئەکەن، بەمەرجێ ئەو کارە لەناو بردن نەبێت وەك ڕاو کردن، هەروەها سەرتاشین‌و نینۆك کردن لەسەر ڕاسترین قسە لایان، وە باسی ئەمانەش لەشوێنی خۆیدا بە درێژی ئەکرێت.

٦- کەڵە شاخ گرتن‌و دوومەڵ تەقاندن و دان هەڵکێشان‌و دەمار برین:

سابتە کە پێغەمبەر ﷺ موحریم بووە‌و لە تەوقی سەری کەڵەشاخی گرتووە[1]، مالیك ووتویەتی: بۆ موحریم خراپ نی‌یە دومەڵ تەقاندن و برین پێچان و دەمار برین ئەگەر پێویست بوو، ئیبنوعەبباس خوایان لێ ڕازی بێت فەرمویەتی: موحریم ئەتوانێ دانی هەڵکەنێ و برین بتەقێنێ و هەڵی بکەنێ، ئەوەوی ووتویەتی: ئەگەر موحریم بیەوێ کەڵە شاخ لە خۆی بگرێ بێ ئەوەی پێویست بێت، ئەوە ئەگەر مووی پێوە قرتا حەرامە، لەبەر قرتاندنی مووەکە، بەڵام ئەگەر مووی پێوە نەقرتا لای جومهوری زانایان دروستە، بەڵام مالیك بە کەراهەتی داناوە. وە لە حەسەنەوە هاتووە: کە ئەوکەسە فیدیەی لەسەرە ئەگەر موشی پێوە نەقرتێ، وە ئەگەر پێویست بوو دروستە با موشی پێوە بقرتێ، بەڵام فیدیەی لەسەر واجب نەبێت، وە (ظاهري)یەکان فیدیەیان تایبەت کردووە بە قژی سەرەوە‌و بەس.

٧- خوراندنی سەر و لەش:

لە عائیشەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتوە کە پرسیاری لێ کراوە ئایا موحریم بۆی هەیە خۆی بخورێنێ؟ فەرمویەتی: بەڵێ، با خۆی بخورێنێ بە توندی. بوخاری و موسلیم گێڕاویانەتەوە.

مالیك ئەمەشی زیاد کردووە کە: ئەگەر دەستم بەسترابێت و هیچم دەست نەکەوێ خۆمی پێ بخورێنم قاچم نەبێت، بە قاچ خۆم ئەخورێنم.

وێنەی ئەوەش لە ئیبنوعەبباس و جابیرو سەعیدی کوڕی جوبەیرو عەطاء و ئیبراهیمی نەخەعی‌یەوە گێڕراوەتەوە.

٨، ٩- سەیری ئاوێنەکردن و بۆن کردنی ڕیحانە:

---

(١) ئیبنوتەیمی‌یە ووتویەتی: ئەمەش ناکرێت مەگەر بە تاشینی هەندێك لە موی سەر نەبێت.

بوخاری ئەگێڕێتەوە لە ئیبنوعەبباسەوە خوا لـێیان ڕازی بێت کە فەرمویەتی: موحریم بۆی هەیە بۆنی ڕیحانە بکات و سەیری ئاوێنە بکات و خۆی تەداوی بکات بە خواردنی زەیت و چەوری.

لە عومەری کوڕی (عبدالعزیز)ەوە هاتوە کە سەیری ئاوێنەی کردووە لەکاتێکدا کە موحریم بووە، وە هەروەها سیواکیشی کردووە، وە ئیبنوموندیر ووتویەتی: زانایان کۆن لەسەر ئەوەی کە موحریم بۆی هەیە زەیت و چەوری و ڕۆن بخوات، وە کۆن لەسەر ئەوەی کە بۆی نییە بۆنی خۆش لە هیچ شوێنێکی لەشی بدات، مالیکی‌یەکان و حەنەفی‌یەکان ڕایان وایە مانەوە لەشوێنێکدا کە بۆنی خۆش و عەتری تێدا بێت کەراهەتی هەیە، جا مەبەستی بۆن کردن بێت، یان مەبەستی بۆن کردن نەبێت وەك یەکە.

لای حەنبەلی‌یەکان و شافیعی‌یەکان: ئەگەر مەبەستی بۆن کردن بێت حەرامە، بەڵام ئەگەر مەبەستی بۆن کردن نەبێت و بۆنەکە بەسەر لوتیدا بێت ئەوە قەیناکە. وە شافیعی‌یەکان ووتویانە: دروستە موحریم دابنیشێ لای عەتتار و لەو شوێنەی بۆنەکە بڵاو ئەکاتەوە، چونکە بەرگری کردن لەوە زۆر گرانە، وە لەبەر ئەوەی ئەو بۆنە نیە کە مەبەستە، بەڵام پەسەند وەهایە کە خۆی بپارێزێ، مەگەر لە شوێنێك بێت کە هۆی نزیك بونەوە بێت لە خواوە، وەك دانیشتن لای کەعبەوە کاتێ گوڵاو پرژێن ئەکرێ، ئەوە کەراهەتی نی‌یە، چونکە دانیشتن لای کەعبەوە هۆی نزیکیە لەخواوە، جا پەسەند نی‌یە واز لێ هێنانی لەبەر شتێکی ڕەوا.

وە موحریم بۆی هەیە بۆنی خۆش هەڵبگرێ لە پارچەدا یان لە شووشەداو هیچ فیدیەی نایەتە سەر.

١٠،١١- پشتێن بەستن بۆ پاراستنی پارەی خۆی و کەسانی ترو ئەنگوستیلە لە پەنجە کردن:

ئیبنوعەبباس فەرمویەتی:خراپ نیە موحریم جزدان بە پشتێنەوە هەڵبگرێ و ئەگوستیلەش لە پەنجە بکات.

١٢- چاو ڕشتن:

ئیبنوعەبباس خوا لـێیان ڕازی بێت فەرمویەتی: دروستە موحریم چاو بەکل برێژێ لەبەر چاویەشە، بە مەرجێ بۆنی خۆشی پێوە نەبێت، وە هەروەها چاویشی ئازاری نەبێت هەر دروستە. وە زانایان ئیجماعیان کردووە کە بۆ تەداوی دروستە نەك بۆ جوانی.

١٣- چوونە بە سێبەری چەتر یا چادر یا سێبەری سەقف و ئەو جۆرە شتانە بۆ موحریم:

عبدالله ی کوڕی عامیر ووتویەتی: لەگەڵ عومەردا ڕۆیشتم خوای لێ ڕازی بێت پێستەیەکی ئەدا بەسەر درەختێکداو ئەچووە بەر سێبەرەکەی کاتێ موحریم بوو. ئیبنوئەبی شەیبە تەخریجی کردووە.

لە ئومو حوصەینەوە خوا لـێی ڕازی بێت هاتوە فەرمویەتی: لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ حەجم کردووە لە حەجی ماڵ ئاوایی‌دا؛ ئوسامەی کوڕی زەیدو بیلالم ئەبینی کە یەکێکیان ڕەشمەی حوشترەکەی پێغەمبەری گرتبوو، ئەوی تریان کراسەکەی بەرز کردبوەوە کردبوی بە سێبەر بۆ پێغەمبەر ﷺ، هەتا ڕەمی جەمەرەی عەقەبەی کرد، ئەحمەد و موسلیم تەخریجیان کردوە.

عەطاء ووتویەتی: موحریم بۆی هەیە سێبەر بۆ خۆی دروست بکات لەبەر تینی گەرما، وە خۆی لە باو باران بپارێزێ. وە لە ئیبراهیمی نەخەعی‌یەوە هاتوە کە ئەسوەدی کوڕی یەزید پارچە قوماشێکی گرتبوو بەسەریەوە لەبەر بارانو موحرەمیش بوو.

١٤- بەکارهێنانی خەنە:

حەنبەلی‌یەکان ڕایان وایە کە خەنە لەسەر موحریم حەرام نی‌یە، موحرەمەکە نێر بێت یان مێ یەکسانە، وە دروستە هەموو ئەندامێکی لەش لە خەنە بگرێت، تەنها سەری نەبێت.

وە شافیعی‌یەکان ووتویانە: دروستە پیاو خەنە بەکار بهێنێ لە کاتی ئیحرامدا بۆ هەموو ئەندامەکانی لەشی، جگە لە دوودەستەو دوو پێی نەبێت کە دروست نی‌یە خەنەیان لێ بدات، لەبەر پێویستی نەبێت، هەروەها نابێت سەریشی بە خەنەیەکی ئەستور داپۆشێ.

وە بە کەراهەتیان داناوە ئافرەت لە ئیحرامدا خەنە بەکار بهێنێ، مەگەر لەکاتی عیددەی مردنی مێردەکەیدا بێت. ئەوکاتە لەسەری حەرامە، هەروەها بە حەرامیان داناوە خەنە بە شێوەی نەخشونیگار لە دەستی خۆی بدات، با ئەو ئافرەتە لەکاتی عیددەی مردنی مێردەکەشیدا بێت. وە لای حەنەفی‌یەکان و مالیکی‌یەکان: دروست نی‌یە موحریم خەنە بەکار بهێنێ، لە هەر ئەندامێکی لەشیدا بێت، جا ئەو موحرەمە پیاو بێت یان ژن یەکسانەو جیاوازی نی‌یە.

لەبەر ئەوەی ئەو خەنەیە بۆنی خۆشە و موحرەمیش لێی قەدەغە کراوە، کە بۆنی خۆش بەکار بهێنێ. لە خەولەی کچی حەکیمەوە هاتوە لە دایکی‌یەوە کە پێغەمبەر ﷺ بە ئومموسەلەمەی فەرموو: (لا تَطَيَّبِي وأنتِ مُحرِمَةٌ، وَلا تَمَسِّي الحِنَّاءَ فَإِنَّهُ طِيبٌ) رواه الطبراني في الكبير، والبيهقي في المعرفة، وابن عبد البر في التمهيد. واتە: لەکاتی ئیحرامدا بۆنی خۆش لە خۆت مەدە، هەروەها خەنەش بەکار مەهێنە، چونکە ئەویش هەر بۆنی خۆشە.

١٥- لێدانی خزمەتکار بە مەبەستی تەمێ کردن:

لە ئەسمائی کچی ئەبو بەکرەوە هاتوە کە فەرمویەتی: لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ چوین بۆ حەج هەتا گەیشتینە عەرج ـ کە شوێنێکە لەنێوان مەککە و مەدینەدا ـ ، جا پێغەمبەر ﷺ لای دا و ئێمەش لەگەڵیدا لامان دا، جا عائیشە لە تەنیشت پێغەمبەرەوە ﷺ دانیشت منیش لە تەنیشت ئەبوبەکرە دانیشتم، شتومەکی پێغەمبەرو ئەبوبەکر هەر یەکێك بوو، وە لای خزمەتکارێکی ئەبو بەکر بوو، ئەبو بەکر دانیشت چاوەڕوانی هاتنی خزمەتکارەکەی ئەکرد، پاشان خزمەتکارەکە پەیدا بوو، بەڵام ووشترەکەی لەگەڵ نەبوو، ئەبوبەکر پێی ووت: ئەوە کوا ووشترەکەت؟ ئەویش ووتی: ئەمشەو ونم کردووە، ئەبوبەکر فەرموی: یەك ووشترێك وون ئەکەیت؟! ئینجا دەستی کرد بە لێدانی، پێغەمبەر ﷺ زەردەخەنەی ئەکرد و

ئەیفەرموو : سەیری ئەو موحریمە بکەن چی ئەکات؟ ئیتر پێغەمبەر ﷺ ئەیفەرمو: سەیری ئەوموحریمە بکەن چی ئەکات و پێ ئەکەنی، و لەوە زیاتریشی نەئەفەرمو. ئەحمەدو ئەبو داودو ئیبنوماجە گێڕاویانەتەوە.

١٦- کوشتنی مێش و گەنەو مێروولە:

لە (عطاء)ەوە هاتووە کە پیاوێك پرسیاری لەبارەی مێرولەوە لێ کرد کە بەسەر لەشیا ئەڕوات ئەویش لە ئیحرامدایە، ئەویش پێی ووت: ئەوەی کە لە لەشی خۆت نی یە لێی بکەرەوە.

ئیبنوعەبباس خوایان لێ ڕازی بێت فەرمویەتی: قەیناکا پیاو لە ئیحرامدا گەنە و حەلەمە کە لە گەنە گەورەترە بکوژێت، هەروەها دروستە موحریم گەنە لە ووشتر لێ بکاتەوە.

لە عیکریمەوە هاتووە کە ئیبنوعەبباس فەرمانی پێ کرد گەنە لە ووشترێك لێ بکاتەوە کە لە ئیحرامیشدا بوو، عیکریمەش پێی ناخۆش بوو ئەو کارە بکات، ئیتر ئیبنوعەبباس پێی فەرموو: دە هەڵسە سەری ببڕە، ئەویش سەری بڕی، ئیبنوعەبباس پێی فەرموو: دایکت نەمێنێ، ئەوە چەند گەنەو جانەوەرت پێوە کوشت.

١٧- کوشتنی پێنج فاسقەکان و هەموو ئەو شتانەی کە زیانیان هەیە بۆ خەڵك.

لە عائیشەوە هاتوە فەرمویەتی: پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (خَمسٌ مِنَ الدَّوَابِّ كُلُّهُنَّ فَاسِقٌ يُقتَلنَ فِي الحَرَمِ: الغُرَابُ، وَالحَدأَةُ، وَالعقرَبُ، وَالفَأرَةُ، وَالكَلبُ العَقُورُ) رواه مسلم والبخاري وزاد (الحَيَّةُ). واتە: پێنج جانەوەر فاسقن و لە حەرەمدا ئەکوژرێن: قەلەڕەش و کوڵارە و دووپشك و مشك و سەگی قەپاڵ گر. لە ریوایەتەکەی بوخاریدا (ماریش).

زانایان هەموو لەسەر ئەوە ڕێکن کە قەلەڕەشی ناو کشتوکاڵ لەوانە نییە، کە باڵندەیەکی بچووکە دانەوێڵە ئەخوات، وە سەگی قەپاڵگریش هەموو ئەو حەیوانانە ئەگرێتەوە کە خەڵك ئەگرێت و ئەیان ترسێنێ و دەست درێژیان بۆ سەر ئەکات وەك: شێرو پڵنگ و گورگ. بەپێی فەرموودەی خوای گەورە کە ئەفەرموێ: ﴿يَسْـَٔلُونَكَ مَاذَآ أُحِلَّ لَهُمْۖ قُلْ أُحِلَّ لَكُمُ ٱلطَّيِّبَـٰتُۙ وَمَا عَلَّمْتُم مِّنَ ٱلْجَوَارِحِ مُكَلِّبِينَ تُعَلِّمُونَهُنَّ مِمَّا عَلَّمَكُمُ ٱللَّهُۖ﴾ (المائدة/٤). واتە: لێت ئەپرسن کە چییان بۆ حەڵاڵە، تۆش بڵێ: شتی پاکتان بۆ حەڵاڵە، وە هەروەها هەرچی ئەو دڕندەو پەلەوەرانە بۆتانی گرت کە فێری ڕاوتان کردون بەوشێوەیەی کە خوا فێری ئێوەی کردووە.

حەنەفی یەکان ئەڵێن: ووشەی (کلب) هەر سەگ ئەگرێتەوەو شتی تر ناگرێتەوە جگە لە گورگ.

ئیبنوتەیمی یە ووتویەتی: موحریم بۆی هەیە ئەو شتانە بکوژێ کە عادەت وایە ئازاری خەڵك ئەدەن، وەك مارو دووپشك و مشك و قەلەڕەش و دڕندە، وە هەروەها بۆی هەیە ئەو ئادەمیزادانەی ئازاری پێ ئەگەیەنن لە خۆی دوور بخاتەوە، وە هەروەها حەیوانی چوارپێش، هەتا ئەگەر کەسێك پەلاماری داو لێی دوور

نەکەوتەوە بەشەڕ نەبێت، بۆی هەیە شەڕی لەگەڵدا بکات، چونکە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (مَن قُتِلَ دُونَ مَالِهِ فَهُوَ شَهِيدٌ، وَمَن قُتِلَ دُونَ دَمِهِ فَهُوَ شَهِيدٌ، وَمَن قُتِلَ دُونَ دِينِهِ فَهُوَ شَهِيدٌ، مَن قُتِلَ دُونَ حُرمَتِهِ فَهُوَ شَهِيدٌ). واتە: هەرکەس لە پێناوی ماڵەکەیدا بکوژرێ شەهیدە، وە هەرکەس لە پێناوی خوێنیدا بکوژرێ شەهیدە، وە هەرکەس لەپێناوی ئایینیدا بکوژرێ شەهیدە، وە هەر کەس لە پێناوی حورمەتیدا بکوژرێ شەهیدە.

وە ووتویەتی: ئەگەر کەسێك کێچ و ئەسپێ گەزتیان بۆی هەیە بیان گرێت‌و فرێیان دا، وە بۆشی هەیە بیان کوژێ‌و هیچی ناکەوێتە سەر، هەرچەندە فرێ دانیان هێواش ترە لە کوشتنیان، هەروەها ئەگەر ئەو گیان لەبەرانەی تووش بوو کە خودی خۆیان حەرامن، وەك شێرو پڵنگ، بۆی نی‌یە بیانکوژێت، وە ئەگەر کوشتنی ئەوە هیچی لەسەر نابێت، بە پێی ڕاستترین قسەی زانایان، بەڵام خۆ دوژین بەبێ ئازار نابێ بیکات چونکە بۆ خۆشی‌یە، وە ئەگەر کردیشی هیچی لەسەر نابێت.

ئەو شتانەی لە کاتی ئیحرامدا حەرامن:

یاسا دانەری ئیسلام چەند شتێکی لەسەر موحریم حەرام کردووەو بەرگری کردوە لە کردنیان، وا لە خوارەوە باسیان ئەکەین:

١- چوونە لای ئافرەت و ئەو کارانەی کە پاڵ پێوە نەرن بۆ چوونە لا، وەك: ماچ و دەست لێدان بە ئارەزووەوە و ئەو قسانەی کە پیاو لەگەڵ ئافرەتدائەیکات و پەیوەندی بە چونەلاوە هەیە.

٢- خراپە کردن و تاوان کردن، و ئەوکارانەی کە ئادەمیزاد لە گوێڕایەڵی خوا دەرئەکات.

٣-شەڕ کردن لەگەڵ هاوڕێ و خزمەتکارو کەسانی تردا.

بنەڕەتی حەرامی ئەمانەش ئەگەڕێتەوە بۆ فەرمودەی خوای گەورە کە ئەفەرموێ: ﴿فَمَن فَرَضَ فِيهِنَّ ٱلۡحَجَّ فَلَا رَفَثَ وَلَا فُسُوقَ وَلَا جِدَالَ فِي ٱلۡحَجِّۗ﴾ (البقرة/١٩٧). واتە: هەرکەس لە مانگەکانی حەجدا ئیحرامی بەست بۆ حەج، ئیتر چوونە لای ژن و دەرچون لە فەرمانی خواو دەمەقاڵێ نابێت بکات لە حەجدا.

بوخاری و موسلیم ئەگێڕنەوە لە ئەبو هورەیرەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (مَن حَجَّ وَلَم يَرفُث، وَلَم يَفسُق، رَجَعَ مِن ذُنوبِهِ كَيَومَ وَلَدَتهُ أُمُّهُ). واتە: هەر کەس حەجی بەجێ هێناو قسەی ناشیاوو کاری نارەوای نەکرد، کە ئەگەڕێتەوە وەك ئەو ڕۆژەی لێ دێت کە تازە لە دایك ئەبێت.

٤- لەبەرکردنی شتی درواو، وەك کراس‌و کڵاوو کەواو شەرواڵ‌و شتی تر، یان لەسەر کردنی شتی درواو وەك مێزەرو کڵاوی طەربوش و ئەو شتانەی ئەکرێنە سەرەوە، هەروەها حەرامە لەبەرکردنی ئەو قوماشانەی کە ڕەنگ کراون بەشتێك کە بۆنی خۆشە، وەك چۆن لە پێ‌کردنی پاپوج و پێڵاو حەرامە.

لە ئیبنوعومەرەوە خوا لـێیان ڕازی بێت هاتوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (لا يَلبَسُ المُحرِمُ القَميصَ، وَلا العِمَامَةَ، وَلا البُرنُسَ، وَلا السَّرَاوِيلَ، وَلا ثَوباً مَسَّهُ وَرسٌ، وَلا زَعفَرَانٌ، وَلا الخُفَّينِ، إلا أن لا يَجِدَ نَعلَينِ فَلِيَقطَعهُمَا حَتَّى يَكُونَا أسفَلَ مِنَ الكَعبَينِ) رواه البخاري ومسلم. واتە: نابێت موحریم کراسو مێزەرو برنس ـ بەرگێکە کە کڵاوەکەی بە خۆیەوە لکاوە ـ و شەرواڵ لەبەر بکات، وە هەر شتێك کە ڕەنگ کرابێت بە شتێك بۆنی خۆشی لـێ بێت، یان زەعفەرانی لێ درابێت، وە نابێت کاڵە لەپێ بکات مەگەر جوتێ نەعلی دەست نەکەوێت ئەو کاتە کاڵەکانی ببڕێتەوە تاوای لـێ دێت لەژێر قوڵە پێکانییەوە بێت.

زانایان کۆن لەسەر ئەوەی کە ئەم قەدەغەکراوانە تەنها تایبەتە بە پیاوەوە. بەڵام ئافرەت وەك پیاو نابێت و بۆی هەیە ئەوانە هەمووی لەبەر بکات و لەسەری حەرام نییە، ئیللا لیباسێك نەبێت کە بۆنی لـێ درابێت یا ڕوبەند بێت یا دەست کێش، بەپێی قسەکەی ئیبنوعومەر ﷺ کە فەرمویەتی: پێغەمبەر ﷺ ڕێی نەدا ئافرەتان لە ئیحرامدا دەست کێش لە دەست بکەن یا ڕوبەند بپۆشن، وە هەروەها ئەو قوماشانەی کە وەرس[1] یا زەعفەرانی لـێ درابوو، جا لەوانە بەو لاوە بۆی هەیە چی پێ خۆشە لە جلی ڕەنگاو ڕەنگ یا حەریر یا خشڵ یا شەرواڵی ژنانە یا کراس لەبەر بکات و کاڵەش لە پێی بکات. ئەبوداود و بەیهەقیو حاکم گێڕاویانەوەو پیاوەکانی پیاوانی صەحیحن.

بوخاری ووتویەتی: عائیشە جلێکی لەبەر کردبوو کە ڕەنگ کرابوو لە کاتی ئیحرامدا، وە دەیفەرموو: ئافرەت دەم هەڵنەبەستێو ڕوبەند نەپۆشێو کراسێك کە وەرسی پێوە بێت یا زەعفەرانی لێ درابێت لەبەر نەکات.

جابیر فەرمویەتی: من ڕەنگ کراو بە عەصفەر بە بۆنی خۆش نازانم.

عائیشە ڕای وەها بووە خشڵ لە خۆدان خراپ نییە، وە هەروەها جلی ڕەشو گوڵدار، وە هەروەها کاڵە (خف) بۆ ئافرەت خراپ نییە،

لە لای بوخاری و ئەحمەد هەر لە جابیرەوە هاتوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (لا تَنتَقِبُ المَرأةُ المُحرِمَةُ، وَلا تَلبَسُ القُفَّازَينِ). واتە: ئافرەتی موحریم نە ئەبێ ڕوبەند بپۆشێ نە دەست کێش لە دەست بکات.

ئەمەش بەڵگەی ئەوەی تێدایە کە ئیحرامی ئافرەت لە ڕوخسارو دەستی دایە، زانایان ووتویانە ئەگەر بەشتێك ڕووی داپۆشی قەیناکە[2].

---

(١) گیایەکی زەردی بۆنخۆشە.

(٢) بە مەرج گرتنی ڕوو دەرخستن لاوازەو هیچ بنەمایەکی نییە، ئیبنوقەییم ئەمەی ووتوە، هەروەها ئەو حەدیسەی کە ئەڵێت: (ئیحرامی پیاو لەسەریایەتی و ئیحرامی ئافرەت لە ڕوییایەتی) ڕاست نییە.

وە دروستە ڕووی لە پیاو داپۆشێ بە چەترو وێنەی چەتر، وە واجبە ڕووی داپۆشێ ئەگەر ترسی فیتنەی هەبێت لەسەیر کردن.

عائیشە فەرمویەتی: سوار بە لاماندا تێئەپەڕی ئێمەش لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ بە ئیحرامەوە بووین، جا کاتێ ئەگەیشتنە لامان و لەگەڵمانا ئەبوون ئەمڕێشتن پەچەکانمان بەرئەدایەوە بەسەر دەم و چاوماندا، وە کە لێمان تێئەپەڕین ڕوومان دەرئەخستەوە. ئەبوداود و ئیبنوماجە گێڕاویانەتەوە.

وە ئەوانەی ئەڵێن پەچە پۆشین دروستە (عطاء) و مالیك و (ثوري) و شافیعی و ئەحمەد و ئیسحاقن.

**ئەو پیاوەی کە جلی ئیحرامی و نەعلی نەبوو:**

ئەو کەسەی نەعل و جلی ئیحرامی نەبوو چی هەبوو لەبەری بکات. لە ئیبنو عەبباسەوە خوا لێیان ڕازی بێت هاتوە کە پێغەمبەر ﷺ لە عەرەفات ووتاری ئەداو ئەیفەرموو: (إذا لم يَجدِ المُسلمُ إزاراً فَليَلبَسِ السَّراوِيلَ، وَإذا لَم يَجدِ النَّعلَينِ فَليَلبَسِ الخُفَّينِ) رواه أحمد والبخاري ومسلم. واتە: هەرموسوڵمانێك بەرکۆشی دەست نەکەوت با شەرواڵ لەپێ بکات، وە ئەگەر نەعلیشی دەست نەکەوت با کاڵە لەپێ بکات.

لە ڕیوایەتێك کە لای ئەحمەدە هاتووە لە عەمری کوڕی دینارەوە: کە (أبا الشعثاء) بۆی گێڕاوەتەوە لە ئیبنوعەبباسەوە کە گوێی لە پێغەمبەر ﷺ بووە فەرموویەتی لە ووتارەکەیدا: هەرکەس بەرکۆشی دەست نەکەوت و شەرواڵی هەبوو با لەپێی بکات، وە هەر کەس نەعلی نەبوو خوفی هەبوو با لەپێی بکات)، ئەڵێ: پێم ووت: ئەی نەیفەرموو: با خوفەکە ببڕێ؟ فەرموی: نەء.

ئەحمەدیش بۆ ئەوە چووەو ڕێی داوە موحریم شەرواڵ و خوف لەپێ بکات، ئەگەر بەرکۆش و نەعلی نەبوو، بەڵگەشی بە حەدیسەکەی ئیبنوعەبباس هێناوەتەوە کە ئەوکەسە فیدیەی نایەتە سەر. ئیبنوحەزمیش ئەمەی تەئکید کردوە.

جومهوری زانایان بۆ ئەوە چوون: کە ئەبێ خوفەکان ببڕدرێن هەتا ژێر قولە پێکانەوە بۆ ئەوانەی نەعلیان دەست نەکەوێت، چونکە خوف بە کورت کردنەوە ئەبێتە نەعل.

بەپێی فەرموودەکەی پێشەوەی ئیبنوعومەر کە لەوێدا ئەفەرموێت: (ئیللا مەگەر جوتێك نەعلی دەست نەکەوێت با خوفەکان بڕێت و کورتیان بکاتەوە هەتا ئەگەنە خوار قولە پێکانەوە.

حەنەفییەکان ڕایان وەهایە کە ئەوکەسەی بەرکۆشی دەست نەکەوێ ئەبێ شەرواڵەکەش هەڵبدڕێ، چونکە ئەگەر وەکو خۆی لە پێی بکات ئەبێ فیدیەی بدات.

مالیك و شافیعی ئەڵێن: نابێ شەرواڵ هەڵبدڕێ، بەڵکو وەك خۆی لەپێی بکات، و فیدیەشی نایەتە سەر؛ بە پێی ئەوەی جابیر کوڕی زەید ئەگێڕێتەوە لە ئیبنو عەبباسەوە خوایان لێ ڕازی بێت کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: ئەگەر کەسێك بەرکۆشی نەبوو با شەرواڵ لەپێ بکات، وە ئەگەر نەعلی نەبوو با خوف لەپێ بکات، بەڵام بیان بڕێت هەتا کورت ئەبێتەوەو ئەگاتە خوار قولەپێکانیەوە. نەسائی بە

سەندێکی صەحیح گێڕاویەتی‌یەوە، وە ئەگەر کەسێك شەڕواڵی لەپێ کرد پاشان بەرکۆشی دەست کەوێ، نەبێ شەڕواڵەکە لاببات‌و بەرپۆشەکە بپۆشێ، بەڵام ئەگەر سەرشانی دەست نەکەوت نابێت کراس لەبەر بکات چونکە بە کراس سەرشان دروست ئەکرێ، بەڵام بە شەڕواڵ ئیزار دروست ناکرێ.

٥- ژن مارە کردن بۆ خۆی یا بۆ کەسێکی تر بە وەکالەت یا بە سەرپەرشتی:

ئەو عەقدە پوچەڵەو شوێنەوارە شەرعی‌یەکانیشی لەسەر دانامەزرێ، بەپێی ئەوەی موسلیم و جگە لەو نەگێڕنەوە لە عشمانی کوڕی عەففانەوە خوا لــێی ڕازی بێت کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (لايَنكِحُ المُحرِمُ، وَلا يُنكَحُ. وَلا يَخطُبُ) رواه الترمذي وليس فيه (ولا يخطب) وقال: حديث حسن صحيح. واتە: موحریم نە ژن مارە ئەکات، نە بۆ خۆی مارە ئەکرێت ئەگەر ئافرەت بوو. وە نە داوای ژن ئەکات.

هەندێ لە یارەکانی پێغەمبەر ﷺ بەوە کاریان کردووە، وە مالیك‌و شافیعی‌و ئەحمەدو ئیسحاقیش وەها دەڵێن، وە ڕایان وایە کە موحریم نابێت ژن بهێنێ، وە ئەگەر هێنای پوچەڵە.

وە ئەوەی هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ (مەیمونەی هێناوە بە موحریمی) ئەمە بەو حدیسە بەرپەرچ دراوەتەوە کە موسلیم ریوایەتی کردووە کە ئەفەرموێ: (پێغەمبەر ﷺ کاتێ هێناریتی موحریم نەبووە)، (ترمذي) ووتویەتی: جیاوازی‌یان هەیە لەوەدا کە پێغەمبەر ﷺ چۆن بووە کە مەیمونەی هێناوە، چونکە پێغەمبەر ﷺ لە ڕێگای مەککە هێناریتی، جا هەندێك ووتویانە: کاتێك پێغەمبەر ﷺ مارەی کردوە حەلاڵ بووە، وەکاتێك بڵاوبۆتەوەو ئاشکرا بوە موحریم بووە، پاشان کە گواستوێتی‌یەوە لە (سرف) لە ڕێگای مەککە هەر حەلاڵ بووە.

حەنەفی‌یەکان بۆ ئەوە چوون کە موحریم بۆی هەیە ژن مارە بکات چونکە ئیحرام ڕێ لە گوڼجانی ژن ناگرێ کە مارە بکرێ، بەڵکو ڕێی چوونە لای لــێ‌ئەگرێ، نەك ڕێی دروستی (عقد) پەیمانی مارە کردنەکە بێت.

٦،٧- نینۆك کردن‌و موو لــێ‌کردنەوە: (جا بە تاشین بێت یان بە هەڵکەندن) یا بە هەر ڕێگایەکی تر بێت، قژی سەر بێت یا مووی شوێنێکی تری.

بەپێی فەرمودەی خوای گەورە کە ئەفەرموێ: ﴿وَلَا تَحْلِقُوا۟ رُءُوسَكُمْ حَتَّىٰ يَبْلُغَ ٱلْهَدْىُ مَحِلَّهُۥ﴾ (البقرة/١٩٦). واتە: سەرتان مەتاشن هەتا قوربانی‌یەکان ئەگەنە شوێنی خۆیان.

زانایان ئیجماعیان کردوە کە حەرامە لەسەر موحریم نینۆك کردن بەبێ بەهانە، بەڵام ئەگەر نینۆك شکا، بۆی هەیە شکاریەکە لــێ بکاتەوە بێ ئەوەی خوێنی بێتە سەر، وە دروستە موو لــێ کردنەوە ئەگەر مانەوەی زیانی پێ بگەیەنێت، بەڵام فیدیەی دێتە سەر، ئیللا لابردنی مووی چاو نەبێت ئەگەر ئازاری بە

موحریم گەیاند بۆی هەیە لـێی بکاتەوە بێ ئەوەی فیدیەی بێتە سەر[1]، خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿فَمَن كَانَ مِنكُم مَّرِيضًا أَوْ بِهِۦٓ أَذًى مِّن رَّأْسِهِۦ فَفِدْيَةٌ مِّن صِيَامٍ أَوْ صَدَقَةٍ أَوْ نُسُكٍ﴾ (البقرة/١٩٦)، ئەمە لە شوێنی خۆیدا ڕوون ئەکرێتەوە.

٨- بۆن دان لە لەش و جلو بەرگ، جا ژن بێت یا پیاو یەکسانە :

لە ئیبنوعومەرەوە خوا لـێیان ڕازی بێت هاتوە کە (عمر) بۆنێکی خۆش هات بە لوتیا لە موعاویەوە کە موحریم بوو، (عمر) پێی فەرموو: بگەڕێرەوە بیشۆرەوە، چونکە من لە پێغەمبەرم ﷺ بیستووە کە فەرموویەتی: (الحَاجُّ الشَّعِثُ التَّفِل) رواه البزار بسند صحيح. واتە: حاجی ئەبێت قژ هەڵچوو بێ بۆن بێت.

وە بەپێی ئەوەی کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (أمَّا الطِّيبُ الَّذِي بِكَ فَاغسِلهُ عَنكَ ثَلاثَ مَرَّاتٍ). واتە: ئەو بۆنەی پێتەوەیە سێ جار بیشۆرەوە.

کاتێکیش موحریم مرد، نابێ بۆنی خۆش نە بکرێتە ناوی شتنەکەیەوە نە بدرێ لە کفنەکەی[2]. بەپێی فەرمودەی پێغەمبەر ﷺ کە دەربارەی ئەو کەسەی بە موحریمی مرد فەرمویەتی: (لا تُخَمِّرُوا رَأسَهُ، وَلا تَمَسُّوهُ طِيباً، فَإنَّهُ يُبعَثُ يَومَ القِيَامَةِ مُلَبِّياً). واتە: سەری دامەپۆشنو بۆنی لـێ مەدەن، چونکە ڕۆژی دوایی کە زیندو ئەکرێتەوە بەدەم (لبیك) ووتنەوە زیندو ئەکرێتەوە.

بەڵام ئەو بۆنەی کە بەلەشەوە یا بەجلەوە ئەمێنێتەوە کە پێش ئیحرامەکە لـێی داوە هیچ زیانی نیە. وە بۆن کردنی ئەو شتانەی کە بۆ بۆن بەکار ناهێندرێن دروستە، وەك سێوو بەهێ، چونکە ئەمانە لە ڕووەکەکانی تر ئەچن لەوەدا کە بۆ مەبەستی بۆن بەکارناهێنرێن، و بۆنیشیان لێ دروست ناکرێ. بەڵام حوکمی ئەوکەسەی کە بۆنی کەعبەی بەرئەکەوێو لە ئیحرامدایە، سەعیدی کوڕی مەنصور ئەگێڕێتەوە لە صالحی کوڕی کەیسانەوە کە ووتویەتی: ئەنەسی کوڕی مالیکم بینیوە کاتێك لە ئیحرامدا بوە جلەکانی لەبۆنی کەعبەی بەرکەوتووە و نەیشۆریوە.

لە عەطائەوە ئەگێڕێتەوە کە ووتویەتی: ناشۆرێو هیچ زیانی نیە، وە لای شافیعیەکان هەرکەس بەقەستی چووە بەر ئەوبۆنە، یان تێوەی چوو ئەشی توانی بیشۆرێ، و هەوڵی ئەوەی نەدا ئەوە خراپی کردووەو فیدیەی دێتە سەر.

٩- پۆشینی جلێکی ڕەنگ کراو بەشتێك کە بۆنی خۆشی لێ بێت:

(١) مالیکیەکان ئەڵێن فیدیەی دێتە سەر

(٢) ئەبوحەنیفە ڕێی داوە.

زانایان هەموو لەسەر ئەوەن کەحرامە پۆشینی شتێك ڕەنگ کرابێ و بۆنی خۆشی هەبێت. مەگەر ئەوشتە شۆرا بەجۆرێك کە بۆنەکەی نەمێنێ، ئەوە دروستە. لە نافیعەوە لە ئیبنو عومەرەوە خوا لـێیان ڕازی بێت هاتوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (لا تَلبَسُوا ثوباً مَسَّهُ وَرسٌ، أو زَعفَرانٌ إلا أن يَكُونَ غَسِيلاً) رواه ابن عبدالبر، والطحاوي. واتە: لە کاتی ئیحرامدا قوماشێك مەپۆشن کە وەرس و زەعفەرانی لێ درابێ، مەگەر شۆرابێ.

کەراهەتی هەیە بەشۆراویش کەسێکی پێشەوای چاو لـێ کراو بیپۆشێ نەك عەوام کاتی ئیحرام بیپۆشن بە بۆنەکەیەوە، بە پێی ئەوەی مالیك لە نافیعەوە گێڕاویەتییەوە: کە گوێی لە ئەسلەم ـ خزمەتکاری عومەری کوڕی خطاب ـ بوە بۆ عبداللە ی کوڕی عومەری ئەگێڕایەوە ئەیووت: عومەری کوڕی (خطاب)، (طلحة)ی کوڕی (عبيد الله) ی بینی قوماشێکی ڕەنگ کراوی پۆشیبوو بە موحریمی، (عمر) پێی فەرموو: ئەو قوماشە ڕەنگ کراوە چیە ئەی (طلحة)!؟ (طلحة) ووتی: ئەی گەورەی موسڵمانان بە مەدەر ڕەنگ کراوە، (عمر) فەرموی: ئێوە -ئەی کۆمەڵی صەحابە! ئەگەر پیاوێکی نەزان ئەو قوماشەی بە ئێوەوە بینی ئەوە چونکە پێشەوان، چاوتان لـێ ئەکرێ. ئەڵێت: (طلحة)ی کوڕی (عبيد الله) قوماشێکی ڕەنگ کراوی پۆشیووە بۆ ئیحرام، لەبەرئەوە لەو جۆرە قوماشانە مەپۆشن.

بەڵام بۆن کردنە ناو خواردن لە کاتی کوڵاندندا، یا شتی خواردنەوە بە جۆرێ هیچ بۆن و تام و ڕەنگی نەمێنێ، ئەگەر موحریم بیخوات یا بیخواتەوە، زیانی نیەو فیدیەی نایەتە سەر.

بەڵام ئەگەر بۆنی مایەوەو خواردی ئەوە فیدیەی لەسەر واجب ئەبێت لای شافیعیەکان. وە حەنەفیەکان ئەڵێن: فیدیەی لەسەر نابێت، چونکە مەبەستی ئەوە نەبوە بۆ خۆشی بۆن بەکار بهێنێت.

١٠- ڕاوکردن:

دروستە موحریم ڕاوی ئاوی بکات، خۆی بیکات، ئیشارەتی بۆ بکات، لـێی بخوات. وە حەرامە لەسەری ڕاوکردنی لەسەر ووشکانی بە کوشتن یا سەربڕین یا بە ئیشارە بۆ کردنی، یا شتەکە لەوانەش بێت کە خۆی ئەبینرێ و خۆی ناشارێتەوە، یا ڕێ نیشانی کەسێکی تر بدات ئەگەر نەئەبینرا، یا بچێت هەڵی سێنێ بۆ ئەوەی کەسێکی تر بیکوژێت. وە حەرامە لەسەری شکاندنی هێلکەی باڵندەی ووشکانی وەك چۆن حەرامە لەسەری کڕین و فرۆشتنی ئاژەڵی ووشکانی و دۆشینی شیرەکەی.

بەلگەش لەسەر ئەوانە فەرموودەی خوای گەورەیە: ﴿أُحِلَّ لَكُمْ صَيْدُ ٱلْبَحْرِ وَطَعَامُهُۥ مَتَـٰعًا لَّكُمْ وَلِلسَّيَّارَةِ ۖ وَحُرِّمَ عَلَيْكُمْ صَيْدُ ٱلْبَرِّ مَا دُمْتُمْ حُرُمًا ۗ﴾ (المائدة:/٩٦). واتە: ئەوەی کە لە دەریادا ڕاو ئەکرێ بۆ ئێوە حەڵاڵ کراوە وەهەروەها ئەوەش کە دەریا فڕێی ئەداتە کەنارەوە، بۆ ئەوانەتان کە لە شوێنی

دەریاکەن و بۆ ئەوانەش کە بە ڕێبواری لەوێوە ئەڕۆن. وە نەچیری ڕاوی ووشکانیتان لەسەر حەرامە هەتا لە ئیحرامدا بن.

١١- خواردنی گۆشتی نەچیری ڕاوکراو:

حەرامە لەسەر موحریم لە گۆشتی نەچیری ڕاوی ووشکانی بخوات ئەوەی کە بۆ ئەو ڕاو کرابێ یا بە ئیشارەتی ئەو ڕاو کرابێ یا بە یارمەتی ئەو ڕاو کرابێ. بە پێی ئەوەی بوخاریو موسلیم لە ئەبی قەتادەوە ئەگێڕنەوە: کە پێغەمبەر ﷺ بۆ حەج دەرچوو لە ماڵ صەحابەش لەگەڵیا دەرچوون، جا کۆمەڵێکیانی جیا کردەوە -کە ئەبو قەتادەشیان تێدابوو- پێی فەرمون: لە کەناری دەریاوە بڕۆن هەتا بە یەك ئەگەین. ئەوانیش بە قسەیان کرد، کاتێ تێپەڕین هەموو ئیحرامیان بەست ئەبوقەتادە نەبێت، کاتێ بەڕێگاوە ئەڕۆیشتن کۆمەڵێك کەرە کێویان بینی، ئەبو قەتادە چوو بۆیان دەڵە کەرێکی لێ کوشتن، ئەوانیش دابەزینو لە گۆشتەکەیان خوارد، ئینجا ووتیان: ئێمە گۆشتی نێچیر ئەخۆین و ئیحرامیشمان بەستووە؟ ئیتر ئەو گۆشتەی مایەوە هەڵیان گرتو هاتن بۆ لای پێغەمبەر ﷺ پێیان ووت: ئەی نێرراوی خوا ئێمە ئیحراممان بەست، بەڵام ئەبو قەتادە ئیحرامی نەبەست، دوای ئەوە کۆمەڵێ کەرەکێویمان بینی ئەبو قەتادە پەلاماری دانو یەکێکیانی کوشت، ئێمەش دابەزین لە گۆشتەکەمان خوارد، لەپاشاندا ووتمان: ئایا ئێمە گۆشتی شتی ڕاوکراو ئەخۆینو ئیحرامیشمان بەستووە؟ ئیتر ئەو گۆشتەی مایەوە هەڵمان گرت لەگەڵ خۆماندا، فەرمووی: کەس لە ئێوە پێی ووت بچۆ بۆیان یا نیشانی بدات ووتیان: نەء، فەرمووی: دە ئەو گۆشتەشی ماوەتەوە بیخۆن.

دروستە موحریم گۆشتی ئەو نەچیرە بخوات کە خۆی ڕاوی نەکردووە یا بۆی نەکوژراوە، یا ئەو نیشانی ڕاوچی نەداوە، یا یارمەتی ئەوی تێدا نەبووە، بەپێی ئەوەی (مطلب) لە جابیرەوە ئەگێڕێتەوە خوا لێی ڕازی بێت: پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (صَيدُ البَرِّ لَكُم حَلالٌ وَأَنتُم حُرُمٌ، مَا لَم تَصِيدُوهُ أو يُصَد لَكُم) رواه أحمد والترمذي. واتە: نێچری ووشکانی بۆتان حەڵاڵە کاتێ موحریم بن، مادام خۆتان ڕاوتان نەکردبێ یان بۆ ئێوە نەکوژرابێ.

(ترمذي) ئەڵێت: حدیسەکەی جابیر لێك درەوەیە، وە ئاگامان لێ نیە (مطلب) لە جابیری بیستبێت.

وە هەندێك لە زانایان لەسەر ئەوە کار ئەکەن، وە ڕایان وایە کە قەیناکە موحریم لە گۆشتی شتی ڕاوکراو بخوات ئەگەر خۆی ڕاوی نەکردبێ یا بۆی ڕاو نەکرابێ.

شافیعی ووتویەتی: ئەو فەرموودەیە چاکترین فەرموودەیە لەم بەشەدا ریوایەت کرابێ ـ وە نزیکترینە بۆ قیاس، ئەوەش قسەی ئەحمەدو ئیسحاقە ـ مالیكو جومهوریش بەو پێیە ئەڵێن.

بەڵام ئەگەر خۆی ڕاوی کردبوو یان بۆ ئەو ڕاو کرابو حەرامە پێی، بە ڕازی بوونی خۆی بۆی ڕاوکرابێ یا بێ ڕازی بوونی خۆی. بەڵام ئەگەر کەسێك کە لەئیحرامدا نەبوو شتێکی بۆ خۆی ڕاوکردبێ و مەبەستی کەسێکی موحریم نەبووبێ. لەپاشاندا لە گۆشتەکەی بەشی موحریمێکی دا، یا فرۆشتی پێی، حەرام نیە.

لە (عبدالرحمن) کوڕی عوثمانی تەیمیـیەوە هاتوە ووتویەتی: لەگەڵ (طلحة)ی کوڕی (عبید الله) دا ڕۆشتین ئیحرامان بەستبوو، باڵندەیەکی ڕاوکراویان پێ بەخشی، (طلحة) خۆی ڕاکشابوو، هەندێکمان لـێمان خواردو هەندێکمان لێمان نەخوارد، کاتێ (طلحة) هەڵسا ئەوانەی بە ڕاست دانا کە لـێیان خواردووە، ئینجا فەرمووی: ئێمەش خواردومانە لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ. ئەحمەدو موسلیم گێڕاویانەتەوە.

ئەو فەرموودانەش کە ڕێ لە موحریم ئەگرن لە گۆشتی شتی ڕاوکراو بخوات، وەك حەدیسەکەی صەعبی کوڕی (جثامة)ی (لیثي) کە کەرە کێوی‌یەکی بە دیاری بۆ پێغەمبەر ﷺ نارد ـ لەوکاتەشدا پێغەمبەر ﷺ لە ئەبواء یا لە وەددان بوو ـ بەڵام پێغەمبەر ﷺ گلی نەدایەوە، ئەڵێ: کاتێ پێغەمبەر ﷺ کابرای بینی لە گل نەدانەوەکە تێك چوو فەرمووی: تەنها لەبەر ئەوە گلمان نەدایەوە چونکە موحریم بووین. ئەم حەدیسە وا مانا ئەکرێ کە کەسێکی غەیرە موحریم ڕاوی کردبێ لەبەر خاتری کەسێکی موحریم، تاوەکو ڕێکخستن هەبێت لەنێوان فەرمودەکاندا.

(ابن عبدالبر) ووتویەتی: بەڵگەی ئەوکەسەی کە ئەو بۆچوونەی هەیە، ئەوەیە کە ئەو فەرمودانە صەحیحن کە لەو بارەیەوە هاتوون، وە کاتێکیش بەوجۆرە لێك بدرێنەوە ئیتر دژایەتی جیاوازی لەنێوانیاندا نامێنێت. هەر بەو جۆرەش پێویستە حەمل بکرێن، وە نابێت بەرهەڵستی یەکتریان پێ بکرێ مادام ڕێگایەك هەبێ بۆ ئەوەی کە بە هەردوکیان کار بکرێ، ئیبنوقەییم ئەو بۆ چوونەی تەرجیح داوەو ووتویەتی: شوێنەواری صەحابە بە گشتی بەڵگەی تێدایە لەسەر ئەم ڕون کردنەوەیە.

**حوکمی ئەوکەسەی شتێك بکات لەو شتانەی کە قەدەغە کراون لەکاتی ئیحرامدا:**

هەرکەس بەهانەیەکی هەبوو، وە پێویستی بەوە بوو کارێك لەو کارە قەدەغە کراوانە بەجێ بهێنێ لە ئیحرامدا، جگە لە چوونە لای ژن، وەك سەرتاشین، موو لـێ کردنەوە، لەبەر کردنی جلی درواو لەبەر خۆپاراستن لە گەرما یا لە سەرماو ئەو جۆرە شتانە، ئەبێ ئەو کەسە کاوڕێك سەربڕێ یان شەش هەژار تێر بکات، هەر هەژارێك نیو صاع خواردنی بداتێ، یا سێ ڕۆژ بەڕۆژوو بێت، وە ئەو کەسە ئارەزووی خۆیەتی کامیان ئەکات. وە حەج بەهیچ کام لەو کارە قەدەغە کراوانە بەتاڵ نابێتەوە جگە لە جیماع.

لە (عبدالرحمن)ی کوڕی ئەبی لەیلاوە، لە کەعبی کوڕی عوجرەوە هاتوە: کە پێغەمبەر ﷺ سەردەمی حودەیبی‌یە بەلایا تێ‌ئەپەڕێ و پێی ئەفەرمووێ: (قَد آذاكَ هَوَامُّ رَأسِكَ، قَالَ: نَعَم، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: إحلِق، ثُمَّ اذبَح شَاةً نُسُكاً، أو صُم ثَلاثَةَ أيَّامٍ، أو أطعِم ثَلاثَةَ آصُعٍ مِن تَمرٍ عَلَى سِتَّةِ مَسَاكِينَ) رواه البخاري ومسلم وأبوداود. واتە: جانەوەرەکانی سەرت ئازارت ئەدەن؟ ووتی: بەڵێ، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: دە

سەرت بتاشە لە پاشاندا کاوڕێك بۆ خوا سەر ببڕە، یا سێ ڕۆژ بەڕۆژووبە، یا سێ صاع خورما بدە بە شەش هەژار.

هەر لەوەوە هاتوە لە ریوایەتێکی تردا ووتویەتی: لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ بووم لە ساڵی حودەیبیەیەدا ئەسپێ و ڕشك دابوویە سەرم، هەتا ترسی چاوم هەبوو کوێر بێت، خوای گەورە ئەم ئایەتەی نارده خوارەوە: ﴿فَمَن كَانَ مِنكُم مَّرِيضًا أَوْ بِهِۦٓ أَذًى مِّن رَّأْسِهِۦ فَفِدْيَةٌ مِّن صِيَامٍ أَوْ صَدَقَةٍ أَوْ نُسُكٍ﴾ (البقرة/١٩٦). واتە: جا هەرکەس لە ئێوە نەخۆش بوو یا تووشی ئازارێك بوو لەسەریدا ـ کە پێویستی بە سەرتاشین بو لە کاتی ئیحرامدا ـ ، ئەبێ فیدیە بدات ئەگەر سەری تاشی، جا یا بەڕۆژوو بێت، یا صەدەقە، یا قوربانی‌یەك بکات.

ئەڵێ پێغەمبەر ﷺ بانگی کردم و پێی فەرموم: (إحلِق رَأسَكَ، وَصُم ثلاثةَ أيَّامٍ، أو أطعِم سِتَّةَ مَسَاكِين فَرقاً مِن زَبِيبٍ. أو انسُك شاةً، فَحَلَقتُ رأسي ثُمَّ نَسَكتُ). واتە: سەرت بتاشە، وە سێ ڕۆژ بە ڕۆژووبە، یا خواردنی شەش هەژار مێوژ بە ئەندازەی یەك فەرەق[1] بدە بە هەژاران، یا کاوڕێك بکە بە قوربانی، ئەڵێ: سەرم تاشی و قوربانیەکەم کرد.

شافیعی بێ بەهانەش قیاس ئەکات لەسەر بەهانەدار لە واجب بوونی فیدیەدا، وە ئەبوحەنیفە خوێنی واجب کردووە لەسەر بەهانەدار ئەگەر دەسەڵاتدار بوو، نەك لەسەر بێ دەسەڵات، وەك لە پێشەوە باس کرا.

**ئەوەی هاتووە دەربارەی بڕینی هەندێك لە قژ :**

لە عەطائەوە هاتوە ووتویەتی: کاتێك موحریم سێ موو بەرەو ژووری هەڵکەند لە خۆی، ئەوە خوێنی لەسەر واجب ئەبێت. سەعیدی کوڕی مەنصور گێڕاویەتی‌یەوە.

وە شافیعی لێ‌یەوە ئەگێڕنەوە کە ووتویەتی: بە هەڵکەندنی تاڵە موویەك موددێك خواردنی ئەکەوێتە سەر، وە بە دوو تاڵ موو دوو موددە، بەڵام لە سیان و بەرەو ژوور ئەبێ خوێن بدات.

**حوکمی چەور کردن:**

لە (المسوى) دا هاتوە: خۆ چەور کردن بە ڕۆنی ڕووت، یا بە سرکەی ڕووت، خوێن پێویست ئەکات لای ئەبی حەنیفە جا هەر ئەندامێکی لەشی پێ چەور بکرێ یەکسانە.

لە لای شافیعی‌یەکان: لە چەور کردنی مووی سەرو ڕیشدا بە ڕۆنی بێ بۆن، فیدیە ئەدرێ بەڵام بۆ ئەندامەکانی تری لەش هیچ نادرێ.

---

(١) پێوانەیەکە شانزە ڕیتڵی عیراقی ئەگرێت. وە بریتی‌یە لە سێ صاع.

**کەسێك نەی زانی یا بیری نەبوو جلی تری لەبەر کرد یا بۆنی خۆشی لە خۆی دا تاوانبار نابێت:**

ئەگەر کەسێکی موحریم بەرگێکی تری لەبەرکرد یا بۆنی لەخۆی دا ـ و نەیزانی کە حەرامە، یا لەبیری نەبوو ـ هیچی ناکەوێتە سەر، لە یەعلای کوڕی ئومەییەوە هاتوە ووتویەتی: پیاوێك لەجیعرانە هاتە لای پێغەمبەر ﷺ جبەیەکی لەبەر کردبوو سەرو ڕیشیشی لێ زەرد کردبوو. ووتی: ئەی نێرراوی خوا بۆ عومرە لەسەر ئەم شێوەیە کە ئەیبینی ئیحرامم بەستووە؛ ئەویش فەرمووی: (إغسِل عَنكَ الصُفرَةَ، وَانزع عَنكَ الجُبَّةَ، وَمَا كُنتَ صَانِعاً فِي حَجِّكَ فَاصنَع فِي عُمرَتِكَ) رواه الجماعة إلا ابن ماجة. واتە: سەرو ڕیشت بشۆرە زەردیەکەی لێ بکەرەوەو ئەو جبەیە داکەنە، وە بۆ حەجەکەت چیت کرد بۆ عومرەکەشتی بکە.

(عطاء) ووتویەتی: ئەگەر ئەوکەسە جلی لەبەر کرد یا بۆنی لەخۆیدا ـ بە نەزانی یا بیری نەبوو ـ کەفارەتی لەسەر نیە. بوخاری گێڕاویەتیەوە، ئەمەش بە پێچەوانەی ئەوەیە کە ئەگەر نەچیرێکی ڕاوی بکوژێت ـ لەبیری نەبێ یا نەزانێ کە حەرامە ـ ئەوە سزای لەسەر واجب ئەبێ، چونکە دەستەبەری نەچیر دەستەبەربونی ماڵە، وە دەستەبەر بونی ماڵیش زانین و نەزانین تێیدا وەك یەکە، وەك دەستەبەر بونی ماڵی ئادەمیزاد.

**بەتاڵ بوونەوەی حەج بە جیماع :**

عەلیو عومەرو ئەبی هورەیرە خوا لێیان ڕازی بێت فەتوایان داوە ئەگەر کەسێك موحریم بێت بە حەج و بچێتە لای خێزانی، باکاری حەجەکەیان تەواو بکەن، بەڵام ئەبێ سەر لە نوێ ساڵی ئایندە حەج بکەنەوە، وە قوربانیشیان لەسەر ئەبێت.

ئەبوعەبباسی طەبەری ووتویەتی: ئەگەر موحریم جیماعی کرد پێش یەکەم ئیحرام شکاندن حەجەکەی پوچەڵ ئەبێتەوە، لە عەرەفە وەستابێ یا دوای وەستانی عەرەفە بێت وەك یەکە. وە واجبە لەسەری کارەکانی حەجە پوچەڵەکە بەجێ بهێنێ، وە واجبە ووشترێك بکات بە قوربانیو حەجەکە قەزا بکاتەوە لە ساڵی ئایندەدا، جا ئەگەر ژنەکەش موحریم بو وە بە ئارەزووی خۆی بوو ئەوە ئەبێ ئەو حەجە تەواو بکاتو حەجێکی تریش بکاتەوە، وە هەروەها ئەبێت قوربانیش بدات لای بەشی زۆری زانایان. وە هەندێ لە زانایان بۆ ئەوە چوون کە قوربانییەك بۆ هەردووکیان ئەبێت ئەمەش قسەی عەطائە.

بەغەوی لەشەرحی سوننەدا ووتویەتی: ئەوە بەناو بانگترین قسەی شافیعیە، وە ئەو قوربانیە لەسەر پیاو واجب ئەبێ، وەك دەربارەی کەفارەتی جیماعی ڕۆژی ڕەمەزانیش هەر وای ووتوە. جا ئەگەر چوونەوە بۆ گێڕانەوەی حەجەکە ئەبێ بەجیا بچن نەك وەك جاری یەکەمیان لێ بێتەوەو تووشی جیماع ببنەوە. وە ئەگەر کەسێك دەسەڵاتی ووشترێکی نەبوو ئەبێ مانگایەك بکات، ئەگەر ئەوەشی نەتوانی حەوت سەر مەڕ، ئەگەر هەر نەیتوانی ئەبێ ووشترەکە بخەمڵێنێ بە پارەو پارەکەش بدرێ بە خواردنو بیدات بە هەژاران، هەر هەژارەی موددێك خواردنی بداتێ.

ئەگەر هەر نەیتوانی لە جیاتی هەر موددێك ڕۆژێك بەڕۆژوو بێت.

وە خاوەن ڕاکان ووتویانە: ئەگەر لەپێش وەستانی عەرەفەدا جیماعی کرد، ئەوە حەجەکەی بەتاڵە، وە ئەبێ مەڕێك یان حەوت یەکی ووشترێك سەر ببڕێت. بەڵام ئەگەر لەدووای وەستان لە عەرەفە جیماعەکەی کرد ئەوە حەجەکەی بەتاڵ نابێتەوەو ووشترێکی لەسەرە.

وە (قارن) ئەگەر حەجەکەی بەتاڵ بووەوە چی لەسەر (مفرد) پێویستە ئەوەش لەسەر (قارن)ە، وە کە قەزاشی کردەوە ئەبێ قارین بێت.

قوربانی قیرانیشی لەسەر لا ناچێ.

وە ووتویانە: ئەو جیماعەی پێش ئیحرام شکاندنی یەکەم ڕوو ئەدا حەج بەتاڵ ناکاتەوە، وە قەزاشی لەسەر نیی یە، بەلای بەشی زۆری زانایانەوە.

بەڵام هەندێکیان بۆ ئەوە چوون کە پێویستە قەزای بکاتەوە، ئەوەش قسەی ئیبنو عومەرەو قسەی حەسەنو ئیبراهیمە وە فیدیەشی واجبە بدرێ، وە ئەو فیدیەش بە ووشترە یا کاوڕ؟ جیاوازی هەیە لەوەدا.

ئیبنوعەبباس و عطاء بۆ ئەوە چوون کە ووشتر واجبە کە ئەمەش قسەی عیکریمە و یەکێ لە قسەکانی شافیعی یە، ڕاکەی تر ئەوەیە کە کاوڕ پێویستە ئەمەش بۆچونی مالیکە.

ئەگەر موحریم خەوی بینی یا بیری کردەوە یا سەیری کردو ئاوی هاتەوە هیچی نایەتە سەر لای شافیعی یەکان، ووتوشیانە: کەسێك بە ئارەزووەوە دەستی دا لە ئافرەت یا ماچی کرد: ئەوە ئەبێ کاوڕێك سەر ببڕێ ئاوی بێتەوە یان نا.

لە لای ئیبنوعەبباس خوا لـێیان ڕازی بێت: ئەو کەسە خوێنی لەسەرە، وە موجاهید ووتویەتی: پیاوێك هات بۆ لای ئیبنو عەبباسو ووتی: من کاتێ ئیحرامم بەست بوو خێزانەکەم خۆی ڕازاندبۆوەو هاتە پێش چاوم، منیش خۆمم پێ ڕانەگیرا و ئارەزووەکەم زاڵ بوو بەسەرمدا؟ ئەڵێ: ئیبنوعەبباس پێکەنی هەتا کەوتە سەر پشت ئینجا فەرمووی: تۆ پیاوێکی ئارەزووت زۆرە قەیناکە... ئەوەندە هەیە خوێنێك بڕێژەو حەجەکەت تەواوە. سەعیدی کوڕی مەنصور گێڕاویەتی یەوە.

## سزای ڕاوکردنی نەچیر

خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَقْتُلُوا۟ ٱلصَّيْدَ وَأَنتُمْ حُرُمٌ ۚ وَمَن قَتَلَهُۥ مِنكُم مُّتَعَمِّدًا فَجَزَآءٌ مِّثْلُ مَا قَتَلَ مِنَ ٱلنَّعَمِ يَحْكُمُ بِهِۦ ذَوَا عَدْلٍ مِّنكُمْ هَدْيًۢا بَـٰلِغَ ٱلْكَعْبَةِ أَوْ كَفَّـٰرَةٌ طَعَامُ مَسَـٰكِينَ أَوْ عَدْلُ ذَٰلِكَ صِيَامًا لِّيَذُوقَ وَبَالَ أَمْرِهِۦ ۗ عَفَا ٱللَّهُ عَمَّا سَلَفَ ۚ وَمَنْ عَادَ فَيَنتَقِمُ ٱللَّهُ مِنْهُ ۗ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ ذُو ٱنتِقَامٍ﴾ (المائدة/٩٥). واتە: ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە کاتێ ئێوە لە ئیحرامدان

ڕاو مەکەن‌و نێچیر مەکوژن. جا هەر کەسێکتان بەقەستی ڕاوی کرد سزای ئەوەیە چی کوشتووە شتێك سەر ببڕێ کە هاوتای ئەو شتە بێت کە کوشتوویەتی. ئەویش دوو کەسی دادپەروەر دای‌بنێن. بیکاتە قوربانی بگاتە لای کەعبەو لە پەنایەوە بکرێت، یا کەفارەت بدات، ئەویش دانی خواردن بە هەژارانە، یا ئەوەندەی ئەو کەفارەتە ڕۆژوو بگرێ، بۆ ئەوەی تاڵاوی کردەوەکەی خۆی بچێژێ، ئیتر خوا لەو شتانە ئەبورێ کە ڕابوردووە، وە هەرکەس دووبارەی کردەوە خوا تۆڵەی لێ ئەکاتەوە. وە خوای گەورە بە تواناو تۆڵەسێنەرە. (کەفارەتەکەشی ئەوەندەی نرخی ئەو شتەیە کە سەری ئەبڕێ).

(ابن کثیر) ووتویەتی: ئەوەی جومهوری لەسەرە ئەوەیە ئەو کەسەی بەقەستی ڕاو بکات و ئەوکەسەی لە بیری نەبێت وەك یەکن لە سزادا.

زوهری ووتویەتی: قورئان بەڵگەیە بەسەر ئەو کەسانەوە کە بە قەستی ڕاو ئەکەن، وە سوننەتیش بەڵگەیە بەسەر ئەوانەوە کە لە یادیان ئەچێت.

واتە: قورئان بەڵگەیە لەسەر واجب بوونی سزا لەسەر ئەوانەی کە بە قەستی ڕاو ئەکەن‌و تاوانباریان ئەکات بەوەی ئەفەرمووێ: ﴿لِّيَذُوقَ وَبَالَ أَمْرِهِۦ﴾. وە سوننەتیش هاتووە بە حوکمی پێغەمبەر ﷺ و حوکمی یارەکانی کە واجبە سزای ئەوانەش بدرێ کە بە هەڵەکاری وەها ئەکەن. وەك چۆن قورئان بەڵگە بوو بەسەر ئەوانەوە کە بە دەستی قەست کاری وەها ئەکەن. چونکە نێچیر کوشتن لە ناوبردنە وە لەناو بردنیش ئەبێ زەمانەتی بۆ دابنرێ لە قەستی‌و لەبیر چونەوەدا.

جا ئەوەی بە قەستی بیکات تاوانبارە بەڵام ئەوەی بە هەڵە بیکات لۆمە ناکرێ. وە لە (المسوی)دا ووتراوە: ﴿فَجَزَآءٌ مِّثْلُ مَا قَتَلَ مِنَ ٱلنَّعَمِ﴾. ماناکەی لەسەر قسەی ئەبو حەنیفە ئەوەیە لەسەر ئەو کەسەی نێچیرێك بکوژێ سزایەك پێویستە بە ئەندازەی ئەوەی کە کوشتوویەتی، واتە لە نرخدا وەك یەك بن، بە حوکمی دوو کەسی دادپەروەر: کە یان ئەبێت لە ئاژەڵ بێت‌و بگاتە کەعبەو لەوێ سەر ببڕێ، یان کەفارەت بدات کە ئەویش خواردنی هەژارانە.

وە واتا کەی لەسەر قسەی شافیعی: واجبە لەسەر ئەو کەسانەی نەچیر ئەکوژن سزا بدرێن، جا ئەو سزایە یا شتێکە وەك ئەوەی کە کوشتویەتی لە شکل و شێوەدا، کە ئەبێ لە جنسی ئاژەڵ بێت و دوو کەسی دادپەروەر حوکم بە هاوێنەیەتی بدەن، و بکرێت بە قوربانی، یان کەفارەتێکە ئەوەندەی نرخی ئەو ئاژەڵە، یا ئەوەندەی کەفارەتەکە بە ڕۆژوو ئەبێت.

## داوەری کردنی عومەرو پێشینەکان

لە (عبد الملك) ی کوڕی قەریبەوە هاتوە لە محمدی کوڕی سیرینەوە: کە پیاوێك هاتە لای (عمر)ی کوڕی (خطاب) خوا لێی ڕازی بێت ووتی: من‌و هاوڕێیەکەم بە دوو ئەسپەوە چوین بۆ دۆڵێك، لە ڕێگا

تووشی ئاسکێك بووین هەردووکیشمان موحریم بووین، ئاسکەکەمان کوشت، جا تۆ ڕات چییە؟ عمر بە پیاوێکی تەنیشتی خۆی ووت: وەرە با منو تۆ ئەو حوکمە بکەین، ئەڵێ: هەردووکیان حوکمیان دا بە بزنێك، کابرا ڕۆیشت بەدەم ڕۆیشتنەوە ئەی ووت تا ئەوە گەورەی موسڵمانانە ناتوانێ حوکمێك بدات بۆ ئاسکێك، هەتا پیاوێکی تری بانگ کرد. عمر گوێی لە قسەی کابرا بوو بانگی کردو لێی پرسی سورەتی مائیدە ئەخوێنیتەوە؟ کابرا ووتی: نەء. عمر ووتی: ئەی ئەو پیاوە ئەناسی کە حوکمەکەی دا لەگەڵما؟ ووتی: نا. عمر فەرمووی: ئەگەر بتوتایە سورەتی مائیدە ئەخوێنمەوە بڕێکی چاکم لێ ئەدای.

لەپاشاندا ووتی: خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿يَحۡكُمُ بِهِۦ ذَوَا عَدۡلٖ مِّنكُمۡ هَدۡيَۢا بَٰلِغَ ٱلۡكَعۡبَةِ﴾. ئەو پیاوەش (عبد الرحمن) ی کوڕی عەوفە.

پێشینان بۆ نەعامەیەك ووشترێکیان داناوە، وە بۆ کەرەکێوی و کەڵەکێوی و ئاسکی نێرو ئاسکی مێ مانگایەکیان داناوە.

وە بۆ وەبەرو کۆتر و قومری و کەوو دبس، بۆ هەر یەکەیان کاوڕێك.

وە بۆ کەمتیارێك بەرانێك، وە بۆ ئاسکێك بزنێك، وە بۆ کەروێشکێك کاژیلەیەکی چوار مانگ، وە بۆ ڕێوی‌یەك کاوڕێکی چکۆلە، وە بۆ یەربوع کاژیلەیەکی چوار مانگە.

**ئەگەر سزاکەی نەبوو چی ئەکرێ:**

سەعیدی کوڕی مەنصور لە ئیبنو عەبباسەوە ئەگێڕێتەوە خوا لێیان ڕازی بێت کە دەربارەی فەرموودەی خوای گەورە: ﴿فَجَزَآءٞ مِّثۡلُ مَا قَتَلَ مِنَ ٱلنَّعَمِ﴾ فەرمویەتی: ئەگەر موحریمێك نێچیرێکی ڕاو کرد حوکمی بەوە ئەدرێ کە سزاکەی بدات، جا ئەگەر ئەو کەسە سزاکەی هەبوو سەری ئەبڕێ لە جیاتی ئەو شتەو گۆشتەکەی دابەش ئەکات بەسەر هەژاراندا. وە ئەگەر سزاکەی نەبوو، ئەوە بە پارە نرخەکەی دائەنرێ لەپاشاندا پارەکە هەڵئەسەنگێنترێ بە خواردن و دابەش ئەکرێ، وە ئەگەر ئەوەش نەکرا لەجیاتی هەر نیو (صاع) لەو خواردەمەنی‌یە یەك ڕۆژ بەڕۆژوو ئەبێت، جا کە موحریم شتێکی ڕاوی کوشت، بە پێی ئەو شتە حوکمی ئەدرێ بەسەردا. ئەگەر ئاسکێك یا وەك ئاسکی کوشت ئەوە ئەبێ لە جیاتی ئەو کاوڕێك سەر ببڕێ لەمەککە، پاشان ئەگەر نەی بوو ئەبێ خواردنی شەش هەژار بدات، وە ئەگەر ئەوەشی نەبوو سێ ڕۆژ بەڕۆژوو ئەبێت. وە ئەگەر بزنە کێوی‌یەکی کوشت یا شتێکی وەك ئەو، ئەوە ئەبێ مانگایەك سەرببڕێ، ئەگەر نەیبوو ئەبێ خواردنی بیست هەژار بدات، ئەگەر ئەویشی نەبو ئەبێ بیست ڕۆژ بەڕۆژوو بێت.

ئەگەر ووشترمورغێکی کوشت یا کەرەکێوی‌یەك یا شتێکی وەك ئەو، ئەوە پارێنە ووشترێکی قەڵەوی لەسەرە، وە ئەگەر نەی بووی ئەبێ سی هەژار تێر بکات، وە ئەگەر نەی بوو ئەبێ سی ڕۆژ بەڕۆژوو بێت.

ئیبنوئەبی حاتم و ئیبنوجەریر گێڕاویانەتەوەو ئەوەشیان زیاد کردووە کە خواردنەکە ئەبێ موددێك بێت چونکە مود تێریان ئەکات.

**چۆنیەتی خواردن دانەکەو ڕۆژوو گرتنەکە :**

مالیك ووتویەتی: چاکترین شت کە بیستبێتم دەربارەی ئەو کەسەی نەچیرێك ڕاو ئەکات و حوکم ئەدرێ بە سزاکەی ئەوەیە سەیری ئەو نەچیرە بکرێو نرخەکەی دابنرێ بە خواردەمەنی، پاشان ئەو خواردنە دابەش بکرێ بەسەر هەژاراندا، هەر هەژارێك موددێکی لەو خواردەمەنیە بدرێتێ، یا لە جیاتی هەر مودێك ڕۆژێك بەڕۆژوو ئەبێت، جا سەیر ئەکات تا بزانێت ژمارەی هەژارەکانی چەندە؟ ئەگەر دە هەژار بوو دە ڕۆژ بەڕۆژوو ئەبێت، وە ئەگەر بیست بوو بیست ڕۆژ بەڕۆژوو ئەبێت، ئیتر ژمارەیان هەر چەند بوو هەر بیست ڕۆژ بەڕۆژوو ئەبێت، با زیاتر لە شەست هەژاریش بێت.

**هاوبەشی کردن لە کوشتنی نەچیردا :**

ئەگەر کۆمەڵێك بە قەستی هاوبەشییان کرد لە کوشتنی نەچیرێکدا، یەك سزا زیاتریان لەسەر نابێت، بەپێی فەرموودەی خوای گەورە: ﴿فَجَزَآءٌ مِّثْلُ مَا قَتَلَ مِنَ ٱلنَّعَمِ﴾.

لە ئیبنوعومەر خوا لێیان ڕازی بێت پرسیار کرا لەبارەی کۆمەڵێکەوە کە موحریم بوون و کەمتیارێکیان کوشت؟ فەرموی: ئەبێ بەرانێك سەر ببڕن، ووتیان: هەریەکەمان بەرانێك؟ فەرموی: بەڵکو بە هەمووتان یەك بەران.

**ڕاو کردن لە حەرەمداو دار بڕینی:**

حەرامە بۆ موحریم و جگە لە موحریمیش ڕاوکردن لە حەرەمدا یا ترساندن و دور خستنەوەیان، یا بڕینی ئەو دارو درەختانەی کە عادەتەن خەڵك نەیڕواندون، وە هەروەها ڕووەك و گیا هەتا دڕکیش (إذخر و سنا) ئەبێت، چونکە ئەو دوانە حەڵاڵە بڕین و هەڵکەندنیان و لەناو بردنیان.

بەپێی ئەوەی بوخاری لە ئیبنوعەبباسەوە خوا لێیان ڕازی بێت ئەگێڕێتەوە کە فەرمویەتی: پێغەمبەر ﷺ ڕۆژی فەتحی مەککە فەرمویەتی: (إنَّ هَذَا البَلَدَ حَرَامٌ، لا يُعضَدُ شَوكُهُ، وَلا يُختَلَى خَلاهُ، وَلا يُنَفَّرُ صَيدُهُ، وَلا تُلتَقَطُ لَقِيطَتُهُ إلا لِمُعَرِّفٍ)، فَقَالَ العبَّاسُ: إلا الإذخِرَ فَإنَّهُ لابُدَّ لَهُم مِنهُ، فَإنَّهُ لِلقُيُونِ وَالبُيُوتِ. فَقَالَ: إلا الإذخِرَ). واتە: بەڕاستی ئەم وولاتە حەرامە، دڕکی نابڕێو ڕووەکی نابڕێ و نەچیرەکانی ناترسێنرێ و وون بووی هەڵناگیرێتەوە، مەگەر بۆ دۆزینەوەی خاوەنی ئەبێت. عەبباسی مامی ووتی: (إذخر) ئەبێت کە زۆر پێویستە بۆ ئاسنگەری و خانوو دروست کردن. فەرمووی: جگە لە (إذخر).

شەوكانى ووتويەتى: (قرطبـي) ئەڵێت: زانايان ئەو دارانە تايبەت ئەكەن بە حەرامەوە كە خوا ڕواندونى و ئادەميزاد دەستى لە چاندنياندا نيە. بەڵام ئەو ڕووەكانەى كە بەهۆى ئادەمى‌يەوە دەڕوێن زانايان جياوازن تىٚيدا، جومهور لەسەر ئەوەن كە دروستە بەكارهێنانيان.

شافيعى ووتويەتى: هەموو درەخت و ڕووەكێ سزاى لەسەرە، ئيبنوقودامەش پارسەنگى ئەو ڕايە ئەدات، زانايان لە سەزاى بڕينى جۆرى يەكەمدا واتە: خۆڕسك جياوازى‌يان هەيە: ماليك ووتويەتى: سزاى تێدا نيە بەڵكو ئەو كەسە گوناهبار ئەبێت.

(عطاء) ئەڵێت: داواى لێ بوردن لە خوا ئەكات.

ئەبوحەنيفە ئەڵێت: ئەوەندەى نرخەكەى قوربانى ئەكات.

شافيعى ووتويەتى: بۆ درەختى گەورە ئەبێ مانگا سەر ببڕێ‌و بچوكتر كاوڕ. وە زانايان سوود وەرگرتن لەو لق‌و پەلانەى ئەشكێنەوە، هەروەها ئەو درەختانەى ئەبڕێن بێ ئەوەى ئادەميزاد دەستى تێ‌دا هەبێت، وە ئەو گەڵايانەى ئەكەونە خوارەوە، لەو حەرامى‌يەتيە جيا ئەكەنەوە.

ئيبنوقودامە ووتويەتى: زانايان كۆن لەسەر ئەوەى كە ڕەوايە سوود وەرگرتن لەو ڕووەكانەى كە خەڵك لە حەرەمدا چانديويانە، لە پاقلەو نيسك‌و نۆك‌و دانەوێڵەو ئەوشتانەى كە بۆ بۆن ئەچێنرێن، وە ئەو جۆرانە دروستە ئاژەڵ تێ‌كردنيان‌و هەڵكەندنيان. لە (الروضة الندية)دا هاتووە: ئەو كەسەى موحريم نەبێ لە ڕاو كردنى ناو حەرەم و داربڕينى هيچى ناكەوێتە سەر، ئەوە نەبێت كە گوناهبار ئەبێت. بەڵام ئەوانەى موحريم بن ئەوە ئەو سزايە‌يان لەسەر ئەبێت كە خوا باسى كردووە لە قورئاندا، ئەگەر نەچيرى ڕاو كردبێ، هەروەها هيچى ناكەوێتە سەر لە دارەكانى مەككەدا، چونكە بەڵگەى وەها نەهاتووە حوججەى پێ هەڵسێ، وە ئەوەى ئەگێڕنەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ كە فەرمويەتى: (فِي الدَّوحَةِ الكَبِيرَةِ إذا قُطِعَت مِن أصلِهَا بَقَرَةٌ). واتە: بۆ درەختى گەورە ئەگەر لەبن دەرهێندرا مانگايەك واجب ئەبێت. (ئەم حەديسە صەحيح نيە).

وە ئەوەش كە لە هەندێ لە پێشينەكانەوە ئەگێڕنەوە نابنە بەڵگە، لەپاشاندا ووتويەتى: سەرئەنجام لە نێوان قەدەغە كردنى ڕاوو بڕينى داردا، وە لە نێوان واجب بوونى سزا يا نرخەكەيدا پەيوەندى نيە، ـ قياس ناكرێنە سەر يەك ـ بەڵكو ئەو قەدەغە كردنەكە بە حەقيقەت هەر حەرام بونەكە ئەگرێتەوە، وە سزاو نرخ واجب نابن بە بەڵگە نەبێت، وە هيچ بەڵگەيەك نەهاتووە ئەو فەرموودەيە نەبێت كە فەرمويەتى: ﴿لَا تَقۡتُلُواْ ٱلصَّيۡدَ وَأَنتُمۡ حُرُمٞ﴾. واتە: نەچيرِ ڕاو مەكەن لەكاتێكدا ئيحرامتان بەستبوو.

كە ئەمەش باسى سزا نەبێت هيچى ترى تێدا نيە، كەواتە نابێت شتى تر واجب بكرێ.

**سنووری حەرەمی مەککە :**

حەرەمی مەککە سنورێکی هەیە دەوری مەککەی داوە لە هەر پێنج لاوە نیشانەی بۆ دانراوە. ئەو نیشانانەش بەردی گەورەو بەرزن، ئەوەندەی مەترێك لەم لاولای ڕێگاکانەوە هەڵنراون.

جا سنوورەکەی لە لای باکورەوە (التنعیم)ە، شەش کیلومەتر لە مەککەوە دوورە.

وە لەلای باشورەوە (أضاه)ە، کە دوانزە کیلومەتر لە مەککەوە دوورە.

وە لە لای ڕۆژهەڵاتەوە (الجعرانة)یە کە شانزە کیلومەتر لە مەککەوە دوورە.

وە لە لای باکوری ڕۆژهەڵاتەوە (وادي النخلة)یە کە چواردە کیلومەتر لە مەککەوە دوورە.

وە لە ڕۆژئاوایەوە (الشميسي)یە کە پانزە کیلو مەتر لە مەککەوە دوورە.

(محب الدين الطبري) ووتویەتی: لە زوهرییەوە هاتوە لە (عبیدالله)ی کوڕی (عبدالله)ی کوڕی عوتبەوە ووتویەتی: ئیبراهیم نیشانەکانی حەرەمی داکوتاوەو جوبرائیل نیشانی داوە. ئیتر نەجوڵێندراوە هەتا قوصەی تازەی کردنەوە. پاشان نە جوڵێندرا هەتا پێغەمبەر ﷺ هات، ئەوەبو ساڵی فەتحی مەککە تەمیمی کوڕی ئوسەیدی خوزاعی نارد تازەی کردنەوە. لەپاشاندا دەستی لـێ نەدرا هەتا (عمر) بوو بە خەلیفە، چوار کەسی لە قوڕەیش نارد، ئەوانیش: مەخرەمەی کوڕی نەوفل، سەعیدی کوڕی یەربوع، (حویطب)ی کوڕی (عبدالعزی) و ئەزهەری کوڕی (عبدعوف) بوون، تازەیان کردەوە، لەپاشاندا موعاویەش تازەی کردنەوە. لە پاشاندا عبدالملك فەرمانی بە تازە کردنەوەیان دا.

**حەرەمی مەدینە**

وەك چۆن حەرامە ڕاو کردنو دار بڕین لە حەرەمی مەککەدا، بەو شێوەیش حەرامە ڕاوکردن و داربڕین لە حەرەمی مەدینەدا، لە جابیری کوڕی عبد الله وە خوا لـێی ڕازی بێت هاتوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (إِنَّ إبرَاهِيمَ حَرَّمَ مَكَّةَ، وَإِنِّي حَرَّمتُ المَدِينَةَ مَا بَينَ لابَتَيهَا، لا يُقطَعُ عِضَاهُهَا ولايُصَادُ صيدُها) رواه مسلم. واتە: ئیبراهیم (علیه السلام) مەککەی حەرام کردووە منیش مەدینەم حەرام کردوە، هەرچی لەنێو شاخەکانیدایە، نەدرکی ئەبڕێ، نە نەچیری ڕاو ئەکرێ.

ئەحمەدو ئەبوداود ئەگێڕنەوە لە عەلییەوە خوا لێی ڕازی بێت کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی لەبارەی مەدینەوە: (لايُختَلَى خَلاهَا وَلا يُنَفَّرُ صَيدُهَا وَلا تُلتَقَطُ لُقَطَتُهَا إلا لِمَن أشَادَ بِهَا، وَلا يَصلُح لِرَجُلٍ أن يَحمِلَ فِيهَا السِّلاحَ لِقِتَالٍ، وَلا يَصلُحُ أن تُقطَعَ فِيهَا شَجَرَةٌ، إلا أن يَعلِفَ رَجُلٌ بَعِيرَهُ). واتە: نە ڕووەکی هەڵئەکەندرێ و نە نەچیری ئەترسێندرێ و نە شتی وون بووی هەڵئەگیرێتەوە، مەگەر کەسێك بیەوێ خاوەنەکەی بۆ بدۆزێتەوە، وە دروست نییە بۆ کەس چەکی تێدا هەڵبگرێ بۆ شەڕ، وە دروست نییە داری تێدا ببڕێ مەگەر پیاوێ بیەوێ ئالف بدات بە ووشترەکەی.

وە لە فەرموودەیەکی (متفق علیه)دا هاتووە (الْمَدِينَةُ حَرَمٌ، مَا بَيْنَ عَيْرٍ إِلَى ثَوْرٍ). واتە: مەدینە لە نێوان عەیرو ثەوردا حەرەمە.

هەر لەبارەی مەدینەوە لە ئەبوهورەیرە هاتوە ئەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ هەرچی لە نێوان (لابتین) ئەمسەراو سەری شاخەکانی مەدینەدایە حەرامی کردووە، وە دوانزە میلی بەچوار دەوری مەدینەدا کردووە بە سنور.

(لابتین) بە دوو (لابة) ئەوترێ مەبستیش بە (لابة) بەردی رەشە، چونکە هەردوو لای مەدینە بەردی رەشی لێیە لەلای رۆژهەڵات و رۆژئاوادا.

وە حەرەمی مەدینە بە دوانزە میل دانراوە، درێژ ئەبێتەوە لە عەیرەوە هەتا ثەور، عەیر شاخێکە لای شوێنی ئیحرام بەستنەوە، وە ثەوریش شاخێکە لای ئوحودە لەلای باکوری مەدینەوە.

پێغەمبەر ﷺ رێی داوە بە خەڵکی مەدینە دار ببڕن بۆ ئامێرەکانی جووت و سواریو ئەو شتانەی کە زۆر پێویستن، وە پوشو پەڵاشیش ئەوەندە بدرونەوە کە بەشی ئالفی ئاژەڵەکانیان بکات.

ئەحمەد لە جابری کوری (عبد الله)ەوە ئەگێرێتەوە خوا لێی رازی بێت کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (حَرامٌ مَا بَيْنَ حَرَّتَيهَا، وَحِمَاهَا كُلُّهَا، لا يُقطَعُ شَجَرَةٌ إلا أن يُعلَفَ مِنهَا). واتە: لەنێوان دوولای بەردە رەشە سوتاوەکانیدا حەرەمە، وە سنورەکەشی هەمویەتی، داری نابڕێ بۆ ئاژەڵ نەبێت.

ئەمەیان بە پێچەوانەی حەرەمی مەککەیە، چونکە خەلکەکەی ئەوەندەی بەشیان بکات دەستیان ئەکەوێت، بەڵام خەڵکی مەدینە ئەوەندەیان دەست ناکەوێ کە بێنیازیان بکات لە شتی تر.

وە بۆ راوکردنی نێچیری حەرەمی مەدینە و برینی دارەکەی سزا دانەنراوە، بەڵام ئەو کەسە گوناهبار ئەبێت.

بوخاری لە ئەنەسەوە ئەگێرێتەوە خوا لێی رازی بێت کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (الْمَدِينَةُ حَرَمٌ مِن كَذَا إِلَى كَذَا، لايُقطَعُ شَجَرُهَا، وَلا يُحدَثُ فِيهَا حَدَثٌ، مَن أحدَثَ فِيهَا حَدَثاً فَعَلَيهِ لَعنَةُ اللهِ وَالْمَلائِكَةِ وَالنَّاسِ أجمَعِين). واتە: مەدینە حەرامە لەوێوە بۆ ئەوێ، داری نابڕێ و نابێت هیچی تێدا روویدات، وە هەرکەس شتێکی تازە بەدی هێنراوی تێدا بەدی بهێنێ، نەفرینی خواو فریشتەو هەموو خەڵکی لێ بێ.

وە هەرکەس دارێکی براوەی دۆزیەوە بۆی هەیە هەڵی بگرێ.

لە سەعدی کوری ئەبی وەققاصەوە خوا لێی رازی بێت هاتوە کە ئەو بەرەو کۆشکەکەی ئەچووەوە لە عەقیق، خزمەت کارێکی بینی داری ئەبری، ئەویش شتەکانی لێسەند.

کاتێ سەعد گەرایەوە کەسو کاری بەندەکە هاتن بۆ لای سەعد داوایان لێ کرد شتەکان بداتەوە بە غوڵامەکەیان کە لێی سەندووە.

سەعد ووتی: پەنا ئەگرم بەخوا شتێك بگێڕمەوە كە پێغەمبەر ﷺ پێی دابم، ئیتر شتەكانی نەدانەوە. موسلیم گێڕاویەتیەوە. ئەبوداود و حاكم كە بە (صەحیحی) داناوە گێڕاویانەتەوە كە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (مَن رَأيتُمُوهُ يَصِيدُ فِيهِ شَيئاً فَلَكُم سَلَبُهُ). واتە: هەركەستان بینی ڕاوی تێدا كرد ڕوتی بكەن و شتەكانی بۆ خۆتان.

**ئایا لەسەر زەوی دا حەرەمی تر هەیە؟!:**

ئیبنو تەیمیەیە ووتویەتی: لەودوانە زیاتر لەسەر زەوی دا حەرەمی تر نیە، نە (بيت المقدس) و نە شوێنی تر، جگە لەو دوو حەرەمە، وە بە هیچ شوێنێكی تر ناوترێ (حرم) وەك هەندێ نەفام و نەزان ئەڵێن (حرم المقدس) و (حرم الخليل) چونكە ئەو دوانەو شوێنی تریش حەرەم نین بە ڕێك كەوتنی هەموو موسڵمانان. وە ئەوەی ئیجماعی لەسەرە كە حەرەمە، حەرەمی مەككەیە.

بەڵام مەدینەش حەرەمی هەیە بەڕای جومهوری موسڵمانان، چونكە فەرموودەیەكی زۆر لەوبارەیەوە هاتووە لە پێغەمبەروە ﷺ.

ئیتر موسڵمانان هیچ كێشەیەكیان نەبوە دەربارەی ئەوەی كە حەرەمی سێیەم هەبێت (وجاء) نەبێت كە دۆڵێكە لە (طائف) لای هەندێ لە زانایان حەرەمە[1]. بەڵام لای بەشی زۆری زانایان حەرەم نی یە.

**فەضلی مەككە بەسەر مەدینەدا:**

جومهوری زانایان بۆ ئەوە چوون كە مەككە فەزلی زۆرترە لە مەدینە.

بە پێی ئەوەی ئەحمەدو ئیبنو ماجەو (ترمذي) كە بە صەحیحی داناوە ئەگێڕنەوە لە عبدوڵڵای كوڕی عەدی كوڕی حەمراوە كە خۆی گوێی لە پێغەمبەر ﷺ بووە فەرمویەتی: (وَاللهِ إنَّكِ لَخَيرُ أرضِ اللهِ وَأحَبُّ أرضِ اللهِ إلى اللهِ، وَلَولا أنِّي أُخرِجتُ مِنكِ مَا خَرَجتُ). واتە: سوێند بەخوا تۆ باشترین زەوی خوایت و خۆشەویست ترین پارچە زەویت لای خوا، وە ئەگەر دەریان نەكردمایە بەجێم نەئەهێشتی.

(ترمذي) ئەگێڕێتەوەو بە صەحیحی داناوە لە ئیبنوعەبباسەوە خوا لێی ڕازی بێت كە پێغەمبەر ﷺ بە مەككەی ئەفەرموو: (مَا أطيَبَكِ مِن بَلَدٍ، وَأحَبَّكِ إليَّ، وَلَولا أنَّ قَومِي أخرَجُونِي مِنكِ مَا سَكَنتُ غَيرَكِ). واتە: چەندە وڵاتێكی خۆشیو چەند خۆشەویستی لام، ئەگەر هۆزەكەم دەریان نەدەكردم لێت، لە هیچ شوێنێكی تر جێگیر نە ئەبووم.

**چوونە ناو مەككە بەبێ ئیحرام :**

چوونە ناو مەكە دروستە بەبێ ئیحرام، بۆ كەسێك كە نەیەوێ حەج و عومرە بكات، جا ئەو چوونەی بۆ پێویستی بێت و زۆر جار دووبارە بێتەوە ـ وەك دار فرۆش و پوش فرۆش و ئاوگێڕو ڕاوچی و كەسانی تر ـ

(١) كە شافیعی یە، شەوكانیش تەرجیحی ڕاكەی ئەدات. بەڵام لە لای جومهور حەرەم نیە.

یا دووبارە نەبێتەوە وەك بازرگان و کەسێك کە دیدەنی ئەکات و کەسانی تر، وە چوونەکە لە ترسا بێت یا لە ئاسایش دا یەکسانە.

لە حەدیسی موسلیم دا هاتوە کە پێغەمبەر ﷺ چۆتە ناو مەککەوە مێزەرێکی ڕەشی بەسەروە بووە بەبێ ئیحرام بەستن.

لە ئیبنوعومەرەوە خوا لێیان ڕازی بێت هاتوە فەرمویەتی: لە سەفەرێك گەڕامەوە چوومە ناو مەککەوە بە بێ ئیحرام.

لە ئیبنوشیهابەوە هاتوە ووتویەتی: قەیناکە بێ ئیحرام بەستن چوونە ناو مەککەوە.

ئیبنوحەزم ووتوویەتی: چوونە ناو مەککەوە بەبێ ئیحرام دروستە، چونکە پێغەمبەر ﷺ ئەو شوێنانەی داناوە بۆ ئیحرام بەستنی ئەو کەسانەی کە ئەیانەوی حەج بکەن یا عومرە.

وە دای نەناوە بۆ کەسانێك کە نەیانەوێ حەج یا عومرە بکەن.

خوای گەورە هەرگیز فەرمانی نەداوە، وە هەروەها پێغەمبەرەکەی ﷺ کە کەس نەچێتە ناو مەککەوە بەبێ ئیحرام.

چونکە ئەوە ئەبێتە سەپاندنی شتێك کە لە شەرعدا نەهاتوە.

ئەوەی پەسەندە لە کاتی چونە ناو مەککەو خانەی خوادا:

پەسەندە بۆ چوونە ناو مەککە ئەمانەی خوارەوە بەجێ بهێنرێ:-

١- خۆشۆردن.

لە ئینوعومەرەوە هاتووە کە خۆی ئەشۆرێ کاتێ ئەچووە ناو مەککەوە.

٢- مانەوە بەشەو لە (ذي طوى) لای (الزاهر)ەوە.

چونکە پێغەمبەر ﷺ شەو تێیدا ماوەتەوە.

نافیع ووتوویەتی: ئیبنو عومەر ئەمایەوە تێیدا. بوخاری و موسلیم گێڕاویانەتەوە.

٣- لەلای بەشی سەرووەوە بچێتە ناوی کە پێی ئەوترێ (ثنية كداء).

چونکە پێغەمبەر ﷺ لەلای میعلاتەوە ئەچووە مەککەوە، جا هەرکەس بۆی بلوێت باوەها بکات، ئەگینا چۆن بۆی لوا بەوشێوە بچێتە مەککەوە، وەگوناهبار نابێت.

٤- خێرا بەرەو خانەی خوا بڕوات دوای ئەوەی کەلوپەلەکەی لە شوێنێکی ئەمیندا دانا، وەلە دەرگای بەنی شەیبەوە بچێتە ناوی -باب السلام- بە ملکەچییەوە بلێ: (أعُوذُ بِاللهِ العَظِيمِ وَبِوَجهِهِ الكَرِيمِ، وَسُلطَانِهِ القَدِيمِ، مِنَ الشَّيطَانِ الرَّجِيمِ، بِسمِ الله، اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى مُحَمَّد وَآلِهِ وَسَلِّم، اللَّهُمَّ اغفِر لِي ذُنُوبِي، وَافتَح لِي أبوَابَ رَحمَتِكَ). واتە: پەنا ئەگرم، بەخوای گەورەو ڕووی پیرۆزیو دەسەلاتی دێرینی، لە شەیتانی

نەفرین لێ کراو، بەناوی خوا، خوایە بەزەیی‌و میهرەبانی برژێنە بەسەر موحەممەدو ئالی موحەممەددا ، خوایە لە تاوانەکانم ببورەو دەرەکانی میهرەبانی خۆتم بۆ گوشاد بکە.

٥- ئەگەر چاوی کەوت بە کەعبە دەست بەرز بکاتەوەو بلێ: (اللَّهُمَّ زِد هَذَا البَيتَ تَشرِيفاً، وَتَعظِيماً، وَتَكرِيماً، وَمَهَابَةً، وَزِد مِن شَرَفِهِ وَكَرِّمهُ مِمَّن حَجَّهُ، أَوِ اعتَمَرَهُ، تَشرِيفاً وَتَكرِيماً وَتَعظِيماً وَبِراً)[1] . واتە: خوایە شەرەف و رێزو گەورەیی و سام و شکۆمەندی ئەم خانەیە زیاد بکەیت، وە خوایە شەرەف و رێزی ئەو کەسانەیش زیاد بکەیت کە رێزی لێ ئەگرن و بە پیرۆزی ئەزانن لە حاجی‌و ئەوانەی عومرە ئەکەن.

وە بلێ: (اللَّهُمَّ أنتَ السَّلامُ وَمِنكَ السلام فَحَيِّنَا رَبَّنَا بِالسَّلامِ). واتە: خوایە تۆ سەلامی جا پەروەردگارمان بە ئاشتی و گوێڕایەڵی بمان ژیێنە.

٦- لە پاشاندا بەرەو بەردە ڕەشەکە بچێت و ماچی بکات بەبێ دەنگ. ئەگەر نەی توانی دەستی پێدا بهێنێ و دەستی ماچ بکات. ئەگەر ئەوەشی نەتوانی با ئیشارەتی بۆ بکات بەدەست.

٧- پاشان لەتەنیشتی‌یەوە بوەستێ و دەست بکات بە سوڕانەوە بە دەوریا.

٨- نابێ نوێژی سلاوی مزگەوتی تێدا بکات (تحية المسجد) چونکە تەوافکردن لەجیاتی (تحية المسجد)ە، مەگەر لەوکاتەدا کە گەیشت وەختی نوێژی فەرز بێت جا لەگەڵ ئیمامدا نوێژ دائەبەستێ.

بەپێی فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ کە فەرمویەتی: (إِذَا أُقِيمَتِ الصَّلاةُ فَلا صَلاةَ إلا المَكتُوبَةَ). واتە: کە نوێژی فەرز قامەتی بۆ کرا ئەو نوێژە فەرزە نەبێت نوێژی تر ناکرێت.

هەروەها ئەگەر ترسی چوونی نوێژە فەرزەکەی هەبوو ئەبێ لە پێشدا دەست بکات بە نوێژەکەی.

## سوڕانەوە بەدەوری کەعبەدا (الطواف)

**چۆنیەتی سوڕانەوە:**

١- تەواف کەر دەست ئەکات بە سوڕانەوە بەدەوری کەعبەدا لەکاتێکدا کە ئیحرامی بەستووەو شانی لای کەعبەوە ڕوت ئەکات واتە شانی چەپی لە ڕێکی بەردە ڕەشەکەوە، جا یاماچی ئەکات یا دەستی لێ ئەدا، یائیشارەی بۆ ئەکات، هەر چۆنی بۆ گونجا بەشێوەیەك کە خانەی خوا بکەوێتە لای چەپی‌یەوە بلێت: (بِسمِ اللهِ، وَاللهُ أكبَرُ، اللَّهُمَّ إِيمَاناً بِكَ، وَتَصدِيقاً بِكِتَابِكَ، وَوَفَاءً بِعَهدِكَ، وَاتِّبَاعاً لِسُنَّةِ النَّبِيِّ ﷺ). واتە: بەناوی خوا، خوا لەهەمووشتێ گەورەترە، خوایە باوەڕم بە تۆیەو باوەڕم بە کتێبەکەتە و وەفابە پەیمانەکەت ئەکەم، و شوێن کەوتوی سوننەتی پێغەمبەرەکەتم ﷺ.

---

(١) شافیعی ریوایەتی کردوەو رەفعی ئەکات بۆ پێغەمبەر ﷺ، عومەریش ئەمەی ووتوە.

٢- کاتێ دەستی کرد بە سوڕانەوە واپەسەندە کە لە سێ جاری یەکەمدا لۆقە بکات، بە حۆرێك خێرا بکات لە ڕۆیشتنەکەیدا ، وە هەنگاوەکانی نزیك یەك بێت و نزیك بێت لە کەعبەوە، وە بە عادەتی بڕوات لە چوار خولەکەی دواییدا.

ئەگەر نەی توانی بەلۆقە بڕوات یا نەیتوانی نزیك بێت لە بەیتەوە لەبەر قەرەباڵغی، چۆن بۆی گونجا با وەها تەوافی بکات.

جا وا پەسەندە کە دەست بدات لە (الركن اليماني)، وە لە هەر حەوت خولەکەدا بەردە ڕەشەکە ماچ بکات یا دەستی لێ بدات.

٣- پەسەندە زۆر بپاڕێتەوەو یادی خودا بکات، وە ئەوەندەی خۆی پێی خۆش بوو دوعاو زیکر هەڵبژێرێ، بێ ئەوەی خۆی ببەستێتەوە بە شتێکەوە یا ئەوانە دووبارە بکاتەوە کە تەواف کەران ئەیلێن.

چونکە بۆ ئەوە زیکرێکی دانراوی نییە کە یاسادانەری ئیسلام بۆی دانابێ کە هەر ئەوە بڵێین.

وە ئەوە دوعاو زیکرانەی کە خەڵك لە خولی یەکەمو دوەم و ئەوانەدا ئەیلێن بنەمایەکی شەرعی نیە، وە هیچی لە پێغەمبەرەوە ﷺ نەهاتوە، جا بۆ تەواف کەر هەیە بۆ خۆی و براکانی بپاڕێتەوە بە ئارەزووی خۆی و داوای خێری دونیا و قیامەت بکات، وا لەخوارەوە هەندێ لەو دوعایانەی لەو بارەوە هاتووە باس ئەکەین:

١- ئەگەر ڕووی کردە بەردە ڕەشەکە بڵێ: (اللَّهُمَّ إِيمَاناً بِكَ وَتَصدِيقاً بِكِتَابِكَ، وَوَفاءً بِعَهدِكَ وَاتِّبَاعاً لِسُنَّةِ نَبِيِّكَ، بِسمِ اللهِ، وَاللهُ أكبَر)، لە پێشەوە واتای لێدراوەتەوە، وە ئەم پاڕانەوەیە بە مەرفوعی ئەگێڕنەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ.

٢- ئەگەر دەستی کرد بە سوڕانەوە بڵێ: (سُبحَانَ اللهِ، وَالحَمدُ للهِ، وَلا إِلَهَ إِلا اللهُ، وَاللهُ أكبَرُ، وَلا حَولَ وَلا قُوَّةَ إِلا بِالله ) رواه ابن ماجة.

٣- کاتێ گەیشتە ڕوکنی یەمانی بپاڕێتەوەو بڵێ: (رَبَّنَا آتِنَا فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِي الْآخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ النَّارِ) رواه أبو داود والشافعي عن النبي ﷺ .

٤- شافیعی ووتوویەتی: وام پێخۆشە هەرچەند گەیشتە ڕێکی بەردە ڕەشەکە (الله أكبر) بکات، وە لەکاتی لۆقە کردنەکەدا بڵێ: (اللَّهُمَّ اجعَلهُ حَجاً مَبرُوراً وَذَنباً مَغفُوراً وَسَعياً مَشكُوراً).

وە لە هەموو خولێکی تەوافەکەدا بڵێ: (رَبِّ اغفِر وَارحَم، وَاعفُ عَمَّا تَعلَم، وَأنتَ الأعَزُّ الأكرَمُ اللَّهُمَّ آتِنَا فِي الدُّنيَا حَسَنَةً، وَفِي الآخِرَةِ حَسَنَةً، وَقِنَا عَذَاب النَّار).

لە ئیبنوعەبباسەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتووە کە لەنێوان دوو ڕوکنەکاندا ئەیووت: (اللَّهُمَّ قَنِّعنِي بِمَا رَزَقتَنِي، وَبَارِك لِي فِيهِ، وَاخلُف على كُلِّ غَائِبَةٍ بِخَيرٍ) رواه سعيد بن منصور والحاكم. واتە: خوایە بەوەی

داوتە پێم قەناعەتم پێ بکەیت و لێم پیرۆز بکە، خوایە هەرچیم لە کیس چووە بەخێر جێگایم بۆ پڕ بکەرەوە.

**خوێندنی قورئان لەلایەن تەواف کەرەوە:**

قەیناکە تەواف کەر کاتی تەواف قورئان بخوێنێ، چونکە تەواف بۆ یادی خوا دانراوە و قورئانیش یادی خوایە

لە عائیشەوە خوای لێ ڕازی بێت هاتوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (إِنَّمَا جُعِلَ الطَّوافُ بِالبَيتِ، وَبَينَ الصَّفَا وَالمَروَةِ، وَرَمِيَ الجِمَارِ، لإِقَامَةِ ذِكرِ اللهِ عَزَّوَجَل) رواه أبوداود والترمذي. وقال: حسن صحيح. واتە: تەواف و سەعی صەفا و مەروەو ڕەمی جەمەرات بۆیە دانراوە کە یادی خوای گەورەی تیا بکرێ.

**فەزڵی تەواف:**

بەیهەقی بە ئیسنادێکی (حسن) ئەگێڕێتەوە لە ئیبنو عەبباسەوە خوای لێ ڕازی بێت کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (يُنَزِّلُ اللهُ كُلَّ يومٍ على حُجَّاجِ بَيتِهِ الحَرَامِ: عِشرِينَ وَمِائَةَ رَحمَةٍ، ستِّينَ لِلطَّائِفِينَ وَأربَعِينَ لِلمُصَلِّينَ وَعِشرِينَ لِلنَّاظِرِينَ). واتە: خوای گەورە هەموو ڕۆژێك سەدو بیست ڕەحمەت ئەبارێنێتە خوارەوە بۆ سەر حاجیانی خانەی خۆی، شەستیان بۆ سەر تەواف کەران و چلیان بۆ سەر نوێژ کەران و بیستیان بۆ سەیرکەران.

٥- ئەگەر ئەو کەسە لە حەوت جار سوڕانەوەکە بووەوە لای مەقامی ئیبراهیم دووڕکات نوێژ بکات و ئەم فەرموودەیەی خوای گەورە بخوێنێ: ﴿وَٱتَّخِذُواْ مِن مَّقَامِ إِبۡرَٰهِـۧمَ مُصَلًّىۖ﴾ (البقرة/١٢٥). بەم شێوەیە تەواف کۆتایی دێت.

لە پاشاندا ئەگەر تەواف کەر موفرید بوو ئەو تەوافە ناوئەنرێت بە تەوافی قودوم و تەحیە و تەوافی چونە ناو مەککە. کە ئەوە ڕوکنێك نیەو وا جبیش نیە لە حەجدا.

بەڵام ئەگەر (قارن) بوو یان (متمتع)، ئەوە ئەو تەوافە تەوافی عومرەیە، وە لە جیاتی تەوافی تەحی-یەو قودومیش ئەبێت بۆی، وە لەسەری واجبە عومرەکەی تەواو بکاتج جا سەعی نێوان صەفاو مەروە بکات.

**جۆرەکانی تەواف:**

١- تەوافی هاتنی مەککە (طواف القدوم).

٢- تەوافی هاتنە خوارەوە لە عەرەفاتەوە بەرەو مینا (طواف الإفاضة).

٣- تەوافی خواحافیزی (طواف الوداع). کە لە شوێنی خۆیاندا باس دەکرێن.

٤- تەوافی سوننەت (طواف التطوع).

پێویستە لەسەر حاجی، بوونی لە مەککە بە هەل و دەرفەت بزانێ و تەوافی تطوع زۆر بکات و نوێژ زۆر بکات لە مزگەوتی حەرامدا.

بۆ تەوافی تطوع لۆقەو شان ڕووت کردن نیە. وە سوننەت وەهایە کە سڵاو لە مزگەوتی حەرام بکات بە سوڕانەوە بەدەوریا، هەرکاتێك هاتە ناوی، بەپێچەوانەی مزگەوتانی ترەوە کە سڵاو لێ کردنیان نوێژ کردنە تێیاندا.

وە بۆ تەواف کردن چەند مەرج و سوننەتو ئاداب هەیە وا لە خوارەوە باسیان ئەکەین:

## مەرجەکانی تەواف

بۆ تەواف کردن ئەم مەرجانە پێویستە:

١-خاوێنی لە بێ‌دەست نوێژی گەورەو بچووك و پیسی‌یەتی[1]، بە پێی ئەوەی ئیبنو عەبباس خوایان لێ ڕازی بێت گێڕاویەتی‌یەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (الطَّوَافُ صَلاَةٌ... إلا أنَّ اللهَ تعالي أحَلَّ فِيهِ الكَلاَمَ، فَمَن تَكَلَّمَ، فَلا يَتَكَلَّم إلا بِخَيرٍ) رواه الترمذي و الدارقطني وصححه الحاكم و ابن خزيمة و ابن السكن. واتە: تەواف نوێژە، ئەوەندەی هەیە خوای گەورە قسە کردنی تیا حەڵاڵ کردووە، جا هەرکەس قسە بکات لە کاتی تەوافدا با قسەی باش نەبێت نەیکات.

لە عائیشەوە خوای لێ ڕازی بێت هاتوە کە پێغەمبەر —لەکاتی حەجدا- ڕۆژێك هاتەوە ماڵەوە عائیشە ئەگریا فەرمووی: ئەوە بێ نوێژ بووی: ئەمیش ئەڵێت: بەڵێ. فەرمووی: (إنَّ هَذَا شَيءٌ كَتَبَهُ اللهُ علي بَنَاتِ آدَمَ، فَاقضِي مَا يَقضِي الحَاجُّ، غَيرَ أن لاتَطُوفِي بِالبَيتِ حَتَّى تَغتَسِلِي) رواه مسلم. واتە: ئەوە شتێکە خوای گەورە لەسەر کچانی ئادەم نوسیویەتی، حاجی چی ئەکا تۆیش بیکە بەڵام بەدەوری کەعبەدا مەسوڕێرەوە هەتا پاك ئەبیتەوەو خۆت ئەشۆری.

هەر لە عائیشەوە هاتوە فەرمویەتی: یەکەم شت کە پێغەمبەر ﷺ دەستی پێ کرد —کاتێ هاتە مەککە- دەستنوێژی گرت و پاشان بەدەوری کەعبەدا سوڕایەوە). بوخاری و موسلیم گێڕاویانەتەوە.

هەرکەس پیسی‌یەکی پێوە بوو کە نەیتوانی لێی بکاتەوە وەك ئەوەی میزەچرکێی بێت، وە وەك ئەو ئافرەتانەی کە بەردەوام خوێنیان هەیە، ئەوانە تەواف ئەکەنو هیچیان لەسەر نابێت، بەڕای هەموو زانایان. چونکە نوێژێك تێیدا خێری سەدهەزار نوێژی تری هەیە کە لە مزگەوتی تردا بکرێ.

---

(١) حەنەفی‌یەکان ڕایان وایە کە دەستنوێژ مەرج نیە، بەڵکو واجبەو بە خوێن قەرەبو ئەکرێتەوە، جا ئەگەر بەبێ دەستنوێژ تەوافی کرد ، تەوافەکەی دروستە و مەڕێکی لەسەر واجبە. وە ئەگەر بە لەش گرانی تەوافی کرد ، تەوافەکەی دروستەو ورشتر ـ یا مانگا ـ یکی قەڵەوی لەسەر واجبە، وە مادام لە مەککەدا بێت ئەبێت دوبارەی بکاتەوە، بەڵام پاکی‌یەتی لە پیسی جل‌وبەرگ و بەدەن، ئەوە لەلای ئەوان سوننەتە.

مالیك ئەگێڕێتەوە کە عەبدوڵڵای کوڕی عومەر، ژنێك هاتە لای پرسیاری لێ کرد، ووتی: من هاتووم ئەمەوی تەوافی بەیت بکەم، کاتێ گەیشتمە دەرگای مزگەوت بێ نوێژ بووم، گەڕامەوە هەتا ئەوەم لەسەر لاچوو، لەپاشاندا هاتمەوە هەتا گەیشتمەوە لای دەرگای مزگەوت وام لێ هاتەوە، دوبارە گەڕامەوە هەتا ئەوەم لەکۆڵ بووەوە، لەپاشاندا هاتمەوە هەتا گەیشتمەوە دەرگای مزگەوت دووبارە وام لێ هاتەوە.

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر فەرمووی: ئەوە لەقەیەکە لە شەیتانەوەیە تۆش خۆت بشۆرەو پەڕۆیەك هەڵبگرە بەخۆت پاشان تەواف بکە.

٢- داپۆشینی عەورەت[١]: بە پێی ئەو حەدیسەی ئەبوهورەیرە کە فەرمویەتی: ئەبو بەکری صدیق لەو حەجەدا کە پێغەمبەر ﷺ کردی یە پێشەوا پێش حەجی ماڵ ئاوایی، ناردمی لەگەڵ کۆمەڵێك بۆ ناو خەلکەکە کە هاوار بکەین لە ڕۆژی قوربانی دا بلێین: (لا يَحُجُّ بَعدَ العَامِ مُشرِكٌ، وَلا يَطُوفُ بِالبَيتِ عُريَانٌ) رواه الشيخان. واتە: لەمساڵە بەدواوە ئیتر بێ باوەڕان نایەنە حەج، وە ڕوت و قوتیش بەدەوری کەعبەدا ناسوڕێتەوە.

٣-ئەبێ سوڕانەوەکە حەوت جاری تەواو بێت. جا ئەگەر لە جارێکیانا هەنگاوێکی واز لێ هێناو تەواوی نەکرد، بە تەواف ناژمێررێ.

وە ئەگەر گومانی هەبوو لەسەر کەمەکە دای ئەنێت هەتا یەقینی ببێت لە حەوت جارەکە، وە ئەگەر دوای تەواف گومانی پەیدا کرد هیچی نایەتە سەر.

٤- ئەبێ لەلای بەردەڕەشەکەوە دەست پێ بکات و لای ئەویشەوە کۆتایی پێ بهێنێ.

٥- ئەبێ کەعبە بخاتە لای شانی چەپی‌یەوە. چونکە ئەگەر سوڕایەوەو کەعبە کەوتبوە شانی ڕاستی‌یەوە تەوافەکەی دروست نابێت.

بەپێی قسەکەی جابیر خوا لێی ڕازی بێت کە پێغەمبەر ﷺ کاتێ هاتە مەککەوە چوە لای بەردە ڕەشەکەو دەستی لێ‌دا و لەپاشاندا بەلای ڕاستیا دەستی کرد بە سوڕانەوە، سێ جاریان بە لۆقەو چوار جاریان بە ڕۆیشتنی ئاسایی. موسلیم گێڕاویەتی‌یەوە.

---

(١) لای حەنەفی‌یەکان خۆ داپۆشین واجبە، جا کەسێك کە بە ڕوتی تەواف بکات، تەوافەکەی دروستە، وە ئەبێ دوبارە بکاتەوە مەگەر لە مەککە دەرچوبێت، ئەوسا خوێنی لەسەر واجب ئەبێت.

٦- ئەبێ سوڕانەوەکە لە دەرەوەی کەعبەدا بێت. جا ئەگەر کەسێك لە حیجردا بسوڕێتەوە تەوافەکەی دروست نیەیە، چونکە (حجر)[1] و (شاذروان)[2] هەر لەناو ماڵی بەیتە. جا نابێت لەناو ئە دوانەشەوە بسوڕێتەوە، وە خوا فەرمانی داوە بە دەوری کەعبەدا تەواف بکرێ نەك لەناو کەعبەدا، وە ئەفەرموێ: ﴿وَلْيَطَّوَّفُوا بِالْبَيْتِ الْعَتِيقِ﴾ (الحج/٢٩). واتە: با بەدەوری خانەی دێرینی خوادا بسوڕێنەوە.

وە پەسەندە هەتا بتوانرێ لە نزیك بەیتەوە سوڕانەوە بکرێ.

٧- سوڕانەوەکە بەسەریەکەوە بێت:

لای مالیك و ئەحمەد ئەگەر کەسێك بە کەمێك نێوانیان بخات زیانی نیە با بەبێ بەهانەش بێت، وە هەروەها نێوان خستنی زۆریش بە بەهانەوە هەر زیانی نیەیە.

شافیعی و حەنەفی بۆ ئەوە چوون کە تەواف کردن بەسەریەکەوە سوننەتە.

جا ئەگەر کەسێك نێوان بخاتە نێوانی سوڕانەوەکە بەزۆری بێ بەهانە، ئەوە تەوافەکەی بەتاڵ نابێتەوە، وە لەسەر ئەوەوە دەست پێ ئەکاتەوە کە کردویەتی.

سەعیدی کوڕی مەنصور ئەگێڕێتەوە لە حومەیدی کوڕی زەیدەوە ووتوویەتی: عەبدوللای کوڕی عومەرم بینیوە خوایان لێ ڕازی بێت سێ جار یا چوار جار بە دەوری کەعبەدا سوڕایەوە، لە پاشاندا دانیشت بحەرێتەوە، غوڵامێکی هەبوو باوەشێنی ئەکرد، پاشان هەڵسا تەوافەکەی تەواو کرد لە سەر ئەوەی پێشووەوە.

لە لای شافیعی یەکان و حەنەفی یەکان ئەگەر کەسێك لە کاتی تەواف دا دەستنوێژی شکا واجب نیە لە هەوەڵەوە دەست پێ بکاتەوە، با نێوانەکەشی زۆر بێت.

لە ئیبنوعومەرەوە خوای لێ ڕازی بێت هاتوە کە بەدەوری کەعبەدا سوڕاوەتەوە لەو کاتەدا قامەت کراوە بۆ نوێژ هاتووە لەگەڵ خەڵکەکەدا نوێژەکەی کردووەو لە پاشاندا هاتووەتەوە تەوافەکەی تەواو کردووە لە سەر ئەوەی پێشووی.

وە لە (عطاء)ەوە هاتوە کە ئەی ووت: ئەگەر پیاوێك تەوافی ئەکرد هێشتا تەواوی نەکردبوو جەنازەیەك هات، با بچێت نوێژی لەسەر بکات، پاشان بگەڕێتەوە چەندی ماوە لە سوڕانەوەکە تەواوی بکات.

---

(١) (حجر) : حیجری ئیسماعیلە کە کەوتۆتە باکوری مەککەوە، دیوارێکی بە دەورەوەیە لەسەر شێوەی نیوەبازنەیی، وە هەمو حیجر بە بەیت دانانرێ، بەڵکو ئەو بەشەی کە لە بەیتە ئەندازەی شەش زیراعە: دەوری سێ مەتر.

(٢) (شاذروان) : ئەو بینایەیە کە لکاوە بە بناغەی بەیتەوە کە ئەڵقەکانی بەردەکەی پێوە کراوە.

## سوونەتەکانی تەواف

١- تەواف بەدەوری کەعبەدا چەند سوونەتی هەیە وا لە خوارەوە باسیان ئەکەین:

(١) ڕوکردنە بەردە ڕەشەکە کاتی دەست کردن بە سوڕانەوە لەگەڵ وتنی (الله أکبر) و (لا إله إلا الله)دا، وە دەست بەرز کردنەوە وەك چۆن لە نوێژدا دەست بەرز ئەکرێتەوە، وە دەست لێ دانی بەردە ڕەشەکە بەوەی هەردوو دەستی بخرێتە سەر یا ماچ کردنی، ماچ کردنێك دەنگی لەگەڵدا نەبێت، وە ڕومەت خستنە سەری ئەگەر بۆی لوا، ئەگینا هەر دەست لێ دان و ماچ کردنی دەستی بەسە، یا بە شتێك کە بە دەستی‌یەوە بێت لێی بدرێ و ماچی بکات، یا بە دار دەستێك ئیشارەتی بۆ بکرێ، وە لەو بارەیەوە چەند فەرموودەیەك هاتوون وا هەندێکیان باس ئەکەین:

ئیبنوعومەر خوایان لێ ڕازی بێت فەرمویەتی: پێغەمبەر ﷺ ڕووی کردە بەردە ڕەشەکەو دەستی لێ دا، لەپاشاندا لێوەکانی خستە سەری و زۆر گریا، عومەریش زۆر گریا ئەنجا فەرمووی: ئەی عومەر! (هُنَا تُسكَبُ العَبَرَات) لێرەدا فرمێسك ئەڕێژرێ. حاکم گێڕاویەتی‌یەوە و پلەی (صحیح)ی بۆ داناوە.

لە ئیبنو عەبباسەوە هاتوە کە عومەر خۆی دا بە سەر بەردە ڕەشەکەداو فەرموی: من ئەزانم تۆ تەنها بەردێکی، ئەگەر خۆشەویستەکەم ﷺ نەبینیایە ماچی ئەکردی و دەستی لێ ئەدای، نە دەستم لێ ئەدای و نە ماچم ئەکردی. ﴿لَّقَدۡ كَانَ لَكُمۡ فِي رَسُولِ ٱللَّهِ أُسۡوَةٌ حَسَنَةٌ﴾ (الأحزاب/٢١). واتە: بەڕاستی ئێوە لە پێغەمبەردا ﷺ پێشەواو سەرمەشقی چاکتان هەیە کە لێوەی فێربن و چاوی لێ بکەن. ئەحمەدو جگە لەو گێڕاویانەتەوە بە چەند زاراوەیەك کە لە یەك نزیکن.

نافیع وتوویەتی: ئیبنوعومەرم بینیوە دەستی داوە لە بەردەکەو دەستی ماچ کردوە، وە فەرمویەتی: لەو کاتەوە پێغەمبەرم ﷺ بینیوە وەهای کردووە من وازم لێ نەهێناوە، بوخاری و موسلیم گێڕاویانەتەوە.

سوەیدی کوڕی غەفلە وتوویەتی: عومەرم بینیوە خوا لێی ڕازی بێت بەردەکەی ماچ کردووەو دەستی لێ داوە، وە فەرمویەتی: پێغەمبەرم ﷺ بینیوە کە ئاوا گرنگی پێ داویت. موسلیم گێڕاویەتەوە.

لە ئیبنو عومەرەوە خوا لێیان ڕازی بێت هاتوە کە پێغەمبەر ﷺ ئەهات بۆ بەیت، پاشان دەستی ئەدا لە بەردەکەو ئەی‌فەرموو: (بِسمِ اللهِ وَاللهُ أکبر) رواه أحمد.

موسلیم لە ئەبی طوفەیلەوە ئەگێڕێتەوە فەرمویەتی: پێغەمبەرم ﷺ بینیوە بەدەوری کەعبەدا سوڕاوەتەوە و گۆچانەکەی داوە لە بەردە ڕەشەکەو دوایی گۆچانەکەی ماچ کردووە.

بوخاری‌و موسلیم و ئەبوداوود ئەگێڕنەوە کە عومەر خوا لێی ڕازی بێت هاتووە بۆ لای بەردە ڕەشەکە و ماچی کردووە، پاشان فەرمویەتی: من ئەزانم کە تۆ بەردێکی نەزیان بەخشی نە سوود بەخش. وە ئەگەر پێغەمبەرم ﷺ نەبینیایە ماچی کردووی ماچم نەئەکردی.

(خطابي) ووتوویەتی: ئەم باسە زانستی ئەوەی تێدایە کە شوێن کەوتنی ڕەفتارەکانی پێغەمبەر ﷺ واجبە، هەرچەندە هۆکارەکانی نەزانرێن و مەعقول نەبن.

وە خودی ئەو ڕەفتارانە بەڵگەیە بەسەر ئەوکەسانەوە کە پێیان گەیشتووە با ماناکەشیان نەزانیبێت.

بەڵام بە شێوەیەکی تێکڕایی زاندراوە کە ماچ کردنی ئەو بەردە ڕێز لێنان‌و بە پیرۆز زانین و بەگەورە دانانی‌یەتی.

خوای گەورە هەندێ بەردی پیرۆزتر کردووە لە هەندێکیان، وەك چۆن هەندێك شوێن و وڵاتی گەورەتر کردووە بەسەر هەندێك شوێنی تردا. وە هەروەوەکو چۆن هەندێ شەوو ڕۆژو مانگی بە بەرزتر داناوە. ئیتر ئێمەش ئەبێ تەسلیمی ئەوفەرمانە بین.

لەم بارەیەشەوە شتێك هاتووە کە عەقڵ وەری ئەگرێ‌و وا نیەیە ڕێی لێ بگیرێ و ئینکاری لێ بکرێ، لە هەندێ فەرموودەدا هاتووە: (الْحَجَرُ يَمِينُ اللهِ فِي الأرض). واتە: بەردە ڕەشەکە دەستی ڕاستی خوایە لە سەر زەوی.

واتە هەرکەس دەستی خستە ناو دەستی لە سەر زەوی ئیتر پەیمانی لە لایەن خواوە ئەدرێتێ، ئەوەش وەك ئەو پەیمانانە وەهایە کە پاشاو فەرمان ڕەواکان بە دەست خستنە ناو دەست ئەی بەستن بۆ ئەو کەسانەی کە ئەیانەوێ سەر بەوان بن و تایبەت بن بەوانەوە، وە هەروەها وەك چۆن دەست ئەخرێتە ناو دەستی پاشاکان بۆ بەیعەتکردن.

هەروەها ماچ کردنی دەستی گەورە لەلایەن خزمەتکارو کاربەدەستانەوە ئەوانە وەك نمونەو شێوەی ئەوەن.

(مهلب) ووتویەتی: حەدیسەکەی عومەر بەرپەرچ دانەوەیە بۆ ئەوکەسانەی ئەڵێن: بەردە ڕەشەکە دەستی خوایە لە سەر زەوی و تەوقە لەگەڵ بەندەکانی ئەکات پێی، وە پەنا بەخوا کە خوا ئەندامی هەبێت، بەڵکو ئەو ماچ کردنە دانراوە بۆ تاقی کردنەوە، تا بزاندرێ -بەبینینی چاو- کێ گوێڕایەڵی فەرمانەکانی ئەکات.

ئەوەش وەك باسەکەی شەیتانە کە فەرمانی پێ درا کڕنوش بەرێ بۆ ئادەم، وە کەسیش نازانێ — بە یەقین- کە بەردێك مابێ لەو بەردانەی کەعبە کە ئیبراهیم (عليه السلام) دایناببێ ئیللا ئەو بەردە ڕەشە نەبێ.

## قەرەباڵغی کردن بۆ سەر بەردە ڕەشەکە

قەیناکە قەرەباڵغی و خۆتەکان دان بۆ بەردە ڕەشەکە بەو مەرجەی ئازاری کەس نەدرێت. چونکە ئیبنوعومەر خوا لێی ڕازی بێت پاڵە پەستۆی ئەکرد بۆی هەتا لوتی ئەپژا.

پێغەمبەر ﷺ بە عومەری ئەفەرموو: (يَا أَبَا حَفص! إِنَّكَ رَجُلٌ قَوِيٌّ، فَلا تُزَاحِم على الرُكنِ، فَإِنَّكَ تُؤذِي الضَّعِيفَ. وَلَكِن إِن وَجَدتَ خَلوَةً فَاستَلِم. وَإِلا فَكَبِّر وَامضِ) رواه الشافعي في سننه. واتە: ئەی

باوکی حەفصە تۆ پیاوێکی بەهێزو بەتوانای، پاڵە پەستۆ مەکە بۆ بەردە ڕەشەکە چونکە لاوازەکان ئازار ئەدەیت، بەڵام ئەگەر چۆڵیت بینی ئەوە دەستی لێ بدە. ئەگینا (الله أكبر) بکەو بڕۆ.

(٢)- (الإضطباع)[1] :

لە ئیبنو عەبباسەوە خوا لێیان ڕازی بێت هاتوە کە: پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ یارەکانی لە جیعیڕانەوە عومرەیان کرد ناوەڕاستی ئیحرامەکەیان خستە ژێر باڵیان و لاکانیان دایەوە بەسەر شانی چەپیاندا. ئەحمەدو ئەبوداوود گێڕاویانەتەوە.

ئەمەش بۆچونی جومهورە. وە ووتوویانە: حیکمەتەکەی ئەوەیە کە یارمەتی لۆقە کردن ئەدات لە تەوافدا.

مالیك ووتوویەتی: پەسەند نیە، چونکە ئەوە نەزانراوە کەس نەی کردووە، وە لە نوێژی تەوافدا پەسەند نیە بەڕای هەموان.

(٣)- (الرمل) لۆقە کردن لە خولەکانی یەکەم تا سێیەم، و ڕۆیشتن بە عادەتی لە چوار خولەکانی دواییدا:

لە ئیبنوعومەرەوە خوا لێیان ڕازی بێت هاتوە کە پێغەمبەر ﷺ بە لۆقە ئەڕۆیشت لە بەردە ڕەشەکەوە بۆ بەردە ڕەشەکە سێ جار، وە چوار جاریش لەسەر خۆ ئەڕۆیشت. ئەحمەدو موسلیم ئەگێڕنەوە.

ئەگەر لە سێ جاری یەکەم دا وازی لێ بهێنێ لە چوار جاری دواییدا نای گێڕێتەوە.

وە ئیحرام دان بە شانداو لۆقە کردن تایبەتە بۆ پیاوان لە تەوافی عومرەدا، وە لە هەموو تەوافێکدا کە بۆ حەج بێت و سەعی نێوان صەفاو مەروەی بەدووادا بێت.

لە لای شافیعی یەکان ئەگەر ئیحرامیدا بە شانداو لۆقەی کرد لە تەوافی قودومدا لەپاشاندا سەعی کرد، ئەو شێوەیە دووبارە ناکاتەوە لە تەوافی ئیفاضەدا. وە ئەگەر دوای لۆقەکردن و ئیحرام دان بە شاندا فریای سەعی نەکەوت، وە دوای خست بۆ دوای تەوافی زیارەت، ئەوە ئەبێ لە تەوافی زیارەتا ئیحرام بدات بە شانیداو لۆقە بکات.

بەڵام ئافرەتان ئەو دوو شێوەیەیان لە سەر نیە -لە بەر پێویستی خۆ داپۆشین- بە پێی ووتەی ئیبنوعومەر خوا لێیان ڕازی بێت کە فەرمویەتی: ئافرەتان لۆقە کردنیان لەسەر نیە نە لە سوڕانەوەدا بەدەوری کەعبەدا، وە نە لەنێوان صەفاو مەروەدا. بەیهەقی گێڕاویەتیەوە.

---

(١) خستنی ناوەڕاستی سەرشانەکە لەژێر باڵی ڕاست و دانی لایەکانی بە سەر شانی چەپدا.

**حیکمەتی لۆقە کردن:**

حیکمەتی لۆقە کردن ئەوەیە کە ئیبنو عەبباس خوا لێیان ڕازی بێت ئەگێڕێتەوەو ئەفەرموێ: پێغەمبەر ﷺ لە مەککەوە هات بۆ مەدینە لەرزوتای مەدینە (یثرب) لاوازی کردبوون، بێباوەڕەکان وتیان: کۆمەڵێك دێن بۆ ناوتان لەرزوتا لاوازی کردون و توشی زیان بوون بەدەستیەوە، خوای گەورە پێغەمبەری ئاگادار کرد لەسەر ئەوەی وتیان، جا فەرمانی پێدان کە لە سێ خولی یەکەمدا بە لۆقە کردنەوە بڕۆن وە لەنێوان هەردوو ڕوکنەدا بڕۆن، کاتێ بێباوەڕەکان بەو شێوەیە بینیانن وتیان: ئەمانە ئەوانە بوون کە باستان ئەکردن کە لە رزوتا لاوازیکردون؟ ئەمانە لە ئێمە بەهێزترو دلێرترن.

ئیبنوعەبباس فەرمویەتی: بۆیە فەرمانی پێ نەدان لەهەر حەوت جارەکەدا بە لۆقە کردنەوە بڕۆن لەبەر ئەوەی ماندوو نەبن و توشی زیان نەبن. بوخاری و موسلیم و ئەبوداود گێڕاویانەتەوە وە زاراوەکەشی هی ئەبوداودە.

عومەر خوای لێ ڕازی بێت ویستی ئەو لۆقە کردنە لابەرێ دوای ئەوەی حیکمەتی تێدا تەواو بوو، وە موسڵمانەکان خوا سەری خستن و بەهێزی کردن لە زەویدا، بەڵام دوایی وای بە باش زانی کە بێنێتەوە وەکو سەردەمی پێغەمبەر ﷺ، بۆ ئەوەی هەموو نەوەکان یەك بەدوای یەکدا بەجێی بهێنن و بیبینن.

(محب الدین الطبري) وتویەتی: جاری وا هەیە شتێك لە فەرمانەکانی ئایین دروست ئەبێت بەهۆیەکەوە، لەپاشاندا ئەو هۆیەش نامێنێ، بەڵام حوکمەکەی هەر ئەمێنێ.

لە زەیدی کوڕی ئەسلەمەوە هاتوە لە باوکیەوە کە وتویەتی: گوێم لە عومەری کوڕی (خطاب) بووە خوا لێی ڕازی بێت ئەیفەرمو: ئیتر ئەم لۆقە کردنە بۆ چی لەگەڵ ئەم شان ڕووت کردنەدا؟ لە کاتێکدا کە خوای گەورە ئاینی ئیسلامی چەسپاندو بێ باوەڕی و خاوەنەکانی دەرپەڕاند، وە لەگەڵ ئەوەشدا ئێمە شتێك واز لێ ناهێنین کە لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ بەجێمان ئەهێنا.

(٤) دەست هێنان بە سەر گۆشەی یەمانیدا :

بە پێی ئەوەی ئیبنوعومەر خوا لێیان ڕازی بێت فەرمویەتی: نەم بینیوە کە پێغەمبەر ﷺ دەست بهێنێ بە هیچ گۆشەیەك لە گۆشەکانی کەعبەدا جگە لە دوو گۆشە یەمانیەکە.

وە فەرمویەتی: لەو کاتەوە پێغەمبەرم ﷺ بینیوە دەستی پێدا هێناون، منیش وازم نەهێناوە لە دەست هێنان بەو دو ڕوکنەدا -یەمانی و بەردە ڕەشەکە- نە لە خۆشیداو نە لە ناخۆشیدا. بوخاری و موسلیم گێڕاویانەتەوە.

بۆیە تەواف کەر دەستیان پێدا نەهێنێ لەبەر ئەو (فضیلة)ی کە لەو دوانەدا هەیە کە لە هیچ کامێکی تریاندا نیە.

بۆ نمونە لەو گۆشە ڕەشەدا دوو فەزڵ هەیە:

یەكەمیان: ئەو گۆشەیە لەسەر بناغەی ئیبراهیم داندراوە (علیه السلام).

دووەمیان: ئەو بەردە ڕەشەی تێدایە كە كراوە بە شوێنی سەرەتای تەواف و شوێنی كۆتاییەكەی.

ئەما گۆشە یەمانییەكەی بەرامبەری ئەویش دیسان لەسەر بناغەكەی ئیبراهیم داندراوە (علیه السلام).

ئەبوداوود لە ئیبنوعومەرەوە خوایان لێ ڕازی بێت ئەگێڕێتەوە كە ئیبنو عومەر پێی ڕاگەیانراوە كە عائیشە فەرمویەتی: (إنَّ الحَجَرَ بَعضُهُ مِنَ البَيتِ) واتە: بەردەكە هەندێكی لەماڵی بەیتە.

ئیبنوعومەر فەرمویەتی: سوێند بەخوا من وائەزانم كە عائیشە ئەوەی لە پێغەمبەرەوە بیستوە، وە من وائەزانم كە پێغەمبەر وازی لە دەست پیا هێنانیان نە ئەهێنا، تەنها لەبەر ئەوەی ئەو دو گۆشەیە لەسەر بناغەی بەیت نین، وە هەر لەبەر ئەوەشە خەڵكی لەدوای بەردەكەوە تەواف ئەكەن.

وە ئومەتی ئیسلام لەسەر ئەوە ڕێكن كە پەسەندە دەست بەو دوو ڕوكنەدا بهێنرێ، وە لە سەر ئەوەن كە نابێ تەواف كەر دەست بەدو ڕوكنەكەی تردا بهێنێ. وە ئیبنوحببان لە صەحیحەكەیدا ئەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (الحَجَرُ وَالرُّكنُ اليَمَانيُّ يَحطُّ الخَطَايَا حَطّاً). واتە: بەردەكەو ڕوكنە یەمانییەكە تاوان ئەسڕنەوە بە سڕین.

**كردنی دوو ڕكات نوێژ لە دوای تەواف[1]:**

سوننەتە بۆ تەواف كەر دوو ڕكات نوێژ بكات دوای هەموو تەوافێك لای مەقامی ئیبراهیم (علیه السلام). یالە هەر شوێنێكی مزگەوتە كەدا بێت.

لە جابیرەوە خوای لێ ڕازی بێت هاتوە كە پێغەمبەر ﷺ كاتێ گەیشتە مەككە حەوت جار بەدەوری كەعبەدا سوڕایەوە، لەپاشاندا هاتە مەقامی ئیبراهیم ئەم ئایەتەی خوێند: ﴿وَٱتَّخِذُواْ مِن مَّقَامِ إِبۡرَٰهِـۧمَ مُصَلّٗىۖ﴾.

پاشان دوو ڕكات نوێژی لە دوای مەقامەكەوە كرد، پاشان چوو بۆ لای بەردە ڕەشەكەوەو دەستی لێ دا. (ترمذي) گێڕاویەتیەوەو ووتوویەتی: (حديث حسن صحيح).

سوننەتە لە دووڕكاتەكەدا دوای سورەتی فاتیحە لە ڕكاتییەكەمدا سورەتی (الكافرون) و لە ڕكاتی دووەمدا سورەتی (الإخلاص) بخوێنرێ.

چونكە ئەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ سابت بوە وەك موسلیمو جگە لەو ئەیگێڕنەوە. وە ئەو دووڕەكاتە لە هەموو كاتێكدا ئەكرێن، هەتا ئەوكاتانەش كە نوێژ قەدەغەیە تیایاندا.

(١) ئەو دوو ڕكاتە لای ئەبو حەنیفە واجبە.

لە جوبەیری کوڕی موطعیمەوە هاتوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (يَا بَنِي عَبدِ مَنَاف! لاتَمنَعُوا أحَداً طَافَ بِهَذَا البَيتِ، وصلى أيَّةَ سَاعَةٍ شاءَ، مِن لَيلٍ أو نَهَار) رواه أحمد، وأبو داود، والترمذي وصححه.
واتە: ئەی هۆزی عەبدومەناف! رێ لەکەس مەگرن کە تەوافی ئەم بەیتەی کرد، و دووڕکات نوێژی کرد لە هەرکاتێکدا ویستی، شەو بێت یان ڕۆژ. ئەمەش بۆچونی شافیعی و ئەحمەدە.

وە وەك چۆن دوو ڕکات نوێژ سوننەتە دوای تەواف لە مزگەوتەکەدا، لە دەرەوەی مزگەوتیش هەر دروستە. بوخاری لە ئوممولسەلەمەوە ئەگێڕێتەوە خوا لێی ڕازی بێت: کە ئوممولسەلەمە بە سواری تەوافی کردووەو نوێژیشی نەکردووە هەتا هاتۆتەدەر.

مالیك لە عومەرەوە ئەگێڕێتەوە خوا لێی ڕازی بێت کە عومەر ئەو دووڕکاتەی لە (ذي طوى) کردووە.

بوخاری ووتویەتی: عومەر خوای لێ ڕازی بێت لە دەرەوەی حەرەم ئەو دوو ڕکاتەی کردووە.

وە ئەگەر کەسێك دوای تەواف نوێژی فەرزیش بکات هەر بری ئەو دوو ڕکاتە ئەکەوێ بۆی. وە ئەمە صەحیحە لای شافیعیەکان و بەناوبانگە لە مەزهەبی ئەحمەدا.

مالیك و حەنەفی یەکان ئەڵێن: هیچ شتێك جێی ئەو دوو ڕکاتە ناگرێتەوە کە لە جێی خۆیدا بکرێ.

**تێ پەڕ بوون بە بەردەم نوێژ کەرا لە حەرەمی مەککەدا:**

دروستە کەسێك لەمزگەوتی حەرام نوێژ بکات و خەڵکیش بە بەردەمی دا تێپەڕبن، ژن و پیاو، بێ ئەوەی خراپ بێت، ئەمەش لە تایبەتمەندی یەکانی مزگەوتی حەرامە، لە (کثیر)ی کوڕی (کثیر)ی کوڕی (مطلب)ی کوڕی وەداعەوە، لە هەندێ لە خزمانی یەوە، لە باپیریەوە هاتوە کە پێغەمبەری ﷺ بینیوە لەم لای بەنی سەهمەوە نوێژی کردووەو خەڵك بە بەردەمیدا ڕۆیشتون و سوترەشی دانەناوە. سوفیانی کوڕی عویەینە ووتوویەتی: لەنێوان پێغەمبەرو کەعبەدا سوترە نەبووە. ئەبوداودو نسائی و ئیبنو ماجە گێڕاویانەتەوە.

**تەوافی پیاوان لەگەڵ ژناندا:**

بوخاری لە ئیبنو جورەیجەوە ئەگێڕێتەوە کە ووتوویەتی: (عطاء) بۆی گێڕاوەمەوە کە ئیبنوهیشام ڕێی لە ژنان گرتوە لەگەڵ پیاواندا تەواف بکەن، (عطاء) یش پێی ووتووە: چۆن تۆ ڕێیان لێ ئەگری خێزانەکانی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ پیاواندا تەوافیان کردووە؟

ئەڵێ: ووتم: ئایا ئەوە دوای واجب بوونی حیجاب بوو یا پێش واجب بوونی؟

ووتی: بەڵێ سوێند بێت دوای حیجاب بوو بینیم.

ئەڵێ: ووتم: چۆن تێکەڵی پیاوان ئەبوون؟

ووتی: تێکەڵی پیاوان نەئەبوون عائیشە ڕەزای خوای لێ بێت بەتەنها لەلایەکەوە تەسوڕایەوەو تێکەڵیان نە ئەبوو.

ژنیك پێی ووت: ئەی دایکی باوەڕداران با بڕۆین دەست بدەین لە بەردەکە، ئەویش فەرمووی: برۆ وازم لـێ بهێنە و بەقسەی نەکرد، جا بەشەو خۆیان ئەگۆڕیو لەگەڵ پیاوان تەوافیان ئەکرد، بەڵام ئەگەر بچونایە ناو بەیتەوە، ئەوەستان هەتا پیاوان ئەهاتنە دەرەوە ئینجا ئەچونە ناوە بەیتەوە. وە ئافرەت بۆی هەیە کە دەست بدا لە بەردە ڕەشەکەوە کاتێ دەوری چۆڵ بوو وە لە پیاوانەوە دور بوو.

لە عائیشەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتوە کە بە ئافرەتێکی فەرموە: پاڵە پەسۆ مەکە بۆ سەر بەردەکە، ئەگەر هەلێکت دەست کەوت و چۆڵ بوو بچۆ دەستی لـێ بدە، بەڵام ئەگەر بینیت وا قەرەباڵغە ئەوکاتەی گەیشتیتە لای بەردەکە (الله أکبر) و (لا إله إلا الله) بکەو برۆ ئیتر ئازاری کەس مەدە.

**تەواف بە سواریـیەوە:**

دروستە تەواف کەر بەسواریـیەوە تەواف بکات یا بشتوانێ بەپێ بڕوات، ئەگەر هۆیەك هەبو پێویستی بە سوار بون بوو.

لە ئیبنوعەبباسەوە خوایان لـێ ڕازی بێت هاتوە کە پێغەمبەر ﷺ لە حەجی ماڵ ئاواییدا بەسواری ووشترێکەوە ئەسوڕایەوە بە دەوری کەعبەدا بە گۆچانەکەی ئیستلامی بەردە ڕەشەکەی ئەکرد. بوخاری و موسلیم گێڕاویانەتەوە.

لە جابیرەوە خوای لـێ ڕازی بێت هاتوە کە پێغەمبەر ﷺ لە حەجی ماڵئاوایدا بەسواری ووشترەوە تەوافی ئەکرد، وە هەروەها صەفاو مەروەی ئەکرد، بۆ ئەوەی خەڵکی چاویان لێی بێت چی ئەکاتو پرسیاری لـێ بکەنو خۆی سەرپەرشتی موسڵمانان بکات، چونکە خەڵکەکە دەورەیان دابوو.

**کەراهەتی تەواف کردنی گەرو گول لەگەڵ خەڵکدا:**

مالیك لە ئیبنو ئەبی مولەیکەوە ئەگێڕێتەوە: کە عومەری کوڕی (خطاب) ژنێکی گولی بینی ئەسوڕایەوە بە دەوری بەیتدا، پێی فەرموو: ئەی دروست کراوی خوا ئازاری خەڵك مەدە، ئەگەر لەماڵەوە دابنیشی باشتر نی‌یە!؟ ئەویش بەقسەی کرد. دوای ئەوە کابرایەك چوو بۆلای ژنەکە پێی ووت ئەو کەسەی ڕێی تەوافی لـێ ئەگرتی مرد، بچۆ بۆ تەواف، ئەویش ووتی: من لەوانە نیم بە زیندوویی ملکەچی فەرمانی بم بەڵام کە مرد سەر پێچی لـێ بکەم.

**پەسەندی‌یەتی خواردنەوە لە ئاوی زەمزەم:**

ئەگەر تەواف کەر لە تەواف کردن بوەوەو دووڕکات نوێژی لای مەقامی ئیبراهیم کرد، پەسەندە بۆی کە لە ئاوی زەم زەم بخواتەوە.

لە هەردوو صەحیحدا سابت بووە کە پێغەمبەر ﷺ لە ئاوی زەمزەمی ئەخوارادەوە و ئەیفەرموو: (إِنَّهَا مُبَارَكَةٌ. إِنَّهَا طَعَامُ طُعمٍ وَشِفَاءُ سُقمٍ). واتە: بەڕاستی ئاوێکی پیرۆزە، هەرکەس لێی بخواتەوە تێر ئەبێت و چارەسەری نەخۆشیشە.

جوبرەئیل (علیه السلام) ئەو شەوەی شەوڕەوی کرا بە پێغەمبەر ﷺ دڵی پێغەمبەری پێ شۆرد.

(طبراني) لە (الکبیر)ردا ئەگێڕێتەوە، وە هەروەها (ابن حبان) لە ئیبنو عەبباسەوە خوا لێی ڕازی بێت کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (خَیرُ مَاءٍ علی وَجهِ الأرضِ مَاءُ زَمزَمَ، فِیهِ طَعَامُ الطُّعمِ، وَشِفَاءُ السُّقمِ) الحدیث، قال المنذري : ورواته ثقات. واتە: پیرۆز ترین ئاو لە سەر ڕووی زەوی ئاوی زەم زەمە خواردنی برسی و چارە سازی دەردی تێدایە.

ئاداب و ڕەوشتی خواردنەوە لە ئاوی زەم زەم :

سوننەتە ئەو کەسەی لە ئاوی زەم زەم ئەخواتەوە بە نیازی شیفاوە بیخواتەوە وە بەنیازی ئەو شتانەوە کە خێری دین و دنیای تیایە، چونکە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (مَاءُ زَمزَمَ لِمَا شُرِبَ لَهُ). واتە: ئاوی زەم زەم بۆ ئەوە ئەبێت کە بۆی ئەخورێتەوە

لە سوەیدی کوڕی سەعیدەوە هاتوە ووتوویەتی: عەبدوڵلای کوڕێ موبارەکم دیوە لە مەککە هاتە سەر ئاوی زەم زەم و داوای جامێکی کردوو پاشان ڕووی کردە کەعبەو ووتی: خوایە ئیبنونەبی مەوالی بۆی گێڕاوینەوە لە موحەممەدی کوڕی مونکەدیرەوە لە جابیرەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئاوی زەم زەم بۆ ئەوە ئەبێ کە بۆی ئەخورێتەوە، وامنیش ئەی خۆمەوە لە بەر تینوێتی ڕۆژی دوایی، لەپاشاندا خواردیەوە. ئەحمەد بە سەنەدێکی صەحیح گێڕاویەتیەوە وە هەروەها بەیهەقی.

لە ئیبنوعەبباسەوە خوا لێیان ڕازی بێت هاتوە دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (مَاءُ زَمزَمَ لِمَا شُرِبَ لَهُ، إن شَرِبتَهُ تَستَشفِي شَفَاكَ اللهُ، وَإن شَرِبتَهُ لِشَبَعِكَ، أشبَعَكَ اللهُ، وَإن شَرِبتَهُ لِقَطعِ ظَمَئِكَ قَطَعَهُ اللهُ، وَهِيَ هُزمَةُ جِبرَئِیلَ، وَسُقیَا اللهِ إسماعِیلَ) رواه الدارقطني، والحاکم وزاد: (وَإن شَرِبتَهُ مُستَعِیذاً أعَاذَكَ اللهُ). واتە: ئاوی زەم زەم بۆ ئەوە ئەبێ کە لەپێناویدا ئەخورێتەوە، ئەگەر خورادتەوە بۆ چارەسازی و دەرمان، خوا چارەت ئەکا، وە ئەگەر خواردتەوە لەبەر ئەوەی تێر بیت خوا تێرت ئەکات، وە ئەگەر خواردتەوە لەبەر تینوێتی خوا تینوێتیت ئەشکێنێ، ئاوی زەم زەم بیری جوبرەئیلەو خوا بۆ تێراو کردنی ئیسماعیل علیه السلام دەری خستووە. وە حاکم ئەوەشی زیاد کردووە کە فەرمویەتی: ئەگەر خوارتەوە لەبەر پەنابردن خوا پەنات ئەدات.

پەسەندە کە بەسێ جار بخورێتەوەو ڕوو بکرێتە قیبلە وە تێری لێ بخورێتەوە، وەسوپاسی خوا بکرێت وە لە خوا بپاڕێتەوە بەو پاڕانەوەی کە ئیبنو عەبباس پێی ئەپاڕایەوە.

لە ئەبو مولەیکەوە هاتوە ووتویەتی: پیاوێك هاتە لای ئیبنوعەبباس ئیبنوعەبباس پێی ووت: لە کوێوە هاتویت؟ ووتی: لە ئاوی زەم زەمم خواردەوە. ئیبنو عەبباس فەرموی: ئایا وەك پێویستە خواردتەوە؟ کابرا ووتی ئەوە چۆنە ئەی ئیبنو عەبباس؟ ووتی: ئەگەر ئاوی زەمزەمت خواردەوە ڕوو بکە قیبلەو یادی خوا بکەو بە سێ جار بیخۆرەوەو تەواو تێر بخۆرەوە، کە تێرت خواردەوە سوپاسی خوا بکە.

چونکە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (آيَةُ مَا بَينَنَا وَبَينَ المُنَافِقِينَ أَنَّهُم لايَتَضَلَّعُونَ مِن زَمزَم) رواه ابن ماجة والدارقطني والحاكم. واتە: نیشانەی نێوان ئێمەو دووڕووەکان ئەوەیە ئەوان زکیان هەڵناناوسێنن لە ئاوی زەم زەم (تێر ناخۆنەوە).

ئیبنوعەبباس کە لە ئاوی زەمزەمی ئەخواردەوە ئەی فەرمو: خوایە من داوای زانستێکی بەسوودو رۆزیەکی فراوان و چارەسازی و شیفا لەهەموو نەخۆشیەکت لیٚ دەکەم.

بنەڕەتی ئاوی زەمزەم:

بوخاری ئەگێڕێتەوە لە ئیبنو عەبباسەوە خوا لیٚیان ڕازی بێت کە کاتیٚ هاجەرە چووە سەر مەروە کە خۆیو منداڵەکەی توشی تینوێتی هاتبوون، گوێی لە دەنگیٚ بوو، ووتی: بیٚ دەنگ —مەبەستی خۆی بوو- پاشان پاش گوێی ڕاگرت دووبارە بیستیەوە بە خۆی ووت: بەڕاستی دڕا بە گوێمدا ئەگەر یارمەتی و دەستگیرۆییت هەیە، کاتێك زانی وا فریشتیەك لە شوێن زەمزەمدا بە پاژنەی یا ووتی: بە باڵەکانی ئەگەڕا هەتا ئاوەکە دەرکەوت، ئینجا دۆلاوی بۆ ئەکرد بەدەستی ئاوای ئەکرد-مستە ئاوی دەرئەهێنا- ئینجا ئاوەکە هەڵقولا بەتەواوی دوای ئەوەی چەند مشتێکی لیٚ دەرهێنا.

ئیبنو عەبباس خوا لیٚی ڕازی بێت فەرمویەتی: پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (رَحِمَ اللهُ أُمَّ إِسمَاعِيلَ، لَو تَرَكَت زَمزَمَ ـ أوقَالَ: لَو لَم تَغتَرِف مِنَ المَاءِ ـ لَكَانَت زَمزَمُ عَيناً مَعِيناً ). واتە: ڕەحمەتی خوا لە دایکی ئیسماعیل بێت ئەگەر وازی لە زەم زەم نەهێنا یا فەرمووی: ئەگەر بە مستی ئاوی لیٚ دەرنەئەهێنا زەمزەم چاوگێکی بەردەوام ڕۆیشتوو بوو.

ئەڵیٚ: هاجەرە لیٚی خواردەوەو شیری ئەدا بە منداڵەکەی، فریشتەکە پێی ووت: لە وون بوون مەترسن، چونکە بەڕاستی ئالێرەدا خانەی خوا دروست ئەبێت، ئەم کوڕە و باوکی دروستی ئەکەن، وە خوای گەورە کەسی خۆی بیٚ سەرو شوێن ناکات. وە شوێنی بەیت وەك تەپۆلکەیەك وەها بوو لافاو ئەهات لە لای ڕاستو چەپیەوە دای ئەماڵی.

پەسەندیەتی پاڕانەوە لای (الملتزم) :

دوای خواردنەوە لە ئاوی زەمزەم، پەسندە پاڕانەوە لە خودا لای (الملتزم)، چونکە بەیهەقی لە ئیبنو عەبباسەوە ئەگێڕێتەوە کە ئەو لە نێوان دەرگاکەو بەردە ڕەشەکەدا ئەوەستاو ئەی فەرمو: نێوان بەردەکەو دەرگاکە پێی ئەوترێت (الملتزم) کەسێك نیە لێرەدا بوەستیٚو داوای شتێك بکات لە خوا ئیللا ئەیداتیٚ.

هەر بەیهەقی ئەگێڕێتەوە لە عەمری کوڕی شوعەیبەوە لە باوکیەوە لە باپیریەوە کە فەرمویەتی: (پێغەمبەرم ﷺ بینیوە سنگو ڕووی نوساندوە بە (الملتزم)ەوە). وە ووتراوە (الحطيم) مولتەزمە.

بوخاری ڕای وەهایە (الحطيم) ناوەوەی کەعبەیە .

بەڵگەشی بە حەدیسی شەوڕەوی (إسراء) هێناوەتەوە کە فەرموویەتی: کاتێك من لای (الحطیم) نوستبوم وە جاری را هەبوو ئەی فەرموو لای حیجر نوستبووم.

پەسەندی چوونە ناو کەعبەو حیجری ژووری ئیسماعیلەوە:

بوخاری و موسلیم لە ئیبنو عومەرەوە خوا لێیان ڕازی بێت ئەگێڕنەوە کە فەرمویەتی: پێغەمبەر ﷺ چوە ناو کەعبەوە – ساڵی فەتحی مەککە- لەگەڵ ئوسامەی کوڕی زەیدو عوسمانی کوڕی (طلحة)، دەرگاکەیان داخست کاتێ دەرگاکەیان کردەوە، بیلال پێی ڕاگەیاندم کە پێغەمبەر ﷺ لە ناو کەعبەدا لە نێوان دووکۆڵەکە یەمانی‌یەکەدا نوێژی کرد.

زانایان ئەوەیان کردۆتە بەڵگەو ئەڵێن: چوونە ناو کەعبەو نوێژ تێدا کردنی سوننەتە.

وە ئەڵێن: هەر چەندە سوننەتە بەڵام لە کردەوەکانی حەج نیە، بەپێی قسەکەی ئیبنوعەبباس کە فەرمویەتی: ئەی خەڵکینە! چوونە ناو کەعبەتان لە کردەوەکانی حەج نیە. حاکم بە سەنەدێکی صەحیح گێڕاویەتی‌یەوە.

هەرکەس نەیتوانی بچێتە ناو کەعبەوە پەسەندە بۆی بچێتە ناو حیجری ئیسماعیلەوە (علیه السلام) و نوێژی تێدا بکات، چونکە بەشێك لە حیجریش لە کەعبەیە.

ئەحمەد بە سەنەدێك کە پلەی (جید)ی هەیە ئەگێڕێتەوە لە سەعیدی کوڕی جوبەیرەوە لە عائیشەوە کە فەرمویەتی: ئەی نێرراوی خوا! هەموو کەس‌وکارەکانت چونە ناو کەعبەوە تەنها من نەبێت. فەرمووی: بنێرە بەدوای شەیبەدا[1] کە دەرگای کەعبەت بۆ بکاتەوە) ئەویش ناردی.

شەیبە ووتویەتی: نەمان توانیوە نە لە سەردەمی نەفامی دا و نە لە ئیسلامدا بەشەو دەرگای کەعبە بکەینەوە.

جا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (صَلِّي فِي الحِجرِ فَإِنَّ قَومَكِ استَقصَرُوا عَن بِنَاءِ البَيتِ حِينَ بَنَوهُ). واتە: لە حیجری ئیسماعیلدا نوێژ بکە چونکە هۆزەکەت بە شێکیان لە کەعبە بەجێ هێشت کاتێ بەیتیان دروست کرد کە ئەویش حیجرە.

## (سعي) بە پەلە ڕۆیشتن و ڕاکردنی نێوان صەفا و مەروە[2]

ئەصلی مەشروعی‌یەتی سەعی:

بوخاری لە ئیبنو عەبباسەوە خوا لێیان ڕازی بێت ئەگێڕێتەوە کە فەرمویەتی: ئیبراهیم (علیه السلام) هاجەرەو ئیسماعیلی کوڕی کە لەو کاتەدا ئیسماعیل شیرە خۆرە بوو هێنانی، لای بەیت دای نان لای

(١) شەیبە، کوڕی عوسمانی کوڕی (طلحة) بوە، کلیلی کەعبەی بەدەست بو.

(٢) صەفاو مەروە دو کێوی بچوکن لە نزیك کەعبەوە لای ڕۆژهەڵاتەوە.

دارێکی گەورە لەسەر زەمزەم، هەردوکیانی لە ژێر دارەکەدا دانا، لەو کاتەدا کەس لە مەککەدا نە ئەژیاو ئاوی تێدا نەبوو، تورەکەیەك خورمای لا دانان و جەوەنەیەك کە ئاوی تێدا بوو، لەپاشاندا ئیبراهیم بەرەو دوا گەڕایەوە، دایکی ئیسماعیل شوێنی کەوت‌و ووتی: ئەی ئیبراهیم بۆ کوێ ئەچیت و لەم دۆڵە چۆڵ‌و هۆڵەدا بەجێمان ئەهێڵی؟ چەند جار ئەوەی دوبارە کردەوە، بەڵام ئیبراهیم ڕوی نەکرد بەلایەوە، پاشان ووتی: ئایا خوا فەرمانی پێ داوی وەها بکەی؟ فەرموی: بەڵێ، ووتی: کەواتە خوا بێ سەرو شوێنمان ناکات و نامان فەوتێنێ.

لە ڕێوایەتێکی تردا ئەڵێت: لای کێ بەجێمان ئەهێڵی؟ فەرموی: لای خوا ئەویش ئەڵێت: کەواتە ڕازیم، پاشان گەڕایەوە.

ئیبراهیم ڕۆیشت هەتا گەیشتە لای پێچێك بە شێوەیەك ئەوان چاریان لێی نەبوو، ڕووی کردە شوێنی بەیت‌و بەم دوعایانە پاڕایەوەو هەردو دەستی بەرزر کردەوەو ووتی: ﴿رَّبَّنَآ إِنِّيٓ أَسۡكَنتُ مِن ذُرِّيَّتِي بِوَادٍ غَيۡرِ ذِي زَرۡعٍ عِندَ بَيۡتِكَ ٱلۡمُحَرَّمِ رَبَّنَا لِيُقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ فَٱجۡعَلۡ أَفۡـِٔدَةٗ مِّنَ ٱلنَّاسِ تَهۡوِيٓ إِلَيۡهِمۡ وَٱرۡزُقۡهُم مِّنَ ٱلثَّمَرَٰتِ لَعَلَّهُمۡ يَشۡكُرُونَ﴾ (ابراهیم/٣٧). واتە: ئەی پەروەردگارمان من هەندێ لە مندالەکانم بەجێ هێشتووە لە دۆڵێکی بێ کشت‌وکاڵ و ئاو لای ماڵە حەرامەکەت، خوایە بۆ ئەوەی بەبەردەوامی نوێژ بکەن، خوایە دڵی هەندێ خەڵك وا لێ بکە حەز بەلایان بکەن، وە ڕۆزی یان بدەیت لە بەروبومەکانت هەتا سوپاس گوزاریت بکەن.

ئینجا دایکی ئیسماعیل لەژێر درەختەکەدا دانیشت مندالەکەی لە تەنیشتت خۆیەوە دانا جەوەنەکەی هەڵواسی لێی ئەخواردەوەو مندالەکەی شیر ئەدا هەتا ئاوی ناو جەوەنەکە بڕایەوە، ئیتر شیریشی تێدا نەماو برسیەتی زۆری بە مندالەکەی هێنا هەتاوەهای لێ هات سەیری کرد خەریك بوو گیانی ئەدا؛ هەڵسا لە بەر ئەوەی حەزی نە ئەکرد بەو شێوەیە بیبینێ، چووە سەر صەفا ـ کە نزیکترین تەپۆڵکە بوو لێیەوە ـ پاشان سەیری دۆڵ‌و شیوەکانی کرد بزانێ کەسێك بەدی ناکات؟ بەڵام کەسی نەئەدی، هاتە خوارەوە لە صەفا، هەتا گەیشتە شیوەکە چمکی کراسەکەی کرد بەلاداو دەستی کرد بەڕاکردن وەك کەسێکی ماندوو هەتا لە شیوەکە تێپەڕی، لەپاشاندا چووە سەر مەروە وەستا سەیری ئەکرد بزانێ ئایا کەس بەدی ناکات؟ بەڵام کەسی نەئەبینی، حەوت جار ئەوەی کرد ئیبنو عەبباس خوای لێ ڕازی بێت فەرمویەتی: پێغەمبەر ﷺ ئەی فەرموو: (فَذَلِكَ سَعَى النَّاسُ بَينَهُمَا). واتە: ئەو ڕاکردنەی خەڵك لە نێوان صەفاو مەروەدا لە بەر ئەوەیە.

**حوکمی سەعی لە نێوان صەفاو مەروە:**

زانایان جیاوازییان هەیە لە حوکمی ڕاکردنی نێوان صەفاو مەروە لەم بارەیەوە سێ ڕایان هەیە:

أ- ئیبنو عومەرو جابیرو عائیشە لە صەحابە خوایان لێ ڕازی بێت، وە مالیك و شافیعی و ئەحمەد – لە یەکێ لە ڕیوایەتەکانیدا- بۆ ئەوە چوون کە سەعی نێوان صەفاو مەروە پایەیەکە لە پایەکانی حەج، بە شێوەیەك ئەگەر حاجی نەی کرد حەجەکەی بەتاڵە و بەکەفارەتی خوێن و شتی تر ناگیرسێتەوە، وە بۆ بۆچونەکەشیان ئەم بەڵگانەیان هێناوەتەوە.

١- بوخاری لە زوهرییەوە ئەگێڕێتە کە عوروە فەرمویەتی: پرسیارم لە عائیشە کرد خوا لێی ڕازی بێت پێم ووت: ئەبینی ئەم ئایەتە چی ئەڵێت: ﴿إِنَّ ٱلصَّفَا وَٱلۡمَرۡوَةَ مِن شَعَآئِرِ ٱللَّهِۖ فَمَنۡ حَجَّ ٱلۡبَيۡتَ أَوِ ٱعۡتَمَرَ فَلَا جُنَاحَ عَلَيۡهِ أَن يَطَّوَّفَ بِهِمَاۚ﴾ (البقرة/١٥٨). واتە: هاتو چۆی نێوان صەفاو مەروە لەدروشمەکانی ئاینی خوان، جا هەرکەس حەج یا عومرەی کرد تاوانێ نیەیە بۆی کە هاتو چۆی نێوان صەفاو مەروە بکات.

جا سوێند بە خوا کەس تاوانبار نابێت کە بە دەوریاندا نەسوڕێتەوە.

ئەڵێ عائیشە فەرموی: خراپت ووت برازا: ئەگەر وەك ئەوە بوایە کە لێکت داوەتەوە، ئەوە ئەیفەرمو: (لا جناح علیه أن لا یطوف بهما)، بەڵام ئەم ئایەتە دەربارەی ئەنصار هاتۆتە خوارەوە:

ئەوان پێش موسڵمان بونیان هاواریان ئەکرد بۆ بتەکەیان کەناوی (مناة) بوو ئەیان پەرست لای (المشلل)، جا هەرکەس ئەو هاوارەی بکردایە ئیتر پێی ناخۆش بوو کە هاتوو چۆی نێوان صەفاو مەروە بکات ئەیان ووت گوناهە.

کاتێ موسڵمان بوون پرسیاریان کرد لە پێغەمبەر ﷺ دەربارەی ئەوە. ووتیان: ئەی نێراوی خوا ئێمە ئەوسا پێمان ناخۆش بوو هاتوچۆی نێوان صەفاو مەروە بکەین، جا خوا ئەو ئایەتەی ناردە خوارەوە ﴿إِنَّ ٱلصَّفَا وَٱلۡمَرۡوَةَ مِن شَعَآئِرِ ٱللَّهِۖ فَمَنۡ حَجَّ ٱلۡبَيۡتَ أَوِ ٱعۡتَمَرَ فَلَا جُنَاحَ عَلَيۡهِ أَن يَطَّوَّفَ بِهِمَاۚ﴾.

عائیشە فەرموی: پێغەمبەر ﷺ هاتوو چۆی نێوان صەفاو مەروەی داناوە، ئیتر بۆ کەس نیە هاتووچۆی نێوانیان نەکات و وازی لێ بهێنێ.

٢- موسلیم لە عائیشەوە ئەگێڕێتەوە خوای لێ ڕازی بێت فەرمویەتی: پێغەمبەر ﷺ تەوافی نێوان صەفاو مەروەی ئەکردو خەڵکیش لەگەڵیا تەوافیان ئەکرد، ئیتر بوو بە سوننەت، سوێند بێت هەرکەس نەیکات خوا حەجەکەی بە تەواو بۆ نانوسی.

٣- لە حەبیبەی کچی ئەبی تەجراوە ـ ژنێك لە ژنەکانی هۆزی بەنی عبد الدار ـ هاتوە ووتویەتی: لەگەڵ کۆمەڵێ ژنی قورەیشدا چوینە ماڵی ئالی ئەبی حسین سەیری پێغەمبەرمان ئەکرد ﷺ لەنێوان صەفاو مەروەدا هاتوو چۆی ئەکرد، پەشتەماڵەکەی لەناو قەدیدا ئەسوڕایەوە لەبەر خێرایی ڕۆیشتنی هەتا من ئەڵێم: ئەژنۆکانیشیم بینی و گوێم لێی بوو ئەی فەرموو: (إسعَوا، فَإنَّ اللهَ كَتَبَ عَلَيكُمُ السَّعيَ) رواه ابن ماجة وأحمد والشافعي. واتە: بەپەلە بڕۆن چونکە خوا لە سەری نوسیون و واجبی کردووە لەسەرتان بەپەلە بڕۆن. ئەم حەدیسە لە ئیسنادەکەیدا عەبدوڵلای کوڕی موئەممەل هەیە کە لاوازە، بەڵام چەند ڕێگایەکی هەیە ئەگەر بخرێنە سەر یەك بەهێز ئەبێت.

٤- لەبەرئەوەی سەعی نێوان صەفاو مەروە عیبادەتێکە لە حەج و عومرەدا بە جێ دێت، ئیتر بوە بە ڕوکن لە هەردوکیاندا، وەك تەواف بەدەوری بەیتدا.

ب- ئیبنوعەبباس و ئەنەس و ئیبنوزوبەیر و ئیبنوسیرین و ڕیوایەتێك لە ئەحمەدەوە بۆ ئەوە چوون کە هاتو چۆی نێوان صەفاو مەروە سونەتە و بەنەکردنی هیچ واجب نابێت.

بەڵگەشیان بەم فەرمودەی خوا هێناوەتەوە کە فەرموویەتی: ﴿فَلَا جُنَاحَ عَلَيۡهِ أَن يَطَّوَّفَ بِهِمَاۚ﴾. وە لابردنی حەرەج و گوناه لەسەر بکەرەکەی بەڵگەیە لەسەر واجب نەبونی، چونکە ئەوە پلەی (ڕەوایی)یە، وە بەم فەرمودەیەی خوا ﴿مِن شَعَـٰٓئِرِ ٱللَّهِۖ﴾ سابت ئەبێ کە سوننەتە، وە لە موصحەفەکەی ئوبەی و ئیبنومەسعوودا هاتووە کە خوا ئەفەرموێ: ﴿فَلا جُنَاحَ عَلَيْهِ أنْ لا يَطوفَ بِهِمَا﴾. واتە: گوناه نیە لە سەری ئەگەر هاتوو چۆی نێوان صەفاو مەروە نەکات.

ئەمە ئەگەر قورئانیش نەبێت لەو پلەیە نزم نابێتەوە کە خەبەر بووە واتە: ئەبێت بە تەفسیر.

٢- لەبەر ئەوەی سەعی خوا پەرستی‌یەکی بەژمارەیە، پەیوەندی نی‌یە بە بەیتەوە، وە نابێت بە پایەیەکی حەج وەك ڕەمی جەمەرات.

ج- ئەبو حەنیفەو (ثوري) و حەسەن بۆ ئەوە چوون کە سەعی نێوان صەفاو مەروە واجبە، وە پایەیەکی حەج نی‌یە، حەج و عومرە بە نەکردنی بەتاڵ نابنەوە، بەڵام ئەگەر کەسێك نەیکرد خوێنی لەسەر واجب ئەبێت، خاوەنی (المغني) ئەم ڕایەی پارسەنگ داوەو ووتویەتی:

١- ئەم ڕایە لەپێشترە، چونکە بەڵگەی ئەوکەسەی کە بە واجبی ئەزانێ، بەڵگەیە لەسەر واجب بونی موتڵەق، نەك لەسەر ئەوەی کە شتێك بێت واجب بەبێ ئەو تەواو نەبێت.

٢- قسەکەی عائیشە خوا لێی ڕازی بێت بەرپەرچ دراوەتەوە بە قسەی ئەو کەسانەی پێچەوانەی ئەون لە صەحابە.

٣- حەدیسەکەی کچی ئەبی تەجرا، ئیبنوموونزیر لەبارەیەوە ووتویەتی: عەبدوڵڵای کوڕی موئەممەل ئەیگێڕێتەوە، کە زانایانی حەدیس قسەیان کردوە لەسەر حەدیسەکەی، ئەوەش ئەبێتە بەڵگەی ئەوەی کە صەفاو مەروە واجبە.

٤- ئەمما ئایەتەکە کاتێ هاتە خوارەوە کە هەندێ لە خەڵك پێیان ناخۆش بوو هاتوو چۆی بەینی صەفاو مەروە لە ئیسلامدا بکەن، لەبەر ئەوەی لە سەردەمی نەفامی دا ئەیان کرد لەبەر خاتری ئەو دوو بتەی کە لەسەر صەفاو مەڕوە بوون.

مەرجەکانی سەعی نێوان صەفاو مەروە:

بۆدروستی هاتوچۆی نێوان صەفاو مەروە چەند مەرج هەیە لەوانە:

١- ئەبێ دوای تەوافی بەیت بێ.

٢- ئەبێ حەوت جار بێت.

٣- ئەبێ لە صەفاوە دەست پێ بکرێو بەمەرەوە کۆتایی بێت.

٤- ئەبێ ڕاکردنەکە لەشوێنی خۆیدا بێت کە ئەویش ئەو ڕێگایەیە درێژ بۆتەوە لە نێوان صەفاو مەروەدا. بە پێی کردەوەی پێغەمبەر ﷺ لەوەدا. لەگەڵ فەرموودەی: (خُذُوا عَنِّي مَنَاسِكَكُم). واتە: شێوازی حەجو عومرە کردن لە منەوە فێر بن و وەری بگرن.

جا ئەگەر پێش تەواف چووبێت بۆ سەعی، یا بە مەروە دەستی پێ کردبێ و بە صەفا کۆتایی هێنابێت، یا لەشوێنی خۆیدا سەعیەکەی نەکرد، ئەوە ئەو سەعییە بەتاڵە.

سەرکەوتنە سەر صەفا:

بۆ دروستی سەعی نێوان صەفاو مەروە چوونە سەر صەفاو مەڕوە مەرج نیە. بەڵام پێویستە لە سەری کە نێوانیان تەواو ببڕێ و قاچ بخاتە سەر هەردوو لایان لە چون و گەڕانەوەدا، جا ئەگەر بەشێك مابوو بەتەواوی نەیبڕیبوو، دروست نیە بۆی هەتا تەواوی نەکات.

ئایا حەوت جار سەعی کردنەکە بەسەر یەکەوەو بەدوای یەکدا بێت:

مەرج نیە هاتوو چۆی نێوان صەفاو مەروە بەشوێن یەکەوە بێت، بۆ نمونە ئەگەر شتێکی بۆ پێش هات نەی هێشت بەردەوام بێت لە سەر هاتوچۆ، یاکاتی نوێژ هات، بۆی هەیە هاتوچۆکەی بپچڕێ. وە کاتێ لەو شتە بۆوە کە ڕێی لێ گرتبوو، بۆی هەیە لە سەر جارەکانی پێشووەوە هاتوچۆکە تەواو بکات.

لە ئیبنوعومەرەوە خوا لێیان ڕازی بێت هاتوە کە سەعی نێوان صەفاو مەروەی ئەکرد، لەو کاتەدا میز زۆری بۆ هێنا، چووە ئەو لاوەو داوای ئاوی کرد دەست نوێژی گرتەوەو هەڵسا لەسەر ئەوەوە کە کردبووی تەواوی کرد، سەعیدی کوڕی مەنصور گێڕاویەتیەوە.

هەروەها بەشوێن یەکەوە کردنی تەواف‌و سەعی‌یەکەش مەرج نیە.

لە (المغني) دا هاتووە: ئەحمەد وەتوویەتی: ئەیناکە سەعی دوا بخرێ هەتا ئەو کەسە ئەحەوێتەوە یادوای بخات بۆ ئێوارە. وە (عطاء) و حەسەن بەلایەنەوە وابوو کە ئەیناکە ئەو کەسە لە بەیانیدا تەواف بکات بە دەوری مالّی بەیتدا لەپاشان هاتو چۆی نێوان صەفاو مەروە بخاتە شەوەوە. قاسم و سەعیدی کوڕی جوبەیر وەهایان کردووە، چونکە ئەگەر بەسەریەکەوە کردن لە هاتو چۆکە خۆی دا مەرج نەبێت، ئەوە لەنێوان تەواف‌و ئەو هاتو چۆیەدا لەپێشترە کەمەرج نەبێت.

سەعیدی کوڕی مەنصور ئەگێڕێتەوە کە سەودەی خێزانی عوروەی کوڕی زوبەیر سەعی کردو بە سێ ڕۆژ تەوافی تەواو کرد چونکە قەڵەو بوو.

**دەست نوێژ گرتن بۆ سەعی:**

بەشی زۆری زانایان بۆ ئەوە چوون: کە دەست نوێژ مەرج نیە بۆ هاتو چۆی نێوان صەفاو مەروە، بە پێی فەرموودەکەی پێغەمبەر ﷺ کە بە عائیشەی فەرموو کاتێ بێ نوێژ بوو (فَاقْضِي مَا يَقْضِي الحَاجُّ، غَيْرَ أن لاتَطُوفِي بِالبَيتِ حَتَّى تَغتَسِلِي) رواه مسلم. واتە: حاجی چی ئەکات تۆش بەجێی بهێنە، بەلاّم تەوافی بەیت مەکە هەتا خۆت ئەشۆرێت.

عائیشەو ئوممو سەلەمە فەرموویانە: ئەگەر ئافرەتێك تەوافی بەیتی کردو دوو ڕکات نوێژەکەی کرد لە پاشاندا تووشی بێ نوێژی بوو با سەعی بکات. سەعیدی کوڕی مەنصور گێڕاویەتیەوە.

هەرچەندە وا پەسەندە کە ئادەمیزاد لە سەر خاوێنی هەموو کارەکانی حەج بەجێ بهێنێ. چونکە خاوێنیتی کارێکی بایەخ پێدراوە لە شەرعدا.

**پیادەیی و سواری لە سەعی دا:**

دروستە بە پیادەیی یا بەسواری هاتوو چۆی نێوان صەفاو مەروە بکرێ، بەلاّم پیادەیی چاکترە. وە لە حەدیسەکەی ئیبنوعەبباسدا هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ لە پێشەوە پیادە بوو، کاتێك خەلْك زۆر بوو بەدەوریەوە سواربوو بۆ ئەوەی چاریان لێی بێت‌و پرسیاری لێ بکەن.

ئەبوطوفەیل بە ئیبنو عەبباسی ووت خوا لێیان ڕازی بێت: پێم بلێ هاتوو چۆی نێوان صەفاو مەروە بە سورای سوننەتە یان نا؟ چونکە هۆزەکەت ئەڵێن سوننەتە. فەرمووی: ڕاستیش ئەکەن‌و ڕاستیش ناکەن، ئەڵێ ووتم: مەبەستت چیە ڕاست ئەکەن‌و ڕاست ناکەن؟.

ووتی: پێغەمبەر ﷺ خەلْك زۆر بوو بەدەوریا ئەیان ووت ئەوە موحەممەدە ﷺ، ئەوە موحەممەدە ﷺ، هەتا کیژۆڵەکانیش لە مالّەکان هاتنەدەرەوە. وە پێغەمبەر ﷺ خەلکی دەرنەئەکرد لە بەردەمیا، بۆیە

کاتێك خەڵك زۆر بون سوار بوو. وە ڕۆیشتن بە پیادەو ڕاکردن[1] چاکترە. موسلیم و جگە لەو گێڕاویانەتەوە.

سواربوونیش هەرچەندە دروستە، بەڵام کەراهەتی هەیە.

(ترمذي) ووتویەتی: بەلای هەندێك زانایانەوە کەراهەتی هەیە پیاو تەواف بکاتو سەعی بکات بە سواری لەبەر بەهانەیەك نەبێت. ئەمەش قسەی شافیعیەیە.

لای مالیکیەکان: ئەوکەسەی سەعی بە سواری بکات بە بێ بەهانە ئەبێ دووبارەی بکاتەوە ئەگەر کات بەسەر نەچووبوو، وە ئەگەر کاتی نەمابوو خوێنی لەسەرە، چونکە ڕۆیشتن لە کاتی توانیندا واجبە.

ئەبو حەنیفەش هەروەهای ووتووە. وە سوار بوونەکەی پێغەمبەریان ﷺ بەوە لێکداوەتەوە کە خەڵك زۆربووەو چواردەوریان داوەو ڕێیان لێ گرتووە، ئەو ڕێ لێگرتنەش بە هانەیەکە سورابوون پێویست ئەکات.

**پەسەندی ڕاکردن لە نێوان دوو میلەکەدا:**

سونەتە ڕۆیشتنی نێوان صەفاو مەروە، جگە لە نێوان دوو میلەکە کە سوونەتە لۆقە بکرێ لەو نێوانەدا.

لە پێشەوە حەدیسەکەی کچی ئەبی تەجرا باسکرا کە ئەوەی تێدا بوو: پێغەمبەر ﷺ ڕای ئەکرد بە شێوەیەك پەشتە ماڵەکەی ئەسوڕایەوە لە توندی ڕاکردنەکەی. وە لە حەدیسەکەی ئیبنوعەبباسی پێشوودا هاتووە کە ڕۆیشتنو ڕاکردن چاکترە. واتە ڕاکردنی نێوان دوو میلەکەی ناو شیوەکە وە ڕۆیشتن لە شوێنەکانی تردا، وە ئەگەر بڕوات بێ ئەوەی ڕابکات دروستە.

لە سەعیدی کوڕی جوبەیرەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتوە فەرمویەتی: ئیبنو عومەرم بینیوە بە ڕۆیشتن ئەڕۆیشت لە نێوان صەفاو مەروەدا، پاشان فەرموی: ئەگەر من بەم شێوەیە ئەڕۆم، پێغەمبەرم ﷺ بینیوە بەو شێوەیە ڕۆیشتوە. وە ئەگەر ڕام کرد، ئەوە پێغەمبەرم ﷺ بینیوە ڕای کردووە، وە من پیاوێکی بە ساڵا چووم. ئەبوداود و (ترمذي) گێڕاویانەتەوە.

ئەو سوننەتە دەرحەق بە پیاوە. بەڵام ئافرەت سوننەت نیە بۆی ڕابکات، بەڵکو ئەبێت بە ڕۆیشتنی سروشتی بڕوات.

شافیعی لە عائیشەوە خوا لێی ڕازی بێت ئەگێڕێتەوە کە فەرمویەتی: ـ کاتێك کۆمەڵێك ژنی ئەبینی ڕایان ئەکرد ـ ئایا ئێوە نابێ چاو لە ئێمە بکەن؟... ئێوە لۆقەکردنتان لەسەر نییە.

---

(١) ڕاکردن لەناو دۆڵەکەدا لەنێوان دو میلەکەدا ئەبێت، وە ڕۆیشتنیش لە بێجگە لەودایە.

**پەسەندی‌یەتی چوونە سەر گردی صەفاو مەروەو پاڕانەوە لەسەریان لەگەڵ وەستان بەرەو کەعبە:**

چوونە سەر صەفاو مەروە پەسەندە، هەروەها پاڕانەوە لەسەریان بە ئارەزووی خۆی بۆ دین‌و دونیا، لەگەڵ وەستان رووەو قیبلە، چونکە ئەوەی کە لە پێغەمبەرەوە ﷺ زانراوە ئەوەیە کە پێغەمبەر ﷺ لە دەرگای صەفاوە هاتوەتە دەرەوە، وە کاتێك کەلە صەفا نزیك کەوتۆتەوە ئەم ئایەتەی خوێندۆتەوە: ﴿إِنَّ ٱلصَّفَا وَٱلْمَرْوَةَ مِن شَعَآئِرِ ٱللَّهِ﴾. فەرمویەتی: بەوە دەست پێدەکەم کە خوا دەستی پێکرد. ئیتر لە صەفاوە دەستی پێکردووە چوە سەری هەتا کەعبەی لێوە دەرکەوت. ئینجا رووەو قیبلە وەستاو سێ جار (لا إله إلا الله) و (الله أكبر)ی کرد، وە سوپاسی خوای کردو فەرمووی: (لا إِلَهَ إلا اللهُ وَحدَهُ لاشَرِيكَ لَهُ، لَهُ المُلكُ وَلَهُ الحَمدُ يُحيِي وَيُمِيتُ وَهُوَ عَلى كُلِّ شَيءٍ قَدِير، لا إِلَهَ إلا اللهُ وَحدَهُ أنجَزَ وَعدَهُ، وَنَصرَ عَبدَهُ، وَهَزَمَ الأحزابَ وَحدَهُ). پاشان لە نێوان ئەوەدا ئەپاڕایەوە، وە سێ جار ئەوەی ئەوتەوە. پاشان هاتە خوارەوە بەپێ بەرەو مەروە هەتا گەیشتە مەروە، چووە سەری هەتا کەعبەی بینی ئەنجا چی لەسەر صەفا کرد ئەوەشی لە سەر مەروە کرد.

لە نافیعەوە هاتوە ووتویەتی: گوێم لە عەبدوڵلای کوڕی عومەر بووە خوا لێیان ڕازی بێت ـ لەسەر صەفا ئەپاڕایەوەو ـ ئەیفەرمو: خوایە تۆ بۆ خۆت فەرمووتە: ﴿ٱدْعُونِىٓ أَسْتَجِبْ لَكُمْ﴾ واتە: لێم بپاڕێنەوە وەڵامتان ئەدەمەوە. وە بەڕاستی تۆ لەو وەعدەی داوتە پەشیمان نابێتەوە. وەمن داوات لێ ئەکەم ـ وەك چۆن هیدایەتت داوم بۆ ئیسلام ـ ئیسلامم لێ مەسێنە هەتا بە موسڵمانی ئەم مرێنی.

**پاڕانەوەی سەعی:**

پاڕانەوەو یادی خوا کردن و قورئان خوێندن لەنێوان صەفاو مەروەدا پەسەندە. ئەگێڕنەوە کە پێغەمبەر ﷺ لە سەعی‌یەکەیدا ئەیفەرموو: (رَبِّ اغفِر وَارحَم وَاهدِنِي السَّبِيلَ الأقوَم). واتە: پەروەردگارم لێم خۆش بەو ڕەحمم پێ بکەو ڕاسترین ڕێگەم نیشان بدە.

وە ئەگێڕنەوە لێ‌یەوە کە فەرمویەتی: (رَبِّ اغفِر وَارحَم إنَّكَ أنتَ الأعَزُّ الأكرَم). واتە: پەروەدگار لێم ببورەو ڕەحمم پێ بکە، چونکە تۆ لە هەموو کەس بەتواناترو بەڕێز تری.

بە تەواف‌و سەعی کارەکانی عومرە تەواو دەبێت. وە حاجی ئیحرامەکەی ئەشکێنێت بە سەرتاشین یان کورت کردنەوە ئەگەر تەمەتتوع بکات، بەڵام قارن بو، ئەوە بە ئیحرامەکەیەوە ئەمێنێتەوە، وە نابێ ئیحرامەکە بشکێنێ هەتا ڕۆژی قوربانی، وە ئەو سەعیەی بەسە لەبری سەعی دوای تەوافی فەرز، ئەگەر قارن بوو.

بەڵام ئەوەی حەجی تەمەتتوع ئەکات، جارێکی تر سەعی ئەکاتەوە دوای تەوافی (إفاضە). وە لە مەککە ئەمێنێتەوە هەتا ڕۆژی تەرویە.

**چوون بەرەو مینا:**

ڕۆیشتن بەرو مینا لە ڕۆژی تەرویەدا سوننەتە[1].

جا ئەگەر حاجی قارین بوو یا موفرید بوو، ئەبێ بە ئیحرامەوە بەرەو مینا بچێت، بەڵام ئەگەر حەجی تەمەتتوعی ئەکرد، ئەبێ ئیحرام بە حەج ببەستێتەوە، وەلە میقاتدا چی کردووە دوبارەی بکاتەوە.

سوننەتە کە ئیحرام لەو شوێنەوە ببەستێ کە لێی دابەزیوە.

جا ئەگەر لە مەککە بوو، ئەبێ لە مەککەوە ئیحرام ببەستێ، بەڵام ئەگەر لە دەرەوەی مەککە بوو، ئەوە لە کوێدا بوو لەو شوێنە وە ئیحرام ئەبەستێ.

لە فەرمووددەدا هاتووە: (مَن كَانَ مَنزِلُهُ دُونَ مَكَّةَ، فَمَهُلُّهُ مِن أَهلِهِ، حَتَّى أَهلُ مَكَّةَ يُهِلُّونَ مِن مَكَّةَ). واتە: هەرکەسێ شوێنەکەی لەدەرەوەی مەککە دا بوو، ئەوە لەو شوێنە وە ئیحرام ئەبەستێ، هەتا خەڵکی مەککە لەمەککەوە ئیحرام ئەبەستن.

پەسەندە پاڕانەوەی زۆرو (لبيك) ووتنی زۆر، لە کاتی چوون بەرەو مینا، وە لە کاتی نوێژی نیوەڕۆو عەسرو ئێوارەو خەوتنان، وە شەو مانەوەش لێی پەسەندە.

هەروەها پەسەندە حاجی مینا بەجێ نەهێڵێ هەتا ڕۆژی نۆیەمی (ذي الحجة) هەڵدێ، لەبەر پەیڕەوی کردنی پێغەمبەر ﷺ.

جا ئەگەر ئەوەی نەکرد یاشتێکی واز لێ هینا، ئەوە سوننەتی واز لێ هێناوە، وە هیچیشی ناکەوێتە سەر. چونکە عائیشە ڕۆژی تەرویە لە مەککە نەچووە دەرەوە هەتا شەو هات بە سەرداو سێیەکی شەو ڕۆیشت. ئیبنومونذیر ئەوەی گێڕاوەتەوە.

**چۆن بۆ مینا لە پێش ڕۆژی تەرویە دروستە:**

سەعیدی کوڕی مەنصور لە حەسەنەوە ئەگێڕێتەوە: کە حەسەن لە مەککەوە ئەچوو بۆ مینا پێش ڕۆژی تەرویە بە ڕۆژێك یا دوو ڕۆژ، وە مالیك چون بۆ مینای لە پێش ڕۆژی تەرویەدا بە کەراهەت داناوە، وە مانەوەی لە مەککە لە ڕۆژی تەرویەدا بە کەراهەت داناوە، بەڵام ئەگەر کاتی نوێژی هەینی هات بە سەریاو لە مەککەدا بوو، لە سەریەتی نوێژی هەینی بکات پێش ئەوەی دەرچی بۆ مینا.

**ڕۆیشتن بەرەو عەرەفات:**

ڕۆیشتن بەرەوعەرەفات سوننەتە دوای هەڵاتنی ڕۆژ لە ڕۆژی نۆیەمدا، لە ڕێگای (ضب)ەوە لەگەڵ کردنی (الله أكبر) و (لا إله إلا الله) و (لبيك) ووتندا.

---

(١) ڕۆژی تەرویە، ڕۆژی هەشتەمی (ذي الحجة)یە، وە بۆیە ئەو ناویان لێی ناوە، چونکە ئیمام کردەوەکانی حەج نیشان خەڵك ئەدات.

محمدی کوڕی ئەبی بەکری (ثقفي) ووتوویەتی: پرسیم لە ئەنەسی کوڕی مالیك ـ لەو کاتەدا لە میناوە بەرەو عەرەفات ئەڕۆیشتین ـ لەبارەی تەلبیەیەوە، ئایا ئێوە چیتان ئەکرد کە لەگەڵ پێغەمبەردا بوون؟ فەرمووی:: هەرکەس بە ئارەزووی خۆی، تەلبیەیان ئەکرد ڕێی لێ نە ئەگرتن، وە (الله أكبر) یان ئەکرد ئینکاری لێ نەئەکردن، وە (لا إله إلا الله)یان ئەکردو ئینکاری لێ نەئەکردن. بوخاری و جگە لەو گێڕاویانەتەوە.

وە دابەزین لە (نمرة)و خۆشۆردن لەوێدا پێش وەستان لە عەرەفە پەسەندە، وە پەسەندە نەچێتە عەرەفەوە ئیللا کاتی وەستان نەبێت لە دوای زەوال.

## وەستان لەعەرەفە

فەزڵی ڕۆژی عەرەفە:

لە جابیرەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتوە فەرمویەتی: پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (مَا مِن أيَّامٍ عِندَ اللهِ أفضَلُ مِن عَشرِ ذِي الحِجَّةِ). واتە: هیچ ڕۆژێك نیە لای خوا چاکتر بێت لە دە ڕۆژی (ذی الحجة).

پیاوێك ووتی: ئەو دەڕۆژە چاکترن، یا کەسێك ئەوەندەی ئەو دەڕۆژە جیهاد بکات لە ڕێی خوادا؟ فەرمووی: (هُنَّ أفضَلُ مِن عِدَّتِهِنَّ جِهَاداً فِي سَبِيلِ اللهِ. وَمَا مِن يَومٍ أفضَلُ عِندَ اللهِ مِن يَومِ عَرَفَةَ، يَنزِلُ اللهُ تَبَارَكَ وَتَعالى إلَى السَّمَاءِ الدُّنيَا، فَيُبَاهِي بِأهلِ الأرض أهلَ السَّمَاءِ، فَيَقُولُ: أُنظُرُوا إلَى عِبَادِي، جَاءُونِي شُعثاً غُبراً ضَاحِّينَ، جَاءُوا مِن كُلِّ فَجٍ عَمِيقٍ، يَرجُونَ رَحمَتِي وَلَم يَرَوا عَذَابِي، فَلَم يُرَ يَومٌ أكثَرَ عَتِيقاً مِنَ النَّارِ مِن يَومِ عَرَفَةَ). واتە: ئەو دەورۆژە چاکترە لە ئەوەندەی ژمارەی ئەوان کە لە جیهادا بەسەر بچێت لە ڕێی خوادا، وە هیچ ڕۆژێك نیە چاکتر بێت لای خوا لە ڕۆژی عەرەفە، خوای گەورە دێتە خوارەوە بۆ ئاسمانی دونیا شانازی بە خەڵکی سەر زەوییەوە ئەکات لەلای خەڵکی ئاسمان، ئەفەرمووێ: سەیری بەندەکانم بکەن هاتون بۆلام بەسەرو ڕیشی هەڵچوو تۆزاوییەوە، بە قوربانییەوە، وە لە هەموو شیوو دۆڵێکی قوڵەوە هاتوون، بەهیوای ڕەحمەتی منن هەرچەندە سزای منیشیان نەچەشتووە، جا هیچ ڕۆژێك نەبینراوە ئەوەندەی ڕۆژی عەرەفە ڕزگار بووی تێدا بێت لە ئاگر.

(منذري) ووتویەتی: ئەبویەعلاو بەززارو ئیبنوخوزەیمەو ئیبنوحیببان گێڕاویانەتەوەو لەفزەکەش هی ئیبنوحیببانە.

ئیبنوموبارەك ئەگێڕێتەوە لە سوفیانی (ثوري)یەوە لە زوبێری کوڕی عەلیەوە لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە خوا لێی ڕازی بێت فەرمویەتی: پێغەمبەر ﷺ لە عەرەفات وەستابوو خەریك بوو ڕۆژ ئاوا ئەبوو فەرمووی: ئەی بیلال خەڵکەکەم بۆ بێ دەنگ بکە، بیلال هەڵسا هاواری کرد: گوێ بگرن لە پێغەمبەری خوا ﷺ، خەڵکەکە بێ دەنگ بوون، فەرمووی: (يَامَعشَرَ النَّاسِ أتَانِي جِبرِيلُ عَلَيهِ السَّلامُ

آنِفاً، فَأقرَأني مِن رَبِّي السَّلامَ وَقَالَ: إنَّ اللهَ عَزَّوَجل غَفَر لأهلِ عَرَفَات، وَأهلِ المَشعَرِ الحَرَام، وَضَمِنَ عَنهُمُ التَّبِعَاتِ. فَقَامَ عُمَرُ بنُ الخَطَّابِ (رضى الله عنه) فَقَالَ : يَا رَسُولَ الله! هَذَا لَنَا خَاصَّةً؟ فَقَالَ: هَذَا لَكُم وَلِمَن أتَى مَن بَعدَكُم إلَى يَومِ القِيَامَةِ. فَقَالَ عُمَر رضى الله عنه: كَثُرَ خَيرُ اللهِ وَطَابَ). واتە: ئەی خەلکینە: جوبرەئیل (علیه السلام) ئێستا هات بۆ لام و سڵاوی پەروەدگارمی پێ ڕاگەیاندمو ووتی: خوای گەورە لەوانەی ئامادەن لە عەرەفاتو مەشعەری حەرامدا خۆش بووەو بۆ گوناهانی داهاتووش زامنی کردوون کە خۆش ببێ.

عومەری کوڕی (خطاب) خوا لێی ڕازی بێت هەڵساو فەرموی: ئەی نێراوی خوا ئەمە تایبەتە بۆ ئێمە؟ فەرمووی: (ئەوە تایبەتە بۆ ئێوەو بۆ ئەوانەی دوای ئێوە دێن هەتا ڕۆژی دوایی) عومەر فەرموی: خێرو چاکەی خوا زۆرو چاک بوە.

موسلیم و جگە لەویش ئەگێڕنەوە لە عائیشەوە خوا لێی ڕازی بێت: کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (مَا مِن يَومٍ أكثرُ مِن أن يَعتِقَ اللهُ فِيهِ عَبداً مِنَ النَّارِ مِن يَومِ عَرَفَةَ، وَإنَّهُ لَيَدنُو عَزَّوَجل ثُمَّ يُبَاهِي بِهِمُ المَلائِكَةَ فَيَقُولُ: مَا أرَادَ هَؤلاءِ؟). واتە: هیچ ڕۆژێك نیيە خوا زیاتر بەندەی خۆی لە ئاگر ڕزگار بکات تێیدا وەك ڕۆژی عەرەفە، خوای گەورە نزیك ئەبێتەوەو شانازیان پێوە ئەکات لای فریشتەکانی و ئەفەرموێ: ئەمانە چییان ئەوێت؟

لە ئەبو دەردائەوە خوا لـێی ڕازی بێت هاتوە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (مَا رُؤِيَ الشَّيطَانُ يَوماً هُوَ فِيهِ أصغَرَ، وَلا أدحَرَ وَلا أغيَظَ مِنهُ فِي يَومِ عَرَفَةَ، وَمَا ذَاكَ إلا لِمَا رَأى مِن تَنَزُّلِ الرَّحمَةِ، وَتَجَاوُزِ اللهِ عَنِ الذُّنُوبِ العِظَامِ إلا مَا أُرِيَ مِن يَوم بَدرٍ، قِيلَ: وَمَا رَأى يَومَ بَدرٍ يَا رَسُولَ الله؟ قَالَ: أمَا إنَّهُ رَأى جِبرِيلَ يَزَعُ المَلائِكَةَ).

واتە: هیچ ڕۆژێك شەیتان وەك ڕۆژی عەرەفە بێ نرخو لوت شکاوو توڕەو قین هەڵساوتر نابینرێت، ئەوەش لەبەر ئەوەیە کە ئەبینێ ڕەحمەتی خوا دێتە خوارەوە بۆ سەر بەندەکانیو لە گوناهە گەورەکانیان ئەبورێ، مەگەر لە ڕۆژی بەدردا ئەوەی نیشان درابێ، ووتیان: ڕۆژی بەدر چی بینیوە ئەی نێراوی خوا؟ فەرمووی: (ئەی بینی جوبرەئیل سەرکردایەتی فریشتەکانی ئەکرد). مالیك بە مورسەلی گێڕاویەتیەوەو حاکم بە مەوصولی.

**حوکمی وەستان لە عەرەفە:**

زانایان هەموویان لە سەر ئەوە ئیجماعیان هەیە: کە وەستان لە عەرەفە ڕوکن و پایە گەورەکەی حەجە، بە پێی ئەوەی ئەحمەدو خاوەن سونەنەکان ئەگێڕنەوە لە (عبدالرحمن)ی کوڕی یەعمورەوە: کە پێغەمبەر ﷺ فەرمانیدا بانگ بێژێك بانگەواز بکا: (الحَجُّ عَرَفَة، مَن جَاءَ لَيلَةَ جمع قَبلَ طُلُوعِ الفَجرِ فَقَد أدرَكَ).

واتە: حەج وەستانی عەرەفەیە[1]، هەرکەس شەوی جەمع[2] گەیشت پێش ئەوەی ڕۆژ هەڵبێت ئەوە گەیشتووە بە حەج.

**کاتی وەستانی عەرەفە:**

جومهوری زانایان ڕایان وایە کە کاتی وەستان لە عەرەفە لەدوا نیوەڕۆی ڕۆژی نۆیەمەوە[3] دەست پێ ئەکات هەتا بەرە بەیانی ڕۆژی دەیەم، وە ئەوەندە بەسە کە وەستان هەبێت لە هەر بەشێکی ئەم ماوەیەدا بەشەو بێت یا ڕۆژ.

ئەوەندە هەیە ئەگەر ئەو کەسە بە ڕۆژ وەستا واجبە لەسەری هەتا دوای ڕۆژ ئاوا بوون بوەستێ، بەڵام ئەگەر بەشەو وەستا هیچی لەسەر نییە. وە بۆچونی شافیعی ئەوەیە کە درێژە پێدانی وەستان هەتا شەو سونەتە.

**مەبەست بەو ڕاوەستانە:**

مەبەست لە وەستان ئامادە بوون‌و بوونی ئەو کەسەیە لەو شوێنەدا، جا لەهەر شوێنێکی عەرەفەدا بێت، با نوستوش بێت، یا بە ئاگا بێ، یان سوار بێت، یان دانیشتبێت، یان ڕاکشابێت، یان پیادە بێت، وە یەکسانە خاوێن بێت یا خاوێن نەبێت وەك بێنوێژ و زەیستان و لەش گران.

زانایان جیاوازی‌یان هەیە دەربارەی وەستانی بوراوە بوراوەیەك کە هەتا لە عەرەفات دەر ئەچی هۆشی نایەتەوە خۆ.

ئەبوحەنیفە و مالیك ووتوویانە: هەر دروستە.

شافیعی‌و ئەحمەدو حەسەن و (أبو ثور) و ئیسحاق و (ابن المنذر) ووتویانە: دروست نییە، چونکە وەستان پایەیەکە لە پایەکانی حەج، وە لەو کەسەوە کە بوراوەتەوە بەجێ نەهاتووە، وەك غەیری وەستان لە پایەکانی تردا.

(ترمذي) دوای تەخریج کردنی حەدیسەکەی ئیبنویەعمور ووتویەتی: سوفیانی (ثوري) ووتویەتی: کار لەسەر حەدیسەکەی (عبدالرحمن)ی کوڕی یەعمور لای زانایانی صەحابەو دوای ئەوان ئەوەیە: ئەوکەسەی کە لە عەرەفات نەوەستابێ پێش بەرەبەیان، ئەوە حەجی لەدەست دەرچووە، وە بری ناکەوێ ئەگەر دوای

---

(١) واتە: حەجی صەحیح حەجی ئەو کەسەیە کە فریای وەستان کەوتوە لە ڕۆژی عەرەفە.

(٢) شەوی جەمع: شەوی مانەوەیە لە موزدەلیفە، کە شەوی قوربانی‌یە. زاهیری ئەم فەرمودەیە ئەوەیە کە وەستان لە هەر بەشێکی عەرەفە با یەك ساتیش بێت بەسە.

(٣) مەزهەبی حەنبەلی‌یەکان ئەوەیە کە وەستان لە بەرەبەیانی ڕۆژی نۆیەمەوە دەست پێ ئەکات تاوەکو بەرەبەیانی ڕۆژی قوربانی.

هەڵهاتنی بەرەبەیان هاتبێ، وە با بیکات بە عومرەوساڵێکی تر حەج بکاتەوە، ئەمەش قسەی شافیعیو ئەحمەدو جگە لەوانە.

## پەسەندیەتی وەستان لای بەردە گەورەکان

وەستان لە هەرشوێنێکی عەرەفە بری ئەکەوێت چونکە عەرەفە هەمووی شوێنی وەستانە، جگە لە دۆڵی عەرەفە کە ئەکەوێتە لای ڕۆژ ئاوای عەرەفەوە، چونکە وەستان لەو شوێنەدا بە ئیجماع بری ناکەوێت.

وە پەسەندە وەستانەکەی لای بەردەگەورەکان بێت یانزیك لەوشوێنەوە بێ بەپێی توانا، چونکە پێغەمبەر ﷺ لەوشوێنەدا وەستاوەو فەرمویەتی: من لێرەدا وەستاوم، بەڵام عەرەفە هەموو شوێنێکی جێی وەستانە. ئەحمەدو موسلیم و ئەبو داوود لە حەدیسی جابیرەوە ئەگێڕنەوە، وە سەرکەوتنە سەر کێوی (الرحمة) و باوەڕ بوون بەوەی کە چاکترە ئەوە هەڵەیەو سوننەت نیە.

**پەسەندیەتی خۆ شۆردن:**

خۆ شۆردن بۆ وەستانی عەرەفە سوننەتە، وە ئیبنوعومەر خوا لێیان ڕازی بێت ئێوارەی وەستانی عەرەفە، خۆی ئەشۆری. مالیك گێڕاویەتیەوە.

عومەر لە عەرەفات خۆی شۆریوەو (لا إله إلا الله)ی ئەکرد.

**ئادابی وەستان و پاڕانەوە لە عەرەفە:**

پێویستە پارێزگاری خاوێنی تەواو بکرێ، هەروەها وەستان بەرەو قیبلە، هەروەها زۆر داوای لێ بوردن و یادی خواو پاڕانەوە بۆ خۆی و بۆ کەسانی تر، بۆ سوودی دین و دنیا، لەگەڵ ئامادە بونی دڵو مل کەچی تەواو، وە لەگەڵ دەست بەرزکردنەوەدا.

ئوسامەی کوڕی زەید فەرمویەتی: لە پاشکۆی پێغەمبەروە بووم ﷺ لە عەرەفات، هەردوو دەستی بەرزکردەوەو پاڕایەوە. نەسائی گێڕاویەتیەوە.

لە عەمری کوڕی شوعەیبەوە لە باوکیەوە لە باپیریەوە هاتوە فەرمویەتی: زۆرترین پاڕانەوەی پێغەمبەر ﷺ ڕۆژی عەرەفە (لا إِلٰه إلا اللهُ وَحدَهُ لاشَرِيكَ لَهُ، لَهُ المُلكُ وَلَهُ الحَمدُ بِيَدِهِ الخَيرُ وَهُوَ على كُلِّ شَيءٍ قَدِير). رواه أحمد والترمذي ولفظه: إنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: خَيرُ الدُّعَاءِ دُعاءُ يَومِ عَرَفَةَ، وَخَيرُ مَا قُلتُ أَنَا وَالنَّبِيُّونَ مِن قَبلِي: لا إلَه إلا اللهُ وَحدَهُ لاشَرِيكَ لَهُ، لَهُ المُلكُ وَلَهُ الحَمدُ وَهُوَ على كُلِّ شَيءٍ قَدير).

واتە: چاکترین پاڕانەوە پاڕانەوەی ڕۆژی عەرەفەیە وە چاکترین شتێك من و پێغەمبەرانی پێش من ووتبێتمان: (لا إله إلا الله وحده لاشريك له، له الملك وله الحمد وهو على كل شيء قدير).

ئەگێڕنەوە لە حسینی کوڕی حسەنی میروەزیەوە کە ووتویەتی: پرسیارم کرد لە سوفیانی کوڕی عویەینە دەربارەی چاکترین پاڕانەوەی ڕۆژی عەرەفە؟ فەرموی: (لا إله إلا الله وحده لاشريك له). ووتم: ئەمە ستایشە نەك پاڕانەوە.

ووتی: ئەی حەدیسەکەی مالیکی کوڕی حارث نازانی؟ ئەوە تەفسیرەکەیەتی.

ووتم: دەتۆ بۆم بگێڕەرەوە. ووتی: مەنصور بۆی گێڕامەوە لە مالیکی کوڕی (حارث)ەوە ووتویەتی: خوای گەورە ئەفەرموی: ئەگەر بەندیەکم بە ستایش‌وحەمدی منەوە وەها خەریك بوو کە داوای لێ نەدەکردم، چاکترینی ئەو شتانەی ئەدەمێ کە بە داواکارانی ئەدەم.

ووتی: ئەمە تەفسیری فەرموودەکەی پێغەمبەرە ﷺ کە فەرمووی چاکترین دۆعا ووتنی (لا إله إلا الله...)یە. پاشان سوفیان ووتی: ئەی نەتزانیوە کە ئومەییەی کوڕی صەلت کاتێك هات بۆلای عبد الله ی کوڕی جودعان بۆ داواکاری‌یەکەی چی ووت؟ ئەڵێ: ووتم نە، ئەویش ووتی: ئومەییە ووتی:

أأذكُرُ حَاجَتِي أم قَد كَفَانِي — حَيَاؤُكَ إنَّ شِيمَتَكَ الحَيَاءُ

وَعِلمكَ بِالحُقوقِ وأنتَ فَرعٌ — لَكَ الحَسَبُ المُهَذَّبُ وَالسَّنَاءُ

إذَا أثنَـــي عَليكَ المَرءُ يَوماً — كَفَــاهُ مِن تَعَرُّضِهِ الثَّنَاءُ

واتە: ئایا باسی حاجەت و پێویستی‌یەکەم بکەم یان هەر شەرم و حەیاکەت بەس بێ بۆ من چونکە ڕەوشت و خوی تۆ شەرم و حەیایە، یان هەر زانیاریت بە مافەکان بۆ من بەس بێت کە تۆ بۆ خۆت بەشێکی لە زانین، وە بۆ تۆیە حەسەب و گەورەیی و بەرزی.

ئەگەر پیاو ڕۆژێك لە ڕۆژان بیەوێ ستایشت بکات ئەوە هەر ستایش کردنەکە بری داوا کردن ئەکەوێ.

ئینجا ووتی: حوسەین! ئەمە دروست کراوێکە کە هەر بە ستایش کردنەکە قەناعەت ئەکات لە داوا کردن، جا ئەی خالق چۆن قەناعەت ناکات.

بەیهەقی ئەگێڕێتەوە لە عەلی‌یەوە خوا لێی ڕازی بێت: کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (إنَّ أكثَرَ دُعَاءِ مَن قَبلِي مِنَ الأنبِيَاءِ، وَدُعَائِي يَومَ عَرَفَة، أن أقُولَ: لا إلَهَ إلا اللهُ وَحدَهُ لاشَرِيكَ لَهُ، لَهُ المُلكُ وَلَهُ الحَمدُ، وَهُوَ على كُلِّ شَيءٍ قَدِير، اللّهُمَّ اجعَل فِي بَصَرِي نُوراً، وَفِي سَمعِي نُوراً، وَفِي قَلبِـي نُوراً. اللّهُمَّ اشرَح لِي صَدرِي، وَيَسِّر لِي أمرِي، اللّهُمَّ أعُوذُ بِكَ مِن وَسوَاسِ الصَّدرِ، وَشَتَاتِ الأمرِ، وَشَرِّ فِتنَةِ القَبرِ، وَشَرِّ مَا يَلِجُ فِي اللَّيلِ، وَشَرِّ مَا يَلِجُ فِي النَّهَارِ، وَشَرِّ مَا تَهُبُّ بِهِ الرِّيَاحُ، وَشَرِّ بَوَائِقِ الدَّهرِ). واتە: بەشی زۆری پاڕانەوەی پێغەمبەرانی پێش خۆم و پاڕانەوەی خۆم لە عەرەفە ئەوە بو کە ووتومە: (جگە لە خوا هیچ پەرستراوێکی بە حەقی تر نیە کە هاوبەشی نیە، موڵك و سوپاس هەر بۆ ئەوە، وە هەر ئەو بەسەر هەمووشتێکدا توانای هەیە، خوایە ڕۆشنایی بخەیتە چاوو گوێو دڵم. خوایە سنگم فراوان بکەیو کارم بۆ ئاسان بکەی، خوایە پەنا ئەگرم بە تۆ لە وەسوەسەی ناو سنگ و پەرتو بڵاوی کار، و شەڕی فیتنەی ناو

گۆڕ، خوایە پەنا ئەگرم بە تۆ لە شەڕی ئەو شەڕدارانەی لە شەوو ڕۆژدان، وە شەڕی ئەو شەڕدارانەی کە با ئەیان هێنێ. وە شەڕی ئەو لەناوبەرانەی کە لە زەمانەدا هەیە.

(ترمذي) ئەگێڕێتەوە هەر لە عەلیەوە کە فەرمویەتی: بەشی زۆری پاڕانەوەکانی پێغەمبەر ﷺ لە عەرەفە لە شوێنی وەستاندا: (اللَّهُمَّ لَكَ الحَمدُ كَالَّذِي نَقُولُ، وَخيراً مِمَّا نَقُولُ، اللَّهُمَّ لَكَ صَلاتِي، وَنُسُكِي، وَمَحيَاي، وَمَمَاتِي، وَإلَيكَ مَآبِي، وَلَكَ رَبِّ تُراثِي، اللَّهُمَّ إنِّي أعُوذُ بِكَ مِن عَذَابِ القَبرِ، وَوَسوَسَةِ الصَّدرِ، وَشَتَاتِ الأمرِ، اللَّهُمَّ إنِّي أعُوذُ بِكَ مِن شَرِّ مَا تَهُبُّ بِهِ الرِّيحُ). واتە: خوایە سوپاس و ستایش بۆ تۆ وەك ئەوەی ئێمە ئەیلێین، وە چاکتریش لەوەی کە ئەیلێین، خوایە نوێژو سەربڕینم و ژیان و مردنم بۆ تۆیە، وە هەر بۆلای تۆ ئەگەڕێمەوە، خوایە ئەوەی پاش مردن بەجێی ئەهێڵم هەر بۆ تۆیە، خوایە من پەنا ئەگرم بە تۆ لە سزای ناوگۆڕ، و وەسوەسەی ناو سنگ و پەرت و بڵاوی کار، خوایە من پەنا ئەگرم بە تۆ لە شەڕی ئەوەی با ئەیهێنێ.

وەستان سونەتی ئیبراهیمە (علیه السلام):

لە میربەعی ئەنصاریەوە هاتوە کە پێغەمبەر ﷺ ئەیفەرمو: (كُونُوا عَلَى مَشَاعِرِكُم فَإنَّكُم عَلَى إرثٍ مِن إرثِ إبرَاهِيمَ) رواه الترمذي وقال: حديث حسن. واتە: هەر لەسەر شوێنی عیبادەتەکانی حەجتان بن، چونکە ئێوە لە سەر میراتێکن لە میراتەکانی ئیبراهیم (علیه السلام).

ڕۆژووی ڕۆژی عەرەفە:

سابت بوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ کە ڕۆژی عەرفە بەڕۆژوو نەبووە وە فەرمویەتی: (إنَّ يَومَ عَرَفَةَ، وَيَومَ النَّحرِ، وَأيَّامَ التَّشرِيقِ عِيدُنَا ـ أهلَ الإسلام ـ وَهِيَ أيَّامُ أكلٍ وَشُربٍ). واتە: بەڕاستی ڕۆژی عەرەفە و ڕۆژی جێژنی قوربانو ڕۆژەکانی تەشریق جەژنی ئێمەی موسڵمانانە -وە ئەمانە ڕۆژی خواردن و خواردنەوەن-.

وە سابتە لێیەوە ﷺ کە ڕۆژووی ڕۆژی عەرەفەی لە عەرەفات قەدەغە کردووە، وە بەشی زۆری زانایان ئەم فەرموودەیان کردۆتە بەڵگە لە سەر پەسەندی بەڕۆژوو نەبوونی حاجی لە ڕۆژی عەرەفەدا بۆ ئەوەی هێزی پاڕانەوەو یادی خوای تێدا بێت.

وە ئەوەی هاتووە لە هاندان بۆ ڕۆژووی ڕۆژی عەرەفە، ئەوە سەبارەت بە کەسێکە کە لە حەجدا نەبێت.

کۆکردنەوەی نوێژی نیوەڕۆو عەسر:

لە فەرموودەی صەحیحدا هاتووە: کە پێغەمبەر ﷺ نوێژی نیوەڕۆو عەسری لە عەرەفە بەسەر یەکەوە کردووە، فەرمانی داوە بانگ دراوە لەپاشان قامەت کراوەو نوێژی نیوەڕۆی کردووە، لە پاشاندا قامەت کراوەتەوە نوێژی عەسریشی کردووە.

لە ئەسوەدو عەلقەمەوە هاتوە کە ووتوویانە: لە تەواوێتی حەج ئەوەیە کە نوێژی نیوەڕۆو عەسر لەگەڵ ئیمامدا بکرێ لە عەرەفە.

(ابن المنذر) ووتویەتی: زانایان لەسەر ئەوە ئیجماعیان هەیە کە ئیمام ئەبێ نوێژی نێوەڕۆو عەسر لە عەرەفە بەسەریەکەوە بکات، وە هەروەها ئەو کەسەش کە لەگەڵ ئیمام نوێژ ئەکات. جا ئەگەر لەگەڵ ئیمام دا بەسەر یەکەوە نەی کردبوو ئەبێ بەتەنها بەسەر یەکەوە بیان کات.

لە ئیبنوعومەرەوە خوا لێیان ڕازی بێت: کە ئەو لە مەککەدا دائەنیشت وە کاتێك بچوایە بۆ مینا نوێژی کورت ئەکردەوە.

لە عەمری کوڕی دینارەوە هاتوە ووتوویەتی: جابیری کوڕی زەید پێی ووتووم: لە عەرەفە نوێژ کورت بکەرەوە. سەعیدی کوڕی مەنصور ئەمەی گێڕاوەتەوە .

**بە لێشاو هاتنە خوارەوە لە عەرەفە (إفاضة)**

لە دوای ڕۆژ ئاوا بوون بەلێشاو هاتنەخوارەوە لە عەرەفەوە بەبێ دەنگی سوننەتە، چونکە پێغەمبەر ﷺ بەوشێوەیە هاتۆتە خوارەوە، بەشێوەیەك ڕەشمەی ووشترەکەی ئەوەندە توند کردبو بۆ لای خۆیەوە، خەریك بوو سەری ئەدا لە کۆپانەکەی، وە پێغەمبەر لەوکاتەدا ئەیفەرمو: (أَيُّهَا النَّاسُ عَلَيكُم بِالسَّكِينَةِ، فَإِنَّ البِرَّ لَيسَ بالأيضاعِ) رواه البخاري ومسلم. واتە: ئەی خەلکینە لەسەرخۆو بێ دەنگ بن، چونك خێر لە خێرا ڕۆیشتندا نیە.

پێغەمبەر ﷺ لە سەر خۆ ئەڕۆیشت بۆ ئەوەی ئازاری کەس نەدا بەڵام ئەگەر چۆڵاییەکی بۆ ڕێ بکەوتایە بەپەلە ئەڕۆیشت. شەیخەین گێڕاویانەتەوە.

تەلبیەیەو یادی خوا پەسەندە. چونکە پێغەمبەر هەر تەلبیەی ئەکرد هەتا ڕەمی جەمەرەی عەقەبەی کرد.

لە (أشعث)ی کوڕی سولەیمەوە لە باوکیەوە هاتوە ووتویەتی: لەگەڵ ئیبنو عومەردا ئەهاتەوە لە عەرەفاتەوە بۆ موزدەلیفە لە (الله أكبر) و (لا إله إلا الله) کردن نەئەکەوت هەتا گەیشتینە موزدەلیفە، ئەبو داوود ریوایەتی کردووە.

**کۆکردنەوەی نوێژی ئێوارەو خەوتنان لە موزدەلیفە:**

جا کاتێك حاجی هاتە موزدەلیفە، نوێژی شەوان و خەوتنان بەسەریەکەوە ئەکات و نوێژی خەوتنان ئەکات بە دوو ڕکات، وە بە یەك بانگ و دووقامەت بەسەریەکەوە بێ ئەوەی نوێژی سوننەت بکات لە نێوانیان.

لە حەدیسەکەی موسلیم دا هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ هاتە موزدەلیفە، نوێژی ئێوارەو خەوتنانی کۆکردەوەو بەسەر یەکەوە کردنی بەیەك بانگ و دووقامەت، وەلە نێوانیاندا نوێژی سوننەتی نەکرد. وە ئەو کۆکردنەوەیە سوننەتە بە ئیجماعی زانایان. بەڵام جیاوازن لەوەدا کە ئەگەر کەسێك هەر نوێژە لە کاتی خۆی دا بکات.

زۆر لە زانایان بە دروستیان داناوە، وە کارەکەی پێغەمبەریان ﷺ لەسەر ئەوە داناوە کە کۆکردنەوە لە پێش ترە.

(ثوري) و خاوەن ڕاکان ووتویانە: ئەگەر کەسێك پێش موزدەلیفە نوێژی ئێوارەی کردبێ ئەبێ نوێژەکەی بگێڕێتەوە.

بەڵام کردنی نوێژی نیوەڕۆو عەسریان هەریەکە لە کاتی خۆیدا بە دروست داناوە، لەگەڵ کەڕاهەتدا.

**شەو مانەوە لە موزدەلیفە و وەستان تێیدا :**

لە حەدیسەکەی جابیردا خوا لێی ڕازی بێت هاتوە کە پێغەمبەر ﷺ کاتێ هات بۆ موزدەلیفە نوێژی ئێوارەو خەوتنانی بەجێ هێنا. لەپاشاندا ڕاکشا هەتا بەرەبەیان، ئینجا نوێژی بەیانی کرد. پاشان سواری (قصواء) بوو هەتا هاتە مەشعەری حەرام، هەر ڕاوەستا هەتا دونیا تەواو ڕون بۆوە، لەپاشاندا پێش ڕۆژ هەڵاتن کەوتە ڕێ، وە سابت نەبوە کە پێغەمبەر ﷺ ئەو شەوەی ڕۆژ کردبێتەوە بەنوێژ و یادی خواوە.

ئەمەش سونەتێکی سابتە بۆ مانەوەی شەو لە موزدەلیفەو وەستان تێیدا.

ئەحمەد مانەوەی شەو لە موزدەلیفە بە واجب دائەنێ لەسەر حاجی، جگە لە شوان و ئاودابەش کەران، کە ئەوان واجب نی‌یە لەسەریان شەو لە موزدەلیفە بمێننەوە.

بەڵام هەمو پێشەوا خاوەن مەزهەبەکانی تر، وەستان لە موزدەلیفە بە واجب دائەنێن بەبێ مانەوەی شەو.

مەبەست لە وەستان ئەوەیە کە لەو شوێنەدا ئامادە بێت بەهەر شێوەیەك بێت، بەپێوە بێت یان ڕاوەستاو بێت، یا بە دانیشتنەوە یا هاتووچۆ بکات یا خەوتبێ.

حەنەفی‌یەکان ئەڵێن: ئەوەی واجبە ئامادە بوونە لە موزدەلیفە پێش بەرە بەیانی ڕۆژی قوربانی.

جا ئەگەر کەسێك ئامادە نەبوو خوێنێکی لەسەر ئەبێت. مەگەر بەهانەیەکی هەبێت، ئەوکاتە واجب نی‌یە حازر بێت، وە هیچیشی لەسەر نابێت.

مالیکی‌یەکان ئەڵێن: واجب چونە بە شەو بۆ موزدەلیفە لە پێش بەرەبەیاندا، ئەوەندەی بارەکەی بخات لەکاتێکدا لە عەرەفەوە بەرو مینا ئەچێت، بەمەرجێ بەهانەیەکی نەبێت، جا ئەگەر بەهانەی هەبوو دابەزین لە موزدەلیفە واجب نیە لەسەری.

شافیعی‌یەکان ووتویانە: واجب ئەوەیە ئامادە بێ لە موزدەلیفە لە نیوەی دووەمی شەوی قوربانیدا، دوای وەستان لە عەرەفە. وە مانەوە تێیدا مەرج نی‌یە. وە مەرجیش نیە بزانێ کە ئەوە موزدەلیفەیە، بەڵکو ئەوەندەی بەسە بەناویدا بڕوا جا ئەو کەسە بزانێ ئەوە موزدەلیفە یان نا وەك یەکە.

سونەت وەهایە نوێژی بەیانی لە سەرەتای کاتەوە بکات، پاشان لە مەشعەری حەرام بوەستێ هەتا ڕۆژ ئەبێتەوە و دونیا تەواو ڕوناك ئەبێتەوە پێش ڕۆژ هەڵاتن. وە لەو شوێنەدا زۆر یادی خوا بکات و بپاڕێتەوە.

خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿فَإِذَآ أَفَضْتُم مِّنْ عَرَفَٰتٍ فَٱذْكُرُوا۟ ٱللَّهَ عِندَ ٱلْمَشْعَرِ ٱلْحَرَامِ ۖ وَٱذْكُرُوهُ كَمَا هَدَىٰكُمْ وَإِن كُنتُم مِّن قَبْلِهِۦ لَمِنَ ٱلضَّآلِّينَ ۝ ثُمَّ أَفِيضُوا۟ مِنْ حَيْثُ أَفَاضَ ٱلنَّاسُ وَٱسْتَغْفِرُوا۟ ٱللَّهَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ (البقرة/١٩٨-١٩٩). واتە: ئەگەر لە عەرەفاتەوە بە لێشاو هاتنە خوارەوە، یادی خوا بکەن لای مەشعەری حەرام، وە چۆن ڕێنمایی کردوون بۆ ڕێی ڕاست یادی بکەن، هەرچەندە لە پێش ئەوەدا لە گومڕاکان بوبێتن، پاشان بەلێشاو وەرنە خوارەوە وەك چۆن خەڵك بە لێشاو دێنە خوارەوەو داوای لێ خۆش بوون بکەن لە خوا چونکە خوا لێ بوردەو بە بەزەییە.

جا پێش ڕۆژ هەڵاتن لە موزدەلیفەوە دێتە خوارەوە بۆ مینا، کاتێ گەیشتە (محسر) پەلە بکات ماوەی بەردە هاوێژێك.

**شوێنی وەستان لە موزدەلیفە:**

موزدەلیفە هەمووی شوێنی وەستانە جگە لە شیوی (محسر) کە دۆڵێکە لە نێوان موزدەلیفەو مینا.

لە جوبەیری کوڕی (مطعم)ەوە هاتوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (كُلُّ مُزدَلِفَةَ مَوقِفٌ، وَارفَعُوا عَن مُحَسِّر) رواه أحمد ورجاله موثقون. واتە: موزدەلیفە هەمووی شوێنی وەستانە، وە کە گەیشتنە (محسر) پێ هەڵگرن. وە وەستان لای (قُزَح) چاکترە.

لە حەدیسی عەلی دا هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ کاتێ ڕۆژی کردەوە لە (جمع) هاتە (قزح)[1]. لەسەری وەستاو فەرمووی: (هَذَا قُزَحُ وَهُوَ المَوقِفُ، وَجُمَعُ كُلُّهَا مَوقِفُ) رواه أبوداود، والترمذي، وقال: حسن صحيح. واتە: ئەوە (قزح)ەو شوێنی وەستانە، وە (جمع) هەمووی شوێنی وەستانە.

**کارەکانی ڕۆژی قوربانی:**

کارەکانی ڕۆژی قوربانی بەرێك و پێکی جێبەجێ ئەکرێن بەم شێوەیە: دەست ئەکرێت بە ڕەمی کردن، پاشان سەربڕینی قوربانیەکان، پاشان سەرتاشین، پاشان تەواف. وە ئەم ریز کردنە سوننەتە، جا ئەگەر کارێك پێش کارێك بخات هیچی نایەتە سەر، لای بەشی زۆری زانایان.

ئەمەش بۆچونی شافعی‌یە بەپێی حەدیسەکەی عەبدوڵلای کوڕی عەمر کە فەرمویەتی: پێغەمبەر ﷺ لە حەجی ماڵ ئاوایی‌دا ڕاوەستا لە مینا و خەڵکەکە پرسیاریان لێ ئەکرد، پیاوێك هاتە لای و ووتی: ئەی نێرراوی خوا من نەم زانی سەرم تاشی پێش ئەوەی قوربانی بکەم، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: سەری ببڕە هیچی تێدا نیە و قەیدێ ناکا.

---

(١) شوێنێکە لە موزدەلیفە شوێنی وەستانی قوڕەیش بوو لە سەردەمی نەفامی دا، چونکە ئەوان لە عەرەفات نەئەوەستان.

لە پاشاندا یەکێکی تر هات وتی: ئەی نێراوی خوا من نەم زانی قوربانی‌یەکەم کرد پێش ئەوەی ڕەمی بکەم. فەرمووی: ڕەمی بکە زیانی نی‌یە. وە هیچ پرسیارێك لە پێغەمبەر ﷺ نەکرا دەربارەی دواخستن و پێش خستنی کارەکانی کە نەی‌فەرموبێت: بیکە بێ حەرەجە و قەیدێ ناکا.

ئەبو حەنیفە بۆ ئەوە چووە کە هەرکەس ئاگاداری ئەو تەرتیبە نەکات و کارێك پێش کارێ بخات خوێنێ ئەکەوێتە سەر. وە ئەوەی کە پێغەمبەر ﷺ ئەی فەرموو: (ولا حرج) بەوەی لێك داوەتەوە مەبەست ئەوەیە گوناهی نی‌یە، بەڵام خوێنێکی لەسەرە.

خۆکردنەوە و ئیحرام شکاندنەوەی یەکەم و دووەم

بە (رمي الجمرات) بەرد هەڵدانی ڕۆژی قوربانی و سەرتاشین یا کورت کردنەوەی، هەمو ئەوانەی لەسەر موحریم حەرام بووە ڕەوا ئەبێ بۆی لەکاتی ئیحرامەکەدا.

جا بۆی هەیە بۆن لە خۆی بدات و جل لەبەر بکات و ئەو جۆرە شتانە، جگە لە چونەلای ژن، ئەوە خۆ کردنەوەی یەکەمە.

جا کاتێك تەوافی (إفاضة)ی کرد ـ کە ڕوکنە ـ هەموو شتێکی بۆ ڕەوا ئەبێت هەتا ژنیش. ئەمەش ئیحرام شکاندنی دووەم و کۆتایی‌یە.

(رمي الجمار) بەردگرتن لە کۆمەڵە بەردەکان

بنەمای دامەزراندنی:

بەیهەقی ئەگێڕێتەوە لە سالمی کوڕی جەعدەوە لە ئیبنوعەبباسەوە خوا لێیان ڕازی بێت کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: کاتێ ئیبراهیم هات بۆ بەجێ هێنانی کارەکانی حەج، شەیتان ڕێی پێ گرت لای جەمرەی عەقەبە ئەویش حەوت بەردی تێ گرت هەتا چو بەناخی زەویدا، پاشان لەلای جەمرەی دوەمەوە هات بۆی، حەوت بەردی تریشی تێ گرتەوە هەتا چوو بەناخی زەویدا، پاشان لەلای جەمرەی سێهەم هاتەوە ڕێی پێ گرتەوە، ئەم جارەش حەوت بەردی تریشی تێ گرتەوە هەتا چووەوە بەزەویدا.

ئیبنو عەبباس ئەیفەرمو: شەیتان ڕەجم ئەکەن‌و شوێن ئاینی باوکتان کە ئیبراهیمە ئەکەون. ئەمە (منذري) ووتوویەتی.

هەروەها ئیبنوخوزەیمە لە صەحیحەکەیدا گێڕاویەتی‌یەوەو حاکمیش وە ووتوویەتی صەحیحە لەسەر مەرجی شەیخەین.

حیکمەتی ڕەمی کردن:

ئەبو حامیدی غەزالی ڕەحمەتی خوای لەسەر بێت لە کتێبی (الإحیاء) دا ووتویەتی: بەڵام بەرد هاویشتن، با بەرد هەڵدەر مەبەستی مل نان بێت بۆ فەرمانەکانی خوا، وە دەرخستنی بەندایەتی بۆ خوا، وە ڕاپەڕین بێت تەنها لەبەر گوێ ڕایەڵی کردن، بێ ئەوەی بەشی دەروون و ئاوەزی تێدا بێت لەوەدا.

پاشان با مەبەستی ئەوەبێ کە وەك ئیبراهیمی کردوە (علیه السلام) کاتێ شەیتان ڕێی پێ گرتوە ـ نەفرینی خوای لێ بێ ـ لەوشوێنەدا بۆ ئەوەی شوبهەو گومان بخاتە حەجەکەیەوە، یان توشی تاوانێکی بکا، ئیتر خوای گەورە فەرمانی پێدا کە حەوت بەردی تێ بگرێ بۆ ئەوەی بڕوات و هیوابڕاو بێت[1].

جا ئەگەر هات بە دڵتا ووتت خۆ ئیبراهیم شەیتان ڕێی پێ گرتووەو بینیویەتی بۆیە بەردی تێ گرت، خۆ من شەیتان ڕێی پێ نەگرتووم بۆ چی ئەم بەردانە بهاوێژم؛ بزانە ئەو ختورەیە لە شەیتانەوەیە، وە هەر ئەوە هێناویەتی بەدڵتا بۆ ئەوەی جەختت نەمێنێ لەسەر بەرد هەڵدانەکە، وە بە خەیاڵتدا بێت کە ئەمە هیچ سوودی نییە، وە وەك یاری منداڵانە وەهایە، بۆ خۆی پێوە خەریك ئەکەی؟.

تۆش ئەوە لە دڵت دەربکە بە کۆشش کردن و خێرا کردن لە بەرد هەڵدان، جا بەوشێوەیە لوتی شەیتان ئەشکێنی، وە بشزانە تۆ لە ڕواڵەتدا بەرد ئەگریتە عەقەبە، بەڵام لە ڕاستیدا بەرد ئەگریتە سەرو چاوی شەیتان‌و پشتی پێ ئەشکێنی.

چونکە شەیتان لوتی ناشکێ هەتا تۆ بەتەواوی مل نەنێیت بۆ فەرموودەی خواو بەگەورەی نەزانی، تەنها لەبەر ئەوە کە فەرمانی پێ داوی بەبێ ئەوەی ئارەزووی دەروونی خۆتی تێدا بێت.

**حوکمی بەرد هاویشتن:**

جومهوری زانایان بۆ ئەوە چوون کە: بەرد گرتنە جەمەرەکان واجبە بەڵام پایەیەکی حەج نیە، وە واز لێ هێنان‌و نەکردنی بەخوێن قەرەبو دەکرێتەوە. بە پێی ئەوەی ئەحمەدو موسلیم و نەسائی گێڕاویانەتەوە لە جابیرەوە خوا لێی ڕازی بێت فەرمویەتی: پێغەمبەرم ﷺ بینیوە ڕۆژی قوربانی لەسەر وولاغەکەیەوە بەردی ئەگرتە جەمەرەکە وە ئەیفەرموو: (لِتَأْخُذُوا عَنِّي مَنَاسِكَكُم، فَإِنِّي لا أدرِي لَعَلِّي لا أحُجُّ بَعدَ حَجَّتِي هَذِهِ). واتە: بۆ ئەوەی بەجێ هێنانی کارەکانی حەجەکەتان لە منەوە فێر بن، چونکە من نازانم دووای ئەم حەجە حەجێکی تر ئەکەمەوە یان نا.

لە (عبدالرحمن)ی تەیمی‌یەوە هاتوە کە پێغەمبەر ﷺ لە حەجی ماڵ ئاواییدا فەرمانی پێ ئەداین کە بە وووردە بەردی وەك بەردی دارلاستیك ڕەمی بکەین (وەك دەنکە پاقلە). (طبراني) لە (الکبیر)دا بە سەنەدێك کە پیاوەکانی پیاوی فەرموودەی صەحیحن گێڕاویەتی‌یەوە.

---

(١) ئەو سێ شوێنەی بەردی تێ ئەگیری هەمویان لە مینان کە ئەمانەن:

١- (جمرة العقبة) : لای چەپی ئەوکەسەیە کە ئەچێتە ناو میناوە.

٢- (جمرة الوسطي) : لەدوای ئەوەوەیە، لەنێوان ئەم و یەکەمدا ١١٦,٧٧ مەترە،

٣- (جمرة الصغرى): کە لەم لای مزگەوتی حەیفاوەیە لە نێوان ئەم و ناوەڕاست ١٥٦,٤مەترە).

**ئەندازەی بەردەکان چەندە بێ و چ جۆرێك بێت؟:**

لە حەدیسەکەی پێشوودا هاتووە: ئەو بەردەی ڕەمی پێ ئەکرێ وەکو بەردی دارلاسیك وەها بێت. لەبەر ئەوە زانایان ئەو جۆرە بە پەسەند ئەزانن، وە ئەگەر کەسێك لەوە تێ پەڕی و بەردی گەورەی گرتە جەمرەکان، جومهوری زانایان ئەڵێن: دروستەو بری ئەکەوێ، بەڵام کەراهەتی هەیە.

ئەحمەد ووتویەتی: بری ناکەوێت هەتا بەردی وورد نەهێنێ، لەسەر کردەوەکەی پێغەمبەر ﷺ کە کردوویەتی، وە لەبەر ئەوەی قەدەغەی کردووە لەوە گەورەتر بێت.

لە سولەیمانی کوڕی عەمری کوڕی ئەحوەصی ئەزدیەوە لە دایکیەوە هاتوە کە ووتوویەتی: گوێم لە پێغەمبەر ﷺ بووە - کە لەناو شیوەکەدا بوو - ئەیفەرموو: (يَا أَيُّهَا النَّاس! لايَقْتُل بَعضُكُم بَعضاً، إذَا رَمَيتُمُ الجَمرَةَ فَارمُوا بِمثْلِ حَصَى الخَذَفِ) رواه أبو داود. واتە: ئەی خەڵکینە! یەکتر مەکوژن ئەگەر بەردتان هەڵدا بەردێك بهاوێژن وەکو بەردی دارلاسیك وەهابێت واتە بەقەدەر دەنکە پاقلەیەك بێ.

لە ئیبنوعەبباسەوە خوا لێیان ڕازی بێت فەرمویەتی: پێغەمبەر ﷺ فەرموی پێم: (هَاتِ، إلقِط لِي). بێنە، بۆم بدۆزەرەوە.

ئەڵێ: منیش چەند وورده بەردێکم بۆ دۆزیەوە، کاتێ بەردەکانم خستە دەستی فەرموی: (بِأَمثَالِ هَؤلاءِ وَإِيَّاكُم وَالغُلُوّ فِي الدِّينِ، فإنَّمَا أَهلَكَ الَّذِينَ مِن قَبلِكُمُ الغُلُوُّ فِي الدِّين) رواه أحمد، والنسائي، وسنده حسن. واتە: با لەسەر ئەو شێوە بن، ئاگاتان لەخۆتان بێت لە زیادەڕەوی کردن لە دیندا، چونکە ئەوانەی لەپێش ئێوەدا بوون، زیادەڕەوی لە ئایندا لەناوی بردوون.

جومهور ئەم فەرموودانەیان لەسەر لەپێشتری و سوننەت داناوە.

زانایان هەموو ڕێکن لەسەر ئەوەی کە ڕەمی بە جگە لە بەرد دروست نیە، وە بە ئاسن یا مس و وێنەی ئەم دوانە دروست نیە.

حەنەفیەکان لەوەدا پێچەوانەن، وە ڕەمی کردن بە هەرچیەك کە لە جۆری زەوی بێت بەدروستی دائەنێن، وەك بەردو قوڕ گەچ و گڵ و بەردەوورده، چونکە ئەو حەدیسانەی کە هاتون لەبارەی ڕەمیەوە بە موطلەقی هاتوون.

وە کردەوەی پێغەمبەر ﷺ و یارەکانی لە سەر پەسەندیەتی دائەنرێ نەك لەسەر تایبەت کردن بە بەردەوە.

وە ڕای یەکەم تەرجیح ئەدرێ چونکە پێغەمبەر ﷺ بە وورده بەرد ڕەمی کردووە، وە فەرمانی داوە ئەوانیش بە وێنەی بەردی دارلاسیك ڕەمی بکەن، جا ئەمە بێجگە لە بەرد هیچ ناگرێتەوە، وە هەموو جۆرەکانی وورده بەرد ئەگرێتەوە.

**لەکوێ ئەو بەردانە هەڵ ئەگیرێ:**

ئیبنو عومەر خوا لێیان ڕازی بێت وورده بەردی لە موزدەلیفەوە هەڵئەگرت. وە سەعیدی کوڕی جوبەیر هەروەهای ئەکردو ئەی ووت: ئەوانەی پێش ئێمە لەوێوە بەردە ووردەیان هەڵئەگرتەوە، وە شافیعیش وەهای بە پەسەند دائەنا. وە ئەحمەد ووتویەتی: بەئارەزووی خۆت لە کوێ وورده بەرد هەڵئەگری هەڵبگرە. ئەوەش قسەکەی (عطاء) و (ابن المنذر)ە. بەپێی حەدیسەکەی ئیبنوعەبباس کە باس کرا کە ئەفەرموێ: (القط لي) واتە: بۆم هەڵبگرەوە. ئیتر شوێنی دۆزینەوەکەی دیاری نەکردووە.

دروستە ئەو بەردانە هەڵبگریتەوە کە فڕێ دراون‌و ڕەمی‌یان پێ کراوە، لەگەڵ ئەوەی کەراهەتی هەیە، لە لای شافیعی و حەنەفی‌یەکان‌و ئەحمەد. وە ئیبنوحەزم ووتویەتی: ئەگەر ئەوبەردانە بهاوێژرێتەوە کەلەپێشەوە هاوێژراون دروستەو کەراهەتیشی نی‌یە، وە هەروەها بەسوارەییش بیهاوێژێ هەر دروستە.

ئەما هۆی دروستی ڕەمی کردن بە بەردێك کە هاوێژراوە دروستی‌یەکەی لەبەر ئەوەیە کە نە قورئان، نە سوننەت، قەدەغەیان نەکردووە. لەپاشاندا ووتویەتی:

ئەگەر ووتیان: لە ئیبنوعەبباس گێڕراوەتەوە کە ئەو بەردانە هەرچی بەکار دێن هەڵبگیرێن وهەرچی بەکارنایەن وازیان لێ بێنن، ئەگەر وەها نەبوایە ئێستا ئەوەندەی گردێك ئەبوون و ڕێگاکەیان گرتبوو.

ئەڵێین: بەڵێ چی ئەبوو؟ ئەگەر بەو بەردانە، خوا ڕەمی لە عەمر وەرناگرێ بەڵام لە زەیدی وەرئەگرێ. چونکە جاری وا هەیە کەسێك خێرێك ئەکات خوا لێی وەرناگرێ کەچی کەسێکی تر هەر ئەوشتە بەدەست ئەهێنێ و ئەیکاتە خێر، خوا لێی وەرئەگرێ.

ئەما ڕەمی کردن بەسواری‌یەوە، بەپێی حەدیسەکەی قودامەی کوڕی عەبدوڵلایە کە فەرمویەتی: پێغەمبەرم ﷺ بینیوە ڕەمی جەمەرەی عەقەبەی ئەکرد لە ڕۆژی قوربانیدا بەسوار ووشترەکەیەوە بوو کە سورو سپی بوو، نە لێ دان هەبوو نە دەرکرن، نە ئەوەی کە بە یەکتر بڵێن دور کەوەرەوە، دور کەوەرەوە، وە هەرکەس بە ئارەزووی خۆی بوو.

**ژمارەی بەردەکان:**

ژمارەی ئەو بەردانەی ڕەمی‌یان پێ ئەکرێ حەفتا، یا چل‌ونۆ بەردوچکەیە.

حەوتیان ڕۆژی قوربانی ئەهاوێژرێ لای جەمرەی عەقەبە، وە بیست‌ویەکیان ڕۆژی یانزەهەم بەسەر سێ جەمرەکەدا دابەش ئەکرێ هەر جەمرەیەك حەوت دانە.

بیست‌ویەکی تر بەوشێوەیە لە ڕۆژی دوانزەهەمدا.

بیست‌ویەکی تر لە ڕۆژی سیانزەهەمدا بەوشێوەیە.

بەو شێوەیە ژمارەی بەردەکان ئەگەنە حەفتا بەرد.

جا ئەگەر کەسێك هەر لە سێ ڕۆژی یەکەمدا ڕەمی بکات و واز لە ڕۆژی سیانزەهەم بهێنێ دروستە.

لەم شێوەیەدا حاجی چل و نۆ بەرد ئەهاوێژێ.

مەزهەبی ئەحمەد: ئەگەر حاجی پێنج بەرد بهاوێژێ بری ئەکەوێ.

(عطاء) ووتوویەتی: ئەگەر کەسێك پێنج بەرد بهاوێژێ بری ئەکەوێ.

موجاهید ووتوویەتی: ئەگەر شەش بەرد بهاوێژێ، هیچی نایەتە سەر.

لە سەعیدی کوڕی مالیکەوە هاتوە فەرمویەتی: گەڕاینەوە لە حەج لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ، وە هەندێکمان ئەی ووت شەش بەردم هەڵداوە وە هەندێکمان ئەی ووت: حەوت بەرد، کەسمان عەیبمان لە یەکتری نەدەگرت.

ئەو ڕۆژانەی ڕەمی تێدا ئەکرێ:

ڕۆژەکانی ڕەمی کردن یا سێ ڕۆژە، یا چوار، ڕۆژی جەژنی قوربان و دوو ڕۆژی تریش، یا سێ ڕۆژە لە ڕۆژانی (تشریق).

خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿وَٱذۡكُرُواْ ٱللَّهَ فِيٓ أَيَّامٖ مَّعۡدُودَٰتٖۚ فَمَن تَعَجَّلَ فِي يَوۡمَيۡنِ فَلَآ إِثۡمَ عَلَيۡهِ وَمَن تَأَخَّرَ فَلَآ إِثۡمَ عَلَيۡهِۖ لِمَنِ ٱتَّقَىٰۗ﴾ (البقرة/٢٠٣). واتە: یادی خوا بکەن لە چەند ڕۆژێکدا ـ یانزەو دوانزەو سیانزەی (ذي الحجة) لە مینا ـ ، جا هەرکەس پەلە بکات لە دوو ڕۆژدا بیکات ـ لە یانزەو دوانزەدا ـ گوناهی ناگات. هەرکەسیش دوای بخات ـ و سیانزەهەمیش بمێنێتەوە لە مینا ـ هەر گوناهی ناگات، ئەمەش ـ مانەوەی ڕۆژی سیانزەهەم ـ بۆ ئەو کەسانەیە کە لە خوا ئەترسن.

ڕەمی کردن لە ڕۆژی قوربانیدا:

کاتی هەڵبژێراو بۆ بەرد هاویشتن لە ڕۆژی قوربانی کردندا چێشتەنگاوە لە دوای ڕۆژهەڵاتن، چونکە پێغەمبەر ﷺ چێشتەنگاوی ئەو ڕۆژە بەردەکانی هاویشت.

لە ئیبنو عەبباسەوە خوا لێیان ڕازی بێت هاتوە فەرمویەتی: پێغەمبەر ﷺ هەر لەوێشەوە کەس و کاری لاوازی وەك ژن و منداڵ و پیری خستە پێشەوە بۆ ئەوەی ڕەمی بکەن. وە فەرمووی: ڕەمی جەمرەی عەقەبە مەکەن هەتا ڕۆژ هەڵدێ. (ترمذي) گێڕاویەتیەوەو بە صەحیحی داناوە، جا ئەگەر دوایشی خست تا کۆتایی ئەو ڕۆژە، ئەوە دروستە.

(ابن عبدالبر) ووتوویەتی: زانایان لەسەر ئەوە ئیجماعیان هەیە کە هەرکەس ڕۆژی قوربانی پێش خۆرئاوابوون ڕەمی بکات ئەوە لە کاتی خۆیدا ڕەمی کردوە، هەرچەندە دوا خستنی پەسەند نیە.

ئیبنوعەبباس خوایان لێ ڕازی بێت فەرمویەتی: پێغەمبەر ﷺ ڕۆژی قوربانی کردن لە مینا پرسیاری لێ ئەکرا، پیاوێك ووتی: من ئێوارە ڕەمی جەمرەم کردووە فەرمووی: (لاحرج) قەیناکە. بوخاری گێڕاویەتیەوە.

**ئایا دروستە ڕەمی کردن دوا بخرێ بۆ شەو؟:**

ئەگەر بەهانەیەك هاتە پێش و ڕێی ڕەمی کردنی گرت لە ڕۆژدا، دروستە ڕەمی کردنەکە دوا بخرێ بۆ شەو. بەپێی ئەوەی مالیك لەنافیعەوە ئەگێڕێتەوە کە کچێکی صەفیەی خێزانی ئیبنوعومەر لە موزدەلیفە مندالی بوو، لەگەڵ صەفیەی دایکیدا دوا کەوتن، کە گەیشتنە مینا ڕۆژ ئاوا بوبوو لە ڕۆژی قوربانی کردندا، کاتێ هاتن و گەیشتن ئیبنوعومەر فەرمانی پێ دان ڕەمی جەمەرات بکەن، وە ڕای وابوو هیچیان نایەتە سەر.

بەڵام ئەگەر هیچ بەهانەیەك نەبوو، دواخستنی ڕەمی کردنەکە کەراهەتی هەیە، وە لە شەودا ڕەمیەکە ئەکاتو خوێنیشی نایەتەسەر، بەڕای حەنەفیەکانو شافعیەکانو ریوایەتێکی مالیك، بەپێی ئەوحەدیسەی ئیبنوعەبباس کە لەپێشەوە باسکرا.

لای ئەحمەد ئەگەر کەسێك بەرد هاویشتنەکەی دوا خست هەتا ڕۆژی قوربانی کردن تەواو بوو، ئەوە نابێ بەشەو بەردەکانی بهاوێژێ، وە ئەبێ بۆ بەیانی دوای نیوەڕۆ بەردەکانی بهاوێژێ.

**ڕێ دانی لاوازو بەهانەدارەکان کە ڕەمیەکە دووای نیوەشەوی قوربانی بەجێ بهێنن:**

دروست نیە کەس ڕەمی کردن پێش نیوەی کۆتایی شەو بەجێ بهێنێ بە ئیجماعی زانایان، بەڵام ڕێ دراوە بە ئافرەتان و منداڵانو لاوازو بەهانەدارو شوانی ووشتر کە جەمەرەی عەقەبە لەنیوە شەوی قوربانیدا ڕەمی بکەن. لە عائیشەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتوە پێغەمبەر ﷺ ئومموسەلەمەی لە شەوی قوربانیدا نارد بۆ ڕەمی، ئەویش چوو پێش بەرەبەیان بەردەکانی هەڵدا، پاشان گەڕایەوە (إفاضة) ی کرد. ئەبو داود و بەیهەقی گێڕاویانەتەوە وە بەیهەقی ووتوویەتی ئیسنادەکەی ڕاستەو بێگەردە.

لە ئیبنوعەبباسەوە خوا لێیان ڕازی بێت هاتوە کە پێغەمبەر ﷺ ڕێی داوە بە شوانی ووشتر ڕەمی جەمەرات بکات لەشەوا. بەززار گێڕاویەتیەوە. بەڵام لە ئیسنادەکەیدا موسلیمی کوڕی خالیدی زەنجی هەیە کە لاوازە.

لە عوروەوە هاتوە ووتویەتی: پێغەمبەر ﷺ چوو بۆلای ئومموسەلەمە لە ڕۆژی قوربانیدا، وە فەرمانی پێدا پەلە بکات لە گەڕانەوە لە (جمع)ەوە هەتا بگاتە مەککەو نوێژی بەیانی تێدا بکات، ئەوڕۆژە نۆرەی ئەوبوو پێغەمبەر ﷺ پێی خۆش بوو کە لەگەڵیا بێت. شافیعیو بەیهەقی گێڕاویانەتەوە.

لە (عطاء)ەوە هاتوە ووتوویەتی: کەسێك پێی ڕاگەیاندم لە ئەسمائەوە کە ڕەمی جەمەرەی کردوە، ووتم: ئێمە بەشەو ڕەمیمان ئەکرد. ئەویش ووتی: ئێمەش لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ وەهامان ئەکرد، ئەبوداود گێڕاویەتیەوە.

(طبري) ووتویەتی: شافیعی حەدیسەکەی ئوموسەلەمە و نەسائی کردۆتە بەڵگە لەسەر بۆچونەکەی، کە ئەڵێ: (إفاضة) لە عەرەفەوە لە دوای نیوە شەو دروستە.

ئیبنوحەزم باسی ئەوەی کردووە کە ڕێ دان بە ڕەمی کردن لە شەودا تایبەتە بە ئافرەتەوە نەك پیاوان، جا پیاوان لاوازو بە هێزیان بۆ ڕێ پێنەدان وەك یەکن.

ئەوەی حەدیسەکە ئەیگەیەنێت ئەوەیە کەسێك بەهانەدار بوو دروستە پێش بکەوێت و شەو ڕەمی بکات.

(ابن المنذر) ووتویەتی: سوننەت وەهایە کە لە دوای هەڵهاتنی ڕۆژ نەبێت ڕەمی جەمەرە نەکرێ، وەك پێغەمبەر ﷺ کردی. وە دروست نیە پێش بەرەبەیان ڕەمی بکرێت. چونکە کەسێك ئەوە بکات پێچەوانەی سوننەتە. وە هەرکەس ئەو کاتە ڕەمی کرد گێڕانەوەی لەسەر نیيە، چونکە کەسێك نازانم کە ووتبێتی: بری ناکەوێت.

ڕەمی کردنی جەمەرە لەلای سەرەوە :

لە ئەسوەدەوە هاتوە فەرمویەتی: عومەرم بینیوە خوا لێی ڕازی بێت لە سەرەوەی جەمرەکەوە بەردە بارانی ئەکرد.

لە (عطاء) پرسرا دەربارەی بەردە باران کردنی جەمرەکە لە سەرەوەی ووتوویەتی: قەیناکە. هەردووکیان سەعیدی کوڕی مەنصور گێڕاونی‌یەوە.

ڕەمی کردن لەو سێ ڕۆژەدا:

کاتی هەڵبژێرراو بۆ ڕەمی کردن لەو سێ ڕۆژەدا لەدوای نیوەڕۆوە دەست پێ ئەکات هەتا ڕۆژئاوابوون.

لە ئیبنوعەبباسەوە خوا لێیان ڕازی بێت هاتوە کە پێغەمبەر ﷺ لەکاتی (زوال) لادانی خۆر لە ناوەڕاستی ئاسمان بەردەکانی هاویشت، یا لەدووای زەوالدا بوو. ئەحمەدو ئیبنوماجەو (ترمذي) کە پلەی (حسن)ی بۆ داناوە گێڕاویانەتەوە.

بەیهەقی لە نافیعەوە ئەگێڕێتەوە: کە عەبدوڵڵای کوڕی عومەر خوا لێیان ڕازی بێت ئەی فەرموو: لەو سێ ڕۆژەدا بەردەکان نا هاوێژین هەتا دووا نیوەڕۆ. جا ئەگەر ڕەمی‌یەکەی دووا خستایە هەتا شەو لای ناخۆش بوو، وە لە شەودا ڕەمی کردوە تا ڕۆژهەڵاتنی بەیانی‌یەکەی.

ئەمەش هەموو پێشوا مەزهەبیەکان لەسەری ڕێك کەوتوون ئەبی‌حەنیفە نەبێت، ئەو ڕێی داوە ڕۆژی سێ‌یەمیش پێش نیوەڕۆ ڕەمی بکرێ.

بە پێی فەرموودەیەکی لاواز کە لە ئیبنوعەبباسەوە گێڕدراوەتەوە فەرمویەتی: ئەگەر ڕۆژ بەرز بووەوە لەدوا ڕۆژی گەڕانەوە، ئەوە ڕەمی کردن و گەڕانەوە لە مینا دروستە.

**وەستان و پاڕانەوە دوای ڕەمی کردن لە (أيام التشريق)دا :**

وەستان بەرەو قیبلەو پاڕانەوە لە خواو سوپاس گوزاری خواو داوای لێ بوردن بۆ خۆی و برا موسڵمانەکانی لەدوای ڕەمی‌یەکە پەسەندە.

بەپێی ئەوەی بوخاری‌و ئەحمەدو ئەگێڕنەوە لە سالمی کوڕی عەبدوڵلای کوڕی عومەرەوە لە باوکی‌یەوە کە پێغەمبەر ﷺ کاتێ ڕەمی ئەکرد لە جەمرەی یەکەم کە لەمەلا مزگەوتەکەوە بوو. حەوت بەردی تێ ئەگرت و لەگەڵ هەر بەردێکا (الله أكبر)ی ئەکرد. لەپاشاندا بەلای چەپدا ئەڕۆیشت بۆناو شیوەکە لەوێ ئەوەستا بەرەو قیبلە دەستەکانی بەرز ئەکردەوەو ئەپاڕایەوە لە خوا. وە ڕاوەستانەکەی درێژ ئەکردەوە.

پاشان جەمرەی دووەمی ڕەمی ئەکرد بەحەوت بەردی ترو لەگەڵ هەر بەردێکدا (الله اكبر)ی ئەکرد. پاشان بەلای چەپدا ئەڕۆیشتەوە بۆ ناو دۆڵەکە لەوێ ڕائەوەستا، وەبەرەو قیبلە دەستەکانی بەرز ئەکردەوەو ئەپاڕایەوە.

دوای ئەوە ئەڕۆیشت هەتا ئەگەیشتە ئەو جەمرەیەی کە لای عەقەبەوەیە ئەویشی بە حەوت بەرد ڕەمی ئەکردو (الله أكبر)ی ئەکرد لەگەڵ هەر بەردێکدا ئیتر ئەڕۆیشت و نەئەوەستا.

لە حەدیسەکەدا ئەوە هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ لە دووای ڕەمی جەمرەی عەقەبە نەئەوەستایەوە، بەڵکو لەدووای ڕەمی دوو جەمرەکەی تر ئەوەستا.

زانایان بۆ ئەمە بنەمایەکیان داناوەو ووتویانە: هەر بەرد هاویشتنێك لەدوایەوە بەرد هاویشتنی‌تر نەبوو لەوڕۆژەدا ڕاناوەستێ لەلایەوە، وە هەر بەردهەڵدانێك بەرد هەڵدانی تری بەدوواوە بوو لەوڕۆژەدا ڕائەوەستێ.

ئیبنوماجە ئەگێڕێتەوە لە ئیبنوعەبباسەوە کە پێغەمبەر ﷺ کاتێك جەمرەی عەقەبەی بەردە باران ئەکرد، ئەڕۆیشت‌و نەئەوەستا.

**ڕەمی بە تەرتیب :**

ئەوەی سابتە لە پێغەمبەرەوە ﷺ ئەوەیە کە دەستی بەڕەمی کردن کردووە لە جەمرەی یەکەمەوە کە لەم لای میناوەیە، لەپاشاندا جەمرەی ناوەڕاستی بەردە باران کردووە، کە لەم لای یەکەمەوەیە، لەپاش ئەوە جەمرەی عەقەبەی ڕەمی کردووە.

سابتیشە لێ‌یەوە کە فەرمویەتی: (خُذُوا عَنِّي مَنَاسِكَكُم) واتە: کارو باری بەجێ هێنانی حەجتان لەمنەوەفێر بن.

جا هەرسێ پێشەواکان ئەمەیان کردۆتە بەڵگەی ئەوەی کە مەرجە تەرتیب لە نێوان جەمرەکاندا، وە ئەبێ بەوشێوەیە ڕەمی بکرێن بەرێك‌و پێکی، وەك چۆن پێغەمبەر ﷺ کردویەتی.

ئەوەی حەنەفی‌یەکان هەڵیان بژاردووە ئەوەیە کە ئەو تەرتیبە سوننەتە.

**پەسەندیەتی (الله أكبر) ووتن و پاڕانەوە لەگەڵ هەر بەردێکداو خستنی بەردەکان لەنێوان پەنجەکاندا**

لە عەبدوللای کوڕی مەسعودو ئیبنوعومەرەوە خوا لـێیان ڕازی بێت هاتوە کە ئەوان لای ڕەمی کردنی جەمەرەی عەقەبە ئەیان ووت: (اللَّهُمَّ اجعَلهُ حَجاً مَبْروراً وَذَنباً مَغفُوراً) خوایە بۆمان بکەی بە حەجێکی وەرگیراوو لە گوناهەکانیشمان ببوریت.

لە ئیبراهیمەوە هاتوە ووتویەتی: حەزیان ئەکرد کە پیاو جەمرەی عەقەبەی ڕەمی کرد بڵـێ: خوایە بۆمان بکەی بە حەجێکی مەبروورو لە گوناهیشمان ببوریت. پێیان ووت: تۆ لەگەڵ هەموو بەردێکا وا ئەڵێیت؟ ووتی: بەڵـێ.

لە (عطاء)ەوە هاتوە ووتویەتی: ئەگەر بەردەکەت هەڵدا (الله أكبر) بکە بەدوای هەر هەڵدانێکدا (الله اکبر)ێك. سەعیدی کوڕی مەنصور گێڕاویەتیەوە.

لە حەدیسی جابیردا خوا لێی ڕازی بێت هاتووە کە لای موسلیمە: پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ هەر بەردێکدا (الله أكبر)ی ئەکرد.

خاوەنی (فتح) ووتویەتی: زانایان هەموو لە سەر ئەوە ئیجماعیان هەیە: کە هەرکەس (الله أكبر)ی نەکرد هیچی نایەتە سەر.

لە سلمانی کوڕی ئەحوەصەوە هاتوە لە دایکیەوە کە ووتویەتی: پێغەمبەرم ﷺ بینیوە لای جەمرەی عەقەبەوە بە سواریەو بەردەکانم بینیوە لە نێوان پەنجەکانیدا ئەی هاویشت، خەڵکەکەش لەگەڵیا بەردیان ئەهاویشت، ئەبوداود گێڕاویەتیەوە.

**ڕەمی کردن لەباتی کەسێکی تر:**

ئەگەر کەسێك بەهانەیەکی هەبوو ڕێگر بوو لەوەی کە بۆ خۆی ڕەمی جەمرەکان بکات، وەك نەخۆشیو شتی وا، بۆی هەیە کە سێکی تر لە جیاتی ئەو ڕەمی بکات.

جابیر خوای لـێ ڕازی بێت فەرمویەتی: لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ حەجمان کرد ژنو منداڵمان لەگەڵدا بوو، لەجیاتی منداڵەکان تەلبیەمان ئەکردو ڕەمیمان ئەکرد. ئیبنوماجە گێڕاویەتیەوە.

**شەو مانەوە لە مینا:**

مانەوەی شەو لە مینا واجبە لە هەرسێ شەوەکەدا، یان لە شەوی یانزەو دوانزە، لای سێ پێشەوای مەزهەبەکان.

حەنەفیەکان ڕایان وەهایە کە مانەوەی شەو سوننەتە.

ئیبنوعەبباس خوا لـێی ڕازی بێت فەرمویەتی: ئەگەر شەیتانت ڕەجم کرد بێنەرەوە لەو شوێنەی ئارەزووت کرد. ئیبنوئەبی شەیبە گێڕاویەتیەوە.

لە موجاهیدەوە هاتوە کە قەیناکە سەرەتای شەو لە مەککە بمێنیتەوەو ئاخیری شەو لە مینا. یان سەرەتای شەو لەمیناو ئاخری شەو لە مەککە.

ئیبنوحەزم ووتوویەتی: هەرکەس شەوەکانی مینا لە مینا نەمایەوە ئەوە خراپی کردووە، بەڵام هیچی نایەتە سەر.

زانایان لەسەر ئەوە رێکن کە خاوەن مەعزەرەت و ئاوەدەرو شوانی ووشتر، ئەوەیان لەسەر نییە و بە تەرك کردنی هیچیان نایەتە سەر.

عەبباس داوای لە پێغەمبەر ﷺ کرد کە رێی بدات شەوانی مینا لە مەککە بمێنێتەوە لەبەر ئاودانەکەی بە خەڵك، ئەویش رێی پێدا. بوخاریو جگە لەو گێڕاویانەتەوە.

لە عاصمی کوڕی عەدی‌یەوە هاتوە کە پێغەمبەر ﷺ رێی دا بە شوانەکان کە شەو لە مینا نەمێننەوە. خاوەن سونەنەکان گێڕاویانەتەوەو (ترمذي) بە صەحیحی داناوە.

**کەی حاجی ئەگەڕێتەوە لە مینا:**

حاجی لە مینا ئەگەڕێتەوە بۆ مەککە پێش ڕۆژ ئاوا بوونی ڕۆژی دوانزەهەم دوای ڕەمی کردن لای هەرسێ پێشەواکە.

لای حەنەفی‌یەکان پێش دەرکەوتنی بەرەبەیان ئەگەڕێتەوە بۆ مەککە لە ڕۆژی سیانزەهەم لە (ذي الحجة).

بەڵام گەڕانەوە دوای ڕۆژ ئاوا بوون بە کەراهەت دانراوە، چونکە پێچەوانەی سوننەتە، بەڵام هیچی لەسەر نییە.

## (هدي) قوربانی

قوربانی ئەو حەیوانانەیە کە سەر ئەبڕێن بۆ حەرەم بەمەبەستی نزیك بونەوە لە خواوە. خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿وَٱلْبُدْنَ جَعَلْنَٰهَا لَكُم مِّن شَعَٰٓئِرِ ٱللَّهِ لَكُمْ فِيهَا خَيْرٌ ۖ فَٱذْكُرُوا۟ ٱسْمَ ٱللَّهِ عَلَيْهَا صَوَآفَّ ۖ فَإِذَا وَجَبَتْ جُنُوبُهَا فَكُلُوا۟ مِنْهَا وَأَطْعِمُوا۟ ٱلْقَانِعَ وَٱلْمُعْتَرَّ ۚ كَذَٰلِكَ سَخَّرْنَٰهَا لَكُمْ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ۝ لَن يَنَالَ ٱللَّهَ لُحُومُهَا وَلَا دِمَآؤُهَا وَلَٰكِن يَنَالُهُ ٱلتَّقْوَىٰ مِنكُمْ﴾ (الحج/٣٦-٣٧).

واتە: ئێمە ـ سەر بڕینی ـ مانگاو ووشترمان کردووە بە دروشمەکانی خوا بۆ ئێوەو خێری تێدایە بۆتان، جا ئێوەش لەکاتی سەربڕینیاندا ناوی خوایان لەسەر بهێنن و ریزیان بکەن بۆ سەر بڕین، جا کاتێ بە تەواوی گیانیان دەرچوو خۆتان لێی بخۆن و بەشی ئەو گەداو مسکینانەش بدەن کە نەفسی‌یان بەرزەو داوا ناکەن، هەروەها ئەو کەسانەش کە داوا ئەکەن، ئێمە بەو شێوەیە ئەوانەمان بۆ رام کردوون لەگەڵ ئەو گەورەیی‌و بەهێزی‌یەیاندا بە ئومێدی ئەوەی کە سوپاس گوزاری خوا بکەن. بشزانن خوا هیچی لەو گۆشتە دەست ناکەوێ، بەڵکو لە خوا ترسانەکەتان بۆ خوا ئەبێت.

عومەر خوای لـێ ڕازی بێت فەرمویەتی: قوربانی بکەن، چونکە خوا قوربانی پێ خۆشە.

پێغەمبەر ﷺ سەد وشتری کردە قوربانی، وە ئەو قوربانیانەشی بە ئارەزووی خۆی (تطوع) بووە نەك واجب بووبێت لەسەری.

**چاکترین شت کە بکرێ بە قوربانی:**

زانایان ئیجماعیان هەیە لەسەر ئەوەی کە قوربانی لە ووشترو ڕەشە وولاغو مەڕ نەبێت نابێ، وە لە سەرە ئەوە ڕێك کەوتوون کە چاکترینیـان ووشترە، لە پاش ئەو ڕەشە وولاغە لەپاش ئەو مەڕە، بەو تەرتیبە.

چونکە ووشتر بەسودترە بۆ هەژاران لەبەر گەورەیی، وە ڕەشەوولاغیش هەروا بەسوودترە لە مەڕ.

وە زانایان جیاوازیان لەوەدا هەیە کە چاکترین قوربانی بۆ یەك کەس چییە؟

ئایا حەوت یەکی ووشتر یا حەوت یەکی ڕەشە وولاغ یا خۆی بە تەنها مەڕێك بکات بە قوربانی؟ بەڵام زاهیر ئەوەیە کە کامیـان بە سوودترە بۆ هەژاران ئەوە باشترە.

**کەمترین شت کە بری ئەکەوێت لە قوربانیدا:**

هەرکەسێك بۆی هەیە قوربانی بکات بۆ حەرەم بە ئارەزووی خۆی لە ووشترو ڕەشە وولاغ و مەڕ.

پێغەمبەر ﷺ سەد ووشتری کردۆتە قوربانی وە قوربانییەکەشی قوربانی (تطوع) بوە.

وە کەمترین شت کە بری یەك کەس ئەکەوێت مەڕێکە، یا حەوت یەکی ووشترێك یا حەوت یەکی مانگایەك، چونکە ڕەشە وولاغ یا ووشتر بری حەوت کەس ئەکەوێت.

(جابر) خوای لـێ ڕازی بێت فەرمویەتی: لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ حەجمان کرد، ووشترێکمان بۆ حەوت کەس سەر بڕی، وە ڕەشە وولاغێکیش بۆ حەوت کەس. ئەحمەد و موسلیم گێڕاویانەتەوە.

وە مەرج نیە هاوبەشەکانی هەموویان بیانەوێ بۆ خوا قوربانی بکەن، بەڵکو ئەگەر هەندێکیان بۆ خوایان بوێو هەندێکیان بۆ گۆشت هەر دروستە.

بەپێچەوانەی حەنەفییەکانەوە کە کردویانەتە مەرج لەسەر هەموو هاوبەشەکان کە لەبەر خوای گەورە ئەو شتە سەر ببڕن.

**کەی ووشتر واجب ئەبێت؟:**

ووشتر واجب نابێت لە سەر کەس مەگەر کەسێك بەلەشی گرانەوە تەوافی زیارەت بکات، یا بێنوێژ بێت، یا زەیستان، یا جیماعی کردبێ دوای ڕاوەستانی عەرەفەو پێش سەرتاشین، یا نەزری کردبێ کە ووشترێك سەر ببڕێ، وە هەر کەس لەوانە ووشتری دەست نەکەوت ئەبێ حەوت مەڕ بکڕێ.

لە ئیبنوعەبباسەوە خوایان لـێ ڕازی بێت هاتوە کە پێغەمبەر ﷺ پیاوێك هاتە لای ووتی: ووشترێکم لە سەرەو توانای کڕینیشیم هەیە، بەڵام دەستم ناکەوێ بیکڕم، پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێدا حەوت مەڕ بکڕێ و سەری ببڕێ. ئەحمەد و ئیبنوماجە بەسەنەدێکی صەحیح گێڕاویانەتەوە.

**جۆرەکانی قوربانی:**

قوربانی ئەکرێت بە دوو بەشەوە سوننەت و واجب.

قوربانی سوننەت بۆ حاجی (مفرد) و بۆ کەسێك کە عومرەی ئینفرادی کردبێ.

بەڵام قوربانی واجب بەشەکانی وەك لای خوارەوەیە:

١،٢- واجبە لەسەر کەسێك کە حەجی قیران بکات، وە لەسەر کەسێك کە حەجی تەمەتتوع بکات.

٣- واجبە لەسەر کەسێك کە یەکێ لە واجبەکانی حەجی تەرك کردبێ وەك ڕەمی کردنی جەمەرەکان، و ئیحرام بەستن لەشوێنی خۆیەوە، وە وەستانی شەووڕۆژ بەیەکەوە لە عەرەفە یا شەو مانەوە لە موزدەلیفە یا لە مینا، یا تەوافی ماڵ ئاوایی تەرك کردبێ.

٤- واجبە لەسەر کەسێك کە شتێکی کردبێ لەو شتانەی کە لە کاتی ئیحرامدا قەدەغەن، جگە لە جیماع وەك بۆن لە خۆدان و سەرتاشین.

٥- واجبە لەسەر کەسێك کە تاوانێك بەرامبەر حەرەم بکات وەك ڕاو کردنی و بڕینی درەختەکەی. وە ئەمانە هەمووی لەپێشەوە لە شوێنی خۆیاندا ڕوون کراونەتەوە.

**مەرجەکانی قوربانی:**

بۆ قوربانی کردن ئەم مەرجانەی خوارەوە گیراوە:

١-ئەبێ (ثني) بێت واتە ددانی شیلەی کەوتبێ. ئەگەر قوربانی‌یەکە مەڕ نەبوو، بەڵام مەڕ ئەگەر تەمەنی شەش مانگ بێت هەر بری ئەکەوێت، وە ئەبێت قەڵەو بێت.

وە (ثني) لە وشتردا ئەوەیە پێنج ساڵ بێت.

وە لە ڕەشە وڵاغدا ئەوەیە دوو ساڵ بێت، وە لە بزندا ساڵێکی تەواو بێت، ئەمانە (ثني)و بەرەوژوورتریان دروستەو بری ئەکەوێت.

٢- ئەبێت ساغ بێت. چونکە کوێرو شەلو گەڕو لاواز دروست نییە.

لە حەسەنەوە هاتوە کە ئەوان ووتویانە: ئەگەر پیاوێك وشترێکی کڕی یا شتێکی تری کڕی بۆ قوربانی ساغ بوو، دوای ئەوە کوێر بوو یا شەل یا لات بوو پێش ڕۆژی سەربڕین، با سەری ببڕێت دروستە بۆی و بری ئەکەوێ. سەعیدی کوڕی مەنصور گێراویەتیەوە.

**پەسەندی‌یەتی هەڵبژاردنی شتی قوربانی :**

سالیك ئەگێڕێتەوە لە هیشامی کوڕی عوروەوە لە باوکی‌یەوە کە بە کوڕەکانی ئەووت: ڕۆڵەکانم کەستان شتێك نەکەن بە قوربانی بۆ خوا کە ڕووی نەیەت بیدات بە خۆشەویستێکی بەڕێزی، چونکە بەڕاستی خوا بەڕێزترینی هەموو بەڕێزانە وە شیاوترین کەسە کە شتی چاکی بۆ هەڵبژێردرێ.

سەعیدی کوڕی مەنصور ئەگێڕێتەوە لە ئیبنو عومەرەوە خوا لێیان ڕازی بێت سواری ووشترێکی مێ ببوو لەنێوان مەککەدا پێی ووت: بەخ بەخ بەلایەوە چاك بوو، لێی دابەزیو دیاری کردو کردی بە قوربانی.

**دیاری کردنی قوربانیو شت لە مل کردنی:**

دیاری کردن (الإشعار) : ئەوەیە کە لایەکی کۆپانی ووشترەکە (ئەو گۆشتەیە کە بەرز بۆتەوە بەسەر پشتیەوە) یا لایەکی ووڵاخەکە ببڕدرێ بۆ ئەوەی خوێنی لێ بێت و دیار بێت کەهی قوربانیە بۆ ئەوەی کەس نەچێت بەلایدا.

شت لە مل کردن التقلید: ئەوەیە کە پارچە چەرمێك یا شتێك بکرێتە ملی بۆ ئەوەی بناسرێت کەهی قوربانیە.

پێغەمبەر ﷺ مەڕێکی کردە قوربانی و شتێکی کردە ملیەو لەگەڵ ئەبی بەکردا ناردی، کاتێ ئەبوبەکر چوو بۆ حەج لە ساڵی نۆیەمدا.

سابتیشە لە پێغەمبەرەوە ﷺ کە شتی کردۆتە ملی قوربانیەکانی و دیاری کردوون و ئیحرامی بەستوە بە عومرە لەکاتی حودەیبیەدا.

زانایان هەمویان دیاری کردنیان لا پەسەندە، ئەبوحەنیفە نەبێت.

**حیکمەت لە دیاری کردنو شت لە مل کردندا:**

حیکمەت تیایاندا بەگەورە دانانی دروشمەکانی خواو دەرخستنیانە، وە ڕاگەیاندنە بە خەڵك کە ئەوانە قوربانین و ئەبرێن بۆ ماڵی خوا لەوێ سەر ئەبڕرێن بۆ نزیك بوونەوە لە خوا.

**سواربونی قوربانی :**

دروستە سوار بونی ووشتری قوربانی وسوود لێ وەرگرتنی بە پێی فەرموودەی خوای گەورە کە فەرمویەتی: ﴿لَكُمْ فِيهَا مَنَٰفِعُ إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى ثُمَّ مَحِلُّهَآ إِلَى ٱلْبَيْتِ ٱلْعَتِيقِ﴾ (الحج/٣٣). واتە: بۆ ئێوە لەو ئاژەڵانەدا کە کردووتانن بە قوربانی هەتا کاتێکی دیاری کراو سوود هەیە، لەپاشاندا ئەبرێن بۆ خانەی دێرینی خواو لەوێ سەر ئەبڕرێن.

(ضحاك) و (عطاء) ووتوویانە: سوود لێ وەرگرتنیان سواربوونیانە لەکاتی پێویست، وە هەروەها سوود وەرگرتنە لە توكو شیرەکەیان.

کاتی دیاریکراویش ئەوەیە: کە شتێکی بکرێتە مل و ببێتە قوربانی.

وە دەربارەی شوێنەکەیان بۆ لای خانەی قەدیمی خوا ووتویانە: ڕۆژی سەر بڕینیەتی لە مینا.

لە ئەبوهورەیرەوە هاتوە کە پێغەمبەر ﷺ پیاوێکی بینی ووشترێکی لێ ئەخوڕی فەرمووی: سواری بە، ووتی: ئەمە ووشتری قوربانیە فەرمووی: سورای بە وەیل بۆ تۆ. دووجار سێ جار پێی فەرموو.

بوخاریو موسلیمو ئەبوداوودو نەسائی گێڕاویانەتەوە. ئەمەش مەزهەبی ئەحمەدو ئیسحاق و ئەوەی بەناوبانگە لە مەزهەبی مالیك.

شافیعی ووتوویەتی: ئەگەر زۆر پێویستی پێی بوو ئەبێ سواری ببێت.

**کاتی سەر بڕین :**

زانایان جیاوازن لە کاتی سەر بڕینی قوربانیدا :

لای شافیعی: کاتی سەربڕین ڕۆژی سەربڕینەو ڕۆژانی جەژنی قوربانە، بە پێی فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ کە فەرمویەتی: (وَكُلُّ أَيَّامِ التَّشْرِيقِ ذَبْحٌ) رواه أحمد. واتە: هەموو ڕۆژەکانی جەژن ڕۆژی سەر بڕینە.

جا ئەگەر کاتەکەی بەسەر چوو ئەبێ قوربانیە واجبەکە بە قەزا سەر ببڕێتەوە. وە لای مالیكو ئەحمد کاتی سەربڕینی قوربانی -جا قوربانیەکە واجب بێت یا (تطوع)- ڕۆژەکانی سەربڕینە (أيام النحر).

ئەمەش ڕای حەنەفیەکانە دەربارەی قوربانی تەمەتتوعو قیران. بەڵام خوێنی نەزرو کەفارەتو (تطوع) هەرکاتێك سەری ببڕێ دروستە. وە ئەگێڕنەوە لە ئەبی سەلەمەی کوڕی (عبدالرحمن) و نەخەعیەوە: کە کاتەکەی ڕۆژی سەربڕینیەتی هەتا دوا ڕۆژی مانگی (ذي الحجة).

**شوێنی سەربڕین :**

قوربانی ـ واجب بێت یا سوننەت ـ نابێت سەر ببڕێ لە حەرەمی مەککە نەبێت، وە ئەوکەسە بۆی هەیە سەری ببڕێ لە هەر شوێنێکی حەرەمدا بێت.

لە جابیرەوە خوای لێ ڕازی بێت هاتوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (كُلُّ مِنى مَنحَرٌ، وَكُلُّ المُزدَلِفَةِ مَوقِفٌ، وَكُلُّ فِجَاجِ مَكَّةَ طَرِيقٌ، وَمَنحَرٌ) رواه أبو داود، و ابن ماجة. واتە: مینا هەمووی شوێنی سەربڕینە، وە موزدەلیفە هەمووی شوێنی ڕاوەستانە، وە هەموو شیوەکانی مەککە ڕێگاو شوێنی سەربڕینە.

باشتر وایە بۆ ئەوکەسەی کە حەج ئەکات لە مینا سەری ببڕێ، وە بۆ ئەو کەسەی کە عومرە ئەکات لای (مروة) سەری ببڕی، چونکە شوێنی ئیحرام شکاندنی هەریەکەیانە.

لە مالیکەوە هاتوە کە پێی گەیشتوە پێغەمبەر ﷺ لە مینا فەرمویەتی: (هَذَا المَنحَرُ، وَكُلُّ مِنَى مَنحَرٌ). واتە: ئەمە شوێنی سەربڕینە، میناش هەمووی شوێنی سەربڕینە.

وە لە بارەی عومرەوە فەرمویەتی: (هَذَا المَنحَرُ ـ يعني المروة ـ وَكُلُّ فِجَاجِ مَكَّةَ وَطُرُقِهَا مَنحَرٌ). واتە: ئەمە شوێنی سەر بڕینە ـ مەبەستی مەروەیە ـ وە هەموو شیوەکانی مەککەو ڕێگاکانی شوێنی سەر بڕینە.

**پەسەندی‌یەتی (نحر[1]) کردنی ووشترو سەربڕینی ئاژەڵەکانی تر :**

وا پەسەندە کە ووشتر (نحر) بکرێت، بە پێوە بێت و دەستی چەپی بسترابێت ئەوەش بەپێی ئەم فەرمودانەی خوراوە:

١- موسلیم گێراویەتی‌یەوە لە زیادی کوڕی جوبەیرەوە: کە ئیبنوعومەر خوایان لێ ڕازی بێت هات بە سەر پیاوێکدا ووشترەکەی بە دانیشتنەوە نەحر ئەکرد، پێی فەرمو: بە پێوەو بە دەستی بەستراوەوە نەحری بکە، چونکە سوننەتی پێغەمبەرەکەتانە.

٢- لە جابیرەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتوە کە پێغەمبەر ﷺ و یارەکانی کاتێك ووشتریان نەحر ئەکرد دەستی چەپیان ئەبەستەوەو بەپێوە ئەمایەوە لەسەر سیانەکەی تری. ئەبوداود گێراویەتی‌یەوە.

٣- لە ئیبنوعەبباسەوە هاتوە خوایان لێ ڕازی بێت کە دەربارەی فەرمودەی خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿فَٱذۡكُرُواْ ٱسۡمَ ٱللَّهِ عَلَيۡهَا صَوَآفَّۖ﴾ (الحج/٣٦). فەرمویەتی: صواف: واتە: بە پێوە لەسەر سێ قاچ ڕاوەستێنرێ. حاکم گێراویەتی‌یەوە.

بەڵام ڕەشە وولاغ و مەڕو بزن وا پەسەندە کە لە پاڵەوە سەر ببڕێ. جا ئەگەر ئەو ئاژەڵانەی نەحر ئەکرێ، سەر ببڕێو ئەوەی سەر ئەبڕێ نەحر بکرێ. ووتراوە: کەراهەتی هەیە وە ئەشڵێن: قەیناکە.

وا پەسەندە ئەوکەسەی قوربانی‌یەکەی کردووە خۆی سەری ببڕێ ئەگەر باش بزانێ ئاژەڵ سەر ببڕێ، ئەگینا وا باشە کە چاوی لە سەربڕینەکە بێت.

**نابێ قەساب لە قوربانی‌یەکە کرێی بدرێتێ:**

دروست نیە کرێی سەر بڕین لە قوربانی‌یەکە بدرێ بە قەساب بەڵام قەیناکە بەخێر گۆشتی پێ بدرێ.

بە پێی ئەوەی عەلی خوای لێ ڕازی بێت فەرمویەتی: پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێ دام کە بەسەر ووشترەکانی‌یەوە بوەستم پێستەو سەروپێ‌کانیان دابەش بکەم، و فەرمانی پێ دام کە هیچی لێ نەدەم بە سەر بڕەکە، وە فەرمووی: (نَحنُ نُعطِيهِ مِن عِندِنَا) رواه الجماعة. واتە: ئێمە بۆخۆمان کرێی ئەدەینێ.

حەدیسەکە ئەبێتە بەڵگەی ئەوەی کە دروستە کەسێکی تر لە جیاتی خاوەنەکەی هەڵسێ بە سەربڕینی قوربانی‌یەکان و دابەش کردنی گۆشتەکەو پێستەو سەروپێ‌کەی.

وە لەسەر ئەوەی کە دروست نی‌یە هیچی لێ بدرێ بە قەسابەکە بەناوی کرێ، بەڵام ئەبێ کرێی کارەکەی بدرێتێ بەپێی فەرموودەکە کە فەرمووی: (نعطيه من عندنا).

لە حەسەنەوە ئەگێڕنەوە کە فەرمویەتی: خراپ نی‌یە پێستەکەی بدرێ بە قەسابەکە.

---

(١) نەحر جۆرێك سەربڕینە تایبەتە بە ووشترەوە.

**خواردن لە گۆشتی قوربانی :**

خوای گەورە فەرمانی داوە کە لە گۆشتی قوربانی بخورێ وە فەرمویەتی: ﴿فَكُلُواْ مِنْهَا وَأَطْعِمُواْ ٱلْبَآئِسَ ٱلْفَقِيرَ﴾ (الحج/٢٨). واتە: خۆتان لێی بخۆن و بەشی هەژاران و لێ‌قەوماوان بدەن.

ئەم فەرمانە لە ڕواڵەتدا قوربانی واجب و سوننەت ئەگرێتەوە، گەرچی زانایانی وولاتان تێیدا جیاوازن.

ئەبوحەنیفەو ئەحمد بۆ ئەوە چوون: کە دروستە لە گۆشتی قوربانی تەمەتتوع بخورێت، وە هەروەها لە قوربانی قیران، و قوربانی (تطوع)، ئیتر جگە لەمانە زیاتر دروست نیە لێ‌یان بخورێت.

مالیك ووتویەتی: لەو قوربانی‌یە ئەخورێت کە لەبەر تێك چوونی حەج یا لە دەست چوونی حەج ئەهێنرێ، هەروەها لە قوربانی ئەو کەسەی کە تەمەتتوع ئەکات، وە لە هەموو قوربانی‌یەك، جگە لە فیدیەی ئازارو سزای ڕاو کردن، وە ئەوەی کە نەزری کردووە بۆ هەژاران، وە قوربانی (تطوع) ئەگەر پەکی کەوت پێش ئەوەی بگاتە شوێنی سەربڕین.

لای شافیعی: دروست نی‌یە لە قوربانی واجب بخورێ هەروەك خوێنی واجب لە تۆڵەی ڕاودا، وە لەبەر تێك چوونی حەج، و لە قوربانی تەمەتتوع و قیراندا.

هەروەها ئەوەی کراوە بە نەزرو لەسەر خۆی فەرزی کردووە، بەڵام ئەوقوربانی‌یانەی کە سوننەتن، ئەوکەسە بۆی هەیە لێ‌یان بخوات و لێی ببەخشێ و لێ‌ی بکات بە صەدەقە.

**چەندە ئەخورێ لە قوربانیەکە:**

بۆ قوربانی کەر هەیە لە قوربانی‌یەکەی کە بۆی ڕەوایە چەند حەز ئەکات لێی بخوات، بەبێ سنور. وە هەروەها بۆی هەیە کە لێی ببەخشێ و لێی بکات بە خێر چۆنی پێ خۆش بێ.

ووتراوە: نیوەی بخوات و نیوەی بکات بە خێر.

وە ووتراوە: ئەی کات بە سێ بەشەوە سێ‌یەکی بخوات و سێ‌یەکی ببەخشێو سێ‌یەکی بکاتە خێر.

## سەرتاشین یا کورت کردنەوە

سەرتاشین و کورت کردنەوەی سابتە بە کیتابو سوننەتو ئیجماع. خوای گەرە فەرمویەتی: ﴿لَّقَدْ صَدَقَ ٱللَّهُ رَسُولَهُ ٱلرُّءْيَا بِٱلْحَقِّ لَتَدْخُلُنَّ ٱلْمَسْجِدَ ٱلْحَرَامَ إِن شَآءَ ٱللَّهُ ءَامِنِينَ مُحَلِّقِينَ رُءُوسَكُمْ وَمُقَصِّرِينَ لَا تَخَافُونَ﴾ (الفتح/٢٧). واتە: خوا ڕاستی کردووە لەگەڵ نێراوەکەیدا لەوەی نیشانی داوە لە خەوەکەیدا کە بەڕاستی ئەچنە مزگەوتی حەرامەوە بەویستی خوا بە هێمنیو ئاسایش، سەرتان ئەتاشن یا مووەکانی کورت ئەکەنەوەو ترستان نابێ.

بوخاری و موسلیم ئەگێڕنەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (رَحِمَ اللهُ الْمُحَلِّقِينَ قَالُوا: وَالْمُقَصِّرِينَ يَا رَسُولَ اللهِ؟ قَالَ: رَحِمَ اللهُ الْمُحَلِّقِينَ، قَالُوا: وَالْمُقَصِّرِينَ يَا رَسُولَ اللهِ؟ قَالَ: رَحِمَ اللهُ الْمُحَلِّقِينَ، قَالُوا: وَالْمُقَصِّرِينَ يَا رَسُولَ اللهِ؟ قَالَ: وَالْمُقَصِّرِينَ)[1]. واتە: خوا میهرەبانی برژێنێت بەسەر ئەوانەدا کە سەریان تاشیوە، ووتیان: ئەوانەش کە کورتیان کرۆدتەوە ئەی نێرراوی خوا؟ فەرمووی: خوا میهرەبانی برژێنێت بەسەر ئەوانەدا کە سەریان تاشیوە، ووتیان: ئەی ئەوانەی کورتیان کردۆتەوە، ئەی نێرراوی خوا؟ فەرمووی: خوا میهرەبانی برژێنێت بەسەر ئەوانەدا کە سەریان تاشیوە، ووتیان: ئەی ئەوانەی کورتیان کردۆتەوە ئەی نێرراوی خوا؟ فەرموی: ئەوانەش کە کورتیان کردۆتەوە.

هەروەها بوخاری و موسلیم لێوەی گێڕاویانەتەوە کە پێغەمبەر ﷺ خۆی سەری تاشیوەو کۆمەڵێك لە یارەکانیشی تاشیویانە و کۆمەڵێکیش کورتیان کردۆتەوە.

مەبەست لە سەرتاشین لابردنی مووی سەرە بە تیغ و ئەو جۆرە شتانە یابە هەڵکەندنی، جا ئەگەر سێ مووریش بێت هەر دروستە.

مەبەستیش لە کورت کردنەوە ئەوەیە کە ئەوەندەی سەرە پەنجەیەك موو لە سەر بپردرێ. وە جومهوری زانایان جیاوازن لە حوکمەکەیدا. بەشی زۆریان بۆ ئەوە چوون: کە ئەو کارە پێویستەو نەکردنی بە خوێن ئەگیرسێتەوە.

شافیعی‌یەکان بۆ ئەوە چوون کە پایەیەکە لە پایەکانی حەج.

**کاتەکەی:**

کاتی سەرتاشین یا کورت کردنەوە بۆ حاجی دوای ڕەمی جەمەرەی عەقەبەیە لە ڕۆژی قوربانی. جا ئەگەر کەسێك قوربانی پێ بوو دوای سەربڕینی سەری ئەتاشێ یا کورتی ئەکاتەوە.

لە حەدیسەکەی (معمر)ی کوڕی (عبد الله) دا هاتوە: کە پێغەمبەر ﷺ کاتێ قوربانیەکانی سەربڕی لە مینا ئەڵێ: فەرمانی پێدام کە سەری بتاشم) ئەحمەدو (طبراني) گێڕاویانەتەوە.

وە کاتەکەی لە عومرەدا دوای تەواو بونە لە (سعي) نێوان صەفاو مەروە، وە بۆ ئەوانەش کە قوربانیان پێ بێ دوای سەربڕینی‌یەتی.

---

(١) ووتراوە: هۆی دووبارەکردنەوەی دوعا بۆ ئەوکەسانەی سەرئەتاشن هاندانە لەسەر ئەوکارەو جەخت کردنەوەیە لەسەر سوننەتی‌یەکەی، چونکە سەرتاشین ڕەساترە لە عیبادەتداو زیاتر ڕاستی نی‌یەت ئەگەیەنێ لە خۆ بەکەم زانیندا بۆ خوا، لەبەر ئەوەی ئەوکەسەی سەر کورت ئەکاتەوە شتێك جوانی بۆ خۆی ئەهێڵێتەوە. پاشان بەشێکیشی لە دوعا دانا بۆ سەر کورت کەرەوەکان تاوەکو کەس لە ئوممەتەکەی لە دوعای چاکی ئەو بێ‌بەش نەبێت.

واجبە لەناو حەرەم دا بێت و لە ڕۆژانی قوربانی دا بێت لای ئەبوحەنیفەو مالیكو ڕیوایەتێكی ئەحمەد، بە پێی فەرمووده‌كەی پێشوو.

وە لای شافیعیو محمدی كوڕی حسەن، وە ئەوەی بەناوبانگە لە مەزهەبی ئەحمەددا ئەوەیە كە واجبە سەرتاشینو كورت كردنەوەی لەناو حەرەم دا بێت نەك لە ڕۆژانی قوربانیدا، جا ئەگەر كەسێك دوای خست بۆ دوای ڕۆژانی قوربانی دروستە و هیچی نایەتە سەر.

ئەوەی كە پەسەندە تێیدا :

پەسەندە لە سەرتاشین دا كە لە لای ڕاستی سەرەوە دەست پێ بكرێ پاشان لای چەپ وە ڕووەو قیبلە بێت، وە كە لـێ‌بووەوە (الله اكبر) بكاتو دووڕ كات نوێژ بكات.

وەكیع ووتوویەتی: ئەبوحەنیفە ووتی: لە پێنج بابی حەجدا بەهەڵە چووم و كەڵە شاخ گرێك فێری كردم، ئەوەش كاتێك بو كە ووویستم سەرم بتاشم چوومە لای كەڵەشاخ گرێك و ووتم پێی: بەچەند سەرم ئەتاشی؟ ووتی: ئەوە تۆ عێراقیت؟ ووتم: بەڵـێ.

ووتی: بەجێ هێنانی كارەكانی حەج كرێی لەسەر نیە، دانیشە.

پشتەو قیبلە دانیشتم، پێی ووتم: ڕوەو قیبلە دانیشە.

ویستم لەلای چەپی‌یەوە سەرم بتاشێ ووتی: لای ڕاستم تێ بكە منیش لای ڕاستم تێ كرد، ئەو سەری ئەتاشیمو من بێ دەنگ بووم، پێی ووتم: (الله أكبر) بكە، ئیتر هەر (الله أكبر)م ئەكرد هەتا هەستام بڕۆم پێی ووتم: بۆ كوێ؟

ووتم بۆ لای بارەكەم، پێی ووتم: دووڕكات نوێژ بكە ئینجا بڕۆ.

ووتم: ئەمە نابێت لە عەقڵی ئەم سەرتاشەوە بێت، پێم ووت: ئەمانەی پێت ووتم لە كوێوە فێر بووی؟ ووتی: (عطاء)ی كوڕی ئەبی ڕەباحم دیوە وەهای كردووە. (المحب الطبري) باسی كردووە.

پەسەندی‌یەتی هێنانی تیغ و موس بە سەر سەری ڕوتاوەدا:

جومهوری زانایان بۆ ئەوە چوون كە پەسەندە بۆ سەر ڕوتاوە كە تیغ بهێنێ بە سەری دا با موویشی پێوە نەبێت.

(ابن المنذر) ووتویەتی: ئەوانەی ئێمە شتمان لێوە لەبەر كردوون لە زانایان ئیجماعیان هەیە لەسەر ئەوەی كە سەرڕوتاوە ئەبێ تیغ بهێنێ بە سەریا.

ئەبو حەنیفە ئەڵـێ: هێنانی تیغ بەسەریدا واجبە.

پەسەندی‌یەتی نینۆك كردن و گرتن لە سمێڵ :

وا پەسەندە بۆ كەسێك كە سەری تاشی یا كورتی كردەوە لە سمێلیشی بگرێو نینۆكیش بكات، چونكە ئیبنوعومەر خوایان لـێ ڕازی بێت، كە سەری ئەتاشی لە حەج یا عومرە لە سمێڵو ڕیشی ئەگرت.

(ابن المنذر) ووتوویەتی: سابت بوە کە پێغەمبەر ﷺ کاتێ سەری ئەتاشی نینۆکیشی ئەکرد.

**فەرمان دان بە ئافرەت بە کورت کردنەوەو قەدەغە کردنی سەرتاشین لێی:**

ئەبو داودو چەند کەسی تر ئەگێڕنەوە لە ئیبنوعەبباسەوە خوا لێیان ڕازی بێت کە فەرمویەتی: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (لَيسَ عَلَى النِّساءِ حَلقٌ وَإنَّمَا عَلَى النِّساءِ التَّقصِيرُ) حسنه الحافظ. واتە: سەرتاشین لە سەر ئافرەتان نیە بەڵکو کورت کردنەوەیان لە سەرە.

(ابن المنذر) ووتوویەتی: ئەهلی عیلم ئیجماعیان کردوە لەسەر ئەوە، چونکە سەرتاشین بۆ ژنان ئەتك کردنە بۆیان.

**ئەوە ئەندازەیەی کە ئافرەت لە قژی سەری ئەیگرێ:**

لە ئیبنو عومەرەوە خوا لـێیان ڕازی بێت هاتوە فەرمویەتی: ئەگەر ژنێك بیەوێ قژی سەری کورت بکاتەوە ئەبێ قژەکەی هەمووی لەپێشی سەریدا کۆ بکاتەوەو لە پاشاندا ئەوەندەی سەرە پەنجەیەکی لـێ بگرێ.

(عطاء) ووتوویەتی: ئەگەر ژن قژی کورت کردەوە ئەبێ لە لایەکانی بگرێ، لە کورتو درێژی، هەردوکیان سەعیدی کوڕی مەنصور گێڕاویەتیەوە. وە ئەڵێن: سنوری دیاری کراو نی‌یە بۆ ژن کەلە قژی بگرێ.

شافیعی‌یەکان ئەڵێن: کەمترینی ئەوە کە بری بکەوێ، سـێ موە.

**تەوافی (إفاضة)**

موسڵمانان ئیجماعیان کردوە کە تەوافی (إفاضە) پایەیەکە لە پایەکانی حەج ئەگەر حاجی‌یەك نەیکات حەجەکەی بەتاڵە، بە پێی فەرموودەی خوای گەورە: ﴿وَلۡيَطَّوَّفُواْ بِٱلۡبَيۡتِ ٱلۡعَتِيقِ﴾ (الحج/٢٩). واتە: با بەدەوری خانەی دێرینی خوادا تەواف بکەن.

وە هەر ئەبێت نی‌یەتی تێدا دابمەزرێ لای ئەحمەد، بەڵام سـێ پێشەواکەی تر ڕایان وەهایە کە نی‌یەتی حەجەکە ئەمیش ئەگرێتەوە، وە ئەگەر نیەتیشی نەهێنێ حەجەکەی هەر دروستە.

جومهوری زانایان ڕایان وەهایە: کە ئەو تەوافە حەوت جار سوڕانەوەیە.

ئەبوحەنیفە ڕای وەهایە کە ڕوکنی حەج لەمەدا چوار جار سوڕانەوەیە، جا ئەگەر حاجی نەی کات حەجەکەی بەتاڵ ئەبێتەوە، بەڵام سـێ جارەکەی تر واجبەو ڕوکنی حەج نیە، وە ئەگەر حاجی ئەو سێ جارە نەکات یا جارێکیان، ئەوە واجبێکی تەرك کردووە، وە حەجەکەی بەتاڵ نابێتەوە بەڵام خوێنی ئەکەوێتە سەر.

**کاتی ئەو تەوافە:**

سەرەتای کاتەکەی نیوە شەوی شەوی قوربانی‌یە لای شافیعی‌و ئەحمەد، وە بۆ کۆتایی‌یەکەی سنور نی‌یە، بەلاَم ئافرەت بۆ پیاو حەلاَڵ نابێت هەتا ئەو تەوافە نەکات. وە بە دوا خستنی لە ڕۆژانی جەژن خوێن واجب نابێت هەرچەندە کەراهەتی هەیە بۆی.

وە چاکترین کات کە تێیدا بەجێ بێت چێشتەنگاوی ڕۆژی قوربانی‌یە. وە لەلای ئەبی حەنیفەو مالیك: کاتەکەی بە هەڵهاتنی بەرەبەیانی ڕۆژی قوربانی دێت. بەلاَم جیاوازیان هەیە لە کۆتایی کاتەکەیدا.

لە لای ئەبی حەنیفە واجبە بەجێ بهێنرێ لە هەر ڕۆژێك لە ڕۆژەکانی قوربانی‌دا، جا ئەگەر دوای خست خوێنی ئەکەوێتە سەر.

مالیك ووتویەتی: قەیناکە دوا بخرێت بۆ کۆتایی ڕۆژەکانی جەژن، بەلاَم بە پەلە کردنی چاکترە.

وە کاتەکەی درێژ ئەبێتەوە بۆ کۆتایی مانگی (ذي الحجة)، جا ئەگەر لە وە زیاتری دوا بخات خوێنی ئەکەوێتە سەر، بەلاَم حەجەکەی دروستە، چونکە هەموو مانگی (ذي الحجة) بەلای مالیکەوە لە مانگەکانی حەجە.

**پەلە کردنی ئافرەتان لە تەوافی (إفاضة):**

پەسەندە ئافرەتان تەوافی (إفاضە) بە پەلە بکەن لە ڕۆژی قوربانی‌دا ئەگەر ترسی کەوتنە بێ‌نوێژی یان هەبوو.

عائیشە فەرمانی ئەدا بە ژنان کە پەلە بکەن لە تەوافی (إفاضە) لە ڕۆژی قوربانیدا، نەوەك بکەونە بێ نوێژی‌یەوە.

(عطاء) ووتویەتی: ئەگەر ژنێك ترسی بێ نوێژی هەبوو با پێش ڕەمی کردنی جەمرەکە زیارەتی کەعبە بکات، وە پێش ئەوەش کە قوربانی سەر ببڕی.

وە دەرمان بە کارهێنان خراپ نی‌یە بۆ دواخستنی بێ نوێژی هەتا بتوانێ تەوافی بەیت بکات.

سەعیدی کوڕی مەنصور ئەگێڕێتەوە لە ئیبنو عومەرەوە خوا لێ‌یان ڕازی بێت: کە پرسیاری لێ کرا دەربارەی ئەوەی کە ئافرەت دەرمان بخوات هەتا بێ نوێژیەکەی دوا بکەوێ، فەرمووی: خراپ نیە، وە ئاوی دار ئەراکیشی بۆ وەصف کردن لەوبارەیەوە.

(محب الدین الطبري) ووتوویەتی: ئەگەر ئەو دواخستنە حساب بکرێ لەم شێوەیەدا، لە بەسەرچونی عیددەو شتی تریشدا بۆی حیساب ئەکرێ. هەروەها خواردنەوەی دەرمانێك کە کاتی بێ نوێژی نزیك بخاتەوە هەروەك ئەوە وایە و یەك حوکمیان هەیە.

دابەزین لە دۆڵێ (محصب) :

سابتە لە پێغەمبەرەوە ﷺ کە کاتێ گەڕاوەتەوە لە میناوە بۆ مەککە لە (محصب) دابەزیوەو[1] و نوێژی نیوەڕۆو عەسرو ئێوارەو خەوتنانی لێ کردوەو نەختێکیشس لێی ڕاکشاوە، وە ئیبنو عومەریش وەهای دەکرد.

زانایان جیاوازیان هەیە لە پەسەندی یەتی ئەو دابەزینەدا.

عائیشە فەرمویەتی: پێغەمبەر ﷺ بۆیە دابەزی لە (محصب) بۆ ئەوەی دەرچوونی ئاسانتر بێت و سوننەت نی یە، جا هەرکەس ئارەزوو بکات دائەبەزێ، وە هەرکەس ئارەزوو نەکا دانابەزێ.

(خطابي) ووتوویەتی: ئەوە شتێك بوو کە ئەکرا، لەپاشاندا وازی لێ هێنرا.

(ترمذي) ووتوویەتی: هەندێ لە زانایان بە پەسەندی دائەنێن دابەزین لە (أبطح) دا بێ ئەوەی بە واجبی بزانن، مەگەر کەسێ خۆی حەز لەوە بکات.

حیکمەت لە دابەزین لەو شوێنەدا سوپاس گوزاری خودایە لەسەر ئەو سەرکەوتنەی کە خوا بەخشی بە پێغەمبەرەکەی ﷺ بەسەر ئەو دوژمنانەدا کە سوێندیان خوارد لەو شوێنەدا لە بەنیهاشم و بەنی (مطلب) کە نە ژن و ژن خوازیان لەگەڵدا بکەن، وە نە کڕین و فرۆشتن، تا پێغەمبەریان تەسلیم نەکەن .

ئیبنوقەییم ووتوویەتی: مەبەستی پێغەمبەر ﷺ دەرخستنی دروشمی ئیسلام بووە لەو شوێنەدا کە دروشمی بێ بڕواییان تێدا دەرخستبوو، وە هەروەها دوژمنایەتی خواو پێغەمبەرەکەی.

چونکە پێغەمبەر ﷺ عادەتی وەها بوو کە ئیسلامی ئاشکرا ئەکرد لەو شوێنانەدا کە لە پێشەوە شوێنی دروشمی کوفرو بێ باوەڕی بوون، وەك چۆن فەرمانیدا مزگەوتی (طائف) لە جێی (لات)و (عزى) دروست بکەن.

## عومرە

عومرە: لە (الإعتمار)ەوە وەرگیراوە، ئەویش دیدەنی یە، مەبەست لە عومرە لێرەدا دیدەنی کردنی کەعبەو سوڕانەوەیە بە دەوریدا هاتوو چۆی نێوان صەفاو مەروەو سەرتاشین و کورت کردنەوەی مووی سەرە.

زانایان لە سەر ئەوە ئیجماعیان هەیە کە عومرە (مشروع) دانراوی یاسای ئیسلامە. لە ئیبنوعەبباسەوە خوا لێیان ڕازی بێت هاتوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (عُمرَةٌ فِي رَمَضَانَ تَعدِلُ حَجَّةً) رواه أحمد وابن ماجة. واتە: عومرەیەك لە مانگی ڕەمەزاندا هاوتایی حەجێك ئەکات[2].

---

(١) (محصب) (أبطح)ە یان (بطحاء) دۆڵێکە لە نێوان کێوی نورو کێوی حەجوندا.

(٢) واتە: پاداشتی بەجێهێنانی عومرەیەك لە ڕەمەزانا، هاوتای پاداشتی حەجێکە کە فەرز نەبێت، وە بەجێ هێنانی عومرە حەجی واجب لە مل ناکاتەوە.

لە ئەبو هورەیرەوە هاتوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (العُمرَةُ إلى العُمرَةِ كَفَّارَةٌ لِمَا بَينَهُمَا، وَالحَجُّ المَبرُورُ لَيسَ لَهُ جَزاءٌ إلا الجَنَّة) رواه أحمد والبخاري ومسلم. واتە: عومرە تا عومرە سڕەرەوەی گوناهی نێوانیانیانە وە حەجی وەرگیراو پاداشتی نیە بەهەشت نەبێت.

لە پێشەوە ئەو حەدیسە باسکرا کە ئەفەرموێ: (تَابِعُوا بَينَ الحَجِّ وَالعُمرَةِ).

دووبارە کردنەوەی عومرە:

١- نافیع وتوویەتی: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر خوا لێیان ڕازی بێت چەند ساڵ عومرەی کردووە لەزەمانی ئیبنوزوبەیردا، هەر ساڵێك دوو عەمرەی کردووە.

٢- قاسم ووتوویەتی: عائیشە خوای لێ ڕازی بێت لە ساڵێکدا سێ عەمرەی کردووە، پرسیار کرا ئایا کەس ئەوەی بە ئەنگ لێ نەگرتووە؟ ووتی سبحان الله، دایکی بڕواداران؟!! وە بەشی زۆری زانایان بۆ ئەوە چوون کە عومرە تێکرار ئەکرێتەوە.

مالیك لە جارێك زیاتر لە ساڵێکدا بە کەڕاهەتی داناوە.

دروستی عومرە پێش حەج وەلە مانگەکانی حەج دا:

دروستە بۆ عومرەکەر کە لە مانگەکانی حەجدا عومرە بکات بێ ئەوەی حەجیش بکات.

وە دروستیشە: عومرە کردن پێش حەج وەك عومەر کردی خوای لێ ڕازی بێت.

(طاوس) ووتوویەتی: لە سەردەمی نەفامیدا خەڵك ڕایان وەها بوو کە عومرە کردن لە مانگەکانی حەجدا خراپترین گوناهە، وە ئەیان ووت: کاتێ مانگی صەفەر کۆتایی هات و برینی سم یان پشتی ووڵاغ چاك بووەوەو شوێنەورای سەفەر نەما بەهۆی حەجەوە، عومرە ڕەوا ئەبێ بۆ عومرەکەران.

بەڵام کە ئیسلام هات فەرمانی دا بەخەڵك عومرە بکەن لە مانگەکانی حەجدا، جا بەوە عومرە چووە نێو مانگەکانی حەجەوە هەتا ڕۆژی دوایی.

ژمارەی عومرەکانی پێغەمبەرﷺ:

لە ئیبنو عەبباسەوە خوایان لێ ڕازی بێت هاتوە کە پێغەمبەر ﷺ چوار عومرەی کردووە: عومرەی حودەیبیەیە و عومرەی قەزا، سێیەم لە جیعرانە، چوارەمیشیان لەگەڵ حەجەکەیدا، ئەحمەدو ئەبو داوود و ئیبنو ماجە گێڕاویانەتەوە بەسەنەدێك کە پیاوەکانی جێی باوەڕن.

حوکمی عومرەکردن:

حەنەفیەکان و مالیك بۆ ئەوە چوون کە عومرە سوننەتە.

بە پێی حەدیسەکەی جابیر خوای لێ ڕازی بێت: کە پێغەمبەر ﷺ پرسیاری لێ کرا کە ئایا عومرە واجبە؟ فەرمووی نە،، ئەحمەدو (ترمذي) گێڕاویانەتەوە. وە (ترمذي) ووتوویەتی: (حسن صحيح).

لە لای شافیعی و ئەحمەد عومرە فەرزە، بە پێی فەرموودەکەی خوای گەورە کە ئەفەرموێ: ﴿وَأَتِمُّواْ ٱلْحَجَّ وَٱلْعُمْرَةَ لِلَّهِ﴾ (البقرة/١٩٦). واتە: حەج و عومرە بە خالیسی بۆ خوا تەواو بکەن.

لە ئایەتەکەدا عومرە عەطفە بۆ سەر حەجەکە، کەواتە ئەمیش فەرزە وەك حەجەکە، بەڵام ڕای یەکەم بەهێزترە .

لە (فتح العلام)دا هاتووە: لەو بارەیەوە چەند حەدیس هەیە کە بەڵگەیان پێ ڕاناوەستێ. وە (ترمذي) لە شافیعیەیەوە هێناویەتی کە ووتوویەتی: دەربارەی عومرە شتێ سابت نەهاتوە کە سوننەت بێت.

**کاتی عومرە کردن:**

جومهوری زانایان بۆ ئەوە چوون کە هەموو کاتێکی ساڵ عومرە بەجێ دێت، کەواتە دروستە لە هەر ڕۆژێك لە ڕۆژەکانی ساڵدا بەجێ بێت.

ئەبوحەنیفە بۆ ئەوە چووە: کە کەراهەتی هەیە عومرە کردن لە پێنج ڕۆژی ساڵدا: ڕۆژی عەرەفەو ڕۆژی قوربانی و سێ ڕۆژەی جەژن.

ئەبو یوسف بۆ ئەوە چووە کە لە ڕۆژی عەرەفەو سێ ڕۆژ دوای عەرەفە عومرە کردن کەراهەتی هەیە.

وە زانایان ڕێك کەوتوون لەسەر ئەوەی کە عومرە لە مانگەکانی حەجدا دروستە،

١- بوخاری لە عیکریمەی کوڕی خالیدەوە ئەگێڕێتەوە کە ووتوویەتی: پرسیارم لە عەبدوڵلای کوڕی عومەر کرد خوا لێیان ڕازی بێت، دەربارەی عومرەی پێش حەج، فەرموی: خراپە نیە لەسەر کەسێك کە عومرە بکات پێش حەج، چونکە پێغەمبەر ﷺ عومرەی کرد پێش ئەوەی حەج بکات.

٢- لە جابیرەوە خوای لێ ڕازی بێت ئەگێڕنەوە: کە عائیشە بێنوێژ بوو، جا هەمو کارەکانی حەجی بەجێ هێنا جگە لەوە کە تەوافی بەیتی نەکرد.

جا کاتێ پاك بووەوەو تەوافی کرد فەرموی: ئەی نێرراوی خوا! ئایا ئێوە بە حەج و عومرەیەکەوە دەرئەچن، کەچی منیش بە حەجێکەوە؟ ئیتر پێغەمبەر ﷺ فەرمانیدا بە (عبدالرحمن)ی کوڕی ئەبوبەکر کە لەگەڵیا بچێ بۆ تەنعیم، عائیشەش عومرەی کرد دوای حەج لە مانگی (ذی الحجة)دا. وە چاکترین کات بۆ عومرە کردن مانگی ڕەمەزانە وەك لە پێشەوە باسکرا.

**شوێنی ئیحرام بەستن بۆ عومرە:**

ئەوکەسەی ئەیەوێ عومرە بکات یا لە دەرەوەی شوێنی ئیحرام بەستنەکانە کە لە پێشەوە باس کرا، یا لەو شوێنانەدایە، جا ئەگەر لە دەرەوە بوو، دروست نیە بۆی لێیان تێپەڕ بێ بەبێ ئیحرام.

بە پێی ئەوەی بوخاری گێڕاویەتیەوە: کە زەیدی کوڕی جوبەیر هات بۆ لای عەبدوڵلای کوڕی عومەر، پرسیاری لێ کرد: لە کوێوە دروستە کە عومرە بکەم؟ فەرموی: پێغەمبەر ﷺ (قرن)ی فەرز کردووە بۆ

خەلکی نەجد. وە بۆ خەلکی مەدینە (ذالحليفة)ر بۆ خەلکی شام (الجحفة)، جا ئەگەر لەناو شوێنی میقاتەکاندا بوو، میقاتەکەی لەوشوێنەوەیە کە ئیحرامی شکاندۆتەوە، با لەناو حەرەمیشدا. بێت بە پێی حەدیسە پێشوەکەی بوخاری کە تێیدا هاتبوو: عائیشە چوو بۆ تەنعیم و لەوێ ئیحرامی بەست، وە ئەوەش بە فەرمانی پێغەمبەر ﷺ بوو.

## (طواف الوداع) تەوافی ماڵ ئاوایی

تەوافی ماڵئاوایی بۆیە بەو ناوەوە ناونراوە، چونکە بۆ ماڵ ئاوایی کردنە لە کەعبە، وە پێشی ئەووترێ تەوافی (صدر)، چونکە لەکاتی دەرچوونی خەلکە لە مەککەوە، وە ئەم تەوافە لۆقەکردنی تێدا ناکرێ. وە دوا کاری حەجە کە حاجیەکانی دەرەوەی مەککە بەجێی ئەهێنن کاتێ بیانەوێت لە مەککە بچنە دەرەوە.

مالیك لە (الموطأ) دا ئەگێرێتەوە کە عومەر خوا لـێی ڕازی بێت فەرمویەتی: دوایەمین کارەکانی حەج تەواف کردنە بەدەوری خانەی خوادا.

بەڵام دەرحەق بە خەلکی مەککەو ئافرەتی بێ نوێژ ئەگەر ئەو تەوافە نەشکەن هیچیان ناچێتە سەر.

لە ئیبنو عەبباسەوە خوایان لـێ ڕازی بێت هاتوە کە فەرمویەتی: ڕێ دراوە بە ژنی بێ نوێژ کە بگەڕێتەوە بە بێ تەواف کردن بە دەوری بەیتدا. بوخاری و موسلیم گێڕاویانەتەوە.

لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە فەرمویەتی: فەرمان دراوە بە خەلك کە ئەو تەوافە ئاخر بینینیان بێت بۆ بەیت، بەڵام بۆ ژنی بێ نوێژ سوك کراوە.

وە هەر بوخاریو موسلیم ئەگێڕنەوە لە صەفیەی خێزانی پێغەمبەر ﷺ کە بێ نوێژ بووە، جا بە پێغەمبەریان ووتووە فەرموویەتی: (أَحَابِسَتُنَا هِيَ؟) واتە: گیری داین؟ ووتیان: تەوافی (إفاضة)ی کردوە، فەرمووی: کەواتە نا.

**حوکمی تەوافی ماڵ ئاوایی:**

زانایان هەموو ڕێکن لە سەر ئەوەی کە مەشروعە:

بەپێی ئەوەی موسلیمو ئەبو داورد گێڕاویانەتەوە لە ئیبنوعەبباسەوە خوا لـێیان ڕازی بێت کە فەرمویەتی: خەلك هەر یەك بەلایەکدا ئەڕۆیشتن. پێغەمبەر فەرمووی ﷺ : (لايَنفِر أحَدُكُم حَتَّى يَكُونَ آخِرُ عَهدِهِ بِالبَيتِ). واتە: کەس بەهیچ لایەکدا نەڕوات هەتا دوا جێگای دیداری، دەوری بەیت نەبێت.

وە زانایان جیاوازیان هەیە لە حوکمەکەیدا:

مالیكو داودو (ابن المنذر) ووتوویانە: سوننەتە و بە نەکردنی هیچ واجب نابێت، ئەمەش قسەی شافیعیەیە.

حەنەفیەکان و حەنبەلیەکانو ڕیوایەتێکی شافیعی ئەلێن: ئەو تەوافە واجبەو بە نەکردنی خوێن واجب ئەبێت.

**کاتی تەوافی ماڵی ئاوایی:**

کاتی تەوافی ماڵی ئاوایی بەدەوری کەعبەدا، ئەو کاتەیە کە حاجی لە هەموو کارەکانی ئەبێتەوە، وە ئەیەوێت بگەڕێتەوە بۆ ئەوەی ئاخر بینینی بۆ بەیت بێت. وەك لە حەدیسەکەی پێشەوە باسکرا.

جا کاتێك حاجی تەوافەکەی کرد ئەبێ یەکسەر بڕوات بێ ئەوەی خۆی مەشغوڵ بکات بە کڕین و فرۆشتنەوە، وە بێ ئەوەی ماوەیەك بمێنێتەوە، جا ئەگەر شتی وەهای کرد ئەبێ تەوافەکە دووبارە بکاتەوە، مەگەر پێویستی‌یەکی ڕێگا بەجێ بهێنێ، یا شتێك بکڕێ کە زۆر پێویستی پێی بێت وەك خواردەمەنی لەم شێوەیەدا سوڕانەوەکە دووبارە ناکاتەوە. چونکە ئەو شتانە دەری ناکات لەوەی کە دوا دیداری بۆ بەیت بێت.

وە پەسەندە بۆ ئەو کەسەی تەوافی وەداع ئەکات لە خوا بپاڕێتەوە بەو دوعایەی کە لە ئیبنوعەبباسەوە خوا لێیان ڕازی بێت گێڕراوەتەوە کە ئەمەیە:

(اللّٰهُمَّ إنِّي عَبدُكَ، وَابنُ عَبدِكَ، وَابنُ أمَتِكَ، حَملتَنِي عَلَى مَا سَخَّرتَ لِي مِن خَلقِكَ، وَسَترتَنِي فِي بِلادِكَ حتى بَلَغتَنِي ـ بِنِعمَتِكَ ـ إلى بَيتِكَ، وَأعَنتَنِي عَلَى أدَاءِ نُسُكِي، فإن كُنتَ رَضِيتَ عَنِّي فَازدَد عَنِّي رضاً، وإلا فَمِنَ الآنَ فَارضَ عَنِّي قَبلَ أن تَنأى عَن بَيتِكَ دَارِي، فَهَذَا أوَانُ انصِرَافِي إن أذِنتَ لِي غَيرَ مُستَبدِلٍ بِكَ وَلا بِبَيتِكَ، وَلا رَاغِبٍ عَنكَ، وَلا عَن بَيتِكَ. اللّٰهُمَّ فَأصحِبنِي العَافِيَةَ فِي بَدَنِي، وَالصِّحَّةَ فِي جِسمِي، وَالعِصمَةَ فِي دِينِي، وَأحسِن مُنقَلَبِي، وَارزُقنِي طَاعَتَكَ مَا أبقَيتَنِي، وَاجمَع لِي بَينَ خَيرَيِ الدُّنيا وَالآخِرَةِ، إنَّكَ على كُلِّ شَيءٍ قَدِير). واتە: خوایە من بەندەی تۆم و کوڕی بەندەو کەنیزەکی تۆم، خوایە هەڵت گرتووم بەشتێ کە خۆت بۆت دابین کردووم و دروست کراوی خۆتە، وەلە وڵاتی خۆتدا عەیبەکانت داپۆشیم هەتا گەیانتمە خانەکەت و یارمەتیت دام لە سەر بەجێ هێنانی کارەکانی حەج، جا خوایە ئەگەر لێم ڕازی بوویت ڕازی بونتم بۆ زیاد بکە، ئەگینا لەئێستاوە لێم ڕازی بە پێش ئەوەی خانەکەم لە خانەکەت دور کەوێتەوە، چونکە ئێستا کاتی گەڕانەوەمە ئەگەر ڕێم پێ بدەی، بێ ئەوەی کە هیچ شتێك بە تۆو بەخانەکەت بگۆڕمەوە، وە بێ ئەوەی بێزار بم لە خۆت و خانەکەت. خوایە سەلامەتی بکە هاوڕێی لاشەم و تەندروستم بکە، خوایە ئاینم بپارێزە، خوایە شوێنی گەڕانەوەشم چاك بکە، خوایە هەتا ماوم گوێڕایەڵی فەرمانەکانتم پێ بدە، خوایە خێری دونیاو دواییم بەسەریەکەوە پێ ببەخشە، چونکە هەر تۆ بەڕاستی توانات بە سەر هەموو شتدا هەیە.

شافیعی ووتویەتی: من وا حەز ئەکەم ئەو کەسەی کە ماڵی ئاوایی لە بەیت دەکات لە مولتەزیم بوەستێ کە شوێنێکە لە نێوان ڕوکن و دەرگاکەدا. پاشان ئەوەی سەرەوەی باسکردووە .

**چۆنی‌یەتی جێ‌بەجێ کردنی حەج:**

ئەگەر حاجی لە شوێنی ئیحرام بەستن نزیك بووەوە وا پەسەندە سمێڵ‌و مووی سەری کورت بکاتەوەو نینۆکی بکات و خۆی بشۆرێ، یا دەست نوێژ بگرێ وە بۆن لە خۆی بدات و جلی ئیحرام لەبەر بکات.

ئەگەر گەیشتە شوێنی ئیحرام دوورکات نوێژ بکات‌و ئیحرام ببەستێ و نی‌یەتی حەج بهێنێ ئەگەر (مفرد) بێ واتە حەجی ئیفراد بکات، یا نیەتی عومرە بێنێ ئەگەر حەجی تەمەتتوع بکات، یا نی‌یەتی هەردووکیان بێنێ بەیەکەوە ئەگەر قیران بکات، ئەو ئیحرام بەستنەش پایەیەکە لە پایەکانی حەج، وە کارەکانی حەج بە بێ ئەو ئیحرامە دروست نی‌یە.

بەڵام دیاری کردنی جۆری حەج، لە ئیفراد یا تەمەتتوع یا قیران فەرز نییە، جا ئەگەر نی‌یەتی موطلەقی هێنا و جۆری عیبادەتەکەی دیاری نەکرد ئیحرامەکەی دروستە. وە بۆی هەیە یەکی لەو سیانە بکات.

ئیتر هەر کە ئیحرامەکەی بەست ئەبێ بەدەنگی بەرز تەلبی‌یە بکات هەرکاتێ سەر کەوتە شوێنێکی بەرز، یا دابەزی‌یە ناو دۆڵێك، یا کاتێ گەیشت بە کۆمەڵێك سوار، یا بە کەسێك، وە لە پارشێواندا، وە لە دوای هەموو نوێژێکەوە.

وە ئەبێ موحریم دور کەوێتەوە لە جیماع و ئەو شتانەی پاڵ بە ئادەمیزادەوە ئەنێت بۆ جیماع، وە دوورکەوێتەوە لە دژایەتی کردنی هاوڕێ و کەسانی تر، وە دورکەوێتەوە لە شەڕە قسەی بێ سوود، وە نابێت خۆی ژن بهێنێت و ژن بۆ کەسیش بهێنێ.

وە ئەبێ دوور کەوێتەوە لە لەبەرکردنی پۆشاکی دوراو، وە دورکەوێتەوە لە لەپێ‌کردنی پێڵاوێك کە ئەوەندە درێژ بێت بگاتە سەرو قولەپێ‌یەوە.

نابێ سەری داپۆشی و بۆن لەخۆی بدات‌و سەری بتاشێ‌و موو لە خۆی بکاتەوە، وە نابێت نینۆکی بکات و بە هیچ شێوەیەك ڕاوی زەمینی بکات، وە نابێ دارو درەخت‌و ڕووەکی حەرەم دەست کاری بکات.

کاتێ چووە ناو مەککەی (مکرمە)وە پەسەندە لەلای ژووروەوە بچێتە ناوی دوای ئەوەی کە لە بیری (ذي طوى) خۆی شۆری لە (الزاهر) ئەگەر بۆی لوا.

پاشان بەرەو کەعبە بچێت لە (باب السلام)ەوە بچێتە ناوی، ئەو پاڕانەوەیە بڵێ کە لەکاتی چوونە ناو مزگەوتدا ئەوترێ و پەیڕەوی ئاداب و ڕەوشتی چونە ناوی بکات و بەملکەچی و خۆبەکەم زانیەوە بچێتە ژورەوەو تەلبی‌یە بکات.

جا کاتێ چاوی کەوت بە کەعبە دەستی بەرز بکاتەوەو لە خوا بپاڕێتەوە، وە پەسەندە ئەوپاڕانەوەیە بڵێت کە لەوبارەیەوە هاتووە (مستحب)ە.

وە یەکسەر ڕوو بکاتە بەردە ڕەشەکەو ماچی بکات بە جۆرێ ماچەکە دەنگی لێوە نەیات، یا دەستی لێ بدات و دەستی ماچ بکات، جا ئەگەر نەیتوانی ئیشارەتی بۆ بکات، لە پاشاندا لە ڕێکی بەردە کە بووەستێو ئەو ذیکرە سوننەتە بخوێنێ کە هاتووەو بپاڕێتەوە بەو پاڕانەوەیە کە پێشینان پێی پاڕاونەتەوە، لەپاشاندا دەست بکات بە تەواف.

موستەحەببە کە ناوەڕاستی پەشتەمالەکەی بخاتە بن باڵی ڕاستیو چمکەکانی بدات بەسەر شانی چەپیدا و لە سێ خولی یەکەمدا بە لۆقە بڕوات، وە لە چوار خولەکەی تردا کە ئەمێنێتەوە بەعادەتی بڕوات وە سوننەتە بۆی کە دەست بدات لە ڕووکنی یەمانیو بەردە ڕەشەکە ماچ بکات لە هەموو خولێکدا.

کاتێ لە تەواف بوەوە بچێت بۆ (مەقامی ئیبراهیم) ئەم فەرموودەیەی خوا بخوێنێتەوە: ﴿وَٱتَّخِذُواْ مِن مَّقَامِ إِبۡرَٰهِـۧمَ مُصَلًّىۖ﴾ (البقرة/١٢٥). ئینجا دورکات نوێژی تەواف بکات، لە پاشاندا بچێت بۆ لای (زمزم) تێر تێر لە ئاوەکەی بخواتەوە.

لە پاش ئەوە دێتە (الملتزم) لە خوا ئەپاڕێتەوەو داوای خێری دونیاو ڕۆژی دوایی ئەکات.

پاشان بەردە ڕەشەکە دەست لێ ئەداتو ماچی ئەکات، وە لە دەرگای صەفاوە دێتە دەرەوە بۆ صەفاو ئەم فەرمودەی خوا ئەخوێنێتەوە: ﴿إِنَّ ٱلصَّفَا وَٱلۡمَرۡوَةَ مِن شَعَآئِرِ ٱللَّهِۖ﴾ (البقرة/١٥٨). وە ئەچێتە سەری و ڕوئەکاتە کەعبەو ئەپاڕێتەوە بەو پاڕانەوەی کە هاتووە لەو بارەیەوە، لەپاشاندا دێتە خوارەوەو دەست ئەکات بە سەعی بە زیکر کردن و پاڕانەوە بەوەی کە پێی خۆشە.

جا کە گەیشتە نێوان دوو میلەکە بە لۆقە کردن ئەڕوات، لە پاشان لە سەرخۆ دەست ئەکاتەوە بەڕۆیشتن هەتا ئەگاتە مەروە، جا سەر ئەکەوێتە سەر مەروەو بەرەو کەعبە ئەوەستێ بە زیکر کردنی خواو بە پاڕانەوە، ئا ئەمە (شوط)ی یەکەمە.

وە ئەبێت بەو شێوەیە هاتو چۆی نێوان سەفاو مەروە بکات هەتا هەر حەوت (شوط)ەکە تەواو ئەکات.

ئەم هاتوچۆیەش لەسەر بەهێزترین ڕا واجبە، وە لەسەر وازلێ هێنەری -هەندێکی یا هەمووی- خوێن واجب ئەبێت. جا ئەگەر موحریم حەجی تەمەتتوعی کردبو ئەوە سەری ئەتاشێ یا کورتی ئەکاتەوە.

بەوە عومرەکەی کۆتایی دێت وە هەرچی لە سەر حەرام بووە بە هۆی ئیحرام بەستنەوە بۆی حەڵاڵ ئەبێتەوە هەتا چوونە لای ژنیش.

بەڵام قارینو موفرید لەسەر ئیحرامەکەیان ئەمێننەوە.

جا لە ڕۆژی هەشتەمی (ذی الحجة) موتەمەتتیعەکە ئیحرام ئەبەستێتەوە لە شوێنەکەی خۆیەوەو دێتەدەر لەگەڵ ئەوانەی کە هێشتا ئیحرامیان نەشکاندووەو ئەچن بەرەو میناو شەو لەوێ ئەمێننەوە، کاتێ

ڕۆژ هەڵات ئەڕوات بەرەو عەرەفات و لە لای مزگەوتی (نمرة) دا ئەبەزێ. وە خۆی ئەشوات‌و نوێژی نیوەڕۆو عصر بە پێش خراوی و بەسەریەکەوە لەگەڵ ئیمامدا ئەکات و نوێژ کورت ئەکاتەوە.

ئەمە ئەگەر بۆی ڕێك کەوت لەگەڵ ئیمام نوێژ بکات، ئەگینا خۆی بە تەنها بە پێی توانا نوێژەکانی ئەکات بە کورتی و بەسەریەکەوە.

وە هەتا دوای نیوەڕۆ وێستان لە عەرەفە دەست پێ ناکات ، جا دوای نیوەڕۆ لای بەردە گەورەکانەوە، یان لە نزیکیانەوە ئەوەستێ، چونکە ئەو شوێنە شوێنی وەستانی پێغەمبەر ﷺ بووە.

وە ڕاوەستان لە عەرەفە پایەیەکە لە پایە گەورەکانی حەج ، وە نە سوننەتە وە نە واجبە بچێتە سەر کێوی (رحمة).

جا لەوێ بەرەو قیبلە ئەوەستێ دەست ئەکا بە پاڕانەوەو یادی خوا کردن هەتا شەو دێت.

کە شەو داهات دێتە خوارەوە بەرەو موزدەلیفە لەوێ نوێژی ئێوارەو خەوتنان ئەکات بەسەریەکەوەو بەدوا خستنی نوێژی ئێوارە بۆ پاڵ نوێژی خەوتنان، وە شەو لەوێ ئەمێنێتەوە.

لە کاتی بەرە بەیاندا لە (المشعر الحرام) ڕائەوەستێ و زۆر زیکری خوا ئەکات هەتا دونیا ڕون ئەبێتەوە، جا ئەو شوێنە بەجێ ئەهێڵێ دوای ئامادەکردنی بەردە وردەکان، وە ئەگەڕێتەوە بۆ مینا.

ڕاوەستان لە مەشعەری حەرام واجبە، بەنەکردنی خوێن واجب ئەبێت. وە لە دوای ڕۆژ هەڵاتن جەمرەی عەقەبە بەردەباران ئەکات بەحەوت بەرد.

پاش ئەوە قوربانی‌یەکەی سەر ئەبڕێ -ئەگەر توانی- و سەری ئەتاشێ یا کورتی ئەکاتەوە، جا بەو سەرتاشینە هەرچی لە سەر حەرام بووە بۆی حەڵاڵ ئەبێتەوە جگە لە ژن.

لەپاشاندا ئەگەڕێتەوە بۆ مەککەو بەدەوری کەعبەدا تەوافی (إفاضة) بەجێ ئەهێنێ، کە تەوافی ڕوکنە، جا تەواف ئەکات وەك چۆن تەوافی قودومی کرد. وە بەم تەوافە تەوافی زیارەتیشی پێ ئەوترێ، وە ئەگەر ئەوکەسە موتەمەتتیع بوو، دوای تەواف سەعی نێوان صەفاو مەروە ئەکات.

بەڵام ئەگەر موفرید بوو یا قارین، وە کە هاتبو بۆ مەککە سەعی قودومیشی کردبوو، ئەوە سەعی-یەکی تری لەسەر نیە.

لە دوای ئەو تەوافە هەموو شتێکی بۆ حەڵاڵ ئەبێتەوە هەتا چوونە لای ژنیش، لەپاشاندا ئەگەڕێتەوە بۆ مینار شەو ئەمێنێتەوە تێیدا، وە مانەوە لە مینا واجبەو بە نەکردنی خوێن واجب ئەبێت، جا کە گەیشتە دوا نیوەڕۆی ڕۆژی یانزەهەم لە (ذي الحجة)، ئەچێ سێ جەمرەکان ڕەمی ئەکات، لە پێشەوە لەوەوە دەست پێ‌ئەکات کە لەملای میناوەیە، لەپاشاندا ئەوەی ناوەڕاست. دوای ئەم ڕەمی کردنە ئەوەستێ‌و ئەپاڕێتەوەو یادی خوا ئەکات، ئینجا جەمرەی عەقەبە بەرد باران ئەکات‌و لای ئەم ناوەستێ.

وە پێویستە هەر جەمرەیەك بە حەوت بەرد ڕەجم بکات لە پێش ڕۆژ ئاوابووندا.

ڕۆژی دوانزەهەمیش ئەو کارە دووبارە ئەکاتەوە.

دوای ئەوە ئەو کەسە ئارەزووی خۆیەتی یا دا ئەبەزێ بۆ مەککە پێش ئاوا بونی ڕۆژی دوانزەهەم یا شەو ئەمێنێتەوەو ڕۆژی سیانزەهەم ڕەمی ئەکاتەوە.

وە ڕەمی کردن واجبە و بەنەکردنی خوێن واجب ئەبێت.

جا ئەگەر گەڕایەوە مەککەو ویستی بگەڕێتەوە بۆ وڵاتی خۆی، ئەوە ئەبێ تەوافی ماڵ ئاوایی بکات، وە ئەو تەوافە واجبە.

ئەگەر کەسێك دەیکردبو واجبە لەسەری بگەڕێتەوە مەککەو ئەو تەوافە بکات، ئەگەر توانی بگەڕێتەوەو لە شوێنی ئیحرام بەستن تێ نەپەڕیبێت، ئەگینا ئەبێ مەڕێك سەر ببڕێ.

لە هەموو ئەوانەی کە لە پێشەوە باس کرا ئەوە وەرئەگیردرێ کە کارەکانی حەج و عومرە بریتی یە لە:

ئیحرام بەستن لە میقات، تەواف کردن، و سەعی نێوان صەفاو مەروە، و سەرتاشینە، بەم کارانەش کارەکانی عومرە تەواو ئەبێت. وە ئەمانەشی پێ زیاد ئەکرێت لە حەجدا:

وەستان لە عەرەفە، و ڕەمی کردن، و تەوافی (إفاضة)، ومانەوەی شەو لە مینا، و قوربانی کردن، و سەرتاشین، یا قژ کورت کردنەوە.

ئەمانە کورتەی کارەکانی حەج و عومرە بوون.

## پەسەندی‌یەتی زوو گەڕانەوە

لە ئەبوهورەیرەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (السَّفَرُ قِطعَةٌ مِنَ العَذَابِ، يَمنَعُ أحَدُكُم طَعَامَهُ وَشَرَابَهُ، فَإذَا قَضَى أحَدُكُم نَهمَتَهُ فَليُعَجِّل إلى أهلِهِ) رواه البخاري و مسلم. واتە: سەفەر پارچەیەك لە شکەنجەو ئازارە لە خواردن و خواردنەوەتان ئەکات، جا ئەگەر کەسێکتان پێویستی-یەکەی بەجێ هێنا بازوو بگەڕێتەوە ناو کەس‌وکاری.

لە عائیشەوە هاتوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (إذَا قَضَى أحَدُكُم حَجَّهُ فَليَتَعَجَّل إلى أهلِهِ، فَإنَّهُ أعظَمُ لأجرِهِ) رواه الدارقطني. واتە: هەرکەسێکتان حەجی تەواو کرد بابە پەلە بگەڕێتەوە ناو کەس‌وکاری چونکە ئەوە پاداشتی پێ گەورە ئەبێت.

موسلیم ئەگێڕێتەوە لە عەلائی کوڕی (حضرمي)یەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (يُقِيمُ المُهَاجِرُ بَعدَ قَضَاءِ نُسُكِهِ ثَلاثاً). واتە: کۆچ کەر دوای تەواو بوونی کارەکانی حەج هەر سێ ڕۆژ ئەمێنێتەوە.

## ڕێ لێ گیران (الإحصار)

(إحصار) : ڕێ لێ گرتن و بەند کردنە، خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿فَإِنۡ أُحۡصِرۡتُمۡ فَمَا ٱسۡتَيۡسَرَ مِنَ ٱلۡهَدۡيِۖ﴾ (البقرة/١٩٦). واتە: ئەگەر ڕێتان لێ گیرا، چیتان بۆ هەڵسوڕا بیکەنە قوربانی.

ئەم ئایەتە کاتێك هاتە خوارەوە کە پێغەمبەرو یارانی ڕێیان نەدرا لە حودەیبیەیە بڕۆن بۆ مزگەوتی حەرام. مەبەست لە ڕێ گرتنەکەش ڕێ گرتنە لە تەواف کردن لە عومرەدا، وە لە وەستان لە عەرەفە، یا تەوافی (إفاضە) لە حەجدا.

زانایان جیاوازی‌یان هەیە لەوەی کە ئەبێتە هۆی قەدەغە بوون‌و ڕێ گیران .

مالیك‌و شافیعی وتوویانە: بە دوژمن نەبێت بەدی نایەت.

چونکە ئایەتەکە هاتە خوارەوە دەربارەی ڕێ گرتن لە پێغەمبەر ﷺ لە لایەن دوژمنەوە.

ئیبنو عەبباس فەرمویەتی: ڕێگرتن تەنها لە دوژمنەوە ئەبێت وحوکمەکانی لەسەر جێ‌بەجێ ئەبێت.

بەشی زۆری زانایان بۆ ئەوە چوون -لەوانە حەنەفی‌یەکان‌و ئەحمەد- کە قەدەغە بوون بەهەموو شتێك ئەبێت کە ڕێ بگرێت لە حاجی بۆ حەج کردن و چونە ناو بەیت لەوانە دوژمن، یا نەخۆشی‌یەك کە بە جوڵەو ڕۆیشتن زیاد بکات، یا ترس، یا ون بوونی پول و پارە، یا مردنی مەحرەمی ئافرەت لە ڕێگا وە جگە لەوانەش، لەو عوزرانە کە ڕێگرن، هەتا ئیبنومەسعود فەتوای داوە دەربارەی پیاوێك مارو دوو پشك پێوەی دا کە ئەویش هەر ڕێ لێ‌گیراو (محصر)ە.

وە بەڵگەشیان گشتی‌یەتی فەرموودەکەی خوایە کە فەرموویەتی: ﴿فَإِنۡ أُحۡصِرۡتُمۡ﴾ وە هۆی هاتنە خوارەوەکەشی ڕێ گیرانی پێغەمبەرو بوو ﷺ بە دوژمن، چونکە حوکمی گشتی تەنها بەهۆکەیەوە نابەسترێتەوە، وە ئەمەش بە هێزترە لە بۆ چوونەکانی تر.

**ڕێ لێ گیراو مەڕێك و بەرەوژوری لەسەر واجبە:**

ئایەتەکە صەریحە لەوەدا کە ڕێ لێ‌گیراو لەسەریەتی کە هەرچی بۆ هەڵسوڕا لە قوربانی سەری ببڕێ.

لە ئیبنوعەبباسەوە خوا لێ‌یان ڕازی بێت هاتوە کە پێغەمبەر ﷺ کەڕێی لێ گیرا، سەری تاشی و چووە لای خێزانەکانی‌و قوربانیەکانی سەربڕی، هەتا ساڵی داهاتوو عومرەی کرد. بوخاری گێڕاویەتی‌یەوە.

جومهوری زانایان ئەوەیان کردۆتە بەڵگەی ئەوە کەڕێ لێ گیراو واجبە لە سەری مەڕ یا مانگایەك یا وشترێك سەر ببڕێ.

مالیك وتوویەتی (واجب نی‌یە).

لە کتێبی (فتح العلام)دا هاتووە: ڕاستی لەگەڵ ئەوەیە کە لەگەڵ مالیکدایە، چونکە هەموو ڕێ لێ گیراوێك قوربانیان پێ نی‌یە. وە ئەو قوربانی‌یانەی کە پێغەمبەر ﷺ پێی بوو لە مەدینە بە سوننەت هێنابووی.

خواش مەبەستی ئەوە بوە بە فەرمودەی: ﴿وَٱلۡهَدۡيَ مَعۡكُوفًا أَن يَبۡلُغَ مَحِلَّهُۥ﴾ (الفتح/٢٥). واتە: وە قوربانی‌یەکان ڕێ‌یان لێ گیرا کە بگەنە شوێنی خۆیان بۆ سەربڕین.

ئایەتەکەش ئایێتە بەڵگەی واجب بون.

**شوێنی سەربڕینی قوربانی ڕێ لێ گیراو:**

لە (فتح العلام)دا ئەڵێ: زانایان جیاوازن لەوەدا کە ئایا قوربانی‌یەکانی ڕۆژی حودەیبی‌یە لە حەرەمدا بووە یا لەدەرەوەی حەرەم؟ بەڵام ڕواڵەتی ئایەتەکە: ﴿وَٱلۡهَدۡيَ مَعۡكُوفًا أَن يَبۡلُغَ مَحِلَّهُۥۚ﴾ (الفتح/٢٥) وا دەردەخات کە لە دەرەوەی حەرەم سەریان بڕیون.

بۆ شوێنی سەربڕینی ڕێ لێ گیراو چەند ڕایەك هەیە:-

یەکەم ڕای جومهورە: لەو شوێنەدا ئەبێ سەری ببڕی کە خۆی تەکاتەوەو ئیحرام ئەشکێنێ، جا لە حەرەمدا بێ، یا لە دەروەی حەرەمدا بێ.

دووەم ڕای حەنەفی‌یەکانە: کە نابێت قوربانیەکان سەر ببڕێ لە حەرەمدا نەبێ.

سێیەم ڕای ئیبنو عەبباس‌و کۆمەڵێك: کە ئەو کەسە ئەگەر بتوانێ قوربانیەکان بنێرێ بۆ حەرەم ئەوە واجبە لەسەری بینێرێ، وەنابێ ئیحرامیش بشکێنێ هەتا قوربانیەکان لە شوێنی قوربانیدا سەر نەبڕرێن، وە ئەگەر نەی توانی بیان نێرێ، لەو شوێنەی ڕێی لێ گیراوە سەری ببڕێ.

**ڕێ لێ‌گیراو ئەو حەجە ناگێڕێتەوە مەگەر حەجی فەرزی لەسەر بێ:**

لە ئیبنوعەبباسەوە خوا لێ‌یان ڕازی بێت هاتوە دەربارەی ئەم ئایەتە: ﴿فَإِنۡ أُحۡصِرۡتُمۡ فَمَا ٱسۡتَيۡسَرَ مِنَ ٱلۡهَدۡيِۖ﴾ (البقرة/١٩٦). فەرمویەتی: هەرکەس ئیحرامی بەست بۆ حەج یا عومرە لە پاشاندا ڕێ بەندکرا لە بەیت، لەسەری واجبە چی بۆ هەڵسوڕا لە قوربانی سەری ببڕێ، مەڕو لەمەڕ گەورەتر.

جا ئەگەر ئەوە حەجی فەرز بوو، ئەبێ بیگێڕێتەوە. بەڵام ئەگەر حەجێك بوو دوای حەجی فەرز چوبوو، گێڕانەوەی لە سەر نی‌یە.

مالیك ووتوویەتی: من پێم گەیشتوە کە پێغەمبەر ﷺ و یارەکانی گەیشتنە حودەیبی‌یە لەوێ قوربانی‌یەکانیان سەربڕی و سەریان تاشی و حەڵاڵ بون لە هەموو شتێك، پێش تەوافی بەیت، وە پێش ئەوەی قوربانی‌یەکان بگات بە بەیت.

پاشان باسی ئەوە نەکراوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمانی دابێ بە کەسێك لە یارەکانی و ئەوانەی لەگەڵیدا بوون کەهیچ بگێڕنەوەو دوبارەی بکەنەوە، وە حودەیبیەش لەدەرەوەی حەرەمە. بوخاری گێڕاویەتی‌یەوە.

شافیعی ووتویەتی: لە کوێ ڕێی لێ گیرا قوربانی‌یەکان لەوێ سەربڕی، قەزاشی لەسەر نیە چونکە خوای گەورە باسی قەزا کردنەوەی نەکردووە.

پاشان ووتویەتی: ئێمە بۆمان دەرکەوتوە ـ لە ئەنجامی ڕێك کەوتنی قسەکانیاندا ـ کە پێغەمبەر ساڵی حودەیبیەیە پیاوانی ناسراوی لەگەڵدا بووە، لەپاشاندا عومرەی قەزایان کردووە جا هەندێ لەوپیاوانە لەمەدینە نەچوون لەگەڵیان، بێ ئەوەی ئیشی پێویستیان هەبێتو هۆیەك هەبێت لەگیانیان و سامانیاندا، جا ئەگەر گێڕانەوە واجب بوایە پێغەمبەر ﷺ نەی ئەهێشت دوا بکەون.

وە ووتوویەتی: بۆیە پێ یان ووتووە عومرەی (قضاء و قضية) لەبەر ئەو ڕێکەوتنەی کە ڕوی دا، لەنێوان پێغەمبەر ﷺ و قورەیشدا کە بۆ ساڵی ئاینده بەجێی بهێنی، نەك لەبەر ئەوەی واجب بوویێت لەسەری ئەو عەمرەیە قەزا بکاتەوە.

**دروستی‌یەتی بەمەرج دانانی موحریم کە عوزری نەخۆشی و شتی تر ئیحرام بشکێنی:**

بەشی زۆری زانایان بۆ ئەوە چوون کە دروستە حاجی کاتێ ئیحرام ئەبەستێ مەرجی ئەوە دابنێ کە توشی نەخۆشی هات ئیحرامەکەی بشکێنێ.

موسلیم لە ئیبنو عەبباسەوە خوایان لێ ڕازی بێت ئەگێڕێتەوە: کە پێغەمبەر ﷺ بە ضوباعەی فەرمووە: ئیحرام ببەستە بۆ حەج کردن، وە مەرجی ئەوە دابنێ کە لە کوێ ڕێ بەند کرای خۆت بکەیتەوە.

جا ئەگەر کەسێك ڕێی لێ گیرا بەهۆیەك لە هۆیەکانی نەخۆشیو شتی تر، ئەگەر ئەو مەرجەی دانابوو بۆی هەیە ئیحرام بشکێنی بێ ئەوەی خوێن یا ڕۆژوی بێتە سەر.

## داپۆشینی کەعبە

خەڵکی لەسەر دەمی نەفامیدا کەعبەیان دادەپۆشی، هەتا کاتی ئیسلامیش هات داپۆشینەکەی سابت کرد.

واقیدی ئەگێڕێتەوە لە ئیسماعیلی کوڕی ئیبراهیمی ئەبی حەبیبەوە لە باوکیەوە کە ووتوویەتی: لە سەردەمی جاهیلیدا کەعبە بە (الإنطاع) دائەپۆشرا ئەویش ڕاخەرێکە لەوسەردەمەدا لەپێستی سور دروست ئەکرا، لەپاشاندا پێغەمبەر ﷺ بە قوماشی یەمانی دایپۆشی. وە عومەرو عوسمان ڕەزای خوایان لێ بێ بە قوماشی قبطی دایان پۆشی. ئەنجا حەجاج بە پارچەی حەریر دای پۆشی. وە ریوایەت کراوە کە یەکەم کەس کە پۆشاکی کردۆتە بەر کەعبە ئەسعەدی حیمیەری بووە کە ئەویش هۆزی توببەعە.

ئیبنوعومەر ووشترەکانی ئەڕازاندەوە بە قوماشی قبطی و ئەنماط و پۆشاك لەپاشاندا ئەیناردن بۆ کەعبە هەتا لەجیاتی ئەو کەعبەی پێ داپۆشن. مالیك گێڕاویەتی‌یەوە.

هەروەها واقیدی تەخریجی کردوە لە ئیسحاقی کوڕی ئەبی عەبدی کوڕی ئەبی جەعفەر محمدی کوڕی عەلی کە ووتوویەتی: خەڵك قوماشیان ئەبەخشی بە کەعبە کە پێی داپۆشرێ، وە قوربانیان ئەنارد بۆ کەعبەو باریان ئەکرد لە قوماشی یەمەنی تا کەعبەی پێ داپۆشن.

جا کاتێ یەزیدی کوڕی موعاویە هات بە حەریر داپۆشی، وە کاتێ ئیبنوزوبێر هات هەر لەسەر ڕێ و شوێنی ئەو ئەڕۆیشتو ئەینارد بۆلای موصعەبی کوڕی زوبەیر هەموو ساڵێك قوماشی بۆ بنێری بۆ کەعبە کە پێی دابپۆشێ، وە ڕۆژی عاشورا لە هەموو ساڵێك دایئەپۆشی.

سەعیدی کوڕی مەنصور دەری هیناوە کە (عمر) ی کوڕی (خطاب) خوا لێی ڕازی بێت هەموو ساڵێك پۆشاکی کەعبەی دائەماڵی پارچەی پارچە ئەکرد و دابەشی ئەکرد بەسەر حاجیەکاندا بۆ ئەوەی بیکەن بە سێبەر لەسەر داری سەموری لە مەککە.

بۆن خۆشکردنی کەعبە:

لە عائیشەوە خوا لـێی ڕازی بێت هاتوە کە فەرمویەتی: کەعبە بۆن خۆش بکەن، چونکە ئەوەش لە پاك کردنەوەیەتی.

ئیبنوزوبەیر بۆنی خۆشی ئەدا لە هەموو ناو کەعبە. وە هەموو ڕۆژێك ڕەتلێك داری عودی دائەگیرساند لە کەعبەدا، وە ڕۆژانی هەینی دوو ڕتڵی بە کار ئەهێنا بۆ بۆن خۆش کردنی.

قەدەغە کردنی سەرپێچی لە حەرەمدا:

خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿وَمَن يُرِدۡ فِيهِ بِإِلۡحَادِۭ بِظُلۡمٖ نُّذِقۡهُ مِنۡ عَذَابٍ أَلِيمٖ﴾ (الحج/٢٥). واتە: هەرکەس بیەوێ سەرپێچی تێدا بکات بە ستەم سزای توندو بە ئازاری ئەدەین.

ئەبو داود لە موسای کوڕی باذانەوە ئەگێڕێتەوە ووتوویەتی: چوومە لای یەعلای کوڕی ئومەییە ووتی: پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (إحتِكَارُ الطَّعَامِ فِي الحَرَمِ إلحَادٌ فِيهِ), واتە: خواردەمەنی شاردنەوە لە حەرەمدا سەرپێچیەو تێیداو ئیلحادە.

بوخاری لە (التأريخ الكبير) دا ریوایەتی کردوە لە یەعلای کوڕی ئومەییەوە کە گوێی لە عومەری کوڕی (خطاب) بووە ئەی فەرمو: خواردن شاردنەوە لەمەککەدا سەرپێچیە.

ئەحمەد ئەگێڕێتەوە لە ئیبنوعومەرەوە خوا لێیان ڕازی بێت کە چووە بۆ لای ئیبنوزوبەیر کاتێ لە حیجردا دانیشتبوو، فەرمویەتی: ئەی ئیبنوزوبەیر! نەکەی سەرپێچی و ئیلحاد بکەی لە حەرەمی خوای گەورەدا، من شایەتی ئەدەم کە بیستومە لە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (يُحِلُّهَا رَجُلٌ مِن قُرَيش). واتە: پیاوێکی قورەیشی شتی حەرام کراوی حەرەم حەڵاڵ ئەکات و سەرپێچی تێدا ئەکات.

لە ڕیوایەتێکی تردا فەرمورویەتی: (سَيُلحِدُ فِيهِ رَجُلٌ مِن قُرَيش، لَو وُزِنَت ذُنُوبُهُ وَذُنُوبُ الثَّقَلَينِ لَوَزَنَتهَا). واتە: پیاوێکی قورەیش سەرپێچی و ئیلحاد لە حەرەمدا ئەکات، ئەگەر تاوانەکانی بکێشرێت لەگەڵ تاوانەکانی هەموو ئادەمی و پەری هاوکێش ئەبن. جا ئاگات لە خۆت بێت تۆ ئەوە نەبیت.

موجاهید ووتویەتی: تاوان چەند بەرابەر ئەکرێتەوە لە مەککەدا، وەك چۆن چاکە چەند بەرابەر ئەکرێتەوە.

لە ئیمامی ئەحمەد پرسیار کرا ئایا تاوان لە جارێك زیاتر لە سەر خاوەنی ئەنوسرێ؟

ووتی: نەء، ئیللا لە مەککەدا نەبێت، لەبەر گەورەیی شوێنەکەی.

**داگیر کردنی کەعبە:**

بوخاری و موسلیم لە عائیشەوە ڕەزای خوای لەسەر بێت ئەگێڕنەوە کە فەرمویەتی: پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (يَغزُو جَيشٌ الكَعبَةَ، فَإذَا كَانُوا بِبَيدَاءَ مِنَ الأرضِ يُخسَفُ بِأوَّلِهِم وَآخِرِهِم. قُلتُ: يَا رَسُولَ الله! كَيفَ وَفِيهِم أسوَاقُهُم وَمَن لَيسَ مِنهُم؟ قَالَ: يُخسَفُ بِأوَّلِهِم وَآخِرِهِم ثُمَّ يُبعَثُونَ عَلَى نِيَّاتِهِم). واتە: سوپایەك کەعبە (غەزو) داگیر ئەکات، کە گەیشتنە بیابانێك خوا هەموو یان ئەبات بەناخی زەویدا. ئەڵێ ووتم: ئەی نێرراوی خوا! چۆن ئەگەر بازاڕیشیان لەگەڵدا بێت و کۆمەڵێك کە لەوانیش نەبن؟ فەرمووی: خوا هەموویان ئەبا بەناخی زەویدا، دوایی بە پێی نیەتەکانی خۆیان زیندوویان ئەکاتەوە .

**پەسندی‌یەتی بارپەست کردن بۆ سێ مزگەوتەکان**

لە سەعیدی کوڕی موسەییبەوە هاتوە لە ئەبو هورەیرەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ فەرمویەتی : (لاتُشَدُّ الرِّحَالُ إلا إلَى ثَلاثَةِ مَسَاجِدَ: المَسجِدُ الحَرَام، وَمَسجِدِي هَذَا وَالمَسجِدِ الأقصَى) رواه البخاري ومسلم وأبوداود. واتە: بنەو بارگەی سەفەر ناپێچرێتەوە بۆ سێ مزگەوت نەبێت، مزگەوتی حەرام، و ئەم مزگەوتەی من و مزگەوتی ئەقصا.

وە لە زاراوەیەکی تردا هاتوە: (إنَّمَا يُسَافَرُ إلَى ثَلاثَةِ مَسَاجِدَ: مَسجِدِ الكَعبَةِ، وَمَسجِدِي، وَمَسجِدِ إيلِيَا).

لە (أبوذر)ەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتوە فەرمویەتی: ووتم: ئەی نێراوی خوا کام مزگەوتە یەکەم جار لە سەر زەوی دانراوە؟ فەرمووی: (المسجد الحرام). واتە: مزگەوتی حەرام، ووتم: لەپاش ئەو کامە؟ فەرموی: (المسجد الأقصى) مزگەوتی ئەقصا، ئەڵێ: ووتم: چەندە لە نێوانیاندا بووە؟ فەرموی: (أربَعُونَ سَنَةً، ثُمَّ أينَ أدرَكَتكَ الصَّلاةُ بَعدُ، فَصَلِّ فَإنَّ الفَضلَ فِيهِ). واتە: چل ساڵ، ئینجا لەکوێ نوێژ هات نوێژی لێ بکە، چونکە فەزڵ و چاکی لەو شوێنەدایە.

بۆیە سەفەر کردن بۆ ئەم سێ مزگەوتە شەرعیە، چونکە ئەو فەزڵ و تایبەتمەندی‌یەی کە لەم سێ مزگەوتەدا هەیە لە مزگەوتەکانی تردا نیە.

لە جابیرەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (صَلاةٌ فِي مَسجِدِي أفضَلُ مِن ألفِ صَلاةٍ فِيمَا سِوَاهُ، إلا المَسجِدَ الحَرَام، وَصَلاةٌ فِي المَسجِدِ الحَرَام أفضَلُ مِن مِائَةِ ألفِ صَلاة فِيمَا سِوَاهُ)

رواه أحمد وسنده صحيح. واتە: نوێژێك لەم مزگەوتەی مندا لە هەزار نوێژی مزگەوتەکانی تر چاکترە، جگە لە مزگەوتی حەرام، وەنوێژێك لە مزگەوتی حەرامدا لە سەد هەزار نوێژی مزگەوتەکانی تر چاکترە.

لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە هاتوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (مَن صلى فِي مَسجِدِي أربَعِينَ صَلاةً، لاتَفُوتُهُ صَلاةٌ كُتِبَت لَهُ بَرَاءَةٌ مِنَ النَّار، وَبَرَاءَةٌ مِنَ العَذَابِ، وَبرِيءٌ مِنَ النِّفَاقِ) رواه أحمد والطبراني بسند صحيح. واتە: هەرکەس لەم مزگەوتەی مندا چل نوێژ بکات و نوێژێکی نەچێ، ئەوە ڕزگار بونی لە ئاگرو لە سزاو لە دوو ڕوویی بۆ ئەنوسرێ.

وە لە چەند فەرمودەیەکدا هاتووە کە فەزڵی نوێژ لە مزگەوتی بيت المقدس دا زۆرترە لە نوێژی مزگەوتەکانی تر جگە لە مزگەوتی حەرام و مزگەوتی پێغەمبەر ﷺ بە پێنج سەد نوێژ.

**ئادابی چوونە مزگەوتی پێغەمبەرو ئادابی زیارەتی:**

١- پەسەندە چوونە ناو مزگەوتی پێغەمبەر ﷺ بە هێمنی و بە ڕێزەوە بێت، وە بۆنی خۆی خۆش کردبێ، وە خۆی ڕازاندبێتەوە بە چاکترین پۆشاك، وە لەپێشەوە قاچی ڕاستی بخاتە ناو مزگەوتەکەوەو بڵێ: (أعوذُ باللهِ العَظِيمِ، وَبِوَجهِهِ الكَرِيمِ، وَسُلطَانِهِ القَدِيمِ، مِنَ الشَّيطَانِ الرَّجِيمِ، بِسمِ الله، اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ وَآلِهِ وَسَلِّم، اللَّهُمَّ اغفِر لِي ذُنُوبِي، وَافتَح لِي أبوَابَ رَحمَتِكَ).

٢- پەسەندە کە لە پێشەوە بچێتە (روضة)ی پیرۆزو دوو ڕکات نوێژی (تحية المسجد) سلاوی مزگەوت بکات بە ئەدەب و ملکەچیەوە.

٣- کە لە نوێژەکە بووەوە ـ نوێژی سلاوی مزگەوت ـ ڕوبکاتە قەبری پیرۆزی پێغەمبەر ﷺ و ڕووەو گۆڕەکەی بوەستێ و پشتی لە قیبلە بێت، سلاو لە پێغەمبەر ﷺ بکات و بڵێت: (السَّلامُ عَلَيكَ يَا رَسُولَ الله! السَّلامُ عَلَيكَ يَا نَبِيَّ الله! السَّلامُ عَلَيكَ يَا خِيرَةَ خَلقِ الله من خلقه! السَّلامُ عَلَيكَ يَا خَيرَ خَلقِ الله! السَّلامُ عَلَيكَ يَا حَبِيبَ الله! السَّلامُ عَلَيكَ يَا سَيِّدَ المُرسَلِينَ! السَّلامُ عَلَيكَ يَا رَسُولَ رَبِّ العَالَمِينَ! السَّلامُ عَلَيكَ يَا قَائِدَ الغُرِّ المُحَجَّلِينَ! أشهَدُ أن لا إلَهَ إلا الله، وَأشهَدُ أنَّكَ عَبدُهُ وَرَسُولُهُ وَأمِينُهُ وَخِيرَتُهُ من خَلقِه. وَأشهَدُ أنَّكَ قَد بَلَّغتَ الرِّسَالَةَ، وَأدَّيتَ الأمَانَةَ، وَنَصَحتَ الأُمَّةَ، وَجَاهَدتَ فِي اللهِ حَقَّ جِهَادِهِ). واتە: سلاوت لێ بێت ئەی نێرراوی خوا، سلاوت لێ بێت ئەی پێغەمبەری خوا، سلاوت لێ بێت ئەی چاکترین هەڵبژێرراوی ناو دروست کراوەکانی خوا، سلاوت لێ بێت ئەی خۆشەویستی خوا، سلاوت لێ بێت ئەی سەروەری پێغەمبەران، سلاوت لێ بێت ئەی نێرراوی خوای پەروەردگاری جیهانیان، سلاوت لێ بێت ئەی پێشەوای دەست و پێ سپی و نورانیەکان (لە ڕۆژی دواییدا بە هۆی دەست نوێژەوە)، شایەتی ئەدەم جگە لە الله پەرستراوێکی بە حەقی تر نیە، وە شایەتی ئەدەم کە تۆ نێرراوی ئەمین و هەڵبژێرراوی ئەوی لە خەڵکەکەیدا، وە شایەتی ئەدەم کە بە ڕاستی نامەکەی خوات گەیاندو ئەو ڕاسپاردەیەت گەیاندووە کە پێت سپێردراوە و ئامۆژگاری نەتەوەی ئیسلامت کردووەو لەڕێی خوادا بە حەق جیهادت کردووە.

٤- لەپاشاندا نزیکەی باڵێك بێتە دواوە بەلای ڕاستداو سلاو لە ئەبوبەکری صدیق بکات، پاشان باڵێکی تر بێتە دواوەو سلاو لە عومەری فاروق بکات خوا لە هەردوکیان ڕازی بێت.

٥- لە پاشاندا ڕووبکاتە قیبلەو بپارێتەوە بۆ خۆیو خۆشەویستانی و براکانی و هەموو موسڵمانان لەپاشاندا بڕوات.

٦- لەسەر ئەو کەسە پێویستە کە دەنگی بەرز نەکاتەوە ئەوەندە نەبێت کە خۆی ببیستێ، وەلەسەر کاربەدەستان پێویستە بە نەرمی ڕێ لەو کەسانە بگرن کە دەنگ بەرز ئەکەنەوە.

چونکە سابتە کە عومەری کوڕی خطاب خوای لێ ڕازی بێت، دوو پیاوی بینیوە دەنگیان لە مزگەوتی پێغەمبەرا ﷺ بەرز ئەکردەوە فەرمووی: ئەگەر بزانیبایە خەڵکی ئێرەن تێر لێم ئەدان.

٧- دور بکەوێتەوە لە دەست هێنان بە ژوورەکەیدا –واتە: قەبرەکە- و ماچ کردنی. چونکە ئەمانە شتێکن کە پێغەمبەر ﷺ خۆی قەدەغەی کردوون.

ئەبو داوود لە ئەبی هورەیرەوە ئەگێڕێتەوە خوا لێی ڕازی بێت کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (لا تَجعَلُوا بُيُوتَكُم قُبُوراً، وَلا تجعَلُوا قَبرِي عِيداً، وَصَلُّوا عَلَيَّ فَإنَّ صَلاتَكُم تَبلُغُنِي حَيثُ كُنتُم). واتە: ماڵەکانتان مەکەنە گۆڕستان و گۆڕەکەم مەکەنە عیبادەتگا و بۆی بێن، وە صلاواتم لەسەر بدەن چونکە صلاواتەکانتان پێم ئەگات لە هەرکوێ بن.

عەبدوڵلای کوڕی حەسەن پیاوێکی بینی زۆر ئەچووە سەر گۆڕی پێغەمبەر ﷺ بۆ پاڕانەوە، پێی ووت: لەگەڵ تۆمە! پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (لاتَتَّخِذُوا قَبرِي عِيداً، وَصَلُّوا عَلَيَّ حَيثُمَا كُنتُم، فَإنَّ صَلاتَكُم تَبلُغُنِي). واتە: گۆڕەکەم مەکەنە عیبادەتگا، ولە هەرکوێ بوون صلاواتم لەسەر بدەن، چونکە صەلاواتەکانتانم پێ ئەگات.

جا هەی پیاو تۆو ئەوەی کە لە ئەندەلوسە وەك یەکن لەو بارەیەوە (واتە لە سلاوات ناردن و گەیشتنی بە پێغەمبەر ﷺ).

**پەسەندی‌یەتی خوا پەرستی زۆر لە (روضة)ی پیرۆزدا:**

بوخاری لە ئەبوهورەیرەوە ئەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (مَا بَينَ بَيتِي وَمِنبَرِي رَوضَةٌ مِن رِيَاضِ الجَنَّة، وَمِنبَرِي على حَوضِي). واتە: نێوان ماڵەکەم و دوانگەکەم باخچەیەکە لە باخچەکانی بەهەشت، و دوانگەکەم لە سەر حەوزەکەمە.

**پەسەندی‌یەتی چوون بۆ مزگەوتی قوباو نوێژ تێدا کردنی :**

چونکە پێغەمبەر ﷺ هەموو ڕۆژانی شەممەیەك بسواری یا بەپێ ئەچوو بۆ قوباو دووڕکات نوێژی تێدا ئەکرد.

پێغەمبەر ﷺ هاتی یارەکانی ئەدا بۆ ئەوەو ئەی فەرموو: (مَن تَطَهَّرَ فِي بَيتِهِ، ثُمَّ أتى مَسجِدَ قُبَاء، فصلى فِيهِ صَلاةً، كَانَ لَهُ كأجرِ عُمرَةٍ) رواه أحمد، والنسائي، وابن ماجة، والحاكم، وقال: صحيح الإسناد. واتە: هەرکەس لە ماڵی خۆیەوە دەست نوێژ بگرێ و لەپاشاندا بچێ بۆ مزگەوتی قوباو نوێژێکی تێدا بکات پاداشتی عومرەیەکی هەیە بۆی.

## فەزیلەتەکانی شاری مەدینە

بوخاری لە ئەبی هورەیرەوە ئەگێڕێتەوە خوا لێی ڕازی بێت کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (إنَّ الإيمَانَ لَيَأرِزُ إلى المَدِينَةِ كَمَا تَأرِزُ الحَيَّةُ إلى جُحرِهَا). واتە: باوەڕ پۆنگ ئەخواتەوەو کۆدەبێتەوە لە مەدینەدا، وەك چۆن مار یەك دێتەوەو کۆ ئەبێتەوە لە کونەکەیدا.

طبرانی لە ئەبی هورەیرەوە ئەگێڕێتەوە بە ئیسنادێك کە خراپ نیە: پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (المَدِينَةُ قُبَّةُ الإسلامِ، وَدَارُ الإيمَانِ، وَأرضُ الهِجرَةِ، وَمَثوى الحَلالِ والحَرَامِ). واتە: مەدینە گومەزی ئیسلام، و خانەی باوەڕ، و زەوی کۆچ بۆ کراوەو شوێنی جیا کردنەوەی حەڵاڵ و حەرامە.

لە عومەرەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتوە فەرمویەتی: گرانی داکەوت و خەڵك برسی بوون لە مەدینە. پێغەمبەر ﷺ فەرموی: (إصبِرُوا وَأبشِرُوا فَإنِّي قَد بَارَكتُ على صَاعِكُم وَمُدِّكُم، وَكُلُوا وَلا تَتَفَرَّقُوا، فَإنَّ طَعَامَ الوَاحِدِ يَكفِي الإثنَينِ، وَطَعَامَ الإثنَينِ يَكفِي الأربَعَةَ، وَطَعَامَ الأربَعَةِ يَكفِي الخَمسَةَ وَالسِّتَّةَ، وَإنَّ البَرَكَةَ فِي الجَمَاعَةِ، مَن صَبَرَ على لأوائِهَا وَشِدَّتِهَا، كُنتُ لَهُ شَفِيعاً وَشَهِيداً يَومَ القِيَامَةِ، وَمَن خَرَجَ عَنهَا، رَغبَةً عَمَّا فِيهَا أبدَلَ اللهُ بِهِ مَن هُوَ خَيرٌ مِنهُ فِيهَا، وَمَن أرَادَهَا بِسُوءٍ أذَابَهُ اللهُ كَمَا يَذُوبُ المِلحُ فِي المَاءِ). رواه البزار بسند جيد. واتە: ئارام بگرن، و مژدەی خۆشی بدەن، چونکە من داوای گەشە کردن و زیاد کردنم کردووە بۆ صاع و موودەکەتان، و بخۆن و لە یەك جیا مەبنەوە، چونکە خواردنی کەسێك بەشی دوو کەس ئەکات، وە خواردنی دووکەس بەشی چوار کەس ئەکات، وە خواردنی چوار کەس بەشی پێنج و شەش کەس ئەکات، وە بەڕاستی پیرۆزی و گەشەکردن لە کۆمەڵ و جەماعەتدایە، هەرکەس ئارام بگرێ لە سەر ناخۆشی و نەهاتی شاری مەدینە، ڕۆژی دوایی ئەبە شایەتی و تکاکار بۆی، وە هەرکەس بەجێی بهێڵێ لەبەر ئەوەی توشی بووە و پشتی تێ بکات، خوا لەجێی ئەو کەسێکی چاکتر لەوێدا دائەنێ. وە هەرکەس نیازی خراپەی پێ هەبێ خوا ئەیتوێنێتەوە وەك چۆن خوێ لە ئاودا دەتوێتەوە.

## فەزڵی مردن لە مەدینەدا

(طبراني) بە ئیسنادێکی حەسەن ئەگێڕێتەوە لە ئافرەتێکی هەتیوەوە کە لای پێغەمبەر ﷺ بووە لە هۆزی (ثقيف)، پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (مَنِ استَطَاعَ مِنكُم أن يَمُوتَ بِالمَدِينَةِ فَليَمُت، فَإنَّهُ مَن

مَاتَ بِهَا كُنتُ لَهُ شَهِيداً، أو شَفِيعاً يَومَ القِيَامَةِ). واتە: هەركەس لە ئێوە ئەتوانێ لە مەدینەدا بمرێ با لەوێ بمرێ، چونکە هەرکەس لەمەدینەدا بمرێ من ئەبمە تکاکاری لە ڕۆژی دواییدا.

وە لەبەر ئەوە بوو عومەر خوا لێی ڕازی بێت داوای لە پەروەردگاری ئەکرد کە لە مەدینەدا بمرێت.

بوخاری ئەگێڕێتەوە لە زەیدی کوڕی ئەسلەمەوە لە باوکییەوە کە عومەر ئەیفەرمو: (اللَّهُمَّ ارزُقنِي شَهَادَةً فِي سَبِيلِكَ، وَاجعَل مَوتِي فِي حَرَمِ رَسُولِكَ ﷺ). واتە: خوایە شەهادەتم بکەی بە نسیب و مردنەکەشم لە حەرەمی پێغەمبەرەکەتدا بێت ﷺ.

# (الزواج) ژن هێنان و مێرد کردن

ژن هێنان‌و مێرد کردن: سوننەتێکە لە سونەتەکانی خوای گەورە لە دروست کردن و پێك هێناندا، کە ئەمەش کارێکی گشتی ڕێك‌و ڕەوانە کەس لە جیهانی ئادەمیزادو ئاژەڵ‌و ڕووەك تیێ دا لای نەداوە.

خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَمِنْ كُلِّ شَيْءٍ خَلَقْنَا زَوْجَيْنِ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ﴾ (الذاريات:٤٩)

واتە: وە لە هەموو شتێك لەجینسی بونەوەرەکان دوو جۆری جیاوازمان درووست کردووە هەتا بیر بکەنەوە لەدەسەڵاتی خواو پەند وەربگرن. وە هەروەها ئەفەرموێ: ﴿سُبْحَانَ الَّذِي خَلَقَ الْأَزْوَاجَ كُلَّهَا مِمَّا تُنْبِتُ الْأَرْضُ وَمِنْ أَنْفُسِهِمْ وَمِمَّا لا يَعْلَمُونَ﴾ (يس:٣٦)

واتە: پاکی و پیێ گەردی بۆ ئەو خوایەی نێرو مێ‌کانی هەموو دروست کردووە لەو شتانەی لەزەویدا ئەڕوێت و لە خۆیان و لە شتێك کە نایزانن هەر خوا ئەیزانێ.

ئەمەش شێوەیەکە خوای گەورە هەڵی بژاردووە بۆ زۆربوون‌و منداڵ پەیداکردن، وە بۆ بەردەوامی ژیانی سەرزەوی دوای ئەوەی کە هەردوو جوتەکەی ئامادەکردووە بۆ ئەوە، بەشێوەیەك هەر یەکەیان هەڵسێ بەکاری ڕێکوپێکی خۆی بۆ بەدیهێنانی ئەو مەبەستە. خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُمْ مِنْ ذَكَرٍ وَأُنْثَى﴾ (الحجرات: من الآية١٣).

واتە: ئەی خەڵکینە ئێمە ئێوەمان دروست کردووە لە نێرومێ‌یەك کە ئادەم و حەوایە.

وە هەروەها دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُمْ مِنْ نَفْسٍ وَاحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالاً كَثِيراً وَنِسَاءً﴾ (النساء: من الآية١).

واتە: ئەی خەڵکینە لەو پەروەردگارەتان بترسن کە دروستی کردون لە گیانێك کەئادەمە وە تاکەکەی تری لێ دروست کردووە کە حەووایە، وە لەو دوانە لە سەرتاسەری زەوی دا پیاوان و ژنانی زۆری خستۆتەوە.

وە خوا نەی ویستووە ئادەمیزاد وەك بەشەکانی تری جیهانیان وەها لێ بکات ئارەزوی بەرەڵا بێت بەبێ ئەوەی هەست بە هیچ لێ پرسینەوەیەك بکات وە وای لێ بکات نێرو مێ کانی جووت بن بە شێوەیەکی هەرەمەکی‌و بێ یاسا. بەڵکو یاسایەکی لەواوی داناوە بۆ گەورەیی ئادەمیزاد کە بەهۆی ئەو یاسایەوە شەرەفو کەرامەتی خۆی پارێزگاری بکات، جا وای لێکردووە کەجووت بوونی نێرو مێ‌ی ئادەمی جووت بونێکی پیرۆزبێت لەسەر بناغەی ڕەزامەندی هەردوکیان دامەزرابێت وە

لەسەر (إیجاب و قبول) پێویستو وەرگرتن وەك و دوو ڕواڵەتی ئەو ڕەزامەندییە، وە لەسەر شایەت گرتن واتە: ئامادەبوونی خەلکی بەوەی کە هەر یەکەیان هی ئەوی ترە.

بەم شێوەیە بۆ غەریزەی ئارەزوو ڕێگایەکی ئەمینی داناو بنەچەی ئادەمی لە لەناوچوون پاراست، وە ئافرەتی پاراست کە ببێتە لەوەڕگەیەکی ڕەوا بۆ هەموو ئارەزوو بازێك کەبۆیەوێ هەرکاتێ بیخوات بیخوات.

وە هەروەها ناوکی خێزانی دانا ئەو خێزانەی کە غەریزەی دایکایەتی چواردەوری دابێتو سۆزی باوکایەتی سەرپەستی بکات, جا بەوە نەشونمایەکی پاك ئەکاتو بەرە پرسوودەکەی ئەدات، ئەو یاسایەشە خوای گەورە ڕازییە پێیو ئیسلامیشی لەسەر هێشتۆتەوە, وە هەرچی یاسای تر هەیەلەو بارەیەوە سڕیویەتیەوە.

**ئەو جۆرە نیکاحانەی کە ئیسلام لەناوی بردوون**

لەوانە: هێنانی دۆست (الخدن) ئەیان ووت: ئەوەی نادیارە قەیناکات، وە ئەوەی ئاشکرایە ئەوە لۆمە ئەکرێ، ئەمەش خوای گەورە باسیان ئەکات وە ئەفەرموێ: ﴿وَلَا مُتَّخِذَاتِ أَخْدَانٍ﴾ (النساء: من الآية٢٥)

واتە: ئەوانەیان نا کە دۆستیان گرتووە.

وە هێنان بە گۆڕینەوە: ئەویش ئەوە بووە کە پیاو بەپیاوی ئەووت واز لە ژنەکەی خۆت بهێنە بۆم منیش واز لە ژنکەم ئەهێنم بۆتو باقیت ئەدەمەوە.

وە خاتو عائیشە جگە لەم دوو جۆرە باسی هی تری کردووە ئەفەرموێت: نیکاح و خواستن لەسەر چوار جۆر بووە:

١- ژن هێنان لەسەر ئەم شێوەیەی ئێستا: پیاو ئەچوو داوای کچی کابرایەکی یان خزمێکی ئەکرد، مارەیی ئەدایە لە پاشاندا مارەی ئەکرد.

٢- وە شێوەیەکی تر لە ژن هێنان: پیاو بە ژنەکەی ئەوت کاتێ پاك ئەبوەوە لە بێ نوێژی بچۆ بۆلای فلانەکەس لەگەلیا جووت ببە بۆ ئەوەی منالێکیان ببێ وەك ئەو پیاوە ڕەسەن بێت، ئیتر ئەو پیاوە ماوەیەك لێی دوور ئەکەوتەوە هەتا سکی پڕ ئەبوو، کە دەرکەوت سکی پڕە لە کابرا، ئیتر ئەگەر حەزی بکردایە ئەچۆوە بۆلای، وە بۆیە ئەم کارەی ئەکرد لەبەر منالی نەژاد زادە. وە بەم نیکاحە ئەوترا (الإستبضاع).

٣- شێوەیەکی تر: کۆمەڵێك کەمتر لە دەکەس هەموویان کۆ ئەبوونەوەو ئەچوونە لای ژنێك. جا ئەگەر سکی پڕ ببوایەو, منداڵەکەی ببوایەو, چەند شەوێکی بەسەردا بڕۆیشتایە، ئەی‌نارد

بەدوایاندا کەسیشیان نەی ئەتوانی نەچێت، کاتێ هەموویان لای کۆ ئەبوونەوە پێی ئەووتن: خۆتان ئەزانن چیتان کردووە, ئەواسکم پڕ بووەو منداڵێکم بووە, فلانەکەس ئەوە منداڵی تۆیە، جا ناوی کێی حەز لێ بکردایە ناوی ئەوەی ئەهێناو منداڵەکەی ئەدایە پاڵی. پیاوەکەش نەیئەتوانی قبوڵی نەکات.

٤- وەشێوەی چوارەم: خەڵکێکی زۆر کۆ ئەبوونەوەو ئەچوونە لای ژنێكو ئافرەتەکەش ڕێی لە کەس نە ئەگرت ـ ئەمانەش زیناکەر بوون﴾ لەبەر دەرگاکانیاندا ئالآیەکیان ئەچەقاند بۆ ئەوە نیشانە بێت، هەرکەس بیوستایە ئەچووە لایان کاتێ یەکێکیان سکی پڕ ببوایەو منداڵی بوایە کۆ ئەبوونەوە لای، سەرناسیان بانگ ئەکردو ئەیان دا بەسەر یەکێکیاندا، ئیتر پێوەی ئەنوساو ئەبویە منداڵی و ئەویش ڕێگری لەوە نەئەکرد.

کاتێ خوای گەورە محمدی نارد (ﷺ) بە حەق سەرجەم ئەو نیکاحانەی سەردەمی جاهیلی نەهێشت و ڕوخاندی، ئیللا ئەو نیکاحەی ئەمڕۆ نەبێت کە خەڵکی لەسەرە.

وە ئەو یاسایەی ئیسلام هێشتیەوە جێبەجێ نابێت هەتا پایەکانی کە (إیجاب و قبول) کردنە نەیەتە جێ، وە هەروەها هەتاوەکو شایەت نەبێت لەسەری نایاتە جێ[1].

وە بەوە پەیمانی نێوان ئەبەستێ ئەو پەیمانەی ئەبێتە هۆی ڕەوابوونی خۆشی وەرگرتنی ژنو مێرد لە یەك بەو شێوەیەی خوا داینـاوە. وە هەر بەو پەیمانە ئەو مافو ئەرکانە ئەچەسپێ کە لەسەر هەریەکەیان پێویستە.

## هاندان لەسەر ژن هێنان و مێرد کردن

ئیسلام زۆر هانی خەڵکی داوە بۆ ژن هێنان و شووکردن بە چەندین شێوازی جۆراو جۆر.

جاری وا هەیە وا باس ئەکات کە ئەمە ڕەوشتی پێغەمبەرانو ڕێنماییانە کە ئەوانیش پێشەوایانێکن ئەبێ چاویان لێ بکرێ, خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلاً مِنْ قَبْلِكَ وَجَعَلْنَا لَهُمْ أَزْوَاجاً وَذُرِّيَّةً﴾ (الرعد: من الآية ٣٨)

واتە: بە راستی ئێمە پێش تۆ چەند پێغەمبەرمان ناردووە، وە خێزان و منڵ و نەوەشمان پێ داون.

وە لە حەدیسی (ترمذی) دا هاتوە لە ئەبی ئەیوبەوە خوای لێی رازی بێت کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (أربع من سنن المرسلين: الحناء، والتعطر، والسواك، والنكاح)[1].

---

(١) البخاري (٥١٢٧).

واته: چوارشت له ڕەفتاری پێغەمبەرانە: بەکارهێنانی خەنە, خۆبۆن خۆش کردنو سیواك کردنو ژن هێنان.

وه جاری وا هەیە باسی ئەکا له ڕووی ئەوەوە که خوا چاکەی لەگەڵ کردوون و نیعمەتی پێ داون وەك ئەفەرموێ: ﴿وَاللَّهُ جَعَلَ لَكُمْ مِنْ أَنْفُسِكُمْ أَزْوَاجاً وَجَعَلَ لَكُمْ مِنْ أَزْوَاجِكُمْ بَنِينَ وَحَفَدَةً وَرَزَقَكُمْ مِنَ الطَّيِّبَاتِ﴾ (النحل: من الآية٧٢).

واته: خوا له جینسی خۆتان خێزانی بۆ داناون وه لەو خێزانانە کوڕو کوڕەزای بۆ دروست کردون وه ڕۆزی دوان له شته پوختەکان.

وه جاری واهەیە به نیشانەیەك له نیشانەکانی خوا باسی ئەکاتو ئەفەرموێ: ﴿وَمِنْ آيَاتِهِ أَنْ خَلَقَ لَكُمْ مِنْ أَنْفُسِكُمْ أَزْوَاجاً لِتَسْكُنُوا إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُمْ مَوَدَّةً وَرَحْمَةً إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآياتٍ لِقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ﴾ (الروم:٢١).

واته: وه له نیشانەکانی خوا ئەوەیە که له جینسی خۆتان خێزانی بۆ ئێوه دروست کرد تا لەلای ئەوان ئارام بگرن وه خۆشەویستیو ڕەحمەتی خستۆته نێوانتان, به ڕاستی لەمەدا گەلێك نیشانه هەیە بۆ تاقمێ که بیر دەکەنەوه.

وه ڕەنگە مرۆڤ دوو دڵ بێت له ژن هێنان، وه خۆی بگرێتەوه لێی له ترسی هەڵسان به (تکاليف) ئەرك و ناڕەحەتی‌یەکانی، وه لەبەر ڕاکردن له هەڵگرتنی قورسایی‌یەکانی.

جا ئیسلام سەرنجی ڕاتەکێشی بۆ ئەوەی که خوا ژن هێنان ئەکات به ڕێگای دەوڵەمەندی، و بار گرانی هەژاری لەسەر لا ئەبات‌و هێزی وەهای پێ ئەدا که توانای سەرکەوتنی هەبێ بەسەر هۆیەکانی هەژاری‌دا خوای گەوره ئەفەرموێ: ﴿وَأَنْكِحُوا الْأَيَامَى مِنْكُمْ وَالصَّالِحِينَ مِنْ عِبَادِكُمْ وَإِمَائِكُمْ إِنْ يَكُونُوا فُقَرَاءَ يُغْنِهِمُ اللَّهُ مِنْ فَضْلِهِ وَاللَّهُ وَاسِعٌ عَلِيمٌ﴾ (النور:٣٢).

واته: وه بۆ پیاوانی بێ ژن، ژن بخوازن و ژنانی بێ‌مێردیش بەمێرد بدەن، وه هەروەها بۆ غوڵامان و کەنیزانی خۆڕەوشت چاکیش ژن بهێنن و بیان دەن به شو، وه بیر له دەست کورتیان مەکەنەوه چونکه ئەگەر فەقیر و هەژار و دەست کورت بن خوا له فەزڵی خۆی بێ‌نیاز و دەوڵەمەندیان ئەکات وه خوا واسیع و زانایه.

---

(١) ئەم حەدیسە (ضعیف)ە، ئەحمەد (٥/٤٢١) و (ترمذي) (١٠٨٠) گێڕاویانەتەوه، بڕوانه (ضعيف السنن الترمذي ١٠٨٠) و (إرواء الغليل ٧٥) و (المشكاة ٣٨٢).

وه له حەدیسی (ترمذي) دا هاتووه له ئەبی هورەیرە کـه پێغەمبـەر ﷺ فەرمویـەتی: (ثلاثـة حق على الله عونهم: المجهاد في سبيل الله، والمكاتب الذي يريد الأداء، والناكح الذي يريد العفاف)

واته:سێ جۆر کەس حەقه خوا یارمەتیان بدات: جیهادکەر له ڕێی خواداو ئەو بەندەیەی نامەی پێ دراوه له لایەن خاوەنەکەی بۆ ئەوەی خۆی ئازاد بکات و ئەیەوێ نرخەکەی بدات، و ئەوکەسەی ژن ئەهێنێ لەبەر داوێن پاکی.

وه ژن چاکترین زێڕو گەنجینەیه که ئەچێته ناو سەرمایەی پیاوەوه. (ترمذي) و ئیبنو ماجه له سەوبانەوه ئەگێڕنەوه خوا لێی ڕازی بێت که دەفەرموێت: کاتێ ﴿وَالَّذِينَ يَكْنِزُونَ الذَّهَبَ وَالْفِضَّةَ وَلا يُنْفِقُونَهَا فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَبَشِّرْهُمْ بِعَذَابٍ أَلِيمٍ﴾ (التوبة: من الآية٣٤).

واته ئەوانەی زێڕوزیو کۆ ئەکەنەوەو له ڕێی خوادا نایبەخشن مژدەی سزایەکی توندیانن بدەرێ. ئەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەردا بووین ﷺ له یەکێ لە سەفەرەکانیدا, هەندێ ئەیان ووت: ئەم ئایەته دەربارەی زێڕو زیو هاتۆته خوارەوه, ئەگەر ئەمانزانی کام ماڵه خێری تیایه کۆمان ئەکردەوه؟ ئەویش فەرموی : (لسان ذاكر، وقلب شاكر، وزوجة مؤمنة تعينه على إيمانه)[1].

واته: زمانێکی پاراو به یادی خوا، وه دڵێکی سوپاس گوزاری خوا، وه ژنێکی موسڵمان یارمەتی دەریێت لەسەر باوەڕەی.

وه (طبراني) بـه سەنەدێکی باش دەگێڕێتەوه له ئیبوعەبباسەوه خوا لێیان ڕازی بێت: که پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (أربع من أصابهن فقد أعطي الدنيا والآخرة: قلباً شاكراً, ولساناً ذاكراً، وبدناً على البلاء صابرا، وزوجة لا تبغيه حوباً في نفسها وماله)[2].

واته: هەرکەس چوارشتی هەبوو ئەوه خێری دونیاو ئاخیرەتی دراوەتێ: دڵێکی شوکرانه بژێر، زمانێکی پاراو بەیادی خوا, لاشەیەکی به ئارام لەسەر بەڵا ، وه ژنێك که نایەوێت سەبارەت به نەفسی خۆیو ماڵی مێردەکەی تووشی گوناح ببێ.

وه موسلیم ئەگێڕێتەوه له عبدالله ی کوڕی عەمری‌کوڕی عاصەوه: که پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (الدنيا متاع، وخير متاعها المرأة الصالحة)[3].

---

(١) أحمد (٥/٢٨٢) و (الترمذي) (٣٠٩٤) وابن ماجه (١٨٥٦) وه حەدیسەکه صەحیحه، بڕوانه (صحيح الترمذي) و (صحيح سنن ابن ماجة ١٨٥٦).

(٢) الطبراني مجمع الزوائد (٤/٢٧٣).

(٣) مسلم (١٤٦٧).

واته: دونیا کەلوپەلە چاکترین کەلوپەلیش ژنێك چاکی بۆخوا صولَحاوه.

جاری وا هەیە دێت بە ئەندێشەی مرۆڤدا لە ساتێك لـە ساتەکانی بێـداری ڕۆحـی یـا، کـە دوور بکەوێتەوەو دابڕێ لە هەموو کارو باری دونیایی جا شەوانە نوێژ بکات و ڕۆژان بـەڕۆژو بێت و واز لە ژنان بهێنێت و لەسەر ڕێگەی راهیبەکان بڕوات کـە دووره لـە سروشـتی مرۆڤایەتیـیەوه. بـەلاَم ئیسلام فێری ئەکات کە ئەوه پێـچەوانەی سروشـتییـەتی و پێـچەوانەی ئاینەکەیـەتی, وه سـەروەری پێغەمبەران ﷺ ـ کە ئەو لە خواترس ترین کەس بووه ـ بەڕۆژووش ئەبوو بەڕۆژووش نەئەبوو نوێـژی ئەکردو ئەنوستو ژنی ئەهێنا ـ جا هەر کەس هەولْ بدات لەڕێو شوێـنی ئـەو دەربـچێت ئـەوه پلـەو پایەی ئەوەی نییە کە لە ئەتەوەی ئەو بێت.

بوخاری و مسلم ئەگێڕنەوه لە ئەنەسەوه خوایان لێی ڕازی بێت کە فەرموویەتی: سێکەس هاتن بۆ مـالّی خێزانەکانی پێغەمبەر ﷺ پرسـیاریان کـرد دەربـارەی چـۆنیـەتی خواپەرسـتی پێغەمبـەر ﷺ، کاتێ پێیان ڕاگەیاندرا- وەك بلێی بەلایەنەوه کەم بوو- وتیان: ئێمە لەکوێو پێغەمبەر ﷺ لە کوێ کە خوا لە گوناهی سـەرەتاو کۆتایی خۆش بـووه. یـەکێکیان ووتـی: مـن بەشـەو هەمیـشە شەونوێژ ئەکەم و ناخەوم هەرگیز یەکێکی تریان ووتی: منیش بەدرێژایی سالْ بـەڕۆژ بـەڕۆژوو ئـەبم ئەوی تریان ووتی: من لە ژن دوور ئەکەومەوه هەرگیز ژن ناهێنم. پێغەمبەر ﷺ هـاتو فـەرمووی: ئێوەن ووتوتانە وا ئەکەین و وا ئەکەین؟ سوێند بە خوا من لـە هـەمووتان زیـاتر لـە خـوا ئەترسـم، لەگەلْ ئەوەشدا بەڕۆژوئەبم‌و بەڕۆژووش نابم، شەونوێژ ئەکەم و ئەش خەوم، وه ژنیش ئەهێنم، جا هـەر کەس حەز لەڕێوشوێنم نەکاتو لێی لادات لە من نیيە[1].

وه ژنی چاك لێشاوی بەختیاریە ئەو مالّە پڕ ئەکات لە خۆشـیو شـادی و درەخشانەوه. لـە ئـەبو ئومـامەوه خوای لێ ڕازی بێت لە پێغەمبەرەوه ﷺ کە فەرمویەتی: (ما استفاد المؤمن -بعد تقوى الله عزوجل- خيراً له من زوجة صالحة: إن أمرها أطاعته, وإن نظر إليها سرَّته، وإن أقسم عليها أبرَّته، وإن غاب عنها نصحته في نفسها وماله) رواه ابن ماجه[2].

واته: بڕوادار سوودی وەرنەگرتووه لە هیچ شتێکی باش - دوای لە خواترسان- ئەوەندەی خێزانێکی چاك: کاتێ فەرمانی پێ ئەدا گوێڕایەلّی ئەکات، وه کاتێ سەیری ئەکات دلّی خۆش

---

(١) رواه البخاري (٥٠٦٣) و مسلم (١٤٠١).

(٢) إبن ماجه (١٨٥٧) و حەدیسەکە زەعیفە، بڕوانە (ضعيف سنن ابن ماجه٣٦٥) و (مشكاة المصابيح ٣٠٩٥ التحقيق الثاني) و (السلسلة الضعيفة ٤٤٢١).

ئەبێ پێی، وەكاتێ سوێندی بەسەردا بخوات سوێندەكەی ناشكێنێ و ئەیباتە سەر، وە كاتێ لێی دووركەوتەوە خۆی و ماڵی ئەپارێزێ.

وەلە سەعدی كوڕی ئەبی وەققاصەوە خوا لێی ڕازی بێت هاتووە دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (من سعادة ابن آدم ثلاثة، ومن شقاوة ابن آدم ثلاثة: من سعادة ابن آدم: المرأة الصالحة، والمسكن الصالح، والمركب الصالح. ومن شقاوة ابن آدم: المرأة السوء، والمسكن السوء، والمركب السوء) رواه أحمد بسند صحيح.

واتە:سێ شت لە بەختیاری ئادەمیزادە، وە سێ شت لە بەدبەختی مرۆڤە، ئەوەی لە بەختەوەری ئادەمیزادە: ژنی چاك. خانوی چاك. وولاغی چاك. وە ئەوەی لە بەدبەختی ئادەمیزادە: ژنی خراپ. خانوی خراپ. وولاغی خراپ.

وە (طبراني) و بەززاز و حاكم كە بە صەحیحی داناوە گێڕاویانەتەوە.

وە راڤەی ئەم فەرمودەیە لە فەرمودەیەكی تردا هاتووە كە حاكم گێڕاویەتیەوە[1]: پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (ثلاثة من السعادة: المرأة الصالحة، تراها تعجبك، وتغيب فتأمنها على نفسها ومالك، والدابة تكون وطيئة تلحقك بأصحابك، والدار تكون واسعة كثيرة المرافق، وثلاث من الشقاء: المرأة تراها فتسوءك، وتحمل لسانها عليك، وإن غبت عنها لم تأمنها على نفسها ومالك، والدابة تكون قطوفاً فإن ضربتها أتعبتك، وإن تركتها لم تلحقك بأصحابك، والدار تكون ضيقة قليلة المرافق).

واتە: سێ شت لە بەختیاریەوەیە: ژنی چاك كە چاوت پێی ئەكەوێ خۆشحاڵ ئەبیت، وە كاتێ لێی دووربی ئەمینیت لە خۆیو لە ماڵەكەت، وە وولاغی سواری كە گوێ ڕایەڵ و خێراتر بێت، بت گەیەنێت بە هاوەڵەكانت، وە خانویەك كە فراوانو شوێنی زۆر بێت. وە سێ شت لە بەدبەختیە: ژنێك سەیری بكەیت دڵ تەنگ بیت، وە زمانت لێدرێژ بكات. كاتێ لێی دوركەوتیتەوە ئەمین نەبیت لێی لەسەر خۆی و ماڵت، وە وولاغێك كەم ڕۆو تەمەڵ بێت كە لێی

---

(١) (٢/٥٠٩) (٢٧٣١) وە دەفەرموێت صەحیحە لەسەر مەرجی شەیخەین، وە ئیمامی ئەحمەد لە (مسنددا (١/١٦٨) دەیگێڕێتەوە وە لە چەند ڕیوایەتێكی تردا (أربع)ەیە، وە بڕوانە (حلية الأولياء، أبو نعيم ٨/٣٨٨) وە بەززار لە موسنەدەكەیدا (١٤١٢)، وە ئیبنوحیببان لە صەحیحەكەی (٤٠٢١). وە (الخطيب، تأريخ بغداد ١٢/٩٩). وە (طبراني، معجم الكبير ١/٣٢٩). وە بڕوانە (مجمع الزوائد ٤/٢٧٢).

بدەی هەر ماندو ببی، وە ئەگەر وازی لێ بهێنی نات گەیەنێت بە هاوەڵەکانت، وە خانویەك تەسك و کەم شوێن بێت.

ژن هێنان و شوکردن خواپەرستییە ئادەمیزاد بەوە نیوەی ئاینەکەی تەواو ئەکات، وە بە پەروەردگاری خۆی ئەگات بەهۆی ئەوەوە لەسەر چاکترین شێوەی پاکیو بێگەردی. لە ئەنەسەوە خوا لێی ڕازی بێت: کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (من رزقه الله امرأة صالحة فقد أعانه على شطر دينه، فليتق الله في الشطر الباقي) رواه الطبراني والحاكم وقال: صحيح الإسناد[1].

واتە: هەرکەس خوا ژنێکی چاکی پێ بەخشی ئەوە یارمەتی داوە لە نیوەی ئاینەکەیدا، جا با لە نیوەکەی تریدا لە خوا بترسێ.

وە هەر لە پێغەمبەرەوە ﷺ کە فەرمویەتی: (من أراد أن يلقى الله طاهراً مطهراً فليتزوج الحرائر) رواه ابن ماجه وفيه ضعف[2].

واتە: هەرکەس ئەیەوێ بە پاكو بێگەردی بگات بە لیقای خوای گەورە با ژن بهێنێ.

ئیبنو مەسعود دەفەرموێت: ئەگەر لە تەمەنمدا جگە لە دە ڕۆژ زیاتر نەمابێ، وە بش زانم لەدوای ئەوە دەمرم، و توانای ژن هێنانم هەبێت، ئیللا ژن ئەهێنم لە ترسی فیتنە.

## حیکمەتی ژن هێنان و مێرد کردن

وە بۆیە ئیسلام بەو شێوەیە هانی خەڵکی داوە بۆ ژن هێنانو مێرد کردن و خۆشەویستی ئەکات بەلایانەوە، لەبەر ئەو ئەنجام و شوێنەوارە بەسوودانەی کە دائەمەزرێ لەسەری و. ئەگەڕێتەوە بۆ تاکەکەس خۆیو بۆ نەتەوەکەی بە تێکڕایی وە بۆ جۆری مرۆڤایەتی بە گشتی:

١- چونکە بەڕاستی غەریزەی جنس بەهێزترین و توندترین غەریزەیە، هەمیشە پاڵ بە خاوەنییەوە ئەنێت بۆ ئەوەی ڕێگای بدات ئەو غەریزەیە تێر بکات، جا ئەگەر شتێك نەبوو ئەو غەریزەیە تێر بکات ئادەمیزاد تووشی زۆر ناخۆشی و ئاڵۆزی ئەکاتو تووشی خراپ ترین شتی ئەکات.

---

(١) رواه الطبراني في الأوسط. مجمع الزوائد (٤/٢٧٢) والحاكم (٢/١٦١).

(٢) وەك دانەر ئاماژەی بۆ کردووە حەدیسەکە ئیبنوماجە گێڕاویەتییەوە (١٨٦٢) وە حەدیسەکە زەعیفە، بڕوانە (ضعيف سنن ابن ماجه) بە ژمارە (٣٦٧) و (سلسلة الأحاديث الضعيفة ١٤١٧).

وە ژن هێنان و مێردکردنیش باشترین ڕێگای سروشتییە و لـواوترین بـوارە بـۆ تێرکردنـی ئەو غەریزەیە. ئیتر بەوە لاشەی ئادەمیزاد لە ئالۆزی ئارام ئەبێتەوەو دەرون خامۆش ئەبێت ئیتر چاو لە ڕوانینی حەرام وەرئەگێڕێ و، سۆزی دەرون دائەمرکێ بەوەی خوا بۆی حەڵاڵ کردووە.

وە ئا ئەوەیە کە ئەم ئایەتە پیرۆزە ئاماژەی بۆ ئەکات و ئەفـەرموێت: ﴿وَمِـنْ آيَاتِـهِ أَنْ خَلَـقَ لَكُمْ مِنْ أَنْفُسِكُمْ أَزْوَاجاً لِتَسْكُنُوا إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُمْ مَوَدَّةً وَرَحْمَةً إِنَّ فِـي ذَلِـكَ لَآيـاتٍ لِقَـوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ﴾ (الروم:٢١).

واتە وە لە نیشانەکانی خوا ئەوەیە کە لە جینسی خۆتان خێزانی بۆ ئێوە دروسـت کـرد، تـا لە لای ئەوان ئارام بگرن، وە خۆشەویستی و میهرەبـانی خـستۆتە نێوانتـان، بەڕاسـتی لەمـەدا گەلێك نیشانە هەیە بۆ تاقمێ کە بیر دەکەنەوە.

وە لە ئەبی هورەیرەوە خوا لێی ڕازی بێت: کـە پێغەمبـەر ﷺ فەرمویـەتی: (إن المـرأة تقبـل في صورة شيطان، وتدبر في صورة شيطان، فإذا رأى أحدكم من امرأة مايعجبه فليأت أهله، فإن ذلك يردُّ ما في نفسه) رواه مسلم وأبوداود والترمذي[١].

واتە: ئافرەت کە ڕوت تێ ئەکات لە شێوەی شەیتاندایە، وە کـە پـشتت تـێ ئـەکات لـە شـێوەی شەیتاندایە، جا ئەگـەر کەسـێکتان شـتێکی لـە ئافرەتێـك بینـی سـەرنجی ڕاکێـشا، بـا بچێتە لای خێزانەکەی چونکە ئەوە چی لە دەروونیدا بێت لای ئەبات.

٢- ژن هێنان و مێرد کردن باشترین هۆن بۆ پەیدابوونی منداڵو زۆرکردنی نەوەو درێژەدان بـە ڕەوڕەوەی ژیان لەگەڵ پارێزگاریکردنی ئەو نەسەبانەی کە ئیسلام بایەخی پێ ئەدات، وە لەپێـشەوە باسی ئەو فەرمودەیەی پێغەمبـەرمـان کرد ﷺ کە فەرمویەتی: (تزوجوا الودود الولود فإني مكاثر بكم الأنبياء يوم القيامة)[٢].

(١) مسلم (١٤٠٣/٩و١٠) وأبوداود (٢١٥١) والترمذي (١١٥٨).

(٢) ئەم حەدیسە ئەبو داود (٢٠٥٠) و نەسائی (٦/٦٥) و (طبراني) (٢٠/٥٨) لە (المعجم الكبير) دا، هەروەها ئیبنو حیببان لە صەحیحەکەی (٤٠٥٧) و حاکم لە (المستدرك ٢/٥٠٩، ٢٧٣٢) و(البيهقي، السنن الكبرى ٧/٨١) دا گێڕاویانەتەوە بە سەنەدێکی صەحیح، هەروەها شێخ ئەلبانی ڕەحمەتی خوای لێ بێت بڕوانە (إرواء الغليل ١٧٨٤) و (آداب الزفاف ل١٦)و (صحيح سنن النسائي ٣٠٢٦) و (صحيح أبي داود ١٧٨٩).

واتە: ژنی میهرەبان‌و زۆر زازوزێکەر بهێنن چونکە من بە ئێوە خۆم بەزۆرتر ئەزانم و شانازی ئەکەم بەسەر پێغەمبەرەکانی تر لە ڕۆژی دواییدا.

وە لە زۆر کردنی نەوەو وەچە بەرژەوەندی‌یەکی گشتی و قازانجێکی تایبەتی تێدایە کە وای کردووە تومەتەکان زۆر سوور بن لەسەر زۆر کردنی نەوە بە بەخشینی دیاری‌یەکی هاندەرانە بۆ کەسێك نەوەکەی زۆر بووە و ژمارەی خێزانەکەی زیاد کردووە، وە لە کۆنەوە ووتراوە: عیززەت و سەربەرزی بۆ ئەوکەسەیە کە وەچەی زۆرە، وە ئەمەش ڕاستی‌یەکی بەردەوامە شتێك نی‌یە پوچی بکاتەوە و بیگۆڕێت.

ئەحنەفی کوڕی قەیس چووە لای موعاویە- یەزید لەلای دانیشتبوو سەیری ئەکردو دڵی پێ‌ی خۆش بوو- پێ‌ی ووت: ئەی ئەبا بەحر چی ئەڵێیت دەربارەی کوڕ؟ ئەحنەف تێ گەیشت مەبەستی چی‌یە ووتی: ئەوان کۆڵەکەی پشتمان‌و بەری دڵمانن و ڕۆشنایی چاومانن بەوان ئەچین بەگژ دوژمنانماندا، ئەوان جێ‌نشینی ئێمەن، لەبەر ئەوە بۆیان ببە بە زەوی دابین کراوو ئاسمانی (سێبەرکەر)، ئەگەر داوای شتێکیان کرد پێیان ببەخشە، ئەگەر داوای ڕەزامەندی خۆتیان کرد لێیان ڕازی بە، لە بەخشینی خۆت بێ بەشیان مەکە مەبادا لە نزیکیت بێزار بن، و لە ژیانت بێ تاقەت بن، وە حەز لە مردنت بکەن.

فەرمووی: قسەکانت تەواوەو ئەی ئەبابەحر! ئەوان بەو شێوەیەن هەروەك وەسفت کرد[1].

٣- پاشان غەریزەی دایکایەتی‌و باوکایەتی لە سێبەری منداڵی‌تی‌یەوە نەشونما ئەکات و تەواو ئەبێت، وە هەروەها هەستەکانی سۆزو خۆشەویستی و دڵ نەرمی هەر لە منداڵێتی‌یەوە گەشە دەکات، کە ئەمانەش چەند تایبەتمەندی و چاکیەتێن بەبێ ئەوانە مرۆڤایەتی تەواو نابێت.

٤- هەست کردن بە ئەرك و برکی ژن و مێردایەتی و سەرپەرشتی منداڵ پاڵ بە هەستی تاکە فەردەوە ئەنێت بۆ ئامادەبوون و بەخشینی ئەوپەڕی توانا بۆ بەهێز کردنی کۆششەکانی، جا بەمەش ئەرەوات بەرەو کارو پیشە لە پێناوی بەڕێوەبردنی ئەو ئەرکانەو هەڵسان بە واجبی. ئیتر هۆکاری بەرهەم هێنان زۆر دەبێت، وە ئەبێ بە پاڵ نەرێك بۆ دەرهێنانی ئەو سامانەی خوا لە زەوی‌دا دایناوە کە جێ‌ی سوود بەخشینە بە خەڵکی.

---

(١) بڕوانە (الأمالي لأبي علي القالي).

٥- دابەش کردنی کار بەشێوەیەك کە کارو باری ناومالْ پێی ڕێك و پێك ببێت لەلایەکەوە، وە لەلایەکی تریشەوە کاروباری دەرەوەی خێزانی مالێشی پێ ڕێك وپێك ببێت. لەگەڵ دانانی سنوورێك بۆ بەرپرسایەتی هەریەك لە پیاووژن دەربارەی ئەو کارەی پێی سپێردراوە.

ژن هەڵئەسێ بە سەرپەشتی کردنی ماڵ و کاروباری ناوماڵ و پەروەردەکردنی منداڵان و ئامادەکردنی زەمینەیەکی خۆش بۆ پیاو کەتێیدا بحەوێتەوەو کارێك ئەکات کە نارەحەتی یەکەی بڕەوێنێتەوە، لەولاشەوە پیاو هەڵئەسێ بەکاروباری پێویست و ئەوەی کەماڵ و منداڵ پێویستی پێی هەبێت لە سامان و خەرجی یەکانی.

بەو دابەش کردنە ڕێکەو دادوەرانەیە هەریەك لە پیاوو ژن کارو باری سروشتی خۆی بەجێ ئەهێنێ لەسەر باشترین شێوەیەك کە هەم خوا پێی ڕازی بێت و هەم خەڵك سوپاسی بکەن، بەوشێوەیە بەروبوومی پیرۆز ئەدات.

٦- ئەوەی کە (زواج) ژن و مێردایەتی بەرهەمی ئەهێنێ لە پەیوەندی خێزانی و بەهێزکردنی هۆیەکانی خۆشەویستی لە نێوان ئەندامانی خێزاندا وە بەهێزکردنی پەیوەندیە کۆمەڵایەتی یەکان شتێکن کە ئیسلام پشتی ئەگرێ و یارمەتی ئەدات. چونکە بەڕاستی ئەو کۆمەلگایەی کە پەیوەندی خۆشەویستی لە نێوانیاندا هەبێت کۆمەلگایەکی بەهێزو بەختەوەرە.

٧- لە ڕاپۆرتێکی نەتەوە یەکگرتووەکان دا هاتووە کە ڕۆژنامەی (الشعب) بلاوی کردۆتەوە لە ڕۆژی شەمە ٦/٦/١٩٥٩م. ئەوانەی ژنیان هێنانەوەو شوویان کردووە ماوەیەکی درێژتر ئەژین لەوانەی کە ژنیان نەهێناوەو شوویان نەکردووە، جا ئیتر چ ئەوانەی ژن و مێردیان نەکردووە بێوەژن بن یان تەڵاق دراو بن یان لە هەردو جینسەکە بوخچەی نەکراوە بن. وە لە ڕاپۆرتەکەدا هاتووە: خەڵك دەستیان کردووە بە ژن هێنان و شووکردن لە تەمەنی بچوکی لە هەموو جیهاندا، وە بە ڕاستی تەمەنی ئەو ژن و مێردانە درێژترە.

وە نەتەوە یەکگرتووەکان ئەو ڕاپۆرتەیان لەسەر بناغەی ئەو لێکۆڵینەوەو سەرژمێریانە نوسیوە کە لە هەموو لایەکانی جیهاندا کراوە سالی (١٩٥٨)، وە لەسەر ئەو سەرژمێرانەی کە کراون، ڕاپۆرتەکە ووتویەتی: بەڕاستی شتێکی زانراوە کە تێکرای مردن لەناو ئەوانەدا کە ژنیان هێناوەو شوویان کردووە، کەمترە لە تێکرای مردن لەناو ئەوانەدا کە ژنیان نەهێناوەو شوویان نەکردووە، لە تەمەنە جیاجیاکاندا.

وه ووتوویەتی: وه لەسەر ئەوه ئەتوانرێ بووترێ كه ژن هێنانو شووكردن شتێكی بـه كەڵكـه بـۆ تەندروستی ژنو پیاو وەك یەك. هەتا مـەترسی‌یەكانی سك پڕ بوونو منداڵ بوون وەهـا كـەم بۆتـەوه كه هیچ زیان ناگەیەنن به ژیانی نەتەوەكان.

هەروەها ووتوویەتی: كه ناوەندترین تەمەن بۆ هاوسەری له هەموو جیهاندا تەمرۆ ٢٤ سـاڵ بـۆ ژنو ٢٧ ساڵ بۆ پیاوه, ئەمـەش تەمـەنێكه كه كەمتره له ناوەندترین تەمـەنی ژن هێنانی چەندەساڵە.

## حوكمی (زواج) ژن هێنانو شووكردن

ژن هێنانو شووكردنی (واجب):

ژن هێنانو مێردكردن پێویسته لەسەر ئەوەی توانای هەیه و ئـارەزووی لـی‌یـەتی و ئەترسـێ لـه داوێن پیسی. چونكه خۆپاراستنو داوێن پاكی پێویسته لەسەر ئادەمیزاد، جا ئەوەش به ژن هێنانو شوكردن نەبێت دروست نابێت.

(قرطبي) دەفەرموێت: ئەو كەسەی توانای هەیەو دەترسێت زیان به نەفسی و دینی بگات ئەگەر به عازەبی بمێنێتەوه، وه ئەو ترسەی لەسەر لاناچێت به ژن هێنان نەبێت یان به شو كـردن نـەبێت، ئەوه جیاوازی تێدا نی‌یه كه واجبه لەسەری ژن بهێنێـت یـان شـوو بكـات. وه ئەگـەر نەفـسی داوای دەكرد بەڵام نەیـدەتوانی نەفەقـەی ژنەكـه بكێـشێ، ئـەوه ووتەكـەی خـوای گـەوره دەیگرێتـەوه كـه دەفەرموێت: ﴿وَلْيَسْتَعْفِفِ الَّذِينَ لا يَجِدُونَ نِكَاحاً حَتَّى يُغْنِيَهُمُ اللَّهُ مِنْ فَضْلِهِ﴾ (النـور: مـن الآية٣٣) واته: ئەو كەسانەی ئەوەندەیان سامان و ماڵ نی‌یه بۆ ژن هێنان بـا خۆیـان پـاك ڕابگـرن لەوەی كه خوا حەرامی كردووه، هەتا خوا دەوڵەمەندیان ئەكات به میهرەبانی خۆی و ژن هێنانیـان بۆ ئاسان ئەكات.

جا ئەوەی ناتوانێ لەبەر هەژاری ژن بهێنێ با زۆر بەڕۆژو بێت بەپێی ئەوەی كه (جەماعەت), له ئیبنو مەسـعودەوه ئەگێڕنـەوه خـوا لێـی ڕازی بێـت، كـه پێغەمبـەر ﷺ فەرمویـەتی: (يـا معشر الشباب، من استطاع منكم الباءة فليتزوج، فإنه أغض للبصر، وأحـصن للفـرج، ومـن لم يـستطع فعليه بالصوم, فإنه له وجاء)[1].

---

(١) بوخاری (٥٠٦٦) وه موسلیم (١٤٠٠) وه ئەبو داود (٢٠٤٦) وه (ترمذي ١٠٨١) وه نسائی (٦/٥٨).

واتە: ئەی کۆمەڵی لاوان هەرکەس لە ئێوە توانای ژن هێنانی هەیە با ژن بهێنێ، چونکە چاکترە بۆ چاوگرتن لە ڕوانینی حەرامو داوێن پاراستن لە خراپەو گوناه، وە ئەوەی کە ناتوانێ ژن بهێنێ با بەڕۆژو بێت چونکە ڕۆژو دەماری ئارەزوو ئەمرێنێ.

## ژن هێنانی پەسەند (الزواج المستحب):

ئەمما ئەگەر کەسێك توانای هەبوو ژن بێنێ و حەزیشی لێ بوو بەڵام لە خۆی نەئەترسا کە خراپە بکات، ئەوە ژن هێنان بۆ ئەو پەسەندە و باشترە لەوەی خۆی یەك لا بکاتەوە بۆ خواپەرستی، چونکە گۆشەنشینی لە ئیسلامدا نیە. (طبراني) لە سەعدی کوڕی ئەبی وەققاصەوە ئەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (إن الله أبدلنا بالرهبانية، الحنيفية السمحة).

واتە: خوا گۆشە نشینیو دابڕانی بۆ گۆڕین بە ئاینی ڕاستوڕێك و ئاسان.

وە بەیهەقی ئەگێڕێتەوە لە حەدیسی ئەبی ئومامەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (تزوجوا فإني مكاثر بكم الأمم، ولا تكونوا كرهبانية النصارى)[1].

واتە: ژن بهێنن چونکە بە ئێوە خۆم لە نەتەوەکانی تر بە زۆرتر ئەزانم و شانازی ئەکەم، وە وەکو گۆشەنشینەکانی گاور مەبن.

وە عومەر بە ئەبی زەوائیدی ووت:ئەوەی ڕێ لە تۆ ئەگرێ ژن بهێنی یان نەتوانینە یان بەد ڕەوشتی یە.

وە ئیبنوعەبباس دەفەرموێت: خواپەرستی کەس تەواو نابێت هەتا ژن نەهێنێ.

## ژن هێنانی حەرام:

ژن هێنان حەرامە لەسەر کەسێك کە زیان بە ژن بگەیەنێت لە خەرجی کێشان و چونە لادا، لەگەڵ نەبوونی دەسەڵاتی ژن هێنان و ئارەزوی بۆی.

(قرطبي) دەفەرموێت: کاتێ کەسێك زانی توانای بەخێوکردنی ژنی نیە یا مارەیی نیە بیداتێ یا شتێ لە مافەکانی کەلەسەریەتی دەربارەی ژن ناتوانێ بەجێی بهێنێ، دروست نیە بۆی ژن بهێنێ هەتا بۆ ئەو ژنە ڕوون نەکاتەوە، یا هەتا نەزانێ خۆی ئەو توانایانەی تێدا دروست بووە.

وە هەروەها ئەگەر نەخۆشی یەکی هەبوو کە بەرگری لێ ئەکرد لەکاری سەرجێیی، لەسەریەتی بۆ ئەو ئافرەتە ڕوون بکاتەوە بۆ ئەوەی دوایی تەنگو چەڵەمە دروست نەبێت، وە هەروەها دروست

---

(١) رواه البيهقي (٧/٧٨) وە لە سەنەدەکەیدا (محمد)ی کوڕی (ثابت) هەیە کە لاوازە.

نیيه بەوە هەڵی خەڵەتێنێ کە ماڵی زۆری هەیە یا کارێکی باشی هەیە یا شتێکی باش ئەزانی بە درۆ. وە هەروەها لەسەر ئافرەت پێویستە ئەگەر بزانێ خۆی تواناى نیيە بە ئەرکی ژن و میردایەتی هەڵسێ، یا نەخۆشی‌یەکی هەیە رێی خۆشی لێ وەرگرتنی ئەگرێ، لەوانە شێتی و گولی و نەخۆشی ناو فەرج دروست نیيە بیان شارێتەوە و بەو کەسە نەڵێن وەك چۆن لەسەر کەلوپەل فرۆشێك پێویستە عەیبی کەلوپەلەکەی بلێ.

وە هەرکاتێ یەکێ لە ژن‌ومێرد عەیبی ئەوی‌تری بۆ دەرکەوت بۆی هەیە پەشیمان ببێتەوە. ئەگەر عەیبەکە بەژنەکەوە بوو پیاوەکە بۆی دەرکەوت بۆی هەیە پەشیمان بێتەوەو چی داوەتێ مارەیی لێی وەربگرێتەوە.

وەئەگێڕنەوە پێغەمبەر ﷺ ئافرەتێکی بەنی بەیاضەی هێنا سەیری کرد پەڵەیەکی بینی بەناو قەدی‌یەوەیە جا گێڕایەوەو فەرمووی: (دلَّستم علي) واتە: لێتان گۆڕیوم.

وە ڕیوایەتی جیاواز هاتووە لە مالیکەوە دەربارەی ژنی پیاوێ کە توانای نزیکی کردنی نیيە - ئەگەر خۆی خستە بەردەستی پیاوەوە لەپاشاندا بەو هۆیەوە جیاکرایەوە، جا کەرەتێکیان فەرمووی: هەموو مارەیی‌یەکەی بۆ هەیە، وە جارێکی تر فەرمووی: نیوەی مارەیی بۆ هەیە. وەئەمە لەسەر ئەوە بینا کراوە کە خیلافی لەسەرە بە چی شایەنی مارەیی ئەبێت؟ بە خۆ خستنە بەر دەست پیاو یا بە چونە لای؟ لەسەر ئەوەش دوو قسە هەیە: لە دوایدا بەدرێژی باس ئەکرێت.

### ژن هێنانی مکروە:

کەراهەتی هەیە کەسێك ئەرکی ژن‌و مێردایەتی بۆجێ نەیەت لەچونە لاو بەخێوکردن، ژن بهێنێ بە مەرجێ زیانەکە نەکەوێتە سەر ئافرەتەکە. وەك ئەوەی ئەو ژنە دەوڵەمەند بێت و زۆر ڕەغبەتی لە چونە لانەبێت. جا ئەگەر بەو ژن هێنانە لە شتێك لە فەرزەکان ببڕێ یا لە فێربوونی زانست ئەوە کەراهەتەکەی زۆرترە.

### ژن هینانی ڕەوا:

ژن هێنان ڕەوا دەبێت کاتێك کە ڕێگرەکان و هۆکارەکانی پێویست کردن نەبێت.

قەدەغە بوونی خۆ دابڕان لە ژن هێنان و ئەرکەکانی لەبەر خوا پەرستی بۆ کەسێك کە توانای ژن هێنانی هەبێت:

١- له ئیبنوعهبباسهوه هاتوه: پیاوێك هاته لای پێغهمبهر ﷺ بێزاری له بێ ژنی دهربڕی‌و ووتی: ئایا خۆم نهخسێنم؟ فهرمووی: (لیس منا من خصي أو اختصى)[1].

واته:خهسێنهرو خۆ خهسێنهر له ئێمه نیه. (طبراني) گێراویهتیهوه.

٢-سهعدی کوڕی ئهبی وهققاص دهفهرموێت: پێغهمبهر ﷺ ڕێی به عوسمانی کوڕی (مظعون) نهدا خۆی دابڕێ له ژن هێنان. وه دهفهرموێت: ئهگهر ڕێی بدایه خۆمان ئهخساند. بوخاری گێراویهتیهوه[2].

واته ئهگهر ڕێی بدایه ئێمه ئهوهنده زیادهڕهویمان ئهکرد لهوهدا ههتا خۆشمان ئهخساند. (طبري) دهفهرموێت: ئهو خۆدا بڕینهی عوسمانی کوڕی (مظعون) ئهیویست حهرام کردنی ژن و بۆن و ههموو ئهوشتانه بوو که خۆشی لێ وهرئهگیرێ، لهبهر ئهوه دهربارهی ئهوه ئهم ئایهته هاتۆته خوارهوه: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لا تُحَرِّمُوا طَيِّبَاتِ مَا أَحَلَّ اللَّهُ لَكُمْ وَلا تَعْتَدُوا إِنَّ اللَّهَ لا يُحِبُّ الْمُعْتَدِينَ﴾ (المائده:٨٧) .

واته: ئهی ئهوکهسانهی باوهڕتان هێناوه ئهوانهی بۆتان حهلاڵ کراوه لهلایهن خواوه له خواردن و خواردنهوهو ژن هێنان، لهسهر خۆتان حهرام مهکهن‌و زیاد ڕهوی مهکهن, چونکه خوا ئهو جۆره کهسانهی خۆش ناوێ که زیادهڕهوی ئهکهن.

پێش خستنی ژن هێنان بهسهر حهجدا:

ئهگهر کهسێك پێویستی بهژن هێنان بوو ترسی خراپهو گوناه کردنی بوو له نههێنانی ژن، ئهبێ بیخاته پێش حهجی فهرز، بهڵام ئهگهر ترسی نهبوو ئهبێ حهجهکه پێش بخات, ههروهها فهرزه کیفایهتهکان -وهك فێربونی زانست و جیهاد- پێش ژن هێنان ئهخرێن ئهگهر ترسی گوناهی نهبێت.

## ڕوو وهرگێڕان له ژن هێنان‌و هۆیهکانی

بهوانهی پێشودا بۆمان دهردهکهوێت کهژن هێنان پێویستیهك ناتوانرێ وازی لێ بهێنرێ، وه هیچ شتێك ڕێ له ژن هێنان ناگرێ جگه له نهتوانایی و بهدڕهوشتی. وهك پێشهوای باوهڕداران عمر خوا لێی ڕازی بێت فهرمووی، وه ڕاهیبی له ئیسلامدا نیه، وه پشت ههڵکردن له ژن هێنان زۆر سوودو چاکه له دهست مرۆڤ ئهدات.

(١) بڕوانه (مجمع الزوائد) (٤/٢٥٤).

(٢) البخاري (٥٠٧٣).

وه ئەوه بەس بوو بۆ پاڵ نان به کۆمەڵی موسڵمانانەوه کە هەمووکار بکەن بۆ ئامادەکردنی هۆکانیو ئاسان کردنی بابەتەکانی، هەتا ژنو پیاو وەك یەك بە خۆشی بژین بەهۆی ژنو مێردایەتیيەوه. بەڵام بە پێچەوانەی ئەمانەوه زۆر لە خێزانەکان دورن لە یاسای بەرزی فراوانی ئیسلام، ژن هێنانیان قورس و گران کردووەو چەند گیروگرفتێکیان هێناوەته سەر ڕێگای، وه بەوه گرانی وتەنگ و چەڵەمەیەکیان دروست کردوه کە بووەته هۆی ئەوەی زۆر لە ژنانو پیاوان دوچاری ئازارەکانی تەنهاییو موشکیلەو نائومێدیيەکانی ببن، وه هەروەها وەڵام دانەوه بۆ عیلاقاتی بەربەرەڵڵاو پەیوەندیيە ڕیسواو بێ باکەکان. وه دیاردەی گیروگرفتو نالەباری وەزعی ژن هێنان وەك لە شارەکاندا دەرئەکەوێ لە لادێکاندا وەها دەرناکەوێ. چونکە لادێکان هێشتا ژیان تێیدا دووره لە زیادەڕەوی و نالەباری و هۆکانی -جگە لە هەندێ خێزانی دەوڵەمەند نەبێت- کەچی ژیان لە شارەکان دا وەها دەرئەکەوێ کە زۆر گرانو نالەباربێت.

وه بەشی زۆری ئەزمەی ژن هێنان ئەگەڕێتەوه بۆ زیادی مارەییو زۆری خەرجیيەکان کە پیاو ماندوو ئەکات. ئەمە لەلایەکەوه، لە لایەکی ترەوه زیادەڕەوی ژن و دەرچوونی بەم شێوه سەرسوڕهێنەره شك و گومان ئەخاتە ڕێگاکەیەوه بە جۆرێك پیاوی وەهالێ کردووه ناتوانێ هاوسەرێ بۆخۆی هەڵبژێرێ. بەڵكو بەو هۆیەوه زۆر خەڵك مان ئەگرن لە ژن هێنان، چونکە ـ بە بیری خۆی ـ ژنێك نادۆزێتەوه چاك بێت بۆ هەڵگرتنی ژیانی ژنو مێردایەتی.

لەبەر ئەوه پێویستە گەڕانەوه بۆلای ئیسلامو تەعلیماتەکانی بێت لەو شتانەدا کە پەیوەندی هەیە بە پەروەردەکردنی ئافرەتو پێگەیاندنی لەسەر چاکیو داوێن پاکیو خۆ داپۆشین، وه وازهێنان لە مارەیی زۆرو گرانو کەلوپەلی ژن هێنان.

## هەڵبژاردنی خێزان

ژن شوێنی حەوانەوەیە بۆ پیاو هەروەها کێڵگەیەتی، وه هاوبەشی ژیانو پەروەردەکەری ماڵو دایکی منداڵو ئارامگای دڵو شوێنی نهێنیو هیواکانی پیاوه. وه ئەو گرنگترین پایەی خێزانە، چونکە ئەو منداڵ ئەهێنێت، وه لەوەوه زۆر خوو ڕەوشتی جوانو صیفاتی بەرز وەرئەگرێت، وه لە ئامێزی ئەودا سۆزو ئەندێشەکانی منداڵ دروست ئەبێتو هیواو ئاواتەکانی نەشونما ئەکات و فێری زمان ئەبێت، وه زۆر لە خوو ڕەوشتو ئایینو سلوکی کۆمەڵایەتی وەرئەگرێ.

لەبەر ئەوانە ئیسلام زۆر گرنگی داوه بە هەڵبژاردنی خێزانی چاك، وەکردویەتی بە چاکترین کەلوپەلێ کە پێویستە بەپەرۆشەوه بۆی بگەڕێین. چاکیەتیش تەنها ئەوەیە کە پارێزگاری ئاین بکات و دەست بە ڕەوشتە بەرزەکانەوه بگرێو گوێ بداتە مافی ژن و مێردایەتیو پارێزگاری

کردنی منداڵەکانی، ئەمان کە لە کاتی ژن هێناندا ئەبێ چاودێری بکرێ. ئیتر جگە لەمانە لە ڕواڵەتەکانی دونیا، ئەوە لەو شتانەیە کە ئیسلام قەدەغەی کردوون ئەگەر ڕووت بوون لە خێرو فەضل و چاکیەتی.

زۆر کەس چاو ئەبڕێتە ماڵی دونیا یا جوانی زۆر یا پلەو پایەی کۆمەڵایەتی‌و ناوبانگی باو باپیرەو هۆزایەتی پێ ئەوەی گوێ بدەنە تەواوێتی دەروون‌و چاکی پەروەردە. لەم کاتانەدا بەرهەمی ژن‌و مێردایەتی تاڵ ئەبێت وە سەرەنجامێکی خراپی ئەبێ.

لەبەر ئەوەیە پێغەمبەر ﷺ ژن هێنانی لەسەر ئەو شێوەیە قەدەغە کردووەو ئەفەرموێ: (إياكم وخضراءَ الدِّمَنِ, قيل: يا رسول الله وما خضراء الدمن؟ قال: المرأة الحسناء في المنبت السوء).

واتە: پێتان ڕائەگەیەنم دوورکەونەوە لە سەوزەی کەلاوە, ووتیان:ئەی نێرراوی خوا سەوزەی کەلاوە چیە؟ فەرموی: ئافرەتی جوان لە بنەماڵەی خراپ[1].

وە دەفەرموێت: ( لاتزوجوا النساء لحسنهن، فعسى حسنهُنَّ أن يُرديهِنَّ، ولا تزوجوهنَّ لأموالهن، فعسى أموالهن أن تطغيهن, ولكن تزوجوهن على الدين، ولأمة خرماء ذات دين أفضل)[2].

واتە: لەبەر جوانی ژن مەهێنن لەوانەیە ئەو جوانیە ملیان بشکێنێ. وە لەبەر ماڵ‌و سامانیان مەیان هێنن، لەوانەیە سامانەکەیان مل هوڕیان بکات, بەڵکو لەبەر ئاینیان بیان هێنن, ژنێکی لوت سمراوو گوێ بڕاوی بەدین چاکترە.

وە هەروەها ڕای ئەگەیەنێت ئەوەی مەبەستی لە ژن هێنان ئەوە نەبێت کە مەبەستە بنەڕەتیەکەی لەسەر دانراوە لە دروست کردنی خێزان‌و ئاگاداری کاروباری خێزان، ئەوە بەشێوەیەك مامەڵەی لەگەڵ ئەکرێ کە پێچەوانەی مەبەستەکەی بێت وە ئەفەرموێ: (من تزوج امرأة لمالها لم يزده الله إلا فقراً، ومن تزوج امرأة لحسبها لم يزده الله إلا دناءة، ومن تزوج امرأة ليغض بها بصره، ويحصِّن فرجه، أو يصل رحمه، بارك الله له فيها وبارك لها فيه). رواه ابن حبان فى الضعفاء.

---

(١) رواه الدارقطني و قال تفرد به الواقدي وهو ضعيف، والقضاعي في الشهاب (٦٢٢) والرامهرمزي في الأمثال (٨٤).

(٢) (إبن ماجة) (١٨٥٩)ئەم حەدیسە زۆر زەعیفە وەك شێخ ئەلبانی دەفەرموێت. بڕوانە (ضعيف سنن ابن ماجه ٣٦٦ والضعيفة ١٠٦٠).

واته: هەرکەس ئافرەتێك بهێنێ لەبەر سامان‌و ماڵەکەی خوا هەژاری نەبێ هیچی بۆ زیاد ناکات، وە هەرکەس ئافرەتێك بهێنێ لەبەر بنەماڵەو بەرزی، خوا نزمی نەبێ هیچی بۆ زیاد ناکات، وە ئەوەی ژنێك بهێنێ لەبەر ئەوەی چاوی خۆی لە حەرام دوربخاتەوەو داوێن پیس نەبێت یا لەبەر گەیاندنی ڕەحم خوا لە هەردوکیان پیرۆز ئەکات.

مەبەست لەو دورخستنەوەیە لەو جۆرە ژن هێنانە ئەوەیە کە مەبەستی یەکەم لە ژن هێنان ڕووکردن بەرەو ئامانجە دونیایی‌یەکان نەبێت، چونکە بەوانە کەس شان‌و شکۆی بەرز نابێتەوەو بێ‌ی نابێت بە هیچ. بەڵکو پێویستە کە ئاین مەبەستی سەرەکی بێت، چونکە ئاین ڕێنمایی ئاوەزو ویژدانی مرۆڤە.

لە پاش ئاین ئەبێ ئەو صیفاتانە بێت کە مرۆڤ بە سروشتی حەزیان لێ ئەکات‌و دەرونی بۆی ئەچێ. پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ: (تنكح المرأة لأربع: لمالها, ولحسبها، ولجمالها، ولدينها, فاظفر بذات الدين تربت يداك) رواه البخاري ومسلم[1].

واتە: ئافرەت لەبەرچوار شت ئەخوازرێ یا لەبەر سامانەکەی، یا بنەماڵەی، یا لەبەر جوانی‌یەکەی، یا لەبەر ئاینەکەی. جا ئەوەی دیندارە بیخوازە دەستت خۆڵاوی بێت ئەگەر وانەکەیت[2].

وە بۆ ئافرەتی چاك سنورێك دیاری ئەکات کە ئەویش ئەوەیە کە جوان‌و گوێ ڕایەڵ‌و بێ تاوان‌و ئەمینە ئەفەرموێت: (خير النساء مَن إذا نظرت إليها سرَّتك، وإذا أمرتها أطاعتك، وإذا أقسمت عليها أبرَّتك، وإذا غبت عنها حفظتك في نفسها ومالك) رواه النسائي وغيره بسند صحيح[3].

واتە: چاکترین ژن ئەوەیە کە کاتێك سەیرت کرد دڵ خۆشی کردی، وە کاتێك فەرمانت پێدا گوێڕایەڵی کردی، وە کاتێك سوێندت لێ خوارد سوێندی نەخستی، وە کاتێك لێی دورکەوتیتەوە

(١) البخاري (٥٠٩٠) ومسلم (١٤٦٦) وابن ماجه (١٨٥٨) وأبي داود (١٧٨٧) والنسائي (٣٠٢٩)، وانظر الإرواء (١٧٨٣).

(٢) تربت يداك واتە: دەستت خۆڵاوی بێت. کە ئەمەش دوعایە بە فەقیری لەو کەسەی کە دین مەبەستی نەبێت لە ژن هێنانا.

(٣) أحمد (٢/٢٥١و٤٣٢) والنسائي (٢/٧٢) والحاكم (٢/١٦١) وە سەنەدەکەی (صحيح)ە بڕوانە الصحيحه (١٨٣٨).

خۆیو ماڵەکەی بۆ پاراستی). وە لەو سیفاتانەی کە پێویستە لە ئافرەتی دیاری کراودا هەبێت ئەوەیە لە ژینگەیەکی بەڕێزو ناسراوبن بە ئیعتیدالو لەسەرخۆیو دوور لە لادانی دەروونی، چونکە ئەم جۆرانە شایەنی ئەوەن کە بەسۆزو دڵ نەرم بن بەرامبەر منداڵو پارێزەری مافی مێرد بن.

پێغەمبەر ﷺ ئوموو هانیئی داواکرد ئەویش عوزری بۆ هێنایەوە کە منداڵ دارە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (خير نساء ركبن الإبل صالح نساء قريش، أحناه على ولد، في صغره، وأرعاه على زوج في ذات يده)

واتە: چاکترین ئافرەتێ سواری ووشتر بوبێت ئافرەتە چاکەکانی قورەیشە، کە میهرەبانترە بۆ منداڵ لە بچوکیدا، وە چاودێریکەرترە بۆ مێرد لە کاتی دەست کورتیدا.[1]

وە سروشتی بنەچەی پڕ ڕێز ئەوجۆرانەی لێ پەیدا ئەبێت. پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێت: (الناس معادن كمعادن الذهب والفضة، خيارهم في الجاهلية خيارهم في الإسلام إذا فَقِهوا)[2] واتە: خەڵکی کانزان وەك کانزای زێڕو زیو، چاکترینیان لە سەردەمی نەفامیدا لە ئیسلامیش دا هەر چاکن ئەگەر لە ئایین تێ گەیشتن.

وە یەکێ لە مەبەستە سەرەکیەکانی ژن هێنان منداڵ بوونە. کەواتە ئەبێ ژن نەزۆك نەبێت ئەوەش بە ساغی لاشەیدا ئەزانرێ، وە هەروەها بە گوێرەی خوشكو پوور کەسوکاردا دەرئەکەوێ.

پیاوێك داوای ژنێکی نەزۆکی کرد: ووتی: ئەی نێرراوی خوا من داوای ئافرەتێکی بنەچە چاكو جوانم کردووە بەڵام نەزۆکە پێغەمبەر ﷺ نەی هێشتو فەرمووی: (تزوجوا الودود الولود، فإني مكاثر بكم الأمم يوم القيامة)[3].

واتە: ئافرەتی پڕ سۆزو منداڵ بوو بخوازن، چونکە من لە ڕۆژی دوایی بەزۆری ئێوەوە شانازی ئەکەم بەسەر نەتەوەکانا. وە ئافرەتی پڕسۆزیش ئەو ئافرەتەیە کە سۆزو خۆشەویستی بۆ مێرد هەبێتو خۆی ماندوبکات بۆ ڕازی بوونی ئەو. وە مرۆڤ لە سروشتیدا حەز لە جوانی ئەکاتو بۆی سەرگەردانە وە هەمیشە هەست بەوە ئەکات کەشتێکی وون کردووە. کاتێ شتی جوان لێی دور بێت، جا ئەگەر بە دەستی هێنا هەست بەئارامی دەرونیو بەختیاری ئەکاتو ئەحەوێتەوە. لەبەر

---

(١) الحاكم (٤/٥٣) و (مجمع الزوائد) (٤/٢٧١).

(٢) أحمد (٢/٢٩٥) ومسلم (٢٦٣٨/١٥٩و١٦٠) وأبوداود (٤٨٣٤).

(٣) لەوە پێش تەخریجی کرا.

ئەوە ئیسلام جوانی لانەبردووە لە حیسابا لەکاتی هەڵبژاردنی خێزان . لە حەدیثی صحیحدا هاتووە: (إن الله جميل يحب الجمال)[1]. واتە: خوا جوانەو جوانی خۆش دەوێت.

موغیرەی کوڕی شوعبە داوای ئافرەتێکی کردو بە پێغەمبەری ڕاگەیاند، پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: (اذهب فانظر إليها، فإنه أحرى أن يودم بينكم)[2]

واتە: بچۆ سەیری بکە چونکە ئەو سەیرکردنە هۆیەکە بۆ بەردەوامی خۆشەویستی نێوانتان.

وە پێغەمبەر ﷺ ئامۆژگاری پیاوێکی ئەکرد کە داوای ئافرەتێکی ئەنصاری کرد بوو پێی فەرموو: (أنظر إليها فإن في أعين الأنصار شيئاً)[3] واتە: سەیری بکە چونکە لە چاوی ئەنصاریەکانا شتێك هەیە.

وە جابری کوڕی عبدالله خۆی پەنا ئەدا بۆ ئەو ئافرەتەی کە بیویستایە بیخوازێ، هەتا بتوانێ بە جوانی سەیر بکاتو ئەو شتانەی لێ ببینێ کە دەبێە هۆی ئەوەی پاڵی پێوە بنێ بۆ هێنانی.

وە پێغەمبەر ﷺ هەندێ ئافرەتی ئەنارد بۆ ورد بوونەوەو زانینی هەندێك لەو عەیبانە کە شاراوەن، وە پێیانی ئەفەرموو: (شُمّي فمها، شُمّي إبطيها، أنظري إلى عرقوبيها)[4] واتە: بۆنی دەمی بکە، بۆنی بن باڵەکانی بکە، سەیری دەماری پشت پاژنەی بکە.

وە وا باشە کە ئافرەت بە کچی بهێنرێ، چونکە کچ سادەیەو لەگەڵ پیاودا تێکەڵی نەکردووە. هێنانی ئەو پەیوەندی ژنو مێردایەتی بەهێزتر ئەکات وە خۆشەویستی بۆ پیاوەکەی زۆرتر بە دڵەوە ئەنوسێ (فما الحب إلا للحبيب الأول) واتە: خۆشەویستی نیە بگاتە خۆشەویستی یەکەم.

کاتێ جابیری کوڕی عبدالله بێوەژنێکی هێنا پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: (هلا بكرا تلاعبها وتلاعبك)[5]. واتە نە ئەبوو کچ بوایە یاریت لەگەڵ بکردایەو یاری بکردایە لە گەڵتا. ئەویش بە پێغەمبەری ﷺ ڕاگەیاند کە باوکی کۆمەڵێ کچی ووردی بەجێ هێشتووە، وە ئەوان پێویستیان بە ئافرەتێك هەیە چاودێریان بکات، بێوەژنیش بە تواناترە بۆ ئەو شتانە لە کچ کە هێشتا ڕانەهاتووە

---

(١) مسلم (٩١) وأحمد (١/٣٨٥) وأبوداود (٤٠٩١) والترمذي (١٩٩٩).

(٢) ترمذي (١٠٨٧) والنسائي (٦-٦٩-٧٠) وابن ماجه (١٨٦٥) وحەدیسەکە صەحیحە وەك شێخ ئەلبانی دەفەرموێت بڕوانە (المشكاة ٣١٠٧) و (الصحيحة ٩٦).

(٣) مسلم (١٤٢٤).

(٤) أحمد (٣/٢٣١) والحاكم (٢/١٦٦) والبيهقي (٧/٨٧).

(٥) بوخاری (٥٠٧٩و٥٠٨٠) وموسلیم (٧١٥).

له بەڕێوەبردنی ناوماڵ. وه ئەوەی پێویسته ڕەچاو بکرێ ئەوەیه که ئەبێت نزیکی ببێت له نێوان ژن و پیاوەکەدا لەڕوی تەمەنەوەو لەڕوی پلەو پایەی کۆمەڵایەتی‌یەوەو ئاستی ڕۆشنبیری‌و ئابووری‌یەوە. چونکه نزیکی لەم لایەنانەوە یارمەتی دەرە بۆ بەردەوامی بەیەکەوە ژیان و مانەوەی خۆشەویستی نێوانیان.

وه ئەبوبەکرو عمر خوا لی‌یان ڕازی بێت داوای فاطمەی کچی پێغەمبەریان صلی الله علیه وسلم کرد ئەویش نەی فەرموو: (هێشتا منداڵه) بەڵام کاتێ عەلی خوای لێ ڕازی بێت داوای کرد لێی مارەکرد.

ئەمانه هەندێ شتن که ئیسلام خەڵك ڕێنمایی ئەکات بۆی، تاوەکو ژن هێنەرەکان بیکەنه چرایەك‌و ڕێی خۆیانی پێ ڕۆشن بکەنەوەو لەسەری بڕۆن.

جا ئەگەر ئێمه ئەو شتانەمان ڕچاو کرد لەکاتی هەڵبژاردنی ژندا، ئەتوانین ماڵەکانمان بکەینه بەهەشتێك که منداڵ تێیدا بحەوێتەوەو مێرد تێیدا بەختەوەر ببێت، وه بۆ ژیان کۆمەڵێ منداڵی چاك ئامادە بکرێن که ئەتەوە بەهۆی ئەوانەوە ژیانێکی خۆش‌و پڕ ڕێز بەرێته سەر.

## هەڵبژاردنی مێرد

لەسەر سەرپەشتی‌کەری ئافرەت پێویسته پیاو هەڵبژێرێ بۆ ئەو ئافرەتەی سەرپەرشتی دەکات، نەی‌دا تەنها به کەسێك نەبێت که باوەڕو ئاین‌و ڕەوشت‌و شەرەفی هەیه، چونکه ئەگەر لەگەڵیا ژیا به چاکه ئەژی، وه ئەگەر دەست بەرداری بوو، به چاکی دەست بەرداری ئەبێت.

ئیمامی غەزالی له (الإحیاء) دا ووتویەتی: ئیحتیات له مافی ئافرەتدا زۆر گرنگه، چونکه ناسکه له شوکردنداو خۆ ڕزگارکردنی بۆنی‌یه، بەڵام پیاو به هەموو شێوەیەك ئەتوانێ له ژن خۆی ڕزگار بکات به دەست لێ بەردانی (الطلاق) جا هەرکاتێ پیاو کچی خۆی‌دا به ستەمکارو تاوان بارو بیدعەچی‌و عارەق خۆر، ئەوە تاوانی کردووە بەرامبەر ئاینەکەی‌و خۆی خستۆته بەر ڕق و خەشمی خوای گەورە لەبەر بڕینی سیلەی ڕەحم‌و خراپی هەڵبژاردنەکەی.

پیاوێك به حەسەنی کوڕی علی ووت: کچێکم هەیه کێ به باش ئەزانی بیدەمێ؟

ئەویش فەرمووی: بیده به کەسێ که له خوابترسێ، چونکه ئەگەر خۆشی بوێ ڕێزی لێ ئەگرێ، وه ئەگەر خۆشیشی نەوێ ستەمی لێ ناکات.

عائیشه دەفەرموێت: شوكردن بەندایەتییه جا سەیری ئەوه بكەن كچەكانتان ئەخەنە كوێوه.
پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (من زوَّج كريمته من فاسق فقد قطع رحمها) رواه ابن حبان في الضعفاء من حديث أنس، ورواه في الثقات من قول الشعبي بإسناد صحيح[1].

واته: هەركەس كچی خۆیدا بەفاسقێك ئەوه سیلەی ڕەحمی بەرامبەری بڕیوه.

ئیبنوتەیمیە دەفەرموێت: هەركەس بەردەوام بێت لەسەر تاوان كاری نابێ كەس ژنی بداتێ

## خوازبێنی (الخطبة)

خوازبێنی (الخطبة): لە پێشەكییەكانی ژن هێنانە، وە خوای گەوره داینـاوه پـێش ئـەوەی پەیوەندی ژنو مێردایـەتی ببەسـترێ بـۆ ئـەوەی ئەو پیاووژنـە یـەكتر بناسـن، وە بـۆ ئـەوەی ژنو مێردایەتییەكەیان لەسەر ڕەزامەندیو شارەزایی بێت.

### ض ذنيك رةواية داخوازي بكريَت:

دروست نییه داخوازی ئافرەتێك بكرێ هەتا دوو مەرجی تێدا نەبێ:

(یەكەم): نەبێ ئەو شتانەی تێدا نەبێ كه بەپێی شەرع ڕێ گرن له هێنانی.

(دووەم): كەسێكی تر پێش ئەو داخوازی شەرعی نەكردبێ.

جا ئەگەر ئەو شته شەرعیانەی تێدا بوو كه ڕێ لـه هێنـانی بگـرێ، وەك ئـەوه حەرام بێـت بـۆی بەهۆیەكه وه له هۆیەكانی حەرامی هەمیشەیی یا كاتی, یـا كەسـێكی تـر لـه پـێش ئـەوەوه داوای كردبوو, ئەوه دروست نییه ئەو دوای بكات.

**داخوازی ئافرەتێك كه له عیددەی كەسێكی ترا بێت:**

حەرامه داوای ئافرەتی عیددەدار بكرێ. جا ئەو عیددەیه عیددەی مێرد مردن بێت، یا عیـددەی تەلاق، تەڵاقەكه تەڵاقی ڕەجعی بێت، یا بائین. جا ئەگەر ئەو ئافرەته له عیددەی تەڵاقی ڕەجعی دا بێت، ئەوه حەرامه داخوازی بكرێ، چونكه ئـەو ئافرەتـه لـه عیـصمەتی مێردەكـەی دەرنەچـووه، وه پیاوەكه هەركاتێك بیـەوێت ئـەتوانێت بیگێڕێتـەوه. وه ئەگـەر لـه عیـددەی تـەڵاقی بـائیندا بێـت، حەرامه خوازبێنی كردنی به شێوەی ڕاستەوخۆ، چونكه هێشتا مافی مێردەكەی بەسـەرەوه مـاوه، وه ئەو پیاوه حەقی ئەوەی هەیه كه بیگێڕێتەوه به عەقدێكی تازه. وه چـونه پێـشەوەی پیـاوێكیتر بـۆ داخوازی كردنی تەعدایه بۆ سەر مافی مێردەكەی.

---

(١) بڕوانه (كتاب المجروحين)ی ئیبنو حیبان (١/٢٣٨).

وە زانایان جیاوازییان هەیە ئەگەر پیاو ئیشارە بکات بە داخوازی دروستە، یان نا، ڕاستی ئەوەیە ئەو کارە دروستە.

وە ئەگەر لە عیددەی مێرد مردندا بوو ئەوە دروستە (تعریض) ئیشارە کردن بە داخوازی لە کاتی عیددەدا نەك بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ، چونکە پەیوەندی ژنو مێردایەتی بە مردن پچراوە، وە مێردەکەی مافی نەماوە بە خێزانەکەیەوە.

وە بۆیە حەرامە بە شێوەی ڕاستەوخۆ داخوازی بکرێ، لەبەر ئاگاداری کردنی دڵی ئەو ئافرەتە کە لە غەم و پەژارەو تەعزیەدایە لە لایەکەوە وە لە لایەکی تریشەوە لەبەر ئاگاداری کردنی هەستی کەسو کاری مردووەکەو وەرەسەکانی. خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿وَلاَ جُنَاحَ عَلَيْكُمْ فِيمَا عَرَّضْتُمْ بِهِ مِنْ خِطْبَةِ النِّسَاءِ أَوْ أَكْنَنتُمْ فِي أَنفُسِكُمْ عَلِمَ اللَّهُ أَنَّكُمْ سَتَذْكُرُونَهُنَّ وَلَكِنْ لاَ تُوَاعِدُوهُنَّ سِرًّا إِلاَّ أَنْ تَقُولُوا قَوْلاً مَعْرُوفًا وَلا تَعْزِمُوا عُقْدَةَ النِّكَاحِ حَتَّى يَبْلُغَ الْكِتَابُ أَجَلَهُ وَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ يَعْلَمُ مَا فِي أَنْفُسِكُمْ فَاحْذَرُوهُ﴾ (البقرة: من الآية٢٣٥) واتە: تاوان نییە لە سەرتان لەوەدا کە ئیشارەتان کردووە بە داخوازی ژنانی مێرد مردوو لە کاتی عیددەکەیانا، یا لە ناو دڵتانا حەشارتان داوە، خوا ئەزانێ ئێوە هەر یادیان ئەکەن، بەڵام وریا بن بە نهێنی پەیمانی مارەکردنیان پێ مەدەن مەگەر قسەیەکی چاکە بکەن لە لایان. وە مارەیان مەکەن هەتا ئەو عیددەیەی خوا بۆی داناوە کۆتایی دێت، وە بشزانن خوا ئەزانێ چی لە دەرونتاندایە جا لێی بترسن. وە واتای (تعریض)یش ئەوەیە کە قسەکەر شتێك باس بکات کە نایەوێت ڕاستەوخۆ بە دەم بیدرکێنێ، وەکو ئەوەی بڵێت: (ئەمەوێ ژن بهێنم) یا بڵێت: (لە خوا ئەخوازم ئافرەتێکی چاکم بکات بە نسیب) یا بڵێ: (خوا توشی خێرێکت بکات.).

وە دیاری بردن بۆ ژنی عیدەدار دروستەو ئەویش هەر جۆرێکە لە (تعریض). هەروەها دروستە لای ئەو ژنە وەسفی خۆی بکات، وە باسی بنەماڵەو ڕابردوی خۆی بکات لە ڕووی قسەی ژێر پەردەوە و ئیشارە کردن بە ژن هێنان، چونکە ئەبوجەعفەر موحەممەدی کوڕی عەلی کوڕی حوسەین ئەو کارەی کردووە.

سوکەینەی کچی (حنظلة) دەفەرموێت: علی کوڕی محمد داوای بینینی کردم کە هێشتا عیدەی مێردە مردووەکەم کۆتایی نەهاتبوو. ووتی: نزیکیم لە پێغەمبەرەوە ﷺ ئەزانی، وە نزیکیم لە علیەوەو شوێنم لەناو عەرەبدا، ووتم: خوا لێت ببورێ ئەی ئەبا جەعفەر، تۆ پیاوێکی شتت لێوە وەرئەگیرێ کەچی لە عیددەکەمدا داخوازیم ئەکەی؟

ووتی: من هەر نزیکیم لە پێغەمبەرو علیەوە بۆ باس کردی.

پێغەمبەر ﷺ چوو بۆ ماڵی ئوم سەلەمە کە ئەبی سەلەمەی مێردی مرد بوو هێشتا لە عیددەدا بوو فەرموی: (لقد علمت أني رسول الله و خيرته، وموضعي في قومي) رواه الدارقطني[1].

واتە: بۆت دەرکەوتووە کە من پێغەمبەری خواو هەڵبژاردەی ئەوو شوێنو جێگام چۆنە لەناو نەتەوەکەمدا) وە ئەوە داخوازی بوو.

کورتەی ڕای زانایان ئەوەیە کە بە ئاشکرا داواکردنی هەموو ئافرەتێکی عیددەدار حەرامە، وە ئیشارە کردن بۆ ئافرەتی عیددەدار لە تەڵاقی بائین و عیددەداری مێرد مردوو دروستە، هەروەها حەرامە بۆ عیددەدار لە تەڵاقی ڕەجعی. وە ئەگەر کەسێك دانی نا بە داخوازی یا لە کاتی عیددەدا بەڵام مارەی نەکرد هەتا عیددەکەی کۆتایی هات، زانایان جیاوازیان هەیە لە حوکمی ئەمەدا:

مالك دەفەرموێت: ئەبێ لە یەك جیا بکرێنەوە. چوبێتە لای یان نا. شافیعی دەفەرموێت: عەقدی مارەکردنەکە دروستە هەرچەندە شتێکی قەدەغەکراوی کردووە لەبەر جیاوازی ڕووەکەی.

وە زانایان هەموو لەسەر ئەوە ڕێك کەوتوون کە ئەگەر مارەکردنو گواستنەوەی لە عیددەدا بوو لە یەك جیا ئەکرێنەوە. بەڵام ئایا دوای ئەوە حەڵاڵ ئەبێت بۆی یان نا؟

مالیكو لەیث و ئەوزاعی فەرمویانە: دروست نیە دوای ئەوە مارەی بکاتەوە. وە جومهوری زانایان ئەڵێن: بەڵکو دروستە ئەگەر عیددەکەی تەواو بوو مارەی بکاتەوە ئەگەر ویستی.

**داخوازی بەسەر داخوازی کەسێکی تردا:**

حەرامە کەسێك دوای ئافرەتێك بکات کە برایەکی موسڵمان داوای کردبێ، لەبەر ئەوەی دەست درێژی کردن و خراپەکردنە بەرامبەر داخوازیکەری یەکەم، وە جاری وا هەیە ئەو جۆرە کارانە ئەبێتە هۆی دوورخستنەوەی خێزانەکان لە یەکتری و ئاسایش لەناو ئەبات.

لە عوقبەی کوڕی عامیرەوە: کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (المؤمن أخو المؤمن، فلا يحل له أن يبتاع على بيع أخيه، ولا يخطب على خطبة أخيه حتى يذر) رواه أحمد ومسلم[2].

واتە: باوەڕدار برای باوەڕدارە, دروست نیە شت بەسەر شتی براکەیدا بفرۆشێت، وە دروست نیە داوای ئافرەتێك بکات کە ئەو داوای کردبێ هەتا وازی لێ نەهێنێ.

---

(١) حەدیسەکە (منقطع) پچڕاوە، لەبەر ئەوەی محمد الباقری کوڕی عەلی پێغەمبەری نەبینیوە ﷺ.

(٢) أحمد (٢/٣١١) ومسلم (٤/١٤١).

وە حەرامیەکەش لەسەر ئەوەیە کە ئافرەتە داواکراوەکە ڕازی بوو بێت پێی و سەرپەشتی کەریشی ڕێ بدات, چونکە ڕێ دانی ئەو ئیعتباری پێ ئەکرێ.

بەڵام داواکردن دروستە ئەگەر ئافرەتە داواکراوەکە ڕازی نەبووبێت، یان وەڵامەکە بەشێوەیەکی شاراوە بێت، وەك ئەوەی بڵێت: ڕەغبەتم لە تۆ نیە.

وە هەروەها دروستە بۆ کەسی دووەم ئەگەر ئاگای لە کەسی یەکەم نەبووبێت کە داوای ئەو ئافرەتەی کردووە، یا ئافرەتەکە ئەو کەسەی بە دڵ نەبووبێ و دەری کردبێ، یا داواکاری یەکەم ڕێ بە دووەم بدات.

وە (ترمذي) لە شافیعیەوە لە واتای فەرمودەکەدا ئەگێڕێتەوە: ئەگەر ئافرەتەکە داخوازی کراو ڕازی بوو مەیلی هەبوو. ئیتر بۆ کەس نیە داوای ئەو ئافرەتە بکات. بەڵام ئەگەر کەسێك ئەو ڕازی بوونەی نەزانی، قەیناکە داوای بکات. وە ئەگەر کەسی دووەم داوای ئافرەتەکەی کرد لە پاش ڕازی بوونی بە داواکاری یەکەم و مارەی کرد، ئەوە تاوانبار ئەبێت بەڵام مارە کردنەکەی دروستە، چونکە قەدەغە کردنەکە بۆ داواکردنەکەیە, وە داواکردنیش مەرج نیە بۆ دامەزراندنی زەواج، کەواتە ئەگەر داواکردنەکە صەحیح نەبێت، عەقدەکە هەڵناوەشێتەوە.

وە داود دەفەرموێت: ئەگەر داواکاری دووەم مارەشی کردبوو ئەبێ هەڵبوەشێنرێتەوە، هەتا ئەگەر گواستبوشیەوە.

**تەماشاکردنی ئافرەتی داواکراو:**

ئەوەی ژیانی ژن و مێردایەتی خۆش ئەکات و وای لێ ئەکات کە بەختەوەری و پیرۆزی دەوری بدات ئەوەیە کە پێش خوازبێنی ئەو پیاوە سەیری ئەو ئافرەتە بکات تاجوانی ئەو ئافرەتە بزانێ کە هۆیەکە بۆ هێنانی، هەروەها ناشیرینیشی کە هۆی دورکەوتنەوەیە لێی.

وە پیاوی هوشیار ناچێتە شوێنێکەوە هەتا شەڕو خێری ئەو شوێنە نەزانێ پێش ئەوەی بچێتە ناوی، ئەعمەش دەفەرموێت: هەر ژن هێنانێك و شوکردنێك بەبێ یەکتر بینین پێك بێت، بە غەم و پەژارە کوتایی دێت، ئەو سەیرکردنەش یاسای ئیسلام ڕێی پێداوەو هانی خەڵك ئەدات بۆی.

١- لە جابیری کوڕی عبد الله وە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (إذا خطب أحدكم المرأة، فإن استطاع أن ينظر منها إلى مايدعو إلى نكاحها، فليفعل)

واتە: ئەگەر کەسێك داوای ئافرەتێکی کرد و توانی ئەوەندە تەماشای بکات کە پاڵی پێوە ئەنێ بۆ هێنانی با بیکات.

جابیر دەفەرموێت: ژنێکی بەنی سەلەمەم داواکرد، ئەچوم خۆمم بۆ حەشار ئەدا هەتا هەندێ شوێنیم بینی کە پاڵی پێوەنام بیهێنم. ئەبوداود گێڕاویەتی‌یەوە[1].

٢- وەلەموغیرەی کوڕی شوعبەوە: کە خۆی داوای ژنێکی کردبوو. پیغەمبەر ﷺ پێی فەرمووە: سەیرت کردووە؟! ووتی: نەء، فەرموی: سەیری بکە چونکە ئەوە هۆی بەردەوامی ژیانتانە بەیەکەوە. نەسائیو ئیبنو ماجەو (ترمذي) کە بە حەسەنی داناوە گێڕاویانەتەوە[2].

٣- وە لە ئەبی هورەیرەوە خوا لیێ ڕازی بێت هاتووە: کە پیاوێك ژنێکی ئەنصاری داوا کرد پیغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئایا سەیرت کردووە؟ ووتی: نەخێر، فەرموی: بچۆ سەیری بکە چونکە چاوی ئەنصاری شتێکی تێدایە[3].

**ئەو شوێنانەی دروستە سەیر بکرێ:**

جومهوری زانایان بۆ ئەوە چوون کە پیاو بۆی هەیە سەیری روخسارو دەستی بکات و هیچی‌تر، چونکە ڕوخسار بەلگەی جوانیو ناشیرینی ئافرەتەو دەستەکانیشی نیشانەی نەرمو نیانی لاشەیەتی، داوود دەفەرموێت: سەیری هەموو لاشەی ئەکرێت.

ئەوزاعی ئەفەرموێت: سەیری شوێنی گۆشتی ئەکرێ. وە فەرموودەکان شوێنی سەیرکردنیان دیاری نەکردووە بەلکو فەرمودەکان بە ڕەهایی هاتوون شێوەیەکن تا سەیری ئەو شوێنانە بکات کە مەبەستی پێ بەدی بێت لەو سەیر کردنە.

وە بەلگەش لەسەر ئەوە ئەوەیە عبدالرزاق و سەعیدی کوری مەنصور گێڕایانەتەوە: عومەری کوڕی خطاب داوای ئومو کولثومی کچی عەلی کرد، ئەویش فەرمووی: هێشتا منداڵە، بەلام ئەینێرم بۆ لات ئەگەر پێی ڕازی بویت ئەوە خێزانتە. ئەویش بۆی نارد، عومەر قاچی هەڵدایەوە سەیری کات، ئەویش پێی ووت: ئەگەر گەورەی موسڵمانان نەئەبوی زڵلەم ئەیا لە هەردو چاوت.

---

(١) ئەم حەدیسە ئیبنو ماجە (٢٠٨٢) وأحمد لە (مسند) دا (٣/٣٦٠) گێڕاویانەتەوە وە حەدیسەکە حەسەنە وەك شێخ ئەلبانی دەفەرموێت: لە (صحيح سنن أبي داود ١٨٣٢)دا.

(٢) أحمد (٤/٢٤٦) وە (ترمذي ١٠٨٧) وە (نسائي) (٦/٦٩) وە ئیبنو ماجە (١٨٦٥) وە حەدیسەکە صەحیحە، وەك شێخ ئەلبانی دەفەرموێت. بڕوانە (السلسلة الصحيحة ٩٦) و (المشكاة ٣١٠٧).

(٣) تەخریجەکەی لەمەوبەر باس کراوە.

وە ئەگەر پیاو سەیری ئافرەتێکی کردو پێی ڕازی نەبوو ئەبێ بێدەنگ ببێت‌و هیچ نەڵێت بۆ ئەوەی بەباس کردنی دڵ گران نەبێت، چونکە لەوانەیە ئەوەی ئەو پێی ڕازی نیە یەکێکی تر پێی ڕازی بێت.

**سەیرکردنی ژن بۆ پیاو:**

ئەم حوکمی سەیرکردنە تەنها بۆ پیاوان نیە بەڵکو شتێکی چەسپاوە بۆ ئافرەتیش وە بۆی هەیە سەیری داواکاری بکات، چونکە ئەمیش وەك پیاو چەند شتێك سەرنجی ڕائەکێشێ لە داواکارەکەیدا. عومەر وتوویەتی: کچەکانتان مەدەن بە پیاوی ناشیرین، چونکە ئەوەی لە ژنانا سەرەنجی پیاوان ڕائەکێشێ لە پیاوانیشدا بە هەمان شێوەیە.

**ڕەوشت ناسین:**

ئەمە بە نیسبەت ئەو سەیرکردنەیە کە جوانی‌و ناشیرینی پێ بزانرێ, بەڵام خوو ڕەوشتەکانی‌تر ئەبێ بە گەڕان‌و پرسیار کردن بێت لەوکەسانەی کە ئەیناسن بەهۆی تێکەڵی یا هاوسێیەتی، یا بەهۆی هەندێ لە کەس‌وکاری نزیکی جێی باوەڕی، وەك دایك‌و خوشك. پێغەمبەر ﷺ ئوممو سولەیمی نارد بۆلای ئافرەتێك‌و پێی فەرموو: (أنظري إلى عرقوبها وشُمّي معاطفها. -وفي رواية- شُمّي عوارضها ) رواه أحمد والحاكم والطبراني والبيهقي.

واتە: سەیری دەماری پاژنەی بکەو بۆنی لاملی بکە. وە لە ڕیوایەتێکی تریدا (بۆنی دەمی بکە.

غەزالی لە (الإحياء)دا ووتویەتی: کەسێك کە چاوساغ و ڕاستگۆ و شارەزای ڕوکەش و ناوەوە نەبێت داوای وەصف کردنی ئەخلاق و جوانی لێ ناکرێت، تا مەیل بەلایدا نەکات بە شێوەیەك زیاد لە خۆی وەصفی بکات، وە حەسوودی پێ نەبات و درێغی بکات لە وەصفیدا، چونکە تەبیعەت لە مەسەلەی خوازبێنیدا هەمیشە بەلای یەکێکیاندا ئەچێت، وە لە وەصفی ئەوانەدا کە شوو ئەکەن یا درێغی ئەکرێ یا زیادەڕەوی.

وە کەم کەس ڕاست دەڵێت و وەك خۆی شتەکان دەڵێت، بەڵکو فێڵ و هەڵخەڵەتاندن زیاترە، جا لەبەر ئەوە ئیحتیات کردن گرنگە بۆ کەسێك کە لە خۆی ئەترسێت جگە لە خێزانەکەی سەیری کەسانی‌تر بکات.

**قەدەغەیی بە تەنها مانەوە لەگەڵ ئافرەتی داواکراودا:**

حەرامە بە تەنها مانەوە لەگەڵ ئافرەتی داواکراودا، چونکە ئەو ئافرەتە حەرامە لەسەر داواکارەکەی هەتا مارەی نەکات، وە یاسای ئیسلامیش جگە لە سەیرکردن ڕێی نەداوە، وە لەبەر

ئەوە لەتەنها مانەوەدا دڵنیایی ناکرێت لە تووش بوونی ئەوەی کە خوا قەدەغەی کردووە. بەڵام ئەگەر مەحرەمێك هەبوو دروستە بەیەکەوە بمێننەوە، چونکە بوونی مەحرەم ڕێگرە لەوەی تووشی گوناه ببن. لە جابیرەوە خوا لێی ڕازی بێت کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (من کان یؤمن بالله والیوم الآخر فلا یخلونَّ بامرأة لیس معها ذومحرم منها، فإن ثالثهما الشیطان)[1]

واتە: هەرکەسێك باوەڕی بەخواو ڕۆژی دوایی هەبێت لەگەڵ ژنێکدا بە تەنها دانەنیشێ کە مەحرەمی لەگەڵ نەبێت چونکە شەیتان سێیەمیان ئەبێت.

وە لە عامیری کوڕی ڕەبیعەوە خوا لێی ڕازی بێت: پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (لایخلون رجل بامرأة لاتحل لە، فإن ثالثهما الشیطان إلا لمحرم) رواهما أحمد[2].

واتە: نابێت پیاو بە تەنها لەگەڵ ژنی بێگانەدا کۆبێتەوە، چونکە شەیتان ئەبێتە سێیەمیان مەگەر مەحرەمی لەگەڵدا بێت.

**مەترسی گوێ نەدان بە تەنها دانیشتن لەگەڵ نامەحرەمو زیانەکانی:**

زۆر کەس کەمتەرخەمی کردووە لەو بارەوەو بە ئاسانی گرتووە، وە ڕێگەی داوە بە کچەکەی یا خزمەکەی لەگەڵ دەستگیرانیدا تێکەڵ بێت لە چۆڵەوانیدا بێ چاودێری کردن. وە بە ئارەزووی خۆی لە گەڵیدا ئەڕوات بۆ هەر شوێنێ بیەوێت بێ سەرپەرشت. وە لە ئەنجامی ئەمەدا گەلێ شتی ناڕەوا ڕووی داوە کە زۆر لە ئافرەتان شەرەفو ناموسی خۆیان لە دەست داوە بەو کارە ناڕەوایە.

جا جاری وا هەیە ئەو ژنو مێردە پێك نایەن ئیترئەوەش ئەبێتە هۆی ئەوەی کەسێکی تریش نەیەوێ. وە بە پێچەوانەی ئەوەوە کۆمەڵێکی ووشك هەن نایەڵن داخوازیکەر کچیان ببینێ کاتێك داوای ئەکات، وە ئەبێ هەر ڕازی بێ بەو شێوەیە، ئیتر کابرا مارەی ئەکات بێ ئەوەی چاویان بەیەك کەوتبێ هەتا شەوی بوكو زاوایەتی.

وە جاری واهەیە بینینەکە چاوەڕوان نەکراوو کتوپڕ ئەبێت بۆ هەردوکیان، ئیتر شتێك ڕووئەدا کە لە حیسابا نی‌یە لە جیابوونەوەو دوور کەوتنەوە لەیەك.

هەندێ کەس بە سەیرکردنی وێنەکەی ڕازی ئەبێت. بەڵام لە ڕاستیدا وێنە شتێك نییە مرۆڤ پێی دڵنیا بێت، چونکە شێوەی ڕاستی ئەو کەسە لە وێنەکەدا دەرناکەوێ بەتەواوی, کەواتە

---

(١) أحمد (٣/٣٣٩).

(٢) أحمد (٣/٤٤٦).

چاکترین شت ئەوەیە کە ئیسلام دایناوە، چونکە مافی هەردوکیان تێیدا پارێزراوە لەسەیرکردنی هەردوولا بۆ یەکتر، لەگەڵ خۆپاراستن لە بەتەنها مانەوە بۆ ئەوەی شەرەف و ناموس پارێزراوبێ.

پاش گەزبونەوەو ئەنجامەکەی:

داواکردن و خواستن پێشەکی یەکە پێش عەقدی زەواج ئەکەوێت، جا جاری وا هەیە هەموو مارەیی یەکەیان هەندێکی لەدووای خواستن پێشکەش ئەکرێت هەروەها دیاری و شیرینی و خواردن و هاتوچۆی زۆر لە نێواندا ڕوو ئەدات بۆ پشتگیری کردنی ئەم پەیوەندی یە تازەیە. وە هەندێك جار پیاوەکە یا کچەکە پاش گەز ئەبێتەوە یا هەردوکیان بەیەکەوە، جا ئایا شتی وەها دروستە؟ وە ئایا چی دراوە بەو ئافرەتە ئەبێ بگێڕدرێتەوە بۆ پیاوەکە؟

وە داخوازی کردن تەنها بەڵێنە بە هێنان، وە عەقد نی یە شت پێویست بکات، لەبەر ئەوە پاشگەز بوونەوە لە ئەنجامدانی مافێکە هەردوولا هەیانە. وە یاسادانەری ئیسلام بۆ پەشیمان بوونەوە لەو بەڵێنە هیچ سزایەکی ماڵی دانەناوە کە بەپێی ئەوە کەسێ پاش گەز بوەوە سزا بدرێ. هەرچەندە بەڵێن نەبردنە سەری بەڕەوشتێکی ناشیرین داناوە، وە لە ڕەوشتی مرۆڤی دوو ڕوی حیساب کردووە، مەگەر زەرورەتێك بێت پێویست بکات کە ئەو پەیمانە نەبرێتە سەر.

وە لە صەحیحدا هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (آية المنافق ثلاث: إذا حدَّث كذب, وإذا وعد أخلف, وإذا أؤتمن خان)[1].

واتە: نیشانەی ئادەمیزادی دوو ڕوو سێ شتە: ئەگەر قسەی کرد درۆ ئەکات وە ئەگەر پەیمانی دا پەشیمان ئەبێتەوە، وە ئەگەر ئەمانەتێکی لا دانرا خیانەتی لێ ئەکات.

کاتێ (عبداللّٰه)ی کوڕی (عمر) خوا لێی ڕازی بێت لە سەرەمەرگدا بوو ووتی: ئەو پیاوە قورەیشی یە نیوە بەڵێنێکم پێداوە دەربارەی کچەکەم، جامن نامەوێ بە سێ یەکە نیفاقەکەوە بچمە بارەگای خوا، ئێوە شایەت بن ئەوا کچەکەمم دایە[2].

وە ئەوەی کە دراوە بە ئافرەت لە دەست گیرانیدا بۆ پیاو هەیە وەری بگرێتەوە کاتێ پاش گەز بوونەوە، چونکە ئەو شتانە لەبەر هێنان دراون. وە مادام هێنان نەبوو، مافی هیچ یەك لەو شتانەی نابێت، لەبەر ئەوە پێویستە ئەو شتانەی بۆ بگێڕێتەوە، چونکە پیاو خۆی خاوەنی تەواوی ئەو شتانەیە. بەڵام ئەو شتانەی بە هەدی یە ئەدرێت حوکمی بەخششی بۆ دائەنرێ. وە ئەوەی ڕاست بێت

(١) بوخاری (٣٣) وە موسلیم (٥٩) لە حەدیسی ئەبوهورەیرەوە بە مەرفوعی.

(٢) بڕوانە (تذكرة الحفاظ).

ئەوەیە کە بەخشش وەرناگیرێتەوە بە مەرجێ ئەو شتانە بەخششی تەواو بن و لەجیاتی شتێك نەدرابن؛ چونکە هەرکەس شتێکی پێشکەش کرا کاتێ گەیشتە دە ستی ئەبێتە خاوەنی ئەو شتە، وە بۆی هەیە بە ئارەزوی خۆی تەسەرروفی تێدا بکات. جا داواکردنەوەی ئەو شتە بردنی مولکەکەیەتی بەبێ ئەوەی ڕازی بێت. ئەمەش بە پێی ئاوەزو شەرع شتێکی پوچەڵە. بەڵام ئەگەر کەسێك دیارییەکی بەخشی بە کەسێك بۆ ئەوەی لە جیاتی ئەو بەخششە شتێك وەربگرێ یان پاداشت بدرێتەوە، وە دیاری پێ دراوە کە ئەوەی نەکرد، ئەوە بۆی هەیە پەشیمان بێتەوە لە دیاریەکەی چی داوە وەری بگرێتەوە، چونکە ئەو بەخششەی لەڕوی گۆڕینەوەوەیە. جا لەبەر ئەوەی ژن هێنانەکە نەبوو بۆی هەیە پەشیمان بێتەوە لەو دیارییە، بنەمای ئەمانەش:

١- ئەوەیە کە خاوەن سوننەکان گێڕاویانەتەوە لە ئیبنو عەبباسەوە خوا لێیان ڕازی بێت: کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (لايحل لرجل أن يُعطِيَ عطيَّة أو يَهَبَ هِبَةً فيرجع فيها، إلا الوالد فيما يعطي ولده)[1].

واتە: دروست نییە بۆ کەس کەشتێکی بەخشی یا کردی بەدیاری لێی پەشیمان بێتەوە، باوك نەبێت لەوەی ئەیدا بە کوڕەکەی.

٢- وە دیسان هەر لەوەوە ئەگێڕنەوە: کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (العائد في هبته كالعائد في قيئه)[2].

واتە: پاش گەز بوەوە لە دیاری وەك ئەو کەسە وایە کە ڕشابێتەوەو پەشیمان بێتەوە لە ڕشانەوەکەی.

٣- وە لە سالیمەوە لە باوکییەوە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (من وهب هبة فهو أحق بها مالم يثب منها)[3].

واتە: هەرکەس شتێکی بەخشی خۆی مافی بەسەریەوە زۆرترە ئەگەر لە جیاتی ئەوە شتێکیان پێ نەبەخشی بێت. وە شێوەی یەکخستن و کۆکردنەوە لە نێوان ئەم فەر مودانەدا ئەوەیە کە لە (أعلام الموقعين)دا هاتووە کە ئەفەرموێت: ئەوکەسە کە بۆی حەڵاڵ نییە لەوشتەی بەخشیوێتی

---

(١) ئەبوداود (٣٥٣٩) وە ترمذي (٢١٣٢) وە نەسائی (٦/٢٦٥) وە ئیبنو ماجە (٢٣٧٧) وە حەدیسەکە صەحیحە وەك شێخ ئەلبانی دەفەرموێت، بڕوانە (الإرواء) (٦/٦٣).

(٢) شەیخەین گێڕاویانەتەوە و ئەبوداود (٣٥٣٨) و ئیبنو ماجە (٢٣٨٥) بڕوانە (الإرواء ١٦٢٢).

(٣) بەیهەقی (٦/١٨١) وە حاکم (٢/٥٢).

پەشیمان بێتەوە کەسێکە کە بێ بەرامبەر ئەو شتەی کردبێتە دیاری، نەك بۆ ئەوەی کەسەکەی تریش شتی پێ ببەخشێ. وە ئەوەی کە بۆی هەیە لەو بەخششەی پاش گەز بێتەوە کەسێکە کە شتێکی بەخشی بێت بە کەسێك بۆ ئەوەی ئەویش شتی پێ ببەخشێ؛ وە پاداش بدرێتەوە، کە چی بەخشش پێ دراو هیچی نەکردبێت، بەم شێوەیە ئەبێ فەرمودەکانی پێغەمبەر ﷺ هەموویان بەکار بهێنرێن نەك بدرێن بەیەکا.

## رای زانایانی ئیسلام:

بەڵام ئەوەی حوکمی پێ ئەکرێ لە دادگاکاندا: مەزهەبی حەنەفی‌یەکانە کە ڕای وایە ئەوەی پیاو دای بە ئافرەت لەکاتی دەست گیرانیدا مافی گێڕانەوەی بۆ هەیە ئەگەر ئەو شتە لەسەر شێوەی خۆی مابوو نەگۆڕابوو.

بازنەو ئەنگوستیلەو ملیوانکەو کاتژمێر و وێنەی ئەمانە ئەگێڕرێنەوە بۆ پیاو ئەگەر مابوون. بەڵام ئەگەر ئەو شتانە وەك خۆیان نەمابوون، وەك ئەوەی وون بوبن یا فرۆشرابن یا گۆڕرابن، یا خواردن بوو خورابو، یا قوماش بوو کرابو بە کراس و شت؛ ئەوە بۆی نی‌یە داوایان بکاتەوە یا نرخەکەی لە جیاتی وەربگرێ.

وە دادگای سەرەتایی (طنطا) حوکمێکی کۆتایی دا لە یۆلیۆی ساڵی (١٩٣٣). وە بریاری ئەمانەی دا کە ببنە بنەماو قاعیدە.

١- ئەوەی پیاو ئەی بەخشی بە دەست گیرانی کە عەقدی لەسەر نەکرابوو بەدیاری ئەژمێرێ.

٢- دیاری وەکو بەخشش وەهایە بەواتاو بە حوکم.

٣- بەخشش عەقدی کردن بە مولکە بە وەرگرتنی شتەکە بەجێ دێت. ئیتر شت پێ بەخشراو بۆی هەیە بە ئارەزوی خۆی ئاڵو گۆڕ بە شتەکە بکا وە ئەم کارەشی بەجێیە.

٤- لەناوچوونی شتەکە یا بەکارهێنانی ئەبێتە هۆی ڕێ گرتن لە گێڕانەوەی.

٥- بۆ بەخشش‌دەر نی‌یە کە داوای شتی‌تر بکاتەوە جگە لە شتەکەی خۆی ئەگەر مابوو.

وە مالیکی‌یەکان لەم بارەیەوە ڕوون کردنەوەیان هەیە لە نێوان ئەمەدا کە پاشگەز بوونەوەکە لەلایەن پیاوەکەوە دەبێت یا لەلایەن ژنەکەوە؛ جانەگەر پاش گەز بوونەوە کە لەلایەن پیاوەکەوە بوو ئەوە هیچی بۆ ناگێڕدرێتەوە لەوەی بۆی کردووە. بەڵام ئەگەر لەلایەن ئافرەتەکەوە بوو ئەبێ چی بۆ کراوە بیگێڕێتەوە ئەگەر وەك خۆی مابێ، وەئەگەر لەناو چوبێت ئەبێ نرخەکەی بدرێتەوە، مەگەر عادەت وابێ ئەگێڕرێتەوە، یان کرابێ بە مەرج، ئەو کاتە کار بەوە ئەکرێ. وە لای شافیعی‌یەکان

هەدیە ڕەد ئەکرێتەوە، مابێت یا فەوتابێت، جا ئەگەر مابو ئەوە هەر خۆی ڕەد ئەکرێتەوە، وە ئەگەر نەشمابو نرخەکەی ڕەد ئەکرێتەوە؛ وە ئەم بۆچونە نزیکە لەوەی کە ئێمە پێی ڕازین.

## پەیمانی ژن و مێردایەتی (عقد الزواج)

پایەی ڕاستەقینەی ژن و مێردایەتی ڕازی بوونی هەردولایە، وە پێك هاتنی ویستی هەردووکیانە لەسەر پەیوەندی بەستن. بەڵام لەبەر ئەوەی ڕازی بوون‌و ڕێك کەوتنی‌ویست لەکارە دەرونی‌یەکانە کە کەس ناتوانێ ئاگاداری بێ، ئەوە پێویستە شتێك هەبێت کە ببێتە بەڵگەی ئەوەی کە هەردوولا لە قوڵایی دڵەوە ئەو پەیوەندی یەیان ئەوێت. وە ئەو شتەش ئەو عیبارەتانەیە کە لە نێوان پەیمان بەستەکانەوە دەرئەبڕێ. جا ئەوەی لە ئەووەڵەوە لەلایەنێکەوە دەرئەبڕێ بۆ پێك هێنانی پەیوەندی ژن‌و مێردایەتی پێی ئەوترێ: (إيجاب). وە ئەوەی لەلایەنی دووەمەوە دەرئەبڕێ کە بەڵگە بێت لەسەر ڕازی بوونی بەو کارە پێی ئەوترێ: (قبول). ئیتر لەوەوە زانایان ئەڵێن پایەکانی ژن و مێردایەتی (إيجاب)و(قبول)ە.

مەرجەکانی (إيجاب و قبول)[1]:

عەقدی ژن‌و مێردایەتی پێك نایەت و شوێنەوارەکانی ژن و مێردایەتی لە سەری دانامەزرێ، هەتا ئەم مەرجانەی خوارەوەی تێدا نەبێت:

١- خاوەن تەمیزی هەردولا: جا ئەگەر کەسێکیان شێت بێت یا منداڵێکی بێ تەمیز بێ ئەو (عقد) پەیمانە نابەسترێ‌و دروست نی‌یە.

٢- (إيجاب و قبول) لەیەك کۆڕدا بێت: بەواتای ئەوەی قسەیەکی بێگانە نەکەوێتە نێوان (إيجاب) و (قبول)ەکەو جیایان بکاتەوە، یا بە شتێکی‌تر جگە لەوە خۆیان خەریك نەکەن. وە مەرجیش نی‌یە (قبول) یەکسەر لەدوای (إيجاب)ە وە بێت, ئەگەر کۆڕەکە درێژەی کێشاو (قبول) دواکەوت‌و شتێکی وەها ڕووی نەدا کە ڕوو وەرگێڕان بگەیەنێت، ئەوە کۆڕەکە یەکە. وە حەنەفی‌یەکان‌و حەنبەلی‌یەکان بۆ ئەوە چوون. وە لە کتێبی (المغنی)دا هاتووە: ئەگەر (قبول) ماوەیەك دوا کەوت لە (إيجاب) ئەوە هەر دروستە، بەمەرجێ ئەو کۆڕە تێك نەچێت و بە شتی ترەوە خەریك نەبن.

لەبەر ئەوە حوکمی مەجلیسەکە حوکمی حاڵەتی پەیمانەکەیە، بە بەڵگەی (قبض) وەرگرتن لەو شتانەدا کە وەرگرتن تێیدا مەرجە، وە سابت بوونی (خیار) ئارەزو لە عەقدی گۆڕینەوەکانا. بەڵام

(١) وە پێشی ئەوترێ: مەرجەکانی عەقد بەستن (إنعقاد).

ئەگەر ئەو دانیشتنە بڵاوەی پێ کرا ئەوە (إيجاب)ەکە پوچەڵ ئەبێتەوە، و واتای نامێنێ؛ چونکە ڕوو وەرگێران لە لایەنێکیانەوە دەرکەوت بە بڵاوە کردنەکە، کەواتە قبوڵ نەکراوە. وە هەروەها ئەگەر بەشتێکی ترەوە خۆیان خەریك کرد کە قبوڵ کردنەکەی پچڕاند؛ چونکە ئەو خۆخەریك کردنەش ڕوو وەرگێڕانە لە عەقدەکە.

ئەگێڕنەوە لە ئەحمەدەوە، پرسیاری لێکرا: ئەگەر پیاوێك کۆمەڵێك بچن بۆ لای و پێی بڵێن: کچەکەت بدە بە فلانە کەس. بڵێت: لەسەر هەزار ئەی دەمێ، بگەڕێنەوە بۆلای کابراو پێی بڵێن: ئەویش بڵێ: قەبوڵمە، ئایا ئەوە ئەبێت بە نیکاح؟ ووتی: بەڵێ.

شافیعی‌یەکان قەبوڵ کردنی دەست بە جێ‌یان بە مەرج داناوە ئەڵێن: ئەگەر نێوانی (إيجاب)و (قبول) بە ووتارێك جیا کرایەوە وەك ئەوەی سەرپەرشتیکەر بڵێ: ئەوا کچەکەم پێدای، ئەویش بڵێ:

(بسم الله والحمد لله و الصلاة والسلام على رسول الله)، ئەو نیکاحەم قبوڵ کرد. ئەوە دوو ڕووی هەیە:

یەکەمیان: ـ کە قسەی شێخ ئەبی حامیدی (أسفرايينى)یە, ـ ئەوەیە کە دروستە؛ چونکە ئەو ووتارە فەرمانی پێ دراوە بوترێ لەکاتی (عقد) پەیمان بەستندا. لەبەر ئەوە ڕێ لە دروستی ناگرێ؛ وەك تەیەمووم کردن لە نێوان دوونوێژی بەسەریەکەوە وایە.

دووەمیان: دروست نیيە؛ چونکە (إيجاب)و (قبول) لەیەك جیا کرایەوە. لەبەر ئەوە دروست نیيە. وەك ئەوە وەهایە بەشتێك جگە لە ووتار بڕرابێت. وە ئەمەش پێچەوانەی تەیەموومە چونکە تەیەموم لە نێوان دوونوێژدا فەرمانی پێ دراوە، بەڵام ئەو ووتارە فەرمانی پێ دراوە کە پێش عەقد بووترێ.

بەڵام مالیك: ڕێی داوە بە کەمێك دواخستن لە نێوان (إيجاب)و (قبول)دا.

وە هۆی ئەو جیاوازیيە ئەوەیە کە ئایا مەرجە بۆ پەیمان بەستن بوونی قەبوڵ کردن لە لایەن ئەو دووانەوە کە عەقدەکە ئەکەن لە یەك کاتا؟ یا ئەمە مەرج نیيە؟

٣ـ دەبێت (إيجاب) و (قبول) پێچەوانەی یەك نەبن، ئیللا مەگەر پێچەوانەکە بەرەو چاکتر بێت بۆ وەڵامەکە. کە ئەوە لەم کاتەدا نیشانەی زیادی ڕازی بوونە. وەك ئەوەی ئەگەر کەسی یەکەم ووتی: وا من ئەم کچەی خۆمم پێدای لەسەر سەد دینار مارەیی، کەسی دووەم ووتی: لەسەر دووسەد قەبوڵمە، ئەوە پەیمانەکە ئەبەسترێ؛ چونکە قەبوڵەکە شێوەیەکی چاکترە.

ﷺئەبێ هەردوولا گوێیان لە یەکتری بێت‌و تێ بگەن کە مەبەست لەو قسانە دامەزراندنی پەیمانی ژن‌و مێردایەتی‌یە، با لە هەندێ ووشەی ڕستەکەش تێ نەگەن؛ چونکە لێرەدا سەیری مەبەست‌و نیاز ئەکرێ.

زاراوەکانی پەیمان بستن (إنعقاد)[1]

پەیمانی ژن‌و مێردایەتی بەهەر زمانێك کە هەردوکیان لێی تێ بگەن ئەبسترێت، هەرکاتێ دەربڕینەکەیان بەڵگەی ویستی هەردوکیان بوو لەسەر ژن‌و مێردایەتی بەبێ پێچ و پەنا.

شێخی ئیسلام ئیبنو تەیمیە دەفەرموێت: پەیمانی ژن‌و مێردایەتی ئەبسترێ بە هەر زمان و وشەو کردەوەیەك بێت کە خەڵك بە مارەکردنی تێ بگات. وە هەموو عەقدو پەیمانێکی تریش هەر وەهایە.

وە زانایان پێك هاتوون لەسەر ئەوە سەبارەت بە (قەبوڵ کردن)، وە مەرجی ئەوەیان دانەناوە کە ئەبێت لە وشەی تایبەتی وەرگیرێ‌و بوترێ، بەڵکو بە هەرچی زاراوەیەك بێت دروستە بە مەرجێ ڕێك کەوتن و ڕازی بوونیان لەسەر ئەو کارە بگەیەنێت؛ وەك بڵێت: قبوڵم کرد، یا یەك کەوتم، یا بەجێم هێنا، یا گوزەراندم.

بەڵام (إیجاب) زانایان لەسەر ئەوە پێك هاتوون کە ئەبێت بە زاراوەی (إنکاح) و (التزویج) بووترێ، یا بە ووشەیەك کە لەوانەوە وەرگیرابێ وەك (زوجتك) یا (انکحتك)؛ چونکە ئەم دوو زاراوەیە بە ئاشکرا مەبستەکە ئەگەیەنن، وە زانایان جیاوازن لەوەدا کە ئایا بەبێ ئەو دوو زاراوەیە پەیمانەکە ئەبسترێ وەك: ئەم کچەم پێ بەخشیت، یا پێم فرۆشتی، یا کردمەماڵی تۆ، یا بەخێر پێم دای. حەنەفی‌یەکان‌و (ثوري) و (أبو ثور) و (أبو عوبید) و (أبو داود) بە دروستیان داناوە. چونکە ئەوە عەقدەو نیاز تێیدا ئیعتیباری بۆ ئەکرێ، وە بۆ دامەزراندنی مەرج نیە زاراوەیەکی تایبەت بووترێ" بەڵکو ئەوەی ئیعتباری بۆ بکرێ ئەوەیە هەر زاراوەیەك ڕێك بکەوێت مانا شەرعی‌یەکەی ببەخشێت، واتە ئەگەر لە نێوان ئەو زاراوەیەو واتای شەرعیدا هاوبەشی هەبوو.

چونکە پێغەمبەر ﷺ ژنێکیدا بە پیاوێك پێی فەرموو: (قد ملَّكتُكَها بما معك من القرآن) رواه البخاري[2].

---

(١) یان (إیجاب) و (قبول).

(٢) البخاري (٥٠٨٧) و مسلم (١٤٢٥).

واتە: کردمە ماڵی تۆ بەوەی چیت لە قورئان لەبەرە فێری بکەی.

وە هەروەها لەبەر ئەوەی زاراوەی پێبەخشین (الهبة) پەیمانی ژن هێنانی پێغەمبەری ﷺ پێ بەستراوە، هەروەها پەیمانی ژنومێردایەتی نەتەوەکەشی پێ ئەبەسترێ، خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ إِنَّا أَحْلَلْنَا لَكَ أَزْوَاجَكَ اللَّاتِي آتَيْتَ أُجُورَهُنَّ﴾ (الأحزاب: من الآية٥٠) هەتا ئەوەی ئەفەرموێ: ﴿وَامْرَأَةً مُؤْمِنَةً إِنْ وَهَبَتْ نَفْسَهَا لِلنَّبِيِّ﴾ (الأحزاب: من الآية٥٠) واتە: ئەی نێراوی خوا ئێمە بۆ تۆمان ڕەوا کردووە ئەو ژنانەی کە مارەییەکەیان ئەدەیتێ) هەتا ئەوەی ئەفەرموێ: وە ژنێکی باوەڕداریشمان حەڵاڵ کردووە بۆت کە خۆیت پێشکەش بکات بێ مارەیی.

وەلەبەر ئەوەی ئەتوانرێ پەیمانی ژنو مێردایەتی بەمەجاز دابمەزرێنرێ کەواتە بەو وشانەش دامەزراندنی پێویست ئەبێت و دائەمەزرێ، وەك خستنی تەلاق بە کینایە. وە شافیعی و ئەحمەد و سەعیدی کوڕی (مسیب) و (عطا) بۆ ئەوە چوونە کە دانامەزرێ ئیللا بەزاراوەی (التزويج والنكاح)و ئەو شتانەی لەمانەوە وەرئەگیرێ؛ چونکە زاراوەکانی تر وەك بەخشینو کردنەماڵ واتای نیکاح نابەخشن. چونکە لای ئەوان شایەت مەرجە بۆ مارەکردن، جا ئەگەر بە زاراوەی بەخشین بوو ئەوە ئەو شایەتییە ناکەوێتە سەر نیکاح.

مارەکردن بەجگە لە زمانی عەرەبی:

زانایان لەسەر ئەوە ڕێکن کە دروستە مارەکردن بە زمانێك جگە لە زمانی عەرەبی ئەگەر هەردوکیان یا یەکیان لە زمانی عەرەبی نەگەن. وە جیاوازن لەوەدا کە ئەگەر لە عەرەبی بگەن و بتوانن پەیمانی ژنو مێردایەتی پێ ببەستن:-

ئیبنو قودامە لە (المغنی)دا دەفەرموێت : ئەگەر کەسێك بتوانێ بەزمانی عەرەبی زاراوەی نیکاح بڵێت دروست نییە بە زمانێکی تر ژنی بۆ مارە بکرێت. ئەمەش یەکێکە لە قسەکانی شافیعی. وە لای ئەبی حەنیفە دروستەو دائەمەزرێ، با بەزمانی عەرەبیش بتوانێ چونکە ئەو زاراوەیەکی تایبەتی هێناوە بۆ مارەکردن، کەواتە پێی دائەمەزرێ، وەك چۆن بە زمانی عەرەبی دائەمەزرێ. وەلای ئێمە: ئەوکەسەی لە زاراوەی (الانكاح والتزويج) لابدات لەگەڵ ئەوەشدا کە توانای عەرەبی هەبێ ئەوە دروست نییە، وەك چۆن بە زاراوەی (إحلال) دروست نییە. بەڵام ئەو کەسەی کە زمانی عەرەبی باش نازانێ، دروستە بە زمانی خۆی عەقدی نیکاح بکات، چونکە هەر ئەوەندەی توانا هەیە، کەواتە ئەو حوکمەی کە ئەبێ بە عەرەبی بێت لەسەری نامێنێت، وەکو لاڵ، بەڵام ئەبێ بە شێوەیەك بێت کە مانای زاراوە عەرەبییەکە بدات، ئیتر ئەو کەسەی کە عەرەبی باش نازانێ پێویست نییە لە سەری فێری زاراوەکانی نیکاح بکرێ بە زمانی عەرەبی.

ئەبو خەطاب دەفەرمووێت: پێویستە لەسەری فێر ببێت, چونکە ئەو شتەی عەرەبی مەرج بێت لە دروست بونیدا پێویستە لەسەری فێری ببێت بە مەرجێ توانای هەبێت، وەك (الله أكبر). مەبست لەو بۆچونەی یەکەم کە ئەڵێ ئەوەی عەرەبی باش نازانێ ئەتوانێ بە زمانی خۆی عەقدی نیکاح بکات ئەوەیە کە نیکاح شتێکی پێویست نیيە، لەبەر ئەوە پێویست نیيە پایەکانی بەزمانی عەرەبی بزانرێ وەك فرۆشتن, بە پێچەوانەی (الله أكبر)ەوە.

بەڵام ئەگەر یەکێکیان عەرەبی زانی و ئەوی تریان نەیزانی ئەبێ ئەوەی عەرەبی ئەزانێ بە عەرەبی بیڵێت، وە ئەوی تریان بە زمانی خۆی. بەڵام ئەگەر یەکێکیان لە زمانی ئەوی تر نەئەگەیشت پێویستە ـ بۆ ئەوەی بزانێ ئەو زاراوەیەی بەرامبەرەکەی ئەیڵێت زاراوەی نیکاحە ـ کە کەسێکی جێ‌ی باوەڕ پێ‌ی ڕابگەیەنێت، بە مەرجێ ئەوکەسە هەردوو زمانەکە بزانێ

وە ئەو ڕاستی‌یەی کە بۆ ئێمە دەرئەکەوێ ئەوەیە کە ئەمە گران کردنەوەیە، وە ئاینی خوا سووك‌و ئاسانە، وە لە پێشەوە ووتمان: کە پایەی ڕاستەقینە لەمەدا ڕازی بوونە، وە (إيجاب) و (قبول) تەنها دوو ڕواڵەتن بۆ ئەو ڕازی بونەو بەڵگەن لەسەری. جا کاتێك (إيجاب) و (قبول) ڕوی دا ئیتر ئەوە بەسە، بە هەر زمانێك بێت. ئیبنو تەیمی‌یە دەفەرموێت: هەرچەندە (نكاح) ژن‌و مێردایەتی خواپەرستی‌یە، بەڵام هەر وەك بەندە ئازادکردن‌و خێرکردنە، نەزاراوەی عەرەبی نە عەجەمی بۆ دانەنراوە. پاشان ئەو کەسە کە عەرەب نی‌یە ئەگەر ئەوکاتە فێری عەرەبی بوو لەوانەیە مەبەست تێ نەگا لەوزاراوەیە کە فێری بووە، وەك چۆن لە زمانەکەی خۆی تێ ئەگات.

بەڵێ: ئەگەر ووترا: کەراهەتی هەیە پەیمان بەستن بە جگە لە زمانی عەرەبی بەبێ پێویستی، وەك چۆن هەر گفتوگۆیەکی تر بە جگە لە عەرەبی کەراهەتی هەیە بەبێ پێویست: ئەوە بەجێیە. وەك لە مالیك‌و ئەحمەدوشافیعی‌یەوە شتێکی وا گێڕراوەتەوە کە بەڵگەیە لەسەر کەراهەت بوونی قسەکردن بەجگە لە زمانی عەرەبی بێ پێویستی.

### ژن هێنانی کەڕولاڵ:

دروستە مارەکردنی کەڕولاڵ بە ئیشارەتی خۆی ئەگەر تێ بگات وەك چۆن فرۆشتنی دروستە، چونکە ئیشارەت واتایەکی تێ گەیەنەرە، بەڵام ئەگەر ئافرەتەکە لە ئیشارەتەکەی نەگەیشت ئەوە دروست نیيە، چونکە ئەوە پەیمان بەستنە لە نێوان دوو کەسا. وە ئەبێت هەردوولا لەیەکتر بگەن کەچی ئەڵێن.

### ژن هێنان بۆ نادیار (غائب)

ئەگەر یەکێ لە دوو لایەنی عەقدەکە ئامادە نەبوو وە ویستی پەیمانی ژن هێنان ببەستێ ئەوە پێویستە لەسەری کە یەکێ بنێرێ، یا نوسراوێك بنوسێ بۆلای ئەو لایەنەی کە داوای ژنیان لێ ئەکات. وە لەسەر لایەنەکەی تر پێویستە- ئەگەر ڕەغبەتی لێی بوو- شایەت ئامادە بکات‌و ئەوەی لە نامەکەدا نوسراوە یا ئەوەی کە نێر راوەکە هێناویەتی بیدات بەگوێیاندا، وە هەر لەو کۆڕەشدا بە شایەتیان بگرێ کە ئەویش ئەوە زەواجەی قەبوڵە. وە ئەو قبوڵەش ئەبەسترێ بەو کۆڕەوە.

### مەرجەکانی صیغەی پەیمانەکە (شروط صیغة العقد)[1]

زانایان چەند مەرجیان داناوە بۆ شێوەی (إیجاب و قبول) : کە ئەبێ بە دوو زاراوە بن کە بۆ ڕابردوو دانرابن، یا یەکێکیان بۆ ڕابردوو وە ئەوی تریان بۆ داهاتوو بێ.

نمونە بۆ یەکەم ئەوەیە: لایەنی یەکەم بڵێت: کچەکەم پێ دایت، ئەویش بڵێت قبوڵم کرد. نموونە بۆ دووەم: لایەنی یەکەم بڵێت: کچەکەمت پێ ئەدەم، ئەویش بڵێت، قبوڵم کرد. وە بۆیە ئەمەیان بە مەرج گرتووە، چونکە بەدی هاتنی ڕەزامەندی و یەك کەوتنی ویستی ئەو دووانە، پایەی ڕاستەقینەیە بۆ بەستنی پەیمانی زەواجەکە، وە وەکو لە پێشەوە باس کرا (إیجاب) و (قبول) دوو ڕواڵەتی ئەو ڕەزامەندیەن. وە ئەبێ بە شێوەیەکی قەطعي بەدی هاتنی ئەو ڕەزامەندی‌یە بگەیەنن لە کاتی عەقدەکەدا. وە ئەو صیغەیەی کە یاسادانەر بەکاري هێناوە بۆ دامەزراندنی عەقدەکان صیغەی (ماضي) ڕابوردووە، چونکە ئەم صیغەیە بە شێوەیەکی قەطعي بەڵگەیە لەسەر بەدیهاتنی ڕازی بوون لە هەردوو لایەنەکەوە. ئیتر جگە لەمە هیچ مانایەکی‌تر نابەخشێت.

بە پێچەوانەی ئەو صیغانەی کە حاڵ و داهاتوو ئەگەیەنن، چونکە ئەمانە بەشێوەی قەطعی بەڵگە نین لەسەر بەدی هاتنی ڕازی بوون کاتی قسە کردنەکە جا ئەگەر لایەنی‌یەکەم بڵێت: کچەکەمت ئەدەمێ. ئەوی تر بڵێت: قبوڵی ئەکەم؛ ئەم صیغەیەی هەردوکیان پەیمانەکەی پێ نابەسترێ، چونکە لەوانەیە مەبەست لەم زاراوانە تەنها وەعد بێت. وە وەعد بە مارەکردن لە داهاتوودا نابێتە پەیمان بەستن یەکسەر لەوکاتەدا.

وە ئەگەر داواکار ووتی: کچەکەتم لێ مارەبکە، ئەویش ووتی: ئەوا کچەکەم لێ مارەکردی، بەوە پەیمانەکە بەجێ دێت‌و ئەبەسترێ, چونکە صیغەی (زوجني)- لێم مارە بکە ـ مانای بەوەکیل گرتن ئەگەیەنێت، وە پەیمانەکەش دروستە یەکێك لە دوو لایەنەکە سەرپەرشتی بکات. جا کاتێك داواکار

(١) صیغة العقد واتە: ئەو شێوە داڕشتنەی کە پەیمانەکەی لەسەر ئەبەسترێ.

ووتی: (زوجني) لیّم مارەبکە، وە لایەنەکەی تر ووتی: قبولّم کرد ئەمە ئەوە ئەگەیەنێ کە یەکەم لایەن دووەمی کردۆتە وەکیل. وە دووەم لایەنیش پەیمانەکەی پێك هێنا بەو عیبارەتەی کە ووتی بۆ هەردوولا.

**بە مەرج گرتنی (تنجیز)[1] لە عەقدەکەدا:**

وە هەروەها زانایان ئەوەیان کردۆتە مەرج کە ئەبێ پەیمانەکە (منجز) بێت. واتە ئەو صیغەیەی کە پەیمانی ژن و مێردایەتی پێ ئەبەسترێ پێویستە (مطلق) ڕەها بێت و نەبەسترابێتەوە بە هیچەوە، وەك ئەوەی باوکەکە بە داواکار بڵێت:

کچەکەم پێدای، داواکاریش بڵێت: قبولّم کرد. ئەوە ئەو پەیمانە (منجز)ە . وە هەر کاتێك مەرجەکانی هاتەدی صەحیحەو شوێنەوارەکانی لەسەری دائەمەزرێت. پاشان صیغەی عەقد جاری وا هەیە ئەبەسترێتەوە بە مەرجێکەوە، یان ئەدرێتە پاڵ کاتێکی داهاتوو، یان بەرامبەرە بە کاتێکی دەست نیشان کراوەوە، یان بەرامبەرە بە مەرجێکەوە؛ ئەوە ئەو صیغەیە لەم حاڵەتانەدا عەقدی زەواجی پێ نابەسترێت. وا لە خوارەوە هەریەکە لەو شێوانە ڕوون ئەکرێتەوە.

١-ئەو صیغەیەی بەسترابێت بە مەرجێکەوە:

ئەمەش ئەوەیە کە بەدی هاتنی ناوەڕۆکی صیغەکە بەسترابێت بە بەدی هاتنی شتێکی ترەوە بە یەکێ لە ئالەتەکانی تەعلیق؛ وەك ئەوەی داواکار بڵێت: ئەگەر تەعین کرام لە کارێکدا کچەکەت مارە ئەکەم، باوکەکەش بڵێت: قبولّم کرد ئەوە زەواج بەم صیغەیە دانامەزرێت ؛ چونکە پێکهاتنی پەیمانەکە بە شتێکەوە بەستراوە کە لەوانەیە ببێت و لەوانەیە نەبێت لە پاشەڕۆژدا.

وە پەیمانی ژنومێردایەتی یەکسەر سوودی خاوەنیەتی خۆشی وەرگرتن ئەدات، وە حوکمەکەی دوا ناکەوێ، بەلاّم ئەو مەرجە - کە تەعین بوونە - لەکاتی قسەکردندا نییە، وە ئەوەی بەسترا بە شتێکی نەبووەوە، هەر نەبوە. کەواتە ژنو مێردایەتییەکەش نابێت.

بەلاّم ئەگەر بەستنەوەکە بەشتێکەوە بوو کە لەو کاتەدا بەدی هاتبوو ئەوە ئەو پەیمانە ئەبەسترێو دروستە، وەك ئەوەی کە داواکار بڵێت: ئەگەر کچەکەت تەمەنی بیست ساڵ بێت ئەوە مارەی ئەکەم. باوکەکەش بڵێت: قوبولّم کرد. وە تەمەنیشی فعلاً بیست ساڵ بوو.

---

(١) تنجیز واتە: جێ بەجێ کردنی خێرا.

وه هەروەها ئافرەتەکه بڵێت: ئەگەر باوکم قایل بێت شووت پێ ئەکەم؛ داواکاریش بڵێت: قبوڵم کرد، باوکیش هەر لەو کۆڕەدا بڵێت: قایلم، چونکه ئەم بەستنەوەیه لەم حاڵەتەدا شکڵیيه، وه صیغەکه له واقیعدا بەجێ هاتووه.

٢- ئەو صیغەیەی که ئەدرێته پاڵ کاتێکی داهاتوو:

وەك ئەوەی داواکار بڵێت: بەیانی یا مانگێکی تر کچەکەت ئەهێنم. باوکەکەش بڵێت: قبوڵم کرد؛ ئەم صیغەیه پەیمانی ژن‌و مێردایەتی پێ نابەسترێ، نه به یەکسەری و نه لەو کاته داهاتووەدا، چونکه هێنانی ئەو صیغەیه بەو شێوەیه یەك نایەتەوه لەگەڵ عەقدی زەواجا که مافی خۆشی وەرگرتن دروست ئەکات یەکسەر.

٣- ئەو صیغەیەی که ماوەیەکی دیاری کراو دەست نیشان ئەکات بۆ عەقدەکە:

وەك ئەوەی بۆ ماوەی مانگێك یا زیاتر یا کەمتر ئەی هێنێت، جا ئەم شێوه ژن هێنانه حەڵاڵ نییه؛ چونکه مەبەست له ژن هێنان بەردەوامی ژن‌و مێردایەتییه بۆ منداڵ بوون و پارێزگاری کردنی ڕەگەزی مرۆڤ و پەروەردەکردنی منداڵ. لەبەر ئەوه زانایان حوکمی بەتاڵییان داوه بەسەر زەواجی (متعة) و زەواجی (تحليل)دا، چونکه مەبەست لەو زەواجەی یەکەم تەنها ڕابواردنێکی کاتییه، وه مەبەستیش لە شێوەی دووەم حەڵاڵ کردنەوەی ئافرەته بۆ مێردی یەکەمی. وا له خوارەوه لەسەر هەریەکەیان ئەدوێین:-

## ژن هێنانی کاتی (زواج المتعة)

وه پێشی ئەوترێ مارەکردنی‌کاتی، یا مارەکردنی بچراو؛ ئەمەش ئەوەیه که پیاوێك ئافرەتێك مارە بکات بۆ ماوەی ڕۆژێك یا هەفتەیەك یا مانگێك لەگەڵیا ڕائەبوێرێ وه لەبەر ئەوەیه پێی ئەڵێن (متعة) چونکه پیاو سوود وەرئەگرێ و خۆشی لەو زەواجه تا ئەو ماوەیەی خۆی داینـاوه دوایی بەرەڵای ئەکات. وه ئەم شێوه ژن هێنانه هەموو سەرمەزهەبەکان لەسەر حەرامی پێك هاتوون.

وه ئەڵێن: ئەگەر پەیمانەکەش بەسترا پوچەڵه. وه ئەمانەی خوارەوەیان کردۆتەوه بەڵگە:

(یەکەم): ئەم شێوه ژن هێنانه ئەو ئەحکامانەی له قورئاندا هاتووه بەرامبەر ژن‌و مێردایەتی‌و تەڵاق‌و عیددەو میرات نای گرێتەوه، کەواته پوچەڵ ئەبێت وەك نیکاحه پوچەڵەکانی تر.

(دووەم): فەرموودەکان به ڕاشکاوی هاتوون دەربارەی حەرام بوونی.

لەسەبورەی جوهەنی‌یەوە هاتووە: کە ئەو خۆی لەگەڵ پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم دا بووە لەکاتی فەتحی مەککە، پێغەمبەر ﷺ ڕێی پێدان کە بە موتعە ژن بهێنن، ئەڵێ: هێشتا پێغەمبەر ﷺ لە مەککە دەرنەچوبوو کە حەرامی کردەوە.

وە لە زاراوەیەکی تردا هاتووە کە ئیبنو ماجە گێراویەتی‌یەوە: پێغەمبەر ﷺ موتعەی حەرام کرد و فەرمووی: (أيها الناس إني كنت أذنت لكم في الاستمتاع، ألا وإن الله قد حرمها إلى يوم القيامة)[1].

واتة: ئةى خةلكينة لة ثيَشةوة ريَم ثآدان بؤ متعة، بةلآم ئيَستا خوا قةدةغةى كرد ذن بة موتعة هيَنان تا رؤذيى قيامةت.

وە لە عەلی‌یەوە خوا لێی ڕازی بێت: کە پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کرد ژن بە موتعە بهێنن لە ڕۆژی گرتنی خەیبەردا، وە هەروەها خواردنی گۆشتی کەری خۆماڵی قەدەغە کرد[2].

(سێیەم): (عمر) خوالێی ڕازی بێت حەرامی کرد لەسەر دوانگە سەردەمی خەلافەتی خۆی، وە صەحابەکانیش ڕەزای خوایان لێبێ بڕیاریان لەسەردا جا ئەگەر (عمر) هەڵە بوایە، صەحابەکان بڕیاریان لەسەر نەئەدا.

(چوارەم): خطابی ووتویەتی: حەرام کردنی موتعە وەك ئیجماعی لێ هاتووە، لای هەندێ شیعە نەبێت، وە لەسەر بنچینەی خۆیان دروست نی‌یە گەڕانەوە بکرێت بۆلای قسەکانی عەلی خوای لێ ڕازی بێت، وە بە صەحیحی هاتووە لە عەلی‌یەوە کە ئەم کارە نەسخ بۆتەوە.

وە بەیهەقی لە جەعفەری کوڕی موحەممەدەوە ئەگێڕێتەوە کە پرسیاری لێ کرا دەربارەی موتعە فەرمووی: خۆی لە خۆیدا زینایە.

(پێنجەم): چونکە مەبەست لەوژن هێنانە تارەزوو شکاندنە، نەك نەوەخستنەوەو پارێزگاری منداڵ کە مەبەستی بنەڕەتی‌ژن‌و مێردایەتی‌یە، لەبەر ئەوە لە زینا ئەچێ لەڕووی خۆشی لێ وەگرتنەوە. پاشان زیانیش ئەدات لە ئافرەت؛ چونکە وەك کەلوپەلێکی لێ دێت بە دەستی ئەم و ئەوەوە، هەروەها زیان بە منداڵان ئەگەیەنێت، چونکە ماڵێکیان نابێت تێیدا ئارام بگرن و پەروەردەو خوو ڕەوشتیان لەخۆ بگرێت.

(١) أحمد (٢/٤٠٤-٤٠٦) ومسلم (١٠٤٦/١٩-٢٠) وأبوداود (٢٠٧٢).

(٢) البخاري (٥١١٥) ومسلم (١٤٠٧/٢٩-٣٠).

وه گێڕراوەتەوە لە هەندێ صەحابەو تابیعیەوە کە زەواجی موتعە حەڵاڵە، وە ئەوەش بەناوبانگە لە ئیبنوعەبباسەوە (ﷺ). وە لە (تهذیب السنن) دا هاتووە: بەڵام ئیبنوعەبباس ئەمەی بۆ کاتی پێویست ووتوە، وە بە هەمیشەیی ڕەوای نەکردووە، چونکە کاتێ پێی گەیشتەوە خەڵکەکە بەزۆری رویان تێ کردووە لێی پاش گەز بوەوەوە. وە خۆی حەرام کردنەکەی بۆ کەسێك دا ئەنا کە پێویستی پێی نەبێت.

(خطابي) ووتویەتی:سەعیدی کوڕی جوبەیر دەفەرموێت: بە ئیبنوعەبباسم ووت: ئەزانی چیت کرد و بەچی فەتوات دا؟...

بە فەتواکەت سوارەکان ڕۆیشتن وشاعیرەکان شیعریان پێیا هەڵدا. فەرموی: چیان ووتوە؟ ووتم: ووتویانە.

قد قلت للشيخ لما طال مجبسه يا صاح هل لك في فتيا ابن عباس؟

هل لك في رخصة الأطراف آنسة تكون مثواك حتى رجعة الناس؟

واتە: ووتم بەو پیرەی ماوەیەکی زۆرە بەندە ئەی هاوەڵەکەم فەتواکەی ئیبنو عەبباست ناوێ؟ ئایا لەلاشەو ئەندامی نەرم و ناسك هۆگرێکت ناوێ کە جێی حەوانەوەت بێت هەتا خەڵك دێنەوە بۆ لات.

ئەڵێ: ئیبنو عەبباس ووتی: (إنا لله وإنا إليه راجعون!) سوێند بەخوا من بەوە فەتوام نەداوە، وە ئەوەشم مەبەست نەبووە, وە تەنها بەو شێوەیەم حەڵاڵ کردووە وەك خوا مرداروەوە بوو و خوێن و گۆشتی بەرازی حەڵاڵ کردووە. وە بۆ بێچارە نەبێت حەڵاڵ نیيە، وە ئەوەش هەروەك مرداروەوە بوو خوێن و گۆشتی بەراز وەهایە.

بەڵام شیعەی ئیمامی بەلایانەوە دروستە؛ وە پایەکانیشی ئەمانەن لای ئەوان:

١- (صيغة) شێوەی دارشتنەکە: واتە بەزاراوەی (زوجتك) یا (أنكحتك) یا (متعتك) پەیمان پێك دێت.

٢- ژنەکە: مەرجەکە موسڵمان بێت یا لەسەر ئاینێکی ئاسمانی بێت. وە پەسەندە کە ئافرەتێکی داوێن پاکی‌موسڵمان هەڵبژێرێت، وە زیناکار کەراهەتی هەیە.

٣- مارەیی: ناوهێنانی مەرجەو بینینی بەسە، وە بەرازی بوونی هەردولا چەندایەتی دائەنرێ ئەگەر مشتێك گەنیش بێت.

٤- ماوە: ئەمەش مەرجە لە پەیمانەکەدا.

وە ئەمەش بەڕەزامەندی هەردولا بڕیار ئەدرێ وەك ڕۆژومانگ‌و ساڵ، وە ئەبێت هەر دیاری بکرێ. وە حوکمەکانی ئەم ژن هێنانە لای ئەوان ئەمانەی لای خوارەوەیە:-

١- باسی مارەیی‌و ماوەی تێك دان. پەیمانەکە پوچوڵ ئەکاتەوە، وە ناوهێنانی مارەیی بێ ناوهێنانی ماوەکە ئەو کارە هەڵئەگێڕێتەوە بۆ مارەکردنی دایمی‌و هەمیشەیی.

٢- منداڵ ئەدرێتەوە بە پیاو.

٣- نە تەڵاق و نە لیعان ناکەوێت بە موتعە.

٤- میرات لە یەکتری ناگرن.

٥- بەڵام منداڵ میراتی هەردولا وەرئەگرێ و ئەمانیش میراتی ئەگرن.

٦- عیددەکە تەواو دەبێت بە تەواو بوونی کاتەکەی بەوەی دوو حەیز ببینێت ئەگەر لەوانە بوو کە حەیز دەبینێ، وە ئەگەر لەوانە بوو کە حەیزی ئەبینی، بەڵام نەکەوتە حەیزەوە ئەوە عیددەکەی چل‌وپێنج ڕۆژە.

**مارەکردنی ئافرەت لەکاتێکدا مێرد نیەتی هەیە تەڵاقی بدات:**

زانایان لەسەر ئەوە ڕێکن کە ئەگەر کەسێك ئافرەتێکی مارەکرد بێ ئەوەی کات دیاری کردن بە مەرج دابنێت، بەڵام لە دڵیا هەبێت کە دوای ماوەیەك تەڵاقی بدات، یا دوای ئەوەی کارەکەی تەواو بوو لەو شارەی تێیدایە تەڵاقی بدات. ئەو مارەکردنە دروستە. وە ئەوزاعی بە پێچەوانەی ئەوان بە موتعەی داناوە.

شێخ رشید رضا بە تەعلیق لەسەر ئەوە لە تەفسیری (المنار)دا ووتویەتی: توندو تیژی زانایانی پێشین و دوایین لەسەر قەدەغەیی موتعە ئەوە ئەگەیەنێت کە مارەکردن بە نیازی تەڵاق دانیش هەر قەدەغە بێت، هەرچەندە زانایان دەفەرموون: پەیمانی ژن‌و مێردایەتی‌یەکە صەحیحە ئەگەر پیاوەکە لە دڵیا کاتەکەی دیاری کردبێت، بەڵام لە عەقدەکەدا بە مەرجی دا نەنابێت. بەڵام شاردنەوەکەی بە فێڵ‌و تەڵەکە دائەنرێ. وە ئەمەیان لە پێش ترە بەتاڵ بێت لەو پەیمانەی کە ماوە تێیدا مەرج بێت و بە ڕەزامەندی هەر دولاو سەپەرشتی‌کەری ژنەکە دامەزراوە. وە ئەوە هیچ خراپەیەکی تێدا نیە ئەوە نەبێت کە گاڵتە کردنە بەو پەیوەندی‌یە گەورەیە کە گەورەترین پەیوەندی‌یە لەنێوان ئادەمیزادا. وە هەروەها ئەبێتە هۆی لەوەڕاندنی ئارەزوی ئارەزوبازان لەم لاولەولادا و ئەو خراپی‌یانەی کە بە هۆی ئەوەوە پەیدا ئەبێت. وە ئەو مارەکردنەی کە کات دیاری کردن تیایدا بە مەرج دانانەدرێت سەرڕای ئەو خراپی‌یانە خیانەت و فریودانیشە، کە چەندەها خراپەی تریشی لێ ئەکەوێتەوە لە دوژمنایەتی و ڕق و کینەو بڕوا نەمان هەتا بە ڕاستگۆکانیش، کە حەقیقەتی زەواج مەبەستیانە، کە

پاك ڕاگرتنی هەریەکە لە ژن و پیاوە بۆ یەکترو دڵسۆزی و هاوکاری‌یانە لەسەر دامەزراندنی ماڵێکی چاك لە ماڵەکانی ئەم نەتەوەیە.

### تۆژینەوەی شەوکانی ڕەحمەتی خوای لێ بێت

شەوکانی دەفەرموێت: بە هەر حاڵ ئێمە گوێڕایەڵی هەموو ئەوانەین کە پێمان دەگات لە لایەن خوای گەورە و پێغەمبەرەکەی، وە بە صەحیحی گەیشتووە پێمان کە موتعە هەتا هەتایە حەرام کراوە، وە موخالەفەی کۆمەڵێك لە صەحابە نابێتە تێکدەری ئەو بەڵگەیە، وە نابێتە بەهانە بۆ ئێمە کە کاری پێ بکەین.

چۆن وا ئەبێت لە کاتێکدا جومهوری صەحابە ئەمەیان وەرگرتووەو کاریان پێ کردووە، وە بۆمانیان گێڕاوەتەوە ؛هەتا ئیبنو عومەر خوای لێ ڕازی بێت دەفەرموێت: (وەك ئیبنوماجە بۆمان دەگێڕێتەوە بە سەنەدێکی صەحیح) کە پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێی پێ داین کە سێ ڕۆژ موتعە بکەین، پاشان حەرامی کرد، سوێند بە خوا نابینیم کەسێکی خێزاندار موتعە بکات، ئیللا بەردەبارانی ئەکەم[1].

وە ئەبو هورەیرە لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە دەفەرموێت: (هدم المتعةَ الطلاقُ والعدَّةُ والميراثُ). واتە تەڵاق و عیددەو میرات موتعەی ڕوخاند. (دارقطني) تەخریجی کردووە، وە (حافظ) بە حەسەنی داناوە[2].

وە بونی (مؤمل ابن إسماعيل) لە سەنەدەکەیدا نابێتە هۆی ئەوەی سەنەدەکەی حەسەن نەبێت، ئەگەر ئەو شایەتانەی کەش کە بەهێزی ئەکەن، بهێنرێتە لای، هەر وەك فەرمودەکانی تری (حسن لغيره).

ئەمما ئەوەی دەوترێت کە حەڵاڵ کردنی موتعە ئیجماعی لەسەرە، وە ئەوەی ئیجماعی لەسەر بێت (قطعي) براوەیە، وە حرام بوونەکەی خیلافی لەسەرە، وە شتێك خیلافی لەسەر بێت (ظني) جێی گومانە، وە (ظني)ش نەسخی (قطعي) ناکاتەوە. بەمە وەڵامی ئەدرێتەوە:

یەکەم: بە بەرگری کردنی ئەم دەعوایە ـ کە (ظني) نەسخی (قطعي) ناکاتەوە ـ چونکە کامەیە بەڵگە لەسەر ئەمە؟ وە تەنها ئەوەی کە مەزهەبی جومهورە شتێکی قەناعەتکەر نی‌یە، بەڵکو داوا لە بەرامبەرەکەی دەکرێت بەڵگەی عەقلی و سەمعی و ئیجماع بهێنێت.

---

(١) مسلم (١/١٤٥) وابن ماجه (١٩٦٣) مسلم (١٤٠٥/١٦).

(٢) دارقطني (٣/٢٥٩).

وە دووەم: نەسخ کردن و سڕینەوە بەم (ظني)یە بۆ بەردەوامێتی (ظني) یە نەك (قطعي).

ئەمما خوێندنەوەی ئیبنوعەبباس و ئیبنو مەسعود و ئوبەی کوڕی کەعب و سەعیدی کوڕی جوبەیر بۆ ئەم ئایەتە: (فما استمتعتم به منهن إلى أجل مسمى) بەم شێوەیە، ئەوە قورئان نییە بەلای ئەوانەوە کە (تواتر) بە مەرج دائەنێن، وە سوننەتیش نییە لەبەر ئەوەی ڕیوایەت کراوە وەك قورئان، کەواتە وەك تەفسیرێك ئەبێت بۆ ئایەتەکە، کە ئەمەش بەڵگە نییە بەڵام لای ئەو کەسانەی کە (تواتر) بە مەرج دانانێن، هیچ ڕێگرێك نییە لەوەی کە (ظني) سوننەت، (ظني) قورئان نسخ بکاتەوە، وەك لە (أصول)دا هەیە. قسەکەی شەوکانی تەواو بوو.

### مارەکردنی حەڵاڵ کردنەوە (مارە بەجاش)

ئەمەش ئەوەیە کە کەسێك ئافرەتێکی عیدە تەواو بووی تەڵاق دراو مارە بکات، یا بچێتە لای لەپاشاندا تەڵاقی بداتەوە بۆ ئەوەی بۆ مێردی یەکەمی حەڵاڵ بێتەوە. حوکمەکەی: ئەم جۆرە مارەکردنە یەکێکە لە گوناهە گەورەکان و تاوانە هەرە خراپەکان، کە خوا حەرامی کردووەو نەفرینی لە بکەری کردووە.

١- لە ئەبی هورەیرەوە: کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (لعن الله المحلّل والمحلّل لـه) رواه أحمد بسند حسن[١].

واتە: نەفرینی خوا لەسەر ئەوکەسە بێت کە ژنێك ئەهێنێت بۆ ئەوەی حەڵاڵی بکاتەوە بۆ پیاوە کۆنەکەی‌و نەفرینی خواش لەو پیاوە بێت کە ژنی بۆ حەڵاڵ ئەکرێتەوە.

٢- وەلە عبدالله ی کوڕی مەسعودەوە کە دەفەرموێت: (لعن رسول الله صلى الله عليه وسلم المحلِّل والمحلَّل له) رواه الترمذي، وقال هذا حديث حسن صحيح.

وە ئەم فەرمودەیە لە چەند ڕوی ترەوە لە پێغەمبەرەوە گێڕراوەتەوە[٢].

وە زانایانی صەحابە کاریان بەو فەرمودەیە کردووە. لەوانە: عومەری کوڕی (خطاب) و عوسمانی کوڕی (عفان) و عبدالله ی کوڕی عومەر و چەند کەسی تر. وە ئەوەش ڕای زانایانی تابیعی بووە.

---

(١) أحمد (٢/٣٢٣) وأبوداود (٢٠٧٦) وهو صحيح. (صحيح سنن أبي داود ١٨٢٧) للألباني (رحمه الله).

(٢) أحمد (١/٤٥٠-٤٥١) والنسائي (٦/١٤٩) والترمذي (١١٢٠) وابن ماجه (١٩٢٤-١٩٢٥) عن علي وابن عباس وأبوداود (٢٠٧٧) وهو صحيح، أنظر (الإرواء ١٨٩٧) والمشكاة (٣٢٩٦).

٣- وه له عوقبەی کوڕی عامیرەوە: که پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (ألا أخبركم بالتيس المستعار؟ قالوا: بلى يا رسول الله، قال: هو المحلِّل لعن الله المحلِّل والمحلَّل له) رواه بن ماجه والحاكم.

واته: ئایا پێتان ڕانەگەیەنم کەڵەگای بەکرێ گیراو کێیە؟ ووتیان: بەڵێ ئەی نێردرای خوا پێمان ڕابگەیەنە. فەرمووی: ئەوکەسەیە کە ئافرەت مارە ئەکات بۆ ئەوەی حەلاڵ بێتەوە بۆ پیاوی یەکەمی نەفرینی خوا لە هەردو پیاوەکە بێت.

ئەبو (زُرعة) و ئەبو حاتەم ئەم فەرمودەیەیان عیللەت دار کردووە بەوەی مورسەلە. وە بوخاری ئینکاری لێ کردووە. وە یەحیای کوڕی عوسمانی تێدایەکە لاوازە[1].

٤- وەلە ئیبنو عەبباسەوە: کە پێغەمبەر ﷺ پرسیاری لێ کرا دەبارەی ئەوکەسەی ئافرەتێک مارەبکات بۆ ئەوەی حەلاڵی بکاتەوە بۆ پیاوەکەی پێشووی فەرمویەتی: (لا إلا نكاح رغبة، ولا دلسة، ولا استهزاء بكتاب الله عزوجل، حتى تذوق عسيلته) رواه ابو إسحاق الجوزجاني[2].

واته: هیچ نیکاحێك و مارەکردنێك نییە. ئیللا نیکاحێك کە بە ویست و ڕەزامەندی نەبێت، نەك نیکاحی فێڵ و تەڵەکەو گاڵتە کردن بە کیتابی خوای گەورە، تاوەکو چێژو تام لە هەنگوینەکەی نەکات.

وە لە عومەرەوە خوا لێی ڕازی بێت کە دەفەرموێت: هەر حەلاڵکەرو حەلاڵ بۆ کراوێکم بۆ بهێنن بەردە بارانیان ئەکەم.

٥- پیاوێك پرسیاری لە ئیبنوعومەر کرد ووتی: چی دەڵێیت دەربارەی ئافرەتێك خواستم بۆ ئەوەی بۆ پیاوەکەی حەلاڵ بکەم، وە ئەو خۆی داوای لێ نەکردوم و ئاگاشی لێی نییە؟ ئیبنوعومەر فەرموی: هیچ نیکاحێك دروست نییە، ئیللا نیکاحێك نەبێت کە بە ویست و ڕەزامەندی بێت، ئەگەر بە دڵت بوو بیهێڵەوە وە ئەگەر بە دڵت نەبوو لێی جیا بەرەوە، و ئێمە ئەمەمان بە داوێن پیسی دەزانی لەسەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ[3].

---

(١) ابن ماجه (١٩٣٦) وحاكم (٢/١٩٩) وە حەدیسەکە حەسەنە وەك شێخ ئەلبانی دەفەرموێت. بڕوانە (الإرواء ٦/٣٠٩-٣١٠).

(٢) إبن ماجة (١٩٣٦) والحاكم (٢/١٩٩).

(٣) حاكم (٢/٥٦٢) (٢٨٦٠) و (طبراني في الأوسط) هەروەك لە (مجمع) دا (٤/٢٦٧) وە دەفەرموێت: پیاوەکانی پیاوانی صەحیحین.

وه فەرمووی: بەردەوام هەردوکیان زینا ئەکەن با بیست ساڵیش بەسەریەکە بن، ئەگەر زانرا ئەو مەبەستی بووە کە حەڵاڵی بکات.

ئەو دەقانەی سەرەوە ڕاستو ڕێکن دەربارەی پوچەڵیو نادروستی ئەو جۆرە ژنو مێردایەتیەیە. چونکە نەفرین تەنها لە کەسێك ئەکرێ کە لەسەر شتێکی ناشەرعی بێت، وە ئەو ژنە کە حەڵاڵ ناکاتەوە بۆ پیاوی یەکەمی، ئەگەرچی مەرجی ئەوەشی تێدا نەهێنی لەکاتی پەیمانەکەدا. مادام مەبەستی حەڵاڵ کردنی هەبێت، چونکە ئیعتیبار بە نییەتو مەبەست ئەکرێ.

ئیبنوقەییم دەفەرموێت: لای خەڵکی مەدینەو ئەهلی حدیث و زاناکانی جیاوازی نیە لەوەدا کە ئەو مەرجە بە ووتن بێت، یا بەنیازو ڕێك کەوتن بێت، چونکە بەلای ئەوانەوە لە عەقدەکانا مەبەست ئیعتباری بۆ ئەکرێ. وە کارەکانیش بەپێی نیازن. وە ئەو مەرجەی کە هەردو لایەنی عەقدەکە لەسەری ڕێك کەون، بەلای ئەوانەوە وەك ئەوە وایە کە ووترابێت، چونکە زاراوەکان بۆ خودی خۆیان مەبەست نین، بەڵکو لەبەر ئەوەیە مانا ئەبەخشن، جا کاتێك ماناو مەبەست ئاشکرا بوو، ئیتر سەیری زاراوەکان ناکرێت، چونکە ئەوان تەنها هۆکارن، وە کە مەبەست و نیازەکان هاتنەدی ئیتر حوکمەکان لەسەری دائەنرێ. جا چۆن ئەوروترێت ئەو زەواجە ژنەکەی پێ حەڵاڵ ئەبێتەوە بۆ پیاوی یەکەمی، لەگەڵ ئەوەدا کە مەبەستی بۆ ماوەیەك بێت، ئیتر نیازی بە سەریەکەوە ژیانی نەبێت و نیازی ئەو شتانەی نەبێت کە مەبەستن لە زەواج، وەك منداڵ بوون و پەروەردە کردنیان و گەلێکی تر لە مەبەستە ڕاستەقینەکانی زەواج بەڕاستی ئەم جۆرە ژن هێنانە شکڵی بە درۆو خەڵەتاندنە،

وە خوای گەورە دای نەناوە لە ئاینی ئیسلام دا، وە بۆ کەسی ڕەوا نەکردووە، چونکە خراپەو زیانی زۆری تێدایە کە لە کەس شاراوەنیە.

ئیبنوتەیمیە دەفەرموێت: ئاینی خوا پاکترو بێگەردترە لەوەی داوێنی ئافرەتێك حەرام بکات هەتا کەڵەگایەکی بۆ بگیرێ کە ڕەغبەتی لە مارەکردنی نەبێت و نەیەوێ تێکەڵی بێتو ئەسڵەن نەیەوێ لەگەڵ ئەو ژنەدا بمێنێتەوە، جا جوت ببێ لەگەڵیاو بەوە حەڵاڵ بکرێ، بەڕاستی ئەوە زینایەو داوێن پیسیە، هەر وەك صەحابەی پێغەمبەر ﷺ ناویان بردووە، جا چۆن کاری حەرام حەڵاڵ کەر دەبێت؟ یا چۆن شتی پیس پاك کەرەوە ئەبێت؟ وە شاراوە نیە بۆ کەسێك خوا دڵی کردبێتەوە بۆ ئیسلام و دڵی بە ڕۆشنایی باوەڕ ڕوناك کردبێتەوە کە ئەوە زشت ترینی کارە بەدەکانە کە هیچ خاوەن عەقڵێك نایکات, ئیتر چۆن یاسای پێغەمبەران بڕیار لەسەر شتی وەها ئەدا بەتایبەتیش چاکترین یاسا و پیرۆزترین مەنهەج. (تەواو).

ئائەمە حەقە، وە مالیك و ئەحمد و ثه وری و ئەهلی (ظـاهر) و زانایانی تـریش جگـه لـەمان بۆی چوون، وەك حەسەن و نەخەعی و قەتادە و لەیث و وئیبنومویارەك.

بەڵام هەندێکی تر بۆ ئەوە چوون کـه دروسـتـه ئەگـەر لـەکاتی مارەکردنەکـەدا نەکرێتـه مـەرج. چونکه حوکم بەسـەر ڕواڵەتـدا ئـەدرێ نـەك بەسـەر مەبەسـتو دەرونـدا، وە نییـەت لـە عەقدەکانا ئیعتباری پێ ناکرێت.

شافیعی دەفەرموێت: ئەو حەڵاڵ کەرەی نیکاحەکەی فاسیدە ئەوەیە کە ژنێك ئەهێنی بۆ ئەوەی حەڵاڵی بکاتەوە لەپاشاندا تەلاقی بدات، بەڵام ئەگەر لە عەقدی نیکاحەکەدا ئەوەی بە مەرج نەگرت، ئەوە عەقدەکە صەحیحە.

ئەبوحەنیفەو (زفر) ووتویانە: ئەگەر ئەوە کرایە مەرج کاتی مارەکردن، وەك ئەوەی بەڕاشکاوی بڵێ کە ئەو حەڵالی ئەکات بۆ یەکەم، ئەوە بۆ یەکەم حەڵاڵ ئەبێتەوە، بەڵام کەراهەتی هەیە چونکە عەقدی زەواج بە مەرجە فاسیدەکان باتڵ نابێتەوە، جا بۆ مێردی یەکەم حەڵاڵ ئەبێتەوە، پاش ئەوەی کە مێردی دووەم تەلاقی بدات، یان بمرێت و عیددەکەی بەسەر بچێت. هەرکاتێ پیاوی دووەم تەلاقی بداتەوە یا بمرێ دوای تەواوبوونی عیدەکەی. وەلای ئەبویوسف عەقدە کە فاسیدە چونکە زەواجێکی موەقەتە واتە کاتییە. وە محمد ڕای وەهایە کە پەیمانی دووەمی دروستە، بەڵام بۆ پیاوی یەکەمی حەڵاڵ ناکاتەوە.

**ئەو شوکردنەی کە تەلاق دراوەکە پێی حەڵاڵ بێتەوە بۆ پیاوی یەکەمی:**

ئەگەر پیاوێك ژنەکەی سێ‌بەسێ تەلاق دا دروست نیـیە بیگێڕێتەوە تاوەکو لە دووای تەواو بوونی لە عیددەکە شوو بە پیاوێکی تر ئەکات بە خواستنێکی صەحیح نەك بە مەبەستی تەحلیل کردن .

جا ئەگەر پیاوی بە ڕەغبەت و ئارەزووەوە هێنایو چووە لای بەڕاستی هەتا هەرکامێکیان تامی ئەوی تریانی کرد، لە پاشاندا لێی جیا بۆوە بە تەلاق دان یا بە مردن، ئەو کاتە حەڵاڵە بۆ پیاوی یەکەم جارێکی تر مارەی بکاتەوە دوای تەواوبونی عیددەکەی.

شافیعی و ئەحمد و بوخاری و موسلیم لە عائیشەوە ئەگێڕنەوە کە دەفەرموێت: ژنەکەی ڕیفاعەی (قرظي) هاتە لای پێغەمبەر ﷺ پێی وت: من لای ڕیفاعە بووم و تەلاقی دام: عیدەکەم کۆتایی هات و عبد الرحمن ی کوڕی زوبەیر مارەی کردم، بەڵام شتەکەی ئەڵێی چمکە

کراسه، پەلکە- پێغەمبەر ﷺ زەردە خەنە گرتی‌و فەرموی: ئەتەوێ بگەڕێیتەوە لای ڕیفاعە[1]؟.. نا.. نابێت هەتا تام لە عوسەیلەکەی نەکەیت و ئەویش تام لە عوسەیلەکەت نەکات واتە: هەتا نەچنە لای یەك‌و جیماع نەکەن[2].

وە ئەوەندە بەسە شوێنی خەتەنەکان لە یەك بدەن و خۆشتن‌و حەد پێویست بکەن، وە لەو بارەیەوە فەرمودەی خوای گەورە هاتە خوارەوە کە ئەفەرموێ: ﴿فَإِنْ طَلَّقَهَا فَلا تَحِلُّ لَهُ مِنْ بَعْدُ حَتَّى تَنْكِحَ زَوْجاً غَيْرَهُ فَإِنْ طَلَّقَهَا فَلا جُنَاحَ عَلَيْهِمَا أَنْ يَتَرَاجَعَا إِنْ ظَنَّا أَنْ يُقِيمَا حُدُودَ اللَّهِ﴾ (البقرة: من الآية٢٣٠) واتە: ئەگەر پیاو ژنەکەی خۆی تەلاقدا بە تەلاقی سێهەمی، ئیتر بۆی حەلاڵ نی‌یە ئیللا مەگەر شوو بکات بە پیاوێکی تر شوکردنێکی ڕاست و جیماعی لەگەڵا بکات، وە ئەبێ زەواجەکە بە ڕەغبەت بێ نەك بە نی‌یەتی حەلاڵ کردنەوەی ژنەکە بێت بۆ پیاوی یەکەمی، جا ئەگەر ئەم پیاوەی دووایی تەلاقی دا یان مردو عیددەکەی تەواو بوو، تاوان نی‌یە لەسەر ژنەکەو مێردە یەکەمەکەی کە بگەڕێنەوە بۆ لای یەکتر، بە عەقدێکی تازەو مارەیی تازە، ئەگەر زانی‌یان حوکمەکانی خوا ڕائەگرن.

لەسەر ئەمە ژن حەلاڵ نابێتەوە بۆ پیاوی یەکەمی بەم مەرجانە نەبێت:-

١- دەبێت شوکردنی بە مێردی دووەم شوکردنێکی صەحیح بێت[3].

٢- دەبێت شوکردنەکە بە خواست و ویست بێت.

٣- ئەبێ ئەو پیاوە دووای عەقدەکە بە ڕاستی بچێتە لای و تام و چێژ لە یەکتر وەربگرن.

**حیکمەتی ئەوە چی‌یە:**

زانایان و موفەسسرین لە حیکمەتی ئەوەدا دەفەرموون: ئەگەر پیاو زانی ئەو ژنەی کە سێ جار تەلاقی‌داوە، پێی حەلاڵ نابێتەوە هەتا شوو بە پیاوێکی تر نەکاتەوە، ئیتر بەخۆیا دێتەوەو واز

(١) البخاري (٥٢٦٠) ومسلم (١٤٣٣/١١١).

(٢) زانایان ئەمەیان کردووە بە بەڵگە کە ئەگەر ئافرەت یا سەرپەرشت کەرەکەی نییەتی حەلاڵ کردنەوەی بێت، بەڵام پیاوەکە ئەوەی نیاز نەبێت، ئەوە بە هیچ دانانرێ و تەئسیر ناکاتە سەر عەقدەکە. هەروەها مێردی یەکەمیش، چونکە ئەو خاوەنی ئەو عەقدە نی‌یەو توانای لابردنی نی‌یە، کەواتە ئەو بێگانەیە، وە تەنها لەبەر ئەوە نەفرینی لێ کراوە ئەگەر بەم حەلاڵ کردنەوەیە بگەڕێتەوە بۆ لای ژنەکە، چونکە ئەو ژنە پێی حەلاڵ نی‌یە، کەوابێ زینا ئەکا.

(٣) زەواجی فاسد تەلاق دراوی سێ بەسێ حەلاڵ ناکاتەوە.

ئەهێنێ، چونکە ئەوە لەو شتانەیە کە غیرەت و مەردایەتی پیاو پێی ڕازی نابێت. بە تایبەتی ئەگەر پیاوی‌دووەم دوژمنی ئەو بێت یا چاویان بەیەك بکەوێت.

خاوەنی تەفسیری (منار) لە تەفسیرەکەیدا[1]: ئەفەرموێت: ئەو پیاوەی ژنەکەی تەلاق ئەدا لەپاشان بۆی دەرئەکەوێ کە ناتوانێ وازی لێ بهێنێ، دووبارە ئەیهێنێتەوەو پەشیمان ئەبێتەوە لە تەلاق دانی، لە پاش ئەوە ژیان لە گەڵیا ناخۆش ئەبێتەوە جا تەلاقی ئەداتەوە، لە پاشاندا هەست بەوە ئەکا پێویستی پێی هەیە وە ناتوانێ وازی لێ بهێنێ، دووبارە ئەی‌گێڕێتەوە، ئیتر بەوە ژنەکەی بۆ تاقی ئەبێتەوە. چونکە تەلاقی یەکەم جاری بەبێ بیکردنەوە بووەو بە ڕاستی نەی زانیوە کە ئەوەندە پێویستی بەو ژنە هەیە. بەڵام تەلاقی دووەم جار بەو شێوە نابێت، چونکە دوای پەشیمانی لەسەر ئەوەی یەکەم جاری بووە، و دوای هەست کردن بەوەی کە ئەیکا هەڵەی کردووە، لەبەر ئەوە ووتمان تاقی کردنەوەکە بەوە تەواو ئەبێت. جا ئەگەر دوای ئەوە گێڕایەوە مانای وایە هێڵانەوەی بە چاکتر ئەزانێ لە وازلێ هێنانی. وە دوورە لەوە بگەڕێتەوەو واز لێ هێنانی بە چاکتر بزانێ دوای ئەوەی بەچاوی خۆی تاقی کردنەوەی واز لێ هینانی بینێ. جا ئەگەر گەڕایەوەو سێیەم جار تەلاقی دا، ئەوە ئەو پیاوە کەم هۆش‌و کەم ڕەوشتە.

وە حەقی ئەوەی نی‌یە کە ئافرەت بکات بە تۆپێك بە دەستی‌یەوە هەر کاتێك دڵی ویستی فڕێی بدات، وە هەرکاتێ هەوەسی ویستی بیگێڕێتەوە. بەڵکو حیکمەت لەوەدایە کە بەتەواوی لێی بسێنرێتەوەو کاری بەسەریەوە نەمێنێ، چونکە زانرا کە باوەڕ ناکرێ یەکگرنەوەو سنوورەکانی خوا ڕابگرن، جا ئەگەر ڕێکەوت دوای ئەوە ئەو ئافرەتە مێردی کرد بە پیاوێکی تر بە ئارەزوی خۆی، وە وەها ڕێکەوت کە ئەویش تەلاقی دایەوە یا مرد، لە پاش ئەوە پیاوی یەکەم حەزی کرد بیهێنێتەوە - وە ئاگای لەوە بوو کە چۆتە سەر جێگای پیاوێکی تر﴾ وە ئافرەتەکەش حەز بکات جارێکی تر بگەڕێتەوە لای ئەو پیاوە، ئەوە ئومێدی یەکگرتنیان و ڕاگرتنیان بۆ سنورەکانی خوا زۆر بەهێز دەبێت، هەر بۆیە دووای عیددە بۆی حەڵاڵ بۆتەوە.

### ئەو صیغە عەقدەی کە بەرامبەر بە مەرجێك بێت

ئەگەر پەیمانی ژن‌و مێردایەتی بەرامبەر کرا بە مەرجێك: یان ئەوەتا ئەو مەرجە لە پێداویستی‌یەکانی عەقدەکەیە یان پێچەوانەیەتی- یا لەوانەیە کە سوودەکەی دەگەڕێتەوە تەنها بۆ

(١) (ج٣ ص ٣٩٢).

ئافرەتەکە؛ یا لەو مەرجانەیە کە شەرع قەدەغەی کردووە. بۆ هەریەکە لەم شێوانە حوکمی تایبەتیھەیە کە بەکورتی باسیان ئەکەین:

(١) ئەو مەرجانەی کە پێویستە بەجێ بهێنرێن :

هەندێك مەرج هەن پێویستە جێبەجێ بکرێن ئەویش ئەوانەیە کەلە پێداویستیەکانی پەیمانەکەو مەبەستەکانی بن[1]، وە گۆڕانی حوکمی خواو پێغەمبەری تێدا نەبێت، وەك بە مەرج گرتنی ئەوەی کە لەگەڵیا بەچاکی بژی و بەخێوی بکاتو شوێنی چاکی بۆ دابین بکات و درێغی نەکات لە حەقیا و وەك خێزانەکانی تری مافی خۆی بداتێ، وە هەروەها بە مەرج بگیرێ کە ژنەکە بەبێ ئیزنی ئەو نەچێتە دەرێو لە فەرمانی دەنەچێت و بەبێ ئیزنی ئەو ڕۆژوی سوننەت نەگرێت، وە نەهێڵێت کەس بێتە ماڵەکەی بەبێ ڕەزامەندی ئەو، وە بە ڕەزامەندی ئەو نەبێت تەسەرروف لە ماڵکەیدا نەکات وە ڕێنەی ئەمانە.

(٢) ئەو مەرجانەی کە پێویست نیٖیە جێ بەجێ بکرێت:

وە ئەومەرجانەی کە پێویست نیٖیە بەجێ بهێنرێن لەگەڵ دروستی پەیمانەکەشدا، ئەو مەرجانەیە کە پێچەوانەی پێداویستیەکانی پەیمانەکەیە وەك مەرجی نەفەقە نەکێشان یا نەچونەلا یا مەرجی ئەوەی مارەیی نەبێت، یا ئەوەی (عزل)ی لێ بکات، یا مەرجی ئەوەی ئافرەتەکە نەفەقە بدا بە پیاوەکە، یا شتێکی بداتێ، یا حەفتەی یەك شەو نەبێت لای نەبێت، یا مەرجی ئەوی لەگەڵ بکات کە بەڕۆژ بچێتە لای نەك بەشەو.

ئەم جۆرە مەرجانە هەموویان بەتاڵن لە خۆیاندا؛ چونکە پیچەوانەی پەیمانی ژن و مێردایەتین، وە لەبەر ئەوەی ئەم مەرجانە کۆمەڵێ ماف لائەبەن کە بە عەقد پێویست ئەبن پێش ئەوەی ببەسترێ، کەواتە دروست نیٖیە. وەك ئەوەی دوو هاوبەش یەکێکیان بەشەکەی خۆی لاببەرێ پێش فرۆشتن.

بەڵام عەقدەکە خۆی لەخۆیدا دروستە؛ چونکە ئەم مەرجانە دەگەڕێتەوە بۆ مانای زیادە لە عەقدەکە، کە مەرج نیٖیە باس بکرێن و نەزانینیشی زیانی نیٖیە، لەبەر ئەوە پەیمانەکە پوچەڵ نابێتەوە. وەك و چۆن مارەییەکی حەرام بکاتە مەرج؛ وە لەبەر ئەوەی زەواج دروستە بە (عوض) بریتی لەگەڵ نەزانینا، هەروەهاش دروستە لەگەڵ مەرجی فاسیدا.

(٣) ئەو مەرجانەی کە سوودی ئافرەتەکەی تێدایە:

---

(١) النووي: شرح مسلم.

وەلەو مەرجانەی کە سوودەکەی ئەگەڕێتەوە بۆ ئافرەتەکە، وەك ئەوەی کە مەرج دابنێ کە لە ماڵەکەی خۆی دابێت یا لە شارەکەی خۆیدا، یا نەیبات بۆ سەفەر یا ژنی بەسەر نەهێنێ و ئەو جۆرە شتانە.

لەناو زانایان دا هەیە ڕایان وەهایە مارەکردنەکە دروستە و ئەم مەرجانە پوچەڵن و لەسەر پیاو نیە بەجێیان بهێنێ.

وە هەیانە ڕای وایە لەسەر پیاو پێویستە وە فا بەو مەرجانە بکات کە ژنەکە دایان ئەنێت، وە ئەگەر وەفایان پێ نەکات پەیمانەکە (فسخ) هەڵئەوەشێتەوە، یەکەمیان مەزهەبی ئەبو حنیفە و شافیعی و زۆر لە زانایانە، وە ئەمانەی لای خوارەوە شیان کردۆتە بەڵگە:

١- پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: (المسلمون على شروطهم، إلا شرطاً أحل حراماً أو حرم حلالاً)[١].

واتە: موسڵمانان لەسەر مەرجەکانیانن، ئیللا مەرجێك نەبێت حەرامی حەڵاڵ کردبێ یا حەڵاڵی حەرام کردبێ.

وە دەفەرمون: ئەو مەرجە کە کردویانەتە مەرج حەڵاڵی حەرام کردوە، کە ئەویش ژن هێنان و ڕۆیشتن و سەفەرە. ئەمانەش هەمویان حەڵاڵن.

٢- وە فەرمودەی پێغەمبەر ﷺ کە ئەفەرموێ: (كل شرط ليس في كتاب الله فهو باطل وإن كان مائة شرط)[٢].

واتە: هەر مەرجێك لە کیتابەکەی خوادا نەبێت ئەوە باتڵە ئەگەر سەد مەرجیش بێت.

دەفەرمون: وە ئەمە لە کیتابەکەی خوادا نین چونکە یاسای ئیسلام دای نەناون.

٣- وە دەفەرمون: ئەو مەرجانە لەبەرژەوەندی پەیمانەکەو پێداویستیکانی نیە.

وە ڕای دووەم مەزهەبی عومەری کوڕی خطاب و سەعدی کوڕی ئەبی وەققاص و موعاویە و عەمری کوڕی عاص و عومەری کوڕی عبد العزيز و جابری کوڕی زەید و طاوس و ئەوزاعی و ئیسحاق و حەنبەلیەکانە، و ئەمانەی خوارەوەشیان کردۆتە بەڵگە:

---

(١) أبوداود (٣٥٩٤) والترمذي (١٣٥٢) وابن ماجه (٢٣٥٣) وە حەدیسەکە صەحیحە بڕوانە (الإرواء ١٣٠٣).

(٢) رواه الشيخان وأحمد (٦/٢١٣) وابن ماجه (٢٥٢١) والحديث صحيح أنظر الإرواء (١٣٠٨).

١- خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا أَوْفُوا بِالْعُقُودِ﴾ (المائدة: من الآية١) واتە: ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە پەیمانەکانتان بەجێ بهێنن.

٢-وە فەرموودەی پێغەمبەری خوا ﷺ کە فەرمویەتی: (المسلمون على شروطهم)[1] واتە: موسڵمانان لەسەر مەرجەکانی خۆیانن.

٣- بوخاریو مسلم و جگە لەوان گێڕاویانەتەوە لە عوقبەی کوڕی عامیرەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: (أحق الشروط أن يوفى به ما استحللتم به الفروج)[2]. واتە:لە پێش ترین مەرج کە ئەبێ بەجێ بهێندرێ، ئەو مەرجانەیە کە ئافرەتانی پێ حەڵاڵ ئەکەن بۆ خۆتان.

٤- أثرم بە ئیسنادی خۆی ئەگێڕێتەوە: پیاوێك ژنێکی مارەکرد بە مەرجێك هەر لە ماڵی ژنەکەدا بێت لە پاشاندا ویستی لە ماڵی ژنەکەدا نەمێنن. چوونەلای عومەری کوڕی خطاب خوا لێی ڕازی بێت شکاتیان کرد فەرموی: ئەبێ مەرجەکەی بۆ جێبەجێ بکرێ، چونکە (مقاطع الحقوق عند الشروط) واتە: شوێنی پچڕاندنی مافەکان لای مەرجەکانە.

٥- وە چونکە ئەو مەرجە قازانج و مەبەستی تێدایە، کە ڕێ لە مەبەستی ژنو مێردایەتی ناگرێ لەبەر ئەوە پێویستە بەجێ بێت، وەك ئەوە وەهایە کە مەرجی زیادی مارەیی دانابێ.

ئیبنو قودامە ئەم ڕایە تەئکید ئەکاو ڕای یەکەم پوچەڵ ئەکاتەوە وە ئەفەرموێت: بە ڕاستی قسەی ئەوانەی کە ناومان بردن لەصەحابەکان، لە سەردەمی خۆیاندا کەس موخالفیان نەبووە، کەواتە بووە بە ئیجماع. وە ئەوەی پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (كل شرط...الخ) مانای وایە لە حوکمی خواو یاسای خوادا نەبێت،

بەڵام ئەوانە شتێکی مەشروعن، وە لە پێشەوە باسی مەشروعیمان کرد، هەرچەندە جیاوازی لە مەشروعی بونیان هەیە, وە ئەوانەی نەفی مەشروعی بونیان ئەکەن ئەبێ بەڵگە بهێننەوە.

وە ئەو قسەیە کە ئەڵێن: ئەوە حەڵاڵ حەرام ئەکات، ئێمەش ئەڵێین: حەڵاڵ حەرام ناکات، بەڵکو ئیختیاری هەڵوەشاندنەوەی عەقدەکە بۆ ژنەکە سابت ئەکات، ئەگەر پیاوەکە مەرجەکان بەجێ نەهێنێت .

---

(١) تەخریجی ئەم حەدیسە ڕابورد.

(٢) بخاري (٢٧٢١) ومسلم (١٤١٨).

وە ئەو قسەیە کە ئەڵێن: لە بەرژەوەندی پەیمانەکە نییە ئێمەش ئەڵێین: ئەوە ناسەلمێنین. چونکە لە بەرژەوەندی ئافرەتەکەیە، وە ئەوەی لە بەرژەوەندی پەیمان بەستەکان بێت لە بەرژەوەندی پەیمانەکەشە.

وە ئیبنو روشد[1] فەرمویەتی: هۆی جیاوازی زانایان، بەرەنگاری کردنی عمومە بۆ خصوص، عموم حەدیسەکەی عائشەیە خوا لێی ڕازی بێت کە پێغەمبەر ﷺ ووتاری بۆ خەڵك داو فەرموی: (کل شرط لیس في کتاب الله فهو باطل ولوکان مئة شرط)[2]. واتە: هەر مەرجێ لە کیتابەکەی خوادا نەبێت ئەوە باتڵە، با سەد مەرجیش بێت. وە خصوصیش حەدیسەکەی عوقبەی کوڕی عامیرە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (أحق الشروط أن یوفی به ما استحللتم به الفروج)[3]. واتە: لەپێشترین مەرج کە ئەبێ بەجێ بهێنرێ ئەو مەرجانەیە کە ئافرەتی پێ حەڵاڵ ئەکەن بۆ خۆتان.

وە هەردوو حەدیسەکە صەحیحن، بوخاری و موسلیم تەخریجیان کردووە.

بەڵام ئەوەی لای زانایانی ئوصول بەناوبانگە ئەوەیە کە حوکمی خاص بەسەر عام دا ئەدەن، کە ئەویش (پێویست بوونی بەجێ هێنانی مەرجەکانە).

وە ئیبنو تەیمیە فەرموویەتی: نیازو مەبەستی مرۆڤە عاقڵەکان ئەگەر چووە ناو پەیمانەکانەوەو لە بەرژەوەندی پەیمانەکە بوو کە هەر ئەوەش مەبەستە، ئەوە بە فیڕۆ ناڕوات، وەك دواخستنی ماوە لە (أعواض) بریتی‌یەکانا، وە وەك و ئەو پارە (معجل)ەی کە لە نرخە دیاری کراوەکان ئەدرێ لە هەندێ وولاتدا، وە وەك سیفاتی شتە فرۆشراوەکان، وە وەك پیشەی بە مەرج دانراو لەسەر یەکێ لە ژن‌و مێردەکە، وە جاری وا هەیە مەرجەکان سوودی وا ئەدەن کە (إطلاق) ڕەهایی نایدات؛ بەڵکو جیاوازی ئەو ئەبێت.

(٤) ئەو مەرجانەی یاسادانەری ئیسلام قەدەغەی کردوون:

وە لەو مەرجانەی کە یاسا دانەری ئیسلام قەدەغەی کردوون و حەرامە بەجێ بهێنرێ: ئەوەیە کە ئافرەت کاتی شوکردنی داوای تەڵاق دانی هەوێکەی بکات.

لە ئەبو هورەیرەوە کە پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی کردووە کەسێك خوازبێنی بەسەر خوازبێنی برا موسڵمانەکەیدا بکات یا مامەڵە بەسەر مامەڵەکەیدا بکات، وە قەدەغەی کردووە ژنێك داوا لە

---

(١) بداية المجتهد (ج٢ ص٥٥).

(٢) تەخریجی ئەم حەدیسە ڕابورد.

(٣) تەخریجی ئەم حەدیسە ڕابورد.

پیاوێك بکات که ژنەکەی تەلاق بداتو خۆی شووی پێ بکات، تا مافەکانی ئەویش بۆ خۆی بێت بوخاری و موسلیم ڕیوایەتیان کردووە[1].

وە له لەفزێکی ترا که هەر بوخاری و موسلیم هێناویانە هاتووە: که پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی کردووە که ژن تەڵاق دانی خوشکە موسڵمانەکەی بکات بە مەرج[2].

وە له عبدالله ی کوڕی عەمرەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (لا يحل أن تُنْكَح امرأة بطلاق أخرى) رواه أحمد.

واتە: دروست نییە ئافرەتێك بە تەلاق دانی ئافرەتێك مارە بکرێت.

جا ئەم قەدەغە کردنە خراپی قەدەغە کراوەکە ئەگەیەنێت، چونکە ئەو ئافرەتە مەرجی ئەوەی داناوە لەسەر پیاوەکە کە عەقدەکەی هەڵبوەشێنێتەوە و مافی خۆی و ژنەکەی باتڵ بکاتەوە، کەواتە دروست نییە، وەك ئەوەی مەرجی ئەوەی لەگەڵدا بکات کە ئەو شتەی فرۆشتویەتی مامەڵەکەی فسخ بکاتەوە.

ئەگەر بووترێ: جا جیاوازی چی‌یە لە نێوان ئەمەو لە نێوان ئەوەی کە ژن بیکات بە مەرج ژنی بەسەر نەهێنرێ. هەتا ئێوە ئەوەیان بە ڕاست ئەزانن، وە مەرجی تەڵاقدانی هەوێ بە باتڵ دائەنێن؟

ئیبنوقەییم وەڵامی ئەوە ئەداتەوەو ئەفەرموێت:

ووتراوە: جیاوازی نێوانیان ئەوەیە کە مەرجی تەڵاق دانی ژنەکە زیان بەو ژنە ئەگەیەنێت و دڵی ئەشکێنێ و ماڵی لێ تێك ئەدات‌و دوژمنی پێ خۆش ئەکات کە ئەم زیانانە لە مەرجی ژن بەسەر نەهێنان دا نییە، وە دەق جیای کردونەتەوە کەواتە قیاسی هەریەکەیان لەسەر ئەوی تریان فاسیدە.

## ژن بە ژن (نکاح الشغار)[3]

(٥) وە لە جۆرەکانی ئەو زەواجەی کە مەرجی نادروستی لەگەڵدا بێت، زەواجی (شغار) ژن بەژنە :

---

(١) البخاري (٥١٤٢) ومسلم (١٤١٢).

(٢) بوخاری (٥١٥٢) موسلیم (١٥١٥/١٢).

(٣) شغار لە ئەسڵدا بە مانای خاڵی‌یە، ئەوترێ: (بلدة شاغرة) کاتێ خاڵی بێ لە فەرمان ڕەوا، وە لێرەدا مەبەست پێی خاڵی بوونە لە مارەیی.

وە وتراوە: بۆیە بەم نیکاحە ئەڵێن شیغار لەبەر ناشیرینی‌یەکەی. وە لە ناشیرینی‌دا چوێندراوە بە قاچ بەرز کردنەوەی سەگەوە لەکاتی میز کردنا. وە ئەم جۆرە زەواجە باو بووە لە سەردەمی نەفامیدا.

که ئەویش ئەوەیە کە پیاو کچەکەی یا ئەو ئافرەتەی لەژێر دەسەڵاتی دایە بدات بە پیاوێکی تر، بە مەرجێ ئەویش کچەکەی یا ئەو ئافرەتەی لەژێر دەسەڵاتی دایە بیداتێ، وە مارەیی‌یان لەنێواندا نەبێت؛ وە پێغەمبەر ﷺ ئەو شێوە ژن هێنانەی قەدەغە کردووەو فەرمویەتی:

١﴾ (لا شغار في الإسلام) رواه مسلم عن ابن عمر، ورواه ابن ماجه من حديث أنس بن مالك[1].

واتە: شیغار لە ئیسلام دا نیيە .

لە (الزوائد)دا وتراوە: ئیسنادەکەی صەحیحەو پیاوەکانی جێی بڕوان، وە چەند شایەتێکی صەحیحی هەیە، هەروەها (ترمذي) گێڕاویەتی‌یەوە لە حەدیثی عیمرانی کوڕی حوصەینەوە وە فەرمویەتی: (حديث حسن صحيح)[2].

٢- وە لە ئیبنو عومەرەوە فەرمویەتی: (نهى رسول الله ﷺ عن الشغار) واتە: پێغەمبەر ﷺ ژن بە ژنی قەدەغە کردووە[3].

شیغار ئەوەیە: کە پیاوێك بە پیاوێکی تر بڵێت: کچەکەت یا خوشکەکەتم بدەرێ، منیش کچەکەم یا خوشکەکەمت ئەدەمێ، وە لە نێوانیاندا مارەیی نەبێت. ئیبنوماجە گێڕاویەتی‌یەوە[4].

**ڕای زانایان لەسەر ژن بە ژن:**

جومهوری زایان ئەم دوو حەدیسەیان کردۆتە بەڵگەی ئەوەی کە پەیمانی (شغار) ژن بەژن دانامەزرێ لە بنەڕەتدا و بەتاڵە.

ئەبو حەنیفە بۆ ئەوە چووە کە عەقدەکە دروستە، وە بۆ هەریەکە لە کچەکان (مهر المثل) واجب ئەبێت لەسەر مێردەکەی، چونکە هەریەکە لەو دوپیاوە شتێیان ناو بردووە کە ناگونجێت ناوی مارەیی بێت. چونکە دانانی ژن لە بەرامبەر ژنەکەی تردا بە ماڵ حیساب ناکرێت.

---

(١) موسلیم (١٤١٥/٦٠).

(٢) ترمذي (١١٢٣).

(٣) بوخاری (٥١١٢) موسلیم (١٤١٥/٥٧).

(٤) ئیبنوماجە (١٨٨٣).

وه فەسادەکە لە شیغارا لە لایەنی مارەیییەوەیە کە ئەویش پەیمانەکە فاسد ناکات، وەك ئەوەی کە لەسەر عارەق یا لەسەر بەراز ژن مارە بکرێت. پەیمانەکە بەتاڵ نابێتەوە، وە ئەبێت کە بە گوێرەی مارەیی ئافرەتێکی وەك ئەو مارەیی بۆ دابنرێت، (مهر المثل).

**هۆی قەدەغە کردنی ژن بە ژن:**

زانایان لە هۆی قەدەغەبوونەکەیدا جیاوازیان هەیە.

ووتراوە: هۆیەکەی هەڵواسین و وەستاندنە, وەك ئەوەی ئەڵێت: مارەکردنی کچەکەم نابەسترێ هەتا مارەکردنی کچەکەت ئەبەسترێ .

وە ئەڵێن: عیللەتەکە هاوبەشی کردنە لە (بضع) —لەشی ئافرەتەکەدا-, وە دانانی هینی هەریەکەیان بە مارەیی ئەوی تریان، وە ئەو ئافرەتەش هیچ سوودێك لەو مارەیییە وەرناگرێت، وە ئەو مارەیییە بۆ ئافرەتەکە ناگەڕێتەوە، بەڵکو ئەگەڕێتەوە بۆ وەلی ئافرەتەکە، ئەویش خاوەنێتی (بضع) ی ئەو ئافرەتەیە کە بۆتە ژنی، بە موقابیلی (بضع)ی ئەو کچەی یا ئەو خوشکەی کە ئەیدات بە لایەنی موقابیل. ئەمەش ستەمە بۆ هەردوو ئافرەتەکەو لەناوبردنی ئەو مارەیییەیە کە ئافرەتان سوودی لێ ئەبەن.

ئیبنوقەییم دەفەرموێت: ئەم واتایە ڕێك ئەکەوێ لەگەڵ زمانی عەرەبیدا.

**مەرجەکانی دروست بوونی زەواج**

مەرجەکانی دروستی زەواج ئەو مەرجانەیە کە صیحەتی ئەو زەواجەی لەسەر بوەستێت. بە شێوەیەك کە ئەگەر ئەو مەرجانە هاتنەکایەوە پەیمانەکەش دێتە کایەوەو بەپێی شەرع هەموو ئەحکام و مافەکانی ئەو کارە ئەچەسپێ.

مەرجەکانیش ئەم دوانەن:

(مەرجی یەکەم):

ڕەوا بوونی ئافرەتەکەیە بۆ ئەوەی شوبکات بەو پیاوەی کە خۆی ئەیەوێ.

کەواتە مەرجە ئەو ئافرەتە حەرام نەبێت لەو پیاوە بەهیچ هۆیەك لە هۆیەکانی حەرامی کاتی یا هەمیشەیی.

وە ئەم باسە بەدرێژی دێت لە باسی (ئەو ئافرەتانە کە هێنانیان حەرام کراوە).

(مەرجی دووەم):

بوونی شایەت لەسەر زەواجەکە، ئەمەش لەم باسانەی خوارەوە دا کۆ ئەبێتەوە:

١- حوکمی شایەت گرتن.

٢- مەرجەکانی شایەت.

٣- شایەت دانی ئافرەتان.

حوکمی شایەت گرتن لەکاتی ژن مارەکردندا.

جومهوری زانایان بۆ ئەوە چوون کە پەیمانی ژن هێنان نابەسترێ هەتا بەڵگە نەبێت.

وە نابەسترێ هەتا شایەتەکان کاتی پەیمانەکە ئامادە نەبن. هەرچەندە بە هۆیەکی تریشەوە بتوانرێت بڵاو بکرێتەوە.

وە ئەگەر شایەتەکان ئامادە بوون، بەڵام پەیمان بەستەکان داوایان لێ کردن کە بیشارنەوەو ئاشکرای نەکەن پەیمانەکە هەر دروستە، وە بەڵگەشیان لەسەر دروستی ئامانەی خوارەوەیە:

(یەکەم) لە ئیبنوعەبباسەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (البغايا اللاتي ينكحن أنفسهن بغير بينة) رواه الترمذي[1].

واتە: داوێن پیس ئەوانەن کە خۆیان بێ شایەت مارە ئەکەن لە پیاوان.

(دووەم) وە لەعائیشەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (لا نكاح إلا بولي وشاهدي عدل) (دارقطني) ریوایەتی کردووە[2].

واتە: ژن مارەکردن دروست نیە بەبێ سەرپەرشتی کەرو دوشایەتی عادل.

وە ئەو نەفیەش ڕوو ئەکاتە دروست بوونی کارەکە، ئەمەش ئەوە پێویست ئەکات کە شایەت گرتن مەرج بێت، چونکە ئەگەر شایەت نەبوو پەیمانەکەش دروست نیە. جا هەرچی بەو شێوەیە بێت ئەوە مەرجی دروستی ئەو کارەیە.

(سێیەم) : لە ئەبی زوبەیری مەککیەوە کە عومەری کوڕی (خطاب) نیکاحێکیان بۆلای هێنا کە تەنها ژنو پیاوێك نەبێ کەس شایەتی نەبوو لەسەری فەرموی: (ئەمە مارەکردنی نهێنیە، وە من بە دروستی دانانێم ئەگەر بمزانیایە ڕەجمم ئەکرد). مالیك لە (الموطأ) دا ڕیوایەتی کردووە[3].

ئەم حەدیسانە هەرچەند لاوازن بەڵام یەکتر بەهێز ئەکەن.

---

(١) ترمذي (١١٠٣).

(٢) دارقطني (٣/٢٢٦).

(٣) مالك في الموطأ (٢/٥٣٥).

(ترمذي) دەفەرموێت: زانایانی صەحابە کاریان بەو شێوەیە کردووە، وە دوای ئەوانیش تابیعی‌یەکان‌و کەسانی تریش, وە ووتویانە: بەبێ شایەت ئافرەت مارە ناکرێ[1]. وە کەس لەوەدا جیاوازی نەبووە کۆمەڵێك لەزانایانی ئەم دوایی‌یە نەبێت.

(چوارەم) وە لەبەر ئەوە ئەم کارە جگە لە خاوەن دوو عەقدەکە پەیوەندی هەیە بە مافی کەسی تریشەوە،، کە منالّە، کەواتە شایەت گرتن مەرجە تێیدا؛ نەوەکو لە دووابیدا باوکەکە حاشا لەو منداڵە بکات و نەسەبی ئەو منداڵە لەناو بچێت.

بەڵام هەندێ لە زانایان ڕایان وەهایە کە دروستە بێ شایەت:

لەوانە شیعەو عبدالرحمن ی کوڕی مەهدی‌و یەزیدی کوڕی هارون‌و ئیبنو مونذیر و داود، وە ئیبنو عومەرو ئیبنو زوبەیریش لەسەر ئەوە ڕۆیشتون.

وە ئەگێڕنەوە لە حەسەنی کوڕی عەلی‌یەوە کە بەبێ شایەت ژنی هێناوە، لە پاشاندا نیکاحەکەی ئاشکرا کردووە.

ئیبنومونذیر فەرمویەتی: لەبارەی دوو شایەتی ژن مارەبڕین هیچ خەبەرێك سابت نی‌یە.

وە یەزیدی کوڕی هارون ووتویەتی: خوای گەورە ئەمری کردووە کە لەسەر مامەڵە کردن شایەت بگیرێ، بەڵام لەسەر مارەبڕین ئەمری نەکردووە.

بەڵام خاوەن ڕاکان شایەتی‌یان لە نیکاحدا بە مەرج داناوە، بەڵام لە کڕین و فرۆشتندا دایان نەناوە.

وە ئەگەر پەیمانی مارە کردنەکە بەسترا بەڵام شاردیانەوەو داوایان لە دەورو بەریان کرد کە بیشارنەوە، دروستە بەڵام کەراهەتی هەیە، چونکە پێچەوانەی فەرمان کردنە بە ئاشکرا کردنی.

وە شافیعی و ئەبو حەنیفەو ئیبنو مونذیر بۆ ئەوە چوون.

وە ئەوانەی کە بەخراپیان داناوە، عومەر و عوروەو شیعبی و نافیعن. وە لای مالیك ئەو پەیمانە فەسخ ئەبێتەوە (هەڵئەوەشێتەوە).

ئیبنو وەهەب ئەگێڕێتەوە لە مالیکەوە دەربارەی پیاوێك کە ژنێکی مارە کردبێ بە شایەتی دووپیاو بەڵام داوایان لێ بکات بیشارنەوەو ئاشکرای نەکەن؟ فەرمویەتی: لەیەك جیا ئەکرێنەوە بە

(١) نیل الأوطار (٤/١٩٩).

تەلاقێك، وە مارە کردنەکە دروست نیيە, وە ئەگەر چوبێتە لای ئەبێ مارەیيیەکەی بداتێ بەڵام شایەتەکان سزا نادرێن.

**٢ـ ئەو مەرجانەی ئەبێ لە شایەتەکانا هەبێت:**

بە مەرج گیراوە لە شایەتەکانا: عەقڵ، پێ گەیشتویی (بلوغ), وە بیستنی قسەی پەیمان بەستەکان لەگەڵ تێ گەیشتن کە مەبەست لەو قسانە پەیمان بەستنی ژنو مێردایەتییە[1].

ئەگەر منداڵو شێتو کەرو سەرخۆش شایەتی ئەو پەیمانە بن، ئەوە زەواجەکە دروست نیيە چونکە بوونی ئەوانە وەك نەبوون وەهایە.

**مەرجی (عدالة) دادپەروەرێتی لە شایەتەکانا:**

بەڵام مەرجی دادپەروەرێتی لە شایەتەکانا, حەنەفیيەکان بۆ ئەوە چوون کە عەدالەت مەرج نیيە لە شایەتدا وە پەیمانی ژنو مێردایەتی بە ئامادە بوونی دوو شایەتی (فاسق) تاوان باریش هەر ئەبەسترێ، وە هەرکەس بۆ ئەوە چاك بێت کە ببێتە سەرپەرشتیکەر لە ژن مارەکردندا دروستیشە ببێتە شایەت.

لە پاشاندا مەبەستیش لە بوونی شایەت بڵاوکردنەوەیە.

وە شافعیيەکان ووتویانە: ئەبێت شایەتەکان دادپەروەربن لەبەر فەرمودەکەی پێشو کە ئەفەرموێ: (لا نكاح إلابولي وشاهدي عدل)[2].

وە لای ئەوان ئەگەر پەیمانەکە بە ئامادەبوونی دوو شایەتی حاڵ نەناسراو بەسترا، دوو ڕووی هەیە: وە لە مەذهەبی ئەوان دروستە. چونکە ژن هێنان لە دێهات و بیابان و لە نێوان عامەی خەڵکدا ئەبێت، لە کەسانێکدا کە حەقیقەتی دادوەری نازانن. وە ئەگەر ئەوە ئیعتباری بۆ بکرێ ئەوە گرانکاری دروست ئەبێت، لەبەر ئەوە ڕواڵەتی شاهیدەکە بەسە وە ئەمە کە حاڵی شاراوەیەو تاوانی دەرنەکەوتووە، جا ئەگەر دوای پەیمانەکە دەرکەوت کە فاسیقە ئەوە کارناکاتە سەر پەیمانەکە، چونکە مەرجی دادپەروەرێتی لە ڕووی ڕواڵەتەوەیە کە لە ڕواڵەتدا فاسق نەبێت، وە ئەوەش هاتۆتەدی.

**شایەتی دانی ژنان:**

---

(١) وە ئەگەر شایەتەکان نابینا بوون، بە مەرج گیراوە تێیاندا ناسینی دەنگی پەیمان بەستەکان و یەقین لە دەنگەکانا بە شێوەیەك کە گومانی تێدا نەبێت.

(٢) تەخریجی ئەم حەدیسە ڕابورد.

شافعی‌یەکان و حەنبەلی‌یەکان بە مەرجی دائەنێن لە شایەتەکانا کە ئەبێ نێرینە بن، چونکە پەیمانی زەواج بە شایەتی پیاوێك‌و دووژن دروست نی‌یە. بەپێی ئەوەی (أبو عبید) لە زوهری‌یەوە گێراویەتی‌یەوە کە فەرمویەتی: سوننەت لە پێغەمبەرەوە ﷺ وا هاتووە کە نابێت‌و دروست نی‌یە ژن بە شایەت گرتن, نە لە حەددەکاناو نە لە نیکاح و نە لە تەلاقدا.

وە لەبەر ئەوە پەیمانی ژن‌و مێردایەتی پەیمانی ماڵ و سامان نی‌یەو مەبەستیش تیایدا ماڵ‌و سامان نی‌یە، وە بە زۆری پیاو تیایدا ئامادە ئەبێ، لەبەر ئەوە سابت نی‌یە بە شایەتی دانی ئافرەت دروست بێت. وەك لە حەددەکاندا دروستە.

بەڵام حەنەفی‌یەکان ئەو مەرجە دانانێن، وەڕایان وەهایە کە شایەتی دووپیاو و شایەتی پیاوێك و دوو ژن کافی‌یە بەپێی فەرموودەی خوای بەرز کە ئەفەرموێ: ﴿وَاسْتَشْهِدُوا شَهِيدَيْنِ مِنْ رِجَالِكُمْ فَإِنْ لَمْ يَكُونَا رَجُلَيْنِ فَرَجُلٌ وَامْرَأَتَانِ مِمَّنْ تَرْضَوْنَ مِنَ الشُّهَدَاءِ﴾ (البقرة: من الآية٢٨٢)

واتە: دوو شایەت بگرن لە پیاوەکانتان، ئەگەر دووپیاو نەبوو، با یەك پیاوو دووژن شایەت بن لەوانەی خۆتان پەسەندیان ئەکەن.

وە لەبەرئەوەی عەقدی زەواج وەك کڕین و فرۆشتنە لەوەدا کە پەیمانی (معاوضة) گۆڕینەوەیە و بە دوو شایەتی ژن لەگەڵ یەك شایەتی پیاو پێك دێت.

**بە مەرج گرتنی ئازادی لە شایەتەکانا:**

ئەبو حەنیفە و شافیعی مەرجی ئەوە دائەنێن لە شایەتەکاندا کە ئەبێ ئازاد بن.

بەڵام ئەحمەد ئازادی ناکات بە مەرج، وەڕای وەهایە کە شایەتی دووبەندەش عەقدی زەواجی پێ ئەبەسترێ، وە هەروەها شایەتی‌یان لە هەموو شتێکدا وەرئەگیرێ، چونکە دەقێك نەهاتووە لە کتاب‌و سوننەت دا شایەتی بەندە ڕەت بکاتەوەو ڕێ لە وەرگرتنی بگرێت بە مەرجێك ئەمین‌و ڕاستگۆو لەخوا ترس بن.

**مەرجی ئیسلامی شایەتەکان:**

زانایان جیاوازیان نی‌یە لەوەدا کە ئەبێ شایەتەکان موسڵمان بن ئەگەر پەیمانەکە لە نێوان ژن‌و پیاوی موسڵماندا بوو.

وە زانایان جیاوازن لەوەدا کە ئەگەر شایەت موسڵمان نەبێت، لەکاتێکدا پیاوەکە بەتەنها موسڵمان بێت (وە ئافرەتەکە کیتابی بێت).

لای ئەحمەد و شافیعی و محمدی کوڕی حەسەن، ئەو زەواجە پێك نایەت؛ چونکە زەواجی موسڵمانە، وە شایەتی غەیری موسڵمان تێیدا وەرناگیرێ.

وە ئەبو حەنیفەو ئەبو یوسف شایەتی دانی دوو کیتابییان لەسەر مارەکردنی ئافرەتێکی کیتابی لە پیاوێکی موسڵمان بە دروست داناوە، وە یاسای کاروباری شەخصیش بەوپێیە کار ئەکات.

عەقدی زەواج شەکلییە :

عەقدی زەواج پێك دێت بەبەدی هاتنی پایەکانیو مەرجەکانی بەستنەکەی، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەسەرە شەرعییەکانی لەسەر دانامەزرێ ئیللا بە شایەتی شایەتەکان نەبێت، وە ئامادەبوونی شایەتەکان شتێکە بە ڕازی بوونی هەردوو لایەنەکە نییە، جا لەو ڕووەوە پێی ئەوترێت عەقدی شەکلی، کە ئەوەش جیاوازە لەگەڵ عەقدی ڕەزامەندیا کە بۆ پێك هاتنی، پێکەوە بوونی تەنها ئیجاب و قەبول بەسە، وە ڕازی بوونی هەدوو لایەنی عەقدەکە بە تەنها ئەبێتە دامەزرێنەری عەقدەکە، وەکو عەقدی بە کرێ دان و شتی تر، جا ئەو عەقدە لەو حاڵەتەدا هەموو حوکمێکی لەسەر دائەمەزرێت، وە یاساش پشتگیری ئەکات و پێویستی بە هیچی تر نییە.

مەرجەکانی تەواو بوونی عەقدەکە:

ئەگەر پەیمانەکە تەواو بوو بەشێوەیەکی دروست، ئیتر بۆ جێبەجێ بوون و ڕانەگرتنی لەسەر ئیجازەی کەس بە مەرج گیراوە کە :

١- ئەبێ هەریەکە لە دوو پەیمان بەستەکان کە سەرپەرشتی پەیمانەکەیان کردووە بە تەواوی شیاو بێ، واتە عاقڵ و پێگەیشتو و ئازاد بێت. جا ئەگەر یەکێکیان شیاوی تەواوی نەبوو وەك ئەوەی کەم عەقڵ بوو یا منداڵی جیاکەرەوە بوو یا بەندە بوو، ئەوە ئەو عەقدەی کە خۆی ئەیبەستێ دروستە، بەڵام ئەوەستێتە سەر ڕێ دانی سەرپەرشتیکەر، یا گەورە، جا ئەگەر ڕێیدا ئەوە تەواوە، ئەگینا بەتاڵ ئەبێتەوە.

٢ وە ئەبێ هەریەکە لە دوو پەیمان بەستەکان خاوەنی ئەو سیفەتە نەبێت کە وای لێ بکات مافی ڕاپەراندنی پەیمانەکەی هەبێت. جا ئەگەر پەیمان بەستەکە فزولی بوو دەستی کرد بە پەیمانەکە بە بێ ئەوەی وەکیل بێت یا سەرپەرشت بێ، یا وەکیل بوو بەڵام لە وەکالەتەکەیدا موخالەفەی کردبوو، یا سەر پەرشتیار بوو بەڵام سەرپەرشتیارێکی تری هەبوو کە لەو نزیکتر و لەپێش تر بوو، ئەوە عەقدی هەریەکە لەمانە ئەگەر مەرجەکانی بەستنی و دروستی هاتبووە دی، دروستە و لەسەر ڕێدانی خاوەن کار ڕاوەئەستێ.

**مەرجەکانی سابت بوونی پەیمانی ژن و مێردایەتی**

پەیمانی ژنو مێردایەتی سابت ئەبێت کاتێ کە پایەکانیو مەرجەکانی دروستیو مەرجەکانی تەواو بوونی هاتەدی.

جا کاتێك سابت بوو ئیتر بۆ هیچ کام لە ژنو مێردەکە یا کەسێکی تر نیە تێکدانەوەو هەڵوەشاندنەوەی, وە بە تەڵاقو مردن نەبێت کۆتایی نایەت. وە ئائەوەش بنەمایە لە پەیمانی ژنو مێردایەتیدا.

چونکە ئەو مەبەستانەی لە پێناویدا دانراوە- لەبەردەوامی بەیەکەوە ژیانی ژن و مێردایەتیو پەروەردەکردنی منداڵو هەڵسان بەکاروباریان- بەدی نایەت هەتا ئەو پەیمانە سابت نەبێت. لەبەر ئەوە زانایان ووتویانە:

مەرجەکانی چەسپانی ژن و مێردایەتی یەك مەرج کۆیان دەکاتەوە، ئەویش ئەوەیە ژن و مێردەکە مافی ئەوەیان نەبێت ئەو پەیمانە هەڵبوەشێننەوە دوای پێك هاتنیو دروستی و تەواو بوونی. جا ئەگەر کەسێك مافی هەڵوەشاندنەوەی هەبێت ئەوە پەیمانێك بوە کە نەچەسپاوە.

**کەی پەیمانەکە ناچەسپێ:**

عەقدەکە سابت نابێت لەم شێوانەی خوارەوەدا: ئەگەر دەرکەوت پیاوەکە ژنەکەی هەڵخەڵەتاندووە یا ژنەکە پیاوەکەی هەڵخەڵەتاندووە. نمونەی ئەمەش:

پیاوێکی نەزۆك ئافرەتێك مارە بکات، وە ئەو ژنە بە نەزۆکیەکەی نەزانێت. لەم شێوەیەدا ژنەکە بۆی هەیە ئەو پەیمانە هەڵوەشێنێتەوە کاتێ پێیزانی. مەگەر هەر خۆی ڕازی بێت ئیتر ئارەزوی خۆیەتی ئەگینا مافی هەڵوەشاندنەوەی هەیە.

عومەر خوای لێ ڕازی بێت بەوکەسەی ووت کە ژنێکی مارە کرد ـ وە پیاوەکە منداڵی لێ نەئەبوو ـ پێی بڵێ کە تۆ نەزۆکیو ئارەزوش بدەرە دەست خۆی با خۆی هەڵی بژێرێ پێت ڕازیە یان نا.

وە لە شێوەکانی هەڵخەڵەتاندن, پیاوێك ژنێك مارە بکات لەسەر ئەو ئەساسە کە پیاوێکی ڕاستگۆو چاکە، دوایی دەربکەوێ کە فاسقە، لەم شێوەیەشدا ژنەکە بۆی هەیە پەیمانەکە هەڵبوەشێنێتەوە.

وە هەر لەو شێوانەیە ئەوەی کە ئیبنو تەیمیە باسی کردووە: ئەگەر پیاوێك ئافرەتێکی مارە کرد لەسەر ئەوەی کە کچ بێت دوایی دەرکەوت ژنە, پیاوەکە بۆی هەیە ئەو پەیمانە هەڵبوەشێنێتەوە، وە بۆی هەیە کە داوای ئەو جیاوازیە بکات کە لەنێوان مارەیی ژنو کچدا هەیە، بەڵام ئەگەر پێش

بە یەك گەیشتن عەقدەکەی هەڵوەشاندەوە ئەوە هیچی مارەیی بۆ نی‌یە، وە هەروەها عەقدەکە ناچەسپێ ئەگەر پیاوەکە عەیبێکی لە ژنەکەدا دۆزی‌یەوە کە ببێتە هۆی دوورکەوتنەوەی پیاو لەژن. وەك ئەوەی هەمیشە بێ‌نوێژ بێت، چونکە بێ نوێژی هەمیشەیی عەیبێکە نیکاحی پێ هەڵئەوەشێتەوە.

وە هەروەها ئەگەر ئەو ئافرەتە عەیبێکی وای هەبوو کە ئەبووە ڕێگری چوونە لا وەك ئەوەی ناو لەشی ئافرەتەکە گیرابێت. وە لەو عەیبانەی کە ڕێ ئەدا بە پیاو پەیمانەکە هەڵبوەشێنێتەوە: ئەو نەخۆشی‌یانەیە کە پیاو دوور ئەکاتەوە: وەك گەڕی و شێتی وگولی. وە وەك چۆن پیاو مافی هەڵوەشاندنەوەی هەیە ژنیش بۆی هەیە ئەو پەیمانە هەڵبوەشێنێتەوە ئەگەر پیاوەکە گەڕبێت یا شێت یا ئالەتی پیاوەتی بڕابێ یا ئەو ئەندامەی مردوبێت یا چکۆلەبێ و کاری پێ نەکرێ.

**ڕای زانایان دەربارەی هەڵوەشاندنەوەی نیکاح بەهۆی عەیبەوە:**

**زانایان جیاوازیان هەیە لەوەدا:**

١- هەندێك لەوان ڕای وایە کە پەیمانی ژن‌و مێردایەتی هەڵ ناوەشێتەوە بەهۆی عەیب داریەوە، ئەو عەیبانە هەر چۆنێك بن. لەوانەش داود و ئیبنوحەزم.

خاوەنی (الروضة الندية) ووتویەتی: بزانە ئەوەی بە زەرورەتی ئاینی سابت بووە ئەوەیە کە پەیمانی نیکاح لازمەو حوکمەکانی ژن‌و مێردایەتی پێ سابت ئەبێت، لە چونە لاو پێوست بوونی نەفەقەو ڕێنەی ئەوانە، وە میرات گرتن‌و هەموو حوکمەکانی تر، وە چەسپاوە بە پێویستی ئاینی کە دەرچون لەو پەیمانە یا بە تەڵاق ئەبێت یا بە مردن.

جا هەرکەس بڵێ دەرچون لە نیکاح دروستە بەهۆیەك لە هۆیەکان، ئەبێ بەڵگەی ڕاست بهێنێ کە پێویست بکات لادان لەو سابت بوون بە زەرورەتی دینی‌یە بکرێت.

وە لە بارەی هەڵوەشاندنەوەی زەواج بەهۆی ئەو عەیبانەی کە باسیان کردووە بەڵگەی ڕوون نی‌یەو هیچیشیان سابت نەبوون.

وە وەئەما فەرمودەکەی پێغەمبەر ﷺ کە فەرمویەتی: (إلحقي بأهلك)[1] ئەو صیغەیە صیغەی تەڵاقە. وە لە فەرزێکا ئیحتیمالی فەسخیشی ببێت، واجب ئەوەیە کە لەسەر یەقینەکە دابندرێ کە تەڵاقە نەك شتی تر. وە هەروەها هەڵوەشاندنەوە بەوەی کە پیاوەکە توانای چونە لای نی‌یە، هیچ بەڵگەی ڕاستی لەسەر نەهاتووە.

---

(١) بوخاری (٥٢٥٤) و ئیبنوماجە (٢٠٥٠) و نەسائی (٦/١٥٠)

وه ئەسل مانەوەیە لەسەر ئەو نیکاحە هەتا شتێکی وەها دێت کە ببێتە هۆی دەرچوون وە لە هەموو شت سەیرتر ئەوەیە هەندێ عەیب تایبەت ئەکەن لەوەدا و ئەوانی تر هیچ.

٢- وە هەندێکیکە لە زانایان ڕایان وایە کە ژن و مێردایەتی بە هەندێ عەیب هەڵئەوەشێتەوەو بە هەندێك نا، ئەوانیش جومهوری ئەهلی زانستن، وە ئەمانەشیان کردۆتە بەڵگەی بۆچونەکەیان:

(یەکەم) ئەوەی کەعبی کوڕی زەید، یا زەیدی کوڕی کەعب. ئەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ ئافرەتێکی بەنی غەفاری هێنا، کاتێ چووە لایەو جلەکانی لابرد لەناو قەدیا سپێتی‌یەکی بەدی کرد لێی دور کەوتەوە، لە پاشاندا فەرموی: (خذي عليك ثيابك, ولم يأخذ مما آتاها شيئاً) رواه أحمد وسعيد بن منصور[1].

واتە: جلەکانت لەبەر بکەرەوە. ئیتر چی دابویە لێی نەسەندەوە، ناردی‌یەوە بۆ ناو کەس‌وکاری.

(دووەم) لە عومەرەوە کە فەرمویەتی: هەر ئافرەتێك پیاوێکی پێ هەڵخەڵەتا، شێت بوو یا گول یا گەر، ئەوە مارەیی‌یەکەی ئەدرێتێ بەوەی کە چۆتە لای، و مارەیی کابرا بەو کەسە ئەبڕێرێ کە هەڵی خەڵەتاندوە. مالیك و (دارقطني) گێراویانەتەوە[2].

وە ئەو زانایانە جیاوازیان هەیە لەوەدا کەبە (چ) عەیبێك نیکاح هەڵئەوەشێتەوە, ئەبوحەنیفە تەنها بە نەتوانینی چونەلا هەڵی ئەوەشێنێتەوە. بەڵام مالیكو شافیعی شێتی‌و گەری‌و گولیشیان خستۆتە سەر هەروەها داخرانی ناولەشی ئافرەت، وە ئەحمەد جگە لەوەی سێ ئیمامەکە باسیان کردووە ئافرەتی (فتقاء)یشی خستۆتە سەر، فەتقا ئەوەیە ڕێی مندالّ و ڕێی پیسایی ئافرەتەکە دڕابێت‌و تێکەلّ بوبن.

**لێکۆڵینەوە لەم کێشەیە:**

لە ڕاستی‌یا هەموو ئەم ڕایانە شایەنی ئەوە نین کە ئیعتباریان پێ بکرێ. چونکە ژیانی ژن‌و مێردایەتی کە لەسەر ئارام گرتن و خۆشەویستی‌و میهرەبانی دروست بووە هەرگیز نایەتەجێ‌و جێ‌گیر نابێت، مادام عەیبێك هەبێت ئەو ژن‌و پیاوە لەیەك دورئەخاتەوە. چونکە ئەو عەیب‌و نەخۆشی‌یانەی کە مرۆڤ لەیەك دوور ئەخاتەوە مەبەستی ژن‌و مێردایەتی لەگەڵیا نایەتەدی. لەبەر ئەوەیە یاسا دانەری ئیسلام ئەو ژن‌و مێردەی سەرپشك کردووە بۆ هەڵبژاردنی یەکێ لەم دووانە یامانەوە یا دەست لێ بەردان.

---

(١) أحمد (٣/٤٩٣).

(٢) مالك في الموطأ (٧٦٧) و دارقطني (٢٦٣).

وە ئیمام ئیبنوقەییم لێکۆڵینەوەیەکی هەیە لەم بارەیەوە کە شایەنی ئەوەیە سەیر بکرێو ئیشی پێ بکرێ.

ئەفەرموێت: کوێری، کەڕی، لاڵی، یا هەردوو دەست براو یا هەردوو قاچ بڕاو یا دەستێك یا قاچێك بڕاو چ پیاوەکە وە هابێت یا ژنەکە- گەورەترین شتن ئادەمیزاد لەیەك دوور ئەخەنەوە، وە بێدەنگ بوون لەمانە پیس ترین فێڵو تەڵەکەیەو پێچەوانەی ئاینن.

وە ئەمیری موسڵمانان عومەری کوڕی (خطاب) خوا لێی رازی بێت فەرمووی بەوکەسەی ئافرەتێکی هێنا، وە ئەو منداڵی لێی نەئەبوو: بە ژنەکەت بڵێ کە نەزۆکی و لەپاشان خۆی سەرپشك بکە ئەمێنێـەوە لات یا ئەڕوات.

جا ئەی چی ئەڵێت ڕەزای خوای لێبێت لەو عەیبانەدا کە ئەو نەزۆکی‌یە بە چاویا ئەوپەڕی بێ عەیبی و تەواوی‌یە.

وە فەرمویەتی: قیاس ئەوەیە کە هەموو ئەو عەیبانەی کە ژن و مێرد لەیەك دور ئەخاتەوەو مەبەستی ژنو مێردایەتی پێ نایەتەدی لە سۆزو میهرەبانیو خۆشەویستی، ئەوە سەرپشك بوون پێویست ئەکات، چونکە نیکاح لە پێشترە لە کڕینو فرۆشتن. وەك چۆن ئەو مەرجانەی لە نیکاحا ئەگیرێن لە پێشترن بە جێبەجێ کردن. لە مەرجەکانی کڕینو فرۆشتن.

وە خواو پێغەمبەر ﷺ قەت کەسێك فێڵی لێ کرابێ مەجبوری ناکەن کە بێ دەنگ بێ لەو فێڵ و فریودانە. جا هەرکەس بیر بکاتەوە لە مەبەستەکانی یاسای ئیسلام لە سەرچاوەکانیدا، وە لە شوێنی دانانیا، وە لە عەدالەت و حیکمەتیدا، وە لەو بەرژەوەندی‌یانەیە کە تیایەتی، ئەوە بەهێزی ئەم قسەیەو نزیکی‌یەتی لە قاعیدەکانی شەرعەوە بەلایەوە شاراوە نابێت.

یەحیای کوڕی سەعیدی ئەنصاری لە ئیبنو موسەییبەوە گێڕاویەتەوە ڕەحمەتی خوای لێ بێت کە فەرمویەتی: عمر خوای لێ ڕازی بێت فەرمویەتی: هەر ئافرەتێك هێنراو شێتیو گەڕی و گولی تێدا بوو، وە کابرا چوبوە لای و ئەوانەی بۆ دەرکەوت ئەوە ئەو ئافرەتە مارەیەکەی ئەکەوێت بەوەی چۆتە لای، وە ئەبێت سەرپەشتیاری ئافرەتەکە ئەو مارەیی‌یە بۆ کابرا بژمێرێ بەوەی کە فریوی داوەو فێڵی لێ کردووە.

وە (شعبي) لە عەلی‌یەوە ئەگێڕێتەوە خوای لێ ڕازی بێت کە فەرمویەتی: هەر ژنێك شوی کرد گەڕی یا شێتی یا گولی تێدا بو یا شوێنی جیماعی داخراو بوو پیاوەکەی ئارەزووی خۆیەتی تەڵاقی ئەدات یا لای خۆی ئەیهێڵێتەوە، بە مەرجێك نەچوبێتە لای، بەڵام ئەگەر چوبێتە لای مارەییەکەی ئەکەوێت.

وەکیع فەرمویەتی: لە سوفیانی سەوریەوە، لە یەحیای کوڕی سەعیدەوە، لە سەعیدی کوڕی موسەییبەوە، لە عومەرەوە خوا لێی ڕازی بێت فەرمورویەتی: ئەگەر پیاوێك گەڕێك یا کوێرێك شوی پێ کرد، وە پیاوەکە چووە لای و پێی زانی ئەوە مارەییەکەی ئەکەوێت، وە ئەو ماڵە لە کەسێك ئەسێنێتەوە کە خەڵەتاندویەتی نەك لە ژنەکە.

ئیبنوقەییم فەرمویەتی: ئەمە ئەوە ئەگەیەنێت کە عومەر ئەو عەیبانەی پێشەوەی بە شێوەی تایبەت باس نەکردووە جگە لەوانەی تر.

وە هەروەها قازی ئیسلام شورەیح خوای لێ ڕازی بێت کە نمونە دێتەوە بە زانست و ئاین و حیکمەتی ئەو، هەروای حوکم داوە.

عبدالرزاق فەرمویەتی: لە موعەممەرەوە لە ئەییوبەوە لە ئیبنوسیرینەوە خوا لێی ڕازی بێت، کە پیاوێك لای شورەیحی قازی شکاتی کردووەو وتویەتی: ئەو پیاوە پێی وتم: ئێمە جوانترین ئافرەتت لێ مارە ئەکەین ئێستا کوێرێکی بۆ هێناوم.

شورەیح فەرمویی: ئەگەر عەیبەکەی لێ شاردبێتەوە دروست نیە.

جا باش لەم حوکمەو قسەکەی وورد بەرەوە کە ئەڵێت: (ئەگەر لێی شاردویتەوە) کە چۆن ئەوە ئەگەیەنێ هەموو عەیبێکی شاراوە لە ئافرەتدا بۆ پیاو هەیە پەیمانەکەی پێ ڕەت بکاتەوە.

زوهری خوا لێی ڕازی بێت فەرمویەتی: نیکاح بە هەموو نەخۆشەیەکی بێدرەمان ڕەت ئەکرێتەوە، وە فەرمویەتی: هەرکەس باش لە فەتواکانی صەحابەو پێشینان وورد بێتەوە ئەزانێت کە ڕەت کردنەوەی پەیمانیان تایبەتی نەکردووە بە عەیبێکەوە بێجگە لە عەیبێکی تر، جگە لە یەك ڕیوایەت نەبێت کە لە عومەرەوە ئەگێڕنەوە فەرموویەتی: ئافرەت بە چوار عەیب نەبێت ناگێڕرێتەوە: شێتی و گەڕ و گولی و بەڵەکی و نەخۆشی ناولەش. ئەم ڕیوایەتە سەنەدی نازانین جگە لە ئەصبەغ و ئیبنو وەهەب لە عومەرو عەلیەوە خوا لێیان ڕازی بێت. وە لە ئیبنو عەبباسیشەوە بە ئیسنادێکی متصل گێڕراوەتەوە.

ئەمانە هەمووی کاتێکە کە پیاوەکە مەرجی دانەنابێ.

بەڵام ئەگەر مەرجی سەلامەتی دابنێ، یا مەرجی جوانی دابنێو دوایی دەرکەوت کە ئافرەتەکە ناشرینە، یا مەرجی تازە پێگەیشتویی داناو دەرکەوت پیرەژنێکی سەر بۆزە. یا مەرجی ئەوەی دانا کە پێست سپی بێت، بەڵام دەرکەوت کە ڕەشە، یا مەرجی ئەوەی دانا کە کچ بێت بەڵام دەرکەوت کە ژنە، ئەوە لە هەموو ئەو حاڵەتانەدا بۆی هەیە پەیمانەکە هەڵبوەشێنێتەوە. جا ئەگەر

هەڵوەشاندنەوەکە پێش چونە لای بێت مارەیی ناکەوێت، وە ئەگەر دوای چونە لایێت مارەیی ئەکەوێت. وە لە وەلی‌یەکەی ئەسێنێتەوە ئەگەر فێڵی لێ کردبێت.

بەڵام ئەگەر ژنەکە فێڵی لێ کردبێت ئەوە مارەیی ناکەوێ، یا ئەبێ بۆی بگێڕێتەوە ئەگەر وەری گرتبوو. ئەحمەد دانی بەوەدا ناوە لە یەکێ لە دوو ڕیوایەتەکانیدا, وە ئەمە لە هەموو ڕاکان لەپێشترە و نزیکترە لە ئوصول، ئەگەر پیاوەکە ئەو مەرجانەی دانابێ.

وە هاوەڵەکانی ئەحمەد ووتویانە: ئەگەر ئافرەتێك صیفەتێکی لە پیاوەکەدا کردە مەرج دوایی دەرکەوت وەها نیەیە، ئەوە ڕێگای هەڵوەشاندنەوەی بۆ نی‌یە، جگە لە مەرجی ئازادی نەبێت ئەگەر بۆی دەرکەوت عەبدە ڕێگای هەڵوەشاندنەوەی بۆ هەیە.

وە لە مەرجی نەسەبدا ئەگەر پێچەوانە دەرچوو دوو ڕووی هەیە. ئەوەی مەزهەب و بنەماکانی ئەحمەد پێویستی ئەکات ئەوەیە جیاوازی نیەیە لە نێوان مەرجەکانی پیاوو ژندا. بەڵکو ڕێگای هەڵوەشاندنەوە بۆ ئافرەتەکە لەپێش ترە؛ ئەگەر ئەو مەرجەی داینابوو نەهاتبووە دی، چونکە ئافرەت ناتوانێ بە تەڵاق جیا بێتەوە. وە ئەگەر دروست بوو هەڵوەشاندنەوەی پەیمان لەلایەن پیاوەوە کە بە شێوەی تریش توانای جیابوونەوەی هەیە ئەوە بۆ ئافرەت کە توانای ئەوەی نی‌یە، لەپێش ترە کە دروست بێت. وە ئەگەر دروست بێ بۆ ئەو ئافرەتە نیکاحەکە هەڵبوەشێنێتەوە کاتێك دەرکەوت کە پیاوەکە خاوەن پیشەیەکی نزمە، وە هیچیش لە ئایین و شەرەفی کەم ناکاتەوە ئەوەندە نەبێت کە ئەو ئافرەتە ناتوانێت بە شێوەیەکی تەواو لەگەڵ ئەو پیاوەدا لەززەت بەرێت و لەگەڵیا ڕابوێرێ، جا چۆن ڕێگای هەڵوەشاندنەوەی نی‌یە ئەگەر مەرجی ئەوەی دانا کە پیاوەکە لاوێکی جوانی بێ عەیب بێت کەچی دوایی دەرکەوت پیرێکی ناقۆڵای کوێری کەڕی لاڵێ ڕەشە, چۆن بەو پیاوەوە دەبەسترێتەوەو ڕێی هەڵوەشاندنەوەی لێ ئەگیرێ؟ ئەگەر ئەوەکرا ئەوە ئەوپەڕی ڕێ لێ گرتن و پێچەوانەیی و دووری‌یە لە قیاسو بنەمای شەرعەوە.

هەروەها ئەحمەد فەرمویەتی: چۆن یەکێ لە ژن و مێرد ڕێی هەڵوەشاندنەوەی هەبێت لەسەر بەڵەکی‌یەك کە بە ئەندازەی یەك دەنکە نیسك بێت، ئەی چۆن لەسەر گەڕی‌یەك کە ڕیشەی داکوتاوەو گیرەوەترە لەو تۆزە بەڵەکی‌یە ڕێگای هەڵوەشاندنەوە نی‌یە.

وە نەخۆشی‌یە گرانەکانی تریش هەر بەم شێوەیە دائەنرێن.

وە ئەگەر پێغەمبەر ﷺ حەرامی کردبێ لەسەر فرۆشیار شاردنەوەی عەیبی ئەو شتەی کە ئەیفرۆشێ، وە حەرامی کردبێ لەسەر ئەو کەسەی ئاگای لەو عەیبەیەو ئەیشارێتەوە لە کڕیار، ئیتر ئەبێ شاردنەوەی عەیبەکانی نیکاح چۆن بێت؟.

وە پێغەمبەر بە فاطمەی کچی قەیسی فەرموو کاتێ پرسی پێکرد دەربارەی شوکردنی بە موعاویە یا بە ئەبی جەهم: (أما معاوية فصعلوك لا مال له، وأما أبو جهم فلايضع عصاه عن عاتقه)[1] واتە: ئەمما موعایە لاتو بێ ماڵە، وە ئەبی جەهمیش تێلا لەسەرشانی نایەتە خوارەوە

کەواتە زاندرا کە دەرخستنی عەیب لە نیکاحدا لەپێشتر و پێویست ترە لە دەرخستنی لە مامەڵەو کڕین و فرۆشتندا.

جا چۆن شاردنەوەو فێڵ و خیانەتی حەرام ئەبن بە هۆی چەسپاندنی نیکاح؟ یان چۆن عەیبدار ئەکرێ بە کۆتو زنجیر لە ملی هاوەڵەکەیدا لە کاتێکدا ئەو ئەوپەڕی دووی لێ ئەکات.

بە تایبەت کە مەرجی بێ عەیبی و سەلامەتی دانابێت؟

وە ئەمە شتێکە بێ گومان ئەزانرێ کە کاری شەریعەت و بنەماکانیو ئەحکامەکانی قەدەغەی ئەکات ئیتر خواش زاناترە —تەواو-

وە ئەبو محمدی کوڕی حەزم بۆ ئەوە چووە کە ئەگەر پیاو مەرجی سەلامەتی لە عەیب دانا، وە دوایی هەر عەیبێکی دۆزیەوە؛ ئەو نیکاحە باتڵەو لە بنچینەوە نەبەستراوە. ئیتر بە ئارەزوو و ئیجازەی پیاوەکە نابێت، وە نەفەقەو میراتیش نابێت.

وە فەرمویەتی: چونکە ئەو ئافرەتەی کراوەتە ژوورەوە بۆ ئەو ئەوە نی یە کە مارەی کردووە، چونکە ئەو بێ گومان مەبەستی ساغ و بێ عەیبەکە بووە، جا مادام مارەی نەکردووە کەواتە ژن و مێردایەتی نی یە لە نێوانیانا (واتە پیاوەکەو ژنە عەیبدارەکە).

### ئەو ئافرەتانەی حەرامن لەسەر پیاو

هەموو ئافرەتێك ناگونجێت کە پیاو بیهێنێ, بەڵکو ئەو ئافرەتەی کە ئەیەوێ مارەی بکات ئەبێ مەرجی ئەوەی تێدا بێت کە حەرام نەبێت لەسەر پیاوەکە، جا ئەو حەرامێتی یە هەمیشەیی بێت یا کاتی. وە حەرامیەتی هەمیشەیی ڕێگرە لەوەی ئافرەت ببێ بەژنی پیاو لە هەمووکاتێکدا.

وە حەرامی کاتی ڕێ لە ئافرەت ئەگرێ شوبکات بەو پیاوە هەتا لەسەر ئەو شێوە تایبەتی یە بێت.

بەڵام ئەگەر حاڵ گۆڕاو ئەو حەرامی یە کاتی یە نەما حەڵاڵ ئەبێتەوە.

---

(١) أحمد (٦/٤١٢) ومسلم (١٤٨٠) وأبوداود (٢٢٨٥-٢٢٨٩) وترمذي (١١٨٠) ونسائي (٦/٧٤).

هۆکانی حەرامێتی هەمیشەیی ئەمانەن:-

١-نەسەب.

٢-ژن‌و مێرد خوازی

٣- شیر پێدان.

ئەو ئافرەتە حەرام کراوانەش ئەوانەن کە خوای گەورە باسی کردون‌و ئەفەرموێ: ﴿حُرِّمَتْ عَلَيْكُمْ أُمَّهَاتُكُمْ وَبَنَاتُكُمْ وَأَخَوَاتُكُمْ وَعَمَّاتُكُمْ وَخَالاتُكُمْ وَبَنَاتُ الْأَخِ وَبَنَاتُ الْأُخْتِ وَأُمَّهَاتُكُمُ اللَّاتِي أَرْضَعْنَكُمْ وَأَخَوَاتُكُمْ مِنَ الرَّضَاعَةِ وَأُمَّهَاتُ نِسَائِكُمْ وَرَبَائِبُكُمُ اللَّاتِي فِي حُجُورِكُمْ مِنْ نِسَائِكُمُ اللَّاتِي دَخَلْتُمْ بِهِنَّ فَإِنْ لَمْ تَكُونُوا دَخَلْتُمْ بِهِنَّ فَلا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ وَحَلائِلُ أَبْنَائِكُمُ الَّذِينَ مِنْ أَصْلابِكُمْ وَأَنْ تَجْمَعُوا بَيْنَ الْأُخْتَيْنِ إِلَّا مَا قَدْ سَلَفَ﴾ (النساء: من الآية٢٣)

واتە: حەرام کراوە لەسەرتان دایکەکانتان و کچەکانتان و خوشکەکانتان وە خوشکەکانی دایك و باوکتان وە کچانی براکانتان و کچانی خوشکەکانتان و ئەو ئافرەتانەی شیریان پێ داون‌و خوشکە شیرییەکانتان و دایکی خێزانەکانتان، وە کچی ئەو ژنانەی هێناوتانن‌و لە باوەشتاندا پەروەردەیان ئەکەن بە مەرجێ چوبنە لای دایکەکانیان، جا ئەگەر نەچوبنە لایان تاوان نابێت بۆتان مارەیان بکەن، وە ژنی ئەو کورانەی لە پشتانن، وە هێنانی دوو خوشك لە یەك کاتدا، ئەوانە نەبێت کە لە پێشەوە کراون.

و حەرامی کاتیش کۆئەبنەوە لەچەند جۆرێکا، وا لە خوارەوە باسی هەریەکەیان ئەکەین:-

ئەو ئافرەتانەی بۆ هەمیشە حەرامن:

١- ئەو ئافرەتانەن کە لەنەسەبەوە حەرامن.

٢- دایکەکان.

٢-کچەکان.

٣-خوشکەکان.

٤-خوشکانی باوك.

٥- خوشکانی دایك.

٦- کچانی برا.

٧- کچانی خوشك.

وە دایك هەموو مێینەیەك ئەگرێتەوە کە (ولادة) زایینی ببێ بەسەرتەوە؛ جا ئەمانە ئەگرێتەوە: دایك، و دایکەکانی و نەنکەکانی، دایکی باوك و نەنکەکانی، هەرچەندە بەرەو ژوریش بن.

وە کچ ناوێکە بۆ هەموو ئەو مێیینانەی کە زاینت ببێ بەسەریەوە، یان نەسەبەکەیان ئەگەرێتەوە بۆ لای تۆ بەهۆی زایینەوە بە پلەیەك یان بە چەند پلەیەك. جا ئەمە کچی پشت و کچانی ئەو ئەگرێتەوە.

خوشکیش ئەوەیە کە لە دایك باوك یا لە یەکێکیانەوە خوشك بێت.

وە (عمة )پور (خوشکی باوك) و (خوشکی دایك) ئەو ئافرەتانە ئەگرێتەوە کە هاوبەشی هەیە لەگەڵ باوکتدا یا لەگەڵ باپیرتدا لەدایك و باوکەوە بێت، یا هەر لە یەکێکیانەوە بێت. وە جاری وائەبێت (عمة) لەلایەن دایکەوە ئەبێت وەك خوشکی باوکی دایك، وە جاری وا ئەبێت لەلایەن باوکەوە ئەبێت وەك خوشکی دایکی باوك.

(خالة) پور (خوشکی دایك) ئەو ئافرەتەیە کە خوشکی دایکە لەدایكو باوکەوە بێت، یان هەر لە یەکێکیانەوە، لە باوکەوە یان هەر لەدایکەوە، وەجاری وائەبێت ئەم (خالة)یە لەلایەن باوکەوە ئەبێت، وەك خوشکی دایکی باوك.

کچی برا (برازا) ناوە بۆ ئەو مێیینەیە کە براکەت (ولادة) زایینی ببێ بەسەریەوە، ڕاستەوخۆ یا بەهۆیەکەوە، وە هەروەهایە کچی خوشك.

**ئەو ئافرەتانەی بەهۆی ژنو ژنخوازییەوە حەرام ئەبن:**

**ئەمانەی خوارەوەن:**

١-دایکی خێزانەکەی، وە دایکی دایکیو دایکی باوکیو بەرەو ژوور، بە پێی فەرموودەی خوای گەورە کە ئەفەرموێ: ﴿وَأُمَّهَاتُ نِسَائِكُمْ﴾ (النساء :٢٣) واتە: دایکانی خێزانەکانتان.

وە مەرج نییە بۆ حەرامبونیان ئەو پیاوە چوبێتە لای ژنەکەی، بەڵکو هەرمارەی کردبێ ئەمانە حەرام ئەکات.

٢- کچی ژنەکەی لە مێردێکی تری بەمەرجێ چوبێتە لای ژنەکەی.

ئەمەش کچی کچی ژنەکەو کچی کوڕەکانی ژنەکە ئەگرێتەوەو بەرەوخوار، چونکە هەر بە کچی ئەو ژنەی ئەژمێررێن، بەپێی فەرموودەکەی خوای گەورە: ﴿وَرَبَائِبُكُمُ اللَّاتِي فِي حُجُورِكُمْ مِنْ نِسَائِكُمُ اللَّاتِي دَخَلْتُمْ بِهِنَّ فَإِنْ لَمْ تَكُونُوا دَخَلْتُمْ بِهِنَّ فَلا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ﴾ (النساء:٢٣).

(ربائب) لێرەدا کۆی (ربیبة)یە، (ربیب)ی پیاویش ئەوەیە لەژنەکەی بوبێت لەمێردێکی تری.

بۆیە پێی ئەڵێن (ربیبە) چونکە وەك منداڵی خۆی بەخێوی ئەکاو سەرپەرشتی ئەکا.

وە ئەوەی کە ئەفەرموێ: ﴿اللَّاتِي فِي حُجُورِكُمْ﴾ (النساء:٢٣) سیفەتە بۆ ڕوونکردنەوەی ئەو حاڵەتەیە کە زۆرتر وایە (ربیبة) لە کۆشی مێردی دایکدا ئەبێت، نەك بەستنەوەی (ربیبة) (بەم مانا ئەگەر لە کۆشی زڕباوکەکەدا نەبێت، ئیتر حەرام نابێت). بەڵام لای ظاهیرییەکان بەوە ئەبەسرێتەوە، ئەڵێن: پیاو کچی ژنەکەی لێ حەرام نابێت هەتا لە کۆشی خۆیدا بەخێوی نەکات.

هەروەها ئەو قسەیە لە هەندێ صەحابەوە گێڕراوەتەوە.

لە مالیکی کوڕی ئەوسەوە کە فەرمویەتی: ژنێکم هەبوو منداڵێشم لێی هەبوو کۆچی دوایی کرد زۆر پێی غەمبار بووم، ڕۆژێك عەلی کوڕی ئەبی تالیبم پێ گەیشت خوا لێی ڕازی بێت فەرمووی: ئەوە چیتە؟ ووتم: خێزانم مردووە. فەرمووی: کچی هەیە لەمێردێکی تری؟ ووتم: با والە طائیف. فەرمووی: لەباوەشی خۆتا بوو. ووتم: نەء. فەرمووی: دەمارەی بکە: ووتم: ئەی ئەو فەرموودەی خوا لەکوێیە کە ئەفەرموێ: ﴿وَرَبَائِبُكُمُ اللَّاتِي فِي حُجُورِكُمْ . . .﴾(النساء: ٢٣) فەرمووی: خۆ لەکۆشی تۆدا نەبووە، ئەوە ئەگەر لە باوەشی تۆدا بەخێوت کردایە وا ئەبوو.

جومهوری زانایان ئەم ڕایە ڕەت ئەکەنەوەو ئەڵێن: حەدیسەکەی عەلی سابت نییە، چونکە لە ڕیوایەتی ئیبراهیمی کوڕی عوبەیدە، لە مالکی کوڕی ئەوسەوە، لە عەلییەوە خوا لێی ڕازی بێت، وە ئەو ئیبراهیمە نەناسراوە، و بەشی زۆری زانایان حەدیسی ئەویان ڕەد داوەتەوە.

٣- ژنی کوڕ، و ژنی کوڕی کوڕ، و ژنی کوڕی کچ، و هەرچەند بەرەو خوار بێت، بەپێی فەرموودەی خوای بەرز کە فەرموویەتی: ﴿وَحَلَائِلُ أَبْنَائِكُمُ الَّذِينَ مِنْ أَصْلَابِكُمْ﴾(النساء:٢٣) واتە: وە ژنی ئەو کوڕانەی کەلە خۆتانن.

٤- ژنی باوك: حەرامە بۆ پیاو ژنی باوکی خۆی بهێنێ، هەر ئەوەندە مارەی کردبێ حەرام ئەبێت با نەچوبێتە لایشی.

وە ئەم جۆرە ژن هێنانە لەسەر دەمی نەفامیدا بڵاوبووە، وەپێیان ئەوت ژن هێنانی ڕق و کینە، وە ئەو کوڕەی لەو بوایە پێیان ئەووت کیناوی. جا خوای گەورە قەدەغەی کردووە و بەخراپی باسی کردووە خەلکی لێ دورخستەوە، ئیمامی ڕازی ووتوویەتی: پلەکانی ناشیرینی سێ پلەیە: ناشرینی عەقڵی، ناشیرینی شەرعی، و ناشیرینی عادی. وە خوای گەورە وەسفی ئەو نیکاحەی کردووە بەهەموو ئەو پلانە: کە ئەفەرموێ: (فاحشە) ئیشارەتە بۆ ناشیرینی عەقڵی، وە کە ئەفەرموێ: (ومقتاً) ئیشارەتە بۆناشیرینی شەرعی، وە کە ئەفەرموێ: (وساء سبیلاً) ئیشارەتە بۆ ناشیرینی عادی.

ئیبنوسەعد لە محمدی کوڕی کەعبەوە هۆی هاتنە خوارەوەی ئەو ئایەتە ئەگێڕێتەوە، ئەڵێت: پیاو ئەگەر بمردایەو ژنەکەی بەجێ بهێشتایە، کوڕەکەی لەهەمو کەس لە پێشتر بوو ژنەکەی مارە بکاتەوە ئەگەر ئارەزوی بکردایە، بەمەرجێ دایکی نەبوایە، وە یاییدات بەهەرکەس ئارەزوی بکردایە.

کاتێ ئەبو قەیسی کوڕی ئەسلەت مرد کوڕەکەی موحصین ژنەکەی مارە کردەوەو هیچی بۆ صەرف نەکردو هیچی لەماڵەکەی باوکی نەدایە بەمیرات، ژنەکەش هاتە لای پێغەمبەر ﷺ و ئەوەی بۆ باسکرد، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بگەڕێرەوە بەهیوای ئەوەی خوا دەربارەت شتێك بنێرێتە خوارەوە. ئیتر ئەو ئایەتە هاتە خوارەوە: ﴿وَلا تَنْكِحُوا مَا نَكَحَ آبَاؤُكُمْ مِنَ النِّسَاءِ إِلَّا مَا قَدْ سَلَفَ إِنَّهُ كَانَ فَاحِشَةً وَمَقْتاً وَسَاءَ سَبِيلاً﴾[1] (النساء: ٢٢)

واتە: ئەو ئافرەتانە مەهێنن کە باوکتان هێناویێتی، مەگەر ئەوانەی لەوەو پێش ڕوی داوە، چونکە ئەوە داوێن پیسی و جێی ڕقو کینەیەو ناشیرینترین ڕێگەیە.

وە حەنەفیەکان ڕایان وەهایە هەرکەس زینا لەگەڵ ئافرەتێکدا بکات، یادەستی لێ بدات یا ماچی بکات، یان سەیری شوێنی شەرمی بکات بە ئارەزووەوە، ئەوە ئەصلو فەرعی ئەو ژنەی لێ حەرام ئەبێت، وە ئەو ژنەش ئەصڵ و فەرعی ئەو پیاوەی لێ حەرام ئەبێت چونکە لای ئەمان حەرامیەتی ژن و ژن خوازی بە زیناش دروست ئەبێت، وە هەروەها پێشەکیەکانو پاڵ پێوە نەرەکانی زیناش ئەو حەرامیە دروست ئەکەن، وە ئەڵێن: ئەگەر پیاوێك زینای لەگەڵ دایکی ژنەکەی کرد یا لەگەڵ کچی ژنەکەی، ئەوە ئەو ژنەی لێ حەرام ئەبێت بۆ هەمیشە.

بەڵام جومهوری زانایان ڕایان وایە کە: حەرامیەتی ژن و ژن خوازی بە زینا سابت نابێت، وە بەو خاڵانەی خوارەوەش بەڵگەیان هێناوەتەوە:

١- فەرموودەی خوای گەورە ﴿وَأُحِلَّ لَكُمْ مَا وَرَاءَ ذَلِكُم﴾(النساء:٢٤)

واتە: لەوانە بەولاوە بۆتان حەڵاڵ کراوە، ئەمەش ڕوونکردنەوەو بەیان کردنی ئەو ئافرەتانەیە کە حەڵاڵە مارە بکرێن دوای ئەوەی ڕوون کرایەوە کامانە حەرامن، ئیتر خوا باسی ئەوەی نەکردووە کە زینا هۆیەکە لە هۆیەکانی حەرام بوون.

٢- عائیشە خوا لێی ڕازی بێت: گێڕاوێەتیەوە کە پێغەمبەر ﷺ پرسیاری لێکرا دەربارەی پیاوێك زینای لەگەڵ ژنێکدا کردبوو، جا کابرا ئەیویست یا خۆی یا کچەکەی مارە بکات.

---

(١) الدر المنثور (٢/٤٦٨) أسباب النزول للواحدي (١٧٩).

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (لايحرِّم الحرامُ الحلال، إنما يحرم ماكان بنكاح) رواه ابن ماجە عن ابن عمر[1]. واتە حەرام حەڵاڵ حەرام ناکات، بەڵکو هەرچی بە نیکاح بوو ئەبێتە هۆی حەرامیەتی.

٣- ئەو ئەحکامانەی باسیان کردووە لەوانەن کە زۆر پێویستن، وە جاری واهەیە بەڵاکەی گشت لایێ ئەگرێتەوە، لەبەر ئەوە نابێت یاسادانەری ئیسلام بێدەنگ بوبێت لیێ، نە قورئانی بۆ هاتبێتە خوارەوەو نەسوننەت باسی کردبێ، وە نەخەبەر و ئەسەری صەحابە مابێتەوە بۆمان، لە کاتێکا ئەوان نزیك بوون لەسەردەمی نەفامیەوە کە زینا تێیدا بڵاوبووە لەنێوانیاندا.

جا ئەگەر یەکێ لەوان بیزانیایە ئەوە بەڵگەیەکی هەیە لە شەرعا یان حیکمەتێك بوایە لەسەری، ئەوە بە تەئکید پرسیاریان ئەکرد لەبارەیەوەو زۆر ڕیوایەتمان بۆ نەقل ئەکرا لەسەر ئەو فتوایەی کە ئەیان دا لەسەری.

٤- وە لەبەر ئەوەی ئەو کارانە شتێکن کە مانای ئەوە ناگەیەنێت ئەو ئافرەتە ببێت بەڕاخەری پیاو، کەواتە حەرامی ژن و ژن خوازی بەوانەوە نابەسترێ، هەر وەك دەست لێدان بەبێ شەهوەت.

ئەو ئافرەتانەی بە هۆی شیردانەوە حەرام ئەبن:

ئەوەی کە بە نەسەب حەرام بێت بە شیردانیش حەرام ئەبێت.

وە ئەوانەی بەهۆی نەسەبەوە حەرامن: دایك و کچ و خوشك و خوشکی باوك و خوشکی دایك و کچی براو کچی خوشکە، کە خوای گەورە ڕوونی کردۆتەوەو ئەفەرموێ:

﴿حُرِّمَتْ عَلَيْكُمْ أُمَّهَاتُكُمْ وَبَنَاتُكُمْ وَأَخَوَاتُكُمْ وَعَمَّاتُكُمْ وَخَالاتُكُمْ وَبَنَاتُ الْأَخِ وَبَنَاتُ الْأُخْتِ وَأُمَّهَاتُكُمُ اللَّاتِي أَرْضَعْنَكُمْ وَأَخَوَاتُكُم مِنَ الرَّضَاعَةِ﴾ (النساء:٢٣)

کەواتە: لەسەر ئەوە دایکی شیری وەك دایك دائەنرێو حەرام ئەبێ لەسەر شیر خۆرەکە لەگەڵ هەموو ئەوانەی لەسەر کوڕ حەرام ئەبن لەلایەن دایکی نەسەبیەوە، کەواتە ئەمانە حەرام ئەبن:

١- ژنە شیردەرەکە، چونکە بەشیر پێ دانەکەی بە دایکی شیر خۆرەکە ئەژمێررێ.

٢- دایکی ژنە شیردەرەکە، چونکە ئەبێتە نەنکی.

٣- دایکی مێردی ژنە شیردەرەکە -خاوەن شیر- چونکە ئەویش ئەبێتە نەنکی.

٤- خوشکی دایکە شیریەکەی، چونکە ئەبێتە پوری.

٥- خوشکی مێردی شیردەرەکە ـ کە خاوەن شیرەکەیە ـ چونکە ئەویش ئەبێتە پوری.

---

(١) ابن ماجە (٢٠١٥).

٦- کچی کوڕەکانی‌و کچی کچەکانی، چونکە ئەبنە خوشکەزاو برازای.

٧- خوشکی، لەباوك و دایکێك بێت یاهەر لەدایك یا هەر لە باوك[١].

**ئەو شیرەی حەرامی پێ سابت ئەبێ:**

لە ڕواڵەتدا ئەو شیردانەی حەرامی پێ ئەچەسپێ تێکڕای شیردانە بە گشتی.

بەڵام بەشیردانێکی تەواو نەبێت نایەتە دی، ئەویش ئەوەیە منداڵەکە مەمکی ژنەکە بخاتە دەمی و بیمژێ و شیر بچێتە دەمی وەوازی لێ نەهێنێت هەتا خۆی بە ئارەزووی خۆی دەمی لێ بەرئەدا بێ‌ئەوەی شتێکی تر کار بکاتە سەری.

جا ئەگەر جارێك یا دووجار بیمژێ ئەوا پێی حەرام نابێت چونکە ناگاتە شیر پێ دانی تەواو و کارناکاتە سەر خواردن.

عائیشە خوا لێی ڕازی بێت فەرمویەتی: پێغەمبەر ﷺ نەی‌فەرموو: ﴿لاتُحرم المصَّة و لا المصتان﴾ رواه الجماعة إلا البخاري[٢].

واتە: مژو دوو مژ کەسی پێ حەرام نابێت.

وە (مصة) بە مانای یەك مژە، کە ئەویش وەرگرتنی کەمێکە لە شت. ئەوترێ مژێکم لێدا واتە: کەمێکم خواردەوە. وە ئەمە بەهێزە بەلای ئێمەوە.

بەڵام زانایان لەم بارەیەوە چەند ڕایەکیان هەیە:

١- کەم و زۆری شیر وەکو یەکن بۆ حەرام کردن بەپێی ئەوەی ووشەی شیردان لە ئایەتەکەدا بەموطلەقی هاتووە.

وە بەپێی ئەوەی بوخاری‌و مسلم گێڕاویانەتەوە لە عوقبەی کوڕی حاریسەوە فەرمویەتی: تومویەحیای کچی ئەبی ئیهابم مارە کرد، ئافرەتە کۆیلەیەکی ڕەش هات و ووتی: (شیرم داوە بە

---

(١) خوشکی دایکی و باوکی ئەوەیە دایکەکە بەشیری باوکەکە بەخێوی کردبێ جا لەگەڵ ئەو شیر خۆرەدا شیری دابێت پێیان یا بە جیا وەك یەکە.

(٢) أحمد (٦/٣١) ومسلم (١٤٥٠) وأبوداود (٢٠٦٣) والترمذي (١١٥٠) والنسائي (٦/١٠١) وإبن ماجة (١٩٤١).

هەردووکتان) منیش هاتم بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ بۆم گێڕایەوە، فەرمووی: (وکیف، وقد قیل؟ دعها عنك)[1]. واتە: چۆن، بەڕاست وا ووترا؟ وازی لێ بێنە.

جا واز هێنانی پێغەمبەر ﷺ لەوەی کە پرسیار بکات لە ژمارەی جارەکان‌و فەرمان پێدانی بە دوور کەوتنەوە لێی ئەبێتە بەڵگەی ئەوەی کە ئەوەی ئیعتیباری پێ ئەکرێ تەنها شیر پێدانە، ئیتر هەرکاتێ ناوەکەی هەبوو حوکمەکەشی ئەبێت.

وە لەبەر ئەوەی شیر پێدان کارێکە حەرام بوونی پێوە بەندە، کەواتە کەم‌و زۆری وەك یەکە، وەك چۆن چونە لای ئافرەت ئەبێتە هۆی حەرام بوون.

وە لەبەر ئەوەی ئێسك‌و گۆشت دروست کردن بەکەم و زۆری شیر بەدی دێت.

ئەمەش مەزهەبی عەلی و ئیبنو عەبباس و سەعیدی کوڕی موسەییب و حەسەنی بەصری و زوهری و قەتادەو حەمادەو ئەوزاعی و ثەوری و ئەبی حەنیفە و مالیك و ڕیوایەتێك لە ڕیوایەتەکانی ئەحمەدە.

٢- حەرام بوون پێك نایەت‌و ناچەسپێ بەکەمتر لە پێنج جار شیردانی جیا جیا.

بە پێی ئەوەی موسلیم و ئەبوداوود ونسائی ئەگێڕنەوە لە عائیشەوە کە فەرمویەتی: (ئەوەی پێشان لە قورئان هاتبووە خوارەوە (دە جار شیردانی ئاشکرا بوو کە حەرامی ئەکرد)، لە پاشاندا سڕاوە بە پێنج جاری ئاشکرا، وە پێغەمبەر ﷺ کۆچی دوایی کردو ئەو پێنج جارە تا ئێستا لە قورئاندا ئەخوێنرێتەوە)[2] ئەمەش تەقیید کردن و بەستنەوەیە بۆ (إطلاق) ڕەهایی کیتاب و سوننەت، وە بەستنەوەی (مطلق)یش ڕوون کردنەوەیە، نەك نەسخ کردنەوە، وە نەك تایبەت کردن.

وە ئەگەر بەرەنگاری ئەو ڕاو بۆچوونە نەکرایە بەوەی کە قورئان بە موتەواتیری نەبێت سابت نابێت، وە بەوەی ئەگەر وەك ئەوە بوایە کە عائیشە فەرمویەتی، لە موخالیفەکانی شاراوە نە ئەبوو بەتایبەتی عەلی و ئیبنوعەبباس، ئەڵێین:

ئەگەر وانەبوایە ئەو ڕایە بەهێزترین ڕا ئەبوو، هەر بۆیە ئیمامی بوخاری لای داوە لەو ڕیوایەتەی عائیشە.

---

(١) أحمد (٣٨٤/٤) والبخاري (٥١٠٤) وأبوداود (٣٦٠٣) والترمذي (١١٥١) والنسائي (٣٣٣٢).

(٢) مسلم (١٤٥٢/٢٤-٢٥) وأبوداود (٢٠٦٢) والترمذي (١١٥٠) والنسائي (١٠٠/٦) وإبن ماجة (١٩٤٢).

ئەمەش مەزهەبی عبد الله ی کوڕی مەسعود و یەکێك لەڕیوایەتەکانی عائیشەو عبدالله ی کوڕی زوبیر و عەطاء و طاووس و شافیعی و ئەحمەد لە ڕوالەتی مەزهەبەکەیداو ئیبنو حەزم و بەشی زۆری ئەهلی حەدیسە.

**٣- حەرام بوون ئەچەسپێ بە سێ جار شیردان و زیاتر.**

چونکە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (لاتُحرم المصَّة والمصتان)[١].

ئەوەش راستەو ڕێك نەفی تەحریم ئەکات بەکەمتر لەسێ جار، کەواتە حەرام بوون تەنها بەزیاتر لەوە ئەبێت. وە ئەبو عوبەید و ئەبو ثەور و داودی ظاهیری و ئیبنو مونذیر و ڕوایەتێکی ئەحمەد بۆ ئەوە چوون.

**شیری ژنە شیردەرەکە حەرامکەرە بە شێوەیەکی گشتی:**

خواردنی شیری شیردەر حەرام کەرە، بە خواردنەوە بێت، یان بە کردنە قورگ یان بە کردنە لوتەوە بێت، بەمەرجێ برسێتی ئەو منداڵە بشکێنێ‌و ئەوەندەی جارێك شیر پێدان بێت، چونکە ئەوەی بە مژینی شیرەکە دروست ئەبێت‌و پێکدێت لە گۆشت و ئێسك بەو شێوەیەش هەر دروست ئەبێت، کەواتە لە حەرام کردنیشا یەکسانن.

**ئەو شیرەی تێکەڵ بە شتی تر بووە:**

ئەگەر شیری شیردەر تێکەڵ خواردنێك، یا خواردنەوەیەك، یا دەرمانێك، یا شیری ئاژەڵێك کراو منداڵە شیرە خۆرەکە خواردی ئەوە ئەگەر شیری ئافرەتەکە لەو شتانەدا بەشی زۆری بوو ئەوە حەرام کەرە، بەڵام ئەگەر شیرەکە بەشی زۆری ئەو شتە نەبوو کە تێکەڵی کرا بوو ئەوە حەرامکەر نیە و پێی سابت نابێت.

ئەمەش مەزهەبی حەنەفی‌یەکان و موزەنی و ئەبی ثەورە.

ئیبنو قاسمی مالکی ووتوویەتی: ئەگەر شیر کرایە ناو ئاوەوە یا شتی تر، لە پاشاندا منداڵی شیرە خۆر خواردی‌یەوە بەو شێوەیە حەرام کەر نابێت.

وە شافیعی‌و ئیبنو حەبیب و (مطرف) و ئیبنو ماجیشون لە هاوەڵانی مالیك ڕایان وەهایە: کە بەو شێوەیە حەرام کەرە وەك ئەوەی کە شیرەکە بە تەنها بێت، چونکە بە تێکەڵ کراویش عەینی شیرەکە هەر ئەمێنێ.

---

(١) تەخریجی ئەم حەدیسە ڕابورد.

ئیبنو روشد فەرمویەتی: هۆی جیاوازی زانایان ئەوەیە کە ئایا شیرەکە حوکمی حەرام کردنی ئەمێنێ کاتێ تێکەڵی شتی تر کرا یاحوکمی نامێنێ.؟ وەك حاڵی شتی پیس کە تێکەڵێ شتێکی پاك بکرێت.

بنەمای ئیعتیبار پێکراو لەوەدا مانەوەی ناوی شیرەکەیە بەسەریەوە، وەك ئاو کە ئایا پاك کەرەوەیە کاتێ تێکەڵی شتێکی پاك بکرێت؟

**سیفەتی شیردەر:**

ئەو شیردەرەی کە بەشیرەکەی حەرامی پێ ئەچەسپێ ئەو ژنەیە شیر لە هەردوو مەمکی بێتە دەرەوە، باڵق بێت یا باڵق نەبێت، لە بێنوێژی وەستابێتەوە، یا نەوەستابێتەوە مێردی هەبێت یا نەیبێت، دوو گیان بێت یادوو گیان نەبێت .

**تەمەنی شیرە خۆرە:**

ئەو شیر خواردنەی کە زەواج حەرام ئەکات ئەوەیە لەدو ساڵی یەکەمی تەمەندا بێت، ئەو ماوەیە کە خوای گەورە دایناوەو ئەفەرموێ: ﴿وَالْوَالِدَاتُ يُرْضِعْنَ أَوْلادَهُنَّ حَوْلَيْنِ كَامِلَيْنِ لِمَنْ أَرَادَ أَنْ يُتِمَّ الرَّضَاعَةَ ﴾(البقرة:٢٣٣)

واتە: دایکەکان دوو ساڵی تەواو شیر ئەدەن بەمنداڵەکانیان ئەوە بۆ کەسێکە بیەوێ شیری تەواو بدات بەمنداڵەکە.

چونکە منداڵی شیرە خۆرە لەوماوەیەدا بچوکەو ئەو شیرەی بەسە، وە بەو شیرە گۆشت دروست ئەبێت، و ئەبێ بە بەشێك لەو دایکە شیردەرە، ئیتر ئەو منداڵە هاوبەش ئەبێت لەگەڵ منداڵەکانی تریدا لەحەرامیدا.

(دارقطني) و ئیبنوعەدی ئەگێڕنەوە لە ئیبنو عەبباسەوە خوایان لێ ڕازی بێت کە فەرمویەتی: شیر خواردن لە دوو ساڵەی سەرەتای تەمەنیدا نەبێت ئیعتیباری بۆ ناکرێ[1] .

وە بەمەرفوعی ئەگێڕنەوە لە پێغەمبەروە کە فەرمویەتی: (لا رضاع إلا ما أنشز العظم وأنبت اللحم) رواه أبوداود[2] .

واتە: ئەو شیر خواردنەی گۆشت و ئێسك دروست نەکات بەشیر خواردن دانانرێ.

---

(١) الدارقطني (٤/١٧٤) والبيهقي (٧/٤٦٢).

(٢) أبوداود (٢٠٥٩).

ئەوەش بۆ کەسێکە کە لـە دوو سـاڵی یەکـەمی تەمەنیدایـە، بەشـیر گۆشـت و ئێـسکی دروسـت ئەبێت.

وە لە ئومموسەلەمەوە خوا لیێ ڕازی بێت فەرمویەتی: پێغەمبەر ﷺ ئەی فەرموو: (لا يحـرِّم مـن الرضاع إلا مافتق الأمعاء، وكان قبل الفطام) رواه الترمذي وصححه، وقال ابن القيم: هذا حديث منقطع[1].

واتە: شیردان حەرام کەر نیە، ئەوە نەبێ کە ڕیخۆڵەکان پڕ بکات و پێش لەشیر بڕینەوە بێت.

وە ئەگەر شیرە خۆرەیەك پێش دووساڵەکە لە شیر بڕرایەوە و خواردنی تری بەس بوو. لەپاشاندا ژنێك شیری پێدا، ئەوە ئەو شیر پێدانە حەرامیەتی پێ سابت ئەبێ لای ئەبوحەنیفـە و شـافیعی وە بەپێی فەرمودەکەی پێغەمبەر ﷺ کە فەرمویەتی: (إنما الرضاعة من المجاعة)[2].

واتە: شیر پێدان ئەوەیە لەبەر برسێتی بێت.

وە مالیك فەرمویەتی: ئەو شیردانەی کە دوای دووساڵەکە بێت کەمو زۆری هیچ حـەرام ناکـات و وەك ئاوی لێدێت. وە فەرمویەتی: ئەگەر منداڵ پێش دووساڵە لە شیر بڕرایـەوە، یـا بـەخواردن وازی لە شیر خواردن هێنا، دوای ئەوە چی شیری بدرێتێ حەرامی ناکات.

**شیرخواردنی گەورە:**

لەسەر ئەوە شیردان بەگەورە حەرامکەر نیە بەڕای جەماوەری زانایان بەپێی بەڵگەکانی پێشوو.

بـەڵام کۆمـەڵێك لـە زانایـانی پێـشینەو پاشـینە بـۆ ئـەوە چـوون کـە حەرامکـەرە -ئەگـەر پـیرە پیاوێکیش بێت- وەك چۆن شیردان بە بچووك حەرام کەرە، ئەمـەش ڕای عـائیـشەیە خـوا لـیێ ڕازی بێت.

وە ئەوە لە عەلی و عوروەی کوڕی زوبەیرو عطای کوڕی ئەبی ڕەباح ئەگێڕنەوە، هـەروەها قـسەی لەیـسی کـوڕی سـەعد و ئیبنـو حەزمـە، وە بەڵگەشـیان ئەوەیـە کـە مالیـك لـە ئیبنـو شیهابەوە ئەگێڕێتەوە کە ئەو پرسیاری لێکرا دەربارەی شیردان فەرموی: عوروەی کـوڕی زوبـەیر حەدیسێکی بۆ گێڕامەوە کە (پێغەمبەر ﷺ فەرمانی دا بەسەهلەی کچی سوهەیلە شیر بـدات بـە سـالم ئـەویش شیری پێداو بەکوڕی خۆی ئەزانی[3].

(١) ترمذي (١١٥٢).

(٢) أحمد (٦/٢١٤) والبخاري (٥١٠٢) ومسلم (١٤٥٥).

(٣) أحمد (٦/١٧٤) ومسلم (١٤٥٣/٢٨-٣١) والنسائي (٦/١٠٦) وابن ماجة (٩٤٧).

عورره فەرمویەتی: جا عائیشەی دایکی ئیماندارانیش خوای لیّ ڕازی بێت ئەو کارەی ئەکرد لەگەڵ دەو کەسانەی کە پێی خۆش بوو هاتوچۆی بکەن لە پیاوان.

وە فەرمانی ئەدا بە خوشکەکەی کەناوی ئومو کەلثوم بوو وە بە کچی براکەی کە شیر بدەن بەو کەسانەی کە پێی خۆش بوو بچن بۆ ماڵەکەی، تا ببن بە مەحرەمی.

وە مالیك و ئەحمەد ئەگێڕنەوە کە ئەبا حوزەیفە سالمی کردبووە کوڕی خۆی کە خزمەت کاری ئافرەتێکی ئەنصاری بوو، وەك چۆن پێغەمبەر ﷺ زەیدی کردبووە کوڕی خۆی.

وە لەسەردەمی نەفامیدا ئەگەر پیاوێك کەسێکی بکردایە بەکوڕی خۆی خەڵك بەناوی ئەوەوە بانگیان ئەکردو میراتیشی ئەگرت، هەتا خوای گەورە ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە کە ئەفەرموێ: ﴿ادْعُوهُمْ لِآبَائِهِمْ هُوَ أَقْسَطُ عِنْدَ اللَّهِ فَإِنْ لَمْ تَعْلَمُوا آبَاءَهُمْ فَإِخْوَانُكُمْ فِي الدِّينِ وَمَوَالِيكُمْ﴾ (الأحزاب:٥).

واتە: بەناوی باوکی خۆیانەوە بانگیان بکەن چونکە ئەوە لای خوا ڕاسترو عادلانەترە، بەڵام ئەگەر ناوی باوکیانتان نەزانی ئەوە برای ئاینیو دۆستی ئێوەن.

سەهلە هات بۆ لای پێغەمبەر ﷺ ووتی: ئەی نێرراوی خوا ئەوسا ئێمە سالمان بە کوڕی خۆمان ئەزانیو لەگەڵ ئەبی حوزەیفەدا ئەهاتە ژورەوە لامان ئەمایەوەو بەکراسێکەوە منی ئەبینی، وە خوای گەورەش وەك ئەزانی چی ناردۆتە خوارەوە دەربارەیان پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (أرضعیه خمس رضعات)[1].

واتە: پێنج جار شیری بدەرێ، ئیتر بەو شیرە وەك کوڕی لێهات.

وە لە زەینەبی کچی ئومو سەلەمەوە خوا لیّی ڕازی بێت کە فەرمویەتی : ئومو سەلەمە بە عائیشەی ووت خوا لیّی ڕازی بێت: غوڵامی تازە پێگەیشتوو دێت بۆ ماڵەکەت کە من حەز ناکەم بێتە ماڵم. عائیشە خوا لیّی ڕازی بێت فەرمووی: ئەی چاو لە پێغەمبەر ﷺ ناکەی؟ پاشان فەرمووی: ژنەکەی ئەبی حوزەیفە ووتی: ئەی نێرراوی خوا سالم دێتە لامان و پیاوێکە، ئەبی حوزەیفەش شت دێتە دڵیەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموی: (أرضعیه حتی یدخل علیك) واتە: شیری بدەرێ بۆ ئەوەی بێتە ژوورەوە بۆلات[2].

---

(١) تەخریجی ئەم حەدیسە ڕابورد.

(٢) تەخریجی ئەم حەدیسە ڕابورد.

هەڵبژێردراو لەم دوو قسەیە ئەوەیە کە ئیبنوقەییم لێی کۆڵیونەتەوەو ئەفەرموێ: حەدیسەکەی سەهلە نە سڕراوەتەوەو نە تایبەتە و نە گشتی‌یە بەرامبەر هەمووکەس، بەڵکو ئەوەی ڕوخسەتێکە بۆ پێویستی بۆ ئەو کەسەی کە ناتوانێ نەچێتە ژوورو ماڵی ژنان وە ئەو ژنە زۆر پێویستی پێی هەبێ، وەك حاڵی سالم لەگەڵ ژنەکەی ئەبی حوزەیفەدا.

کەسێك بەو شێوەیە بێت وەك ئەو گەورەیە ئەگەر ژن شیری بداتێ شیرەکە کار ئەکات، بەڵام بۆ کەسانی تر کار ناکات بەمنداڵی نەبیت — ئەمەش ئەو بۆچونەیە کە ئیبنوتەیمی‌یە ڕەحمەتی خوای لێ بێت گرتویەتی.

وە ئەو فەرموودانەی نەفی شیردان بەگەورە ئەکەن: یا (مطلق) ڕەهان و بە حەدیسەکەی سەهلە ئەبەسترێنەوە یاگشتین لەهەموو شێوەیەکداو ئەو شێوەیەی لێ تایبەت ئەکرێ لەگشتی‌یەکەی .

وە ئەوەی کە باس کرا لەو قسەیە لە پێشترە کە ئەڵێ نەسخ کراوەتەوە، وە لەوەی کە ئەڵێ تایبەت کراوە بە کەسێکی تایبەتەوە، وە نزیکترە بۆ کارکردن بە هەموو حەدیسەکان لە هەردوو لاوە، وە بنەماکانی شەرعیش شایەتن لەسەری.

**شایەتی دان لەسەر شیردان:**

شایەتی یەك ژن وەر ئەگیرێ لە شیرداندا — ئەگەر جێی بڕوا بێت — بەپێی ئەوەی کە عوقبەی کوڕی حاریس ئەگێڕێتەوە کەژنیکی مارەکرد ناوی ئومو یەحیایی کچی ئەبی شیهاب بوو، ژنێکی کۆیلەی ڕەش هات‌و ووتی: من شیرم داوە بە هەردووکتان، ئەڵێ ئەوەم بۆ پێغەمبەر ﷺ گێڕایەوەو خۆم لە ئافرەتەکە دوور کردەوە ئەویش فەرمووی: جا چۆن ئەبێت تازە ووتوویەتی شیرم پێ داون؟. ئیتر لێی قەدەغە کرد[1].

طاووس و زوهری و ئیبنوئەبی ذئب و ئەوزاعی و ڕیوایەتێکی ئەحمەد ئەم حەدیسەیان کردۆتەوە بەڵگە کە شایەتی یەك ژن لە شیردانا وەرئەگیرێ.

وە جومهور بۆ ئەوە چوون کەتەنها شایەتی شیردەرەکە بەس نی‌یە؛ چونکە شایەتی‌یە لەسەر کاری خۆی.

ئەبوعوبەید لە عومەرو موغیرەی کوڕی شوعبەو عەلی کوڕی ئەبی طالیب و ئیبنوعەبباسەوە تەخریجی کردووە کە ڕێیان نەداوە ژن‌و مێرد بەوە لەیەك جیا بکرێنەوە.

---

(١) تەخریجی ئەم حەدیسە ڕابورد.

عومەر خوا لیی ڕازی بێت ووتویەتی: کاتێ لەیەکیان جیا بکەنەوە کەشتی ڕوون و ئاشکرا بێت ئەگینا واز لەژن و مێرد بهێنن مەگەر خۆیان وەرع بکەن، وە ئەگەر ئەم دەرگایە وەکرێ و والاّ بێ ئافرەت هەرکاتێ بیەوێ ژنو مێرد لەیەك بکات ئەیکات.

وە مەزهەبی حەنەفییەکان لە شایەتیداندا لەسەر شیردان، ئەبێ دوو پیاو شایەتی بدەن یا پیاوێكو دووژن، وە شایەتی ژنان بەتەنها وەرناگیری بەپێی فەرمودەی خوای گەورە کە ئەفەرمووێ: ﴿وَاسْتَشْهِدُوا شَهِيدَيْنِ مِنْ رِجَالِكُمْ فَإِنْ لَمْ يَكُونَا رَجُلَيْنِ فَرَجُلٌ وَامْرَأَتَانِ مِمَّنْ تَرْضَوْنَ مِنَ الشُّهَدَاءِ﴾ (البقرة:٢٨٢)

وە بەیهەقی ئەگێڕێتەوە : ئافرەتێکیان هێنا بۆ لای عومەر خوا لیی ڕازی بێت شایەت بوو بەسەر پیاوو ژنێکەوە کە شیری داوەتە هەردووکیان، فەرموی: نابێ هەتا دووپیاو شایەتی نەدات یا پیاوێك و دووژن.

وە لە شافعییەوە خوا لیی ڕازی بێت: کە بەوەش سابت ئەبێ و بە شایەتی چوار ژنیش هەر دروستە، چونکە دوانیان بەرامبەر بە پیاوێکن، وە لەبەر ئەوەی ژنان بەزۆری ئاگاداری شیردانن وەك منداڵ بوون.

وە لەلای مالیك: شایەتی دووژن وەر ئەگیرێ بەمەرجێ لەوە پێش باسی ئەوە بڵاو بووبێ.

ئیبنوروشد فەرمویەتی:

وە هەندێکیان حەدیسەکەی عوقبەی کوڕی حاریث بۆ پەسەندی وەردەگرن بۆ ئەوەی لەگەڵ ئوصوڵ و بنەماکاندا یەك کەوێ، ئەمەش زیاتر وێ چووەو ڕیوایەتێکە لەمالیکەوە.

**باوکییەتی مێردی ژنە شیردەرەکە بۆ شیر خۆرەکە:**

ئەگەر ئافرەتێك شیریدا بەمنداڵێك مێردی ئەو ژنە ئەبێت بەباوکی ئەو کوڕەو براکەشی ئەبێتە مامی، بە پێی حەدیسەکەی حوزەیفە کە لە پێشەوە هات، وە بەپێی حەدیسی عائیشە خوا لیی ڕازی بێت کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (إئذني لأفلح أخي أبي العقيس فإنه عمك)[1].

واتە: ڕێ بدە بە ئەفلەحی برای ئەبی عوقەیس چونکە ئەو مامتە. وە ژنەکەی ئەبی عوقەیس شیری دابوو بە عائیشە خوا لیی ڕازی بێت.

---

(١) البخاري (٥٢٣٩) ومسلم (٣/١٤٤٥).

وە لە ئیبنو عەبباسیان پرسی: پیاوێك دوو جاریەی هەیە یەکێکیان شیری داوە بە جاریەیەك ئەوی تریان شیری داوە بە غوڵامێك: ئایا ئەبێت ئەو غوڵامە ئەو جاریەیە بهێنێ؟ فەرموی: (نەء) یەك لیقاحن.

ئەمەش ڕای هەر چوار ئیمامەکەو ئەوزاعی و ثوریەیە، وە لەو صەحابانەش کە ئەو بۆچونەیان بووە عەلی و ئیبنوعەبباس بوون خوا لێیان ڕازی بێت.

**کەمتەرخەمی کردن لە کاری شیر پێدانا:**

زۆر لە ئافرەتان لە شیر پێدانا تەساهول ئەکەن، منداڵەکەیان شیر ئەدەن لە ژنێك یا چەند ژنێك، بێ ئەوەی گوێ بدەنە ناسینی منداڵەکانی ئەو ژنە یا خوشکەکانی کە شیر ئەدات بەمنداڵەکە، وە هەروەها بێ ئەوەی گوێ بدەنە ناسینی منداڵی پیاوەکەی - لە ژنێکی تری - وە یا گوێ بدەنە ناسینی برای ئەو پیاوە، بۆ ئەوەی ئەو حوکمانە بزانن کە لەسەری دائەمەزرێ، وەك حەرام بوونی نیکاح و مافەکانی ئەو خزمایەتیەیە تازەیە کە یاسادانەری ئیسلام وەك نەسەب دایناوە.

چونکە زۆر پیاو خوشکی شیری خۆی یا پوری شیری خۆی ئەهێنێ بێ ئەوەی پێی بزانێ[1].

جا ئەوەی پێویستە ئەبێ ئیحتیاتی تەواو بکرێ لەم کارەدا هەتا مرۆڤ نەکەوێتە شتی قەدەغە کراوەوە.

**حیکمەتی ئەو حەرام کردنە:**

لە تەفسیری مەناردا هاتووە[2]: خوای گەورە لەنێوان خەڵدا چەند جۆرە سیلەی ڕەحمی داناوە کەبەهۆی ئەوانەوە سۆزیان بۆیەك هەبێتو یارمەتی یەك بدەن بۆ دورخستنەوەی زیانو هێنانی سوود و قازانج بۆیەك، وە بەهێزترین ئەو سیلانەش سیلەی خزمایەتیو سیلەی ژن و ژن خوازیەیە.

وە بۆ هەریەك لەم دوانە پلەی جیاوازی خۆیان هەیە.

ئەمما سیللەی ڕەحمی خزمایەتی بەهێزترینی ئەوەیە کە لە نێوان منداڵان و باوکاندا هەیە لەڕوی سۆزو خۆشەویستییەوە.

جا هەرکەس بگات بە نهێنی سۆزی باوك بۆ منداڵەکەی ئەبینێ لە دڵی ئەو باوکەدا پاڵ پێوەنەرێکی سروشتی هەیە کە پاڵی پێوە ئەنێت گوێ بدات بەکوڕەکەی بۆ ئەوەی ببێتە پیاوێك وەك خۆی.

---

(١) المنار (ص ٤٧٠ ج ٤).

(٢) (ج٥ ص٢٩) من تفسير المنار.

ئینجا ئەو باوکە وەکو چۆن سەیری ئەندامێك لە ئەندامەکانی ئەکات ئاوها سەیری ئەو منداڵە ئەکات، وە پشت بەو ئەبەستێ لە ڕۆژانی داهاتویدا، وە منداڵەکەش واهەست دەکات کە ئەو باوکە سەرچاوەی دروست بونیەتی و هۆی بەردەوامی ژیانو پەروەردەکردنو نیشانی شەرەفییەتی.

بەو هەستەوە منداڵ ڕێزی باوکی ئەگرێ وەبەو سۆزە ناسکەوە باوك ئەڕوانێتە منداڵیو یارمەتی ئەدات.

ئەوەبو ووتەی مامۆستا (محمد عبده).

وە لەسەر کەسیش شاراوە نیە سۆزو ڕەحمەت و بەزەیی و دڵ نەرمی دایکایەتی زۆر بەهێزترە لە سۆزو ڕەحمەت و بەزەیی و دڵ نەرمی باوکایەتی، چونکە دڵی ناسکترەو هەستی ناسکترە. وە منداڵەکە بە کۆرپەیی لە خوێنەکەیدا دروست ئەبێت ئەو خوێنەی کە ژیانی پێوە وەستاوە.

لەپاشاندا ئەبێتە منداڵ و شیرەکەی ئەخوات، وە لەگەڵ هەر مژێك کە لە مەمکی دایکی ئەدات سۆزێکی تازەی بۆ زیاد ئەبێت کە ئارام ئارام لە دڵی ئەو دایکەدا دەری ئەکێشێ، وە منداڵیش هیچ کەسێکی لەدونیادا پێش دایکی خۆش ناوێت، لەپاشاندا ئەو منداڵە باوکی خۆش دەوێت بەڵام ئەوەندەی دایکی نا، هەرچەندە زۆرتر ڕێزی باوکی ئەگرێ لەدایکی.

جا ئایا تاوان نیە لەسەر سروشتی مرۆڤایەتی کە ئارەزو بازی تەنگ بەو خۆشەویستییە گەورەی نێوان دایك و باوك و منداڵ هەڵبچنێت و جێگەی بگرێت، لەکاتێکدا ئەو خۆشەویستیە چاکترین شتە کە لە ژیاندایە.

بەڵێ تاوانە هەر لەبەر ئەوەشە حەرام بوونی هێنانی دایکان توندتر هاتوە لە پێشەوە لە ئایەتەکەدا، وە لەپاش ئەوان حەرام کردنی کچان. وە ئەگەر لە مرۆڤدا تاوان و دەست درێژی بۆ سەر سروشت و گاڵتە پێ کردنی و خراپ کردنی نەبینرایە، بۆ ئادەمیزادی سروشت ساغ زۆر جێی سەرسوڕمان بوو کە دایکان و کچان لەسەر مرۆڤ حەرام کراوە، چونکە هەر سروشتی ئەو ئادەمیزادە ساغە تەنانەت بیر کردنەوە لە نزیك بوونەوەشیان بە محاڵ دائەنێ.

ئەمما براو خوشك پەیوەندی نێوانیان وەك پەیوەندی نێوان دایكو باوكو منداڵەکانیان وەهایە لەو ڕووەوە کە هەموویان وەك ئەندامی لاشەیەك وەهان، چونکە خوشكو برا لە بنەچەیەکن کە هەردوکیان وەك یەکن بۆ ئەو بنەچەیە بەبێ جیاوازی.

پاشان ئەوانە هەردووکیان لەیەك باوەشدا، بەخێو بوون و زۆر جار لەسەر یەك شێوازیش، وە سۆزی خوشكو برایەتی لە نێوانیاندا هاوتایە، لەیەکێکیاندا زۆر نیەو لەوی تریاندا کەم، وەك هێزی سۆزو خۆشەویستی دایکایەتیو باوکایەتی بەرامبەر سۆزی جگەر گۆشەی.

لەبەر ئەو هۆیانە هۆگری ئەو دوانە بە یەکتری‌یەوە هۆگری‌یەکی یەکسانەو هیچ هۆگری‌یەکی تر شان لەشانی نادات، چونکە لە نێوان مرۆڤدا هیچ پەیوەندیەك نی‌یە کە ئەو شێوە یەکسانی‌یە تەواوەی تێدا بێت وە ئەو سۆزو بڕواو خۆشەویستی‌یە بەرامبەری‌یەی تێدا بێت.

ئەگێڕنەوە ژنێك هانای بردووە بۆ لای حەججاج بۆ رزگار کردنی مێردو کوڕو براکەی کە ئەیویست بیان کوژێت ئەویش ووتی: تکاکەت بۆ یەکێکیان وەرئەگرم، وە پێی ووت خۆت یەکێکیان هەڵبژێرە، ئەویش براکەی هەڵبژارد، پرسیاری لێکرد بۆچی براکەی هەڵبژارد کە نەکوژرێت، ژنەکە ووتی: لەبەر ئەوەی برا تەنها کەسێکە کە بریتی نی‌یە چونکە دایكو باوکمان مردووە، بەڵام مێردو کوڕەکە ئەتوانرێ بریتیان دەست بکەوێت، حەججاج ئەو وەڵامەی لاسەیر بوو هەر سێکیانی عەفوکردو ووتی: ئەگەر ئەو ژنە لەبراکەی بەولاوە هەڵبژرادایە هەرسێکیانم بۆ ئەکوشت.

خولاسەی قسە: پەیوەندی خوشك و برایەتی پەیوەندی‌یەکی سرووشتی بەهێزە، وە خوشك و برا دڵیان نابات ئارەزوو لەیەکتر بشکێنن، چونکە سۆزی خوشكو برایەتی دەسەڵاتدارە بەسەر دەروندا بە شێوەیەك کە جێی شتی تر نابێتەوە لەگەڵیا مادام فیترەت ساغ و پاك بێت.

لەبەر ئەو حیکمەتی یاسای ئیسلام بەحەرامی داناوە خوشك مارەکردن هەتا خاوەن فیترەتە نەخۆشەکان رێگایەکیان نەبێت بۆ ئەوەی سۆزو خۆشەویستی و برایەتی بگۆڕنەوە بە ئارەزو بازی.

وە ئەمما پورەکان ئەوانیش هەر لەو قورەی دایك و باوکن، وە لەحەدیسدا هاتووە (عم الرجل صنو أبيه)[1].

واتە: مامی پیاو دوپەلی دارێکن لەگەڵ باوکدا. چونکە وەك دوپەلی دار لە دارەکە رووان.

وە لەبەر ئەو واتایە کە پەیوەندی پورە باوکی‌یەکان لە پەیوەندی باوکی‌یەتیەوەن وە پەیوەندی پورە دایکی‌یەکان لە پەیوەندی دایکی‌یەتیەوەن - ووتویانە: حەرام کردنی نەنکەکانیش وان لەناو حەرام کردنی دایکەکاندا، وە لە چاکی‌یەتی ئاینی فیترەتە کە پارێزگاری سۆزی پەیوەندی پورەکان بکرێت و بەهۆی ئەو سۆزەوە یارمەتیو بەزەیی ببێت بەرامبەریان، وە نابێت ئارەزوو بازی بەسەر ئەو سۆزەدا زاڵ بێت، ئەویش بەحەرام کردنی نیکاحی خوشکی باوكو دایکە.

---

(١) ترمذي (٣٧٦٢).

وە برازاو خوشکەزاش بۆ پیاو وەك کچی خۆی وەهان، چونکە براو خوشکەکەی وەك خۆی وەهان، وە خاوەنی فیترەتی سەلیم هەر ئەو سۆزەی ئەبێت بۆیان، هەروەها خاوەنی فیترەتی نەخۆشیش هەروایە، بەڵام ئەو سۆزەکەشی هەروەك سروشتەکەی نەخۆشە.

بەڵێ: سۆزی پیاو لە سەر کچەکەی بەهێزترە چونکە پارچەیەکە لەخۆی و نەشونمای کردووە بە چاودێری و شەرپەرشتی خۆی. وە هۆگرتنی بە خوشك و براکەیەوە بەهێزترە لە هۆگرتنی بە کچیانەوە لەبەر ئەوەی لە پێشەوە باسکرا.

بەڵام جیاوازی نێوان پورەکان و برازا و خوشکەزاکان ئەوەیە کە خۆشەویستی خوشکەزاو برازا خۆشەویستی بەزەیی و سۆزە، وە خۆشەویستی پورەکان خۆشەویستی ڕێزگرتن و ئیحتیرامە جا هەر دوولا- بۆ دووریان لەوەوە کە ئارەزوویان پێ بشکێت- وەك یەکن.

وە بۆیە لە ئایەتەکەدا پێش برازاو خوشکەزا خراون، چونکە ئەوان لە باوك و دایکەوەیە کەواتە پەیوەندی ئەوان گەورەترو بەرزترە لە پەیوەندی خوشك و براکان.

ئەمانە جۆرەکانی خزمایەتی نزیکە کە خەڵك بەو خزمایەتییانەوە سۆزو بەزەییو خۆشەویستیو یارمەتییان هەیە بۆ یەکتر. وە بەو خۆشەویستیو ڕێزو میهرەبانییەی کە خوا خستویەتییە دڵەکانیانەوە.

جا خوا نیکاحی ئەو خزمە نزیکانەی حەرام کردووە بۆ ئەوەی سۆزی ژنو مێردایەتیو خۆشەویستی بەرەو کەسێك بچێت کە پەیوەندی سروشتیو نەسەبی لە نێوانیاندا لاواز بێت، وەك غەریب و بێگانە، و ئەو چینانەی دوورن بە خزمایەتی لەو کەسەوە وەك ئامۆزاو خاڵۆزاو پورزا.

وە بەوە لەنێوان ئادەمیزاددا خزمایەتی تێکەڵ بوون تازە ئەبێتەوە کە ئەویش لە خۆشەویستی و سۆزو میهرەبانیدا وەك خزمایەتی نەسەبە، بەو شێوەیە چوارچێوەی خۆشەویستیو دڵسۆزی فراوان ئەبێت لە نێوان خەڵكدا.

ئەمەیە حیکمەتی ڕوحی شەرع لەبارەی ئەو خزمە نزیکانەی کە حەرام کراون.

پاشان مامۆستا (محمد عبدة) فەرمویەتی: لەگەڵ ئەمانەشدا حیکمەتێکی کەی لاشەیی زیندووی گەورە هەیە. ئەویش ئەوەیە کە هێنانی خزم و نزیکان هۆی لاوازی نەسلە، ئەگەر ئەو کارە بەردەوام بێو ئەو لاوازییە بە زنجیرە بێتە خوارەوە وای لێدەکات نەسل لەناو دەچێت ئەمەش دوو هۆی هەیە:

یەکەم: کە زانایان ئیشارەتی بۆ ئەکەن ئەوەیە، کە هێزی نەسل بە ئەندازەی هێزی هۆکارەکانی زاووزێیە لە ژن و مێردا. کە ئارەزوە.

وە ووتوویانە: ئەو ئارەزووە لە نێوان خزماندا لاوازە لەبەر ئەوە بووە کە بەکەراهەتیان زانیوە هێنانی ئامۆزاو پورزا. تا دوایی. وە هۆی ئەوەش ئەوەیە کە ئەو ئارەزووە هەستێکە لە دەروونەدا، هەستی سۆزی خزمایەتی کە دژی ئەوە تەنگی پێ هەڵئەچنێت جا یا لەناوی ئەبات یا لاوازی ئەکات.

دووەم: پزیشکەکان ئەیزانن، وە بۆ خەڵکیش دەرئەکەوێ بەنموونەیەکی نزیك و ناسراو لای جووتیاران.

ئەویش ئەوەیە کە زەوی ئەگەر هەمیشە یەك جۆر تۆوی تێ بکرێ ئەو کشتوکاڵە جار بۆ جار لاواز ئەبێت هەتا وای لێ دێت لەناو ئەچێت، لەبەر کەم بونەوەی ئەو مەوادەدەی کە خۆراکی سەرەکی‌یەتی، وە زۆر بوونی شتی تر کە ئەو خۆراکی لێ وەرناگرێ، وە ئەو خواردنەش ئەخۆن کە ئەو پێویستی پێی هەیە، بەڵام ئەگەر ئەو تۆوە لە زەوی‌یەکی تردا بچێنرێو ئەو زەوی‌یە جۆرێکی تری دانەوێڵە تێدا بچێنرێت ئەوە هەریەکەیان نەشونمایەکی جوان ئەکەن.

بەڵکو لای جوتیاران سابتە کە گۆڕانکاری لە جۆرەکانی یەك دانەوێڵەش سوودی هەیە. جا ئەگەر گەنم لە زەوی‌یەکدا چێنراو تۆوەکەی هەڵ گرنو جارێکی تر هەر لەو زەوی‌یەدا بیچێننەوە ئەبینن نەشونمای لاواز دەبێت و دانی کەم.

بەڵام ئەگەر تۆوی گەنمی زەوی‌یەکی تریان هێناو هەر لەو زەوی‌یەدا چاندیان نەشونمای چاکترو باشتر ئەبێت. هەروەها ئافرەتیش ـ وەك زەوی‌یە ـ منداڵی تێدا ئەچێنرێت، وە کۆمەڵی خەڵکیش وەك جۆرەکانی تۆو وەهان.

لەبەر ئەوە پێویستە ئەندامانی هۆزێك ژن لە هۆزێکی تر بهێنن بۆ ئەوەی منداڵەکانیان چاك دەرچێت.

چونکە منداڵ لە میزاج و خوی ئەو دایك و باوکەو لە ماددەی لاشەیان وەردەگرێ، هەروەها لە ڕەوشت و سیفاتی ڕۆحی‌یان وەرئەگرێت وە لە هەندێ شت لەوان جیاوازە.

کەواتە ئەو وەرگرتن و جیاوازی‌یە دوو سوننەتن لە سوننەتەکانی ژیان، پێویستە هەرکەسێك بەشی خۆی شتیان لێ وەربگرێ بۆ ئەوەی ئەوەی مرۆڤ بەرز بێتەوەو خەڵکی لە یەکتری‌یەوە نزیك ببنەوە، وە هەندێکیان لە هەندێکیان هێزو ئامادەیی وەربگرن، وە ژن هێنان لە خزم پێچەوانەی ئەو کارانەیە.

جا بەوەی پێشەوە سابت بوو کە ئەو کارە زیانی لاشەیی‌و دەروونی هەیەو پێچەوانەی فیترەتە، وپەیوەندیەکانی کۆمەڵایەتی تێك ئەدات، و ڕێ گرێکە بۆ بەرزبوونەوەی مرۆڤ.

غەزالی لە (الإحیاء)دا باسی ئەوە ئەکات: کە ئەو خاڵانەی پێویستە ڕەچاو بکرێن لە ئافرەتدا، ئەوەیە کە نابێت لە خزمی نزیك بێت. ئەڵێ چونکە منداڵ بەلاوازی دروست ئەبێت. وە لەو بارەیەوە فەرموودەیەکی هێناوە کە صەحیح نیە. بەڵام ئیبراهیمی حەرەبی ئەیگێڕێتەوە لە (غریب الحدیث) دا کە عومەر بە ئالی سائیبی فەرمووە: ئافرەتی بێگانە بهێنن و منداڵەکانتان لاواز مەکەن.

وە غەزالی ئەوەی وەها لێك داوەتەوە: کە ئارەزوو دروست ئەبێت بەهێزی هەستی سەیرکردنو دەست لێدان، جا ئەو هەستە بەشتێکی غەریبی تازە زیاتر هێز پەیدا ئەکات، بەڵام ئەوەی کە هەمیشە لەبەرچاو بێت هەست لاواز ئەکاتو بەتەواوی کار ناکاتە سەر دروست بوونی ئارەزو.

وە ووتوویەتی: ئەو لێکدانەوە بەسەر هەموو شێوەکاندا تەطبیق نابێت، بەڵام بەشی زۆریان بەو شێوەیەیە کە وتمان.

هیکمەتی حەرام بوون بەهۆی شیردانەوە:

وە ئەمما حیکمەتی حەرام بوون بەهۆی شیردانەوە؛ لە میهرەبانی خواوەیە کە چوار چێوەی خزمایەتی بۆ فراوان کردووین بەوەی ئەوانەی شیریش ئەخۆن هەر بەخزم دائەنرێن؛ چونکە هەندێ لە لاشەی منداڵەکە بەو شیرە دروست ئەبێت، وە بەوە منداڵی خۆی چی لێ وەرئەگرێ ئەویش بەهۆی ئەو شیرەوە لێی وەر ئەگرێ.

هیکمەتی حەرام بوون بەهۆی ژنو ژنخوازییەوە:

وە حیکمەتی حەرام بوون بەهۆی ژنو ژنخوازییەوە ئەوەیە ئەوەیە کە کچی ژنو دایکی لە پێش ترن بۆ حەرام بوون، چونکە ژنی پیاو بەشێکە لە گیانی ئەو پیاوە؛ ڕاگری ئەسڵ و بنەڕەتی ئینسانی ئەوەو تەواوکەرییەتی. لەبەر ئەوە پێویستە کە دایکی ژنەکەی بۆ ڕێزو خۆشەویستی وەك دایکی خۆی بێت، وە زۆر ناشیرینە بۆی ببێتە هەوێ چونکە خزمایەتی ژن و ژنخوازی وەك خزمایەتی نەسەبە.

وە کاتێ پیاوێك ژنێك لە هۆزێك دێنێت وەك یەکێ لە ئەندامەکانی ئەو هۆزەی لێ دێت، وەلە دەروونیدا سۆزو خۆشەویسی تازەی بۆ دروست دەبێت. جا ئایا ئەبێت ئەوە هۆیەك بێت بۆ دوور کەوتنەوەو زیان لە نێوان دایكو کچدا؟ .. نا .. چونکە بەڕاستی ئەوە پێچەوانەی حیکمەتی خزمایەتییە بەژنو ژنخوازی وە هۆی تێکدانی هۆزە. کەواتە ئەوەی موافەقەی فیترەت بێتو بەرژەوەندی پێ هەڵسێ ئەوەیە: کە دایکی ژن وەك دایکی پیاوەکە بێت، وە ئەو کچەی کە لەگەڵ ژنەکەیدایەو ئەو بەخێوی ئەکات وەکو کچی خۆی سەیری بکات.

وە هەروەها پێویستە ژنی کوڕ وەك کچی خۆی بێت؛ وە ئەو سۆزەی بەرەو ڕوو بکات کە بۆ کچی خۆی هەیەتی، وەك چۆن کوڕ ژنی باوکی وەك دایکی خۆی دادەنێت.

وە ئەگەر لە میهرەبانی خواوەو لە حیکمەتی خواوە دوو خوشك لەیەك کاتدا هێنانی حەرام کردووە تاوەکو خزمایەتی ژن‌و ژنخوازی هۆیەك بێت بۆ خۆشەویستی نەك هۆیەك بێت بۆ زیان‌و دوورکەوتنەوە لەیەك، ئیتر چۆن عەقڵ ئەوە وەر ئەگرێ کە هێنانی نزیك ترین کەس لە ژنەوە ڕەوا بێت وەك دایکی و کچی، یا ژنی باوك بۆ کوڕ، یان ژنی کوڕ بۆ باوك؟!

وە ڕوون بۆتەوە بۆمان کە حیکمەتی ژن هێنان ئارام بوونی دەروونی هەریەکە لەو ژن و مێردەیە بەوی تریان، وە خۆشەویستی‌و میهرەبانی نێوانیان‌و نێوان ئەو کەسانەیە کە پەیوەستە بەوانەوە بە خزمایەتی نەسەب، خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿وَمِنْ آيَاتِهِ أَنْ خَلَقَ لَكُمْ مِنْ أَنْفُسِكُمْ أَزْوَاجاً لِتَسْكُنُوا إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُمْ مَوَدَّةً وَرَحْمَةً﴾ (الروم:٢١).

واتە: وە لەنیشانەکانی خوای گەورە ئەوەیە کە لە خۆتان خێزانی بۆ دروست کردوون بۆ ئەوەی لە پاڵیاندا ئارام و دڵنیا بن وە خۆشەویستی‌و میهرەبانی خستۆتە نێواتان.

خوای گەورە دڵنیایی دەروونی تایبەت کردووە بەژن‌و مێردایەتی‌یەوە، بەڵام خۆشەویستی‌و میهرەبانی نەبەستوە تەنها بەوەوە، چونکە لە نێوان ژن‌و مێردو ئەوانەی پەیوەندیان بەوانەوە هەیە بە خزمایەتی پشتی خۆشەویستی‌و میهرەبانی‌یان هەیە، وە ئەوەش بە منداڵ زیادو بەهێز ئەبێت.

## حەرام کراوە کاتی‌یەکان

(١) هێنانی دوو مەحرەم:

حەرامە دوو خوشك بەیەکەوە ژنی پیاوێك بن، بە پەیمانی ژن‌و مێردایەتی بێت یا بە کەنیزەکی، وە ئافرەت و پوری (خوشکی دایك بێت یا خوشکی باوك) وە هەروەها حەرامە هێنانی هەموو دوو ئافرەتێك کە خزمایەتی‌یەکی وەهایان لەنێوانیاندا بێت ئەگەر یەکێك لەو ئافرەتانە پیاو بێت دروست نەبێت ئەوی تر بهێنێ، بەڵگەی ئەوەش:

١- فەرموودەی خوای گەورەیە کە ئەفەرموێ: ﴿وَأَنْ تَجْمَعُوا بَيْنَ الْأُخْتَيْنِ إِلَّا مَا قَدْ سَلَفَ﴾ (النساء:٢٣).

واتە: قەدەغە کراوە کە دوو خوشك لەیەك کاتدا لە باخەڵتانابن، جگە لەوانەی لە پێشەوە لەسەردەمی نەفامیتانا کراوە، لەوەیان خۆش بووین.

(٢) وه ئەوەی كه بوخاری و موسليم له ئەبو هورەیرەوە ئەگێڕنەوە: كه پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی كردبوو ئافرەت و پوری (خوشكی باوك بێت یا خوشكی دایك) بەیەكەوە كۆ بكرێنەوە[1].

(٣) وه بەپێی ئەوەی ئەحمەدو ئەبو داودو ئیبنوماجەو (ترمذي) كه به (حسن)ی داناوه گێڕاویانەتەوە له فەیروزی دەیلەمی‌یەوە كاتێ موسڵمان بووە دوو خوشك ژنی بوون، پێغەمبەر ﷺ پێی فەرمووە: (به ئارەزوی خۆت یەكێكیان تەڵاق بدە)[2].

(٤) له ئبنوعەبباسەوە هاتووە كه فەرمویەتی: پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی كردبوو كه پیاو ژنێك بەسەر پورەكەی بهێنێت (كەخوشكی دایكی ژنەكە بێت یاخوشكی باوكی) واته ئەو ژنەی كه ئەیهێنێ خوشكەزای یابرازای ژنەكەی خۆی بێت، وه فەرمویەتی: (إنكم إذا فعلتم ذلك قطعتم أرحامكم)[3] واته: ئەگەر ئێوە ئەوەتان كرد سیلەی ڕەحم له نێوانتاندا ئەبڕن.

(قرطبي) ووتویەتی: ئەبو محمدی ئەصیلی له (فوائد)ەكەیدا، وه (ابن عبدالبر) و چەند كەسی تریش باسیان كردووە

(٥) وه له (مراسیل)ی (أبی داود)دا هاتووە له حوسەینی كوڕی طەلحەوە وتویەتی: كه پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی كردووە كه خوشكی ژن بەسەر ژندا بهێندرێ لەبەر مەترسی ناكۆكی و بڕانی كسایەتی‌یان[4].

له حەدیسەكەی ئیبنوعەبباس و حوسەینی كوڕی طەلحەدا ئاگادار كردنەوەی تێدایه كه هۆی حەرام كردنی ئەم جۆره ژنهێنانه خۆپاراستنه له بڕینی سیلەی ڕەحم له نێوان خزماندا. چونكه كۆكردنەوەی ئەو دوو ئافرەته كه هەردووكیان بەیەكەوە ژنی پیاوێك بن حەسوودیو ڕقو كینه دروست ئەكات لەنێوانیاندا؛ لەبەر ئەوەی دوو هەوێ بەكەمی گێژەڵوكەی غیرەت له نێوانیاندا كپ ئەبێت.

جا ئەو كۆكردنەوەیه له نێوان مەحرەمەكاندا وەك بۆ زەواج قەدەغه كراوه لەكاتی عیددەشدا هەر قەدەغه كراوه.

---

(١) بخاري (٥١٠٩و٥١١٠) ومسلم (١٤٠٨/٣٣و٣٦و٣٧).

(٢) أحمد (٤/٢٣٢) وأبوداود (٢٢٤٣) والترمذي (١١٢٩-١١٣٠) وابن ماجه (١٩٥٠-١٩٥١).

(٣) ابن حبان (٤١١٦).

(٤) أبوداود في المراسيل (٢٠٨).

چونکه زانایان کۆن لەسەر ئەوەی کە ئەگەر پیاوێك ژنەکەی تەڵاق بدات بە تەڵاقی ڕەجعی دروست نىیە خوشکەکەی یان چوار ژنی تر جگە لەو بهێنێ هەتا عیددەی ئەو ژنەی تەواو نەبێت، چونکە هێشتا پەیمانەکەیان ماوەو ئەو پیاوە بۆی هەیە بیگێڕێتەوە بۆ لای خۆی هەرکاتێك بیەوێ. بەڵام زانایان جیاوازىیان هەیە لەوەدا کە ئەگەر تەڵاقی بائینی بدات کە نەتوانێ بەو شێوەیە بیگێڕێتەوە لای خۆی.

عەلی و زەیدی کوڕی سابیت و موجاهیدو نەخەعی و سوفیانی ثەوری و حەنەفیەکانو ئەحمەد فەرمویانە: ئەو پیاوە بۆی نىیە خوشکی ئەو ژنە بهێنێ کە تەڵاقی داوە هەروەها چوار ژنی تریش هەتا عیددەی ئەو ژنە تەواو نەبێت، چونکە پەیمانەکە حوکمەکەی هەر ئەمێنێ کاتی عیددەکە هەتا تەواو ئەبێت، بەو بەڵگەیەی کە ژنەکە نەفەقەی هەیە لەو کاتەدا.

ئیبنو مونذیر ووتویەتی: هەروا ئەزانم قسەیەکی مالیك نەبێت کە ئێمەش هەر ئەو قسەیە ئەکەین، کە بۆی هەیە خوشکەکەی یا چوار ژنی تر بهێنێ.

وە سەعیدی کوڕی موسەییب و حەسەن و شافعی فەرمویانە: چونکە پەیمانی ژنو مێردایەتی تەواو بووە بە (بینونة) دابڕان کەواتە ئەو کۆکردنەوەیە حەرام نىیە. وە ئەگەر پیاوێك دوو ئافرەتی هێنا کە بەسەریەکەوە هێنانیان حەرام بێت، بۆ نموونە دوو خوشکی هێنا بەسەر یەکەوە، ئەوەیان بە یەك عەقد هەردووکیانی هێناوە یان بە دوو عەقد جا ئەگەر هەردووکیانی بە یەك عەقد هێنابێت و لە هیچ کامیانا مانیع نەبێت کە ڕێگر بێت لە عەقد کردن، ئەوە عەقدەکە لە هەردوکیان هەڵئەوەشێتەوە، وە حوکمەکانی ژن هێنانی فاسید بە سەریا جێبەجێ ئەکرێت کەواتە پێویستە لە یەك جیا بکرێنەوە، ئەگینا دادگا لەیەکیان جیائەکاتەوە.

جا ئەگەر جیاکردنەوەکە پێش چونە لایێت هیچیان مارەیىیان ناکەوێ، وە تەنها لەسەر ئەو عەقدە هیچ ئەسەرێك دانانرێت، وە ئەگەر جیا کردنەوەکە دووای چوونە لا بووبێت ئەوە ئەو ئافرەتەی کە چۆتە لای مارەیی هاوڕێنەی خۆی، یان کەمتر لەوە، یان ئەوەندە مارەیىیەی کە ناوبرابوو ئەیدرێتێ، وە ئەو ئەسەرانەی لەسەر تەرتیب ئەکرێت کە لەسەر ژن هێانی فاسید تەرتیب ئەکرێت.

بەڵام ئەگەر یەکێکیان مانعێکی شەرعی هەبوو، وەك ئەوەی ژنی کەسێکی تر بێت، یا لەعیددەیدا بێت، وە ئەوی تریان هیچ مانیعی نەبێ ئەوە عەقدەکە بە نیسبەت ئەوەیانەوە کە مانیعی نىیە دروستە، وە بە نیسبەت ئەوی تریانەوە فاسیدەو حوکمەکانی خۆی بەسەرا ئەکرێت.

بەڵام ئەگەر بەدوو عەقدی یەك بەدوای یەکدا هێنابونی وەهەریەکەیان پایەکانی بەجێ هاتبوو وە مەرجەکانی تەواو بوو وە زانرا کامەیانی لە پێشەوە مارە کردووە ئەوەیان کە لە پێشەوە مارەی کردووە عەقدەکەی دروستە و ئەوی تریان کە لە دوایی‌دا بووە فاسیدە، بەڵام ئەگەر تەنها یەکێك لە دوو عەقدەکە مەرجەکانی دروست بوونی بەجێ هاتبو ئەوە هەر ئەوەیان دروستە ئیتر ئەوەی پێشەوە بێت یا دوایی.

بەڵام ئەگەر ئەوەی پێشەوەیان نەزانرا، یان زانرا بوو لە بیرچوبۆوە، وەك ئەوەی کابرایەك بکات بە وەکیل دوو ژنی بۆ بهێنی ئەویش دوو ژنی بۆ بهێنێ، لەپاشاندا دەرکەوێ کە خوشکن، بەڵام نەزانرێ کامیان زووتر مارە کراوە، یا زانرابوو بەڵام لە بیر چوبووەوە، ئەوە هیچ کام لەدوو عەقدەکە دروست نین چونکە هیچ شتێك نی‌یە کە یەکێکیان تەرجیح بدات بەسەر ئەوی تریانا، وە حوکمی نیکاحی فاسیدیان بەسەردا تەڕوات.

**(٢، ٣) ژنی کەسێکی ترو عیددە تەواو نەبوو:**

حەرامە لەسەر موسڵمان ژنی کەسێکی تر بهێنی یا ژنێکك بهێنی کە عیددەی لەمێردەکەی تری تەواو نەبووبێ لەبەر پارێزگاری کردنی مافی مێردەکەی. بە پێی فەرمودەی خوای گەورە کە ئەفەرموی: ﴿وَالْمُحْصَنَاتُ مِنَ النِّسَاءِ إِلَّا مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ ﴾ (النساء: ٢٤).

واتە: وە ژنە خاوەن مێردەکان لەسەرتان حەرامە ئەوانە نەبێت کەلەجەنگی کافراندا بەدەستی ئەهێنن. چونکە تالانی جەنگ حەڵاڵە دوای ئەوەی کە ڕوون بۆوە دوگیان نی‌یە با مێردیشی کردبێ.

بەپێی ئەوەی موسلیمو ئیبنو ئەبی شەیبە ئەگێڕنەوە لە ئەبی سەعیدەوە خوای لێ ڕازی بێت کە فەرمویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ سوپایەکی نارد بۆ جەنگ بۆلای (أوطاس) لەوێ دوژمنیان بەرەنگار ئەبێ و ئەبێبەشەڕیان، خوا سەریان ئەخات و تالانی‌یەکیان دەست ئەکەوێت لە ئافرەت، هەندێ لە یارانی پێغەمبەر ﷺ لە شانیان گران بوو نەچوونە لایان لەبەر مێردە بێباوەڕەکانیان، جا خوای گەورە ئەو ئایەتەی ناردە خوارەوە کە ئەفەرموێ: ﴿وَالْمُحْصَنَاتُ مِنَ النِّسَاءِ إِلَّا مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ ﴾ (النساء:٢٤).

واتە: وە حەرام کراوە لەسەرتان هێنانی ژنی مێرددار، ئیللا ئەوانە نەبێ کە لە جیهادی کافرانا بە کەنیزەکی دەستان کەوتوون پاش ئەوەی کە زانیتان سکیان نی‌یە. کە ئەوەش بە یەك بێنوێژی نەبێت[1].

---

(١) مسلم (١٤٥٦).

حەسەن ووتویەتی: هاوەڵەکانی پێغەمبەر ﷺ سك نەبونیان بەیەك بێنوێژی دائەنا بۆ ئەو ئافرەتانەی بەتاڵان دەستیان نەکەوت، وە ئافرەتی خاوەن عیددەش لە باسی (خطبة) داواکردندا باس کرا.

(٤) ئافرەتی تەلاّق دراوی سێ بەسی:

ژنی سێ بەسێ تەلاّق دراو دروست نابێتەوە بۆ مێردی یەکەمی هەتا شویەکی تر نەکاتەوە بەمارەکردنێکی صحیح.

(٥) عەقدی (مُحرِم) ئەو کەسەی لە ئیحرامدا بێت:

حەرامە لەسەر ئەو کەسەی لە ئیحرامدایە کە پەیمانی نیکاح بۆ خۆی یان بۆ کەسێکی تر ببەستێت بە وەکیلی یا بە شێوەی سەرپەرشتیار، ئەگەر کردی پەیمانەکەی بەتاڵە و ئاسارە شەرعی‌یەکانی لەسەر دانامەزرێت. بەپێی ئەوەی موسلیمو چەند کەسێکی تر ئەگێڕنەوە لە عوسمانی کوڕی عەففانەوە خوا لێی ڕازی بێت کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (لايَنْكِحُ المحرم ولا يُنْكَحُ ولا يَخْطِبُ) رواه الترمذي وقال: حديث حسن صحيح[1]. وە لە ڕیوایەتەکەی (ترمذي)دا (ولايخطب)ی تێدا نی‌یە

واتە: موحریم نەژن بۆ خۆی مارە ئەکات نە بۆ کەسێکی تر و نەداوای کەس ئەکات.

وە کار بەوە کراوە لە لایەن هەندێ لە یارەکانی پێغەمبەرەوە ﷺ وە شافیعی و ئەحمەد و ئیسحاقیش هەر ئەوە دەڵێن، وە ڕایان وەهایە کە کەسێك ئیحرامی بەستبێت نابێت ژن بهێنێ لەو کاتەدا، ئەگەر ژنیشی هێنا بەتاڵە وە ئەوەی لە پێغەمبەرەوە ﷺ هاتووە: (کە مەیمونەی هێناوەو لە ئیحرامدا بووە)[2].

ئەوە بەرەنگاری کراوە بەو فەرموودەیەی کە موسلیم ڕیوایەتی کردووە کە کاتێ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) مەیمونەی هێنا لەئیحرامدا نەبوو[3].

(ترمذي) ووتویەتی: زانایان جیاوازن لە هێنانی مەیمونە لە لایەن پێغەمبەرەوە ﷺ چونکە پێغەمبەر ﷺ لەرێگای مەککە هێناویەتی[1].

---

(١) أحمد (١/٦٩) ومسلم (١٤٠٩) وأبوداود (١٨٤٢) والترمذي (٨٤٠) والنسائي (٥/١٩٢) وابن ماجة (١٩٦٦).

(٢) البخاري (١٨٣٧) ومسلم (١٤١٠).

(٣) مسلم (١٤١١).

جا هەندێك ئەڵێن: کاتێك مەیمونەی هێنا حەڵاڵ بوو، بەڵام کە هەواڵی هێنانەکەی بڵاو بووەوە لە ئیحرامدا بوو، پاشان کە گواستوویەتیەوە حەڵاڵ بووە لە (سرف) لە ڕێگای مەککە.

وە حەنەفیەکان بۆ ئەوە چوون کە دروستە موحریم عەقدی نیکاح ببەستێ، چونکە ئیحرام ڕێ لە گونجانی ژن ناگرێ کە پەیمانی ژن و مێردایەتی لەسەر ببەستێ، بەڵکو ڕێی جیماعی لێ ئەگرێ نەك دروستی پەیمان بەستن.

(٦) هێنانی کەنیزەك لەگەڵ توانای ژنی ئازادا:

زانایان لەسەر ئەوە ڕێکن کە دروستە کۆیلە کەنیزەك بهێنێ، وە لەسەر ئەوەی دروستە ئافرەتی ئازاد شوبکات بە پیاوی کۆیلە ئەگەر خۆی ڕازی بێت لەگەڵ سەرپەرشتی کەرەکانی.

وەك چۆن ڕێکن لەسەر ئەوەی دروست نیيە ئافرەت شو بکات بە کۆیلەی خۆی، وە لەسەر ئەوەی کە ئافرەت ئەگەر بووە خاوەنی مێردی خۆی بە کۆیلەیی ئەوە نیکاحەکەیان هەڵئەوەشێتەوە.

بەڵام جیاوزیان هەیە لەوەدا پیاوی ئازاد کەنیزەك بهێنێ.

ڕای جەماوەر ئەوەیە کە دروستە کەنیزەك بهێنرێ بە دوومەرج:

یەکەم: توانای هێنانی ژنی ئازادی نەبێت.

دووەم: ترسی کەوتنە گوناهی هەبێت لەبەر بێ ژنی.

وە بەڵگەشیان بۆ ئەوە ئەم فەرموودەیەی خوای گەورەیە: ﴿وَمَنْ لَمْ يَسْتَطِعْ مِنْكُمْ طَوْلاً أَنْ يَنْكِحَ الْمُحْصَنَاتِ الْمُؤْمِنَاتِ فَمِنْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ مِنْ فَتَيَاتِكُمُ الْمُؤْمِنَاتِ﴾ (النساء:٢٥) واتە: هەرکەس تواناو دەسەڵاتی هێنانی ژنی ئازادی موسڵمانی نەبوو با ئەو کەنیزەکانە بهێنن کە هی خۆتانن لە کەنیزەکە موسڵمانەکان.

هەتا ئەوەی ئەفەرموێ: ﴿ذَلِكَ لِمَنْ خَشِيَ الْعَنَتَ مِنْكُمْ وَأَنْ تَصْبِرُوا خَيْرٌ لَكُمْ﴾ (النساء: ٢٥)

واتە: ئەمە بۆ ئەو کەسانەیە ترسی کەوتنە تاوانیانەوە هەیە لەبەر بێ ژنی، بەڵام ئەگەر ئارام بگرن هەتا دەسەڵاتتان ئەبێت و ئافرەتی ئازاد دێنن ئەوە بۆ ئێوە چاکترە.

(قرطبي) فەرمویەتی: ئارام گرتن لەسەر بێ ژنی چاکترە لە هێنانی کەنیزەك، چونکە ئەبێتە هۆی کۆیلە بوونی منداڵان، و شکاندنی نەفس، وە ئارام گرتن لەسەر بەرزی ڕەوشت چاکترە لە

---

(١) الترمذي (٨٤٢).

بەرەڵاکردنی ئارەزوە لە عومەرەوە ئەگێڕنەوە کە فەرمویەتی: هەر پیاوێکی ئازاد ژنێکی کۆیلەی هێنا ئەوە نیوەی خۆی کردۆتە کۆیلە.

وە لە (ضحاك) ی کوڕی موزاحیمەوە کە فەرمویەتی: گوێم لە ئەنەسی کوڕی مالیك بووە ووتوویەتی: گوێم لە پێغەمبەر بووە ﷺ فەرموویەتی (من أراد أن يلقى الله طاهراً مطهراً فليتزوج الحرائر) رواه ابن ماجة، وفي اسناده ضعف[1].

واتە: هەرکەسێ ئەیەوێ کە بە پاك‌و پوختی بگات بە خوا، باژنی ئازاد بهێنێ.

وە ئەبو حەنیفە بۆ ئەوە چووە کە پیاو بۆی هەیە کەنیزەك بهێنێ لەگەڵ ئەوەشدا دەسەڵاتی هێنانی ئازادی هەبێت، مەگەر ئازادێکی لە باخەڵدا بێت، چونکە ئەگەر ژنێکی ئازادی لە ئەستۆدا بوو حەرامە کەنیزەکی بەسەر بهێنێ لەبەر پارێزگاری کردنی کەرامەتی ئازادەکە.

(٧) هێنانی ئافرەتی زیناکەر:

دروست نی‌یە بۆ پیاو ئافرەتی زیناکەر بهێنێ، وە دروست نی‌یە بۆ ژن شوبکات بە پیاوی زیناکەر، مەگەر هەردوولایان تۆبەیان کردبێ، بەڵگەی ئەوەش:

١- خوای گەورە داوێن پاکی کردۆتە مەرج کە ئەبێ لە ژن و پیاوەکەدا پێش زەواج ببێ وە ئەفەرموێ: ﴿الْيَوْمَ أُحِلَّ لَكُمُ الطَّيِّبَاتُ وَطَعَامُ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ حِلٌّ لَكُمْ وَطَعَامُكُمْ حِلٌّ لَهُمْ وَالْمُحْصَنَاتُ مِنَ الْمُؤْمِنَاتِ وَالْمُحْصَنَاتُ مِنَ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ مِنْ قَبْلِكُمْ إِذَا آتَيْتُمُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ مُحْصِنِينَ غَيْرَ مُسَافِحِينَ وَلا مُتَّخِذِي أَخْدَانٍ﴾ (المائدة:٥).

واتە: ئەمڕۆ بۆ ئێوە حەڵاڵ کراوە شتی حەڵاڵ و پاك‌و خواردەمەنی ئەوانەی کە خاوەنی کتێبی ئاسمانین هەر حەڵاڵە بۆتان، وە خواردەمەنی ئێوەش بۆ ئەوان حەڵاڵە، وە هەروەها حەڵاڵ کراوە بۆتان ئەو ئافرەتانەی کە داوێن پاکن و موسوڵمانن، وە هەروەها ئافرەتانی داوێن پاك لەوانەی پێش ئێوە کتێبی ئاسمانیان بۆ هاتووە ئەگەر مارەیی‌یەکانیان بدەنێ لە کاتێکا ئێوەش داوێن پاك بن‌و دۆستگر نەبن بە نهێنی.

٢- هەروەها باسی داوێن پاکی کردووە لە هێنانی کەنیزەکدا کاتی کەم دەستی بۆ هێنانی ژنی ئازادو فەرموویەتی: ﴿فَانْكِحُوهُنَّ بِإِذْنِ أَهْلِهِنَّ وَآتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ مُحْصَنَاتٍ غَيْرَ مُسَافِحَاتٍ وَلا مُتَّخِذَاتِ أَخْدَانٍ﴾ (النساء: ٢٥).

---

(١) تەخریجی ئەم حەدیسە ڕابورد.

واته: به ئیزنی خاوەنەکانیان ئەو کەنیزەکانە مارە بکەن، وە مارەییان بدەنێ بەو شێوەیەی کە ڕازی بوون، کە داوێن پاك بن نەك زیناکارو دۆستگر بن بە نهێنی.

٣- ئەوەی بەشێوەیکی ڕاستەوخۆ پشتگیری ئەوە ئەکات ئەوەیە کە لەم فەرمودەی خوای گەورەدا هاتووە: ﴿الزَّانِي لا يَنْكِحُ إِلَّا زَانِيَةً أَوْ مُشْرِكَةً وَالزَّانِيَةُ لا يَنْكِحُهَا إِلَّا زَانٍ أَوْ مُشْرِكٌ وَحُرِّمَ ذَلِكَ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ﴾ (النور:٣)

واته: پیاوی زیناکەر ئەبێ هەر ئافرەتی زیناکەر یا بێ باوەڕ مارە بکات، وە ژنی زیناکەر پیاوی زیناکەر یا بێباوەڕ نەبێت نابێ مارەی بکات، وە ئەو نیکاحە لەسەر باوەڕداران حەرامە. واتە هێنانی ئەو ئافرەتانەی کە زیناکارن یان موشریکن لەسەر باوەڕداران حەرامە.

٤- ئەوەی عەمری کوڕی شوعەیب گێڕاویەتیەوە لە باوکیەوە لە باپیریەوە کە مەرثەدی کوڕی مەرثەدی غەنەوی دیلی لەمەککەوە ئەهێنا، وە لەناو مەککە ئافرەتیکی داوێن پیس هەبوو ناوی عەناق بوو، وە دۆستی مەرثەد بوو ئەڵێ: هاتمە لای پێغەمبەر ﷺ ووتم ئەی پێغەمبەری خوا ئایا عەناق مارە بکەم؟ ئەڵێ : پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم قسەی نەکرد. ئیتر ئەو ئایەتە هاتە خوارەوە: ﴿وَالزَّانِيَةُ لا يَنْكِحُهَا إِلَّا زَانٍ أَوْ مُشْرِكٌ﴾ (النور: ٣).

مەرثەد ئەڵێ: بانگی کردەو بۆی خوێندمەوەو فەرمووی: (مارەی نەکەیت). ئەبو داود و (ترمذی) و نەسائی گێڕاویانەتەوە[١].

٥- وە لە ئەبو هورەیرەوە هاتوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (الزانی المجلود لاینکح إلا مثله) رواه أحمد وأبوداود[٢]. واته: زیناکەری تۆڵە لێ سەندراو نابێ یەکێکی وەك خۆی نەبێت بیهێنێ.

شەوکانی فەرمویەتی: ئەو وەسفە لە زۆری دەرچووە بە گوێرەی ئەو کەسەی زینای لێ دەرکەوتووە، وە بەڵگەی ئەوەی تێدایە کە نابێ پیاو ژنێك بهێنی زینای لێ دەرکەوتبێ.

وە هەروەها ئافرەت بۆی نییە شوبکات بە پیاوێك زینانی لێ دەرکەوتبێ.

وە بەڵگەش لەسەر ئەوە ئەو ئایەتەیە کە لە قورئاندا هاتووە، چونکە کۆتاییەکەی ئەفەرموێت: ﴿وَحُرِّمَ ذَلِكَ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ﴾ (النور:٣) کە ئەمە بە صەراحەت مارە کردنیان حەرام ئەکات.

---

(١) أبوداود (٢٠٥١) والترمذي (٣١٧٦) والنسائي (٦/٦٦).

(٢) أحمد (٢/٣٢٤) وأبوداود (٢٠٥٢).

## زینا کردن و (زواج) ژن و مێردایەتی

جیاوازیەکی زۆر هەیە لە نێوان ژن و مێردایەتی و کاری تەناسولی، چونکە زەواج ناوکی کۆمەڵەو بنەچەی بەدیهاتنیەتی، وە ئەو یاسا سروشتییەیە کە جیهان لەسەر ڕێك و پێکییەکەی ئەڕوات، وە سوننەتێکی کەونییە کە ژیان وەها لێ ئەکات نرخ و ڕێزی تایبەتی هەبێت.

وە هەرئەوە سۆز و خۆشەویستی ڕاستەقینە، وە هەر ئەوە هاوکاری کردن لە ژیاندا، و هاوبەشی کردن بۆ دروستکردنی خێزان و ئاوەدان کردنەوەی جیهان.

مەبەستی ئیسلام لە حەرام کردنی نیکاحی زینا:

ئیسلام نایەوێت پیاوی موسوڵمان بکەوێتە نێوان کەڵبەی ئافرەتی زیناکەرەوە، وە نایەوێت ژنی موسوڵمان بکەوێتە دەستی پیاوی زیناکەرەوە، و بکەوێتە ژێر کاریگەری ئەو گیانە پەست و نزمە، وە لەگەڵ ئەو دەرونە نەخۆشەدا هاوبەشی بکات و تێکەڵی ئەو لاشە میکرۆباوییە پیسە ببێت کە پڕە لە جۆرەها نەخۆشی و ئازار.

ئیسلام لە هەموو فەرمانەکان و حوکمەکانیدا وە لەهەموو قەدەغە کراوەکان و گێڕەرەوەکانیدا - جگە لە بەختەوەری مرۆڤ و بەرزکردنەوەی جیهان بۆ ئەو ئاستە بەرزەی کە خوا ئەیەوێ ڕەگەزی مرۆڤایەتی پێ بگەیەنێت هیچی تری ناوێت.

زیناکەران سەرچاوەی ترسناکترین نەخۆشین:

جا چۆن زیناکەران لەدونیایاندا بەختەوەر ئەبن لە کاتێکا ئەوان سەرچاوەی ترسناکترین و سەختترین نەخۆشین کە لە ناکاو لە ناویان بەرێت، کە زیاتر ڕۆچون بە هەموو ئەندامەکانی لاشەیانا؟! ..

لەوانەیە تەنها (زوهری و سیلان) کە لە نەخۆشیەکانی جیهازی تەناسولین وا لە زیناکاران بکات بێ بە شەرێکی دیار و بلاو بۆوە کە پێویستە ئەم جیهانەیان لێ پاك بکرێتەوە، وە لەسەر ڕووی زەوی هەڵکەندرێن. وە چۆن مرۆڤایەتییەك بەختەوەر ئەبێت ئەو زیناکەرانەی تێدابێت کە، نەخۆشی‌یە درووییەکانیان ئەگوێزنەوە بۆ نەوەکانیان، وە لەگەڵ ئەو نەخۆشیە دەرونیانەدا نەخۆشی زوهری میراتی ئەگوێزنەوە؟ بەڵکو چۆن ئەو خێزانە بەختەوەر ئەبێت کە منداڵی وەهایان ببێت لە ڕەوشت و لە دروست کردنا تێك چووبێت و ناشیرین بێت بەهۆی ئەو نەخۆشیانەی کە تووشی دەستگای تەناسولی بوون و ئەوانەی کوتوپڕ لێی دەرئەکەوێت؟! .

**شێوەی لێك چوانی زیناکەر بە بێباوەڕەوە:**

ئەو موسڵمانەی کە پەروەردە کرابێت بە پەروەردەی قورئانی پیرۆزو شوێنکەوتوی ڕێو شوێنی چاکترین دروستکراوی خوا موحەممەد ﷺ بێت، ناگونجێ ژیان بەسەر بەرێ لەگەڵ ژنێکی زیناکەردا کە بیرکردنەوەی جیاوازە لەگەڵ بیرکردنەوەی ئەودا، وە ناتوانێ لەگەڵ ئافرەتێکدا تێکەڵ بێت کە وەکو ئەو ژیانێکی ڕاست و ڕێکی نیە، وە ناتوانێ پەیوەندی ژن و مێردایەتی ببەستێت لەگەڵ کەسێکدا کە هەست و نەستی وەکو ئەو نەبێت لە کاتێکا ئەزانێ خوای گەورە دەربارەی ژنو مێردایەتی فەرمویەتی: ﴿وَمِنْ آيَاتِهِ أَنْ خَلَقَ لَكُمْ مِنْ أَنْفُسِكُمْ أَزْوَاجاً لِتَسْكُنُوا إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُمْ مَوَدَّةً وَرَحْمَةً﴾ (الروم:٢١)

واتە: لە نیشانەکانی خوایە، کە لە خۆتان چەند خێزانێکی بۆ دروستکردون کە لە پاڵیانا بحەوێنەوەو خۆشەویستیو میهرەبانی خستوتە نێوانتان.

جا کوا ئەو خۆشەویستیەی دروست ئەبێت لە نێوان موسڵمانو زیناکەردا؟ وە ئەو دەرونە زیناکەرە لەکوێو ئەو دەرونە باوەڕدارە ساغە لەکوێیە کە دەرونی ئیمانداری ڕاست ئارام بگرێ لە پاڵیا.

وە ئەو موسڵمانەی کە ناتوانێ زیناکەرێك بهێنێ- وەك لە پێشەوە باسمانکرد لە بەر پیسی دەرونیو لادانی سۆزی - هەروەهاش ناتوانێ ژیان بەرێتە سەر لەگەڵ (مشركة) ژنێکی هاوبەش پەیداکەردا کە ئیمان و بیرو باوەڕی ئەوی نیە، وە بۆچونی لە ژیانا وەك بۆچونی ئەو نیە. ئەو تاوان و بێفەرمانیەی خوا کە ئاینی ئەو حەرامی ئەکات ئەم بە حەرامی نازانێت، وە دان بەو بنچینە مرۆڤایەتیە بەرزانەدا نانێ کە ئیسلام دانی پێدا ناوە. چونکە بیرو باوەڕێکی گومڕاو پوچەڵی هەیە.

ئەو ژنە جۆرێك بیرئەکاتەوە کە دوورە لە بیرکردنەوەی ئەمەوە، وە ئاوەزێکی هەیە کە ناگاتەوە بە ئاوەزی ئەم بە هیچ پەیوەندیەك، لەبەر ئەوەیە خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿وَلا تَنْكِحُوا الْمُشْرِكَاتِ حَتَّى يُؤْمِنَّ وَلَأَمَةٌ مُؤْمِنَةٌ خَيْرٌ مِنْ مُشْرِكَةٍ وَلَوْ أَعْجَبَتْكُمْ وَلا تُنْكِحُوا الْمُشْرِكِينَ حَتَّى يُؤْمِنُوا وَلَعَبْدٌ مُؤْمِنٌ خَيْرٌ مِنْ مُشْرِكٍ وَلَوْ أَعْجَبَكُمْ أُولَئِكَ يَدْعُونَ إِلَى النَّارِ وَاللَّهُ يَدْعُو إِلَى الْجَنَّةِ وَالْمَغْفِرَةِ بِإِذْنِهِ وَيُبَيِّنُ آيَاتِهِ لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ﴾ (البقرة:٢٢١).

واتە: ئەو ئافرەتانە مەهێنن کە بێ باوەڕن هەتا باوەڕ نەهێنن، وە کەنیزەکێکی خاوەن باوەڕ باشترە لە ئافرەتێکی ئازادی بێ باوەڕ باحەزیشیان لێ بکەن، وئافرەتە موسڵمانەکانتان مەدەن بە پیاوی بێباوەڕ هەتا باوەڕ نەهێنن، وەکۆیلەیەکی خاوەن باوەڕ چاکترە لە بێ باوەڕێکی ئازاد باحەزیشی

لێ بکەن، ئەوانە بانگەواز ئەکەن بۆ ئاگرو دۆزەخ، وە خوای گەورە بانگەوازی مەردوم ئەکات بۆ بەهەشتەو لێ خۆشبوون بە فەرمانی خۆی، وەخوای گەورە نیشانەکانی دەرئەخات بۆ خەڵك تا بیر بکەنەوەو پەندی لێ وەربگرن.

**تۆبە کردن لە گوناە پێش خۆی ئەسڕێتەوە:**

بەڵام ئەگەر هەریەك لە ژن و پیاوی زیناکەر تۆبەیەکی ڕاستیان کردو پەشیمان بونەوە و داوای لێ خۆشبوونیان لە خوا کردو وازیان لەو کارە هێنا بە تەواوی، وە هەریەکەیان ژیانێکی پوختی بێتاوانی دەست پێکرد، ئەوە خوای گەورە تۆبەکەیان وەرئەگرێ و بە میهرەبانی خۆی ئەیاغاتە ریزی بەندە چاکەکانی: ﴿وَالَّذِينَ لا يَدْعُونَ مَعَ اللَّهِ إِلَهاً آخَرَ وَلا يَقْتُلُونَ النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلَّا بِالْحَقِّ وَلا يَزْنُونَ وَمَنْ يَفْعَلْ ذَلِكَ يَلْقَ أَثَاماً (٦٨) يُضَاعَفْ لَهُ الْعَذَابُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَيَخْلُدْ فِيهِ مُهَاناً (٦٩) إِلَّا مَنْ تَابَ وَآمَنَ وَعَمِلَ عَمَلاً صَالِحاً فَأُولَئِكَ يُبَدِّلُ اللَّهُ سَيِّئَاتِهِمْ حَسَنَاتٍ وَكَانَ اللَّهُ غَفُوراً رَحِيماً﴾ (الفرقان:٧٠)

واتە: وە ئەوانەی کە لەگەڵ بانگ کردنی خوادا هاوتا دانانێن، و ئەو گیانە ناکوژن کە خوا حەرامی کردووە ئیللا بە مافی خۆی نەبێت، وە زینا ناکەن، وە هەرکەس شتی وەها بکات بە سزای ئەو تاوانەی ئەگات، و سزای ڕۆژی دوایی بۆچەند جارە ئەبێتەوە، و بۆ هەتا هەتایە بە سوكو ڕیسوایی تێیدا ئەمێنێتەوە، کەسێك نەبێت کە تۆبە بکاتو کردەوەی چاك بەجێ بهێنێت، ئەو جۆرە کەسانە خوا خراپەکانیان ئەسڕێتەوەو چاکە لە جێگایان دائەنێ، بۆ چونکە خوای گەورە لێبوردەو میهرەبانە.

پیاوێك پرسیاری لە ئیبنو عەبباس کرد ووتی: من هاتوچۆی ژنێکم ئەکرد ئەوەی خوا حەرامی کردبو لێم لەگەڵیا کردم، پاشان خوای گەورە تۆبەی کردە بەشم، جا ویستم مارەی بکەم. چەند کەسێ وتیان: زیناکەر نابێت لە زیناکەرو بێ باوەڕ زیاتر کەسی تر بهێنێ. ئیبنوعەبباسیش فەرمووی: ئەوە بۆ ئەوە نییە مارەی بکە، ئەگەر گوناهی هەبوو لە ئەستۆی من. ئیبنوئەبی حاتەم گێڕاویەتییەوە.

وە لە ئیبنو عومەریان پرسی ئەگەر پیاوێك داوێن پیسی کرد لەگەڵ ئافرەتێکدا ئایا مارەی بکات؟ فەرمووی: ئەگەر تۆبەیان کردو چاك بوون (بەڵێ).

جابیری کوڕی عەبدوڵاش هەر بەو شێوەیە وەڵامی داوەتەوە.

ئیبنوجەریر ئەگێڕێتەوە کە پیاوێکی یەمەنی خوشکەکەی داوێن پیسییەکی کرد، کێردێکی هێنا لە دەمارەکانی لاملی دا بەڵام نەمرد، دەرمانیان کرد هەتا چاك بووەوە، لەپاش ئەوە مامی

ئەو ئافرەتە کەس و کاری گواستەوە بۆ مەدینە، ئەویش دەستیکرد بە قورئان خوێندن و خواپەرستی هەتا وای لـێهات خوا پەرستترین ئافرەت بوو لەمەدینەدا، پاشان کابرایەك داوای ئەو ئافرەتەی کرد لە مامی، مامی لای ناخۆش بوو لێی بگۆڕیو غەش بکات لەبارەی برازاکەیەوە، هاتە لای عومەرو ئەوەی بۆ گێڕایەوە. عومەر فەرمووی: ئەگەر نهێنیی‌یەکەیت بڵاو بکردایەوە سزام ئەدای، ئەگەر پیاو چاکێك هاتو لێی ڕازی بووی بیدەرێ.

وە لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە کە عومەر پێی فەرمو: ئایا نهێنی هەڵ ئەماڵی؟ ئەچیت ئەوەی خوا بۆی داپۆشیوە دەری ئەخەی؟ سوێند بەخوا ئەگەر شتی وەهات کردبێو بەکەست ووتبێ ئەتکەم بە پەندی شاران؛ بڕۆ مارەی بکە بە ئافرەتێکی داوێن پاکی موسڵمان.

وە عومەر فەرمووی: هات بەدڵما کە نەهێڵێم هەر کەسێك داوێن پیسی کردبێ لە ئیسلاما ئافرەتی داوێن پاك بهێنێ.

ئوبەی کوڕی کەعب پێی ووت: هاوبەش دانان بۆ خوا لەوەش گەورەترەو خوا لێی وەرئەگرێ ئەگەر تۆبەی کرد.

وە ئەحمەد ڕای وەهایە تۆبەی ئافرەتی داوێن پیس بەوە ئەزانرێ کە کەسێك بچێت خۆی نیشان بداتو داوای خراپەکردنی لەگەڵدا بکات؛ جا ئەگەر وەڵامی دایەوە ئەوە تەوبەکەی ڕاست نی‌یە، وە ئەگەر وەڵامی نەدایەوە ئەوە تۆبەکەی ڕاستە. لەمەدا ئیمام ئەحمەد شوێن ئەوە کەوتووە کە لە ئیبنوعومەرەوە گێڕراوەتەوە.

بەڵام هاوەڵەکانی ئەحمەد ووتوویانە: دروست نی‌یە موسڵمان داوا لەهیچ ئافرەتێك بکات بۆ زینا کردن، چونکە داواکردنەکە ئەبێ لە شوێنی چۆڵو نهێنیدا بێت، وە دروست نی‌یە لەگەڵ ئافرەتی بێگانە بەتەنها مانەوە لە چۆڵەوانیدا، با قورئانیشی فێر بکات، ئیتر چۆن دروستە بۆ کارێکی وەها ناشیرین؟

پاشان دڵنیایی لەوە ناکرێ چونکە ئەگەر وەڵامی دایەوە ئەگەڕێتەوە بۆ سەر خراپە، کەواتە دروست نی‌یە خۆنیشاندان بۆ شتی وەها، چونکە تۆبە بۆ هەموو تاوانێکەو مافی هەموو کەسێکە، وە بە نیسبەت حوکمەکانی تر بەو شێوەیە نی‌یە، کەواتە ئەمیش هەروەهایە. ئیمامی ئەحمەد و ئیبنوحەزمیش هەر بۆ ئەوە چوون، وە ئیبنو تەیمی‌یە و ئیبنوقەییم بە بەهێزیان داناوە.

بەڵام ئیمام ئەحمەد مەرجێکی تریشی خستوەتە پاڵ تۆبەکە ئەویش ئەوەیە ئەبێ عیددەکەی تەواو ببێت، جا هەرکاتێك کەسێك ئەو ئافرەتەی هێنا پێش تۆبە یان پێش تەواو بوونی عیددەی، ئەو

نیکاحە فاسیدەو لەیەك جویێ ئەکرێنەوە، وە ئایا عیددەکەی سێ حەیضە یان یەك حەیضە؟ هەردوو قسەکە لە ئیمام ئەحمەدەوە هاتووە.

بەلاَم مەزهەبی حەنەفی و شافیعی و مالیك ئەوەیە کە دروستە زیناکەر ئافرەتی زیناکەر بهێنێ، وە ئافرەتی زیناکەریش دروستە بۆی شوویکات بە پیاوی زیناکەر، چونکە لای ئەمان زینا ڕێگر نی‌یە لە دروستی عەقدەکە.

ئیبنو روشد ووتوویەتی: هۆی جیاوازی زانایان لە واتای فەرمودەی خوای گەورەدایە کە ئەفەرموێ: ﴿وَالزَّانِيَةُ لا يَنْكِحُهَا إِلَّا زَانٍ أَوْ مُشْرِكٌ وَحُرِّمَ ذَٰلِكَ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ﴾ (النور:٣)

کە ئایا ئەمە بۆ زەم کردنیانە یان بۆ حەرام کردنیان؟

وە ئایا ئەو ئیشارەتە لە فەرموودەکەدا: ﴿وَحُرِّمَ ذَٰلِكَ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ﴾.

بۆ زیناکەیە کە حەرامە لەسەر موسڵمانان یاهێنانی زیناکەرە؟

بەلاَم جەماوەر لەسەر ئەوە ڕۆیشتوون کە ئایەتەکە بۆ زەم کردنە نەك حەرام کردن، ﴾بەپێی ئەوەی هاتووە لە فەرموودەدا: کە پیاوێك بە پێغەمبەری ﷺ ووت: ژنەکەم دەست نانێ بەڕووی کەسەوە بۆ خراپە کردن لەگەڵیا. پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: (تەلاَقی بدە) کابرا پێی ووت: من خۆشم ئەوێ پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: دەرای گرە لای خۆت[1].

پاشان ئەوانەش کە ڕێیان داوە بەدروستی هێنانی زیناکەر جیاوازی‌یان هەیە لە هێنانی‌دا لەکاتی عیددەکەیدا، مالیك ڕێی نەداوە بە هێنانیان کاتی عیددە لەبەر ڕێزی ئاوی مێردەکەیو پارێزگاری کردن لە تێکەڵ بوونی نەسەبی ڕاست بەمنداڵی زیناوە.

---

(١) ئیمام ئەحمەد وتویەتی: ئەم حەدیسە (منکر)ە ، وە ئیبنو جەوزی لە حەدیسە دانراوەکانا هێناویەتی، هەروەها (أبو عبيد) باسی کردووە کە ئەم حەدیسە پێچەوانەی قورئان و سوننەتی بەناوبانگە، چونکە خوا تەنها ڕێی دا کە ئافرەتی ئازادی داوێن پاك بهێندرێ، پاشان لە بارەی ئەو کەسەوە کە تۆمەت بۆ ژنەکەی هەڵئەبەستێ ئایەتی لیعانی ناردە خوارەوە، ئینجا (رسول الله) حوکمی جیاکردنەوەیانی ئیجرا کرد، کەوابێ قەت کۆنابنەوە. ئیتر چۆن پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرمان ئەدا بە مانەوە لەگەڵ ژنێکی زیناکارا کە کەس ڕەد ناکاتەوە، وە حەدیسەکە (مرسل)ە، (إبن القيم) وتویەتی: بەم حەدیسە (متشابهە)یە بەرەنگاری کراوە لەگەڵ چەند حەدیسێکی (محکم) کە بە ئاشکرا ڕێگری ئەکەن لە هێنانی ژنی داوێن پیس.

وە ئەبوحەنیفە و شافیعی بۆ ئەوە چوون کە دروستە مارەبکرێ پێش تەواو بوونی عیددەش. لەپاش ئەوە شافیعی ڕێی داوە کە مارە بکرێ ئەگەر دووگیانیش بێت چونکە ئەوسکە بێ ڕێزە.

وە ئەبو یوسف فەرمویەتی هەروەها ڕیوایەتێکیش لە ئەبوحەنیفەوە: دروست نیە مارە بکرێ هەتا منداڵەکەی دائەنێ بۆ ئەوەی نەك ئەو پیاوە ئاوی زەرعی کەسێکی تر بدات.

وە پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی کرد کە نزیکی بکرێ لەو ئافرەتە بە تاڵان هێنراوانە کە حاملە بوون هەتا منداڵەکانیان لێ ئەبێتەوە. هەرچەندە ئەو منداڵەش هەر بەندەو کۆیلەی ئەو کەسە ئەبوو.

جا سك پڕ بە زینا لە پێشترە کە کەس نەچێتە لای هەتا سکەکەی دائەنێ؛ چونکە ئاوی زیناکەر هەرچەندە ڕێزی نیە؛ بەڵام ئاوی مێردەکە ڕێزی هەیە، ئیتر چۆن دروستە کە تێکەڵی ئەو ئاوە پیسەی بکات؟. وە لەبەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ خەریك بوو ئەوکەسە نەفرین بکات کە ئەیویست بچێتە لای کەنیزەکە دوگیانەکەی کە لەیەکێکی تر دوگیان بووەو بەتاڵان گیراوە، لەگەڵ ئەوەشدا کە ئەو منداڵە تازە لە باوکی دابڕاوەو بووەتە کۆیلەو بەندەی ئەو.

وە ئەبوحەنیفە لە ڕیوایەتێکی تریدا ووتویەتی: دروستە مارە بکرێن بەڵام چونە لایان دروست نیە هەتا منداڵەکەیان لێ ئەبێتەوە.

جیاوازی حاڵەتی سەرەتا لەگەڵ حاڵەتی مانەوەدا:

لە پاشاندا زانایان ووتوویانە: ژنی شودار ئەگەر زینای کرد نیکاحەکەی هەڵناوەشێتەوە، وە هەروەها پیاویش، چونکە حاڵەتی سەرەتا جیایە لەگەڵ حاڵەتی مانەوە.

وەلە حەسەن و جابیری کوڕی عبد الله وەوە ئەگێڕنەوە: کە ئەگەر ژنی مێرددار زینای کرد لە یەك جیا ئەکرێنەوە. وە ئەحمەدیش وای بە پەسەند داناوە کە لەو ژنە جیا ببێتەوە، وە فەرمویەتی: من ڕام وەها نیە پیاو ئەو جۆرە ئافرەتانە ڕابگرێت، چونکە ئەو جۆرانە ترسی ئەوەیان لێ ئەکرێ کە داوێن پیسی بکەن و منداڵی کەسێکی تر بدەنە پاڵ مێردەکانیان .

٨- هێنانی ئەو ژنەی کە (لعان)ی لەگەڵا کراوە:

دروست نیە کە پیاو ئەو ژنەی لیعانی لەگەڵا کردوە بیهێنێ، چونکە ئەو ئافرەتە بۆ هەمیشە لە سەری حەرام ئەبێت دوای لیعانەکە خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿وَالَّذِينَ يَرْمُونَ أَزْوَاجَهُمْ وَلَمْ يَكُنْ لَهُمْ شُهَدَاءُ إِلَّا أَنْفُسُهُمْ فَشَهَادَةُ أَحَدِهِمْ أَرْبَعُ شَهَادَاتٍ بِاللَّهِ إِنَّهُ لَمِنَ الصَّادِقِينَ (٦) وَالْخَامِسَةُ أَنَّ لَعْنَتَ اللَّهِ عَلَيْهِ إِنْ كَانَ مِنَ الْكَاذِبِينَ (٧) وَيَدْرَأُ عَنْهَا الْعَذَابَ أَنْ تَشْهَدَ أَرْبَعَ شَهَادَاتٍ بِاللَّهِ إِنَّهُ لَمِنَ الْكَاذِبِينَ (٨) وَالْخَامِسَةَ أَنَّ غَضَبَ اللَّهِ عَلَيْهَا إِنْ كَانَ مِنَ الصَّادِقِينَ﴾ (النور:٩)

واتە: وە ئەو کەسانەی کە تۆمەتی زینا ئەدەنە پاڵ ژنەکانیان و بێجگە لە خۆیان شایەتیان نییە، ئەبێ هەریەکەیان لە بەردەمی دادوەرا چوار جار شایەتی بدات بە خوا کە ئەو ڕاست ئەکات، وە لەسەری پێنجەم شایەتی‌دا ئەبێ دۆعا لەخۆی بکات و بڵێت نەفرینی خوای لێ بێت ئەگەر درۆ بکات لەو قسەیەیدا، وە ئافرەتەکە سزاو تۆڵەی دونیایی لە کۆڵ ئەکەوێت ـ کە ئەویش ڕەجم کردنە تا مردن ـ ئەگەر چوار جار سوێند بخوات بەخوا کە ئەو پیاوەی درۆ ئەکات، وە لەسەری پێنجەم سوێندا ـ بە خۆی ـ بڵێت بەر غەزەبی خوا بکەوێت ئەگەر ئەو پیاوەی ڕاست بکات.

٩-هێنانی ژنی موشریك :

زانایان لەسەر ئەوە ڕێکن کە نابێت پیاوی موسڵمان ئافرەتی بت پەرست و بێ‌دین و هەڵ گەڕاوە لە ئیسلام مارە بکات، وەهەروەها ئافرەتی گاپەرست، وە هەروەها دروست نییە ئەوانە بهێنێت کە باوەڕیان بە بەرەڵایی هەیە وەك (وجودية)و وێنەی ئەو لە مەزهەبەکانی (ملاحدة) بەڵگەی ئەمەش فەرموودەی خوای گەورەیە کە ئەفەرموێت: ﴿وَلا تَنْكِحُوا الْمُشْرِكَاتِ حَتَّى يُؤْمِنَّ وَلَأَمَةٌ مُؤْمِنَةٌ خَيْرٌ مِنْ مُشْرِكَةٍ وَلَوْ أَعْجَبَتْكُمْ وَلا تُنْكِحُوا الْمُشْرِكِينَ حَتَّى يُؤْمِنُوا وَلَعَبْدٌ مُؤْمِنٌ خَيْرٌ مِنْ مُشْرِكٍ وَلَوْ أَعْجَبَكُمْ أُولَئِكَ يَدْعُونَ إِلَى النَّارِ وَاللَّهُ يَدْعُو إِلَى الْجَنَّةِ وَالْمَغْفِرَةِ بِإِذْنِهِ وَيُبَيِّنُ آيَاتِهِ لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ﴾ (البقرة:٢٢١)
لە پێشەوە مانا کراوە .

هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتە:

١- موقاتیل فەرمویەتی: ئەم ئایەتە لە سەر ئەبی مەرثەدی غەنەوی هاتە خوارەوە، وە ئەڵێن: لەبارەی میرثەدی کوڕی ئەبی میرثەد ، کە ناوی کەنازی کوڕی حوصەینی غەنەوی بوو.

کە پێغەمبەر ﷺ بە نهێنی ناردی بۆ مەکە بۆ ئەوەی یەکێك لە هاوڕێکانی ڕزگار بکات، وە لەمەککەدا ئافرەتێکی تێدا بوو کە لەسەردەمی نەفامیدا خۆشی ئەویست ناوی عەناق بوو، عەناق هاتە لای و (مرثد) پێی ووت: ئیسلام شتی سەردەمی نەزانی حەرام کردوە، ئەویش ووتی، دەمارەم بکە، ووتی: هەتا پرس بە پێغەمبەر نەکەم مارەت ناکەم، هاتە لای پێغەمبەر ﷺ و پرسی پێکرد: ئەویش ﷺ ڕێی نەدا بیهێنێ چونکە ئەم موسڵمانەو ئافرەتەکە موشریکە[1].

٢﴾ سوددی لە ئیبنوعەبباسەوە ئەگێڕێتەوە خوا لێیان ڕازی بێت، کە ئەم ئایەتە دەربارەی عبدالله ی کوڕی ڕەواحە هاتۆتە خوارەوە، کە کەنیزەکێکی ڕەش پێستی هەبوو، جارێکیان لێی

(١) أسباب النزول، للواحدي (١٠٤).

توڕە بوو وە زللەیەکی لێدا. لەپاشاندا بیری کردەوەو ترسی لێ نیشت، هات بۆلای پێغەمبەر ﷺ چی کردبوو بۆی گێڕایەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (چۆنە عبد الله)؟ ئەویش ووتی: ئەی نێرراوی خوا ڕۆژو ئەگرێ و نوێژ ئەکات و باش دەستنوێژ ئەگرێ و شایەتی ئەوە ئەدات کە هیچ پەرستراوێك نی‌یە شایستەی پەرستن بێت بە حەق ئیللا الله نەبێت، وە شایەتی ئەدات کە تۆ نێراوی خوای، فەرمووی: ئەی عەبدوللاّ ئەو ئافرەتە باوەڕدارە عەبدوللاّ ووتی: بەو زاتەی تۆی بەهەق ناردووە ئازادی ئەکەم و مارەی ئەکەم، ئیتر کردی. جا چەند کەسێك لە موسوڵمانان تانەیان لێ داو وتیان: کەنیزەکێکی مارە کردووە؛ وە لەوکاتەدا خەڵکی ئارەزوویان لەوە بوو کە ژن‌و ژنخوازی لەگەڵ بێ باوەڕاندا بکەن لەبەر نەسەبەکانیان، ئیتر خوای گەورە ئەو ئایەتەی ناردە خوارەوە: ﴿وَلا تَنْكِحُوا الْمُشْرِكَاتِ حَتَّى يُؤْمِنَّ﴾.

خاوەنی (المغني) ووتویەتی: وە هەموو بێ باوەڕێك جگە لە خاوەن کتێبە ئاسمانی‌یەکان — وەك ئەوانەی کە بت و دارو بەردو ئاژەڵ ئەپەرستن— هیچ خیلافێ نی‌یە لە نێوان زانایاندا لەوەدا کە ئافرەت و گۆشتی سەربڕاویان حەرامە، وە (ووتویەتی) مارەکردنی هەڵگەڕاوە لە ئیسلام حەرامە لەسەر هەر ئاینێك بێت.

## هێنانی ئافرەتی خاوەن کتێبە ئاسمانیەکان (أهل الكتاب)

دروستە پیاوی موسڵمان ئافرەتی ئازادی خاوەن کتێبە ئاسمانی‌یەکان بهێنێت بە پێی فەرموودەی خوای گەورە کە ئەفەرموێ: ﴿الْيَوْمَ أُحِلَّ لَكُمُ الطَّيِّبَاتُ وَطَعَامُ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ حِلٌّ لَكُمْ وَطَعَامُكُمْ حِلٌّ لَهُمْ وَالْمُحْصَنَاتُ مِنَ الْمُؤْمِنَاتِ وَالْمُحْصَنَاتُ مِنَ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ مِنْ قَبْلِكُمْ إِذَا آتَيْتُمُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ مُحْصِنِينَ غَيْرَ مُسَافِحِينَ وَلا مُتَّخِذِي أَخْدَانٍ﴾ (المائدة:٥) لەپێشەوە ڕونکراوەتەوە لەبەشی هێنانی زیناکەردا.

ئیبنومونذیر فەرمویەتی: شتێکی ڕاست نەهاتووە لە پێشینەکانەوە کە ئەوەی حەرام کردبێ. وە لە ئیبنو عومەرەوە هاتووە کە کاتێك پرسیاری لێ ئەکرا دەربارەی هێنانی ئافرەتی گاور یا جولەکە ئەی فەرموو: خوا ئافرەتانی موشریکی حەرام کردووە لەسەر باوەڕداران، وە من هیچ شەریك دانانێك لەوە بەگەورەتر نازانم کە ئافرەتێك بڵێ: پەروەردگارم عیسایە، یا بەندەیەك لەبەندەکانی خوا.

قرطبی: ئەڵێت نوحاس ووتویەتی: ئەو قسەیە لەقسەی ئەو جەماعەتە دەر ئەچێت کە قسەکانیان ئەکرێتە بەڵگە. چونکە کۆمەڵێك ووتویانە نیکاحی خاوەن کتێبە ئاسمانی‌یەکان حەڵاڵە، لەوانە کۆمەڵێك لە صەحابەکان‌و تابیعی‌یەکان وەك عوسمان و طەلحە و ئیبنوعەبباس و جابیر و حوزەیفە.

وه له تابیعی‌یه‌کان سه‌عیدی کوڕی موسه‌ییب و سه‌عیدی کوڕی جوبه‌یرو حه‌سه‌نو موجاهید و طاووس و عیکرمه‌و شعبی و ضه‌حاك و زانای وولاته‌کان.

وه هیچ به‌ره‌نگاری‌یه‌ك نی‌یه له‌نێوان ئه‌و دوو ئایه‌ته، چونکه ڕواڵه‌تی زاراوه‌ی (الشرك) خاوه‌ن کتێبه‌کان ناگرێته‌وه به‌پێی فه‌رمووده‌ی خوای به‌رز: ﴿لَمْ يَكُنِ الَّذِينَ كَفَرُوا مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ وَالْمُشْرِكِينَ مُنْفَكِّينَ حَتَّى تَأْتِيَهُمُ الْبَيِّنَةُ﴾ (البينة:١)

واته: ئه‌وانه‌ی که بێ باوه‌ڕن له خاوه‌ن کتێبه‌کان و هاوبه‌ش دانه‌ره‌کان ده‌ست له بێ باوه‌ڕی‌یه‌کانیان هه‌ڵناگرن هه‌تا نیشانه ڕوونه گه‌وره‌که‌یان بۆ نه‌یات ئه‌وه‌تا له زاراوه‌دا جیای کردوونه‌ته‌وه. وه ڕواڵه‌تی عه‌طفه‌که‌ش ئه‌وه ئه‌گه‌یه‌نێت پێچه‌وانه‌ی یه‌کن. وه عوسمان خوای لێ ڕازی بێت نائیله‌ی کچی فه‌رافیصه‌ی که‌لبی ماره‌کرد وه لای خۆی موسڵمان بوو.

وه حوزه‌یفه ئافره‌تێکی جوله‌که‌ی مه‌دائینی ماره کردوه.

له جابیریان پرسی ده‌رباره‌ی هێنانی ئافه‌رتی جووله‌که و گاور فه‌رموی: له کاتی فه‌تحی مه‌ککه‌دا من و سه‌عدی کوڕی ئه‌بی وه‌قاص ئافره‌تی جوله‌که‌و گاورمان هێناوه.

(کراهة)ی هێنانی ئه‌و ئافره‌تانه:

هێنانی ئافره‌تی ئه‌هلی کیتاب هه‌رچه‌نده دروسته به‌ڵام که‌ڕاهه‌تی هه‌یه، چونکه که‌س ئه‌مین نابیت له‌وه‌ی که ئه‌و پیاوه ڕابکێشێت به‌لای خۆی‌داو له ئاینه‌که‌ی هه‌ڵی بگێڕێته‌وه، یان مه‌یل په‌یدا بکات به‌لای که‌س‌وکاری ئه‌و ئافره‌ته‌دا. جا ئه‌گه‌ر جه‌نگی بوو وه له وولاتی ئیسلامدا نه‌بوو ئه‌وه که‌ڕاهه‌ته‌که‌ی زۆر زیاتره، چونکه کۆمه‌ڵی غه‌یری موسڵمانان و دوژمنه‌کانیان زیاد ئه‌کات. وه هه‌ندێك له زانایان ڕایان وایه که هێنانی ئافره‌تی جه‌نگی حه‌رامه.

وه ده‌رباره‌ی هێنانی ئافره‌تی حه‌ربی پرسیاریان له ئیبنو عه‌بباس کرد ئه‌ویش فه‌رمووی: دروست نی‌یه، وه ئه‌م ئایه‌ته‌ی خوێنده‌وه که ئه‌فه‌رموێ: ﴿قَاتِلُوا الَّذِينَ لا يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَلا بِالْيَوْمِ الْآخِرِ وَلا يُحَرِّمُونَ مَا حَرَّمَ اللَّهُ وَرَسُولُهُ وَلا يَدِينُونَ دِينَ الْحَقِّ مِنَ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ حَتَّى يُعْطُوا الْجِزْيَةَ عَنْ يَدٍ وَهُمْ صَاغِرُونَ﴾ (التوبة:٢٩)

واته: بجه‌نگن دژی ئه‌وانه‌ی باوه‌ڕ به‌خواو ڕۆژی دوایی ناهێنن، وه خۆ ناپارێزن له‌وه‌ی که خواو ڕه‌سولی خوا قه‌ده‌غه‌ی کردووه، وه ئاینی ڕاست وه‌رناگرن له‌وانه‌ی کتێبی خواییان بۆ هاتوه، له جوله‌که‌و گاوره‌کان، هه‌تا سه‌رانه نه‌ده‌ن به‌زه‌بوونی.

قرطبی: ووتوویه‌تی : ئیبراهیمی نه‌خعی که ئه‌مه‌یان دا به‌گوێی‌دا لای سه‌یر بوو.

**حیکمەتی ڕەوابوونی مارەکردنیان:**

ئیسلام بۆیە بەڕەوای داناوە هێنانی ئافرەتانی ئەهلی کیتاب بۆ ئەوەی پەردەی نێوان ئەهلی کیتابو ئیسلام لابەرێ، چونکە بە زەواج تێکەڵی و خزمایەتی و نزیك بوونەوە دروست ئەبێت لەنێوان خێزانەکاندا، جا ئەو کاتە هەل و مەرج ئەڕەخسێ بۆ دیراسە کردنی ئیسلام و ناسینی حەقیقەت و بنچینەکانی.

کە ئەوەش شێوەیەکە لە شێوەکانی نزیك بوونەوەی زانستی لە نێوان موسڵمانان و ئەوانی تردا لە خاوەن کتێبەکان، وە (دعاية) بانگە وازێکە بۆ ڕێنمایی ئاینی ڕاست.

جا پێویستە لەسەر ئەوکەسە کە ئەیەوێ ژنیان لـی بهێنێ ئەوە بکاتە مەبەستێك لە مەبەستەکانی و ئامانجێك لە ئامانجەکانی.

**جیاوازی نێوان ئافرەتی موشریك و ئافرەتی خاوەن کتێب :**

ئافرەتی (مشركة) هاوتادانەر ئاینێکی نیە کە خیانەت حەرام بکاتو ئەمانەتی لەسەر پێویست بکات و فەرمانی کاری خێری پێ بکات و قەدەغەی شەڕی لێ بکات، جا ئەو لەسەر سروشتی خۆی ئەڕواتو ئەوەی لەسەری پەروەردە بووە لەناو هۆزەکەیدا، کە ئەویش شتی پڕوپوچی بت پەرستیەو خەوو هیوای شەیتانە، خیانەت لە مێردی ئەکاتو بیرو باوەڕی منداڵەکانی خراپ ئەکات.

ئەگەر ئەو پیاوە هەریەو شێوەیە بێنێتەوە خۆشی بوێ و بە جوانیەکەی موعجەب بێ، ئەبێتە هۆی ئەوەی کە ئەو ئافرەتە زیاتر لە گومڕاییەکەیدا ڕۆبچێت و کسانیکەش گومڕا بکات. وە ئەگەر چاوی لابدات لە ڕواڵەتە جوانەکەی، وە ناوەڕۆکە زاڵ ببێت بەسەر دڵیدا، ئەوکاتە لەزەت بردن لە جوانیەکەی لێ تاڵ ئەکات، بەهۆی ئەو حاڵە خراپەی کە هەیەتی.

بەڵام لەنێوان خاوەن کتێب و موسڵماندا جیاوازی گەورە نیە. چونکە ئەو ئافرەتە باوەڕی بەخوا هەیەو ئەی پەرستێ، وە باوەڕی بە پێغەمبەران هەیەو باوەڕی بە ژیانی دوایی‌و ئەوەی کە تیایدایە لە پاداشت و سزا هەیە، وە ئاینێکی هەیە کە کاری خێری لەسەر پێویست بکات و کاری شەڕی لەسەر حەرام بکات.

وە جیاوازی گەورە بنەڕەتی لە نێوانیانا: باوەڕە بە پێغەمبەرایەتی موحەممەد ﷺ.

جا ئەو کەسەی باوەڕی بە پێغەمبەرایەتی گشتی هەبێت تەنها شتێك کە ڕێی لـێ ئەگری باوەڕی بە موحەممەد ﷺ هەبێت نەزانینە سەبارەت بەو دینە کە هێناویەتی، وە بەوەی کە موحەممەدیش ﷺ

هەر ئەو کتێب و فەرمانە ئاسمانیانەی هێناوە کە پێغەمبەرەکانی تر هێناویانە لەگەڵ ئەو زیادەیەی کە بارو دۆخی ئەم سەردەمەو پێشکەوتنی‌و ئامادەیی ئینسان بۆ ئەو زیادەیە پێویستی پێی هەیە، یاخود هەر کەللە ڕقی‌و ئینکاری کردنە بە ڕوالەت هەرچەندە لە دڵەوە ئەزانێ کە ڕاستەو باوەڕی پێ‌یەتی، کە ئەمەی دووایی کەمە، وە جۆری یەکەم زۆرترە.

وە لەوانەیە ئافرەتەکە لە ئەنجامی تێکەڵی لەگەڵ پیاوی موسڵماندا بۆی ڕون بێتەوە کە ئاینی پیاوەکەی حەق ترەو یاساو شەریعەتی ئەو جوانترە لەگەڵ وەستان لەسەر سیرەو ڕەوشتی ئەو کەسەی کە ئەو ئاین و شەریعەتەی هێناوە، وە چۆن خوا بە نیشانەی ڕون و ئاشکرا پشت گیری کردووە، ئەوکاتە ئەویش ئیمانی تەواو ئەبێت و ئیسلامەتی‌یەکەی جوان ئەبێت، وە دووجار پاداشت ئەدرێتەوە ئەگەر لەسەر هەردو ئاینەکە چاکەکار بوبێت.

## هێنانی ئافرەتی (صابئة)

صابیئی‌یەکان کۆمەڵێکن لە نێوان مەجوسی‌و جولەکەو گاوردان، وە ئاینێکی‌یان نی‌یە.

موجاهید وتوویەتی: ئەڵێن ئەوانە کۆمەڵێکن کە خاوەنی کتێبی ئاسمانین و زەبور ئەخوێننەوە. وە لە حەسەنەوە هاتووە: کە ئەوانە کۆمەڵێکن فریشتە ئەپەرستن.

عبد الرحمن ی کوڕی زەید ووتوویەتی: ئەوانە خاوەنی ئاینێکن لە ئاینەکان، لە جزیرەی موصڵ بوون ئەیان ووت: (لا إله إلا الله) بەڵام بێ کردەوەو کتێب و پێغەمبەر بوون، جگە لە ووشەی (لا إله إلا الله) ئەڵێ: باوەڕیان بە هیچ پێغەمبەرێك نەبوو، لەبەر ئەوە بوو بێ باوەڕەکان بە یارەکانی پێغەمبەریان ﷺ ئەوت: ئەوانە (صابئین)ن، ئەیان چواندن بەوانەوە لە وتنی (لا اله الا الله)دا.

(قرطبی) ووتوویەتی: ئەوەی لەمەزهەبەکەیان بەدەست دێ وەك هەندێ زانایان باسیان کردووە کە ئەمانە (موحد) یەکتا پەرست بوون و باوەڕیان وا بووە ئەستێرە تەئسیرو شوێنەواری هەیە.

وە ڕازی ئەو بۆ چوونەی هەڵبژاردووە کە ئەمانە ئەستێرە پەرستن: بەو واتایەی کە خوا کردوویەتی بە قیبلە بۆ پەرستن‌و پاڕانەوە، یان بەومانایە کە خوا کاروباری ئەم جیهانەی سپادووە بە ئەستێرە، جا هەر لەسەر ئەوە زانایان جیاوازیان هەیە لەوەی کە ئایا دروستە ئافرەتیان لێ بهێندرێ، هەیانە ڕای وایە کە ئەوانە خاوەنی کتێب بوون بەڵام گۆڕین و دەستکاری تێدا کراوە، جا لەگەڵ جوولەکەو گاور یەکسانی کردوون، کەواتە: بە گوێرەی ئەوە دروستە ژن هێنان لەوان بە پێی فەرموودەی خوای گەورە کە ئەفەرموێ: ﴿الْيَوْمَ أُحِلَّ لَكُمُ الطَّيِّبَاتُ وَطَعَامُ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ حِلٌّ لَكُمْ وَطَعَامُكُمْ حِلٌّ لَهُمْ وَالْمُحْصَنَاتُ مِنَ الْمُؤْمِنَاتِ وَالْمُحْصَنَاتُ مِنَ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ مِنْ قَبْلِكُمْ﴾ (المائدة:٥)

واته: ئەمڕۆ بۆ ئێوە حەڵاڵ کراوە شتی حەڵاڵ و پاك و خواردەمەنی ئەوانەی کە خاوەنی کتێبی ئاسمانین هەر حەڵاڵە بۆتان، وە خواردەمەنی ئێوەش بۆ ئەوان حەڵاڵە، وە هەروەها حەڵاڵ کراوە بۆتان ئەو ئافرەتانەی کە داوێن پاکن و موسوڵمانن، وە هەروەها ئافرەتی داوێن پاك لەوانەی پێش ئێوە کتێبی ئاسمانی‌یان بۆ هاتووە.

ئەمەش مەزهەبی ئەبوحەنیفەو هاوەڵەکانیەتی، وە هەندێ لە زانایان هەیە دوو دڵە لەبەر نەزانینی حەقیقەتیان، جا ووتویانە: ئەگەر لەگەڵ جولەکەو گاور ڕێك کەون لە بنەمای ئاییندا، لە باوەڕ بوون بە پێغەمبەران‌و باوەڕ بوون بە کتێبە خوایی‌یەکان﴾ ئەوە لەوان ئەبن، وە ئەگەر لە وەدا پێچەوانەی ئەوان بن ئەوە لەوان نابن، وە حوکمیشیان حوکمی بت پەرستەکانە، هەر ئەوەش لە شافیعی‌یەکان‌و حەنبلی‌یەکان گێڕراوەتەوە.

هێنانی ئافرەتی مەجوسی:

ئیبن و مونذیر ووتوویەتی: زانایان لەسەر حەرامێتی هێنانی مەجوسی‌و خواردنی گۆشتی سەربڕاوەکانیان ڕێك نەکەوتون، بەڵام بەشی زۆری زانایان لەسەر ئەوەن، لەبەر ئەوە مەجوسی کتێبی ئاسمانی‌یان نی‌یە، وە باوەڕیان بە پێغەمبەرایەتی نی‌یە، وە ئاگر پەرستن، شافیعی ئەگێڕێتەوە کە عومەر باسی مەجوسی کردووەو فەرمویەتی: نازانم چیان لێ بکەم؟ عبدالرحمن ی کوڕی عەوف پێی ووتووە: گوێم لە پێغەمبەر ﷺ بووە کە فەرموویەتی: (سُنو بهم سنة أهل الکتاب)[1] واتە: ڕەفتاری خاوەن کتێبی‌یان لەگەڵدا بکەن.

ئەمەش ئەبێتە بەڵگەی ئەوەی خاوەن کتێبی ئاسمانی نەبوون.

وە لە ئیمامی ئەحمەد پرسرا ئایا ڕاستە مەجوسەکان نامەیان هەبووە؟ ووتی: ئەوە قسەیەکی بەتاڵە، وە زۆر ئەو قسەی بە گەورە زانی، وە ئەبو ثەور بۆ ئەوە چووە کە حەڵاڵە هێنانی ئافرەتی مەجوسی، چونکە ئەهێڵرێنەوە لەسەر ئاینەکەیان بەدانی سەرانە (جزیە) وەك جولەکەو گاور.

هێنانی ئەو ئافرەتانەی کتێبی ئاسمانیان هەیە جگە لە جولەکەو گاور:

حەنەفیەکان بۆ ئەوە چوون کە هەرکەس باوەڕی بە ئاینی ئاسمانی و کتێبی ئاسمانی هەبێت، وەك صەحیفەکانی ئیبراهیم و شیث و زەبوری داود، سڵاوی خوایان لێ بێت، دروستە ژنیان لێ بهێنرێ و گۆشتی سەربڕاوەکانیان بخورێت بەمەرجێ هاوبەش بۆ خودا پەیدا نەکەن. ئەمەش ڕویەکە لە مەزهەبی حەنبەلی‌یەکان: چونکە ئەوانە شوێن کەوتوی کتێبێکن لە کتێبە خوایی‌یەکان لەبەر ئەوە

(١) الشافعي (٢/١٣٠).

وەك جولەكەو گاور وەهان. وە مەزهەبی شافیعی و روبەكی مەزهەبی حەنبەلی‌یەكان: ئەوەیە كە ژن هێنان لێیان دروست نی‌یە و سەربڕاوەكانیان ناخورێت بەپێی فەرمودەی خوای گەورە كە فەرمویەتی: ﴿أَنْ تَقُولُوا إِنَّمَا أُنْزِلَ الْكِتَابُ عَلَى طَائِفَتَيْنِ مِنْ قَبْلِنَا﴾ (الأنعام:١٥٦) واتە: نەوەك بلێن بەڕاستی كتێب تەنها بۆ سەر دوو كۆمەڵی پێش ئێمە هاتوەتە خوارەوە. وە لەبەر ئەوەی ئەو كتێبانە هەمووی پەندو ئامۆژگاری بوون و ئەحكامیان تێدا نەبووە وە حوكمی ئەو كتێبانەی تریان بۆ سابت نەبووە كە ئەحكامیان تێدا بووە.

مارە كردنی ژنی موسڵمان لە ناموسڵمان:

زانایان هەموویان ئیجماعیان كردووە لە سەر ئەوەی دروست نی‌یە ئافرەتی موسڵمان شوبكات بە غەیری موسڵمان، چ موشریك بێت یان خاوەن كتێبی ئاسمانی. بەڵگەی ئەمەش ئەوەیە كە خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا جَاءَكُمُ الْمُؤْمِنَاتُ مُهَاجِرَاتٍ فَامْتَحِنُوهُنَّ اللَّهُ أَعْلَمُ بِإِيمَانِهِنَّ فَإِنْ عَلِمْتُمُوهُنَّ مُؤْمِنَاتٍ فَلا تَرْجِعُوهُنَّ إِلَى الْكُفَّارِ لا هُنَّ حِلٌّ لَهُمْ وَلا هُمْ يَحِلُّونَ لَهُنَّ﴾ (الممتحنة:١٠).

واتە: ئەی ئەو كەسانەی باوەڕتان هێناوە ئەگەر ئافرەتانی موسڵمان كۆچیان كرد بۆ لاتان تاقیان بكەنەوە، خوا ئاگای لە باوەڕیانە، جا ئەگەر بۆتان دەركەوت باوەڕدارن مەیان گێڕنەوە بۆناو كافران، چونكە نە ئەمانە حەڵاڵن بۆ ئەوان، وە نە ئەوان حەڵاڵن بۆ ئەمان.

وە حیكمەتی ئەمەش ئەوەیە كە پیاو مافی ئەوەی هەیە دەسەڵاتی بەسەر ژنەكەیدا هەبێت، وە لەسەر ژنەكەی پێویستە ملكەچی فەرمانە چاكەكانی مێردەكەی بێت، كە ئەمەش مانای دەسەڵات و سەرپەرستیاری‌یە بەسەر ئەو ئافرەتەوە. وە نابێت كافر دەسەڵاتی بەسەر موسڵماندا هەبێت نە بەسەر پیاوو نە بەسەر ژن.

خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿وَلَنْ يَجْعَلَ اللَّهُ لِلْكَافِرِينَ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ سَبِيلاً﴾ (النساء:١٤١) واتە: خوای گەورە ڕێگا نادات بە بێباوەڕان كە زاڵ بن بەسەر بەندە چاكەكانیدا.

پاشان بێباوەڕ ئیعتراف ناكا بەڕاستی ئاینی ژنی موسڵمان؛ بەڵكو كتێبە ئاسمانی‌یەكەی بەدرۆ ئەزانێ؛ وە ئینكاری بەرنامەی پێغەمبەرەكەی ئەكات، هیچماڵێكیش دامەزراو نابێت و ژیان تێیدا جێگیرو بەردەوام نابێت لەگەڵ ئەو جیاوازی‌یە بەرفراوان و دوورەدا. وە بە پێچەوانەوەی ئەوەوە ئەگەر موسڵمانێك ئافرەتی خاوەن كتێب بهێنێ، ئەو پیاوە دان ئەنێت بە ئاینەكەیدا، و باوەڕی خۆی بەتەواو نازانێ هەتا باوەڕی بە كتێبەكەی ئەوو پێغەمبەركەی ئەویش نەبێت.

١٠- هێنانی زیاتر لە چوار ژن:

حەرامە لەسەر پیاو لەیەك کاتدا لە چوار ژن زیاتری هەبێت بەسەر یەکەوە، چونکە چوار ژن بەسە بۆ پیاو، وە لەوە زیاتر ئەو چاکەیە لەدەست ئەچێت کە خوا دایناوە بۆ بەرژەوەندی ژیانی ژن‌و مێردایەتی، بەڵگەش لەسەر ئەوە ئەم فەرموودەی خوای گەورەیە کە ئەفەرمووێ: ﴿وَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا تُقْسِطُوا فِي الْيَتَامَى فَانْكِحُوا مَا طَابَ لَكُمْ مِنَ النِّسَاءِ مَثْنَى وَثُلَاثَ وَرُبَاعَ فَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا تَعْدِلُوا فَوَاحِدَةً أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ ذَٰلِكَ أَدْنَى أَلَّا تَعُولُوا﴾ (النساء:٣)

واتە: ئەگەر ترسی ئەوەتان هەبوو کە دادپەروەر نەبن لەگەڵ ئافرەتە هەتیوەکانا، چ ئافرەتێکتان بەلاوە باشە لە ئافرەتان مارەی بکەن، دوان یا سیان یا چوار، وە ئەگەر ترسان کە دادپەروەر نەبن بەینیانا ئەوە هەر ژنێك بهێنن، یا ئەو کەنیزەکانەی خۆتان خاوەنیانن، ئائەوەی بۆم داناون نزیکترە بۆ لانەدان لە حەق و ستەم نەکردن.

**هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتە:**

بوخاری و ئەبوداود و نەسائی و (ترمذي) ئەگێڕنەوە لە عوروەی کوڕی زوبێرەوە کە خۆی پرسیاری کردووە لە عائیشە خێزانی پێغەمبەر ﷺ دەربارەی ئەو ئایەتە: ﴿وَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا تُقْسِطُوا فِي الْيَتَامَى فانكِحُوا ماطابَ لكُمْ مِنَ النساء......﴾

ئەویش فەرموویەتی: کوڕی خوشکم، ئەوە مەبەستی کچی هەتیوە کە لەکۆشی سەرپەرشتیکەرەکەیدا بێت لە ماڵەکەیدا، پاشان جوانیو ماڵەکەی سەرنجی ئەو سەرپەرشتیارەی ڕابکێشێو بیەوێ مارەی بکات. بێئەوەی عەدالەت بەجێ بهێنێ لە مارەیییەکەیدا، وە ئەوەندەی بداتێ کە خەڵك ئەیداتێ، جا قەدەغە کرا لێیان کە مارەیان بکەن مەگەر ئەوەی کە عادل بن لەگەڵیان، و بەرزترین نرخی مارەییان بدەنێ، وە فەرمانیان پێ درا کە لە جیاتی ئەوان چ ئافرەتێکی تریان بێ باشە ئەوە بهێنن.

عوروە ئەڵێ: عائیشە فەرمووی: پاش ئەوە خەڵك پرسیاریان ئەکرد لە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم دەربارەی ئافرەتان، هەتا خوا ئەم ئایەتەی نارده خوارەوە کە ئەفەرمووێ: ﴿وَيَسْتَفْتُونَكَ فِي النِّسَاءِ قُلِ اللَّهُ يُفْتِيكُمْ فِيهِنَّ وَمَا يُتْلَى عَلَيْكُمْ فِي الْكِتَابِ فِي يَتَامَى النِّسَاءِ اللَّاتِي لا تُؤْتُونَهُنَّ مَا كُتِبَ لَهُنَّ وَتَرْغَبُونَ أَنْ تَنْكِحُوهُنَّ﴾ (النساء: ١٢٧).

واتە: ئەی محمد خەڵك داوات لێ ئەکەن کە قەزیەی ئافرەتان و حوکمەکانیان ڕوون کەیتەوە بۆیان، تۆش بڵێ خوای تەعالا ئەوەتان بۆ ڕوون ئەکاتەوە، وە ئەوەش کە لە قورئانا بۆتان ئەخوێندرێتەوە دەربارەی کچە هەتیوەکان کە ئەوەی خوا بۆی فەرز کردوون لە مارەییو میرات و مافەکانی تر پێیان نادەن وە پێشتان خۆشە کە مارەیان بکەن وە عائیشە فەرمووی: ئەوەی کە خوا

باسی ئەکات لە قورئاندا بۆتان ئەخوێنرێتەوە، ئایەتەکەی یەکەمە کە خوای پاك و بەرز لەوێدا فەرمووی: ﴿وَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا تُقْسِطُوا فِي الْيَتَامَى فانكحوا ماطاب لكم من النساء﴾.

وە فەرموی: وە ئەم فەرمودەیەی خوا لە ئایەتەکەی ترا: ﴿وترغبون أن تنكحوهن﴾ لەبەر ئەوەیە کە هەندێك لە ئێوە نایەوێ ئەو کچە هەتیوەی لە ماڵەکەیدا بە خێوی کردووە بیهێنێ لە بەرکەمی جوانیو سامانی، جا قەدەغە کران ئەوانەش بهێنن کە لەبەر سامان و جوانیەکەیان حەزیان لێ ئەکەن بە عەدالەت نەبێت، چونکە ئەگەر کەم سامان و جوانی بن نایان هێنن[1].

واتای ئایەتەکە بەگشتی:

وە واتای ئایەتەکە ئەوەیە کە خوای گەورە بەسەرپەرشتیارانی هەتیو ئەفەرموێ: ئەگەر کچێکی هەتیو لە ماڵی کەسێکتان و لەژێر سەرپەرشتی خۆتاندا بە خێوتان کردو ترسی ئەوەشتان هەبوو ئەگەر مارەی بکەن مارەیی کەم بدەنێ، با واز لەو بهێنێت و ئافرەتی تر بهێنێت، چونکە ئافرەتی تر زۆرە، وە خوا لەسەری تەسك نەکردۆتەوە بەڵکو بۆی حەڵاڵ کردوە لە ژنێکەوە هەتا چوار ژن.

جا ئەگەر هەر ترسا لەوەی کە ستەم بکات کاتێ لە ژنێك زیاتری هێنا، باهەر ژنیك بهێنێ یا هەرچی خۆی خاوەنی‌یەتی لە کەنیزەك.

ئیفادەی ئایەتەکە تەنها لە سەرچوار ژنە:

شافیعی فەرمویەتی: سوننەتی پێغەمبەر ﷺ کە ڕون کەرەوەیە لە خواوە ئەوە ئەگەیەنێت کە دروست نی‌یە بۆ هیچ کەسێك جگە لە پێغەمبەر ﷺ کە لە چوار ژن زیاتر بهێنێ لە یەك کاتدا. وە ئەوەی شافیعی فەرمویەتی لە نێوان زانایانا ئیجماعی لەسەرە، کۆمەڵێ لە شیعە نەبێت کە ڕێیان داوە لە چوار ژن زیاتر بهێنرێ لە یەك کاتدا، هەتا هەندێکیان وتویانە ئەتوانرێ بێ سنوور ژن بهێنرێ. وە هەندێکیان لەسەر کردەوەی پێغەمبەر ﷺ ئەڕۆن کە لە چوار ژن زیاتری هەبووە هەتا نۆ هەر وەك لە صحیحدا هاتووە.

ئیمامی (قرطبي) ڕەددی ئەوانەی داوەتەوەو فەرمویەتی:

بزانە ئەو ژمارەیە (دوان، سیان، چوار) نابێتە بەڵگەی ڕەوایی هێنانی نۆ ژن وەك ئەوانەی کە دوورن لە تێگەیشتنی قورئانو سوننەتەوە ئەوە ئەڵێن، وە وازیان هێناوە لەوەی کە سەلەفی ئەم ئومەتەی لە سەر بووە، ئەڵێن ئەو (واوەی) لە نێوانیاندا هەیە (واوی) کۆکردنەوەیە.

---

(١) البخاري (٤٥٧٦) وأبوداود (٢٠٦٨) والنسائي (٦/١١٥).

وە ئەو قسەیەی خۆیان پاڵپشت داوە بەوەی کە پێغەمبەر ﷺ نۆ ژنی هێناوە، وە لە یەك کاتدا هەر نۆی هەبووە، وە ئەو کەسەی بەرەو ئەو نەزانییە ئەچێ‌و ئەو قسەیە ئەکات شیعە و هەندێك لە ظاهیرییەکانن کە ووشەی (مثنی) یان دوو دوو لێك داوەتەوە. هەروەها سێ سێ‌و چوار چوار. وە هەندێ لە ئەهلی ظاهیر بۆ خراپتر لەوەش چوون وە وتویانە کە دروستە هەژدە ژن کۆبکرێتەوە چونکە ئەڵێن ژمارەکە دوبارە کردنەوە ئەگەیەنێت، وە واوەکە بۆ جەمعە. جا وشەی (مثني) و (ثلاث) و (رباع) یان دوو بەرابەر کۆکردۆتەوە.

ئەوەش هەمووی نیشانەی نەشارەزاییە لە زمانی عەرەبی‌و سوننەتی پێغەمبەر ﷺ وە پێچەوانەی ئیجماعی نەتەوەی ئیسلامە، چونکە لە هیچ کەس لە صەحابەو تابیعی نەبیستراوە کە لە چوار ژنی زیاتر هەبووبێ بەسەریەکەوە.

مالیك لە (الموطأ)دا و نەسائی و (دارقطني) لە (سوننەکەیاندا تەخریجیان کردووە کە پێغەمبەر ﷺ بە غەیلانی کوڕی ئومەییەی ثەقەفی فەرمووە کاتێ موسڵمان بووەو دە ژنی هەبووە: (إختر منهن أربعاً، وفارق سائرهن)[1] واتە: چواریان هەڵبژێرەو ئەوانی تر واز لـێ بهێنە.

وە لەکتێبی ئەبی داوددا هاتووە لە حارثی کوڕی قەیسەوە کە فەرمویەتی: کاتێ کە موسڵمان بووم هەشت ژنم هەبووە، بۆ پێغەمبەرم ﷺ باس کرد فەرموی: (إختر منهن أربعاً) واتە: چواریان لێ هەڵبژێرە[2].

وە موقاتیل فەرمویەتی: قەیسی کوڕی حاریس هەشت ژنی ئازادی هەبووە، جا کاتێ ئەو ئایەتە هاتە خوارەوە پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێ‌دا کە چواریان تەڵاق بدات‌و چواریان لای خۆی بهێڵێتەوە، وە قەیسی کوڕی حاریسیش هەر ئەوەی ووتوە. وە لە ڕاستیدا ئەوەی کە موقاتیل ئەیڵێ ناوی حاریسی کوڕی قەیسی ئەسەدییە وەك ئەبوداود باسی کردوە.

وە هەروەها (محمدی کوڕی حسن) گێڕاویەتییەوە لە کتێبی (السیر الکبیر)دا کە ئەو پیاوە ناوی حاریسی کوڕی قەیسە کە ناسراوە لای زانایان.

وە ئەوەش کە بۆ پێغەمبەر ﷺ ڕەوا کراوە زیاتر لە چوار ژنی هەبێت، ئەوە لە تایبەتمەندییەکانی خۆیەتی ﷺ.

---

(١) أحمد (٢/٨٣) والترمذي (١١٢٨) وابن ماجه (١٩٥٣).

(٢) أبوداود (٢٢٤١) والترمذي (١٩٥٢).

وە ئەوەی ئەڵێن: پیتی (و) واوی جەمعە، شتی وەها ووتراوە، بەڵام خوای گەورە بە پاراوترین زمان لەگەڵ عەرەبدا دوواوە. وە عەرەب ناهێڵێت کەسێك بڵێت نۆ و دوو و سێ و چوار لە جیاتی ئەوەی بڵێت نۆ یا دوو یا سێ یا چوار،

وە هەروەها لایان ناشیرینە کەسێك بڵێت چوارو شەش و هەشت بدە بە فلان کەس وە هەروەها ناشلێت هەژدە.

بەڵکو ئەو واوە لەوێدا واوی (بدل) بریتیيە واتە: سێ ژن بهێنن لە جیاتی دوو ژن وە چوار لە جیاتی سێ، هەر لەبەر ئەوە بە واو (عطف) کراوەتەوە نەك بە (أو) واتە یان. جا ئەگەر بە (أو) عەطف بکرایەتەوە ئەوە خاوەنی دوو ژن سێهەمی بۆ نەئەبوو، وە خاوەنی سێ ژن چوارەمی بۆ نەئەبوو. وە ئەوەی کە ئەڵێن: (مثنی) (اثنین) یش ئەگرێتەوە واتە دووی تریش، وە (ثلاث) (ثلاثة)ەش ئەگرێتەوە واتە سێی تریش، وە (رباع) (أربع)ەش ئەگرێتەوە واتە چواری تریش، ئەوە حوکمێك ئەدەن کە ئەهلی زمانەوانی لەگەڵیان رێك ناکەوێت لەسەری وە نەزانینە لەوانەوە.

وە هەروەها ئەوانەی تریش نەیان زانیوە لەبەر ئەوەی (مثنی) (دوو دوو) ئەگرێتەوە، وە (ثلاث) سێ سێ، وە (رباع) چوار چوار، وە نەیان زانیوە کە (اثنین اثنین) و (ثلاثاً ثلاثاً) و (أربعاً أربعاً) لە عەرەبیدا حەصری ژمارەیە، بەڵام (مثني و ثلاث و رباع) پێچەوانەی ئەوەیە.

چونکە لە ژمارەی رێك کراودا لای عەرەب زیادەواتایەك هەیە کە لە ئەصڵدا نییە. بەوشێوەیە ئەگەر کەسێك ووتی: سوارەکان هاتن (مثنی) مەبەستی ئەوەیە کە دوو دوو هاتون واتە جوت جوت هاتون. جەوهەری ووتویەتی: ژمارەی رێك کراویش هەر بەو شێوەیە.

وە هەندێکی تر ئەڵێن ئەگەر ووتت: ئەو کۆمەڵە بە (مثنی) یا (ثلاث)، یا (آحاد) یا (عشار) هاتن، ئەوە مەبەستت ئەوەیە کە یەك یەك، یان دوو دوو، یا سێ سێ، یا دە دە هاتوون.

وە ئەو واتایەش لە ئەصڵدا وانییە چونکە ئەگەر تۆ ووتت: کۆمەڵێك هاتن بۆلام (ثلاثة ثلاثة)، یان کۆمەڵێك (عشرة عشرة)، ئەوە تۆ (حصر) سنوورت داناوە بۆ ژمارەی کۆمەڵەکە بەم قسەیەت سێ و دە. بەڵام ئەگەر ووتت بە (ثُناء) و (رباع) هاتون، ئەوە سنوورت بۆ ژمارەیان دانەناوە، بەڵکو تەنها مەبەستت ئەوەیە دوو دوو یا چوار چوار هاتوون، جا ژمارەیان زۆر بێت یا کەم. کەواتە کورت کردنەوەی ئەوان بۆ هەر زاراوەیەکی ژمارەیی لەسەر کەمتر لەوەی کە ئەو زاراوەیە ئەیگەیەنێت بە قسەی خۆیان تەنها حوکم کردنە. تەواو.

**واجبێتی دادگەری لە نێوان ژناندا:**

خوای گەورە بەڕەوای داناوە هێنانی چەند ژن وە لە چوارا وەستاندویەتی، وە بە واجبی داناوە دادگەری لە نێوانیاندا بێ جیاوازی لە خواردن و جێگاو پۆشاكو شەومانەوە لایان، وە لە هەموو شتێکی ماددییا بێجیاوازی کردن لەنێوان ئافرەتی دەوڵەمەندو فەقیرا، وە لە نێوان پایە بەرزو نزما، جا ئەگەر پیاوەکە ترسی ستەم کردن و جێبەجێ نەکردنی مافەکانیانی هەبوو، ئەوە حەرامە لەسەری بەسەریەکەوە ئەوەندەی ژن هەبێت، وە ئەگەر توانی مافی سیانیان جێبەجێ بکات وە بۆ چوارەم نەیتوانی ئەوە حەرامە چوارەم بهێنێ. وە ئەگەر توانی مافی دوانیان جێبەجێ بکات وە بۆ سێیەم نەیتوانی حەرامە سێیەم بهێنێ، وە هەروەها ئەگەر توانی حەقی ژنێك بەجێ بهێنێ وە بۆ دووەم نەیتوانی حەرامە لەسەری دووەم بهێنێ بە پێی فەرموودەی خوای گەورە: ﴿فَانْكِحُوا مَا طَابَ لَكُمْ مِنَ النِّسَاءِ مَثْنَى وَثُلاثَ وَرُبَاعَ فَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا تَعْدِلُوا فَوَاحِدَةً أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ ذَلِكَ أَدْنَى أَلَّا تَعُولُوا﴾ (النساء:٣) لە پێشەوە ڕوون کراوەتەوە.

وە لە ئەبی هورەیرەوە هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (من كانت له امرأتان فمال إلى إحداهما جاء يوم القيامة و شقه مائل) رواه أبو داود، و الترمذي، و النسائي، و ابن ماجة[1].

واتە: هەرکەس دوو ژنی هەبێت و مەیلی بەلای یەکێکیانەوە زۆرتر بێت، ڕۆژی دوایی کە دێت لایەك لە شانەکانی خوارە، وە هیچ بەرەنگاری نییە لە نێوان ئەو دادەی پێویستی کردووە لەم ئایەتەداو ئەوەی کە نەفی کردووە لە ئایەتێکی تردا لە سورەتی (النساء) دا کە ئەفەرموێ: ﴿وَلَنْ تَسْتَطِيعُوا أَنْ تَعْدِلُوا بَيْنَ النِّسَاءِ وَلَوْ حَرَصْتُمْ فَلا تَمِيلُوا كُلَّ الْمَيْلِ فَتَذَرُوهَا كَالْمُعَلَّقَةِ﴾ (النساء:١٢٩)

واتە: وە تواناتان نییە لەسەر دادوەری تەواو لە نێوان ژنەکانا لە خۆشەویستی و مەیلی دڵ هەرچەندە بە پەرۆشیش بن، جا هەموو مەیلتان مەدەن بە یەکێکیانو ئەوی تریان واز لێ بهێنن وەك هەڵواسراو.

چونکە ئەو دادپەروەریەی داواکراوە ئەو دادپەروەرییە ڕواڵەتییەیە کە ئادەمیزاد بەسەریا توانای هەیە، وە ئەو دادپەروەرییە نییە کە لە خۆشەویستیو سۆزدا بکرێ، چونکە ئەم جۆرەیان کەس ناتوانێ بەجێی بهێنێ، بەڵکو ئەو دادپەروەرییەی کە داوا نەکراوە ئەوەیە کە لە خۆشەویستی و میهرەبانی و چونە لادا بکرێت.

---

(١) أحمد (٢/٣٤٧) وأبوداود (٢١٣٣) والترمذي (١١٤١) والنسائي (٧/٦٣) وابن ماجة (١٩٦٩).

محمدی کوڕی سیرین فەرمویەتی: پرسیارم لە (عبیدە) کرد دەربارەی ئەو ئایەتە فەرموی: ئەوە خۆشەویستی و سۆزو جیماعە (کە ناتوانرێ عەدالەتی تێدا بکرێت). ئەبوبەکری کوڕی عەرەبی ووتوویەتی: ڕاست ئەکات چونکە کەس دەسەڵاتی بەسەریدا نیيە چونکە دڵی مرۆڤ لە نێوان دوپەنجە لە پەنجەکانی خوادایە چۆن ئارەزو بکات وەها ئەیچەرخێنێ، وە هەروەها جیماع ڕێئەکەوێت ئەوەندەی بۆ یەکێکیان گورج‌وگۆڵە بۆ ئەوی تریان وەها نابێت، جا ئەگەر ئەوانە بەقەستی نەبێت ئەوە تاوان نیيە لەسەری، چونکە لەوانەیە کە دەسەڵاتی بەسەریانا نیيە، کەواتە تەکلیفی شەرعی پێوە نابەسترێ، عائیشە فەرمویەتی: پێغەمبەر ﷺ شەوەکانی بەش ئەکرد لە نێوان خێزانەکانیدا بە عەدالەت، وە ئەی‌فەرموو: (اللهم هذا قسمي فيما أملك، فلا تلمني فيما تملك ولا أملك) قال أبوداود: يعني القلب[1].

واتە: خوایە ئەمە بەش کردنی منە لەو شتەدا کە توانام بەسەریەوە هەیە، جا ئیتر لەوەدا کە هی تۆیەو من توانام بەسەریەوە نیيە لێم مەگرە، ئەبوداود ئەڵێ: مەبەست بەوەی کە مولکی ئەو نیيە دڵە. ئەبوداود و (ترمذي) و نەسائی و ئیبنوماجە گێڕاویانەتەوە.

خەطابی ووتویەتی: ئەوە بەڵگەیە لەسەر جەخت کردنەوەی پێویستی بەش کردن لە نێوان هەوێ ئازادەکانا، بەڵام کەراهەتەکە لەوەدایە بەلای یەکێکیاندا زۆر مەیل بکرێت؛ مەیلی تێکەڵاوی کە مافی تێدا زەوت بکرێ، نەك مەیلی دڵ، چونکە دڵ کەس خاوەنی نیيە. پێغەمبەر ﷺ بەیەکسانی ئەچووە لای خێزانەکانیو ئەی فەرموو: خوایە ئەمە بەش کردنی منە ...هتد، وە لەم بارەیەوە بوو ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە کە ئەفەرموێ: ﴿وَلَنْ تَسْتَطِيعُوا أَنْ تَعْدِلُوا بَيْنَ النِّسَاءِ وَلَوْ حَرَصْتُمْ فَلَا تَمِيلُوا كُلَّ الْمَيْلِ فَتَذَرُوهَا كَالْمُعَلَّقَةِ﴾ (النساء:١٢٩) لە پێشەوە ڕوون کراوەتەوە.

وە ئەگەر پیاو چووە سەفەر ئەتوانێ هەر کامیان پێی خۆش بوو لەگەڵ خۆیدا بیبات، ببات بەڵام ئەگەر پشك قورعە بخات لەنێوانیاندا ئەوە چاکترە.

وە بۆ ئەو ژنە هەیە کە پشکەکەی بۆ دەرچووە لەمافی خۆی وازبهێنێ بۆ یەکێکی تریان، چونکە ئەوە مافی تەواوی خۆیەتیو بۆی هەیە بیبەخشێ بە یەکێکی تریان.

لە عائیشەوە خوا لێی ڕازی بێت کە فەرمویەتی: پێغەمبەر ﷺ ئەگەر بچوایە بۆ سەفەر پشکی ئەخست لە نێوان خێزانەکانیدا بەرکامیان بکەوتایە ئەوەیانی ئەبرد لەگەڵ خۆی، وە ڕۆژەکانی

---

(١) أبوداود (٢١٣٤) والترمذي (١١٤٠) والنسائي (٧/٦٤) وابن ماجه (١٩٧١).

دابەش ئەکرد لە نێوانیاندا بە یەکسانی، بەڵام سەودەی کچی زەمعە ڕۆژەکەی خۆی بەخشی بوو بە عائیشە[1].

**ژن مافی ئەوەی هەیە بەو مەرجە شوبکات ژنی بەسەر نەیات:**

وەك چۆن ئیسلام هێنانی چەند ژنی بەستۆتەوە بەتوانای دادپەروەری‌و عەدالەتەوە، وە ڕێی نەداوە لە چوار بەو لاوە بهێنرێ، هەروا مافیشی داوە بە ئافرەت و سەرپەرشتیاری کاتێ ئەیدات بە شوو مەرجی ئەوە دابنێن کە ژنی تری بەسەر نەهێنرێ، جا ئەگەر ئافرەتێك لە عەقدی زەواجەکەدا مەرجی ئەوەی دانا کە نابێ ئەو پیاوە ژنی بەسەر بهێنێ ئەو مەرجە دروستەو ئەبێ کابرا لەسەری بڕوات، وئەو ئافرەتە بۆی هەیە ئەو پەیمانە هەڵبوەشێنێتەوە ئەگەر پیاوەکە مەرجەکەی بەجێ نەهێنا، وە ئەو مافەی لەدەست ناچێ مەگەر خۆی نەیەوێ و ڕازی بێت، ئیمامی ئەحمەد بۆ ئەوە چووە، وە ئیبنو تەیمیە و ئیبنوقەیسیش بە بەهێزیان داناوە. چونکە مەرجەکانی ناو زەواج مەترسی گەورترە لە مەرجەکانی کڕین‌و فرۆشتن و شتی تر. لەبەر ئەوە بەجێ هێنان‌و لەسەر ڕۆیشتنیان ئەکیدترو پێویستترە، وە لەسەر بۆ چوونەکەیان ئەم بەڵگانەی خوارەوەیان هێناوەتەوە:

١- بەپێی ئەو حەدیسەی بوخاری و موسلیم ئەگێڕنەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (إن أحق الشروط أن توفوا ماالستحللتم به الفروج) واتە : لە پێشترین مەرج کە ئەبێ بەجێی بهێنن ئەوەیە کە ئافرەتتان بێ حەلاڵ کردووە بۆ خۆتان[2].

٢- وە هەروەها بوخاری‌و موسلیم ئەگێڕنەوە لە عەبدوللای کوڕی ئەبی مولەیکەوە کە میسوەری کوڕی مەخرەمە بۆی گێڕامەوە خۆی گوێی لە پێغەمبەر ﷺ بووە لەسەر مینبەر فەرمویەتی: (بەنی هاشمی کوڕی موغیرە داوای ئەوەم لێ ئەکەن ڕێیان بدەم کە کچی خۆیان بدەن بە عەلی کوڕی ئەبی طالیب، بەڵام من ڕێیان نادەم، لە پاشان ڕێیان نادەم مەگەر کوڕی ئەبی طالیب خۆی بیەوێ کچەکەم تەڵاق بدات و کچەکەی ئەوان بهێنی، چونکە فاطمە پارچەیەکە لە لەشی من هەرچی ئازار بەو بگەیەنێ بە منیش ئەگەیەنێت وە لە ڕێوایەتێکی تردا فەرموویەتی: فاطمە لەمنەو ئەترسم کە تووشی فیتنە ببێت لە دینەکەیدا[3]. لەپاشان باسی زاوایەکی کرد کە لە

(١) البخاري (٢٥٩٣) و (٤١٤١) مسلم (١٤٦٣/٤٧و٢٧٧٠/٥٦).

(٢) تەخریجی ئەم حەدیسە ڕابورد.

(٣) البخاري (٥٢٣٠) ومسلم (٢٤٤٩/٩٣و٩٦).

بەنی عبد الشمس بوو وە ستایشی کرد بە چاکی بۆ ئەو زاوایەتی‌یە و چاکی‌یەی و فەرمووی: (حدثني فصدقني، ووعدني فوفى لي، وإني لست أحرم حلالاً، ولا أحل حراماً ولكن والله لا تجتمع بنت رسول الله و بنت عدو الله في مكان واحد أبداً)[1].

واتە: هەرچی ووت ڕاستی کرد لەگەڵمدا، وە بەڵێنی دامێ‌و بەجێی هێنا، وە من حەڵاڵ حەرام ناکەم، وە حەرام حەڵاڵ ناکەم، بەڵام سوێند بە خوا کچی نێرراوی خواو کچی دوژمنێکی خوا لەیەك شوێندا کۆنابنەوە.

ئیبنوقەییم فەرمویەتی: ئەم حوکمە چەند شتێکی تێدایە: ئەویش ئەوەیە کە ئەگەر پیاو مەرجی کرد ژن بەسەر ژنەکەی نەهێنێ ئەبێ بەجێی بهێنێ، وە هەرکاتێ ژنی تری هێنا ئەو ئافرەتە بۆی هەیە پەیمانەکە هەڵبوەشێنێتەوە.

وە ڕووی ئەوەی کە حەدیسەکە ئەوەش ئەگرێتەوە ئەوەیە کە پێغەمبەر ﷺ ڕایگەیاندووە کە ئەوە ئازار بە فاطمە ئەگەیەنێت.

وە ئاشکراشە پێغەمبەر ﷺ کاتێ فاطمەی داوە بە عەلی بەو مەرجە داویەتی کە ئازاری نەداو تووشی گومانی نەکات، وە ئازاری باوکی نەداو تووشی گومانی نەکات.

جا هەرچەند ئەوە لە ناوەڕۆکی پەیمانەکەدا نەشکرابێ بە مەرج بەڵام بە زەرورەت ئاشکرایە کە داخلی پەیمانەکەیە.

وە لەوەدا کە باسی زاواکەی تری کردوەو ستایشی کردووە بەوەی کە ڕاستگۆ بوەو ئەو پەیمانەی داوێتی بردوویەتی‌یە سەر، نیشانی عەلی ئەدا کە چاو لەو بکات، هەروەها ئەوەش دەرئەخات کە بەڵێن لە نێواندا بووە کە ئازاری نەدات و تووشی گومانی نەکات، جا هانی عەلیش ئەدات بۆ ئەوەی پەیمانەکەی بباتە سەر وەك چۆن زاواکەی تری کردویەتی.

لەمەوە ئەوە وەرئەگیرێت کە ئەوەی بە عورف و عادەت مەرج بێت وەك ئەو مەرجە وایە کە بە دەم وترابێ، وە جێبەجێ نەکردنی مەرجی لەفزی مافی هەڵوەشاندنەوە ئەدات بەخاوەنی. بۆ نمونە ئەگەر وا فەرز بکەین کە هۆزێك عادەتیان وەهایە ئافرەتیان نەچێتە دەر لەناویانداو ڕێگە بە پیاوەکانیان نادەن لەوە دەرچن، وە عادەتیان لەسەر ئەوە بڕوات، ئەوە وەك بەمەرج دانراوی لەفزی‌یە، ئەمەش لە بنەماکانی عادەتی خەڵکی مەدینەدا هەیە.

---

(١) سەیری تەخریجی حەدیسەکەی پێشوو بکە.

وە بنەماکانی ئەحمەد (ڕەحمەتی خوای لـێ بێت) وەهایە کە مەرجی عورفی وەك مەرجی لە فزی وەهایە، لەبەر ئەوە بووە کرێیان بە پێویست داناوە لەسەر ئەوکەسەی جلەکانی ئەدا بە جل شۆر یاکورت کەرەوە، یا ئەوەی هەویرەکەی ئەدات بە نانەوا، یا خواردەمەنی ئەدات بەو چێشت لێنەرانەی کە بەکرێ ئیش دەکەن یا کاتێ چووە حەمام و داوای لە یەکێك کرد بیشوات کە ئەو کەسە عادەتی وەهابوو بەکرێ خەلکی ئەشت، ئەبێ کرێی وێنەی ئەو کارانە بدات هەرچەندە لە پێشەوە باسی کرێیان نەکردووە.

جا لەسەر ئەمە ئەگەر فەرز بکرێت کە ئافرەتەکە لە بنەماڵەیەکە پیاویان ژن بەسەر ژنەکانیان ناهێنن، وە ڕێگاش نادەن بەو کارە، وە ئەو عادەتەیان بەردەوام بەو جۆرە بوو، ئەوە وەك ئەوە وەهایە بە زار ئەو مەرجە بلێن.

وە لەسەر ئەوە گەورەی ئافرەتانی جیهان و کچی سالاری ئادەمیزادان لەهەموو ئافرەتێك لە پێش ترە ئەو مەرجەی هەبێت، جا ئەگەر عەلی کاتی پەیمانەکە ئەو مەرجەی لە ناوەڕۆکی پەیمانەکەدا دانابێ بۆ دوپات کردنەوەیە نەك دامەزراندن و بیناکردن، وە لە ڕێگری کردن لە عەلی کە کچی ئەبی جەهل و کچی پێغەمبەر ﷺ کۆ بکاتەوە چەند حیکمەتێکی جوان هەیە، ئەویش ئەوەیە کە ئافرەت لەگەڵ مێردەکەیدا لە پلەیەکی کەمتر لەودایە، جا ئەگەر ئەو ئافرەتە خۆی لە خۆیدا پلەیەکی بەرزی هەبوو وە مێردەکەشی هەروا پلەی بەرز بوو، ئەوە ئەو ئافرەتە پلەی بەرز دەبێ هەم بەخۆی و هەم بە مێردەکەی، کە حالەتی عەلی و فاطمە خوایان لـێ ڕازی بێت بەم شێوەیە بوو.

ئینجا خوای گەورە کچی ئەبی جەهل لەگەڵ فاطمەدا لەیەك پلەدا دانانێ نە بە هۆی خۆی وە نە بە هۆی عەلی‌یەوە لە کاتێکدا لە نێوان ئەم دوانەدا ئەو جیاوازی‌یە هەیە کە هەیە، کەواتە شووکردنی بەسەر گەورەی ئافرەتانی جیهان چاك نی‌یە نە بەپێی شەرع وە نە بە پلەو پایە، وە پێغەمبەر ﷺ خۆی ئیشارەتی بۆ ئەوە کردووە کە فەرموویەتی: (والله لاتجتمع بنت رسول الله وبنت عدو الله في مكان واحد أبداً). جا ئەمە بە وتەبێ یا بە ئیشارەت ئەو پلەوپایەیە ئەگرێتەوە. وە لە پێشەوە باسی ئەو جۆرە مەرجەو سوودەکەی بۆ ئافرەت و هەروەها ڕای زانایان لەسەری کرا، جا بۆی بگەڕێرەوە.

**حیکمەتی هێنانی زیاتر لە یەك ژن :**

١- لە ڕەحم و میهرەبانی خوایە بۆ ئادەمیزاد کە بۆی ڕەوا کردووە چەند ژن بهێنێ، وە کە لە چواریش زیاتر نەبن بەیەکەوە.

جا بۆ پیاو دروستە کە لەیەك کاتدا لە ژنێك زیاتری هەبێت بەمەرجێ توانای نەفەقەکێشان و شەو مانەوەی هەبێت لایان، وەك لە پێشەوە باس کرا.

جا ئەگەر ترسا لەوەی ستەم بکات و ئەو مەرجانە بەجێ نەهێنێ کە بە دوایدا دێت حەرامە لەسەری زیاتر لە یەك ژن بێنێت. تەنانەت ئەگەر ترسا لەوەی کە مافی یەك ژنیشی بۆ نەدرێت ئەوە حەرامە لەسەری ژن بهێنێت، هەتا توانای ژنهێنانی تێدا دروست نەبێت.

وە ئەو چەند ژنهێنانە نە واجبە و نە سوننەتە، بەڵکو شتێکە ئیسلام ڕەوای کردووە، چونکە جاری وا هەیە بۆ ئاوەدان کردنەوەو چاك کردنی باری ژیانو کۆمەڵ هێنانی زیاتر لە ژنێك وەك زەرورەتێکی لێدی، وە جوان نی‌یە لەلایەن یاسا دانەرەوە ئەو شتە پشتگوێ بخرێ و چاوی لێ بنوقێنرێ.

٢- چونکە ئیسلام خاوەنی نامەیەکی مرۆڤایەتی بەرزە سپێردراوە بە موسڵمانان کە ئەو نامەیە ڕاپەڕێننو هەڵسن بە گەیاندنی.

وە ئەوان ناتوانن هەڵسن بە ڕاپەڕاندنی ئەو نامەیە هەتا دەوڵەتێکی بە هێزیان نەبێتو هەموو ڕاگرێکی ئەو دەوڵەتە ئامادە نەکرابێ لە سەرباز و زانستی و پیشەسازیو کشتوکاڵو بازرگانی، وە بێجگە لەوانە لەو شتانەی کە بوونی دەوڵەتی لەسەر ئەوەستێ کە لەهەموو لایەکەوە لێی بترسنو فەرمانی بڕواو دەسەڵاتی بەهێز بێت.

وە ئەوەش تەواو نابێت بە زۆری ئەندام نەبێت، بە شێوەیەك کە لە هەموو بوارەکانی چالاکی مرۆڤیدا ژمارەیەکی زۆر هەبێت بۆ کار کردن، لەبەر ئەوەیە ووتراوە (إنما العزة للتكاثر) واتە: هێزو گەورەیی بۆ زۆرە.

وە ڕێگاش بۆ ئەو زۆر بوونە زوو ژن هێنانە لە لایەکەوە، وە هێنانی چەند ژنە لە لایەکی ترەوە.

وە دەوڵەتە تازەکانی ئەم سەردەمە ئێستا هەستیان بە بەنرخی ئەو ژمارە زۆرییە کردووە، وە کاریگەری ئەو زۆرییە لەسەر بەرهەم هێنانو شەڕو شۆڕو فراوان کردنی دەسەڵات، بۆیە لە هەوڵی ئەوەدان کە ژمارەی دانیشتوان زۆر بکەن بەهۆی هاندانی خەڵك بۆ ژن هێنان و دانانی پاداشت بۆ ئەو هاوولاتی‌یانەی کە ئەندامانی خێزانەکەیان زۆر ئەکەن، تاوەکو هێزو بەرگری بۆ دەوڵەتەکەیان دابین بکەن.

گەرۆکی ئەڵمانی (پۆل اشمید) هەستی بەو زۆری نەوەیە کردووە لای موسڵمانان، وە ئەوەی بە هۆیەك لە هۆیەکانی هێزو دەسەڵاتیان داناوە لەبەر ئەوە لە کتێبی (الإسلام قوة الغد)دا کە ساڵی

(١٩٣٦) دەرکەوتووە ئەڵێت: پایەکانی هێزو توانا لە ڕۆژهەڵاتی ئیسلامیدا لە سێ شتدا کۆ ئەبێتەوە :

أ- لە هێزی ئیسلامدا، وەك ئاین، وە لە بیرو باوەڕ بەو ئاینە، وە لە ڕەوشتە بەرزەکانیدا، وە لە برایەتیو یەکیەتی نێوان ڕەگەزە جیاجیاکان لە ڕەنگو ڕۆشنبیری دا.

ب- وە لەزۆری سەرچاوەکانی سامانی سروشتی لە پارچە زەوی ڕۆژهەڵاتی ئیسلامی دا کە لە ئۆقیانوسی ئەطلەسییەوە درێژ ئەبێتەوە بەسەر سنووری مەراکیشدا لە ڕۆژئاواوە هەتا ئۆقیانوسی ئارام لەسەر سنووری ئەندەنوسیا لە ڕۆژهەڵاتەوە.

وە بوونی ئەم سەرچاوە زۆرانە ئەبنە هۆی دروستکردنی بارێکی ئابوری ساغو بەهێز کە بەشی خۆیان ئەکات و نایەڵێ موسڵمانان هەرگیز پێویستیان هەبێت بەڕۆژ ئاوا، بە مەرجێ خۆیان یەك بن و هاوکاری یەکتر بکەن.

جـ — وە لە کۆتاییدا ئاماژەی بۆ هۆکاری سێیەم کردووە کە ئەویش: زۆری ئەوەی بەشەرییە لەلای موسڵمانان، کە وایان لێ ئەکات توانای ژمارەییان هەمیشە هەر لە زۆربوندا بێت.

لە پاشان ووتویەتی: جا ئەگەر ئەو سێ هێزە کۆببێتەوەو موسڵمانان یەکیان گرت لەسەر بیرو باوەڕو یەکتاپەرستی، وە ئەو سامانە سروشتییە پێویستییەکانی ژمارە زۆرەکەیانی دابین کرد. ئەو کاتە خەتەری ئیسلامی هەڕەشەیەك ئەبێت کە هەواڵی لەناوبردنی ئەوروپا ئەدات بەگوێی دونیادا، وە هەواڵ ئەدات بە دەسەڵات و سەروەری جیهانی لە ناوچەیەکدا کە مەرکەزی هەموو جیهانە.

وە ئەو (پول ئەشمید)ە پاش ئەوەی ئەو سێ هۆیەی ڕوون کردەوە لە ڕێگای سەرژمێری ڕەسمییەوە، وە لە ڕێگای ئەوەی کە ئەی زانی دەربارەی بنەڕەتی بیرو باوەڕی ئیسلامی وەك ئەدرەوشێتەوە لە مێژووی موسڵمانانداو مێژوویی پەیوەندیان و پێشڕەوی کردنیان بۆ بەرپەرچ دانەوەی ستەم و تەجاوز بۆ سەریان، پێشنیازی ئەوە ئەکات: »کە ڕۆژئاوای مەسیحی یەك بگرن و هاوکاری بکەن بە گەل و دەوڵەتەوە تاوەکو جەنگی خاچ پەرستی بگێڕنەوە بە شێوەیەکی تر کە بۆ ئەم سەردەمە بلوێ، بەڵام بەشێوەیەکی کاریگەرترو چاك تر«.

٣ـ وە ئەو دەوڵەتەی خاوەن نامەیەکی مرۆڤایەتی بێت زۆرتر توشی گێرەو کێشەی جیهاد ئەبێت و ژمارەیەکی زۆر لە ئەندامانی کۆمەڵگەی لەدەست ئەچێت، کە پێویستە ئاگاداری خێزانی ئەوانە بکرێت کە شەهید بوون، وە هیچ ڕێگایەکیش نییە بۆ چاودێری کردنیان لەوە چاکتر بێت کە بەشوو بدرێن، وە مەجالی تر نییە جێی ئەو لەدەست چوانە بگرێتەوە زۆری ئەوە نەبێت، وە هێنانی چەند ژنیش لە هۆیەکانی ئەو زۆرییەیە.

٤ـ جاری وا ئەبێت ژمارەی ئافرەتەكانی گەلێك لە گەلان زۆرتر ئەبێت لە نێرینەكانی، وەك عادەتەن دووای جەنگەكان ئەوە ڕوو ئەدات، بەڵكو جاری وەها ئەبێ كە ژمارەی مێرینە لە زیاد بووندا ئەبێت لەناو زۆر لە نەتەوەكانا، هەتا لەكاتی ئاسایشیشدا، لەبەر ئەوەی زۆر لە پیاوان تووشیان ئەبێت بەكاری گران و ناخۆش كە ئەبێتە هۆی تەمەن كورت كردنەوەی پیاوان زیاتر لە ژنان.

وە ئەو زۆرییە هێنانی چەند ژن پێویست ئەكات و ئەیسەپێنێ بۆ ئەوەی ئەو ژمارە زیادەیە سەرپەرستی بكرێت، و بپارێزرێت، چونكە ئەگەر واش نەكرێت، ئەوە ئەو ئافرەتانە ناچار ئەبن كە لابدەن و دەست بدەنە كاری نزم و پەست، وە بەوە كۆمەڵ پیس ئەبێت و ڕەوشی نامێنێ، یا ئەوەتا ژیانیان بەرنەسەر بە ئازاری بێ ئومێدیو نارەحەتی بێ مێردی، وە لە ئەنجامدا ئاوەزیان لە دەست بدەن و سامانێكی زۆری توانای مرۆڤایەتی لەناو بچێت كە ئەتوانرا ئەو سامانە ببێتە هۆی بەهێزبوونی ئەم گەلە، وە ببێتە گەنجینەیەك و بخرێتە پاڵ گەنجینەكانی تری.

وە هەندێ لەو دەوڵەتانەی كە ژمارەی ئافرەتیان زۆرترە لە ژمارەی پیاوەكانیان ناچار بوون كە هێنانی چەند ژن بە ڕەوا دابنێن، چونكە لەوە بەولاوە چارەیەكی چاكتر نادۆزرێتەوە هەرچەندە پێچەوانەی باوەڕەكەی بێت و پێچەوانەی ئەوە بێت كەلەسەری ڕاهاتووە.

دكتۆر (محمد یوسف موسی) ووتوویەتی: لە بیرمە منو هەندێ لە برادەرانی میسریم بانگ كراین ساڵی (١٩٤٨) - كاتێ لە پاریس بووین — تا ئامادە بین لە كۆنگرەی لاوانی جیهانیدا لە شاری (میونیخ)ی ئەڵمانیا.

ئەوەبوو منو هاوڕێیەكی میسریم بەشداریمان كرد لەو حەلقەیەی كەباسی تەنگوچەڵەمەی زیادبوونی ژمارەی ئافرەتیان ئەكرد لە ئەڵمانیا كە چەند جار لە ژماەری پیاوان زیاترە دوای جەنگ، وە داوای ئەوەیان ئەكرد كە چارەسەرێكی باشی بۆ بدۆزرێتەوە، وە هەركەس چی ئەزانێ لەوبارەیەوە بیخاتە ڕوو.

جا دوای ئەوەی هەموو چارەسەركان خرایە پێش چاوو هەموویان ڕەفزكران، من و هاوڕێكەم چارەسەرێكی سروشتیمان خستە پێش چاویان، ئەویش ڕێدان بێت بەهێنانی زیاتر لە یەك ژن.

لەسەرەتاوە ئەو ڕایە بە سەرسوڕمان و بێزارییەوە وەرگیرا، بەڵام دوای ئەوەی لێكۆڵینەوەیەكی عادلانەو قوڵیان لەسەر كرد كۆڕبەستەكان هاتنە سەر ئەوەی كە هیچ چارەسەری تری نییە، وە لە ئەنجامدا بوو بەیەكێ لەو ئامۆژگاریانەی كە كۆنگرەكە بڕیاری لەسەردا.

وه ئهوهی كه زۆر دڵی شاد كردم ئهوه بوو دوای گهڕانهوهم بۆ نیشتمان ساڵی (١٩٤٩) زانیم كه چهند ڕۆژنامهیهكی میسری بڵاوی كردبۆوه كه خهڵكی شاری (بۆن) پایتهختی ئهڵمانیای ڕۆژ ئاوا داوای ئهوهیان كردبوو قانون ڕێ بدات كه زیاتر له یهك ژن بهێندرێت.

٥- پاشان تواناو ئامادهیی پیاو بۆ ئهوه هێنان زیاتره له تواناو ئامادهیی ئافرهت، چونكه ئهو ئهتوانێ كاری جنسی بهجێ بهێنێ، ههتا ئهگاته دوا ساتهكانی تهمهنی، بهڵام ئافرهت ماوهی بێنوێژی (كه جاری وا ئهبێت ئهگاته ١٠ ڕۆژ) و زهیستانی و منداڵ بوون (كه جاری وا ئهبێت ئهگاته ٤٠ ڕۆژ) ئامادهیی نیيه بۆ ئهو كاره، ئهمه بێجگه له بارو زروفی سك پڕی و شیردانیش.

وه توانای ئافرهت بۆ منداڵ بوون كۆتایی دێت له نێوان ٤٥ ساڵی تا ٥٠ ساڵی، بهڵام پیاو توانای منداڵ دروست بوونی ههیه ههتا دوای شهست ساڵیش، وه ئهبێ ئهم حاڵهتانه ڕهچاو بكرێن و چارهسهری گونجاویان بۆ دابنرێ .

جا ئهگهر ژن لهو حاڵهتهدا توانای بهجێهێنانی كاری ژنو مێردایهتی نهبێت پیاو چی بكات لهو ماوهیهدا؟

ئایا باشتر نیيه بۆی ئافرهتێكی تری حهڵاڵ بهێنێت كه لهداوێن پیسی و كاری خراپ بیپارێزێ، یا ئافرهتێك بكات به دۆست كه هیچ پهیوهندییهك نهبێت لهنێوانیاندا جگه له پهیوهندی ئاژهڵی؟!

لهگهڵ تێبینی كردنی ئهوهی كه ئیسلام زینای حهرام كردووه به توندترین شێوه.

خوای گهوره فهرموویهتی: ﴿وَلا تَقْرَبُوا الزِّنَى إِنَّهُ كَانَ فَاحِشَةً وَسَاءَ سَبِيلاً﴾ (الاسراء: ٣٢)
وه له زینا كردن نزیك مهبنهوه بهڕاستی ئهوه زۆر كارێكی زشتهو خراپترین ڕێگایه.

وه سزایهكی سهختی بۆ زیناكار بڕیارداوه:

﴿الزَّانِيَةُ وَالزَّانِي فَاجْلِدُوا كُلَّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا مِائَةَ جَلْدَةٍ وَلا تَأْخُذْكُمْ بِهِمَا رَأْفَةٌ فِي دِينِ اللَّهِ إِنْ كُنْتُمْ تُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ وَلْيَشْهَدْ عَذَابَهُمَا طَائِفَةٌ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ﴾ (النور:٢).

واته: ئافرهتو پیاوی زیناكهر كه زهواجیان نهكردبێ، یهكی سهد جار قامچیان لێ بدهن، وه بهزهیی هاتنهوه پێیاندا نهتان گرێو واز لهو سزایه بهێنن یان سوكی بكهن، ئهگهر ئێوه باوهڕتان بهخواو ڕۆژی دوایی ههیه، وه با كۆمهڵێك له باوهڕداران ئامادهی سزادانیان بن بۆ پهند وهرگرتن.

٦- جاری وا ئهبێ ژنهكه نهزۆك ئهبێتو منداڵی نابێت یا نهخۆشیهكی ئهبێت كه چاك بوونهوهی نابێت له گهڵ ئهوهشدا حهزی له بهردهوامی ژیانی ژن و مێردایهتییه، وه پیاوهكهش حهز له منداڵ ئهكاتو له ئافرهتێك بۆ كاروباری ماڵهكهی.

جا ئایا خێر لەوەدایە كە ئەو پیاوە ڕازی بێت بەو واقیعە دەردناكەو ژیان لەگەڵ ئەو نەزۆكەدا یا لەگەڵ ئەو نەخۆشەدا بەرێتە سەر بێ ئەوەی مندالێكی هەبێت یا كەسێك هەبێت سەرپەرشتی كاروباری ئەو ماڵەی بۆ بكات، ئیتر ئەو پیاوە بە تەنیا هەڵگری ئەو هەموو زیانە بێت؟!. یا خێر لەوەدایە كە لەو ئافرەتە جیا ببێتەوە لەكاتێكا ئەو ئافرەتە پێی خۆشە لای بمێنێتەوە، ئەویش بەو جیا بوونەوەیە تووشی ئازاری بكات؟!.

یان خێر لەوەدایە كە ڕێكخستن بكات لە نێوان ئارەزووی خۆیو خێزانەكەی، بەو شێوەیە كە ئافرەتێكی تر بهێنێ و ئەویش هەر لەلای خۆی گل بداتەوە، بەوكارەش بەرژەوەندی هەردوكیان بێتە جێ؟!

باوەڕم وەهایە كە چارەسەری دووایی باشترین بێتو شیاوتر بێت بە وەرگرتن، وە هەر خاوەن ویژدانی زیندوسۆزی ووشیار قەبوڵی ئەكات و پێی ڕازی ئەبێت.

٧- وە هەندێ پیاو هەیە ـ بە حوكمی سروشتی دەرونی و بەدەنی ـ ئارەزویەكی جنسی سەركێشی زۆری هەیە لەوانەیە بە ژنێك ئەو ئارەزوەی نەشكێنێ و تێری نەكات، بەتایبەتی لە هەندێك لە ناوچە گەرمەكاندا. جا لەجیاتی ئەوەی دۆستێكی تر بگرێو ئەخلاقو ڕەوشتی تێك بچێ بۆی ڕەوا كراوە كە غەریزەكەی بە ڕێگایەكی تری حەڵاڵی شەرعی تێر بكات.

٨- ئەوانە هەندێ هۆكاری تایبەتیو گشتین كە ئیسلام ڕەچاوی كردون لەوبارەیەوە، وە ئیسلام یاسایەك دانانێ تەنها بۆ جیلێكی تایبەتی لە خەڵك، یا تەنها بۆ سەردەمێكی دیاری كراو، بەڵكو بۆ هەموو خەڵكی داناوە هەتا خوا زەویو هەرچی لەسەریەتی ئەیباتەوە، بەڵام ئاگاداری كردنی سەردەم و شوێن پایەو ئیعتیباری خۆی هەیە، وە هەروەها بارو زروفی تەك تەكی خەڵكی ئەبێ حیسابی بۆ بكرێ.

وە هەروەها سوربوون لەسەر بەرژەوەندی نەتەوەی ئیسلام ـ بە زۆركردنی ئەندامەكانی بۆ ئەوەی چەكی جەنگ و ئاسایش بن ـ لە گرنگترینی ئەو ئامانجانەیە كە یاسادانەر مەبەستی‌یەتی.

وە گرنگ ترین مەبەستە كە یاسادانەری ئیسلام لە بەرچاوی گرتووە.

٩- ئەم یاسایە لە كۆنەوە كە دانراوەو جیهانی ئیسلامی ئیشی پێ كردووە، فەزڵێكی گەورەی هەبووە بۆ مانەوەی بەپاكیو دوركەوتنەوەی لەهەموو پیشە ناشیرینەكانی كۆمەڵایەتیو كەم ڕەوشتی كە لەو گەلانەدا بڵاوبووە كە باوەڕیان پێی هەبووەو ئیعترافیان پێ نەكردووە.

وە لەو كۆمەلگانەدا كە هێنانی چەند ژن قەدەغەیە ئەم شتانە دەبینرێ:

١- بلاوبوونەوەی سەرپێچی و داوێن پیسی هەتا ژمارەی ئافرەتە ڕەوشت پیسەکان لە ژمارەی ئەوانە زۆرترن کە مێردیان کردووە لەهەندێ شوێندا.

٢- بەهۆی ئەو داوێن پیسی‌یەوە ژمارەی منداڵی زۆڵیش زۆر بووە. چونکە لە هەندێ شوێندا ڕێژەی ئەگاتە ٥٠٪ ی لەدایك بووان. وە لە وولاتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکا هەموو ساڵێك زیاتر لە دووسەد هەزار منداڵی ناشەرعی لە دایك ئەبێت!!!

گۆڤاری گەل لەئابی (١٩٥٩) ئەمەی بلاوکردۆتەوە:

ئەو ڕەقەمە سەرسوڕهێنەرەی منداڵی ناشەرعی کە لەدایك بوون لەولاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا سەرلەنوێ دەمەقاڵێی تازە کردۆتەوە دەربارەی ئەمە کە ئاستی ڕەوشت لە ئەمریکادا چەندە لە خوارەوەیە، وە ئەو بارە گرانەی کە دێتە سەرشانی باج دەرانی ئەمریکا ـ لە ئەنجامی ئەو خەرجی‌یەی کە ئەبێ صەرف بکرێ بۆ ئەم سوپای منداڵە زۆرە ـ وە ئەمە سەیر نی‌یە چونکە ژمارەیان ساڵیانە لە دووسەد هەزار تێ ئەپەڕێ.

وە بۆ بەرەنگار کردنی ئەم تەنگو چەڵەمەیە دەستگا ڕەسمی‌یەکان لە هەندێ شوێندا بیر لەوە ئەکەنەوە کە ئافرەتان نەزۆك بکەن بەتایبەتی ئەوانەی لە تەعلیماتی تاین لایان داوە.

وە لە هەندێ شوێندا دەمەقاڵێ ئەکرێ لەسەر ئەو پێشنیازانە کە داوائەکەن یارمەتی کەم بکەنەوە لەو دایکانەی کەلە منداڵێکی ناشەرعی زیاتریان ئەبێت.

وەزارەتی تەندروستی و پەروەردەو کاری کۆمەلایەتی لە وولاتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکا ئەڵێت:

بەڕاستی باج دەران لە ئەمەریکا ئەم ساڵ ئەبێ (٢١٠) ملیۆن دۆلار بدەن بۆ دابین کردنی خەرجی ئەو منداڵانەی بەناشەرعی ئەبن، کە بۆ هەر منداڵێك مانگی (٢٧) دۆلارو (٢٩) سەنت صەرف دەکرێ.

وە سەر ژمێری‌یەکی ڕەسمی ئەڵێت کە ژمارەی ئەو منداڵانە لە (٨٧) هەزارو (٩٠٠) لە ساڵی (١٩٣٨)دا گەیشتۆتە (٢٠١) هەزارو ٧٠٠ لە ساڵی ١٩٥٧ دا.

وە وەك وەزارەتی کاروبارەی کۆمەلایەتی داینێاوە ژمارەی ئەو منداڵانە ساڵی ١٩٥٨ ئەکەنە ٢٥٠٠٠٠ هەزار منداڵ.

بەلام پسپۆڕەکان ئەڵێن لەو ژمارەیە زۆر زۆرتر ئەبێت.

وە سەرژمێرە دەوڵەتییەکان کەلەم دوایییەدا ئەنجام دراوە وا دەرئەخات کە ژمارەیان لە هەریەك هەزاردا گەیشتۆتە سێ بەرامبەر، بەتایبەتی لەم دووجیلەی دوایی‌دا کە کارێکی ترسناك دەرئەخات لەنێوان ئافرەتە تازە پێ‌گەیشتوەکاندا.

وە زانایانی زانستی کۆمەڵایەتی ڕاستییەکی تر دەرئەخەن ئەویش ئەوەیە کە خێزانە بەتواناکان ئەگەر کچێکیان منداڵێکی ناشەرعی بوو ئەیشارنەوەو منداڵەکە ئەنێرن بۆ خێزانێکی تر تا بیکەنە منداڵی خۆیان‌و بە خێوی بکەن -گۆڤارەکە تەواو بوو-.

٣- ئەم تێکەڵ بوونە پیسە بوەتە هۆی بڵاوبونەوەی نەخۆشی لاشەیی‌و گرێی دەرونی‌و تێك چوونی ئارەزو مێشك.

٤- هۆیەکانی لاوازی دەرونی و تێك چوون خۆی کێشاوەتەوە ناویان.

٥- گرێی پەیوەندییە بەهێزەکانی نێوان ژن‌و مێرد کراوەتەوەو ژیانی ژن و مێردایەتی تێك چووەو پەیوەندی خێزانی هەڵوەشاوە هەتا وای لێ هاتووە بووە بە شتێکی بێ بایەخ.

٦) وون بوونی نەسەبی ڕاست، هەتا مێرد ناتوانێ بەتەواوی بڵێت ئەو منداڵانەی پەروەردەیان ئەکات هی خۆیەتی.

ئەم خراپییانەو گەلێ شتی تر ئەنجامێکی سروشتی بووە بۆ لادان لە فیترەت و دورکەوتنەوە لە فەرمانەکانی خوا، کە ئەویش بەهێزترین بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە بۆچوونی ئیسلام چاکترین بۆچوونە، وە یاسای ئیسلام ڕەواترین یاسایە بۆ مرۆڤێك لەسەر ڕووی زەوی بژی، نەك بۆ ئەو فریشتانەی کە لە ئاسمانن.

با ئەو وتەیە کۆتایی بهێنن بەو پرسیارو وەڵامانەی کە (الفونس اتيين دينية) هێناویەتی‌و وتوویەتی: ئایا لە نەمانی چەند ژنهێناندا سوودێکی ڕەوشتی هەیە؟

لەپاشان وەڵامی داوەتەوە: ئەمە شتێکە گومانی لێ ناکرێت؛ چونکە ئەو بەدڕەوشتییەی کە زۆر کەمە لە زۆربەی وڵاتە ئیسلامییەکاندا لەمەودووا لەوێش بڵاو ئەبێتەوەو شوێنەوارە وێرانکەرەکانی دەردەکەوێت.

هەروەها نەخۆشییەك دەرئەکەوێ کە لەوەپێش نەیان ناسیوە، ئەویش مانەوەی ئافرەتە بێ ئەوەی شوو بکات، کە بەهۆی ئەوەوە خراپە بڵاو ئەبێتەوە لەو وڵاتانەدا کە تەنها هێنانی یەك ژن تێیاندا ڕەوایە.

وە ئەوەی تێدا دەرکەوتووە بە ڕێژەیەکی ترسناك بە تایبەتی کاتەکانی دوای جەنگ[1].

**بەستنەوەی هێنانی زیاتر لەیەك ژن**

خراپی بەجێ‌هێنان و گوێ نەدان بە ئامۆژگاری‌یەکانی ئیسلام بووەتە بەڵگەی ڕاپەڕین بۆ ئەو کەسانەی کە ئەیانەوێ هێنانی زیاتر لە یەك ژن ببەستنەوە بەوەی کەرەوا نەبێت بۆ پیاو ژنێکی تر بهێنێ هەتا قاضی یا ئەو لایەنانەی ئەوکارەیان خراوەتە ئەستۆ تەواو لە حاڵ و توانای ماڵی ئەو کەسە نەکۆڵنەوە، ئینجا ڕێیان داوە بەو پیاوە ژنیکی تر بهێنێ. ئەمەش لەبەر ئەوەیە کە ژیانی ماڵداری پێویستی بە نەفەقەیەکی زۆر هەیە، جا ئەگەر ژمارەی ئەندامی خێزان زیادی کرد بەهۆی چەند ژنەوە، ئەوە باری پیاوەکە گران ئەبێت‌و لاواز ئەبێت، لەوەدا کە هەستێ بەپێی پێویست بەنەفەقە کێشانیان، وەکەم توانا ئەبێت لە پەروەردەکردنیان پەروەردەیەکی وا کە بیان‌کاتە ئەندامی چاکی کۆمەڵەکەیان، کە لە پاشەڕۆژدا بتوانن هەڵسن بە بەجی هێنانی ئەرکی گرانی ژیان، وە بەوەش نەزانی و نەخوێندەواری بڵاو ئەبێتەوە و بێ کاری دەست بەسەر ئەندامەکانی ئەو کۆمەڵەدا ئەکێشێ و ژمارەیەکی زۆریان لێ دەربەدەر ئەبێت وە تاوەکو پیر ئەبن هێشتا هەر هەڵگری ئەو میکرۆبە پیسانەن کە ئێسکەکانیانی خواردوە.

پاشان پیاو لەم ڕۆژگارەدا زیاتر لە ژنێك ناهێنی مەگەر لەبەر تێرکردنی ئارەزو و دەستکەوتنی سامان نەبێت، بێ ئەوەی بگەڕێ بەشوێن حیکمەتی چەند ژنهێنان، وە لەو هێنانەشدا مەبەستی لایەنی بەرژەوەندی‌یەکەی نی‌یە، لەبەر ئەوە زۆر جار ستەم لە مافی ئەو ژنەی کە ژنی بەسەردا هێناوە ئەکات و بە منداڵەکانی زیان ئەگەیەنێ، کە بێ بەشیان ئەکات لە میرات، و بەوە ئاگری ناکۆکی لە نێوان براو خوشکەکان لەو هەوێیانە هەڵئەگیرسێنێ، لە پاشاندا ئەم ناکۆکیە بڵاوئەبێتەوە بەنێوان خێزانەکاندا، دوژمنایەتی زۆر ئەبێت و هەر ژنە تێ ئەکۆشی تۆڵە لەوی تر بستێنێ، ئیتر ئەو شتە بچوکانە گەورە ئەبن هەتا ئەگەنە ڕادەی کوشتن لەهەندێ جاردا

ئەوە هەندێکە لە شوێنەوارەکانی هێنانی چەند ژن کە بەڵگەی بەستنەوەی لێ وەرگیراوە

جا ئێمەش ئەڵێین: چارەسەرکردن بەوە ناکرێ کەرێ لەوە بگیرێ کە خوا ڕەوای کردووە، بەڵکو بە پەروەردەکردن‌و شارەزاکردنی خەڵکی بەیاسای خوا ئەبێت.

ئایا نابینی کە خوا ڕێی داوە بە مرۆڤ بخواو بخواتەوە بێ ئەوەی لە ڕادەی خۆی تێ پەڕێت، جا ئەگەر لە خواردن‌و خواردنەوەدا زیادەڕەوی کرد و تووشی نەخۆشی‌و دەرم بوو ئەوە ئەو نەخۆشی و

---

(١) لە کتێبی (محمد رسول الله): وەرگێڕانی (د/ عبدالحلیم محمود).

درمە ناگەڕێتەوە بۆ خواردن‌و خواردنەوەکە، ئەوەندەی کە ئەگەڕێتەوە بۆ زۆر خواردن‌و ئیسراف کردنەکە

وە چارەسەرکردنی ئەوەش بەوەنابێ کە ڕێی خواردن و خواردنەوە بگیری لەوانە، بەڵکو بە فێر کردنی ئەو ڕەوشتانەی کە پێویستە ئاگاداری بکرێ بۆ خۆپاراستن لە ڕوودانی ئەو زیانە.

لە پاشاندا ئەوانەی بۆ ئەوە چوون کە چەند ژنهێنان قەدەغە بکرێ هەتا قاضی ڕێ نەدات وە بەڵگەشیان واقیعی حاڵی ئەوانەیە کە لە ژنێك زیاتریان هێناوە، یا نازانن یا خۆیان گێل ئەکەن لەو خراپەیەی کە ڕوو ئەدات لە ئەنجامی ئەو قەدەغەکردنە، چونکە زیانی دروست بوو لە ئەنجامی ڕەوایی چەند ژندا زۆر هێواش ترە لە زیانی قەدەغە کردنی .

وە پێویست ئەوەیە کە خۆ لە توندترینی ئەم دووزیانە بپارێزرێ بەوەی کە سوکەکەیان ڕەوا بکرێ بە پێی قاعیدەی (سوك ترین زیان لە دووزیان) وە سپاردنی ئەو کارە بە قاضی شتێکە کە ناتوانێ زەوتی بکات، چونکە هیچ کێش‌و پێوانێکی ڕاست نیە بتوانرێ بارو زروفی خەڵکی پێ بزانرێ، وە لەوانەیە زیانی نزیك تربێ لە سوودەکەی.

وە موسڵمانان لەسەردەمی یەکەمەوە هەتا ئێستا لە ژنێك زیاتریان هێناوە، وە پێمان نەگەیشتووە کەسێك هەوڵی ئەوەی دابێ قەدەغەی بکات، یا بیبەستێتەوە بەو شێوەیەی کە ئەمانە پێشنیازیان کردووە. جا با ئێمەش ئەو توانایەی ئەوانمان ببێت، وە پێویست نیە بۆمان ڕەحمەتی خوای فراوان لەسەرخۆمان تەسك بکەینەوە، وە لەو یاسایە کەم بکەینەوە کەهەرچی خووڕەوشتی جوانە تێیدا کۆبۆتەوە بەشایەتی دوژمنان جگە لە دۆستان.

**مێژووی چەند ژن هێنان:** [1]

لە ڕاستیدا ئەم یاسایە لە پێش دەرکەوتنی ئیسلامیشدا هەر بڵاو بووە لەنێوان زۆر لە گەلانی سەرزەویدا لەوانە (عیبریەکان) و (عەرەب) لە سەردەمی نەزانیدا، وە گەلانی (صەقالیبە) یا (سلافیون) ەکان، کە بەشی زۆری خەڵکی ئەم وڵاتانە ئەچنەوە سەریان کە ئەمڕۆ ناوئەبرێن بە: (روسیاو لیتوانیاو لیثوانیاو ئەستونیاو بولونیاو چیکۆسلۆفاکیا و یوغسلافیا)

وە لای هەندێ گەلانی جەرمەنیو سەکسۆنی کە بەشی زۆری خەڵکی ئەو وڵاتەتانە ئەگرێتەوە کەئەمڕۆ پێی ئەڵێن: (ئەڵمانیاو نەمساو سویسراو بەلجیکاو هۆڵەنداو دانیمارك‌و سویدو نەرویج‌و ئینگلتەرا).

---

(١) لە کتێبی (حقوق النساء في الإسلام): مامۆستا علی عبدالواحد.

کەواتە ڕاست نیە ئەوەی کە ئەڵێن هەر ئیسلام ئەم یاسایەی هێناوە،

لە ڕاستیدا ئەم یاسای چەند ژنە هەتا ئێستا بڵاوە لە نێوان زۆر گەلانی جیهاندا کەلەسەر ئاینی ئیسلامیش نین وەك وولآتانی ئەفەریقیاو هیندو چین‌و یابان،

کەواتە ئەوەش ڕاست نیە کە ئەڵێن ئەم یاسایە تەنها لەناو ئەو وولآتانەدا هەیە کە لەسەر ئاینی ئیسلامن.

وە لە ڕاستیدا ئاینی مەسیحی هیچ پەیوەندی نیە بەحەرام کردنی چەند ژنەوە، چونکە لە ئینجیلدا دەقێکی ڕاست‌و ڕەوان نیە کە بەڵگە بێت بۆ حەرام کردنی،

جا ئەگەر بەشی زۆری مەسیحیە دێرینەکان لە خەڵکی ئەورووپا لەسەر یاسای یەك ژنهێنان بوون لەبەر ئەوە بووە بەشی زۆری نەتەوە ئەورووپیەکان بتپەرستی لەنێوانیاندا بڵاو بووە کەواتە ئەو یاسایە هەرلەوانەوە بۆیان ماوەتەوە، وەك گەلانی یۆنانی‌و ڕۆمان کە ڕەوشتیان وەها بووە چەند ژن حەرام بووە کەمارە بکرێن، ئیتر خەڵکەکە هەر لەسەر ئەوە ڕۆیشتوون کە باوو باپیرانیانی لەسەر بووە،

کەواتە یاسای یەك ژنی یاسایەکی کوت‌و پڕ نەبووە هاتبێتە ناویان بەهۆی ئاینە تازەکەیانەوە کە چوونە ناوی، بەڵکو یاسایەکی کۆن بووە لە کاتی بت پەرستیەوە کاری پێ کراوە، وە تەنها شتێك لێرەدا ئەوەیە کە یاساکانی کەنیسەی تازە داهێنراو دووای ئەوە جێ گیربووە لەسەر حەرامی چەند ژنی وە وای داناوە کە لە تەعلیماتی ئاینیە، هەرچەندە لە کتێبی ئینجیلەکاندا شتێکی وەها نەهاتووە بەڵگە بێت لەسەر ئەو حەرامیە،

وە ڕاستیەکەی ئەوەیە کە یاسای چەند ژنی لە گەلانی پێشکەوتوو لە شارستانیەتیدا نەبێ بەو شێوە ڕوونە دەرنەکەوتووە، لەکاتێکدا لەناو گەلە دواکەوتوەکاندا زۆر کەم بووە وەك زانا کۆمەڵناسەکان و مێژوو نوسەکانی شارستانیەت بڕیاریان لەسەر داوە، وە لەسەرووی هەموویانەوە (ویسترمارك و هوبهوس و هیلر و جنربرج).

وە تێبینی ئەوە کراوە کە یاسای یەك ژنی لەناو بەشی زۆری گەلە دواکەوتوەکاندا باو بووە بەتایبەتی ئەو گەلانەی لەسەر ڕاوکردن ژیاون، یا ئەوانەی لەسەر داهاتووی میوەی سروشتی ژیاون کە لەسروشتدا هەبوون، وە هەروەها لەناو ئەوگەلانەدا باو بووە کە زۆر زۆر لەسەر دووا کەوتویی سەرەتا نەماوەتەوە؛ وەك ئەو گەلانەی کەتازە کاربوون لە کشتوکاڵدا،

لەکاتێکیشدا کە یاسای چەند ژن بەشێوەی ڕوون و ئاشکرا دەرنەکەوتوە لەناو ئەو گەلانەدا نەبێت کە زۆر پێشکەوتوو بوون؛ ئەوانیش ئەو گەلانە بوون کە مەرحەلەی ڕاوی سەرتاییان بڕیوەو گەیشتوونەتە مەرحەلەی پەروەردەکردنی ئاژەڵ و بەکارهێنانی بەروبومیان، وە ئەو گەلانەی لە مەرحەلەی کۆکردنەوەی بەروبوومی سروشتی تێ پەڕیون بۆ مەرحەلەی کشتوکاڵ.

وە زۆر لە زانایانی کۆمەڵناسیو مێژوو نووسی شارستانیەکان ڕایان وەهایە کە یاسای چەند ژن بەرفراوان ئەبێت و ئەو گەلانە زۆر ئەبن کە بەو یاسایە ئیش بکەن، هەتا لە شارستانیەتیدا پێش بکەون، کەواتە ڕاست نیە ئەوەی ئەڵێن یاسای چەند ژن بەستراوە بە دوواکەوتوویی شارستانیەتیەوە، بەڵکو ئەوەی کە لەگەڵ واقیعدا ڕێك دێتەوە بە تەواوی پێچەوانەی ئەوەیە.

ئائەوەیە کە ڕاست و ئاشکرایە دەربارەی یاسای چەند ژنی لە لایەن مێژوویەوە، وە ئەوەشە هەڵوێستی مەسیحیەت لەو بارەیەوە، وە ئەوەشە ڕاستی دەربارەی سنووری بڵاو بوونەوەیو پەیوەندی بە پێشکەوتنی شارستانیەتیەوە، وە ئێمە بۆ ئەوە باسی ئەمانەمان نەکردووە کە ئەم یاسایە سەربخەین؛ بەڵکو تەنها بۆ ئەوەی هەر شتە لە شوێنی خۆیدا دابنێن وەبۆ ڕونکردنەوەی ئەوەی کە ئەوروپاییەکان ئەیکەن دەربارەی شاردنەوەو گۆڕینی ڕاستیو مێژوویی.

## (الولایة) سەرپەرشتیار لەسەر زەواج

مانای سەرپەرشتی: سەرپەرشتی مافێکی شەرعیە، بەپێی ئەو سەرپەرشتیە فەرمان بەسەر کەسانی تردا جێبەجێ ئەکرێ بەبێ ویستی خۆی، ئەویش سەرپەرشتی گشتیو تایبەتیە، وە سەرپەرشتی تایبەتی سەرپەرشتی لەسەر گیانە وسەرپەرشتی لە سەرماڵ، وە ئەوەی لێرەدا مەبەستە سەرپەرشتی لەسەر گیانە واتە سەرپەرشتی لەسەر گیان لە ژنهێناندا.

### مەرجەکانی سەرپەرشتیکار:

مەرجە سەرپەرشتیکەر ئەمانەی تێدا بێت: ئازادی، عەقڵ، بالغی، جا سەرپەرشتی کراوەکە موسوڵمان بێت یاموسوڵمان نەبێت، کەواتە نابێت کۆیلەو شێتو منداڵ ببنە سەرپەرشتیکەر، چونکە ئەمانە خۆیان سەرپەرشتی خۆیان پێ ناکرێ، ئیتر چۆن ئەبێت سەرپەرشتی کەری کەسانی تر بن. وە لەسەر ئەم مەرجانەوە مەرجێکی تر زیاد ئەکرێت ئەویش ئیسلامەتیە، ئەگەر سەرپەرشتی کراوەکە موسڵمان بێت، چونکە نابێت ناموسڵمان سەرپەرشتی کەری موسڵمان بێت بە پێی فەرموودەی خوای گەورە کە ئەفەرموێ: ﴿وَلَنْ يَجْعَلَ اللّٰهُ لِلْكَافِرِينَ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ سَبِيلاً﴾ (النساء:١٤١) واتە: خوای گەورە ڕێگا نادات بە کافرەکان زاڵ بن بەسەر بەندە چاکەکانی خۆیدا.

**مەرج نییە عەدالەت لە سەرپەرشتیکەردا هەبێت:**

مەرج نییە سەرپەرشتی کەر عادل بێت چونکە لە فەرمانی خوا دەرچوون (فسق) شایستەی ئافرەت بەشوودان لانابات مەگەر ئەو فاسقە بگاتە ڕادەی بێ ئابڕوویی، چونکە سەرپەرشتی کەر لەو حاڵەتەدا پشتی پێ نابەسترێت کە ئەمین بێت بەوەی لە ژێر دەستی دایە، لەبەر ئەوە مافی سەرپەرشتیکەرێتی لێ ئەسەندرێتەوە.

**ئایا ئافرەت ئەبێتە سەرپەرشتیکەری خۆی لە مێردکردندا:**

زۆر لە زانایان بۆ ئەوە چوون کە ئافرەت دروست نی‌یە خۆی مارەبکات یا کەسێکی تر مارەبکات، وە پەیمانی ژن‌و مێردایەتی بە عیبارەتی ئەو نابەسترێ، چونکە بوونی سەرپەرشتیکار مەرجە لە دروستی پەیمانەکەدا، وە ئەبێ ئەو پەیمان بەستەش سەرپەرشتی کەرەکە بێت بەم بەڵگانەی خوارەوە:-

١-خوای گەورە فەرمووبەتی: ﴿وَأَنْكِحُوا الْأَيَامَى مِنْكُمْ وَالصَّالِحِينَ مِنْ عِبَادِكُمْ وَإِمَائِكُمْ﴾ (النور:٣٢)

واتە: ئەی ئیمانداران ـ زەواج بکەن بە کوڕو کچە ئازادەکانتان، هەروەها بە بەندەو کەنیزەکە باشەکانیشتان.

٢- وە فەرموویەتی: ﴿وَلَا تُنْكِحُوا الْمُشْرِكِينَ حَتَّى يُؤْمِنُوا﴾ (البقرة:٢٢١)

واتە: ئافرەتە باوەڕدارەکانتان مەدەن بە بێ باوەڕان هەتا باوەڕ ئەهێنن.

وە بەڵگەی هەردوو ئایەتەکە ئەوەیە خوا لەگەڵ پیاودا دوواوە لە نیکاحدا وە لەگەڵ ئافرەتدا نەدواوە، وە وەك ئەوە وەهایە بفەرمویٚ: (ئەی سەرپەرشتی کەران ئافرەتەکانتان مەدەن بە کافران).

٣-وە لە ئەبی موساوە هاتوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (لانكاح إلا بولي) رواه أحمد، و أبوداود، و الترمذي، و ابن حبان، و الحاكم وصححاه[1].

واتە: بێ سەرپەرشتی کەر ئافرەت مارە ناکرێت. وە ئەو قەدەغەکردنەی کە لەحەدیسەکەدا هاتووە بەمانای ئەوە دێت کە مارە کردن بەبێ وەلی دروست نەبێت، وە هەر ئەوەش نزیکترە وەك

(١) أحمد (٤/٤١٨) وأبوداود (٢٠٨٥) والترمذي (١١٠١) وإبن ماجة (١٨٨١) وإبن حبان (٤٠٧٧) والحاكم (٢/١٦٩).

له مانای تر که بۆی دابنرێ، کەواتە مارەکردنی ئافرەت بێ وەلی باتڵە، وەك کەمێکی تر له حەدیسەکەی عائیشەدا دێت خوای لێ ڕازی بێت.

٤-وە بوخاری له حەسەنەوە ئەگێڕێتەوە فەرمووبەتی: ﴿فَلا تَعْضُلُوهُنَّ ﴾ (البقرة:٢٣٢) واتە: ڕێیان لێ مەگرن. ووتوویەتی: مەعقیلی کوڕی یەسار بۆی گێڕامەوە کە ئەم ئایەتە دەربارەی ئەو هاتۆتە خوارەوە ئەڵێ: خوشکێکم دا بە پیاوێك تەڵاقیدا، کاتێ خەریك بوو عیددەکەی تەواو بێ هاتەوە داوای کردەوە، منیش پێم ووت: خوشکەکەم دایتێ و بۆم ڕاخستی و ڕێزم گرتی، تۆش تەڵاقت داوە، ئێستاش هاتویت داوای ئەکەیتەوە!! سوێند بەخوا هەرگیز ناچێتەوە پاڵی، وە کابرا پیاوێکی خراپ نەبوو، خوشکەکەشم ئەیویست بگەڕێتەوە لای، جا خوای گەورە ئەو ئایەتەی ناردە خوارەوە: ﴿فَلا تَعْضُلُوهُنَّ ﴾ (البقرة:٢٣٢) .واتە: ڕێیان لی مەگرن ئەڵێ: منیش ووتم: ئێستا ئەو کارە ئەکەم ئەی نێرراوی خوا. ئەڵێ ئیتر خوشکەکەم دایەوە بەکابرا[١].

حافظ له (فتح)دا فەرموویەتی: ئەو هۆیەی باسکراوە بەهێزترین حوججەیە دەربارەی هاتنە خوارەوەی ئەو ئایەتە، وە ئەوەش ئاشکراترین بەڵگەیە بۆ ئەوەی کەمەرجە ئەبێ سەرپەرشتی کەر هەبێ، ئەگینا ڕێ گرتنی مانای نەئەبوو، چونکە ئەو ئافرەتە ئەگەر بۆی ببوایە خۆی مارە بکات ئەوە پێویستی بەبراکەی نەئەبوو، وە ئەگەر کەسێك دەسەڵاتی بەدەست خۆی بێت، پێی ناووترێ کەسێکیتر ڕێی لێگرتوە.

٥﴾ وە له عائیشەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (أيما امرأة نكحت بغير إذن وليها فنكاحها باطل، فنكاحها باطل، فنكاحها باطل، فإن دخل بها فلها المهر بما استحل من فرجها، فإن اشتجروا فالسلطان ولي من لا ولي له) رواه أحمد، وأبوداود، وابن ماجة، والترمذي، وقال: حديث حسن، وقال القرطبي: هذا الحديث صحيح[٢]

واتە: هەر ئافرەتێك بەبێ ئیزنی سەرپەرشتیکەری شوویکرد شووەکەی بەتاڵە، شووەکەی بەتاڵە، شووەکەی بەتاڵە، جا ئەگەر ئەو پیاوە چووبووە لای مارەییەکەی پێ ئەشێ بەوەی پێی حەڵاڵکراوە له لەشی، وە ئەگەر ڕێیان لێگیرا له بەشوودان (سلطان) فەرمان ڕەوا سەرپەرشتیکەری کەسێکە کەسەرپەرشتیکەری نەبێت.

---

(١) البخاري (٤٥٢٩) و(٥١٣٠) وأبوداود (٢٠٨٧) والترمذي (٢٩٨١).

(٢) أحمد (٦/١٦٦) وأبو داود (٢٠٨٣) والترمذي (١١٠٢) وابن ماجة (١٨٧٩).

وه ئیعتیبار بەقسەی ئیبنوعولەییە ناکری کە لە ئیبنو جورەیجەوە ئەگێڕێتەوە کە ووتوویەتی: (لەبارەی ئەو فەرمووده‌یەوە پرسیارم لە زوهری کرد ووتی نایزانم، ئیبنوعولەییە نەبێت کەس ئەوەی لە ئیبنو جورەیجەوە نەگێڕاوەتەوە، وە جەماعەتێك لەزوهرییەوە ئەوەیان گێڕاوەتەوە باسی ئەو قسەیان نەکردوە کە وتبێتی نایزانم، وە ئەگەر ئەوەش لە زوهرییەوە سابت بووایە نەئەبوو بە بەڵگە، چونکە کۆمەڵێکی جێی بڕوا لێیان گێڕاوەتەوە، لەوانە سلێمان ی کوڕی موسا کە مامۆستایەکی سیقە بووە، وە جەعفەری کوڕی ڕەبیعە، وە ئەگەر زوهری لە بیریشی چوبێتەوە زیان بە فەرمووده‌کە ناگەیەنێ چونکە مرۆڤ لە لەبیرچونەوە نەپارێزراوە.

حاکم فەرموویەتی: ئەو ڕیوایەتە بەصەحیحی لە خێزانەکانی پێغەمبەرەوە صلی الله علیه وسلم هاتووە لەوبارەیەوە لەوانە: عائیشە و ئوم و سەلەمە و زەینەب لە پاشاندا سی فەرمووده‌ی هێناوەتەوە.

٦- فەرموویانە: وە لەبەر ئەوەی زەواج چەندەها مەبەستی تێدایە، ئافرەتیش زۆر جار مل کەچی سۆزو عاتیفەی ئەبێت، لەبەر ئەوە چاك هەڵنابژێرێ، وە ئەو مەبەستانەی لەدەست ئەچێت، لەبەر ئەوە قەدەغەکراوە خۆی پەیمانەکە ببەستێ، وەدراوە بەسەرپەرشتیکەرەکەی، بۆ ئەوەی مەبەستەکانی ژن هێنان و شووکردن بێتەدی بە تەواوترین شێوە.

(ترمذی) فەرموویەتی: لەسەر ئەو فەرمووده‌یەی پێغەمبەر ﷺ (لانكاح إلا بولي)[1] زانایانی صەحابە ڕۆیشتون وکاریان پێ کردووە لەوانە: عومەری کوڕی خەطّاب و عەلی کوڕی ئەبی طالیب و عەبدوڵلای کوڕی عەبباس و ئەبو هورەیرە و ئیبنو عومەر و ئیبنو مەسعود و عائیشە.

وە لە زانایانی تابیعی کە بۆ ئەوە چووبن ئەمانەن: سەعیدی کوڕی موسەییب و حەسەنی بەصری و شورەیح و ئیبراهیمی نەخەعی و عومەری کوڕی عەبدالعزیز و چەند کەسیتر.

هەروەها سوفیانی ثەوری و ئەوزاعی و عەبدوڵلای کوڕی موبارەك و شافیعی و ئیبنو شیبرمە و ئەحمەد و ئیسحاق و ئیبنوحەزم و ئیبنو ئەبی لەیلاو طەبەریو ئەبی ثەوریش هەروەهایان ووتووە.

وە طەبەرانی ووتوویەتی: لە حەدیسەکەی حەفصە ـ کاتێ بێمێرد مایەوە، و عومەر پەیمانی نیکاحەکەی بەست و خۆی نەیبەست – بەتاڵ کردنەوەی ئەو قسەیەی تیایە کە: ئافرەتی پێ گەیشتوو خاوەنی خۆیەتیو خۆی مارە ئەکات و پەیمانی نیکاح ئەبەستێ، بێ سەرپەرشتیکەری، ئەگەر ئەوەی بۆ ببوایە پێغەمبەر ﷺ ئەوەی فەرامۆش نەئەکرد کە حەفصە خۆی خۆی مارەبکات،

---

(١) أحمد (٤/٤١٨) وأبو داود (٢٠٨٥) والترمذي (١١٠١) وابن ماجة (١٨٨١).

کاتێ خۆی بەخۆی لە پێش‌تر بووایە لە باوکی، وەلە کەسێکی داخوازی بکات کە کاری ئەو کەسەی بەدەست نەبێت و پەیمانی بۆ ببەستێ.

وە ئەبوحەنیفە و ئەبو یوسف ڕایان وایە: کە ئافرەتی عاقڵی بالغ مافی ئەوەی هەیە کە خۆی خۆی مارە بکات کچ بێت یا بێوەژن، وە وەها پەسەندە کە سەرپەرشتی‌کەرەکەی بکات بەوەکیل لە پەیمانی نیکاحدا بۆ پاراستنی لە چاوبڕی‌کەوتنی پیاوان کە ئامادەی ئەو پەیمانە ئەبن کاتێ خۆی خۆی مارەئەکات، وە سەرپەرشتی‌کەرەکەی کە میراتگریەتی بۆی نیە ڕێی لێ‌بگرێ، مەگەر خۆی مارەبکات لەکەسێك هاوتای نەبێت، یا مارەی‌یەکەی کەمتر بێت لەمارەیی عادەتی،

جا ئەگەر خۆی مارە کرد لە کەسێك هاوتای نەبێت، وە سەرپەرشتی‌کەرەکەی ڕازی نەبوو، ئەوەی لە ئەبووحەنیفەو ئەبی یوسف گێڕراوەتەوە لە مەزهەبەکەدا، وە فەتوای لەسەر دراوە ئەوەیە کە ئەو نیکاحە دروست نیە، چونکە هەموو سەرپەرشتی‌کەرێك باش نازانێ داوا پێشکەش بکات بەقازی، وە هەموو قازی‌یەکیش دادپەروەر نیە، لەبەر ئەوە فەتوایان داوە کە نیکاحەکە دروست نیە بۆبەستنی دەرگای ئاژاوە

وە لەڕیوایەتێکدا هاتووە کە سەرپەرشتی کەر مافی ڕێ‌نەدانی هەیە بەوەی داوا لە حاکم بکات لە یەکیان جیابکاتەوە بۆ دوورخستنەوەی عەیب و عار، هەتا لەو پیاوە منداڵی نەبووە، یازگی پڕ نەبووە لێی‌و زگی بەرز نەبۆتەوە، چونکە لەم کاتانەدا مافی ئەوەی نامێنی داوای جیاکردنەوەیان بکات لەبەر منداڵەکەو لەناوچوونی زگەکە، بەڵام ئەگەر مێردەکە هاوشان بوو وە مارەیی‌یەکەی لە مارەیی عادەتی کەمتر بوو، سەرپەرشتی‌کەر بۆی هەیە داوای ئەوە بکات کەمارەیی‌یەکە بەرزبکاتەوە ئەگەر پیاوەکە قبوڵی‌کرد ئەوە پەیمانەکە نەبسترێ، بەڵام ئەگەر قبوڵی نەکرد ئەوە ئەدرێ بەقازی بۆ هەڵوەشاندنەوەی،

بەڵام ئەگەر سەرپەرشتی‌کەری میراتگری نەبوو وەك ئەوەی هەر وەلی نەبێت، یا وەلی هەبێت و میراتگر نەبێت، ئەوە کەس بۆی نیە ڕێ لەپەیمانەکەی بگرێ. خۆی لە هاوتای خۆی مارە کردبێ یان نا، بەمارەیی عادەتی، یا مارەیی کەمتر لە عادەتی، چونکە لەم حاڵەدا کاری خۆی لەسەرشانی خۆیەتی، وەلە مافی تەواوی خۆیدا تەسەڕوفی کردووە، وە سەرپەرشتی‌کەرێکی نیە کە ئەگەر خۆی لە هاوتای خۆی مارە نەکردبێ تووشی ئەنگی ببێت، وە مارەیی‌یە عادەتی‌یەکەی نامێنی بەواز هێنانی لێ‌ی.

وە جەماوەری حەنەفی‌یەکانیش بەڵگەیان بەمانەی خوارەوە هێناوەتەوە:-

١- فەرموودەی خوای گەورە كە ئەفەرمووێ: ﴿فَإِنْ طَلَّقَهَا فَلا تَحِلُّ لَهُ مِنْ بَعْدُ حَتَّى تَنْكِحَ زَوْجاً غَيْرَهُ﴾ (البقرة:٢٣٠)

واتە: وە ئەگەر پیاوەكە تەڵاقی سێیەمیدا ئیتر حەڵاڵ نییە بۆی هەتا ئەو ژنە شونەكات بە پیاوێكی تر.

وە فەرموودەی خوای گەورە كەفەرموویەتی: ﴿وَإِذَا طَلَّقْتُمُ النِّسَاءَ فَبَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ فَلا تَعْضُلُوهُنَّ أَنْ يَنْكِحْنَ أَزْوَاجَهُنَّ﴾ (البقرة:٢٣٢) واتە: ئەگەر ئافرەتانتان تەڵاقدا نەك تەڵاقی سێهەم وە عیددەكەیان كۆتایی هات و هێشتا نەتان گێڕابونەوە، ئەوە ڕێیان لێ مەگرن لە گەڕانەوە بۆ لای مێردەكانیان. ئەوەتا لەم دوو ئایەتەدا شوكردنو گەڕانەوە دراوەتە پاڵ ئافرەتەكە، وە ئەصڵی درانە پاڵیش بۆ بكەری ڕاستییە (واتە ئەو كەسەی بەڕاستی كارەكە دەكات).

٣- پاشان ئافرەت بۆی هەیە پەیمانی كڕین و فرۆشتن و شتیتر ببەستێ لەبەر ئەوە مافیشی هەیە پەیمانی ژن و مێردایەتی ببەستێ، چونكە جیاوازی نییە لە نێوان پەیمانێك و پەیمانێكی تردا. وە پەیمانی ژن و مێردایەتی هەرچەندە سەرپەرشتیكەر مافی تێدا هەیە بەڵام مافی ئەو بەتاڵ ناكاتەوە.

وە مافی ئەو سەرپەرشتی كەرە لە كاتێكدا كاری پێ ئەكرێ كە ئەوئافرەتە بە خراپی مافەكەی بەجێ هێنابێت، وەك ئەوەی شوو بەكەسێك بكات هاوتای خۆی نەبێت، چونكە خراپی كارەكەی ئەنگ و عار ئەگەیەنێت بەسەرپەرشتیكەرەكەی،

وە ووتوویانە: مەرجی بوونی سەرپەرشتیكەر لەحەدیسەكاندا بۆ كەسانێك دانراوە كە كەم توانابن وەك ئەوەی بچووك یا شێت بێت،

وە تایبەت كردنی عام و بەستنەوەی بەچەند كەسانێكەوە بە قیاس دروستە لای بەشی زۆر لەزانایانی (أصول).

**پێویستی ئیزن وەرگرتن كردن لە ئافرەت پێش مارە كردن:**

هەرچی جیاوازی هەبێت لە نێوان زانایاندا لە بارەی سەرپەرشتیكردنی ئافرەت، بەڕاستی پێویستە لەسەر لەسەرپەرشتیكەر ئەبێ لە پێشەوە ڕای ئافرەتەكە وەربگرێ، وە ئەبێ ڕەزامەندی ئافرەتەكە بزانێ پێش (عقد) پەیمان بەستن. چونكە ژن ومێردایەتی تێكەڵ بوونێكی هەمیشەییە، وەهاوبەشییە لەنێوان ژنو مێردا، وە خۆشەویستیو یەكگرتن و ویستن بەردەوام نابێت هەتا نەزانرێ ئافرەتەكە ڕازییە یان نا؛ هەر بۆیە یاسای ئیسلام ڕێ نادات زۆر لە ئافرەت بكرێ -كچ بێت یا بێوەژن- بۆ شووكردن، وە زۆری لێ بكرێ بۆ كەسێك كە خۆی حەزی پێ نەكات، وە ئەو پەیمانەی

بەبێ پرسی ئەو بسترابێت بە پوچەڵیان داناوە، وە مافی هەیە کە داوا بکات ئەو پەیمانە هەڵوەشێتەوە بۆ پوچەڵکردنەوە کارەکانی سەرپەرشتی کەری زۆردار ئەگەر ئەو سەرپەرشتیکەرە مارەی کردبێت:

١-لە ئیبنو عەبباسەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (الثيب أحق بنفسها من وليها. والبكر تستأذن في نفسها وإذنها صُماتها)رواه الجماعة الا البخاري[١].

واتە: بێوەژن بۆ خۆی لە پێشترە[٢] لە سەرپەرشتیکەرەکەی. وە کچیش ئەبێ پرسی پێ بکرێت، وە بێدەنگ بوونی نیشانەی ڕازی بوونە.

وە لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە لای ئەحمەد و مسلیم و ئەبوو داود و نەسائی: (البكر يستأمرها أبوها) واتە: باوکی کچ داوای ڕێ پێدانی لێ ئەکات پێش ئەوەی پەیمانەکەی ببەستێ.

٢-وە لە ئەبی هورەیرەوە خوای لێ ڕازی بێت کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (لاتنكح الأيِّمُ حتى تُستَأمَر، ولا البكر حتى تستأذن. قالوا يارسول الله: كيف إذنها؟ قال: أن تسكت)[٣].

واتە: بێوە ژن نادرێ بەشوو هەتا ڕای وەرنەگیرێ، وە کچ نادرێ بە شوو هەتا پرسی پێنەکرێ ووتیان: ئەی نێرراوی خوا چۆن بزانین ڕازییە؟ فەرمووی: بێ دەنگ بوون ڕازی بوونە.

٣-لە خەنسای کچی خیدامەوە (کە باوکی داوێتی بە شوو بە بێوە ژنی، ئەویش هاتە لای پێغەمبەر ﷺ نیکاحەکەی ڕەت کردەوە) جەماعەت بێجگە لە موسلیم تەخریجیان کردووە[٤].

٤- وە لە ئیبنوعەبباسەوە: کە کچێك هاتە لای پێغەمبەر ﷺ ووتی: باوکم بەزۆر داومی بەشوو، پێغەمبەر ﷺ ئارەزووی دایە دەستی. ئەحمەد و ئەبور داود و ئیبنو ماجە و دارەقوطنی گێڕاویانەتەوە[٥].

---

(١) أحمد (١/٢١٩) ومسلم (١٤٢١/٦٦-٦٨) وأبو داود (٢٠٩٨-٢٠٩٩) والترمذي (١١٠٨) والنسائي (٦/٨٤-٨٥) وإبن ماجة (١٨٧٠).

(٢) واتە لەوەلی لەپێشترە بە خۆی لەوەدا کە نابێت مارە بکرێت تاوەك و ڕازی نەبێت، نەك ئەوەی کە خۆی مارە بکات بێجگە لە وەلی.

(٣) البخاري (٥١٣٦) ومسلم (١٤١٩).

(٤) أحمد (٦/٣٢٨) والبخاري (٥١٣٨) وأبو داود (٢١٠١) والترمذي (١١٠٨) والنسائي (٦/٨٦).

(٥) أحمد (١/٢٧٣) وأبو داود (٢٠٩٦) وابن ماجة (١٨٧٥) والدارقطني (٣/٢٣٥).

٥-له عبدوللای كوڕی بوڕەیدەوە له باوكیەوە كەفەرموویەتی: (كچێك هاتە لای پێغەمبەر ﷺ ووتی: باوكم داومی بە برازاكەی بۆ ئەوەی بەمن خۆی بەرز بكاتەوە، ئەڵێ: پێغەمبەر ﷺ ئارەزووی خۆیدایە دەستی خۆی. ئینجا كچەكە ووتی: ئەوەی باوكم كردوویەتی ڕێم پێدا، بەڵام ویستم ژنان تێ بگەیەنم باوكان لەم كارەدا هیچیان بەدەست نیە. ئیبنوماجە گێڕاویەتیەوە وە پیاوەكانی پیاوی صەحیحن[1].

**بەشوودانی ئافرەتی منداڵ :**

ئەوە بەگوێرەی ئافرەتی گەورە بوو، بەڵام ئافرەتی منداڵ دروستە باوك و باپیرە بیدەن بە شوو بێ پرسی خۆی، چونكە ڕایان نیە و باوك و باپیرە ئاگایان له مافەكانیەتی و ئەیپارێزن. ئەبوبەكر خوا لێی ڕازی بێت عائیشەی دایكی موسڵمانانیدا بە پێغەمبەر ﷺ كە تەمەنی منداڵ بوو بێ ئەوەی پرسی پێ بكات، چونكە له تەمەنێكی وادا نەبوو ئیعتبار بۆ ئیزن و ڕای ئەو بكرێ، وەكاتێ گەورەش بوو ئیتر ڕێگای هەڵوەشاندنەوەی بۆ نیە، وە شافیعیەكان بە پەسەندیان داناوە، كە باوك و باپیرەش كچی منداڵ بەشوو نەدەن تا گەورە ئەبێ و باڵق ئەبێ و ئیزنی لێ ئەخوازن، بۆ ئەوەی نەكەویتە ناو بەندی شوكردن و ژن و مێردایەتیەوە له حاڵێكا پێی خۆش نەبێ.

وە جەماوەر بۆ ئەوە چوون كە باوك و باپیرە نەبێت لەسەر پەرشتیكەران كەسی تر بۆی نیە ئافرەتی منداڵ مارە بكات، ئەگەر كردیشی دروست نیە،

ئەبو حەنیفە و ئەوزاعی و كۆمەڵێك له زانایانی پێشین ووتوویانە: دروستە بۆ هەموو سەرپەرشتیكەران و پەیمانەكەش دروست ئەبێت، وە كە گەورە بوو ئارەزووی ئەدرێتە دەستی خۆی، وە ئەمەش ڕاستترین بۆچوونە؛ بە پێی ئەوەی كە پێغەمبەر ﷺ ئومامەی كچی حەمزەی دابەشوو بە منداڵی وە كاتێ گەورە بوو ئارەزووی هەڵوەشاندنەوەی بێت[2].

وە پێغەمبەر ﷺ بۆیە دابووی بەشوو لەبەر ئەوەی خزمی نزیكی بوو، وە سەرپەرشتی كەریشی بوو، وە بەو شێوەیە نەی دابوو بەشوو لەبەر ئەوەی كە پێغەمبەرە، چونكە ئەگەر بەو شێوەیە بیدایە بەشوو مافی هەڵ وەشاندنەوەی نەئەبوو كاتێ گەورە بوو، بە پێی فەرموودەی خوای گەورە كەئەفەرمووێ: ﴿وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلَا مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَمْراً أَنْ يَكُونَ لَهُمُ الْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ﴾ (الأحزاب:٣٦)

---

(١) أحمد (٦/١٣٦) والنسائي (٦/٨٧) وابن ماجة (١٨٧٤).

(٢) أبوداود (٢١٢٠).

واتە: بۆ هیچ موسڵمانێکی ژن‌و پیاو نی‌یە کە خواو پێغەمبەر ﷺ فەرمانێکیان پێ دان ئارەزویان لەو کاردا هەبێ.

ئەم بۆ چوونەش عومەرو عەلی‌و عەبدوڵلای کوڕی مەسعودو ئیبنو عومەرو ئەبو هورەیرە لە صەحابە خوایان لێ ڕازی بێت لەسەری بوون.

سەرپەرشتی‌کەری بە زۆر:

سەرپەرشتی کردنی بە زۆر چەسپاوە بۆ ئەو کەسانەی توانای شتیان نەبێت وەك شێت و منداڵی بێ تەمیز، هەروەها چەسپاوە بۆ کەسانێك ناتەواون وەك منداڵ‌و کەم عەقڵی جیاکەرەوە. وە مانای چەسپانی سەرپەرشتی کەری بەزۆر؛ ئەوەیە کە ئەو سەرپەرشتی کەرە بۆی هەیە پەیمانی ژن‌و مێردایەتی ببەستێ بۆ ئەو کەسانەی سەرپەرشتیان ئەکات بێ ئەوەی پرسیاریان لێ بکات. وە ئەو پەیمانەش بەجێ دێت بێ ئەوەی بوەستێ لەسەر ڕەزامەندی سەرپەرشتی کراو (واتە: ئەگەر پیاو بوو ئەتوانێ ژنی بۆ بهێنێ و ئەگەر ئافرەت بوو بیدات بەشوو).

وە یاسا دانەری ئیسلام ئەم جۆرە سەرپەرشتی‌یەی لەبەر بەرژەوەندی سەرپەرشتی‌کراو داناوە، چونکە ئەوکەسەی بێ‌توانا بوو، یا ناتەواو بوو ناتوانێ بڕوانێ چی بەرژەوەندی‌یەتی، وە ئەوەندە توانای تێ‌فکرینی نی‌یە کە هەست بە بەرژەوەندی ئەو پەیمانانە بکات کە ئەی بەستێ،

وە هەروەها لەبەر ئەو ڕەفتارانەی کە ئەیکات لەبەر منداڵی یا شێتی یا بێ‌عەقڵی، هەربۆیە کاروباری ئەمانە ئەگەڕێتەوە لای سەرپەرشتی کەریان،

بەڵام مرۆڤی بێ‌تواناو بێ‌ئەهلیەت واتە: ناشایستە ئەگەر پەیمانی نیکاحی بەست ئەو پەیمانە بەتاڵە، چونکە عیبارەتەکانی بۆ پەیمان بەستن ئیعتیباری نی‌یە، لەبەر نەبوونی تەمییز کە بنەڕەتی ئەهلیەتە.

بەڵام کەم ئەهلیەت ئەگەر پەیمانی نیکاحی بەست پەیمانەکە دروستە، هەرکاتێ مەرجە پێویستەکان بێتەدی، بەڵام ئەوەستێ لەسەر پرس و ڕای سەرپەرشتی کەر، ئارەزوی خۆیەتی یان ڕێی پێ ئەدا یان ڕەتی ئەکاتەوە.

حەنەفی‌یەکان وتوویانە: ئەم جۆرە سەرپەرشتی‌یە بۆ کەس‌و کاری نزیك چەسپاوە لەسەر منداڵ و شێت‌و کەم ئاوەز

بەڵام جگە لەحەنەفی‌یەکان منداڵ‌و شێت‌و کەم ئاوەزویان لەیەك جیاکردۆتەوە، وە لەسەر ئەوە ڕێك کەوتون کە باوك‌و باپیرەو وەصی و حاکم چەسپاوە بۆیان ببنە سەرپەرشتی کەری شێت‌و کەم

ئاوەز. وە جیاوازیان هەیە لەوەدا کە سەرپەرشتی کردنی منداڵی کوڕو کچ بۆ کێ چەسپاوە، ئیمامی مالیك و ئەحمد فەرموویانە: بۆ باوك و وەصی ئەبێ بەتەنها، و بۆ کەسی تر نەچەسپاوە، بەڵام شافیعی بۆ ئەوە چووە کە: بۆ باوك و باپیرەش چەسپاوە.

**سەرپەرشتیکەران کێن:**

جەماوەری زانایان لەوانە مالیك و (ثوري) و (الیث) و شافیعی بۆ ئەوە چوون کە سەرپەرشتی کەران لە بەشوودانو ژنهێناندا ئەبێ پشتبن، وە خاڵ و برا لە دایکەوە و کوڕی دایك و خزمان لە دایکەوە بۆیان نییە سەرپەرشتی کەربن لەو کارەدا،

شافیعی فەرموویەتی: بەعیبارەت و قسەی سەرپەرشتیکەری نزیکی ئافرەت نەبێت مارەیی نایەت، جا ئەگەر وەلی نزیك نەبوو بە عیبارەو قسەی سەرپەرشتیکەری دوور، ئەگەر ئەوەش نەبوو بە عیبارەتی سوڵتان[1].

جا ئەگەر بە ئیزنی وەلی یا بێ ئیزنی وەلی خۆی مارەکرد مارەیی نایەت و بەتاڵە، ئیتر لە سەر ئیزنی وەلی ڕاناوەستێنری، وە لای ئەبووحەنیفە جگە لە خزمی نزیکیش ئەتوانن سەرپەرشتی بەشودان بکەن.

خاوەنی (الروضة الندیة) لێکۆڵینەوەیەکی هەیە لەم بابەتەدا ئەڵێت: ئەوەی لای من پێویستە بووترێ ئەوەیە کە: (سەرپەرشتیکەر خزمانی ئافرەتەکەن لە نزیکەوە بۆ دوور، ئەوانەی کە تووشی نەنگیو عەیبەو عار دەبن بەشووکردنی ئافرەتەکە بەکەسێك هاوتای خۆی نەبێت، کاتێك کەسێکیتر دابێتی بەشوو).

وە ئەم واتایە تایبەت نییە بە خزمانی پشتییەوە، بەڵکو لە خزمانی تریشدا ئەوە هەیە لەوانەی خاوەن بەش بن لەمیراتدا وەك برا لە دایکەوە. وەخزمان لەڕەحمەوە: وەك کوڕی کچ،

وە لەوانەیە ئەمانە زۆرتر تووشی نەنگی بێن لە کوڕی مام و ئەو جۆرانە، کەواتە هیچ ڕوویەك نییە بۆ تایبەت کردنی سەرپەرشتی کەری نیکاح بە خزمی پشتییەوە، وەك چۆن هیچ ڕوویەك نییە بۆ تایبەت کردنی بەوانە کە میراتی ئەبەن،

---

(١) واتە لای ئەو بەم شێوەیە ئەبێ (باوك پاش ئەو باوکی باوك، برای باوك و دایکی، برای لە باوکەوە، لە پاش ئەوان کوڕی برای باوکی و دایکی لەپاش ئەو کوڕی برا، لەپاشان مام، پاشان کوڕی مام. ئەگەر ئەمانە نەبوون حاکم) کەواتە هەتا یەکێکی نزیکتر هەبێت بە یەکێکی دوورتر بەشو نادرێت. چونکە ئەو مافە بە هۆی خزمایەتییەوەیە" وە وەك میرات وایە جا ئەگەر بەو تەرتیبە مارە نەبڕا مارەیی نایەت)

جا هەرکەس وەها بلێ ئەبێ بەڵگە بێنێت یا نەقڵێك بێنێت، کەمانای سەرپەرشتی کەر لە نیکاحدا لە شەرعا یا لە لۆغەتا ئەوەیە.

وە ووتوویەتی: گومان نی‌یە کە هەندێ خزمایەتی لە پێش ترە لە هەندێك... وە ئەم لە پێش بوونەش بەپێی بەرکەوتنی لە ماڵ و میرات و بە پێی تەسەروفی لەو ماڵەدا نییە، هەتا وەکو میراتی لێ بێ، یان وەك سەرپەرشتی‌کەری کەسێکی تری لێ‌بێ، بەڵکو بە پێی فەرمانێکی ترە، ئەویش ئەوەیە کە خزم بەری ئەکەوێ لەوننگی‌یەی بەهۆی ئەوەوە پێوەی ئەلکێ ئەمەش بە خزمانی پشتەوە تایبەت نی‌یە، بەڵکو لە خزمانی تریشدا ئەوە هەیە، وە بێگومان هەندێ لە خزمان زیاتر لەو بارەیەوە چووە ناو ترن و نزیکترن لە هەندێکیان، باوکان وکوڕان لە پێشترن لەوانی‌تر، لەپاش ئەوان برایانی باوك و دایکی، لە پاشاندا برای باوکی، یا برایانی دایکی، لەپاشاندا کوڕانی کوڕ و کوڕی کچ، لە پاشاندا کوڕانی براو کوڕانی خوشك، لەپاشاندا مام و خاڵ، لەپاشاندا بەو پێیە لەدوای ئەوانەوە چی هات.

وە هەرکەس پێی وایە ئەم مافی سەرپەرشتی کردنە تایبەتە بەهەندێکیانەوە بێجگە لە هەندێکی‌تر، ئەبێ بەڵگە بهێنێ، وە ئەگەر هیچی بەدەستەوە نەبوو قسەی ڕووت نەبێت کەلەکەسی پێشتری وەری گرتبێ، ئەوە ئێمە لەوانە نین کەلەسەر ئەوە بڕۆین و پشتی پێ ببەستین) تەواو بوو ووتەی خاوەنی (روضة الندية).

**دروستە سەرپەرشتیار سەرپەرشت کراوەکەی مارە بکات:**

دروستە پیاو ئەو ئافرەتە مارە بکات کە خۆی سەرپەرشتی کەرێتی بێ ئەوەی پێویستی بەوەلی‌تر هەبێت، ئەگەر ئافرەتەکە ڕازی بێت پێی. لەسەعیدی کوڕی خالیدەوە لە ئوم و حەکیمی کچی (قارظ)ەوە: بە عبدالرحمن ی کوڕی عەوفی ووتوە چەند کەس داوام ئەکەن، هەرکامیان ڕات لە سەرێتی مارەم بکە لێی ئەویش ووتی: ئایا ئەی دەیتە دەستی من؟ ئەویش ووتی بەڵێ: ووتی: ئەوە مارەم کردی بۆ خۆم.

مالیك فەرموویەتی: ئەگەر بێوە ژنێك بەسەرپەرشتی کەرەکەی بڵێت: مارەم بکە بەو کەسەی خۆت ڕات لێیەتی ئەویش لە خۆی مارە بکات، یا کەسێکی تری بۆ هەڵبژێری، ئەوە دەسەپێ بەسەریا، با کەسەکەش نەناسێ. ئەمەش مەزهەبی حەنەفی‌یەکان و (لیث) و (ثەوری) و ئەوزاعی‌یە.

شافیعی و داود فەرموویانە: سوڵتان یا سەرپەرشتی‌کەرێکی‌تر وەکو خۆی، یا لەو دوورتر لە سەرپەرشتی‌کەری یەکەمی مارە بکات، چونکە بوونی سەرپەرشتی کەر لە پەیماندا مەرجە، کەواتە

نابێت ئەو کەسەی مارەی دەکات لە کەسێکی تر مارەکەری بێت لە خۆی. وەك ئەوەی کە نابێت شت بەخۆی بفرۆشێ. ئیبنو حەزم لە ڕای شافیعی و داود ئەکۆڵێتەوە و ئەڵێت: ئەوەی کە ئەڵێن: نابێت مارەکەر مارەکەر بێ لە خۆی، لەوەدا ئێمە مونازەعەیان لەگەڵدا ئەکەین، بەڵکو دروستە کە ئەو کەسەی مارە دەکات مارەکەر بێ لە خۆی. جا ئەو دەعوایەی من وەك دەعوای ئەوانە، وە ئەوەی کە ئەڵێن: دروست نی‌یە شت بەخۆی بفرۆشێ، ئەم ڕستەیە ڕاست نی‌یە وەك خۆیان باسیان کردووە، بەڵکو دروستە ئەگەر کەسێك کرایە وەکیل بۆ فرۆشتنی شتێك دروستە ئەو کەسە بەخۆی بفرۆشێ، ئەگەر خۆی هەڵنەبژێرێت بە شتێك، لەپاشاندا بەڵگە ئەهێنێتەوە لەسەر ڕاستێتی ئەوەی کە هەڵی بژاردووە بەوەی کە بوخاری ئەگێڕێتەوە لە ئەنەسەوە : کە پێغەمبەر ﷺ صەفی‌یەی ئازاد کردوو هێنای وە ئازاد کردنەکەی لە جیاتی مارەیی بوو، وە بەخورما و ڕۆن ئاهەنگی بۆگێڕا[1].

ئیبنوحەزم دەڵێ: ئەوە پێغەمبەرە ﷺ کە نیزەکەکەی خۆی دووای ئەوەی ئازادی کرد لە خۆی مارەی بڕی، ئەویش حوججەیە بەسەر خەڵکی ترەوە، لەپاشان ووتوویەتی: خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَأَنْكِحُوا الْأَيَامَى مِنْكُمْ وَالصَّالِحِينَ مِنْ عِبَادِكُمْ وَإِمَائِكُمْ إِنْ يَكُونُوا فُقَرَاءَ يُغْنِهِمُ اللَّهُ مِنْ فَضْلِهِ وَاللَّهُ وَاسِعٌ عَلِيمٌ﴾ (النور:٣٢)

واتە: زەواج بکەن بە کوڕو کچە ئازادەکانتان، هەروەها بە بەندەو کەنیزەکە باشەکانیشتان ئەگەر ئەو کەسانەی زەواج ئەکەن لەبەر پاکی‌یەتی بیکەن، خوا بێ‌نیازیان ئەکا لە ڕزقی فراوانی، وە خوا خێری زۆرەو زانایە بە حاڵی بەندەکانی.

جا هەرکەس بێوەژنێکی لە خۆی مارە بڕی بەرەزامەندی خۆی ئەوە فەرمانی خوای بەجێ هێناوە، وە خوای گەورە قەدەغەی نەکردووە کە بەشودەری بێوەژنێك خۆی مارەی بکات، کەواتە ئەم قسەیە پێویستە.

**نادیاری سەرپەرشتیار:**

ئەگەر سەرپەرشتی کەری نزیك کە هەموو مەرجێکی سەرپەرشتی کەرێتی تێدا بوو ئامادە بوو ئیتر بۆ سەرپەرشتی‌کەری دوورتر لەخۆی دروست نی‌یە سەرپەرشتی بکات، بۆ نموونە ئەگەر باوك ئامادە بوو برا بۆی نی‌یە سەرپەرشتی بە شوودانی بکات، وە هەروەها مام و هەرکەسی‌تر، جا ئەگەر یەکێ لەمانە منداڵێك یا کەسێك کە حوکمی منداڵی هەبێت مارەی بڕی بەبێ ڕێ‌پێدانی باوکەکە یان کردنی بەوەکیل، ئەوە خۆی هەڵقورتاندووە، وە عەقدەکە ئەوەستێ لە سەر ڕای ئەو کەسەی کە سەرپەرشتی‌کەرە، کە ئەویش باوکە،

(١) البخاري (٥٠٨٦و٥١٦٩) ومسلم (١٣٦٥/٨٤).

بەڵام ئەگەر ئەو وەلی‌یە نزیکە دیار نەبوو بە شێوەیەك کە خوازبێنی‌کەری ئافرەتەکە هاوشانیەتی و ڕاناوەستێ تا سەرپەرشتی‌کەرە نزیکەکە دێتەوە، ئەوە سەرپەرشتی ئەدرێت بەکەسێك کە لەدووای ئەوەوەیە، بۆ ئەوەی ئەو بەرژەوەندی‌یە لە دەست نەچێت، وە بۆ سەرپەرشتی کەری دیار نەبوو نی‌یە کە ڕێگری بکات کە گەڕایەوە، چونکە ئەو دیار نەبوونەی وەك نەبوون وەهایە، ئیتر مافی ئەوەی دوایی‌یە ببێ بەسەرپەرشتی‌کەری، ئەمەش مەزهەبی حەنەفی‌یەکانە.

وە شافیعی فەرمووبەتی: ئەگەر کەسێك لەسەرپەرشتی کەرانی دوور ئافرەتەکەی دا بەشوو وە نزیکەکەش ئامادە بوو- ئەوە مارەیی نایەت، وە ئەگەر نزیك ترین سەرپەرشتی‌کەری دیار نەبوو هیچ کام لەوانەی دووای ئەون بۆیان نی‌یە مارەی ببڕن؛ بەڵکو ئەبێ قازی مارەی ببڕێت.

وەلە (بداية المجتهد) ووتوویەتی : قسەی مالیك لەوەدا جیاوازی هەیە جارێك ووتوویەتی: ئەگەر دوورەکە مارەی‌بڕی ونزیکەکەش ئامادە بوو ئەو مارە بڕینە هەڵئەوەشێتەوە، وە جارێکی تر ووتوویەتی: دروستە. وە جارێکی تر ووتوویەتی: بۆ نزیکەکە هەیە هەڵی بوەشێنێتەوە یا ڕێی پێ‌بدات.

ووتوویەتی: ئەم جیاوازیانە هەموو دەربارەی ئەو کەسانەن کە باوکی کچ نین، یا وەصی (مجورة)[1] نین، ئەگینا جیاوازی لەم قسەیەدا نی‌یە کە ئەڵێت: (نیکاحی ئەم دوو حاڵەتە هەڵوەشاوەیە) مەبەستم بەشوودانی کچ لەلایەن کەسێکەوە جگە لە باوك لەگەڵ ئەوەشدا باوك ئامادەبێ، یان بەشوودانی (مجورة) لە لایەن کەسێکی‌تر جگە لەوەصی‌یەکە لەگەڵ ئامادە بوونی وەصی‌یەکە. وە ئیمامی مالیك لەگەڵ ئەبی حەنیفەدا لەسەر ئەوە ڕێکن کە ئەبێ سەرپەرشتی‌یەکە بدرێت بەکەسیکی دوور، لە کاتێکدا سەرپەرشتیاری نزیك ئامادە نەبێت.

وەلی نزیکی بەندکراو وەك دوورە:

لە کتێبی (المغني) دا هاتووە: ئەگەر وەلی‌یە نزیکەکە بەندکراوبوو یادیل بوو لە شوێنێکی نزیکیشدا بوو بەڵام نەتوانرێ سەری لێ بدرێ، ئەوە وەك دوور وەهایە، چونکە دووری‌یەکە خۆی بۆ خۆی ئیعتباری بۆ ناکرێ، بەڵکو لەبەر ئەوەیە بەشودانەکە لەژێر چاودێری ئەودا ناکرێ. وە ئەوەش لێرەدا هەیە، لەبەر ئەوە ئەگەر نەزانرا نزیکە یا دوور یازانرا نزیکە بەڵام شوێنەکەی نەزانرا وەك دوور وەهایە.

---

(١) مجور واتە: ئەو ئافرەتەی حیجری لەسەر دانرابێ لە لایەن قاچی‌یەوە لەبەر کەم عەقڵی.

**پەیمان بەستن لەلایەن دوو سەرپەرشتیارەوە:**

ئەگەر دوو وەلی ئافرەتێکیان دابەشوو، یا هەردوکیان لەیەك کاتدا ئەبن، یا یەکێکیان پێش ئەوی تریان ئەبێت. جا ئەگەر هەردوکیان لەیەك کاتدابن ئەوە هەردوو مارەکردنەکە باتلە. وە ئەگەر لە دووای یەکدا بن ئەوە مارە کردنەکە بۆ یەکەمیانە، جا پیاوی دووەم چوبێتە لای یا نەچوبێت. وە ئەگەر چوبێتە لای و زانیبێتی پێش خۆی مارە کراوە لە کەسێکی تر. ئەوە زینای کردووەو شایستەی حەد ئەبێت. بەڵام ئەگەر پێی نەزانیبوو، ئەبێ بیگێڕنەوە بۆ پیاوی یەکەم، وە تۆڵەی لێ ناسەندرێ لەبەر ئەوەی پێی نەزانیبو

لە سەمورەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (أيما امرأة زوَّجَها وَلِيَّان فهي للأول منهما) رواه أحمد، وأصحاب السنن، وصححه الترمذي[1].

واتە: هەر ئافرەتێك دوو سەپەرشتیکەر دایان بەشوو بۆ یەکەم پیاویان ئەبێت.

گشتیەتی ئەم حەدیسە وا پێویست ئەکات کە بۆ یەکەمیان ئەبێت، دووەمیان چوبێتە لای، یا نەچوبێت یەکسانە.

**ئەو ئافرەتەی سەرپەرشتیاری نەبێت و نەتوانێ بگاتە لای قازی**

(قرطبي) ووتویەتی: ئەگەر ئافرەتێك لە شوێنێکدا بوو سوڵتانی لێ نەبوو، وە سەرپەرشتی نەبوو، ئەوکاتە سەرپەرشتی‌یەکەی ئەدرێت بەو کەسەی کە باوەڕی پێ ئەکرێت لە دەرو دراوسێ و ئەیدات بەشوو، وە لەو حاڵەتەدا ئەو کەسە ئەبێ بە سەرپەرشتیاری؛ لەبەر ئەوەی خەڵك هەر ئەبێ زەواج بکەن، وە ئەوەش ئەبێ بە جوانترین شێوە بەجێ بهێنن.

وە لەسەر ئەوە مالیك دەربارەی ژنی بێ‌کەس ووتویەتی: ئەوکەسە مارەی ئەبڕێ کە ئافرەتەکە خۆی کارەکانی پێ ئەسپێرێ، چونکە ئەو ئافرەتە لەو کەسانەیە کە دەستی ناگاتە سوڵتان، لەم حاڵەتەدا لەوانە ئەچێت کە سوڵتان لە شوێنەکەیدا نەبێت. بە گشتی موسڵمانان سەرپەرشتیاری ئەوانەن کە کەسیان نی‌یە.

وە شافیعی ووتویەتی: ئەگەر ئافرەتێك لە سەفەرێکدا سەرپەرشتیاری نەبوو، ئەگەر خۆ بداتە دەستی پیاوێك کە بیدات بە شوو دروستە، چونکە ئەم شێوەیە وەك ناوبژی‌کەری لێ دێ، وە ئەو کەسەش جێی حاکم ئەگرێتەوە.

---

(١) أحمد (٥/٨) وأبوداود (٢٠٨٨) والترمذي (١١٠) والنسائي (٧/٣١٤) وابن ماجة (٢١٩٠).

**ڕێ نەدانی سەرپەرشتیار:**

زانایان لەسەر ئەوە ڕێك کەتون کە بۆ سەرپەرشتیار نی‌یە ڕێگا بگرێ لەو کەسەی سەرپەرشتی ئەکا، وە ستەمی لێ بکات بەوەی کە ڕێگر بێ لەوەی کە شوو بکات، کاتێك کەسێکی هاوتای خۆی داوای کرد بە مارەیی عادەتی، جا ئەگەر ڕێی لێ گرت لەم حاڵەتەدا ئەو ئافرەتە مافی ئەوەی هەیە کە کارەکە بەرز بکاتەوە بۆ قازی کە بیدات بەشوو, وە سەرپەرشتی ناگوێزرێتەوە لەم حاڵەتەدا بۆ کەسێکی تر کە لە دووای ئەو وەلی‌یە ستەمکارەوەیە، بەڵکو ڕاستەوخۆ ئەچێتە لای قازی.

بەڵام ئەگەر ڕێ گرتنەکەی لەبەر هۆیەکی مەقبوڵ بوو، وەك ئەوەی پیاوەکە هاوتای نەبوو، یا مارەیی‌یەکەی لە عادەتی کەمتر بوو، یا داواکەرێکی تر هەبوو لەوچاکتر، لەم کاتەدا سەرپەرشتی‌یەکەی ناگوێزرێتەوە بۆ قازی، چونکە بە ڕێ لێگر ناژمێررێ.

لە مەعقیلی کوڕی یەسارەوە کە فەرمویەتی: خوشکێکم هەبوو خەڵك ئەهاتن بۆ دوای بۆ لام، ئامۆزایەکم داوای لێ کردم و لێم مارەکرد، لە پاشاندا بە ڕەجعی تەڵاقی‌داو وازی لێ هێنا هەتا عیددەکەی بەسەر چوو، کاتێ خەڵك بۆ داوای هاتەوە داوای کردەوە. منیش ووتم سویند بەخوا نات دەمەوە, ئەڵێ: ئەم ئایەتە لەسەر من هاتە خوارەوە کە ئەفەرموێ: ﴿وَإِذَا طَلَّقْتُمُ النِّسَاءَ فَبَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ فَلا تَعْضُلُوهُنَّ أَنْ يَنْكِحْنَ أَزْوَاجَهُنَّ﴾ (البقرة: من الآية٢٣٢) واتە: کاتێك ژنەکانتان تەڵاقدا بە تەڵاقی رجعی وە عیددەیان تەواو بوو، ڕێگەیان لێ مەگرن و مەنعیان مەکەن لەوە کە شوو بکەنەوە بە مێردەکانیان.ئەڵێ: کەفارەتی سوێندەکەم داو لێم مارە کردەوە[1].

**مارەکردنی کچی هەتیو**

دروستە کچە هەتیو مارە بکرێ پێش باڵق بوونی، سەرپەرشتیارانی, سەرپەرشتی بەستنی پەیمانەکە ئەکەن، وە دوای گەورەبوونی ئارەزووی ئەدرێتە دەست، ئەمەش مەزهەبی عائیشە و ڕەزای خوای لێ بێت ئەحمەد و ئەبی حەنیفەیە.

خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿وَيَسْتَفْتُونَكَ فِي النِّسَاءِ قُلِ اللَّهُ يُفْتِيكُمْ فِيهِنَّ وَمَا يُتْلَى عَلَيْكُمْ فِي الْكِتَابِ فِي يَتَامَى النِّسَاءِ اللَّاتِي لا تُؤْتُونَهُنَّ مَا كُتِبَ لَهُنَّ وَتَرْغَبُونَ أَنْ تَنْكِحُوهُنَّ﴾ (النساء: من الآية١٢٧).

واتە: داوای ڕون کردنەوەت لێ ئەکەن دەربارەی ئافرەتان, بڵێ خوا ئەوەتان بۆ ڕون دەکاتەوە، وە ئەوەش کە لە کتێبی ئاسمانیدا بە سەر ئێوەدا دەخوێنرێتەوە لە بابەت کچانی هەتیو کە ئەوەی

(١) تەخریجی ئەم حەدیسە ڕابورد.

بۆیان فەرز کراوە لە مارەیی و میرات و مافەکانیتر پێیان نادەن، وە نەشتانەوێ بۆخۆتان مارەیان بکەن.

عائیشە فەرمویەتی: ئەوە کچە هەتیوەیە کە لەژێر سەرپەرشتی سەرپەرشتیاریدا دەبێت، جا ئەو سەرپەرشتیارەی پێی خۆشە مارەی بکات، لەگەڵ ئەوەشدا ئەو مارەییەی کە ئەیکەوێ بە تەواوی نایداتێ، جا لە مارە کردنیان نەهی کرا هەتاوەکو بە تەواوی مارەییەکەیان نەدرێت.

وە لە هەرچوار سونەنەکەدا هاتووە لە پێغەمبەرەوە ﷺ کە فەرمویەتی: (اليتيمة تستأمر في نفسها، فإن صمتت فهو إذنها وإن أبت فلا جواز عليها)[1].

واتە: کچی هەتیو پرسی پێ ئەکرێ کاتی بە شوودانی، جا ئەگەر بێ دەنگ بوو ئەوە ڕازی بونیەتی، بەڵام ئەگەر ڕازی نەبوو دروست نییە بدرێ بەشوو.

شافیعی ووتویەتی: دروست نییە کچە هەتیو مارە بکرێ هەتا بالغ نەبێت، بەپێی فەرمودەکەی پێغەمبەر ﷺ کە فەرمویەتی: (اليتيمة تستأمر)[2]. واتە: کچی هەتیو پرسی پێ ئەکرێ پرس پێکردنیش دووای گەورەبوون و باڵق بوون نەبێت نییە، چونکە پرس بە منداڵ کردن بێ سوودە.

**بەستنی پەیمانی ژنومێرد بەیەك کەس:**

ئەگەر تەنها کەسێك سەرپەرشتیاری پیاوەکەو ژنەکە بوو دروستە و بۆی هەیە سەرپەرشتی پەیمانەکە بکات، باپیرە بۆی هەیە کچی بچوکی کوڕەکەی بدات بە کوڕی بچوکی کوڕەکەی، وەك ئەوەی کە ئەگەر وەکیل بوبێت.

**سەرپەرشتی سوڵتان (قاضی):**

سەرپەرشتی ئەگوێزرێتەوە بۆ قازی لە دوو حاڵەتدا:

(یەکەم) ئەگەر سەرپەرشتیارەکانی ئافرەتەکە بوو بە ناکۆکیان.

(دووەم) ئەگەر سەرپەرشتیاری لەوێ نەبوو، ئەویش بە نەبوونی تەواوی یا بەدیار نەبوونی، جا کاتێ پیاوێکی هاوتا ئامادە بوو، ژنەکەش ڕازی بوو وە هیچ یەك لە سەرپەرشتیارەکانیش ئامادە نەبوون وەك ئەوەی غائب بوون یا لە شوێنێکی نزیکیش بێت، وە ئەگەر لە دەرەوەی شاری ئافرەتەکە بوو وە کەسێکیش ئەیویست ئەو ئافرەتە مارە بکات، قاضي لەم حاڵەتەدا مافی ئەوەی هەیە پەیمانەکە ببەستێ مەگەر ئافرەتەکەو پیاوەکە هەردوکیان ڕازی بن بە چاوەڕوان کردنی

(١) أحمد (٢/٢٥٩) وأبوداود (٢٠٩٣) والترمذي (١١٠٩) والنسائي (٦/٨٧) من حديث أبي هريرة.

(٢) أبوداود (٢٠٩٣) والترمذي (١١٠٩) والنسائي (٦/٨٥).

هاتنەوەی سەرپەرشتیارەکە، چونکە ئەوە مافی ئافرەتەکەیە ئەگەرچی درێژەش بکێشێ، بەلام ئەگەر ڕازی نەبوون هیچ ڕوویەك نییە چاوەڕوانی کردن پێویست بکات.

لە فەرموودەدا هاتووە: (ثلاث لا يؤخرن. وهنَّ: الصلاة إذا أتت، والجنازة إذا حضرت والأيِّم إذا وجدت كفؤاً) رواه البيهقي وغيره عن علي، وسنده ضعيف[1].

واتە: سێ شت دوا ناخرێن: نوێژ کە کاتی هات، تەرم کە ئامادەبوو، بێوەژن کە هاوتای پەیدا بوو داوای کرد.

وە لەم بارەیەوە فەرمودە زۆر هاتووە بەڵام هەموویان لاوازن، لە هەموویان چاکتر ئەوەیە ئەویش سەنەدەکەی لاوازە.

**وەکیل گرتن لە (زواج) ژن هێنانو شووکردندا**

وەکیل گرتن دروستە لە عەقدەکانا بە نێکڕا، لەبەر ئەوەی خەڵك زۆر پێویستی پێیەتی لە مامەڵەکانیاندا، زانایان لەسەر ئەوە ڕێك کەوتون کە هەموو ئەو پەیمانانەی دروستە مرۆڤ خۆی بیبەستێ دروستە بە وەکیلیش بکرێ. وەك کڕین و فرۆشتن و بەکرێ دان و مافی خەڵك دانەوەو ناکۆکی و بۆ وەرگرتنی ماف و ژن هێنانو بەشوودان و تەڵاق و ئەو کارانەی کە جێگر وەرئەگرێ. پێغەمبەر ﷺ بە دەوری وەکیل هەڵئەسا لە پەیمانی ژن هێناندا بۆ هەندێ لە صەحابەکان. ئەبو داود ئەگێڕێتەوە لە عوقبەی کوڕی عامیرەوە خوا لێی ڕازی بێت: کە پێغەمبەر ﷺ بە پیاوێکی فەرموو: ئایا ڕازی ئەبی فلانە ئافرەتت لێ مارە بکەم؟ ووتی: بەڵێ وە بە ئافرەتەکەشی ووت: ئایا ڕازی ئەبیت کە بتدەم بە فلانە پیاو؟ ووتی: بەڵێ: لە یەکی مارەکردنو گواستیەوە بێ ئەوەی مارەیی لەسەر فەرز بکات و هیچیشی نەدایە. وە لەوانە بوو کە لە حودەیبیەیە ئامادە بوو- هەرکەس حودەیبیەی بینی بێت بەشی هەبووە لە خەیبەردا-. کاتێ پیاوەکە لەسەرەمەرگدابوو ووتی: پێغەمبەر ﷺ فلانە ئافرەتی لێ مارە کردم هیچ مارەییم بۆ دانەناوە وهیچیشم نەداوەتێ، بە شاهید بن من بەشەکەی خۆمی لە خەیبەر ئەکەمە مارەیی، ژنەکە بەشەکەی وەرگرت و فرۆشتیەوە بە سەد هەزار[2].

ئەم حەدیسە ئەبێتە بەڵگەی ئەوەی کە دروستە کەسێ: وەکیلی هەردولابێت[3].

---

(١) الترمذي (١٠٧٥) وابن ماجه (١٤٨٦).

(٢) أبوداود (٢١١٧).

(٣) أبو داود (٢١١٧).

وه له ئومو حهبیبهوه: که ئهو لهو کهسانه بوو کۆچی کرد بۆ حهبهشه نهجاشی مارهی بڕی له پێغهمبهر هێشتا لای خۆی بوو. ئهبوداود گێڕاویهتیهوه[1]. وه ئهوکهسهی پهیمانهکهی بهست عهمری کوڕی ئومهییهی ضهموری بوو که وهکیلی پێغهمبهر بوو ﷺ کردبووی به وهکیل بۆ ئهوه. بهڵام نهجاشی مارهییهکهی پێ دا لهبهر ئهوه بهشودانهکه درایه پاڵ ئهو.

**کێ دروسته ببێته وهکیل و کێ دروست نییه:**

دروسته پیاوی خاوهن ئاوهزو پێ گهیشتوو ئازاد ببێته وهکیل، چونکه شیاویهتی تهواوی ههیه، وه ههرکهس شیاویهتی تهواوی ههبێت بۆی ههیه ژن بۆ خۆی بهێنێ، وه ههرکهس وههابوو دروسته کهسێکی تر وهکیلی بکات.

بهڵام ئهگهر ئهوکهسه شیاویهتی نهبوو، یان شیاویهتی کهم بوو، ئهوه بۆی نییه وهکیلی کهسێکی تر بکات، وهکو شێت و منداڵ و بهندهو بێعهقڵ، چونکه بۆ هیچ کام لهوانه سهربهخۆ مافی هێنانی ژنیان نییه بۆ خۆیان، وه زانانیان جیاوازییان ههیه له دروستی وهکیل گرتنی ژنی پێگهیشتوو خاوهن ئاوهز له بهشودانی خۆیدا، به پێی جیاوازییان له دروستی پهیمانی ژنو مێردایهتیدا به عیبارهتی ئهو ئافرهته.

وه ئهبو حهنیفه ووتویهتی: وهك چۆن دروسته پیاو وهکیل بگرێ، ئاوههاش دروسته ژن وهکیل بگرێ؛ چونکه مافی پهیمان بهستنی ههیه- وه کاتێك ئهو کاره مافێك له مافهکانی بێت، کهواته مافی ئهوهی ههیه کهسێك بکاته وهکیلی خۆی ئهو پهیمانهی بۆ ببهستێ.

بهڵام جهماوهری زانایان ووتویانه: سهرپهرشتیاری ئافرهت بۆی ههیه پهیمانی بۆ ببهستێ بێ ئهوهی ئافرهتهکه بیکاته وهکیلی ههرچهند ڕازی بونیش بایهخی پێ ئهدرێ وهك له پیشهوه باس کرا.

وه ههندێ له زانایانی شافیعی باوك و باپیرهیان جیا کردۆتهوه له سهرپهرشتیارهکانی تر. ووتویانه: پێویست ناکات باوكو باپیره بکرێنه وهکیل، بهڵام بۆ سهرپهرشتیارهکانی تر، ئهبێ ئافرهتهکه بیان کاته وهکیلی خۆی.

**وهکیلی (مطلق) ئازادو ڕهها وه وهکیلی (مقید) بهستراوه:**

**وهکالهت دروسته به موتڵهقی و به موقهییهدی بێت:**

موتڵهق: ئهوهیه کهسێك کهسیکی تر بکاته وهکیلی خۆی, ژنی بۆ بهێنێ بێ ئهوهی بۆی دیاری بکات کام ژنهی بۆ بهێنێ, و بێ ئهوهی مارهییهکهی بۆ دیاری بکات.

---

(١) أبوداود (٢٠٨٦) نسائي (٦/ ١١٩) أحمد (٦/ ٤٢٧).

موقەییەدیش: ئەوەیە کە بیکاتە وەکیل ئەو ژنەی خۆی ئەیەوێ‌و دیاری کردووە بۆی بهێنێ، یا ئافرەتێکی بۆ بێنێت لە خێزانێکی دیاری کراو، یا ئافرەتێکی بۆ بێنێت بە ئەندازەیەك مارەیی دیاری کراو.

وە حوکمی وەکیلی موتڵەق ئەوەیە کە وەکیل نەبەسترێتەوە بە هیچ قەیدێکەوە ئەمەش ڕای ئەبو حەنیفەیە، جا ئەگەر وەکیلەکە ئافرەتێك بۆ وەکیل گرەکە مارە بکات کە عەیبدار بێت یان هاوشانی نەبێت، یا مارەیی‌یەکەی زۆرتر بێت لە مارەیی خۆی و لەو مارەیی‌یەی کە باوە، ئەوە دروستە[1] و عەقدەکەی صەحیحە و جێ‌بەجێ ئەکرێ، چونکە وەکیل گرتنی موتڵەق و ئازاد ئەوە ئەگەیەنێت.

ئەبو یوسف‌و محمد ووتویانە: ئەبێت ئەو وەکیلە ئەوەی هەڵی دەبژێری ساغ و سەلامەت‌و هاوتا بێت و مارەیی‌یەکەی عادەتی بێت جگە لە زیادەیەکی کەم کە خەڵك بە عادەت گوێی پێ نادەن. وە بەڵگەشیان بۆ ئەوە: ئەو کەسەی کەسێکی تر بکات بەوەکیل بۆ ئەوە ئەیکات بەوەکیل کە یارمەتی بدات بۆ ئەوەی شتی چاك هەڵبژێرێ، لەبەر ئەوەی وازهێنان لە بەستنەوەو قەید کردن ئەوە ناگەیەنێت کە هەرچی ژنێکی دەست کەوت بۆی بهێنێ، چونکە ئەو مانایەی کە ئەیبەخشێ ئەوەیە کە ئافرەتێکی هاوتای بە مارەیی عادەتی بۆ هەڵبژێرێ، وە ئەبێت سەرنج لەوە بدرێ و ئیعتیباری بۆ بکرێت، چونکە ئەوەی بە عورف عادەت ناسراوە وەکو مەرجێکی دانراو وەهایە. ئەوەیە ئەو ڕایەی کە ئەبێت گەڕانەوەی بۆ بکرێ.

وە حوکمی وەکیلی (مقید) بەستراوە ئەوەیە پێچەوانەی تێدا دروست نیە مەگەر بۆ شتێك بێت کە چاکتر بێت. وەك ئەوەی ئەو ژنەی وەکیلەکە هەڵی بژاردووە، جوانترو چاك تر بێت لەوەی ئەو دیاری کردووە، یا مارەیی‌یەکە کەمتر بێت لەوەی خۆی دیاری کردوە. جا ئەگەر موخالەفەکە بۆ ئەوانە نەبوو، پەیمانەکە دروستە بەڵام بەسەر وەکیل گردا ناسەپێ و بە ئارەزووی خۆیەتی ڕێی پێ ئەدات یا ڕەتی ئەکاتەوە.

حەنەفی‌یەکان ووتویانە: ئەگەر وەکیلگر ژن بوو، یا بۆ شتێکی دیاری کراو وەکیل ئەگرێ، یا بۆ شتێکی دیاری نەکراو، ئەگەر بۆ یەکەم بوو، ئەوە پەیمانەکە بەجێ نایەت هەتا تەواو لەگەڵ ئەوەی خۆی ووتویەتی ڕێك نەکەوێ، لەلایەنی پیاوەوە بێ یا لەلایەنی مارەیی‌یەوە. بەڵام ئەگەر بۆ دووەم بوو ـ وەك ئەوە پێی ووتبوو بیدات بەشو بێ ئەوەی پیاوەکە دیاری بکات. وەکیلەکەش لەخۆی یا لە

(١) جگە لەوەی تۆمەتی تێدا بێت، وەك ئەوەی وەکیلەکە کچی خۆی بۆ مارە بکات، یا ئافرەتێکی لێ مارە بکات کە سەرپەرشتیاری بێت، ئەوە ئەو پەیمانە دروست نابێت هەتا وەکیلگر ڕازی نەبێت.

باوکی یا له کوڕەکەی مارە کرد ـ ئەو پەیمانەی ناسەپێنرێ بەسەردا, لەبەر ئەوەی توهمەتی تێدایە، جا ئەگەر شتی وەهابوو بەجێ هێنانی ئەوەستێ لەسەر ڕێ پێدانی ئافرەتەکە. بەڵام ئەگەر مارەی برِی بوو له کەسێکی تر جگە لەوانەی باس کران واتە بێگانە. جا ئەگەر پیاوەکە هاوتا بوو مارەیی‌یەکەی عادەتی بوو؛ ئەسەپێنرێ بەسەریا نەبۆ خۆی و نە بۆ وەلی‌یەکەی نی‌یە ڕەتی کاتەوە.

بەڵام ئەگەر پیاوەکە هاوتابوو بەڵام ماریی‌یەکەی کەمتر بوو له مارەیی عادەتی-بەشێوەیەك زۆرکەم بوو- ئەوە پەیمانەکە جێ‌بەجێ ناکرێت بەڵکو لەسەر ئیجازەی وەلی‌یەکە و ئیجازەی خۆی ئەوەستێ، چونکە هەردوکیان مافی ئەوەیان هەیە. بەڵام ئەگەر پیاوەکە هاوتا نەبوو پەیمانەکە فاسید ئەبێت، مارەیی‌یەکەشی له مارەیی عادەتی کەمتر بێت، یا ڕێك بێت، یا زیاتر، یەکسانە و ئەبێ هەڵبوەشێتەوە وە ڕێ پێ‌دان نای گرێتەوە، چونکە ڕێ پێ دان بۆ شتی خراپ نابێت، بەڵکو بۆ نیکاحی وەستاوە.

**وەکیل لەژن هێنان و بەشوودانا نوێنەرو قسەکەرە:**

وەکالەت له نیکاحدا جیاوازە له وەکالەتی پەیمان بەستنی‌تر. چونکە وەکیل له زەواجدا نوێنەرو قسەگەیەنەرەو هیچیتر، وە مافەکانی پەیمانەکەی بۆ ناگەڕێتەوە، وە داوای مارەیی لێ ناکرێ، وە داوای ئەوەی لێ ناکرێ ئافرەتەکە وەها لێ بکات گوێڕایەڵی پیاوەکە بێت ئەگەر وەکیلی ژنەکەبوو. وە بۆی نی‌یە مارەیی وەربگرێ له جیاتی ژنەکە ئەگەر وەکیلی بوو هەتا خۆی ڕازی نەبێت، وە ئەگەر ڕێی پێ‌دا ئەوە ئەبێتە وەکیلی وەرگرتن کە ئەوەش جیایە له وەکیل گرتنی ژن مارە کردن کە بەتەواوبونی پەیمانەکە ئەویش کۆتایی دێت.

### (کفاءة) هاوتایی له زەواجدا

**پێناسەکەی:**

مەبەست له هاوتایی له بەشی زەواجدا ئەوەیە ئەو پیاوە له پلەو پایەی کۆمەڵایەتی و ڕەوشت‌و باری دارایی‌یەوە یەکسان بێت لەگەڵ ژنەکە، وە گومان لەوەدا نی‌یە هەتا پیاوەکە یەکسان بێت بە ژنەکە لەپلەو پایەدا زیاتر ژیانی هاوسەریان سەرکەوتو ئەبێت، و دوور ئەبێت له سەرنەکەوتویی و هەڵوەشاندنەوەو ئاژاوە.

**حوکمی هاوتابوون:**

بەڵام ئایا حوکمی ئەم هاوتابوونە چی‌یە؟ وە تا چ ڕادەیەك ئیعتیباری هەیە؟

ئیبنوحەزم بۆ ئەوە چووە کە ئەم هاوتاییە ئیعتباری نییە. وە ووتویەتی: (هەر موسڵمانیك ـ بە مەرجێ زیناکەر نەبێت- بۆی هەیە هەر ژنێکی موسڵمانی بوێت بیدرێتێ بە مەرجێ ژنەکەش زیناکەر نەبێت.

وە ووتویەتی: موسڵمانان هەموو برای یەکن کوڕی زەنجیەکی نەناسراو حەرام نییە لەسەری کچی خەلیفەیەکی هاشمی بهێنێ.

وە موسڵمانی تاوانبار هەرچەندە کە تاوانەکانی زۆر بێت -بە مەرجی زیناکەر نەبێت- هاوتایە لەگەڵ ئافرەتێکی موسوڵمانی تاوانبار ـ بە مەرجێ زیناکەر نەبێت ـ .

وە ووتویەتی: بەڵگەش فەرمودەی خوای گەورەیە کە فەرمویەتی : ﴿إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ﴾ (الحجرات: من الآية١٠) واتە: باوەڕداران هەموو برای یەکن.

وە هەروەها فەرموودەی خوای بەرز کە ڕوو بە هەموو موسلمانانە: ﴿فَانْكِحُوا مَا طَابَ لَكُمْ مِنَ النِّسَاءِ﴾ (النساء: من الآية٣) واتە: کام ئافرەتەتان بە دڵەو چاکە بۆتان ئەوە مارە بکەن. وە خوای گەورە باسی ئەو ئافرەتانە ئەکات کە حەرامە لەسەرمان، لەپاشاندا ئەفەرموێ: (وَأُحِلَّ لَكُمْ مَا وَرَاءَ ذَلِكُمْ﴾ (النساء: من الآية٢٤) واتە: لەوانە بەولاوە بۆتان حەڵاڵەو ڕەوایە بیان هێنن.

پێغەمبەر ﷺ زەینەبی دایکی موسڵمانانی لەپێش دا مارەبڕی بۆ زەیدی خزمەتکاری؛ وە میقداد چەباعەی کچی زوبێری کوری عبدالمطلب ی هێناوە. وە ووتویەتی: بەڵام ئەوەی دەربارەی فاسقی پیاوو ژن ئەیلێین پێویست ئەکا لەسەر ئەوانەی کە موخالەفەمان ئەکەن بڵێن: پیاوی فاسق لە ئافرەتی فاسق زیاتر نابێ بهێنێ، وە هەروەها ئافرەتی فاسق بە پیاوی فاسق نەبێت نابێت شو بکات، ئەمەش کەس نایڵێت چونکە خوای گەورە فەرمویەتی:

﴿إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ﴾ (الحجرات: من الآية١٠). وە هەروەها فەرمویەتی: ﴿وَالْمُؤْمِنُونَ وَالْمُؤْمِنَاتُ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاءُ بَعْضٍ﴾ (التوبة: من الآية٧١) واتە: موسڵمانانی پیاوو ژن دۆست و پاڵپشتی یەکترن.

**هاوتایی لە ڕاستی و ڕەوشت بەرزیدا ئیعتیباری بۆ ئەکرێ:**

وە کۆمەڵێك بۆ ئەوە چوون کە هاوتایی ئیعتباری بۆ دائەنرێ، بەڵام لە ڕاستی و ڕەوشت و ئەخلاقدا، نەك (نسب) لە بنەماڵەو پیشە، و دەوڵەمەندی و شتیترا، کەواتە دروستە بۆ پیاوێکی موسڵمان کە نەسەبیشی نەزانرێ ئافرەتێکی خاوەن نەسەب بهێنێ. وە خاوەن پیشەنزمێك ئافرەتیکی خانەدان بهێنێ، وە ئەوەی پلەوپایەی کۆمەڵایەتی نەبێت ئافرەتێك لە بنەماڵەیەکی بەناوبانگ بهێنێ، وە پیاوێکی هەژار ئافرەتێکی دەوڵەمەند بهێنێ -بەمەرجێ موسڵمانێکی داوێن

پاك بێت- وە ئەگەر ئەوە بوو بۆ هیچ سەرپەرشتیارێك نییە ڕێ لەو كارە بگرێ یا داوای جیابوونەوەیان بكات. ئەگەرچی لەگەڵ سەرپەرشتیاری ئافرەتەكە كە مارەی كردووە یەكسان نەبن لەپلەو پایەدا، بە مەرجێ مارەكردنەكە بە ڕەزامەندی ئافرەتەكە بوبێت. بەڵام ئەگەر مەرجی ڕاستاڵی لە پیاوەكەدا نەبوو ئەوە ئەو پیاوە هاوتای ئافرەتی چاكی موسڵمان نییە، وە ئەو ئافرەتە بۆی هەیە داوای هەڵوەشاندنەوەی پەیمانەكە بكات ئەگەر كچ بوو وە سەرپەرشتیارەكەی زۆری لێ كردبوو كە ئەبێ شووبكات بەوفاسقە..

وە لە كتێبی (بداية المجتهد)دا هاتووە: كە جیاوازی نییە لە مەزهەبی مالكیدا كە كچ ئەگەر باوكی دای بە عارەق خۆر و بەگشتی بەفاسق، بۆی هەیە شوو بەوكابرایە نەكات، وە حاكم ئەبێت سەیری ئەو كێشەیە بكاتو لە یەكیان جیا بكاتەوە، وە هەروەها ئەگەر بیدات بە كەسێك سامانەكەی حەرام بێت، یا دابوی بە كەسێك كە زۆر تەڵاق خۆر بوو، خاوەنی ئەم مەزهەبەش بەڵگەیان بۆ ئەم قسەیە ئەمانەی خوارەوەیە:

١- خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُمْ مِنْ ذَكَرٍ وَأُنْثَى وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوباً وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِنْدَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ﴾ (الحجرات: من الآية١٣).

واتە: ئەی خەڵكینە ئێمە ئێوەمان دروست كردووە لە یەك نێرومێ، كەواتە گەورەیی لە نێوانتانا نییە بە نەسەب، وە گەل و نەتەوەی جیاوازمان لێ دروست كردوون بۆ ئەوەی تێكەڵی یەك بكەن و یەكتر بناسن، بەڕاستی لای خوا بەڕێزترینتان ئەوەتانە كە زۆرتر لە خوا بترسێت.

لەم ئایەتەدا بڕیاری ئەوە دراوە كە خەڵك لە دروست بوندا یەكسانن، وە هەروەها لە نرخی مرۆڤایەتیدا، وە كە كەس لە كەس بەڕێزتر نییە بە لە خواترسان نەبێت، ئەوەش بە بەجێ هێنانی مافەكانی خواو مافی بەندەكانی ئەبێت.

٢- وە (ترمژی) بە ئیسنادێكی حەسەن ئەگێڕێتەوە لە ئەبی حاتەمی موزەنییەوە كە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (إذا أتاكم من ترضون دينه وخلقه فأنكحوه، إلا تفعلوا تكن فتنة في الأرض و فساد كبير، قالوا: يا رسول الله وإن كان فيه! قال: إذاجاءكم من ترضون دينه وخلقه فأنكحوه ـ ثلاث مرات ـ)[1].

واتە: ئەگەر كەسیك داوای ژنی لێ كردن و لە ئاینو ڕەوشتی ڕازی بوون ژنی بدەنێ، ئەگەر بێت و وەها نەكەن ئەوە فەسادی گەورەو فیتنەیەك لە زەویدا بەرپا ئەبێت, ووتیان: ئەی نێرراوی خوا

---

(١) الترمذي (١٠٨٥).

ئەگەر قسەشی لەبارەوە کرا؟ فەرمووی: هەرکەس لە ئایینو ڕەوشتی ڕازی بوون ژنی بدەنێ. سێجار ئەمەی فەرموو.

لەم حەدیسەدا ڕووی قسە لە باوکانو سەرپەرشتیارانی ئافرەتە کە ئافرەتەکانیان بدەن بە کەسێك هاتە خوازبێنی ئەو ئافرەتانەو خاوەنی ئایین و ئەمانەت و ڕەوشتی باش بوون، جا ئەگەر وانەکەن بەوەی کە ئافرەتان نەدەن بە خاوەن ڕەوشتی باش، وە نەسەب و پلەوپایەو پارەیان پێ خۆش بوو، ئەوکاتە فیتنەو فەسادێك بڵاو ئەبێتەوە کە کۆتایی نییە.

٣- وە ئەبودواد لە ئەبی هورەیرەوە ئەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (يا بني بياضة أنكحوا أباهند وأنكحوا إليه).

واتە: ئەی هۆزی (بياضة) ژن بدەن بە ئەبا هیندو ژنی لێ بخوازن, کە کابرایەکی کەڵەشاخ گریوو[1].

لە (معالم السنن)دا ووتویەتی: ئەم حەدیسە بەڵگەیە بۆ مالیكو ئەوانەی وەك بۆچونەکەی ئەویان هەیە کە ووتویانە هاوتایی تەنها بە ئایینە چونکە ئەبو هیند مەولاو بەندە ئازادکراوی بەنی (بياضة) بوو، وە لە خۆیان نەبووە.

٤- پێغەمبەر ﷺ زەینەبی کچی جەحشی داواکرد بۆ زەیدی کوڕی حاریسە خۆی و عبدالله ی برای ڕازی نەبوون، لەبەر نەسەبەکەی کە لە قورەیش بوو, وە کچی پوری پێغەمبەر ﷺ بوو دایکیشی ئومەیمەی کچی عبد المطلب بوو, و زەیدیش بەندە بوو. جا خوای گەورە لەسەر ئەوە ئەم ئایەتەی نارده خوارەوە کە ئەفەرموێ: ﴿وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلَا مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَمْراً أَنْ يَكُونَ لَهُمُ الْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ وَمَنْ يَعْصِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَقَدْ ضَلَّ ضَلالاً مُبِيناً﴾ (الأحزاب:٣٦).

واتە: بۆ هیچ موسڵمانێکی ژنو پیاو نییە کە خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ فەرمانێکیان بۆ دانا ئارەزووی خۆیانی تێدا بێت لەو کارەدا، جا هەرکەس سەرپێچی لە فەرمانەکانی خواو پێغەمبەرەکەی بکات ئەوە گومڕا بووە بە گومڕاییەکی ئاشکرا.

ئیتر براکەی بە پێغەمبەری ووت: بە چی فەرمانم پێ ئەدەی فەرمانم پێ بدە. وە مارەی کرد لە زەید.

٥- وە ئەبو حوزەیفە, هیندی کچی وەلیدی کوڕی عوتبەی کوڕی ڕەبیعەی مارە کرد لە سالم کەبەندەی ئازادکراوی ئافرەتێکی ئەنصاری بوو.

---

(١) أبوداود (٢١٠٢) والحاكم (٢/١٦٤).

٦- وه بیلالی کوڕی ڕەباح خوشکی عبدالرحمن ی کوڕی عەوفی هێنا.

٧- له ئیمامی عەلی پرسیار کرا دەربارەی مارەکردنی هاوشان, ئەویش فەرمووی: خەڵك هەموو هاوتای یەکن عەرەبی‌و عەجەمی‌و قورەیشی‌و هاشمی ئەگەر موسڵمان و باوەڕ داربن.

وه ئەمەش مەزهەبی مالکییەکانه. شەوکانی ووتویەتی: هەروەها نەقڵ کراوه له عومەر و ئیبنو مەسعود و موحەممەدی کوڕی سیرین و عومەری کوڕی عبدالعزیزەوه. وه ئیبنو قەییم به بەهێزی داناوەو ووتویەتی: ئەوەی حوکمی پێغەمبەر ﷺ پێویستی ئەکات ئەوەیه که هاوتایی له ئاییندا ئیعتبار ئەکرێ له بنەڕەتدا و له تەواویدا، کەواته ئافرەتی موسڵمان نابێ بدرێت به کافر، وه هەروەها داوێن پاك به داوێن پیس؛ ئیتر قورئان لەوه بەولاوه ئیعتباری بۆ هاوتایی دانەناوه. چونکه حەرامی کردووه ئافرەتی موسڵمان بدرێت به زیناکەرێکی پیس، ئیتر نەسەب‌و کارو پیشەو دەوڵەمەندی‌و ئیش هیچ ئیعتباری بۆ دانەناوه، وه کۆیلەیەکی پەتی دروسته ئافرەتێکی خاوەن نەسەبی دەوڵەمەند بهێنی به مەرجێ پاك‌و موسڵمان بێت، وه به دروستی داناوه که ئەوەی قورەیشی نییه ئافرەتی قورەیشی بهێنێ، وه ئەوەی هاشمی نییه ئافرەتی هاشمی بهێنی وه هەژار دەوڵەمەند بهێنێ.

مەزهەبی جەماوەری زانایان له هاتاییدا

وه ئەگەر مالکییەکان‌و زانایانی‌تر که له پێشەوه ئاماژەمان بۆ کردن ڕایان وەهایێت که هاوتایی له ڕاستاڵی‌و چاکەیدایه نەك شتی تر، جگه لەوانه زانایانی تریش ڕایان وەهایه که هاوتایی له ڕاستاڵی و چاکیدا ئیعتیباری بۆ ئەکرێ، وه پیاوی فاسق هاوتای داوێن پاکێك نییه، بەڵام ئەمان هاوتایی تەنها لەوەدا تەنگ ناکەنەوه، بەڵکو ڕایان وەهایه که چەند شتێکی تر هەیه ئەبێ ئیعتباری پێ بکرێ.

ئێمەش لێرەدا باسی ئەکەین:

(یەکەم) بنەماڵه (النسب): عەرب لەناو خۆیدا هاوتای عەرەبه, قورەیشی هاوتای قورەیشی‌یه، وه عەجەمی هاوتای عەرەبی نییه، وه عەرەبی هاوتای قورەیشی نییه. بەڵگەش بۆ ئەمە:

١- بەپێی ئەوەی حاکم له ئیبنوعومەرەوه گێڕاویەتی‌یەوه که پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (العرب أكفاء بعضهم لبعض، قبيلة لقبيلة، وحي لحي، ورجل لرجل، إلا حائكاً أوحجاما)[1].

---

(١) تلخيص الحبير (٣/١٦).

واتە: عەرەب هەندێکیان هاوتای هەندێکیانن، هۆز بەهۆز، و گەڕەك بە گەڕەك، و پیاو بە پیاو، جۆلاو کەڵەشاخ گر نەبێت.

٢- بەززار ئەگێڕێتەوە لە موعاژی کوڕی جەبەلەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (العرب بعضهم لبعض أكفاء، والموالي بعضهم أكفاء بعض)[١]. واتە:
عەرەب هەندێکیان هاوتای هەندێکیانن و بەردەکان هەندێکیان هاوتای هەندێکیانن.

٣- وە لە عومەرەوە کە فەرمویەتی: ڕێ نادەم ئافرەتی خاوەن نەسەب بە هاوتای خۆی نەبێ بدرێ. (دارقطني) گێڕاویەتیەوە[٢].

سەبارەت بە حەدیسەکەی ئیبنوعومەر ئیبنوئەبی حاتەم لە باوکی پرسیوە ووتویەتی: درۆیەو ئەصڵی نیە. وە (دارقطني) لە (العلل)دا ووتویەتی: صەحیح نیە.

ئیبنو عبدالبر ووتویەتی: ئەوە مونکەرو دانراوە.

بەڵام حەدیسەکەی موعاژ، سولەیمانی کوڕی ئەبی جەونی تێدایە کە ئیبنو قەگان ووتویەتی: نەناسراوە. پاشان لە ڕیوایەتی خالیدی کوری مەعدانە لە موعاژەوە، کە ئەویش لێی نەبیستووە، وە لە ڕاستیدا فەرمودەیەکی صەحیحی سابت نیە، کە ئیعتیبار بە نەسەبەوە بکات بۆ هاوتایی.

وە شافیعیەکان و حەنەفیەکان جیاییان نیە لەوەدا کە نەسەب ئیعتباری بۆ ئەکرێ لە هاوتاییدا بەوشێوەیەی باس کراوە، بەڵام جیاییان لەوەدایە کە قورەیشیەکان فەچلیان هەیە. حەنەفیەکان ڕایان وایە کە قورەیشی هاوتای ئافرەتی هاشمیە[٣].

بەڵام شافیعیەکان ئەوەی ڕاستە لە مەزهەبەکان ئەوەیە کە قورەیشی هاوتای ئافرەتی هاشمی و (مطلبي) نیە، بەڵگەشیان بۆ ئەوە ئەوەیە کە (واثیلة)ی کچی ئەسقەع گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (إن الله اصطفى كنانة من بني إسماعيل، واصطفى من كنانة قريشاً، واصطفى من قريش بني هاشم، واصطفاني من بني هاشم، فأنا خيار من خيار) رواه مسلم[٤].

---

(١) البزار (١٤٢٤).

(٢) دارقطني (٣/٢٩٨).

(٣) قورەیشی ئەوەیە کە لە نەوەی نەضري کوڕی کینانە بێت، وە هاشمی ئەوەیە کە لە نەوەی هاشم ی کوڕی عەبدی مەناف بێت، عەرەبیش ئەوانەن کە باوکێك لە پشت نەضرەوە کۆی کردبنەوە.

(٤) مسلم (٢٢٧٦).

واته: خوا کینانەی لە نەوەی ئیسماعیل هەڵبژاردووە, وە لە کینانەش قورەیش، وە لە قورەیش بەنی هاشمی هەڵبژاردووە, وە منیشی لە بەنی هاشم هەڵبژرادووە، جا من چاکترینم لە چاکترین لەچاکترین.

(حافظ) لە (فتح) دا ووتویەتی: ڕاستی ئەوەیە کە بەنی هاشم و بەنی (مطلب) پێش کەسانی تر بخرێ وە جگە لەوان ئیتر هاوتای یەکن.

وە ڕاستی پێچەوانەی ئەوەیە. چونکە پێغەمبەر ﷺ دوکچی داوە بە عیمانی کوڕی عەففان، وە زەینەبی داوە بە ئەبا عاصی کوڕی ڕەبیع کە هەردوکیان لە هۆزی عەبدو شەمس بوون، وە عەلی ئومو کلپومی کچی‌دا بە عومەر کە عەدەوی بوو.

بەڵام شەرەفی زانست و زانیاری لە پشت هەموو شەرەف و نەسەبێکەوەیە. پیاوی زانا هاوتای هەموو ئافرەتێکە لە هەرچی بنەماڵەیەك بێ، با ئەوزانایەش نەسەبێکی نەناسراوی هەبێت، بەپێی فەرمودەی پێغەمبەر ﷺ کە فەرمویەتی: (الناس معادن، كمعادن الذهب والفضة، خيارهم في الجاهلية خيارهم في الإسلام إذا فقهوا)[1].

واته: خەڵکی وەك کانزای زێڕو زیون، چاکترینیان لەسەردەمی نەزانیدا چاکترینیانە لە ئیسلام دا ئەگەر زانا بن.

وە فەرموودەی خوای گەورە کە ئەفەرموێ: ﴿يَرْفَعِ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا مِنكُمْ وَالَّذِينَ أُوتُوا الْعِلْمَ دَرَجَاتٍ﴾ (المجادلة: من الآية١١).

واته: خوای گەورە پلەو پایەی ئەوانە بەرز ئەکاتەوە کە باوەڕدارن وە ئەوانەی کە خوا کردونی‌یە زانا بە چەندەها پلە بەرز ترن.

وە فەرموودەی خوای بەرز: ﴿قُلْ هَلْ يَسْتَوِي الَّذِينَ يَعْلَمُونَ وَالَّذِينَ لا يَعْلَمُونَ﴾ (الزمر: من الآية٩).

واته: بلێ ئایا ئەوانەی کە پەروەردگاری خۆیان و ئاینی ڕاستی خۆیان ئەزانن لەگەڵ ئەوانەدا کە هیچ لەوە نازانن یەکسانن.

ئەمە بە نیسبەت عەرەب بەڵام لەبارەی عەجەمی‌یەکانەوە ووتراوە: هاوتایی نەسەب لە ناویاندا نی‌یە.

---

(١) أبوداود الطيالسي (٣٢٤) والمقاصد الحسنة (١٢٣٨) من حديث أبي هريرة.

وه له شافیعی و بەشی زۆری هاوەڵەکانیەوه ئەگێڕنەوه: که ئەوانیش بنەماڵەو نەسەب لەناویاندا ئیعتباری بۆ ئەکرێ، به قیاس لەسەر عەرەب، چونکه ئەوانیش نەنگیان پێوه ئەنوسێ کاتێ کەسێك له خۆیان نزمتر بهێنێ، کەواته حوکمیان وەك حوکمی عەرەبی لێ دێ لەبەر یەکبوونی هۆیەکه.

(دووەم) ئازادی: کۆیلەو بەنده هاوتای ئازاد نین, وه هەروەها ئازادکراو هاوتای ئازادێك نیەیه که له ئەصڵدا ئازاده، وه کەسێك یەکێك لەباو باپیرانی تووشی کۆیلایەتی بووبێت هاوتای کەسێك نیەیه که هیچ کەسێکی تووشی نەبوبێت. چونکه ئافرەتی ئازاد نەنگی دێ بەسەریا کاتێ ژنی پیاوێکی بەنده بێت، یا کەسێك یەکێك له باووباپیرانی تووشی کۆیلایەتی بووبێت.

(سێیەم) ئیسلامەتی: واته هاوتایی له ئیسلامەتی بنەچەیدا، ئەمەش لەوانەی عەرەب نین ئیعتباری بۆ ئەکرێ، بەڵام بۆ عەرەب ئیعتباری بۆ ناکرێ، چونکه بەوه وازیان هێناوه که شانازی به نەسەبیانەوه بکەن، وه به ئیسلامەتی بنەچەیان نانازن.

بەڵام ئەوانەی که عەرەب نین له مەوالی و عەجەم به ئیسلامەتی بنەچەیانەوه شانازی ئەکەن، جا لەسەر ئەوه ئەگەر ئافرەتێك باوكو باپیرانی موسڵمان بوبن ئەوه هاوتای پیاوێك نیەیه که هیچ کام له باووباپیرانی موسڵمان نەبوبێ.

وه هەر ئافرەتێك یەك باوکی هەبوبێت له ئیسلامدا، ئەوه ئەو پیاوەی یەك باوکی بووه له ئیسلامدا هاتایی دەکات، وه ئەو ئافرەتەی باوو باپیرێکی له ئیسلامدا بووبێت ئەوه ئەو پیاوەی که باوك و باپیرانێکی بووبێت له ئیسلامدا هاوشانی ئەکات، چونکه ناسینی مرۆڤ به باوکی و باپیریەوه دەبێت، جا ئیتر لەوه زیاتر سەیری بۆ ناکرێ و حیسابی بۆ ناکرێ.

ئەبو یوسف لای وایه که ئەوکەسەی یەك باوکی هەبێت له ئیسلامدا هاوتایه بۆ ئەو ئافرەتەی چەند باپیرێکی هەیه له ئیسلامدا، چونکه لای ئەو ناسران به تەواوی به باوك ئەبێ، بەڵام ئەبوحەنیفه و محمد دەڵێن ناسرانی تەواو به باوك و باپیرەوه نەبێت نابێت.

(چوارەم) کارو پیشه: ئەگەر ئافرەت له خێزانێك بێت پیشەیەکی بەرزیان هەبێت کەسێکی پیشه نزم هاوتای نیەیه. ئەگەر پیشەکەیان نزیك بوو لەیەکەوه ئیعتبار بۆ ئەو جیاوازیەی ناکرێ که له نێوانیاندا هەیه. ئیعتیبارکردن بەکارو پیشەی بەرزو نزم بەپێی عورف و عادەته؛ چونکه جاری وا ئەبێت پیشەیەك له شوێنێکدا یا له زەمانێکدا بەرزە له شوێنێکی تر و سەردەمێکی تردا رێزی نیەیه. وه ئەوانەی ئەڵێن کارو پیشه ئیعتباری بۆ ئەکرێ بەڵگەیان ئەو حەدیسەیه که له پێشەوه باس کرا که ئەفەرمووێ: (العرب بعضهم أكفاء لبعض... إلا حائكاً أو حجاما) وه به

ئەحمەدی كوڕی حەنبەلیان ووت: چۆن لەسەر ئەو فەرموودەیە ئەڕۆیتو بە لاوازیشت داناوە؟ فەرمووی: هەر بەو شێوەیە كاری پێ كراوە.

خاوەنی (المغنی) ووتویەتی: واتە ئەو فەرموودەیە لەگەڵ عورف دا ڕێك كەوتووە. چونكە خاوەن پیشەو كارە بەرزەكان وا دائەنێن كە ئەگەر كچەكانیان بدەن بە كەسانێك كارو پیشەكەیان لە خوار ئەوانەوە بێت كەمیێتی و ناتەواوییە ـ وەك جوڵاو دەباغچیو كەناسوخوڵ ڕێژ﴾ وە عورفی خەڵك وا هاتووە كە ئەوە عەیب و نەنگییە، كەواتە وەك هاوتایی نەبوونە لە نەسەبدا، ئەمەش مەزهەبی شافیعیكانە، وە هەروەها موحەممەد و ئەبو یوسف لەحەنەفیەكان, وە لە ڕیوایەتێكدا لە ئەحمەدو ئەبی حەنیفەوە, وە لە ڕیوایەتێكی ئەبی یوسف دا ئەو شتە ئیعتباری بۆ ناكرێ هەتا نزمی پلەی كارەكە زۆر نەبێت.

(پێنجەم) سامانو ماڵ: شافیعییەكان جیاوازیان هەیە لە ئیعتبار بۆ كردنیدا, هەیانە ئیعتباری بۆ كردووە، لای ئەوان هەژار هاوتای دەوڵەمەندێك نییە، بەپێی ئەوەی سەموڕە ئەگێڕێتەوە كە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (الحسب المال، والكرم التقوی)

واتە: پلە بەرزی بە ماڵەو بەرێزیش بە لەخواترسانە، وە ووتویانە: چونكە نەفەقەی هەژار كەمترە لە نەفەقەی دەوڵەمەند. وە هەیانە ووتویەتی: ئیعتیباری بۆ ناكرێت، چونكە ماڵ و سامان دێو دەڕوا، وە لەبەر ئەوەی كەسانێك كە خاوەن پیاوەتی بن شانازی پێوە ناكەن, وە قسەی شاعیریان باس كردووە كەئەڵێ:

غنینا زمانا بالتصعلك والفقر وكلا سقاناه بكأسیها الدهر

فما زادنا بغیا علی ذي قرابة غنانا ولا أزرا بأحسابنا الفقر

واتە: ئێمە ماوەیەك لەفەقیری و هەژاری بێنیاز بووین، وە زەمانە هەریەك لە دەوڵەمەندی و هەژاری بە پەرداخەكەی دەرخواردی ئێمەدا، جا نە دەوڵەمەندییەكەمان تووشی ستەم و سەركێشی كردین بەسەر خزم و كەساو نە هەژارییەكەمان ڕێزو شەرەفی كەم كردینەوە.

بەڵام لای حەنەفیەكان ماڵ و سامان ئیعتیباری هەیە لەهاوتاییدا، وەئەوەی ئیعتیباری پێئەكرێ ئەوەیە كە ئەو پیاوە خاوەنی مارەیی و نەفەقەی ئافرەتەكە بێت. تەنانەت ئەگەر كەسێك هیچیانی نەبوو، یان یەكیانی هەبوو وئەوەی تری نەبوو نابێتە هاوتا. مەبەست لە مارەیی ئەو مەبلەغەیە كە عادەتە لە پێشەوە بدرێ بە ئافرەت، چونكە ئەوەی دووایی لە عوروف و عادەتدا دوائەخرێ، وە لە ئەبی یوسفەوە هاتووە كە ئەو توانای نەفەقە ئیعتیبار ئەكات بە هاوتایی نەك مارەیی، چونكە مارەیی ئاسان كاری تێدا ئەكرێت، و پیاو بە دەوڵەمەندی باوكی وادائەنرێ كە

توانای مارەیی هەیە. وە ئیعتیبار کردنی ماڵ لە هاوتایی‌دا ڕیوایەتێکە لە ئەحمەدیشەوە، چونکە ئافرەتی دەوڵەمەند زیانی پێ ئەگات بە دەست تەنگی مێردەکەی، چونکە ناتوانێ خەرجی ئەو ژنەو منداڵەکانی بکێشێت، وە لەبەر ئەوەی خەڵك هەژاری بەکەمی‌و ناتەواوی دائەنێن, وپلەو پایەیان بەسامان بەرز ئەبێتەوە وەك نەسەب و لەوەش زیاتر.

(شەشەم) ساغ و سەلامەتی لە عەیب: هاوەڵانی شافیعی وایان ئیعتبار کردووە- وە ئەوەی کە ئیبنونەصر باسی کردووە لە مالیکەوە- کە سەلامەتی لە عەیب مەرجێکە بۆ هاوتایی, وە هەرکەس عەیبێکی هەبوو عەیبێکی وەها نیکاحی پێ هەڵبوەشێتەوە هاوتای ئافرەتی ساغ و بێ عەیب نیە, بەڵام ئەگەر هەڵوەشاندنەوەی پێ سابت نەدەبوو بەڵام مرۆڤ ڕەوین بوو وەك کوێری و براوی ئەندام و ناڕێکی لەش و ئەندام، ئەوە دوو ڕووی هەیە. ڕویەکیانی ئەوەی هەڵبژاردووە کە ئەوەی خاوەنی ئەو عەیبانە بێت هاوتای سەلامەتێك لە عەیب نیە. بەڵام حەنەفی و حەنبەلی ئیعتیباریان بۆ نەرکردووە. لە (المغنی)دا هاتووە: سەلامەتی لە عەیب مەرجی هاوتایی نیە، چونکە خیلاف نیە کە نەبوونی سەلامەتی نیکاح بەتاڵ ناکاتەوە، بەڵام ئارەزووی هەڵوەشاندنەوە بۆ ئافرەتەکە ثابت ئەبێت، نەك بۆ سەرپەرشتیاران. چونکە زیانەکەی تایبەتە بەوەوە، بەڵام سەرپەرشتیارەکەی بۆی هەیە ڕێی لێ‌بگرێت شووبکات بەگەڕو گول و بەڵەك و شێت.

**هاوتایی بۆ کامیان ئیعتباری پێ ئەکرێ؟**

هەوتایی لەژن‌و مێردایەتیدا تەنها بۆ پیاو دانراوە نەك بۆ ژن. واتە پیاو خۆی ئەومەرجەی بۆ دائەنرێ کە هاوتا بێت بۆ ئافرەتێکی وەك خۆی لەپلەدا، وە مەرج دانانرێ کە ئافرەت هاوتای پیاو بێت.

**بەڵگەی ئەمەش:**

(یەکەم): چونکە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (من كان عنده جارية فعلمها، وأحسن تعليمها، وأحسن إليها ثم أعتقها وتزوجها فله أجران) رواه البخاري ومسلم[1]. واتە: هەرکەس جاریەیەکی لابوو هوشیاری کردو چاك فێری کردو چاکەی لەگەڵدا کرد، لە پاشاندا ئازادی‌کردو مارەی کرد دوو پاداشتی هەیە.

(دووەم): چونکە پێغەمبەر ﷺ لەپلەو پایەدا هاوتای نیە لەگەڵ ئەوەشدا لە زۆر تیرەکانی عەرەب ژنی هێناوە. وە صەفیەی کچی حویەی هێناوەکە جولەکە بووە و موسڵمان بووە.

---

(١) البخاري (٢٥٤٤) ومسلم (٢٤١).

(سێیەم): ئافرەتی پلەو پایە بەرز واباوە خۆی و سەرپەرشتیارەکانی عەیبدار ئەبن ئەگەر شوو بە هاوتای خۆی نەکات. بەڵام پیاوی شەریف عەیب دار نابێت ئەگەر ژنێکی پلەو پایە نزم بهێنێ.

**هاوتایی مافی ئافرەت و سەرپەرشتیارەکانییەتی :**

جەماوەری زانایان ڕایان وەهایە کە هاوتایی مافە بۆ ئافرەت و سەرپەرشتیارەکانی. کەواتە دروست نییە بۆ سەرپەرشتیار ئافرەتێك لە ناهاوتای خۆی مارە بکات. مەگەر بە ڕازی بوونی خۆیو هەموو سەرپەرشتیارەکانی نەبێت؛ چونکە مارە کردنی ئەو ئافرەتە لە کەسێك کە هاوتای نەبێت عەیب و نەنگ بە سەرپەرشتیارەکانی ئەگەیەنێت، هەر بۆیە تاوەکو هەمویان ڕازی نەبن دروست نییە، جا ئەگەر ئافرەتەکە ڕازی بوو وە هەموو سەرپەرشتیارەکانی ڕازی بوون، دروستە بدرێ بەو کەسە، چونکە ڕێ نەدان مافی ئەوانە کاتێ ڕازی بوون ڕێ نەدانەکە لائەچێ. شافیعییەکان ووتویانە: ئەوە بۆ کەسێکە کە سەرپەرشتیاری یەکسەری بۆ ببێت، وە ئەحمەد لە ڕیوایەتێکدا ووتویەتی: مافی هەموو سەرپەرشتیارانە دوورونزیکیان, جا هەرکەسیان ڕازی نەبوو بۆی هەیە هەڵی بوەشێنێتەوە. وە لەڕیوایەتێکی تری ئەحمەددا: ئەوە تەنها مافی خوایە، ئەگەر سەرپەرپەرشتیارەکان و ئافرەتەکەش ڕازی بن کە هاوتایی لابەرن ڕازی بونیان دروست نییە. بەڵام ئەم ڕیوایەتەیان لەسەر ئەوە هەڵئەگیرێ کە هاوتایی لە ئاییندایەو بەس، وەك لە یەکێك لە ڕیوایەتەکان

**کاتی ئیعتیبار کردنی هاوتایی:**

هاوتایی لەکاتی پەیمان بەستنەکەدا ئیعتباری بۆ ئەکرێ، جا ئەگەر دوای پەیمانەکە هەر وەسفێك لە وەسفەکانی تێك چوو زیانی نییە و هیچ لە واقیع ناگۆڕێو کار ناکاتە سەر پەیمانی نیکاحەکە، چونکە مەرجەکان کاتی عەقدەکە نەبێت ئیعتیباریان پێ ناکرێت، جا ئەگەر کاتی ژن هێنانەکە خاوەنی پیشەیەکی بەرێز بوو یا توانای نەفەقەکێشانی هەبوو، یا پیاوی چاك بوو لەپاشاندا کات و شوێن گۆڕاو پیشەیەکی نزمی دەست کەوت، یا هەژار کەوت و توانای نەفەقەکێشانی نەما، یا کەوتە تاوان کردنو سەرپێچی فەرمانی خوای کرد، دوای ژن هێنانەکە ئەو پەیمانە وەك خۆی ئەمێنێتەوە, چونکە کات و سەردەم زۆر گۆڕانی بەسەرادێ, وە ئادەمیزاد لەسەر یەك شێوە نامێنێـەوە, وە لەسەر ژن پێویستە ئەو واقیعە قەبوڵ بکات و ئارام بگرێو لە خوا بترسێ، چونکە ئەوە لە کارە هەرە گەورەکانە.

## مافەکانی ژن ومێردایەتی

کاتێ پەیمانی نیکاح بەستراو پەیمانەکە دروست بوو شوێنەوارەکانی دائەمەزرێ‌و مافەکانی ژن‌و مێردایەتی پێویست ئەبێت بە پێی ئەو پەیمانە، وە ئەو مافانەش سێ بەشن:

١- مافی پێویستی ئافرەتەکە لەسەر پیاوەکە.

٢- مافی پێویستی پیاو لەسەر ژنەکە.

٣- مافی هاوبەشی نێوان هەردوکیان:

وە هەڵسانی هەریەکە لە ژن و مێرد بەکار و ئەرکی واجب‌و پێویستی خۆی و ئاگاداری کردنی کارەکانی ئەوەیە کە هۆکارەکانی دڵنیایی‌و ئارامی دەروونی دابین ئەکات، و بەوەش بەختیاری ژن‌و مێردایەتی تەبێت، وا لە خوارەوە هەندێ لەو ماف و ئەرکانە ڕوون ئەکرێنەوە.

ئەو مافانەی کە هاوبەشن لە نێوان ژن و مێردا بریتین لە:

١- ڕەوایی تێکەڵ بون و خۆشی وەرگرتن لەیەك، وە ئەوە مافێکی ڕەوایە بە هاوبەشی، جا چی ڕەوایەو حەڵاڵە بۆ پیاوەکە بۆ ژنەکەش حەڵاڵە. . وە ئەو خۆشی وەرگرتنە مافی ژن‌و پیاوەو نایەتەدی هەتا هەردوکیان هاوبەشی تێدا نەکەن چونکە ناکرێ کەسێکیان بە تەنها خۆی ئەوخۆشی‌یەی دەس بکەوێت.

٢- حەرام بوون بە موصاهەرە (خزمایەتی) : واتە ئەو ژنە حەرام ئەبێت لەسەر باوك و باپیرە و کوڕ و لقەکانی کوڕ و کچەکانی ئەو مێردە، وەك چۆن پیاوەکە حەرام ئەبێت لەسەر دایك و کچ و لقی کوڕ و کچەکانی ئەو ژنە.

٣- سابت بوونی میرات گرتن لە نێوان هەردوکیاندا هەر بەتەواو بوونی پەیمانەکە، جا ئەگەر کەسێکیان دوای تەواوبوونی پەیمانەکە مرد ئەوی تریان میراتەکەی ئەگرێت, با نەشچوبنە لای یەکیش.

٤- سابت بوونی نەسەبی منداڵەکانی لەلایەن ئەو مێردەیەوە کە چۆتە لای.

٥- تێکەڵی‌و بەیەکەوە ژیان بە چاکی: پێویستە لەسەر هەریەکە لە ژن‌و مێردەکە بە چاکی هەڵسوکەوت بکات لەگەڵ ئەوی تریان بۆ ئەوەی خۆشەویستی‌و هێمنی و سەلامەتی باڵیان بەسەردا بکێشێ. خوای گەورە ئەفەرموێ ﴿وَعَاشِرُوهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ﴾ (النساء: من الآية١٩) واتە: لەگەڵ خێزانەکانتان بەچاکی ژیان بەسەر بەرن و ڕەفتاریان لەگەڵدا بکەن.

## ئەو مافانەی کە واجبە لەسەر پیاو بەرامبەر بە ژن

لەو مافانەی کە واجبە لەسەر پیاو بۆ خێزانەکەی:

١ـ چەند مافێکی ماڵی: ئەویش مارەیی‌و نەفەقەکێشانە.

٢- وە چەند مافێکی غەیرە ماڵی: وەك دادپەروەری لە نێوان ژنەکاندا ئەگەر لە ژنێك زیاتری هەبوو، هەروەها وەك زیان نەگەیاندن بەژن.. وە لەمەولا باسیان ئەکرێت.

### مارەیی

لە باشی چاودێری کردنی ئافرەت و رێزگرتنی لەلایەن ئیسلامەوە ئەوەیە کە مافی خاوەنی‌یەتی داوەتێ، لەکاتێکدا لە سەردەمی نەفامی‌دا ئەو مافە پێشێل کرابوو بەشێوەیەك کە سەرپەرشتیاری ئافرەت لە سامانی تایبەتی ئافرەتەکەدا تەسەڕوفی ئەکردو دەرفەتی خاوەنیەتی نەئەدایە، وە ڕێی نەئەدا بە تەسەرروف کردن تێیدا.

ئەوەبوو کە ئیسلام ئەو بارە گرانەی لابرد لەسەری و مارەیی بۆ داناو کردی بەمافی ئافرەت لەسەر پیاو کە بۆ خۆی بێت نەك بۆ باوکی، وە بۆ کەسێکی نزیکی نی‌یە هیچ لەو مارەیی‌یە وەربگرێ مەگەر ئەو ئافرەتە خۆی ڕازی بێت. خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿وَآتُوا النِّسَاءَ صَدُقَاتِهِنَّ نِحْلَةً فَإِنْ طِبْنَ لَكُمْ عَنْ شَيْءٍ مِنْهُ نَفْساً فَكُلُوهُ هَنِيئاً مَرِيئاً﴾ (النساء:٤)

واتە: مارەیی‌یەکان بدەن بە ئافرەتان کە واجبەو خوا بۆی فەرز کردوون، بەڵام ئەگەر بەخۆشی خۆیان شتێکیان پێدان لەو مارەوی‌یە وەری بگرن و بە خۆشی و حەڵاڵی بیخۆن.

بەڵام ئەگەر ژنەکە لەبەر شەرم یا ترس یا فێڵێکی لێ کرا لەو مارەیی‌یەی بەخشی، وەرگرتنی ڕەوا نی‌یە. خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿وَإِنْ أَرَدْتُمُ اسْتِبْدَالَ زَوْجٍ مَكَانَ زَوْجٍ وَآتَيْتُمْ إِحْدَاهُنَّ قِنْطَاراً فَلا تَأْخُذُوا مِنْهُ شَيْئاً أَتَأْخُذُونَهُ بُهْتَاناً وَإِثْماً مُبِيناً، وَكَيْفَ تَأْخُذُونَهُ وَقَدْ أَفْضَى بَعْضُكُمْ إِلَى بَعْضٍ وَأَخَذْنَ مِنْكُمْ مِيثَاقاً غَلِيظاً﴾ (النساء: ٢٠-٢١).

واتە: وە ئەگەر ویستتان ژنێك لابەن و ژنێکی‌تر لە جێی بهێنن، وە ماڵێکی زۆرتان کردبو بە مارەیی بۆ ئەو ژنەی کە ئەتانەوێ تەڵاقی بدەن ئەوە لێی وەرمەگرنەوە، وە حەڵاڵ نی‌یە بۆتان، ئایا ئێوە بە بوختان و تاوانی ئاشکرا لێیان وەرئەگرنەوە؟ جا چۆن لێ‌یان وەردەگرنەوە لەکاتێکدا ئێوە بە یەکەوە ژیاون و خۆشیتان لەیەکتر وەرگرتووە و پەیمانێکی زۆر توندو تیژیان لێ وەرگرتون کە ئەو مارەیی‌یەیان بدەنێ. وە ئەو مارەیی‌یە کە بۆ ژن دانراوە. وەکو چۆن ئەو مانایە دەگەیەنێ دڵی ئافرەتیشی پێ خۆش ئەبێت و ڕازی ئەکات بە دەسەڵاتی پیاو بەسەریەوە خوای گەورە ئەفەرموێ:

﴿الرِّجَالُ قَوَّامُونَ عَلَى النِّسَاءِ بِمَا فَضَّلَ اللَّهُ بَعْضَهُمْ عَلَى بَعْضٍ وَبِمَا أَنْفَقُوا مِنْ أَمْوَالِهِمْ﴾ (النساء: من الآية ٣٤).

واتە: پیاوان خاوەن دەستەڵاتن بەسەر ژنانەوە بەهۆی ئەو فەضڵەی کە خوا پێی داون، وە بەهۆی ئەو سامانو ماڵەی سەرفی ئەکەن بۆ ژنان لە مارەیی و نەفەقەکێشان.

جگە لەوانەی ئەو مارەیییە پەیوەندی نێوانیان بەهێز ئەکاتو هۆی خۆشەویستی و میهرەبانیشە.

**ئەندازەی مارەیی:**

یاسای ئیسلام سنووری بۆ لایەنی کەمی و زۆری مارەیی دانەناوە. چونکە خەڵك جیاوازییان هەیە لە دەوڵەمەندیو هەژاری دا، وە هەروەها لە بەدەستەڵاتیو بێ دەسەڵاتیدا جیاوازن، وە هەرجێیەك داب و نەریتی خۆی هەیە، لەبەر ئەوە وازی لە دانانی سنوور هێناوە بۆ ئەوەی هەرکەس بەپێی توانا مارەیی بدات، وە بەپێی حاڵەتی و خووڕەوشتی هۆزەکەی. وە هەموو دەقەکان کە دەربارەی مارەیی هاتوون ئیشارەت بۆ ئەوە ئەکەن کە مارەیی مەرجی تێدا دانانرێ مەگەر ئەوەندە کە شتێك بێت نرخی تایبەتی هەبێت؛ بێ ئەوەی سەیری کەمی و زۆری بکرێ, جا دروستە بە ئەنگوستلەیەك بێت یان بە کاسەیەك خورما، یا بە فێر کردنی قورئان، بە مەرجێك پەیمان بەستەکان ڕازی بن.

١- لە عامیری کوڕی ڕەبیعەوە کە ژنێکی بەنی فەزارە لەسەر جوتێ نەعل خۆی مارە کرد. پێغەمبەر ﷺ فەرموی: (أرضيت عن نفسك بنعلين؟ فقالت: نعم، فأجازه) رواه أحمد وابن ماجه والترمذي وصححه[1].

واتە: ئایا ڕازی بوویت بەجوتێ نەعل لە جیاتی خۆت و ماڵەکەت؟ ووتی: بەڵێ, پێغەمبەریش ﷺ ڕێی پێ دا).

٢-لە سەهلی کوڕی سەعدەوە کە ئافرەتێك هات بۆلای پێغەمبەر ﷺ ووتی: ئەی نێرراوی خوا من خۆم بەخشی بەتۆ، وە ماوەیەکی زۆر وەستا، هەتا پیاوێك لەولاوە هەستاو ووتی: ئەی نێرراوی خوا لە منی مارە بڕە ئەگەر خۆت پێویستت پێی نییە, پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئایا هیچت هەیە بیدەیتێ بە مارەیی، ئەویش ووتی: هیچم نییە ئەم بەرکۆشەم نەبێت. پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ئەگەر بەرکۆشەکەتی بدەیتێ خۆت بێ بێبەرکۆش ئەمێنیتەوە. بگەڕێ بۆ شتێکی تر, ووتی: هیچ

(١) أحمد (٣/٤٤٥) ترمذي (١١١٣) ابن ماجه (١٨٨٨).

شك نابەم فەرمووی: بگەڕێ ئەنگوستیلەیەکی ئاسنیش بێت باشە, ئەویش گەڕا هیچی نەدۆزیەوە، لەپاشاندا پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: قورئانت هیچ لەبەرە؟ ووتی: بەڵێ، سورەتی ئەوەو ئەوە, چەند سورەتێکی ناوبرد، پێغەمبەر ﷺ فەورمووی: ئەوا لێم مارەکردی کە چیت قورئان لەبەرە فێری بکەیت. بوخاری و موسلیم گێڕاویانەتەوە.

لە ڕیوایەتێکی ئەبی هورەیرەدا: بۆی دانا فێری بیست ئایەتی بکات[1].

٣_ وە لە ئەنەسەوە: کە ئەبو طەلحە (أم سلیم)ی داواکرد، ئەویش ووتی: سوێند بەخوا پیاوی وەك تۆ ڕەت ناکرێتەوە بەڵام تۆ کافری و من موسڵمانم، جا دروست نیيە بۆم شوو بەتۆ بکەم، ئەگەر موسڵمان ئەبیت، ئەوە موسوڵمان بوونەکەت ئەبێتە مارەیی‌یەکەم، وە داوای هیچی ترت لێ ناکەم، ئیتر کە شووی پێ کرد هەر ئەوە مارەیی‌یەکەی بوو[2].

ئەم فەرمودانە بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە دروستە مارەیی شتێکی کەمیش بێت، وە دروستە شتی سوود گەیەنەریش هەر بکرێ بە مارەیی، و فێربوونی قورئانیش لەو شتانەیە کە سوودیان هەیە. وە حەنەفی‌یەکان دایان ناوەکە کەمترین مارەیی ئەبێ دە درهەم بێت. وەك چۆن مالیکی‌یەکان سێ درهەمیان داناوە. ئەو دانانەش هیچ بەڵگەو حوججەیەکی لەسەر نیيە کە پشتی پێ ببەسترێ.

(حافظ) ووتویەتی: دەربارەی کەمترین مارەیی چەند فەرموودەیەك هاتوە کە هیچیان سابت نین، وە ئیبنوقەییم لە فەرموودەکانی پێشو کۆڵاوەتەوەو ووتویەتی: ئەوەی ئومو سولەیم هەڵی بژارد ئەوە بوو کە سوود لە ئیسلام بوونی ئەبی طەلحە وەربگرێ، خۆی بەخشی پێی ئەگەر موسڵمان بێت، وە ئەوەی لاخۆش تر بوو لە ماڵێك کە مێردەکەی بیدات. چونکە مارەیی لە بنەڕەتدا بۆیە دانراوە کە ئافرەت سوودی لێ وەربگرێ، جا ئەگەر ڕازی بێت بە زانست و ئایین و موسڵمان بوونی مێرد، و قورئان فێر بوون، ئەوە باشترین و بەسوودترین و بەرزترین مارەیی‌یە، چونکە هیچ پەیمانێك بێ مارەیی نەبووە. جا کوا ئەو حوکمەی مارەیی داناوە بە سێ درەهەم یا دە درهەم، لە دەقەکانی قورئانو فەرمودەو قیاسا، لەلای ئەو حوکمەی مارەیی بە دروست داناوە بەو شتانەی کە باسمان کردن بە دەقی قورئان و فەرمودەو قیاس. وە ئەوە یەکسان نیيە لە نێوان ئەو ژنەدا ـ أم سلیم ـ و ئەو ژنەی خۆی بەخشی بە پێغەمبەر ﷺ، کە ئەوە شتێکی تایبەت بوو بە پێغەمبەر ﷺ جیا لە موسڵمانان. چونکە ئەو ئافرەتە خۆی بەخشی بە بەخشینێکی ڕووت لە سەرپەرشتیارو مارەیی‌یە. پێچەوانەی ئەوەی کە ئێمەی تێیداین کە مارەبڕینە بە سەرپەرشتیارو

(١) أحمد (٥/٣٣٠و٣٣٤و٣٣٦) والبخاري (٥٠٣٠و٥١٤٩) ومسلم (١٤٢٥/٧٦و٧٧).

(٢) نسائي (٦/١١٤).

مارەیی‌یەوە، با ماڵیش نەبێت، چونکە ئافرەتەکە لە جیاتی ماڵ شتێکی هەڵبژاردووە کە سوودی هەبووە بۆی وە خۆی نەبەخشیوە بە پیاوەکەی بە بەخشینی ڕووت وەك چۆن شتێکی ماڵەکەی ببەخشێ. ئەوەش پێچەوانەی ئەو خۆبەخشینە کە تایبەتە بە پێغەمبەرەوە ﷺ.

ئەوەی فەرمودەکان پێویستی بکەن ئەوەبو کە باس کرا، بەڵام هەندێکیان پێچەوانەی قسەی ئەو کەسانەیە کە وتوویانە: مارەیی ئەبێ ماڵ بێت، و شتی سوود بەخشی تر نابێت، نە فێرکردن و نە زانست مارەیی نین، وەك ئەبوحەنیفە ووتویەتی، وە هەروەها ئەحمد ـ ڕەحمەتی خوا لە هەردوکیان بێت ـ لە ڕیوایەتێکدا.

وە ئەوانەی وتویانە: مارەیی نابێت لە سێ درهەم کەمتر بێت وەك مالیك یا دە درهەم وەك ئەبی حەنیفە. وە چەند ووتەیەکی تری شاذ کە بەڵگەی نی‌یە نە لە قورئان نە لە سوننەت نە لە ئیجماع نە لە قیاس نە لە قەولی صەحابی

وە هەرکەس بڵێ ئەو حەدیسانەی باسمان کردن تایبەت بوون بە پێغەمبەرەوە ﷺ و سڕاونەوە، یان خەڵکی مەدینە بە پێچەوانەی ئەوە کاریان کردووە، ئەوە ئیدعایەکە هیچ بەڵگەیەکی نی‌یە وە ئەصلیش ئەوەیە کە ڕەت بکرێتەوە.

سەعیدی کوڕی موسەییب گەورەی خەڵکی مەدینە لە تابیعی‌یەکان کچەکەی دا بە شوو لەسەر مارەیی دوو درهەم، وە هیچ کەسیش لەسەر ئەو کارە سەرزەنشی نەکرد، بەڵکو ئەو کارە بە یەکێك لە گەورەیی و خووە چاکەکانی ژمێردرا.

وە هەروەها عبدالرحمن ی کوڕی عەوف ژنێکی مارە کرد لەسەر پێنج درهەم، و پێغەمبەر ﷺ بڕیاری لەسەردا[1].

ئیتر هیچ ڕێگا نی‌یە بۆ سابت کردنی ئەندازەی مارەیی مەگەر لەلایەن خاوەن یاسای ئیسلامەوە بێت.

بەڵام لەلایەنی زۆری‌یەوە: هیچ سنورێك نی‌یە بۆ زۆری مارەیی، لە عومەرەوە هاتووە ﷺ کە لەسەر مینبەرەکەیەوە قەدەغەی کردووە لەوەی کە مارەیی ئافرەت لە چوارسەد درهەم زیاتر بێت، لەپاشان هاتە خوارەوە، ئافرەتێکی قورەیشی ڕێی لێ گرت و ووتی: نەت بیستووە خوا ئەفەرموێ: ﴿وَآتَيْتُمْ إِحْدَاهُنَّ قِنطَاراً﴾ (النساء: من الآية٢٠) واتە: ئەگەر ماڵێکی زۆرتان کرد بە مارەیی‌یان، عمر فەرمویی: خوایە لێم ببورە، هەموو کەس لە عمر زاناترە، لەپاشان گەڕاوەو چووە سەر

---

(١) البخاري (٥٠٧٢) ومسلم (١٤٢٧/٧٩).

دوانگەکەو فەرمووی: من لە پێشەوە ڕێی ئەوەم لێ گرتن کەمارەیی لە چوارسەد درهەم زیاتر بدرێت. هەرکەس ئارەزوی خۆیەتی حەز ئەکات لە ماڵەکەی هەرچەندەی پێ خۆش بوو بیدات. سەعیدی کوڕی مەنصورو ئەبویەعلا بە سەنەدێکی جید گێڕاویانەتەوە[1].

وە لە عبداللە ی کوڕی موصعەبەوە کە عومەر فەرمویەتی: لە چل ئۆقی‌یە زیو زیاتر مەدەن بە مارەیی، هەرکەس لەوە زیاتر بدات زیادەکە ئەخەمە (بیت المال)ەوە, ئافرەتێك ووتی: ئەوە بۆ تۆ نی‌یە. فەرمووی: چۆن؟ ژنەکە ووتی: چونکە خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿وَآتَيْتُمْ إِحْدَاهُنَّ قِنْطَاراً﴾ (النساء: من الآية ٢٠) عومەر فەرمووی: ئافرەتێك پێکای و پیاوێك هەڵەی کرد[2].

**کەراهەتی زیادەڕەوی لە مارەیی‌دا:**

هەرچی بێت، ئیسلام پەرۆشی ئەوەیە کە مۆڵەتی ژن هێنان زۆر بکات بۆ ژمارەیەکی زۆر لە ژنان و پیاوان؛ بۆ ئەوەی هەموو کەس بەشێوەیەکی حەلاڵ و پاك خۆشی‌و ڕابواردنی دەست کەوێ. ئەمەش نایەتەدی هەتا هەموو هۆیەکانی ئاسان نەکرێت و ڕێگاکانی چارە نەکرێت، بەشێوەیەك ئەو هەژارانەی کە کەم دەستن توانایان بەسەری‌دا هەبێت، بە تایبەتی کە ئەوانە بەشی زۆری خەڵکن، لەبەر ئەوە ئیسلام بە کەراهەتی داناوە زیادەڕەوی لە مارەیی‌دا بکرێت، وە ڕای گەیاندووە کە هەتا مارەیی کەم بێت کارەکە پیرۆزترە، وە کەمی مارەیی لە چاکی ئافرەتە. لە عائیشەوە خوا لێی ڕازی بێت کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (إن أعظم النكاح بركة أيسره مؤنة)[3]. واتە: ئەو نیکاحەی گەورەترین بەرەکەتی هەبێ ئەوەیانە کە کەمی تێ چووبێت.

وە فەرمویەتی: چاکی ئافرەت لە سوکی مارەیی‌یەتی و ئاسانی نیکاحیەتی و جوانی ڕەوشتیەتی. وە خراپی ئافرەت بە زۆری مارەیی و گرانی مارە کردنی و ڕەوشتی خراپی‌یەتی[4]. وە زۆر کەس لە خەڵکی لەم ئامۆژگاری‌یانە دوور کەوتونەوەو خۆیان هەڵواسیوە بەخوو ڕەوشتی نەفامی‌یەوە لە زیادە ڕەوی کردن لە مارەییدا. ژن نادەن بەکەس هەتا مارەیی‌یەکی زۆر نەدات، کە ئەبێتە هۆی ماندوکردنی‌و کەم دەست کردنی، وەك ئەوەی ئافرەت کەلوپەل بێت و مامەڵەو بازرگانی پێوە بکەن. ئەمەش بووەتە هۆی زۆری هاوار لە دەست مارەیی و ڕەنج بینینی خەڵك لە

---

(١) الدر المنثور (٢/٤٦٦).

(٢) عبد الرزاق في المصنف (١٠٤٢٠).

(٣) أحمد (٦/١٤٥).

(٤) أحمد (٦/٧٧).

تەنگ و چەڵەمەی زەواج کە زیانی بە ژنان و پیاوان گەیاندووە بە یەکسانی، وە لە ئەنجامدا خراپەو خراپەکاری زۆر بووەو بازاڕی ژنو مێردایەتی نشوستی هێناوەو وای لێ هاتووە حەڵاڵ لە حەرام زۆر گرانتر بە دەست دێت.

**پێش خستنی مارەیی‌و دواخستنی:**

دروستە مارەیی پێش بکەوێ یا دوا بکەوێ، یا هەندێکی پێش بکەوێ و هەندێکی دوا بخرێ، بەپێی باوو نەریتی خەڵکی، بەڵام وا پەسەندە کە بەشێکی پێش بخرێ؛ بەپێی ئەوەی ئیبنوعەبباس گێراویەتی‌یەوە: کە پێغەمبەر ﷺ نەی‌هێشت عەلی فاطمە بگوێزێتەوە هەتا شتێکی نەداتێ. عەلی وتی: هیچم نی‌یە. فەرموی: ئەی درعە حیطەمی‌یەکەت کوا؟ ئیتر ئەوەی دا بە فاطمە لە جیاتی مارەیی. ئەبو داودو نەسائی‌و حاکم گێراویانەتەوە و حاکم بە صەحیحی داناوە[1].

وە ئەبوداود و ئیبنو ماجە لە عائیشەوە ئەگێڕنەوە کە فەرمویەتی: پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێ کردوم کەرێ بدەم پیاو بچێتە لای ژنەکەی پێش ئەوەی هیچ مارەییشی بداتێ[2].

ئەم فەرموودەیە بەڵگەی ئەوەیە کە ئافرەت دروستە بگوێزرێتەوە پێش ئەوەی هیچ لە مارەیی‌یەکەی بدرێتێ. وە حەدیسەکەی ئیبنو عەبباس ئەوە ئەگەیەنێت کەئەو مەنع و قەدەغە کردنە لەسەر شێواز و ڕێگای پەسەندی بووە.

زوهری ووتویەتی: پێمان گەیشتووە کە سوننەت وا بووە ئافرەت نەگوێزرێتەوە هەتا نەفەقەیەکی پێشکەش نەکرێت یان پۆشاکێکی بدرێتێ، وە موسڵمانان هەربەو شێوەیە کاریان کردووە،

وە بۆ مێرد هەیە بچێتە لای ژنی خۆی و ئەویش خۆی بخاتە بەر دەستی و ڕێی هیچی لێ نەگرێ با مارەیی‌یە پیشەکی‌یەکەشی نەدابێتێ، هەرچەندە فەرمان ئەکرێ کە بیدرێتێ.

ئیبنوحەزم ووتویەتی: هەرکەس ژنێکی مارە کرد، مارەیی بۆ دانا یا بۆی دانەنا، بۆی هەیە بچێتە لای ئەو ئافرەتە پێی خۆش بێ یان پێی ناخۆش بێ، وە ئەبێ ئەو پیاوە چی بۆ داناوە بیداتێ پیاوەکە پێی خۆش بێت یان پێی ناخۆش بێ، وە لەبەر ئەوە ڕێی لێ ناگیرێ بیگوێزێتەوە، بەڵام فەرمان ئەکرێ کە بەپەلە بیگوێزێتەوە، وە فەرمان ئەکرێ بە دانی مارەیی‌یەکەی بە پێی ئەوەی کە لای پیاوەکە هەیە، بەڵام ئەگەر هیچی بۆ دانەنابوو ئەبێ مارەیی وەك خۆی بدرێتێ، مەگەر خۆیان ڕازی بن بە کەمتر یان زۆرتر.

---

(١) أبوداود (٢١٢٥ و ٢١٢٦) والنسائي (٦/١٢٩)

(٢) أبوداود (٢١٢٨) وابن ماجه (١٩٩٢).

ئەبو حەنیفە ووتویەتی: (پیاو بۆی هەیە ژن بگوێزێتەوە ئافرەتەکە حەز بکات یان نا، ئەگەر مارەیی‌یەکەی دوواخرابوو، چونکە ئەو ئافرەتە خۆی ڕازی بووە بەو دووا خستنە، وە ئەوەش مافی پیاو لانابات. بەڵام ئەگەر هەمووی یا هەندێکی پێش خرابوو، بۆی نی‌یە بیگوێزێتەوە هەتا ئەوەی نەداتێ کە مەرج بووە بیداتێ، وە بۆ ئافرەتەکەش هەیە خۆ نەدات بە دەستەوە هەتا ئەوەی نەداتێ کە لەسەری ڕێك کەوتون.

ئیبنو مونذیر ووتویەتی: (هەموو ئەوانەی خاوەن زانستن و زانستیان لێوە لەبەر کراوە لەسەر ئەوەن کە ئافرەت بۆی هەیە خۆی نەدات بە دەست پیاوەوە هەتا مارەیی‌یەکەی نەداتێ) خاوەنی (المحلی) لەم ڕایە کۆڵاوەتەوە و ووتویەتی: (جیاوازی نی‌یە لە نێوان کەسێك لە موسڵمانان کە پیاو کاتێك ئافرەتی مارە کرد ئەبێتە ژنی خۆی و بۆی حەڵاڵەو، ئەویش بۆ ئەو حەڵاڵە، هەرکەس ڕێی لێ بگرێ هەتا مارەیی‌یەکەی ئەدات بەو ژنە، ئەوە بۆتە کۆسپ لە نێوان ئەوو ژنەکەیدا بەبێ ئەوەی بەڵگە و دەقێکی هەبێت لەلایان خوا و لەلایەن پێغەمبەرەکەیەوە ﷺ

بەڵام ڕاستی ئەوەیە ئێمە ووتومانە: نابێت ئافرەت ڕێ لە مافی پیاو بگرێو پیاو ڕێ لە مافی ژن بگرێ لە مارەیی. بەڵام پیاو هەربۆی هەیە بچێتە لای ئەو ژنە - پێی خۆش بێت یان نا - وە چی لە دەست ئەو پیاوە بوو لێی وەربگیرێ بە مارەیی، پیاوەکە پێی خۆش بێت یان نا.

وە لە پێغەمبەرەوە صلی الله علیه وسلم شتێکی وا هاتووە کە ڕاستی ئەم وتەیە بگەیەنێ کە ئەڵێ: مافی هەموو خاوەن مافێك بدەن[1].

ع کاتێك هەموو ئەو مارەیی‌یەی ناوبراوە پێویست ئەبێت:

مارەیی ناوبراو پێویست ئەبیت بە یەکێ لەمانەی خوارەوە:

١- کاتێ چوونە لای تەواو هاتەدی- بەپێی فەرموودەی خوای گەورە: ﴿وَإِنْ أَرَدْتُمُ اسْتِبْدَالَ زَوْجٍ مَكَانَ زَوْجٍ وَآتَيْتُمْ إِحْدَاهُنَّ قِنْطَاراً فَلا تَأْخُذُوا مِنْهُ شَيْئاً أَتَأْخُذُونَهُ بُهْتَاناً وَإِثْماً مُبِيناً )وَكَيْفَ تَأْخُذُونَهُ وَقَدْ أَفْضَى بَعْضُكُمْ إِلَى بَعْضٍ وَأَخَذْنَ مِنْكُمْ مِيثَاقاً غَلِيظاً﴾ (النساء: ٢٠-٢١) واتە: ئەگەر ویستتان ژنێك لابەن و ژنێکی‌تر لە جێی بهێنن، وە ماڵێکی زۆرتان کردبو بە مارەیی بۆ ئەو ژنەی کە ئەتانەوێ تەڵاقی بدەن، ئەوە لێی وەرمەگرنەوە، وە حەڵاڵ نی‌یە بۆتان، ئایا ئێوە بە بوختان و تاوانی ئاشکرا لێیان وەرئەگرنەوە؟ جا چۆن لێیان ئەسێننەوە لە کاتێکدا ئێوە بە

(١) البخاري (١٩٦٨) والترمذي (٢٤١٣).

یەکەوە ژیاون و خۆشیتان لە یەکتر وەرگرتووەو پەیمانێکی زۆر توندو تیژیان لێوەرگرتوون کە ئەو مارەییەیان بدەنێ.

٢-کاتێ یەکیکیان بمرێ پێش چونەلاو گواستنەوە ئەمەش ڕای هەموو زانایانی لەسەرە.

٣- وە ئەبو حەنیفە ڕای وەهایە: کە ئەو ئافرەتە مارەیی‌یە ناوبراوەکەی ئەکەوێت بەوەی کە هەردووکیان بەیەکەوە لەشوێنێکی چۆڵ بن بە ڕاست، بەو جۆرە کە ژن و پیاوەکە بە تەنیا لە شوێنێك بن و دڵنیابن کە کەسیان لێ دیار نەبووە، وە هیچیان مانیعی شەرعی‌یان بۆ چوونەلا و نزیکی کردن نەبێت، وەك ئەوەی یەکێکیان بەرۆژو بێ ڕۆژوی فەرز، یا وەك ئەوەی ژنەکە بێ‌نوێژبێ. یان مانیعی هەستی ببێ، وەك ئەوەی یەکێکیان نەخۆش بێ بە جۆرێك توانای چوونەلای بەڕاستی نەبێ، یان یا مانیعی سروشتی وەك ئەوەی کەسێکی تریان لەلا بێ،

ئەبو حەنیفە لەمەدا ئەوەی کردۆتە بەڵگە کە ئەبوعوبەیدە ئەگێڕێتەوە لە زائیدەی کوڕی ئەبی ئەوفاوە کە ووتویەتی: (خلفاء الراشدین) وایان داناوە کە ئەگەر دەرگایان لەسەر خۆیان داخست و پەردەیان داداوە، مارەیی پێویست ئەبێت)

وەکیع لە نافیعی کوڕی جوبەیرەوە ئەگێڕێتەوە کە ووتویەتی: یارەکانی پێغەمبەر ئەیان ووت: کە پیاو دەرگای داخست و پەردەی داداوە مارەیی پێویست ئەبێت) وە لەبەر ئەوەی خۆ بەدەستەوەدانی شیاو لەلایەن ژنەکەوە بەجێ هاتووە, کەواتە ئەبێ بریتی‌یەکەشی سابت ببێ کە مارەیی‌یەکەیە.

شافیعی و مالیك و داود لەوەدا پێچەوانەی ئەبو حەنیفەن و ووتویانە: مارەیی جێگیر نابێت بەچوونەلا نەبێت، وە بەیەکەوە بوونی تەنها نیوەی مارەیی نەبیت پێویستی ناکات، بەپێی فەرموودەی خوای گەورە: ﴿وَإِنْ طَلَّقْتُمُوهُنَّ مِنْ قَبْلِ أَنْ تَمَسُّوهُنَّ وَقَدْ فَرَضْتُمْ لَهُنَّ فَرِيضَةً فَنِصْفُ مَا فَرَضْتُمْ﴾ (البقرة: ٢٣٧) واتە: ئەگەر ئافرەتەکانتان تەڵاقدا پێش ئەوەی بچنە لایان و مارەیی‌تان بۆ دانابون، نیوەی ئەومارەیەیی‌یان ئەکەوێت. ئەمەش کاتێکە تەڵاقەکە پێش نزیکی کردنی ڕاستەقینە بێت، وە تەنها بەیەکەوە بوون ئەوە ناگەیەنێت، کەواتە هەموو مارەیی‌یەکە پێویست ناکات،

شورەیح ووتویەتی: (نەم بیستووە خوا لە کتێبەکەیدا باسی دەرگا یا پەردەی کردبێ, ئەگەر پیاوەکە ووتی نەچوومە لای نیوەی مارەیی ئەکەوێ.

وە سەعیدی کوڕی مەنصور ئەگێڕێتەوە لە ئیبنو عەبباسەوە کە ئەو ئەیوت دەربارەی ئەو پیاوەی ژنی گوێزایەوە، لە پاشاندا تەڵاقی‌داو بڵێت نەچوومەلای (ئەوە نیوەی مارەیی ئەکەوێت).

وە عبدالرزاق لێوەی گێڕاوەتەوە کە ووتوویەتی: (مارەیی هەمووی پێویست نابێت هەتا جیماعی لەگەڵدا نەکات).

**واجب بوونی مارەیی ناوبراو بە هۆی چوونەلا لە نیکاحی فاسیددا:**

ئەگەر پیاوێك ئافرەتێکی مارەکرد و گواستییەوەو چووە لای، لە پاشاندا دەرکەوت ئەو نیکاحە فاسیدە بەهۆیەك لەهۆیەکان، مارەیی ناوبراو هەمووی پێوست ئەبێت. بەپێی ئەوەی ئەبوداود ئەگێڕێتەوە: کە بەصرەی کوڕی ئەکپەم ئافرەتێکی مارە کرد بەکچی گواستییەوە و چووە لای، سەیری کرد دوگیانە و سکی هەیە، ئەویش هات بۆ پێغەمبەری ﷺ گێڕایەوە فەرمووی: (لها الصداق بما استحللت من فرجها) واتە: مارەیی‌یەکەی ئەکەوێ بەوەی بۆ خۆتت حەڵاڵ کردووە. لەپاشاندا لەیەکی جیاکردنەوە[1]. ئەم فەرموودەیە دەری ئەخات کە مارەیی ناوبراو پێویست ئەبێت بە نیکاحی فاسیدیش، وە هەروەها ئەوە دەرئەخات کە نیکاح فاسید ئەبێت کاتێ دەرکەوت ئافرەتەکە دوگیان بووە بە زینا.

**هێنانی ژن بەبێ باسی مارەیی:**

ژن هینان بەبێ باسی مارەیی کە پێی ئەوترێ: (زواج التفويض) ڕاستە بە قسەی هەموو زانایان، بەپێی فەرمودەی خوای گەورە: ﴿لاجُناحَ عَلَيْكُمْ إنْ طَلَّقْتُمُ النِّساءَ ما لَمْ تَمَسُّوهُنَّ أوْ تَفْرِضوا لَهُنَّ فَرِيضَةً﴾ (البقرة: ٢٣٦) واتە: تاوان نیيە لە سەرتان ئافرەتانێك تەڵاق بدەن کە نەچوینە لایان یا مارەیی‌تان بۆ دانەنابن.

وە ئەگەر کەسێك ژنێکی هێنا بەبێ مارەیی، وەبەو مەرجەی مارەیی نەداتێ ئەڵێن: ئەو ژن هێنانە دروست نیيە. مالیکی‌یەکان و ئیبنوحەزم بۆ ئەوەچوون، ئیبنو حەزم ووتویەتی:

ئەگەر مەرجی ئەوەی کردبێ مارەیی تێدا نەبێ ئەوە هەڵوەشاوەیە بەپێی فەرمودەی پێغەمبەر: ﷺ (كل شرط ليس في كتاب الله عزوجك فهو باطل)[2]. واتە: هەر مەرجێك لە کتێبەکەی خوای گەورەدا نەبوو ئەوە پوچەڵ و بەتاڵە.

وە ئەو مەرجەش لە قورئاندا نیيە لەبەر ئەوە پوچەڵە بەڵکو لە قورئاندا پوچەڵکردنەوەی هەیە.

خوای گەورە ئەفەرموێ: (وَآتُوا النِّسَاءَ صَدُقَاتِهِنَّ نِحْلَةً)(النساء: من الآية ٤) واتە: ئەو مارەیی‌یەی خوا بۆ ئافرەتانی فەرز کردووە بیان دەنێ. کەواتە ئەو مەرجە پوچەڵە، و ئەو نیکاحەی

---

(١) أبوداود (٢١٣١).

(٢) تەخریجی ئەم حەدیسە ڕابورد.

باس کرا دروست بوونی پێك نایەت مەگەر ئەوەی کە ڕاست نیيە بە ڕاستی بگێڕرێ. ئەوەش نیکاحێکە ڕاستی تێدا نیيە.

وە حەنەفیيەکان بۆ ئەوە چوون کە دروستە، چونکە مارەیی نە پایەو نە مەرجە لە پەیمانی ژن‌ومێردایەتیدا.

**پێویست بوونی مارەیی وەکو خۆی (المهر المثل) بە چوونەلا یا بە مردن پێش چوونەلا:**

ئەگەر ژنەکە مێردەکەی گواستیەوەو چووەلای, یا مرد پێش ئەوەی بیگوێزێتەوە، لەم حاڵەتەدا ئافرەتەکە (مهر المثل) مارەیی وەك خۆی ئەکەوێ و میراتیشی ئەکەوێ، بەپێی ئەوەی ئەبوداود لە عبدالله ی کوڕی مەسعودەوە ئەگێڕێتەوە کە لەو بارەیەوە فەرمویەتی: بەڕای خۆم شتێك ئەڵێم - ئەگەر پێکام ئەوە لە خواوەیە و ئەگەریش هەڵەم کرد ئەوە لە خۆمەوەیە﴾ ڕام وایە: کە مارەیی ئەوەندەی هاو ڕێنەی خۆی ئەکەوێ بێ‌کەم‌و زیاد وە عیددەی لەسەرە و میراتیش ئەگرێ. میعقەلی کوڕی یەسار هەڵساو ووتی: شایەتی ئەدەم وەك ئەوەت کرد کە پێغەمبەر ﷺ بەرامبەر بە ڕەوعی کچی واشیق کردی[1]. ئەبوحەنیفە و ئەحمەد و داود بۆ ئەوە چوون، وە هەروەها ڕاسترینی دووقسەی شافیعیيە.

مارەیی هاو ڕێنە (مهرالمثل) :

(مهر المثل) ئەو مارەییيەیە کە ئافرەت شیاویەتی لەکاتی عەقدەکەدا، هەروەك مارەیی هاو ڕێنەی خۆی لە تەمەن و جوانی و سامان و ژیری و ئایین و کچێتی و بێوەژنی و وولات، وە هەروەها هەر هۆیەکی تر کە مارەیی‌یەکە بگۆڕێت، وەك ئەوەی ئافرەتەکە منداڵێکی لەگەڵدا بێت یا نەبێت، چونکە بەو پێیە نرخی مارەییيەکە ئەگۆڕێ بۆ ئافرەتەکە بەپێی جیاوازی ئەو سیفاتانە, وە ئەوەی ئیعتیباری پێ ئەکرێ لە هاو ڕێنەیی‌دا لە لایەن خزمایەتی پشتی‌یەوەیە وەك خوشکی و پوری و کچانی مامی.

ئەحمەد فەرموویەتی: ئەو مارەییيە بەپێی مارەیی ئافرەتە خزمەکانی داتراوە خزمی پشتی بن یا خزمی پشتی نەبن ئیعتیباری پێ ئەکرێ, بەڵام ئەگەر ئافرەتی خزمی نەبوو لە لایەنی باوکەوە کە مارەیی ئەوی لەسەر دابنرێ بەهاوڕێنەیی- ئەوە ئەبێ لەسەر مارەیی ئافرەتێکی بێگانە دابنرێ کە خێزانەکەی هاو ڕێنەی خێزانی باوکی ئافرەتەکە بێت.

---

(١) أحمد (٤٧٧/١) وأبو داود (٢١١٤) والترمذي (١١٤٥) والنسائي (١٢١/٦) وإبن ماجة (١٨٩١).

**مارەکردنی ئافرەتی منداڵ بە کەمتر لە مارەیی هاو وێنە:**

شافیعی و داود و ئیبنو حەزم و دوو هاوەڵە حەنەفیەکان بۆ ئەوە چوون کە دروست نییە باوك کچەکەی بدات بەشوو بەمارەیی یەك کەمتر بێت لە مارەیی هاو وێنەی، وە فەرمانی باوکی ئافرەتەکە لەوەدا پێویست نابێ، وە هەر ئەبێت مارەیی وەکو خۆی دابنرێ، چونکە ئەو مارەییە مافی ئەو کچەیە، وە حوکمی باوك لە ماڵی کچەکەدا نییە

وە ئەبو حەنیفە ووتویەتی: ئەگەر باوك کچی بە بچووکی دا بەشوو ومارەییەکەی کەم کردەوە دروستە، وەئەو کارە بۆ کەسێکیتر نییە جگە لە باك و باپیرە.

**دوو بەش کردنی مارەیی:**

پێویستە لەسەر مێرد نیوەی مارەیی بدات ئەگەر ژنەکەی تەڵاق دا پێش گواستنەوەو چوونەلای، کە لەپێشەوە مارەیی تەواوی بۆ دانابوو، بە پێی فەرمودەی خوای گەورە کە ئەفەرمووێ: ﴿وَإِنْ طَلَّقْتُمُوهُنَّ مِنْ قَبْلِ أَنْ تَمَسُّوهُنَّ وَقَدْ فَرَضْتُمْ لَهُنَّ فَرِيضَةً فَنِصْفُ مَا فَرَضْتُمْ إِلَّا أَنْ يَعْفُونَ أَوْ يَعْفُوَ الَّذِي بِيَدِهِ عُقْدَةُ النِّكَاحِ وَأَنْ تَعْفُوا أَقْرَبُ لِلتَّقْوَى وَلَا تَنْسَوُا الْفَضْلَ بَيْنَكُمْ إِنَّ اللَّهَ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ﴾ (البقرة:٢٣٧) واتە: ئەگەر تەڵاقتان دان پێش ئەوەی بچنە لایان، بەڵام مارەییتان بۆ دانابون، ئەوە واجبە لەسەرتان کە نیوەی ئەوەیان بدەنێ کە بۆتان داناون، مەگەر ئافرەتەکان خۆیان لێتان خۆش بن، یان مێردەکە کە پەیمانی نیکاحەکەی بە دەستە لە تەڵاق دراوەکە خۆش بێت و هەموو مارەییەکەی بداتێ وە لێ بوردنتان نزیك ترە لە تەقواوە، وە فەزڵ و چاکە کردن لە نێوانتانا لە بیر مەکەن، چونکە خوا چاوی لەوەیە چی ئەکەن.

**بەهرەمەند کردن (متعة) پێوستە:**

ئەگەر پیاو ژنەکەی تەڵاقدا پێش چوونەلا، وە مارەیی بۆ دانەنابوو، پێویستە لەسەری بەهرەمەندی بکات لە جیاتی ئەوەی لە دەستی چووە. وە ئەمە جۆرێکە لە وازهێنانی جوان و وازهێنان بە چاکی، خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿فَإِمْسَاكٌ بِمَعْرُوفٍ أَوْ تَسْرِيحٌ بِإِحْسَانٍ﴾ (البقرة: من الآية٢٢٩) واتە: دوای گێڕانەوەیان، یا ڕاگرتنە بەباشی یا واز لێهێنانیانە بە چاکی، ئەوەش بە بەجێ هێنانی مافەکانیانە.

وە زانایان هەموو لەسەر ئەوە کۆن ئەگەر ئافرەتێك مارەیی بۆ دا نەنرابوو، وە نەچوبووە لای، مارەیی ناکەوێ جگە لە (متعة) بەهرەمەند کردن. بەهرەمەند کردنیش ئەگۆڕێ بە پێی دەستەڵاتی پیاو، وە سنوورێکی دیاری کراوی نییە، خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿لَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ إِنْ طَلَّقْتُمُ النِّسَاءَ مَا لَمْ تَمَسُّوهُنَّ أَوْ تَفْرِضُوا لَهُنَّ فَرِيضَةً وَمَتِّعُوهُنَّ عَلَى الْمُوسِعِ قَدَرُهُ وَعَلَى الْمُقْتِرِ قَدَرُهُ

مَتَاعاً بِالْمَعْرُوفِ حَقّاً عَلَى الْمُحْسِنِينَ﴾ (البقرة:٢٣٦) واته: تاوان نىيه لەسەرتان ئەگەر ژنانێك تەڵاق بدەن کە نەچوینە لایان، یا مارەییتان بۆ دانەنابن، بەڵام بەهرەمەندیان بکەن بە شتێك کە دڵیان باتەوە، وە ئەم (متعة)یە واجبە بە پێی دەوڵەمەندی و هەژاری پیاوە تەڵاق دەرەکە، وە ئەوەش مافێکی سابتە لەسەر چاکەکاران.

لە کۆڵ کەوتنی مارەیی:

پیاو هەموو مارەیی لە کۆڵ ئەکەوێ و هیچی لەسەر نامێنێ بیدات بەژن، لە هەموو جیابوونەیوەیەکدا پێش گواستنەوە و چوونەلا، ئەگەر لەلایەن ژنەکەوە بێت -وەك ئەوەی ژنەکە لە ئیسلام هەڵگەڕێتەوە، یا پەیمانەکە هەڵبوەشێنێتەوە لەبەر هەژاری پیاوەکە یا، عەیبداری، یا پیاوەکە پەیمانەکەی هەڵوەشاندەوە لەبەر عەیبداری ئافرەتەکە، یا پەیمانەکە بەهۆی هەڵبژاردنەوە لەگەورەییدا هەڵبوەشێتەوە، وە (متعة)شی بۆ پێویست نابێت، چونکە ژنەکە پێش ئەوەی بریتییەکەی تەسلیم کرێ لە بەینی بردووە، کەواتە هیچی ناکەوێ، وەك فرۆشیارێك کە شتە فرۆشراوەکە لەناو بەرێت پێش وەرگتنی کرپارەکە.

وە هەروەها مارەیی لە کۆڵ ئەکەوێ ئەگەر ئافرەتەکە گەردنی ئازاد بکات پێش چوونەلای، یا ئافرەتەکە بەخشیبێتی بە پیاوەکە، چونکە مارەیی لەو حاڵەتەدا لە کۆڵ ئەکەوێ بە لابردنی ژنەکە، چونکە مارەیی مافی تەواوی خۆیەتی.

زیاد کردنی مارەیی دوای مارەکردن:

ئەبو حەنیفە فەرموویەتی: زیادکردنی مارەیی دووای پەیمانەکە سابت ئەبێ کاتێ چووە لای ژنەکەی یا مرد، بەڵام ئەگەر تەڵاقیدا پێش چوونەلا ئەوە سابت نابێت، وە هەر نیوەی مارەیی ناوبراوی ئەکەوێت و بەس.

وە مالیك فەرموویەتی: زیادەکە سابت ئەبێ کاتێ گواستییەوە، بەڵام ئەگەر تەڵاقیدا پێش گواستنەوەی نیوەی مارەیی ئەکەوێ و نیوەی ئەو زیادەیە، بەڵام ئەگەر پیاوەکە مرد پێش گواستنەوەو پێش وەرگرتن بەتاڵ ئەبێتەوە. وە مارەیی ناوبراوی ئەکەوێ بە پەیمانەکە.

وە شافیعی فەرموویەتی: ئەو زیادەیە بەخششێکی دەست پێکراوەیە. ئەگەر وەریگرتبێ دروستە، وەئەگەر وەری نەگرتبێ بەتاڵ ئەبێتەوە.

ئەحمەد فەرموویەتی: حوکمەکەی وەك حوکمی مارەیی ئەصلی وایە.

**مارەیی نهێنی و مارەیی ئاشکرا:**

ئەگەر پەیمان بەستەکان بە نهێنی ڕێك کەوتن لەسەر مارەیی‌یەك و لەپاشاندا پەیمانەکەیان بە ئاشکرا بەست و بە زیاتر لەو مارەیی‌یە، پاشان تێك چوون و گەیشتنە لای قاضی. قاضی چۆن حوکم ئەکات؟

ئەبو یوسف ووتویەتی: بەوە حوکم ئەکات کە بەنهێنی لەسەری ڕێك کەوتوون، چونکە ویستی ڕاستەقینە دەردەخات و مەبەستی هەردوو پەیمان بەستەکەیشە.

وە ووتویانە: بەو مارەیی‌یە حوکم ئەدات کە ئاشکرا کراوە، چونکە ئەوە لە پەیمانەکەدا باس کراوە. وەئەوەی نهێنی‌یە خوا ئاگای لێیە، وە حوکم شوێن شتی دیار ئەکەوێ. ئەمەش مەزهەبی ئەبی حەنیفە و محمد و ڕواڵەتی قسەی ئەحمەدە کە ئەثرەم گێراویەتەوە, وە قسەی شەعبی و ئیبنوئەبی لەیلاو ئەبی عوبەیدە.

**وەرگرتنی مارەیی:**

ئەگەر ژنەکە بەتەمەن منداڵ بوو, باوك بۆی هەیە مارەیی‌یەکەی وەربگرێ، چونکە ئەو سەرپەرشتییاری ماڵەکەیەتی. لەبەر ئەوە بۆی هەیە وەری بگرێ وەك بۆی هەیە نرخی ئەو شتەی ئەیفرۆشێ وەربگرێ.

بەڵام ئەگەر باوك و باپیرەی نەبوو، سەرپەرشتییاری سامانەکەی بۆی هەیە مارەیی‌یەکە وەربگرێ، وە بیخاتە ئەو شوێنەوە کە لەلایەن حاکمەوە سەرپەرشتی ئەکرێ، وە نابێ تەسەررووفی پێوە بکات بە ئیزنی دادگای تایبەت نەبێت. بەڵام مارەیی بێوەژنی گەورە بۆ سەرپەرشتیارەکەی نی‌یە وەری بگرێ بە ئیزنی خۆی نەبێت، ئەگەر ژیر بوو، چونکە خۆی تەسەرف لەماڵی خۆیدا ئەکات. وە باوك ئەگەر بە ئامادەبونی خۆی ئەو مارەیی‌یەی وەرگرت وا دائەنرێ کە خۆی ڕێی پێدابێت، ئەگەر قسەی نەکرد، وە بەوە مارەیی لە ملی مێردەکە ئەبێتەوە، چونکە ڕێ پێدانی بۆ وەرگرتنی مارەیی‌یەکەی وەك وەرگرتنی نرخی ئەو شتە وەهایە کە فرۆشتویەتی‌و باوکی وەری ئەگرێ.

بەڵام لەبارەی کچی گەورەی ژیرەکەوە ووتراوە: باوك نابێت مارەیی‌یەکەی وەربگرێ بە فەرمانی خۆی نەبێت، ئەگەر گەورەو ژیر بوو، وەك بێوەژن.

وە وتراوە: باوك بۆی هەیە بەبێ ئیزنی کچەکە وەری بگرێ چونکە وا باوە, وە لەبەر ئەوەی لە بچووك ئەچێت.

## جیهازی بووك

جیهازی ئەو کەلوپەلانەیە کە ژنەکە خۆیو کەسوکاری ئامادەی ئەکەن بۆ ئەوەی لە ماڵەکەدا لەگەڵیا بێت، کاتێ پیاوەکە ئەیگوازێتەوە. وە وا باوبووە کە ژنەکە و کەسوکاری هەڵسن بە ئامادە کردنی جیهازی و کەلوپەلی ناوماڵ. ئەمەش شێوازێکە لە شێوازەکانی خۆشی خستنە دڵی ئافرەتەکەوە بە بۆنەی گواستنەوەی.

نەسائی لە عەلیەوە گێڕاویەتیەوە کە فەرمویەتی: پێغەمبەر ﷺ سەرچەفێك و جەوەندەیەك و پشتیەیەکی ئاخنراو بە إذخری کردە جیهازی فاطمة)[1] ئەمەش هەر باوێکە کەخەڵك لەسەری ڕۆیشتوون.

بەڵام ئەو کەسەی لێپرسراوە لەئامادەکردنی ماڵ بە ئامادەکردنێکی شەرعی، وە هەروەها ئامادەکردنی هەموو ئەو شتەی کەماڵ پێویستییەتی، لەکەل و پەل و فەرش و کەرەسەی ناوماڵ، ئەمانە هەموویان ئەرکی سەرشانی مێردە، و ژنەکە لەوبارەیەوە هیچ لێ پرسینەوەیەکی نییە، مارەییەکەی هەرچەندە بێت، یا زیادەی مارەیی یەکەش لەبەر کەلوپەلی ناوماڵ بوو بێت، چونکە مارەیی مافی تایبەتی ژنە لە بەرابەری ئەو ڕابووواردنەی کە لەگەڵیدا دەکرێ، نەك لە بەرابەری ئامادەکردنی کەل و پەلی ناوماڵی ژن و مێردایەتی، چونکە ئەو مارەیی یە تایبەتی خۆیەتی و تایبەتی هیچ کەسیتر نی یە، نە باوك، نە مێرد، نە هیچ کەسیتر مافی پێوەی نییە.

مالکییەکان ڕایان وەهایە: مارەیی مافی پەتی ژن نییە، لەبەر ئەوە بۆی نییە لێی سەرف بکات بۆ خۆی و قەرزی خۆی پێ بداتەوە، مەگەر ئەوەندەی کەپێویستی بێت و کەمێکی لێ خەرج بکات بە پێی باو، وە قەرزی کەمی لێ بداتەوە وەك دینارێك ئەگەر مارەیەییەکە زۆر بوو.

وە بۆیە لەو مارەیی هیچ نییە بۆ ژنەکە، چونکە لەسەریەتی کە جیهازی ئامادە بکات بۆ مێردەکەی بە پێی باو، واتە: بەو شێوەی کە باوە لەناو کۆمەڵدا بۆ کڕینی کەلوپەل بۆ مێردەکەی بەو مارەیییەی وەری ئەگرێ پێش گواستنەوە، ئەگەر حازر بوو، یا بەوەی لەدوای گواستنەوە وەری ئەگرێ ئەگەر دواخراو بوو، وە کاتی وەرگرتنەکەی هاتبوو پێش گواستنەوە، جا ئەگەر شتێکی نەدرایە تا دووای گواستنەوە، ئەوە ئەو ژنە بۆی هەیە هیچ شتێك لەمارەیی یەکە خەرج نەکات لەخۆیدا کە لەدووای گواستنەوەوە وەری گرتووە، مەگەر بە مەرج گیرابێت، یان لەناو خەڵکدا باوبێت.

(١) نسائي (٦/١٣٥).

بەڵام ئەگەر جیهازی‌یەکە ژنەکە بە پارەی خۆی کڕی بووی، یا باوکی بۆی کڕی بوو ئەوە مولکی رووتی ژنەکەیەو کەس مافی بە سەریەوە نی‌یە، نە مێرد نە کەسی تر، وە بۆی هەیە کە بهێڵێ مێردەکەی و کەس و کارەکەی سوودی لێ وەربگرێ، وەك چۆن بۆی هەیە نەهێڵێ کەس سوودی لێ وەربگرێ، وە زۆری لێ ناکرێ بۆ ئەوە.

مالیك ووتویەتی: مێرد بۆی هەیە سوود لە جیهازی ژنەکەی وەربگرێ سودێك کە باوبێت لەناو کۆمەڵدا.

## نەفەقە کێشان

مەبەست لە نەفەقەکێشان: ئامادەکردنی ئەو شتانەیە کە ژن پێویستی پێ‌ی هەیە لە خواردەمەنی و خانوو خزمەت کارو دەرمان هەرچەند ئافرەتەکە دەوڵەمەندیش بێت. وە نەفەقە پێویست بووە بە کیتابو سونەتو ئیجماع.

پێویست بوونی بە قورئان:

١-بە پێ‌ی فەرمودەی خوای گەورە: ﴿وَعَلَى الْمَوْلُودِ لَهُ رِزْقُهُنَّ وَكِسْوَتُهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ لا تُكَلَّفُ نَفْسٌ إِلَّا وُسْعَهَا﴾ (البقرة: من الآية٢٣٣). واتە: پێویستە لەسەر باوکان کە خۆراك و پۆشاك بۆ دایکە تەڵاق دراوە شیردەرەکان ئامادە بکەن، بە پێ‌ی شەرع و نەریت؛ چونکە خوا ئەرکێك ناخاتە سەر کەسێك کە توانای نەبێت.

٢- وە هەروەها فەرمودەی خوای گەورە: ﴿أَسْكِنُوهُنَّ مِنْ حَيْثُ سَكَنْتُمْ مِنْ وُجْدِكُمْ وَلا تُضَارُّوهُنَّ لِتُضَيِّقُوا عَلَيْهِنَّ وَإِنْ كُنَّ أُولاتِ حَمْلٍ فَأَنْفِقُوا عَلَيْهِنَّ حَتَّى يَضَعْنَ حَمْلَهُنَّ﴾ (الطلاق: من الآية٦) واتە: ئەو ژنانەی کە تەڵاقتان داون و لەکاتی عیددەکەیانان لەو شوێنانەدا دایان بنێن کە وەکو شوێنی خۆتانە، بەپێ‌ی دەسەڵاتتان، و زیانیان پێ مەگەیەنن بۆ ئەوەی تەنگیان پێ هەڵچنن، وە ئەگەر ئەو ژنانە دووگیان بوون نەفەقەیان بکێشن هەتا سکەکەیان دائەنێن.

٣- وە هەروەها فەرمودەی خوای گەورە: ﴿لِيُنْفِقْ ذُو سَعَةٍ مِنْ سَعَتِهِ وَمَنْ قُدِرَ عَلَيْهِ رِزْقُهُ فَلْيُنْفِقْ مِمَّا آتَاهُ اللَّهُ لا يُكَلِّفُ اللَّهُ نَفْساً إِلَّا مَا آتَاهَا﴾ (الطلاق: من الآية٧) واتە: با دەستەڵاتدار بەپێ‌ی دەستەڵاتەکەی خۆی نەفەقەی ئەو ژنە تەڵاق دراوەو منداڵەکەی بکێشێ، بەڵام ئەگەر کەسێك دەست کورت بوو با بەپێ‌ی ئەوە نەفەقە بکێشێ کە خوا پێ‌ی داوە, خوا داوا لە کەس ناکات بەپێ‌ی ئەوە نەبێ کە پێ‌ی داوە.

وە ئەما پێویست بوونی بە سوننەت:

١- موسلم ئەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ لە حەجی ماڵ ئاوایی‌دا فەرمویەتی: (فاتقوا الله في النساء فإنكم أخذتموهن بكلمة الله، واستحللتم فروجهن بكلمة الله، ولكم عليهن ألا يوطئن فرشكم أحدا تكرهونه، فإن فعلن ذلك فاضربوهن ضربا غير مبرح، ولهن عليكم رزقهن، وكسوتهن بالمعروف)[1].

واتە: ئەی باوەڕداران لە مامەڵەکە کردنتاندا لەگەڵ ئافرەتاندا لە خوا بترسن، چونکە بە ووشەی خوا ئەوانتان هێناوەو بە وشەی خوا حەڵاڵتان کردوون، وە ئەوانیش لەسەریانە ڕێ نەدەن بە کەسێك پێ بنێتە ماڵەکانتان کە پێتان ناخۆش بێت بێتە ماڵتان، ئەگەر ئەوەیان کرد لێیان بدەن لێدانێکی وا کە شوێنەواری دیار نەبێ، وە لەسەر ئێوە پێویستە خواردن‌و پۆشاکیان پێ بدەن بە چاکی.

٢- بوخاری و موسلیم لە عائیشەوە ئەگێڕنەوە خوا لێی ڕازی بێت: کە هیندی کچی عوتبە ووتی: ئەی نێرراوی خوا ئەبو سوفیان پیاوێکی بەخیلە هیچ نە بەخۆم و نە بە منداڵەکانم نادات، ئەوە نەبێت کە لێی هەڵئەگرم و ئاگای لێ نی‌یە، پێغەمبەر ﷺ فەرموی: (خذي ما يكفيك وولدك بالمعروف) واتە: ئەوەندە بەرە کە بەشی خۆت و منداڵەکەت بکات بەشێوەی عادەتی[2].

٣- لە موعاویەی قوشەیری‌یەوە (خوا لێی ڕازی بێت) کە فەرمویەتی: ووتم: ئەی نێرراوی خوا مافی ژنی هەریەك لە ئێمە چی‌یە لەسەری؟ فەرمووی: (تطعمها إذا طعمت وتكسوها إذا اكتسيت، ولا تضرب الوجه، ولا تقبح، ولا تهجر إلا في البيت)[3].

واتە: لەگەڵ خۆتا خواردن و پۆشاکی بۆ ئامادە بکە، لە سەرو چاوی نەدەیت و قسەی ناشیرینی پێ نەڵێی، وە لە ماڵەوە نەبێت جێی لێ دانەبڕێت.

بەڵام پێویست بوونی بە ئیجماع: ئیبنو قودامە ووتویەتی: زانایان هەموو لەسەر ئەوە ڕێکن کە نەفەقەی ژنانە پێویستە لەسەر مێردەکانیان ئەگەر باڵغ بن، ئەوانە نەبن کە خۆیان دانانیشن بەلای پیاوەکانیانەوە. ئیبنو مونزیرو کەسانی تر باسی ئەوەیان کردووە.

---

(١) البخاري (١٥٥٧) ومسلم (١٢١٨/١٤٧-١٥٠).

(٢) البخاري (٥٣٦٤) ومسلم (١٧١٤/٧).

(٣) أبوداود (٢١٤٤) والنسائي في (عشرة النساء ٢٨٩) وابن ماجه (١٨٥٠) والحاكم (٢/١٨٧-١٨٨) وابن حبان (٤١٧٥).

ووتویەتی: نەفەقەکێشان جۆرێك پەندی تێدایە، ئەویش ئەوەیە ئافرەتەکە بەندە لای پیاوەکە ڕێی کاسپی و کاروباری لێ ئەگرێ، لەبەر ئەوە پێویستە نەفەقەی بکێشێ.

**هۆی واجب بوونی نەفەقە:**

بۆیە یاسادانەری ئیسلام پێویستی کردووە لەسەر پیاو نەفەقەی ژنەکەی بکێشێ، چونکە ئەو ژنە بەپێی پەیمانی ژنومێردایەتی دروست ئەکەوێتە ملی ئەو پیاوەوە، و بەند ئەبێ لەبەر مافی پیاوەکە بۆ ئەوەی هەمیشە خۆشی لێ وەربگرێ، وە پێویستە لەسەر ژن کە گوێ ڕایەڵی پیاوەکەی بکات و لە ماڵەکەیدا بمێنێتەوەو سەرپەرشتی بکاتو منداڵەکانی پەروەردە بکات.

وە لەسەر پیاو پێوستە بەرامبەر ئەوانە پێویستییەکانی بۆ جێبەجێ بکاتو نەفەقەی بکێشێ، مادام ژنو مێردایەتی لە نێوانیاندا بەردەوام بێت و هەڵگەڕانەوە نەبێت لەلایەن ژنەکەوە، یا هۆیەك نەبێت کەڕێ لە نەفەقەکێشان بگرێ ئەمەش بەپێی ئەصلێکی گشتییە کە ئەڵێت: هەرکەس لەبەر ماف و سوودی کەسێك بەند بوو، ئەوە نەفەقەی لەسەر ئەو کەسەیە کە لە پێناوی دا بەند کراوە.

**مەرجەکانی شایستە بوونی نەفەقە**

بۆ شایستە بوونی نەفەقە ئەم مەرجانەی خوارەوە دائەنرێ:

١- ئەبێ پەیمانی ژنومێردایەتی دروست بێت و دامەزراوبێ.

٢- ئەبێ ئەو ئافرەتە خۆی بدات بە دەست مێردەکەیەوە.

٣- ڕێگا بدات کە خۆشی لێ وەربگرێ.

٤- مێردەکەی بۆ کوێ بگوێزێتەوە ئەم ڕێ گری نەبێت[1].

٥- ئەبێ هەردوکیان لەوانە بن کە خۆشی لەیەك وەربگرن.

جا ئەگەر مەرجێك لەم مەرجانە نەهاتبووە دی، نەفەقە پێویست نابێت.

چونکە ئەگەر پەیمانەکە دروست نەبوو؛ بەڵکو فاسید بوو, ئەوە پێویستە لەسەر هەردوکیان لەیەك جیا ببنەوە لەبەر نەهێلانی فەساد.

وە هەروەها ئەگەر ژنەکە خۆی نەدات بە دەست پیاوەکەوە, یا نەیتوانی پیاوەکە وەها لێبکات خۆشی لێ وەربگرێ، یا نەچوو لەگەڵیا بۆ ئەو شوێنەی ئەی گوێزایەوە, لەم شێوانەدا نەفەقە پێویست نابێت چونکە ئافرەتەکە بۆی بەند نەبووە، وە هۆی نەفەقە کێشانیش هەر ئەوەیە, وەك

(١) مەگەر بیبات بۆ جێگەیەك کە بیەوێ زیان بەژنەکە بگەیەنێ یان ژنەکە لە ماڵو گیانی ئەمین نەبێ.

چۆن نرخی فرۆشراو پێویست نابێ ئەگەر فرۆشیار شتەکە نەدات بەکڕیارەکە، یان پێی ئەدات لە شوێنێکی تایبەتیداو لە شوێنێکی تر نای داتێ. وە لەبەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ عائیشەی مارە کرد (خوا لێی ڕازی بێت) و دوای دووساڵ گواستیەوە، بەڵام نەفەقەی نەکێشا لەو کاتەوە نەبێت کە گواستیەوە, وە ئەوەی پێشووی نەداێ.

وە ئەگەر ژنەکە خۆی دا بە دەست پیاوەکەوە، بەڵام منداڵ بوو بەشێوەیەك کەسێکی وەك ئەو جیماعی لەگەڵ نەئەکرا. لای مالکیەکان و ئەوەی ڕاست بێت لە مەزهەبی شافیعیدا نەفەقە پێویست نابێت، چونکە مانای تەواوی خۆشی لێ وەرگتن بەجێ نەهاتووە، لەبەر ئەوە شیاوی نەفەقە نیە. وە ووتویانە: ئەگەر ژنەکە گەورە بوو بەڵام پیاوەکە بچوك بوو، ڕاستی ئەوەیە کە نەفەقە پێویست ئەبێت؛ چونکە توانین لەلایەنی ژنەکەوە بەدی هاتووە، بەڵام لەلایەن پیاوەکەوە بەدی نەهاتووە, لەوکاتەشدا نەفەقە لەسەر پیاو واجبەو وەك ئەوە وایە کە ئافرەتەکەی بدرێتە دەست و ئافرەتەکەش خۆی بدات بە دەستەوە بەڵام پیاوەکە لە دەستی ڕابکات. وە ئەوەی لای حەنەفیەکان فەتوای لەسەر دراوە: پیاو ئەگەر ئافرەتی منداڵی هێشتەوە لە ماڵەکەیدا بۆ ئەوەی بێتاقەتی خۆی پێ دەربکات، نەفەقە پێویست ئەبێت چونکە ڕازیە بەو مانەوە ناتەواوە, بەڵام ئەگەر لای خۆی نەیهێڵێتەوە نەفەقەی لەسەر پێویست نیە.

وە ئەگەر ژن خۆی بە دەستەوەدا بۆ پیاوەکە بەڵام بەشێوەیەکی وا نەخۆش بوو کە ڕێگەی لەوە دەگرت تێکەڵی بکات، لەو کاتەشدا نەفەقە واجبە لەسەر پیاو بۆ ئەو ژنە.

وە جوان نیە بۆ هاوبەشی ژیانو ژنو مێردایەتی، وە ئەو چاکەیەش نیە کە خوا فەرمانی پێ داوە کە نەخۆشی فەوتێنەر بێت بۆ نەفەقەی پێویستی ئافرەت.

وە ئەو ئافرەتەی شوێنی جیماعی داخرابوو وەك نەخۆش نەفەقەی ئەکێشرێ، وە کزی و لاوازیش وەك نەخۆشی ئەبێت، وەهەروەها ئەو عەیب دارەی کەرێ لە پیاو ئەگرێ بچێتە لای. وە هەروەها ئەگەر پیاوەکە توانای چونەلای نەبوو، یا چۆکی بڕرا بوو, یا خەساو بوو، یا نەخۆش بوو بە شێوەیەك توانای چونەلای ئافرەتی نەبوو، یا بەند بوو لەبەر قەرزاری یا تاوانێکی کردبوو، چونکە توانای خۆشی وەرگرتن لەلایەن ئافرەتەکەوە هەیە, بەڵام بەهانە لای پیاوەکەوەیەو پیاوەکە هۆیە, و ئافرەتەکەی ناخرێتە پاڵ بۆ کەمتەرخەمی چونکە پیاوەکە بۆخۆی مافی خۆی لە دەستی خۆی داوە.

وەنەفەقە پێویست نابێت ئەگەر ژنەکە لە ماڵی پیاوەکەوە بچێ بۆ ماڵێکی تر بەبێ ئەوەی پیاوەکە ڕێی پێ دابێت و بێ ڕوویەکی شەرعی, یا بەبێ ئیزنی پیاو چوو بۆ سەفەر، یا ئیحرامی حەجی بەست بەبێ ڕێدانی پیاو. بەڵام ئەگەر چووە سەفەر یا ئیحرامی بەست یا لەگەڵ پیاوەکەدا

چووە دەر ئەوە نەفەقەی هەر نەمێنێ، چونکە لە گاعەتی دەرنەچووە. وە هەروەها نەفەقە پێویست نیيە ئەگەر ژنەکەی رێی نەدا پیاوەکە بچێتە لای لەو ماڵەدا کە تێیدا دانیشتون بە مەرجێك ژنەکە داوای نەکردبێ کە لەوماڵە بیگوێزێتەوەو پیاوەکە نەیکردبێت. وە ئەگەر ژنەکە داوای گواستنەوەی لێ کرد لەو شوێنەداو پیاوەکە بەقسەی نەکرد, ئەمیش نەی هێشت بچێتە لای نەفەقە هەر پێویستە.

وە هەروەها نەفەقە پێویست نابێت ئەگەر ژنەکە بەندکرا لەبەر تاوان، یا قەرزاری، یا بە ستەم بەند کرابوو، مەگەر پیاوەکە خۆی ژنەکەی بەندی کردبێ لەبەر قەرزی خۆی کە بە ملی ژنەکەوە بێت، چونکە پیاوەکە خۆی مافی خۆی لەدەست داوە, هەروەها ئەگەر داگیرکەرێك بەزۆر غەصبی کردبوو لە پیاوەکەی دروخستبۆوە, ئەوکاتە شایستەی نەفەقە نیيە لە ماوەی غەصبیدا. وە هەروەها ئافرەتێکی خاوەن پیشە ئەگەر بچێ بۆ پیشەکەی و مێردەکەی رێی پێ نەدات ئەم هەر بچێت مافی نەفەقەی نیيە. وە هەروەها ئەگەر خۆی نەدا بە دەست پیاوەوە بەهۆی رۆژووی سوننەت یا ئیعتیکافی سوننەتەوە.

لە هەموو ئەو شێوانەدا ئافرەت مافی نەفەقەی نیيە، چونکە ئافرەتەکە مافی پیاوەکەی فەوتاندووە بەبێ هیچ روویەکی شەرعی. بەڵام ئەگەر مافەکەی بە هۆی رووبەکی شەرعی فەوتاندبێ، نەفەقە کێشانەکەی هەر ئەمێنێ و لەسەری لاناچێ، وەك چۆن ئەگەر ژنەکە لە رکێف و فەرمانی پیاو دەربچێ لەبەر ئەوەی شوێنی دانیشتنەکەیان شەرعی نیيە, یان لەبەر ئەوە مێردەکە ئاسایشی گیانیو ماڵی بۆ ژنەکە دابین ناکات.

**ژنێك بەبێ مێردەکەی موسڵمان ببێت:**

ئەگەر ژن و مێرد هەردووکیان بێ بڕوا بن، ژنەکە موسڵمان ببێت دوای گواستنەوە، بەڵام پیاوەکە موسڵمان نەبێت؛ نەفەقەی ژنەکە نابڕێ، چونکە خۆشی لێ وەرگتنی لەلایەن پیاوەکەوە رێی لێ گیراوە، کە ئەتوانێ لای بەرێ، بەوەی کە موسوڵمان بێت، کەواتە نەفەقەی ژنەکە نابڕێ، وەك موسڵمانێك وەهایە دورکەوتێتەوە لە ژنەکەی.

**هەڵگەڕانەوەی پیاو لە ئایین نەفەقە نابڕێ:**

ئەگەر پیاوەکە لە دووای گواستنەوە لە ئیسلام هەڵگەڕاوە، نەفەقەی ژنەکەی نابڕێ، چونکە خۆی بووەتە هۆی رێ لێ گرتنی چونەلا، کە ئەتوانێ ئەوە لا ببات بەوەی بگەڕێتەوە سەر ئیسلام, بە پێچەوانەی ئەوەوە ئەگەر ژنەکە لە ئایین هەڵبگەڕێتەوە، ئەوکاتە ژنەکە هیچ نەفەقەی ناکەوێت،

چونکە ژنەکە بۆخۆی بووەتە هۆی ڕێ گرتنی چوونە لا، بەهۆی ئەو سەرپێچی‌یەوە کە کردویەتی لەلایەن خۆیەوە، وە وەك ئەو ئافرەتەی لێ دێ کە خۆی بەلای مێردەوە دانەنیشێ.

**مەزهەبی ڤاهیری‌یەکان لە بارەی هۆی پێویست بوونی نەفەقەدا:**

ڤاهیری‌یەکان ڕایەکی تریان هەیە لە بارەی هۆی پێویست بونی نەفەقە، ئەویش خودی ژن و مێردایەتی‌یە، جا لە هەر شوێنێك ژن و مێردایەتی پەیدابوو نەفەقە پێویست ئەبێت.

لەسەر مەزهەبی خۆیان نەفەقە کێشانی ژنێك کە منداڵ بێت و ئەو ژنەش کە سەرپێچی کەربێت (ناشزە) بە واجب دەزانن. بەبێ ئەوەی سەیری ئەو مەرجانە بکرێت کە زانایانی تر ووتویانە.

ئیبنوحەزم ووتویەتی: پیاو ئەبێ نەفەقەی ژنەکەی بکێشێ لەو کاتەوە مارەی ئەکات. داوای گواستنەوەی کردبێ یا نەی کردبێ، ئەگەر لەسەر پشتی بێشکەش بێت، دانیشێ بەلای مێردەوە یا دانەنیشێ. دەوڵەمەند بێت یا هەژار، باوکی هەبێت یا هەتیو بێت، کچ بێت یا بێوەژن بێت ئازاد بێت یا کۆیلە بە پێی حاڵی خۆی[1].

وە ووتویەتی: ئەبوسولەیمان و هاوەڵەکانی و سوفیانی پهوری ووتویانە: نەفەقە پێویستە بۆ بچووك لەو کاتەوە مارەی ئەبڕێ. حەکەمی کوڕی عوتەیبە فەتوای داوە ـ دەربارەی ئافرەتێك بەتوڕەیی لە ماڵی مێرد بچێتە دەر ـ: ئایا نەفەقەی بۆ هەیە؟ ووتویەتی: بەڵێ.

ووتویەتی: نەبیستراوە لە هیچ صەحابەیەکەوە قەدەغە کردنی نەفەقە لە ئافرەتی ناشیزە، ئەوە تەنها شتێکە لە نەخەعی و شەعبی‌یەوە گێڕراوەتەوە، وە لە حەمادی کوڕی ئەبی سلیمان و حەسەن و زوهری‌یەوە. وە پێشمان وانی‌یە کە هیچ بەڵگەکەیەکیان هەبوبێت. ئەوە نەبێت کە ووتویانە: نەفەقە بەرامبەر جیماعە. ئەگەر ڕێی لە جیماع گرت نەفەقەی لێ قەدەغە ئەکرێت. قسەکەی کۆتایی هات بە دەستکاری‌یەکی کەمەوە.

**دانانی نەفەقەو بناغەکەی:**

ئەگەر ژن لەگەڵ مێرددا دانیشتبوو, پیاوەکەش نەفەقەی ئەکێشا، وە خۆی سەرپەرشتیکەری بوو, بۆ پەیدا کردنی خواردنو پۆشاكو گەلێ شتی تر، ئیتر بۆ ژن نی‌یە لەم شێوەیەدا داوای نەفەقە بکات، لە کاتێکدا پیاوەکە هەڵسابێت بە ئەرکی خۆی.

بەڵام ئەگەر پیاوەکە چروك بوو بەتەواوی نەفەقەی ژنەکەی نەئەکێشا، یا بەبێ نەفەقە ئەی هێشتەوە بەبێ حەق، لەم شێوەیەدا ژنەکە بۆی هەیە داوای نەفەقە کێشانی بکات لە خواردنو

(١) المحلی (ج١٠).

پۆشاك‌و شوێن‌و جێگا, وە قاچی بۆی هەیە نەفەقە لەسەر مێردەکەی پێویست بکات و زۆر لە مێردەکەی بکات هەرکاتێك بۆی دەرکەوت کە ژنەکە ڕاست ئەکات.

هەروەها ئافرەتەکە بۆی هەیە لە ماڵی مێردەکەی ببات ئەوەندەی کە بەشی خۆی‌و منداڵەکانی ئەکات بەپێی عادەت [1] با مێردەکەش پێی نەزانێ؛ چونکە خۆی ڕێی لەو پێویستە گرتووە کە ڕەوایە بە ئافرەتەکەو مافی خۆیەتی، وە بۆ خاوەن ماف هەیە مافی خۆی بسێنێ بە دەستی خۆی هەرکاتێ توانی بە دەستی بهێنێ. بنەمای ئەمەش ئەوەیە کە ئەحمەدو بوخاری‌و مسلیم‌و ئەبوداودو نەسائی گێڕاویانەتەوە لە عائیشەوە (خوا لێی ڕازی بێت): کە هیند ووتی: ئەی نێرراوی خوا ئەبو سوفیان پیاوێکی چروك و ڕستە، ئەوەندەم ناداتێ بەشی خۆم و منداڵەکانم بکات، ئەوە نەبێ کە ئەو ئاگای لێ نی‌یەو هەڵی ئەگرم؟ پێغەمبەر ﷺ فەرموی: (خذي ما يكفيك وولدك بالمعروف) واتە: ئەوەندەی بەشی خۆت‌و کوڕەکەت بکات بە پێی عادەت هەڵبگرە لە ماڵەکەی [2].

لەم فەرمودەیەدا بەڵگەی ئەوە هەیە کە نەفەقە ئەوەندە دائەنرێ کە بەشی ژنەکە بکات لەگەڵ بەستنەوەی بە عورف و عادەتەوە، واتە: ئەوەی کە باوە لە نێوان جۆرەکانی خەڵکدا بە لە پێش چاوگرتنی بەشی زۆریان، بەڵام ئەمەش بە گوێرەی شوێن و کات و حاڵەتەکان و کەسەکان ئەگۆڕێت.

خاوەنی (الروضة الندية) ڕای وەهایە: کە بەشکردن بە نیسبەت خواردەمەنی‌یەوە هەموو ئەو شتانە ئەگرێتەوە کە ئافرەت پێویستی پێی هەیە. میوەش ئەگرێتەوە, وە ئەوەی کە خەڵك لەسەری ڕاهاتووە لە جەژناندا بکرێ، وە هەموو ئەو شتانەی کە هەمیشە خەڵك لەسەری ڕاهاتوون، بەشێوەیەك ئەگەر نەبێ زیانی هەیە، یا هۆی شەڕوشۆڕو تورە بوون لەیەك دەبێ.

ووتویەتی: هەروەها دەرمان و ڕێنەی ئەویش ئەگرێتەوە, وە فەرمووەدەکەی خوا ئیشارەت بۆ ئەوە ئەکات کە ئەفەرموێ: ﴿وَعَلَى الْمَوْلُودِ لَهُ رِزْقُهُنَّ وَكِسْوَتُهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ﴾ (البقرة: من الآية ٢٣٣) واتە: وە لەسەر باوکانە کە خۆراك و پۆشاکی ژنە تەڵاق دراوە شیردەرەکان بدەن، بە پێی عادەتی ئەو شوێنە. ئەمەش دەقێکە دەربارەی جۆرێك لە جۆرەکانی نەفەقە: کە پێویستە لەسەر ئەو کەسەی کە نەفەقەی کۆمەڵێکی لەسەرە ڕزق و ڕۆزی‌یان بدات، وە ڕزق ئەو دەرمان و شتە ئەگرێتەوە کە ئێمە باسمان کرد، لەپاشاندا خاوەنی (الروچە) باسی ڕای هەندێ لە زانایانی کردووە دەربارەی

---

(١) بەمەرجێ ژنەکە ژیربێ‌و دەست بڵاوی نەکات لە وەرگرتنەکەدا.

(٢) تەخریجی ئەم حەدیسە ڕابورد.

ئەوەی کە نرخی دەرمان و کرێی دکتۆر پێویست نییە، چونکە ئەوە بۆ پاراستنی لاشەی مرۆڤە، وەك چۆن لەسەر خاوەن خانو کرێی چاك کردنەوەی ئەو شوێنەی ئەڕوخێ لە خانوو پێویست نییە بیدات بە کرێچی.

وە ئەو قسەیەی پێش خستووە کە چارەسەرکردنیش هەر نەفەقەیە، وە ئەویش پێویستە، وە وتویەتی: کە خاوەنی (الغيث)یش ووتویەتی: بەڵگەکە ئەوەیە کە دەرمان بۆ پاراستنی گیانە کەواتە وەکو نەفەقە وایە.

ووتویەتی: ئەوی ڕاستی بێت ئەوانەش ئەکەونە بەر گشتی‌یەتی ئەو فەرمودەیەی پێغەمبەر ﷺ کە فەرمویەتی (مايكفيك) وە بەر فەرمودەی خوای گەورە: ﴿رزقهن﴾ الآية، چونکە (صيغه)دا ڕشتەی یەکەم گشتی‌یە بەهۆی بوونی ووشەی (ما)وە وە دووەمیش گشتی‌یە، چونکە (مصدرێکی مضاف)ە کە لە صیغە گشتی‌یەکانە, وە تایبەت کردنی ئەو (مصدر)ە کە (رزق)ە بە هەندێ موستەحەق ڕێ لەوە ناگرێ کە ئەوەش بگرێتەوە. ووتویەتی: لە هەموو ئەوانەی باسمان کرد, بۆت ڕوون ئەبێتەوە کە ئەوەی پێویستە لەسەر ئەوکەسەی نەفەقەی ئەوانە ئەکێشێ کەوا نەفەقەیان لەسەرێتی، ئەوەندەیە کە بە چاکی بەشی‌یان بکات، ئیتر مەبەست ئەوە نی‌یە کە کار بدرێتە دەست ئەوکەسەی کە نەفەقەی بۆ ڕەوایە بە دەستی خۆی وەری بگرێ، لە ترسی ئیسراف و زیادەڕەوی لە هەندێ حاڵتا، بەڵکو مەبەست ئەوەیە, ئەوەندەی بدرێتێ کە بەشی بکات بەشێوەیەك ئیسرافی تێدا نەبێت, دوای ڕوون کردنەوەی ئەو بڕەی بەشی ئەکات بە قسەی ئەوانەی کە خاوەن تەجروبەن لەو بارەیەوە, وە ئەوەیە واتای فەرمودەی پێغەمبەر ﷺ کە ئەفەرموێ: ﴿بالمعروف﴾ واتە نەك بە غەیر (معروف) کە ئەویش دەست بڵاوی و چروکی‌یە.

بەڵێ ئەگەر پیاوەکە ئەو نەفەقەیەی لەسەری بوو نەیدا. دروستە بۆمان ڕێ بەو کەسە بدەین کە نەفەقەی بۆ ڕەوایە خۆی وەری بگرێت ئەوەندەی کە بەشی ئەکات، ئەگەر لەوانە بوو کەژیر بێت، نەك لەوانە بێت کەماڵ بە فیڕۆ ئەدەن. چونکە ئەوکەسە دروست نی‌یە وای لێ بکرێ کە خۆی وەری گرێ و دەستی بگاتە ماڵی ئەوکەسەی نەفەقەی لەسەرە، لەبەر ئەوە خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿وَلَا تُؤْتُوا السُّفَهَاءَ أَمْوَالَكُمُ﴾ (النساء: من الآية٥). واتە: ماڵەکانتان مەدەنە دەست کەم ئاوەزەکانتان بەخۆڕایی بە فیڕۆی بدەن.

پاشان ووتویەتی: بەڵام پێویستە لەسەرمان ئەگەر ئەو کەسەی کە نەفەقەی لەسەر بوو یاخی بوو، وە ئەوەی کە مافی نەفەقەی هەیە ژیر نەبوو, وەها بکەین کە سەرپەرشتیاری کەم عەقڵ و ئاوەز نەفەقە وەربگرێ یا پیاوێکی‌دادوەر، وەری بگرێ –تەواو-.

وه لەو شتانەی کە پێویستە لەسەر پیاو بۆ ژن لە نەفەقە ئەوەی کە پێویستی پێیەتی لە شانەو صابونو چەوری و هەموو ئەو شتانەی کە پاك و خاوێنی پێ ئەکات.

وه شافعی‌یەکان ووتویانە: بەڵام بۆنی خۆش ئەگەر مەبەست لێی لابردنی بۆنی ناخۆش بێت؛ ئەویش پێویستە لەسەر نەفەقەکێش چونکە مەبەست لێی پاك کردنەوەیە، بەڵام ئەگەر مەبەست لێی بۆخۆشی و ڕابواردن بێت، ئەوە پێویست نی‌یە، چونکە ئەوە مافی پیاوە، کەواتە زۆری لێ ناکرێ.

ڕای حەنەفی‌یەکان:

حەنەفی‌یەکان ڕایان وایە نەفەقە بە یاسای ئیسلام تەقدیر نەکراوە. تەنها ئەوەیە کە پێویستە لەسەر پیاو ئەوەندە بدات بە ژنەکەی کە بەشی بکات لە خواردنو داوو دەرمان و گۆشتو سەوزەوات میوەهاتو زەیت و ڕۆن و هەموو ئەو شتانەی کە بۆ ژیان پێویستە بە پێی عورفو نەریت، وه ئەوەش بە پێی جیاوازی شوێن و کات و حاڵەت ئەگۆڕێت.

هەروەها پێویستە پۆشاکی ژنەکە لە هاوینو زستاندا دابین بکرێت . وه ڕایان وەهایە تەقدیر کردنی نەفەقەی ژن لەسەر پیاوەکەی بەپێی ماڵی پیاوەکەیە، لە بەدەستەلاتی و کەم دەستی‌دا، جا حاڵی ژنەکە هەر چۆن بێت جیاوازی نی‌یە؛ بەپێی فەرمودەی خوای گەورە: ﴿لِيُنْفِقْ ذُو سَعَةٍ مِنْ سَعَتِهِ وَمَنْ قُدِرَ عَلَيْهِ رِزْقُهُ فَلْيُنْفِقْ مِمَّا آتَاهُ اللَّهُ لا يُكَلِّفُ اللَّهُ نَفْساً إِلَّا مَا آتَاهَا سَيَجْعَلُ اللَّهُ بَعْدَ عُسْرٍ يُسْراً﴾ (الطلاق:٧). واتە: با دەستەلات دار بەپێی دەسەلاتەکەی نەفەقەی ژنە تەلاق دراوەکەی و منداڵەکەی بکێشێ، وه هەرکەس دەست کورت بوو با ئەوەندە بدات کە خوا پێی داوە، وه خوا داوا لە هیچ نەفسێك ناکات لەتوانای خۆی زیاتر، وه بەدوای هەموو ناخۆشی‌یەك خۆشی و ئاسانی ئەنێرێ.

هەروەها ئەفەرموێ: ﴿أَسْكِنُوهُنَّ مِنْ حَيْثُ سَكَنْتُمْ مِنْ وُجْدِكُمْ﴾ (الطلاق: من الآية٦) واتە: ژنە تەلاق دراوەکان کە لەکاتی عیددەیان لەو شوێنەی کە خۆتان تێیدا دانیشتون دایان بنیشێنن بە پێی تواناتان.

مەزهەبی شافعی‌یەکان لە دانانی نەفەقەدا

شافیعی‌یەکان بەوە وازیان نەهێناوە کە نەفەقە بەوە دابنێن چەندی بەش ئەکات، بەڵکو ووتویانە: نەفەقە بەپێی یاسای ئیسلام دانراوە، هەرچەندە لەگەڵ حەنەفی‌یەکان ڕێکن لەوەدا کە ئەبێ بەپێی حاڵی پیاوەکە بێت لە دەوڵەمەندی و هەژاریدا، وه پێویستە لەسەر پیاوی بە دەسەلات (کە توانای نەفەقەکێشانی هەیە بە سامان و کارەکەی) هەموو ڕۆژێك دوو مود خۆراك بدات، وه پێویسە

لەسەر دەست کورت کە ناتوانی نەفەقە بکێشێ بە ماڵ و کاسبی، ڕۆژی مودەدێك بدات، وە لەسەر دەسەلاّت ناوەند پێویستە مودەدێك‌و نیو بدات, وە بەڵگەشیان بۆ ئەو بۆچوونەیان فەرمودەی خوای گەورەیە: ﴿لِيُنْفِقْ ذُو سَعَةٍ مِنْ سَعَتِهِ وَمَنْ قُدِرَ عَلَيْهِ رِزْقُهُ فَلْيُنْفِقْ مِمَّا آتَاهُ اللَّهُ﴾ (الطلاق: من الآية٧) کە لە پێشەوە ڕون کراوەتەوە.

ووتویانە: خوای گەورە بە دەسەلاّت‌و کەم دەستی لەیەك جیاکردۆتەوە, وە لەسەر هەریەکەیان بەپێی حاڵیان نەفەقەی پێویست کردوە. بەلام چەندێتی‌یەکەی دیاری نەکردووە لەبەر ئەوە پێویستە بە ئیجتیهاد دابنرێ. وە ئەوەی کە لە نەفەقە ئەچێت‌و نەفەقەی لەسەر قیاس ئەکرێ, خواردنی کەفارەتی سوێندە. چونکە خواردەمەنی‌یەکە بە یاسای ئیسلام پێویست کراوە بۆ تێرکردنی برسی‌یەکان، وە زۆرترینی کە پێویستە لە کەفارەتدا بۆ هەژار دوو مودەدە لە بریتی (أذي) ئازاردان، وە کەمترینیش کە پێویست بێت مودەدێکە لە کەفارەتی جیماعی ڕەمەزامەندا ئەدرێ، بەڵام ئەگەر کەسەکە حاڵی مام ناوەندی بوو ئەبێ مودەدو نیوێك بدات؛ چونکە ناتوانرێ ببەسترێ بە دەوڵەمەندی تەواوەوە، چونکە لە خوار دەوڵەمەندەوەیە، و نابەسترێ بە فەقیریشەوە چونکە لەسەرو ئەوەوەیە.

وە ووتویانە: ئەگەر دەرگای کیفایەت و بەس بوون بۆ ئافرەتان بکرایەوە ئاژاوەیەك دروست ئەبوو کە ئەوپەڕی دیار نەبێ، کەواتە ئەبی نەفەقە بە گوێرەی عورف و عادەت بێ، بەم شێوەیە چەندەی پێویستە دەبێ بیدرێتێ، وە ئەوەش خیلافێکە هەر دروست ئەبێت لەسەر خواردەمەنی‌و پێخۆرو گۆشت و میوەهات.

وە ووتویانە: پۆشاکیش هەر پێویستە لەسەر پیاو لەگەڵ ئاگاداری کردنی حاڵی پیاوەکە لەکەم دەستی‌و بە دەسەلاّتیدا. بۆ ئافرەتی پیاوی دەوڵەمەند ئەبێ پۆشاکێك بکڕێ کەلەو شارەدا باوە بۆ دەوڵەمەند لە قوماشی بەنرخ. بەڵام بۆ پیاوی کەم دەست قوماشی ئەستووری لۆکەو کەتان‌و ئەو شتانە ئەبێ بکڕێ، بەلاّم بۆ پیاوی حاڵ مام ناوەندی، مام ناوەندی بۆ بکڕێ.

هەروەها پێویستە جێ و شوێنی بۆ دابین بکرێ بە پێی بە دەستەلاّتی و کەم دەستی و مام ناوەندی حاڵ, لەگەڵ دابین کردنی کەلوپەل بۆ ئەو شوێنە بەپێی حاڵەتی پیاوەکە.

وە ووتویانە: ئەگەر پیاوەکە فەقیر بوو ئەبێ نزمترین خۆراك‌و پێخۆر بۆ ئەو ژنە دابین بکات بە مەرجێ بەپێی عورف بێت. وە هەروەها پۆشاکیش نزمترین پۆشاکی زستانەو هاوینە. بەڵام ئەگەر حاڵی مام ناوەند بوو، ئەبێ لەوە بەرزتری بۆ بکات لە پۆشاك‌و خواردەمەنی بە عادەتی. وە بۆیە

ئەبێ نەفەقەو پۆشاك بە پێی عورف و عادەت بێت, چونکە لابردنی زیان لە ژن پێویستە، ئەوەش بە پێویست بوونی مام ناوەند لە کیفایەتدایە، کە ئەوەیە مانای (المعروف)

**دانانی نەفەقە بە شت یا بە پارە:**

دروستە کە نەفەقە بدرێ بەشیوەی نان و پێخۆرو پۆشاك لە هەموو جۆرێك، وەك دروستیشە نرخی ئەو شتانە بدرێ کە هەرچی پێویست بێت پێی بکرێ، وە دروستە نەفەقەکە سالانە یا مانگانە یا هەفتانە یا رۆژانە بەو شێوەیەی بۆ پیاوەکە ئاسان بێت.

**گۆڕانی نرخی شتومەك یا گۆڕانی وەزعی مالی پیاوەکە:**

ئەگەر نرخی شت گۆڕا دوای کاتی دانانی نەفەقەکە، یا حالی مالی پیاوەکە گۆڕا، جا ئەو گۆڕانە یا نرخ زیاد ئەکات یا کەم ئەکات، یان حالی مالی پیاوەکە گۆڕا بە چاکە یا خراپە, ئەوە پێویستە ئاگاداری هەموو ئەو حالەتانە بکرێ, ئەگەر نرخی شت زیادی کرد دوای دانانی شتەکە، بۆ ژنەکە هەیە داوای ئەو زیادەیە بکات لە نەفەقەکەیدا. بەلام ئەگەر نرخی شت کەمی کرد بۆ پیاوەکە هەیە داوای کەم کردنەوەی نەفەقەکە بکات.

وە ئەگەر حالی مالی پیاوەکە چاکتر بوو لەوکاتەی نەفەقەکە دانرابوو؛ ئەوە بۆ ژنەکە هەیە داوای نەفەقەی زیاد بکات, بەلام ئەگەر حالی مالی پیاوەکە بەرەو خراپ بوون چوو, ئەوە مافی پیاوەکەیە کە داوای کەم کردنەوەی نەفەقە بکات.

**هەلە کردن لە دانانی نەفەقەدا:**

ئەگەر دەرکەوت دوای دانانی نەفەقەکە کە دانانەکە هەلە بووەو بەشی ژنەکە ناکات، بە پێی حالی پیاوەکە، لە کەم دەستیو دەولەمەندی، مافی ژنەکەیە کە داوای چاو پیا گێڕانەوە بە دانانەکەدا بکات, وە لەسەر قاچی پێویستە ئەوەندەی بۆ دابنێ کە بەشی خواردنو پۆشاکی بکات لەگەل تێبینی کردنی حالی پیاوەکە.

**قەرزاری نەفەقە بەقەرزی ڕاستەقینە دائەنرێ لە گەردنی پیاودا:**

ووتمان: کە نەفەقەی ژن پێویستە لەسەر پیاو هەرکاتێ ئەو مەرجانە هاتە دی کە لە پێشەوە باس کرا. وە هەرکاتێ نەفەقەی ژن لەسەر پیاو پێویست بوو لەبەر بوونی هۆیەکانی، وە مەرجەکانی بەدی هات، پاشان پیاوەکە نەیدا، ئەوە ئەبێت بە قەرز لەسەر شانی و وەکو ئەو قەرزانەی تری لێ دێ کە بە دانەوە نەبێت، یان بە گەردن ئازاد کردن، لە مل ناکەوێت. ئەمە بۆچونی شافیعی‌یەکانە.

**گەردن ئازاد کردن لە قەرزی نەفەقە یا بەرامبەر کردنی:**

ئەگەر ئەو نەفەقەیەی کە مافی ژنە دابنرێ بە قەرز لە ئەستۆی پیاودا لەو کاتەوە کە بەبێ حەقێکی شەرعی نەیداوەتێ، ئەوە ژنەکە بۆی هەیە گەردنی ئازاد بکات لەهەمووی یا هەندێکی ئەو قەرزە.

بەڵام ئەگەر لەوە گەردنی ئازاد بکات کە هێشتا نەهاتووەو نەبۆتە قەرز لەسەر پیاوەکە دروست نییە؛ چونکە گەردن ئازاد کردن ئەبێ لە قەرزێکدا بێت کە فیعلاً سابت بێت وە گەردن ئازاد کردن لە مانگێکی داهاتوو یا ساڵێکی داهاتوو ئەگەر نەفەقەکە مانگانە بێت یا ساڵانە بێت- ئەوە دروستە و لەوەی باس کرا جیا ئەکرێتەوە.

وە ئەگەر نەفەقەکە بە قەرزێکی صەحیح دانرا کە لە کۆڵ ناکەوێ بە دانەوە یا بەگەردن ئازاد کردن نەبێت، وە پیاوەکە قەرزی هەبوو لەسەر ژنەکە، وە یەکێکیان داوا بکا کە بەرامبەر بکرێن دروستە داوا کەی بێتە جێ، لەبەر یەکسان بوونی هەردوو قەرزەکە.

حەنبەلیەکان ڕای خۆیان هەیە لەو ئاڵو گۆڕ کردنەدا, ئەوان ژنی دەوڵەمەندو هەژار لەیەك جیا ئەکەنەوە. جا ئەگەر ژنەکە دەوڵەمەند بوو بۆ پیاوەکە هەیە, قەرزەکەی بخاتە بریتی نەفەقەکە. چونکە هەرکەس حەقێکی بەسەرەوە بوو بۆی هەیە لە هەر ماڵێك کەهەیەتی بیداتەوە. ئەو قەرزەش لە ماڵەکەیەتی.

بەڵام ئەگەر ژنەکە هەژار بوو پیاوەکە بۆی نییە ئەوە بکات؛ چونکە قەرز دانەوە ئەبێ لە ماڵی زیاد بدرێتەوە، وە ئەو قەرزە کە لایەتی لەخۆی زیاد نییە، وە چونکە خوای گەورە فەرمانی داوە بە مۆڵەت دانی قەرزداری هەژار. وە فەرمویەتی: ﴿وَإِنْ كَانَ ذُو عُسْرَةٍ فَنَظِرَةٌ إِلَى مَيْسَرَةٍ﴾ (البقرة: من الآية۲۸۰) واتە: وە ئەگەر قەرزدارەکە دەست کورت بوو، ئەوە مۆڵەتی پێ بدەن هەتا خوا شتێکی بۆ ئاسان ئەکاو قەرزەکان ئەداتەوە.

**پێش خستنی نەفەقەو ڕوودانی شتێك کە بێتە هۆی ڕەوا نەبوونی نەفەقە:**

ئەگەر پیاوەکە بە پەلە نەفەقەی ماوەیەکی داهاتوویدا وەك مانگێك، یا ساڵێك بۆ نمونە، لەپاشاندا شتێکی وا ڕوویدا کە ئەو ژنە نەفەقەی پێ ڕەوا نەبێت، وەك ئەوەی ژنو مێردەکە یەکێکیان بمرن, یا ژنەکە بەلایەوە دانەنیشت؛ بۆ پیاوەکە هەیە داوای گێڕانەوەی ئەو نەفەقەیە بکات کە ژنەکە بەلایەوە ماوە.

چونکه بۆیە وەری گرتووە کە بەندە لەبەر مێردەکەی, جا کاتێ ئەو بەندی‌یە نەما بە مردن یا بە دانەنیشتن، ئەبێ ئەو نەفەقەیە بگێڕێتەوە کە لە پێشەوە دراویەتیێ، بۆ ئەو ماوەی کە ماوەتەوە. ئیمامی شافیعی و موحەممەدی کوڕی حەسەن بۆ ئەوە چوون.

**نەفەقەی ژنێك لە عیددەدا بێت:**

ژنی عیددەکێشی تەلاقی ڕەجعی و ئافرەتی عیددەکێشی دوگیان نەفەقەیان بۆ ڕەوایە؛ بە پێی فەرموودەی خوای گەورە دەربارەی ئافرەتی تەلاق دراوی ڕەجعی: ﴿أَسْكِنُوهُنَّ مِنْ حَيْثُ سَكَنْتُمْ مِنْ وُجْدِكُمْ﴾ (الطلاق: من الآية٦). واتە: خۆتان لە کوێ دائەنیشن لەوێدا نیشتەجێیان بکەن بەپێی توانا و دەسەلاتی خۆتان.

وە هەروەها دەربارەی تەلاق دراوە دووگیانەکان ئەفەرموێ: ﴿وَإِنْ كُنَّ أُولاتِ حَمْلٍ فَأَنْفِقُوا عَلَيْهِنَّ حَتَّى يَضَعْنَ حَمْلَهُنَّ﴾ (الطلاق: من الآية٦) واتە: ئەگەر دووگیان بوون نەفەقەیان بکێشن هەتا زگەکەیان دائەنێن.

ئەم ئایەتە ئەبێتە بەڵگەی ئەوەی کە نەفەقە پێویستە بۆ دووگیان لە تەلاقی ڕەجعی‌دا بێت، یا لە بائیندا، یا عیددەکەی عیددەی مێرد مردن بێت.

بەڵام تەلاق دراوی بائین زانایان جیاوازن لە پێویست بوونی نەفەقە بۆی، ئەگەر دوگیان نەبوو، سێ ووتەی لەسەرە:

١- ژنەکە شوێنی دانیشتنی بۆ هەیە بەڵام نەفەقەی بۆ نی‌یە، ئەمەش قسەی مالیك و شافیعی‌یە بەڵگەشیان فەرمودەی خوای گەورەیە کە فەرمویەتی: ﴿أَسْكِنُوهُنَّ مِنْ حَيْثُ سَكَنْتُمْ مِنْ وُجْدِكُمْ﴾ (الطلاق: من الآية ٦).

٢- نەفەقەو شوێنی دانیشتنی بۆ هەیە, ئەمەش ووتەی عومەری کوڕی خەططاب و عومەری کوڕی عبدالعزیزو پەوری و حەنەفی‌یەکانە, بەڵگەشیان بۆ قسەکەیان گشتێتی فەرموودەی خوای گەورەیە: ﴿أَسْكِنُوهُنَّ مِنْ حَيْثُ سَكَنْتُمْ مِنْ وُجْدِكُمْ﴾ (الطلاق: من الآية ٦).

ئەمە دەقێکە لەسەر پێویست بونی شوێنی دانیشتن، جا هەرکاتێ شوێنی دانیشتن بەپێی شەرع پێویست بوو نەفەقەش پێویست ئەبێت لەبەر ئەوەی نەفەقە لەگەڵ جێی دانیشتنە لە تەلاقی ڕەجعی و دوگیان و لە خودی ژنو مێردایەتی‌دا.

عومەرو عائیشە خوا لێیان ڕازی بێت ئینکاری ئەو حەدیسەیان ئەکرد کە فاطمەی کچی قەیس گێڕابویەوە. وە عومەر ئەیفەرمو: کتێبی خواو سوننەتی پێغەمبەر ﷺ واز لێ ناهێنین بۆ قسەی ژنێك کە نازانین لەوانەیە لەبیری بێت یا لەبیری چوبێت[1].

کاتی ئەوە گەیشتەوە بە فاطمە وەتی: (کتێبی خوا لەنێوان من و لەنێوان ئێوەدا بێت). خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ وَأَحْصُوا الْعِدَّةَ وَاتَّقُوا اللَّهَ رَبَّكُمْ لا تُخْرِجُوهُنَّ مِنْ بُيُوتِهِنَّ وَلا يَخْرُجْنَ إِلَّا أَنْ يَأْتِينَ بِفَاحِشَةٍ مُبَيِّنَةٍ وَتِلْكَ حُدُودُ اللَّهِ وَمَنْ يَتَعَدَّ حُدُودَ اللَّهِ فَقَدْ ظَلَمَ نَفْسَهُ لا تَدْرِي لَعَلَّ اللَّهَ يُحْدِثُ بَعْدَ ذَلِكَ أَمْراً﴾ (الطلاق: من الآية١).

واتە: ژنەکانتان لە عیدەکەیاندا ـ واتە لەپاکی‌یەکدا کە نزیکی تیا نەکرابێ ـ تەڵاق بدەن‌و عیدەکە حساب بکەن‌و لە خوای پەروەردگارتان بترسن, دەریان مەکەن لەماڵەکانتاندا، تا عیددەکەیان تەواو ئەبێت، وە نابێت دەرچن لە ماڵ مەگەر ئەوانەی کە کاری خراپی ئاشکرایان کردبێ, ئەوانە ئەحکامی خوایە بۆ بەندەکانی داناوە، وە هەرکەس لە حوکمەکانی خوا دەرچێ ئەوە ستەمی لە خۆی کردووە، تۆ ـ ئەی تەڵاق دەر ـ نازانی لەوانەیە خوا دوای ئەوە کارێکی تر بەدی بهێنێ‌و بیگێڕێتەوە.

جا چ کارێك دوای سێ تەڵاقە دروست ئەبێت‌و دێتەدی[2]!.

٣- نەفەقەو سوکنای بۆ نی‌یە، ئەمەش وتەی ئەحمەدو داودو ئەبی پەورو ئیسحاقە, وە لە عەلی‌یەوە ئەگێڕنەوە، وە هەروەها لە ئیبنوعەبباس و جابیرو حەسەن‌و عەطاو شیعبی و ئیبنو ئەبی‌لەیلاو ئەوزاعی‌و ئیمامی‌یەکان.

بەڵگەشیان ئەوەیە بوخاری و موسلیم گێڕاویانەتەوە لە فاطیمەی کچی قەیسەوە کە فەرمویەتی: مێردەکەم لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ تەڵاقی دام، نە نەفەقەی کێشام نە شوێنی دانیشتنی دامێ. وە لە هەندێ ڕیوایەتەکاندا پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (إنما السكنى والنفقة لمن لزوجها عليها الرجعة)[3].

واتە سوکناو نەفەقە بۆ ژنێکە مێردەکەی توانای گێڕانەوەی مابێ.

---

(١) مسلم (١٤٨٠/٤٦).

(٢) أحمد (٤١٤/٦) ومسلم (١٤٨٠/٤١) وأبوداود (٢٢٩٠) والنسائي (٢١٠/٦).

(٣) - أحمد (٤١١/٦) ومسلم (١٤٨٠/٤٢و٤٤) وأبوداود (٢٢٨٨) والترمذي (١١٨٠) والنسائي (٢١٠/٦) وابن ماجه (٢٠٣٥).

وە ئەحمەدو موسلیم و ئەبو داودو نەسائی ئەگێڕنەوە کە پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموە: نەفەقەت بۆ نی‌یە مەگەر حامیلە بیت[1].

## ئەو مافانەی کە ماددی نین

لەپێشەوە باس کرا کە مافی ژن لەسەر مێردەکەی هەندێکی ماددی‌یە وەکو مارەیی و نەفەقە کێشان، وە هەندێکی ماددی نی‌یە ئەوش ئەمانەیە کە باس ئەکرێن:

١- تێکەڵی‌و ژیان بردنە سەر لەگەڵیا بە جوانی:

یەکەمین شت کە پێویستە لەسەر مێرد، ڕێزگرتنی ژنەکەیەتی و تێکەڵی کردنیەتی بەشێوەیەکی چاك‌و مامەڵە کردنە لەگەڵیا بەباشی، وە پێشکەش کردنی ئەوەی لە توانایا بێت لەو شتانەی کە دڵی هۆگر ئەکات، بێجگە لە ئارام گرتن بەرامبەر ئەو شتانەی کە لێوەی ئەوەشێتەوە. خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿وَعَاشِرُوهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ فَإِنْ كَرِهْتُمُوهُنَّ فَعَسَى أَنْ تَكْرَهُوا شَيْئاً وَيَجْعَلَ اللَّهُ فِيهِ خَيْراً كَثِيراً﴾ (النساء: من الآية١٩).

واتە: با هاوەڵێتی‌تان لەگەڵیانا دامەزراو بێت لەسەر ڕێزگرتن و خۆشەویستی‌و بەجێ هێنانی مافەکانیان، وە ئەگەر ڕقتان لێیان بوو لەبەر هۆیەکی دونیایی ئارام بگرن، بەڵکو ئەو شتەی لاتان ناخۆشە خوا خێرێکی زۆری تێدا دابنێت.

وەلە ڕواڵەتەکانی تەواوبەتی خوڕەوشت و گەشەکردنی باوەڕو ئیمان ئەوەیە کە پیاو دڵ نەرم بێت لەگەڵ خێزانەکەیدا, پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ: (أكمل المؤمنين إيماناً أحسنهم خلقاً، وخياركم خياركم لنسائهم)[2].

واتە تەواوترین کەس لەڕوی باوەڕەوە، جوانترینیانە لەڕوی ڕەوشتەوە، وە چاکترین کەستان ئەوکەسەیە کە لەگەڵ خێزانەکەیدا باش بێت.

وە ڕێز گرتنی ئافرەت نیشانەی شەخصیەتی تەواوە، وە شکاندن و ڕێز نەگرتنی نیشانەی نزمی‌یەتی و پەستی‌یە. پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ: (ما أكرمهن إلا كريم, وما أهانهن إلا لئيم) واتە: خاوەن ڕێز نەبێت ڕێزیان ناگرێ, و پیاوخراپ نەبێت بە خراپی سەیریان ناکات، وە لە ڕێزگرتنی ژنە هەڵس و کەوت لەگەڵیا بە نەرمی‌و یاری لەگەڵا کردنی. وە پێغەمبەر ﷺ بە نەرمی‌یەوە لەگەڵ عائیشەدا ئەجولایەوەو پێش برکێی لەگەڵدا ئەکرد, وە عائیشە فەرمویەتی:

---

(١) أحمد (٦/٤١٤) ومسلم (١٤٨٠/٤١) وأبوداود (٢٢٩٠) والنسائي (٦/٢١٠).

(٢) أحمد (٢/٢٥٠) وأبوداود (٤٦٨٢) والترمذي (١١٦٢) وابن حبان (٤١٦٤) والحاكم (١/٣).

پێغەمبەر ﷺ پێش بڕکێی لەگەڵدا ئەکردم من پێشی ئەکەوتم، بەڵام دووای ماوەیەك كە گۆشتم گرت کە پێش بڕکێم لەگەڵدا کرد پێشم کەوت و فەرمووی: ئەم پێش کەوتنە بەوەی پێشوو. ئەحمەدو ئەبوداود گێڕاویانەتەوە[1].

وە ئەحمەد و خاوەن سوننەنەکان گێڕاویانەتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (كل شئ يلهو به ابن آدم فهو باطل، إلا ثلاثاً: رميه عن قوسه, وتأديبه فرسه, وملاعبته أهله، فإنهن من الحق)[2]. واتە: ئادەمیزاد بە هەرچی ڕابوێری پوچەڵە جگە لەسیان: نیشانە نانەوەو تیر هاویشتن, ئەسپ ڕاهێنان، و دەست بازی لەگەڵ ژنەکەی، ئەمانە حەق و ڕاستن.

وە لە ڕێزگرتنی ئەوەیە لە ئاستی خۆیدا سەیری بکاو بەرزی بکاتەوە تا موستەوای خۆی و ئازاری نەدا هەتا بە ووشەیەکیش بێت، لە موعاویەیەی کوڕی حەیدەوە خوا لێی ڕازی بێت کە فەرمویەتی: ووتم ئەی نێرراوی خوا مافی خێزانەکانمان بەسەر ئێمەوە چییە؟ فەرمووی: (أن تطعمها إذا طعمت، وتكسوها اذا اكتسيت، ولا تضرب الوجه ولا تقبِّح, ولا تهجر إلا في البيت)[3]. واتە: ئەوەیە کە لەگەڵ خۆتدا خواردن‌و پۆشاکی بۆ ئامادە بکەی, وە لەسەرو چاوی نەدەیت‌و قسەی ناشیرینی پێ نەڵێیت و جێی لێ دانەبڕی لە ماڵەوە نەبێت.

وە ئافرەتیش تەواوێتی تێدا نابینرێ، وە لەسەر پیاو پێویستە قبوڵی بکات هەرچۆنێك بێت. پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (استوصوا بالنساء خيراً؛ فإن المرأة خلقت من ضلع أعوج، وإن أعوج ما في الضلع أعلاه, فان ذهبت تُقيمُه كسرته, وإن تركته لم يزل أعوج)[4]. رواه البخاري ومسلم.

واتە: ڕاسپاردەی خێر بکەن بۆ ئافرەتان, ئافرەت لە پەراسوو دروست کراوە وە خوارترین شوێنی پەراسو لای سەرەوەیەتی, ئەگەر بچییت ڕاستی کەیتەوە ئەشکێت، وە ئەگەر وازیشی لێ بهێنێ هەر خوارە.

(١) أحمد (٦/٢٦٤) وأبوداود (٢٥٧٨) والترمذي (١٧٨٥) والنسائي (٥٦-٥٩) في عشرة النساء، وابن ماجه (١٩٧٩).

(٢) أحمد (٤/١٤٤و١٤٨) والترمذي (١٦٣٧) وابن ماجه (٢٨١١).

(٣) أحمد (٥/٣٥) وأبوداود (٢١٤٢) وابن ماجة (١٨٥٠) والنسائي في (الكبري (٩١٧١) والحاكم (٢/١٨٧) وابن حبان (٤١٧٥).

(٤) البخاري (٣٣٣١) ومسلم (١٤٦٨).

لەمەدا ئیشارەت بۆ ئەوە ئەکرێ کە ئافرەت لە دروست بونیدا خواری سروشتی هەیە, وە نابێت هەوڵدان بۆ ڕاستکردنەوەی بدرێت, چونکە وەك پەراسوی لار وەهایە ڕاست ناکرێتەوە، لەگەڵ ئەوەشدا ئەبێ هاوەڵێتی بکرێ لەسەر ئەو شێوەیەی کە لەسەریەتی، وە بە چاکترین شێوە مامەڵەی لەگەڵدا بکرێ، ئەوەش ڕێی ئەوە ناگرێ کە پەروەردە بکرێو ڕێی ڕاستی نیشان بدرێت ئەگەر خواری لێی ڕوودا لە کارێکدا.

هەندێ پیاو چاو لە چاکی و ناوازەیی ژن ئەنوقێنێو ئەو شتانە لەبەر چاوی خۆی زل ئەکات کە بەخراپی ئەزانێ لەژنەکەیدا. لەبەر ئەوە ئیسلام ئامۆژگاری پیاو ئەکات کە پێویستە خراپەو چاکەی ئافرەت بکێشێ، چونکە چەندە خراپەی لێ ئەبینێ ئەوەندەش چاکەی تێدا ئەبینێ. پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (لايفرك مؤمن مؤمنة إن كره منها خلقاً رضي منها خلقاً آخر)[1]. واتە: موسڵمان ڕقی لە ژنی موسلمان نەبێت، چونکە ئەگەر خویەکی خراپی لێ بینی خویەکی چاکیشی لێ ئەبینێ.

(٢) پارێزگاری کردن لەژن:

پێویستە لەسەر پیاو ئاگاداری ژنەکەی بکات و بیپارێزێ لە هەموو ئەو شتانەی شەرەفی ئەڕۆشێنێ و ناموس و کەرامەتی هەتك ئەکاتو ناوبانگی ئەخاتە بەر وتەی خراپ. ئەمانە هەموو لەو غیرەتانەیە کە خوا خۆشی ئەوێ. بوخاری لە ئەبی هورەیرەوە ئەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (إن الله يغار، وإن المؤمن يغار، وغيرة الله أن يأتي العبد ما حرّم عليه)[2].

واتە: خوا غیرە ئەکات، وە باوەڕداریش غیرە ئەکات، وە غیرەتی خوا لەسەر ئەوە ئەبێت کە بەندەکەی شتێ بکات کە حەرامە لەسەری.

وەلە ئیبنومەسعودەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (ما أحد أغير من الله؛ ومن غيرته حرَّم الفواحش ما ظهر منها وما بطن، وما أحد أحب إليه المدح من الله؛ ومن أجل ذلك أثنى على نفسه؛ وما أحد أحب إليه العذر من الله، ومن أجل ذلك أرسل الرسل مبشرين ومنذرين)[3].

واتە: کەس لە خوا بەغیرەت تر نیە وە لەبەر غیرەتی‌یەتی کە خراپەی ئاشکراو نهێنی حەرام کردوە، وەکەسیش نیە ئەوەندەی خوا مەدح کردنی پێ خۆش بێت. لەبەر ئەوە مەدح و ستایشی

---

(١) أحمد (٢/٣٢٩) ومسلم (١٤٦٩/٦١).

(٢) البخاري (٥٢٢٣) ومسلم (٢٧٦١).

(٣) البخاري (٥٢٢١) ومسلم (٢٧٦٠و٢٧٦١).

خۆی نەكات. وە كەسیش ئەوەندەی خوا عوزری پێ خۆش نیيە، لەبەر ئەوەشە پێغەمبەرانی ڕەوانەكردوە كە موژدەدەرو ترسێنەربن.

وە ئەگێڕنەوە كە سەعدی كوڕی عوبادە ووتویەتی: ئەگەر پیاوێك ببینم لەگەڵ ژنەكەمدا لە ملی ئەدەم و لێی خۆش نابم. پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (أتعجبون من غيرة سعد. لأنا أغير منه, والله أغير مني، ومن أجل غيرة الله حرم الفواحش ما ظهر منها وما بطن)[1].

واتە: ئایا غیرەتی سەعدتان لا سەیرە؟ من لەو بەغیرەت ترم و خواش لە من بەغیرەت ترە, لەبەر ئەو غیرەتەیە كە خوا گوناهی ئاشكراو نەهێنی حەرام كردووە.

وە لە ئیبنوعومەرەوە كە فەرمویەتی: پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (ثلاثة لا يدخلون الجنة: العاق لوالديه، والديوث، ورجلة النساء) رواه النسائي، والجزار، والحاكم، وقال: صحيح الإسناد[2].

واتە: سێ كەس ناچنە بە هەشتەوە: ئەو كەسەی ئازاری دایك و باوكی بدات, گەواد, ئەو ژنانەی خۆیان ئەگۆڕنە سەر شێوەی پیاو.

وە لە عەممارى كوڕی یاسرەوە كە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (ثلاثة لا يدخلون الجنة أبداً: الديوث، والرجلة من النساء, ومدمن الخمر, قالوا: يا رسول الله أما مدمن الخمر فقد عرفناه. فما الديوث؟ قال: الذي لا يبالي من دخل على أهله. قلنا: فما الرجلة من النساء؟ قال: التي تتشبه بالرجال) رواه الطبراني[3]. قال المنذري: ورواته ليس فيهم مجروح.

واتە: سێ كەس هەرگیز ناچنە بەهەشتەوە: گەواد و ئەوكەسەی ڕاهاتووە لەسەر عارەق خواردنەوەو (الرجلة من النساء) ووتیان: ئەی نێرراوی خوا ئەوە ڕاهاتوو لەسەر عارەقمان زانی. ئەی (دیوث) چییە؟ فەرمووی: كەسێكە گوێ ناداتێ هەركەس بچێت بۆلای ژنەكەی, ووتیان: ئەی (الرجلة من النساء) چییە؟ فەرمووی: ئەو ئافرەتەیە خۆی وەك پیاو لێ ئەكات.

وە وەك چۆن لەسەر پیاو پێویستە غیرەتی هەبێ بەرامبەر خێزانەكەی، داواشی لێ ئەكرێ كە ئەبێ مام ناوەند بێت لەو غیرەتەدا، زیادەڕەوی نەكات بە گومانی خراپە بەرامبەر ژنەكەی، وە ئیسراف نەكات لە شوێن كەوتنی هەڵسوكەوتیدا، وە هەموو عەیبەكانی ئامار نەكات، چونكە ئەوە پەیوەندی نێوان ژنو مێرد تێك ئەدات، وە ئەو پەیوەندییەی كە خوا فەرمانی داوە ببەسترێ

---

(١) البخاري تعليقاً (٩/٣١٩) ومسلم (١٤٩٩).

(٢) النسائى فى الكبرى (٢٣٤٣) والبزار (١٨٧٥و١٨٧٦) والحاكم (١/٧٢) ومجمع الزوائد (٨/١٤٧).

(٣) البيهقي في شعب الإيمان (١٠٨٠٠) ومجمع الزوائد (٤/٣٢٧).

ئەیپچڕێنێ. پێغەمبەر ﷺ لەو فەرموودەیەدا کە ئەبوداود و نەسائی و ئیبنوحیببان ئەگێڕنەوە لە جابیری کوڕی عەتیکەوە ئەفەرمێ: بەڕاستی غیرەت هەیە خوا خۆشی ئەوێ و غیرەت هەیە خوا ڕقی لێیەتی. وە خۆ بە زل زانین هەیە کە خوا خۆشی ئەوێ، وە خۆ بە زل زانین هەیە کە خوا ڕقی لێیەتی، ئەمما ئەو غیرەتەی خوا خۆشی ئەوێ: غیرەتە لە گوماندا، وە ئەوەی خوا ڕقی لێیەتی: غیرەتێکە لە گوماندا نەبێت. وە ئەو خۆ بەزل زانینەی خوا خۆشی ئەوێ ئەو خۆ بەزل زانینەیە کە لەکاتی جەنگدا پیاو خۆی بەزل بزانێ، وە هەروەها لەکاتی لێ قەوماندا. وە ئەو خۆ بەزل زانینەی خوا ڕقی لێیەتی ئەوەیە لەسەر باتڵ بێت. وە عەلی خوا لێی ڕازی بێت فەرمویەتی: غیرەت لەگەڵ خێزانەکەتدا زۆر بەکار مەهێنە، نەوەك لەبەر ئەوە بەخراپی سەیر بکرێ لەلایەن خەڵکەوە.

**چوونەلای ژن:**

ئیبنوحەزم ووتویەتی: فەرزە لەسەر پیاو بچێتە لای ژنی خۆی بەلای کەمەوە جارێك دوای هەموو پاك بوونەوەیەك لە بێ نوێژی ئەگەر توانای هەبوو, ئەگینا سەرپێچی فەرمانی خوای کردووە. بەڵگەی ئەمەش فەرموودەی خوای گەورەیە: ﴿فَإِذَا تَطَهَّرْنَ فَأْتُوهُنَّ مِنْ حَيْثُ أَمَرَكُمُ اللَّهُ﴾ (البقرة: من الآية٢٢٢) واتە: کاتێ پاك بوونەوە ئێوە بەو شێوەیە بچنە لایان کە خوا فەرمانی پێ کردون.

وە جەماوەری زانایان بۆ ئەو قسەیەی ئیبنو حەزم چوون کە پێویستە لەسەر پیاو بچێتە لای ژنی خۆی ئەگەر بەهانەی شەرعی نەبوو.

شافیعی ووتویەتی: واجب نیە لەسەری چونکە مافێکی خۆیەتی، وەك هەموو مافەکانی تر پێویست نیە. وە ئەحمەد دانی بەوەدا ناوەکە نەچونەلای ژن لە چوار مانگ تێ نەپەڕێ، چونکە خوای گەورە بەوشێوەیە دایناوە دەربارەی ئەو کەسەی (إیلاء) ئەکات، وە دەربارەی کەسانی تریش هەروەها ئەبێت.

ئەگەر پیاو چووە سەفەرو لە ژنەکەی دوور کەوتەوە، ئەگەر بەهانەیەکی نەبێ کە بگەڕێتەوە، ئەحمەد بۆ ئەوە چووە کە نابێ لە شەش مانگ تێپەڕێ، وە پرسیاری لێ کرا ئایا پیاو ئەتوانێ ماوەی چەندە لە ژن دوورکەوێتەوە؟ ووتویەتی: شەش مانگ. دوای شەش مانگ نامەی بۆ ئەنوسێ، ئەگەر نەگەڕایەوە ئەبێ حاکم لە یەکیان جیا بکاتەوە.

بەڵگەشی ئەوەیە کە ئەبوحەفص بە ئیسنادی خۆی گێراویەتیەوە لە زەیدی کوڕی ئەسلەمەوە کە ووتویەتی: کاتێك عومەری کوڕی (خطاب) لە کۆڵانەکانی مەدینەدا پاسەوانی ئەکرد، بەلای ژنێکدا تێپەڕ بوو کە لە ماڵەکەی خۆیدابوو وە دەیووت:

تطاول هذا الليل واسود جانبه　　وطال عليَّ أن لا خليل ألاعبه
والله لولا خشية الله وحده　　لحرك من هذا السرير جوانبه
ولكن ربي والحياء يَكُفُّني　　وأكرم بعلي أن توطأ مراكبه

واتە: ئەم شەوە چەند ڕەش و دوورو درێژە بەسەر مندا کە خۆشەویستەکەم لا نیە یاری لەگەڵدا بکەم، سوێند بەخوا لە ترسی خوای تاکو تەنها نەبوایە، ئێستا ئەم تەختەخەوەم لەملاو لاوە ڕائەژێندرا، بەڵام خوای خۆم و شەرم و حەیاکەم نامهێڵن، وە هەروەها ڕێز لە مێردەکەم ئەگرم کە پێ نەخرێتە سەر شوێنی دانیشتنی‌یەوە. جا عومەر پرسی ئەو ئافرەتە کێیە؟ ووتیان: فلانەکەسە، مێردەکەی لێی دوورکەوتۆتەوەو لە جەنگدایە لە ڕێی خوادا. جا عومەر ناردی‌یەوە بە شوێنیدا کە لەگەڵیا بێت، لەپاشاندا چوو بۆلای حەفصەی کچی و فەرمووی: کچەکەم ئافرەت چەندە ئەتوانێ ئارام بگرێ بێ مێرد؟. ئەویش فەرمووی: سبحان الله! پیاوێکی وەك تۆ لە یەکێکی وەك من ئەو پرسیارە ئەکات؟ عومەر فەرمووی: ئەگەر ئەم ویستایە حاڵی موسڵمانان بزانم پرسیارم لێ نەئەکردی، ئەویش فەرمووی: پێنج مانگ. شەش مانگ. عومەریش شەش مانگی دانا بۆ پیاوان کە لە غەزادا بن مانگێ بەڕێوە بن، چوار مانگ لە جەنگداو مانگێکیش بۆ گەڕانەوە.

غەزالی لە شافیعی‌یەکان ووتویەتی: پێویستە پیاو هەر چوار شەو جارێك بچێتە لای ژنی خۆی ئەوە دادپەروەری ترین شێوەیە، چونکە ژمارەی ئەو ژنانەی دروستە پیاو هەی بێت چوار ژنە، لەبەر ئەوە دروستە هەتا ئەو ڕادەیە خۆی دوابخات. بەڵێ پێویستە لەوە زیاترو کەمتر بێت، بەپێی پێویستی بۆ پاراستنی داوێن پاکی ژنەکەی، چونکە پاراستنی پێویستە لەسەر پیاو هەرچەندە لە شەرعدا داواکردنی جیماع لەلایەن ژنەوە سابت نەبووە، ئەویش لەبەر گرانی وەفا پێ کردنی‌یەتی.

وە لە موحەممەدی کوڕی مەعنی غیفاری‌یەوە کە فەرموویەتی: ژنێك هات بۆلای (عمر)ی کوڕی (خطاب) خوا لێی ڕازی بێت و ووتی: ئەی ئەمیری موسڵمانان مێردەکەم بەڕۆژ بەڕۆژو ئەبێت و بەشەویش شەو نوێژ ئەکات. وە من لام ناخۆشە سکاڵای لەدەست بکەم - کە ئەو خەریکی خواپەرستی‌یە - عومەر فەرمووی: چاکترین پیاو پیاوی تۆیە، ژنەکە هەر ئەو قسەیەی دووبارە ئەکردەوە، عومەریش هەروەهای پێ ئەوتەوە. کەعبی ئەسەدی پێی ووت: ئەی ئەمیری موسڵمانان ئەو ژنە شکاتی دوورکەوتنەوەی مێردەکەی ئەکات لێی لە جێگەدا. عومەر پێی فەرموو: چۆن تێی گەیشتی ئاواش ببە بەدادپرسیان.

کەعب ووتی: پیاوی ئەو ژنەم بۆ بانگ بکەن، بۆیان بانگ کرد. پێی ووت: ئەم ژنەت شکاتی لێ کردووی، ئەویش ووتی: بۆ خواردن، یا بۆ خواردنەوە؟. ووتی: نەء، جا ئافرەتەکە ووتی:

يا أيها القاضي الحكيم رشدُه     ألهي خليلي عن فراشي مسجده
زهَّده في مضجعي تعبده     فاقض القضاء، كعبُ ولا ترده
نهاره وليله ما يرقده     فلست في أمر النساء أحمده

واتە: ئەی قازی حەکیم و داناو ژیر، خۆشەویستەکەم مزگەوتەکەی وای لێ کردووە کە منی لەبیر چۆتەوەو خافڵاوە لە من، لەبەر خوا پەرستی‌یەکەی پشتی لە خەوتن لەگەڵ مندا کردووە، جا ئەی کەعب قەزاوەت بکە لەنێوانماندا وڕەتی مەکەرەوە، مێردەکەم شەوو ڕۆژی ناخەوێت، وە منیش لە کاروباری ژناندا بە دڵم نی‌یە و ستایشی ناکەم.

کابراش ووتی:

زهدني في النساء وفي الحجل     أني امرؤ أذهلني ما نزل
في سورة النحل وفي السبع الطُّوَل     وفي كتاب الله تخويف جَلَل

واتە: ئەوەی لە ئافرەتان و لە جێ خەوی بوك منی گۆشەگیر کردووە ئەمەیە کە من کەسێکم سەرسامی کردوم ئەوەی کە هاتۆتە خوارەوە لە سوڕەتی نەحلدا و لە حەوت سوڕەتە درێژەکاندا، وە لە کتێبی خوادا ترساندنێکی زۆر گەورەی تێدایە.

کەعبیش ووتی:

إن لها عليك حقاً يا رجل     نصيبها في أربع لمن عقل
فأعطها ذاك     ودع عنك العلل

واتە: ئەی پیاو ئەو ئافرەتە مافی بەسەرتەوە هەیە، لە هەر چوار شەودا ئەگەر کەسێك بفامێنێ، جا تۆش مافی خۆی بدەرێ و واز لە بەهانە گرتن بهێنە.

پاشان کەعب پێ‌ی ووت: خوای گەورە دو ژن و سێ ژن و چوار ژنی بۆ حەڵاڵ کردوی، لەبەر ئەوە سێ شەوو سێ ڕۆژ بۆ تۆ خواپەرستی تێدا بکە، وە شەوو ڕۆژێکیش بۆ ژنەکەت.

عومەر فەرموی: سوێند بەخوا نازانم بەکام کارەیانت سەرم سوڕ بمێنێ؟. بەوەی کەلێیان تێ گەیشتی، یان بەو حوکمەی کە لەنێوانیاندا کردت؟. بڕۆ وا قازی‌یەتی بەصرەم بە تۆ سپارد.

وە لە سوننەتدا سابتە کە چونەلای خێزان خوا پاداشتی لەسەر ئەداتەوە. موسلیم گێڕاویەتی‌یەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (. . . ولك في جماع زوجتك أجر. قالوا يا رسول الله: أيأتي أحدنا

شهوته ويكون له فيها أجر؟ قال: أرأيتم لو وضعها في حرام أكان عليه فيها وزر؟ فكذالك إذا وضعها في حلال كان له أجر)[1].

واته: وه له چونه‌لای ژنه‌كه‌ت پاداشتت هه‌یه. ووتیان: ئه‌ی نێرراوی خوا له ئاره‌زوو شكاندنی خۆماندا پاداشتمان هه‌یه؟ فه‌رمووی: ئایا ئه‌گه‌ر له حه‌رامدا به‌كاری بهێنێ تۆڵه‌ی لێ ناسه‌نرێ؟ هه‌روه‌ها ئه‌گه‌ر له حه‌ڵاڵدا به‌كاری بهێنێ پاداشتی هه‌یه.

وه په‌سه‌نده یاری له‌گه‌ڵدا كردن‌و نه‌رمی و ماچ كردن‌و وه‌ستان هه‌تا ئه‌ویش ئاره‌زووی ئه‌شكێ. ئه‌بو یه‌علا ئه‌گێڕێته‌وه له ئه‌نه‌سی كوڕی مالیكه‌وه كه پێغه‌مبه‌ر ﷺ فه‌رمویه‌تی: (إذا جامع أحدكم أهله فليصدقها, فإذا قضى حاجته قبل أن تقضي حاجتها، فلا يعجلها حتى تقضي حاجتها)[2].

واته: هه‌ركه‌سێكتان چووه لای خێزانی با چاكه‌ی له‌گه‌ڵدا بكات, كه خۆی ئاره‌زوی شكا پێش ژنه‌كه‌ی با په‌له نه‌كات هه‌تا ئه‌ویش ئاره‌زوی ئه‌شكێ. وه له پێشه‌وه باسی ئه‌و فه‌رموده‌یه‌مان كرد كه فه‌رمویه‌تی: (هلا بكراً تلاعبها وتلاعبك)[3] واته: ئه‌ی بۆ كچێكت نه‌ئه‌هێنا با یاریت له‌گه‌ڵدا بكردایه‌و یاری له‌گه‌ڵتا بكردایه.

خۆداپۆشین كاتی چوونه لای ژن:

ئیسلام فه‌رمانی داپۆشینی عه‌وره‌تی داوه له هه‌موو كاتێك‌و شێوه‌یه‌كدا مه‌گه‌ر ئه‌وه‌ی پێویست بكات كه ده‌ربخرێ، له به‌هزی كوڕی حه‌كیمه‌وه له باوكی‌یه‌وه له‌باپیری‌یه‌وه كه فه‌رمویه‌تی: ووتم ئه‌ی نێرراوی خوا شه‌رمگه‌مان چی ده‌ربخه‌ین‌و چی داپۆشین؟ فه‌رموی: له ژنی خۆت نه‌بێت شه‌رمگه‌ت بپاریزه، یا له وانه‌ی كه‌نیزه‌كتانن، ئه‌ڵێ: ووتم ئه‌ی نێرراوی خوا ئه‌گه‌ر هه‌موویان له‌یه‌ك بن؟ واته: پیاوان له‌لای یه‌كترو ژنانیش هه‌روا فه‌رمووی: ئه‌گه‌ر بتوانیت كه كه‌س نه‌ت بینێ با نه‌ت بینێ. ئه‌ڵێ: ووتم ئه‌گه‌ر به ته‌نها بین؟ فه‌رمووی: خوا له هه‌موو كه‌س له‌پێشتره شه‌رمی لێ بكرێ. (ترمذي) گێراویه‌ته‌وه‌و ووتویه‌تی: فه‌رموده‌یه‌كی حه‌سه‌نه[4].

---

(١) أحمد (٥/١٦٩) مسلم (١٠٠٦).

(٢) ضعيف الجامع (٤٥٠) وإرواء الغليل (٢٠١٠).

(٣) ته‌خریجی ئه‌م حه‌دیسه ڕابورد.

(٤) أحمد (٥/٣) وأبوداود (٤٠١٧) والترمذي (٢٧٦٩) وابن ماجه (١٩٢٠).

له حەدیسەکەدا هاتووه کە دروستە شەرمگە دەربکەوێ لە کاتی جیماعدا، بەڵام لەگەڵ ئەوشدا نابێت ژنومێرد ڕووتی پەتی بن.

لە عوتبەی کوڕی عەبدی سولەمیەوە کە ووتویەتی: پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (إذا أتى أحدكم أهله فليستتر, ولا يتجردا تجرد العيرين) رواه ابن ماجة[1].

واتە: ئەگەر کەسێکتان چووە لای ژنەکەی با خۆیان داپۆشن، وە خۆیان ڕووت نەکەنەوە وەك دوو گوێ درێژ

وە لە ئیبنو عومەرەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (إياكم والتعري, فإن معكم من لا يفارقكم إلا عند الغائط, وحين يفضي الرجل إلى أهله فاستحيوهم وأكرموهم) رواه الترمذي وقال حديث غريب.

واتە: داواتان لێ ئەکەم خۆتان بپارێزن لە ڕووتی، چونکە کەسانێکتان لەگەڵدایە بۆ سەر ئاو نەبێ لێتان جیا نابنەوەو لە کاتی چونەلای ژنەکانتاندا، جا شەرمیان لێ بکەن و ڕێزیان بگرن.

عائیشە فەرمویەتی: پێغەمبەر ﷺ شوێنی شەرمی منی نەدیوەو منیش هی ئەوم نەدیوە[2].

ناوی خوا هێنان کاتی چونە لای ژن:

سوننەتە کە پیاو ناوی خوا بهێنێ و پەنا بەخوا بگرێ کاتی چوونەلای ژن. بوخاری و موسلیم و کەسانی تر گێڕاویانەتەوە لە ئیبنوعەبباسەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (لو أن أحدكم إذا أتى أهله قال: بسم الله, اللهم جنِّبنا الشيطانَ، وجنِّبِ الشيطان ما رزقتنا. فإن قدر بينهما في ذلك ولد، لن يضر ذلك الولد الشيطان أبداً)[3].

واتە: ئەگەر کەسێکتان چووە لای ژنەکەیو ووتی: (بسم الله) خوایە لە شەیتان بمانپارێزە, وە چیمان پێ ئەبەخشی لە شەیتان بیپارێزە, ئەوە ئەگەر خوا منداڵێکی پێدان بەو نزیکی کردنە، شەیتان هەرگیز زیانی پێ ناگەیەنێت.

---

(١) ابن ماجه (١٩٢١).

(٢) ئەم حەدیسە ڕەت کراوەتەوە بەو حەدیسانەی کە بە ڕەوای داناوە ژنومێرد عەورەتی خۆیان دەربخەن لەکاتی جیماعدا، وە لە ڕیوایەتەکەیدا درۆزنێك و هەڵبەستەرێکی تێدایە کەواتە باتڵە.

(٣) البخاري (٥١٦٥) ومسلم (١٤٣٤/١١٦).

**حەرامی باسی ئەوەی کە لە نێوان ژنومێرددا ئەکرێ کاتی جیماع:**

باسی جیماع کردن و لێ دووان بۆ کەسانی تر پێچەوانەی پیاوەتی ئادەمیزادە، وە لە قسە بێکەلکەکانە، وە پێویست نییە باس بکرێ, وە پێویستە ئادەمیزاد خۆی لێ بپارێزێ، مەگەر شتێك نەبێت ئەوە پێویست بکات. لە فەرموودەی صەحیحدا هاتووە: (من حسن إسلام المرء تركه مالا يعنيه)[1] واتە: لە چاکێتی ئیسلامەتی پیاو وازهێنانە لەو شتانەی پەیوەندیان پێوەی نییە.

وە خوا مەدحی ئەوانە ئەکات کە خۆیان لە قسەی پڕو پوچ دوور ئەخەنەوەو ئەفەرموێ: ﴿وَالَّذِينَ هُمْ عَنِ اللَّغْوِ مُعْرِضُونَ﴾ (المؤمنون:٣) واتە: ئەو موسڵمانانانە سەرکەوتون کە یەکێك لە سیفەتە چاکەکانیان ئەوە بێ کە پشت لەو وتارو کردارانە ئەکەن کە خێری تێدا نییە.

بەڵام ئەگەر پێویست بوو کە باس بکرێ ئەوە قەیناکە، ژنێك ئیدعای ئەوەی کرد کە کە مێردەکەی ناتوانێ بچێتە لای، کابراش وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ (إني لأنفضها نفض الأديم)[2]. واتە : بەڕاستی من وەکو پێستە ئەو ژنە ئەتەکێنم.

بەڵام ئەگەر ژنو مێرد بەزۆری باسی چۆنیەتی ئەو کارەیان ئەگێڕایەوە بۆ خەڵك و ئەوەی ڕووئەدا لەنێوانیانا؛ ئەوە شتێکی حەرامە.

لە ئەبی سەعیدەوە خوا لێی ڕازی بێت: کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (إن شر الناس عند الله منزلة يوم القيامة: الرجل يفضي إلى المرأة، وتفضي إليه، ثم ينشر سرها) رواه أحمد[3]. واتە: خراپ ترین کەس لای خوا لە ڕۆژی دواییدا پیاوێکە کە ئەچێتە لای ژنەکەیو لەگەڵیا ڕائەبوێرێ لەپاشاندا لەناو خەڵکدا چۆنی کردووە باسی ئەکات.

وە لە ئەبی هورەیرەوە (خوا لێی ڕازی بێت): پێغەمبەر جارێکیان نوێژی بۆ ئەکردن، کاتێ سڵاوی دایەوە، ڕووی تێ کردنو فەرمووی: (مجالسكم, هل منكم الرجل إذا أتى أهله أغلق بابه وأرخى ستره، ثم يخرج فيحدِّث فيقول: فعلت بأهلي كذا وفعلت بأهلي كذا؟! فَسَكَتوا، فأقبل على النساء، فقال هل منكن من تحدث؟ فجثت فتاة كِعاب على إحدى ركبتيها, وتطاولت ليراها الرسول ﷺ وليسمع كلامها، فقالت: أي والله إنهم يتحدَّثون، وإنهن ليتحدَّثن، فقال: هل تدرون

---

(١) الترمذي (٢٣١٧) ومالك في الموطأ (٢/٩٠٣).

(٢) البخاري (٥٨٢٥).

(٣) أحمد (٦/٣٨).

ما مثل من فعل ذلك؟ إن مثل من فعل ذلك مثل شيطان وشيطانة, لقي أحدهما صاحبه بالسِّكة, فقضى حاجته منها. والناس ينظرون إليه) رواه أحمد, وأبوداود[1].

واتە: ئەی دانیشتوان, ئایا کەس هەیە لە ئێوە کە بچێتە لای خێزانیو دەرگا دابخات لەسەر خۆی و پەردە دابداتەوە، لەپاشاندا بچێتە دەرەوەو بڵێ: وام کرد لەگەڵ خێزانمداو وام کرد؟ ئەوانیش بێ دەنگ بوون, ئینجا هاتە لای ژنەکانو فەرمووی: ئەی کەس هەیە لە ئێوە باسی ئەوە بکات؟ کچێك لەسەر ئەژنۆکانی ڕاوەستاو خۆی بەرزکردەوە بۆ ئەوەی پێغەمبەر ﷺ ببینێو گوێی لە قسەکانی بێت ئینجا وتی: ئەرێ بەخوا پیاوان باسی ئەکەن و ژنانیش باسی ئەکەن، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەزانن ئەوەی کاری وا بکات وەکو کێ وایە؟

ئەوەی کاری وا بکات وەکو شەیتانی نێرومێ وایە کە لە کۆڵانێکدا بە یەك بگەنو سواری یەك بنو خەڵکیش سەیریان بکات.

**چونەلای ژن لە غەیری شوێنی تایبەتییەوە:**

چونەلای ژن لە دواوە سروشتی مرۆڤ سڵی لێ ئەکاتەوەو خوڕەوشت ڕێگری لێ ئەکاو، شەرعیش حەرامی ئەکات.

خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿نِسَاؤُكُمْ حَرْثٌ لَكُمْ فَأْتُوا حَرْثَكُمْ أَنَّى شِئْتُمْ﴾ (البقرة: من الآية ٢٢٣).

واتە: خێزانەکانتان کێڵگەن بۆ ئێوە جا هەرچۆنێك پێتان خۆشە بچنە لای کێڵگەکانتان.

وە کێڵگەش بە شوێنی کشتوکاڵ داچاندن ئەووترێ، لێرەشدا مەبەست پێی شوێنی منداڵە، چونکە منداڵی تێدا دەچێندرێ.

کەواتە فەرمان کردن بە چونەلای کێڵگە مەبەست پێی فەرمان کردنە بە چونەلای پێشی ئافرەت بە تایبەت.

(ثعلب) ووتویەتی:

إنما الأرحام أرضو ... ن لنا محترثات

فعلينا الزرع فيها ... وعلى الله النبات

---

(١) أحمد (٢/٥٤٠-٥٤١) وأبوداود (٢١٧٤).

واته ڕەحمی ئافرەت زەوی و کێڵگەیە بۆ ئێمە، لەسەر ئێمە چاندنیەتی و لەسەر خواش ڕواندنیەتی.

ئەمەش وەکو فەرمودەی خوای گەورە وایە کە ئەفەرموێ: ﴿فأتوهن من حيث أمركم الله﴾ (البقرة: من الآية ٢٢٢). واتە: لەو شوێنەوە بچنە لایان کە خوا فەرمانی پێ کردوون.

وە هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتە ئەوەیە کە بوخاری و موسلیم ئەیگێڕنەوە کە: جولەکە لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ ئەیان ووت ئەگەر پیاو لەلای دواوە لە پێشەوەی بچێتە لای ژنەکەی، ئەگەر منداڵیان بوو، منداڵەکە خیل ئەبێت، وە ئەنصاریەکانیش لەسەر ئەو قسەیەی جولەکە ئەڕۆیشتن، ئیتر خوای گەورە ئەو ئایەتەی نارده خوارەوە: ﴿نِسَاؤُكُمْ حَرْثٌ لَكُمْ فَأْتُوا حَرْثَكُمْ أَنَّى شِئْتُمْ﴾ (البقرة: من الآية٢٢٣). واتە: هەرچۆنێك بچنە لای ژنەکانتان دروستە بە مەرجێ بۆ پێشەوە بێت و بەو مەرجەی مەبەستتان شوێنی منداڵ بێت.

وە فەرمودەی صەریح هاتووە کە قەدەغەی ئەوە ئەکات پیاو لە دواوە بۆ دواوە بچێتە لای ژنی خۆی.

ئەحمەد و (ترمذي) و ئیبنوماجە ئەگێڕنەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (لاتأتوا النساء في أعجازهن. أو قال: في أدبارهن) ورواته ثقات[1]. واتە: لە دووای دواوە مەچنە لای ژنەکانتان.

عەمری کوڕی شوعەیب ئەگێڕێتەوە لە باوکیەوە لە باپیرەیەوە کە پێغەمبەر ﷺ سەبارەت بەو کەسەی کە ئەو کارە بکات فەرموویەتی: (هي اللوطية الصغرى)[2]. واتە: ئەوە نێربازی چکۆلەیە.

وە لەلای ئەحمەدو خاوەن سونەنەکان هاتووە لە ئەبی هورەیرەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (ملعون من أتى امرأة في دبرها)[3]. واتە: نەفرین لێکراوە ئەوکەسەی لە دوواوە چووە لای ژنەکەی.

ئیبنوتەیمیە فەرمویەتی: هەرکاتێك لە دوواوە چووە لای و ئافرەتەکەش بە گوێی کرد، ئەوە هەردوکیان تەعزیرو سزا ئەدرێن، ئەگینا ئەگەر ژنەکە بەوە ڕازی نەبێ، لەیەك جیا ئەکرێنەوە، وەك چۆن داوێن پیس و ئەوکەسەی داوێن پیسی لەگەڵ ئەکرێت جیا ئەکرێنەوە لەیەك.

---

(١) أحمد (٢/١٨٢) والترمذي (١١٦٤) من حديث علي بن أبي طالب وعلي بن طلق.

(٢) أحمد (٢/١٨٢و٢١٠) ومجمع الزوائد (٤/٢٩٨).

(٣) أحمد (٢/٣٤٤)، وأبوداود (٢١٦٢)، والترمذي (١١٦٥)، والنسائي في الكبرى، (٩٠٠١)، وابن ماجه (١٩٢٣).

**خۆ دابڕین و سنوور دانان بۆ نەوە:**

لە پێشەوە باس کرا کە ئیسلام حەز لە زۆر بوونی نەوەکان ئەکات، چونکە دیمەنێکە لە دیمەنەکانی هێزو تواناو بەرگری بۆ گەلو نەتەوەکان، چونکە عیززەتی گەل بەزۆری نەوەوەیە.

وە ئەوەش هۆی دانرانی یاسای ژنو مێردایەتییە پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ: (ژنێك بهێنن کە زاوزێ کەرو بەسۆزو خۆشەویستی بێت، چونکە من لەناو نەتەوەکانی تردا ڕۆژی دوایی بەزۆریتانەوە شانازی ئەکەم). بەڵام ئیسلام لەگەڵ ئەوەشدا ڕێگری ناکات لە هەندێ کاتی تایبەتیدا کە سنوور دابنرێ بۆ منداڵ داری، بە بەکارهێنانی دەرمان بۆ نەبوونی منداڵ، یا بە هەرهۆیەکی بەسودتر. جا ڕەوایە دانانی سنوورێك بۆ منداڵ نەبوون لە کاتێکدا پیاو خێزانی زۆر بێتو نەتوانێ هەڵسێ بە پەروەردەکردنی منداڵەکانی بە شێوەیەکی ڕاست.

وە هەروەها ئەگەر ژنەکە لاواز بێتو زوو زوو منداڵی ببێ، یا پیاوەکە هەژار بێت، لەم شێوانەدا ڕەوایە سنوردانان بۆ منداڵ نەبوون، بەڵکو لە زانایان ڕایان وایە لەم شێوانەدا نەك ڕەوا بێت و هیچی تر؛ بەڵکو شتێکی پەسەندە.

ئیمامی غەزالی ئەو ژنانەش کە لە جوانیییان ئەترسن ئەخاتە پاڵ ئەمانە. جا لەو شێوانەدا ژنو مێرد بۆ یان هەیە نەیەڵن منداڵیان ببێت, بەڵکو هەندێ لە زانایان بە ڕەوای دائەنێن لە هەموو شێوەیەکدا، بەڵگەشیان بۆ بۆچوونەکەیان ئەمانەی لای خوارەوەیە:

١- بوخاری و موسلیم لە جابیرەوە ئەگێڕنەوە کە فەرمویەتی: لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ خۆمان ئەکێشا دواوەو قورئانیش ئەهاتە خوارەوە[1]. (واتە قەدەغەمان لێ نەئەکرا).

٢- وە هەروەها موسلیم ئەگێڕێتەوە کە فەرمویەتی: ئێمە خۆمان ئەکێشا دواوە کاتی گەیشتن بە خۆشیو تۆوەکەمان لە دەرەوە ئەڕشت. باسی ئەو کارە گەیشت بە پێغەمبەر ﷺ لێی قەدەغە نەکردین[2].

شافیعی ڕەحمەتی خوای لێ بێت فەرمویەتی: ئێمە لە هەندێ صەحابەوە ئەگێڕینەوە کە ڕێیان داوە بە خۆکێشانەوە لەوکاتەدا، وە بە خراپیشیان نەزانیوە.

---

(١) البخاري (٥٢٠٨)، ومسلم (١٤٤٠/١٣٦).

(٢) مسلم (١٤٤٠/١٣٨).

وه بەیهەقی ووتویەتی: ئەو ڕێ پێ دانەمان لە سەعدی کوڕی ئەبی وەققاص و ئەبی ئەییوبی ئەنصاری و زەیدی کوڕی ثابت و ئیبنوعەبباسەوە گێڕاوەتەوە، وئەوەش مەزهەبی مالیك و شافیعی‌یە.

وە عومەرو عەلی خوا لێیان ڕازی بێت بەزیندە بەچاڵ کردنیان دانەئەنا هەتا حەوت شێوەکەی بەسەردا تێ نەپەڕیایە.

قاضی ئەبویەعلا بە ئیسنادی خۆی وە چەند کەسانی تریش ئەگێڕنەوە لە عوبەیدی کوڕی ڕوفاعەوە لە باوکی‌یەوە کە فەرمویەتی: لەلای عومەر و عەلی و زوبەیرو سەعد خوا لێیان ڕازی بێت لەگەڵ چەند کەس لە صەحابە دانیشتین و باسی خۆ کێشانەوەیان کرد و ووتیان: قەیناکە، پیاوێك ووتی: خەڵك ئەڵێن زیندە بە چاڵ کردنی بچوکە. عەلی خوا لێی ڕازی بێت ووتی: بە زیندە بەچاڵ کردن دانانرێ هەتا حەوت قۆناغەکەی بەسەردا تێنەپەڕێ. هەتا ئەبێت لە ڕەگەزی قوڕ، لەپاشاندا ئەبێ بە نوطفە، لەپاشاندا ئەبێ بە پارچە خوێن، لەپاشاندا ئەبێ بە پارچە گۆشت، لەپاشاندا ئەبێ بە ئێسك، دوایی بە گۆشت، دوایی ئەبێ بە شێوەیەکی تر. عومەر فەرموی: ڕاست ئەکەی خوا تەمەنت درێژ بکات.

بەڵام ظاهیری‌یەکان ڕایان وەهایە کە بەرگری کردن لە منداڵ بوون حەرامە، بەڵگەشیان ئەوەیە کەجوزامەی کچی وەهەب گێڕاویەتی‌یەوە: کە خەڵکێك پرسیاریان لە پێغەمبەر ﷺ کرد, دەربارەی خۆکێشانەوە؟ فەرموی: (ذلك هو الوأد الخفي)[1] واتە: ئەوە زیندە بەچاڵ کردنی بچوکە.

وە ئیمامی غەزالی وەڵامی ئەوەی داوەتەوەو ووتویەتی‌لە صەحیح دا چەند فەرمودەیەك هاتووە دەربارەی ڕەوا بوونی، وە ئەوەی کە ئەفەرموێت: (انه الوأد الخفى) زیندە بەچاڵ کردنی بچوکە. وەك ئەو فەرمودەیە وەهایە کە فەرمویەتی: (الشرك الخفى)[2] هاوبەش پەیداکردنی بچوکە. ئەو قسەیەش کەراهی‌یەت پێویست ئەکات نەك حەرامی.

وە مەبەست لە کەراهەت پێچەوانەی باشتر بوونە، وەك ئەوە وەهایە بووترێ: کەراهەتی هەیە بۆ دانیشتوی مزگەوت دانیشێ‌و خۆی خەریك نەکات بەیادی خواوە یا بە نوێژەوە، وە هەندێ لە پێشەوایان وەك حەنەفی‌یەکان ڕایان وەهایە کە خۆکێشانەوە کاتێ ڕەوایە کە بە ڕەزامەندی ژنەکە بێت، بەڵام بێ ڕەزامەندی ئەو کەراهەتی هەیە.

---

(١) أحمد (٦/٣٦١)ومسلم (١٤٤٢/١٤١).

(٢) أحمد (٣/٣٠) وابن ماجه (٤٢٠٤).

**حوکمی سك لەباربردن:**

دوای جێگربوونی نوطفە لەناو ڕەحەمدا دروست نییە کۆرپەلەکە لەناو ببرێ کە سەدوبیست ڕۆژی بەسەردا تێپەڕی، چونکە لەوکاتەوە دەست درێژی کردن ئەبێ بۆ سەر گیانێك کە تۆڵە پێویست ئەکات لەدنیاو ئاخیرەتدا.

بەڵام لەناوبردنی کۆرپەلە، یا تێك دانی تۆوی پیاوو هێلکەی ژن، پێش ئەو کاتە دروستە ئەگەر شتێکی وەهابوو پێویستی بەو کارە کرد, بەڵام ئەگەر شتێکی ڕاستی پێویست نەبوو، ئەو کارە کەڕاهەتی هەیە.

خاوەنی کتێبی (سبل السلام) ووتویەتی: منداڵ لەبار بردن پێش گیان کران بەسەریدا دروستی و نادروستی وەك خۆکێشانەوە جیاوازی زانایانی لەسەرە، هەرکەس خۆکێشانەوە بە دروست دابنێ ئەوە ئەوکارەش بە دروست دائەنێ. وە هەرکەس بە حەرامی دابنێ ئەوکارەش بە حەرام دائەنێ. وەدەرمان دان بە ئافرەت بۆ منداڵ نەبوونیش ئەخرێتە پاڵ ئەوە. تەواو بوو.

وە ئیمامی غەزالی ڕای وەهایە: کە منداڵ لە باربردن تاوانێکە بەرامبەر ئەو شتە ئەکرێ کە هەیە و پێك هاتووە, وە ووتویەتی ئەوشتەش چەند قۆناغی هەیە، کاتێ نوگفە ئەچێتە ڕەحمەوەو تێکەڵی ئاوی ژن ئەبێتو ئامادە ئەبێت بۆ دروست بوون. تێك دانی ئەوە تاوانێکە, جا کاتێ بوو بە پارچە گۆشتو سەرەمێکوتە (زەروو) تاوانێکی گەورەترە، وە کاتێ ڕۆحی کرا بەبەردا تاوانەکە زیاتر گەورە ئەبێت.

### سوێند خواردن لە چوونەلای ژن (إیلاء)

**پێناسەکەی:**

إیلاء: لەشەرعدا ئەوەیە کە پیاو سوێند بخوات نەچێتە لای ژنەکەی, جا سوێندەکە بەخوا بێت، یا بەڕۆژوو، یا بە خێر، یا بە حەج، یا بە تەڵاق بێت وەك یەکە.

لە سەردەمی نەفامیدا پیاوی وا هەبوو سوێندی ئەخوارد نەچێتە لای ژنەکەی بۆ ماوەی ساڵێك، یا دوو ساڵ، یان زیاتر بەمەبەستی ئازاردانی ئەو ژنەو زیان پێگەیاندنی، بەو شێوەیە ئەی هێشتەوە نەژنی بوو نەتەڵاقی دابوو, خوای گەورە وویستیکە سنورێك بۆ ئەو کارە زیان بەخشە دابنێ, چوار مانگی بۆ دانا کە پیاو بیری تێدا بکاتەوە، بەڵکو بگەڕێتەوە بۆ ڕێی ڕاست، جا ئەگەر لەوماوەیدا چووبوە لای ژنەکەی و کەفارەتی سوێندەکەی دا ئەوە باشە، ئەگینا ئەبێ تەڵاقی بدات, خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿لِلَّذِيْنَ يُؤْلُوْنَ مِنْ نِسَائِهِم تَرَبُّصُ أَرْبَعَةِ أَشْهُرٍ فَإِنْ فَاؤُا فَإِنَّ اللهَ غَفُوْرٌ رَحِيْمٌ وَإِنْ عَزَمُوا الطَّلَاقَ فَإِنَّ اللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ﴾ (البقرة:٢٢٧) واتە: بۆ ئەو کەسانەی سوێند لە

ژنەکانیان ئەخۆن کە نەچنە لایان ئەبێ چوار مانگ چاوەڕوانی بکەن، جائەگەر گەڕانەوە لەو چوار مانگەدا ئەوە خوای گەورە لێ بوردەو میهرەبانە، بەڵام ئەگەر نیازی تەڵاق دانیان هەبوو، ئەوە خوای گەورە بیسەرو زانایە بە هەموو شت.

ماوەی إیلاء:

زانایان لەسەرە ئەوە ڕێکن کە هەرکەس سوێندی خوارد دەست لە ژنەکەی نەدات و نەچێتە لای زیاتر لە چوار مانگ ئەوە ئیلائی کردوە. بەڵام جیاوازیان هەیە لەوەدا کەئەگەر ئەو کەسە وا سوێند بخوات چوار مانگ نەچێتە لای ژنەکەی، ئەبوحەنیفەو هاوەڵانی ووتویانە: حوکمی سوێند خۆری بۆ نەچەسپێ‌و ئیلائی کردووە.

بەڵام جەماوری زانایان کە هەرسێ ئیمامەکانیش لەوانن ڕایان وایە کە حوکمی ئیلائی بۆ نی‌یە چونکە خوای گەورە چوار مانگی بۆ داناوە, وە دوای چوار مانگەکە یا پەشیمان ئەبێتەوە یا تەڵاقی ئەدات.

حوکمی إیلاء:

ئەگەر پیاوێك سوێندی خوارد لە ژنەکەی نزیك نەکەوێتەوە, ئەگەر لە ماوەی ئەو چوار مانگەدا چووە لای، ئەوە ئیلاکەی کۆتایی دێت و ئەبێ کەفارەتی سوێند بدات.

بەڵام ئەگەر چوار مانگەکە تەواو بوو وە هەر نەچووە لای ژنەکەی, جەماوەری زانایان ڕایان وەهایە کە ژنەکە بۆی هەیە داوا لە مێردەکەی بکات: یا بچێتە لای یا تەڵاقی بدات، بەڵام ئەگەر پیاوەکە هیچ کامیانی نەکرد, ئیمامی مالیك ڕای وەهایە کە حاکم بۆی هەیە لە جیاتی پیاوەکە ژنەکە تەڵاق بدات بۆ لابردنی زیان لە ژنەکە. وە ئەحمەدو شافیعی‌و ڤاهیری‌یەکان ڕایان وەهایە قازی تەڵاقی نادات بەڵکو زۆر لە پیاوەکە ئەکات کەخۆی تەڵاقی بدات.

بەڵام حەنەفی‌یەکان ڕایان وەهایە کە ئەگەر ماوەکە تەواو بوو نەچوە لای ژنەکەی ئەو ژنە تەڵاقی ئەکەوێ بە تەڵاقی بائین، هەر بەتەواو بوونی ماوەکە.

وە بۆ مێردەکە نی‌یە کە داوای گەڕانەوەی بکات چونکە مامەڵەی خراپ بووە دەربارەی ژنەکە، بەخۆڕاگرتنی لە چوونە لای بەبێ بەهانە، کەواتە مافی ژنەکەی لەناو بردووەو بەوکارەش ستەمی لێ کردووە.

وە ئیمامی مالیك ڕای وەهایە کە مێردەکە حوکمی ئیلای ئەچێتە ئەستۆ، ئەگەر مەبەستی زیان گەیاندن بێت بە ژنەکە بە نەچوونە لای, یا سوێندیشی نەخواردبێ بۆ ئەوە، چونکە لەو حاڵەدا زیان بە ژنەکە ئەگات، وەك چۆن لە کاتی سوێند خواردنیشدا زیانی پێ ئەگات.

**ئەو تەڵاقەی بە إیلاء ئەکەوێ:**

ئەو تەڵاقەی بە إیلاو ئەکەوێ تەڵاقی بائینە, چونکە ئەگەر تەڵاقی ڕەجعی بوایە مێردەکە ئەیتوانی زۆری لێ بکات بیباتەوە لای خۆی، چونکە مافی خۆیەتی, وە بەوە بەرژەوەندی ژنەکە نایەتە جێو زیانی لە کۆڵ ناکەوێ. وە ئەوەش مەزهەبی ئەبوحەنیفەیە.

مالیك و شافیعی و سەعیدی کوڕی موسەیبو ئەبوبەکری کوڕی عبدالرحمن بۆ ئەوە چوون کە تەڵاقەکە تەڵاقی ڕەجعی ئەبێت، چونکە بەڵگەی وائیە کە بائین بێت؛ وە چونکە تەڵاقی ژنێکی گوێزراوەیە بێ بریتی و بێ بەجێ هێنانی گێڕاندنەوەی.

**عیددەی ژنی تەڵاقدراو بە إیلاء:**

جەماوەری زانایان بۆ ئەوە چوون کە ژنی ئیلاو کراو عیددە ئەکێشێ وەك هەموو تەڵاق دراوەکانی تر، چونکە ئەویش تەڵاق دراوە.

جابیری کوڕی زەید فەرمویەتی: عیددەی بەسەردا ناسەپێنرێ ئەگەر لە ماوەی ئەو چوار مانگەدا بێ نوێژ بووبێت سێ جار.

ئیبنوروشد ووتویەتی: کۆمەڵێکیش لە زانایان ئەو قسەیان کردووە. وە هەرئەوەش لە ئیبنوعەبباسەوە گێڕراوەتەوە. وە بەڵگەشی: ئەوەیە کە عیددە بۆ پاك بوونەوەی ڕەحمە، وەئەو بەو بێنوێژییانە پاك بوونەوەکەی بۆ دروست بووە.

## مافی مێرد بەسەر ژنەکەیەوە

مافی پیاو بەسەر ژنەکەیەوە ئەوەیە کە ژنەکەی گوێ ڕایەڵی بکات لەو شتانەدا کە سەرپێچی کردنی خوای تێدا نیەیە، وە خۆی و ماڵەکەی بۆ بپارێزێ، وە کارێك نەکات کە پیاوەکە پێی ناخۆش بێت، و ڕوی لێ کرژ نەکات، و بەشێوەیەك خۆی نیشان نەدات کە ڕقی لێی بێت، و پێی ناخۆش بێت, ئەمانە لە گەورەترین مافەکانی پیاوە بەسەر ژنەکەیەوە.

حاکم ئەگێڕێتەوە لە عائیشەوە کە فەرمویەتی: پرسیم لە پێغەمبەر ﷺ کێ زۆر مافی بەسەر ژنەوە هەیە؟ فەرمووی: مێردەکەی، ووتویەتی: ئەی کێ زۆر مافی بەسەر پیاوەوە هەیە؟ فەرموی: دایکی[1].

---

(١) حاکم (٤/١٧٥).

وه پێغەمبەر ﷺ ئەومافە تەئکید ئەکات و ئەفەرموێ: (لو أمرت أحداً أن يسجد لأحد، لأمرت المرأة أن تسجد لزوجها، من عظم حقه عليها) رواه أبو داود، والترمذي، وابن ماجه، وابن حبان[1].

واتە: ئەگەر فەرمانم بدایە کەسێك کڕنوش بۆ کەسێك ببات، ئەوە فەرمانم ئەدا بە ژن کڕنوش بۆ مێردەکەی بەرێت، لەبەر ئەوەی زۆر مافی بەسەریەوە هەیە.

خوای گەورە وەسفی ژنە چاکەکان ئەکاتو ئەفەرموێ: ﴿فالصالحاتُ قانتاتٌ حافظاتٌ للغيب بما حفظ الله﴾ (النساء: من الآية ٣٤).

واتە: جا ژنانی چاك گوێڕایەڵن و ڕازو نهێنی مێردەکانیان ئەپارێزن بەهۆی ئەوەی کە کراون بە ئەمین لەسەری بە ئاگاداری خوا. ئەوانەش جوانترین ڕەوشتن بۆ ئافرەتان، وە بەوە ژیانی ژنومێردایەتی‌یان بەردەوام ئەبێو بەختیار ئەبن.

وه لە فەرمودەدا هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (خير النساء من إذا نظرت إليها سرتك، وإذا أمرتها أطاعتك، وإذا غبت عنها حفظتك في نفسها ومالك)[2].

واتە: چاکترین ژن ئەوەیە کاتێ سەیرت کرد دڵ خۆشت بکات، وە ئەگەر فەرمانت پێ کرد بەگوێت بکات، وە ئەگەر لێی دوور بوی خۆی و ماڵەکەت بۆ بپارێزێ.

وه پارێزگاری کردنی ئەو مافانە لەلایەن ژنەوە بە جیهاد دائەنرێ لە ڕێی خوادا. ئیبنوعەبباس ئەگێڕێتەوە خوا لێی ڕازی بێت: ژنێك هاتە لای پێغەمبەر ﷺ ووتی: ئەی نێرراوی خوا من لەلایەن ژنانەوە نێرراوم بۆلای تۆ: ئەو جیهادەی خوا لەسەر پیاوانی داناوە, ئەگەر سەرکەوتن پاداشتیان هەیە، وە ئەگەر کوژران زیندوون‌و لای پەروەردگاریان ڕۆزی‌یان ئەدرێتێ، ئێمەی ژنانیش خزمەتیان ئەکەین، ئەی چی بۆ ئێمە ئەبێت لەوەدا؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (أبلغي من لقيت من النساء أن طاعة الزوج واعترافاً بحقه يعدل ذلك. وقليل منكن من يفعله) واتە: هەرچی ژنێکت تووش بوو پێی ڕابگەینە کە گوێ ڕایەڵی پیاوو ئیعتراف کردن بە مافەکانیان وەك ئەو جیهادە وەهایە، هەرچەندە کەمتان ئەوە ئەکات[3].

---

(١) أبوداود (٤١٦٠) والترمذي (١١٥٩) وابن ماجه (١٨٥٢) وأحمد (٦/٧٦)، عن عدد من الصحابة.

(٢) تەخریجی ئەم حەدیسە ڕابورد.

(٣) البزار (١٤٧٤) ومجمع الزوائد (٤/٣٠٥).

وە لەبەر گەورەیی ئەو مافەیە کە ئیسلام گوێ ڕایەڵی مێردی یەك خستووە لەگەڵ بەجێ هێنانی فەرزەکانی ئاینو خواپەرستی. لە عبدالرحمن ی کوڕی عەوفەوە: کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (إذا صلت المرأة خمسها، وصامت شهرها وحفظت فرجها، وأطاعت زوجها، قيل لها ادخلي الجنة من أي أبواب الجنة شئت) رواه أحمد والطبراني[1].

واتە: ئەگەر ئافرەت پێنج نوێژەکەی بەجێ هێناو ڕۆژووی ڕەمەزانی گرتو داوێنی پاراستو مل کەچی فەرمانی مێردی کرد پێی ئەوترێ: بچۆرە بە هەشتەوە لەکام دەرگایانەوە ئەتەوێت.

وە لە ئومو سەلەمەوە خوا لێی ڕازی بێت کە فەرمویەتی: پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (أيما امرأة ماتت، وزوجها عنها راض، دخلت الجنة)[2]. واتە: هەر ژنێك بمرێو مێردەکەی لێی ڕازی بێت ئەچێتە بەهەشتەوە.

وە بەشی زۆری ئەوەی ژن ئەخاتە ئاگرەوە، سەرپێچی کردنی مێردەکەیەتیو لەبیرکردنی چاکەکانییەتی. لە ئیبنوعەبباسەوە خوا لێیان ڕازی بێت: کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (إطلعت في النار فإذا أكثر أهلها النساء، يكفرن العشير، لو أحسنت إلى إحداهن الدهر, ثم رأت منك شيئاً، قالت: ما رأيت منك خيراً قط) رواه البخاري[3].

واتە: ناو ئاگرم نیشان درا دانیشتوانی بەشی زۆریان ئافرەت بوون, چونکە زوو چاکەیان لەبیر ئەچێتەوە، ئەگەر چەندین ساڵ چاکەی لەگەڵدا بکەیت یەك خراپەت لێ ببینێ ئەڵێت: هەرگیز خێرم لە تۆ نەبینیوە.

وە لە ئەبی هورەیرەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (إذا دعا الرجل امرأته إلى فراشه فأبت أن تجيء, فبات غضبان, لعنتها الملائكة حتى تصبح) رواه أحمد والبخاري ومسلم[4].

واتە: ئەگەر پیاوێك شەو ژنەکەی بانگ کرد بۆناو جێگاو نەچوویێتو ئەو شەوە پیاوەکە لێ توڕەبێت هەتا بەیانی، مەلایکە لەعنەتی لێ ئەکەن هەتا ڕۆژ ئەکاتەوە.

---

(١) أحمد (١/١٩١) ومجمع الزوائد (٤/٣٠٦).

(٢) الترمذي (١١٦١) وابن ماجه (١٨٥٤) والحاكم (٤/١٧٣).

(٣) البخاري (٢٩) ومسلم (٩٠٧).

(٤) أحمد (٢/٤٣٩) والبخاري (٥١٩٣) ومسلم (١٤٣٦).

وه مافی ملکەچی وگوێڕاڵی کردنی ئافرەت بۆ مێردەکەی ئەبێ لە کاری چاکەو فەرمانێکدا بێ کە خوا پێی ڕازییە، چونکە (ملکەچی بۆ هیچ مەخلوقو دروست کراوێك دروست نییە لە نافەرمانی خوادا)[1].

جا ئەگەر پیاوەکەی فەرمانی پێ بکات بۆ کردنی خراپەیەك پێویستە لەسەری سەرپێچی فەرمانەکەی بکات.

وە هەر لە ملکەچییە بۆ پیاو کە بەڕازی بوونی ئەو نەبێت ڕۆژوی سوننەت نەگرێ، وە هەروەها حەجی سوننەت نەکات بەڕەزامەندی ئەو نەبێت، و لە ماڵی نەچێتە دەر بە ڕەزامەندی ئەو نەبێت.

ئەبوداودی طیالسي گێڕاویەتیەوە لە عبدالله ی کوڕی عومەرەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (حق الزوج على زوجته أن لا تمنعه نفسها، ولو كان على ظهر قتب، وأن لا تصوم يوماً واحداً إلا بإذنه، إلا لفريضة فإن فعلت أثمت، ولم يتقبل منها، وألا تعطي من بيتها شيئاً إلا بإذنه، فإن فعلت كان له الأجر، وعليها الوزر، وألا تخرج من بيته إلا بإذنه، فإن فعلت لعنها الله وملائكة الغضب حتى تتوبَ أو ترجَع وإن كان ظالماً).

واتە: مافی پیاوە بەسەر ژنەکەیەوە کە ڕێی لێ نەگرێ هەرکاتێ بیەوێ بچێتە لای، با لەسەر پشتی حوشتریش بێت، وە ڕۆژێك بێ ڕێ پێدانی ئەو بەڕۆژوو نەبێت، ئەگەر بەڕۆژو بوو گوناهبار ئەبێت و لێی وەرناگیرێ جگە لە ڕۆژووی فەرز، وە هیچ لە ماڵەکەی نەدا بەکەس بە ئیزنی پیاوەکەی نەبێت، ئەگەر شتی وای کرد پیاوەکە پاداشتی بۆ ئەنوسرێ و ژنەکە گوناهبارە، و نابێت لە ماڵ بچێتە دەر هەتا پیاوەکەی ڕێی نەدا ئەگەر چووە دەر خواو فریشتەکانی توڕەیی نەفرینی لێ ئەکەن هەتا ئەگەڕێتەوە یا پەشیمان ئەبێتەوە، با پیاوەکەی ستەمکاریش بێت.

**کەسێك نەباتە ماڵەوە کە پیاوەکەی پێی ناخۆش بێت:**

وە لە مافی پیاوە بەسەر ژنەکەیەوە کە ژنەکەی کەسێك نەباتە ماڵەوە پیاوەکەی پێی ناخۆش بێت هەتا ڕێی پێ نەدات.

لە عەمری کوڕی ئەحوەصی. جەشمی‌یەوە خوا لێی ڕازی بێت کە گوێی لە پێغەمبەر ﷺ بووە لە حەجی ماڵ ئاوایی‌دا دوای ئەوەی ستایشی خوای کردووەو خەڵکی وەبیر هێناوەتەوەو ئامۆژگاری کردوون لەپاشاندا فەرموویەتی: (ألا, واستوصوا بالنساء خيرًا فإنما هن عوان عندكم ليس تملكون منهن شيئا غير ذلك, إلا أن يأتين بفاحشة مبينة، فإن فعلن فاهجروهن في المضاجع, واضربوهن

---

(١) أحمد (١/٤٠٩و٥/٦٦)، والطيالسي في مسنده (١٧).

ضرباً غير مبرح، فإن أطعنكم فلا تبغوا عليهن سبيلاً، ألا إن لكم على نسائكم حقا، ولنسائكم عليكم حقا، فحقكم عليهن أن لايوطئن فرشكم من تكرهونه، ولا يأذن في بيتوكم من تكرهونه، ألا وحقهن عليكم أن تحسنوا إليهن في كسوتهن وطعامهن) رواه ابن ماجه والترمذي، وقال: حديث حسن صحيح[1].

واته: ئاگاداربن، داواتان لێ ئەکەم کە بەرامبەر ژنەکانتان چاك بن چونکە ئەوان دیلی بەردەستی ئێوەن، لەوە زیاتر هیچتان نیە بەسەریانەوە، مەگەر تاوانێکی ئاشکرا بکەن. ئەگەر شتی وەهایان کرد، لە جێگا لێیان دوور بکەونەوە، وە لێیان بدەن لێ دانێك کە شوێن دیاری نەکات، بەڵام ئەگەر ملکەچتان بوون ئیتر زیادەڕەوی مەکەن لەسەریان، ئاگاداربن، کە ئێوە مافتان هەیە بەسەر ژنەکانتانەوە، وە ژنەکانیشتان مافیان هەیە بەسەرتانەوە. وە مافی ئێوە بەسەر ئەوانەوە ئەوەیە کەسێك پێ نەنێتە ناو ماڵتان کە ئێوە پێتان خۆش نەبێت، وە ڕێ کەسێك نەدەن بێتە ماڵتان کە ڕقتان لێیان بێت، وە بزانن کە مافی ئەوانیش بەسەر ئێوەوە ئەوەیە کە بە چاکی پۆشاکیان بۆ بکەن و خواردنیان بدەنێ.

**خزمەت کردنی پیاو لەلایەن ژنەوە:**

بناغەی پەیوەندی نێوان پیاوو ژن یەکسانیە لە ماف و ئەرکەکاندا، وە بناغەی ئەوەش فەرموودەی خوای گەورەیە کە فەرمویەتی: ﴿وَلَهُنَّ مِثْلُ الَّذِي عَلَيْهِنَّ بِالْمَعْرُوفِ وَلِلرِّجَالِ عَلَيْهِنَّ دَرَجَةٌ﴾ (البقرة: من الآية٢٢٨).

واتە: وە ژنان مافیان هەیە بەسەر مێردەکانیانەوە وەك چۆن مێردەکانیان مافیان هەیە بەسەر ئەوانەوە بە چاکەو بە عورف، وە بۆ پیاوان هەیە پلەیەکی زیاتر لە ژن.

ئەم ئایەتە ئەو مافەی بە پیاوی ئەدات بە ژنیشی ئەدات، جا هەرکاتێ داوای شتێ لەژن بکرێ ئەوەندەی ئەوەش داوا لەپیاو ئەکرێ.

وە ئەو بناغەیەی ئیسلام دایناوە بۆ مامەڵەی نێوان ژن و مێردو ڕێك کردنی ژیان لە نێوانیاندا بناغەیەکی فیگری و سروشتیە، چونکە پیاو بە تواناترە بۆ کارو کاسبی و هەوڵ دان لە دەرەوەی ماڵ، وە ژن بەتواناترە لەسەر ڕێك خستنی ماڵ و پەروەردەکردنی منداڵ و ئاسان کردنی هۆیەکانی حەوانەوەو ئاسایش لەناوماڵدا، جا پیاو ئەو ئەرکانەی پێ ئەسپێردرێ کە گونجاوە بۆی، وە ژنیش ئەو

(١) الترمذي (١١٦٣) وابن ماجه (١٨٥١) وأحمد (٥/٧٢-٧٣) والنسائي في(عشرة النساء (٢٨٧).

ئەرکانەی پێ ئەسپێردرێ کە لەگەڵ سروشتیدا بگونجێ، بەوە کاروباری ماڵ لە ناوخۆو دەرەوەدا ڕێك و پێك ئەبێت، بێ‌ئەوەی هیچ کامیان هۆیەك بدۆزێتەوە کە ماڵەکە تەنیا لەسەر خۆیەتی.

پێغەمبەر ﷺ لەنێوان عەلی کوڕی ئەبی طالیب و فاطمەی خێزانیدا ناوبژی کرد. ئیشی ماڵی سپارد بە فاگیمەو کارو کاسبی دەرەوەی سپارد بە عەلی[1].

بوخاری و موسلیم ئەگێڕنەوە کە فاگمە خوا لێی ڕازی بێت هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ بێزاری خۆی دەربڕی لەوەی کە تووشی دەستی دەبێت بەهۆی دەستاڕکردن، وە داوای کارەکەرێکی لێ کرد، فەرمووی: (ألا أدلكم على ما هو خير لكما مما سألتما: إذا أخذتما مضاجعكما فسبِّحا الله ثلاثاً وثلاثين, واحمدا ثلاثاً وثلاثين, وكبرا أربعا وثلاثين, فهو خير لكما من خادم)[2].

واتە: ئایا ڕێ نمایی‌تان نەکەم بۆ شتێ لەوە چاکتر بێت کە داوای ئەکەن؟: کاتێ چوونە ناو جێگە سی‌وسێ جار بڵێن (سبحان الله) و سی‌وسێ جار بڵێن (الحمد لله) و سی‌وچوار جار بڵێن (الله أكبر) ئەوە چاکترە بۆ ئێوە لە خزمەتکار.

وە لە ئەسمای کچی ئەبی بەکرەوە خوای لێی ڕازی بێت کە فەرمویەتی: من زوبەیرم خزمەت ئەکرد لە ماڵەوە بەهەموو شێوەیەك، وە ئەسپێکی هەبوو خزمەتم ئەکردو جێگەکەیم پاك ئەکردەوەو خواردنم ئەدایەو سەرپەرشتیم ئەکرد. ئەسما خۆی گژوگیای ئەداو ئاوی ئەداو، دۆڵچەی ئەدوری‌یەوەو، هەویری ئەشێلاو، دانەوێڵەی لە زەوی‌یەکەیەوە ئەهێنایەوە کە دوسێ‌یەکی فەرسەخێك دوور بووە.

لەم دوو حەدیسەدا ئەوە دەرئەکەوێ کە لەسەر ژنە کە خزمەتی ماڵ بکات، وەك چۆن لەسەر پیاوە مەسرەف‌و خەرجی ژن بکێشێ.

وە فاگمە ڕەزای خوای لێ بێت کاتێ سکاڵای کرد لەو ماندو بوونە کە توشی ئەبو بەهۆی ئیش کردنەوە، پێغەمبەر ﷺ، نەی‌فەرموو بە عەلی: فاطمە خزمەت کردنی لەسەر نی‌یە بەڵکو هەر لەسەر تۆیە.

وە هەروەها کاتێ بینی ئەسماو چۆن خزمەتی پیاوەکەی ئەکات نەی‌فەرموو پێی خزمەتت لەسەر نی‌یە، بەڵکو بڕیاری لەسەرداو ئیقراری بە خزمەتەکەی کرد. هەروەها ئیقراری لەسەر خزمەتکردنی خێزانەکانی صەحابە کرد، لەگەڵ ئەوەشدا کە ئەیزانی هەیانە ڕازی‌یەو هەیانە پێی ناخۆشە.

---

(١) أقضية رسول الله ﷺ : للقرطبي (٧٢).

(٢) البخاري (٥٣٦٢) ومسلم (٢٧٢٧).

و ئیبنوقەییم فەرمویەتی: ئەمە کارێکە گومانی تێدا نی‌یە, وە نابێت دەوڵەمەندو هەژار، بەرزو نزم لێك جیابکرێنەوە.

ئەوە فاگمەه بوو کە بەرزترین ئافرەتی جیهانە خزمەتی مێردەکەی ئەکرد, و هاتە لای پێغەمبەر ﷺ سکالای کرد لەدەست ئەو خزمەتە، پێغەمبەر ﷺ لە سکالاکەی نەپرسی.

هەندێ لە زانایانی مالیکی ووتویانە: لەسەر ژن پێویستە خزمەتی ماڵ بکات، وە ئەگەر لە خێزانێکی دەوڵەمەند بوو یان لە ماڵی باوکی لە خۆشیدا بوو، ئەوە سەرپەرشتیاری ماڵەکەی لەسەرەو فەرمان کردن بە خزمەتکار، وە ئەگەر حاڵی مام ناوەند بوو، ئەوە جێگا ڕاخستن‌و ئەو جۆرە شتانەی لەسەرە، وە ئەگەر لە خوار ئەوانە بوو لەسەریەتی گسك بدات و ماڵ پاك بکاتەوە و چێشت لێ بنێ و جل بشوات. وە ئەگەر لە ئافرەتانی کورد و دەیلەم و ناوچە شاخاویەکان بوو ئەبێ ئەو کارانە بکات کە ئافرەتی ئەو ناوە ئەیکات، وە بۆ ئەوەشە خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿وَلَهُنَّ مِثْلُ الَّذِي عَلَيْهِنَّ بِالْمَعْرُوفِ﴾ (البقرة: من الآية٢٢٨) وە عادەتی موسڵمانان لەکۆن‌و تازەدا هەربەو شێوەیە بووە کە باسمان کرد.

ئەی نابینی کە خێزانەکانی پێغەمبەرو یارانی ئاردیان هاڕیوەو نانیان کردووەو چێشتیان لێ ناوەو جێ‌یان ڕاخستوەو خواردنیان داناوەو ئەو جۆرە شتانە، وە نازانین کە ژنێك هەبوبێت ئەوانەی نەکردبێ، وە بۆشی دروست نی‌یە کە نەیکات؛ بەڵکو ئەوان جاری وابووە لە خێزانەکانیان داوە ئەگەر تەمەڵی‌یان کردبێ لەوەدا، و ئەگەر ئەو کارانەیان لا ڕەوا نەبوایە داوایان لێ نەئەکردن. ئا ئەوەیە مەزهەبی ڕاست، بە پێچەوانەی ئەوەی کە مالیك‌و ئەبوحەنیفەو شافیعی بۆی چوون کە ووتویانە: واجب نی‌یە لەسەر ژن خزمەتی مێردەکەی بکات.

وە ووتویانە: پەیمانی ژن‌ومێردایەتی تەنها ئەوە پێویست ئەکات کە مێرد خۆشی لە ژن وەربگرێ، نەك کاری پێ بکات‌و سودی تری لێ وەربگرێ. . .، وە دەڵێن فەرمودەکانی پێشوو ئەوە ئەگەیەنن کە کارکردن تەنها بە ئارەزوی ژنەکەیەو لە ڕەوشتی جوانی‌یەوەیەتی.

لادان لە ڕاستی ووتن لە نیوان ژن و مێرددا:

پارێزگاری کردنی بە یەکەوە گونجان لەناو ماڵدا، و بەهێزکردنی پەیوەندی نێوان ئەندامانی خێزان مەبەستێکە لەو مەبەستانەی کە لە پێناویدا درۆکردنیش ڕەوایە.

ئەگێڕنەوە کە ئیبنوئەبی عوزرەی دوئلی ـ لەسەردەمی خەلافەتی عومەردا، ڕەزای خوای لێ بێت ـ ئەو ئافرەتانەی ئەبوونە خێزانی خولعی ئەکردن، وە بەسەرهاتەکەی بەهۆی ژنانەوە بڵاوبۆوە

لەناوخەڵکیدا کەلای ناخۆش بوو، کاتێ بەوەی زانی دەستی عبدالله ی کوڕی ئەرقەمی گرتو بردی بۆ ماڵی خۆیان, لەپاشاندا بەژنەکەی ووت: توئەو خوایە ڕقت لە منە؟

ژنەکەی ووتی: سوێندم مەدە بەخوا. ووتی: سوێندت ئەدەم بە خوا. ژنەکە ووتی: بەڵێ، بە ئیبنوئەرقەمی ووت: گوێت لێ بوو؟ لەپاشاندا هەڵسانو چوون بۆلای عومەر خوا لێی ڕازی بێت، پێی ووت: ئێوە ئەڵێن تۆ ستەم لە ئافرەتان ئەکەیت و خولعیان ئەکەیت. پرسیار بکە لە ئیبنو ئەرقەم، ئەویش پرسیاری لێ کرد، ئیبنو ئەرقەمیش بۆی گێڕاوە, ئەویش ناردی بەدوای ژنەکەی ئیبنوئەبی عوزرەدا، ژنەکەش لەگەڵ پوریا هاتن. عومەر پێی فەرموو: ئەوە تۆی ووتوتە بە مێردەکەت ڕقم لێتە؟

ژنەکە ووتی: پەشیمانم لە کارەکەم و تۆبە ئەکەم، بەڵام ئەو سوێندی دام بە خوا. منیش پێم ناخۆش بوو درۆ بکەم. ئایا درۆم بکردایە ئەی ئەمیری موسڵمانان؟ فەرموی: بەڵێ: درۆت بکردایە، ئەگەر کەسێك لە ئێوە ڕقی لێمان بوو با باسی نەکات. چونکە کەم ماڵ بە خۆشەیستی دروست کراوە، بەڵکو ئەم خەڵکە تێکەڵی یەك ئەبن بە هۆی ئیسلام و نەسڵ زادەیی.

وە بوخاری و موسلیم لە ئومو کولپومەوە ئەگێڕنەوە خوا لێی ڕازی بێت: کە خۆی گوێی لە پێغەمبەر بووە ﷺ فەرمویەتی: (ليس الكذاب الذي يصلح بين الناس، فينمي خيراً، أو يقول خيراً)[1].

واتە: ئەو کەسە درۆزن نیيە کە نێوان خەڵك چاك ئەکات و شت هەڵئەبەستێ. و قسەی خێر ئەکات.

ووتویەتی (ئومو کولثوم): گوێم لێی نەبووە ﷺ کەرێ بدات خەڵك ڕاست نەڵێ، لە سێ شتدا نەبێت: لە جەنگ و چاك کردنی نێوان خەڵك و قسەی ژن لەگەڵ مێردی و مێرد لەگەڵ ژنیدا.

ئەوە فەرمودەی صەریحە کە ڕێ ئەدات هەندێ درۆ بکرێت بۆ بەرژەوەندی.

**هێشتنەوەی ژن لە ماڵی ژن و مێردایەتیدا:**

پیاو مافی ئەوەی هەیە کە نەیەڵێت ژن لەماڵی ژنومێردایەتی بچێتە دەر هەتا خۆی ڕێی پێ نەدا، بە مەرجێ ئەو خانووە شایەنی ئەو ژنە بێت. وە بۆ ئەوە ببێت کە ژیانی ژنومێردایەتی تێدا جێگیر بێت. وە ئەو جۆرە خانووەیە کە پێی ئەوترێ خانوی شەرعی. بەڵام ئەگەر خانوەکە لایەق

---

(١) البخاري (٢٦٩٢) ومسلم (٢٦٠٥).

نەبوو بەو ژنە، وە نەیئەتوانی مافەکانی ژن و مێردایەتی کە مەبەستی پیاوە تێیدا جێ بەجێ بکات، ئەوە پیاوەکەی ناتوانێ زۆری لێ بکات کە تێیدا دابنیشێ، چونکە خانووی شەرعی نیە.

بۆ نمونە: ئەگەر لەو خانووەدا کەسانێکی تێدا بن رێ ئەوەی لێ بگرن کە بەخۆشی بژی لەگەڵ مێردەکەیدا، یا بەبوونی ئەوانە زیانی پێ بگات، یا ترسی کەلوپەلەکانی هەبێ، یا ئەو خانووە پێداویستی زەروری تێدا نەبێت، یا بەشێوەیەك بێت ژنەکە هەست بە ترس بکات تێیدا، یا دراوسێکانی دراوسێی خراپ بن.

**گواستنەوە لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر:**

مافی پیاوە کە بۆ هەر شوێنێك ویستی بگۆزێتەوە, ژنەکەشی لەگەڵ خۆیدا بۆ ئەو شوێنە ببات, خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿أَسْكِنُوهُنَّ مِنْ حَيْثُ سَكَنْتُمْ مِنْ وُجْدِكُمْ وَلَا تُضَارُّوهُنَّ لِتُضَيِّقُوا عَلَيْهِنَّ﴾ (الطلاق: من الآية٦).

واتە: لەو شوێنەدا دایان بنێن کەخۆتان لێی دانیشتوون بە پێی تواناتان، وەزیانیان پێ مەگەیەنن بۆ ئەوەی تەنگیان پێ هەڵچنن.

ئەو قەدەغە کردنی زیانە ئەوە پێویست ئەکات کە نابێ ژن لەبەر ئەوەی زیانی پێ بگات لە شوێنێکەوە بگوێزرێتەوە بۆ شوێنێکی تر، بەڵکو پێویستە کە مەبەست لە گواستنەوەکە بۆ ژیاندن بێت. وە بۆ مەبەستەکانی زەواج بێت، جا ئەگەر مەبەستی زیان گەیاندنو تەنگ هەڵچینین بێت بەژن کاتێ داوای گوێزانەوەی لێ ئەکات، وەك ئەوەی ژنەکە هەندێ لە مارەییەکەی بداتێ، یا واز لە هەندێ نەفەقەی بهێنێ کە پێویستە لەسەر پیاوەکە، یان باوەڕ بە پیاوەکە نەکرێت لە پاراستنی ژندا، لەم کاتانەدا ژنەکە مافی ئەوەی هەیە کە نەچێ لەگەڵیا، وە بۆ قازی هەیە حوکمی ئەوە بدات کە ئافرەتەکە بەقسەی پیاوەکە نەکات لەو کارەدا.

وە زانایان بەکارهێنانی ئەو مافەیان بەستۆتەوە بەوەوە کە لە گواستنەوەیدا ترسی زیان گەیاندنی نەبێت, وەك ئەوەی ڕێگاکە بێ ترس نەبێت، یا تووشی نارەحەتیەك ببێت کە توانای خۆڕاگرتنی نەبێت، یا ترسی دوژمنی هەبێت، جا ئەگەر ژنەکە لە شتێك لەوانە ترسی هەبوو بۆی هەیە ئەو سەفەرە نەکات.

**بە مەرج گرتنی دەرنەچوونی ژنەکە لە خانوەکەی :**

هەرکەس ژنێکی هێنا وە مەرجی ئەوەی بۆ دانا کەلەو ماڵە نەیگوێزێتەوە بۆ ماڵێکی تر، یا لەو شارە نەیباتە دەر، پێویستە لەسەری ئەو مەرجە بەجێ بهێنێ، بەپێی فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ

کە فەرمویەتی: (إن أحق الشروط أن توفوا به، ما استحللتم به الفروج) رواه البخاري ومسلم وغيرهما عن عقبة بن عامر[1].

واتە: ڕەواترین مەرج کە ئەبێ بەجێی بهێنن ئەومەرجەیە کە ژنانتان پێ حەڵاڵ کردووە بۆ خۆتان.

ئەمەش مەزهەبی ئەحمەد و ئیسحاقی کوڕی ڕاهەوەیهی و ئەوزاعیەیە، وە جگە لەوانە لە زانایانی تر بۆ ئەوە چوون کە پێوست نییە بەجێ بهێنرێ وە بۆی هەیە لەوماڵە بیگوێزێتەوە، وە لەبارەی ئەوحەدیسەوە ووتویانە: ئەو مەرجەی پێویستە بەجێ بێت ئەوەیە کە تایبەت بێت بە مارەییەوە, وە هەروەها تایبەت بێت بە مافی ژنومێردایەتی کە پەیمانەکە پێویستیان ئەکات وە لە پێشەوە باسی مەرجەکانی ژن هێنان و جیاوازی زانایانی تێدا کراوە بە درێژی.

ڕێ گرتنی ژن لە کارکردن:

زانایان جیاوازیان خستۆتە نێوان ئەو کارەی کە ژن بیکات و ببێتە هۆی کەم کردنەوەی مافی پیاو، یان زیان پێ گەیاندنی، یان دەرچونی لەماڵ، وە لەنێوان ئەوکارەی کە زیانی تێدا نییە بۆ پیاو، جا ڕێیان نەداوە کاری یەکەم بکرێ، وە ڕێیان داوە کاری دووەم بکرێ. ئیبنوعابدین لە زانایانی حەنەفی ووتویەتی: ئەوەی پێویستە بووترێ ئەوەیە کە پیاو بۆی هەیە ڕێ لە کارکردنی ژن بگرێ، ئەو کارەی کە ببێتە کەم کردنەوەی مافی مێردەکە یا زیان پێ گەیاندنی یا ببێتە هۆی چوونە دەرەوەی ژن، بەڵام ئەو کارەی زیانی تێدا نەبێت هیچ ڕێگا نییە بۆ قەدەغە کردنی لە ژن، وە هەروەها پیاو بۆی نییە ڕێ لە چوونە دەرەوەی ژنەکەی بگرێت ئەگەر پیشەکەی پیشەیەك بێت لە فەرزە کیفایەتەکان و تایبەت بێت بە ژنانەوە وەك مامانی کردن.

دەرچونی ژن بۆ فێربوونی زانستی:

ئەگەر ئەو زانستیەی ژنەکە بۆی ئەچێت فەرز بوو لەسەری بیزانێ, لەسەر پیاوەکە پێویستە فێری بکا ئەگەر توانای فێرکردنی هەبوو، وە ئەگەر نەی کرد پێویستە لەسەری بچێتە دەر بۆ ئەو شوێنەی زانایانو کۆڕی زانیاری تیادا بێت بۆ ئەوەی ئەحکامی ئاینەکەی فێر بێت، با پیاوەکەشی ڕێی نەدات.

بەڵام ئەگەر هاتوو ژنەکە ئەو ئەحکامە فەرزانەی ئەزانی کە خوا بۆی داناوە یا مێردەکەی زانا بوو بە دینی خواو فێری ئەکرد, ئەو کاتە مافی چونە دەرەوەی نییە هەتا مێردەکە ڕێی پێ نەدا.

---

(١) تەخریجی ئەم حەدیسە ڕابورد.

**ئامۆژگاری كردنی ژن لە كاتی (نشوز) خراپ بوون و نافەرمانی كردندا:**

خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿ وَاللَّاتِي تَخَافُونَ نُشُوزَهُنَّ فَعِظُوهُنَّ وَاهْجُرُوهُنَّ فِي الْمَضَاجِعِ وَاضْرِبُوهُنَّ فَإِنْ أَطَعْنَكُمْ فَلا تَبْغُوا عَلَيْهِنَّ سَبِيلاً﴾ (النساء: من الآية٣٤).

واتە: ئەو ژنانەی ترسی ئەوەتان هەبوو نافەرمانیتان بكەن، یەكەم جار ئامۆژگاریان بكەن، ئەگەر چاك نەبوون لە جێگادا خۆیان لێ جیا بكەنەوە، ئەگەر هەر چاك نەبوون لێیان بدەن، بەڵام ئەگەر نافەرمانیان نەكردن ڕێگا بۆستەم لێ كردنیان مەدۆزنەوە.

نافەرمانی ژن (نشوز) ئەوەیە: سەرپێچی فەرمانی مێرد بكات و بەگوێی نەكات یا نەچێتە لای لە جێگادا، یا بەبێ ئیزنی مێرد بچێتە دەر.

وە ئامۆژگاری كردنیشی ئەوەیە: خوای بخرێتەوە بیر و بترسێنرێ بەخوا، وە ئاگادر بكرێتەوە لەوەی كە پێویستە لەسەری لە گوێ ڕایەڵی وە لەوەی كە مێردەكەی مافی هەیە بەسەریەوە، هەروەها سەرنجی بۆ ئەوە ڕابكێشرێ كە چ تاوانێك دێتە ئەستۆی بەو سەرپێچی كردنە وە چ مافێكی لەدەست ئەچێت لە پۆشاك و نەفەقە.

وە جێگا لێ جیا كردنەوە ئەوەیە: لەناو جێگای نوستندا لێی دووربكەوێتەوە. بەڵام قسە لەگەڵ نەكردنی دروست نییە لە سێ ڕۆژ زیاتر، بەپێی ئەوەی ئەبو هورەیرە گێڕاویەتییەوە كە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (لا يحل لمسلم أن يهجر أخاه فوق ثلاثة أيام)[1]. واتە: دروست نییە بۆ موسڵمان لە سێ ڕۆژ زیاتر قسە لە برای موسڵمانی دابڕێت.

وە نابێت لە یەكەم سەرپێچیدا لە ژن بدرێت، چونكە ئایەتەكە شاردنەوەو تەقدیری تێدایە واتە: ﴿واللاتي تخافون نشوزهن فعظوهن﴾ واتە: ئەو ئافرەتانەی كە ترسی ئەوەتان هەیە سەرپێچیتان بكەن ئامۆژگاریان بكەن.

جا ئەگەر نافەرمانیان كردن ﴿واهجروهن في المضاجع﴾ واتە جێیان لێ جیا بكەنەوە.

جا ئەگەر هەر مانەوە لەسەر ئەو نافەرمانی‌یە ﴿واضربوهن﴾ واتە: لێیان بدەن، واتە: ئەگەر بە ئامۆژگاری و جێ لێ جیا كردنەوەكە نەگەڕانەوە، بۆ مێرد هەیە لێیان بدات. پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ (إن لكم عليهن ألا يوطئن فرشكم أحداً تكرهونه، فإن فعلن فاضربوهن ضرباً غير مبرح)[2].

---

(١) أبوداود (٤٩١٢و٤٩١٤).

(٢) أحمد (٥/٧٢-٧٣) والترمذي (١١٦٣) وابن ماجه (١٨٥١) والنسائي في(عشرة النساء (٢٨٧).

واتە: ئێوە ئەو مافەتان بەسەر ژنەکانتانەوە هەیە کە نەیەڵن کەسێك بچێتە ماڵتان، کە حەز ناکەن... ئەگەر شتی وەهایان کرد لێیان بدەن بەڵام لێدانی وانا کە زۆر ئازاری بدا.

وە ئەبێ لە کاتی لێداندا لەسەروچاوی نەدرێ، وە هەروەها لەو شوێنانەی کە مەترسی لێ ئەکرێ، چونکە مەبەست لەو لێدانە ئامۆژگاری کردنە نەك فەوتاندنی ئەبوداود گێڕاویەتی‌یەوە لە حەکیمی کوڕی موعاویەی قوشەیری‌یەوە لە باوکی‌یەوە کە فەرمویەتی: ووتم ئەی نێرراوی خوا: مافمان چی‌یە بەسەر ژنەکانمانەوە؟ فەرموی: (أن تطعمها إذا طعمت وتكسوها اذا اكتسيت, ولا تضرب الوجه لا تقبح ولا تهجر إلا في البيت)[1]. واتە: لەگەڵ خۆتدا خواردن بدەرێ، وە لەگەڵ خۆتا پۆشاکی بۆ بکە، وە لەسەروچاوی مەدەو ناشرینی مەکەو لەناو ماڵدا نەبێت جێی لێ جیا مەکەرەوە.

**خۆ ڕازاندنەوەی ژن بۆ پیاوەکەی:**

وا باشە کە ژن بۆ پیاوەکەی خۆی برازێنێتەوەو خۆی جوان بکات بە کل و خەنەو بۆنی خۆش و وێنەی ئەوانە لە هۆیەکانی جوانی.

ئەحمەد گێڕاویەتی‌یەوە لە کەریمەی کچی هومامەوە کە بە عائیشەی دایکی موسڵمانانی ووت: تۆ چی ئەڵێی لەبارەی خەنەوە؟ ئەویش فەرموی: خۆشەویستەکەم پێغەمبەر ﷺ حەزی لە ڕەنگەکەی ئەکردو ڕقی لە بۆنەکەی بوو, وە حەرام نی‌یە بۆتان بەکاری بهێنن لەنێوانی دوو بێ‌نوێژی دا یا دوای هەموو بێ‌نوێژی‌یەك[2].

## (التبرج) خۆ دەرخستن

واتاکەی: تبرج دەرخستنی ئەو شوێنانەیە کە پیویستە داپۆشرێ.

وە خۆی لە بنەڕەتدا دەرچوونە لە بورج واتە کۆشك, لە پاشاندا بەکارهاتووە لە دەرچوونی ژن لە خۆداپۆشین و دەرخستنی ئەو شوێنانەی کە پیاو تووشی فیتنە ئەکەن و دەرخستنی جوانیان.

**تەبەروج لە قورئاندا:**

ووشەی تەبروج لە قورئاندا لە دوو شوێندا هاتووە:

شوێنی یەکەم: لە سورەتی نوردا کە ئەفەرموێ: ﴿وَالْقَوَاعِدُ مِنَ النِّسَاءِ اللَّاتِي لا يَرْجُونَ نِكَاحاً فَلَيْسَ عَلَيْهِنَّ جُنَاحٌ أَنْ يَضَعْنَ ثِيَابَهُنَّ غَيْرَ مُتَبَرِّجَاتٍ بِزِينَةٍ وَأَنْ يَسْتَعْفِفْنَ خَيْرٌ لَهُنَّ﴾ (النور: من

---

(١) أبوداود (٢١٤٣) وابن ماجه (١٨٥٠) وأحمد (٥/٣،٥).

(٢) أحمد (٦/١١٧).

الآية٦٠) واتە: ئەو پیرە ژنانەی کە هیوای شووکردنیان بڕاوە، گوناه نی‌یە لەسەریان ئەگەر هەندێك لە پۆشاکەکانیان ـ وەك عەبا ـ لابەرن بە مەرجێ مەبەستیان دەرخستنو ڕازاندنەوەیان نەبێت، بەڵام ئەگەر ئەوە نەکەنو خۆیان دەرنەخەن چاکترە بۆیان.

شوێنی دووەم: لە سورەتی ئەحزابدا هاتووە بە ناشرین کردنی و قەدەغە کردنی کە ئەفەرموێ: ﴿وَلا تَبَرَّجْنَ تَبَرُّجَ الْجَاهِلِيَّةِ الْأُولَى﴾ (الأحزاب: من الآية٣٣) واتە:خۆتان مەڕازێنەوەو خۆتان دەرمەخەن وەك کاتی سەردەمی نەفامی‌یەکە.

خۆ دەرخستن پێچەوانەوەی ئایینو شارستانی‌یەتی‌یە:

گرنگترین شت کە مرۆڤی لە ئاژەڵ جیا کردۆتەوە, ئەوەیە کە ئادەمیزاد پۆشاك و شتی جوان بەکار ئەهێنێ.

خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿يَا بَنِي آدَمَ قَدْ أَنْزَلْنَا عَلَيْكُمْ لِبَاساً يُوَارِي سَوْآتِكُمْ وَرِيشاً وَلِبَاسُ التَّقْوَى ذَلِكَ خَيْرٌ ذَلِكَ مِنْ آيَاتِ اللَّهِ لَعَلَّهُمْ يَذَّكَّرُونَ﴾ (الأعراف:٢٦).

واتە: ئەی ئادەمیزاد ئێمە پۆشاکێکمان بۆ ناردونە خوارەوە بۆ ئەوەی شەرمەگەتانی پێ داپۆشن و پۆشاکێکیش بۆ جوانیو خۆڕازاندنەوە، بەڵام پۆشاکی لە خوا ترسان لەوان باشترە بۆ ئێوە, ئەوانەش لە نیشانەکانی خوان بەڵکو بیربکەنەوە.

وە جل‌وبەرگو ڕازاندنەوە هەردوکیان ڕواڵەتی شارستانیەتیو پێشکەوتنن، وە خۆ ڕووت کردنەوە گەڕانەوەیە بۆ ژیانی ئاژەڵیو ژیانی سەرەتایی.

وە ژیان بە پێی سروشت هەر بەرەو پێش ئەڕوات، نابێت بگەڕێتەوە بەرەو دوا مەگەر شتێکی وەها ڕووبدات ڕاو بیری بگۆڕێو تووشی نوشستی ببێت، وە وای لێ بکات بەرەو دوا بگەڕێتەوەو شارستانی‌یەتیو پێش کەوتنی مرۆڤایەتی لە بیر بچێتەوە یا لە بیری خۆی بباتەوە.

جا ئەگەر پۆشاك پێویستی‌یەك بێت لە پیویستی‌یەکانی ئادەمیزادی بەرەو پێش چوو پێش کەوتوو، ئەوە بە نیسبەت ژنەوە زۆر پێویست ترە، چونکە خۆداپۆشین ئەو پارێزەرەیە کە ئایین و شەرەف و ئابڕو و پاك داوێنی ئەپارێزێ .

وە ئەم سیفەتانەش زیاتر بە ژنەوە پەیوەستن، وە بۆ ژن لەپێشترن وەك لە پیاو، هەر بۆیە خۆداپۆشین لەپێشترو شایستەترە بۆ ژن.

بە ڕاستی عەزیزترین شت کە ژن هەیبێ شەرەف و حەیاو داوێن پاکی‌یە, وە پارێزگاری کردنی ئەو سیفاتانە پارێزگاری کردنە لە مرۆڤایەتی ژن لە بەرزترین شێوەیدا، وە نە لەبەرژەوەندی ئافرەتو نە لەبەرژەوەندی کۆمەڵە کە ژن واز لە خۆداپۆشین و خۆ پێچانەوە بهێنێت، بەتایبەتی کە

غەریزەی جنسی توندترین و سەرکێشترین غەریزەیە بەتێکڕا! وە ئەو خۆ ڕوت کردنەوەش، ئەو غەریزەیە ئەجوڵێنێ و لە ئاوساری خۆی بەرەڵای ئەکات.

وە دانانی سنوورو بەبەرست لە بەردەم خۆ بەرەڵلا کردندا توندیو تیژی ئەو غەریزەیە کەم ئەکاتەوەو لە شوێنی هەڵگیرسانی‌یەوە ئەیکوژێنێتەوەو بە شێوەیەك پەروەردەی ئەکات کە شایستەی ئادەمیزادو کەرامەتی مرۆڤ بێت. وەلەبەر ئەوەیە کە ئیسلام گرنگی‌یەکی تایبەتی داوە بە پۆشاکی ژن. وە قورئان باسی جلوبەرگی ئافرەتی کردووە, و سنوورەکەی بە درێژی باس کردووە، کەلە عادەتی قورئان نی‌یە ئەوەندە درێژە بە شتی جوزئی بدات.

ئەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ قُلْ لِأَزْوَاجِكَ وَبَنَاتِكَ وَنِسَاءِ الْمُؤْمِنِينَ يُدْنِينَ عَلَيْهِنَّ مِنْ جَلَابِيبِهِنَّ ذَلِكَ أَدْنَى أَنْ يُعْرَفْنَ فَلَا يُؤْذَيْنَ﴾ (الأحزاب: من الآية٥٩) واتە: ئەی نێرراوی خوا بڵێ بە ژنەکانت و کچەکانت و ژنانی باوەڕداران کە سەرپۆش و ڕوپۆشەکانیان بدەن بە سەریاناو خۆیان داپۆشن، چونکە ئەوە نزیك ترە بۆ ناسینەوەیان بە پاکی هەتا توشی ئەزیەت و ئازار نەبن.

وە ڕووکردنی فەرمان لە خێزانەکانی پێغەمبەرو کچەکانیو ئافرەتی باوەڕداران بەڵگەیە بۆ ئەوەی کە هەموو ئافرەتێك داوای لێ کراوە کە ئەو فەرمانە بەجێ بهێنێ، بێ ئەوەی هیچ ژنێکی لێ دەربکرێ، هەرچەندە پاك بێت، با لە پاکی‌دا وەك خێزانەکانی پێغەمبەرﷺ و کچەکانی بێت.

وە قورئان بایەخێکی تایبەتی داوە بەو باسەو بە درێژی باسی کردووەو ڕوونی کردۆتەوە، وە باسی کردووە کە کوێی دەربخات و کوێی پێوستە دایپۆشێ. ئەفەرموێ: ﴿وَقُلْ لِلْمُؤْمِنَاتِ يَغْضُضْنَ مِنْ أَبْصَارِهِنَّ وَيَحْفَظْنَ فُرُوجَهُنَّ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَى جُيُوبِهِنَّ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا لِبُعُولَتِهِنَّ﴾ (النور: من الآية٣١).

ئەی پێغەمبەر بە ژنانی باوەڕدار بڵێ کە چاویان داخەن و داوێنی خۆیان بپارێزن, وە جوانی خۆیان بۆ پیاوان دەرنەخەن ئەو شوێنانە نەبێت کە دەرئەکەون (وەك هەردوو دەستو دەمو چاو)، و با بە سەرپۆشەکانیان سەروسنگیان داپۆشن و بۆ مێردەکانیان نەبێت جوانی‌یان دەرنەخەن.

هەتا ئەگەر پیرەژنێکیش بێت کە ئارەزووی نەمابێو کەسیش ئارەزوی لێ نەدا بۆی, خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿وَالْقَوَاعِدُ مِنَ النِّسَاءِ اللَّاتِي لَا يَرْجُونَ نِكَاحاً فَلَيْسَ عَلَيْهِنَّ جُنَاحٌ أَنْ يَضَعْنَ ثِيَابَهُنَّ غَيْرَ مُتَبَرِّجَاتٍ بِزِينَةٍ وَأَنْ يَسْتَعْفِفْنَ خَيْرٌ لَهُنَّ﴾ (النور: من الآية٦٠) لە پێشەوە ڕوون کراوەتەوە.

وه ئیسلام زۆر گرنگی داوه بهو کێشهیه، و ئهو تهمهنهی دیاری کردووه که دهبێت ژن خۆی تێدا داپۆشێ، پێغهمبهر ﷺ فهرمویهتی: (يا أسماء إن المرأة اذا بلغت المحيض لم يصلح لها أن يرى منها إلا هذا وهذا, وأشار الى وجهه وكفيه)[1].

واته: ئهی ئهسما ئافرهت که گهیشته تهمهنی ئهوهی بێ نوێژ ببێت، نابێ هیچ شوێنێکی لێ ببینرێ، ئهوهو ئهوهی نهبێت ئیشارهتی کرد بۆ دهمو چاوىو ههردوو دهستی.

ئافرهت فیتنهیه هیچ شتێك لهو زیان گهیهنهرتر نىیه بۆ پیاو, پێغهمبهر ﷺ فهرمویهتی: (إن المرأة إذا أقبلت أقبلت ومعها شيطان، وإذا أدبرت أدبرت ومعها شيطان)[2]. واته: ئافرهت که بهرهو ڕووهات شهیتانی لهگهڵدایه, وهئهگهر پشتی ههڵکرد شهیتانی لهگهڵدایه.

وه خۆڕووتکردنهوهی ژنو دهرخستنی ئهو شوێنانهی که دهبنه هۆی ئاشوب و فیتنه تایبهتمهندترین شتێ که ههیهتی لىێ دائهڕنێ که حهیاو شهرهفىیهتی، وه له ئاستی مرۆڤایهتی ئهیهێنێته خوارهوه. وههیچ شتێك پاکی ناکاتهوه لهو خراپهیهی که پێوهی لکاوه ئاگری دۆزهخ نهبێت.

پێغهمبهر ﷺ فهرمویهتی: (صنفان من أهل النار لم أرهما: رجال بأيديهم سياط كأذناب البقر, ونساء كاسيات عاريات، مائلات مميلات، لا يدخلن الجنة ولايجدن ريحها، وإن ريحها لَيَشُمُّ من مسافة كذا وكذا)[3]. واته: دوجۆر لهئههلی دوزهخی ههن که من هێشتا نهم بینیون: کۆمهڵی پیاوی قامچی به دهست که قامچییهکانیان وهك کلکی مانگا وایه، وه ژنانێك که بهناو پۆشتهن بهڵام ڕوتنو به لهنجهو لار ئهڕۆن بهڕێوه و کارێك ئهکهن ئافرهتانی تریش وهها بکهن، ئهمانه ناچنه بهههشتهوهو بۆنیشی ناکهن، ههرچهنده بۆنهکهی له دوری ئهوهندهو ئهوهنده بۆن ئهکرێ.

وه لهسهردهمی پێغهمبهردا ﷺ پێغهمبهر ﷺ خۆی ههندێ ڕواڵهتی تهبهروجی ئهبینی، جا سهرنجی ئافرهتانی ڕائهکێشا که ئهوه دهرچونه له فهرمانی خوا، وه ئهیگێڕانهوه بۆ سهر شهقامی ڕاست، و سهرپهرشتیارهکان و مێردهکانی ئافرهتانی به لێپرسراو دائهنا لهو لادانه، بۆیه ئهیترساندن له سزاو تۆڵهی خوا.

---

(١) أبوداود (٤١٠٤).

(٢) أحمد (١٤٠٣) وأبوداود (٢١٥١) والترمذي (١١٥٨) وأحمد (٣/٣٣٠) والنسائي في (عشرة النساء (٢٣٥).

(٣) مسلم (٢١٢٨).

١- له موسای کوڕی یەسارەوە خوا لێی ڕازی بێت فەرمویەتی: ژنێك بەلای ئەبی هورەیرەدا تێ پەڕی بۆنی ئەو ناوەی داگرت، ئەویش پێی فەرموو: نیازی کوێت هەیە ئەی دروست کراوی خوای خاوەن جەبرو دەسەلاّت؟ ئافرەتەکەش ووتی: بۆ مزگەوت. فەرموی: بۆ مزگەوت ئەچیت و بۆنیشت لە خۆت داوە؟ ئافرەتەکە ووتی: بەڵێ. فەرموی: دە بگەڕێرەوە خۆت بشۆ، چونکە من بیستوومە لە پێغەمبەر ﷺ ئەیفەرموو: (لا يقبل الله صلاةً من امرأةٍ خرجت إلى المسجد وريحها تعصف حتى ترجع فتغتسل)[1].

واتە: خوا نوێژی ئەو ژنە وەرناگرێ کە بچێ بۆ مزگەوت و بۆنی بلاّوبێتەوە هەتا نەگەڕێتەوەو خۆی نەشوات، ئیبنوخوزەیمە لەصەحیحەکەیدا ڕیوایەتی کردووە، وە (حافظ) ووتویەتی: ئیسنادەکەی (متصل) ە ڕاوی‌یەکانیشی سیقەن.

هەروەها ئەبوداودو ئیبنوماجە لە ڕێگای عاصیمی کوڕی (عبیداللە) ی عەمری‌یەوە. وە بۆیە فەرمانی شتنی پێ کراوە بۆ ئەوەی بۆنەکەی لێ ببێتەوە.

٢- وە هەروەها لە ئەبی هورەیرەوە خوا لێی ڕازی بێت کە فەرمویەتی: پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (أيما امرأة أصابت بخوراً فلا تشهدن العشاء) رواه أبوداود والنسائي[2].

واتە:هەر ژنێك بخوری لە خۆ دابێت نەیەت بۆ نوێژی عیشا. واتە نوێژی کۆتایی.

٣- وە لە عائیشەوە گێڕراوەتەوە خوا لێی ڕازی بێت کە فەرمویەتی: پێغەمبەر ﷺ جارێك دانیشتبوو لە مزگەوت, ژنێك لە هۆزی موزەینە خۆی کرد بەژووردا شانازی ئەکرد بە جلو بەرگەکەیەوە کە ئەڕۆیشت, پێغەمبەر ﷺ فەرموی: (يا أيها الناس، انهوا نساءكم عن لبس الزينة، والتبختر في المسجد, فإن بني إسرائيل لم يلعنوا حتى لبس نساؤهم الزينة وتبختروا في المسجد) رواه ابن ماجه[3].

واتە: ئەی خەلکینە مەهێلن ژنەکانتان خۆ بڕازێنینەوەو بە فیزەوە بێنە مزگەوتەوە، چونکە بەنی ئیسرائیل نەفرینیان لێ نەئەکرا هەتا ژنەکانیان خۆیان نەڕازاندەوەو بە فیزەوە نەچوونە مزگەوتەوە.

---

(١) أبوداود (٤١٧٤) وابن ماجه (٤٠٠٢) وابن خزيمه (١٦٨٢).

(٢) مسلم (٤٤٤) وأبوداود (٤١٧٥) والنسائي (١٥٤/٨).

(٣) ابن ماجه (٤٠٠١).

وە عومەر خوا لێی ڕازی بێت، لەو فیتنە بە لێشاوە ئەترسا، و پێش ئەوەی ڕوو بدات چارەی بۆ ئەدۆزییەوە، لەسەر بنەمای: (الوقاية خير من العلاج) خۆپاراستن لە چارەسەرکردن چاکترە، ئەگێڕنەوە شەوێکیان ئەسوڕایەوە لەناو مەدینەدا گوێی لێ بوو، ژنێك ئەیووت:

هل من سبيل إلى خمر فأشربها

أم هل من سبيل إلى نصر بن حجاج

ئایا ڕێگایەك هەیە بۆ ئارەق کە بیخۆمەوە، یا ڕێگایەك هەیە بم گەیەنێت بەنەصری کوڕی حەجاج.

عومەر فەرموی: لەسەردەمی (عمر)دا نا. کاتێ ڕۆژ بۆوە نەصری کوڕی حەجاجی بانگ کرد سەیری کرد جوانترین کەسە، فەرمانیدا سەریان تاشی، هەر جوانتر بوو، ئیتر دووری خستەوە بۆ شام.

**هۆی ئەم لادانە:**

بەڕاستی نەفامیو لاسایی کردنەوەی کوێرانە بۆتە هۆی ئەم لادانە لە ڕێی ڕاست، وە ئیمپریالیزم هاتووەو فوی تێ کردووە هەتا گەیاندویەتییە ئەو پەڕی مەبەستی خۆی، هەتا وەهای لێ هاتووە کە مسوڵمان بەلایەوە ئاساییە ئافرەتی موسڵمان ببینێ خۆی ڕوت کردووەو ئەو شوێنانەی کە پیاو توشی فیتنە ئەکات دەرخستووەو بەڕازاوەیی ئەچێتە دەر، سەرو ملو گەردنو پشتو قۆڵو قاچی لێ دەرخستووە. وە کورت کردنەوەی قژی سەری هیچ بە کەموکوڕی نازانێ، بەڵکو بە پێویستی دائەنێت ڕەنگو بۆیەو بۆن بەکاربهێنێو جوانترین جلی سەرنج ڕاکێش لەبەر بکات، وە وای لێ هاتووە کاتی تایبەت هەیە بۆ پیشاندانی مۆدیلەکانی جل و بەرگ کە لەوێدا هەمو جۆرە پۆشاکێکی سەرنج ڕاکێشەر نیشان ئەدرێ.

وە ئەبینیت ژن بە شانازییەوە بە دیاردەکانی پێشکەوتنی دائەنێت کە بچێتە ئەو شوێنانەی کە خراپەی تێدا ئەکرێ، وەك شوێنی سوڕدانو شوێنی ڕابواردنو شانۆو سینەماو یاریگاو نادیو چایخانەکان، وە بەوپەڕی نزمی و سوکی گەیشتووە لە سەیرانگەو هەوارگەکاندا و لە شوێنی شادیدا.

وە بووە بە شتێکی ئاسایی کە ئافرەتان پێشبڕکێی جوانیان بۆ ئەکرێ کە بە ڕووتی لەبەردەمی پیاواندا ڕائەوەستن و هەموو شوێنەکانی لەشیان تاقی ئەکەنەوەو سەیریان ئەکەن و هەموو ئەندامێکی لەشیان ئەپێون لەبەرچاوی بینەران و گاڵتەجاڕاندا، وە لە ڕۆژنامەو نامیلکانی بڵاو کردنەوەدا، مەجالی فراوان هەیە بۆ هان دانی ئەم کارە ناشرینانەو فریودانی ژن بۆ ئەوەی بگاتە

ئاستی ئاژەڵی بێنرخ، وە هەروەها بازرگانەکانی پۆشاك دەورێکی ترسناکیان هەیە لەوکارە بێ نرخەدا.

**ئەنجامەکانی ئەم لادانە:**

وە لە ئەنجامی ئەم لادانەدا خراپە زۆر بووە، و زیناکردن بڵاوبۆتەوەو قەوارەی خانەوادەو خێزانی ڕوخاوە, وە ئەرکە ئایینی یەکان پشت گوێ خراون‌و واز هێنراوە لە پەروەردەکردنی منداڵ، و گیرو گرفتی ژنهێنان زۆر بووە, هەتا وای لێهاتووە حەرام زۆر بە ئاسانتر بەدەست دێت لە حەڵاڵ، و بەگشتی ئەو ڕیسوایی یە بووەتە هۆی توانەوەی ڕەوشت‌و ئەریتە جوانەکان، کە خەڵك خویان پێوەگرتووە لەناو هەموو مەزهەب‌و ئایینەکاندا.

وە ئەم لادانە گەیشتۆتە ڕادەیەك کە هەرگیز بەبیری هیچ مسوڵمانێکدا نەئەهات کە وەهای لێ بێت، و بانگەوازکەرانی تواندنەوەو نەهێڵانی ڕەوشت کارێکی وەهایان کردووە کە چەندەها هۆی جوانی و بەکارهێنانی شتی خۆڕازاندنەوەیان زۆر کردووە، و بەرنامەی تایبەتیان بۆ داناوەو پەیمانگەی تایبەتیان کردۆتەوە بۆ خوێندن‌و فێربوونی ئەو هۆیانە.

ڕۆژنامەی (الأهرام) لە ژێر ناونیشانی (لەگەڵ ئافرەتدا) ئەم بڵاوکراوەی خوارەوەی بڵاو کردۆتەوە:

(یەکەم پەیمانگە بۆ چاکردنی قژی ئافرەتان لە (إسکندریة) وە پسپۆڕێکی ئەڵمانی لە دووای یەك مانگی تر لەو پەیمانگەیەدا دەرس ئەڵێتەوە).

بۆ یەکەم جار ڕابیطەی پەیمانگەی چاك کردنی قژی ئافرەتان لە (إسکندریە) پەیمانگەیەك دەکاتەوە، پەیمانگەکەش بە پارەدانی ئەندامەکانی ئەو ڕابیطەیە دروست کراوە، یەکێکیان سیشوارێکی داوە، یەکێکی تریان هەندێك ئوتوی داوە، وە هەندێکیان فڵچەو دەرزی تایبەت بە سەری داوە، بەم شێوەیە پەیمکانگەکە دروست بوو دووای ئەوەی کە ڕابیطە خانویەکی بچوکی بۆ بە کرێ گرت، بۆ ئەوەی لە داهاتودا ببێتە ناوکێکی گەورە.

وە ڕابیطەکە فەرمانێکی دەرکرد بۆ هەموو ئەندامەکانی (کە خاوەنی پیشەگ‌ەن) بۆ ئەوەی لەو پەیمانگەیە حازر بن بۆ وتار دان (محاضرة) هەڵسن بەچەند تاقی کردنەوەو چەند وانەیەکی عەمەلی لەبەر چاوی قوتابی یەکانی پەیمانگاکەدا.

پەیمانگەکە دوێنی بەیانی لە مەڵبەندی ڕابیطە لە کیلوباترا کرایەوە بە ووتاری یەکێك لە ئەندامەکانی لەبارەی چۆنی یەتی سەر چاکردنەوە. وە هەروەها باس کردنی هەندێك ڕێگا لەبارەی پیشەی سەر چاك کردنەوە، وە بۆخۆی جۆرێك سەرچاك کردنی پیشان دا کە دروست کراوی خۆی

بوو و ناوی نا (الشعلة) کە یەکێك لە خاوەن پیشەکان کارەکەی ئەکرد و ئەمیش لەسەری ئەدواو شی ئەکردەوە.

لەو پەیمانگەیەشدا پیشەی چاك کردنی قژو ڕەنگ کردن و بڕینو چاك کردنی نینۆك و ئارایشت کردن و شێلان، دەووترێتەوە. وە سەرۆکی ڕابیطە کە میوان بوو لە (إسکندرية) ئەڵێت:

کە ئەو وتنەی ئەم پەیمانگەیەی لە قاهیرەش لە پێش پێنج مانگدا دامەزراندووە، وە لەگەڵ کەمی ماوەکەشیدا پەیمانگەکە پێشکەوتنێکی سەربەرزانەی بەدەست هێناوە، چونکە قوتابی‌یەکان کوڕو کچیان سوود وەردەگرن لە ڕاگۆڕینەوەی نێوان ئەندامانی کۆمەڵەکە و پیشاندانی چەند قژ چاك کردن لەبەردەمیاناو شی‌کردنەوەی، کە ئەمەش ئەبێتە هۆی بەرز کردنەوەی ئاستی پیشەکە.

هەروەك کەڵکیان وەرگرتووە لە هاتنی هەندێ پسپۆڕی ئەڵمانی و لە (محاضرە)زانستی و فیکری‌یەکانیان لەبەردەم قوتابی‌یەکاندا، وە پسپۆڕێکی ئەڵمانی لە مانگی داهاتوودا دێت بۆ (إسکندرية) وە هەر لەو مانگەشدا ڕابیطەکە پێش برکێ‌یەك ساز ئەدات بۆ بە بەدەست هێنانی خەڵاتی کۆماری لە هونەری قژ چاك کردندا، وە دەرس خوێندنەکەش لە پەیمانگەکەدا لەسەرەتاوە هەفتانە ئەبێت. ئەوەی کە لە (الأهرام) دا بڵاو کرابۆوە تەواو بوو.

ئەمە بێجگە لەو پارە زۆرەیەی کە سەرف ئەکرێت لە کڕینی کەرەسەکانی خۆ جوان کردندا، چونکە هەر تەنها لە قاهرەدا ژمارەی سالۆنی سەرچاکردنی ئافرەتان گەیشتۆتە هەزار سالۆن بۆ ڕێك خستن و جوان کردنی قژ؛ وە لە ساڵدا چەندین ملیون قەڵەمی ڕوج و عەترو بۆدرە دابەش ئەکرێت.

ئەم فەسادەش تەنها لەسەر یەك لایەن کۆ نەبۆتەوە بێجگە لە لایەنێکی تر، بەڵکو پەرەی سەندووە بۆ شوێنی زانستی و پەیمانگە پەروەردەیی‌یەکان و دانشگاکان، چونکە دەبوایە ئەم شوێنانە لەو نزمی‌یە بپارێزرایە تاوەکو قەوارەو ڕێزی خۆی هەر بمایە.

لە ڕۆژنامەی (أخبار اليوم) ی بەرواری (٢٩/٩/١٩٦٢)دا ئەم بڵاو کراوەیە نوسراوە: کچی زانکۆ جیاوازی ناخات لە نێوان سنووری زانکۆو پێشانگای جلوبەرگدا:

لەم ڕۆژانەدا لە هەموو ساڵێکدا، کاتێك زانکۆ کردنەوەی دەرگاکانی ڕائەگەیەنێت، ڕۆژنامەو گۆڤارەکان دەست ئەکەن بە نوسین لەبارەی کچی زانکۆو مشت و مڕ دەست پێ ئەکرێ لەبارەی جلوبەرگ و ئارایشت کردنی‌یەوە. هەندێك داوا ئەکەن کە جلوبەرگەکانی یەك بن، وە هەندێکی تر داوا ئەکەن کە ڕێی لێ بگیرێت ئارایشت بکات، نوسەرەکەش ئەڵێت: من هیچ یەك لەم ڕایانە پارسەنگ نادەمەوە، لەبەر ئەوەی کە باوەڕم وایە هەڵبژاردنی کچ بۆ جلوبەرگەکانی گەشە بە

شەخصی‌یەتی ئەدات، وە یارمەتی ئەدات بۆ پێك هێنانی سەلیقەو زەوقی، وە بەشی زۆری ئەو کچانەی کە لە زانکۆکانی دەرەوەن یەك جلوبەرگ لەبەر ناکەن، وە ڕێیان لێ ناگیرێ ئارایشت بکەن، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا من زۆر سەرزەنشتی خاوەنی ئەم ڕایە پڕۆ بڵاوانە ناکەم. . . چونکە کچە زانکۆیی‌یەکانی خۆمان پاڵیان پێوە دەنێن بۆ ئەو کارە، لەبەر ئەوەی نازانێ چۆن جل و بەرگ و ئارایشتی گونجاو بۆ خۆی هەڵبژێرێ وەك قوتابی‌یەك، وە هیچ هەوڵێش نادات بۆ ئەوە، بەڕاستی ئەوی زۆر جیاوازی ناکات لەنێوان سنوری زانکۆو لەنێوان پێشانگای کەلوپەل و کەرنەڤاڵەکاندا ئەو لە بەیانیاندا کاتێك کە ئەچێت بۆ زانکۆ کراسێکی ئەوەندە تەسك لەبەر ئەکات کە خەریکە ڕێی ڕێ ڕۆیشتنی لێ ئەگرێت، لەگەڵ ئەو پێڵاوە باژنە بەرزەی کە لەپێی کردووە.. وە کاتێك ئەیگۆڕێت کراسێکی پان و پۆڕ لەبەر ئەکات کە ڕێگا لە ڕۆیشتنی هاوەڵەکانیشی ئەگرێ، بەسەر ئەوەشەوە ئەگەر کتێبەکانی و بەرگی (محاضرە)کانی لەبیر بچێت هەرگیز هەڵقەو مستیلەو بازنەو ملیوانکەی لەبیر ناچێت کە گوێچکەی و سنگی و مەچەکی و سەری پێ بڕازێنێتەوە بە نارێکی و بەبێ هیچ زەوقێك.

لەدووای ئەوە نوسەرەکە بەردەوام ئەبێت لە نوسیینداو ئەڵێت: بە ڕای من ئەمانە هەمووی بە هۆی ئەوەیە کە کچی زانکۆ لەلای ئێمە خوێندنی زانکۆ بە جەختی و بە جیددی ناگرێ.. چونکە ئەو جوانی‌و شیك پۆشی لەسەر خوێندنەوە دائەنێ. . . وە دەبوایە کە پێچەوانەی ئەو کارە ڕاست و دروست بوایە، لەکاتێکدا کە سەقافەتی ئافرەت بە بەرزترین ڕێزو پلە گەیشتووە، ئەم قسەی منیش مانای ئەوەی نی‌یە کە من داوا لە ئافرەت بکەم واز لە خۆ جوان کردن و جلوبەرگی بهێنێ، من داوا ئەکەم کە لە پێشەوە خۆی بە دەرسەکەیەوە خەریك بکات، پاشان ئارایشتی دەم و چاوی کەم بکاتەوە، ئەگەر لەبەر چاودێری کردنی سنوری زانکۆکەشی نەبێت، لانی کەم با لەبەر چاودێری کردنی پێستی خۆی بێت کە ئەو هەموو مکیاج کردنە خراپی ئەکات، لە تەمەنێکدا کە ناسکی و گەشی دەم و چاوی زۆر لە مکیاجی دەست کرد جوانترە. لە دووای ئەوەش من داوای لێ ئەکەم کە سنورێك دابنێ بۆ خشڵ بەکارهێنانەکەی، وە ئەو جلوبەرگە سادەیە لەبەر بکات کە گونجاوە بە کچی زانکۆوە، وە جۆرە کراسێك لەبەر بکات کە سادە بێت و داوێنەکەی تاوەکو خوارەوە درێژ بوبێتەوە، و کەمێك پان و پۆڕ بێت کە ڕێ لە ڕێ ڕۆیشتنی نەگرێت، هەروەها کراس و بلوزو وێنەی ئەمانە لەبەر بکات . . هەروەها ئەو ڕەنگە مات و ئارامانە هەڵبژێرێت کە ووتی ووتی ناوروژێنێت لەنێوان هاوەڵەکانیدا.

من داوا لە کچی زانکۆ ئەکەم کە شوێن ئەم خاڵانە بکەوێ... وە داوا لە سەرپەرشتەکانیان ئەکەم کە بە تەواوەتی سەرپەرشتی جلوبەرگەکانیان بکەن، چونکە کچ لەم سەردەمە تازەیدا تەنها

ئامانجی ئەوە نی‌یە کە سەرنجی خەڵك بۆ سەر خۆی ڕابکێشێت بە تەتکەو مەتکە، ئەو لەم ڕۆژەدا پێویستە سەقل و ساف بکرێت بە سەقافەت و زانست و زەوقی سەلیم. چونکە ئێستا وانەماوە کە ئەوپەڕی هیوای ئەوە بێت کە ببێتە سکرتێرێك لە نوسینگەیەکدا بۆ ئەوەی وەڵامی تەلەفونەکانی لێپرسراوەکەی بداتەوە، بەڵکو ئێستا ڕێگا لەبەردەمیدا کراوەتەوە بۆ ئەوەی کە لەسەر نوسینگەی وەزارەت دابنیشێ...)

ئەمە ئەوە بوو کە ئافرەتێکی نوسەر لە هەواڵەکاندا ووتویەتی، کە گلەیی لە هاوڕەگەزی خۆی ئەکات، وە شین لەسەر ئەو هەڵسوکەوتە سەر سوڕهێنەرەیان ئەکات.

وە ئەم حاڵەتە سەرنجی ئەو ئافرەتە بیانیانەشی ڕاکێشاوە کە ئەهاتنە میسر، چونکە ئافرەتی ڕۆژئاوا ئەو لادان و لێژ بوونەوەی کە ئافرەتی ڕۆژهەڵاتی تیێ کەوتووە بەو شێوەیە بە بیریدا نەدەهات.

لە ڕۆژنامەی (الأهرام) بەرواری (٢٧ی مارسی ١٩٦٢)دا بەشێکی تێدا هاتووە لەبارەی ئافرەتەوە بەم ناونیشانە: (ئافرەتی ڕۆژئاوایی ڕازی نی‌یە بەو چاو لێکردنەی کە ئافرەتی ڕۆژهەڵاتی چاوی لیێ کردووە).

لەژێر ئەم ناونیشانەدا هاتووە: بایەخدانی ئافرەتی عەرەبی بە مۆدی غەربی و پەرۆش بوون بۆ چاولێکردنی ئافرەتی غەربی لە هەڵسوکەوت و خوڕەوشتیدا کە ئافرەتە گەشتکەرە ڕۆژئاوایی‌یەکان کە دێن بۆ سەردانی قاهیرە پەسەندی ناکەن، وە ناوبانگیشی بەوە بەرز نابێتەوە لە دەرەوە وەك بیر ئەکاتەوە، ئەم ڕایەش ڕۆژنامەگەرێکی ئینگلیزی باسی کردووە کە لەم دووایی‌یەدا سەردانی میسری کردووە، وە باسێکی نوسیوە لە گۆڤارەکەیداو تێیدا ئەڵێت:

من زۆر تووشی صدمە بووم هەرکە هاتمە ناو خاکی فڕۆکەخانەکەوە، چونکە من پێم وابوو کە ئافرەتی ڕۆژهەلاتی ئەبینم بەتەواوی مانا، وە مەبەستیشم ئەو ئافرەتە نی‌یە کە حیجابی لەبەردایە، بەڵکو مەبەستم ئەو ئافرەتە ڕۆژهەڵاتی‌یە پێشکەوتووەیە کە ئەو جل‌وبەرگانە لەبەر ئەکات کە لەگەڵ تەبیعەت و سروشتی ڕۆژهەڵاتدا دێتەوە، وە بە شێوەیەکی ڕۆژهەڵاتی هەڵسوکەوت ئەکات، بەڵام من هیچ کام لەمانەم نەبینی، چونکە ئافرەتی ئەوێ هەر ئەو ئافرەتەیە کە لێرە ئەیبینی کە بێتە هەر فڕۆکە خانەیەکی ئەوروپی‌یەوە، چونکە جل‌وبەرگەکان خودی ئەو جل‌وبەرگانەی ئێرەیە، وە شێوەی قژ چاك کردنەکەیان هەر ئەوەی ئێرەیە، وە میکیاج کردنەکەیان هەر ئەوەیە، تەنانەت شێوەی قسە کردن و ڕێ ڕۆیشتنەکەشیان هەر ئەوەیە، وە لە هەندێك کاتدا زبانەکەشیان، یان فەرەنسی‌یە یان ئینگلیزی‌یە، وە من لەوەدا تووشی صدمە بووم لە ئافرەتی عەرەبی‌یەوە کە پیێ

وایە پێش کەوتن و شارستانیەت لە چاو لێکردنی ئافرەتی ڕۆژ ئاواییدا ئەبێت، وە ئەوەی لەبیر چۆتەوە کە ئەتوانێ هەر چۆنێك پێی خۆش بێت پێش بکەوێت، لەگەڵ ئەوەشدا خوڕوشتە ڕۆژئاوایی‌یە جوانەکەشی بهێڵێتەوە.

وە لە ڕۆژنامەی (الجمهوریە)دا ڕۆژی شەمە (٩ی یونیو ١٩٦٢) لەژێر ناونیشانی: (ئافرەتێکی نوسەری ئەمریکی ئەڵێت: ڕێگا بگرن لە تێکەڵی ئافرەتان لەگەڵ پیاواندا، وە بۆ ئازادی ئافرەت سنور دابنێن. ڕۆژنامەکە لەژێر ئەم ناونیشانەدا قسەیەکی بە نرخی صەریحی هێناوە، جا لە پێشانا نوسەرە ئەمریکی‌یەکە بە خوێنەرانی ئەناسێنێت ئەڵێت: ڕۆژنامەگەری ئەمریکی (هیلسیان ستانسیری) لە دووای ئەوەی کە چەند هەفتەیەك مایەوە، قاهیرەی بەجێ هێشت، وە لە ناوەندی ئەو چەند هەفتەیەدا سەردانی قوتابخانەکان و زانکۆکان و سەربازەگەی گەنجان و ڕێکخراوە کۆمەڵایەتی‌یەکان و مەڵبەندەکانی کرد، وە هەروەها سەردانی ئافرەت و منداڵانی چەند گەڕەکێکی جۆراوجۆری کرد، ئەم کارەشی لە سەفەرێکی توێژینەوەدا بوو بۆ گەڕان بە شوێنی کەموکوڕی و گیرو گرفتی گەنجەکان و خێزانەکانی کۆمەڵگەی عەرەبیدا.

وە ئەم (هیلسیان)ە ڕۆژنامەگەرێکی گەڕۆکە، کە لەگەڵ زیاتر لە (٢٥٠) ڕۆژنامەی ئەمریکیدا پەیوەندی و هەواڵنێری هەیە، وە مەقالەیەکی ڕۆژانەی هەیە، کە چەندین ملیۆن ئەیخوێننەوە، وە باسی گیرو گرفتی ئەو گەنجانە ئەکات کە لە خوار بیست ساڵەوەن، و لە ڕادیۆ و تەلەفزیۆنیشدا کاری کردووە، و لە ڕۆژنامەنوسیشدا زیاتر لە بیست ساڵە کار ئەکات، و سەردانی هەموو وڵاتانی جیهانی کردووە، ئێستاش تەمەنی لە پەنجاو پێنجەمین ساڵیدایە.

ڕۆژنامەگەرە ئەمریکی‌یەکە لە دووای ئەوەی مانگێکی بەسەر بردووە لە کۆماری عەرەبی میسردا، پاش ناساندنی لە لایەن گۆڤارەکەوە ووتویەتی:

(بەڕاستی کۆمەڵگەی عەرەبی تەواو و ساغە، وە لایەق و بەجێ‌یە بۆ ئەم کۆمەڵگەیە کە دەست بەو ڕێی و ڕەوشتەوی خۆیەوە بگرێت کە کچ و کوڕ موقەیەد ئەکات لە سنورێکی مەعقولدا. وە ئەم کۆمەڵگەیە جیاوازی هەیە لەگەڵ کۆمەڵگەی ئەوروپی و ئەمریکی دا، چونکە ڕێ و ڕەوشتی ئێوە بە میرات گیراوە و جەختیش لەسەر ئەوە ئەکات کە ئافرەت موقەیەد بێت، وە جەختیش لەسەر ئەوە ئەکات کە ڕێز لە دایك و باوك بگیرێت، زیاتر لەوەش جەخت لەسەر ئەوە ئەکات کە ئەو ئیباحی‌یەت و بەرەڵایی‌یە غەربی‌یە قەدەغە بکات کە ئەمڕۆ مەترسی و هەڕەشەی هەیە بۆ کۆمەڵگەو خێزان لە ئەوروپا و ئەمریکادا. جا لەبەر ئەوە ئەو پەیوەند و قەیدانەی کە کۆمەڵگەی عەرەبی لەسەر کچی بچکۆلە داینەوە -مەبەستیشم ئەو کچانەیە کە لە خوار بیست ساڵەوەن- ئەو

پەیوەندو قەیدانە بەسوودو چاکن، هەر لەبەر ئەوە ئامۆژگاریتان ئەکەم کە دەست بە داب و نەریت و ڕەوشتتانەوە بگرن، وە تێکەڵبونی پیاوان بە ئافرەتانەوە قەدەغە بکەن، و ئازادی کچ موقەییەد بکەن، بەڵکو بگەڕێنەوە بۆ سەردەمی حیجاب، چونکە ئەمە باشترە بۆ ئێوە لە ئیباحی و بەرەڵایی، هەروەها لە بێ ئابڕویی ئەوروپی و ئەمریکی باشترە. تێکەڵ بوون قەدەغە بکەن لەسەر ئەو ئافرەتانەی کە تەمەنیان لە خوار بیست ساڵەوەیە، چونکە زۆر بەدەست ئەم قەیرانەوە ناڵاندومانە.

بەڕاستی کۆمەڵگەی ئەمریکی بووە بە کۆمەڵگەیەکی ئاڵۆزو پڕ لە هەموو شێوەکانی بەرەڵایی‌و بێ‌ئابڕویی. وە قوربانی‌یەکانی تێکەڵ بوون و بەرەڵایی و ئازادی کە لە خوار بیست ساڵەوەن زیندانەکان و سەر شەقامەکان و بارەکان و ماڵە نهێنی‌یەکانی پڕ کردووە. وە ئەو ئازادی‌یەی کە ئێمە داومانە بە کچ وکوڕە کەم تەمەنەکانمان کردونی بە عەصابەی ڕوداوەکان و عەصابەکانی (جیمس دین) و و عەصابەکانی موخەددەرات، و عەصابەی بەردەکان..

تێکەڵ بوون و بەرەڵایی و ئازادی لە کۆمەڵگەی ئەوروپی و ئەمریکیدا مەترسی و هەڕەشەی هەیە بۆ خێزانەکان، و قیەم و ئەخلاقی هێناوەتە لەرزە، چونکە کچی کەم تەمەن کە لە خوار بیست ساڵەوەیە لەم کۆمەڵگەیە تازەدا تێکەڵی گەنجەکان ئەکات وە سەما ئەکات و ئارەق ئەخواتەوەو جگەرە ئەکێشێ، و موخەددەرات بەکار ئەهێنێ بەناوی شارستانی‌یەت و پێشکەوتن و ئیباحی‌یەت.

وە سەیریش لە ئەوروپاو ئەمریکادا ئەوەیە کە ئافرەتی مندالکار و کەمتر لە بیست ساڵ یاری ئەکات و ڕائەبوێرێ و هەڵسو کەوت ئەکات لەگەڵ هەرکەسێکدا کە پێی خۆش بێت و لەبەر چاوی خێزانەکەی و کەس‌وکارەکەیدا، تەنانەت بەربەرەکانی دایك و باوکی و مامۆستاکانی و سەرپەرشتەکانی ئەکات. بەناوی ئازادی‌و تێکەڵاوی‌یەوە بەربەرەکانیان ئەکات، لە ماوەی چەند دەقیقەیەکدا شو ئەکات و لەدووای چەند سەعاتێك تەڵاق ئەدرێتەوە!! ئەم کارەش تەنها لە ئیمزایەك زیاتری تێ ناچێ، هەروەها لە چەند قرشێك و زاوایەکی یەك شەوە یان چەند شەوەی تێ ناچێ، لەدووای ئەوەش تەڵاق ئەدرێ، وە لەوانەشە شوبکاتەوەو ئینجا جارێکی تریش تەڵاق بدرێتەوە.

**چارەسەر کردنی ئەم حاڵەتە دەگمەنە (شاذ)ە**

ڕاکردن نی‌یە لە دانانی پلانێکی پتەو بۆ ڕزگاربوون لەم تەنگو چەڵەمەیە, ئەویش بە ئەنجامدانی ئەم شتانەی خوارەوە:

١- بڵاو کردنەوەی (وعی) بیرو هۆشی ئاینی و چاوکردنەوەی خەڵك لەترسناکی کەوتنە بەر ئەو شەپۆلە بەهێزە.

٢- داواکردنی دانانی یاسایەك بۆ پاراستنی ڕەوشت و سزادانی ئەو کەسانەی لێی دەرئەچن بەتوندی.

٣- قەدەغەکردنی بڵاوکردنەوەی وێنەی ڕووت لەناو گۆڤارو ڕۆژنامەکاندا, وە دانانی ڕەقابە لەسەر ئەوانەی کە داهێنەری شێوەکانی جل و بەرگن.

٤- قەدەغەکردنی پێش برکێی (رقص) سوڕدانی بێ ئەخلاقی، وە سوك کردنی هەموو ئەو شتانەی پەیوەندییان بەوەوە هەیە.

٥- هەڵبژاردنی جل‌وبەرگێکی گونجاو کە لە جل‌وبەرگی ڕاهیبەکان بچێت، وە زۆر کردن لەهەموو ئەو کەسانەی کە کاری ڕەسمی بەڕێوە ئەبەن بە پۆشینی.

٦- هەموو کەس لەخۆیەوە دەست پێ بکات لەپاشاندا بانگەوازی خەڵك بکات.

٧- بەچاك ناوبردنی ڕوشت بەرزیو ئابرو و خۆ پاراستن و خۆ داپۆشین.

٨- کاربکرێت بۆ دۆزینەوەی سەرگەرمی و خۆخەریك کردن لە کاتەکانی بێ ئیشیدا، هەتا مەجال نەمێنێ بۆ ئەو شتە پڕو پوچانە لەناو کۆمەڵدا.

٩- کات بەبەشێك لەو چارەسەرکردنە دابنرێ، چونکە ئەو کارە پێویستی بەکاتێکی زۆر هەیە.

ڕەدکردنەوەی شوبهەیەك:

هەندێ کەس حەز ئەکەن کە لەگەڵ ئەو کاروانەدا بڕۆن, بە بیانوی ئەوەی کە ئەمە پێشکەوتن و سەردەمی شارستانیەتی تازە پێویستی کردووە.

ئێمەش ڕێ لەوە ناگرین کە پێش کەوتن بەرێی خۆیەوە بڕواتو بگاتە ئەو پەڕی, بەڵام ترسی ئەوەمان هەیە کە ئەو پێشکەوتنە لەسەر حسابی ئاینو ڕەوشت و داب و نەریت لێکبدرێتەوە، چونکە ئاین و ئەوانەی لەگەڵیایەتی لە ئامۆژگاری ئەدەبی و ئەخلاقی، لەوەحی خواوەیە، و داینراوە بۆ هەموو سەردەمێك و هەموو کاتو شوێنێك... جا ئەگەر پێشکەوتن ڕەوا بێت لە کاروباری دونیاییو لەژیانا ئیتر خۆ ڕەوا نیە لە ئایینی خوادا.

چونکە ئاین خۆی ئاسۆکانی بوونەوەری کردۆتەوە بۆ عەقڵی مرۆڤایەتی، تاوەك و سەرنج بدات و ورد بێتەوە، وە سوود وەربگرێت لەو هێزو بەرەکەتانە کە تێیدایەتی، وە ژیانی پێش بخات هەتا ئەگاتە ئەوپەڕی پێش کەوتن و شارستانیەت.. بەپێی تواناو دەسەڵاتی, کەواتە لێرەدا

جیاوازی‌یەکی گەورە هەیە لەنێوان ئەو شتانەی کە گۆڕان و پێشکەوتنیان تێدا ئەکرێ و ئەوانەی تێیاندا ناکرێ.. وە ئایین یاری نی‌یە ملکەچی ویست و ئارەزووەکان بێت‌و شەهوەت‌و ئارەزووەکان ڕێی نیشان بدەن.

**خۆ جوانکردنی پیاو بۆ ژنەکەی:**

وا پەسەندە کە پیاویش خۆی جوان بکات بۆ ژنەکەی, ئیبنوعەبباس (خوا لێی ڕازی بێت) فەرمویەتی: من خۆم جوان ئەکەم بۆ ژنەکەم وەك چۆن ئەو خۆی جوان ئەکات بۆ من، وە حەز ناکەم هەموو مافەکانی خۆمی لێوەربگرم.. چونکە ئەو کارە هەموو مافەکانی ئەویش لەسەر من پێویست ئەکات، خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿وَلَهُنَّ مِثْلُ الَّذِي عَلَيْهِنَّ بِالْمَعْرُوفِ﴾ (البقرة: من الآية٢٢٨). واتە: وە ژنان مافیان هەیە بەسەر مێردەکانیانەوە، وەك چۆن پیاوان مافیان هەیە بەسەر ئەوانەوە بە باشی.

(قرطبي) لەبارەی قسەکەی ئیبنوعەبباسەوە ووتویەتی: زانایان ووتویانە: ((خۆ جوانکردنی پیاو بەپێی جیاوازی حاڵیانە, چونکە پیاوان لەسەر لێهاتن‌و لێوەشاوەیی و ڕێك کەوتن ئەو کارە ئەکەن، چونکە خۆڕازاندنەوە لە هەندێ کاتدا بەجێ‌یە وە لە هەندێ کاتدا بەجێ نی‌یە، وە هەندێ شێوەی جوانکردن لەلاو ئەوەشێتەوە, وە هەندێکی تر لە پیرو بەساڵاچوو, کە لە لاو ناوەشێتەوە.

ووتویەتی: وە هەروەهایە بە نیسبەت پۆشاکیش, ئیتر ئەمانە هەمووی بۆ بەجێهێنانی مافەکانە، وە ئەو چی شیاوو ڕێکە لەگەڵ خۆیدا ئەوە ئەکات، بۆ ئەوەی لای ژنەکەی بەشێوەیەك بێت، دڵی پێی خۆش بێت، و دوری بخاتەوە لە پیاوانی تر.

ووتویەتی: »بەڵام بۆن‌و بەرامەو سیواك‌و دەم‌و دان شتن‌و چڵك لە خۆ کردنەوەو قژکورتکردنەوەو خۆ شتن‌و نینۆك کردن ئەمانە هەمووی ئاشکران کە بۆ هەموو کەسن.

وە خەنە بۆ پیرو بەساڵاچووە، بەڵام ئەنگوستیلە بۆ لاوو پیر جوانە، کە ئەویش خشڵی پیاوە«. لەپاشاندا ئەبێ بزانێ کەی پێویستی بە پیاو هەیە بچێتە لای، بۆ ئەوەی داوێن پاك بێت، وە پێویستی بە سەیر کردنی خەڵك نەبێت، جا ئەگەر پیاو هەستی کرد کە توانای بەجێهێنانی مافی ژنەکەی نی‌یە لە چوونە لا ، ئەبێ داوو دەرمان بەکاربهێنێ بۆ زیادکردنی توانای جنسی لەوبارەیەوە بۆ ئەوەی ئەو ژنە لە خراپە دوور بخاتەوە.

**حەدیسەکەی ئوم زەرع**

لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێت فەرمویەتی:

یانزه ژن به یەکەوە دانیشتن و پەیمانیان بەست بەیەکەوە کە ڕاست گۆبن وە هیچ باسێکی مێردەکانیان لە یەکتر نەشارنەوە:

یەکەمیان ووتی: مێردەکەم گۆشتی ووشترێکی لەڕو لاوازە بەسەر کێوێکەوەیە (واتە نالەبارو توندو تیژەو بە ئاسانی دەست پێی ناگات وەکو کێو وایە) نە پێی هەلگەرانی ئاسانە تاوەکو خەلکی بۆی بچن هەرچەند لاوازیشە، وە ئەو گۆشتەی ئەوەندە قەلەوە تا خەلك دان بە خۆیاندا بگرن و هەلگەڕێن بە کێوەکەدا بۆ بەدەست هێنانی (واتە مێردەکەی زۆر بەدخوو چروکەو خەلك لێی دەست بەردار بوون).

دووەمیان ووتی: من قسەو باسی مێردەکەم کە هیچ خێری تێدا نییە ئاشکرای ناکەم. وە من ئەترسم کە هیچ نەهێلمەوە لە باسەکەی، جا لەبەر زۆری و درێژی باسەکە تەنها ئاماژە ئەکەم بۆ جومگەکانی (واتە عەیبەکانی) لە ترسی ئەوەی باسەکە زۆر درێژە بکێشێ.

سێیەمیان ووتی: مێردەکەم بەدخوو بەدڕەفتارە: ئەگەر باسی عەیبەکانی بکەم و پێی بگاتەوە تەلاق ئەدرێم، وە ئەگەر باسیشی نەکەم هەر بە هەلواسراوی وبێ مێرد ئەمێنمەوە.

چوارەمیان ووتی: مێردەکەم لەبەر ئارامی و خۆش ڕەفتاری و نەرمی لەگەلێ مندا هەروەك شەوەکانی تیهامە وایە، نە گەرمن و نە ساردن، وە نە مەترسی و نە بێزارییان لێ ئەبیندرێ.

پێنجەمیشیان ووتی: مێردەکەم کە دێتەوە مالەوە لەبەر ئارامی و شەرم و حەیاو خەوی زۆری هەروەکو فەهد وایە (جۆرێك پلنگە)، وە ئەگەر بشچێتە دەرەوە هەروەك شێر وایە لە ئازایی و هێرش بردنی بەرەو دوشمن. وە لەبەر لێبوردەیی پرسیار لەو مالەی ناکات کە لەناو چووە.

شەشەمیان ووتی: مێردەکەم ئەگەر خواردن بخوات ئەیپێچێتەوە، وە ئەگەر بخواتەوە هەلی ئەلوشێ و تێیدا ناهێلێتەوە، وە ئەگەر بخەوێ پێخەفەکە بە تەنیا لە‌خۆی ئەپێچێتەوەو پشت هەلێ ئەکات. وە دەستیش درێژ ناکات تاوەکو بزانێ کە لە چ خەفەتێکدام، یاخود کە خەوت دەستی درێژ ناکات بۆ جونەلای و وەك بێ‌توانا وایە.

حەوتەم ووتی: مێردەکەی من هیچ‌وپوچە، یان توانای جونەلای نییەو مندالی لێ نابێ، وە بێ عەقلێ و نەزانە، هەمو دەردێك کە لەناو خەلکدا بلاو بوبێتەوە لەوا کۆ بۆتەوە، زۆر لە ئافرەتان ئەدا، یان سەر ئەشکێنێ، یان لاشە برینداد ئەکات، یان هەردوکیان ئەکات.

هەشتەم ووتی: مێردەکەم کە دەستی بۆ ئەبەی نەرمە وەکو کەروێشك، وە بۆنیشی خۆشە وەکو زەرنەب (جۆرێك گیای بۆن خۆشە).

نۆهەم ووتی: مێردەکەم لەبەر ڕێزو شەرافەتی، ماڵەکەی بڵندە، ئازایە لە شمشێر هەڵگرتندا، و زۆر ناندەرە، ماڵەکەشی لە ناوەڕاستی خەڵکدایە و ئاسان دەست پێی ئەگات.

دەهەم ووتی: مێردەکەی من خاوەن ماڵە بەڵام چ خاوەن ماڵێك؟ چاکتر لە خاوەن ماڵیش، ووشترێکی زۆری هەیە کە لەبەر زۆری مۆڵگەکانیشیان زۆرە، وە لەبەر سەربڕین بۆ میوان کەم دەرئەکرێت بۆناو لەوەڕگەو هەمیشە ئامادەی سەربڕینن، ئەگەر گوێیان لە دەنگی عودەکە ئەبێت یەکسەر ئەزانن سەرئەبڕدرێن و لەناو ئەچن.

یانزەهەمیان ووتی: مێردەکەم ئەبو زەرعە، بەڵام چ ئەبو زەرعێك؟! گوێچکەمی قورس کردووە بە ئاڵتون و خشڵ، وە مەچەك و لاشەمی قەڵەوو گۆشتن کردووە بە نازو نیعمەت، وە خۆشحاڵی کردم و منیش خۆشحاڵ بووم، یان ڕێزی لێ گرتم، منیش گەورە بووم، لە ناو خاوەن بەرخۆڵەکاندا بە سەختی بەدەستی هێنام، و بردمی‌یە نێوان خاوەن ئەسپ و ووشترو کەژاوەو دانەوێڵەی پاك کراو لەسەر خەرمان و خاوەن بێژنگ، جا لەلای ئەو ئەوەندەم ناز هەیە کە قسە بکەم بە قسەم ئەکات و نەنگ لە قسەکەم ناگرێ، و لە سەرەتای ڕۆژدا ئەخەوم و کەس هەڵم ناستێنێ، واتە کەسێکیش هەیە کە لەبری من کاروباری ماڵ بەجێ بهێنێ. وە خواردنەوەی جۆراوجۆر ئەخۆمەوەو تێر ئەبم لێی.

دایکی ئەبو زەرعیش چ دایکێکە؟! بوخچەی جلوبەرگەکەی قورسە، ماڵەکەشی فراوانە. (واتە کەل و پەل و شتومەکی ناوماڵی زۆرە، ژنێکیش بەو شێوە بێ بە زۆری کوڕەکەشی گەنج و لاو ئەبێت).

کوڕی ئەبو زەرعیش چ کوڕێکە؟! خەوەکەی بە ئەندازەی هەڵکێشانی شمشێرێکە، وە ئەو پێویستی بە خواردنی دایکی نی‌یە، ئەگەر نان بخوات دەستی کاژیلەیەکی چوار مانگەی بەسەو پێی تێر ئەبێت.

کچەکەی ئەبو زەرعیش چ کچێکە؟! گوێڕایەڵی دایك و باوکی‌یەتی، ولا شەشی پڕ بە کراسەکەیەتی، (واتە شەخسیەتی تەواوە) وە قینی هاوسێکەی هەڵئەستێنێ لەبەر ئەو ناز پەروەری‌یەی کە تێیدایە.

کەنیزەکەی ئەبو زەرعیش چ کەنزیزەیەکە؟! هیچ نهێنی‌یەکی ئێمە بڵاو ناکاتەوە، وە ناپاکی ناکات لە ماڵەکەماندا و خواردن باش دروست ئەکات، وە زۆر گرنگی ئەدات بە ماڵ پاك کردنەوەو ڕێك خستنی.

ئینجا دەڵێ: ئەبو زەرع لە کاتێکدا هاتە دەر کە هێشتا زوو بوو ڕۆن لە قاپە ماستەکان ئەگیرا، جا گەیشت بە ژنێك کە دوو کوڕەکەی وەکو فەهد وابوون، لە دوو تەنیشتی‌یەوە یاریان بە

مەمکەکانی ئەکرد، جا منی تەڵاق داو ئەوی مارە کرد، منیش لە دووای ئەو شوم کرد بە پیاوێکی گەورەو بەرێز، کە سواری ئەسپێکی چاك و تازاو گەورە ببو، نێزەیەکیشی بە دەستەوە بوو، جا چوو بۆ غەزاو هێرش کردن و خێرێکی زۆری بۆ هێنامەوە بۆ ناو مۆڵگەکە، وە لە هەموو تاژەڵێکیشدا کە سەر ببڕدرێ جوتێکی دامێ، ووتی: ئومو زەرع بخۆو سیلەی کەسوکارەکەشت بکەو خواردن بۆ ئەوانیش بەرە. ئینجا ووتی: ئەگەر هەموو ئەو شتانەی کە پێی دابووم کۆ بکرایەتەوە نەئەگەیشت بە بچوکترین قابلەمەی ماڵی ئەبو زەرع کە بە بەردەوامی چێشتی تیا لێ ئەندرا.

عائیشە فەرمووی: پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: من بۆ عائیشە وەکو ئەبو زەرع وابووم بۆ ئومو زەرع. هەردو شەیخ و نەسائی گێڕاویانەتەوە[1].

ووتاردان لە پێش مارەکردندا

پەسەندە مارەبڕ لەکاتی مارەبڕیندا ووتارێك بدات، کەمترین ووتاریش ئەوەیە بڵێت (الحمد لله والصلاة والسلام على رسول الله).

١- لە ئەبی هورەیرەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (كل خطبة ليس فيها تشهد فهي كاليد الجذماء)[2] رواه أبوداود والترمذي وقال: حديث حسن غريب.

واتە: هەر ووتارێك شایەتومانی تێدا نەبێت وەك دەستی گەڕ وایە, ڕیوایەتێکی حەسەن و غەریبە.

٢- وە هەر لە ئەبی هورەیرەوە (خوا لێی ڕازی بێت) کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (كل أمر ذي بال لايبدأ فيه بالحمد لله، فهو أقطع)[3] رواه أبوداود و ابن ماجة.

واتە: هەر کارێکی گرنگ کە پێویستی بەوە بێت خاوەنەکەی گرنگی پێ بدات، بە (الحمد لله) دەست پێ نەکات، بەرەکەت بڕاو ئەبێت.

لێرەدا مەبەست (الحمد) نیە بە تایبەتی، بەڵکو مەبەستی یاد کردنی خوای گەورەیە، بۆ ئەوەی ئەم ڕیوایەتە لەگەڵ ڕیوایەتەکانی تردا ڕێك بکەوێ. بەڵام چاکتر وەهایە (خطبة الحاجة) بخوێنێ: لە

---

(١) البخاري (٥١٨٩) ومسلم (٢٤٤٨) والنسائي في عشرة النساء (٢٥٣) والترمذي في الشمائل (٢٤١).

(٢) أبوداود (٤٨٤١) والترمذي (١١٠٦).

(٣) أبوداود (٤٨٤١) والنسائي في عمل اليوم والليلة (٤٩٦) وابن ماجه (١٨٩٤).

عبدالله ی کوڕی مەسعودەوە کە فەرمویەتی: پێغەمبەر ﷺ کۆ کەرەوەی هەموو خێرێك و کۆتاییانی لە قسەدا دراوەتێ, یان فەرموی دەست پێکەری قسە، فێری ووتاری‌نوێژی کردین وە فێری ووتاری (حاجة) پێویستی کردین، ووتاری نوێژ: (التحيات لله والصلوات والطيبات. السلام عليك أيها النبي ورحمة الله وبركاته. السلام علينا وعلى عباد الله الصالحين. أشهد أن لا إله إلا الله وأشهد أن محمداً عبده ورسوله)

وە ووتاری پێویستی (خطبة الحاجة) ئەوەیە: (إن الحمد لله؛ نحمده ونستعينه ونستغفره، ونعوذ بالله من شرور أنفسنا ومن سيئات أعمالنا. من يهد الله فلا مضل له، ومن يضلل فلا هادي له، وأشهد أن لا إله إلا الله وحده لاشريك له وأشهد أن محمداً عبده ورسوله..)

واتە: سوپاس‌و ستایش هەربۆ خوایە, ئێمەش سوپاس‌و ستایشی ئەکەین‌و داوای یارمەتی و لێبوردنی لیَ‌ئەکەین، وە پەنا ئەگرین بە خوا لەشەری خۆمان‌و کارە خراپەکانمان, هەر کەس خوا ڕێنمایی کردبێت گومڕاکەری نابێت, وە هەر کەس خوا گومڕای کردبێت ڕێنمایی کەری نابێت، وە شایەتی ئەدەم هیچ پەرستراوێکی بە حەق نی‌یە کە شایستەی پەرستن بێت جگە لە خوای تاك‌و تەنها کە هاوبەشی نی‌یە، وە شایەتی ئەدەم کە محمد ﷺ بەندەو نێردراوی ئەوە. لەپاشاندا ووتارەکەی ئەبەستێ بە سێ ئایەتی قورئان:-

١- ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِ وَلا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنْتُمْ مُسْلِمُونَ﴾(آل عمران:١٠٢) واتە: ئەی ئەو کەسانەی کە باوەڕتان هێناوە لە خوا بترسن بەشێوەیەك شایستەی ترسی ئەو بێت، وە بەردەوام بن لەسەر دەست گرتنتان بە ئیسلامەکەتانەوە تا کۆتایی ژیانتان؛ تاوەکو بگەن بە خواو ئێوە هەر لەسەر ئیسلام بن.

٢- ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُمْ مِنْ نَفْسٍ وَاحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالاً كَثِيراً وَنِسَاءً وَاتَّقُوا اللَّهَ الَّذِي تَسَاءَلُونَ بِهِ وَالْأَرْحَامَ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيباً﴾ (النساء:١).

واتە: ئەی خەڵکینە، لە پەروەردگاری خۆتان بترسن و فەرمانەکانی بەجێ بهێنن، وە دووری بکەن لە قەدەغە کراوەکانی، ئەو پەروەردگارەی دروستی کردوون لە گیانێك و جوتەکەشی لەخۆی بۆ دروست کردووە, وە هەر لەوان پیاوان و ژنانێکی زۆری لە سەرانسەری زەویدا بڵاوکردۆتەوە, وە بترسن لەو خوایەی کە بەو داوای شت لەیەکتر ئەکەن، وە نەکەن سیلەی ڕەحم بپچڕێنن، بەڕاستی خوا هەمیشە ڕەقیبە بەسەرتانەوە.

٣- ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ وَقُولُوا قَوْلاً سَدِيداً , يُصْلِحْ لَكُمْ أَعْمَالَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَمَنْ يُطِعِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَقَدْ فَازَ فَوْزاً عَظِيماً﴾ (الأحزاب:٧٠-٧١). واتە: ئەی ئەو کەسانەی

باوەڕتان هێناوە لەخوا بترسن کە نافەرمانی بکەن و بەوە شیاوی سزا بن، وە لەهەموو کارو بارێکتانا قسەی ڕاست و ڕێك بکەن. ئەگەر لەخوا ترسان و قسەی ڕاستتان کرد، خواش کردەوەکانتان بۆ چاك ئەکات و لە گوناهەکانتان خۆش ئەبێت، وە هەر کەس ملکەچی خواو پێغەمبەرەکەی بێت، ئەوە بەڕاستی شکۆیەکی گەورەی بەدەست هێناوە. خاوەن سوننەکان گێڕاویانەتەوە. ئەمەش زاراوەی ئیبنوماجەیە[1].

وە ئەگەر ئەم ووتارەش نەڵێت هەر دروستە. پیاوێکی بەنی سولەیم ووتویەتی: داوای ئەو ئافرەتەم کرد لە پێغەمبەر (ﷺ) کە خۆی پێشکەشی پێغەمبەر کرد کە بیهێنێ، ئەویش فەرمووی (ﷺ): (زوجتکها بما معك من القرآن) ولم يخطب[2]. واتە: ئەوا لێم مارە بڕیت لەسەر ئەو قورئانەی لەبەرتە کە فێری بکەیت. وە ووتاریشی نەخوێند.

**حیکمەتی ئەو ووتارە:**

لە (حجة الله البالغة)دا ووتویەتی: خەڵکی سەردەمی نەفامی، پێش مارە بڕین ووتاریان ئەدا بەوەی کە بەشانو شکۆی هۆزەکەیاندا هەڵیان ئەدا، ئەوەیان ئەکردە هۆیەك بۆ باسکردنی ئەو شتەی مەبەستیان بوو, وە ئەم عادەتەیان کە بەم شێوەیە بوو لە بەرژەوەندیان بوو، چونکە ووتار بنچینەکەی لەسەر ئاشکرا کردن و دەست پێ کردنی شتە لەبەر چاوو گوێی جەماوەردا، بۆ ئەوەی کارەکە دەنگ بداتەوە.

وە ئەو ئاشکرا کردنە کە مەبەستیان بوو لەکاتی ژنهێناندا هەبێت بۆ ئەوە بو کە لەداوێن پیسەکان جیابکرێنەوە. وە هەروەها ووتاریش بۆ شتی گرنگ نەبێت بەکار نایەت... وە گرنگی دان بە نیکاحو دانانی بەکارێکی گەورە لە نێوانیاندا لە گەورەترینی مەبەستەکان بوو, بۆیە پێغەمبەر (ﷺ) بنەماکەی هێشتەوە بەڵام شێوەکەی گۆڕی، وە بەوە بەرژەوەندی‌یەکی تری خستە سەر ئەو بەرژەوەندی‌یانە ئەویش ئەوەیە: کە ئەبێ لەهەموو موناسەبەتێکدا زیکرێکی گونجاوی بۆ بوترێ، وە هەموو کارێك بە دروشمەکانی خوا ڕابگەیەندرێ، بۆ ئەوەی تاییبنی حەق ئاڵاکەی بشەکێتەوە، وە دروشمەکانی و نیشانەکانی ئاشکرا بن، لەبەر ئەوە چەند یادێکی تێدا کردووە بەسوننەت لەوانە (الحمد والإستعانة والإستغفار والتعوذ والتوکل والتشهد وآيات من القرآن) واتە: سوپاسو ستایشی خواو داوای یارمەتی لێ‌کردنو لێ‌خۆش بوونو پەناپێ بردنو تەوەکولو شایەتومانو چەند ئایەتێکی قورئان. وە ئیشارەتی بۆ ئەو بەرژەوەندی‌یە کردووە بەوەی کە فەرمویەتی: (وکل

---

(١) أبوداود (١٠٩٨) والترمذي (١١٠٥) وابن ماجه (١٨٩٢) وأحمد (١/٣٩٢).

(٢) البخاري (٥٠٣٠) و (٥١٤٩) ومسلم (١٤٢٥/٧٦و٧٧).

خطبة ليس فيها تشهد فهي كاليد الجذماء)[1]. وەهەروەها ئەوەی کە فەرمویەتی (کل کلام لایبدأ فيه بحمد الله فهو أجذم)[2].

واتە: هەر وتەیەك بە (الحمد لله) دەستی پێ نەکرد ئەوە گولە.

وە فەرمویەتی : (فصل ما بين الحلال والحرام الصوت والدف في النكاح)[3] واتە: جیاکەرەوەی نێوان حەرامو حەلاڵ لە ژنهێناندا، دەنگ و دەف لێدانە- واتە گۆرانی و دەف لێدان.

## پاڕانەوەی پێش مارەبڕین

پەسەندە دوعا بکرێ بۆ ژن و مێرد بەم دوعایانە کە لەپێغەمبەرەوە (صلی الله علیه وسلم) گێڕراوەتەوە:

١-لە ئەبی هورەیرەوە هاتووە: کە پێغەمبەر ﷺ ئەگەر کەسێك ژنی بهێنایە پێی ئەفەرموو:

(بارك الله لك وبارك عليك وجمع بينكما في خير)[4]. واتە: خوا لێتی پیرۆز بکاتو بۆتی پیرۆز بکات وە لەسەر خێر کۆتان بکاتەوە.

٢- لە عائیشەوە کە فەرمویەتی: پێغەمبەر ﷺ کە منی هێنا، دایکم هات بردمی بە مالی پێغەمبەرەوە، کۆمەڵێ ژنی ئەنصاری لێ بوو پێیان ووتم: لەسەر خێرو بەرەکەتوبەختی باش، بوخاری و ئەبو داود گێڕاویانەتەوە[5].

٣- وە لە حەسەنەوە کە فەرمویەتی: عەقیلی کوڕی ئەبی طالیب خوا لێی ڕازی بێت، ژنێکی بەنی جەشمی هێنا، ووتیان: بە هەرزانیو منداڵی زۆر. فەرمووی: وەك ئەوە بڵێن کە پێغەمبەر ﷺ ئەیفەرموو: (بارك الله فيكم وبارك عيلكم)[6]. رواه النسائي واتە: خوا لێتانی پیرۆزکات وە لەسەرتانی پیرۆز بکات.

---

(١) تەخریجی ئەم حەدیسە ڕابورد.

(٢) تەخریجی ئەم حەدیسە ڕابورد.

(٣) أحمد (٣/٤١٨) والترمذي (١٠٨٨) والنسائي (٦/١٢٧) وابن ماجه (١٨٩٦).

(٤) أحمد (٢/٣٨١) وأبوداود (٢١٣٠) والترمذي (١٠٩١) وابن ماجه (١٩٠٥).

(٥) البخاري (٣٨٩٤) ومسلم (١٤٢٢/٦٩) وأبوداود (٤٩٣٣).

(٦) أحمد (١/٢٠١) والنسائي (٦/١٢٨) وابن ماجه (١٩٠٦).

**ئاشکراکردنی ژن هێنان:**

وا چاکە بەپێی یاسای ئیسلام کە ژنهێنان ئاشکرا بکرێت, بۆ ئەوەی لە نیکاحی نهێنی قەدەغە کراو جیا بکرێتەوە، وە لەبەر دەرخستنی خۆشی بەوەی کە خوا حەڵاڵی کردوە لە شتە باشەکان. وە بەڕاستیش ئەوە کارێکە شایستەی ئاشکرا کردنە، بۆ ئەوەی گەورەو بچوك و نزیك و دوور پێی بزانێ، وە بۆ ئەوەی ببێ بە بانگەوازێك هاندەر بێت بۆ ئەوکەسانەی بێ ژنی بەسەر ژن هێناندا هەڵئەبژێرن, تا واز لەوییە بهێنن، و بازاڕی ژن هێنان گەرم ببێت.

وە ئاشکراکردنیشی بەو شێوەیە ئەبێت کە باوە لەناو کۆمەڵدا، وە هەر کۆمەڵە بەشێوەی خۆی بەمەرجێ ئەو شتانەی تێدا نەکرێ کە یاسادانەری ئیسلام قەدەغەی کردون وەك عارەق خواردن و تێکەڵ بوونی ژن و پیاوو ئەو جۆرە شتانە.

١- لە عائیشەوە (خوا لێی ڕازی بێت) کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (أعلنوا هذا النكاح وأجعلوه في المساجد واضربوا عليه الدفوف)[1]. رواه أحمد، والترمذي، وحسنه.

واتە: ژن هێنان ئاشکرا بکەن, لەمزگەوتدا بیکەن وە دەفیشی بۆ لێبدەن.

بێ گومان ئاشکراکردنی لە مزگەوتدا گەورەترین هۆیە بۆ بڵاوکردنەوەو ئاشکرا کردنی، چونکە مزگەوت شوێنی هەموو موسڵمانانە، بە تایبەتی لەسەردەمەکانی یەکەمدا کە مزگەوت جێی شوێنە گشتی یەکانی گرتبووەوە.

٢- ترمذي گێڕاویەتەوەو پلەی (حسن)ی بۆ داناوە, وە حاکم پلەی (صەحیحی)ی بۆ داناوە لە یەحیای کوڕی سولەیمەوە کە فەرمویەتی: بە محمدی کوڕی حاطبم ووت: دوو ژنم هێناوە لە هیچیاندا دەف لێ نەدراوە, ئەویش فەرموی: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (فصل ما بين الحلال والحرام الصوت بالدف)[2]. واتە: جیاکەرەوەی نێوان حەڵاڵ و حەرام دەنگە بەهۆی دەفەوە.

## گۆرانی ووتن لەکاتی ژن هێناندا

وە ئەوەی ئیسلام بەڕەوای داناوەو خۆشەوستی کردووە: گۆرانی ووتنە لەکاتی ژن هێناندا، بۆ ئەوەی دەروون بحەوێتەوەو گورجوگۆڵ ببێت بەڕابواردنێکی پاك, وە پێویستە ئەو گۆرانی یە دوور بێت لە بێ شەرمی و ڕیسوایی و نەرم و شلی و قسەی زشت و بێ هودە.

---

(١) أحمد (٤/٥) ترمذي (١٠٨٩).

(٢) تەخریجی ئەم حەدیسە ڕابورد.

١- له عامیری کوڕی سەعدەوە (خوا لیّی ڕازی بێت) که فەرمویەتی: چوومە ماڵی (قرظـه)ی کوڕی کەعب و ئەبی مەسعودی ئەنصاری لەشاییەکدا, سەیرم کرد چەند کەنیزەکێك گۆرانییان ئەوت. ووتم: ئێوە هەردوکتان یاری پێغەمبەرن ﷺ و له ئەهلی بەدرن لای ئێوەش ئەمە ئەکرێ!! هەردووکیان وتیان: ئەگەر ئارەزووت لێیە لەگەڵماندا گوێ بگرە, ئەگینا برۆ، پێغەمبەر ﷺ ڕێی پێداوین لەکاتی شاییدا ئەوە بکەین[1]. نەسائی و حاکم گێڕاویانەتەوەو حاکمیش پلەی صەحیحی بۆ داناوە.

٢- وە عائیشە خوای لیّ ڕازی بێت فارعەی کچی ئەسعەدی کردە بووك و لەگەڵیا ڕۆیشت بۆ ماڵی زاوا ـ که ئەبیطی کوڕی جابیری ئەنصاری بوو ـ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: عائیشە بەزم و ڕەزمی تێدا نەبوو؟ چونکە ئەنصارییەکان حەز لەبەزم‌وڕەزم ئەکەن[2]. بوخاری و ئەحمەدو کەسانی تر گێڕاویانەتەوە.

وە لەهەندێ ڕیوایەتی ئەم حەدیسەدا پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:

(فهل بعثتم معها جارية تضرب بالدف وتغني؟ قالت عائشة: تقول ماذا يارسول الله؟ قال: تقول

| | |
|---|---|
| أتيناكم أتيناكم | فحيونا نُحَيِّكُمْ |
| ولولا الذهب الأحمر | ما حلت بواديكم |
| ولولا الحنطة السمراء | ما سنت عذاريكم[3] |

واتە: ئایا جارییەیەکتان لەگەڵدا نارد, دەفی بۆ لیّ بدات و گۆرانی بڵێت, عائیشە ووتی: ئەی نێردراوی خوا چی بڵێت؟ فەرمووی: بڵێت.

ئێمە هاتین بۆلاتان، هاتین بۆلاتان، سڵاومان لیّ بکەن سڵاوتان لیّ ئەکەین، ئەگەر ئاڵتونی سوور نەبوایە نەئەهاتە ناو دۆڵەکەتانەوە، وە ئەگەر گەنمی ڕەش نەبوایە، کچەکانتان قەڵەو نەئەبون.

وە له ڕوبەییعی کچی موعەووزەوە کە فەرمویەتی: کاتێ گوێزرامەوە پێغەمبەر ﷺ هات و لەسەر جێیەکەم دانیشت، چەند جارییەیەك دەفیان لیّ‌ئەداو باسی باوك و باپیرانی منیان ئەکرد که له بەدر شەهید کرابون[1]، یەکێکیان ئەیووت:

---

(١) النسائي في السنن الكبرى (٥٥٦٥) والحاكم (١٠٢/١).

(٢) أحمد (٢٦٩/٦) والبخاري (٥١٦٢).

(٣) نيل الأوطار (٢٩٢/٤).

وَفينا نبيٌّ يعلم ما في غدٍ.

وە لە ناوماندا پێغەمبەرێك هەیە، ئەزانێ سبەینێ چی ڕوو ئەدات.

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: واز لەو قسەیە بهێنەو ئەوانەی پێشوو بڵێ. بوخاری و ئەبوداود و (ترمذي) گێڕاویانەتەوە[2].

## چەند ئامۆژگاریەك بۆ بووك

**پەسەندی ئامۆژگاری کردنی بووك:**

ئەنەس فەرمویەتی: هاوەڵەکانی پێغەمبەر ﷺ کاتێ ئافرەتێکیان ئەکرد بە بوك و ئەیان برد بە بوکی، فەرمانیان پێ ئەدا کە خزمەتی مێردەکەی بکاتو ئاگاداری مافەکانی بێت:

**ئامۆژگاری کردنی کچ لەلایەن باوکەوە کاتی گواستنەوە:**

عبداللە ی کوڕی جەعفەری کوڕی ئەبو طالب ئامۆژگاری کچەکەی ئەکردو ئەیفەرموو: (ئاگاداربە دڵت پیس نەبێت لە مێردەکەت؛ چونکە دڵ پیسی کلیلی تەڵاقە).

وە ئاگاداربە زۆر گلەیی مەکە، چونکە گلەیی کردنی زۆر ڕق و کینە دروست ئەکات.

وە چاوت بە کل ڕەش بکە چونکە جوانترین شتی خۆ جوانکردنە.

وە پاکترین و باشترین بۆن خۆشی: ئاوە.

**ئامۆژگاری کردنی ژن لەلایەن مێردەوە:**

ئەبو دەرداء بە ژنەکەی ئەوت: کە منت بینی بە توڕەیی تۆ تووڕە مەبەو ڕازیم بکە.

منیش ئەگەر تۆم بینی بە توڕەیی تووڕە نابم و ڕازیت ئەکەم.

و یەکێك لە پیاوەکان ئامۆژگاری ژنەکەی ئەکات بەم هەڵبستانە:

خذي العفو مني تستديمي مودتي ولا تنطقي في سورتي حين أغضب

ولا تنقريني نقرك الدف مرة فإنك لا تدرين كيف المغيب

ولا تكثري الشكوى فتذهب بالقوى ويأباك قلبي، والقلوب تقلب

---

(١) باسی سیفاتی ئازایەتی و خۆڕاگری و مەردانەیی ئەوانیان ئەکرد، وە ئەو کچە موعەووزی باوکی و دوو مامی کە ناویان عەوف و مەعاز بوو لەجەنگی بەدرا شەهید کرابوون.

(٢) البخاري (٥١٤٧) وأحمد (٦/٣٥٩) وأبوداود (٤٩٢٢) والترمذي (١٠٩٠) وابن ماجه (١٨٩٧).

فإني رأيت الحب في القلب والأذى　　إذا اجتمعا لم يلبث الحب يذهب

واته: چاوپۆشی بکە لێم تاوەکو خۆشەویستی‌یەکەم بۆت بە بەردەوامی بمێنێتەوە. وە لە کاتی تورە بونمدا قسە مەکە. وە ئەوەندە دڵی من مەکوتە هەروەکو دەف بکوتی، چونکە تۆ نازانی حاڵی دڵ چۆنە. وە زۆر سکاڵاو گلەیی مەکە هێزو توانام نەمێنێ و دڵم نەتی هەوێ، چونکە دڵەکان زوو هەڵئەگەڕێنەوە، وە من بینیومە کە خۆشەویستی و ئازاردان کاتێك لە دڵدا کۆبوونەوە ئەوەندەی پێ ناچێ ئەو خۆشەویستی‌یە ئەڕوات.

**ئامۆژگاری کردنی کچ لەلایەن دایکەوە لەکاتی شوکردندا:**

عەمری کوڕی حیجر ـ پاشای کیندە ـ ئومو ئیاسی کچی عەوفی کوڕی موحەللیمی شەیبانی مارە کرد، کاتێك کاتی گواستنەوەی هات، دایکی کە ناوی ئومامەی کچی حارس بوو، بەتەنها چووە لای و ئامۆژگاری‌یەکی کرد، کە بناغەی ژیانی ژن‌ومێردایەتی بەختیاری تێدا ڕوون کردەوە، وە ئەو شتانەی کە پێویستە لەسەری بەرامبەر مێردەکەی و پێی ووت:

کچەکەم: ئەگەر ئامۆژگاری لەبەر گەورەیی ڕەوشت جوانی وازی لێ بهێنرایە من وازم لەوە ئەهێنا بۆ تۆ و ئامۆگاریم نەئەکردی، بەڵام ئامۆژگاری بیرخەرەوەی بێ‌ئاگایانەو یارمەتیدەری ئادەمیزادی ژیرە.

وەئەگەر ئافرەتێك بێ نیاز ببوایە لە مێرد لەبەر دەوڵەمەندی دایك و باوکی و لەبەر زۆری پێویستی هەردوکیان پێی، من لەهەموو کەس زیاتر بێ نیاز ئەبووم لێی، بەڵام ئافرەتان بۆ پیاوان دروست کراون و پیاوانیش بۆ ئەوان دروست کراون.

کچەکەم: تۆ لەو کەش‌و هەوایە دەرچویت کە تێیدا بوویت، وە ئەو لانەیەت بەجێ هێشت کە تێیدا پەروەردە بوویت، ئەچیت بۆ لانەیەك کە شارەزای نیت، وە دەبیتە هاوەڵی کەسێك کە لەگەڵیا ڕانەهاتووی، وە ئەو بەهۆی دەسەڵاتی بەسەر تۆوە بووە بە چاودێرو خاوەن، جاتۆ بۆی ببە بە کەنیزەکێك هەتا ئەویش ببێت بە عەبدی تۆ.

دە خوی بۆ بپارێزە، ئەبێتە زەخیرە بۆت.

(یەکەم و دووەم): بەقەناعەتەوە مل کەچی ببە، وە بە چاکی گوێڕایەڵی فەرمانی ببە.

(سێیەم و چوارەم): سەرپەرشتی شوێنی چاوو لوتی بکە، با هەرگیز چاوی بە شتی ناشیرین نەکەوێ لە تۆوە وە با بۆن نەکات لەتۆوە ئیللا خۆشترین بۆن نەبێت.

(پێنجەم و شەشەم): سەرپەرشتی کاتی نوستن و خواردنی بکە. چونکە برسی‌یەتی زۆر کڵپەیە، وە تێکدانی خەویش هۆی ڕق و کینەیە.

(حەوتەم و هەشتەم): وریایی کردنی ماڵەکەی و چاودێری کردنی خزمەتکارو خێزانی، و کۆڵەکەکەی کاروباری ماڵ جوانی ئەندازە گرتن و بەڕێوە بردنە، وە لە خێزانیشدا جوانی ڕێکخستنە.

(نۆهەم و دەهەم): هەرگیز سەرپێچی فەرمانی مەکە، نهێنییەکانی بڵاومەکەرەوە، چونکە ئەگەر سەرپێچی فەرمانیت کرد، دڵی ڕەش ئەکەیت لە خۆت. وە ئەگەر نهێنییت درکاند، لە غەدری ئەمین نابیت. پاشان ئەکەی دڵ خۆش بیت لەلای ئەو کاتێك ئەو غەمبار ئەبێت، وە غەمبار نەبیت کاتێك ئەو دڵخۆش بێت.

## ئاهەنگ گێڕان و خواردنی شایی (الوليمة)

**پێناسەکەی:**

١- پێناسەی (وليمة) لە (الولم) ەوە وەرگیاوە، واتە کۆکردنەوە، چونکە ژن‌و مێرد کۆ ئەبنەوە، وەلیمە خواردنێکە بۆ شایی دروست دەکرێ. لە قاموسدا هاتووە (الوليمة) یەعنی خواردەمەنی شایی‌و زەماوەند، وەهەموو خواردنێك کە دروست بکرێت بۆ دەعوەت کردن و شتی تر ئەگرێتەوە.

**٢- حوکمەکەی:**

جەماوەری زانایان بۆ ئەوە چوون ئاهەنگ گێڕان بۆ بووك سوونەتێکی جەخت کراوەو مونەککەدە.

١- بەپێی فەرمودەی پێغەمبەر ﷺ کە بە عبدالرحمن ی کوڕی عەوفی فەرمووە: (أَوْلِمْ، ولو بشاةٍ). واتە: خواردنی شایی ئامادە بکە، ئەگەر بە تەنها مەڕێکیش بووە.

٢- لەئەنەسەوە کە فەرمویەتی: پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بۆ هیچ یەك لە ژنەکانی ئەو نانەی نەکرد کە بۆ زەینەبی کرد, بە مەڕێك نانی زەماوەندی کرد. بوخاری‌و موسلیم گێڕاویانەتەوە[1].

٣- وە لە بورەیدەوە کە فەرمویەتی: کاتێ عەلی فاطمەی هێنا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (إنه لابد للعرس من وليمة) رواه أحمد بسند لابأس به كما قال الحافظ[2].

واتە: بەڕاستی ئەبێ بۆ شایی خواردن ئامادە بکرێ.

---

(١) البخاري (٥١٧١) ومسلم (١٤٢٨/٩٠و٩١).

(٢) أحمد (٥/٣٥٩).

٤- ئەنەس فەرمویەتی: پێغەمبەر ﷺ بۆهیچ یەك لە خێزانەکانی ئەو نانەی نەکرد کە بۆ زەینەبی کرد، وە ئەیناردم بەشوێن خەڵکا بانگم ئەکردن، و نان و گۆشتم ئەدانێ هەتا تێر ئەبوون[1].

٥- بوخاری ئەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ نانی شایی هەندێ لە ژنەکانی کردووە بە دوو مود لە جۆ[2].

ئەو جیاوازی‌یەش ناگەڕێتەوە بۆئەوەی کە فەضلی هەندێ لە ژنەکانی دابێت بەسەر هەندێکی تردا، بەڵکو هۆی ئەو جیاوازی‌یە بوونی دەسەڵات و کەم دەستی بووە.

**(٣) کاتەکەی:**

کاتی نان کردن بۆ شایی لەکاتی مارەکردندا ئەبێت, یا لەدواییدا، یا کاتی گواستنەوە، وە یا دوای گواستنەوە، ئەم کارەش بەجێ دێت بەپێی عورف و عادەت، وە لای بوخاری هەیە پێغەمبەر ﷺ دوای گواستنەوەی زەینەب خەڵکەکەی بانگ کرد بۆ نان خواردن[3].

**(٤) وەڵام دانەوەی بانگ کەر بۆ وەلیمە:**

وەڵام دانەوەی بانگ کەر بۆ سەر نانی شایی پێویستە و واجبە لەسەر ئەوکەسەی بانگ ئەکرێ، چونکە لەوەدا گرینگی پێدان و دڵخۆش کردنی بانگکەرەکەی تیا دەرئەکەوێ.

١-لە ئیبنوعومەرەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (إذا دُعي أحدكم الى وليمة فليأتها)[4]. واتە: هەر کەس بانگ کرا بۆ نانی شایی با بچێت.

٢- وە لە ئەبی هورەیرەوە خوا لێی ڕازی بێت پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (ومن ترك الدّعوة فقد عصى الله ورسوله)[5]. واتە: هەرکەس نەچوو بە دەم بانگ کردنەکەوە ئەوە سەرپێچی خواو پێغەمبەرەکەی کردووە.

٣- وە هەر لە ئەبی هورەیرەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (لو دُعيتُ إلى كراعٍ لَأَجَبْتُ، ولو أُهْدي إليَّ ذراع لَقَبِلْتُ). ئەم حەدیسانە بوخاری گێڕاونیەوە[1].

---

(١) سەیری تەخریجەکەی پێشو بکە.

(٢) البخاري (٥١٧٢).

(٣) البخاري (٥٤٦٦).

(٤) البخاري (٥١٧٣و٥١٧٩) ومسلم (١٤٣٢/٩٦-١٠٣).

(٥) البخاري (٥١٧٧) ومسلم (١٤٣٢/١٠٧و١١٠).

واته: ئەگەر بانگ کرام بۆ سەر لولاکی حەیوانێك ئەچم، وه ئەگەر دەستێکم پێ بەخشرا وەری ئەگرم.

بەڵام ئەگەر دەعوەتەکە گشتی بوو تایبەت بە کەسێك یا کۆمەڵێك نەبوو ئەوە چوونی پێویست نابێت، وه چوونەکە پەسەند نی‌یه، وەك ئەوەی کە بانگدەر بڵێ ئەی خەڵکینە وەرن بۆ دەعوەت، بێ ئەوەی کەس دیاری بکات، یا هەر کەست تووش بوو بانگی بکە.

وەك پێغەمبەر ﷺ بەو جۆرەی کرد: ئەنەس فەرمویەتی: (پێغەمبەر ﷺ کاتێ ژنی گواستەوە دایکم (ئومو سولەیم) حەیسی بۆ دروست کرد - کە لە خورما و رۆن و کەشك پێك هاتبوو- کردی‌یه قاپێکەوە ووتی: بیبە بۆ پێغەمبەر ﷺ ئەڵێ: منیش بردم، فەرموی: دایبنێ. لەپاشاندا فەرموی: فلان کەس و فلان کەس بانگ بکەو کێت لەرێگا تووش بوو بانگی بکەرەوە, ئەڵێ منیش ئەوانەی ناوی بردن,و ئەوانەش لە رێگا پێم گەیشتن بانگم کردنەوە. موسلیم گێراویەتەوە[٢].

وه وتراوە: کە وەڵام دانەوەی دەعوەت فەرزی کیفایەتە.

وه ووتراوە پەسەندە.. وه یەکەم رەئی راستترە، چونکە سەرپێچی و نافەرمانی بە وازهێنانی واجب نەبێت ناوترێت. ئەمەی باس کرا بە نیسبەت نان و چێشتی شایی بوو. بەڵام وەڵام دانەوە بۆ دەعوەت جگە لەشایی, پەسەندەو واجب نی‌یه لای جەماوەری زانایان.

هەندێ لە شافیعی‌یەکان رایان وایە کە وەڵام دانەوە بە گشتی واجبە، وه ئیبنوحەزم ئەڵێت: ئەمە قسەی جەماوەری صەحابە و تابیعی‌یەکانە، چونکە فەرموودەکان ئیشارەت ئەکەن بۆ واجب بوونی وەڵام دانەوە بۆ هەموو جۆرە دەعوەتێك، شایی بێت، یا شتی‌تر.

(٥) مەرجەکانی پێویست بوونی وەڵام دانەوەی دەعوەتەکە:

(حافظ) لە (فتح)دا ووتویەتی: مەرجی پێویست بوونی، ئەمانەی خوارەوەیە:

١- بانگدەر ئەبێ موکەللەف و ئازادو پێگەیشتوو بێت.

٢- تەنها تایبەت نەبێت بەدەوڵەمەندەوە بێ لەهەژاران.

٣- ئەبێ لە بانگ کردنەکەیا مەبەستی خۆشیرین کردن دەرنەکەوێ بۆ کەسێك، لەبەر ئەوە مەبەستێکی پێی بێ، یا لێی بترسێ.

---

(١) البخاري (٥٦٨).

(٢) أحمد (١/١٨١) ومسلم (١٤٢٨/٩٤و٩٥) والنسائي (٧/١٣٦).

٤- بانگ کەر ئەبێت موسڵمان بێت لەسەر ڕای ڕاستر.

٥- ئەبێ تایبەت بێ بە ڕۆژی یەکەم لەدەعوەتەکە[١].

٦- پێشبڕکێی تێدا نەبێت کە هەر کەس پێشکەوت ئەبێ ئەو بچێ، نەك ئەوی تریان.

٧- ئەبێ لەو شوێنەدا شتێکی وەها نەکرێ کە پێی نارەحەت بێ، لە خراپەکاری و شتی تر.

٨- ئەو کەسە عوزرو بەهانەیەکی نەبێت.

بەغەوی ووتویەتی: هەرکەس بەهانەی هەبوو, یا ڕێگاکەی دور بێت و توشی ناخوشی بێت ئەوکاتە قەیناکە نەچێت.

(٦) کەراهەتی بانگ کردنی دەوڵەمەند بەبێ هەژار:

کەراهەتی هەیە دەوڵەمەند بەبێ هەژار بانگ بکرێ بۆ دەعوەتەکە.

لە ئەبی هورەیرەوە: کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (شر طعام الوليمة، يُمْنعها من يأتيها، ويُدْعى إليها من يأباها، ومن لم يجب الدعوة فقد عصى الله ورسوله) رواه مسلم[٢].

واتە: خراپترین خواردن خواردنی دەعوەتە کە ئەوەی پێویستی پێی بێت لیێ قەدەغە بکرێ، وئەوەی پێویستی پێی نەبێت ونەیەوێت بانگ بکرێت، وە هەر کەس وەڵامی دەعوەتەکە نەداتەوەو نەچێت کە بانگ کرا، ئەوە سەرپێچی خواو پێغەمبەرەکەی کردووە.

وە بوخاری ئەگێڕێتەوە کە ئەبوهورەیرە فەرمویەتی: خراپ ترین خواردن نانی شایی یەکە دەوڵەمەندی بۆ بانگ بکرێ وواز لە هەژاران بهێنرێ و بانگ نەکرێن[٣].

## زەواجی ئەوانەی کە موسوڵمان نین

قاعیدەی گشتی لەزەواجی ئەوانەدا کە موسوڵمان نین: بڕیاردانە لەسەر ئەوانەی کە لەگەڵ یاسای ئیسلامدا ڕێك ئەکەون کاتێك موسوڵمان ئەبن.

چونکە پێغەمبەر ﷺ خۆی نەئەگەیاندە ئەو نیکاحانەی کە بەکافری کرابوون، کە چۆن کراون، وە ئایا لەگەڵ ئەو مەرجانە ڕێك کەوتون کە ئیسلام داینابوون، هەتا دروست بن، یان ئەگەر لەگەڵ ئەوەدا ڕێك نەکەوتن، بەتاڵ بینەوە؟

---

(١) بۆ جگە لەڕۆژی یەکەم واجب نییە.

(٢) مسلم (١٤٣٢/١٠٧و١١٠).

(٣) بخاري (٥١٧٧).

بەڵکو ئیعتیباری بۆ حاڵەتی نیکاحەکە دائەنا لەکاتی موسوڵمان بوونی پیاوەکەدا، جا ئەگەر لەوکەسانە بووایە کە دروست بێت لەگەڵ ژنەکەیدا بێنێتەوە ئەوە بڕیاری لەسەر ئەدا، با لەسەردەمی نەفامیشدا بووبێت، و لەسەر مەرجی بوونی شایەت و وەلی دانەمەزرابێت.

بەڵام ئەگەر ئەو کەسە لەوانە نەبووایە کە دروست بێت ژن‌ومێردایەتی‌یان بەردەوام بێت، ئەوە بڕیاری لەسەر نەئەدا، وەك ئەوەی کە مسوڵمان بووبێ‌و ژنەکەی مەحرەمی خۆی بێ‌و پێی حەرام بێ، یا دوو خوشکی ژن بوو، یا زیاتر، ئەوەیە ئەو بنچینەیەی کە سوننەتی پێغەمبەر ﷺ کردویەتی بە ئەصل، وە ئەوەی پێچەوانەی ئەو ئەصلە بێت ئاوڕی لێ نادرێتەوە[1].

پیاوێك مسوڵمان بێت و دوو خوشك ژنی بێت، ئەکرێ بە سەرپشك لە هەڵبژاردنی یەکێکیان و واز هێنان لەوەی تریان:

لە ضەححاکی کوڕی فەیروزەوە لەباوکی‌یەوە کە ووتویەتی: کاتێك مسوڵمان بووم، دوو ژنم بوو کە خوشك بوون، پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێکردم یەکێکیان تەڵاق بدەم. ئەحمەدو خاوەن سوننەکان و شافیعی و (دارقطني) و بەیهەقی ڕیوایەتیان کردووە، و (ترمذي) پلەی (حسن)ی بۆ داناوە، و ئیبنو حیببان پلەی (صحیح)ی بۆ داناوە[2].

پیاوێك مسوڵمان بێت و لەچوار ژنی زیاتر هەبێت، ئەبێ چواریان لێ هەڵبژێرێ:

لەئیبنوعومەرەوە فەرمویەتی: غەیلانی ئەقەفی مسوڵمان بوو، لەسەردەمی نەفامی‌یەوە دە ژنی هەبوو، ئەوانیش لەگەڵیا مسوڵمان بوون، پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێ کرد چواریان لێ هەڵبژێرێ. ئەحمەد و (ترمذي) و ئیبنوماجە و شافیعی تەخریجیان کردووە، و ئیبنوحیببان وحاکم پلەی (صحیح)یان بۆ داناوە[3].

موسوڵمان بوونی یەکێ لە ژن و مێرد جگە لەوی تریان:

ئەگەر پەیمانی ژن‌ومێردایەتی بەسترابوو پێش ئیسلام، لەپاشاندا هەردوکیان مسوڵمان بوون ئەوە ئەگەر عەقدەکە لەگەڵ ژنێکدا بەسترابوو کە لە ئیسلامدا دروستە عەقد بکرێ، ئەوە حوکمەکەی ڕوونە وەك لە پێشەوە باس کرا.

---

(١) ئەوە کورتەی ئەوە بوو کە ئیبنوقەییم ووتویەتی.

(٢) أحمد (٤/٢٣٢) وأبوداود (٢٢٤٣) والترمذي (١١٢٩) والشافعي (٢/١٦) والدارقطني (٣/٢٧٣) والبيهقي (٧/١٤٨) وابن حبان (٤١٥٥).

(٣) أحمد (٢/٨٣) والترمذي (١١٢٨) وابن ماجه (١٩٥٣).

بەڵام ئەگەر هەریەکێکیان موسڵمان بوو: ئەگەر مسوڵمان بوونەکە لەلایەنی ژنەکەوە بوو ئەوە پەیمانەکە هەڵدەوەشێتەوەو ژنەکە عیددەی لەسەرە, جا ئەگەر پیاوەکەشی مسوڵمان بوو کە هێشتا ژنەکەی عیددەکەی تەواو نەکردبوو ئەوە مافی خۆیەتی کە بیگەڕێنێتەوە بۆ لای خۆی، بەپێی ئەوەی سابت بووە کە عاتیکەی کچی وەلیدی کوڕی موغەیرە پێش صەفوانی کوڕی ئومەیەی مێردی مسوڵمان بوو بە مانگێک، لەپاشاندا ئەویش مسوڵمان بوو, پێغەمبەر ﷺ بڕیاری لەسەر نیکاحەکەی دا[1].

ئیبنو شەهاب ووتویەتی: پێمان نەگەیشتووە کە ژنێک کۆچی کردبێت بۆلای پێغەمبەر ﷺومێردەکەی کافر بێت و لە وولاتی کافران بێت, ئیللا ئەو کۆچ کردنە جیای کردونەتەوە لە یەکتر، مەگەر ئەوە کە پیاوەکەشی پێش ئەوەی عیددەکەی تەواو بێت کۆچی کردبێت و مسوڵمان بووبێت, وە پێمان نەگەیشتووە کە ژنێک لە مێردەکەی جیا کرابێتەوە, کاتێ مێردەکەی لە عیددەکەیدا هاتبێ بۆ لای و مسوڵمان بووبێت, وە هەر ئەو حوکمەی هەیە کە ئەگەر پیاوەکە مسوڵمان بێت دوای ئەوەی عیددەی ژنەکەی تەواو بووبێت، یا زۆریشی خایاندبێت هەر لەسەر نیکاحی یەکەم جار ئەبن، ئەگەر یەکتریان ویستەوە، بە مەرجێك ژنەکە شووی نەکردبێت.

پێغەمبەر ﷺ کچەکەی دایەوە بەمێردەکەی کە ئەبی عاص بوو لەسەر نیکاحی یەکەم دوای دوو ساڵ، بێ ئەوەی شتی تازەی بۆ بکەن (لەمارەکردن و مارەیی), ئەحمەد و ئەبوداود و ترمذي گێڕاویانەتەوە، وە ترمذي ووتویەتی: فەرموودەیەکی حەسەنەو ئیسنادەکەشی خراپ نییە، وە حاکم بە (صحیح)ی داناوە، وە لە ڕیوایەتی ئیبنوعەبباسە[2].

ئیبنو قەییم ووتویەتی: پێغەمبەر ﷺ هیچ ژن و مێردێکی لەیەك جیانەکردۆتەوە ئەگەر پیاوەکە مسوڵمان بووبێت و ژنەکە لەگەڵیا مسوڵمان نەبووبێت, بەڵکو هەرکاتێ ئەوی تریان مسوڵمان بووبێت نیکاحەکە وەك خۆی ئەمایەوە، مادام ژنەکە شووی نەکردبوو, تا ئەوەیە سوننەتی ئاشکرای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) شافیعی ووتویەتی: ئەبو سوفیانی کوڕی حەرب لە (ظهران) کە دۆڵێکی بەنوو خوزاعە بوو, مسوڵمانی تریش بوو، وە لەناو خوزاعە مسوڵمان هەبوو پێش فەتحی مەککە لە (دار الإسلام)دا، وە ئەبو سوفیان گەڕایەوە بۆ مەککە، هیندی کچی عوتبە هێشتا مسوڵمان نەبوو بوو، ڕیشی گرت و پێی ووت: ئەم پیرە گومڕایە بکوژن, لەپاشاندا هیند دوای موسڵمان بوونی ئەبو سوفیان بەماوەیەکی زۆر، موسڵمان بوو, وە هیند کاتێك کافریش بوو

---

(١) مالك في الموطأ (٢/٥٤٣-٥٤٤).

(٢) أحمد (١/٢١٧) وأبوداود (٢٢٤٠) والترمذي (١١٤٣) وابن ماجه (٢٠٠٩).

له وولاتی ئیسلام نەبوو, ئەبو سوفیانیشی تێدا بوو مسولمان، و هیند هەر کافر، لەپاشاندا دوای ئەوەی عیدەی تەواو بوو موسلمان بوو، وە لەسەر ئەو نیکاحەی پێشوو مانەوە، بەلام ئەوەی هەبوو کە عیددەکەی تەواو نەبووهەتا موسلمان بوو..

وە موسولمان بوونی حەکیمی کوڕی حیزامیش هەر وابوو، هەروەها ژنەکەی صەفوانی کوڕی ئومەیی‌یە موسولمان بوو, وە هەروەها ژنەکەی عیکرەمەی کوڕی ئەبی جەهل لەمەککە، وە وولاتەکەی بوو بە وولاتی ئیسلام، وە حوکمی پێغەمبەر ﷺ سەرکەوت لە مەککەدا، وعیکریمە هەلات بۆ یەمەن کە وولاتی کافر بوو, وە صەفوانیش ویستی بچێ بۆ یەمەن، پاشان صەفوان گەڕایەوە بۆ مەککە کە وولاتی ئیسلام بوو, وە جەنگی حونەینی کرد هەر کافر بوو, لەپاشاندا مسولمان بوو، ژنەکەی لای مایەوە لەسەر نیکاحی یەکەم جار، بەلام هێشتا عیدەکەی تەواو نەبووە وە زانایان لە کتێبی مەغازیدا ئەوەیان لەبەرکردووە کە ژنێکی ئەنصاری لای مێردەکەی بوو لە مەککە پاشان مسولمان بوو وکۆچی کرد بۆ مەدینە، پیاوەکەی هات بۆ مەدینە مسولمان بوو، هێشتا لە عیدەدا بوو، لەسەر ئەو نیکاحە مانەوە- قسەی ئیبنوقەییم تەواو بوو-.

خاوەنی (الروضة النديّة) ووتوویەتی: دووای ئەوەی ئەوقسەیەی نەقلّ کردووە: ئەلێم: مسولمان بوونی ژن لەگەلّ مانەوەی مێرد بەکافری وەك تەلاق نی‌یە, چونکە ئەگەر وا بووایە دووای تەواو بوونی عیددەکەی پیاوەکەی بۆی نەبوو بێت بەلایا, بەڕەزامەندی خۆی نەبوایەو، بە عەقدی تازە, سەرئەنجام ئەگەر ژن مسولمان بوو دووای موسولمان بوونی بێ نوێژ بوو، لەپاشاندا پاك بووەوە، بۆی هەیە شوو بەهەر کەسێکیتر بکات کەبیەوێ، جا ئەگەر شووی کرد مێردی یەکەمی بۆی نی‌یە, داوای بکاتەوە، با مسولمانیش بێت، بەلام ئەگەر شووی نەکردبوو, ئەوا لەژێر سایەی پەیمانی مێردی یەکەجاری ئەمێنێتەوە, ئیتر پێویست ناکات پەیمانی تازە ببەستنەوە و ڕازی بن بەیەك.

بەلکەکان ئاوها پێویست ئەکەن، هەرچەند جیاواز بێ لەگەلّ قسەی خەلّك، هەروەها حوکمی هەلگەڕانەوەی یەکێ لە ژن و مێرد لەدین هەر بەو شێوەیەیە؛ چونکە ئەگەر دووای هەلگەڕانەوەکە گەڕایەوە بۆ ئیسلام حوکمەکەی وەك حوکمی ئیسلام بوونی کەسێکە کە مابێتەوە لەسەر کافری.

# تەڵاق (الطلاق)

(طلاق) لە (إطلاق) وەرگیراوە کە بەمانای ڕەهاکردن و واز لێهێنانە،

وە لە شەرعدا کردنەوەی پەیوەندی ژن و مێرد و کۆتایی هێنانە بە پەیوەندی ژن و مێردایەتی.

کەراهەتی تەڵاقدان:

بەراستی جێگیربوونی ژیانی ژن و مێردایەتی مەبەستێکە لەو مەبەستانەی ئیسلام بۆی بەپەرۆشە,

پەیمانی ژن و مێردایەتیش بۆ بەردەوامیو هەمیشەیی ئەبەستێ هەتا ژیان کۆتایی دێت؛ بۆ ئەوەی بڕەخسێ بۆ ژن و مێرد کەماڵەکە وا لێبکەن ببێتە بێشکەیەك تیا بحەوێنەوە, وە لە سێبەرە فراوانەکەیدا بە خۆشی بژین، تاوەکو بتوانن منداڵەکانیان پەروەردە بکەن بە پەروەردەیەکی چاك,

وە هەر لەبەر ئەوەیە کە پەیوەندی نێوان ژن و مێرد پیرۆزترین و بەهێزترین پەیوەندییە, وە بەڵگە نییە لەسەر ئەو پیرۆزییە بگاتە ئەوەی کە خوای گەورە پەیمانی نێوان ژن و مێردی بە (المیثاق الغلیظ) ناو بردووە, وە فەرموویەتی: ﴿وَأَخَذْنَ مِنْكُمْ مِيثَاقاً غَلِيظاً﴾ (النساء:٢١). واتە: وە لەئێوەیان وەرگرتووە پەیمانێکی ئەستوور کە یان ڕایان گرن بەچاکی، یان ئازادیان بکەن بە جوانی.

جا ئەگەر پەیوەندی نێوان ژن و مێرد بەو شێوەیە پتەو و جەخت کراو بێت؛ ئەوە نابێت تێك بدرێت و بەسووکی سەیر بکرێت.

وە هەرچی شتێك ببێتە هۆ بۆ لاوازکردنی ئەو پەیوەندی و لاوازکردنی شان و شکۆی؛ ئەوە لای ئیسلام بێزراوە لەبەر ئەوەی چەندەها سوودو بەرژەوەندی هەر یەك لە ژن و مێردەکە لەناو ئەچێت.

لە ئیبنو عومەرەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (أبغض الحلال إلى الله- عزّ وجل- الطلاق)[1] رواه أبوداود والحاكم وصححه. واتە: بێزراوترین حەڵاڵ لای خوای گەورە تەڵاقە.

وە هەر ئادەمیزادێك بیەوێ نێوان ژن و مێرد تێك بدات لەبۆچوونی ئیسلامدا, ئەو کەسە لە ئیسلام بەدەرەو, وشەرەفی ئەندامێتی نییە لە ئیسلامدا,

(١) أبوداود (٢١٧٨) وابن ماجة (٢٠١٨).

پێغەمبەر ﷺ فەرمووبەتی: (ليس منا من خبب امرأه على زوجها) رواه أبوداود والنسائي[1] واتە: لە ئێمە نی‌یە ئەو کەسەی ژنێك لەبەر چاوی مێرد ئەخات.

وە جاری واهەیە هەندێك ژن حەز لە پیاوی ژندار ئەکەن و هەوڵی ئەوە ئەدەن ئەو ژنەی پێ بەرەڵڵا بکەن و خۆیان بچنە جێگەی، وە ئیسلام ئەوە بە توندترین شێوە قەدەغە ئەکات، لە ئەبی هورەیرەوە (خوای لێ ڕازی بێت) کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (لاتسأل المرأة طلاق أختها لتستفرغ صحفتها ولتنكح؛ فإنما لها ما قدر لها)[2].

واتە: نابێ ئافرەتی مسوڵمان داوای تەڵاقدانی خوشکی مسوڵمانی بکات، بۆ ئەوەی جێی بگرێتەوە، یا شوو بە پیاوێکی تر بکات، وە هەر ئەوەی بۆ هەیە کە بۆی دانراوە.

وە ئەوژنەی بەبێ هۆو پێویستی داوای تەڵاق بکات لە مێردەکەی، بۆنی بەهەشتی لەسەر حەرامە.

لە ثەوبانەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (أيما أمرأة سألت زوجها طلاقاً من غير بأس، فحرام عليها رائحة الجنة) رواه أصحاب السنن وحسنه الترمذي[3]: واتە: هەرژنێك بێ‌هۆ، داوا لەمێردەکەی بکات تەڵاقی بدات بۆنی بەهەشتی لەسە رحەرامە.

(٣) حوکمی تەڵاق:

زانایان ڕایان جیاوازە دەربارەی حوکمی تەڵاق، وە ڕاسترین ڕا, ڕای ئەو کەسانەیە کە تەڵاق قەدەغە ئەکەن بۆ پێویست نەبێت. ئەوانیش حەنەفی‌یەکان و حەنبەلی‌یەکانن، وە فەرمودەی پێغەمبەر ﷺ ئەکەنە بەڵگە کە فەرمویەتی: (لعن الله كل ذواقٍ مِطْلاق) واتە: نەفرینی خوا لەهەموو ئارەزوو بازێکی زۆر ژن تەڵاقدەر.

وە لەبەر ئەوەی لە تەڵاقداندا ناشکوری نیعمەتی خوای تێدایە، چونکە بە ڕاستی ژن هێنان نیعمەتێکە لە نیعمەتەکانی خوا, وە ناسوپاسی کردنی نیعمەتیش حەرامە، کەواتە تەڵاق دان بۆ زەرورەت نەبێت حەرامە.

---

(١) أبوداود (٢١٧٥) والنسائي في عشرة النساء (٣٣٢) وإبن حبان (٥٥٦٠) والطبراني في المعجم الصغير (١/٢٤٨).

(٢) البخاري (٦٦٠١) وأبوداود (٢١٧٦) والنسائي في عشرة النساء (٣٣٠و٣٣١) والبغوي في شرح السنة (٩/٥٥) برقم (٢٢٧١).

(٣) أحمد (٥/٢٧٧) وأبوداود (٢٦٢٦) والترمذي (١١٨٧) وإبن ماجة (٢٠٥٥).

وە لەو زەرورەتانەی کە تەڵاق ڕەوا ئەکەن, ئەوەیە کە پیاو گومانی هەبێت لە ڕەوشتی ژنەکەی یان بە دڵ حەزی لێ نەکات، چونکە خوای گەورە دڵەکان ئاڵوگۆڕ دەکات, بەڵام ئەگەر تەڵاق بۆ پێویستی نەبوو ئەوە کوفری نیعمەتەو بێ ئەدەبی‌یە لەلایەن پیاوەوە، لەبەر ئەوە خراپ و قەدەغە ئەبێت.

وە حەنبەلی‌یەکان لەو بارەیەوە ڕوونکردنەوەیەکی باشیان هەیە، وا بە کورتی ئەیهێنین:

لای ئەوان تەڵاق جاری واهەیە واجب ئەبێ، وە جاری واهەیە حەرام ئەبێت، وە جاری واهەیە ڕەوا ئەبێت وە جاری وا ئەبێت مەندوب و پەسەند ئەبێت.

تەڵاقی پێویست: تەڵاقی دوو ناوبژیکەرە, (طلاق الحكمين) کاتێ ژن و مێرد ناخۆشی ئەکەوێتە نێوانیانەوە, ئەگەر ڕایان وەها بوو کە تەڵاق هۆیەکە بۆ لابردنی ئەو ناخۆشی‌یە.

وە هەروەها تەڵاقی سوێند خۆر (مولي) دوای چاوەڕوان کردنی چوار مانگەکە، بەپێی فەرموودەی خوای گەورە کە ئەفەرموێ: ﴿لِلَّذِينَ يُؤْلُونَ مِنْ نِسَائِهِمْ تَرَبُّصُ أَرْبَعَةِ أَشْهُرٍ فَإِنْ فَاءُوا فَإِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَحِيمٌ *وَإِنْ عَزَمُوا الطَّلَاقَ فَإِنَّ اللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ﴾ (البقرة:٢٢٦,٢٢٧).

واتە: بۆ ئەوانەی سوێند لە ژنەکانیان ئەخۆن جیماعیان لەگەڵ نەکەن، چاوەڕوانکردنە بۆ ماوەی چوار مانگ, ئەگەر پەشیمان بوونەوە خوا لێ بوردەو میهرەبانە، بەڵام ئەگەر ویستیان تەڵاقیان بدەن ئەوا خوای گەورە بیسەر و زانایە بەحاڵیان.

بەڵام تەڵاقی حەرام: ئەو تەڵاقەیە کە پێویست نی‌یە, وە بۆیەش حەرامە چونکە زیانە بۆ پیاوەکەو ژنەکە، وە فەوتاندنە بۆ ئەو بەرژەوەندی‌یەی بەدیهاتووە لەنێوانیاندا، بێ‌ئەوەی پێویست بێت، لەبەر ئەوە حەرامە، هەروەك ماڵ لەدەست دان بەپێی فەرمودەی پێغەمبەر ﷺ کە فەرمویەتی: (لاضرر ولا ضرار)[1] واتە: زیان بەخۆ گەیاندن و زیان بە خەڵك گەیاندن قەدەغەیە.

وە لەڕیوایەتێکی تردا ئەو جۆرە تەڵاقە مەکروهە بەپێی فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ کە فەرموویەتی: (أبغض الحلال إلى الله الطلاق) واتە: بێزراوترین حەڵاڵ لای خوا تەڵاقە[2].

وە لە زاراوەیەکی تردا هاتووە: (ما أحل الله شيئاً أبغض إليه من الطلاق)[3]. واتە: خوا شتێکی حەڵاڵ نەکردووەو ڕقی لێی بێت بە ئەندازەی تەڵاق.

---

(١) أحمد (١/٣١٣) ابن ماجه (٢٣٣٧) والبيهقي (٦/٦٩).

(٢) تەخریجی ئەم حەدیسە ڕابورد.

(٣) الترمذي (٢١٧٧).

جا کاتێ بێزراوە کە بەبێ پێویست بێت، وە چونکە لابەری ئەو نیکاحە پڕ لە بەرژەوەندی‌یەیە کە ئیسلام بانگەوازی بۆ ئەکات، ئیتر بەوە مەکروە ئەبێت,

بەڵام تەڵاقی ڕەوا: ئەوەیە کاتێك ڕوو ئەدات کە پێویست بێت، لەبەر خراپی ئەخلاق و ڕەوشتی ژنەکەو ناخۆشی ژیان لەگەڵیاو زیان پێگەیاندنی، بەبێ ئەوەی مەبەستەکەی بەدەست بێنێ.

بەڵام ئەوەی پەسەندو مەندوبە: ئەو تەڵاقەیە کە ڕوو ئەدات کاتێك ژنەکە درێغی ئەکات لە مافەکانی خوادا کە واجبە لەسەری، وەك نوێژو شتی تر، وە پیاوەکە نەتوانێ زۆری لێ بکات بۆ بەجێ هێنانی، یا ئافرەتەکە داوێن پاك نەبێت.

ئیمامی ئەحمەد ڕەحمەتی خوای لەسەر بێت فەرمویەتی: نابێت پیاو ئەو ژنە ڕابگرێ، چونکە لە ئاینەکەیدا کەم‌وکوڕی هەیە, وە دڵنیایی لێ ناکرێت کە داوێن پیسی ناکات و منداڵی کەسێکی تر ناخاتە پاڵی، وە لەم شێوانەدا خراپ نی‌یە کە تەنگ بەژنەکە هەڵبچنرێ بۆ ئەوەی بریتی بداتێ و کابرا تەڵاقی بدات.

خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿وَلَا تَعْضُلُوهُنَّ لِتَذْهَبُوا بِبَعْضِ مَا آتَيْتُمُوهُنَّ إِلَّا أَنْ يَأْتِينَ بِفَاحِشَةٍ مُبَيِّنَةٍ﴾ (النساء: من الآية١٩).

واتە: ئەزیەت و ئازاری ژنەکانتان مەدەن لە کاتێکدا کە ڕقتان لێیانە؛ بۆ ئەوەی تەنازولتان بۆ بکەن لە هەندێ لە مارەیی‌یەکەیان یان شتی تر کە داوتانە پێیان، مەگەر تاوانێکی ئاشکرایان کردبێت.

ئیبنو قودامە فەرمویەتی: لەوانەیە تەڵاق لەو دوو شوێنەدا واجب بێت.

فەرمویەتی: وە ئەوەی مەندوبە تەڵاقێکە کە لە حاڵەتی نێوان تێك چوون دابێت, وە لەو حاڵەتەشدا کە ژن ئەگاتە حاڵەتی خولع کردن، بۆ ئەوەی زیانی پێ نەگات.

**حیکمەتی تەڵاق:**

ئیبنوسینا لەکتێبی (شیفا)دا وتویەتی: پێویستە بۆ جیابوونەوە ڕێگایەك هەبێت، و لەهەموو ڕوویەکەوە دانەخرێ، چونکە بەتەواوی بڕینەوەی هۆیەکانی گەیشتن بەجیابوونەوە, لە چەندەها لاوە زیان و خەلەل دروست ئەکات، لەوانە: هەندێ کەس هەیە لەگەڵ هەندێکدا ناگونجێ, هەرکاتێ هەوڵ درابێ بۆ کۆکردنەوەیان کێشەو شەڕیان زیادی کردووەو ژیانیان زیاتر تێك چووە.

وە لەوانە: زۆر کەس هەیە تووشی کەسێك ئەبێت هاوتای خۆی نی‌یە، وە چاك نازانێ هاوسەرێتی بکات، یا ڕو گرژو ناوچاو تاڵە, ئەوە وا لە هاوسەرەکەی ئەکات ئارەزووی بۆ کەسێکی تر بجوڵێ،

چونکە ئارەزوو سروشتی‌یە، وە لەوانەیە ئەو کارە سەر بۆ فساد بکێشێ لە چەند ڕویەکەوە، وە لەوانەیە ژن‌ومێرد یارمەتی یەکتر نەدەن لەسەر منداڵ بوون جا ئەگەر هاوسەری خۆیان گۆڕی یارمەتی یەك ئەدەن لەوکارەدا، لەبەر ئەوە پێویستە بۆ جیابوونەوە ڕێگا هەبێت، بەڵام ئەبێت توند بگیرێت.

**تەڵاق لای جوولەکە:**

ئەوەی نووسراوە لە شەریعەتی جوولەکەداو کاری لەسەر کراوە، ئەوەیە تەڵاق بەبێ بەهانە حەڵاڵە, وەك ئەوەی پیاوێك حەز بکات ژنێکی جوانتر بهێنێ لە ژنەکەی خۆی، بەڵام بەبێ بەهانە بەجوانی نازانێ، وە بەهانەش لای ئەوان دوو بەشە:-

یەکەم- نەنگ و عەیبی سروشتی , لەوانە: چاو کزی و خێلی و بۆگەنی دەم و پشتکۆمی و شەلی و نەزۆکی.

دووەم- نەنگی ڕەوشت:! وە ئەمانەیان باس کردووە: بێ شەرمی, زۆربلێیی, چڵکنی و ئاژاوەگێڕی و عینادی و ئیسراف و زیادەڕەوی‌و زۆرخۆری و قەڵەوی و خۆش خۆری و فیز زلی، وە زینا لای ئەمان بەهێزترین بەهانەیە بۆ تەڵاق دان, وە تەنها بڵاو بوونەوەی قسەکە بەسە لایان بۆ تەڵاق دان، با سابتیش نەبێ کە زینای کردووە، بەڵام مەسیح (سڵاوی خوای لەسەر بێت) بڕیاری لەسەر هیچ کام لەوانە نەداوە بۆ تەڵاقدان جگە لە زینا، بەڵام ئافرەت بۆی نی‌یە داوای تەڵاق بکات, مێردەکەی هەر عەیبێکی هەبێت، ئەگەر سابتیش بێ لەسەری کە زینای کردووە.

**تەڵاقدان لە مەزهەبەکانی مەسیحیدا:**

هەموو مەزهەبە مەسیحی‌یەکان کە گەلانی ڕۆژئاوای لەسەرن ئەگەڕێتەوە بۆ سێ مەزهەب:

١- مەزهەبی کاسۆلیکی.

٢- مەزهەبی ئەرپوژکسی.

٣- مەزهەبی پرۆتستانتی.

مەزهەبی کاسۆلیکی, تەڵاق بەتەواوی حەرام ئەکات, وە بەڕەوای دانانێ جیاکردنەوەی ژن و مێرد لەبەر هەر هۆیەك بێت، هەرچەندە گەورەش بێت، هەتا خیانەت کردنیش بەوە دانانێ کە تەڵاقدان ڕەوا بکات, وە هەموو ئەوەی کە بەڕەوای دائەنێت لە حاڵەتی خیانەتیشدا ئەوەیە کە لە یەك دوور بکەونەوە لەناو جێگاداو بەس. لەگەڵ ئەوەی کە ژن‌و مێردایەتی‌یان هەر ئەمێنێ لە ڕووی شەرعی‌یەوە, وە دروست نی‌یە بۆ هیچ کامیان لەو ماوەی جیابوونەوەدا کەسێکی تر بکەنە

هاوسەریان، چونکە ئەوە وا دائەنرێ کە چەند ژنی هێناوە، وە تایینی مەسیحی چەند ژن هێنان بە هیچ شێوەیەك بەرەوا دانانێت.

وە کاسۆلیکی‌یەکان لە مەزهەبەکەیاندا پشت بەوە ئەبەستن کە لە ئینجیلی (مرقص) دا هاتووە لەزمانی مەسیحەوە (علیه السلام) دەڵێت:

(٨ وە ئەو دووانە ئەبن بە یەك لاشە، کەواتە هێشتا نەبوون بە دووان، بەڵکو لاشەیەکن. ٩ وە ئەوەی خوا خستوونی‌یەتە پاڵ یەك ئادەمیزاد ناتوانێ لەیەکتری‌یان جیا بکاتەوە)[١].

بەڵام دوو مەزهەبەکەی تری ئەرثوذکسی و پرۆتستانتی، ڕێ ئەدەن بە تەڵاق لە هەندێ شێوەی دیاری کراودا لەهەموویان گرنگتر خیانەتکردنە لە هاوسەر، بەڵام هەردوو مەزهەبەکە بە حەرامی دائەنێن لەسەر پیاوو ژن کە دوای ئەوە ژن بهێنن یا شوو بکەن، وە ئەو مەزهەبانەی کە ڕێ بەتەڵاق ئەدات لەکاتی خیانەتی ژن و مێردایەتی‌دا پشتیان بەستووە بەوەی لە ئینجیلی (متی)دا هاتووە، لەسەر زمانی مەسیحەوە (عليه السلام) کە ئەڵێت: هەرکەس ژنەکەی تەڵاق بدات لەسەر زینا نەبێت، وای لێ ئەکات زینا بکات[٢].

وە مەزهەبە مەسیحی‌یەکان لەوەدا کە زەواج حەرام ئەکەن لەسەر پیاو کاتێك ژن تەڵاق بدات، وە لەسەر ژنە تەڵاق دراوەکەش، پشت بەوە ئەبەستن کە لە ئینجیلی (مرقص) دا هاتووە کە ئەڵێت: (هەرکەس ژنەکەی تەڵاق داو ژنێکی تری هێنا زینای لەگەڵ ئەکات، وە ئەگەر ژنێکیش تەڵاق دراو شووی کردەوە بە پیاوێکی تر زینای لەگەڵا ئەکات)[٣].

**تەڵاق لەسەردەمی نەفامی‌دا:**

**دایکی مسوڵمانان عائیشە ڕەزای خوای لەسەر بێت فەرمویەتی:**

پیاو هەرکاتێك بیویستایە ژنەکەی تەڵاق ئەدا، وە هەر ژنی ئەبوو ئەگەر لە عیددەکەیدا بیگێڕایەتەوە، با سەد جاریش تەڵاقی بدایە، یان زیاتر، هەتا پیاوێك بە ژنەکەی خۆی ووتبوو: سوێند بەخوا وات تەڵاق نادەم دەستت لێم ببێتەوەو ناشت هێنمەوە هەرگیز. ژنەکەش ووتبوی ئەوە چۆن دەبێت؟ پیاوەکە ووتبوو: تەڵاقت ئەدەم، هەرکاتێك خەریك بوو عیددەکەت تەواو بێت، ئەت گێڕمەوە. ژنەکەش هەڵسا چووە لای عائیشە بۆی گێڕاوە، عائیشەش قسەی نەکرد هەتا پێغەمبەر

---

(١) مرقص إصحاح ١٠ آيتي ٨و٩.

(٢) إنجيل متى: الإصحاح الخامس ٢١-٢٢.

(٣) إنجيل مرقص، الإصحاح العاشر ١١.

ﷺ هاتبووەوە پێی ڕاگەیاندبوو, پێغەمبەریش ﷺ دەنگی نەکردبوو هەتا قورئان هاتە خوارەوە کە ئەفەرموێ: ﴿الطَّلاقُ مَرَّتَانِ فَإِمْسَاكٌ بِمَعْرُوفٍ أَوْ تَسْرِيحٌ بِإِحْسَانٍ﴾ (البقرة: من الآية٢٢٩),

واتە: تەڵاقێك کە پیاو بتوانێ پەشیمان بێتەوەو ژنەکەی تێدا بگێڕێتەوە دوو جارە, وە حوکمی خوا لەدوای هەریەك لەو دوو تەڵاقە ئەوەیە کە یان ڕایبگرێ بە چاکی وە یان ئازادی بکات بە چاکی.

عائیشە فەرموی: ئیتر لەوەو دووا خەڵك بە مەسەلەی تەڵاقا ئەچوونەوە، ئەوەی کە ژنی تەڵاق دابوو، وە ئەوەش کە ژنی تەڵاق نەدابوو[1].

## تەڵاق تەنها مافی پیاوە

ئیسلام وای داناوە تەڵاق تەنها بەدەست پیاو بێت، چونکە ئەو سورترە لەسەر مانەوەی ئەو ژن و مێردایەتی‌یە کە ماڵی سەرف کردووە لە پێناویدا، کە پێویستی بە ئەوەندەی تر یا زیاترە، ئەگەر بیەوێ ئەو ژنەی تەڵاق بدات، و ژنێکی تر بهێنێ.

وە لەسەری پێویست ئەبێ کە مارەیی‌یە دواخراوەکەی بداتێو موتعەی تەڵاقیش، هەروەها نەفەقەی بکێشێ لەماوەی عیددەکەیدا، ئیتر بەهۆی ئەوەو بەپێی عەقڵ و میزاجی خۆڕاگرترە بەرامبەر ئەو شتانەی کە پێی ناخۆشە لە ژنەکەیدا، ئیتر پەلە ناکات بۆ تەڵاق لەهەر ڕق هەڵسانێکدا، یان هەر خراپەیەك لە ژنەکەوە کە گران بێت لەسەر پیاو خۆی ڕابگرێ, وە ژن لە پیاو خێراتر تووڕە ئەبێت و کەمتریش خۆی ڕائەگرێ، وە ئەوەی بە هۆی تەڵاقدانەوە تووشی پیاو ئەبێت لە خەرجی و نەفەقە، تووشی ئەو نابێت، وە ژن زیاتر لێی ئەوەشێتەوە کە دەست پێشکەری بکات بۆ هەڵوەشاندنەوەی پەیمانی ژن‌ومێردایەتی لەبەر بچوکترین هۆ، یان هەر بۆ شتێك کە بە هۆیەکی ڕاستیش دانانرێ ئەگەر ئەو مافەی بدرێتە دەست.

بەڵگەش لەسەر ئەو لێکدانەوەی ئەوەیە فەرەنگەکان کاتێ داواکردنی تەڵاقیان دایە دەست ژن و پیاو وەك یەك, تەڵاقدان لایان زۆر بوو, ئیتر وای لێهات بوو بە چەند ئەوەندی تەڵاقدان بوو لای مسوڵمانان.

### کێ تەڵاقی ئەکەوێ

زانایان لەسەر ئەوە ڕێك کەوتون کە پیاوی ژیری پێگەیشتووی زۆر لێنەکراو, ئەوکەسەیە کە دروستە بۆی تەڵاق بدات و تەڵاقەکەشی ئەکەوێ.

---

(١) الترمذي (١١٩٢).

بەڵام گەر شێت بوو، یا تەمەنی کەم بوو، یا زۆر لێکراوبوو، ئەوکاتە تەڵاقەکەیان بە لەغو دائەنرێ، ئەگەر تەڵاقیش بدەن، چونکە تەلاقدان کارێکە لەو کارانەی کە شوێنەوراو ئەنجامی ئەبێت لە ژیانی ژن‌ومێردایەتی‌دا، لەبەر ئەوە تەڵاق دەر ئەبێ مرۆڤێك بێت ئەهلیەتی ـ واتە شیاریەتی ـ تەواوی هەبێت بۆ ئەوەی تەسەڕروفەکانی دروست بێت.

ئەهلیەتیش بە عەقڵ و باڵغ بوون و ئارەزوو تەواو ئەبێت.

وە لەو بارەیەوە خاوەن سونەنەکان ئەگێڕنەوە لە عەلی‌یەوە، خوا لێی ڕازی بێت لە پێغەمبەرەوە ﷺ کە فەرمویەتی: (رفع القلم عن ثلاثة: عن النائم حتى يستيقظ، وعن الصبي حتى يحتلم، و عن المجنون حتى يعقل)[1].

واتە: پێنووس لەسەر سێ کەس هەڵگیراوە: لەسەر نووستو هەتا هەڵئەسێ، وە لەسەر منداڵ هەتا باڵغ ئەبێت، وە لەسەر شێت هەتا چاك ئەبێتەوە.

وە لە ئەبی هورەیرەوە خوا لی‌ی ڕازی بێت پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (كل طلاق جائز، إلا طلاق المغلوب على عقله) رواه الترمذي والبخاري موقوفاً[2].

واتە: تەڵاقی هەموو کەس دروستە تەڵاقی ئاوەز تێکچوو نەبێت.

وە ئیبنوعەبباس خوا لێی ڕازی بێت فەرمویەتی: کەسێك دزو جەردە زۆری لێبکەن ژنەکەی تەڵاق بدات، هیچ نی‌یە و تەڵاقی ناکەوێ. بوخاری گێڕاویەتی‌یەوە[3].

وە زانایان ڕای جیاوازی‌یان هەیە لەم چەند کێشەیەدا کەوا لەخوارەوە ڕوونی ئەکەینەوە:

١-تەڵاقی زۆرلێکراو.

٢-تەڵاقی مەست‌وسەرخۆش.

٣- تەڵاقی گاڵتەچی.

٤-تەڵاقی ڕق هەڵساو.

٥-تەڵاقی بێ‌ئاگاو لەبیر چوو.

٦-تەڵاقی عەقڵ تێکچوو.

---

(١) أحمد (٦/١٠٠-١٠١) وأبوداود (٤٤٠٣) والترمذي (١٤٢٣).

(٢) الترمذي (١١٩١) والبخاري تعليقاً (٩/٢٨٨) موقوفاً على ابن عباس.

(٣) البخاري تعليقاً (١٢/٣١١).

**(١)- تەڵاقی زۆرلێ کراو:**

زۆرلێ کراو نە ئیرادە و ویستی هەیە و نە ئارەزوو، وە ئیرادەو ئارەزووش بناغەی تەکلیفە, جا ئەگەر ئەو دوانە نەبوون تەکلیفیش نامێنێ، وە وا دانراوە کە زۆر لێکراو لێپرسراو نابێت بەرامبەر کارەکانی؛ چونکە ویستی لێسەنراوە، وە ئەو لە واقیعدا فەرمانی زۆرلێکەرەکە بەجێ دەهێنێ. وە هەر کەس زۆری لێکرا ووتەی کوفر بڵێت بەوە کافر نابێت، بەپێی فەرمودەی خوای گەورە کە فەرموویەتی: ﴿إِلَّا مَنْ أُكْرِهَ وَقَلْبُهُ مُطْمَئِنٌّ بِالْإِيمَانِ﴾ (النحل: من الآية١٠٦). واتە: مەگەر کەسێك نەبێت زۆری لێ بکرێت کوفر بکات و دڵی سابت بێت لەسەر باوەڕ.

وە هەر کەس زۆری لێ بکرێ لەسەر ئیسلام کە وەری بگرێت، نابێت بە موسوڵمان، وە هەرکەس زۆری لێبکرێ ژنەکەی تەڵاق بدات تەڵاقی ناکەوێت, ئەگێڕنەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (رفع عن أمتي الخطأ والنسيان وما استكرهوا عليه) أخرجه ابن ماجة، وابن حبان، والدارقطني، والطبراني، والحاكم وحسنه النووي واتە: هەڵگیراوە لەسەر ئوممەتی من سزای ئەو گوناهانەی بەهەڵەو لەبیرچوون ئەیکەن، وە ئەوەش کە بە زۆر پێیان کراوە

وە مالیك و شافیعی و ئەحمەد و داود کە لە فوقەهای ریلایەتەکان بوون هەر بۆ ئەوە چوون. وە عومەری کوری خەطاب و عبداللەی کوری و عەلی کوری ئەبی طالیب وئینو عەبباسیش وەهایان ووتوە.

وە ئەبو حەنیفە و هاوەڵانی ووتویانە: تەڵاقی زۆرلێکراو ئەکەوێ, بەڵام هیچ بەڵگەیان نییەو جگە لەوەش پێچەوانەی جەماوەری صەحابەن.

**(٢)-تەڵاقی سەرخۆش:**

جەماوەری زانایان بۆ ئەوە چوون کە تەڵاقی سەرخۆش ئەکەوێ، چونکە خۆی سەبەبە بۆ تێکدانی عەقڵی بە ئارەزوی خۆی. وە کۆمەڵێك ئەڵێن تەڵاقەکەی لەغوەو هیچ حیسابی بۆ ناکرێ، چونکە ئەو و شێت یەکسانن، چونکە هەردووکیان ژیری‌یان لەدەست داوە کە تەکلیف بەهۆی ئەوەوە ئەکرێ، وە لەبەر ئەوەی خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لا تَقْرَبُوا الصَّلاةَ وَأَنْتُمْ سُكَارَى حَتَّى تَعْلَمُوا مَا تَقُولُونَ﴾ (النساء: من الآية٤٣), واتە: ئەی ئەو کسانەی باوەڕتان هێناوە بەسەرخۆشی نزیکی نوێژ مەکەون، هەتا بزانن چی ئەڵێن،

خوای گەورە هیچ ئیعتیبارێکی بۆ قسەی سەرخۆش دانەناوە، چونکە نازانێ چی ئەڵێت، وە سابتە لە عوسمانەوە کە لای وابوو تەڵاقی سەرخۆش ناکەوێ. وە هەندێك لەزانایان بۆ ئەوە چوون کە کەس لە صەحابە جیاوازی عوسمان نەبووە لەوەدا,

وە ئەوە بۆچوونی یەحیای کوڕی سەعیدی ئەنصاری و حەمیدی کوڕی عبدالرحمن و ڕەبیعە و لەیثی کوڕی سەعد و عبداللەی کوڕی حوسەین و ئیسحاقی کوڕی ڕاهەوەیهە و ئەبی ثەور و شافیعی‌یە لە یەکێك لە قەولەکانیاندا, وە هەروەها موزنی لە شافیعی‌یەکان ئەو ڕەئی‌یەی هەڵبژاردووە، وە یەکێکیشە لە ڕیوایەتەکانی ئەحمەد, وە مەزهەبەکەشی لەسەر ئەوە جێگیر بووە وە ئەمە مەزهەبی هەموو ظاهیری‌یەکانە، وە لە حەنەفی‌یەکانیش ئەبو جەعفەری طەحاوی و ئەبو حەسەنی کەرخی ئەم بۆچوونەیان هەڵبژاردووە.

شەوکانی ووتویەتی: ئەو سەرخۆشەی هۆشی بەخۆی نامێنێ تەڵاقەکەی هیچ حوکمێکی نی‌یە. لەبەر نەبوونی عەقڵ کە حوکمەکان بۆ سەر ئەو ئەگەڕێنەوە، وە یاسادانەری ئیسلام سزای بۆ ئەو کسانە داناوە, ئیتر ئێمە بۆمان نی‌یە لای خۆمان لی‌ی لابدەین و بڵێین تەڵاقەکەی ئەکەوێ لە تۆڵەی ئەو کارەیدا ئەو کاتە دوو غەرامەی لەسەر کۆببێتەوە.

(٣)-تەڵاقی ڕق هەڵساو:

ئەو ڕق هەڵساوەی نازانێ چی ئەڵێت و نازانێ چی لەدەم دەرئەچێ تەڵاقی ناکەوێت، چونکە ئیرادەی سەلب کراوە.

ئەحمەد و ئەبوداود و ئیبنو ماجە و حاکم کە بە (صحیح)ی داناوە ئەگێڕنەوە لە عائیشەوە خوا لێی ڕازی بێت کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (لاطلاق ولا عتاق في إغلاق) واتە: نە تەڵاقدان و نە بەندە ئازاد کردن نی‌یە لەکاتی زۆر توڕەبووندا[1], وە ووشەی (إغلاق) بەچەند مانایەك لێکدراوەتەوە لەوانە: ڕق هەڵساو, زۆرلێکراو, شێتی.

وەك لە کتێبی (زاد المعاد)دا هاتووە ئیبن و تەیمیە ڕەحمەتی خوای لێ بێت فەرموویەتی: حەقیقەتی (إغلاق) ئەوەیە کە دڵ لەسەر پیاو دابخرێت, مەبەستی نەمێنێ لە قسەکردندا و نەزانێ چی ئەڵێت، وەك ئەوەی ویست و دەسەڵاتی لەسەر دابخرێ. وە فەرمویەتی: تەڵاقی زۆرلێ‌کراویش ئەچێتە پاڵ ئەوان, وە هەروەها شێت و ئەو کسانەی هۆشیان نامێنێ بە سەرخۆشی یان بەتوڕەیی، وە هەر کسێك مەبەستی نەمێنێ و نەزانێت چی ئەڵێت.

ڕق هەڵسانیش سێ جۆرە:-

١- ئەو ڕقەی ئاوەز ناهێڵێ و خاوەنی هەست بەوە ناکات چی ئەڵێت، ئەو جۆرە کسانە تەڵاقیان ناکەوێت بەبێ نیزاع و کێشە.

---

(١) أحمد (٦/٢٦٧) أبوداود (٢١٩٣) إبن ماجة (٢٠٤٦) حاكم (٢/١٩٨).

٢-ئەو ڕقەی لە دەروونیدایە، بەڵام بەشێوەیەکە ڕێ لە خاوەنی ناگرێت کە بزانێ چی ئەڵێت، ئەو جۆرە کەسانە تەڵاقیان ئەکەوێ.

٣-ڕقەکە بەهێزەو زۆری پێ ئەهێنێ، وە بەتەواوی هۆشی لەدەست نادات، بەڵام نییەت و نیازی تێك نەدات، بەشێوەیەك پەشیمان ئەبێتەوە لەوەی کردوویەتی، ئەگەر زیادەڕەوی کرد، ئەمەیان پێویستی بەسەرنجدان هەیە. بەڵام نەکەوتنی لەم حاڵەتەدا بەهێزترە.

(٤ تەڵاقی گاڵتە باز و بەهەڵەدا چوو:

جەماوەری زانایان ڕایان وایە کە تەڵاقی گاڵتەباز ئەکەوێت، وەك چۆن نیکاحی دروستە, بەپێی ئەوەی ئەحمەد و ئەبوداود و ئیبنو ماجە و (ترمذي) کە بەحەسەنی داناوە و حاکم کە بە (صحیح)ی داناوە گێڕاویانەتەوە لە ئەبی هورەیرەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (ثلاث جدهن جد وهزلهن جد: النکاح والطلاق والرجعة)[1] واتە: سێ شت ووتنی بەڕاستیان ڕاستە و بەگاڵتەش بووترێ هەر ڕاستە: نیکاح و تەڵاق و گێڕانەوەی ژن لەدووای تەڵاقێك. ئەم فەرموودەیە هەرچەندە لەئیسنادەکەیا عبد الله ی کوڕی حەبیبی تێدایە کەخەڵك جیاوازن تێیدا، بەڵام بە فەرمودەی تر بەهێز ئەبێ،

وە هەندێ لە زانایان بۆ ئەوە چوون تەڵاقی بەگاڵتە ناکەوێ لەوانە: باقر و صادق و ناصر، وە هەر ئەوەش قەوڵێکە لە مەزهەبی ئەحمەد و مالیکدا، چونکە ئەوانە مەرجی ئەوەیان داناوە لە کەوتنی تەڵاقدا ئەبێ ڕەزامەندی و ووتن بە زمانی تێدا بێت، وە واتاکەی بزانێ، ومەبەستی بێت، چونکە ئەگەر نی‌یەت و مەبەست نەبوو، ئەو سوێندە بە لەغو دائەنرێ، بەپێی فەرمودەی خوای گەورە کە ئەفەرموێ: ﴿وَإِنْ عَزَمُوا الطَّلاقَ فَإِنَّ اللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ﴾ (البقرة:٢٢٧) واتە: ئەگەر ویست و ئارەزوویان تەڵاقدان بوو, ئەوا خوای گەورە بیسەر و زانایە.

ویست و ئارەزوو ئەوەیە کە ئەو کەسە بیەوێ بە ئارەزووی خۆی ئەو کارە بکات, ئەمەش ئەوە ئەگەیەنێ کە ئەو کەسە ئیرادەیەکی بڕ»اوەی هەبێ بۆ کردنی ئەو کارە یان واز لێ هێنانی. پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (إنما الأعمال بالنيات)[2] واتە: پاداشتی هەموو کردوەیەك بە نی‌یەت دەبێت,

(١) أبوداود (٢١٩٤) والترمذي (١١٨٤) وابن ماجة (٢٠٣٩) والحاكم (٢/١٩٨) والدارقطني (٣/٢٥٦) وصحيح الجامع (٣٠٢٤) ولم يعزه لأحمد.

(٢) البخاري (١) ومسلم (١٩٠٧).

تەڵاقیش کارێکە پێویستی بە نیازو نیەت هەیە وە گاڵتە باز نیازو نیەتی نی‌یە بوخاری لە ئیبنو عەبباسەوە ئەگێڕێتەوە کە فەرموویەیی: (إنما الطلاق عن وطر)[1] واتە: تەڵاقدان پێویستی بە ویست وئارەزوو و قەست هەیە.

بەڵام تەڵاقی بەهەڵەدا چوو ئەوەیە کەیەکێك بیەوێ قسەیەك بکات کەتەڵاقی تێدا نەبێت، کەچی وەها بێتە سەر زمانی، زانا حەنەفی‌یەکان ڕایان وایە: ئەو کەسە مامەڵەی لە ڕوی قەزاییەوە لەگەڵدا ئەکرێ، بەڵام لە ڕووی ئاینی‌یەوە، ئەو کەسە خۆی و خوای خۆی، تەڵاقەکەی ناکەوێ و ژنەکەی پێ حەڵاڵە.

**(٥)- تەڵاقی بێ ئاگا و سەرلی‌تێکچوو:**

بێ ئاگا و سەرلی‌تێکچوو وەك بەهەڵەداچوو و گاڵتەباز وایە، بەڵام جیاوازی نێوان بەهەڵەداچوو لەگەڵ گاڵتەبازدا ئەوەیە: گاڵتەبازەکە تەڵاقەکەی ئەکەوێ بەپێی قەزاو ئاین، لای ئەوانەی ڕایان وەهایە، بەڵام تەڵاقی بەهەڵەدا چوو لە ڕووی قەزاوە ئەکەوێ و بەس، ئەویش لەبەر ئەوەی تەڵاق بۆ گاڵتە و یاری دانەنراوە.

**(٦)- تەڵاقی سەرسام (المدهوش):**

ئەو مەدهوشەی کە نازانێ چی ئەڵێت بەهۆی صەدمەیەك کەتووشی بوبێت و عەقڵی بردبێت و لەبیرکردنەوەی خستبێ، ئەو کەسە تەڵاقی ناکەوێ وەك چۆن تەڵاقی شێت ناکەوێ، وە وەك چۆن تەڵاقی بوراوە و شێت و بێ‌عەقڵ وە ئەو کەسانەی کە عەقڵیان تێك ئەچێت، لەبەر پیری یان نەخۆشی یا بەهۆی کارەساتێکی کوت‌و پڕی، ناکەوێت.

**چ ئافرەتێك تەڵاقی لەسەر ئەکەوێ:**

تەڵاق لەسەر ژن ناکەوێ هەتا شوێنی ئەو تەڵاقە نەبێت، وە کاتێك ئەو ژنە شوێنی تەڵاق ئەبێت کە لەم شێوانەی خوارەوەدا بێت:

١-ئەگەر ژن و مێردایەتی‌یەکە بەڕاستی لەنێوانیاندا بەردەوام بێت.

٢-ئەگەر ژنەکە لە عیددەی تەڵاقی ڕەجعیدا بوو، یا لە عیددەی تەڵاقی بائینی بائیندا بوو، بەمەرجێ بائینەکە بائینی بچووك بێت، چونکە ژن و مێردایەتی لەم شێوانەدا لەڕووی حوکمەوە هەر بەردەوامە هەتا عیددەی تەواو ئەبێت.

---

(١) البخاري تعليقا (٩/٣٨٨).

٣-ئەگەر ژنەکە لە عیددەی ئەوەدا بوو بەجیاکردنەوە تەلاق درابوو، چونکە ئەو (جیاکردنەوەیە) هەر بەتەڵاق دائەنرێ, وەك ئەوە بەهۆی ئیسلام نەبوونی مێردەوە لەیەك جیاکرابنەوە لەکاتێکدا ژنەکە مسوڵمان بوبێت، یا بەهۆی سوێند خواردنەوە (إيلاء) جیابوونەوە, چونکە جیابوونەوە لەو دوو وێنەیەدا بەتەڵاق دائەنرێ لای حەنەفی‌یەکان.

٤-ئەگەر ژنەکە لە عیددەی جیابونەوەیەکدا بێت کە بەهەڵوەشاندنەوە دابنرێ، بەڵام هێشتا پەیمانەکە لە بنەڕەتا تێك نەچووە و حەڵاڵی‌یەتی هەر ماوە, وەك ئەو جیابوونەوەیەی بەهۆی (ردة) هەڵگەڕاندنەوەی ژن لەدین (ردة) دروست ئەبێت. چونکە هەڵوەشاندنەوە لەم حاڵەتەدا بەهۆی ڕوودانێکی کوت‌و پڕی‌یەوە بەسەریاندا هاتووە کە ناهێڵێ پەیمانەکە بەردەوام بێت دووای ئەوەی کە بەڕاستی پێك هاتووە.

**چ ئافرەتێك تەڵاقی لەسەر ناکەوێ**

ووتمان ژن تەڵاقی لەسەر ناکەوێ هەتا لەسەر ئەو شێوەیە نەبێت کە دروستە تەڵاق بدرێ. جا ئەگەر لەسەر ئەو شێوەیە نەبوو, تەڵاقی لەسەر ناکەوێ, کەواتە ئافرەتی عیددەکێش کە لە عیددەی هەڵوەشاندنەوەی ژن و مێردایەتی‌دا بێت بەهۆی هاوتا نەبوون، یان مارەیی‌یەکەی کەمتر بێت لە (مهر المثل)، یان بەچکۆلەیی مارەکرا و کەگەورە بووە ئارەزووی دراوەتە دەست خۆی، یا لە پەیمانەکەدا تێك چوونێك دەرکەوتووە، بەهۆی نەبوونی مەرجێك لەمەرجەکانی دروستی پەیمانەکە، تەڵاقی لەسەرناکەوێ، چونکە پەیمانەکە لەم حاڵەتانەدا لە بناغەوە هەڵوەشاوەتەوە، و ئیتر لەعیددەدا هەر نەماوە، جا ئەگەر پیاوێ بەژنەکەی ووت: —إنت طالق- تەڵاقت کەوتبێ- ژنەکەش لە حاڵەتەکانی سەرەوەدا بێت- قسەکەی لەغوەو هیچ شوێنەوارێکی نابێت.

وە هەروەها ئافرەتی تەڵاقدراو پێش گواستنەوەی وپێش خەڵوەت کردنی تەواو تەڵاقی ناکەوێت، چونکە پەیوەندی نێوانیان نەماوەو کۆتایی هاتووە، وە تەنها بەتەڵاقدانەکە بوونەتە بێگانە, ئیتر ئەو ئافرەتە جێگەی تەلاق نی‌یە چونکە نەژنی کابرایە نە عیددەکێشە.

ئەگەر پیاوێك بە ژنە نەگوێزراوەکەی بڵێت: (أنت طالق.. أنت طالق.. أنت طالق)- تەڵاقت کەوتبێ، تەڵاقت کەوتبێ، تەڵاقت کەوتبێ, هەر بەیەکەم جار تەلاقی ئەکەوێ بە تەڵاقی بائین، چونکە ژن و مێردایەتی‌یان بەردەوامە,

بەڵام دووەم و سێ‌یەمیان لەغون هیچیان پێ ناکەوێ، چونکە ئەو دوانەی دواییان کاتێ وتراوە, کە ئافرەتەکە نە ژنی کابرا بووە نە عیددەکێشی بووە، چونکە عیددە بۆ ئافرەتێك نی‌یە کە نەگوێزرابێتەوە.

وە هەروەها تەلاقی بێگانەیەك ناكەوێ كە لە پێشەوە پەیوەندی ژن‌ومێردایەتی نەیبەستبێ بەیەكەوە. جا ئەگەر پیاوێك بە ژنێكی ووت كە لەپێشەوە پەیوەندی ژن‌و مێردایەتی‌یان نەبوو: (أنت طالق) -تەلاقت كەوتبێ- قسەكەی لەغوەو هیچ تەئسیری نی‌یە.

وە هەروەها بە ژنێكیش كە تەلاقدرابوو عیددەكەشی تەواو بوبوو, چونكە بەكۆتایی هاتنی عیددەكەی وەك بێگانەی لێ دێ بۆ پیاوەكەی.

وە هەروەك ئەمانە وەهایە عیددەكێشێك كە سێ بە سێ تەلاق درابێت، چونكە دوای سێ بسێكە دەستی لە كابرا بەر دەبێت بە (بینونة الكبری) جیابوونەوەو بەینونەی گەورە، ئیتر تەلاق دان بێ‌مانایی‌یە دوای ئەوە.

### تەڵاق دان پێش مارە كردن

ئەو تەلاقە ناكەوێ كە ببەسترێتەوە بە هێنانی بێگانەیەكەوە, بۆنمونە بڵێت: ئەگەر فلآنەكەس بووە ژنم تەلاقی كەوتبێ, بەپێی ئەوەی (ترمذي) لە عەمری كوڕی شوعەیبەوە گێڕاویەتی‌یەوە لە باوكی‌یەوە لە باپیری‌یەوە كە فەرمویەتی: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (لانذر لابن آدم فيما لايملك، ولا عتق له فيما لايملك, ولا طلاق له فيما لايملك)[1] واتە: نەزر نی‌یە بۆ كەسێك لەشتێكدا خۆی خاوەنی نەبێت, ئازادكردن نی‌یە بۆ كەسێك كە بەندەی نەبێت، و تەلاقی بۆ نی‌یە لە ئافرەتێكدا كە خاوەنی نەبێت.

(ترمذي) ووتویەتی: فەرمودەیەكی حەسەنە و چاكترین شتە كە لەم بابەدا گێڕراوەتەوە، ئەوەش قسەی بەشی زۆری زانایانە لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ و كەسانی تر.

وە هەر ئەوە لە عەلی ئەگێڕنەوە, وە لە ئیبنوعەبباس و جابیری كوڕی زەید و چەند كەسی تر لە زانایانی تابعی، وە شافیعیش لەسەر ئەو قسەیەیە.

ئەبوحەنیفە دەربارەی تەلاقی هەڵواسراو ووتویەتی: ئەو تەلاقە ئەكەوێ كاتێ مەرجەكە بەدی هات, جا وەك یەكە ئەو كەسە مەبەستی هەموو ژنێك بێت یا چەند ژنێكی تایبەتی.

مالیك و هاوەڵەكانی ووتویانە: ئەگەر هەموو ژن بەگشتی بڵێت تەلاقی ناكەوێت، بەلآم ئەگەر چەند ژنێكی تایبەتی مەبەست بوو ئەكەوێ.

نموونەی گشتێتی: ئەوەیە كە بڵێت: هەر ژنێكم هێنا تەلاقی كەوتبێ.

---

(١) أحمد (٢/١٩٠) وأبوداود (٣٣١٦) والترمذي (١١٨١) والنسائي (٧/٢٩) والبيهقي (١٠/٦٩) والبزار (٤/١٨٧).

نموونەی تایبەتیش ئەوەیە کە بڵێت: ئەگەر فلانە کەسم هێنا- ناوی ژنەکەی برد- ئەوە تەڵاقی کەوتبێ.

## تەڵاق بەچی ئەکەوێ

تەڵاق ئەکەوێ بە هەموو ئەو شتانەی ببنە بەڵگەی ئەوەی کە کۆتایی بە پەیوەندی نێوان ژن و مێرد بهێنێ، بە قسە بێت، یان بە نووسین بۆ ژنەکە، یان بە ئیشارەت لە کەرو لاڵەوە، یا بەناردنی نێرراوو ڕاسپاردە.

**تەڵاق دان بە زاراوە (لفظ):**

جاری وایە زاراوەکە (صریح) ئاشکرا ئەبێت، وە جاری وایە کینایە ئەبێت، ئاشکرا ئەوەیە لەواتای قسەکە تێبگەیت کاتی قسەکردنەکە وەك: بڵێ: تەڵاقت کەوتبێ, یا تۆ تەڵاق دراوی، وە هەموو ئەو شتانەی کە لە زاراوەی تەڵاق وەرئەگیرێن.

شافیعی ڕەحمەتی خوای لەسەر ووتویەتی: زاراوەی تەڵاقی ئاشکرا سیانە: تەڵاق- جیابوونەوە- بەرەڵاکردن ـ کە لە قورئاندا ناویان هاتووە.

هەندێ لە ظاهیرییەکان ووتویانە: بەوسیانە نەبێت تەڵاق ناکەوێت. . . چونکە شەرع بەو سێ زاراوەیە هاتووە, ئەویش عیبادەتە, وە زاراوەش لە مەرجەکانی عیبادەتە، کەواتە پێویستە هەر زاراوەی شەرعی کە لەو بارەیەوە هاتووە بەکار بێت.

**زاراوەی کینایەت:**

ئەوەیە کە مانای تەڵاق و شتی تریش بگرێتەوە, وەك ئەوەی بڵێ: تۆ (بائن)ی واتە: جیابویتەوە، ئەوە دوو واتا ئەگرێتەوە یان جیابونەوە لە ژنو مێردایەتی، یان جیابونە لە شەڕ، وە نموونەیەکی تری کینایەت وەك: کارت بەدەستی خۆتە, ئەمەش دوو واتا ئەگرێتەوە, یەکەمیان ئەوەیە کە کاری خۆی ئەداتەوە دەست خۆی، یا لەکاری ماڵدا بە ئازادی هەڵسوکەوت بکات.

هەروەها وەك: تۆ لەسەر من حەرام بیت، ئەمەش یا ئەوە ئەگرێتەوە کە حەرام بێت خۆشی لێ وەربگرێ، یا حەرام بێت لەسەری ئازاری بدات.

**زاراوەی صەریح:**

تەڵاقی پێ ئەکەوێ بی ئەوەی پێویستی بەوە بێت مەبەستەکەی ڕوون بکرێتەوە، لەبەر ئاشکرایی بەڵگەی و ئاشکرایی ماناکەی.

وە بۆ کەوتنی تەلاّقی صەریح مەرج دانراوە: کە تەبێت زاراوەکە بدرێتە پاڵ ژنەکە، وەك ئەوەی بڵێت: ژنەکەم تەڵاقی کەوتبێ، یان تەلاّقت کەوتبێ.

بەلاّم کینایەت تەلاّقی پێ ناکەوێت بەنیەت نەبێت، جا ئەگەر ئەو کەسەی بە زاراوەی صەریح تەلاّقی خوارد بڵێت: مەبەستم تەلاّقدانی نەبووە, بەڵکو مەبەستم واتایەکی تر بووە، ئەوە لەڕووی حوکمەوە باوەڕی پێ ناکرێ، وە تەلاّقی ئەکەوێت. وە ئەگەر ئەوکەسەی بە زاراوەی کینایەت تەلاّقی خوارد بڵێت: بە نیازی تەلاّقدانی وام نەوتوە، بەڵکو نیازم واتایەکی تر بووە، ئەوە لە ڕووی حوکمەوە باوەڕی پێ ئەکرێ‌و تەلاّقی ناکەوێت، لەبەر ئەوەی لەفزەکەی مانای تەلاّق و شتی تریش ئەگرێتەوە, وە ئەوەی واتاکەی دیاری ئەکات نیەت و مەبەستە, ئەویش مەزهەبی مالیك و شافیعی‌یە، بەپێی ئەوەی بوخاری و کەسانی تر گێڕاویانەتەوە لە عائیشەوە (خوا لێی ڕازی بێت) کە فەرمویەتی:

کچەکەی جەون کاتێك گوێزرایەوە بۆ پێغەمبەر ﷺ , وە پێغەمبەر ﷺ لێی نزیك بۆوە کچەکە وتی: پەنا ئەگرم بە خوا لەتۆ, پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: (عذت بعظيم، عذت بعظيم، الحقي بأهلك)[1]. واتە: پەنات بە کەسێکی گەورە گرتووە, دوو جار، بچۆرەوە ناو کەس‌و کارت.

وە لە هەردوو صەحیحی بوخاری و موسلیم دا، و جگە لەوانیش هاتووە لە حەدیسی دواکەوتنەکەی کەعبی کوڕی مالیکدا کاتێك پێیان وت: پێغەمبەر ﷺ فەرمانت پێ ئەکات کە لە ژنەکەت دوور بکەویتەوە، ئەویش وتی: تەڵاقی بدەم یان چی بکەم؟! پێغەمبەر ﷺ فەرموی: نا، بەڵکو هەر لێی دوور بکەوەرەوەو نزیکی مەکە. ئەویش بە ژنەکەی وت: (إلحقي بأهلك)[2] بچۆرەوە ناو کەس‌و کارت.

ئەم دوو حەدیسە ئەوەمان بۆ دەردەخات: ئەو زاراوەیە ئەبێ بە تەلاّق لەگەڵ مەبەستدا، بەلاّم نابێ بە تەلاّق بەبێ مەبەست.

بەلاّم مەزهەبی حەنەفیەکان: ڕایان وەهایە کە کینایەتەکانی تەلاّق, تەلاّقیان پێ ئەکەوێ بەنیەت, وەهەروەها تەلاّقیان پێ ئەکەوێت ئەگەر حاڵەتی کینایەتەکە وای گەیاند.

---

(١) البخاري (٥٢٥٤) وابن ماجه (٢٠٥٠) والنسائي (١٥٠/٦) والبيهقي في السنن الكبرى (٣٤٢/٧).

(٢) أحمد (٤٥٨/٣) والبخاري (٤٤١٨) ومسلم (٥٣/٢٧٦٩).

## ئایا حەرام کردنی ژن تەڵاقی پێ ئەکەوێ؟

ئەگەر پیاوێك ژنەکەی خۆی لەسەر خۆی حەرام کرد, یا مەبەستی حەرام کردنی ژنەکەی خۆیەتی یا ئەیەوێ تەڵاقی بدات بەو زاراوەیە، بێ ئەوەی مەبەستی واتای لەفزەکە بێ، بەڵکو مەبەستی بەرەڵڵاکردنی بێت: لەحاڵەتی یەکەمدا، تەڵاقی ناکەوێت, بەپێی ئەوەی (ترمذي) تەخریجی کردووە کە عائیشە خوا لێی ڕازی بێت فەرمویەتی: پێغەمبەر ﷺ ژنەکانی لەسەرخۆی حەرام کرد، پاشان ئەوەی حەرامی کردبوو حەڵاڵی کردەوەو کەفارەتی سوێندەکەی دا[1].

لە صەحیحی موسلیم دا هاتووە لە ئیبنوعەبباسەوە خوا لێیان ڕازی بێت کە فەرمویەتی: ئەگەر پیاوێك ژنەکەی خۆی لەسەر خۆی حەرام کرد, ئەوە سوێندە ئەبێ کەفارەتی بدات پاشان فەرمویەتی: (لقد كان لكم في رسول الله أسوة حسنة). واتە: بەڕاستی ئێوە لە شەخصی ڕەوانەکراوی خوادا چاکترین ڕێو ڕەوشتتان هەیە کە چاوی لێ بکەن[2].

وە نەسائی هەر لە ئیبنو عەبباسەوە لەوەوە تەخریجی کردووە: (کە پیاوێك هاتووە بۆ لای و پێی ووتوە من ژنەکەم لەسەر خۆم حەرام کردووە, ئەویش فەرمویەتی: درۆت کردووە لێت حەرام نییە, لەپاشاندا ئەم ئایەتەی خوێندۆتەوە:- ﴿يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ لِمَ تُحَرِّمُ مَا أَحَلَّ اللَّهُ لَكَ تَبْتَغِي مَرْضَاتَ أَزْوَاجِكَ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَحِيمٌ*قَدْ فَرَضَ اللَّهُ لَكُمْ تَحِلَّةَ أَيْمَانِكُمْ﴾ (التحريم:١,٢).

واتە: ئەی پێغەمبەر بۆچی ئەو شتە لەخۆت حەرام ئەکەیت کە خوا بۆی حەڵاڵ کردوی, ئەتەوێ ژنەکانت ڕازی بکەیت؟ وە خوا لێبوردە و میهرەبانە بۆت، ـ ئەی ئیمانداران ـ بەڕاستی خوا حەڵاڵ کردنەوەی سوێندەکانی لەسەر فەرز کردون، بەمە کە کەفارەتیان بدەن.

تۆ کەفارەتێکی قورست ئەکەوێتە سەر ئەبێ بەندەیەك ئازاد بکەیت)[3].

بەڵام لە حاڵەتی دووەمدا کە مەبەستی لە حەرام کردن تەڵاقدان بێت: تەڵاقی ئەکەوێت، چونکە لەفزی حەرام کردن کینایەتێکە وەك کینایەتەکانی تر.

(١) الترمذي (١٢٠١) وابن ماجه (٢٠٥٩)، ورجّح الترمذي إرساله، لكن وصله البخاري (٥٢٩١).

(٢) النسائي (٦/١٥١).

(٣) النسائي (٧/٧١).

## سوێند خواردن بە سوێندی موسڵمانان

هەر کەس بە سوێندی موسوڵمانان سوێند بخوات، وەك ئەوەی بڵێت: سوێند بەوەی کە موسوڵمانان سوێندی پێ دەخۆن، لەپاشاندا سوێندەکەی کەوت, لای شافیعی یەکان کەفارەتی سوێندەکەی لەسەرە, وە نە تەلاقی لەسەر ئەکەوێ و نە شتی تر.

وە لەمالیکەوە هیچ لەو بارەیەوە نەهاتووە, بەڵام زانایانی دوایین لەمالیکی یەکان لەو بارەیەوە جیاوازی یان هەیە، دەڵێن: ئەو کەسە تەنها تۆبەو داوای لێبووردنی لەخوا لەسەرە, وە ئەوەی بەناوبانگە و فەتوایان لەسەر داوە ئەوەیە: خەڵکی بۆ کەفارەتی سوێند چۆن ڕاهاتوون ئەویش ئەوەی لەسەرە.

وە لە میسردا وا باو بووە کە سوێند بە خواو بە تەڵاق ئەخورا، وە لەسەر ئەوە هەرکەس سوێند بە سوێندی موسڵمانان بخوات و سوێندەکەی بخات، کەفارەتی سوێندەکەی ئەیگرێتەوە, و ئەو ئافرەتەی کە خێزانی یەتی لای ئەمێنێتەوە، وە نابێت بەپێ بچێت بۆ مەککە یا بەڕۆژوو بێت وەك لەسەردەمەکانی پێشوودا باو بووە, چونکە ئێستا کەس سوێند بەوە ناخوات.

ئەبهەری ووتویەتی: ئەو کەسە تەنها ئیستغفاری لەسەرەو بەس, وە وتراویشە کە کەفارەتی سوێندی لەسەرە، وەك شافیعی یەکانیش ڕایان وایە.

وە ئەو جیاوازی یە لە نێوان مالیکی یەکان کاتێ هەیە کە ئەو کەسە بەنیازی تەلاقەوە ئەو سوێندە نەخوات، بەڵام ئەگەر نیازی تەلاقی هەبوو وە سوێندەکەی خست, هەر کەفارەتی سوێندی لەسەر ئەبێت لایان, وە ئێمە ڕای ئەبهەری پێش ئەخەین، کە هەر کەس بەو شێوە سوێند بخوات تەنها تۆبەو پەشیمان بوونەوەی لەسەرە.

## تەلاق دان بەنامە

نووسین بەنامە تەلاقی پی ئەکەوێ, با نووسەرەکە توانای قسەکردنیشی هەبێت، وە وەك چۆن مێرد بۆی هەیە ژنەکەی بە لەفز تەلاق بدات, بۆی هەیە بە نوسینیش تەڵاقی بدات.

وە زانایان ئەوەیان بە مەرج داناوە: کە ئەبێت نوسینەکە ڕوون کراوەو نوسراوە بێت، وە مەبەست بە ڕوون کراوە ئەوەیە کە ئاشکرا بێت بە جۆرێك لە لاپەڕەیەکدا یا وێنەی ئەوەدا بخوێنرێتەوە.

وە مەبەست بە نوسراوە ئەوەیە: کە بە ناونیشانی ژنەکە نوسرابێت وەك ئەوەی بۆی بنوسێ: ئەی فلانە کەس، تۆ تەلاقت کەوتبێ، بەڵام ئەگەر بەو ناونیشانە نەنووسرابوو بۆ وێنە نووسرابوو: تۆ تەلاقت کەوتبێ، یا ژنەکەم تەلاقی کەوتبێ, ئەو شێوەیە تەلاقی پێ ناکەوێ ئەگەر نیازی لەگەڵدا

نەبێت, چونکە لەوانەیە ئەو نووسینەی بە مەبەستی تەڵاق دان نەبوبێت. یا بۆ خەت جوانی نووسیبێتی.

## ئیشارەتی کەڕو لاڵ

ئیشارەت کردن بە نیسبەت کەڕو لاڵەوە ئامرازی تێگەیاندنە، لەبەر ئەوە جێگەی لەفز ئەگرێتەوە لە تەڵاق خستندا، ئەگەر ئیشارەتێکی کرد ئەوە بگەیەنێت کە مەبستی کۆتایی هێنان بێت بە پەیوەندی ژنو مێردایەتی.

وە هەندێ لە زانایان مەرجی ئەوەیان داناوە کە نابێت ئەو کەسە لەنووسین بزانێتو توانای نووسینی هەبێت، چونکە ئەگەر نوسینی زانی و توانای نوسینی هەبوو ئیشارەت بەس نیە، چونکە نووسین زیاتر بەڵگەیە لەسەر مەبەست، کەواتە واز لە نووسین ناهێنرێ بۆ ئیشارەت مەگەر لەبەر پێویست نەبێت، یا توانای نوسینی نەمێنێ.

## ناردنی نێرراو

دروستە کەسێك بنێررێ کەرابگەیەنێت بە ژنە غائیبەکەی، کە تەڵاق دراوەو تەڵاقی کەوتووە, وە نێرراوەکە جێگەی تەڵاق دەر ئەگرێتەوە لەو حاڵەتەدا و تەڵاقەکەش ئەکەوێ.

## شایەت گرتن لەسەر تەڵاق

جەماوەری زانایانی پێشین و دوایین (سەلەف و خەلەف) بۆ ئەوە چوون کە تەڵاق ئەکەوێ بێ شایەتی، چونکە تەڵاق مافێکە لە مافەکانی پیاو، پێویستی بە شایەتی نیە بۆ ئەوەی مافی خۆی بەکار بهێنێ، وە نە لەپێغەمبەر ﷺ وە نە لەصەحابەوە شتێك نەهاتووە کە بەڵگە بێت لەسەر مەشروعیەتی شایەت گرتن لە تەڵاقدا.

وە زانایانی شیعەی ئیمامی پێچەوانەی ئەوەن و ووتویانە: شایەت مەرجێکە بۆ ڕاستی تەڵاق، وە بەڵگەشیان هێناوەتەوە بە فەرموودەی خوای گەورە کە فەرمویەتی: ﴿وَأَشْهِدُوا ذَوَيْ عَدْلٍ مِنْكُمْ وَأَقِيمُوا الشَّهَادَةَ لِلَّهِ﴾ (الطلاق: من الآية٢), واتە: وە دوو شاهیدی دادپەروەر بگرن لەخۆتان، وە بۆ خوا ئەو شاهیدیە بدەن.

(طبرسي) باسی ئەوەی کردووەو دەڵێ: لە ڕواڵەتدا فەرمانە بەگرتنی شایەت لەسەر تەڵاق، وە ئەوەش لە ئیمامەکانی ئالی بەیت گێڕراوەتەوە (خوا لێیان ڕازی بێت) کە ئەو فەرمانە بۆ پێویست بوونەو مەرجە بۆ ڕاستی تەڵاق[1].

---

(١) تفسير الآلوسي، سورة الطلاق، ويراجع اصل الشيعة.

**ئەو کەسانەی بۆ ئەوە چوون کە شایەت گرتن پێویستە لەسەر ژن تەڵاق دان و نەکەوتنی تـەڵاق بەبێ بەڵگە:**

ئەوانەی بۆ ئەوە چوون شایەت گرتن لەسەر تـەڵاق پێویـستەو مـەرجی کەوتنیـەتی لـە صـەحابە: ئەمیری موسڵمانان عەلی کوڕی ئەبی طالیب و عیمرانی کوڕی حوصەین (خوا لێیان ڕازی بێت) وە لە تابیعیەکان: ئیمام موحەممەدی باقرو ئیمـام جەعفـەری صـادق و کوڕەکانیـان، ئیمامـەکانی ئالی بەیت (ڕەزای خوایان لێ بێت) وە هەروەها (عطاء) و ئیبنوجورەیج و ئیبنوسیرین (ڕەحمـەتی خوایان لەسەر) وە لە کتێبی (جواهر الکلام)دا هاتووە لـە عەلیـەوە خـوا لـێی ڕازی بێت، بەو کەسەی فەرمووە کە پرسیای تەڵاقی لـێ کرد: (ئایا دوو پیاوی دادپەروەرت گرتووە بە شـاهید وەك خوای گەورە فەرمانی داوە؟ ئەویش ووتویەتی: نەخێر, فەرموی: برۆ تەڵاقەکەت تەڵاق دان نیە).

وە ئەبو داود لە سوننەنەکەیدا گێڕاویەتیەوە لە عیمرانی کوڕی حوصەینەوە خوا لێی ڕازی بێت کە پرسیاری لـێ کرا دەربارەی پیاوێك ژنەکەی تەڵاق بدات, وە بیگێڕێتەوە, وە شـایەت نـەگرێ نـە لەسەر تەڵاقەکەو نە لەسەر گێڕانەوەکە، فەرموی: نە تەڵاقەکەت لە سەر سوننەتە و نە گێڕانەوەکەت لەسەر سوننەتە، شایەت لەسەر تەڵاق و گێڕانەوەکەی بگرەو دووبارەی نەکەیتەوە[1].

وە لـە ئوصـولدا بڕیـار دراوە: کـە قـسەی صـەحابی کـە بڵێـت: لـە سـوننەتدا وەهایـە، حـوکمی حەدیسێکی هەیە کە ڕەفع بکرێت بۆ لای پێغەمبەر ﷺ لەسەر قەولی صەحیح، چونکە هەر ئەوە بە ڕوتی ڕواڵەتەکەی ئەگەڕێتەوە بۆ ئەو کەسەی کە پێویستە شوێن ڕەفتاری بکـەوین کـە پێغەمبـەرە ﷺ، چونکە مەبەستی صەحابی ڕوونکردنەوەی شەرعە، نەك بۆ لوغەت و عادەت، وەك لە شوێنی خۆیدا روون کراوەتەوە, حافظی سیوطی لە (الدر المنثور)دا تەخریجی کردووە لە تەفسیری ئایـەتی: ﴿فَـإِذَا بَلَغْـنَ أَجَلَهُـنَّ فَأَمْـسِكُوهُنَّ بِمَعْـرُوفٍ أَوْ فَـارِقُوهُنَّ بِمَعْـرُوفٍ وَأَشْـهِدُوا ذَوَيْ عَـدْلٍ مِـنْكُمْ﴾ (الطلاق: من الآية٢).

واتە: کاتێك ژنە تەڵاق دراوەکان نزیك بوونەوە لە کۆتایی عیـددەکانیان، یـان گێڕنـەوە لەگـەڵ جوان ڕەفتار کردن لەگەڵیانا، یان لێیان جیابنـەوە لەگـەڵ جێبـەجێ کردنـی مافیـان، وە شـایەت بگرن لەسەر گێڕانەوەکە یان جیابونەوەکە دوو پیاوی عادل لەخۆتان.

لە عبدالرزاق ەوە لە ئیبنو سیرینەوە کە پیاوێك پرسیاری کرد لـە عیمرانـی کـوڕی حوصـەین, دەربارەی پیاوێك ژنەکەی تەڵاق دابێت و کەسـی نـەگرتبێ بـە شـایەت، وە گێڕابێتیـەوەو کەسـی

---

(١) أبو داود (٢١٨٦) وابن ماجه (٢٠٢٥).

نەگرتبێ بە شایەت، ئەویش فەرمووی: شتێکی خراپی کردووە, تەڵاقدانەکەی بیدعە بووەو گێڕانەوەکەشی هەر بیدعە بووە، با شایەت بگرێ لەسەر تەڵاق دان و گێڕانەوەکەی و داوای لێبووردن بکات لە خوا.

جا ئینکاری کردنی ئەو کارە لە عیمرانەوەو بە خراپ دانانی و فەرمان کردنی بە تۆبە و داوای لێبووردن چونکە وای داناوە کە سەرپێچی فەرمانی خوایە، تەنها لەبەر ئەوە بووە کە شایەت گرتن بەلای ئەوەوە ڕەزای خوای لێ بێت پێویست بووە وەك دەرئەکەوێ.

وە لە کتێبی (الوسائل)دا هاتووە لە ئیمام ئەبی جەعفەری باقرەوە (ڕەحمەتی خوای لەسەر بێت) کە ووتویەتی: ئەو تەڵاقەی خوا لە قورئاندا فەرمانی پێداوە و پێغەمبەر ﷺ داینـاوە, ئەوەیـە کـە پیاو نابێت بچێت بەلای ژنەکەدا دووای پاك بوونەوە لە بێ نوێژی، ئینجا دوو شایەتی عادل بگرێ و تەڵاقی بدات، وە لەو کاتەدا ئافرەتەکە پاك بێت و پیاو نەچووبێتە لای, ئەوکاتـە پیاوەکـە مـافی ئەوەی هەیە بیگێڕێتەوە بەمەرجێ سێ بێنوێژی بەسەردا نەهاتبێ، وە هەموو تەڵاقێك بەو شێوەیە نەبوو بەتاڵە و تەڵاق نیـیە,

جەعفەری صادق ڕەحمەتی خوای لەسەر ووتویەتی: هەر کەس بێ شاهید ژن تەڵاق بدات, تەڵاقەکەی هیچ نیـیە,

(سید مرتضى) لە کتێبی (الإنتصار)دا ووتویەتی: بەڵگەی ئیمامی یەکان لەو قسەیەدا کە ئەڵێن دوو شاهیدی ڕاستگۆ مەرجە لە کەوتنی تەڵاقدا، وە هەر کاتێ شاهید نەبوو تەڵاقەکە ناکەوێ، فەرمودەی خوای گەورەیە کە ئەفەرموێ: ﴿وَأَشْهِدُوا ذَوَيْ عَدْلٍ مِنْكُم﴾ (الطلاق: من الآیة٢) واتە: دوو کەسی ڕاستگۆ لەخۆتان بگرن بە شاهید,

خوای گەورە بەگرتنی شاهید فەرمانی داوە, وە ڕواڵەتی فەرمان لە عورفی شەرعدا بۆ واجب بوونە وە هەڵگرتنی ئەوەی کە ڕواڵەتەکەی واجب بوونە بۆسەر پەسەندی، دەرچوونە لە عورفی شەرع، بەبێ بەڵگە،

وە (سیوطي) لە (الدر المنثور)دا تەخریجی کردووە لە (عبدالرزاق)ەوە, وە لە عەبدی کوڕی حومەیدەوە لە عەطائەوە کە ووتوویەتی: هێنانی ژن بە شاهید نەبێت, تەڵاق دانی بە شاهید ئەبێ، وە گێڕانەوەشی بە شاهید ئەبێ، وە ئیمام ئیبنو کەثیر لە تەفسیرەکەیدا ئەگێڕێتەوە لە ئیبنوجورەیجەوە کە عەطاء ئەی ووت: دەربارەی فەرموودەی خوای گەورە: ﴿وَأَشْهِدُوا ذَوَيْ عَدْلٍ مِنْكُم﴾ (الطلاق: من الآیة٢) دروست نیـیە, نیکاح و تەڵاق و گێڕانەوە بێ دوو شایەتی ڕاستگۆ وەك خوای گەورە فەرموویەتی، مەگەر بەهانەی شەرعی هەبێت.

وە ووتەکەی: (دروست نیيە) ڕاست و ڕێکە بۆ پێویست بوونی شاهید گرتن لەسەر تەڵاق لای ئەو، خوا لێی ڕازی بێت, لەبەر یەکسان بوونی لەگەڵ نیکاحدا, کە ئاشکرایە چی کراوە بە مەرج بۆ مارەکردن, جا کاتێك بۆت ڕون بوەوە کە پێویستی شایەت گرتن لەسەر تەڵاق مەزهەبی ئەو صەحابە و تابیعیيانەیە کە باس کران، بۆت دەرئەکەوێت ئەوەی ووتراوە کە ئیجماع لەسەر پەسەندیەتی هەیە و نەقڵ کراوە لە هەندێ کتێبی شەرعەوە, مەبەست ئیجماعی مەزهەبیيە, نەك ئەو ئیجماعە ئوصولیيە کە پێناسەکەی ـ وەك لە (المستصفی)دا هاتووە ـ ڕێك کەوتنی ئوممەتی محمدە ﷺ بەتایبەتی لەسەر فەرمانێك لە فەرمانە ئاینیيەکان, لەبەر هەڵوەشانەوەی بە جیاوازی و بە موخالەفەکردنی ئەوانەی باس کراون, لە صەحابەو تابیعی و ئەوانەی دووای ئەوان هاتوون لە زانا موجتەهیدەکان,

وە دەرئەکەوێ لەوەوە کە نەقڵمان کردووە لە سیوطی و ئیبنو کەثیرەوە: کە پێویست بوونی شاهید گرتن تەنها بۆچونی زانایانی ئالی بەیت نەبووە (علیهم السلام) وەك سەییدمرتضی لە کتێبی (الإنتصار)دا نەقڵی کردووە، بەڵکو مەزهەبی عەطاء وئیبنو سیرین و جورەیجیشە، وەك باسمان کرد.

**بەجێ هێنان و هەڵواسین (التنجیز والتعلیق)**

داڕشتەو صیغەی تەڵاق: یا بەجێهاتووە، یا هەڵواسراوە، یا خراوەتە پاڵ داهاتوو. بەجێ هاتوو: ئەو صیغەیەیە کە نەبەسراوە بە مەرجێکەوە و نەدراوەتە پاڵ داهاتوو, بەڵکو مەبەستی تەڵاق خۆرەکە تەڵاق کەوتنە دەم و دەست, وەك ئەوەی بڵێت بە ژنەکەی: تۆم تەڵاق دا یان تەڵاقت کەوتبێ

وە حوکمی ئەو تەڵاقە ئەوەیە، کە دەم و دەست ئەکەوێت کاتێ لە دەمی پیاوەکەوە هاتە دەرەوە, وە بە ژنێکی بڵێت کە جێی تەڵاق بێت و پیاوەکەش ئەهلی تەڵاق بێت.

بەڵام هەڵواسراو یا بەستراوە: ئەوەیە کە پیاو کەوتنی تەڵاقەکە ئەبەستێ بە بەدی هاتنی مەرجێکەوە، وەك ئەوەی کە پیاوەکە بە ژنەکەی بڵێت: ئەگەر بچیت بۆ فڵان شوێن تەڵاقت کەوتبێ.. وە بۆ دروست بوونی هەڵواسینی تەڵاق و کەوتنی پێی سێ مەرج هەیە:

(یەکەمیان) ئەبێ لەسەر شتێك نەبوو بێت کە لەوانەبێ دووایی ئەو شتە پەیدا ببێت, جا ئەگەر لەسەر کارێکیوا بوو کە کاتێ صیغەی تەڵاقەکە دەرچوو هەبووبێت, وەك ئەوەی بڵێت: ئەگەر ڕۆژ بووەوە تەڵاقت کەوتبێ، وە لەواقیعدا ڕۆژ بووبێتەوە- ئەوە ئەو تەڵاقە تەڵاقی بەجێ هاتوە، هەرچەند بەشێوەی تەعلیق هاتووە

بەڵام ئەگەر تەڵاقەکە لەسەر شتێك بێت کە هەرگیز نەبێت، ئەوە ئەو تەڵاقە لەغوە، وەك ئەوەی بڵێت کاتێك حوشتر چوو بە کونی دەرزیدا تۆ تەڵاقت کەوتبێ.

(دووەم)ئەبێ کاتێ تەڵاقەکە ئەووترێ ژنەکە جێگەی تەڵاق بێت، بەم شێوەیە پیاوەکە خاوەنی ژنەکە بێت.

(سێیەم) ئەبێ ژنەکە هەر بەوشێوەیە بێت کاتێ ئەو شتەی کە تەڵاقەکەی پێوە هەڵواسرا پەیدابوو.

هەڵواسین (تعليق) دوو بەشە:

(بەشی یەکەم)مەبەستی لە تەڵاقەکە مەبەستی سوێند بێت کە وا لە ژنەکە بکات کارێك بکات یا کارێك واز لێ بهێنێت, یا تەئکید لەسەر هەواڵێك بکات: وە ئەوە پێی ئەڵێن هەڵواسینی سوێندی- وەك ئەوەی بە ژنەکەی بڵێت: ئەگەر لە ماڵ بچیتە دەرەوە تەڵاقت کەوتبێ, لێرەدا مەبەستی لەوەیە کە ڕێ لە ژنەکە بگرێ نەچێتە دەر، نەك خستنی تەڵاقی.

(بەشی دووەم) مەبەستی ئەوە بێت کاتێ مەرجەکە بەدی هات تەڵاقەکە بکەوێ, ئەمەشیان پێی ئەووترێ هەڵواسینی مەرجی؛ وەك ئەوەی بە ژنەکەی بڵێت: ئەگەر لە مارەیی‌یە دووا خراوەکەت گەردنم ئازاد کەی تەڵاقت کەوتبێ, ئەو دوو جۆرە هەڵواسینە تەڵاقی پێ ئەکەوێ لای جەماوەری زانایان، بەڵام ئیبنو حەزم ڕای وەهایە ئەو تەڵاقە ناکەوێ,

ئیبنو تەیمیە و ئیبنو قەییم ئەوەیان ڕوون کردۆتەوەو فەرموویانە: بەڕاستی تەڵاقی هەڵواسراو ئەوەی کە واتای سوێند ببەخشێ ناکەوێ, وە ئەو کەسە کەفارەتی سوێندی لەسەر ئەبێت, کاتێ ئەوەی سوێندەکەی لەسەر خواردووە بەدی بێت, کەفارەتەکەش خواردن دانە بە دە هەژار، یا پۆشاکیان، ئەگەر ئەوانەی نەبوو ئەبێ سێ ڕۆژ بە ڕۆژوو بێت, وە دەربارەی تەڵاقی مەرجی فەرموویانە: ئەو تەڵاقە ئەکەوێ کاتی بەدی هاتنی ئەو شتەی تەڵاقەکەی پێوە هەڵواسیوە.

ئیبنو تەیمیە فەرموویەتی: وە ئەو لەفزانەی خەڵك بەکاری ئەهێنن لەتەڵاقدا سێ جۆرە:

(یەکەم) صیغەی دارشتەکەی بەجێ هێنان و بەرەڵلا کردن (التنجيز والإرسال) وەك ئەوەی بڵێت: تەڵاقت کەوتبێ، ئەو شێوەیە تەڵاقی پێ ئەکەوێ، و سوێندخواردن نیە، وە کەفارەتیشی لەسەر نیە بە ڕێکەوتنی زانایان.

(دووەم) صیغەی هەڵواسین (التعليق)، وەك ئەوەی بڵێت: تەڵاقم کەوتبێ فلان شت ئەکەم، ئەو شێوەیە سوێندە بە ڕێکەوتنی ئەهلی لوغەت، وە بەڕێکەوتنی کۆمەڵانی زانایان و (عامة).

(سێیەم) صیغەی هەڵواسینەکە وەك ئەوەی بڵێت: ئەگەر ئەگەر فلان کارم کرد ئەوە تەڵاقم کەوتبێ، ئەو شێوەیە ئەگەر مەبەست لێی سوێند بێت، و تەڵاق کەوتنی لا ناخۆش بێت، وەك چۆن لەدین هەڵگەڕانەوەی لاناخۆش بێت، ئەوە سوێندە، حوکمەکەی حوکمی یەکەمە، کە صیغەی سوێندە بەرێکەوتنی زانایان.

وە ئەگەر بیەوێ ئەو شتەی تەڵاقەکەی پێوە هەڵواسیوە بێتە دی لەکاتی مەرجەکەدا، ئەوە سوێندی نەخواردوە، وەك ئەوە بڵێت: ئەگەر هەزار دینارم بدەیتێ تەڵاقت کەوتبێ، وە ئەگەر زینات کرد تەڵاقت کەوتبێ، وە مەبەستی تەڵاق دانی بێت کاتێك داوێن پیسی بکات، نەك تەنها سوێند خواردن، ئەوە سوێند نیيە، وە لەسەر ئەوە کەفارەتی ناکەوێتە سەر لای هیچ کەس لە زانایان کە ئێمە بیانزانین، بەڵکو تەڵاقی پێ ئەکەوێ. ئەگەر مەرجەکە هاتەدی.

وە ئەوە صیغەیەی مەبەست پێی، هاندان، یا قەدەغە لێکردن، یا باوەڕ پێ کردن، یا بە درۆخستنەوە بێ، کە ئەگەر پێچەوانەی ئەوەی کرد شتێکی بەسەرا بسەپێنرێ، کە لای ناخۆش بێ ڕوویدات، جا بە صیغەی سوێند بێت، یا صیغەی پاداشت، ئەوە سوێندە لای هەموو کەس عەرەب و غەیری عەرەب.

جا ئەگەر سوێند بوو سوێند تەنها دوو حوکمی هەیە: یا سوێندەکە دابەستراوە ئەبێ کەفارەتی بۆ بدات، یا دابەستراو نیيە، وەك ئەوەی سوێند بە دروست کراوەکانی خوا بخوات ئەوە کەفارەتی نادرێ، یا سوێندێکی پێکهاتووی ڕێك و پێکە بێ کەفارەتە، ئەو حوکمەش نە لەکتێبەکەی خوادا هەیە، نە لەسوننەتی پێغەمبەرەکەیدا، ﷺ وە بەڵگەش لەسەری نیيە.

**ئەمما ئەو صیغەیەی درابێتە پاڵ داهاتوو:**

ئەو جۆرەیە کە بەرابەر کرابێت بە کاتێکەوە، بە مەبەستی کەوتنی تەڵاقەکە لەو کاتەدا، هەر کاتێ هات، بۆ نموونە پیاوەکە بە ژنەکەی بڵێت: بەیانی تەڵاقت کەوتبێ، یان سەری ساڵ تەڵاقت کەوتبێ، ئەو تەڵاقە بەیانی یا سەری ساڵ ئەکەوێ، ئەگەر ژنەکە ژنی بوو کاتی هاتنی ئەو وەختە کە تەڵاقەکەی خراوەتە پاڵ.

وە ئەگەر بە ژنەکەی بڵێت: تا ساڵێك تەڵاقت کەوتبێ. ئەبو حەنیفە و مالیك ووتویانە دەم ودەس تەڵاقەکەی ئەکەوێ. وە شافیعی و ئەحمەد ووتویانە: هەتا ساڵەکە کۆتایی نەیەت تەڵاقەکەی ناکەوێت.

ئیبنوحەزم ووتویەتی: هەر کەس بڵێت: ئەگەر سەری مانگ هات تەڵاقت کەوتبێ، یا هەر کاتێکی وتبێ بەوە تەڵاقی ناکەوێ، نە ئێستا. وە نە ئەگەر سەری مانگ هات. بەڵگەش بۆ

سەلماندنی ئەوەیە: نە لە قورئاندا نە لە سوننەتدا نەهاتووە کەتەلاق بەوە بکەوێ, وە خوای گەورە فێری تەلاقی ژنی گوێزراوەو نەگوێزراوەی کردووین، ئەوەی تێدا نەبووە. ﴿وَمَنْ يَتَعَدَّ حُدُودَ اللَّهِ فَقَدْ ظَلَمَ نَفْسَهُ﴾ (الطلاق: من الآية١), واتە: هەر کەس زیادەڕەوی بکات لەو سنوورەی خوا بۆی داناوە ستەمی لە خۆی کردووە.

وە دیسانەوە، هەر تەلاقێك دەم و دەست نەکەوێ، محاڵە دوای ئەوە بکەوێ، لەکاتێکدا کەکاتی تەلاقدانەکە نەکەوتبێ.

### تەلاقی سوننی و تەلاقی بیدعی

تەلاق ئەبێت بە دوو بەش: تەلاقی سوننی‌و تەلاقی بیدعی.

تەلاقی سوننە: ئەوەیە کە تەلاقەکە لەسەر ئەو شێوەیە بێت کە یاسای ئیسلام بەباشی داناوە, ئەویش بەو جۆرەیە کە پیاو ژنە گوێزراوەکەی خۆی یەك جار تەلاق بدات، لە پاکیدا کە نەچووبێتە لای، بەپێی فەرموودەی خوای گەورە: ﴿الطَّلَاقُ مَرَّتَانِ فَإِمْسَاكٌ بِمَعْرُوفٍ أَوْ تَسْرِيحٌ بِإِحْسَانٍ﴾ (البقرة: من الآية٢٢٩), واتە: تەڵاقی دانراوی شەرعی ئەوەیە جارێك بێت کەلەدووای ئەوە تووانای گێڕانەوەی هەبێ، لەپاشان جارێکی‌ترە، کەگێڕانەوەیەکی تری بەدووادا هەبێت، لەپاش ئەوە پیاوەکە ئارەزووی خۆیەتی، ڕای ئەگرێ بەباشی، یا لێی جیائەبێتەوە بە باشی،

خوای گەورە ئەفەرمووێ: ﴿يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ إِذَا طَلَّقْتُمُ النِّسَاءَ فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ﴾ (الطلاق: من الآية١), واتە: ئەی پێغەمبەر ئەگەر ژنانتان تەلاقدا، تەلاقی‌یان بدەن, لەکاتێکدا کە بەرەو عیددەکەیان ئەچن واتە: ئەگەر بتانەوێ ژنەکانتان تەلاق بدەن، لەکاتێکدا بەرەو عیددە ئەچن تەلاقیان بدەن, بەرەوعیددە چوونیان ئەوەیە دووای ئەوەی لە بێنوێژی یا زەیستانی پاك بوونەوە, پێش ئەوەی پیاو بچێتە لایانەوە. حیکمەتی ئەوەش ئەوەیە ئەگەر ژن تەلاق درا لە کاتێکدا بێ نوێژ بێت لەو کاتەدا بەرەو عیددە ناچێت، لەبەر ئەوە عیددەکەی درێژە ئەکێشێ, چونکە ئەو بێ نوێژیانەی کە ماوەتەوە بۆی ناژمێرێ وبەوە زیانی پێ ئەگات.

وە ئەگەر لە پاکیەکدا تەلاقی بدات کە چووبێتە لای ئەو ژنە نازانێ سکی پڕ بووە یان نا، ئیتر نازانێ بەچی عیددەکەی دابنێت، بەبێ نوێژی یا بە دانانی سکەکەی؟.

لە نافیعەوە لە عبداللە ی کوڕی عومەرەوە خوا لێی ڕازی بێت: (کە ژنەکەی تەلاق دا لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ لەکاتێکدا کەژنەکەی بێ‌نوێژ بوو، عومەری کوڕی خەتتاب لەو بارەیەوە لەپێغەمبەری (صلى الله عليه وسلم) پرسی فەرمووی: (مره فليراجعها، ثمَّ ليمسكها حتّي تطهر،

ثم تحيض، ثم تطهر، ثم إن شاء أمسك بعد ذلك، وإن شاء طلّق قبل أن يَمَسَّ فتلك العدة التى أمر الله سبحانه أن تطلق لها النساء ).

واتە: پێی بڵێ با ژنەکەی بباتەوە لەپاشاندا لای بمێنێتەوە، هەتا پاك ئەبێتەوە، لەپاشاندا بێ نوێژ ئەبێتەوە، لەپاشاندا پاك ئەبێتەوە، ئینجا ئەگەر بیەوێ ڕای بگرێ، وە ئەگەر بیەوێ تەڵاقی بدات، پێش ئەوەی بچێتە لای. ئەوە ئەو عیددەیە کە خوا فەرمانی داوە ژنی تێدا تەڵاق بدرێ.

وە لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە: کە ئیبنو عومەر خوای لێ ڕازی بێت ژنەکەی تەڵاق دا بەیەکەم تەڵاق لەکاتێکدا کەئەو ژنە بێ نوێژ بوو، عمر ئەوەی بۆ پێغەمبەر ﷺ باس کرد، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (مره فليراجعها، ثم ليطلقها إذا طهرت، أو وهي حامل) أخرجه النسائي ومسلم وابن ماجة وأبو داود[1]. واتە: فەرمانی پێ بکە با بیگێڕێتەوە، لەپاشان کە پاك بووەوە، تەڵاقی بدات، یا کاتێك کە زگی پڕ بوو.

ڕواڵەتی ئەم فەرموودەیە، ئەوە دەر ئەخات کە تەڵاق دان لەو پاك بوونەوەیەی دووای بێ نوێژی کە تەڵاقی تێدا ئەکەوێ تەڵاقی سوننەتییە، نەك بیدعی،

وە ئەمەش مەزهەبی ئەبی حەنیفە و یەکێ لە ڕیوایەتەکانە لە ئەحمەدەوە، وە ڕوویەکە لە شافیعییەوە، وە بەڵگەیان هێناوەتەوە بە ڕواڵەتی فەرموودەکە، وە بەوەی کە قەدەغەکە تەنها لەبەر بێ نوێژییەکەیە، جا ئەگەر پاك بووەوە هۆی حەرامیەتەکە لاچووە، وەتەڵاقدان لەو پاك بوونەوەیەدا دروستە وەکو چۆن لەپاکییەکانی تردا دروستە،

بەڵام ڕیوایەتەکەی یەکەم کە ئەفەرمووێ (لەپاشاندا ڕای بگرێ هەتا پاك ئەبێتەوە، لە پاشاندا بێ نوێژ ئەبێتەوە و پاك ئەبێتەوە) زیادەیەکی تێدایە کە پێویستە کاری پێ بکرێ، خاوەنی (الروضة الندية) ووتویەتی: ئەو زیادەیە لە صەحیحی موسلیم و بوخاریشدا هەیە، کەواتە ئەوە لە هەردوو صەحیحدا هەیە لە دوو ڕووەوە لەپێشترە، وە ئەوەش مەزهەبی ئەحمەدە لە یەکێ لە ڕیوایەتەکانیدا، وە مەزهەبی شافیعییە لە ڕوویەکی ترەوە، وە هەروەها مەزهەبی ئەبو یوسف و محمدە.

**تەڵاقی بیدعی:**

تەڵاقی بیدعی، ئەو تەڵاقەیە کە پێچەوانەی تەڵاقی شەرعییە: وەك ئەوە کە بەیەك جار هەر سێ تەڵاقی بدات، یا هەرسێ تەلاقی بدات بە جیاجیا لەیەك دانیشتندا، وەك ئەوەی بڵێت: تەڵاقت

(١) أحمد (٢/٦و٢٦) والبخاري (٤٩٠٧و٥٢٥١) ومسلم (١٤٧١/١-١٤).

کەوتبێ، تەڵاقت کەوتبێ, تەڵاقت کەوتبێ, یا لە بێنوێژیدا یا لە زەیستانیدا تەڵاقی ئەدات، یا لەپاکی‌یەکدا تەڵاقی ئەدات کە چووبێتەلای، زانایان هەموو لەسەر ئەوەن کە تەڵاقی بیدعی حەرامە، ئەو کەسەش تاوان بارە کە دەیکات, وە جەماوەری زانایان بۆ ئەوە چوون کە ئەو تەڵاقە ئەکەوێت، ئەوانەشیان کردۆتە بەڵگە:

١-ئایەتە گشتی‌یەکانی قورئان تەڵاقی بیدعیش ئەگرێتەوە.

٢- روون کردنەوەی ئیبنو عومەر ڕەزای خوای لێ بێت، کاتێ ژنەکەی تەڵاق دا لە بێ نوێژیداو پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێ کرد بیگێڕێتەوە، کە ئەو تەڵاقەی بۆ حیساب کراوە.

وە هەندێ لە زانایان بۆ ئەوە چوون کە تەڵاقی بیدعی ناکەوێ. وە ڕێی ئەوەیان نەداوە کە بکەوێتە ژێر ئایەتە گشتی‌یەکانی قورئان، چونکە لەو تەڵاقانە نی‌یە کە خوا ڕێی پێداوە، بەڵکو لەو تەڵاقانەیە کە خوا بە پێچەوانەیانەوە فەرمانی داوە فەرموویەتی: ﴿فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ﴾ (الطلاق: من الآية١), واتە: کاتێ تەڵاقیان بدەن کە بەرەو عیددەکەیان ئەچن. وە پێغەمبەر ﷺ بە ئیبنو عومەری فەرموو: (مره فليراجعها) وە ڕیوایەتی صەحیح هاتووە کە پێغەمبەر تووڕە بوو کاتێ ئەوەی پێ گەیشت، وە پێغەمبەر ﷺ لە شتی حەڵاڵ تووڕە نەئەبوو،

وە ئەما قسەکەی ئیبنو عومەر کە فەرموویەتی: (تەڵاقێکی بۆ حیساب کرا، ڕوونی نەکردۆتەوە کێ بۆی حیساب کردووە, بەڵکو ئەحمەد و ئەبوداود و نەسائی تەخریجیان کردووە لێیەوە: (کە ژنەکەی تەڵاق داوە لەبێ نوێژیدا، پێغەمبەر ﷺ بۆی گێڕاوەتەوە و بەهیچی دانەناوە[1], وە ئیسنادی ئەم ڕیوایەتەیش صەحیحە, وە کەس نەهاتووە قسەیەکی خراپی لەسەر کردبێ. وە ڕیوایەتەکە بە ئاشکرا دەری ئەخات کە ئەو کەسەی تەڵاقەکەی بە هیچ دانەنا, پێغەمبەر بوو ﷺ، ئیتر قسەی ئیبنو عومەر ڕووبەڕووی ناوەستێ، چونکە بەڵگە لە ڕیوایەتەکەیدایە نەك لەڕایەکەیدا.

بەڵام ئەو ڕیوایەتەی کە ئەڵێت بە لەفزی (مره فليراجعها) وە بە یەك تەڵاق حیساب کراوە، ئەو ڕیوایەتە ئەگەر ڕاست بوایە ئەبووە بەڵگەیەکی ئاشکرا، بەڵام ڕاست نی‌یە وەك ئیبنو قەییم دووپاتی کردۆتەوە لە (الهدى)

وە لەو بارەیەوە چەند ڕیوایەت گێڕراوەتەوە بەڵام لە سەنەدەکانیاندا نە ناسراوو درۆزنی تێدایە، بەڵگەو حوججە بە هیچیان ناچەسپێ. والحاصل: ڕێك کەوتن هەیە لەسەر ئەوەی کەئەو تەڵاقەی

---

(١) أحمد (٢/١٠٢،٧٤،٦٤) وأبوداود (٢١٧٩و٢١٨٠) والنسائي (٦/١٣٧و١٣٨و٢١٢).

پێچەوانەی تەڵاقی سوننی بێت پێی ئەووترێ تەڵاقی بیدعی. وە لە پێغەمبەرەوە ﷺ چەسپاوە کە فەرموویەتی: (إن كل بدعة ضلالة)[1] واتە: بەڕاستی هەموو بیدعەیەك گومڕاییە.

هەروەها هیچ جیاوازی نییە کە ئەو جۆرە تەڵاقە پێچەوانەی ئەو تەڵاقانەیە کە خوا لە قورئاندا دایناوە, وە پێغەمبەر ﷺ ڕوونی کردۆتەوە لە حەدیسەکەی ئیبنو عومەردا، جا هەر شتێك پێچەوانەی ئەوە بێت کە خواو پێغەمبەرەکەی دایان ناوە ڕەت ئەکرێتەوە، بەپێی حەدیسەکەی عائیشە خوا لێی ڕازی بێت کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (كل عمل ليس عليه أمرنا فهو رد)[2] متفق عليه واتە: هەر کارێك فەرمانی ئێمەی لەسەر نەبێت ڕەت ئەکرێتەوە,

جا هەر کەس بڵێت ئەو بیدعەیە حوکمەکەی ئەسەپێت، وە ئەو شتەی کە فەرمانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لەسەری نەبێت ئەکەوێت لەسەر ئەو کەسەی کە ئەیکات و پێوەی ئەبەسترێتەوە, ئەوە لێی وەرناگیرێ بەبێ بەڵگە.

**ئەو کەسانەی بۆ ئەوە چوون کە تەڵاقی بیدعی ناکەوێ:**

ئەوانەی بۆ ئەوە چوون:

١- عبداللەی کوڕی عومەر.

٢- سعیدی کوڕی موسەییب.

٣- طاووس: لە هاوەڵانی ئیبنو عەبباس.

وە خەللاسی کوڕی عەمر و ئەبو قیلابە لە تابیعی‌یەکان هەر ئەوە ئەڵێن: وە لە هەڵبژێرراوی ئیمام ئیبنو عەقیلە لە پێشەواکانی حەنبەلی‌یەکان، وە ئالی بەیت، وزاهیری‌یەکان، وە یەکێ لە ڕووەکانی مەزهەبی ئیمام ئەحمەد. وە ئیبنو تەیمی‌یەش هەڵی بژاردووە.

**تەڵاق دانی ژنی دوو گیان:**

دروستە ژنی دووگیان تەڵاق بدرێ هەر کاتێ بێ, بەپێی ئەوەی موسلیم و نەسائی و ئەبو داود و ئیبنو ماجە ئەخریجیان کردووە کە ئیبنو عومەر ژنێکی تەڵاقێك دا کاتێ بێ نوێژ بووە، (عمر) ئەوە بۆ پێغەمبەر ئەگێڕێتەوە ﷺ ئەفەرمووێ: (مره فليراجعها, ثم ليطلقها إذا طهرت، أو وهي حامل), واتە: فەرمانی پێ بدە با بیگێڕێتەوە، لە پاشاندا تەڵاقی بدات کاتێ پاك بووەوە، یان کاتێ دوو گیان بێت

---

(١) أحمد (٤/١٢٧) وأبوداود (٤٦٠٧) والترمذي (٢٦٧٦) وابن ماجة (٤٣).

(٢) البخاري (٢٦٩٧) ومسلم (١٧١٨).

وە زانایان بۆ ئەوە چوون, بەڵام حەنەفییەکان تێیدا جیاوازن: ئەبو حەنیفە و ئەبو یوسف ووتویانە: لەنێوان هەردوو تەڵاقەکەدا ماوەی مانگێك دابنێ هەتا هەرسێ تەڵاقەکە دێتە جێ, محمد و زوفر ووتویانە: کاتێ ژنەکە دوو گیان بێت لە تەڵاقێك زیاتری ناکەوێ، ئیتر وازی لێ ئەهێنرێ هەتا منداڵەکەی ئەبێت، لەپاشاندا تەڵاقەکانی تر ئەدرێت.

**تەڵاقی (آیسة) هیوا بڕاو و منداڵ و لەبێ نوێژی وەستاوە:**

تەڵاق دانی ئەوانە ئەگەر یەك تەڵاق بێت تەلاقی سوننەتی ئەبێت، وە هیچ مەرجێکی تری بۆ دانانرێ لەوە زیاتر.

## ژمارەی تەڵاقەکان

ئەگەر پیاو ژنەکەی گوێزایەوە ئەبێتە خاوەنی سێ تەڵاق لەسەر ئەو ژنە, وە زانایان لەسەر ئەوە ڕێکن کە حەرامە پیاو بەیەك لەفز ئەو سێ تەڵاقەی بدات، یا بەچەند جار بەدووای یەکدا لەیەك پاکیدا تەڵاقی بدات، وە ئەوەیان وەها لێك داوەتەوە ئەگەر هەر سێ تەلاقەکەی بدات، ئەوە دەرگای پیاگەیشتن لەخۆی دائەخات لەکاتی پەشیمانیدا، وە موعارەزەی یاسادانەری ئیسلامی کردووە, چونکە ئەو بۆیە تەڵاقی بەچەند تەڵاق داناوە بۆ کاتی پەشیمان بوونە و پیاگەیشتن, و جگە لەوەش ئەوەی سێبەسێ ژنەکەی تەلاق دا، ئەوە زیان بەو ژنە ئەگەیەنێت لەو ڕووەوە کە جێگایەتی و مەحەل بوونی ئەو ژنەی پوچەڵ کردۆتەوە بەو سێ تەڵاقەی.

نەسائی ئەگێڕێتەوە لە حەدیثی محمودی کوڕی لەبیدەوە کە ووتویەتی: (بە پێغەمبەرمان ﷺ ڕاگەیاند کە پیاوێك ژنەکەی بەجارێك سێبەسێ تەڵاق داوە: بەتوڕەییەوە هەڵساو فەرمووی: (أيلعب بكتاب الله وأنا بين أظهركم, حتى قام رجل فقال: يارسول الله: أفلا أقتله)[1] واتە: بە کتێبەکەی خوا یاری ئەکرێ کە هێشتا من لەناوتانام، هەتا پیاوێك لەو لاوە هەستاو ووتی: ئەی نێراوی خوا نەی کوژم؟)

ئیبنوقەییم لە (إغاثة اللهفان)دا فەرموویەتی: بۆیە پێغەمبەر ﷺ ئەو کارەیبە یاری کردن بە کتێبی خوا دانا، چونکە پێچەوانەی شێوەی تەڵاق بووە, وە مەبەستی بە شتێك بوو کەخوا مەبەستی پیێ نەبوو، چونکە خوای گەورە مەبەستی ئەوە بوو تەڵاقێك بدات کەبتوانێ ژنەکەی بگێڕێتەوە، هەر کاتێ ویستی، بەڵام ئەو تەڵاقێکی داوە کە مەبەستی ئەوەیە نەتوانێ بیگێڕێتەوە, وە هەروەها سێ تەڵاقدان بەیەك جار پێچەوانەی فەرمودەی خوای گەورەیە کە فەرمویەتی: ﴿الطَّلَاقُ

---

(١) النسائي (٦/١٤٢).

مَرَّتَانِ﴾ (البقرة: من الآية٢٢٩), واتە: تەلاق دان دوو جارە. وە وشەی (مرتان) و (مرات) لە لوغەتی قورئان و سوننەتدا، بەڵكو لە لوغەتی عەرەب و هەموو خەڵكیدا، بۆ ئەوەیە كە جارێك لەدوای جارێك ئەبێت، جا ئەگەر هەردوو جارەكەی بە جارێك ووت: ئەوە زیادەڕەوی كردووە لە سنووری خواو لەوەی كە لەكتێبەكەیدایە. جا ئەو كەسە حاڵی چۆنە لە حوكمێكدا كە یاسادانەر مەبەستێكی هەبوبێت تێیدا، ئەمیش مەبەستی شتێك بێت كە پێچەوانەی مەبەستی یاسادانەر بێت؟! قسەكەی ئیبنو قەییم تەواو بوو.

وە لەكاتێكدا زانایان ڕێكەوتون لەسەر حەرامیەتی ئەو شێوەیە، جیاوازن لەوەدا ئەگەر بە لەفزێك سێ تەلاقەكەی بدات. ئایا تەلاقی ئەكەوێ یان نا؟.

وە ئەگەریش بكەوێ تەلاقێكی ئەكەوێ یان هەرسێكیان؟. جەماوەری‌زانایان بۆ ئەوە چوون كە ئەكەوێ[1].

وە هەندێكیان ڕایان وەهایە كە ناكەوێ, وە ئەوانەی ڕایان هەیە سەبارەت بە كەوتنی جیاوازن: هەندێكیان ئەڵێن: هەرسێ تەلاقەكەی ئەكەوێ.

وە هەندێكیان ئەڵێن: تەنها یەك تەلاق ئەكەوێ, وە هەندێكیان جیایان كردۆتەوەو ئەڵێن: ئەگەر ژنەكە گوێزرابووەوە هەرسێ تەلاقەكە ئەكەوێ، بەلام ئەگەر نەیگوێزابووەوە یەك تەلاقی ئەكەوێ، وە ئەوانەی دەڵێن كە هەرسێ تەلاقی پێ ئەكەوێ ئەمانەیان كردۆتە بەلگە:-

١- فەرمودەی خوای گەورە ﴿فَإِنْ طَلَّقَهَا فَلا تَحِلُّ لَهُ مِنْ بَعْدُ حَتَّى تَنْكِحَ زَوْجاً غَيْرَهُ ﴾ (البقرة: من الآية ٢٣٠), واتە: جا ئەگەر تەلاقی سێهەمی‌دا ئیتر بۆی حەلاڵ نیە, هەتا شوو بە پیاوێكی تر نەكات.

٢- وە فەرموودەی خوای گەورە: ﴿وَإِنْ طَلَّقْتُمُوهُنَّ مِنْ قَبْلِ أَنْ تَمَسُّوهُنَّ وَقَدْ فَرَضْتُمْ لَهُنَّ فَرِيضَةً﴾ (البقرة: من الآية٢٣٧), واتە: وە ئەگەر ژنانتان تەلاق دا پێش ئەوەی بچنە لایان، وە مارەیی‌تان بۆ دانابوون.

---

(١) ئەگەر پیاو بە ژنی خۆی وت بە مەرجێ گوێزابێتیەوە, تەلاقت كەوتبێ, تەلاقت كەوتبێ, تەلاقت كەوتبێ, ئەوە هەر یەك تەلاقە ئەگەر بەو نیازەوە ووتبێتی كە دووپاتی بكاتەوە یا بە نیازی هیچەوە نەیووتبێت. بەلام هەر سێ تەلاقەكە ئەكەوێ ئەگەر بەنیازی سێ تەلاقەوە ووتبێتی, وە هەر یەكەیان ئەوی تریان نیە, ئەوە لای ئەوانەی كە ڕایان وایە كەوتووە وەك لە پێشەوە جیاوازی‌یەكە باس كرا.

٣- فەرمودەی خوای گەورە ﴿لَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ إِنْ طَلَّقْتُمُ النِّسَاءَ﴾ (البقرة: من الآية٢٣٦)، واتە: تاوانبار نابن ئەگەر ژنانتان تەڵاق دا.

ڕواڵەتی ئەم ئایەتانە ڕاستی کەوتنی تەڵاقێك و دوان و سیان دەرئەخات، چونکە لە کەوتنەکاندا یەك و دوان و سیانی جیانەکردۆتەوە.

٤- فەرمودەی خوای گەورە ﴿الطَّلَاقُ مَرَّتَانِ فَإِمْسَاكٌ بِمَعْرُوفٍ أَوْ تَسْرِيحٌ بِإِحْسَانٍ﴾ (البقرة: من الآية ٢٢٩). واتە: ئەو تەڵاقەی کە گێڕانەوەی لەدووابێ دوو جارە، وە حوکمی خوا دوای هەریەکەیان یا ڕاگرتنیتی بەچاکی، یا بەرەڵاکردنێتی بە چاکی.

ڕواڵەتیئەم ئایەتە دروستی سێ بەسێ تەڵاقدان دەرئەخات، یا دوو تەڵاق بەجارێك، یا بەجیا جیا، وە کەوتنیشی.

٥- حەدیسی سەهلی کوڕی سەعد، فەرمویەتی: کاتێ براکەی بەنی عەجلان ژنەکەی مولاعەنە کرد ووتی: ئەی نێرراوی خوا ئەگەر ڕای گرم ستەمم لێ کردووە: ئەوە تەڵاقە، ئەوە تەڵاقە، ئەوە تەڵاقە. ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە[1].

٦- وە لە حەسەنەوە کە ووتویەتی: عبدالله ی کوڕی عومەر بۆی باس کردوین کە خۆی ژنەکەی تەڵاقێك دا بە بێنوێژی، لەپاشاندا ویستوویەتی دوو تەڵاقی تریش بدات، لە دوو بێ نوێژیدا، ئەوە گەیشتەوە بە پێغەمبەر، ﷺ فەرمووی: ئەی ئیبنو عومەر، خوا بەو شێوەیە فەرمانی پێ نەداویت! بەڕاستی تۆ سوننەتت هەڵە کردووە، سوننەت وەهایە کە بەرەو پاك بوونەوە بچێت لەهەر پاك بوونەوەیەکدا تەڵاقێکی بدەی. وە ووتی: پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێدام کە بیگێڕمەوە لەپاشاندا فەرمووی: کاتێ پاك بووەوە لەوکاتەدا تەڵاقی بدە یا ڕای بگرە، ئەڵێ: ووتم: ئەی نێرراوی خوا، ئایا ئەگەر سێ جار تەڵاقم دا، بۆم هەیە بیگێڕمەوە لای خۆم؟. ئەویش فەرموی: نەخێر. بەوە دەستی لێت ئەبێتەوەو ئەگەر بیگێڕیتەوە ئەوە تاوانە، دارقطني گێڕاویەتەوە[2].

٧- عبد الرزاق لەموصەننەفەکەیدا تەخریجی کردووە لە عوبادەی کوڕی صامیتەوە کە فەرمویەتی: باپیرم ژنێکی هەبوو هەزار تەڵاقیدا، ئەمیش چوو بۆ خزمەتی پێغەمبەر ﷺ ئەوەی بۆ باس کرد، پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: باپیرەت لەخوا نەترسا، ئەوە خاوەنی سێ تەڵاقە، وە

(١) أحمد (٥/٣٢٤) والبخاري (٥٢٥٩) ومسلم (١٤٩٢/١).

(٢) الدارقطني (٤/٣١).

نۆسەدو نەوەدو حەوتەکەی تری زیادڕەوی و ستەمکاری‌یە. خوا ئارەزووی خۆیەتی سزای ئەدات یا لی‌ی ئەبورێ.

وە لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە کە فەرمویەتی: بەڕاستی باوکت لە خوا نەترساوە هەتاوەکو دەری بۆ بکاتەوە. دەستی لە دەستی بۆتەوە بە سیانیان کە ئەویش لەسەر سوننەت نەبووە. وە نۆسەدو نەوەدو حەوتەکەی تر تاوانە لە گەردنیا.

٨- وە لە حەدیسەکەی روکانەدا هاتوە: کە پێغەمبەر ﷺ سوێندی‌دا کە لە یەك تەڵاق زیاتر مەبەستی نەبووە[١].

ئەویش بەڵگەی ئەوەیە کە ئەگەر سیان بوایە تەڵاق ئەکەوت. وە ئەوە مەزهەبی جەماوەری زانایانی تابیعی‌و زۆر لە صەحابەیە، وە مەزهەبی هەر چوار پێشەواکەیە.

بەڵام ئەوانەی وتویانە یەك تەڵاقی پێ ئەکەوێ، ئەمانەی لای خوارەوەیان کردۆتە بەڵگە:

(یەکەم) بەپێ‌ی ئەوەی موسلیم ئەگێڕێتەوە: کە ئەبو صەهباء بە ئیبنوعەبباسی وت: (ئایا نازانی کە سێ تەڵاقە بەجارێك یەك تەڵاق بوو لەسەردەمی پێغەمبەرو ئەبو بەکرو سەرەتای سەردەمی عومەر؟ فەرمووی: ئەزانم[٢].

وە هەروەها لێوەی ئەگێڕێتەوە فەرمویەتی: تەڵاق لەسەردەمی پێغەمبەرو ئەبوبەکرو دووساڵی عومەر، سێ تەڵاقە بەجارێك یەك تەڵاق بوو. جا عومەری کوڕی خطاب فەرموی: بەڕاستی خەڵك بەپەلەن لە کارێکدا کە بۆیان هەیە تێیدا پەلە نەکەن[٣] جا ئەگەر حوکمان بدایە لەسەریان، بە کەوتنی تەڵاقەکان، ئیتر حوکمی‌دا لەسەریان.

واتە ئەوان لەپێشدا یەك تەڵاقیان ئەخست لەجیاتی ئەوەی ئێستا خەڵکی سێ تەڵاقی پێ ئەخەن.

(دووەم) لە عیکریمەوە لە ئیبنو عەبباسەوە خوا لێیان ڕازی بێت فەرمویەتی: روکانە ژنەکەی خۆی سێ‌بەسێ لە کۆڕێکدا تەڵاقدا، لەپاشاندا زۆر بۆی غەمگین بوو. پێغەمبەر ﷺ پرسیاری لێ کرد چۆنت تەڵاق دا؟ ئەویش وتی: سێ‌بەسێ. فەرمووی: لەیەك کۆڕدا؟ وتی: بەڵێ، فەرموی:

---

(١) أبوداود (٢٢٠٦) والترمذي (١١٧٧) والشافعي (٢/٣٧) والدارقطني (٤/٣٣) وابن حبان (٤٢٧٤) والحاكم (٢/١٩٩).

(٢) مسلم (١٤٧٢/١٧).

(٣) مسلم (١٤٧٢/١٥).

ئەوە هەر یەك تەڵاقە, ئەگەر حەز ئەكەی بیگێڕەرەوە. ئەویش گێڕایەوە. ئەحمەدو ئەبو داود گێڕاویانەتەوە[1].

ئیبنوتەیمییە لە (فتاوی)دا (ج ٣ ص ٢٢) فەرمویەتی: لە بەڵگە شەرعییەكاندا (كتاب و سنة و إجماع و قیاس) دا شتێك نی‌یە كە پێویستی بكات تەڵاقی سیانی بەسەریەكەوە بكەوێ، و نیكاحەكەی هەر ئەمێنێ بە دڵنیاییەوە ژنەكەی حەرامە بە پیاوی دیكە بەبێ گومان, وە ئەگەر سێ تەڵاقەكە بكەوێ ئەوە حەڵاڵ ئەكرێ بۆ كەسێكی ترو حەرام ئەبێ بەو، وە ئەبێتە ڕێگا بۆ ئەوەی پەنا ببرێ بە مارەبەجاش، كە خواو پێغەمبەرەكەی حەرامیان كردووە, وە (مارە بەجاش) لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ دەرنەكەوتبو, وە هەروەها لە سەردەمی خەلیفەكاندا، وە هەرگیز نەقڵ نەكراوە ژنێك گێڕرابێتەوە لای مێردەكەی دوای كەوتنی سێ تەڵاق بە (مارە بەجاش)، بەڵكو پێغەمبەر ﷺ نەفرینی لەو پیاوە كردووە كەمارە بەجاش ئەكات و نەفرینی لەو كەسەش كردووە كە بۆی ئەكرێت, واتە ژنەكەی كە بەو شێوەیە بۆی حەڵاڵ ئەكرێتەوە, هەتا ئەوەی فەرمویەتی: بەگشتی هەرچی پێغەمبەر ﷺ دایناوە بۆ ئوممەتەكەی شەرعێكی لازمە, ناكرێ بگۆڕێ، چونكە لە دوای پێغەمبەر ﷺ هیچ شتێك ناسڕێتەوە (نسخ نابێتەوە).

وە ئیبنوقەییم قوتابی ئیبنوتەیمییە فەرمویەتی: بە صەحیحی هاتووە لە پێغەمبەرەوە ﷺ كە سێ بەسێ تەڵاق دان بەیەك جار بە یەك تەڵاق دانراوە لەسەردەمی ئەودا, وە هەروەها لەسەردەمی ئەبوبەكرو سەرەتای سەردەمی عومەر خوایان لێ ڕازی بێت, وە ئەوپەڕی ئەوی دابنرێت لەمەدا هەرچەندە دوریشە كە گوایە صەحابەكان لەسەر ئەوەبوون و نەگەیشتۆتەوە بە پێغەمبەر، ﷺ ئەمەش هەرچەندە وەك موستەحیل وایە, بەڵگەی ئەوەیە كە ئەوانیش لەسەردەمی پێغەمبەر ﷺ و لەسەردەمی ئەبوبەكریش دا هەر بەوە فەتوایان داوە، كە تەڵاقی سێ‌بەسێ بە یەك جار دائەنرێت, وە پێغەمبەریش ﷺ هەر بەو شێوەیە فەتوای داوە، ئەوەش فەتواكەیەتی وەكاری صەحابەكانیش وەك ئەوە بووە كە دەست بەدەست وەریان گرتبێ بەبێ موعارەزە.

بەڵام عومەر ڕای وابووە كە وا لە خەڵك بكرێت سێ بە سێ‌كەیان بەیەك جار جێ‌بەجێ بكات وەك سزایەك بۆیان، بۆ ئەوەی خەڵك بەجارێك سێ‌بەسێ تەڵاق نەخۆن، ئەوەش ئیجتیهادێك بووە لە خۆیەوە (خوا لێی ڕازی بێت), بە مەبەستی ئەوەی كە ڕەوا بێت لەبەر بەرژەوەندیەك كە زانیویەتی. ئیتر پێویست ناكات كە واز لەوە بهێنرێت كە پێغەمبەر ﷺ فەتوای لەسەر داوەو صەحابە لەسەر

---

(١) أحمد (١/٢٦٥) وأبوداود (٢٢٠٦).

دەمی خۆی و جێنشینەکەیدا لەسەری بوون, جا گەر ڕاستیەکان دەرکەوتن خەڵك چی ئەڵێن با بیڵێن، وە سەرکەوتن هەر بەخوایە.

وە شەوکانی ووتویەتی: خاوەنی کتێبی (البحر)یش ئەوەی گێڕاوەتەوە لە ئەبی موساوە، وە ڕیوایەتێك لە عەلیەوە, وە لە ئیبنوعەبباس و طاوس و عەطاء و جابیر و ئیبنو زەید و هادی و قاسم و باقر و ئەحمەدی کوڕی عیسا و عبد اللّٰه‌ی کوڕی موسای کوڕی عبدالله و ڕیوایەتێك لە زەیدی کوڕی عەلیەوە.

هەروەها کۆمەڵێك لە زانایانی دوایین لەوانە: ئیبنوتەیمیە و ئیبنوقەییم و کۆمەڵێك لەزانا لێکۆڵەرەوەکان، وە ئیبنوموغیث لە کتێبی (الوثائق)دا ئەوەی نەقڵ کردووە لە موحەممەدی کوڕی وەضاحەوە, وە ئەو فەتوایەی کە لەو بارەیەوە دراوە لە کۆمەڵێك زانایانی قورطوبەوە, نەقڵی کردووە، وەك موحەممەدی کوڕی بەقی و موحەممەدی کوڕی عبدالسلام و جگە لەوان, هەروەها ئیبنومونذیر لە هاوەڵانی ئیبنوعیساوە نەقڵی کردووە, وەك عەطاء و طاوس و عومەر و ئیبنودینار, وە ئیبنوموغیث گێڕاویەتەوە هەر لەو کتێبەدا لە عەلیەوە خوا لێی ڕازی بێت، وە هەروەها لە ئیبنو مەسعود و عبدالرحمن ی کوڕی عەوف و زوبەیرەوە خوا لێیان ڕازی بێت. وە ئەمڕۆ لە دادگاکانیشدا هەر بەوە کار دەکرێ.

بەڵام بەڵگەی ئەوانەی ئەڵێن تەڵاق هەرگیز بەوە ناکەوێ: چونکە تەڵاقی بیدعەییە, وە تەڵاقی بیدعەیی لای ئەوان ناکەوێ و بە لەغو دائەنرێ.

وە ئەو بۆچوونەش لە هەندێ تابیعیەوە ئەگێڕرێتەوە، وە گێڕراوەتەوە لە ئیبنو عەلییە و هیشامی کوڕ حەکەم, وە ئەبو عوبیدەو هەندێك لە ظاهیریەکان بەوە گفتیان داوە, وە مەزهەبی باقر و صادق و ناصر و هەموو ئەوانەیە کە ئەڵێن تەڵاقی بیدعەیی ناکەوێ، چونکە سیان بە یەك لەفز یا چەند لەفزێکی بەدوا یەکدا هاتووە لە تەڵاقی بیدعیە. بەڵام ئەوانەی ژنیگوێزراوەو نەگوێزراوە لەیەك جیائەکەنەوە کۆمەڵێك لە هاوەڵانی ئیبنوعەبباس و ئیسحاقی کوڕی ڕاهەویهە.

**تەڵاقی بڕاوە (البتة)**

ترمذي ووتویەتی: زانایانی صەحابەو زانایانی تریش جیاوازییان هەیە دەربارەی تەڵاقی بڕاوە (البتة), لە عومەری کوڕی خەططابەوە گێڕراوەتەوە: کە (البتة)ی کردووە بە یەك تەڵاق, وە لە عەلیەوە گێڕراوەتەوە: کەبەسێ تەڵاقی داناوە. هەندێ لە زانایان ووتویانە: بەگوێرەی نیازی پیاوەکەیە, ئەگەر نیازی یەك تەڵاق بێت یەك تەڵاق ئەبێت، ئەگەر نیازی سیان بێت سیانە، وە ئەگەر نیازی دووان بێت هەر یەك تەڵاق ئەبێت, ئەمەش قەولی ثەوری و ئەهلی کوفەیە. مالیکی

کوڕی ئەنەس دەربارەی (ألبتة) ووتویەتی: ئەگەر گوێزراوە بوو ئەوە سێ تەڵاقە. وە شافیعی ووتویەتی: ئەگەر نی‌یەتی تەڵاقێکی هێنا هەر یەك تەڵاق ئەبێت و مافی گێڕانەوەی ئەبێت، وە ئەگەر بەنیازی دووانەوە بێت دووانە، وە ئەگەر بەنیازی سیانەوە بێت سیانە.

### تەڵاقی ڕەجعی‌و بائین

تەڵاق یا ڕەجعی‌یە یا بائینە: بائینیش یا بائینی بچووکە، یا بائینی گەورەیە، وە بۆ هەر یەکە لەوانە حوکمی تایبەتی خۆی هەیە لەخوارەوە باسی ئەکەین:

تەڵاقی ڕەجعی: ئەوەیە پیاو تەڵاقێکی ژنەکەی بدات ئەو ژنەی پیاوەکەی بەڕاستی چووبێتە لای، بێ ئەوەی ئەو تەڵاقە لە موقابیلی ماڵدابێت، وە تەڵاقی تری لەپێشدا نەخرابێت، یا هەریەك تەڵاقی لەپێش داخرابێت. جا تەڵاقەکە ئاشکرا بێت یا بەکینایەت جیاوازی نی‌یە,

بەڵام ئەگەر پیاوەکە نەچووبێتە لای ژنەکەی بەچوونی حەقیقی، یا لەسەر ماڵ تەڵاقی دابێت، یا تەڵاقەکە تەواوکەری سێ تەڵاقەکە بێت, ئەوە ئەو تەڵاقە بائینە

بنەمای ئەمەش فەرموودەی خوای گەورەیە کەئەفەرمووێ: ﴿الطَّلَاقُ مَرَّتَانِ فَإِمْسَاكٌ بِمَعْرُوفٍ أَوْ تَسْرِيحٌ بِإِحْسَانٍ﴾ (البقرة: من الآية٢٢٩) واتە: تەڵاقێك توانای گێڕانەوەی تیدابێت دووانە, جا لەدووای هەریەکەیان یا بەچاکی ڕای ئەگرێ یا بە باشی وازی لێ ئەهێنێ لەگەڵ جێبەجێ کردنی مافەکانی.

واتە ئەو تەڵاقەی کە خوا دایناوە جار لە دووای جارە و دروستە بۆ پیاوەکە ژنەکەی بگێڕێتەوە, دووای تەڵاقی یەکەم بە چاکی، وە هەر ئەوەی بۆدروستە دووای تەڵاقی دووەمیش، وە (الإمساك بمعروف) ماناکەی گێڕانەوەیەتی بۆ نیکاح‌و هەڵس و کەوت لەگەڵیا بەباشی، وە ئەو مافەی نی‌یە هەتا تەڵاقەکەی کە خستویەتی ڕەجعی نەبێت. خوای گەورە ئەفەرمووێ: ﴿وَالْمُطَلَّقَاتُ يَتَرَبَّصْنَ بِأَنْفُسِهِنَّ ثَلاثَةَ قُرُوءٍ وَلا يَحِلُّ لَهُنَّ أَنْ يَكْتُمْنَ مَا خَلَقَ اللَّهُ فِي أَرْحَامِهِنَّ إِنْ كُنَّ يُؤْمِنَّ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ وَبُعُولَتُهُنَّ أَحَقُّ بِرَدِّهِنَّ فِي ذَلِكَ إِنْ أَرَادُوا إِصْلاحاً وَلَهُنَّ مِثْلُ الَّذِي عَلَيْهِنَّ بِالْمَعْرُوفِ وَلِلرِّجَالِ عَلَيْهِنَّ دَرَجَةٌ وَاللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ﴾ (البقرة:٢٢٨). واتە: ژنە تەڵاقدراوە, ئازادەکان ئەوانەی کە بێنوێژیان هەیە، واجبە کە چاوەڕێ بکەن بێ شوکردنەوە بۆ ماوەی سێ پاکی یان سێ بێنوێژی، وە دروست نی‌یە خوا چی لەمنداڵدانیاندا دروستکردووە بیشارنەوە، ئەگەر بەڕاستی باوەڕیان بەخواو ڕۆژی دوایی هەبێت، وە مێردەکانیان لەپێش ترن بۆ گێڕانەوەیان ئەگەر بە مەبەستی خۆچاك کردن و خێر بێت.

وە لەفەرموودەی (متفق علیە)دا هاتووە کەپێغەمبەر ﷺ بە عومەر ی فەرموو: (مره فلیراجعها...) واتە: پێی بڵێ با بیباتەوە... هتد.

بەڵام جیاکردنەوەی ئەو سێ‌حاڵەتە لە تەڵاقی ڕەجعی و سابتە لەقورئاندا, وەك لە خوارەوە ڕوون کراوەتەوە:

تەڵاقێك سێ‌بەسێ تەواو بکات, ژن لەمێرد جیا ئەکاتەوە وحەرامی ئەکات لەسەر مێرد، وە دروست نیەیەگێڕانەوەی هەتا شوو بە پیاوێکی تر نەکات شووکردنێك کە مەبەست تێیدا حەڵاڵکردنی واتە (مارە بەجاش) نەبێت بۆ مێردەکەی یەکەم. خوای گەورە ئەفەرمووێ: ﴿فَإِنْ طَلَّقَهَا فَلا تَحِلُّ لَهُ مِنْ بَعْدُ حَتَّى تَنْكِحَ زَوْجاً غَيْرَهُ﴾ (البقرة: من الآیة ٢٣٠), واتە: جا ئەگەر پیاوەکە ژنەکەی تەڵاق دا بۆ جاری سێهەم دووای دوو تەڵاقی یەکەم و دووەم، ئیتر ئەو ژنە دوای ئەم تەڵاقی سێهەمە بۆی حەڵاڵ نابێت، هەتا شوو نەکاتەوە بە پیاوێکی‌تر شوویەکی ڕاستەقینە.

هەروەها تەڵاقی پێش چوونەلا ژن لەمێرد جیا ئەکاتەوەو بائینی ئەکات، چونکە تەڵاق دراو لەو شێوەیەدا عیددەی لەسەرنیە. وە گێڕانەوەیش لە عیددەدا ئەبێت. وە مادام عیددەی نیە گێڕانەوەشی نیە. خوای گەورە ئەفەرمووێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا نَكَحْتُمُ الْمُؤْمِنَاتِ ثُمَّ طَلَّقْتُمُوهُنَّ مِنْ قَبْلِ أَنْ تَمَسُّوهُنَّ فَمَا لَكُمْ عَلَيْهِنَّ مِنْ عِدَّةٍ تَعْتَدُّونَهَا فَمَتِّعُوهُنَّ وَسَرِّحُوهُنَّ سَرَاحاً جَمِيلاً﴾ (الأحزاب:٤٩), واتە: ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە ئەگەر ئافرەتانی مسوڵمانتان مارەکرد لەپاشاندا تەڵاقتان دان پێش ئەوەی بچنە لایان و بیانگوێزنەوە، ئێوە عیددەتان نابێت بەسەریانەوە کەتەواوی بکەن، مارەیی و ماڵیان بدەنێ و بەرەڵلایان بکەن بەشێوەیەکی جوان. هەروەها تەڵاق دراو پێش گواستنەوەو، دووای خەڵوەت لەگەڵ کردن بائین ئەبێت و جیا ئەبێتەوە لە مێردەکەی بە تەواوی، وە پێویست بوونی عیددە لەبەر جۆرێك ئیحتیاتە نەك لەبەر گێڕانەوەی. هەروەها تەڵاقدان لەسەر ماڵێك بۆ ئەوەی ژنەکە خۆی پێ ڕزگار بکات، هەربائینە، چونکە ئەو ماڵەی داوە لە بەرابەری شتێکدا, کە ئەویش ڕزگار بوونیەتی لەو پیاوە, وە ئەو ڕزگار بوونەی بۆ نابێت هەتا تەلاقەکە بائین نەبێت، خوای گەورە ئەفەرموێ :﴿فَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا يُقِيمَا حُدُودَ اللَّهِ فَلا جُنَاحَ عَلَيْهِمَا فِيمَا افْتَدَتْ بِهِ ﴾ (البقرة: من الآیة٢٢٩), واتە: ئەگەر ترسی ئەوەتان هەبوو ئەو ژن و مێردە سنووری خوا ڕانەگرن، گوناه نیە لەسەریان ژنەکە بریتی بدات لەجیاتی خۆی کەتەلاق بدرێ.

**حوکمی تەڵاقی ڕەجعی:**

تەڵاقی ڕەجعی ڕێ لە خۆشی وەرگرتن ناگرێ لەژن، چونکە پەیمانی ژن و مێردایەتی لانابات، وە خاوەنێتیش لانابات، وە کار ناکاتە سەر حەڵاڵیەتی ئەو ژنە.

هەرچەندە ئەو تەڵاقە هۆیەکە بۆ جیابوونەوە، بەڵام کاری تێ ناکات, هەتا تەڵاقدراوەکە لە عیدەدا بێت. بەڵکو کارەکەی کاتێ دەر ئەکەوێ کە عیددەکە تەواو بێت، بێ ئەوەی گێڕابێتیەوە، جا ئەگەر عیدەکە تەواو بوو, نەیگێڕابووەوە ئەبێتە بائین، ئیتر ئەگەر بەو شێوەیە بێت. کەواتە تەڵاقی ڕەجعی ڕێ لە خۆشی وەرگرتن لە ژن ناگرێت، وە ئەگەر یەکێکیان مرد ئەوی تریان میراتەکەی ئەبات، بەمەرجێ عیددەکە تەواو نەبووبێت، وە نەفەقەکەی پێوستە لەسەر پیاو, هەروەها تەڵاق و ئیلاء و ظیهاری پیاوەکە بە ژنەکە ئەگات.

وە مارەیی دواخراو بۆ یەکێك لە دووکاتی: مردن یا تەڵاق، بە تەڵاقی ڕەجعی نایکەوێ. بەڵکو مارەیی دواخراو بە تەواو بوونی عیددە حەلاڵ دەبێ ئەگەر لە عیدەدا نەیگێڕێتەوە.

وە گێڕانەوەی ژن لە عیدەدا مافی مێردەکەیە. وە ئەوە مافێکە یاسادانەری ئیسلام چەسپاندوویەتی بۆ پیاو، لەبەر ئەوە پیاوەکە ناتوانێ ئەومافە لابەرێ. ئەگەر پیاوەکە بڵێ: گێڕانەوەیم بۆ نەبێت بۆی هەیە پەشیمان بێتەوە، وە بیگێڕێتەوە. خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿وَبُعُولَتُهُنَّ أَحَقُّ بِرَدِّهِنَّ فِي ذَٰلِكَ﴾ (البقرة: من الآیة٢٢٨), واتە: مێردەکانیان لەپێش ترن بۆ گێڕانەوەیان لەکاتی عیددەکانیاندا.

وە ئەگەر گێڕانەوەی ژن مافی مێرد بێت ئیتر ڕازی بوونی ژنەکە و پێزانینیی مەرج نیەیە لەوبارەیەوە، وە پێویست بە سەرپەرشتیار ناکات، چونکە مافەکە خوا بۆ مێردی داناوە بەپێی فەرمودەی خوای گەورە: ﴿وَبُعُولَتُهُنَّ أَحَقُّ بِرَدِّهِنَّ﴾.

وە شایەت گرتنیش مەرج نیەیە لەسەری, هەرچەندە پەسەندە شایەت گرتن لەترسی ئینکاری کردنی ژنەکە لەدوایىدا کە گێڕایەوە، بەپێی فەرموودەی خوای گەورە: ﴿وَأَشْهِدُوا ذَوَيْ عَدْلٍ مِّنكُمْ﴾ (الطلاق: من الآیة٢), واتە: وە دوو شایەتی دادپەروەر لە خۆتان بکەن بە شایەت,

وە گێڕانەوەی دروستە بەقسە. وەك ئەوەی بڵێ: گێڕامیتەوە وە بەکردەوە, وەك چوونە لاو ئەو کارانەی کە پاڵنەریەتی، وەك ماچ کردن و دەست لێدان بشەهوەت وهتد. شافیعی ڕای وەهایە کە گێڕانەوەی نابێت بەقسەی ئاشکرا نەبێت بۆ ئەو کەسانەی توانای قسەکردنیان هەبێت، وە بەچوونە لاو ئەوشتانەی کە پاڵنەریەتی وەك ماچ کردن و دەست لێدان بە شەهوەتەوە دروست نىیە. وە بەڵگەی شافیعی ئەوەیە کە تەڵاق نیکاح لائەبات.

ئیبنوحەزم ڕەحمەتی خوای لەسەر بێت ووتویەتی: جا ئەگەر چووە لای بەوە نەیگێڕاوەتەوە. هەتا بە زمان نەیڵێت و شایەتی بۆ نەگرێ و بە ژنەکە نەڵێت, پێش ئەوەی عیددەکەی کۆتایی بێت, جا ئەگەر گێڕایەوە و شایەتی نەگرت. ئەوە گێڕانەوە نییە بەپێی فەرموودەی خوای گەورە: ﴿فَإِذَا بَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ فَأَمْسِكُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ أَوْ فَارِقُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ وَأَشْهِدُوا ذَوَيْ عَدْلٍ مِنْكُمْ﴾ (الطلاق: من الآية۲), واتە: کاتێ ژنە تەڵاق دراوەکان نزیك بوونەوە لە کۆتایی عیددەکانیان یا بەچاکی ڕایان بگرنەوە یا لێیان جیا ببنەوە لەگەڵ پێدانی مافەکانیان, وە دوو کەسی ڕاستگۆ لەخۆتان بگرن بە شاهید.

خوای گەورە گێڕانەوەو، تەڵاق و، شایەت گرتنی لەیەك جیاکردۆتەوە, ئیتر دروست نییە تاك کردنەوەی ئەمانە لەیەك. وەك ئەوەی کەسێك ژنەکەی تەڵاق بدات و دوو شاهیدی ڕاستگۆ نەگرێ، یا بیگێڕێتەوە و دوو شاهیدی ڕاستگۆ نەگرێ, زیادە ڕەوی کردن بێت لەسنوورەکانی خوا. وە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (من عمل عملا ليس عليه أمرنا فهو رد)[1] واتە: هەر کەسێك کارێك بکات فەرمانی ئێمەی لەسەر نەبێت ڕەت ئەکرێتەوە. قسەی ئیبنو حەزم تەواو بوو.

وە ئەبو داود و ئیبنو ماجە و بەیهەقی و طەبەرانی تەخریجیان کردووە، لە عیمرانی کوڕی حوصەینەوە: کە پرسیاری لێ کراوە دەربارەی پیاوێك ژنەکەی تەلاق بدات بە تەلاقی ڕەجعی لەپاشان بچێتە لای، نە بۆ تەلاقەکەی شاهیدی گرتبێ، نە بۆ گێڕانەوەکەی, ووتویەتی: لەسەر غەیری سوونەت تەلاقت داوە، وە لەسەر غەیری سوننەت گێڕاوتەتەوە, شاهید بگرە لەسەر تەلاق و گێڕانەوەی, ئیتر شتی وەها مەکە[2].

**بەڵگەی شافیعی کە تەلاق نیکاح لا ئەبات:**

شەوکانی ووتویەتی: ڕای ئاشکرا ئەوەیە کە ئەوانەی پێشەوە بۆی چوون، چونکە عیددە ماوەی هەڵبژاردنەوەیە، وە هەڵبژاردنیش بە قسەو بە کردەوە دروستە، وە هەروەها فەرموودەی خوای گەورە: ﴿وَبُعُولَتُهُنَّ أَحَقُّ بِرَدِّهِنَّ﴾ (البقرة: من الآية۲۲۸), وە فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ (مره فليراجعها...), ئەو ئایەت و فەرموودەیە ئەوە دەرئەخەن کە دروستە گێڕانەوەی بە کردەوە، چونکە قسەی تایبەت نەکردووە بۆ ئەو کارە, جا هەر کەس بڵێ تایبەتی تێدا هەیە ئەبێ بەڵگەی هەبێت.

---

(١) البخاري تعليقاً (٣/٣١٧) ومسلم (١٧١٨/١٨).

(٢) أبوداود (٢١٨٦) وابن ماجة (٢٠٢٥) والبيهقي (٧/٣٧٣) والطبراني في المعجم الكبير (١٨/٤٢٣).

**ئەوەی دروستە مێرد ببینێ لەژنی تەڵاق دراوی ڕەجعی:**

ئەبو حەنیفە فەرموویەتی: خراپ نیيە کە ژنی تەڵاق دراوی تەڵاقی ڕەجعی، خۆی برازێنێتەوە بۆ مێردەکەی، وە خۆی بۆن خۆش بکات وخۆی نیشان بدات، وە خشڵ و خاشاکی جوان لەبەر بکات، و دەست و پەنجەی و ئەو کلەی لەچاویایە نیشانی بدات، وە نابێ پیاوەکە بچێتە ئەو شوێنەی ئەوی لێیە هەتا ئاگاداری نەکاتەوە، بەقسە یان تەقەتەق یا بە کۆکە و تەقەی پێڵاو. شافیعی فەرموویەتی: ئەو ژنە لەسەر مێردەکەی کە تەلاقی داوە بە تەلاقی ڕەجعی حەرامە بە تەواوی.

وە مالیك فەرموویەتی: نە بەتەنها لەگەڵی ئەمێنێتەوە نە ئەچێتە ماڵی، هەتا ژنەکە ڕێی نەدات، وە نابێت سەیری سەر و قژی بکات، بەڵام قەیناکە نانی لەگەڵ بخوات، ئەگەر کەسێکی تریان لەگەڵدا بێت. وە ئیبنو قاسم ئەگێڕێتەوە کە مالیك پەشیمان بۆتەوە لەوەی ووتویەتی نان خواردن لەگەڵیا حەڵاڵە.

**تەڵاقی ڕەجعی ژمارەی تەڵاقەکان کەم ئەکاتەوە:**

تەلاقی ڕەجعی ئەو تەڵاقانە کەم ئەکاتەوە کە پیاو هەیەتی لەسەر ژن, جا ئەگەر تەڵاقی یەکەمی بە کەوتوو دانرا ئەوە دوو تەڵاق ئەمێنێتەوە, وە ئەگەر دووەمیشی بە کەوتوو دانرا یەك تەلاقی ئەمێنێتەوە، وە گێڕانەوەی کار لە کەم کردنەوەی تەلاق ناکات. جا ئەگەر واز لەو ژنەش بهێنێت هەتا عیددەکەی تەواو ئەبێت, بێ ئەوەی بیگێڕێتەوە, ژنەکەش شوویەکی تر بکات و ئینجا بگەڕێتەوە لای مێردی یەکەمی، بەو تەڵاقانەوە ئەگەڕێتەوە کە لەوەپێش مابووی، وە مێردی دووەم ئەو تەلاقانە ناڕوخێنێ کە کەوتوون. هەر بەکەوتوویی ئەمێنێتەوە

بەپێی ئەوەی گێڕراوەتەوە کە عمر خوا لێی ڕازی بێت پرسیاری لێکرا دەربارەی کەسێك ژنەکەی تەلاق بدات بە دوو تەلاق و عیدەکەی تەواو بێت بەو دوو تەڵاقەوە، لەپاشاندا شوو بکات بە پیاوێکی تر, ئەویش لێی جیابێتەوە لەپاشاندا مێردی یەکەمی مارەی بکاتەوە, فەرموویەتی: ئەو ژنە لای ئەو پیاوە ئەبێت بەو تەلاقانەی لەسەری ماوە لە جاری یەکەمدا, وە هەر ئەو قسەیە گێڕراوەتەوە لە علی و زەید و موعاذ و عبداللەی کوڕی عەمر و سەعیدی کوڕی موسەییب و حەسەنی بەصرییەوە خوا لێیان ڕازی بێت.

**تەڵاقی (بائین) جیاکەرەوە:**

لەپێشەوە باس کراوە کە تەلاقی بائین ئەو تەلاقەیە سێبەسێی پێ تەواو بکرێت، یا تەڵاق دانێکە پێش گواستنەوە، یا تەڵاق دانە لەسەر ماڵ، ئیبنو ڕوشد لە کتێبی (بداية المجتهد)دا ئەڵێت: زانایان لەسەر ئەوە ڕێکن کە تەلاقی بائین ئەو تەڵاقەیە کە پێش گواستنەوە ڕوویدات، یا

ژمارەی تەڵاقی پێ تەواو بکرێت، یا لەسەر ماڵ تەڵاق ڕوو بدات. وە لەسەر ئەوە جیاوازی‌یان هەیە لە خولعدا (داماڵین). کە ئایا خولع تەڵاقە یان هەڵوەشانەوەیە (فسخ)ە، بەڵام لەسەر ئەوە ڕێکن کە ئەو ژمارەیە تەڵاقی بائین دروست ئەکات لە تەڵاقدانی ئازاددا سێ تەڵاقە. ئەگەر بە جیاجیا بکەون، بەپێی فەرموودەی خوای گەورە کە ئەفەرموێت: ﴿الطَّلاقُ مَرَّتَانِ﴾ (البقرة: من الآية٢٢٩) وە جیاوازی‌یان هەیە لەوەدا ئەگەر سێ‌بەسێ‌کە بخرێت بە لەفز بێ‌کردەوە بە یەك ووشە. تەواو.

وە ئیمامی ئیبنو حەزم ڕای وایە: کە تەلاقی بائین: ئەو تەلاقەیە کە سێ تەڵاقەکەی پێ تەواو بکرێت، یا پێش گواستنەوە تەڵاق دان ڕوو بدات، ئیتر لەوە زیاتر نی‌یە، وە ووتویەتی: هەرگیز لە ئاینی ئیسلامدا نەمان بینیوە نە لەخواوە نە لە پێغەمبەرەکەیەوە تەڵاقێکمان نەبینیوە کە بائین بێت و گێڕانەوەی تێدا نەمێنێ ئیللا سێ تەڵاقەو تەڵاقی ژنی نەگوێزراوە نەبێت، جا ئەو سێ‌بەسێ‌یە بەسەر یەکەوە بێت، یا بە جیا جیا، زیاتر نا، وە ئەوەی جگە لەمانە بێت ڕاو بۆچوونی بێ بەڵگەیە. تەواو.

بەشەکانی تەڵاقی بائین:

ئەو جۆرە تەڵاقە ئەبێ بە دوو بەشەوە بائینی بچوك: کە لە سێ تەڵاق کەمتر بێت، وە بائینی گەورە: کە سێ تەڵاقەی پی تەواو بێت.

حوکمی بائینی بچووك:

تەڵاقی بائینی بچووك پێوەندی ژن و مێردایەتی ئەپسێنێ هەر بەکەوتنی تەڵاقەکە، جا ئەگەر پەیوەندی بپسێنێت تەڵاق دراوەکە ئەبێتە بێگانە بە مێردەکەی. کەواتە دروست نی‌یە بۆی خۆشی لێ وەربگرێ و هیچیان میراتی ئەوی تریان نابەن پێش کۆتایی هاتنی عیددە یا دووای، وە بە تەڵاقی بائین کاتی دانی ئەو مارەیی‌یە دێت کە دواخراوە بۆ دوو ئەجەلە دوورەکە کەمردن یان تەڵاقە. وە بۆ مێرد دروستە ئەو ژنەی تەڵاقی داوە بەبائینی بچووك بیگێڕێتەوە بە مارەکردن و مارەیی‌یەکی تازە، بێ ئەوەی شوویەکی تر بکات، وە ئەگەر گێڕایەوە چەند تەڵاقی ماوە بەوەندەوە ئەی گێڕێتەوە، جا ئەگەر تەڵاقێکی خستبوو کە گێڕایەوە بە دوو تەڵاقەوە ئەی گێڕێتەوە، وە ئەگەر دوو تەڵاقی خستبوو تەڵاقێك ئەبێ ئامێنێ.

حوکمی تەلاقی بائینی گەورە:

تەڵاقی بائینی گەورە پێوەندی ژن و مێردایەتی ئەپسێنێ وەك بائینی بچووك، وە هەموو حوکمەکانی ئەو وەرئەگرێ، ئیللا ئەوە نەبێت کە حەڵاڵ نی‌یە بۆ مێرد ئەو ژنە بگێڕێتەوە کە تەلاقی بائینی گەورەی داوە هەتا شوو بەکابرایەکی تر نەکاتەوە، بەنیکاحێکی ڕاست. وە پیاوەکە بچێتە

لای بێ ئەوەی مەبەستی حەڵاڵ کردنەوەی بێت بۆ مێردی یەکەمی[1]. خوای گەورە ئەفەرمووێ: ﴿فَإِنْ طَلَّقَهَا فَلا تَحِلُّ لَهُ مِنْ بَعْدُ حَتَّى تَنْكِحَ زَوْجاً غَيْرَهُ﴾ (البقرة: من الآية٢٣٠), واتە: ئەگەر تەڵاقی سێهەمیشیدا، ئیتر حەڵاڵ نییە بۆ مێردی یەکەم هەتا شوو نەکات بە پیاوێکی تر.

بەپێی فەرموودەکەی پێغەمبەر ﷺ کە بە ژنەکەی (رفاعه)ی فەرموو: (لا حتى تذوقي عسيلته ويذوق عسيلتك) رواه البخاري ومسلم[2]. واتە: نابێت بگەڕێیتەوە بۆ لای مێردی یەکەمت. هەتا ئەم مێردەت هەنگوینەکەت نەچەژێ و تۆش هی ئەو نەچەژی.

**کێشەی (هدم) ڕوخاندن:**

ئەوەی زانایان لەسەری ڕێکەوتوون ئەگەر ئافرەتی تەڵاق دراو بە تەڵاقی بائینی گەورە شووی کردەوە، لەپاشاندا تەلاق درایەوە و گەڕایەوە بۆ لای مێردی یەکەمی دووای تەواو بوونی عیددەکەی بەحەڵاڵییەتێکی تازە ئەگەڕێتەوە بۆ لای، وە مێردەکەی خاوەنی سێ تەلاق ئەبێت لەسەری، چونکە مێردی یەکەم کۆتایی بەڕەوایی یەکەم هێنا. جا ئەگەر گەڕایەوە بە (عقد) پەیمانێکی تازە ئەو پەیمانەی ڕەواییەکی تازە پێك ئەهێنێ بەڵام ئافرەتی تەڵاق دراو بە تەڵاقی بائینی بچووك کاتێك عیددەکەی تەواو بووبێت وشوویەکی تری کردبێتەوە لەپاشاندا مێردی تازەی تەڵاقی بداتەوە، وە لەپاشاندا بگەڕێتەوە لای مێردی یەکەمی، ئەویش هەر وەك بائینی گەورە بە ڕەواییەکی تازەوە ئەگەڕێتەوە لای و مێردەکەیو سێ تەڵاقی ئەبێت لەسەری. لای ئەبی حنیفە و ئەبو یوسف. وە محمد ووتویەتی ئەگەڕێتەوە لای بەو تەڵاقانەی کە ماویەتی، وە وەك ئەوە وەها ئەبێت کە ئەگەر تەلاقی دابێت بە ڕەجعی یا پەیمانێکی تازەی بۆ بستبێتەوە دوای ئەوەی کە بە بەینوونەی بچووك دەست بەرداری بووبێت,

ئەم کێشەیە بە ڕووخاندن (الهدم) ناو ئەبرێت: واتە ئایا مێردی دووەم تەڵاقی لەسێ کەمترەکان ئەڕوخێنێ. وەك سێ تەڵاقەکە ئەڕوخێنێ یا نایڕوخێنێ؟! .

(١) کە ئێمە پێی دەڵێین مارە بەجاش.

(٢) البخاري (٥٢٦٠) ومسلم (١٤٣٣/١١١).

## تەڵاقی نەخۆش بە نەخۆشی سەرەمەرگ

سابت نەبووە نە لە قورئاندا نە لە سوننەتێکی ئاشکرادا حوکمی تەڵاقی نەخۆشێك کە لەسەرەمەرگدا بێت. بەڵام سابتە لە صەحابەوە کە عبدالرحمن ی کوڕی عەوف (تماضر)ی ژنی سێ‌بەسێ تەڵاق دا لەکاتی ئەو نەخۆشی‌یەی کە هەڵنەساوە لێی، عثمان ڕەزای خوای لێ بێت کە مرد میراتی دا بە ژنەکەی، وە فەرمووی: (من بەم کارە تۆمەتی ئەوەی ناخەمە پاڵ کە ڕای کردووە لەمافی ژنەکە لەمیراتا، بەڵکو ویستوومە بەپێی سوننەت کار بکەم، وە لە ئیبنو عەوف خۆیشی‌یەوە هاتووە ووتویەتی: (ما طلقتها ضراراً ولا فراراً) واتە بۆ ئەوەم تەڵاق نەداوە تووشی زیانی بکەم یا لە مافەکانی هەڵبێم. واتە ئینکاری ئەوە ناکات کە میراتی بدرێتی.

وە ئەگێڕنەوە کە عوسمانی کوڕی عەفان خوا لێی ڕازی بێت (أم البنين) کچی عویەینەی کوڕی حوصینی فەزازی تەڵاق دا لە کاتێکدا چوار دەوری گیرابووە لە ماڵەوە، جا کاتێ شەهید کرا ژنەکەی هات بۆ لای عەلی و پێی ڕاگەیاند. ئەویش میراتی بۆ دانا. وە فەرمووی: (وازی لێ هێناوە هەتا گەیشتۆتە سەرەمەرگ تەڵاقی داوە!).

لەسەر ئەوە زانایان جیاوازن لە تەڵاقی نەخۆش بە نەخۆشی سەرەمەرگ، حەنەفی‌یەکان ووتویانە: ئەگەر کەسێکی نەخۆش، ژنەکەی تەڵاق دا بە تەڵاقی بائین، وە لەو نەخۆشی‌یە هەڵنەساوە و مرد ئەو ژنە میراتی ئەگرێ. . . بەڵام ئەگەر دوای بەسەرچوونی عیددەی ژنەکە مرد ئەوە میراتی ناکەوێ. وە هەر ئەو حوکمەی هەیە پیاوێك موبارەزە بکات لەگەڵ کەسێکدا یا ببرێ بۆ کوشتن لە تۆڵەدا یا ببرێ بۆ ڕەجم کردن، ئەگەر لەو ڕووەوە مرد یا کوژرا.

وە ئەگەر پیاوێك ژنەکەی سێ بەسێ تەڵاق دا بەفەرمانی ژنەکە خۆی، یا بە ژنەکەی ووت: ئارەزووی خۆتە ئەویش خۆی هەڵبژارد، یا خۆی (خولع کرد) لە پیاوەکە، پاشان ئەو پیاوە بمرێ‌و ژنەکە هەر لە عیددە دا بێت میراتی لێ ناگرێ. وە جیاوازی نێوان ئەو دوو شێوەیە ئەوەیە: کە تەڵاقەکە لە شێوەی یەکەمدا لە کاتێکدا دەرچووە لە نەخۆشەکەوە کە هەست ئەکات بەوەی کە بۆیە تەڵاقی ئەدات تا مافی لە میرات بفەوتێنێ لەبەر ئەوە بە جۆرێك مامەڵەی لەگەڵدا ئەکرێت کەپێچەوانەی مەبەستەکەی بێت. هەر بۆیە ئەو مافەی بۆ ئەچەسپێ کە پیاوەکەی ویستوویەتی بیفەوتێنێ، لەبەر ئەوەیە ئەو تەڵاقە ناونراوە تەڵاقی هەڵهاتوو. بەڵام تەڵاق دان لەشێوەی دووەمدا ئەوە هەڵهاتنی لێ دەرناکەوێ، لەبەر ئەوەی ئافرەتەکە بۆخۆی فەرمانی کردووە بە تەڵاق دان یا هەڵی بژاردووە، وپێی ڕازی بووە، وە هەروایە حوکم دەربارەی ئەو کەسەی کە دەوری گیرابێت، یان لەریزی جەنگدا بێت و ژنەکەی بەتەڵاقی بائین تەڵاق بدات.

ئەحمەد و ئیبنوئەبی لەیلا ووتویانە: میراتی بەرئەکەوێ دوای تەواو بوونی عیدەکەیشی بەمەرجێ شووی نەکردبێتەوە,

مالیك و لەیس ووتویانە: میراتی بەرئەکەوێت لە عیدەدا بێت یان نا، شووی کردبێتەوە یان نا.

شافیعی ووتویەتی: میرات گر نابێت. لە (بدایة المجتهد)دا ووتویەتی: هۆی ئەو جیاوازیەی زانایان ئەوەیە: کە جیاوازی‌یان هەیە لەسەر واجب بوونی عەمەل کردن بە (سد الذرائع) واتە بەربەست کردنی ئەو شتانەی کە هۆکارن بۆ حەرام و ناشەرعی، ئەویش بەوەی کاتێك پیاوی نەخۆش بەوە تاوان بار ئەکرێت کە بۆیە ژنەکەی لەو نەخۆشی‌یەدا تەڵاق داوە بۆ ئەوەی بەشە میراتی‌یەکەی نەکەوێ, جا هەر کام لە زانایان بە (سد الذرائع) کار بکات ئەڵێت میرات ئەگرێ، وە هەر کەس کاری پێ نەکات, ئەڵێت میرات ناگرێ. ئەمەش لەبەر ئەوەیە ئەم کۆمەڵە ئەڵێن: ئەگەر تەڵاقەکە کەوتبێ پێویستە بەهەموو ئەحکامەکانی‌یەوە بکەوێ. چونکە ئەوان وتیان: پیاوەکە میراتی ناگرێ ئەگەر ژنەکە بمرێ, وە ئەگەریش تەڵاقی نەکەوتبێ ژن و مێردایەتی‌یەکیان هەر ئەمێنێ بەهەموو ئەحکامەکانی‌یەوە. وە لایەنە بەرابەرەکەیان هەر ئەبێ یەکێ لەو دوو وەڵامە بداتەوە، چونکە گرانە بوترێ: لە شەرعدا جۆرێك لە تەلاق هەیە هەندێ ئەحکامی تەڵاق و هەندێ ئەحکامی ژن و مێردایەتی تێدا هەیە، لەوەش گرانتر ئەوەیە بووترێت کەجیاوازی هەیە لەنێوان تەڵاقی دروست و نادروستدا, چونکە ئەبێ بە تەڵاقێکی حوکم وەستاو هەتا دروست ئەبێت یا دروست نابێت، ئەمانە هەموو لەو شتانەن کە گرانە ووتنی لەشەرعدا. بەڵام ئەوانەی ئەڵێن میرات ئەگرێ تەنها دڵیان بەوە خۆشە کە عەلی و عوسمان فەتوایان لەسەر داوە. هەتا مالیکی‌یەکان ئەڵێن ئەوە ئیجماعی صەحابەی لەسەرە. وە قسەکەیان بێ مانایە چونکە خیلاف لەوەدا لە ئیبنو زوبێرەوە بەناوبانگە.

وە ئەو کەسەی کە ڕای وایە کە لە عیدەدا میرات ئەگرێ: لەبەر ئەوەیە کە عیددە لای ئەو هەندێك لە ئەحکامی ژن و مێردایەتی هەیە, وەك ئەوەی بە تەڵاق دراوی ڕەجعی چواندووە, وە ئەو گفتە لە عمر و عائیشەوە ئەگێڕنەوە. وە ئەوەی مەرجی شوونەکردنەوەی داناوە بۆ گرتنی میرات، لەبەر ئەوەیە کە ئیجماعی زانایانی لەسەر بینیوە کە ژنێك لە دوو پیاو میرات ناگرێ, وە لەبەر ئەوەی تاوانبار کردنی پیاو هۆیەکەیە بەلای ئەوانەی کە میرات گرتنیان پێویست کردووە.

ووتویەتی: وە جیاوازن لەوەدا کە ژنەکە خۆی داوای تەڵاق بکات یا مێردەکەی فەرمانی خۆی دایە دەست خۆی ئەویش خۆی تەلاق دا, ئەبو حەنیفە ووتویەتی: ئەسڵەن ئەوە میراتگر نابێت.

وە ئەوزاعی تەلاق و خاوەنێتی لەیەك جیاکردۆتەوە ووتویەتی: بۆ خاوەنێتی (واتە بوون بە خاوەنی فەرمانی خۆی) میرات نابێت، بەڵام بۆ تەلاق دراو ئەبێت. وە مالیك ئەوانەی هەموو وەك یەك داناوە هەتا ووتویەتی: ئەگەر ژنەکە بمرێ پیاوەکە میراتی ناگرێ، بەڵام ئەگەر پیاوەکە بمرێ ژنەکە میراتی ئەگرێ. ئەمەش زۆر پێچەوانەی ئوصولە. (بدایة المجتهد)[1]- تەواو بوو.

ئیبنوحەزم ووتویەتی: (تەلاقی نەخۆش وەك تەلاقی لەش ساغە، لەو نەخۆشی‌یەدا بمرێ یا نەمرێ هیچ جیاوازی نی‌یە). جا ئەگەر تەلاقدانی نەخۆشەکە سێبەسێ بێت یا ئاخرین تەلاقەی بێت، یا پێش گواستنەوەی بێت، جا ئەو پیاوە بمرێ یا ژنەکە پێش تەواو بوونی عیددە بمرێ، یان تەلاقەکەی تەلاقی ڕەجعی بێت و پیاوەکە نەیگێڕابێتەوە هەتا مردبێ دوای تەواو بونی عیددە، ئەوە ژنەکە میراتی بۆ نی‌یە لەهیچ کام لەو شێوانەی کەباس کرا، وە پیاوەکەش میراتی ئەو ناگرێ، وە هەروەهایە تەڵاقی پیاوی ساغ بۆ ژنی نەخۆش، یا تەڵاقی پیاوی نەخۆش بۆ ژنی نەخۆش، وە لەگەڵ ئەوانەی سەرەوە هیچ جیاوازی نی‌یە. وە هەروەهایە بردراو بۆ کوشتن و ژنی حامیلەی بارگران، وە لێرەدا خەڵك جیاوازی‌یان تێیدا هەیە[2].

(١) بدایة المجتهد، (ج٢ ص٨٦-٨٧).

(٢) المحلى (ص٢٢٣ ج ١٠).

## (تفويض) پێ سپاردن و وەكیل گرتن لە تەلاقدا

تەلاق مافێكە لە مافەكانی مێرد، لەبەر ئەوە بۆی هەیە خۆی ژنی خۆی تەڵاق بدات، وە بۆی هەیە تەلاقدانەكە بسپێرێ بە ژنەكە خۆی، وە بۆی هەیە كەسێكی تر بگرێت بەوەكیل بۆ تەلاقدانەكە.

وە هەركام لەسپاردن و وەكیل گرتن مافەكەی لانابات و ڕێ لە بەكارهێنانی ناگرێت هەر كاتێ بیەوێ، وە ظاهیرییەكان پێچەوانەی ئەوەن وتویانە: دروست نییە بۆ پیاو ئەو كارە بدات بە دەست ژنەكەیەوە كە خۆی تەلاق بدات، یا كەسێك بكات بە وەكیل تەڵاقی بدات,

ئیبنو حەزم فەرموویەتی: هەر كەس كاری تەلاق دان بدات بەدەستی ژنەكەی خۆیەوە ئەوتەڵاقدانەی بەسەردا ناچەسپێ و تەڵاق نادرێ؛ جا ئەو ژنە خۆی تەلاق بدات یان نا، چونكە خوای گەورە تەلاقی بۆ پیاو داناوە نەك بۆ ژن.

**داڕشتنەكانی سپاردن (صيغ التفويض):**

صیغەكانی پێ سپاردن ئەمانەیە:

١-خۆت هەڵبژێرە.

٢-كاری خۆت بەدەستی خۆت بێت.

٣-خۆت تەڵاق بدە ئەگەر نارەزوو ئەكەی.

زانایان لەم صیغانەدا جیاوازییان هەیەو بۆ زۆر شێوە چوون, وا لە خوارەوە ڕوونی ئەكەینەوە:-

(١)خۆت هەڵبژێرە:

زانایان بۆ ئەوە چوون كە تەلاق بەو صیغەیە ئەكەوێ: چونكە شەرع لە صیغەكانی تەلاق دایناوە. وە لەو بارەیەوە خوای گەورە ئەفەرمووێ: ﴿يا أيها النبي قُلْ لأزْواجِكَ إنْ كُنْتُنَّ تُرِدْنَ الْحَياةَ الدُّنْيا وَزِينَتَهَا فَتَعَالَيْنَ أُمَتِّعْكُنَّ وَأُسَرِّحْكُنَّ سَراحاً جَميلاً وَإِنْ كُنْتُنَّ تُرِدْنَ اللّهَ وَرَسُولَهُ وَالدَّارَ الْآخِرَةَ فَإِنَّ اللّهَ أَعَدَّ لِلْمُحْسِنَاتِ مِنْكُنَّ أَجْراً عَظِيماً﴾ (الأحزاب:٢٩). واتە: ئەی پێغەمبەر بە ژنەكانت بڵێ ئەگەر ژیانی دنیا و گوزەرانی خۆشتان ئەوێ وەرن با خوا چی لەسەر داناوم بتان دەمێ و بەشێوەیەكی جوان تەلاقتان بدەم، وە ئەگەر ئێوە ڕەزامەندی خوا و پێغەمبەرەكەی و ڕۆژی دواییتان دەوێ، ئەوە خوا بۆ چاكە كارەكانتان پاداشتێكی گەورەی ئامادە كردووە,

وە كاتێ ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە پێغەمبەر ﷺ چووە لای عائیشە و پێی فەرموو: من لەخواوە شتێكت پێ ڕائەگەیەنم لەسەر زمانی پێغەمبەرەكەیەوە، تۆش پەلە مەكە هەتا پرس بە باوك و

دایکت ئەکەیت، ئەویش ووتی: ئەو شتە چییە ئەی نێرراوی خوا؟ ئیتر ئایەتەکەی بۆ خوێندەوە. ووتی: لەبارەی تۆوە ئەی نێرراوی خوا پرس بە باوك و دایکم بکەم؟... بەڵکو من خواو پێغەمبەرەکەی هەڵئەبژێرم و ڕۆژی دوایی، وە داوات لێ ئەکەم ئەمە بەهیچ کام لە ژنەکانی ترت ڕامەگەیەنە. فەرمووی: هەر کەسێکیان پرسیارم لێ بکات پێی ئەڵێم. چونکە خوا نەی ناردوم.... هەتا کۆتایی .

پاشان هەموو خێزانەکانی پێغەمبەر عائیشە چی ووتبوو, ئەوانیش ئەوەیان ووت, وە هەموویان خواو پێغەمبەر و ڕۆژی دوایی‌یان هەڵبژارد[1] ,

بوخاری و موسلیم و ئەبوداود و (ترمذي) و نەسائی و ئیبنو ماجە ئەگێڕنەوە, لە عائیشەوە خوا لێی ڕازی بێت کە فەرمووپەتی: (پێغەمبەر ﷺ هەڵبژاردنی دایە دەست خۆمان، ئێمەش ئەومان هەڵبژارد, ئیتر ئەوی بە هیچ دانەنا). وە لە زاراوەکەی موسلیم دا هاتووە: (کە پێغەمبەر ﷺ هەڵبژاردنی دایە دەست ژنەکان و تەڵاقیش نەبوو).[2] لەوەدا بەڵگەی ئەوە هەیە ئەگەر خۆیان هەڵبژاردایە ئەوە ئەبووە تەڵاق. وە ئەو زاراوەیە بۆ تەلاق دان بەکار ئەهێنرێ,

وە هیچ کام لە زانایان جیاوازی نییە لەوەدا. لەکاتێکدا جیاوازی‌یان هەیە لەوەدا کە چەند تەڵاقی پێ ئەکەوێ ئەگەر ژنەکە خۆی هەڵبژارد, هەندێکیان ئەڵێن تەڵاقێکی ڕەجعی پێئەکەوێ,

وە ئەوە لە عومەر و ئیبنو مەسعود و ئیبنو عەبباسەوە گێڕراوەتەوە. وە وتەی عومەری کوڕی عبدالعزیز و ئیبنو ئەبی لەیلا و سوفیان و شافیعی و ئەحمەد و ئیسحاقە.

وە هەندێکیان ووتویانە: ئەگەر خۆی هەڵبژارد تەڵاقێکی بائینی ئەکەوێ، ئەمەش لە عەلی کوڕی ئەبی طالیبەوە ئەگێڕێتەوە, خوا لێی ڕازی بێت, وە حەنەفی‌یەکانیش گفت بەوە ئەدەن.

مالیکی کوڕی ئەنەس فەرموویەتی: ئەگەر خۆی هەڵبژارد هەر سێ تەڵاقی ئەکەوێ, وە ئەگەر مێردەکەی هەڵبژارد تەڵاقێکی ئەکەوێ. حەنەفی‌یەکان ئەوەیان بە مەرج داناوە لە کەوتنی تەلاق بەو صیغەیە ئەبێ ناوی خۆی بهێنێ لە کاتی گفتەکەیدا یا لە گفتی ژنەکەدا، جا ئەگەر پێی بڵێت: هەڵبژێرە, ژنەکەش بڵێت: هەڵم بژارد ئەوە باتڵەو هیچی پێ ناکەوێ.

---

(١) البخاري (٥٢٦٣) ومسلم (١٤٧٥).

(٢) البخاري (٤٧٨٥) ومسلم (١٤٧٥) وأحمد (٦/١٦٣و١٧٣) وأبو داود (٢٢٠٣) والترمذي (١١٧٩) و(٣٣١٨) والنسائي (٦/٥٦و١٦٠) وابن ماجة (٢٠٢٥) و (٢٠٥٣).

**(٢)کارت بە دەستی خۆت بێت[1]:**

ئەگەر پیاوێك بە ژنەکەی خۆی بڵێت: کاری خۆت بە دەستی خۆت بێت, ژنەکەش خۆی تەلاق دا, ئەوە یەك تەلاقی ئەکەوێ، لای عومەر و عبدالله ی کوڕی مەسعود, وە مەزهەبی سوفیان و شافیعی و ئەحمەدە. ئەگێڕنەوە پیاوێك هاتە لای ئیبنو مەسعود ووتی: شتێك کەوتە نێوان من و ژنەکەم لەوەی کەخەڵك دەکەوێتە نێوانیان. جا ژنەکەم ووتی: ئەگەر ئەوەی بە دەستی تۆیە لەکاری من بەدەستی من بوایە. ئەمزانی چیم ئەکرد, ئەڵێ منیش ووتم: با ئەوەی بەدەستی منە لە فەرمانی تۆو بەدەستی خۆت بێت, ئەویش ووتی: ئەوا سێ‌بەسێ تەلاقم دای.

ئیبنو مەسعود پێی ووت: من ئەو قسەیە بە یەك تەلاق ئەزانم، وە تۆ لەپێشتری بۆی هەتا لە عیدەدا بێت, وە با بگەم بە ئەمیری موسوڵمانان عومەر پرسیاری لێ ئەکەم، لە پاشاندا گەیشت بە عومەر و باسەکەی بۆ گێڕایەوە ئەویش ووتی: خوا چی لەپیاوان بکات. ئەوەی خوا پێی داون ئەیدەن بە دەست ژنەکانیانەوە. قوڕ بەدەمی ژنەکەی. چیت پێ ووت؟ ئەڵی ووتم: من بەیەك تەلاقی ئەزانم. وە مێردەکەشی لەپێشترە بۆی، ووتی: منیش هەر وای ئەزانم، وە ئەگەر بەشێوەیەکی تری بزانیت ئەوە ئەزانیت کە نەت پێکاوە,

حەنەفیەکان ووتویانە: یەك تەلاقی بائین ئەکەوێ، چونکە کاتێ ئەیکاتە خاوەنی فەرمانی خۆی, ئەو کارە ئەوە پێویست ئەکات کە ئەو پیاوە دەسەڵاتی بەسەریدا نەمێنێت, وە کاتێکیش ژنەکەی ئەوەی قبول کرد بە ئارەزووی خۆی پێویستە ئەو دەسەڵاتەی لەسەر لاچێ, ئەوەش دروست نابێت لەگەڵ مانەوەی توانای گێڕانەوەیدا.

---

(١) واتە: ئەو کارەت کە بەدەست منە، کە تەلاقە، دامە دەست خۆت.

**ئایا نیازی پیاوەکە ئیعتیباری پێ ئەکری یا نیازی ژنەکە؟:**

شافیعی بۆ ئەوە چووە کە نیازی مێرد ئیعتیباری پێ ئەکرێ. ئەگەر نیازی وەهابوو گفتی ژنەکە یەك تەلاق بێت ئەوە یەك تەلاق ئەبێت، وە ئەگەر بەنیازی سێبەسێ وە بێت ئەوە سێ بەسێ ئەبێت. وە بۆ پیاوەکەی هەیە فریوی بدات لە عەینی تەلاقەکەدا، وە هەروەها لە ژمارەکانیدا: لە هەڵبژاردندا یا لە بوونە خاوەنی کاری خۆی.

بەڵام جگە لە شافیعی بۆ ئەوە چووە کە ئەگەر نیێتی پیێی تەلاقێك زیاتر بێت ئەوە چەندی نیاز بووە ئەوەندەی ئەکەوێ، چونکە خاوەنی هەر سێ تەلاقەکەیە بە ئاشکرا، کەواتە ئەبێتە خاوەن تەڵاق بە کینایەتیش وەك مێرد. جا ئەگەر ژنەکە سێ تەلاقەی خۆیدا ومێردەکەی بڵێت من لەیەك تەڵاق زیاترم بۆ دانەناوە، گوێ نادرێ بە قسەکەی، وئەوەی ژنەکە بڕیاری داوە هەر ئەوە ئەبێت، ئەمە مەزهەبی عوسمان و ئیبنو عومەر و ئیبنو عەبباسە، وە عومەر و ئیبنو مەسعود ووتویانە: یەك تەلاقی ئەکەوێت وەك لە باسەکەی عبداللەی کوڕی مەسعود دا باسمان کرد.

**ئایا کار دانە دەست ژن بەستراوە بە کۆڕەکەوە؟ یا بەردەوام ئەبێت:**

ئیبنو قودامە لە موغنیدا ووتویەتی: هەر کاتێ پیاو کاری ژنەکەی دایە دەست ژنەکەی ئەوە بەردەوام هەر بەدەستی ئەبێت ونابەسترێتەوە بەو کۆڕەوە.

هەر ئەوەیشیان لە عەلیەوە گێڕاوەتەوە خوا لێی ڕازی بێت، وە ئەبوثەور ئیبنو مونذیر و حەکەمیش هەر بەوە گفتیان داوە.

مالیك و شافیعی و خاوەن ڕاکان ووتویانە: کار دانە دەستی ئافرەت هەر لەو کۆڕەدا ئەبێت کە پیاوەکە پێی ووتووە، وە لەدووای ئەوەی کە لەو مەجلیسە لەیەك جیابوونەوە ئەو ئافرەتە تەڵاقی بە دەست نییە، چونکە ئەوە هەڵبژاردنە کەواتە هەر لە کۆڕەکەدا ئەبێت، وەك ئەوە وایە پێی بڵێ هەڵبژێرە. وە ئیبنو قودامە قسەی یەکەمی پێش خستووە لەبەر ووتەی عەلی ﷺ لەبارەی پیاوێك کەکاری تەڵاقدانی ژنەکەی دایە دەستی خۆی. فەرموی: دەسەڵاتی تەڵاق دانەوەی هەیە هەتاوەك و پەشیمان ئەبێتەوە. وە ووتوویەتی: ئێمە لە صەحابەکاندا موخالیفێك نادۆزینەوە بۆ ئەم قەولە، وە بەوەش ئەبێتە ئیجماع. وە لەبەر ئەوەی ئەو کارە جۆرێك وەکیل گرتنە لەتەڵاقداندا. کەواتە بەردەوام ئەبێت وەك ئەوەی ئەو وەکالەتەی لەسەر بێگانەیەك دانابێت وەهایە.

**پەشیمان بوونەوەی مێرد:**

(ئیبنو قودامە) ووتوویەتی: ئەگەر مێردەکە لەو دەسەڵات دانەوەیە پەشیمان بێتەوە، یان بڵێت: ئەو دەسەڵاتەی کە دامە دەستت هەڵم وەشاندەوە ئەوە بەتاڵ نابێتەوە، وە عطاء و موجاهید و شەعبی و نەخەعی و ئەوزاعی و ئیسحاق بەوە گفتیان داوە.

بەڵام زوهری و ثەوری و مالیك و خاوەن ڕەئی یەکان بۆ ئەوە چوون کە پیاوەکە بۆی نی یە پەشیمان بێتەوە، چونکە ئەو ئافرەتەی کردۆتە خاوەنی ئەو دەسەڵاتە، کەواتە بۆی نی یە پەشیمان بێتەوە تێیدا. هەروەها ووتویەتی وە ئەگەر پیاوەکە چووە لای ژنەکەی، ئەوە پەشیمان بوونەوەیەتی، چونکە ئەوە جۆرێکە لە وەکیل گرتن، وە تەصەروف کردن لەو شتەدا کەوەکیلی بۆ گرتووە، وەکالەتەکە بەتاڵ ئەکاتەوە. وە ئەگەر ژنەکە ئەو دەسەڵاتەی کەدراوەتە دەستی ڕەتی کردەوە بەتاڵ ئەبێتەوە، وەك چۆن وەکالەت بە هەڵوەشاندنەوەی وەکیلی کردنەکە بەتاڵ ئەبێتەوە[1].

**(٣)ئەگەر حەز ئەکەی خۆت تەڵاق بدە:**

حەنەفی یەکان ووتویانە: هەر کەس بە ژنی خۆی ووت خۆت تەڵاق بدە وە بەنیازی تەڵاق دانی یەوە نەبوو، یا بە نیەتی یەك تەڵاقەوە، ژنەکەش بڵێ وا خۆم تەڵاق دا، ئەوە تەڵاقێکی ڕەجعی ئەکەوێت.

بەڵام ئەگەر سێ بەسێ خۆی تەڵاقدا، وە مێردەکەشی ئەوەی مەبەست بوو، هەر سێ تەڵاقی ئەکەوێ، بەڵام ئەگەر بە ژنەکەی بڵێ: خۆت تەڵاق بدە، ئەویش بڵێت: ئەوا خۆم بائین کرد، ئەوە تەڵاقی ئەکەوێت. وە ئەگەر بڵێ خۆم هەڵبژارد تەڵاقی ناکەوێ، بەڵام ئەگەر پیاوەکە پێی بڵێ: هەر کاتێك ئارەزووت کرد خۆت تەڵاق بدە. ئەو ژنە بۆی هەیە لەو دانیشتنەدا و لەکاتی تردا خۆی تەڵاق بدات. وە ئەگەر پیاوەکە بە پیاوێکی ووت: ژنەکەم بۆ تەڵاق بدە. ئەو پیاوە بۆی هەیە لەو دانیشتنەدا و دووای ئەوە ژنەکەی بۆ تەڵاق بدات. بەڵام ئەگەر پێی ووت: ژنەکەم بۆ تەڵاق بدە ئەگەر ئارەزوو ئەکەی، بۆ ئەو پیاوە هەیە هەر لەو دانیشتنە تایبەتەدا ژنەکەی بۆ تەڵاق بدات.

**(التوكيل) وەکیل گرتن:**

ئەگەر کاری ژنەکەی دایە دەست کەسێکی تر دروستە، حوکمەکەی وەك حوکمی ئەوە وایە کە دابێتی یە دەستی ژنەکەی، لەوەدا کەکاری تەڵاق دانی ئەو ژنەی بەدەستە لەو کۆڕەداو دووای ئەو کۆڕە.

---

(١) المغني (ص٢٨٨ ج٨).

وە شافیعی موافەقەی لەسەر ئەوە کردووە بۆ جگە لەژنەکە لەبەرئەوەی وەکیل گرتنە، جا پێی بڵێت: فەرمانی ژنەکەم دایە دەستت، یا بڵێ: ئارەزووم دایە دەست تۆ بۆ تەلاق دانی ژنەکەم، یا بڵێ ژنەکەم تەلاق بدە، وەك یەکە. وە هاوەڵانی ئەبی حەنیفە ووتویانە: ئەو کارە بەستراوە بەو کۆڕەوە و بەس، چوونکە جۆرێکە لە هەڵبژاردن وەك ئەوە وایە پێی بڵێت خۆت هەڵبژێرە،

خاوەنی کتێبی (المغني) ووتویەتی: لای ئێمە ئەو کارە وەکیل گرتنی تێکڕایە. کەواتە بەردەوامی ئەبێت، وەك وەکیل گرتن لە فرۆشتندا، وە ئەگەر ئەو کارە چەسپا، بۆی هەیە ئەو ژنەی تەلاق بدات بەمەرجێك مێردەکەی وەکالەتەکە هەڵ نەوەشێنێتەوە، یا نەچێتە لای ژنەکەی، وە بۆ ئەو وەکیلە هەیە کەئەو ژنە یەك تەڵاق بدات، یا دوو، یا سێ، وەك ژنەکە، وە ئەبێت ئەو کارە بخرێتە دەست کەسێك کە دروست بێت بکرێ بە وەکیل ئەویش خاوەن عەقڵە. وە منداڵ و شێت دروست نیە کە ئەو کارەیان بدرێتە دەست، وە ئەگەر ئەو کارەیان پێسپێراو تەلاقەکەی دا، تەلاقەکە ناکەوێ. وە خاوەن ڕاکان ئەڵێن: دروستەو ئەکەوێ[1].

بەستنەوەی ئەو صیغانەو گشتێتی کردنی:

ئەو صیغانەی باس کران جاری وا هەیە تێکڕا ئەبن، وەك ئەوەی کاری ژنەکە ئەداتە دەست ژنەکەی، یا ژنەکەی خۆی هەڵئەبژێری بێ ئەوەی ببەسترێتەوە بە هیچەوە کە لە صیغەکە زیاد بێت.

لەم حاڵەتەدا ژنەکە بۆی هەیە کە خۆی تەلاق بدات لەو دانیشتنەدا کە کاری خۆی دراوەتە دەستی و بەس، ئەگەر ژنەکە ئامادەی ئەو کۆڕە بوو، وە ئەگەر لەوێ نەبوو ئەو مافەی ئەکەوێتە دەست هەر لەو کۆڕەدا کە بەوەی زانیو بەس، تەنانەت ئەگەر کۆتایی هاتبێ یا ئەو کۆڕەی کە تەلاقەکەی تێدا درایە دەست گۆڕابێت یا ئەو کۆڕەی کەئافرەتەکەی تێدا ئاگادار کراوەتەوە و خۆی تەلاق نەدا ئیتر ئەو مافەی نامێنێ دووای ئەوە، چونکە صیغەکە تێکڕایەو هەر لەو کۆڕەدا بۆی هەیە ئەو کارە بکات، کاتێ ئەوەی لە دەست چوو ئەو مافەی نامێنێ.

وە ئەو حوکمە لە حاڵەتێکدایە کە شتێکی وەها نەبوبێ کە ببێتە بەڵگە بۆ گشتێتی کردنی کار پێ سپاردنەکە، وەك ئەوە لەکاتی عەقدی زەواجەکەدا کرابێت. چونکە عەقڵ نایگرێ کە ئەو کەسە ژنەکە بکاتە خاوەنی ئەو مافە کە خۆی تەلاق بدات لەهەر مەجلیسی مارەکردنەکەدا، کەواتە حاڵەتەکە وا ئەگەیەنێ کە ئەو صیغەیە بۆ گشتێتیە.

---

(١) المغني (ص٢٩٢).

وە جاری واهەیە ئەو صیغانە گشتی ئەبن. وەك ئەوەی بە ژنەکەی بڵێ خۆت هەڵبژێرە هەر کاتێ ئارەزووت کرد، یا کاری خۆت بە دەستی خۆت بێت هەر کاتێ ویستت، لەم شێوانەدا ئەو ژنە بۆی هەیە خۆی تەڵاق بدات هەرکاتێ ویستی، چونکە کردویەتی بەخاوەنی مافی تەڵاق دانی خۆی بە خاوەنیەتی گشتی، ئیتر بۆی هەیە ئەو مافە بەکار بهێنێ وخۆی تەڵاق بدات هەر کاتێك بێت.

وە جاری واهەیە ئەو صیغانە لەکاتێکی دیاری کراودایە، وەك ئەوەی تەڵاقەکانی بداتە دەستی بۆ ماوەی ساڵێك، ئیتر بۆ ئەو ژنە هەیە تەنها لەو ماوە دیاری کراوەدا خۆی تەڵاق بدات وبەس، بەڵام دوای تێپەڕبوونی ئەو ماوەیە ئەو مافەی نامێنێ لە تەڵاق دانی خۆیدا.

**(التفویض) پێ سپاردن کاتی پەیمانی ژن ومێردایەتی و دووای پەیمانەکە:**

دروستە کار پێ سپاردنە دەستی ژن لەکاتی پەیمان بەستنی ژن و مێردایەتیدا یا دووای پەیمانەکە، بەڵام بە مەرج دانراوە لەکاتی مارەکردنەکەدا لای حەنەفیەکان ئەبێ دەست پێکەر ژنەکە بێت، وەك ئەوەی ژنەکە بە پیاوەکە بڵێت: شوت پێ ئەکەم بەمەرجێ کاری خۆم بە دەستی خۆم بێت، هەرکاتێ ویستم خۆم تەڵاق بدەم. پیاوەکەش بڵێت: قەبوڵم کرد، ئیتر بەو قەبوڵ کردنە زەواجەکە تەواو ئەبێ و پێك دێ، وە تەڵاق دانەکەشی دروست ئەبێت و ژنەکە ئەو مافەی هەیە خۆی تەڵاق بدات هەر کاتێ ویستی، چونکە قبوڵ کردنی پیاوەکە بۆ ژن هێنانەکە ئەبێت پاشان بۆ پێ سپاردنەکە.

بەڵام ئەگەر دەست پێکەرەکە پیاوەکە بوو، وەك ئەوەی بە ژنەکە بڵێت: تۆم مارەکرد لەسەر ئەوەی کاری خۆت بە دەستی خۆت بێت، هەر کاتێ ویستت خۆت تەڵاق بدەی. ژنەکەش بڵێت: قبوڵم کرد، بەوە ژن و مێردایەتی تەواو ئەبێت، بەڵام کار پێسپاردنەکە دروست نابێت، وە ژنەکە مافی ئەوەی نابێت خۆی تەڵاق بدات.

وە جیاوازی نێوان ئەو دوو شێوەیەش ئەوەیە کە لەشێوەی یەکەمدا، پیاوەکە خۆی پێ سپاردنەکەی قبوڵ کردووە دووای پێك هاتنی پەیمانەکە، ئیتر ژنەکەی کردۆتە خاوەنی تەڵاق دووای ئەوەی خۆی بووەتە خاوەنی بە تەواو بوونی پەیمانی ژن و مێردایەتیەکە.

بەڵام لە شێوەی دووەمدا، ژنەکەی ئەکاتە خاوەنی تەڵاق، پێش ئەوەی خۆی بوبێتە خاوەنی وپێش تەواو بوونی پەیمانی ژن و مێردایەتی، چونکە (إیجاب) ئەبێت هیچ بەدی نەهاتووە (واتە تەنها ئیجابی تێدایە).

## ئەو حاڵەتانەی قاضی ژنی تێدا تەڵاق ئەدات

ئەو حاڵەتانەی کە قازی ژنیان تێدا تـەڵاق ئـەدات لـە ئیجتهـادی زانایانـەوە وەرگیراوە، چـونکە دەقێکی ئاشکراو ڕاست لەو بارەیانەوە نەهاتووە، وە تەنها حاڵی خەڵکی تێـدا چـاودێری کـراوە بـۆ ئەوەی لەسەر خەڵك ئاسان بکرێت و دوور بێت لە گرانی، وە بـەپێی ئـەوەی کـە ئیـسلام ئـاینێکی ئاسانەو ڕێ ئاسان کەرە. وا لەخوارەوە ئەو حاڵەتانە ڕوون ئەکەینەوە:-

**تەڵاق دان لەبەر نەبوونی نەفەقە:**

ئیمامی مـالیك و شافیعی و ئەحمەد بۆ ئەوە چوون کە دروستە ژن و مێرد لە یەك جیابکرێنـەوە لەبەر نەبوونی نەفەقە بە حوکمی قازی ئەگەر ژنەکە خۆی داوای کـرد، بەمـەرجێ پیاوەکـە مـاڵێکی ئاشکرای نەبێ، وە بۆ مـەزهەبەکەشیان ئەمانەی لای خوارەوەیان کردۆتە بەڵگە:-

١- مێرد موکەللەفە کە ژنەکەی بەچاکی ڕابگرێ یا بەرەڵڵای بکات بە باشی بەپێی فـەرمودەی خوای گەورە کە فەرمویەتی: ﴿فَإِمْسَاكٌ بِمَعْرُوفٍ أَوْ تَسْرِيحٌ بِإِحْسَانٍ﴾ (البقرة: مـن الآیـة٢٢٩). وە بێگومـان نەبوونی نەفەقە پێچەوانەی ڕاگرتنیەتی بە چاکی.

٢-خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿وَلا تُمْسِكُوهُنَّ ضِرَاراً لِتَعْتَدُوا﴾ (البقرة: من الآیـة٢٣١)، ڕایـان مـەگرن بۆ ئەوەی زیانیـان پێبگات و ستـەمیان لێبکەن.

وە پێغەمبەر ( ﷺ )ئەفەرموێ (لاضرَرَ ولاضرار)[1] واتە: نە زیان کردن و نـە زیـان بـە خـەڵك گەیاندن دروست نیە. جا چ زیانێك بگـات بـە ژن لـەوە زیـاتر ئـەبێت کـە نەفەقـەی نەکێـشرێ. وە لەسەر قازی پێویستە ئەو زیانە نەهێڵێ.

٣- وە ئەگـەر بڕیـار درابێـت قـازی ژن و مێـرد لەیـەك جیابکاتـەوە لەبـەر بـوونی عـەیب بـە پیاوەکەوە، بە ڕاستی ئەو ئازارو ستەمەی کە بـە هـۆی نەفەقـە نەکێشانەوە تووشی ژن ئـەبێت زۆر زیاترو سەخت ترە لە بوونی عەیبی پیاوەکە.

لەبەر ئەوە لەیەك جیاکردنەوەیان لەبەر نەبوونی نەفەقە لە پێشترە.

وە حەنەفیەکان بۆ ئەوە چوون کە نابێت لەیەك جیابکرێنەوە لەبەر نەبوونی نەفەقـە، ئـیتر هـۆی نەبوونی ئەو نەفەقەیە نەدانی بێت، یاکەم دەستی، یان نەتوانایی، بەڵگەشیان بۆ ئەوە:-

---

(١) لەپێشەوە تەخریجی ئەم حەدیسە باس کرا.

١-خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿لِيُنفِقْ ذُو سَعَةٍ مِنْ سَعَتِهِ وَمَنْ قُدِرَ عَلَيْهِ رِزْقُهُ فَلْيُنفِقْ مِمَّا آتَاهُ اللَّهُ لاَ يُكَلِّفُ اللَّهُ نَفْسًا إِلاَّ مَا آتَاهَا سَيَجْعَلُ اللَّهُ بَعْدَ عُسْرٍ يُسْراً﴾ الطلاق: ٧.

واتە: با دەسەڵات دار بەپێی دەسەڵاتەکەی خۆی نەفەقە بکێشێت، وە ئەگەر خوا کەسێکی دەست کورت کرد، با لەوەی خوا پێی داوە نەفەقە بکێشێ، چونکە خوا داوا لە کەس ناکات زیاتر لەوەی کە پێی داوە، وە خوای گەورە دووای هەموو تەنگانەیەك خۆشی دێنێ.

لە ئیمامی زوهری پرسرا دەربارەی پیاوێك توانای نەفەقە کێشانی ژنەکەی نەبێت: ئایا لەیەك جیائەکرێنەوە؟ ئەویش فەرموی: ئارام ئەگرێ لەگەڵیدا، وجیایی ناخرێتە نێوانیان، وە ئایەتەکەی پێشووی خوێندەوە.

٢-صەحابەکان دەوڵەمەند و تەنگ دەستیان تێدا بوو، و نەزانراوە لە کەسیانەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) ژن و مێردێکی لەیەك جیاکردبێتەوە لەبەر نەبوونی نەفەقە بەهۆی هەژاری و تەنگ دەستیەوە.

٣- خێزانەکانی پێغەمبەر (ﷺ) داوای شتێکیان ئەکرد لە پێغەمبەر (ﷺ) کە نەی بوو، ئەویش ماوەی مانگێ لێیان دوور کەوتەوە[1] ئەوەش سزایەك بوو بۆیان، جا ئەگەر داواکردنی شتێك لە مێرد کە نەی بوو شیاوی سزا بێت، داواکردنی جیابوونەوە بەهۆی تەنگ دەستیەوە لە پێشترە کە ستەم بێت و هەر گوێشی پێ نەدرێ.

٤-وتویانە: ئەگەر نەدانی نەفەقە لەگەڵ دەسەڵات بووندا ستەم بێت، ئەوە ئەو هۆیەی ستەمەکەی پێ لابرێ فرۆشتنی ماڵەکەیەتی بۆ ئەوەی نەفەقەی لێ دەربکرێ، یا بگیرێ هەتا نەفەقەی ژنەکەی ئەکێشێ، وە نابێ لەیەك جیابکرێنەوە بۆ لابردنی ئەو ستەمە، کاتێك ڕێگای تر هەبێت بۆ لابردنی، وە ئەگەر بەو شێوەیە بێت نابێ قازی بەو هۆیە جیایان بکاتەوە لەیەك، چونکە جیاکردنەوە و تەڵاق بێزراوترین حەڵاڵە لای خوا لەلایەن ئەو مێردەی کە خۆی خاوەنی ئەو مافەیە، ئیتر قازی چۆن پەنا ئەباتە بەر ئەو جیاکردنەوەیە لەگەڵ ئەوەدا کە پێویست نییە، وە تەنها ڕێگایەکیش نییە بۆ لابردنی ئەو ستەمە،

ئەوە بۆ کەسێك توانای نەفەقەکێشانی هەبێت، بەڵام ئەگەر ئەو کەسە تەنگ دەست بوو ئەوە هیچ ستەم لەلایەن ئەوەوە نەبووە، چونکە خوا لەوە زیاتر کە داوێتێ داوا لەکەس ناکات وە لە یاسای ساڵی ١٩٢٠ برگەی (٤)دا هاتوە: (ئەگەر مێرد نەفەقەی ژنەکەی نەکێشا، ئەوە ئەگەر

---

(١) مسلم (١٤٧٨/٢٩).

ماڵێکی دیاری هەبوو. حوکم ئەدرێ بەسەریا بە نەفەقە کێشان لەو ماڵەی، وە ئەگەر ماڵێکی دیاری نەبوو وە نەشی وت کە دەست تەنگە یا دەست فراوانە، بەڵام هەر سوور بوو لەسەر نەفەقە نەدات، ئەو کاتە قازی یەکسەر تەڵاقی ئەدات. وە ئەگەر ئیددیعای نەتوانینی کرد، ئەوە ئەگەر سابتی نەکرد تەڵاقی ئەدات، وە ئەگەر سابتی کرد ماوەیەك مۆڵەتی ئەدات کە لەمانگ زیاد نەبێت ئەگەر هەر نەفەقەی نەکێشا تەڵاقی ئەدات).

بڕگەی (٥): ئەگەر مێردەکە غائیب بوو غائیبی نزیك، ئەوە ئەگەر ماڵێکی دیاری هەبوو حوکمەکە بەوە ئەسەپێ بەسەریا کە نەفەقە لەو ماڵەی دەربکرێ، بەڵام ئەگەر ماڵی دیاری نەبوو قازی لێی ئەبوورێ بەو ڕێگایانەی کەزاندراوە وماوەی بۆ دائەنێ، ئەگەر شتێکی نەنارد بۆ ژنەکە کە بۆخۆی سەرف بکات، یا خۆی نەهاتەوە نەفەقەی بکێشێ، جا ئەو کاتە قازی لەبری ئەو پیاوە تەڵاقی ئەدات لەدووای تەواو بوونی ماوەکە. بەڵام ئەگەر پیاوەکە لەشوێنێکی دوور بوو وە بە ئاسانی بەردەست نەئەکەوت، یا شوێنی نادیار بوو، یا وون بوو بوو، وە سابت بوو کە ماڵێکی نیە بکرێ بە نەفەقەی ژنەکەی، قازی ئەو ژنەی تەڵاق ئەدات. ئەو حوکمە ئەوانەش ئەگرێتەوە کە گیراون و تەنگە دەست بن.

بڕگەی (٦): تەڵاقدانی قازی لەبەر نەبوونی نەفەقە، بە تەڵاقی ڕەجعی دائەنرێ، و بۆ پیاوەکە ئەبێت ژنەکەی بگێڕێتەوە کاتێ کە چەسپا دەوڵەمەند بووە و ئامادەیە نەفەقەی ژنەکە بکێشێ لە کاتی عیددەکەیدا بەڵام ئەگەر نەچەسپا دەوڵەمەند بووبێت، وە ئامادەش نەبێت بۆ نەفەقەکێشان دروست نیە گێڕانەوەی.

**تەڵاق دان بە هۆی زیانەوە:**

ئیمامی مالیك[1] بۆ ئەوە چوو کە ژن بۆی هەیە داوا لە قازی بکات لە مێردەکەی جیای بکاتەوە ئەگەر ئیددیعای ئەوە بکات کە پیاوەکەی زیانی پێئەگەیەنێت زیانێکی وەها کە ناتوانرێ ژیان لەگەڵیا ببرێتە سەر لەناو کەسانی وەك خۆیانا، وەك ئەوەی: لێی بدات، یا قسەی پێ بڵێت یا ئازاری بدات بە جۆرێك کە تەحەمول نەکرێت، یا زۆری لێ بکات بۆ کردنی خراپە بە قسە یا بە کردەوە.

---

(١) هەر وەکو ئەوەیە مەزهەبی ئیمام ئەحمەدیش، بەڵام ئەبو حەنیفەو شافیعی لەمەدا جیاوازن، وە ڕایان وا نیە کە جیا بکرێنەوە لەبەر زیان، چونکە ئەکرێ ئەو زیانە لاببرێ بە سەرزەنش کردن و ناچار نەکردنی ژنەکە بۆ گوێ ڕایەڵی.

جا ئەگەر دەعوای ژنەکە سابت بوو لای قازی بە بەڵگەو شایەتی ژنەکە، یا دان پێدانانی مێردەکە، وە ئازارەکە بەجۆرێك بوو کە ناتوانرێ لەگەڵیدا ژیان ببرێتە سەر لەناو هاو وێنەی خۆیانا وە قازیش نەیتوانی چاکیان بکات ئەوە قازی تەڵاقی ئەدات بە تەڵاقێکی بائین.

وە ئەگەر نەیتوانی بەڵگەو شایەت بهێنێ، یان مێرد دانی بە شکایەتەکەیدا نەهێنا. جا کاتێ ژنەکە چەند جار شکایەتی دووبارە کردەوە و داوای جیابوونەوەی کرد، وە لەلای مەحکەمە ڕاستی داواکەی سابت نەبوو، قازی ئەبێ دوو حەکەم – ناوبژیکەر – دابنێ بەمەرجێ دوو پیاوی ژیری دادپەروەربن، وە خیبرەیان هەبێت بە حاڵی ئەو ژن و مێردە، وە توانای چاك کردنی نێوانیان هەبێت. وە وا چاکە لە کەس و کاری هەردوو لایان بن ئەگەر کرا. وە ئەگەر نەکرا لەکەسانی تر، وە پێویستە لەسەر ئەو دوو حەکەمە هۆی تێکچوونی ئەو ژن و مێردە بزانن، وە بەپێی توانایان یەکیان بخەنەوە، بەڵام ئەگەر نەیان توانی یەکیان بخەنەوە وخراپەش لە هەردوکیانەوە بوو، یا تەنها لە پیاوەکەوە بوو، یا ڕاستی‌یەکان دەرنەکەوتن، ئەبێ بڕیار بدەن لە یەکیان جیابکەنەوە بەتەڵاقێکی بائین[1]، بەڵام ئەگەر خراپەکە لەلایەن ژنەکەوە بوو، لەیەك جیاناکرێنەوە بە تەڵاق، بەڵکو بە داماڵین (خولع) لەیەك جیائەکرێنەوە.

بەڵام ئەگەر دوو حەکەمەکە ڕایان یەك نەکەوت ئەبێ قازی فەرمانیان پێ بدات کە دووبارە گەڕان و لێکۆڵینەوە بکەنەوە، ئەگەر دووای ئەوەش هەر ڕێك نەکەوتن ئەبێ بیانگۆڕێ بە دوو حەکەمی تر. وە لەسەر هەردوو حەکەم پێویستە ئەوەی ڕای هەردوکیان لەسەری جێگیرە بەرز بکەنەوەو بیگەیەنن بە قازی. وە پێویستە لەسەر قازی حوکمەکەیان جێبەجێ بکات. وە بنەڕەتی هەموو ئەوانەش فەرموودەی خوای گەورەیە کە ئەفەرمووێ: ﴿وَإِنْ خِفْتُمْ شِقَاقَ بَيْنِهِمَا فَابْعَثُوا حَكَماً مِنْ أَهْلِهِ وَحَكَماً مِنْ أَهْلِهَا إِنْ يُرِيدَا إِصْلاحاً يُوَفِّقِ اللَّهُ بَيْنَهُمَا﴾ (النساء: من الآية٣٥)، واتە: وە ئەگەر ترسی ئەوەتان هەبوو ژن و مێردەکە لەگەڵ یەکدا تێك بچن، ناوبژی کەرێك لەکەس وکاری پیاوەکە و یەکێکیش لەکەس وکاری ژنەکە بنێرن بۆ لایان. ئەگەر ئارەزووی یەك کەوتنەوەیان هەبوو خوا یەکیان ئەخاتەوە، وە خوای گەورە ئەفەرمووێ: ﴿فَإِمْسَاكٌ بِمَعْرُوفٍ أَوْ تَسْرِيحٌ بِإِحْسَانٍ﴾

(١) ئەبو حەنیفەو ئەحمەدو شافیعی – لەیەکێ لە قەولەکانیدا – بۆ ئەوە چون کە دوو حەکەم ناتوانن تەڵاق بخەن مەگەر مێردەکە ڕایان بسپێرێ. وە مالیك و شافیعی ووتویانە: ئەگەر بە باشیان زانی کە بریتی یا بێ بریتی ڕێکیان بخەن دروستە، وە ئەگەر خولعیان بەباش زانی هەر دروستە، وە ئەگەر ئەو یەکەیان کە لەلایەنی مێردەوەیە تەڵاقی بە باش زانی تەڵاقی ئەدات، وە پێویستی بە ئیزنی مێردەکە نی‌یە لەو تەڵاقەدا، ئەمە لەسەر ئەوە دامەزراوە کە حەکەم بن نەك وەکیل.

(البقرة: من الآية٢٢) واتە: یا ڕاگرتنی بە چاکە یا بەرەڵڵاکردنێتی بەباشە. لەم کاتەدا ڕاگرتنی بە چاکە لەدەست چووە، کەوابێ ئەوەی ماوەتەوە بە باشی بەرەڵڵا کردنە. وە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (لاضرر ولاضرار) واتە: نە زیان کردن و نە زیان پێ گەیاندن دروست نییە.

وە لەیاسای ژمارە ٢٥ی ساڵی ١٩٢٩. بڕگەی (٦)دا هاتووە: (ئەگەر ژ" ئیددیعای ئەوەی کرد کە مێردەکەی زیانی پێ ئەگەیەنێ بە شێوەیەکی وا کە ناتوانرێ ژیان لەگەڵیدا بریتە سەر لەناو هاو وێنەکانی خۆیانا، دروستە ئەو ژنە داوا لە قازی بکات کە جیایان بکاتەوە، وە لەو کاتەدا قازی تەڵاقێکی بائینی ئەدات بە مەرجێك زیانەکە سابت بوو، وە قازیش نەیتوانی ڕێکیان بخات. بەڵام ئەگەر داوای ژنەکە ڕەت کرایەوە پاشان چەند جارێکی تر سکاڵای کردەوە، وە زیانەکەش سابت نەبوو، قازی دوو حەکەم ئەنێرێ و حوکم ئەدا بەو شێوەیەی کە لە بڕگەکانی (٧ و ٨ و ٩ و ١٠ و ١١)دا ڕوون کراوەتەوە.

بڕگەی (٧): وە مەرجە هەردوو ناوبژی کەرەکە دوو پیاوی دادپەروەر بن لەکەس و کاری ژن و پیاوەکە بن بەپێی توانا، وە ئەگەر ئەوە نەکرا با خەڵکی تر بن لە بێگانە، وە لەو کەسانە بن کە ئاگادارن بە حاڵیان، وە بەتواناش بن بۆ یەکخستنەوەیان.

بڕگەی (٨): لەسەر ناوبژیکەرەکان پێویستە کە هەوڵی زانینی هۆکاری ئەو تێکچوونەیان بدەن و هەوڵ بدەن. کە چاکیان بکەنەوە، جا ئەگەر توانرا لەسەر ڕێگەیەك بێت کە هەردووکیان بڕیاری لەسەر بدەن ئەوە بڕیار ئەدەن .

بڕگەی (٩): ئەگەر ناوبژی کەرەکان نەیان توانی یەکیان بخەنەوە و خراپەکە لە پیاوەکەوە بوو یا لەهەردووکیانەوە بوو، یا بۆیان ڕوون نەبوەوە، دروستە بڕیاری جیابوونەوەیان بدەن بە تەڵاقێکی بائین.

بڕگەی (١٠): ئەگەر حەکەمەکان ڕێك نەکەوتن لەنێوان خۆیاندا، ئەبێ قازی فەرمانیان پێ بداتەوە بە گەڕان و تەحقیق کردن، بەڵام ئەگەر هەر جیاوازییان هەبوو کەسانێکی‌تر ئەکرێن بە ناوبژی‌کەریان.

وە لەسەر دوو حەکەمەکە پێویستە ئەوەی بڕیاریان لەسەر داوە بەرزی بکەنەوە بۆ لای قازی وە لەسەر قازیش پێویستە بەپێی ئەوە حوکم بکات.

**تەڵاق دان بەهۆی دیار نەبوونی مێردەوە:**

تەڵاق دان بەهۆی دیارنەبوونی مێردەوە مەزهەبی مالیك و ئەحمەدە[1]، بۆ لابردنی زیـان لەسـەر ژنەکە, وە بۆ ژنەکە هەیە کە داوای جیابوونەوە بکات ئەگەر مێردەکەی دیار نەبوو بـا ماڵیشی بێ لێ‌ی سەرف بکات بەمەرجی ئەوەی:

١- کە دیار نەبوونی پیاو بەهۆی بەهانەیەکی قبوڵ کراوەوە نەبێت.

٢- ئەو ئافرەتە بەدیار نەبوونی تووشی زیان بێت.

٣- ئەو دیار نەبوونە بەس لەو شارەدا نەبێت کە خۆیان تێی‌دا جێنشینن.

٤- ساڵێك تێپەڕێ ژنەکە لەماوەی ئەو ساڵەدا هەر تووشی زیان بووبێت,

بەڵام ئەگەر غائیب بوونەکەی بەهۆیەکی مەقبوولەوە بـوو: وەك ئەوەی چووبێت فێـری زانیـاری بێت، یا بەکاری بازرگانی‌یەوە چووبێت، یا کارمەند بێت لەدەرەوەی شارەکەدا، یا سـەرباز بێـت لـە شوێنێکی دوور, ئەوە لەم حاڵەتانەدا دروست نـی‌یـە داوای جیابوونـەوە بکـات، وە هـەروەها ئەگـەر غائیب بوونەکەی هەر لەو شوێنەدا بێت کە ژنەکە نیشتەجێ‌یە تێیدا.

وە هەروەها ژن مافی هەیە داوای جیابوونەوە بکات, بەهۆی ئەو زیانەوە کـە پێـی ئـەگات لەبەر دووری مێرد لێوەی نەك بـە هـۆی غائیـب بـوونی. وە هـەر ئـەبێت سـاڵێك تێپـەڕ بێـت کـە زیـان لێکەوتنی ژنەکە بێتە دی و هەست بەترس و تەنهایی بکات تێیدا, وە ئەو ژنـە لـەخۆی بترسـێ کـە بەو هۆیەوە بکەوێتە حەرامەوە.

وە دانانی بە ساڵێك قسەیەکە لە ئیمـامی مـالیکەوە[2]، وە ووتـراوە: ئـەبێ سـێ سـاڵ بێـت. وە ئەحمەد ڕای وایە: کـە کـەمترین مـاوە کـە دروسـتە ئـافرەت تێیـدا داوای جیابوونـەوە بکـات شـەش مانگە، چوونکە ئەو پەڕی مـاوەیـە کـە ژن ئـەتوانێ ئـارام بگـرێ لەسـەر دیـار نـەبوونی مێـرد وەك لەپێشەوە باس کرا، کە عومەر پرسی لە حەفصـە و فەتوای حەفصە خوا لێیان ڕازی بێت.

**تەڵاق دان بە هۆی بەند کردنی مێردەوە:**

وە ئەوەی دێتە ناو ئەو باسەوە- لای مالیك و ئەحمەد- تەڵاقدانە بەهۆی بەنـد کردنـی مێـردەوە، چونکە گیانی پیاو زیان ئەدات لە ژن، لەبەر دووری لێوەی. جا ئەگـەر حـوکم درا بـۆ مـاوەی سـێ

---

(١) ئیمامی مالیك ڕای وایە کە ئەوە تەڵاقی بائینە، وە ئیمامی ئەحمەد ڕای وایە کە (فسخ) هەڵوەشاندنەوەیە.

(٢) مەبەست بەو ساڵە ساڵی مانگی‌یە.

ساڵ، یان زیاتر، وە حوکمەکە حوکمی کۆتایی بوو، وە جێبەجێ کرا بەسەر پیاوەکەدا و ساڵێك زیاتر تێپەڕی لەبەردوامی جێبەجێ کردنیەوە، بۆ ژنەکە هەیە داوا لە قازی بکات تەڵاقی بدات لەبەر زیان پێ گەیشتنی بەهۆی دوور بوونی مێردەوە لێی.

جا ئەگەر ئەوە چەسپا قازی تەڵاقێکی بائینی دەدات لای مالیك، وە لای ئەحمەد بە هەڵوەشاندنەوە دائەنرێت. ئیبنو تەیمیە وتویەتی: لەسەر ئەوە حوکم دان لەبارەی ئەو ژنانەوە کە مێردەکانیان بە دیل گیرابێت یا بەند کرابێت وە وێنەی ئەو دوانە وەك کەسێك کە گران بێت ژنەکەی سوودی لێ وەربگرێت هەر وەك حوکم دانە لەبارەی ژنی ون بووەوە بە ئیجماع.

ئەمما جیابوونەوە بەهۆی عەیبەوە لە پێشەوە باس کرا.

## الخلع (داماڵین)

ژیانی ژن‌و مێردایەتی ڕاناوەستێ ئیللا لەسەر خۆشەویستی و بەزەیی‌و دۆستایەتی و تێکەڵی جوان نەبێت, وە هەروەها بەجێ‌هێنانی ئەو مافانەی کە لەسەر هەریەکە لە ژن و مێرد پێویست کراوە. جاری وا ئەبێت پیاو ژنەکەی خۆی خۆش ناوێت, یا ژنەکە ڕقی لە پیاوەکە ئەبێت.

وە ئیسلام لەم حاڵەتەدا داوای ئارام گرتن و دان بەخۆدا گرتن ئەکات, وە داوا ئەکات بە چارەسەرکردنی ئەو شتانەی لەوانەیە بوبێتە هۆی ئەو ڕق لێ‌بوونە, خوای گەورە ئەفەرمووێ: ﴿وَعَاشِرُوهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ فَإِنْ كَرِهْتُمُوهُنَّ فَعَسَى أَنْ تَكْرَهُوا شَيْئاً وَيَجْعَلَ اللَّهُ فِيهِ خَيْراً كَثِيراً﴾ (النساء: من الآية١٩). واتە: با هاوەڵیتان بۆ ژنەکانتان لەسەر ڕێزو خۆشەویستی دابمەزرێت، جا ئەگەر ڕقتان لێ‌یان بوو ئارام بگرن، لەوانەیە شتێك ئێوە لاتان ناخۆش بێت، وە خوا خێرێکی زۆری تێدا دانابێت

وە لە حەدیسی صەحیح دا هاتووە کە ئەفەرمووێ: (لا يفرك مؤمن مؤمنة، إن كره منها خلقاً رضي منها خلقاً آخر)[1] واتە: نابێت مسوڵمان ڕقی لە ژنی مسوڵمان بێت, ئەگەر ڕقی لە ڕەوشتێکی بێت لە ڕەوشتێکی تری ڕازی ئەبێت،

بەڵام جاری وا ئەبێت کە ڕق و کینە پەرە ئەسێنێ و دوبەرەکی توند و تیژ ئەبێت، بەشێوەیەك چارەکردنی زۆر گران ئەبێت و توانای ئارامگرتنی نامێنێت, وە ئەو خۆشەویستی و سۆز و ڕێزو ماف بەجێ هێنانە کە خێزانی لەسەر دامەزراوە ئەڕوات. وە ژیانی ژن و مێردایەتی وای لێ دێت ئیتر چارەسەر ناکرێ، لەم کاتانەدا ئیسلام ڕێ ئەدات بە تاکە چارەسەرێك کە ئەبێت هەر ببێ,

جا ئەگەر ڕق و کینەکە لەلایەن پیاوەکەوە بێت, ئەوە تەلاقی بەدەستە, وە تەلاقیش مافێکە لە مافەکانی‌و بۆی هەیە بەکاری بهێنێ لەو سنوورەدا کە خوا دایناوە, بەڵام ئەگەر ڕق و کینەکە لەلایەن ژنەکەوە بوو, ئەوە ئیسلام بەڕەوای داناوە بۆی کە خۆی لەو ژن و مێردایەتی‌یە ڕزگار بکات بەڕێگای داماڵین (خلع), ئەویش بەوە ئەبێت کە چی لەو پیاوە وەرگرتووە بەناوی ژن و مێردایەتی‌یەوە بیداتەوە بۆ ئەوەی پەیوەندی‌یان بپچڕێ و نەمێنێ, لەو بارەیەوە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَلا يَحِلُّ لَكُمْ أَنْ تَأْخُذُوا مِمَّا آتَيْتُمُوهُنَّ شَيْئاً إِلَّا أَنْ يَخَافَا أَلَّا يُقِيمَا حُدُودَ اللَّهِ فَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا يُقِيمَا حُدُودَ اللَّهِ فَلا جُنَاحَ عَلَيْهِمَا فِيمَا افْتَدَتْ بِهِ﴾ (البقرة: من الآية٢٢٩), واتە: دروست نی‌یە بۆتان هەرچی پێکتان داوێت بەژن لە مارەیی و شتی وا لێ‌ی بسێننەوە, مەگەر ژن

---

(١) مسلم (١٤٦٩).

و مێرد ترسی ئەوەیان هەبێت کە مافەکانی ژن و مێردایەتی جێ بەجێ ناکەن، جا ئەو کاتەی ئەو ترسەتان هەبوو تاوان نییە بۆیان لەوەدا کە ژنەکە ئەیدات بە مێردەکە لەبری تەڵاقدانی،

وە لەوەرگرتنی بریتیدا لەلایەن مێردەوە ڕاستی و عەدالەت هەیە, چونکە هەر پیاوەکە مارەیی داوەو مەسرەفی ژن هێنان و شایی کردوەو نەفەقەی کێشاوە، وە ژنەکەیە کە بەرامبەر ئەوانە بێئەمەکی ئەکات و داوای جیابوونەوە ئەکات، کەواتە عادلانەیە کە هەرچی وەرگرتووە بۆی بگێڕێتەوە.

وە ئەگەر ڕق و کینەکە لە هەردوکیانەوە بوو: ئەوە ئەگەر پیاوەکە داوای جیابوونەوەی کرد ئەوە تەڵاقی بەدەستەوە هەرچی بەدوایدا هات ئەبێ جێبەجێی بکات. بەڵام ئەگەر ژنەکە داوای جیابوونەوەی کرد, خولعی بەدەستەوە هەرچی بەدوایدا بێت لەسەریەتی جێبەجێی بکات.

ئەڵێن داماڵین لەسەردەمی نەفامیدا ڕووی داوە, ئەویش ئەوە بووە: کە عامیری کوڕی (ظرب) کچەکەی خۆی دا بەبرازاکەی خۆی کە ناوی عامیری کوڕی حاریث بووە، کاتێ گواستویەتیەوەو چووەتە لای، کچەکە لێی هەڵاتووە, ئەویش لای باوکی کچەکە شکاتی لێ کردووە, باوکیشی پێی ووتوە: جیابوونەوەی ژنەکەت و ماڵەکەشت لەسەر کۆناکەمەوە ئەوە لە تۆم داماڵی بەوەی چیت داوەتێ بتدەمەوە.

پێناسەی (خولع) داماڵین:

ئەو داماڵینەی ئیسلام بە ڕەوای داناوە لە داماڵینی جلو بەرگەوە هاتووە, کە لەبەر دائەماڵرێ، چونکە ژن پۆشاکی پیاوەو پیاویش پۆشاکی ژن, خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿هُنَّ لِبَاسٌ لَكُمْ وَأَنْتُمْ لِبَاسٌ لَهُنَّ﴾ (البقرة: من الآية۱۸۷), واتە: ئەوان پۆشاکن بۆ ئێوە وە ئێوەش پۆشاکن بۆ ئەوان.

وە بە فیداش (واتە سەربەها) ناو ئەبرێ چونکە ژن بریتی ئەدا بە پیاوەکە تا خۆی ڕزگار بکات, زانایان بەوە پێناسەیان کردووە کە (وازهێنانی پیاوە لە ژن بە بریتییەك کە دەستی بکەوێ).

بنەماکەشی ئەوەیە کە بوخاری و نەسائی لە ئیبنوعەبباسەوە ئەگێڕنەوە کە فەرمویەتی: ژنەکەی ثابتی کوڕی قەیسی کوڕی شەمّاس هاتە لای پێغەمبەر ﷺ ووتی: ئەی نێرراوی خوا من لارێم

نىیـه لەڕەوشـتو ئـاینى مێردەكـەم، بەڵام مـن ناسوپاسـى و ئینكـارى نیعمـەتم پـێ ناخۆشـه لـه ئیسلامـدا[1].

لەبەر ئەوە ئەمەویَ لـێی جیاببمەوە، پێغەمبـەر ﷺ فەرمووی: باغەكەی كه له مارەییـدا وەرت گرتووە بۆی ئەگێڕیتەوە؟ ووتی: بەڵێ، پێغەمبەر ﷺ بە پیاوەكـەی فـەرموو: باغەكـه وەربگـرەوە و تەلاقێكى بدە.

**لەفزەكانى خولع داماڵین:**

وە زانایان ڕایان وایه كه له داماڵین دا ئەبێت به وتەو لەفزى داماڵین بووترێ یا لەفزێك كـه لـەو ووشەیه پێك هاتبێ، یا له فزێك ئەو واتایه ببەخشێ، وەك ووشەی خۆ ڕزگـاركردن و لـەجیاتى دان. جا ئەگەر به لەفزى داماڵین نەبوو یا به لەفزێك نەبوو ئەو مانایه ببەخشێ. وەك ئـەوەی بڵێـت: تـۆم تەلاق دا بەرامبەر بڕی ئەوەنـدە پـاره، ژنەكـەش قبـوڵى كـرد، ئـەوە تـەلاق دانـه لەسـەر مـاڵ نـەك داماڵین. ئیبنوقەییم لـەم باسـه كۆڵیوەتەوەو ووتویـەتى: هەركـەس سـەیرى بنـەڕەتى پەیمانـەكان و مەبەستەكانى بكات جگه لـه لـەفزەكانى. واى دائـەنێ كـەداماڵین هەڵوەشـاندنەوەیه ئیتر بـه هـەر لەفزێك بێت، هەتا به لەفزى تەلاقیش بێت.

ئەمــەش یەكێكـه لـەڕووەكانى هــاوەڵانى ئەحــمەد. هــەروەها هەڵبــژاردەی ئیبنـو تەیمییەیـه, و لەئیبنوعەبباسیشەوە نەقڵ كراوە.

پاشان ئیبنو تەیمیـیه فەرمویەتى: هەركەس حیساب بۆ لەفزەكان بكات و لەسەریان بوەسـتێت، وە له ئەحكامى پەیمانەكاندا ئیعتبـارى بـۆ دانابـێ، ئـەوە ئەگـەر داماڵین بەلـەفزى تـەلاق بـووترێ ئەیكات بـه تـەلاق. لەپاشـاندا ئیبنوقـەییم ئـەم ڕایـه پـێش ئـەخات و ئـەڵێ: بنـەماكانى شـەرع و ئەسـڵەكانى شـاهیدى ئـەوەن كـه ئـەوەی ئـەبێ چـاودێرى بكـرێ لـه پەیمانەكانـدا حەقیقـەت و ماناكانیـەتى، نەك شێوەكانى و لەفزەكانى

وە ئەوەی ئەبێتە بەڵگەی ئەوە، ئەوەیه كه پێغەمبـەر ﷺ بـه ثـابتى كـوڕى قەیـسى فـەرموو: كـه ژنەكەی له خولعا یەك تەلاق بدات، وە لەگەڵ ئەوەشدا فەرمانى دا بەژنەكه تـەنها بەیـەك بێنوێژى عیددە بگرێت, وە ئەمەش ئاشكرایه كه ئەوە هەڵوەشاندنەوەیه، وە با بەلەفزى تەلاقیش بووبێت.

---

(١) واته: ئەو ژنه نەیدەویست لەبەر خراپى خوو ڕەفتارى لێی جیا بێتەوە، بەڵكو لەبەر ناشیرینییەكەی قینى لێی بوو، وە پێی ناخۆش بوو قینەكەی واى لێ بكات كه مافەكانى بفەوتێنێ، مەبەست به كوفریش ناسوپاسى مێردە.

وە هەروەها خوای گەورە حوکمی فیدیەی پێوە بەستووە چونکە فیدیەیە, وە ئاشکراشە کە فیدیە تایبەت نی‌یە بە لەفزەوە, وە خوای گەورە لەفزێکی دیاری کراوی بۆ دانەناوە. وە تەڵاقی فیدا وبریتی تەڵاقێکی بەستراوەیە ناچێتە ژێر حوکمەکانی تێکڕای تەڵاقەوە، هەر وەك گێڕانەوەو عیددەی سێ مانگ ناچێتە نێو ئەحکامەکانی‌یەوە بە سوننەتی سابت[1].

**بریتی لە خولعا:**

خولع - داماڵین - وەك لە پێشەو باس کرا-، لابردنی خاوەنێتی نیکاحە بەرامبەر بە ماڵ کەواتە بریتی دان بەشێکی بنەڕەتی‌یە لە داماڵیندا، ئەگەر بریتی نەیەتەدی داماڵینەکەش نایەتەدی، ئەگەر پیاوەکە بە ژنەکەی ووت: تۆم لەسەر خۆم داماڵی، ئینجا بێ دەنگ بوو و هیچی تری نەوت. ئەوە نابێتە داماڵین, لەپاشاندا ئەگەر نی‌یەتی تەڵاقی هێنابوو، ئەبێ بە تەڵاقێکی ڕەجعی، وە ئەگەر نی‌یەتی هیچی لێ نەهێنابوو هیچ تەڵاقی پێ ناکەوێ، چونکە لە لەفزەکانی کینایەتە کە پێویستی بەنی‌یەت هەیە.

**هەرچی دروست بێت بکرێ بەمارەیی دروستیشە لە خولعا بکرێ بە بریتی:**

شافیعی‌یەکان بۆ ئەوە چوون کە بۆ دروست بوونی داماڵین هیچ جیاوازی نی‌یە لەسەر مارەیی‌یەکە بیت، یا لەسەر هەندێکی، یا لەسەر ماڵێکی تر، جا کەمتر لە مارەیی‌یەکە بێت یا زۆرتر، وە جیاوازی نی‌یە لە نێوان ئەوەدا کە عەین بێت یا قەرز یا سوود لێ وەرگرتن بێت.

وە قاعیدەش ئەوەیە کە: هەرچی دروست بێت بکرێتە مارەیی دروستیشە بکرێت بە بریتی لە داماڵیندا. بەپێی گشتی‌یەتی فەرمودەی خوای گەورە کە ئەفەرموێ: ﴿فَلا جُنَاحَ عَلَيْهِمَا فِيمَا افْتَدَتْ بِهِ﴾ (البقرة: من الآية٢٢٩) تاوان نی‌یە بۆیان لەوەدا کە ژنەکە بریتی بدات بە پیاوەکە.

وە چونکە پەیمانێکە لەسەر (بضع), کەواتە لە نیکاح ئەچێت، وە بە مەرج گیراوە لە بریتی خولعا کە دیار بێت و وەرگیراوبێت، لەگەڵ هەموو مەرجەکانی بریتی‌دا, وەك توانای پێدان و بوونە خاوەنێتی و شتی تر, چونکە داماڵین پەیمانی ئاڵوگۆڕە لە کڕین و فرۆشتن و مارەیی ئەچێ, وە ئەوەش ڕاستە لە خولعی صەحیحدا.

بەڵام لە خولعی فاسیددا زانین بەو شتە دیاری نەکراوە، جا ئەگەر لەسەر شتێکی نادیاری وەك جل و بەرگێکی دیاری نەکراو، خولعی لەگەڵدا بکات، یا لەسەر باری ئەو ووڵاغە، یان خولعی لەگەڵدا بکات لەسەر مەرجێکی فاسید، وەك ئەوەی نەفەقەی نەکێشێ ئەگەر دووگیان بوو, یا جێ

---

(١) زاد المعاد (ص٢٧ ج٤).

و شوێنی بۆ دابین نەکات، یا لەسەر (هەزار) خولعی لەگەڵدا بکات بۆ ماوەیەکی دیاریٔ نەکراوو ئەو جۆرە شتانە، ئەوە لیٚی جیا ئەبێتەوەو بائین ئەبێت بە (مهر المثل).

جیابونەوەکە لەبەر ئەوەیە کە خولع یا هەڵوەشاندنەوەیە، یا تەڵاقە، جا ئەگەر هەڵوەشاندنەوە بێت نیکاحەکە فاسید نابێت بە فاسیدێتی بریتیٚیەکە، وە هەڵوەشاندنەوەکەشی هەروایە، چونکە هەڵوەشاندنەوەکان ڕەنگ دانەوەی پەیمانەکانە، بەڵام ئەگەر تەڵاق بێت، تەڵاق بیٚ بریتیش ئەبێت، وە هەرچی بیٚ بریتی پێك بێت ئەوە لەگەڵ بریتی فاسیدا چاکتر پێك دێت، وەك نیکاح، بەڵکو لەپێشترە، وە لەبەر بەهێزی تەڵاق و تەنینەوەی.

ئەما گەڕانەوە بۆ مارەیی هاو وێنە (مهر المثل) لەبەر ئەوەیە کە کێشەی تێکدانی بریتیٚیەك گێڕانەوەی بریتیٚیەکەی ترە. وە شەرمگەش (بضع) دوای جیابوونەوەی ژن و مێرد ناگێڕێتەوە، کەواتە واجبە بریتیٚیەکەی ڕەت بکرێتەوە، وە ئەوەی باسمان کرد هەرچی لەوە بچێت پێوانە ئەکرێت لەسەری، چونکە ئەوەی پایە نەبێت لە شتێکدا، نەزانین پیٚی زیانی نیٚیە وەك مارەیی، بۆ نمونە:

ئەگەر پیاوێك ژنەکەی داماڵی لەسەر ئەوەی کە لە دەستی ژنەکەدایەو نەشی زانی چیٚیە، ئەوە بە (مهر المثل) لیٚی جیا ئەبێتەوەو ئەبێتە تەڵاقی بائین. وە ئەگەر هیچی لە دەستدا نەبوو ئەوە لە (الوسیط) دا هاتووە کە تەڵاقیکی ڕەجعی ئەکەویٚ، بەڵام ئەوەی نەقڵ کراوە لە کەسانی ترەوە ئەوەیە کە تەڵاقی بائینی ئەکەویٚ بە (مهر المثل).

بەڵام مالیکیٚیەکان ووتویانە: دروستە داماڵین بە ماڵی نادیار وەك کۆرپەلەی زگی مانگاو شتی تر، جا ئەگەر کۆرپەلەکە لەبار چوو ئیتر هیچی ناکەویٚ و دەست بەرداریشی نەبیٚ و ئەبێت بە بائین.

وە خولع دروستە بەشتێك کە وەسف نەکرابیٚ چۆنە، وە بە بەری دارێك کە پیٚ نەگەیشتبیٚ، وە بەوەی کە بەخێو کردنی منداڵەکەی لیٚ بخات. بەمانە دروستەو مافەکەش بۆ پیاوەکە جیٚبەجیٚ ئەبێت. وە ئەگەر خولعی کرد بە شتێکی حەرام، وەك عارەق، یا شتێکی دزراو کە بزانیٚ دزراوە، هیچی ناکەویٚ و دەست بەرداریشی ئەبێت بە تەڵاقی بائین و ئەبیٚ ئارەقەکە بڕێژریٚ و دزراوەکە بدرێتەوە خاوەنی، وە ژنەکە لەجیاتی ئەوە شتێکی تری ناداتیٚ، بە مەرجیٚ پیاوەکە بە حەرامێتی ئەو شتەی زانیبێت، جا ژنەکە زانبێتی یانەی زانیبێت. بەڵام ئەگەر ژنەکە بە حەرامێتی ئەو شتەی زانیبیٚ بیٚ ئەوەی پیاوەکە بزانێت ئەوە خولعەکەی سابت نابیٚ بەسەردا.

**زیادە وەرگرتن لە خولعدا لەوەی کە ژن لە پیاوی وەرگرتووە:**

جەماوەری زانایان بۆ ئەوە چوون کە دروستە مێرد لەوە زیاتر وەرگرێ کە ژنەکەی لێی وەرگرتووە، بەپێی فەرموودەی خوای گەورە کە ئەفەرموێت: ﴿فَلا جُنَاحَ عَلَيْهِمَا فِيمَا افْتَدَتْ بِهِ﴾ (البقرة: من الآية٢٢٩) واتە: تاوان نییە بۆیان لەوەدا کە ژنەکە ئەیدات بە مێردەکەی لە بریتی تەلاقدانی. وە ئەمەش گشتییە کەم و زۆر ئەگرێتەوە.

بەیهەقی لە ئەبی سەعیدی خودرییەوە ئەگێڕێتەوە کە فەرمویەتی: خوشکێکم ژنی پیاوێکی ئەنصاری بوو. ناکۆکییەکەیان گەیاندە لای پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: ئەو باغەی کە لێت وەرگرتووە بۆی ئەگێڕێتەوە؟ ژنەکە ووتی: بۆشی زیاد ئەکەم، ئیتر باغەکەی بۆ گێڕاوە بە زیادەوە[1].

وە هەندێ لە زانایان ڕایان وایە: دروست نییە پیاو لەوەزیاتر وەربگرێ کە داویەتی بە ژنەکە، بە پێی ئەوەی (دارقطني) گێڕاویەتییەوە بە ئیسنادێکی صەحیح: کە ئەبو زوبەیر ووتویەتی: کە ئەو پیاوە باغێکی کردبووە مارەیی. پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: باغەکەی ئەدەیتەوە کە داوێت پێت, ئەویش ووتی: بەڵێ بەزیادەوە, پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: زیادە نابێت، بەڵام تەنها باغەکەی. ئەویش ووتی: بەڵێ باشە[2].

وە بنەمای جیاوازییەکە لەم کێشەیەدا جیاوازییە لەتایبەت کردی گشتێتی ئایەت بە فەرموودەی (آحاد). جا ئەوەی کە پێی وایە گشتییەتی ئایەت بەو فەرموودانەی کە (آحاد)ن تایبەت ئەکرێت، ئەڵێ: ئەو زیادەیە دروست نییە، وە ئەوەی بۆ ئەوە چووە کە گشتییەتی ئایەت بە فەرموودەی (آحاد) تایبەت ناکرێ، ڕای وایە کە زیادەکە دروستە.

لە (بداية المجتهد)دا هاتووە ووتویەتی: کەسێك ئەو بریتییە بچوێنێ بە بریتی مامەڵەکانی تر، ڕای وایە کە ئەندازەی ئەو بریتییە دەگەڕێتەوە بۆ ڕەزامەندی، وە کەسێك بە ڕواڵەتی حەدیسەکە کار بکات ڕای وایە لەوە زیاتر بێت دروست نییە, وەك بڵێی وائەزانێ کە لە بابی وەرگرتنی ماڵی خەڵکە بەناهەق.

(١) البخاري (٥٢٧٣) والنسائي (٦/١٦٩) والبيهقي (٧/٣١٣و٣١٤). وە زانایانی حەدیس ئەڵێن ئەم حەدیثە لاوازە.

(٢) الدارقطني (٣/٢٥٥).

**خولع بە بێ پێویستی:**

خولع کاتێ دروستە کە هۆیەك هەبێت پێویستی بکات، وەك ئەوەی پیاوەکە عەیب دار بێت لەڕووی لاشەوە، یا ڕەوشتی خراپ بێت، یا مافی ژنەکە بەجێ نەهێنێ، وە ژنەکە ترسی ئەوەی هەبێت کە سنوورەکانی خوا ڕانەگرێ، لەو شتانەی کە لەسەری پێویستە لە دۆستایەتی چاکو هاوژینی بە شێوەیەکی جوان. وەك ڕواڵەتی ئایەتەکە نیشانی ئەدات.

بەڵام ئەگەر هۆیەك نەبێت ئەوکارە پێویست بکات قەدەغەیە. بەپێی ئەوەی ئەحمەدو نەسائی ئەگێڕنەوە لە حەدیسی ئەبی هورەیرەوە: (المختلعات هن المنافقات)[1] واتە: ئەو ئافرەتانەی خولع ئەکەن ئەوان مونافیقن. وە زانایان بە کەراهەتیان داناوە.

**خولع بە ڕازی بونی ژن و مێردە:**

خولع ئەبێت بە ڕەزامەندی ژنو مێرد هەردوکیان بێت.

بەڵام ئەگەر ڕازی بوون تەواو نەبوو لەنێوان هەردووکیاندا قازی بۆی هەیە بەزۆر پیاوەکە ڕازی بکات بە خولع، چونکە ثابت و ژنەکەی کارەکەیان گەیاندە لای پێغەمبەر ﷺ وە پێغەمبەر ﷺ زۆری لێ کرد کە باغەکەی خۆی قبوڵ بکاتەوەو تەڵاقی بدات. وەك لە حەدیسەکەدا باس کرا.

**ناکۆکی لە لایەن ژنەکەوە بەسە بۆ خولع:**

شەوکانی ووتویەتی: حەدیسەکانی ئەم بەشە بە ڕواڵەت وا دەرئەخەن کە تەنها ناکۆکی لەلایەن ژنەوە بەسە بۆ دروستی خولع. وە ئیبنو مونذیر ئەوەی هەڵبژاردووە کە خولع دروست نیەیە هەتا ناکۆکی لە نێوان هەردوك لایاندا نەبێت، وە بە ڕواڵەتی ئایەتەکە کاری کردووە. وە طاووس و (شعبی)و کۆمەڵێك لە تابیعیەکانیش ئەوەیان ووتوە . . وە کۆمەڵێك کە یەکێك لەوانە (طبری)یە وەڵامی ئەوەیان بەوە داوەتەوە: کە مەبەست ئەوەیە ئەگەر ژنەکە هەڵنەسا بە بەجێ هێنانی مافی مێرد ئەوە ئەبێتە هۆی ڕق و کینەی مێردەکە بۆی, بەوەش سەرپێچی کردنەکە ئەدرێتە پاڵ ژنەکە, وە ئەوەی پشتگیری ئەم بۆچوونە ئەکات کە ئیعتیبار بۆ ڕق و کینەی مێرد دانانرێ ئەوەیە کە پێغەمبەر ﷺ پرسیاری لە ثابت نەکرد تۆ ڕقت لێیەتی یان نا، کاتێ ژنەکەی ڕای گەیاند کە ڕقی لێیەتی.

---

(١) أحمد (٢/٤١٤) والنسائي في (السنن الكبرى (٥٦٥٥).

**حەرامی‌یەتی خراپە کردن بەرامبەر ژن بۆ ئەوەی خولع بکات:**

حەرامە بۆ پیاو کە ئازاری ژنەکەی بدات، بەوەی هەندێ مافی لێ قەدەغە بکات, هەتا ژنەکە تورەبێت و داوای خولع بکات. جا ئەگەر پیاو شتی وەهای کرد ئەوە خولعەکە باتڵە, وە ئەو بریتی‌یەی پیاوەکە وەری گرتووە ڕەت ئەکرێتەوە، با قازیش فەرمانی پێ دابێت.

وە بۆیەش ئەوکارە حەرام کراوە تاوەکو ژنەکە زیانی جیابونەوە لە مێرد و زیانی ماڵی نەکەوێتە سەر، خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لا يَحِلُّ لَكُمْ أَنْ تَرِثُوا النِّسَاءَ كَرْهاً وَلا تَعْضُلُوهُنَّ لِتَذْهَبُوا بِبَعْضِ مَا آتَيْتُمُوهُنَّ إِلَّا أَنْ يَأْتِينَ بِفَاحِشَةٍ مُبَيِّنَةٍ﴾ (النساء: من الآية١٩).

واتە ئەی ئەوکەسانەی بڕواتان هێناوە دروست نی‌یە بۆتان کە ژنانی باوکەکانتان بە میرات بگرن لە کاتێکدا ئەوان پێیان ناخۆشە، وە دروست نی‌یە بۆتان کە زیان لە ژنەکانتان بدەن، لە کاتێکدا کە ئێوە ڕقتان لێیانە، وە تەنگیان پێ مەچنن بۆ ئەوەی هەندێك لەو میراتەی کە بە مارەیی پێتان داون، دەستتان بکەوێتەوە، مەگەر تاوانێکی ئاشکرا بکەن.

وە بەپێی فەرمودەی خوای گەورە کە فەرمویەتی: ﴿وَإِنْ أَرَدْتُمُ اسْتِبْدَالَ زَوْجٍ مَكَانَ زَوْجٍ وَآتَيْتُمْ إِحْدَاهُنَّ قِنْطَاراً فَلا تَأْخُذُوا مِنْهُ شَيْئاً أَتَأْخُذُونَهُ بُهْتَاناً وَإِثْماً مُبِيناً﴾ (النساء:٢٠).

واتە ئەگەر بتانەوێ ژنێکی تر بهێنن و ژنەکانتان تەڵاق بدەن. ئەگەر ئەو ژنەی تەڵاقی ئەدەن بارێك زێڕتان دابنێ بە مارەیی هیچیان لێ وەرمەگرنەوە, ئایا ئێوە بە بوختان و تاوانی ئاشکرا لێیان ئەسێننەوە؟

هەندێ لە زانایان ڕایان وەهایە کە خولعەکە دێتەجێ بەڵام تەنگ پێ چنینەکەی حەرامە.

بەڵام ئیمامی مالیك ڕای وەهایە کە خولعە کە جێبەجێ ئەکرێ لەسەر ئەوە کە تەڵاقە، وە پێویستە لەسەر مێردەکە چی بەدەلێکی لە ژنەکە وەرگرتووە، بیگێڕێتەوەو بیداتەوە.

**خولع دروستە لەکاتی پاکێتی‌و بێ نوێژی‌دا:**

خولع دروستە لە پاکێتی‌و بێ نوێژی‌دا، وە نەبەستراوە بەکاتەوە, چونکە خوای گەورە بە ڕەهایی باسی کردووەو نەیبەستۆتەوە بە کاتێکی تایبەتی‌یەوە, خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿فَلا جُنَاحَ عَلَيْهِمَا فِيمَا افْتَدَتْ﴾ (البقرة: من الآية ٢٢٩). واتە: تاوان نی‌یە بۆ ژن و مێردەکە لەوەدا کە ژنەکە بریتی بدات و پیاوەکە وەری بگرێ.

وە لەبەر ئەوە پێغەمبەر ﷺ حوکمەکەی بە تێکڕایی‌دا لە خولعەکەی ژنی ثابتی کوڕی قەیسدا، بەبێ گەڕان و لێکۆڵینەوە بە شوێن حاڵی ژنەکەدا، لە کاتێکدا کە بێ نوێژی شتێکی دەگمەن نی‌یە

بە نیسبەت ژنانەوە. شافیعی ووتویەتی: (وازهێنان لەکێشەی حاڵەتەکان لەگەڵ هەڵگرتنی شێوەی تریشدا، ئەچێتە جێگەی گشتی‌یەتی لە قسەدا. وە ئەوەبو پێغەمبەر ﷺ ئەحواڵی ژنەکەی نەپرسی کە بێ نوێژە یان نا.

وە لەبەر ئەوەی شتێك کە قەدەغەی لێ کرابێت تەڵاق دانە لە بێ نوێژی‌دا, بۆ ئەوەی عیددە درێژە نەکێشی بۆ ژنەکە، وە چونکە لێرەدا ژنەکە خۆی داوای جیابوونەوەی کردووە, و خۆی دامالیوە ڕازی‌یە بە درێژەکێشانی عیددەکە.

خولع لە نێوان مێردو بێگانەیەکدا:

دروستە کەسێکی بێگانە ڕێك بکەوێ لەگەڵ مێردەکەدا کە ژنەکەی خولع بکا. وە ئەو کەسە بێگانەیە ئەبێ پەیمان بدات کە بریتی ئەو خولعە بدات بە مێردەکە، ئیتر بەوە جیابوونەوەکە پێك دێت و ئەوکەسە بریتی‌یەکەی ئەکەوێتە سەر کە بیدات بە مێردەکە. وە خولعەکە لەسەر ڕەزامەندی ژنەکە ناوەستێ لەم شێوەیەدا چونکە مێرد خاوەنی تەڵاق خستنەکەیە لەلایەن خۆیەوە بێ ئەوەی ژن ڕازی بێت، وە بریتی‌یەکە ئەچێتە ئەستۆی ئەو کەسەی پەیمانەکەی داوە.

وە ئەبو ثەور ووتویەتی: ئەو شێوەیە دروست نی‌یە چونکە گەوجێتی‌یە، لەبەر ئەوەی ئەوکەسە ماڵێ خۆی بە فیڕۆ ئەدات لە بەرامبەر شتێکدا کە هیچ سودێکی بۆ ئەو نی‌یە، چونکە خاوەنی‌یەکەی بۆ ئەو نابێت.

وە هەندێ لە زانایانی مالیکی ئەو کارەیان بەستۆتەوە بەوەوە کە مەبەستی بەجێ‌هێنانی بەرژەوەندی‌یەك، یان لابردنی خراپەیەك بێت، بەڵام ئەگەر مەبەست زیان گەیاندن بێت بە ژنەکە ئەوە دروست نی‌یە. لە کتێبی (مواهب الجليل)دا هاتووە:

(پێویستە ئەو بۆچوونە ببەسترێتەوە بەوەوە کە ئەو بێگانەیەی لەسەر خۆی پێویست ئەکات بەرژەوەندی‌یەك بێتەدی، یا خراپەیەك لا ببرێ کە بگەڕێتەوە بۆ ئەو بێگانەیە، وەمەبەست لێی زیان گەیاندن نەبێت بەژنەکە).

بەڵام ئەوەی ئێستا خەڵك ئەی‌کەن لەم وڵاتەدا بەوەی بێگانەیەك گیرۆدە ئەکەن مەبەستیان تەنها ئەوەیە کە نەفەقەی پێویست لابەرن لەسەر تەڵاقدەر لەکاتی عیددەی تەڵاق دراوەکەدا, ئەوە ئەبێت لە قەدەغە بوونەکەیدا جیاوازی نەبێت. وە لەوەدا کە تەڵاقدەر دوای کەوتنی تەڵاقەکە سودمەند ببێت، تێڕوانین هەیە.

**خولع کاری ژن ئەداتە دەست خۆی:**

جەماوەری زانایان بۆ ئەوە چوون وە لەوانە چوار پێشەواکان, کە پیاو کاتێك ژنەکەی خولع ئەکا ئەو ژنە ئەبێتە خاوەنی خۆی و کاری خۆی بە دەست خۆی ئەبێت، وە پیاوەکە ناتوانێ بیگێڕێتەوە، چونکە ئەو ژنە ماڵی داوە بۆ ئەوەی لەو ژنومێردایەتی‌یە ڕزگاری ببێت. وە ئەگەر ئەو پیاوە بیتوانیایە بیگێڕێتەوە نەئەکرا کە ژن بەو فیدیەو بریتی‌یەی کە ئەیدات بە مێرد خۆی ڕزگار بکات. تەنانەت ئەگەر هەرچی لەو ژنە وەرگرتووە بۆی بگێڕێتەوەو ژنەکەش قبوڵی بکات، بۆی نی‌یە ژنەکەی بگێڕێتەوە لەعیددەدا، چونکە دەست بەرداری بوەو تەڵاقی بائینی لێی کەوتووە بە خودی خولعەکە.

ئەگێڕنەوە لە ئیبنو موسەییب و زوهری‌یەوە: کەئەو پیاوە ئەگەر بیەوێ بیگێڕێتەوە, ئەو شتەی کە لی‌ی وەرگرتووە بیداتەوەو شاهیدێك بگرێ بۆ گێڕانەوەی.

**دروستی مارەکردنەوەی بە ڕەزامەندی ژنەکە:**

وە دروستە بۆ مێردەکە کەمارەی بکاتەوە بەڕەزامەندی خۆی لەکاتی عیددەکەیدا و سەرلەنوێ عەقدی بکاتەوە.

**خولع کردنی ژنی بچوکی خاوەن تەمیز:**

حەنەفی‌یەکان بۆ ئەوە چوون کە ئەگەر ژنەکە تەمەن منداڵ و خاوەن تەمیز بوو (واتە ئەیتوانی چاکەو خراپە لەیەك جیا بکاتەوە) وە خولعی کرد لە مێردەکەی، یەك تەڵاقی ڕەجعی ئەکەوێ، و ماڵی ناکەوێتە سەر.

ئەمما کەوتنی تەڵاقەکە لەبەر ئەوەیە: کە قسە و عیبارەتی پیاوەکە مانای ئەوەیە بەستویەتی‌یەوە بە قبوڵ کردنی ژنەکەوە، وە بەستنەوەکەش دروست بووە لەبەر ئەوەی قسەکە لەوکەسەوە دەرچووە کە ئەهلی ئەوە بووە, وە ئەو شتەش کە تەعلیقەکەی لەسەر بەستراوە پەیدا بووە، کە قەبوڵ کردنە لەلایەنی کەسێکەوەیە کە ئەهلی ئەوەیە، چونکە ئەهلی‌یەتو شایستەیی بۆ قەبوڵ کردن بە تەمیز ئەبێت – وە ئەم ئافرەتەش لێرەدا خاوەن تەمیزە – جا هەرکاتێك ئەو شتە هەبوو کە تەڵاقەکەی لەسەر تەعلیق کراوە ئەوە تەڵاقەکە کەوتووە.

وە ئەمما ئەوەی کە ماڵی لێ ناسەنرێ: لەبەر ئەوەیە کە منداڵە و ئەهلی ماڵ بەخشین نی‌یە، چونکە مەرجی ئەهلی‌یەت بۆ ماڵ بەخشین: ژیری و پێ‌گەیشتنە، هەروەها حیجری لەسەر نەبێت – واتە ڕێی لێ نەگیرابێت – بەهۆی گەوجی‌یەتی یا نەخۆشی‌یەوە.

بەڵام هۆی ئەوەی کە تەڵاقەکە ڕەجعی ئەبێت: چونکە کاتێك ماڵ سەندن دروست نەبێت ئەوە تەڵاقی رووتە و هیچی لە جیاتی لێ وەرناگیرێ، کەواتە بە تەڵاقی ڕەجعی ئەکەوێ.

خولع کردنی ژنی بچوکی بێ تەمیز:

بەڵام ژنی منداڵی بێ تەمیز ئەوە خولعەکەی لە بنەڕەتدا بە تەڵاق ناکەوێت, لەبەر نەبوونی ئەو شتەی کە تەڵاقەکەی پێوە بەستراوە، کە ئەویش قبوڵ کردنە لەو کەسانە وە کە ئەهلی قبوڵ کردنن.

خولع کردنی ژنی حیجر لەسەر دانراو:

ووتویانە: ئەگەر ژنەکە حیجری لەسەر دانرابوو بەهۆی گەوجی‌یەتی‌یەوە, پیاوەکەشی خولعی کرد لەسەر ماڵێك و قبوڵی کرد، ماڵەکەی ناسەندرێ و تەڵاقەکەی بە ڕەجعی ئەکەوێ، هەر وەك بچوکێکی خاوەن تەمیز کە ئەهلی ماڵ بەخشین نی‌یە، بەڵام ئەهلی قبوڵ کردنە.

خولع کردن لە نێوان سەرپەرشتیاری ئافرەتی منداڵ و مێردەکەیدا:

ئەگەر خولع پێك هات لەنێوان سەرپەرشتیاری ئافرەتی تەمەن بچووك و مێردەکەیدا، بەو شێوەیە کە مێردەکە بڵێت بە باوکی ژنەکە: کچەکەتم خولع کرد لەسەر مارەیی‌یەکەی، یا لەسەر هەزار دینار لە ماڵی خۆی, وە باوکەکە نەبووە زامنی بریتی‌یەکە و ووتی: قبوڵم کرد، تەڵاقی ئەکەوێ، بەڵام ماڵەکەی لەسەر ناکەوێ نە خۆی و نە باوکی.

ئەمما کەوتنی تەڵاقەکە چونکە تەڵاقی هەڵواسراو ئەکەوێ هەر کاتێ پیاهەڵواسراوەکە پەیدا بوو، کە لێرەدا قبوڵ کردنی باوکە، پەیدا بووە. ئەمما ئەوەی کە ماڵەکەی لێ ناسەندرێ، لەبەر ئەوەیە چونکە ئەهلی ئەوە نی‌یە کە بۆ خۆی ماڵ ببەخشێ. وە ئەوە کە لە باوکیشی ناسەندرێ، چونکە نەبووەتە زامن، وە مادام نەبووە بە زامن لەسەری نی‌یە. هەر لەبەر ئەوەیە ئەگەر بووە زامن لێی ئەسەندرێ. وە ووتراوە: تەڵاقی ناکەوێ لەو حاڵەتەدا چونکە پێوە هەڵواسراوەکە قبوڵ کردنی بریتی دانە. کە ئەویش بەجێ نەهاتووە. ئەم قسەیان ئاشکراو ڕۆشنە، بەڵام کار بەقسەی یەکەم ئەکرێ.

خولع کردنی ژنی نەخۆش:

جیاوازی نی‌یە لە نێوان زانایان لەسەر دروستی خولع کردنی ئافرەتی نەخۆش, نەخۆشی‌یەك کە نەخۆشی مردن بێت. وە ئافرەتەکەش بۆی هەیە خۆی داماڵی هەر وەك ئافرەتی لەش ساغ. بەڵام جیاوازی‌یان هەیە لە نرخی داماڵینەکەدا کە چەندە پێویستە لەسەر ژنەکە بیدات بە مێردەکەی، لە ترسی ئەوەی نەك ژنەکە لەبەر یارمەتی دان و ویستنی مێردەکە لەبەشی میرات گرەکانیشی بداتێ.

ئیمامی مالیك ووتویەتی: ئەو بریتیەیە ئەبێ ئەوەندەی ئەو میراتە بێت کە پیاوەکە لە ژنەکەی ئەگرێ. ئەگەر زیاتری پێدا حەرامەو ئەبێت ڕەت بکرێتەوە, و تەڵاقەکەش ئەکەوێ, و میرات گرتنیش نامێنێ لەنێوانیاندا ئەگەر پیاوەکە تەندروست بوو.

وە حەنبەلیەکان ڕایان وەك ڕای مالیکە: لەوەدا کە ئەگەر ئەوەندی میراتەکەی یا کەم تر بوو ئەوە دروستەو گەڕانەوەی تێدا نیە، بەڵام ئەگەر لەوە زیاتر بوو ئەو زیادەیە بەتاڵە.

شافیعی فەرمویەتی: ئەگەر ئافرەتەکە خۆی لێ خولع کات بە ئەندازەی مارەیی هاو ڕێنەی خۆی (مهر المثل) ئەوە دروستە. وە ئەگەر لەوە زیاتر بوو ئەوە ئەو زیادەیە لە سێ یەکی ماڵەکەی حیساب ئەکرێ و بە بەخشش دائەنرێ.

بەڵام حەنەفیەکان ئەو خولعەیان بە لاوە دروستە کە لە سێ یەکی ماڵەکەی زیاتر نەبێت، چونکە بەخشەرە، وە بەخشینیش لە نەخۆشی مەرگدا وەك وەسیەتە, وەسیەتیش تەنها لە سێ یەکی ماڵ دەرئەچێ بۆ بێگانە، مێردەکەش بەو خولعە ئەبێتە بێگانە.

ووتویانە: وە ئەگەر ئەو ژنە خولع کەرە نەخۆشە مرد لەکاتی عیددەدا. مێردەکەی لەسێ یەکی میراتیەکەی و بریتی خولعەکەو بەشە میراتەکەی لە ژنەکە کامیان کەمتر بێ لەم سێیانە ئەوە وەرئەگرێت. چونکە جاری وا ئەبێت کە ژن و مێردەکە ڕێك ئەکەون لەکاتی نەخۆشیەکەیدا بریتیەیەکی زۆری بۆ ناو ئەبات، زیاتر لەوەش کە لە میراتەکە ئەیدرێتێ. جا لەبەر ئیحتیات بۆ مافی میراتگرەکانی ئەو ژنە، وە لەبەر ڕەت کردنەوەی ئەو مەبەستەی کە ژن و مێردەکە لەسەری یەك کەوتون. وتمان: ئەگەر لە عیددەکەدا مرد ئەوە کەمترین شت لەو سیانە وەرئەگرێ. بەڵام ئەگەر چاك بوەوەو نەمرد هەموو ئەو بریتیەیەی کە ناوی بردووە بۆی، ئەیکەوێ، چونکە دەرئەکەوێ کە ئەوکارەی لە نەخۆشی مردندا نەبووە.

بەڵام ئەگەر ژنەکە دوای تەواو بونی عیددەکە مرد ئەوە پیاوەکە بریتیەیەکەی کە لەسەری یەك کەوتون ئەیکەوێ بەمەرجێ لە سێ یەکی ماڵە جێماوەکەی زیاتر نەبێت، چونکە حوکمی وەسێتی بۆ دائەنرێت.

**ئایا خولع تەڵاق دانە یا هەڵوەشاندنەوەیە:**

جەماوەری زانایان بۆ ئەوە چوون کە خولع تەڵاقی بائینە، بەپێی ئەوەی کە لە پێشەوە باس کرا لە فەرموودەکەدا: (خذ الحديقة وطلقها تطليقة) واتە: باغچەکەت وەبگرەوەو تەڵاقێکی بدە.

وە چونکە هەڵوەشاندنەوە جیابونەوەیەك پێویست ئەکات کە مێردەکە هیچ دەسەڵات و ئارەزووی تێدا نیە, بەڵام خولع ئەگەڕێتەوە بۆ ئارەزوو، کەواتە هەڵوەشاندنەوە نیە .

وە هەندێ لە ئەهلی زانست لەوانە ئەحمەد و داود، وە لە صەحابە ئیبن و عەبباس و عوسمان و ئیبن و عومەر بۆ ئەوە چوون: کە خولع هەڵوەشاندنەوەیە. چونکە خوای گەورە لە کتێبەکەیدا باسی تەلاقی کردووەو فەرموویەتی: ﴿الطَّلاقُ مَرَّتَانِ﴾ (البقره: من الآية٢٢٩) واتە: ئەو تەلاقەی گەڕانەوەی تیا بەجێ دێت دووجارە، پاشان باسی بڕیتی کردووە. پاشان فەرمویەتی: ﴿فَإِنْ طَلَّقَهَا فَلا تَحِلُّ لَهُ مِنْ بَعْدُ حَتَّى تَنْكِحَ زَوْجاً غَيْرَهُ﴾ (البقرة: من الآية٢٣٠) واتە: جا ئەگەر تەلاقی سێهەمی‌دا، بۆی دروست نابێت دوای ئەوە هەتا شو بە کابرایەکی تر نەکات.

جا ئەگەر بڕیتی دان بە تەڵاق دابنرێت، ئەوە ئەو تەڵاق دانەی کە ژنەکە بۆ مێرد دروست نابێت ئیللا دوای شوکردنێکی تر نەبێت، تەلاقی چوارەم ئەبێت, وە ئەو کۆمەڵە ئەڵێن: کە هەڵوەشاندنەوە کاتێ دروستە کە بە ڕازی بوونی هەردوولا بێت، بە قیاس بۆ سەر هەڵوەشاندنەوەی مامەڵە.

ئیبنوقەییم فەرمویەتی: ئەوەی ئەبێتە بەڵگەی ئەوەی کە خولع تەلاق نیە، ئەوەیە کە خوای گەورە تەلاقی دوای گواستنەوە, ئەو تەلاقەی کە ژمارەکانی تەلاقی تەواو نەکردبێ، سێ حوکمی بۆ تەرتیب کردووە کە هیچیان لەخولعا نین:

(یەکەم) مێرد شایستەترە بۆ گێڕانەوە.

(دووەم) ئەو تەلاقە لەسیانەکە حیساب ئەکرێ، ئیتر دوای تەواو بوونی ژمارەکە دروست نابێت بۆ ئەو مێردە، مەگەر دووای شوکردنەوەی ئە ئافرەتەو چوونە لای نەبێت.

(سێیەم) عیددە تێیدا سێ بێ‌نوێژیە. وە بە دەق و ئیجماعی زانایان سابت بووە کە گێڕانەوە نیە لە خولعدا، وە بەسووننەت و وتەی صەحابە سابتە کە عیددەی خولع کراو یەك بێ‌نوێژیە، وە سابتە بە دەق کە خولع دروستە دوای دوو تەلاقیش، وە دوای ئەوە سێ تەلاقەکەی ئەکەوێ. ئەمەش زۆر ئاشکرایە کە خولع تەڵاق نیە.

وە سەرئەنجامی ئەو جیاوازیە لەوەدا دەرئەکەوێ کە خولع بە تەلاق دابنرێ، جا هەرکەس بە تەلاقی بزانێ بە تەلاقی بائینی دائەنێ، وەئەوەی بە هەڵوەشاندنەوەی بزانێ بەتەلاقی بائینی دانانێت، وە هەرکەس ژنەکەی دووتەلاق بدات لەپاشاندا خولعی بکات لەپاشاندا بیەوێ مارەی بکاتەوە بۆی هەیە با شویەکی تریشی نەکردبێتەوە, چونکە هەردوو تەلاقەکەی بۆ حیساب ئەکرێ و خولعەکە لەغوە.

وە هەرکەس خولع بکات بەتەلاق ووتویەتی: ئەوکەسە بۆی نیە مارەی بکاتەوو بیگێڕێتەوە هەتا شوویەکی تر نەکاتەوە، چونکە بەو خولعە سێ تەلاقەکەی تەواو کردووە.

**ئایا ئافرەتی خولع کراو تەڵاقی پێ ئەگات؟ :**

ئافرەتی خولع کراو تەڵاقی پیَ ناگات, بڵێین خولع تەڵاقە یا هەڵوەشاندنەوەیە یەکسانە، وە هەردوکیان ژنەکە ئەکاتە بێگانە بەمێردەکەی، وە کاتێکیش ژنەکە بووە بێگانە پێی ئیتر تەڵاقی پێ ناگات.

وە ئەبو حەنیفە ووتویەتی: ئافرەتی خولع کراو تەڵاقی پێ ئەگات, لەبەر ئەوە لای ئەو دروست نیەیە خوشکی ژنی تەڵاق دراو بە تەڵاقی (البتة) – واتە قەطعي و بڕاوە – لەگەڵ ئەودا بهێنرێ.

**عیددەی ژنی خولع کراو:**

بە سوننەت سابتە ژنێك کە خولع کرابێ عیددەکەی یەك بێ نوێژییە, وە لە بەسەرهاتکەی ثابت دا, هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ بە ثابتی فەرموو: (خذ الذي لها عليك وخل سبيلها) واتە: چیت لەسەریەتی لێی وەربگرەوەو بەرەڵای بکە. ئەویش ووتی: بەڵێ، پاشان فەرمانی بەژنەکە کرد کە یەك بێنوێژی عیددە بکێشێ و بچێتەوە ماڵی باوکی). نەسائی بە سەنەدێك کە پیاوەکانی جێی باوەڕن گێڕاویەتیەوە[1].

وە عوثمان و ئیبنو عەبباس بۆ ئەوە چوون, وە هەروەها ڕاسترینی ڕیوایەتەکانە لە ئەحمەدەوە, وە مەزهەبی ئیسحاقی کوڕی ڕاهەوەیهە, وە شێخی ئیسلام ئیبنو تەیمیە, ئەوەی هەڵبژاردووە ووتویەتی: هەرکەس سەیری ئەو گفتە بکات, ئەبینێ بەپێی بنەماکانی یاسای ئیسلامە: چونکە عیددە بۆیە دانراوە بە ماوەی سێ بێنوێژی، تاوەکو ماوەی گێڕانەوە درێژ بێت و مێردەکە بیربکاتەوەو بتوانی لە ماوەی عیددەکەیدا بیگێڕێتەوە، جا ئەگەر گێڕانەوە نەبوو ئەوە مەبەست ئەوەیە کە منداڵدانی پاك بێتەوە لەمنداڵ وە ئەوەش یەك بێنوێژی بەسە.

وە ئیبنوقەییم ووتویەتی: ئەوە مەزهەبی ئەمیری موسڵمانان عوثمانی کوڕی عەففانە خوا لێی ڕازی بێت, وە هەروەها مەزهەبی عبدالله ی کوڕی عومەرو روبەییعی کچی موعەوویذ, و مامی کە یەکێ بووە لە گەورە پیاوانی صەحابە خوا لێیان ڕازی بێت, وە ئەو چوار صەحابەیە نازانرێ کە کەس لە خۆیان پێچەوانەیان بوبێت, وە هەروەها لەیسی کوڕی سەعد ئەگێڕێتەوە لە نافیعەوە مەولای ئیبنوعومەر: کە خۆی گوێی لە رووبەییعی کچی موعەوویذي کوڕی عەفرا بوو کە بۆ ئیبنوعومەری ئەگێڕایەوە کە خۆی خولع کردوە لە مێردەکەی لەسەردەمی عوثمانی کوڕی

(١) النسائي (٦/١٨٦).

عەففاندا. جا مامی هاتووە بۆ لای عوثمان و پێی وتوە: کە کچی موعەوویذ ئەمڕۆ خۆی خولع کردووە لە مێردەکەی، جا ئایا لەوێ بڕوات؟

عوثمانیش فەرمویەتی: با بچێتەوە ماڵی باوکی و میراتی یەکتر ناگرن. و عیددەی لەسەر نیە. بەڵام نابێت شووبکات هەتا بێ نوێژییەك نەشوات. لە ترسی ئەوەی نەك زگی پڕ بێت. عبدالله ی کوڕی عومەریش فەرموی: عوثمان لە ئێمە زاناترو چاك ترە.

وە لەئەبی جەعفەری نەححاسەوە نەقڵ کراوە لە کتێبی (الناسخ والمنسوخ)کە ئەوە ئیجماعی صەحابەی لەسەرە.

وە مەزهەبی جەماوەری زانایان ئەوەیە خولع کراو عیددەکەی سێ بێنوێژییە ئەگەر لەو ئافرەتانە بوو کە بێ نوێژ ئەبوون.

## خراپ بوونی پیاو لەگەڵ ژنەکەیدا (نشوز الرجل)

ئەگەر ژن ترسی خراپ بوونی پیاوی هەبوو, وە ترسی ئەوەی هەبوو کە پشتی تێ بکا, لەبەر نەخۆشی یا لەبەر تەمەن زۆری، یا لەبەر تێك چوونی روخساری, تاوان نیە لەسەریان ئەگەر ڕێك بکەون لە نێوان یەکدا, هەرچەندە لەو ڕێکەوتنەدا تەنازولی ژنەکەی تێدا بێت لە هەندێ مافی، بۆ ڕازی بوونی مێردەکەی, بەپێی فەرمودەی خوای گەورە کە ئەفەرموێ: ﴿وَإِنِ امْرَأَةٌ خَافَتْ مِنْ بَعْلِهَا نُشُوزاً أَوْ إِعْرَاضاً فَلا جُنَاحَ عَلَيهِمَا أَنْ يُصلِحَا بَيْنَهُمَا صُلْحاً وَالصُّلْحُ خَيْرٌ﴾ (النساء: من الآية١٢٨) واتە: ئەگەر ژنێك ترسی خۆبەزل زانینی مێردەکەی هەبوو بەسەریا، یا ترسی ئەوەی هەبوو پشتی تێ بکا، ئەوە گوناح نیە بۆیان کە لەگەڵ یەکدا ڕێك بکەون, وە ڕێککەوتن بۆ هەردولایان باشترە.

بوخاری ئەگێڕێتەوە لەعائیشەوە دەربارەی ئەم ئایەتە ئەفەرموێ: ئەوە ژنێکە کە لای پیاوێك بێت منداڵی لێ نەبێت و بیەوێ تەڵاقی بدات و ژنی بەسەر بهێنێ, ژنەکەش بڵێ: ڕام بگرەو تەڵاقم مەدە، بەڵام ژنێکی تر بهێنە، جا تۆ ئازادبە لە نەفەقە و شەومانەوە لەلام[1].

ئەبوداود ئەگێڕێتەوە لە عائیشەوە کە سەودەی کچی زەمعە کاتێ پیر بوو ترسی ئەوەی هەبوو کە پێغەمبەر ﷺ تەڵاقی بدات ووتی: (ئەی نێرراوی خوا ڕۆژەکەی من بۆ عائیشە). پێغەمبەر ﷺ قبوڵی کرد.

---

(١) البخاري (٥٢٠٦) ومسلم (١٣/٣٠٢١و١٤).

عائیشە فەرمویەتی خوای گەورە بۆ ئەوەو وێنەی ئەوە، ئەم ئایەتەی نارده خوارەوە: ﴿وإن امرأة خافت من بعلها نشوزاً أو إعراضاً﴾[1].

لە (المغني) دا هاتووە: هەرکاتێ ژنەکە ڕێکەوتن بکات لەگەڵ پیاوەکەیدا لەسەر ئەوەی کە هێندێك لە نەفەقە یان لەلا خەوتنی لێ کەم بکرێتەوە، یا هەمووی واز لێ بهێنێ، ئەوە دروستە, وە بۆی هەیە پەشیمانیش بێتەوە.

ئەحمەد ڕای وابوو لەبارەی ئەو پیاوەوە کە لە ژنەکەی دیار نابێت، وە بە ژنەکەی ئەڵێت: ئەگەر بەوە ڕازیت باشە ئەگینا ئیتر خۆت ئەزانی, ئافرەتەکەش بڵێت: ڕازی بووم، ئەوە دروستە وە ژنەکە بۆی هەیە پەشیمان بێتەوە ئەگەر بیەوێ.

**ناکۆکی کەوتنەوە لە نێوان ژن و مێردا:**

ئەگەر ناکۆکی کەوتە نێوان ژن و مێردەوەو پەرەی سەند هەتا ترسی جیابونەوەیان لێ ئەکراو ژیانی ژنومێردایەتی کەوتە ناخۆشی و لەناو چوونەوە, ئەبێ حاکم دوو ناوبژیکەر بنێرێ تا سەیری حاڵیان بکات، وە هەرچی لە بەرژەوەندی ئەوانە بیکات لە مانەوەی ژیانی ژنومێردایەتی، یان کۆتایی هێنانی. خوای گەورە ئەفەرموێ: (وَإِنْ خِفْتُمْ شِقَاقَ بَيْنِهِما فَابْعَثُوا حَكَماً مِنْ أَهْلِهِ وَحَكَماً مِنْ أَهْلِهَا﴾ (النساء: من الآية٣٥) واتە: ئەگەر ئێوە – سەرپەرشتیارانی ژن و مێرد – زانیتان کە ناکۆکی نێوانیان سەر ئەکێشێ بۆ جیابوونەوە، ئەوە ناوبژیکەرێك لەکەسوکاری پیاوەکەو یەکێکیش لە کەسوکاری ژنەکە بنێرن بۆ لایان.

وە مەرجە کە ئەو دوو ناوبژیکەرە ژیرو پێگەیشتوو دادپەروەرو موسوڵمان بن.

بەڵام مەرج نیە لەکەسوکاریان بن، ئەگەر لەکەسوکاریشیان نەبن هەر دروستە. وە ئەو فەرمانەی لە ئایەتەکەدا هاتووە بۆ (ندب) پەسەندیە، چونکە ئەگەر لەکەسوکاریان بن ئەوە دڵ نەرمتر ئەبن پێیان و حاڵیان باشتر شارەزان و ڕووداوەکە باشتر ئەزانن لە کەسانی تر.

وە ئەبێ دوو ناوبژی کەرەکە کارێك بکەن کە بەرژەوەندی تێدا بێت لە مانەوەی ژیانی ژنومێردایەتی، یا کۆتایی هێنان پێی، بێ ئەوەی پێویست بکات ڕەزامەندی ژنومێردی لەسەر بێت یان بیان کەن بە وەکیل.

---

(١) أبوداود (٢١٣٥).

ئەوەش ڕای عەلی و ئیبنوعەبباس و ئەبی سەلەمەی کوڕی عبدالرحمن و شیعبی و نەخەعی و سەعیدی کوڕی جوبەیرو مالیك و ئەوزاعی و ئیسحاق و ئیبنومونذیرە. کە ئەمە لە باسێکی پێشتردا ڕابووورد[1].

## (الظهار)

**پێناسەکەی:**

(ظهار) لە (ظهر) پێك هاتووە، کە بریتی‌یە لەوەی پیاو بە ژنەکەی بڵێت: تۆ بۆ بۆمن وەك پشتی دایکمی.

وە لە سەردەمی نەفامی‌دا (ظهار) تەڵاق بووە, بەڵام ئیسلام هات و ئەو حوکمەی پوچەڵ کردەوە, وە ئەو قسەیەی وا لێ کرد کە ژن حەرام بکات لە مێرد هەتا کەفارەتی ئەو قسەیە ئەدات.

کەواتە ئەگەر کەسێك بیەوێ ژنەکەی بە (ظهار) تەڵاق بدا ئەوە هەر (ظهار)ە، وە ئەگەر تەڵاقی بدا بە مەبەستی (ظهار) ئەوە تەڵاقە, جا ئەگەر بەژنەکەی ووت: تۆ بۆمن وەك دایکم وایت وە مەبەستی تەڵاق بوو ئەوە تەڵاق نی‌یە بەڵکو هەر (ظهار)ە و تەڵاقی ژنی پێ ناکەوێ.

ئیبنوقەییم ووتویەتی: ئەوە بۆیە وەهایە چونکە (ظهار) تەڵاق دان بوو لەسەردەمی نەفامی‌دا، دوایی هەڵوەشایەوەو سڕایەوە, هەر بۆیە دروست نی‌یە گەڕانەوە بکرێت بۆ حوکمی مەنسوخ, وە هەروەها لەبەر ئەوەی کە ئەوسی کوڕی صامیت بەنیازی ئەوەوە ئەو قسەیەی کرد کەتەڵاقی بدات وەك لەپێشا وابووە، ئیتر حوکمی (ظهار)ی بەسەردا درا نەك تەڵاق، هەروەها لەبەر ئەوەی تەڵاق لە حوکمی خۆیدا صەریحە، ئیتر دروست نەبوو بکرێت بە کینایە لەو حوکمەدا کە خوای گەورە بە یاسای خۆی پوچەڵی کردۆتەوە، وە فەرمان و حوکمی خوا لەپێشترە و پێویست ترە. -تەواو-

وە زانایان هەموو لەسەر حەرامێتی ظهار کردن ئیجماعیان هەیە, بۆیە نابێت کەس بەکاری بهێنێ بەپێی فەرمودەی خوای گەورە کە فەرمویەتی: ﴿الَّذِينَ يُظَاهِرُونَ مِنكُمْ مِن نِسَائِهِمْ مَا هُنَّ أُمَّهَاتِهِمْ إِنْ أُمَّهَاتُهُمْ إِلَّا اللَّائِي وَلَدْنَهُمْ وَإِنَّهُمْ لَيَقُولُونَ مُنْكَراً مِنَ الْقَوْلِ وَزُوراً وَإِنَّ اللَّهَ لَعَفُوٌّ غَفُورٌ﴾ (المجادلة:٢) واتە: ئەوانەتان کە لە ژنەکانیان (ظهار) ئەکەن و ئەیان چوێنن بە پشتی دایکیانەوە, لە ڕاستیدا ئەوانە دایکیان نین، وە دایکیان تەنها ئەوانەن کە بویانن، بەڕاستی ئەوانە قسەیەکی خراپ و درۆ ئەکەن, وە بەڕاستی خوا زۆر لێ خۆش بووە لەو کەسانەی کە هەندێك سەرپێچی ئەکەن و خێرا تەوبە ئەکەن.

---

(١) ئەما (نشوز)ی ژن لە باسی (ئامۆژگاری کردنی ژن لە کاتی (نشوز)دا قسەی لەسەر کرا.

وە بنەمای ئەوەش ئەوەیە کە سابتە لە (سنن)دا کە ئەوسی کوڕی صامیت ظیهاری کرد لە ژنەکەی کە ناوی خەولەی کچی مالیکی کوڕی ثەعلەبە بوو، کە هەر ئەویش بوو موجادەلەی کرد لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ و سکاڵای کرد لای خوای گەورەو خوای گەورەش سکاڵاکەی بیست لە سەرو حەوت ئاسمانەوە. وە بە پێغەمبەری ووت: (ئەی نێرراوی خوا! ئەوسی کوڕی صامیت کاتێ منی هێناوە گەورە کچێك بووم، هەمووکەس بە ئاواتمەوە بوو، ئێستاش چووم بە ساڵاو ناوسکم هەڵڕاژاوە، منی وەك کەنیزەکی خۆی لێ کردووە. پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: (ما عندي في أمرك شيء) واتە: دەربارەی تۆ هیچم پێ نیە. ئەویش ووتی: (دە خوایە شکاتەکەم ئەهێنمە لای تۆ). وە ئەگێڕنەوە کە ووتویەتی: (من کۆمەڵێ منداڵی بچوکم هەیە، ئەگەر بەجێیان بهێڵم بۆی لەناو ئەچن، وە ئەگەر لای خۆشم گلیان بدەمەوە برسی ئەبن).

ئیتر قورئان هاتە خوارەوە لەو بارەیەوە. عائیشە فەرمووی: سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە بیسەری هەموو شتێکە، خەولەی کچی ثەعلەبە هاتبوو شکاتی لای پێغەمبەر ئەکرد ﷺ من لە گۆشەیەکی ماڵەکەدا بووم هەندێ قسەی تێ نەئەگەیشتم. کەچی خوای گەورە ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە: ﴿قَدْ سَمِعَ اللَّهُ قَوْلَ الَّتِي تُجَادِلُكَ فِي زَوْجِهَا وَتَشْتَكِي إِلَى اللَّهِ وَاللَّهُ يَسْمَعُ تَحَاوُرَكُمَا إِنَّ اللَّهَ سَمِيعٌ بَصِيرٌ﴾ (المجادلة:١)

واتە: بەڕاستی خوا بیسەری قسەی ئەو ئافرەتە بوو کە دەمەقاڵێی لەگەڵدا ئەکردی، دەربارەی مێردەکەی و سکاڵای لای خوائەکرد، وە خوا قسەکانی ئەبیستن، چونکە خوا بیسەرو بینەرە.

ئینجا پێغەمبەر ﷺ بە ئافرەتەکەی فەرموو: با بەندەیەك ئازاد بکات. ژنەکە ووتی نیەتی! فەرمووی: کەواتە دوومانگ لەسەر یەك بەڕۆژوو بێت ووتی: ئەی نێرراوی خوا ئەو پیرێکی یەك کەوتەیە، توانای ڕۆژو گرتنی نەماوە. فەرمووی: دەبا شەست هەژار تێر بکات. ووتی: هیچی نیە بیکات بەخێر. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: من بە زەمیلەیەك خورما یارمەتی ئەدەم! ژنەکەش ووتی: منیش زەمیلەکەی تری ئەدەمێ. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: چاك ئەکەیت، لە جیاتی ئەو شەست هەژار تێریکەو بگەڕێرەوە لای ئامۆزاکەت[1].

وە لە سوننەتدا هاتووە کە سەلەمەی کوڕی صەخری (بیاضي) (ظهار) ی لە خێزانەکەی کرد بۆ ماوەی یەك مانگ، کە ڕەمەزانیش بوو، لەپاشان یەك شەو پێش تەواو بوونی مانگەکە چووە لای ژنەکەی. ئینجا هات بۆلای پێغەمبەر ﷺ بۆی گێڕایەوە، پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: سەلەمە تۆو شتی وەها. ئەڵێ خۆشم ووتم: من و شتی وەها ئەی نێرراوی خوا؟ - دووجار وام ووت- وە من لەبەر

---

(١) أحمد (٦/٤١٠) وأبوداود (٢٢١٤و٢٢١٥) وابن ماجه (٢٠٦٣).

فەرمانی خوادا ئارام گرم، جا خوا چۆن فەرمانی داوە وەها حوکم بدە. فەرمووی: بەندەیەك ئازاد بکە. ئەڵێ ووتم: بەو زاتەی تۆی بەحەق ناردووە بە پێغەمبەر لەو ژنە زیاتر هیچم نی‌یە وە کێشام بە گەردنما، فەرمووی: دە دوو مانگ بەڕۆژوو ببە لەسەر یەك. ئەڵێ ووتم: ئایا بەهۆی ڕۆژوەوە ئەوەم توش نەبووە؟ فەرمووی: دە تەشتێك خورما بدە بە شەست هەژار. ئەڵێ: ووتم بەو زاتەی بە حەق ناردویتی خۆمان بێ پێخۆر بوین و هیچمان نی‌یە و شەو هیچمان نەبووە بیخۆین. فەرمووی: بچۆ بۆ صەدەقەی بەنی زورەیق با بتدەنێ، وە شەصت فەقیر خواردن بدە لە سەبەتێك خورما، لەپاشان ئەوەی مایەوە خۆت و منداڵەکانت بیخۆن. ئەڵێ: چوم بۆناو قەومەکەم پێم ووتن: ئێوە تەنگی و ڕای خراپتان بۆ دەرئەبڕیم، بەڵام لای پێغەمبەر ﷺ پێچەوانەی ئەوە بووە، وە فەرمانی پێ دام کە لە صەدەقەکەتان وەربگرم[1].

**ئایا ظهار تایبەتە بە دایکەوە؟**

جەماوەری زانایان بۆ ئەوە چوون کە ظیهار تایبەتە بە دایکەوە, وەك لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە, وە وەك لە سوننەتدا هاتووە. جا ئەگەر پیاو بەژنەکەی ووت تۆبۆمن وەك پشتی دایکمی, بەوقسەیە ظیهار دروست ئەبێت، بەڵام ئەگەر ووتی: تۆ بۆ من وەك پشتی خوشکمی، ئەوە نابێت بە ظیهار. بەڵام هەندێ بۆ ئەوە چوون کە هەموو ئەوانەی بە پیاو ناشێن قیاس ئەکرێن لەسەر دایك. لەوانە حەنەفی‌یەکان‌و ئەوزاعی و ثەوری و شافیعی لە یەکێ لە گفتەکانیدا، وە زەیدی کوڕی عەلی، چونکە (ظهار) لای ئەمانە ئەوەیە کە پیاو ژنەکەی بکات بەیەکێ لەو کەسانەی کە پێی ناشێ بۆ هەمیشە بە خزمایەتی بێت یا ژن‌و ژنخوازی یا بە هۆی شیرەوە، چونکە هۆیەکەی حەرامیتی هەمیشەیی‌یە.

وە هەرکەس بەژنەکەی بڵێت: ئەو خوشکمە یا دایکمە بەشێوەی ڕێزو گەورەیی بەوە نابێتە ظهار.

**(ظهار) لە کام کەسەوە ئەبێت:**

ظیهار لە پیاوێکی ژیر و پێگەیشتوو موسڵمانەوە نەبێت نابێت، لەژنێك کە پەیمانی ژن‌ومێردایەتی‌یان بەستبێت بەشێوەیەکی ڕاست و دروست.

(١) أحمد (٥/٤٣٦) وأبوداود (٢٢١٣) والترمذي (١٢٠٠) والحاكم (٢/٢٠٣) وابن خزيمة (٢٣٧٨).

**(ظهار)ی (مؤقت) کاتی:**

ظیهاری کاتی ئەوەیە کە پیاو (ظهار) لە ژنەکەی بکات بۆ ماوەیەکی دیاری کراو. وەك ئەوەی پێی بڵێت: (تۆ وەك پشتی دایکمی بۆمن هەتا شەو)، لەپاش ئەوە بچێتەلای پێش ئەوەی ماوەکە کۆتایی هاتبێ.

ئەوە حوکمەکەی حوکمی ظهاری موتڵەقە. (خطابي) ووتویەتی: زانایان جیاوازن لەوەدا ئەگەر ئەو پیاوە سوێندی خوارد واتە ظیهاری موەققەتی کردو تا کاتەکەی تەواو نەبوو نەچوەلای خێزانی و سوێندەکەی نەخست.

مالیك و ئیبنوئەبی لەیلا ووتویانە: ئەگەر پیاوێك بەژنەکەی ووت: (تۆ بۆ من وەك پشتی دایکمی هەتا شەو) کەفارەتی ظیهاری ئەکەوێتە سەر با نزیکیشی نەکات.

وە بەشی زۆری زانایان ووتویانە: هیچی ناکەوێتە سەر هەتا سوێندەکەی نەخات و لێی نزیك نەبێتەوە.

وە وتویەتی: شافیعی دووگفتی هەیە دەربارەی ظیهاری کاتی: لە قەولێکیدا ظیهاری کاتی ظیهار نىیە.

**کاریگەری (ظهار):**

کاتێ پیاوێك ظیهاری کرد بەرامبەر ژنەکەی و ڕاست دەرچوو، دووکار دائەمەزرێ لەسەری:

(کاری یەکەم) حەرامىیەتی چونەلای ژنەکەی هەتا کەفارەتی ظیهار نەدات. بەپێی فەرمودەی خوای گەورە کە فەرمویەتی: ﴿مِنْ قَبْلِ أَنْ يَتَمَاسَّا﴾ (القصص: من الآیە٣) واتە: پێش ئەوەی دەست لە یەك بدەن.

وە وەك چۆن چونەلا حەرامە، تاواش پێشەکیەکانی حەرام ئەبن، وەك ماچ کردن و باوەش پیا کردن و ئەو جۆرە شتانە. ئەمە ڕای جەماوەری زانایانە.

بەڵام هەندێ لە ئەهلی عیلم بۆ ئەوە چوون کە تەنها چوونە لا حەرامە، چونکە ئەو دەست لێدانەی کە لە ئایەتەکەدا هاتووە کینایەیە بۆ چوونەلا.

(کاری دووەم) پێویست بوونی کەفارەت بە گەڕانەوە.

ئایا گەڕانەوە چیە؟ زانایان جیاوازییان هەیە لەواتای گەڕانەوە لە ظیهاردا. کە چیە؟ قەتادە و سەعیدی کوڕی جوبەیرو ئەبوحەنیفە و هاوەڵەکانی ووتویانە: (ئەوەیە پیاوەکە ویستی ببێ دەست

لەو ژنە بدات کە (ظهار) حەرامی کردووە) چونکە کاتێ وویستی، ئەوە گەڕاوەتەوە لە ویستی وتەوە بۆ ویستی کردەوە، ئیتر کارەکە بکات یان نەیکات.

وە شافیعی ووتویەتی: بەڵکو ڕاگرتنی ژنەکەیە دوای ظهارەکە بۆ ماوەیەك کە بکرێ لەو ماوەیەدا تەڵاق بدات، بەڵام تەڵاقی نەدات. چونکە چواندنی ئەو ژنە بە دایکی خۆی ئەوە پێویست ئەکات کە بائین بێت، و ڕاگرتن پێچەوانەیەتی، جا ئەگەر ڕای گرت ئەوە گەڕاوەتەوە لەوەی ووتویەتی، چونکە گەڕانەوە لە گفت سەرپێچی کردنە لێی .

مالیك و ئەحمەد ووتویانە: عەزمو ویستی چونەلا کرا ئەوە گەڕانەوەیە، با نەشچێتە لای.

وە داود و شوعبە و ظاهیرییەکان ووتویانە: گەڕانەوە دووبارە کردنەوەی لەفزی ظیهارە. چونکە کەفارەت لای ئەوان پێویست نابێت بەیەك جار هەتا جارێکی تر دووبارەی نەکاتەوە.

**چوونەلای ژن پێش کەفارەت دان:**

ئەگەر پیاوێك چووە لای ژنەکەی پێش ئەوەی کەفارەت بدات ئەوە حەرامە لەسەری وەك لە پێشەوە باس کرا، کەفارەتیش نە لائەچێت و نە زیاد ئەبێت، بەڵکو وەکو خۆی ئەمێنێتەوەو یەك کەفارەت ئەبێت.

صەلتی کوڕی دینار ووتویەتی: پرسیارم لە دە زانای تابعی کرد, دەربارەی کەسێك چوبێتە لای ژنەکەی پێش ئەوەی کەفارەت بدات؟ ووتویانە: هەر یەك کەفارەتی ئەکەوێتە سەر.

**کەفارەتەکەی چییە؟ :**

کەفارەتەکەش ئەمەیە: ئازاد کردنی بەندەیەك, ئەگەر نەی بوو دوو مانگ بەڕۆژووبون لەسەریەك، ئەگەر نەیتوانی خواردن دان بە شەست هەژار. بەپێی فەرمودەی خوای گەورە کە فەرمویەتی: ﴿وَالَّذِينَ يُظَاهِرُونَ مِنْ نِسَائِهِمْ ثُمَّ يَعُودُونَ لِمَا قَالُوا فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مِنْ قَبْلِ أَنْ يَتَمَاسَّا ذَلِكُمْ تُوعَظُونَ بِهِ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ فَمَنْ لَمْ يَجِدْ فَصِيَامُ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ مِنْ قَبْلِ أَنْ يَتَمَاسَّا فَمَنْ لَمْ يَسْتَطِعْ فَإِطْعَامُ سِتِّينَ مِسْكِيناً﴾ (المجادلة: الآية ٣،٤).

واتە: ئەوانەی ژنەکانیان لەسەر خۆیان حەرام ئەکەن بە ظیهار کردن لێیان، لەپاشاندا ئەگەڕێنەوە لەوەی ووتویانە، ئەبێ بەندەیەك ئازاد بکەن پێش ئەوەی بچنە لای یەك, ئەوە حوکمی خوایە بۆ ئەو کەسانە تا پەندی لێ وەربگرن‌و نەگەڕێنەوە, وە خوا ئاگادارە بەو کردەوانەی ئەیکەن، جا هەرکەس نەی بوو ئەبێ دوومانگ لەسەر یەك بەڕۆژوو بێت پێش ئەوەی بگەن بەیەك، جا هەرکەس نەیتوانی ئەبێ نانی شەست هەژار بدات.

وە لە کەفارەتی ظهاردا توندو تیژی‌یەکی زۆر کراوە بۆ پاراستنی پەیوەندی ژن و مێردایەتی، وە بۆ بەرگری ستەم کردن لەژن, چونکە پیاو کاتێ بینی کە کەفارەتەکە گرانە لەسەری وناتوانێ بەجێی بهێنێ، ئەو کاتە پەیوەندی ژن و مێردایەتی رێز لێ ئەگرێ وستەم لە ژنەکەی ناکات.

## هەڵوەشاندنەوە (الفسخ)

هەڵوەشاندنەوەی (عقد) پەیمان: پچڕاندنێتی و کردنەوەی گرێی نێوان ژن و مێردە، جا جاری وا ئەبێت کە هەڵوەشاندنەوە بەهۆی خەڵەلێکەوە ئەبێت کە لەپەیمانەکەدا ئەبێت، یا بەهۆی شتێکی کوت وپڕەوە ئەبێت کە رێ لەمانەوەی پەیمانەکە ئەگرێ.

نمونەی هەڵوەشاندنەوە بەهۆی خەڵەلەوە کە لە پەیمانەکەدا ئەبێت:

١- ئەگەر پەیمانەکە کۆتایی هات و دەرکەوت ئەو ژنەی مارەی کردووە خوشکی شیریەتی، ئەوە ئەو پەیمانە هەڵئەوەشێتەوە.

٢- ئەگەر مارەبڕی کوڕ و کچی تەمەن منداڵ باوك یا باپیرە نەبوو، لە پاشاندا گەورەبوون، ئەوە هەردوکیان بۆیان هەیە بڕیاری مانەوەی پەیمانەکە بدەن، یا کۆتایی پێ بهێنن، ئەوەش پێی ئەڵێن هەڵبژاردنی پێگەیشتن (خیار البلوغ)، جا ئەگەر کۆتایی هێنانی ژیانی ژن مێردایەتیان هەڵبژارد ئەوە هەڵوەشاندنەوەیە بۆ عەقدەکە.

نمونەی هەڵوەشاندنەوەی کوتوپڕ بەسەر پەیمانەکەدا:

١- ئەگەر یەکێك لەژن‌ومێردەکە لەئیسلام هەڵگەڕایەوە و نەگەڕاوە سەر ئیسلام، ئەوە پەیمانەکە هەڵئەوەشێتەوە بەهۆی هەڵگەڕانەوەی کوتوپڕ.

٢- ئەگەر پیاوەکە موسڵمان بوو ژنەکەی بەکافری مایەوەو موسڵمان نەبوو، وە ئەو ژنە موشریکیش بوو، ئەو کاتە پەیمانەکە بۆ خۆی هەڵئەوەشێتەوە، بەپێچەوانەی ئەوەوە کەژنەکە کیتابی بێت، چونکە لەو کاتەدا عەقدەکە بەصەحیحی هەر ئەمێنێتەوە وەك خۆی، چونکە مارەکردنی کیتابی هەر لەئەوەڵەوە دروستە.

وە ئەو جیانەبوونەوەیەی کە بەفەسخ دەبێت، وەکو ئەو جیابوونەوەیە نییە کە بەتەڵاق دەبێت، چونکە تەلاق ئەکرێت بە دوو بەش تەڵاقی ڕەجعی و تەلاقی بائین، وە تەلاقی ڕەجعی کۆتایی بەژیانی ژن و مێردایەتی ناهێنێ دەم و دەست، بەلام بائین کۆتایی پێ ئەهێنێ دەم و دەست.

بەلام هەڵوەشاندنەوە، بەهۆیەکی کوت و پڕەوە بێت کە بەسەر پەیمانەکەدا دێت، یا بەهۆی خەلەلێکەوە تێیدا، هەر کۆتایی دینێ بە ژیانی ژن و مێردایەتی دەم و دەست.

وە لەلایەکی ترەو، جیابوونەوە بەهۆی تەڵاقەوە ژمارەی تەڵاقەکان کەم ئەکاتەوە.

بۆ نموونە ئەگەر پیاوەکە بەتەلاقێکی ڕەجعی ژنەکەی تەلاق بدات و لەپاشاندا لە عیددەکەیدا بیگێڕێتەوە، یا مارەی کردەوە دووای کۆتایی هاتنی عیددەکەی بەمارەبڕینی سەرلەنوێ، ئەوە ئەو تەلاقەی بۆ حیساب ئەکرێ و دووای ئەوە دوو تەلاقی زیاتر نابێت.

بەلام جیابونەوە بەهۆی هەڵوەشاندنەوە ژمارەی تەلاقەکانی پێ کەم نابێتەوە، بۆ نموونە ئەگەر هەڵوەشاندنەوەکە بەهۆی هەڵبژاردنی بالغییەوە بێت لەپاشاندا ژن و مێردەکە بە پەیمانێکی تازە چونەوە لای یەك سێ تەلاقی تازەی ئەبێت.

وە زانا حەنەفییەکان ڕیستیان قاعیدەو بنەمایەکی گشتی دابنێن بۆ جیاکردنەوەی جیابونەوەی ژن و مێرد بەتەلاق و جیابونەوەیەك کە بەهۆی هەڵوەشاندنەوە بێت، ووتویانە:

هەموو جیابونەوەیەك كە لە پیاوەوە بوو، وە لەوانە نەزاندرا كە لەژنەوە بێت ئەوە تەڵاقە.

وە هەموو جیابونەوەیەك كە بەهۆی ژنەوە بێت و بەهۆی مێردەوە نەبێت، یا لە پیاوەوە بوو بەڵام وا زاندرا كە بەهۆی ژنەوە بوو ئەوە هەڵوەشاندنەوەیە.

**هەڵوەشاندنەوە بە حوكمی قازی:**

هەندێ حاڵەت هەیە كەهۆی هەڵوەشاندنەوە تێیدا ئاشكرایە و پێویستی بە حوكمی قازی نییە, وەك ئەوەی ڕوون ببێتەوە كەژن و مێردەكە خوشك و برای شیری بن، لەم كاتەدا پێویستە لەسەر ژن و مێرد پەیمانەكە هەڵوەشێننەوە لەخۆیانەوە.

وە هەندێ حاڵەت هەیە كە هۆی هەڵوەشاندنەوە شاراوەیە و دیار نییە وپێویستی بە حوكمی قازی هەیە، وەك ئەو هەڵوەشادنەوەیەی كە بەهۆی مل نەدانی ژنی موشریكەكە بۆ ئیسلام كاتێ پیاوەكەی موسڵمان ئەبێت، چونكە لەوانەیە ژنەكە سەرپێچی نەكا لە موسڵمان بوون ئەو كاتە پەیمانەكە هەڵناوەشێتەوە.

## نەفرین كردن (اللعان)

**پێناسەكەی:**

لیعان لە (لعنة) ەوە وەرگیراوە، چونكە نەفرین‌كەر لەسوێندی پێنجەمدا ئەڵێت كە: (لەعنەتی خوای لەسەر بێت ئەگەر لە درۆزنان بێت). وە ووتراوە كەلەعنەت بە مەعنای دوور كردنەوە دێت. وە بۆیە ژن و مێرد بەو ناوە ناسراون بەهۆی سەرئەنجامی ئەو لەعنەتەوەیە كە تووشی‌یان ئەبێت لە گوناح و دوور كەوتنەوە، وە لەبەر ئەوەی یەكێكیان درۆ ئەكات، بەوەش لەعنەت لێ‌كراو ئەبێت، وە ووتراوە: لەبەر ئەوەیە كە هەریەكەیان لەویتر دووائەكەوێتەوە بە تەئبید كردنی حەرام كردنەكە.

وە حەقیقەتی نەفرین كردن ئەوەیە: كە پیاوەكە - كاتێ زیناكردنی دایە پاڵ ژنی خۆی - چوارجار سوێند ئەخوات كە ڕاست ئەكات، وە لەسەری پێنجەم جاردا ئەڵێت (لەعنەت) نەفرینی خوام لێ بێت ئەگەر درۆ بكەم، وە ژنەكەش كاتێ بیەوێ پیاوەكە بەدرۆ بخاتەوە چوارجار سوێند ئەخوات كە ئەو پیاوە درۆ ئەكات، سەری پێنجەم جار ئەڵێت خوا غەزەبم لێ بگرێ ئەگەر ئەو پیاوە ڕاست بكات.

**دانانی لیعان لەیاسای ئیسلامدا:**

کاتێ پیاوێك تاوانی زیناکردن بداتە پاڵ ژنەکەی و ژنەکە دانی پێدانەنێت, وە پیاوەکەش پەشیمان نەبێتەوە لەو قسەیە بەڵام شاهیدی نەبوو, خوای گەورە لیعانی بۆ داناوە[1].

بوخاری گێڕاویەتیەوە لە ئیبنو عەبباسەوە خوا لێیان ڕازی بێت: کە هیلالی[2] کوڕی ئومەیە تاوانی داوێن پیسی دایە پاڵ ژنەکەی خۆی، لەگەڵ پیاوێك کەناوی شورەیکی کوڕی سەحماء بوو. لای پێغەمبەر ﷺ، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی شایەت بێنە، یا داری تۆڵە ئەدرێ لە پشتت، هیلال ووتی: ئەی نێرراوی خوا کەسێکمان پیاوێك بەسەر ژنەکەیەوە ببینێت ڕاکەین شایەت بگرین؟! پێغەمبەر ﷺ هەرئەوەی دووبارە ئەکردەوە (البينة، وإلا حد في ظهرك) واتە: شایەت, ئەگینا داری تۆڵە لە پشتت ئەدرێ. ئەویش ووتی: بەو زاتەی بە هەق ناردویتی، ڕاست ئەکەم، وە خوا ئەوە ئەنێرێتە خوارەوە کە پشتمی پێ ئەپارێزێ لەتۆڵە. ئیتر جبریل هاتە خوارەوە و ئەم فەرمودەیەی خوای گەورەی هێنایە خوارەوە بۆ پێغەمبەر ﷺ ﴿وَالَّذِينَ يَرْمُونَ أَزْوَاجَهُمْ وَلَمْ يَكُنْ لَهُمْ شُهَدَاءُ إِلَّا أَنْفُسُهُمْ فَشَهَادَةُ أَحَدِهِمْ أَرْبَعُ شَهَادَاتٍ بِاللَّهِ إِنَّهُ لَمِنَ الصَّادِقِينَ وَالْخَامِسَةُ أَنَّ لَعْنَةَ اللَّهِ عَلَيْهِ إِنْ كَانَ مِنَ الْكَاذِبِينَ وَيَدْرَأُ عَنْهَا الْعَذَابَ أَنْ تَشْهَدَ أَرْبَعَ شَهَادَاتٍ بِاللَّهِ إِنَّهُ لَمِنَ الْكَاذِبِينَ وَالْخَامِسَةَ أَنَّ غَضَبَ اللَّهِ عَلَيْهَا إِنْ كَانَ مِنَ الصَّادِقِينَ﴾ (النور:٦-٩) واتە: ئەو پیاوانەی تاوانی زیناکردن ئەدەنە پاڵ ژنەکانیان و شایەتیان نیە لە خۆیان زیاتر، ئەبێ هەرکەسەیان لەبەردەم قازی دا چوار جار سوێند بخوات و بڵێت: بەوخوایەی تاك و تەنها و بێ شەریکە درۆ ناکەم لەوەدا کە زینام داوەتە پاڵی, وە لەسەری پێنجەم دا بڵێت: نەفرینی خوام لەسەر بێت ئەگەر درۆبکەم, وە بەو شایەتی یەی پیاوەکە ژنەکە سزای زینای لەسەر پێویست ئەبێ و لاناچێ مەگەر ئەویش لە بەرابەر شایەتی یەکەی ئەودا چوار جار سوێند بخوات و بڵێت بەو خوایەی تاك و تەنها و بێ شەریکە ئەو پیاوە درۆ ئەکات، وە لەسەری پێنجەم دا بڵێت خوا غەضەبم لێ بگرێ ئەگەر پیاوەکە ڕاست بکات.

(١) ئەوە لەمانگی شەعبانی ساڵی نۆیەمی کۆچی دا بوو. وە وتراوە: لەو ساڵەدا بوو کە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) تیا وەفاتی کرد.

(٢) ئەو یەکەم پیاو بوو لە ئیسلامدا کە لیعانی کرد.

ئینجا پێغەمبەر ﷺ چوو بۆلای ژنەکەو هیلالیش هات، سوێندەکانی خوارد وە پێغەمبەر ﷺ ئەی فەرموو: (إن الله يعلم أن أحدكما كاذب فهل منكما تائب[1]؟) واتە: خوا ئەزانێ یەکێکتان درۆ ئەکات, ئایا یەکێکتان تۆبە ئەکات و پەشیمان ئەبێتەوە؟ پاشان ژنەکەش سوێندەکانی خوارد، کاتێ گەیشتە سەری پێنجەم, ڕایان گرت[2] و پێیان ووت: ئەو سوێندەیان سزا و ئاگری دۆزەخ پێویست ئەکات[3]. ئیبنو عەبباس ووتویەتی: ژنەکە ڕاماو بێدەنگ بوو، هەتا وامان ئەزانی کە پەشیمان ئەبێتەوە, لەپاشاندا ووتی: سەری قەومەکەم شۆڕ ناکەم بەدرێژایی ڕۆژگار, ئینجا سوێندی پێنجەمینیشی خوارد. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (سەیری بکەن ئەگەر منداڵەکەی چاوڕەشیکی سمت شۆڕی قاچ ئەستوور بوو, ئەوە لە شورەیکی کوڕی سەحمایە). پاشان منداڵەکە بەو شێوەیە بوو کە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەگەر بە حوکمی کیتابی خوا نەبوایە[4] من و ئەو کارێکی ترمان بوو[5]

خاوەنی (بداية المجتهد) ووتویەتی: بەڵام لەڕووی ماناوە لیعان بۆ ئەوەیە، کاتێك چوونە لا ئەبێتە هۆی پەیوەست بوونی خزمایەتیو نەسەب، خەڵکی بە زەرورەت پێویستییان بە ڕێگایەکە کە ئەو نەسەبەی پێ لابدەن لەخۆیان کاتێ بۆیان دەرکەوت کە ئەو نەسەبە خراپ بوەو هی خۆیان نیيە. وە ئەو ڕێگایەش (اللعان) نەفرین کردنە. هەر بۆیە نەفرین کردن حوکمێکی سابت و چەسپاوە بەکیتاب و سوننەت و قیاس وئیجماع. چونکە ئەوە هیچ خیلافی تێدا نیيە بە گشتی.

### نەفرین کردن چ کاتێك ئەبێت؟

نەفرین کردن بەدوو شێوە ئەبێت:

---

(١) ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە کاتێك مێرد تۆمەتی دایە پاڵ ژنەکەی، وە نەیتوانی بەڵگە بهێنێ ئەوە سزای تۆمەت هەڵبەستنی لەسەر پێویست ئەبێ، وە کە لیعان کرا ئەو سزایەی لەسەر لائەچێ.

(٢) لەمەدا پەسەندیەتی ئامۆژگاری کردن هەیە بۆ ژن و مێرد پێش لیعانەکە.

(٣) ئامۆژگارییان کرد کە لیعانەکە تەواو نەکات ئەویش ڕاماو نزیك بوو ئیعتیراف بکات بەڵام ڕازی نەبوو بە ئابڕوچونی هۆزەکەی. وە لەمەدا بەڵگەی ئەوە هەیە کە تەنها ڕامان کاری پێ ناکرێ.

(٤) مانای وایە کە لیعان سزا لەسەر ژن لائەدات. ئەگینا پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) سزای ئەدا.

(٥) أحمد (١/٢٣٩) والبخاري (٤٧٤٧) وأبو داود (٢٢٥٤) والترمذي (٢١٧٩) وابن ماجة (٢٠٦٧).

(شێوەی یەکەم) پیاوەکە تاوانی زیناکردن ئەداتە پاڵ ژنەکەی، بەڵام چوار شایەتی نابێت کە شایەتی بدەن لەسەر قسەی کابرا.

(شێوەی دووەم) پیاوەکە بڵێت ئەوسکەی لە من نییە.

جا لیعان کاتێك دروست ئەبێت لە شێوەی یەکەمدا، کە بۆی ڕون بوو زینای کردووە, وەك ئەوەی ژنەکەی ببینێ کە زینا ئەکات، یان خۆی دانی پێدانا، و ئەویش لەدڵی چەقی کە ڕاست ئەکات. لەم حاڵەتەدا باشتر وایە کە تەڵاقی بدات و نەفرینی لێ نەکات. بەڵام ئەگەر لەزیناکردنەکەی دڵنیا نەبوو, ئەوە دروست نییە بۆ پیاوەکە ئەو تاوانە بداتە پاڵی. وە لە حاڵەتێکدا پیاوەکە ئەتوانێ بڵێت سکەکەی لەمن نی‌یە کە ئیدعا بکات کە ئەو هەر نەچۆتە لای لەوکاتەوە کە مارەی کردووە.

یان ئیدعای ئەوە بکات کە کەمتر لە شەش مانگ ئەبێت ئەو سکەی هەیە دووای چونە لای، یان بڵێت زیاتر لە ساڵێکە ئەو سکەی هەیە لە کاتی چونە لاوە.

حاکم بڕیاری لیعان ئەدات:

بۆ نەفرین کردن لەیەکتر ئەبێ دادوەر هەبێت، وە پێویستە لەسەری ئامۆژگاری ژنەکە بکات و بیری مردن و سزا و تۆڵەی خوایی بخاتەوە, وەك ئەوەی لەو حەدیسەدا هاتووە کە ئەبوداود و نەسائی و ئیبنو ماجە گێڕاویانەتەوە و ئیبنو حیببان و حاکم بە صەحیح یان داناوە: (أيما امرأة أدخلت على قوم من ليس منهم، فليست من الله في شيء، ولن يدخلها الله الجنة، وأيما رجل جحد ولده وهو ينظر إليه، احتجب الله منه وفضحه على رؤوس الأولين والآخرين)[1] واتە: هەر ئافرەتێك منداڵێکی غەیرە شەرعی بخاتە ناو هۆزێکەوە، خوا بێ بەشی ئەکات و نایخاتە بەهەشتەوە, وەهەر پیاوێك منداڵەکەی سەیری بکات و ئەو بڵێت منداڵی من نییە خوا خۆی نیشان نادات وئابڕوی ئەبات لەبەرچاوی سەرەتا و کۆتایی خەڵکدا.

مەرجی بوونی ئاوەزو و پێ گەیشتن:

وەك چۆن بوونی دادوەر بۆ نەفرین کردن مەرجە، ئاواش ئاوەز و پێ‌گەیشتووبێ لە هەردوولادا پێویستە، وە ئەمە ڕای هەموو زانایانە.

---

(١) أبو داود (٢٢٦٣) والنسائي (١٧٩/٦) وابن ماجة (٢٧٤٣) وابن حبان (٤٠٩٦) والحاكم (٢٠٣/٢).

**نەفرین کردن دوای شایەتی شاهیدەکان:**

**ئەگەر مێردەکە شایەتی هەبوو لەسەر زیناکردنی ژنەکەی ئایا بۆی هەیە لیعان بکات؟**

ئەبو حەنیفە و داود ووتویانە: لیعان ناکات. چونکە لیعان کردن لەجیاتی شایەت دانراوە، بە پێی فەرموودەی خوا گەورە کە فەرموویەتی: ﴿وَالَّذِينَ يَرْمُونَ أَزْوَاجَهُمْ وَلَمْ يَكُنْ لَهُمْ شُهَدَاءُ إِلَّا أَنْفُسُهُمْ﴾ (النور: من الآية٦) واتە: ئەو پیاوانەی تۆمەتی زینا ئەدەنە پاڵ ژنەکانیان و خۆیان نەبێت کەس نی‌یە شایەت بێت.

وە مالیك و شافیعی ووتویانە: بۆی هەیە لیعان بکات، چونکە شایەتەکان کاریگەریان نی‌یە لە لابردنی ئەو منداڵە گومان لێکراوە.

**ئایا لیعان سوێندە یا شایەتی‌یە؟**

ئیمام مالیك و شافیعی و جەماوەری زانایان ڕایان وایە کە لیعان سوێندە، هەرچەندە شایەتی دانی پێ ئەڵێن، چونکە کەس شایەتی بۆخۆی نادات، بەپێی فەرمودەی پێغەمبەری مەزن ﷺ کەلە هەندێ ڕیوایەتەکانی ئیبنو عەبباس‌دا هاتوە کە فەرمویەتی: (لولا الأيمان لكان لي ولها شأن)[1].

واتە: ئەگەر سوێندەکان نەئەبوو لەنێوان من و ئەودا کارێکی‌تر ئەبوو.

وە ئەبوحەنیفە و هاوەڵەکانی بۆ ئەوە چوون کە لیعان شایەتی‌دانە، وە بەڵگەشیان فەرمودەی خوای گەورەیە: ﴿ فَشَهَادَةُ أَحَدِهِمْ أَرْبَعُ شَهَادَاتٍ بِاللَّهِ﴾ واتە: ئەبێ هەریەك لە ژن و مێردەکە چوار جار شایەتی بدات بە خوا.

وە بەپێی حەدیسەکەی ئیبنو عەبباس کە لە پێشەوە باس کرا ئەوەی تێدابوو: (فجاء هلال فشهد، ثم قامت فشهدت)[2] واتە: هیلال هات و شایەتی‌دا، پاشان ژنەکەش هەستا و شایەتی‌دا.

وە ئەوانەی ڕایان وایە کە لیعان سوێندە ووتویانە: نەفرین کردن دروستە لە نێوان هەموو ژن و مێردێکدا ئازاد بن، یان کۆیلە یا یەکێکیان کۆیلە، بێت و ئەوی تریان ئازاد، ڕاست گۆبن یا فاسق، یا یەکێکیان ڕاستگۆ بێت و ئەوی تریان فاسق.

---

(١) تەخریجی ئەم حەدیسە ڕابوورد.

(٢) تەخریجی ئەم حەدیسە ڕابوورد.

وە ئەوانەی بۆ ئەوە چوون کە شایەتی دانە ووتویانە: نەفرین کردن (لعان) دروست نیيە لەنێوان ژن و مێردا هەتا بۆ شایەتی نەشێن، ئەویش بەوە ئەبێت کە هەردوکیان موسڵمان و ئازاد بن. بەڵام ئەگەر هەردوکیان کۆیلە بن یا تۆڵەی تاوانی بوختان کردنیان لێ سەندرابێت، لیعان کردنیان دروست نیيە. وە هەروەهایە ئەگەر یەکێکیان شیاوی شایەتی بێت و ئەوی تریان شیاو نەبێت.

ئیبنو قەییم ووتویەتی: ئەوەی ڕاست بێت (لعان) نەفرین کردنی ژن و مێرد هەردوو شێوەکە ئەگرێتەوە هەم سوێند و هەم شایەتی، چونکە ئەو نەفرین کردنە شایەتی دانێکی جەخت کراوە بەسوێندو چەند جارە کردنەوەی، وە سوێندی گەورەيە بە لەفزی (شایەتی)و بە چەند جار کردنەوەی، چونکە حاڵەتەکە وەهایە کە پێویستی بە تەئکید کردنەوەیە، هەر بۆیە لە لیعاندا دە جۆر تەئکید هەیە.

(یەکەم) ووتنی لەفزی شایەتومان.

(دووەم) سوێند خواردنەکە بە یەکێ لەناوەکانی خوای پەروەردگارە کە کۆکەرەوەی واتای ناوە جوانەکانیەتی، ئەویش ناوی (الله)یە کە بەرزو گەورەیە.

(سێیەم) تەئکید کردنەوەی وەڵامی سوێندەکە بەوەی کە سوێند لەسەر خوراوی پێ تەئکید ئەکرێتەوە کە ئەویش (أنَّ) و (لام)ە، وە هێنانی وەڵامەکە بەشێوەی (إسم فاعل) کە (صادق) و (کاذب)ە، نەك بە شێوەی فیعلەکە کە (صدق) و (کذب)ە.

(چوارەم) چوارجار دووپات کردنەوەی ئەوە.

(پێنجەم) دوعا کردنی لەخۆی لەسەری پێنجەم جاردا بە نەفرینی خوا ئەگەر درۆ بکات.

(شەشەم) پێ ڕاگەیاندنی لەکاتی جاری پێنجەم دا کە ئەمەیان دۆزەخ پێویست ئەکات‌و سزای دونیا هێواشترە لە سزای ڕۆژی دوایی.

(حەوتەم) دانانی لیعانەکە بە شێوەیەك کە سزاو تۆڵە پێویست ئەکات لەسەر ژنەکە، ئەویش یا (ڕەجم کردنە) یا گرتن, وە لیعان کردنی ژنەکە سزاو تۆڵەی لێ دور ئەخاتەوە.

(هەشتەم) ئەو نەفرین کردنە سزا لەسەر یەکێکیان پێویست ئەکات، یا لە دونیادا ئەبێت، یا لە ڕۆژی دواییدا.

(نۆیەم) هەر دوو نەفرینکەر لەیەك جیا ئەکرێنەوەو ماڵیان وێران ئەبێت و لێیان تێك ئەچێت.

(دەیەم) پشتگیری ئەو جیابونەوەیەو حەرام بوونیان بۆ هەتا هەتایە.

جا لە کاتێکدا ئەو (لیعانە) پلەو پایەی بەو شێوەیە بێت، وا دانراوە کە سوێند بێ لەگەڵ شایەتی‌دا، وە شایەتی بێت لەگەڵ سوێندا، وە لیعانکەرەکە وەك شایەتی لێ دێت (چونکە قسەکەی وەرنەگیرێ) جا ئەگەر ژنەکە پەشیمان بووەوە شایەتی پیاوەکە بەجێ دێ‌و ژنەکە (حد) تۆڵەی لێ ئەسەنرێ و شایەتیکە سوودی ئەبێت.

وە سوێندی پیاوەکە بۆ دوو شتە: خستنی تۆڵە لەکۆڵ خۆی‌و پێویست کردنی لەسەر ژنەکە، وە ئەگەر ژنەکەش لیعانی کردو بەرپەرچی لیعانی پیاوەکەی دایەوە بە لیعانی خۆی، ئەو کاتە لیعانی پیاوەکە سوودی ئەوەی ئەبێت کە تۆڵە لەکۆڵ پیاوەکە ئەخات, بێ ئەوەی پێویستی بکات لەسەر ژنەکە. کەواتە نەفرین کردنەکە بەنیسبەت پیاوەکەوە هەم شایەتی‌یە و هەم سوێند،

چونکە ئەگەر سوێندی پەتی بوایە, تەنها بە سوێندی ئەو حەد لەسەر ژنەکە بەجێ نایەت، وە ئەگەر شایەتی‌دان بوایە تەنها بە شایەتی ئەو حەد بەجێ نایەت لەسەر ژنەکە.

جا ئەگەر ژنەکە لیعان نەکات و پەشیمان بێتەوە ئەوە لایەنی شایەتی و سوێندی پیاوەکە بەهێز ئەبێت بە تەئکید کردنی خۆی‌و بە پەشیمان بوونەوەی ژنەکە، ئیتر ئەوە بەڵگەیەکی ئاشکرایە لەسەر ڕاستگۆیی پیاوەکە، هەر بۆیە تۆڵە لەکۆڵ پیاوەکە ئەکەوێ و پێویست ئەبێت لەسەر ژنەکە. وە ئەوەش چاکترین حوکمە. ﴿وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ اللَّهِ حُكْماً لِقَوْمٍ يُوقِنُونَ﴾ (المائدة:٥٠). واتە: کێ هەیە لەخوا دادوەرتر بێ لە حوکمیا بۆ کەسانێك کە لەیاسای خوا بگەن و باوەڕیان پێی بێ‌و یەقینیان هەبێ.

بەمەدا دەرئەکەوێت کە لیعان سوێندە و واتای شایەتی تێدایە، وە شایەتی‌یە و واتای سوێندی تێدایە.

**لیعانی کوێر و لاڵ :**

هیچ کام لە زانایان جیاوازی نی‌یە لەوەدا کە دروستە کوێر لیعان بکات، بەڵام بۆ لاڵ جیاوازی‌یان هەیە. مالیك و شافیعی ووتویانە: ئەگەر لاڵ لێی تێ‌بگەیت لیعان ئەکات, ئەبوحەنیفە ڕەحمەتی خوای لەسەر بێت ووتویەتی: لیعان ناکات، چونکە شیاوی شایەتی نی‌یە.

**کامیان دەست ئەکات بە لیعان کردن :**

زانایان لەسەر ئەوە ڕێك کەوتوون کەسونەتە لە پێشاندا پیاوەکە دەست پێ‌بکات، وەپێش ژنەکە بکەوێ، بەڵام جیاوازی‌یان هەیە لە واجب بوونی ئەو پێشکەوتنەدا.

شافیعی و کەسانی تر ووتویانە: پێویستە پیاوەکە پێش بکەوێ وە ئەگەر ژنەکە پێش کەوت بۆی حیساب ناکرێ، وە بەڵگەشیان ئەوەیە کە نەفرین کردن دانراوە بۆ لە کۆڵ خستنی تۆڵە لەسەر پیاو، جا ئەگەر ژنەکە پێش کەوت، ئەوە بۆ لابردنی شتێکە کە نەچەسپاوە

بەڵام ئەبو حەنیفە و مالیك ووتویانە: ئەگەر ژنەکە لە پێشەوە دەست پێ بکات دروستە و حیساب ئەکرێ. وە بەڵگەشیان ئەوەیە کە خوای گەورە لەقورئاندا بە (واو) ی عەطف ڕستەکانی بەستووە بەیەکەوە، وە (واو) ی عەطف یەك بەدوای یەکدا پێویست ناکات بەڵکو بۆ کۆکردنەوەی تێکڕایە.

**سەرپێچی کردن لە لیعان :**

سەرپێچی کردن لەلیعان یا لەژنەوە ئەبێت یاله پیاوەکەوە. جا ئەگەر پیاوەکە نەی کرد، ئەوە تۆڵەی تۆمەت دانی زینای لێ ئەسەندرێ. بەپێی فەرموودەی خوای گەورە: ﴿وَالَّذِينَ يَرْمُونَ أَزْوَاجَهُمْ وَلَمْ يَكُنْ لَهُمْ شُهَدَاءُ إِلَّا أَنْفُسُهُمْ فَشَهَادَةُ أَحَدِهِمْ أَرْبَعُ شَهَادَاتٍ بِاللَّهِ إِنَّهُ لَمِنَ الصَّادِقِينَ﴾ (النور:٦) واتە: ئەو پیاوانەی تاوانی داوێن پیسی ئەدەنە پاڵ ژنەکەیان و شایەتیان نیە جگە لە خۆیان ئەوە هەر یەکەیان ئەبێ چوار جار شایەتی بدات و بڵێ کە ئەو لە ڕاستگۆیانە. لەو گفتەدا. جا ئەگەر پیاوەکە شایەتی نەدا ئەوە وەك بێگانەی لێ دێت بۆ تاوان دانەپاڵ ژن. وە بەپێی ئەوەی لە پێشەوە باس کرا کە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (البينة أو حدٌّ في ظهرك) واتە: شایەت یا تۆڵە ئەدرێ لە پشتت.

ئەمەش مەزهەبی هەر سێ پێشەواکەیە.

وە ئەبو حەنیفە ووتوویەتی: تۆڵەی لێ ناسەندرێ. بەڵکو بەند ئەکرێ هەتا (لعان) نەفرین ئەکات، یا خۆی بەدرۆ ئەخاتەوە، جا ئەگەر خۆی بە درۆ خستەوە ئەوە حەددی تۆمەت دانەکەی ئەکەوێتە سەر. بەڵام ئەگەر ژنەکە نەفرین کردنەکەی نەکرد: ئەوە حەددی زیناکردنی لێ ئەدرێ لای مالیك و شافیعی. وە ئەبو حەنیفە ووتویەتی: حەددی لێ نادرێ، وە ئەبێ بەند بکرێت هەتا نەفرینەکە ئەکات یا دان بەزیناکردندا ئەنێت، ئەگەر ووتی پیاوەکەی ڕاست ئەکات، حەددی لێ ئەدرێ،

وە ئەبوحەنیفە ڕەزای خوای لێ بێت بەڵگەی بۆ ئەوە فەرموودەی پێغەمبەرە ﷺ کە فەرموویەتی: (لايحل دم امرئ مسلم إلا بإحدى ثلاث: زنا بعد إحصان، أوكفر بعد إيمان، أوقتل نفس بغير نفس) واتە: خوێنی هیچ موسڵمانێك ڕەوانی‌یە بە یەکێ لەم سیانە نەبێت: زینا کردن

دووای ژن هێنان و شووکردن. یا کوفر کردن دووای باوەڕ هێنان، یا یەکێکی کوشتبێ, بێ ئەوەی ئەوکەسە کەسی کوشتبێ[1].

وە لەبەر ئەوەی خوێن ڕشتن بەهۆی نکوڵ و پەشیمان بوونەوە حوکمێکە بنەماکانی ئیسلام ڕەتی ئەکاتەوە، چونکە لەکاتێکدا زۆر لە زانایان غەرامەی ماڵ پێویست ناکەن بەهۆی پەشیمان بوونەوە، ئەوە لەپێش ترە کە کوشتنەوە بە نکوڵ کردن پێویست نابێت,

ئیبنو ڕوشد ووتویەتی: بە گشتی بنەمای خوێنەکان لە یاسای ئیسلامدا دامەزراوە لەسەر ئەوە کە نابێت خوێن برێژێ بەشایەتی دادپەروەر نەبێت یا بەدان پێدانانی ئەوکەسە. لە پێویستەکانە کە نابێت ئەم بنەمایە تایبەت بکرێ بەناوێکی هاوبەش. کەواتە ئەبو حەنیفە لەم کێشەیەدا لە پێشترو نزیکترە لە ڕاستیەوە إن شاء الله. وە ئەبو مەعالی لە کتێبەکەیدا (البرهان) دانی بە بەهێزی ئەم ڕایەدا هێناوە، کە شافیعیەیە.

جیاکردنەوەی ژن و مێردە لیعان کەرەکە :

ئەگەر ژن و مێرد لیعانیان کرد، جیابوونەوە لەنێوانیاندا دروست ئەبێت بە تەئکید, وە حەرام بوونیان لە یەك لاناچێت بەهیچ جۆرێك. لە ئیبنو عەبباسەوە, کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (المتلاعنان إذا تفرقا لا يجتمعان أبداً)[2] واتە: نەفرین کەران کە لەیەك جیابونەوە هەرگیز یەك ناگرنەوە. وە لە عەلی و ئیبنو مەسعودەوە هاتووە کە ووتوویانە: سوننەت وا هاتووە کە ژن و مێردی نەفرینکەر هەرگیز یەك ناکەونەوە[3]. دارەقوطنی هەردوکیانی گێڕاوەتەوە. لەبەر ئەوە ڕق و کینەو پچڕانی وەها ڕوی داوە لەنێوانیانا کە بۆتە هۆی دابڕانی هەمیشەیی، چونکە بناغەی ژیانی ژن و مێردایەتی ئارامی و خۆشەویستی و بەزەیی و دڵسۆزیە, وە ئەو جۆرە کەسانەش ئەو بناغەیان وون کردووە. جا سزایان جیابوونەوەی هەمیشەییە

وە زانایان جیاوازیان هەیە لەوەدا کە ئەگەر پیاوەکە خۆی بە درۆبخاتەوە, جەماوەر ووتویانە: هەرنابێت یەك بگرنەوە هەرگیز، وە لەبەر فەرموودەکانی پێشوو, وە ئەبو حەنیفە ووتویەتی: ئەگەر پیاوەکە خۆی بەدرۆ خستەوە داری تۆڵەی لێ ئەدرێ, وە دروستە بۆی پەیمانێکی تازەی بۆ ببەستێتەوە. ئەبو حەنیفە بەڵگەی ئەوەیە کە ئەگەر خۆی بەدرۆخستەوە، حوکمی نەفرین کردن

---

(١) تەخریجی ئەم حەدیسە ڕابوورد.

(٢) الدارقطني (٣/٢٧٦).

(٣) الدارقطني (٣/٢٧٦-٢٧٧).

پوچەڵ ئەبێتەوە, وە وەك چۆن ئەو منداڵەی كە لەگوماندا بوو لێی پەی ئەدرێتەوە، بەو شێوەیەش ژنەكەی بۆ ئەگێڕرێتەوە, چونكە ئەوهۆیەی حەرام بوون پێوست ئەكات ئەوەیە كە نازانرێ ڕاستگۆكەیان دەست نیشان بكرێ، لەگەڵ ئەوەدا كە یەكێكیان هەر درۆ ئەكەن، جا كاتێ ڕاستگۆ یا درۆزن دەركەوت حەرام بوونەكە لائەچێت.

چ كاتێك جیابوونەوە دروست ئەبێت؟

جیابوونەوە دروست ئەبێت كاتێ هەردوكیان لە نەفرین كردنەكە ئەبنەوە, ئەمە لای مالیك، وە شافیعی ووتویەتی: كاتێ مێردەكە لە نەفرین كردنەكەی بووەوە جیابوونەوە دروست ئەبێت. ئەبوحەنیفە و ئەحمەد و ثەوری ڕایان وایە: كە هەر حاكم جیایان ئەكاتەوە.

ئایا ئەو جیابوونەوەیە تەڵاقە یان فەسخە؟

جەماوەری زانایان ڕایان وایە كە ئەو جیابوونەوەی بە یەكتر نەفرین كردن دروست ئەبێت (فسخ) هەڵوەشاندنەوەیە.

وە ئەبوحەنیفە ڕای وایە كە ئەو جیابونەوەیە تەڵاقی بائینە، چونكە هۆیەكەی لای پیاوەكەوەیە، وە وادانارێ كە لەلایەن ژنەوە بێت. وە هەر جیابوونەوەیەك بەو شێوەیە بێت ئەوە تەڵاقە و هەڵوەشاندنەوە نیەیە, وە ئەم جیابوونەوە كە لێرەدایە وەك جیابوونەوەی ژنە لەو پیاوەی كە ناتوانێ نزیكی ژن بكات. ئەگەر بە حوكمی حاكم بوو.

وە ئەوانەی بۆ ڕای یەكەم چوون بەڵگەیان حەرام بوونی هەمیشەیی‌یە، كە لە مەحرەم ئەچێت، وە ئەوانە ڕایان وایە كە هەڵوەشاندنەوە بەنەفرین كردن مافی ژن ئەفەوتێنێ لەنەفەقە لە ماوەی عیددەكە، وە هەروەها شوێن و جێگای، چونكە نەفەقە و شوێن كاتێ ڕەوا ئەبێت بۆ ژن كە لە عیددەی تەڵاقدا بێت نەك لە عیددەی هەڵوەشاندنەوە، وە ئەوەی پشتگیری ئەوە ئەكات, ئەوەیە كە ئیبنو عەبباس ڕەزای خوای لێ بێت گێراویەتی‌یەوە لە باسی ئەو دووكەسەدا كە لیعانیان كرد كە پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ئەو ژنە نە خواردەمەنی ئەبێت نە شوێن، چونكە ئەو دووانە نە بەتەڵاق كاریان كردووە نە پیاوەكەی مردووە) ئەحمەد و ئەبوداود ریوایەتیان كردووە[1].

---

(١) أحمد (١/٢٤٥).

**منداڵ ئەدرێ بە دایکی :**

ئەگەر پیاو ووتی ئەومنداڵە هی من نی‌یەو نەفرین کردن تەواو بوو بەوە کە ئەو منداڵەی بەهی خۆی نەزانی، ئەوە نەسەبی لەسەر ئەو پیاوە نامێنێ و نەفەقە کێشانیشی لەسەر لائەچێت، وە میراتی‌یەك ناگرن وئەدرێ بە دایکی و لەگەڵ دایکی‌دا میراتی یەکتر ئەگرن. بەپێی ئەوەی عەمری کوڕی شوعەیب گێڕاویەتی‌یەوە لە باوکی‌یەوە لە باپیرەیەوە کە فەرموویەتی: (پێغەمبەر ﷺ فەرمانی‌دا لەبارەی منداڵی دوو نەفرین کەرەکان کە لەگەڵ دایکیدا میراتی یەك ئەگرن، وە هەرکەس تانەی داوێن پیسی تێ بگرێ بەو منداڵە هەشتا داری لێ ئەدرێ). ئەحمەد تەخریجی کردووە[1]. وە ئەوەی کە ئەم حەدیسە پشتگیری ئەکات ئەو بەڵگانەن کە وا ئەگەیەنن منداڵ بۆ جێگا نوستنە، وە لێرەدا جێگای نوستن نی‌یە, چونکە پیاوەکە لە خۆی دوور ئەخاتەوە،

وە ئەمما کەسێك ئەو نافرەتە بەو منداڵە تانە لێ بدات بە قازیف (تومەتچی) دائەنرێ و هەشتا جەڵدی لێ ئەدرێ، چونکە نەفرین کردن لەناو ئەوانەدایە کە (محصن) ژنیان هێناوە یان شوویان کردووە, وە پێچەوانەی ئەوە لەسەر ئەو ژنە سابت نەبووە, کەواتە هەرکەس بە کوڕەکەی تانەی داوێن پیسی لێ ئەدا حەددی تۆمەت هەڵبەستنی لەسەر واجب ئەبێت، وە هەرکەس تانە لە منداڵەکەشی بدات هەر حەددی لەسەر واجب ئەبێت، ڕێك وەك دایکی. ئەمە بە نیسبەت ئەو حوکمانەوە کە پەیوەستە بە منداڵەکەوە. بەڵام بە نیسبەت ئەو حوکمانەی خوا دای ناوە بۆ هەمووان. ئەومنداڵە وەها مامەڵەی لەگەڵ ئەکرێ وەك ئەوەی کوڕی کابرا بێت بۆ ئیحتیات جا زەکاتی ناداتێ، وە ئەگەر کوشتی قیصاصی لە سەر نی‌یە (وەك چۆن ئەگەر باوك کوڕی خۆی کوشت قیصاصی لەسەر نی‌یە) وە مەحرەمی لە نێوان ئەو منداڵەدا وە لە نێوان منداڵەکانی تردا هەر هەیەو ئەمێنێ. وە دروست نابێت شایەتی بۆ یەکتری بدەن، وە بە نەسەب نادیار دانانرێ، درووست نی‌یە کەسێکی کە بەناوی کوڕی خۆی بانگی بکات, وە ئەگەر پیاوەکە خۆی بەدرۆ خستەوە نەسەبی منداڵەکەی بۆ ئەچەسپێ، وە بە نیسبەت منداڵەکەوە هەموو شوێنەواری لیعان لائەچێت.

---

(١) أحمد (١/٢٤٥).

## عیددە

**پێناسەکەی:**

عیددە لە (عد)و (إحصاء) ەوە وەرگیراوە: واتە ئەو ڕۆژانەی کە ئافرەت تەیان ژمێرێ لەڕۆژانی بێنوێژی و پاکی. وە عیددە ناوە بۆ ئەو ماوەیەی کە ئافرەت تێیدا چاوەڕێیی ئەکات و شوو ناکاتەوە دوای مردنی مێردەکەی یان جیابوونەوە لێی.

وە عیددە لەسەردەمی نەزانیشدا هەبووە, بەپێی فەرمودەی خوای گەورە کە فەرمویەتی: (وَالْمُطَلَّقَاتُ يَتَرَبَّصْنَ بِأَنْفُسِهِنَّ ثَلاثَةَ قُرُوءٍ)(البقرة: من الآية٢٢٨) واتە: ژنانی تەلاق دراو پێویستە کە چاوەڕوانی بکەن بە بێ شووکردنەوە دوای تەلاقەکە ماوەی سێ پاکی یا سێ بێنوێژی بۆ عیددە. وە بەپێی فەرمودەی پێغەمبەر ﷺ کە بە فاطمەی کچی قەیسی فەرمووە: (إعتدِّي في بيت إبن أم مكتوم)[1] واتە: لە ماڵی ئیبنوئوم مەکتوم عیددە بکێشە.

**(٢) حیکمەتی دانانی:**

ا- زانینی خاوێنی منداڵ دان بۆ ئەوەی نەسەبەکان تێکەڵ نەبن لەگەڵ یەکتردا.

ب-ئامادەکردنی هەلێك بۆ ژن و مێرد بۆدووبارە کردنەوەی ژیانی ژن و مێردایەتی ئەگەر بۆیان دەرکەوت و زانیان خێری تێدایە.

ج- گەورەکردنی کاری ژن و مێردایەتی، کە کارێکە ڕێك ناکەوێ بێ کۆمەڵێك پیاو نەبێت، وە هەڵناوەشێتەوە بە چاوەڕوانی زۆر نەبێت, ئەگەر وەها نەبووایە وەك یاری منداڵە ووردکەی لێ ئەهات ڕێك ئەخراو هەر لەو کاتەشدا تێك ئەدرایەوە.

د- بەژەوەندی لەو ژن و مێردایەتی‌یە پێك نایەت هەتا وەکو خۆیان ڕانەهێنن لەسەر ئەوە، دەوام بەو پەیمانە بدەن بە ئاشکرا، جا ئەگەر شتێك ڕوویدا پێویستی کرد کە ئەو یاسایە هەڵوەشێنێ ودەرباز بوون نی‌یە بۆ جێ بەجێ هێنانی شێوەی بەردەوامێتی بە گشتی بەمە کە ماوەیەك ژنەکە چاوەڕوانی بکات کە بەو چاوەڕوانی‌یە دڵی غەمبار ببێت و ناڕەحەتی‌و ڕەنج بکێشێ.

**جۆرەکانی عیددە :**

**عیددە چەند جۆری هەیە:**

١- عیددەی ژنێك کە بێ نوێژی بەسەردا بێت, ئەویش سێ بێ نوێژی‌یە.

(١) أحمد (٦/٤١٤) ومسلم (١٤٨٠/٤١) وأبوداود (٢٢٩٠) والنسائي (٦/٢١٠).

٢- عیددەی ژنێك كە نومێد براو بوویێت لە بێنوێژی ئەویش سێ مانگە.

٣- عیددەی ژنێك كە مێردەكەی مردبێ، ئەویش چوارمانگ و دە ڕۆژە بەمەرجێ دوگیان نەبێت.

٤- عیددەی ژنی دووگیان هەتا زگەكەی دا ئەنێت.

ئەمە كورتەیەكە لەخوارەوە ڕوونی ئەكەینەوە:

وە ژنەكە یا گوێزراوەیە یا نەگوێزراوەتەوە.

عیددەی ئافرەتێك كە هێشتا نەگوێزراییێتەوە:

ئافرەتێك نەگوێزراییێتەوە ئەگەر تەڵاق درا عیددەكێشانی لەسەر نییە بەپێی فەرمودەی خوای گەورە كە ئەفەرموێ: (یَا أَیُّهَا الَّذِینَ آمَنُوا إِذَا نَکَحْتُمُ الْمُؤْمِنَاتِ ثُمَّ طَلَّقْتُمُوهُنَّ مِنْ قَبْلِ أَنْ تَمَسُّوهُنَّ فَمَا لَکُمْ عَلَیْهِنَّ مِنْ عِدَّةٍ تَعْتَدُّونَهَا﴾ (الأحزاب: من الآیة٤٩) واتە: ئەی ئەوكەسانەی باوەڕتان هێناوە ئەگەر ئافرەتی خاوەن باوەڕتان مارەكرد لە پاشاندا تەلاقتان دان پێش ئەوەی دەستیان لێبدەن، بۆتان نییە عیددەیان لەسەر دابنێن كە بیكێشن.

بەڵام ئەگەر نەگوێزرابووەوە و مێردەكەی مرێ ئەوە عیددەی لەسەرە وەك ئافرەتی گوێزراوە، بەپێی فەمودەی خوای گەورە كەفەرمویەتی: ﴿وَالَّذِینَ یُتَوَفَّوْنَ مِنْکُمْ وَیَذَرُونَ أَزْوَاجاً یَتَرَبَّصْنَ بِأَنْفُسِهِنَّ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْراً﴾ (البقرة: من الآیة٢٣٤) واتە: ئەوانەی ئەمرن لە ئێوەو ژنان بەجێ دیڵن ئەو ژنانە ئەبێ چوار مانگ و دە ڕۆژ چاوەڕوانی بكەن، لەماڵ دەرنەچن و خۆیان نەڕازێننەوەو شوونەكەنەوە.

وە بۆیە ئەبێ عیددە بكێشێ با نەش گوێزراییێتەوە، لەبەر وەفاداری بۆ ئەو مێردەی كە مردووە و ئاگاداری كردنی مافەكانی.

عیددەی ژنی گوێزراوە:

بەڵام ژنی گوێزراوە یا لەو ئافرەتانەیە كە بێنوێژی ئەبینن، یا لەو ئافرەتانەیە كە نایبینن.

عیددەی ئەو ژنەی كە بێنوێژی ئەیبینێ:

جا ئەگەر لەو ژنانە بوو كە بێنوێژی ئەبینن ئەوە عیددە چاوەڕوان كردنەكەی سێ جار بێ نوێژ بوونەو پاك بوونەوەیە، بەپێی فەرمودەی خوای بەرز كە فەرمویەتی: ﴿وَالْمُطَلَّقَاتُ یَتَرَبَّصْنَ بِأَنْفُسِهِنَّ ثَلاثَةَ قُرُوءٍ﴾ (البقرة: من الآیة٢٢٨) واتە: ژنانی تەڵاق دراو پێویستە كە ماوەی سێ بێ نوێژی چاوەڕوانی بكەن و عیددە بكێشن. وە (قروء) كۆی (قرء)ە كە مانای بێ نوێژییە.

ئیبنو قەییم ئەو مانایەی پێش خستوەو ووتویەتی: لەفزی (قرء) کە لەقسەی یاسادانەری ئیسلامدا هاتووە بەکار نەهاتووە ئیللا بۆ بێنوێژی نەبێ، وە لە هیچ شوێنێکدا لەوەوە نەهاتووە کە بەکار هاتبێ بە مانای پاك بوونەوە، لەبەر ئەوە هەر بەو شێوەیە دابنرێ کە لە ئایەتەکەدا هاتووە باشترە بەڵکو ئەبێ هەروا بێت. چونکە پێغەمبەر ﷺ بەو ژنەی فەرموو کە بێ نوێژی بەردەوامی هەبوو: (دعي الصلاة أيام إقرائك)[1] واتە: واز لەنوێژ کرد بهێنە لە ڕۆژانی بێنوێژیت، پێغەمبەریش ﷺ لە خواوە قسەی کردووە و بەزمانی نەتەوەکەی قورئان هاتۆتە خوارەوە، جا ئەگەر شتێك هات لە فەرمودەکانیدا دوو واتای هەبوو، بەڵام ئەو ﷺ هەر بەیەکێ لە واتاکانی بەکاری ئەهێنا، ئەبێ لەهەموو قسەکانی تریشیدا هەر بەو واتایە لێك بدرێتەوە، ئەگەر نەچەسپابوو بەواتاکەی تر بەکاری هێنابێ. وە هەر ئەوەش ئەبێتە لوغەتی قورئان کە قسەمان لەگەڵدا ئەکا پێی، یا لە قسەی کەسانی تریشدا واتایەکی تری هەبێت، وە ئەگەر چەسپا یاسادانەری ئیسلام ووشەی (قرء)ی بۆ بێنوێژی بەکار هێنابوو، ئیتر ئەبێ بزانرێ ئەوە زمانەکەیەتی، وە ئەبێ هەربەو شێوەیە دابندرێ لە قسەکانیدا، وە بەڵگەش بۆ ئەوە شێوەی ئایەتەکەیە کە ئەفەرموێ: ﴿وَلا يَحِلُّ لَهُنَّ أَنْ يَكْتُمْنَ مَا خَلَقَ اللَّهُ فِي أَرْحَامِهِنَّ﴾(البقرة: من الآية٢٢٨)

واتە: دروست نیيە بۆیان ئەوەی خوا لە منداڵدانیاندا دروستی کردووە بیشارنەوە.

وە ئەوەش بێنوێژی وسك بوونە لای لێك دەرەوەکانی قورئان بە گشتی، وە دروست کراویش لە منداڵداندا هەر ئەو بێ نوێژیەیە کە هەیەتی، وە سەلەف وخەلەف هەروایان ووتوە، وە کەسیان نەی ووتوە ئەو دروست کراوە پاکبونەوەیە، وە هەروەها خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿وَاللَّائِي يَئِسْنَ مِنَ الْمَحِيضِ مِنْ نِسَائِكُمْ إِنِ ارْتَبْتُمْ فَعِدَّتُهُنَّ ثَلاثَةُ أَشْهُرٍ وَاللَّائِي لَمْ يَحِضْنَ وَأُولاتُ الْأَحْمَالِ أَجَلُهُنَّ أَنْ يَضَعْنَ حَمْلَهُنَّ﴾ (الطلاق: من الآية٤) واتە: ئەو ژنە تەڵاقدراوانەی کە هیوا بڕاو بوون لەبێ نوێژی لەبەر بەتەمەنی ئەگەر گومانتان هەبوو، نەتان ئەزانی حوکمیان چۆنە؟ ئەوە عیددەکەیان سێمانگە، وە هەروەها ئەو ژنانەش کە لەبەر منداڵی بێنوێژ نەبوون. وە ئەو ژنانەی دووگیانن عیددەکەیان تا ئەوکاتە نەبێت کە منداڵەکەیان لێ ئەبێتەوە. جا خوای گەورە هەموو مانگێکی لە بەرامبەر بێنوێژیەك داناوە، وە حوکمەکەی بە نەبوونی بێنوێژیەوە بەستۆتەوە نەك بە نەبوونی پاکیو بێ نوێژییەوە، وە وتویەتی: خوای گەورە لە شوێنێکی تردا ئەفەرموێت: ﴿فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ﴾ (الطلاق: من الآية١) ماناکەی ئەوەیە: کاتێ تەڵاقیان بدەن کە بەرەو عیددەکانیان

---

(١) البخاري (٣٢٥).

ئەچن – واتە لە پاکی‌یەکدا کە چونە لای تێدا نەبوبێ – نەك لە بێ‌نوێژی‌دا. وە ئەگەر ئەو عیددەیەی کە ژنی تێدا تەڵاق ئەدرێ دووای تەڵاقەکە هاتبێ، ئەوەی کە چاوەڕوان ئەکرێ دووای ئەوە بێت هەر بێ نوێژی‌یە، چونکە پاك بەرەو پاکی ناچێ، چونکە خۆی لەناو پاکی‌دا ئەبێت، بەڵکو بەرەو حەیز ئەچێت لەدووای ئەو حاڵەتەی کە ئێستا تێیدایە.

**کەم ترین ماوە بۆ عیددە کێشان بەبێ نوێژی:**

شافیعی‌یەکان ووتویانە: کەمترینی ئەو ماوەیە کە بکرێ ئافرەتی ئازاد عیددەی تێدا بکێشێ بە بێ‌نوێژی‌یەکان: سی‌و دوو ڕۆژ و ساتێکە، ئەویش بەو شێوەیە ئەبێت کە ئەو ژنە تەڵاق ئەدرێ لەکاتی پاکیدا، وە لەسەر ئەو پاکی‌یە ساتێك ئەمێنێتەوە ئەو ساتەش بە یەك (قرء) حیساب ئەکرێ لەپاشاندا ڕۆژێك بێ نوێژی ئەبێت، لە پاشاندا پانزە ڕۆژ پاك ئەبێت، ئەوەیش (قرء)ی دووەم، لەپاشاندا ڕۆژێك بێ‌نوێژ ئەبێت و پانزە ڕۆژ پاك ئەبێت، ئەویش (قرء)ی سێ‌یەم

جا کاتێ پێ‌ی نایە بێ‌نوێژی سێ‌یەم ئەوە عیددەکەی تەواو بووە. بەڵام لای ئەبو حەنیفە کەمترین ماوە بۆ عیددە شەصت ڕۆژە، وە لای دوو هاوڵەکەی سی‌و نۆ ڕۆژە، وە عیددە لای ئەبو حەنیفە بە دە ڕۆژ بێ‌نوێژی دەست پێ ئەکات، کە زۆرترین ماوەی بێ‌نوێژی‌یە، لەپاشاندا بە پانزە ڕۆژ پاکی، دوای ئەوە دە ڕۆژی تر بێ‌نوێژی و پانزە ڕۆژ پاکی، پاشان بێ‌نوێژی سێهەم کە ئەویش هەر دە ڕۆژە، وە کۆی ئەم ڕۆژانە ئەبێت بە شەصت ڕۆژ. جا کاتێك ئەو ماوەیە تەواو بوو و ووتی عیددەکەم کۆتایی هاتووە باوەڕی پێ ئەکرێ بە سوێند دان، ئیتر حەڵاڵ ئەبێت بۆ پیاوێکی تر کە بیەوێ مارەی بکات.

بەڵام دوو هاوەڵەکەی بۆ هەر بێ‌نوێژی‌یەك سێ ڕۆژیان داناوە، کە کەمترین ماوەی بێ‌نوێژی‌یە، وە بۆ هەر یەك لەو دوو پاك بوونەوەیە کە لەنێوان سێ بێ‌نوێژی‌یەکاندا ئەبێت پانزە ڕۆژ، بەوە کۆی ڕۆژەکان سی‌و نۆ ڕۆژە.

**عیددەی ئافرەتێك کە بێ‌نوێژ نەبێت:**

وە ئەگەر ژنەکە لەوانە بێت کە بێ‌نوێژی‌یان بەسەردا نەیەت، ئەوە (عدة) ماوەی چاوەڕوانی‌یەکەی سێ مانگە، وە بۆ ئافرەتی منداڵیش کە هێشتا پێ نەگەیشتووە و بێ‌نوێژ نەبووە هەر سێ مانگە، هەروەها ئافرەتی پیریش کە بێ‌نوێژ نابێت، ئیتر لەوە پێش بێ‌نوێژی نەبووبێ یا بوبێتی و بڕابێت یەکسانە. بەپێ‌ی فەرمودەی خوای گەورە کە ئەفەرمووێ: ﴿وَاللائِي يَئِسْنَ مِنَ الْمَحِيضِ مِنْ نِسَائِكُمْ إِنِ ارْتَبْتُمْ فَعِدَّتُهُنَّ ثَلاثَةُ أَشْهُرٍ وَاللَّائِي لَمْ يَحِضْنَ وَأُولاتُ الْأَحْمَالِ أَجَلُهُنَّ أَنْ يَضَعْنَ حَمْلَهُنَّ﴾ (الطلاق: من الآية٤) ڕوون کراوەتەوە.

ئیبنو ئەبی هاشم لەتەفسیرەکەیدا ئەگێڕێتەوە لە عەمری کوڕی سالمەوە لە ئوبەی کوڕی کەعبەوە کە فەرموویەتی: ووتم: ئەی نێرراوی خوا کەسانێك هەن لە مەدینەدا شتێك ئەڵێن دەربارەی عیددەی ژنان خوا لە قورئاندا باسی نەکردووە, دەربارەی بچوك و گەورە ودوگیان. ئیتر خوای گەورە ئەم ئایەتەی نارده خوارەوە کەئەفەرمووێ: ﴿وَاللاتِي يَئِسْنَ مِنَ الْمَحِيضِ مِنْ نِسَائِكُمْ إِنِ ارْتَبْتُمْ فَعِدَّتُهُنَّ ثَلاثَةُ أَشْهُرٍ وَاللَّائِي لَمْ يَحِضْنَ وَأُولاتُ الْأَحْمَالِ أَجَلُهُنَّ أَنْ يَضَعْنَ حَمْلَهُن﴾[1] (الطلاق: من الآية٤) وە یەکێکیان ماوەکەی ئەوەیە کە سکەکەی دابنێ، جا هەر کاتێ داینا ئیتر ماوەی عیددەکەی تەواو ئەبێت.

بەڵام لەفزی جەریر بەم شێوەیەیە: ئەڵێ ووتم ئەی نێرراوی خوا هەندێ لەخەڵکی مەدینە کاتێ ئەم ئایەتەی سورەتی بەقەرە هاتە خوارەوە دەربارەی عیددەی ژنان وتیان: دەربارەی عیددەی ژنان چەند عددەیەك ماوە لە قورئاندا باس نەکراوە, لەوانە: عیددەی ژنی بچوك و ژنی بەتەمەن کە لە بێنوێژی چۆتەوە و ئافرەتی دوگیان، ئەڵێ : ئیتر ئەو ئایەتەی کە لەبارەی ژنە بەتەمەنەکانەوەیە هاتە خوارەوە کە ئەفەرمووێ: ﴿وَاللَّائِي يَئِسْنَ مِنَ الْمَحِيضِ مِنْ نِسَائِكُمْ إِنِ ارْتَبْتُمْ﴾[2] (الطلاق: من الآية٤).

وە لە سەعیدی کوڕی جوبەیرەوە دەربارەی ئایەتی ﴿وَاللَّائِي يَئِسْنَ مِنَ الْمَحِيضِ مِنْ نِسَائِكُمْ﴾ (الطلاق: من الآية٤) ووتویەتی: مەبەستی ئەو ژنانەیە کە هیوا بڕاو بوون لە بێنوێژی و بێنوێژ نابن، یا ئەو ژنانەی لە بێنوێژی چوونەوە، چونکە ئەمانە هیچیان بێنوێژی نابینن, وە دەربارەی فەرموودەی: (إن ارتبتم) لە ئایەتەکەدا ووتویەتی: مانای ئەوەیە ئەگەر گومانتان هەبوو, ئەوە چاوەڕوان کردنەکەیان سێ‌مانگە,

وە لە موجاهیدەوە: ئەگەر گومانتان هەبوو ونەتان زانی عیددەی ئەو ژنەی کە لە بێنوێژی چۆتەوە چەندەیە، یان ئەو ژنەی کە هەر بێنوێژ نەبووە ئەوە عیددەی ئەوانە سێ مانگە. کەواتە فەرمودەی خوا: (إن ارتبتم) واتە: ئەگەر پرسیارتان کرد دەربارەی حوکمی ئەو ژنانە و حوکمەکەیتان نەئەزانی و گومانتان تێیدا هەبوو ئەوە خوا بۆی ڕوون کردونەوە.

---

(١) تفسير القرطبي (١٨/١٦٢) والطبري (٢٨/٩٣) والدر المنثور (٨/٢٠١) وأسباب النزول، للواحدي (٥٠٣).

(٢) بگەڕێرەوە بۆ سەرچاوەکانی پێشوو.

**حوكمی ژنی خاوەن بێنوێژی كاتێك بێنوێژی نەبینی:**

ئەگەر ژنێك تەڵاق دراو لەوانە بوو كە بێ نوێژ نەبوو، بەڵام لەو ماوەیەدا بێ نوێژی نەبینی لەعادەتی خۆی، وە نەشی زانی هۆیەكەی چییە، ئەبێ ساڵێك چاوەڕوانی بكات: نۆ مانگ چاوەڕوانی ئەكات بۆ ئەوەی پاكی منداڵ دانی دەركەوێ، چونكە نۆ مانگ بەشی زۆری ماوەی دووگیانی ئافرەتە. جا ئەگەر لەو ماوەیەدا دوگیان بوونی دەرنەكەوت، ئەوە پاكی منداڵ دانی بەڕواڵەت ئەزاندرێ، پاشان عیددەی ژنی (آیسة) هیوا بڕاو ئەكێشێ كە سێ مانگە، ئەمە ئەو شێوەیەیە كە عومەر ڕەزای خوای لێ بێت حوكمی پێ كردووە.

شافیعی ووتویەتی: ئەوە حوكمی عومەر بووە لەنێوان كۆچكەران و یارمەتیدەراندا (مهاجرین وأنصار) ئەوەندەی بزانین كەس لەوان ئینكاری لێ نەكردووە.

**تەمەنی هیوا بڕان :**

زانایان جیاوازییان هەیە لە تەمەنی هیوا بڕان لەبێ نوێژی، هەندێكیان ووتویانە: تەمەنی پەنجا ساڵییە، ئەوانی تر ووتویانە: ئەو تەمەنە شەست ساڵییە، بەڵام ئەوەی ڕاست بێت ئەو تەمەنە ئەگۆڕێ بە پێی ئافرەتان.

شێخی ئیسلام ئیبنو تەیمییە ووتویەتی: هیوا بڕان جیاوازە بەپێی جیاوازی ئافرەتان، وە سنورێكی نییە كە ئافرەتان لەسەری ڕێكەون. وە مەبەستی ئایەتەكەش ئەوەیە كە هیوا بڕانی هەموو ژنێك لە خۆیەوەیەتی، چونكە هیوا بڕان دژی بەهیوا بوونە، جا ئەگەر ژنێك هیوا بڕاو بوو لە بێنوێژی و بەتەمای نەبوو، ئەوە (آیسە) هیوا بڕاوە با چل ساڵ بێت یان لەو سنوورەدا بێت، و ژنانی تر هیوا بڕاو نەبوبن هەرچەند تەمەنیشیان پەنجا ساڵ بێت[1].

**عیددەی ژنی دووگیان :**

وە عیددەی ژنی دوگیان بەدانانی سكەكەی كۆتایی دێت، ئیتر تەڵاق دراو بێت یا مێردمرد و وەك یەكە، بە پێی فەرمودەی خوای گەورە كە ئەفەرمووێ: ﴿وَأُولاتُ الْأَحْمَالِ أَجَلُهُنَّ أَنْ يَضَعْنَ حَمْلَهُنَّ﴾ (الطلاق: من الآية٤) واتە وە ژنە دوو گیانەكان عیددەكەیان كاتێك تەواو ئەبێت كە زگەكەیان دانا ومنداڵیان بوو

لە (زاد المعاد) دا هاتووە: فەرموودەی خوای گەورە: ﴿أَجَلُهُنَّ أَنْ يَضَعْنَ حَمْلَهُنَّ﴾ ئەبێتە بەڵگەی ئەوەی كە ئەگەر ئەو ژنە زگی پڕ بوو بەدووانە عیددەكەی تەواو نابێت هەتا هەموویان دانەنێت، وە

---

(١) زاد المعاد ١٠٦ج٤.

ئەبێتە بەڵگەی ئەوەی کە ئەگەر ژنێك پاك بوونەوەی مندالّدانی لەسەر بێت عیددەکەی دانانی سکەکەیەتی

وە ئەبێتە بەڵگەی ئەوەی کە عیددەکەی کۆتایی دێت بە دانانی سکەکەی بە هەر شێوەیەك بێت، بە زیندوویی یا بەمردوویی بێت، تەواوو دروست بێت یا ناتەواو، وە گیانی بەبەرا کرابێت یان نا.

لە سوبەیعەی ئەسلەمیەوە کە خێزانی سەعدی کوڕی خەولە بووە و لەوانە بووە بەشداری شەڕی بەدریان کردووە، پاشان کۆچی دوایی کردووە لە (حجة الوداع) حەجی ماڵ ئاوایی‌دا، ئەمیش زگی پڕ بووە لێی ئەوەندی پێ نەچووە دووای مردنی سەعد منداڵەکەی بووە، کاتێ لە زەیستانی پاك بووەوە خۆی ڕازاندەوە بۆ ئەوەی کەسێك داوای بکات. ئەبو سەنابلی کوڕی بەعکەك چوو بۆ ماڵیان - کە پیاوێك بوو لە بەنی عبدالدار- پێی ووت: ئەوە چیە بە خۆڕازاوەیی ئەت بینم، لەوانەیە بتەوێ شووبکەی؟ سوێند بەخوا تۆ ناتوانی شووبکەی هەتا چوار مانگ و دە ڕۆژ تێ نەپەڕێ بەسەرتا سوبەیعە ووتی: کاتێ ئەوەی پێ ووتم جلەکانم لە خۆم کۆکردەوە وئێوارە چووم بۆ لای پێغەمبەرو ﷺ لەو بارەیەوە پرسیارم لێ کرد ئەویش ﷺ فەتوای پێدام کە من بەدانانی حەملەکەم عیددەکەم تەواو بووە، وە فەرمانی پێدام کە شووبکەم ئەگەر ویستم.

وە ئیبنو شیهاب ووتویەتی: من بەخراپی نازانم هەرکاتێ منداڵەکەی بوو شووبکات. ئەگەر لە زەیستانیشدا بێت قەیناکە، بەڵام ئەوەی تێدایە نابێت مێردەکەی بچێ بەلای‌دا هەتا پاك ئەبێتەوە. بوخاری و موسلیم و نەسائی و ئیبنو ماجە تەخریجیان کردووە[1].

وە زانایان فەرموودەی خوای گەورە: ﴿وَالَّذِينَ يُتَوَفَّوْنَ مِنكُمْ وَيَذَرُونَ أَزْوَاجاً يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْراً﴾ (البقرة: من الآية٢٣٤) تایبەت ئەکەن بەعیددەی ئەو ژنانەی دووگیان نین، وە فەرمموودەی خوای گەورە: ﴿وَأُولاتُ الْأَحْمَالِ أَجَلُهُنَّ أَنْ يَضَعْنَ حَمْلَهُنَّ﴾ (الطلاق: من الآية٤) تایبەت ئەکەن بە عیددەی ژنانی دووگیان، کەواتە ئایەتی دووەم پێچەوانەی ئایەتی یەکەم نیە

عیددەی ژنی مێرد مردوو:

ژنێك کە مێردەکەی بمرێ عیددەکەی چوار مانگ و دە ڕۆژە، مادام دووگیان نەبوو، بەپێی فەرمموودەی خوای گەورە کەئەفەرمووێ: ﴿وَالَّذِينَ يُتَوَفَّوْنَ مِنكُمْ وَيَذَرُونَ أَزْوَاجاً يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْراً﴾ (البقرة: من الآية٢٣٤) واتە: ئەوانەی لە ئێوە ئەمرن و ژنانێك بەجێ

(١) البخاري (٥٣١٨و٥٣١٩) ومسلم (١٤٨٥) والترمذي (١١٩٤) والنسائي (٦/١٩٤) وأحمد (٤/٣٢٧).

دەهێڵن، ئەبێ ئەو ژنانە چوار مانگ و دە ڕۆژ چاوەڕوانی بکەن، لەماڵ دەرنەچن و خۆیان نەڕازێننەوەو شوو نەکەنەوە. وە ئەگەر پیاو ژنەکەی تەڵاقدا بە تەڵاقی ڕەجعی، پاشان مرد وە ژنەکەی لە عیددەدا بوو ئەو ژنە لەدووای مردنی پیاوەکەی ئەبێ عیددە بکێشێ، چونکە کاتێك پیاوەکە مردووە هەر ژنی بووە.

عیددەی ژنێك کە هەمیشە بێنوێژ بێت :

ئەو جۆرە ژنانە بە بێ نوێژ بوون عیددە ئەکێشن. پاشان ئەگەر لە پێشەوە عادەتی بێ نوێژی هەبووبێ ئەبێ عادەتی خۆی لەپێش چاو بگرێ لە بێنوێژی و پاك بوونەوەدا، جا ئەگەر سێ بێ نوێژی بەسەردا ڕۆیشت، ئەوە عیددەکەی تەواو ئەبێت، بەڵام ئەگەر هیوا بڕاو بوو ئەوە بە سێ مانگ عیددەکەی تەواو ئەبێت.

عیددە لە نیکاحی نادروستیشدا هەر پێویستە:

ئەگەر کەسێك بەهەڵە چووە لای ژنێك ئەوە عیددەی لەسەر پێویست ئەبێت، چونکی چوونەلای بەهەڵە وەك ئەو چونە لایەیە کە لەمارە کردنی خزما ڕوو ئەدا کە پێی نەشێ، جا بۆیە وەك چونە لای مارەکردن وەهایە لە پێویست بوونی عیددەدا. وە هەروەها عیددەکێشان پێویست ئەبێت لە نیکاحی فاسیددا ئەگەر بەڕاستی چوبێتە لای. بەڵام ئەگەر پیاوێك زینا بکات لەگەڵ ژنێکدا ئەوە عیددە لەسەر ئەو ژنە پێویست نیەیە، چونکە عیددە بۆ پاراستنی (نسب) خزمایەتیەیە، وە کەسێك زینا بکات نەسەبی پێ ناگات، ئەمە ڕای حەنەفیەیەکان و شافیعیەیەکان و ثەوریەیە، وە ڕای ئەبوبەکر و عومەریشە،

وە مالیك و ئەحمەد ووتوویانە: ئەو ژنەش عیددەی لەسەرە، بەڵام ئایا عیددەکەی سێ بێنوێژیەیە یا یەك بێنوێژیەیە کە مندالدانی بە پاکی دەرخا؟ ئەوە دوو ڕیوایەتن لە ئەحمەدەوە.

گۆڕانی عیددە لە بێنوێژیەوە بۆ عیددەی مانگی:

ئەگەر پیاوێك ژنەکەی تەلاق داو لەو ژنانە بوو کە بێ نوێژ ئەبوو، لەپاشاندا پیاوەکە بمرێ و هێشتا ژنەکە عیددەکەی تەواو نەببوو، ئەوە ئەگەر تەڵاقەکە ڕەجعی بێت، ئەوە پێویستە لەسەر ئەو ژنە عیددەی مێرد مردوو بکێشێ، کە ئەویش چوار مانگو دە شەوە، چونکە هێشتا ژنیەتی، وە لەبەر ئەوەی تەڵاقی ڕەجعی ژن و مێردایەتی لانابات، لەبەر ئەوە میراتی یەکتر ئەگرن هەرکامیان بمرێ لە کاتی عیددەکەدا.

بەڵام ئەگەر تەلاقەکە بائین بێت ئەوە ئەو ژنە عیددەی تەڵاقەکە بە بێنوێژی تەواو ئەکات و عیددەکەی ناگۆڕێ بۆ عیددەی مێرد مردوو، ئەوەش بەهۆی بچڕاندنی پەیوەندی ژن و

مێردایەتیەیە لەنێوانیانا لەو کاتەوە کە تەلاقەکە دراوە, چونکە تەلاقی بائین ژن و مێردایەتی لائەبات، وە مردنەکە ڕووی داوە لە کاتێکدا کە مێردی نەبووە، لەبەر ئەوە میراتی یەکتری ناگرن، ئەگەر یەکێکیان مرد لە عیددەی ژنەکەدا، مەگەر پیاوەکە بە هەڵاتو دابنرێ (واتە تەلاقی دابێت تا میرات نەگرێ).

عیددە لە تەلاقی هەلاتوو:

تەلاقی هەلاتوو ئەوەیە کە پیاوێك ژنەکەی لەکاتی سەرەمەرگدا تەلاق بدات بە تەلاقی بائین بێ ئەوەی ژنەکە ڕازی بیت، لەپاشاندا ئەو پیاوە بمرێت لە کاتێکدا کە ژنەکە لە عیددەدا بێت، ئەوە لەو حاڵەتەدا پیاوەکە بە هەلاتو لە میرات دائەنرێ، هەر بۆیە مالیك ووتوویەتی: ئەو ژنە میرات لەو پیاوە ئەگرێ، هەرچەندە دوای بەسەرچونی عیددەکەشی مردبێ و شوویەکی تریشی کردبێت، لەبەر ئەمەش ئەوەیە مامەڵە لەگەڵ ئەو پیاوەدا بکرێ بە پێچەوانەی مەبەستەکەی.

وە ئەبو حەنیفە و محمد ڕایان وایە کە حوکمەکە لەم حاڵەتەدا ئەگۆڕێ، وە عیددەکەی بەدرێژترین عیددە بۆی دائەنرێ: عیددەی تەلاق یا عیددەی مێرد مردوو، جا ئەگەر عیددە تەلاقیەیە کە درێژتر بوو، ئەو عیددەیە تەواو ئەکات، بەلام ئەگەر عیددەی مێرد مردنەکە درێژتر بوو، ئەوەیان ئەبێتە عیددەی،

واتە ئەگەر سێ بێنوێژیەکەی بە چوار مانگ و دە ڕۆژ زیاتر تەواو کرد ئەوە سێ بێنوێژیەکە ئەبێتە عیددەی، بەلام ئەگەر چوار مانگ و دە ڕۆژەکە زۆرتر بوو لەو ماوەیەی کە سێ بێنوێژیەکەی تێدا تەواو ئەکات، ئەوە چوار مانگ و دە ڕۆژەکە ئەبێتە عیددەکەی. ئەمەش بۆ ئەوەی ژنەکە لە مافی خۆی مەحروم نەبێت کە میراتی پیاوەکەیە، لەکاتێکدا پیاوەکەی ویستویەتی بەتەلاق لیی هەڵ بێت.

وە لای ئەبو یوسف ژنی تەلاق دراو لەم حاڵەتەدا بە عیددەی تەلاقی عیددە ئەکێشی، با ماوەکەشی کەمتر بێت لە چوار مانگ و دە ڕۆژ،

وە شافیعی لە ئاشکراترین دوو بۆچوونەکەی ڕای وایە: ئەو جۆرە ژنانە میرات ناگرن هەر وەك تەلاقدراو بە تەلاقی بائین لە کاتی ساغیدا، وە بەڵگەشی ئەوەیە کە ژن و مێردایەتیان کۆتایی هاتووە بە تەلاقی پێش مردنەکەی، لەبەر ئەوە هۆی میرات گرتنەکە لاچووە. وە گومانی فیلارکردن بە هیچ دانانرێ، چونکە حوکمە شەرعیەکان ئەبەسترێنەوە بەهۆکارە ڕواڵەتیەکانەوە، نەك بە نیەت و نیازە شاراوەکان. وە ڕێك کەوتون لەسەر ئەوەی کە ئەگەر لەکاتی نەخۆشی کابرادا دەست بەرداری یەك بوون، ئەجا ژنەکە مرد، پیاوەکە میراتی ناکەوێ،

وە هەروەها عیددە لە عیددەی بێنوێژییەوە ئەگۆڕێ بەعیددەی مانگی بۆ ئەو ئافرەتەی جارێك یا دووجار بێ نوێژ ئەبێت لەپاشاندا لە بێ نوێژی بچێتەوە و هیوا بڕاو بێت، ئەوە لەم کاتەدا پێویستە لە سەری بە عیددەی سێ مانگ عیددە بکێشێ، چونکە تەواوکردنی عیددە بە بێنوێژی ناکرێت، لەبەر نەمانی بێ نوێژی، وە ئەتوانرێ تەواو بکرێ بە دەست پێکردنەوەی مانگەکان، وە مانگەکان لە جیاتی بێ نوێژی ئەبن.

**گۆڕانی عیددەی مانگی بۆ عیددەی بێ نوێژی:**

ئەگەر هاتوو ژنێك لە بەر منداڵی یا گەیشتنی بە تەمەنی هیوا بڕان دەستی کرد بە عیددەکێشان بە مانگ، لەپاشاندا بێ نوێژ بوو، پێویستە لەسەری لە عیددەی مانگییەوە بچێ بۆ عیددەی بێ نوێژی، چونکە مانگەکان لە جیاتی بێ نوێژین کەواتە نابێت ئیعتیباریان پێ بکرێ لەگەڵ بوونی ئەسڵەکەدا کە بێنوێژییە. وە ئەگەر عیددە کێشانی بە مانگ تەواو بوو لەپاشاندا بێنوێژ بوو پێویست نییە لەسەری دەست بکاتەوە بە عیددەکێشان بە بێنوێژی، چونکە کاتێ ئەوە ڕوویداوە عیددەکەی تەواو بووە.

وە ئەگەر دەستی کرد بە عیددەکێشان بەبێنوێژی یا بە مانگ، لەپاشاندا دەرکەوت کەزگی پڕە لە کابرای مێردی، ئەوە عیددەکەی ئەگۆڕێ بۆ عیددە کێشانی ژنی دووگیان کە بەدانانی زگەکەی عیددەی تەواو ئەبێت، وەزگ پڕبوونیش بەڵگەی ئەوەیە کە منداڵدانی پاکە لەڕوی بڕانەوە.

**کۆتایی هاتنی عیددەکە:**

ئەگەر ژنەکە دووگیان بوو ئەوە بە دانانی زگەکەی، عیددەکەی تەواو ئەبێت، وە ئەگەر عیددەکەی بەمانگ بوو لەو کاتەوە بۆی حیسابە[1] کە لەیەك جیا ئەبنەوە هەتا سێ مانگ تەواو ئەکات، یا لەوکاتەوە مێردەکەی ئەمرێ هەتا چوار مانگ و دە ڕۆژ تەواو ئەکات، بەڵام ئەگەر عیددەکەی بەبێنوێژی بوو، ئەوە بەسێ جار بێنوێژی عیدەکەی تەواو ئەبێت، ئەوەش لە لایەن ژنەکە خۆیەوە ئەزانرێ.

(١) مەزهەبی مالیك و شافیعی ئەوەیە کە ئەگەر تەڵاق لەناوەڕاستی مانگا ڕوی دا ئەوە باقیەکەی عیددە ئەکێشێ، پاشان دوو مانگ عیددە ئەکێشێ بە حیسابی مانگ، پاشان مانگی سێهەمیش سی ڕۆژی تەواو عیددە ئەکێشێ.

وە ئەبو حەنیفە وتویەتی: باقی مانگی یەکەم حیساب ئەکرێ وە ئەوەش کە ڕۆیوە لە مانگی چوارەم تەواوی ئەکات ئیتر مانگەکان سی تەواو بن یا کەمتر بن.

**ئەبێت ژنی عیددەکێش لەماڵی مێردەکەی نەچێتە دەر:**

پێویستە لەسەر ژنی عیددەکێش کە لەو ماڵە نەچێتە دەر کە ژیانی ژن و مێردایەتی تێدا بردۆتەسەر، هەتا عیددەی تەواو ئەبێت، وە دروست نیە کە خۆی بچێتە دەر، وە دروست نیە بۆ پیاوەکەشی کە دەری بکات، وە ئەگەر تەڵاقەکە یان جیابوونەوەکە ڕوی داو ژنەکە لەماڵی ژن و مێردی نەبوو پێویستە هەر کە زانی بگەڕێتەوە بۆ ئەو ماڵە. خوای گەورە ئەفەرمووێ: ﴿يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ إِذَا طَلَّقْتُمُ النِّسَاءَ فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ وَأَحْصُوا الْعِدَّةَ وَاتَّقُوا اللَّهَ رَبَّكُمْ لا تُخْرِجُوهُنَّ مِنْ بُيُوتِهِنَّ وَلا يَخْرُجْنَ إِلَّا أَنْ يَأْتِينَ بِفَاحِشَةٍ مُبَيِّنَةٍ وَتِلْكَ حدودُ اللهِ وَمَنْ يَتَعَدَّ حدود الله فَقَدْ ظَلَمَ نَفْسَه﴾ (الطلاق:١)

واتە: ئەی پێغەمبەر ئەگەر ویستتان ژنەکانتان تەڵاقدا بدەن با لە کاتێکدا بێ کە بەرەو عیددەکەیان ئەچن – واتە لە پاکی‌یەکدا کە چوونە لای تیا نەبووبێ – وە عیددەکەیان ئامار بکەن تا کاتی گێڕانەوە بزانن ئەگەر ویستتان بیان گێڕنەوە، وە لەپەروەردگارتان بترسن، ئەو ژنانە دەرمەکەن لە خانووەکانیان، وە بۆ خۆشیان دروست نی‌یە دەربچن مەگەر تاوانێکی ئاشکرایان کردبێ[1].

وە لە فورەیعەی کچی مالیکی کوڕی سینانەوە - کە خوشکی ئەبی سەعیدی خودری‌یە – کە ئەو هاتووە بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ داوای لێکردووە کە بگەڕێتەوە بۆ ناو کەس‌وکاری لە بەنی خودرە، چونکە مێردەکەی شوێن بەندە هەڵاتووەکانی کەوتووە هەتا گەیشتۆتە قەدوم، (جێگەیەکە شەش میل لە مەدینەوە دوورە) ئەوانیش گرتوویانە و کوشتویانە، جا پرسیاری کرد لەپێغەمبەر کە ئایا بچمەوە نا کەس و کارم چونکە نە خانووی خۆی بۆجێ هێشتووم نە نەفەقە؟ ئەڵێ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بەڵێ. ئەڵێ منیش چووم بۆ ماڵی پێغەمبەر ﷺ یا بۆ مزگەوت، بانگی کردم یا فەرمانی کردو بانگ کرام بۆلای فەرمووی: چیت ووت؟ ئەڵێ: دووبارە باسەکەم بۆ گێڕایەوە دەربارەی مێردەکەم، فەرمووی لە ماڵەکەتدا بمێنەرەوە هەتا ئەو کاتە تەواو ئەبێت کە لە کتێبەکەی خوادا هاتووە، ئەڵێ: لە ماڵەکەمدا چوار مانگ و دە شەو عیددەم کێشا. ئەڵێ: کاتێ عوسمانی کوڕی عەففان بووە جێنشین ناردی بە شوێنمدا لەو بارەیەوە پرسیاری لێم کرد، منیش بۆم

(١) ئیبنو عەبباس وتویەتی: تاوانی ئاشکرا ئەوەیە کە قسەی ناشیرین بە کەس و کاری مێردەکەی بڵێ، جا کاتێ وای کرد دروستە لەماڵ دەربکرێ.

گێڕایەوە، ئەویش لە سەری ڕۆیشت و حوکمی پێ کرد، ئەبوداود و نەسائی و ئیبنو ماجە و (ترمذي) گێڕاویانەتەوە وە (ترمذي) ووتوویەتی: (حسن صحيح)[1]،

وە عومەر ژنە مێرد مردووەکانی لە بیاباندا ئەگێڕایەوەو نەی ئەهێشت حەج بکەن تا عیددەکەیان تەواو ئەبوو. وە ژنی کۆچەری لەوانە جیا ئەکرێتەوە کاتێ مێردی بمرێ و لەگەڵ خێڵەکەی کۆچ ئەکات، ئەگەر کۆچەری بوون،

وە عائیشە و ئیبنو عەبباس و جابیری کوڕی زەید و حەسەن و عەطاء پێچەوانەی ئەوەن، وە هەر ئەوەش لەعەلی و جابیرەوە ئەگێڕنەوە،

وە عایشە فەتوای ئەدا کەژنی مێرد مردوو لەعیددەکەیدا بچێتە دەر وە خۆی (أم كلثوم) ی خوشکی برد بۆ مککە بۆ عەمرە، کاتێ طەلحەی مێردی کوژرا،

وە عبدالرزاق ووتوویەتی : ئیبنوجەریر پێی ڕاگەیاندین و ووتی: عەطاء پێی ڕاگەیاندم لە ئیبنو عەبباسەوە کە فەرموویەتی: بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی چوار مانگ و دە ڕۆژ عیددە بکێشێ، وە نەی فەرمووە لە ماڵەوە عیددە بکێشێ، چونکە بۆی هەیە لە هەرکوێ بێت عیددە بکێشی. وە ئەبو داود لە ئیبنوعەبباسەوە دووبارە ئەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ئەو ئایەتە عیددەی ژنی لەناو کەس وکاریدا نەسخ کردۆتەوە، وە بێ دەنگ بووە لە وەسیەتەکەیدا و ئەگەر ئارەزو بکات ئەچێتە دەر بە پێی فەرموودەی خوای گەورە: ﴿فَإِنْ خَرَجْنَ فَلا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ فِي مَا فَعَلْنَ فِي أَنْفُسِهِنَّ﴾ (البقرة:٢٤٠) واتە: ئەگەر ژنەکان بە ئارەزووی خۆیان چوونە دەر، - ئێوەی وەرەسە - گوناهتان ناگات لەوەدا کە بۆ خۆیان ئەیکەن لەو شتانەی کە ڕەوان. عەطاء ووتوویەتی: لەپاشاندا ئایەتی میرات هاتە خوارەوەو سوکنا نەسخ بۆوە و ژن بۆی هەبوو لەهەر شوێنێك عیددە تەواو بکات[2].

### جیاوازی زانایان لە چوونە دەری ژن لەکاتی عیددەدا:

زانایان جیاوازی‌یان هەیە لە چوونە دەرەوەی ژن لە کاتی عیددەدا، حەنەفی‌یەکان بۆ ئەوە چوون کە دروست نی‌یە ژنی تەڵاق دراو بە تەڵاقی ڕەجعی و بائین بچێتە دەر لەماڵ نە شەو نە ڕۆژ.

---

(١) أحمد (٦/٤٢٠) وأبوداود (٢٣٠٠) والترمذي (١٢٠٤) والنسائي (٦/١٩٩) وابن ماجة (٢٠٣١).

(٢) أبو داود (٢٣٠١) والنسائي (٦/٢٠٠).

بەڵام مێرد مردوو بە ڕۆژ و هەندێ کاتی شەو بۆی هەیە بچێتە دەر، بەڵام ئەبێت شەو هەر لەماڵی خۆیدا بمێنێتەوە، ووتویانە: جیاوازی نێوانیان ئەوەیە، ژنی تەڵاق دراو نەفەقەی لەسەر ماڵی مێردەکەیەتی، بۆیە دروست نیە وەك ژن بچێتە دەر، بە پێچەوانەی مێرد مردووەکە چونکە ئەو نەفەقەی نیە، کەواتە ئەبێت هەر بچێتە دەر بە ڕۆژ بۆ چاکردنی حاڵی خۆی.

وە ووتوویانە: ئەبێ لەو ماڵەدا وەمێنی کە لەکاتی جیابوونەوەکەدا بەماڵ و ژووری ئەو دائەنرا، وە ووتوویانە : ئەگەر بەشەکەی لە خانووی مێردەکەی دا بەشی نەکرد، یا میرات گرەکان لە بەشی خۆیاندا دەریکەن، ئەبێت بڕوات، چونکە ئەوە عوزرو بەهانەیە، وە مانەوە لەو ماڵەدا خواپەرستیە، خواپەرستیش بە بەهانە لە کۆڵ ئەکەوی، وە لای ئەوان: ئەگەر نەیتوانی کرێی ئەو خانووە بدات لەبەر زۆری کرێی، بۆی هەیە بگوێزێتەوە بۆ خانوویەکی تر کە کرێکەی کەمتر بێت،

ئەم قسەیەشیان ئەوە ئەگەیەنێ کە کرێ خانوو لەسەر ژنە مێرد مێردووەکەیە، وەمانەوەی لە کۆڵ ئەکەوی بەهۆی نەتوانینی دانی کرێکەی، هەربۆیە دانیان بەوەدا ناوە کە ئەو ژنە لە بەشەکەی خۆی لە میراتیەکەی دابنیشێ ئەگەر بەشی بکات، ئەمەش لەبەر ئەوەیە لای ئەمان ژنی مێرد مردوو شوێنی دانیشتنی لەسەر ماڵی ئەو مردووە نیە، دوو گیان بێت یان نا، بەڵکو پێویستە لەسەری شەوو ڕۆژ لەو شوێنەدا بمێنێتەوە کە ژنەکەی تێدا بووە کاتێ پیاوەکە مردووە، مەگەر میرات گرەکان بۆی بگۆڕن، ئەگینا ئەو ژنە کرێی خانووەکەی لەسەر ئەبێت،

وە بە مەزهەبی حەنبەلیەکان دروستە ژن بە ڕۆژ بچێتە دەر، تەڵاق دراو بێت یان مێرد مردوو بێت. ئیبنو قودامە ووتوویەتی: ژنی عیددەکێش بۆی هەیە بچێتە دەر بە ڕۆژ بۆ پێویستیەکانی، ئیتر تەڵاق دراو بێت یا مێرد مردوو. جابیر ووتوویەتی: پورم سێ بەسێ تەڵاق درابوو ئەچوو دار خورماکانی ئەبڕی، کابرایەکی تووش بوو نەهی لێکرد، ئەویش بۆ پێغەمبەری ﷺ گێڕایەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (أخرجي فجذي نخلك لعلك أن تتصدقي منه أو تفعلي خيراً)[1] رواه النسائي و أبوداود واتە: بچۆ خورماکانت ببڕە بە ئومێدی ئەوەی شتێکی لێ بکەی بە خێر یا کارێکی خێر بکەیت.

وە موجاهید ئەگێڕێتەوە ووتوویەتی: چەند پیاوێك لە شەڕی ئوحوددا شەهیدکران، ژنەکانیان هاتنە لای پێغەمبەر ﷺ ووتیان: ئەی نێرراوی خوا ئێمە بەشەو ئەترسین، ئایا ئەبێت بەشەو لای یەکتر بمێنینەوە؟ کە ڕۆژ بۆوە بچینەوە ماڵەکانی خۆمان؟ ئەویش ﷺ فەرمووی: (تحدثن عند إحداكن حتى إذا أردتن النوم

(١) مسلم (١٤٨٣) وأبوداود (٢٢٩٧) والنسائي (٦/٢٠٩) وابن ماجة (٢٠٣٤).

فلتؤب كل واحدة إلى بيتها)[1] واته: بەشەو لە ماڵی یەکێکتاندا دانیشن قسە بکەن، کاتێ ویستتان بخەون هەرکەسە بچێتەوە ماڵی خۆی.

ئیتر لە ماڵی خۆیدا نەبێت نابێ بەشەو بێنێتەوە، بەشەویش نەچێتەدەر لەبەر پێویستیەکی زۆر نەبێت، چونکە شەو گومانی خراپەکردنی تێدایە، بە پێچەوانەی ڕۆژەوە کە پێویستی تێدا بەجێ دێت و هەوڵی ژیانی تێدا ئەدرێ و پێویستیەکانی تێ‌دا ئەکردرێ.

(حداد) ماتەمی گرتنی ژنی عیدده‌کێش:

پێویستە لەسەر ژن کەماتەمی بگرێ بۆ مێردە مردووەکەی کاتی عیدده‌کێشان، ئەوەش زانایان هەموو لەسەری ڕێك کەوتوون. بەڵام جیاوازیان هەیە لە ژنی تەڵاق دراودا بەتەڵاقی بائین. حەنەفیەکان وتوویانە: پێویستە ئەویش هەر ماتەمی بگرێ، بەڵام جگە لەوان بۆ ئەوە چوون کە ماتەمی لەسەر نیە، وە لە پێشەوە باسی ماتەم گرتنمان کرد لەبەرگی یەکەمدا.

نەفەقەی عیدده‌کێش :

زانایان هەموو لەسەر ئەوە ڕێك کەوتوون کە ژنی تەڵاق دراو بە تەڵاقی ڕەجعی شایستەی نەفەقە وشوێنی دانیشتنە. بەڵام جیاوازی یان هەیە لە ژنی تەڵاق دراو بە تەڵاقی (البتة). ئەبوو حەنیفە وتوویەتی: نەفەقە و جێگای بۆ هەیە وەك تەڵاق دراوی ڕەجعی، چونکە لەسەریەتی عیدده تەواو بکات لە ماڵی ژن و مێردیدا، چونکە بەندە لەبەر مافی ئەو پیاوە کە لەسەریەتی، ئیتر نەفەقەی بۆ پێویست ئەبێت، وە ئەو نەفەقەیە دائەندرێ بە قەرزێکی دروست لە کاتی تەڵاقەکەوە، وە ڕاناوەستێ لەسەر ڕازی بوونی و حوکمی قازی، وە ئەو قەرزە لە کۆڵ ناکەوی بەدانەوە یا گەردن ئازادکردن نەبێت.

ئەحمەد فەرمویەتی: ژنی تەڵاق دراو بە تەڵاقی (البتة). نە نەفەقەی بۆ هەیە نە سوکنا، بە پێی حەدیسەکەی فاطمەی کچی قەیس: کە مێردەکەی تەڵاقی (البتة)ی دابوو، پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: (ليس لك عليه نفقة) واتە: نەفەقەت لەسەری نیە.

وە مالیك و شافیعی وتوویانە: جێگای بۆ هەیە بەهەموو شێوەیەك و نەفەقەی بۆ نیە مەگەر دوگیان بێت، چونکە عائیشە و ئیبنوموسەییب ئینکاری حەدیسەکەی فاطمەی کچی قەیسیان ئەکرد، مالیك وتوویەتی: گوێم لە ئیبنوشەهاب بووە ئەیووت: ژنێك کە تەڵاق درابێ بە تەڵاقی (البتة) لە ماڵەکەی ناکرێتە دەر هەتا عیددەی بەسەر نەچێت، بەڵام نەفەقەی نابێت، مەگەر دووگیان بێت، جا ئەگەر دوو گیان بوو نەفەقەی ئەکێشری هەتا سکەکەی دائەنێت، لە پاشاندا وتوویەتی: وە ئەم فەرمانە ئێمەش لەسەری ئەڕۆین.

---

(١) الشافعي في الأم (٥/٢٥١) وعبدالرزاق في المصنف (١٢٠٧٧).

## بەخێوكردن و لەخۆ گرتن (الحضانة)

**ماناكەی:**

(حضانة) لە (حضن)ە وە وەرگیراوە، كە باوەشە.

وە زانایان پێناسەیان كردووە: بەوەی كە بریتییە لە هەڵسان بە پاراستنی كوڕ و كچی بچوك، یان نەفامێك كە چاكەو خراپە لەیەك جیانەكاتەوەو سەربەخۆ نەبێ لە كاروباریدا، وە لەخۆگرتنی بە چاك كردنیەتی و پاراستنیەتی لەو شتانەی كە زیانو ئازاری پێ ئەگەیەنن، وە پەروەردە كردنیەتی بە پەروەردە كردنی لاشەیی و دەرونی و ئاوەزی، هەتا بتوانێ هەڵبستێ بە كارەكانی ژیانی و ئاگای لەو شتانە بێت كە لێپرسراوە بەرامبەریان.

وە بەخێوكردنی منداڵی كوڕ یا كچ پێویستە چونكە گوێ نەدان پێی منداڵەكە تووشی لەناو چوون و ون بوون ئەكات.

**بەخێوكردن مافێكی هاوبەشە:**

بەخێوكردن مافێكە بۆ منداڵ چونكە پێویستی بەكەسێك هەیە سەرپەرشتی بكات‌و بیپارێزێ و هەڵسێ بەكارەكانی‌و سەرپەرشتی پەروەردەكردنی بكات. وە مافی دایكەكەشییەتی كە بەخێوی بكات و سەرپەرشتی بكات، بە پێی فەرمودەكەی پێغەمبەر ﷺ كە فەرمویەتی: (أنت أحق بـه)[1] واتە: تۆ شایستە تری بیگرێتە لای خۆت.

وە مادام بەخێوكردن ماف بێت بۆ منداڵ ئەوە زۆر لەدایك ئەكرێت كە بەجێی بهێنێ، ئەگەر وادانرا كە ئەو منداڵە پێویستی بەو دایكە هەیەو لەو زیاتر كەسی تر نییە بەخێوی بكات، بۆ ئەوەی مافی ئەو منداڵە نەفەوتێ لە پەروەردەكردن‌و سەرپەرشتی كردندا، بەڵام ئەگەر وادانرا بەوەی منداڵەكە كەسێكی تری هەبوو جگە لە دایكی وەك نەنكی وە ڕازیش بوو بیگرێتە خۆی، وە دایكەكە ڕازی نەبوو بیگرێتە خۆی، ئەو كاتە مافی دایكەكە ئەفەوتێ لە بەخێوكردندا بەوە كە خۆی فەوتاندویەتی، چونكە بەخێو كردن مافی خۆیەتی.

**دایك لە پێش ترە بۆ منداڵ لە باوكی:**

بەرزترین شێوە لە شێوەكانی پەروەردە ئەوەیە كە منداڵ لە باوەشی دایك‌و باوكیدا پەروەردە بكرێ، چونكە بە سەرپەرشتی هەردووكیان و چاودێری كردنی جوانیان لاشەی پێك دێت و ئاوەزی گەشە ئەكات و دەرونی پاك ئەبێت و ئامادە ئەبێت بۆ ژیان.

---

(١) أحمد (٢/١٨٢)، وأبوداود (٢٢٧٦) والبيهقي (٨/٥) والحاكم (٢/٢٠٧).

جا ئەگەر شتێکی وا ڕوی دا دایكو باوك لەیەك جیا بوونەوەو منداڵ لە نێوانیاندا بوو، دایکی لە پێش ترە لەباوکی کە بیگرێتە لای خۆی، بە مەرجێ ڕێگرێك لەدایکەکەیا نەبێت کە نەیەڵێ لەپێشتر بێت، یامنداڵەکە بەشێوەیەك بێت خۆی دایك و باوك هەڵبژێرێ.

وە هۆی لە پێش تر بوونی دایك ئەوەیە کە دایك توانای سەرپەشتی و بەخێوکردن و شیر پێدانی هەیە، چونکە ئەو زاناترە لە پەروەردە کردنداو بەتواناترە، وە ئەو خۆڕاگریو ئارامی‌یەی کە لەو لایەنەوە هەیەتی پیاو نیەتی، وە ئەو کاتەی ئەو هەیەتی پیاو نیەتی، هەر بۆیە دایك بە لەپێشتر دانراوە لەبەر چاودێری کردنی بەرژەوەندی منداڵەکە. لە عەبدوڵلای کوڕی عەمرەوە هاتووە کە ژنێك ووتی: ئەی نێرراوی خوا ئەم کوڕەم سکم جێگەو دەفر بوو بۆی، باوەشم چادر بوو بۆی، وە مەمکەکانم ئاوەدر بوو بۆی، کەچی باوکی ئەڵێت لێت ئەسێنمەوە، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: (أنتِ أحق به مالم تنكحي) تۆ شایستەتری پێی بەمەرجێ شوو نەکەیتەوە. ئەحمەدو ئەبوداودو بەیهەقیو حاکم ڕیوایەتیان کردووە و حاکم بە صەحیحی گێڕاوە[1].

وە لە یەحیایی کوڕی سەعیدەوە کە ووتوویەتی: گوێم لە قاسمی کوڕی محمد بووە ئەیوت: ئافرەتێکی ئەنصاری خێزانی عومەری کوڕی خەططاب بوو، کە عاصمی کوڕی عومەری لێ بوو لەپاشاندا عومەر لێی جیا بوەوە، دوای ئەوە عومەر هات بۆ (قباء) بینی عاصمی کوڕی یاری ئەکرد لەدەوری مزگەوت، عومەر قۆڵی گرتوو سواری وولاغەکەی کردو لەنێوان دوو دەستەی خۆیدا داینا، نەنکی کوڕەکە تووشی بوو دەمەقاڵێی لەگەڵدا کرد لەسەری، هەتا چونەلای ئەبو بەکری صدیق، عومەر ئەی ووت: کوڕی خۆمە و ژنەکە ئەی ووت: کوڕی خۆمە، ئەبوبەکر بە عومەری ووت: کوڕەکە بەرەڵلا بکە بۆی، ئیتر عومەر هیچی نەووت و منداڵەکەی دایەوە، مالیك ڕیوایەتی کردووە لە (موطأ) دا.

ابن عبد البر ووتوویەتی: ئەم حەدیسە بەناوبانگە لە چەند ڕویەکی (متصل و منقطع)ەوە، بەڵام زانایان وەریان گرتووە.

وە لەهەندێ لە ڕیوایاتدا ئەبو بەکر پێی وت: دایك بەسۆزترو میهرەبانترو بە بەزەیی ترو چاکترە، کەواتە ئەو لەپێشترە بۆ منداڵەکەی ئەگەر شوی نەکردبێتەوە، وە ئەوەی ئەبو بەکر ووتویەتی کە ئافرەت میهرەبانتر و بەسۆزترە، ئەوە بۆتە هۆ بۆ لەپێش بوونی دایك بەمنداڵە بچووکەکەی.

---

(١) بڕوانە تەخریجی حەدیسەکەی پێشوو.

**رێك خستنی خاوەن مافەكان لە بەخێوكردندا:**

جا لەكاتێكدا بەخێوكردن لەسەرەتاوە بۆ دایك بێت، زانایان سەرنجی ئەوەیان داوە كە خزمایەتی دایك لە پێش خزمایەتی باوكەوەیە، وە ڕێك خستنی خاوەن مافەكان لە بەخێوكردندا بەم شێوەیە ئەبێت:

دایك: جا ئەگەر هۆیەك ڕێی گرت، ئەدرێ بە دایكی دایك، هەرچەند بەرەو ژوور بێت. لەپاشاندا ئەگەر ڕێگرێك هەبوو بەخێو كردنەكە ئەچێت بۆ دایكی باوك، پاشان بۆ خوشكی باوك و دایكی. پاشان بۆ خوشكی دایكی، پاشان بۆ خوشكی باوكی، پاشان بۆ كچی خوشكی دایك و باوكی، ئینجا كچی خوشكی دایكی. لەپاشاندا خوشكی دایك لە دایك و باوكی‌یەوە، ئینجا خوشكی دایك لە دایكی‌یەوە، ئینجا خوشكی دایك لە باوكی‌یەوە، ئینجا كچی خوشكی باوكی. لەپاشاندا كچی برای دایك وباوكی، ئینجا كچی برای باوكی، لەپاشان خوشكی باوك لە دایك و باوكەوە، لەپاشان لە دایكی‌یەوە، لەپاشان لە باوكی‌یەوە. لەپاشان خوشكی دایكی دایك، پاشان خوشكی دایكی باوك، پاشان خوشكی باوكی دایك، پاشان خوشكی باوكی باوك، بەشێوەیەك دایكی و باوكی‌یەكە لە هەمویانا پێش بخرێت.

جا ئەگەر بۆ مندالە بچووكەكە خزمێك نەبوو لەو مەحرەمانەی، یا هەبوو بەڵام شیاوی ئەوە نەبوو كەس بەخێو بكات، ئەوە بەخێو كردنی ئەدرێ بە خزمە پشتی‌یە مەحرەمەكانی تر، لە پیاوان بەپێی ڕێك خستنیان لە میراتدا.

ئەدرێ بە باوك، لەپاش ئەو باوكی باوكی هەرچەند بەرەو ژوور بێ، لەپاشاندا بۆ برای باوك و دایكی، پاشان برای باوكی، پاشان كوڕی برای باوك و دایكی، پاشان كوڕی برای باوكی، پاشان مامی باوك و دایكی، ئینجا مامی باوكی، ئینجا مامی باوك و دایكی باوك، پاشان مامی باوكی باوك.

جا ئەگەر لە خزمانی پشتی كەس نەبوو لە پیاوان كە بەخێو كردنەكەی بدرێتە دەست، ئەوە مافی بەخێو كردنەكەی ئەچێت بۆ مەحرەمەكانی لەو پیاوانەی كە خزمی پشتی نین.

جا لەپێشەوە ئەدرێ بە باپیر لە دایكەوە، پاشان بە برای دایك، پاشان بە كوڕی برای دایك، پاشان بۆ مامی دایك، لە پاشاندا بۆ خاڵی دایك لە دایك و باوكی‌یەوە، لەپاشاندا بۆ خاڵی لە باوكی‌یەوە، ئینجا بۆ خاڵی لە دایكی‌یەوە، ئینجا ئەگەر ئەو منالە خزم و كەسی نەبوو قازی كەسێك دا ئەنێت كە سەرپەرشتی بكات.

وە ئەو ڕێك خستنەش بۆیە بەو شێوە دانراوە چونكە سەرپەرشتی كردنی منداڵ شتێكە هەر ئەبێ بكرێت، وە نزیكترین كەسیش بە بەخێو كردنی خزمەكانی‌یەتی، وە هەندێك لە خزمان لە هەندێكی تریان نزیكترن.

جا سەرپەرشتیارەكان پێش ئەخرێن چونكە ئەوان لە پێشەوەن بۆ بینینی بەرژەوەندی منداڵەكە، جا ئەگەر ئەوان نەبوون، یان هەبوون بەڵام ڕێگریان هەبوو، ئەوە ئەدرێ بە خزمەكانی بە پێی دووری و نزیكی‌یان، جا ئەگەر خزم و كەسی نەبوو حاكم لێپرسراوە بۆ دانانی كەسێك كە شیاوبێ بۆ بەخێو كردنی.

مەرجەكانی بەخێوكردن:

بە مەرج گیراوە لە (حاضنة) بەخێوكەرا كە سەرپەرشتی پەروەردەكردنی منداڵەكە ئەكات و هەڵئەستێ بە كارەكانی، كە تواناو شایستەیی هەڵسانی هەبێت بەو كارە گرنگە، وە تواناو شایستەییش كاتێ بەدی دێت كە ئەو كەسە چەند مەرجی دیاری كراوی تێدا هەبێت، ئەگەر یەك مەرجیش لەوانەی تێدا نەبوو ئەوە بەخێو كردنەكەی ئەكەوێ، ئەو مەرجانەش ئەمانەن:-

١- ژیری: شێت و كەم ئاوەز بەخێوكردنیان پێ ناسپێررێ، چونكە ئەو دووانە ناتوانن كاری خۆیان بەرن بەڕێوە، جا كاری كەسێكی تریان پێ ناسپێررێ، چونكە كە سێك شتێكی نەبوو لێی نابەخشی.

٢- پێ گەیشتوویی: چونكە منداڵ ئەگەر چاكە و خراپەش لەیەك جیا بكاتەوە هەر پێویستی بە كەسێكی تر هەیە كاری بەڕێوە بەرێت، و بەخێوی بكات، ئیتر كاری كەسێكی تری بۆ نابرێ بەڕێوە.

٣- توانای پەروەردەكردن: كوێر، یا چاوكز، یا ئافرەتێكی نەخۆش كە نەخۆشی گیرەوەی ببێت و زیاد بكات، یا نەخۆشێك كە نەخۆشیەكەی پەككەوتبێ، بە خێوكردنیان پێ ناسپێرێ، وە هەروەها ئافرەتێكی بەتەمەن كە خۆی پێویستی بەكەسانی تر هەبێت سەرپەرشتی بكەن،

وە هەروەها ژنێك گوێ نەدەربوو بەكار و باری ماڵ و زۆر ماڵی بەجێ ئەهێشت، بە شێوەیەك مەترسی هەبوولەو گوێ پێ نەدانە و زۆر بەجێ هێشتنەدا كە زیان بەمنداڵەكە بگات. وە هەروەها ژنێك لەگەڵ كەسێكدا دانیشتبێ كە ئەو كەسە نەخۆشی گیرەوەی پێوە بێت، یا لەگەڵ كەسێكدا بێت كە ڕقی لە منداڵ بێت، با خزمیش بێت، چونكە بەو شێوەیە چاودێری تەواوو باروو دۆخی گونجاوی بۆ دابین نابێت.

٤- دەست پاكی و ڕەوشت جوانی: چونكە ئافرەتی خراپكار دڵنیایی لێ ناكرێ لەسەر منداڵێ بچووك، وە باوەڕی پێ ناكرێ كە بەرێك و پێكی ئەركی سەرشانی بەجێ بهێنێ، چونكە لەوانەیە

ئەو منداڵە لەسەر شێوەی ئەو پەروەردە ببێت و خووڕەوشتی ئەو ژنە وەربگرێ، ئیبنوقەییم لەم مەرجە کۆڵاوەتەوە و ووتوویەتی: (لەگەڵ ئەوەدا کە ڕاستی ئەوەیە عەدالەت بوون مەرج نیە لە بەخێوکەردا هەرچەندە هاوەڵەکانی ئەحمەد و شافیعی و جگەلەوان بەمەرجیان داناوە، ڕەحمەتی خوایان لێ بێت،

وە بەمەرج دانانی عەدالەت زۆر دوورە، چونکە ئەگەر عەدالەت بکرێتە مەرجی بەخێوکەر، منداڵی جیهان لەناو ئەچێت، وە ئەبێتە بارێکی گران بەسەر نەتەوەوە، چونکە هەر لەو کاتەوە ئیسلام هاتووە، هەتا ڕۆژی دوایی بەسەردا دێت، منداڵی فاسقەکان لەناویاندا پەروەردە دەبن، کەسیش ڕێیان لێ ناگرێ لەدنیادا لەگەڵ ئەوەشدا ئەوان بەشی زۆرن، کەی ڕووی داوە لە ئیسلامدا منداڵ لەدایك و باوك یا لەیەکێکیان سەندارییێتەوە لەبەر فاسقی یان، ئەو بەمەرج گرتنی عەدالەتە لە بەخێوکەردا لەبەر گرانی و کارکردن لە وولاتان و سەردەمەکاندا بە پێچەوانەیەوە، وەکو دانانی مەرجی عەدالەت وایە لە سەرپەرشتیاری نیکاحدا، چونکە بە بەردەوامی ڕوو ئەدات لە وولاتان و سەردەم و دێهات و بیابانەکاندا، لەگەڵ ئەوەشدا کە بەشی زۆری ئەوانەی سەرپەرشتی ئەو نیکاحە ئەکەن فاسقن، وە فاسقی هەر هەبووە لەنێوان خەڵکدا. وە نە پێغەمبەرو ﷺ نە کەسێك لە یارەکانی فاسقێکیان قەدەغە نەکردووە لە پەروەردە کردنی منداڵەکەی، یا لە بەشودانی ئەو ئافرەتەی کە سەرپەرشتی ئەکات.

وە داب و نەریت شایەتە کە ئەگەر پیاو لەفاسقەکانیش بێت هەر ئاگای لەکچەکەی ئەبێت و بەرەڵای ناکات وبە پەرۆش ئەبێت لەسەرخێر بۆی و لەپێناوی‌دا خۆی ماندوو ئەکات، وە ئەگەر پێچەوانەی ئەمەش هەبێت ئەوە کەمە بەگوێرەی ئەوەوە کە خەڵك لە سەری ڕاهاتووە،

وە یاسادانەریش لەوەدا بە هۆکاری سروشتی ڕازی ئەبێت.

چونکە ئەگەر فاسق بەخێوکردنی پێ نەسپێررێ، وە هەروەها سەرپەرشتی نیکاحی پێ نەدرێ، ئەوە ڕوون کردنەوەی ئەمە بۆ نەتەوەی ئیسلام لە گرنگترینی شتەکان بوو، وە خەریك بوونیان بە نەقڵ کردنی و پشتاو پشت کار پێ کردنی پێش ئەخرا لەسەر زۆر لەو شتانەی کە نەقڵیان کردوەو کاریان پێ کردووە.

ئیتر چۆن دروستە ئەو مافە گرنگە وون بێت و بەپێچەوانەیەوە کار بکرێ، وە ئەگەر فاسق بوون دژی بەخێوکردن بووایە ئەوە زیناکەر و عارەق خۆر و ئەوانەی گوناهی گەورە ئەکەن منداڵە بچووکەکانیان لێجیا ئەکرایەوە و ئەیان دان بە کەسانیتر (ئیتر خواش خۆی ئەزانێ).

٥- ئیسلامەتی: بەخێوکردنی منداڵی موسڵمان ناچەسپێ بۆ دایەنی بێ باوەڕ، چونکە بەخێوکردن، سەرپەرشتی کردنە، وە خوا دای نەناوە کە کافر ببێتە سەرپەرشتیکەری موسڵمان: ﴿وَلَنْ يَجْعَلَ اللَّهُ لِلْكَافِرِينَ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ سَبِيلاً﴾ (النساء:١٤١).

واتە: خوا ڕێگایەك دانانێ کە کافرەکان دەسەڵاتیان بەسەر بەندە چاکەکانی ئەودا هەبێت. بەخێوکردنیش وەك ویلایەتی نیکاح و سامانە، وە لەبەر ئەوەی ترسی ئەوە ئەبێت کە ئەو دایەنە بێ باوەڕە ئەو منداڵە لەسەر ئاینەکەی خۆی پێ بگەیەنێت ولەسەر ئەو ئاینە گەورەی بکات، کە لەدووایی‌دا گران ئەبێت بۆی وازی لێ بهێنێ، کە ئەوەش گەورەترین زیانە ئەگات بە منداڵ، لە فەرموودەدا هاتووە:- (كل مولود يولد على الفطرة إلا أن أبويه يهوِّدانه أو ينصرانه أو يمجسانه)[1] واتە: هەموو منداڵێك لەسەر سروشت و باوەڕداری لە دایك ئەبێت، بەڵام دایك و باوکی یان ئەی کەنە جولەکە یا گاور یا مەجوسی).

وە حەنەفی‌یەکان و ئیبنو قاسم لە مالیکی‌یەکان و ئەبو ئەور بۆ ئەوە چوون کە بەخێو کردن بۆ ئافرەتی دایەن ئەچەسپێ هەرچەندە ئەو دایەنە کافریش بێت و منداڵەکەش مسوڵمان، چونکە بەخێوکردنەکە لە شیر پێدان و خزمەت کردنی منداڵەکە تێ ناپەڕێ، وە هەردووکیان لە ئافرەتی کافرەوە دروستن،

ئەبو داود و نەسائی گێڕاویانەتەوە: کە ڕافعی کوڕی سینان موسڵمان بوو، بەڵام ژنەکەی موسڵمان نەبوو، هاتە لای پێغەمبەر ﷺ ووتی: کچەکەم – کە لەشیر بڕابووەوە- ڕافیعیش ئەیوت: کچەکەم، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: خوایە هیدایەتی بدە، منداڵەکە خۆی کێشا بەلای باوکی‌یەوە، ئەویش باوەشی کردو بردی . . .[2]

هەرچەندە حەنەفی‌یەکان ڕایان وایە کە دروستە بەخێوکردن لەلایەن ئافرەتی بێ‌باوەڕیشەوە، بەڵام بەمەرجیان داناوە کەنابێت (مرتدة) بێت واتە لەئیسلام هەڵگەڕابێتەوە، چونکە لە ئیسلام هەڵگەڕاوە لای ئەوان ئەبێ بەند بکرێ هەتا پەشیمان ئەبێتەوە و ئەگەڕێتەوە سەر ئیسلام یالە بەندیدا ئەمرێ، ئیتر ماوەی نابێت منداڵ بەخێو بکات، جا ئەگەر پەشیمان بووەوە و گەڕایەوە بۆ سەر ئیسلام مافی بەخێوکردنی بۆ ئەگەڕێتەوە.

---

(١) أحمد (٢/٢٣٣) والبخاري (١٣٨٥) وأبوداود (٤٧١٤و٤٧١٦).

(٢) بەڵام زانایان ئەم فەرموودەیان بە لاواز داناوە، وە ئیبن مندر ووتوویەتی: لەوانەیە پێغەمبەر ﷺ بەهۆی دوعاکەیەوە زانیبێتی کە کچەکە باوکی هەڵئەبژێرێت، ئەمەش تایبەتە بەوەوە.

٦- ئـەبێ ئـەو ئافرەتـە شـووی نەكردبێتـەوە: چـونكە ئەگـەر ئـەو دايكـە شـووی كـردەوە مـافی بەخێوكردنی نامێنێ بەپێی ئەوەی عەبدوڵڵای كوڕی عومەر ئەگێڕێتـەوە: (كـە ژنێـك ووتـی: ئـەی نێراوی خوا ئەم كوڕەم سكم جێگەو دەفری بوو، وە باوەشم چـادری بـوو، وە مـەمكم ئـاودەری بـوو، كەچی بـاوكی ئـەڵێت لێت ئەسێنمەوە، پێغەمبەر ﷺ فـەرمووی: (تـۆ شايستەتری پـێی مـادام مێردت نەكردبێتەوە) ئەحمەد و ئەبوداود بەيهەقی و حاكم كە بە صەحيحی داناوە گێڕاويانەتەوە[1].

ئەم حوكمە بە نيسبەت ئەو ئافرەتانەيـە كـە شـووبكەن بـە بێگانـە بـەڵام ئەگـەر شـووی كـردەوە بەخزمی مەحرەم بۆ منداڵەكە، وەك مامی، ئەوە بەخێوكردنی هەر ئەمێنێ و ناكەوێ، چونكە مـام خاوەنی مافە لە بەخێوكردندا، وە ئەوەندە خزمايەتیو پەيوەندی هەيە بە منداڵەكەوە كە پاڵی پێـوە بنێ، ئەو منداڵەی خۆشبوێت، و ئاگای لە مافەكانی بێت، بەوشێوە هاريكاری لـە نێوانيانـدا پـەيا ئەبێت بۆ بەخێو كردنی.

بەڵام بە پێچەوانەی بێگانەوە، كە ئەگەر ژنەكە شووی پێ بكات ئەو پيـاوە ميهرەبـانی و سـۆزی بەسەر ئەو منداڵەدا نابێت، وە ناشهێڵێت كە دايكەكە خەريك بێت بە كاروباری ئەو منداڵەوە، ئيتر ئەو منداڵە جەووی ميهرەبـان و هەناسـەدانی سروشتی و بـارودۆخێكی وەهـای دەسـت ناكـەوێ تـا تواناو بەهرەكانی تێيدا گەشە بكات.

وە حەسەن و ئيبنوحەزم ڕايـان وايـە كـە بـەخێوكردنی لـێ ناسـەندرێتەوە بـە شـووكردنەوە هـەر شێوەيەك بێت.

٧- ئازادی: چونكە بەندەو كۆيلە مەشغوڵە بـە كاروبـاری گەورەكەيـەوە و مـەجالی بـەخێوكردنی منداڵی نیيە. ئيبنوقەييم فەرمويەتی: ئازادی بەمەرج دانان بەڵگەی وای لەسەر نیيە كـە دڵ پێـی ئارام بێت، وە هاوەڵانی هەرسێ پێشواكە بەمەرجيان داناوە. وە ماليك ڕەحمەتی خوای لەسـەر بێـت دەربارەی ئازادێك كـە منـداڵی هـەبێت لـە ژنـی كـەنيزەك ئـەڵێت: (ئـەو دايكـە لـە پێـشترە بـۆ بەخێوكردنی بەڵام ئەگەر فرۆشراو گوێزرايەوە باوكی لەپێشترە بۆی) ئەوەش ڕاستە.

كرێی بەخێوكردن:

كرێی بەخێوكردن وەك كرێی شير پێدانی وايە، دايك مافی وەرگرتنی نیيە هەتا ژنی مێـردار بێت، ياله عيددەدا بێت، چونكە يا نەفەقەی ژن ومێردايەتی هەيە، يانەفەقەی عيددە، ئەگـەر ژنـی

(١) أحمد (٢/١٨٢) وأبوداود (٢٢٧٦) والبيهقي (٨/٥) والحاكم (٢/٢٠٧).

مێرددار بێت یالەعیددەدا بێت، خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَالْوَالِدَاتُ يُرْضِعْنَ أَوْلاَدَهُنَّ حَوْلَيْنِ كَامِلَيْنِ لِمَنْ أَرَادَ أَنْ يُتِمَّ الرَّضَاعَةَ وَعَلَى الْمَوْلُودِ لَهُ رِزْقُهُنَّ وَكِسْوَتُهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ﴾ (البقرة:٢٣٣).

واتە: دایکەکان شیر ئەدەن بەمنداڵەکانیان دوو ساڵی تەواو، بۆ ئەو کەسانەی ئەیانەوێ شیری تەواو بدەن بە منداڵەکانیان، وە لەسەر باوکی منداڵەکەیە ڕۆزی و پۆشاکی دایکی ئەو منداڵە بدات بەباشی.

بەڵام دوای کۆتایی هاتنی عیددەکە مافی وەرگرتنی کرێی بەخێوکردنی هەیە وەك چۆن مافی وەرگرتنی کرێی شیردانی ئەبێت، بە پێی فەرمودەی خوای گەورە کە ئەفەرموێ: ﴿فَأَنْفِقُوا عَلَيْهِنَّ حَتَّى يَضَعْنَ حَمْلَهُنَّ فَإِنْ أَرْضَعْنَ لَكُمْ فَآتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ وَأْتَمِرُوا بَيْنَكُمْ بِمَعْرُوفٍ وَإِنْ تَعَاسَرْتُمْ فَسَتُرْضِعُ لَهُ أُخْرَى﴾ (الطلاق:٦)، واتە: نەفەقەی ژنە تەڵاق دراوەکانتان بکێشن لە عیددەکەیانا ئەگەر دوگیان بوون هەتا سکەکەیان دائەنێن. جا ئەگەر بەکرێ شیریان دا بەمنداڵەکە بۆتان، ئێوەش کرێیان بدەنێ، وە با هەموولایەك پێکەوە ڕاوێژ بکەن بە چاکە، وە ئەگەر ڕێك نەکەوتن لەسەر شیر پێدانی دایکەکە با ژنێکی تر شیری پێ بدات.

وە جگە لە دایکیشی هەرمافی وەرگرتنی کرێی بەخێوکردنی هەیە، لەو کاتەوە کە بەخێوی ئەکات، وەك ئەو ژنەی بەکرێ ئەگیرێ بۆ شیردان بە منداڵی شیرەخۆر، وە وەك چۆن کرێی بەخێوکردن و شیردان لەسەر باوکە، کرێی خانوو ئامادەکردنیشی هەر لەسەرە، ئەگەر ئەو ژنە خانویەکی خۆی نەبوو کە منداڵەکەی تێدا بەخێو بکات.

هەروەها کرێی خزمەتکاریشی لەسەرە، یان پەیدا کردنی، ئەگەر دایکەکە پێویستی پێی بوو و باوکەکە بەدەسەڵات بوو. وە ئەوە بە پێچەوانەی نەفەقەی تایبەتی منداڵە لە خواردن و پۆشاك و شوێنی نوستن و چارەسەرکردن و ئەو جۆرە شتانەی کەلە پێویستییە سەرەکییەکانن، و بێ نیازیان لێ ناکرێ، وە ئەوکرێیە پێویست ئەبێ لەوکاتەوە بەخێو کەرەکە دەست ئەکات بە بەخێوکردنی، وە نەبێتە قەرز لە گەردنی باوکداو لاناچێ بەدانەوە نەبێت یا بەگەردن ئازادی.

بەخێو کردنی بە خۆڕایی:

ئەگەر کەسێك لە خزمانی منداڵەکە شیاوی بەخێوکردنی منداڵ بوو، داوای کرد کە بەخۆڕایی ئەو منداڵە بەخێو بکات بەڵام دایکی قایل نەبوو ووتی من هەر بەکرێ بە خێوی ئەکەم.

ئەوە ئەگەر باوکەکە بەدەسەڵات بوو زۆری لێ ئەکرێ کە کرێ بدات بەدایکەکەو منداڵەکە نادات بەو کەسەی بەخۆڕایی بەخێوی ئەکات، بەڵکو هەر لای دایکی ئەمێنێتەوە، چونکە بەخێوکردنو باوەشی دایکی چاکترە، لە کاتێکدا باوکیشی توانای کرێ دانی هەیە.

بەڵام حوکمەکەی جیاوازە لە حاڵەتێکدا باوکەکە کەم دەست بێت، چونکە منداڵەکە ئەدرێت بەو کەسەی بە خۆڕایی بە خێوی ئەکات لەبەرکەم دەستی و نەتوانینی بۆ جێ بەجێ کردنی کرێکە لەگەڵ بوونی کەسێك کە بێ کرێ بەخێوی بکات‌و شیاوی بەخێوکردنیشی بێت لە خزمانی منداڵەکە.

ئەوە ئەگەر نەفەقە پێویست بێت لەسەر باوك. بەڵام ئەگەر منداڵەکە ماڵێکی خۆی هەبوو کە لەو ماڵە نەفەقەی ئەکێشرا ئەوە منداڵەکە ئەدرێ بەوکەسەی کە بە خۆڕایی بەخێوی ئەکات لەبەر پاراستنی سامانەکەی لەلایەکەوە، وە لەبەر بوونی کەسێك لە خزمانی کە بەخێوی ئەکات لەلایەکی ترەوە.

بەڵام ئەگەر باوکەکە دەستکورت بوو وە منداڵەکەش سامانێکی نەبوو، دایکەکەش قایل نەبوو بیگرێتەوە لای خۆی بەکرێ نەبێت، وە لە مەحرەمەکانی خزمێکی وای نەبوو بێ کرێ بەخێوی بکات، ئەوکاتە زۆر لەدایکەکە ئەکرێ کە بەخێوی بکات، وە کرێکەی قەرز ئەبێت لە گەردنی باوکەکەدا لاناچێت هەتا نەیداتەوە یا گەردنی ئازاد نەکرێ.

## کۆتایی هاتنی ماوەی بەخێوکردن:

ماوەی بەخێوکردن کۆتایی دێت بەوەی کەمنداڵەکە کوڕ بێت یان کچ پێویستی بە ئافرەت نەمێنی خزمەتی بکات، وە بگاتە تەمەنی (تمییز) شت جیاکردنەوەو سەربەخۆیی، وە هەریەك لە کوڕو کچەکە توانای بێ کە هەڵبستێ بە پێویستی‌یە سەرەکی‌یەکان، بەم جۆرە کە خۆی نان بخوات و جل و بەرگی خۆی لەبەر بکات، و خۆی پاك بکاتەوە بەتەنها. وە ئەمەش ماوەیەکی دیاری کراوی نی‌یە کە بەکۆتایی بەخێوکردنی کۆتایی بێت.

بەڵکو بەوە دائەنرێ کە باش‌و خراپ جیابکاتەوەو پێویستی بەکەس نەبێت، جا کاتێ منداڵەکە باش و خراپی لەیەك جیا کردەوەو پێویستی بەخزمەتی ئافرەت نەما، وە خۆی بە تەنیا پێویستی‌یە سەرتایی‌یەکانی خۆی بەجێ هێنا، ئەوە بەخێوکردنەکەی کۆتایی دێت. وە ئەوەی حوکمی پێ دراوە لەمەزهەبی حەنەفی و ئەوانی‌تردا ئەوەیە کە: ماوەی بەخێوکردن کاتێ کۆتایی دێت کە منداڵەکە حەوت ساڵی تەمەنی تەواو کردبێ ئەگەر کوڕ بێت، وە ئەگەر منداڵەکە کچ بوو بەتەواو کردنی نۆ ساڵ کۆتایی دێت، وە بۆیە ئەو زیادەیەشیان بۆ کچ داناوە تاوەکو بتوانێ لەوماوەیەدا خوڕەوشتی ئافرەتان وەربگرێ لە بەخێو کەرەکەیەوە.

**هەڵبژاردن ئەدرێتە دەستی منداڵی کوڕو کچ دوای کۆتایی هاتنی ماوەی بەخێوکردن:**

ئەگەر منداڵ بەتەمەن گەیشتە حەوت ساڵ، یا گەیشتە تەمەنێ تەمیزو بەخێوکردنی کۆتایی هات، ئەوە ئەگەر باوك رێك کەوت لەگەڵ ئافرەتە بەخێوکەرەکەدا کەلای یەکێکیان بمێنێتەوە ئەو رێك کەوتنە بەجێ دێت.

بەڵام ئەگەر ناکۆك بوون و کێشە کەوتە نێوانیان، ئەوە منداڵەکە ئارەزوی ئەدرێتە دەست خۆی[1] کامیان هەڵنەبژێری لای ئەوەیان دەمێنێتەوە، جا هەرکامیانی هەڵبژارد ئەوەیان لە پێشترە بۆی، بە پێی ئەوەی ئەبو هورەیرە ئەگێڕێتەوە خوا لێی رازی بێت کە ووتوویەتی: ژنێك هاتە لای پێغەمبەر ﷺ ووتی ئەی نێراوی خوا پیاوەکەم ئەیەوێ کوڕەکەم ببات بۆ خۆی کە لە بیری ئەبی عەنبە[2] ئاوی بۆ هێناوم، وە بەڕاستی سوودی پێ گەیاندم، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی بەمناڵەکە: (ئەوە باوکتە و ئەوە دایکتە حەزدەکەیت لای کامیان بیت دەستی بگرە). ئەویش دەستی دایکی گرت. وە دایکیشی لەگەڵ خۆیدا بردی. ئەبو داود گێڕاویەتیەوە[3].

وە عومەر و عەلی و شورەیح بەو پێیە حوکمیان کردووە، وە ئەوەش مەزهەبی شافیعی و حەنبەلیەکانە، بەڵام ئەگەر منداڵەکە هەر دوکیانی ویست یا کەسیانی هەڵنەبژارد، ئەوە پشکیان بۆ ئەخری (قرعە) و یەکێکیان پێش ئەخرێ.

ئەبو حەنیفە ووتویەتی: باوك شایستە ترە بۆی . . وە سەرپشك کردن دروست نیە، چونکە ئەو منداڵە خاوەنی قسەی خۆی نیە و باش و خراپی خۆی نازانێ، لەبەر ئەوە لەوانەیە ئەوەیان هەڵبژێرێ کە یاری لەگەڵدا ئەکات و واز لەپەروەردەکردنی ئەهێنێ، وە رێ پێ ئەدات ئارەزووەکانی خۆی بەجێ بهێنێ کە ئەوەش ئەبێتە هۆی تێکدانی منداڵەکە، وە لەبەر ئەوەی هێشتا نەگەیشتوەتە تەمەنی بالغی تاوەکو هەڵبژاردنی پێ بدرێت. وەك ئەوەی لە حەوت ساڵ

---

(١) بە مەرج گیراوە لە هەڵبژاردن دانە دەستی منداڵ:

أ- خاوەن کێشەکان لەسەری شیاوبن بۆ بەخێو کردن.

ب- منداڵەکە کەم عەقڵ نەبێت. چونکە ئەگەر کەم عەقڵ بوو دایکەکە لەپێشترە بە دەستەبەر کردنی با دوای پێگەیشتنیشی بێت، چونکە ئەو لەو حاڵەتەدا وەك منداڵ وایە وە دایك لە هەمو کەس بە بەزەیی ترە بۆی، وە زیاتر بەرژەوەندیەکانی ڕائەگرێ هەر وەك کاتی منداڵیەکەی.

(٢) بیرێکە نزیکەی میلێك لە مەدینەوە دوورە.

(٣) أبوداود (٢٢٧٧).

کەمتر بێت وایە، مالیك ووتوویەتی: دایك لە پێش ترە بۆ وەرگرتنی هەتا دادانی شیری ئەکەوێ، ئەمە بەگوێرەی منداڵی نێرینەوەیە، بەڵام کچیش ئارەزووی هەڵبژاردنی ئەدرێتە دەست، وەك کوڕ لای شافیعی.

ئەبو حەنیفە ووتوویەتی: بۆ کچ دایکی لە پێش ترە هەتا شوو ئەکات یا پێ ئەگات.

وە مالیك ووتوویەتی: کچ دایکی لە پێشترە بۆی هەتا شوو ئەکاتو ئەگوێزرێتەوە بۆلای مێرد.

وە لای حەنبەلیەکان: باوك لەپێشترە بۆی کەتەمەنی گەیشتە نۆ ساڵ، بێ ئەوەی خۆی هەڵیان بژێرێ، بەڵام دایك شایستەترە پێی هەتا تەمەنی نۆ ساڵی.

وە لە شەرعدا دەقێکی گشتی نیە یەکێکیان پێش ئەوی تریان بخات بە تێکڕایی، وە هەروەها دەقێك نیە کە منداڵ خۆی هەڵیان بژێرێ هەرگیز.

وە زانایان هەموو لەسەر ئەوە رێك کەوتن کە هیچ کام لە دایك و باوك دیاری ناکرێ بۆ منداڵ، بەڵکو مرۆڤی شەڕەنگێزو توندڕەو پێش کەسێکی بێ تاوان و دادپەروەر چاك ناخرێ، و ئەوەی لێرەدا ئیعتیباری پێ ئەکرێ ئەوەیە کە کامیان زیاتر توانای هەبێت پارێزگاری لەو منداڵە بکات.

جا ئەگەر هاتو باوك گوێی نەئەدا بەوە، یا توانای بەخێوکردنی نەبوو، یا کەس لـێی ڕازی نەبوو، وە دایکەکە پێچەوانەی ئەو بوو، ئەوە ئەو دایکە لە پێشترە بۆ بەخێوکردنی منداڵەکە، وەك ئیبنوقەییم ئیفادەی داوە.

وە وتوویەتی: جا هەرکەسمان لەپێشتر دانا بۆ بەخێوکردنی منداڵەکە بەهەڵبژاردنی منداڵەکە خۆی، یا بە پشك، یاخۆی خۆی دانا، کاتێ پێش ئەخرێ کە بەرژەوەندی منداڵەکەی تێدا بێت.

وە ئەگەر دایکەکە پارێزگارتر بوو لە باوکەکەو بەغیرەت تر بوو لەو، ئەوە پێش باوکەکە ئەخرێ ئیتر گوێ نادرێتە پشك یا هەڵبژاردنی منداڵەکە لەم حاڵەتەدا، چونکە منداڵەکە کەم ئاوەزە دەست بەتاڵی و یاری کردنی لا پەسەندترە، جا ئەگەر کەسێکی هەڵبژارد کە یارمەتی بدا بۆ ئەوە گوێ نادرێ بەو هەڵبژاردنە، وە ئەبێ لای کەسێك بێت کە بەسوودترو باشتر بێت بۆی، وە شەریعەتیش لەوە زیاتر هەڵناگرێ. پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (مروهم بالصلاة لسبع، واضربوهم على تركها لعشر، و فرّقوا بينهم في المضاجع)[1].

واتە: لە حەوت ساڵیدا فەرمانیان پێ بکەن بۆ نوێژکردن و لە دەساڵیدا لەسەری لێیان بدەن و شوێنی نوستنیان لەیەك جیابکەنەوە.

---

(١) أحمد (٢/١٨٠) وأبوداود (٤٩٥) والترمذي (٤٠٧) والحاكم (١/١٩٧) والدارقطني (١/٢٣٠).

وە خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا قُوا أَنفُسَكُمْ وَأَهْلِيكُمْ نَاراً وَقُودُهَا النَّاسُ وَالْحِجَارَةُ﴾ (التحريم:٦).

واتە: ئەی ئەو كەسانەی باوەڕتان هێناوە خۆتان و كەس‌وكارتان بپارێزن لە ئاگرێك كە سووتەمەنی‌یەكەی خەڵك و بەردە.

حەسەن ووتویەتی: منداڵەكانتان فێر بكەن و پەروەردەیان بكەن و فێری زانیاری ئایینیان بكەن.

جا ئەگەر دایكەكە بیخاتە فێرگە و قورئانی فێر بكات، بەڵام منداڵەكە یاری‌و تێكەڵی هاوەڵەكانی لا خۆشتربێت، وە باوكی یارمەتی دەری بێت بۆ بەرلای‌یەكە، ئەوە ئەو دایكە لەپێشترە بۆی بەبێ هەڵبژاردن و بەبێ پشك خستن، وە هەروەها بە پێچەوانەشەوە هەروایە.

وە هەركاتێ یەكێ لەدایك و باوكەكە گوێیان نەدا بە فەرمانەكانی خواو پێغەمبەركەی بۆ كاروباری منداڵەكەیان و ئەوی تریان گوێی پێدا، ئەوە ئەوەیان لەپێش ترە بۆی، وە ئیبنوقەییم ووتوویەتی: گوێم لە شێخەكەم بوو (ابن تيمية) ڕەحمەتی خوای لێ بێت كە ئەی ووت: دایك و باوكێك كێشەیان بوو لەسەر منداڵەكەیان لای حاكمێك، ئەویش منداڵەكەی كردە سەرپشك كە یەكێكیان هەڵبژێرێ، ئەویش باوكی هەڵبژارد، دایكی پێی ووت: پرسیاری لێ بكە بزانە بۆچی باوكی هەڵبژارد، ئەویش پرسیاری لێ كرد، منداڵەكە ووتی: دایكم هەموو ڕۆژێك ئەمنێری بۆ فێرگاو فەقێكە لێم ئەدا، بەڵام باوكم بەرەڵام ئەكات یاری بكەم لەگەڵ منداڵان، ئیتر حاكمەكە دایەوە بەدایكی و ووتی: تۆ شایستە تری بۆی.

ووتویەتی: شێخەكەم ووتویەتی: ئەگەر یەكێ لە دایك و باوكەكە وازی لە فێركردنی منداڵەكە هێنا وە وازی لەوەهێنا كە فەرمانەكانی خوای فێر بكات، ئەوە عاصی و سەرپێچی‌كارە بۆ فەرمانەكانی خوا، و سەرپەرشتی كردنی پێ ناسپێررێ، بەڵكو هەر كەسێك بە ئەركی سەرپەرشتی هەڵنەستێ لەكاتی بەخێوكردندا، ئیتر ئەو كەسە سەرپەرشتی پێ نادرێ، بەڵكو ئەبێت یان دەست هەڵگرێ لە سەرپەرشتی كردنەكەو كەسێكی تر دابنرێ كە واجب بەجێ ئەهێنێ، یا كەسێكی تری ئەخرێتە پاڵی كە بەیەكەوە ئەو كارە بكەن. چونكە مەبەست لێرەدا بەجێ هێنانی فەرمانەكانی خواو پێغەمبەرەكەیەتی بەپێی توانا -تەواو-.

## منداڵ لە نێوان دایك و باوكیا:

شافیعی‌یەكان وتویانە:

ئەگەر منداڵەكە كوڕ بوو، دایكی هەڵبژارد ئەوە بەشەو لای دایكی ئەبێت بە ڕۆژیش لای باوكی ئەبێت لە نوسینگەكەی دا، یالە شوێنی كارەكەیدا، چونكە لێرەدا مەبەست بەشی منداڵەكەیە، وە بەشی منداڵەكەش بەو شێوەیە دێتەدی كەباس كرا، بەڵام ئەگەر باوكی هەڵبژارد ئەوە بەشەوو بەڕۆژ لای باوكی ئەمێنێتەوە، بەڵام نابێ ڕێی لێ بگیرێ سەر لە دایكی بدات، چونكە ڕێ لێ گرتن پاڵ پێوە نانە بۆ سەرپێچی و بچڕاندنی سیلەی ڕەحم، وە ئەگەر منداڵەكە نەخۆش كەوت دایكی لە پێشترە كەمنداڵەكەی لا بمێنێتەوە تا ئاگاداری بكا، چونكە بەنەخۆش كەوتنی، وەك ئەو منداڵەی لێ دێت كە پێویستی بەكەسێك هەیە سەرپەرشتی بكات لەبەر ئەوە دایكی لەپێشترە بۆی.

بەڵام ئەگەر منداڵەكە كچ بوو، هەركامیانی هەڵبژارد ئەبێ شەوو ڕۆژ لای بمێنێتەوە، وە نابێ ڕێ لەوی تریان بگیرێ كە سەر لەمنداڵەكە بدات، بێ ئەوەی سەردانەكەی زۆر بخایەنێت، چونكە جیابوونەوەی ژن و مێرد ڕێ لەوە ئەگرێ كە هەریەكەیان زۆر لەماڵی ئەوی تر یاندا بمێننەوە، وە ئەگەر كچەكە نەخۆش كەوت دایكەكە لەپێشترە سەرپەرشتی بكات لەماڵەكەی خۆی، هەتا چاك ئەبێتەوە، بەڵام ئەگەر یەكێ لەدایك و باوكەكە نەخۆش كەوت، كوڕەكەی لای ئەوی تریان بوو لەو ئەسەنرێتەوەو ئەدرێ بەو، وە ئەگەر پەشیمان بوەوە، و دوبارە ئەوەی یەكەمی هەڵبژاردەوە ئەگێڕدرێتەوە بۆ لای چونكە هەڵبژاردن بە ئارەزوی خۆیەتی، وە چونكە جاری وا هەیە حەز ئەكات ماوەیەك لای یەكێكیان بێت، وە ماوەیەك لای ئەوی تریان، لەبەر ئەوە ئەبێ بە ئارەزوی ئەو بێت وەك چۆن لە خواردن و خواردنەوەدا بە ئارەزوی خۆیەتی.

### بردنی منداڵ بۆ ئەم لاو لا:

ئیبنو قەییم وتوویەتی: ئەگەر یەكێ لە دایك و باوكەكە چوون بۆ شوێنێك بەسەفەر بۆ پێویستی كاری خۆیان لەپاشاندا بگەڕێنەوە، و ئەوی تریان سەفەری نەدەكرد و نیشتەجێ بوو ئەوە نیشتەجێكە لەپێشترە بۆ ئەو منداڵە، چونكە سەفەر كردن بە منداڵی بچوك -بەتایبەتی ئەگەر شیرەخۆرە بێت- زیانی پێ ئەگەیەنێت بەو شێوەیە ئەوەیان بەگشتی باس كردووە و سەفەری حەجیان لەسەفەری تر جیانەكردۆتەوە، وە ئەگەر یەكێ لە دایك و باوكەكە بچێت بۆ شارێكی ترو بیەوێ لەو شوێنە جێگیر بێت، وە شارەكەو ڕێگاكە مەترسیان تیادابێت یان یەكێكیان مەترسی تێدا بێت ئەوە ئەوەی كە نیشتە جێیەو سەفەر ناكا لە پێشترە بە منداڵەكە، بەڵام ئەگەر شارەكەو ڕێگاكە بێ مەترسی بێت دوو گفتی لەسەرە: كە دوو ڕیوایەتن لە ئەحمەدەوە ڕەحمەتی خوای لەسەربێ:

یەکەم: بەخێوکردنی ئەسپێرێ بە باوك، بۆ ئەوەی بتوانێ منداڵەکەی پەروەردە بکات و فێری بکات، ئەمەش گفتی مالیك و شافیعیەیە، و شورەیح حوکمی پێ کردووە.

دووەم: دایکەکە لە پێشترە بۆی.

وە گفتی سێیەمیشی لەسەرە کە ئەڵێت: ئەگەر بارکردووەکە، باوکەکە بوو، ئەوە دایکی شایستەترە بۆی، بەڵام ئەگەر دایکەکە بوو وە بارکردنەکەی بۆ ئەو شارە بوو کە مارەکردنەکەی تێدا کراوە ئەوە ئەو شایستەترە، بەڵام ئەگەر باری کرد بۆ شارێکی تر، ئەوە باوکەکە شایستە ترە بۆی، وە ئەمەش گفتی ئەبوحەنیفەیە.

وە لەئەبی حەنیفەوە ڕەحمەتی خوای لەسەر بێت ڕیوایەتێکی تر ئەگێڕنەوە کە ووتوویەتی: ئەگەر بارکردنی دایکەکە لە شارەوە بۆ لادێ بێ، باوکەکە شایستەترە بۆی، بەڵام ئەگەر لەشارەوە بۆ شاربوو، ئەوە هەر دایکەکە شایستە ترە، وە ئەم گفتانە وەك ئەبینیت هەموویان بەڵگەیەکیان لەسەر نیەیە کەدڵ دامەزرێنن.

بۆیە ڕاستی ئەوەیە کە سەیری بەرژەوەندی منداڵ بکرێ کامەیان زۆر چاکتر بێت بۆی مانەوە یان بارکردن، ئەوەیان لەبەرچاو ئەگیرێ، چونکە مانەوەو بارکردن هیچ کارێك ناکات.

ئەمانە کاتێك هەموو بەو شێوەیە ئەبن کە یەکێکیان نەیەوی بەو بارکردنە زیان بەوی تریان بگەیەنێت و منداڵەکەی لێ زەوت بکات، وە ئەگەر مەبەستی ئەوە بوو، وەڵامی نادرێتەوە (و تەوفیق هەر بە خوایە).

## تۆڵەکان (الحدود)

**پێناسەکەی:**

(حدود) کۆی (حد)ە (حد)یش لە ئەسڵدا بە شتێك ئەوترێ بەربەست بێ لە نێوان دوو شتا وە ئەڵێن: بە جیاکەرەوەی شتێك ئەڵێن لە شتێکی تر، وە هەر لەوەوە بەین و سنوور لە نێوان دوومالّ یان دوو زەوی دا پێی ئەڵێن (حد).

وە لە لۆغەتدا: بە مانای (منع) نەهێشتنە، وە بۆیە سزای سەرپێچی یەکان ناو ئەبرێت بە (حدود)، چونکە زۆر جار دەبێتە هۆی بەربەست بوونی تاوانبار لەوەدا کە نەگەڕێتەوە سەر ئەو تاوانەی کە سزا دراوە لەسەری. وە حەد بە خودی سەرپێچی یەکەش ئەوترێ، وە قەولی خوای گەورەش هەر لەوەوەیە کە ئەفەرموێ: ﴿تلك حدود الله فلا تقربوها﴾ واتە: ئەو حوکمانە کە خوا بۆی داناون سنوورەکانی خوان کە حەلاڵ و حەرام لەیەك جیا ئەکەنەوە، جا ئێوە لێیان نزیك مەبنەوە.

وە حەد لە شەرعا تۆڵەیە کە دانراوە بۆ پاراستنی مافی خوا[1].

**ئەو تاوانانەی تۆڵە و حەدیان بۆ دانراوە:**

کیتاب و سوننەت چەند سزایەکیان داناوە، بۆ کۆمەڵێ تاوانی دیاری کراو کە پێیان ئەڵێن (جرائم الحدود) ئەو تاوانانەش ئەمانەن: (زینا کردن، تۆمەت بارکردنی کەسێکی بێ تاوان بە زیناوە، دزی کردن، سەرخۆش بوون، شەڕکردن دژی ئیسلام، هەڵگەڕانەوە لە ئیسلام، ستەم و تەعەددا کردن).

جا هەرکەسێ تاوانێك لەو تاوانانە بکات، تۆڵەیەکێ تایبەتی هەیە کە شەرع بۆی داناوە، سزای تاوانی زینا: دار لێدانە بۆ کوڕ و کچ، و بەردەبارانە بۆ ژن و پیاو، خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿وَاللَّاتِي يَأْتِينَ الْفَاحِشَةَ مِنْ نِسَائِكُمْ فَاسْتَشْهِدُوا عَلَيْهِنَّ أَرْبَعَةً مِنْكُمْ فَإِنْ شَهِدُوا فَأَمْسِكُوهُنَّ فِي الْبُيُوتِ حَتَّى يَتَوَفَّاهُنَّ الْمَوْتُ أَوْ يَجْعَلَ اللَّهُ لَهُنَّ سَبِيلاً﴾ (النساء:١٥).

واتە: وە ئەوانەی کە فاحیشە ئەکەن لە ژنانی ئێوە چوار شایەتی عادلی موسوڵمان لە خۆتان

---

(١) مەبەست بە مافی خوا واتە: داندراوە بۆ بەرژەوەندی کۆمەڵ و پاراستنی یاسای گشتی، چونکە مەبەست لە دینی خوادا هەر ئەوەیە، جا کاتێك مافێکی خوایی بێت کەواتە خستن نی یە تێیدا، نە لەلایەنی تاکەکانەوە نە لەلایەنی کۆمەڵەوە.

لەسەریان بگرن، جا ئەگەر شایەدیان لەسەر دان بەو کارە، ئەوە ژنە زینا کەرەکان بەند بکەن لە ماڵەکاندا تا ژیانیان کۆتایی دێ بە مردن، یا ئەوەی خوا ڕێگای ڕزگار بوونیان بۆ دائەنێ

وە پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێت: (خذوا عني خذوا عني، قد جعل الله لهن سبيلاً: البكر بالبكر جلد مائة وتغريب عام، والثيب بالثيب جلد مائة، والرجم)

واتە: لێم وەربگرن، لێم وەربگرن، خوا ڕێگایەکی بۆ داناون، کوڕ و کچ سەد دارو ساڵێك دورخستنەوە، و ژن و پیاو سەد دارو بەردەباران کردنە.

وە سزای تاوانی (قذف) تۆمەت کردنی بێتاوانێك بە زینا هەشتا دارە. خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿وَالَّذِينَ يَرْمُونَ الْمُحْصَنَاتِ ثُمَّ لَمْ يَأْتُوا بِأَرْبَعَةِ شُهَدَاءَ فَاجْلِدُوهُمْ ثَمَانِينَ جَلْدَةً وَلا تَقْبَلُوا لَهُمْ شَهَادَةً أَبَداً وَأُولَئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ﴾ (النور:٤) واتە: وە ئەوانەی تاوانی داوێن پیسی ئەدەنە پاڵ پیاوان و ئافرەتانی داوێن پاك بەبێ ئەوەی چوار شایەتی عادل بهێنن، ئەوە هەشتا قەمچییان لێ بدەن و هەرگیز شایەتیان لێ وەرمەگرن، وە ئەوانە کەسانێکن کە لە فەرمانی خوا دەرچوون.

وەسزای دزی دەست بڕینە خوای گەورە ئەفەرمووێ: ﴿وَالسَّارِقُ وَالسَّارِقَةُ فَاقْطَعُوا أَيْدِيَهُمَا جَزَاءً بِمَا كَسَبَا نَكَالاً مِنَ اللَّهِ وَاللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ﴾ (المائدة:٣٨)

واتە: پیاوو ژن ئەگەر دزییان کرد، ئەوە – ئێوەی قازی یا کاربەدەست – دەستیان ببڕن، لە تۆڵەی ئەوەی بە ناحەق ماڵی خەڵکییان بردووە وە سزایەکە لەلایەن خواوە بۆیان دانراوە بۆ ئەوەی کەسانی تر ئەو کارە نەکەن، وەخوای گەورە بە دەسەڵات و کار دروستە.

وە سزای تاوانی خراپەکردن و فەساد لەسەر زەوی: کوشتن، یا لەداردان، یا دوور خستنەوەیە، یا دەست و قاچ بڕینە ڕاست و چەپ، خوای گەورە ئەفەرمووێ: ﴿إِنَّمَا جَزَاءُ الَّذِينَ يُحَارِبُونَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَيَسْعَوْنَ فِي الْأَرْضِ فَسَاداً أَنْ يُقَتَّلُوا أَوْ يُصَلَّبُوا أَوْ تُقَطَّعَ أَيْدِيهِمْ وَأَرْجُلُهُمْ مِنْ خِلافٍ أَوْ يُنْفَوْا مِنَ الْأَرْضِ ذَلِكَ لَهُمْ خِزْيٌ فِي الدُّنْيَا وَلَهُمْ فِي الْآخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٌ﴾ (المائدة:٣٣)

واتە: سزاو تۆڵەی ئەوانەی شەڕ ئەکەن دژی خواو تەجاوز ئەکەنە سەر حوکمەکانی خواو حوکمەکانی پێغەمبەرکەی، وە تێ ئەکۆشن خراپە لەسەر زەوی بڵاو بکەنەوە بە کوشتن و دزین، ئەوەیە کە ئەکوژرێن، یا ئەکرین بەداردا، یا دەست و قاچیان بە پێچەوانەوە ئەبڕێ یان شار بەدەر ئەکرێن، ئەو سزایە کە خوا دایناوە بۆیان سەرشۆڕییە بۆیان لەدنیادا، وە لەئاخیرەتدا سزایەکی گەورە ئەدرێن ئەگەر تەوبە نەکەن.

وە سزای تاوانی سەرخۆش بوون، هەشتا قەمچییە، دارە یا چڵ کە لەدواییدا بەدرێژی باس ئەکرێت لە جێی خۆی.

وە سزای هەڵگەڕانەوە لە ئیسلام کوشتنە بە پێی فەرموودەکەی پێغەمبەر ﷺ کە فەرموویەتی: (من بدل دينه فاقتلوه)[1] واتە: هەرکەسێ ئاینەکەی گۆڕی بیکوژن.

وە سزای تاوانی ستەم و تەعداکردن کوشتنە، بەپێی فەرمودەی خوای گەورە کە ئەفەرمووێ: ﴿وَإِنْ طَائِفَتَانِ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ اقْتَتَلُوا فَأَصْلِحُوا بَيْنَهُمَا فَإِنْ بَغَتْ إِحْدَاهُمَا عَلَى الْأُخْرَى فَقَاتِلُوا الَّتِي تَبْغِي حَتَّى تَفِيءَ إِلَى أَمْرِ اللَّهِ فَإِنْ فَاءَتْ فَأَصْلِحُوا بَيْنَهُمَا بِالْعَدْلِ وَأَقْسِطُوا إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُقْسِطِينَ﴾ (الحجرات:٩)

واتە: ئەگەر دوو کۆمەڵ لەموسڵمانان چوون بەگژ یەکدا ئێوە — ئەی ئیمانداران - ڕێکیان بخەنەوە بە بانگ کردنیان بۆ قەبوڵی حوکم کردن بە کتێبی خواو سوننەتی پێغەمبەرەکەی، جا ئەگەر کۆمەڵێکیان ڕازی نەبوو بەوەو ستەم و زیادەڕەوی کرد، ئەوە شەڕ لەگەڵ ئەو کۆمەڵەیەدا بکەن کە ستەم و زیادەڕەویەکە ئەکات، هەتا ئەگەڕێتەوە بۆ سەر فەرمانی خوا. جا کاتێ گەڕایەوە ئێوەش بەدادپەروەری ڕێکیان بخەنەوە، وە ئێوە لە هەموو کارێکتانا دادپەروەرین، چونکە خوا دادپەروەروەرانی خۆش ئەوێ

وە بە پێی فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ کە فەرموویەتی: (إنه ستكون بعدي هنات وهنات. فمن أراد أن يفرق أمر المسلمين وهم جميع فأضربوه بالسيف كائناً من كان)[2].

واتە: دوای من بەڵاو موصیبەت ڕوو ئەدات جا هەرکەس بیەوی موسڵمانان لێك جیابکاتەوە کاتێ ئەوان یەك بوون بەشمشێر لێی بدەن هەرکەسێك بێت.

عەدالەتی ئەو سزاو تۆڵانە:

ئەو سزایانە لەگەڵ ئەوەدا کە بەدی هێنەرن بۆبەرژەوەندیيە گشتیيەکان و پارێزەرن بۆ ئاسایشی گشتی، سزایەکی ئەو پەڕ ڕاست و عادلیشن.

چونکە تاوانی زیناکردن پیسترین و ناشیرینترینی تاوانەکانە، وە هێرشە بۆ سەرخەڵك و شەرەف و کەرامەت، وە تێکدەری یاسای خێزان و ماڵەکانە، وە ڕێ خۆشکەرە بۆ زۆر لەشەڕ و خراپەکان کە ڕاگرەکانی تاك و کۆمەڵ لەناو ئەبەن، وە قەوارەی نەتەوەی ئیسلام ناهێڵن، لەگەڵ ئەوەشدا ئیسلام

(١) أحمد (١/٢٨٢) والبخاري (٦٩٢٢) وأبوداود (٤٣٥١) والترمذي (١٤٥٨) والنسائي (٧/١٠٤) وابن ماجة (٢٥٥٣).

(٢) مسلم (١٨٥٢) وأبوداود (٤٧٦٢) وأحمد (٤/٢٤) والنسائي في الكبرى (٣٤٨٥).

ئیحتیات و هوشیاری بەکار هێناوە بۆ چەسپاندنی ئەو تاوانە، چونکە چەند مەرجێکی داناوە بۆ چەسپاندنی، کە خەریکە پەیدابوونیان ئەستەم بێت.

هەر بۆیە تۆڵەی زینا تۆڵەیەکە مەبەست لێی سەرزەنش و تەریق بوونەوەو ترساندنە بۆ دوورکەوتنەوە لێی، زیاتر لەوەی کە مەبەست لێی جێبەجێ کردن‌و کارکردن بێت. وە تۆمەت دانە پاڵ پیاو و ژنی بێ تاوان بە زینا لەو تاوانانەیە کە پەیوەندییەکانی نێوان ئەندامانی خێزان ئەپچڕێنێ و ژن و مێرد لەیەك جیائەکاتەوە، وە پایەکانی ماڵ ئەڕوخێنێ لە کاتێکدا کە ماڵ خانەی یەکەمە لە پێکهێنانی کۆمەڵدا، بە چاك بوونی ماڵ کۆمەڵیش چاك ئەبێت، وە بە خراپ بوونی خراپ ئەبێت.

کەواتە دانانی لێدانی هەشتا قەمچی لەو کەسەی تاوانی تۆمەت هەڵبەستن ئەنجام ئەدات دوای ئەوەی کە نەتوانێ چوار شایەت بهێنێ پشتگیری بکەن لەو تۆمەتەدا کە هەڵی بەستووە، ئەوپەڕی حیکمەت و پاراستنی بەرژەوەندییە، بۆ ئەوەی کەرامەتی هیچ کەس بریندار نەکات‌و سومعەی خراپ نەکات.

وە دزی کردن تەعەداکردنە بۆ سەرسامان وماڵی خەڵك و یاری پێکردنە بەسامانی خەڵك، کە سامان خۆشەویست ترین شتە بۆ مرۆڤ.

جا دانانی سزای دەست بڕین بۆ بکەری ئەو تاوانە تاوەکو خەڵکی تر دوور کەونەوە لە کردنی ئەو تاوانە، و هەمووکەس دڵنیا بێت لە سامانەکەی، و دڵنیا بێت لەخۆشەویست ترین و بە نرخترین شتێك کە هەیەتی، لەو شتانەیە کە بە جێی شانازی ئەم شەریعەتە ئەژمێررێ،

وە بەڕاستی کاریگەری وەرگرتنی ئەو یاسایە دەرکەوتووە لەو وڵاتانەدا کە بە ئاشکرا ئەو یاسایە ئەبەن بەڕێوە لە گێڕانەوەی ئاسایش و ئاگاداری سامان و پاراستنی لەدەستی گاڵتەچییان و ئەوانەی لە ئایین و یاسا دەرچوون. وە یەکێتی سۆڤیەت لەم دواییانەدا ناچار بوو کە سزای دزی زیاد بکات دووای ئەوەی دەرکەوت کەتۆڵەی بەندکردن زۆری تاوانەکە کەم ناکاتەوە، لەبەر ئەوە بڕیاریدا دز بکوژرێ بە تفەنگ کە توندترین سزایەکە بکرێ.

وە ئەوانەی شەڕ ئەکەن دژی خواو پێغەمبەرەکەی و هەوڵی بڵاوکردنەوەی خراپە ئەدەن لە سەر زەوی و داگیرسێنەری ئاگری فیتنەن، و تێکدەری ئاسایش و خۆشی کۆمەڵن، ئاشوب ئەنێنەوەو کار ئەکەن لەسەر هەڵگێڕانەوەی ئەو یاسایانەی کە هەن، نابێ سزاکەیان لەوە کەمتر بێت کەدەست و قاچیان ببڕرێ بە پێچەوانەوە، یا شاربەدەر بکرێن.

وە عارەق خواردن کە بیر و هۆشی ئەو کەسە لا ئەبات، وە کاتێك کەسێك بیرو هۆشی لەدەستدا، ئەوە هەموو دەبەنگی و خراپەکاری‌یەك ئەکات، جا کاتێ داری حەددی لێدرا لەسەر ئەو کارە، ئەودار لێ دانەی رێگر ئەبێت لەوەی کە بگەڕێتەوە بۆ ئەو کارە لەلایەك و لەلایەکی ترەوە خەڵکی تری پێ چاوترسێن ئەکرێ، لە کردنی ئەو تاوانە.

**بەجێ هێنانی تۆڵەکان واجبە:**

بەجێ هێنانی تۆڵەکان کەڵکی تێدایە بۆ خەڵکی، چونکە رێ لەتاوانەکان ئەگرێ و تاوانباران ئەترسێنێ و ناهێڵێ کەس بیر لەو شتانە بکاتەوە کە نارەوان، وە ئەبێتە هۆی بەدیهاتنی ئەمن و ئاسایش بۆ هەموو تاکێك، ئیتر ترسی نابێت نە لە گیانی نە لە ماڵ و ناموسی وە نە لە سومعەو کەرامەت و ئازادی.

نەسائی و ئیبنو ماجە لە ئەبی هورەیرە ئەگێڕنەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (حدٌّ يُعْمَلُ به في الأرض خيرٌ لأهل الأرض من أن يُمطروا أربعين صباحاً)[1] في الحديث جرير بن يزيد بن جرير بن عبدالله البجلي وهو ضعيف منكر .

واتە: تۆڵەیەك لەزەویدا کاری پێ بکرێ و بەرێوە ببرێ چاکترە بۆ خەڵکی سەرزەوی لەوەی چل بەیانی بارانیان بەسەردا بباریّ.

ئەم حەدیسە جەریری کوڕی یەزیدی کوڕی جەریری کوڕی عبدوڵلای بوجەلی تێدایە کە (ضعيف و منكر)ە

وە هەر کردەوەیەك بەرپا کردنی تۆڵەکان بوەستێنێ ئەوە حوکمەکانی خوای پەك خستووە و شەڕ کردنە دژی خوا، چونکە ئەوە چەسپانی تاوانەو بڵاوبوونەوەی خراپەیە.

ئەحمەد و أبوداود و حاکم کە بەصحیحی داناوە گێڕاویانەتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (من حالت شفاعته دون حد من حدود الله فهو مضاد الله في أمره)[2] واتە: تکای هەرکەس ببێتە هۆی بەجێ نەهێنانی حەددێك لەحەددەکانی خوا، ئەوە ئەو کەسە دژی خوا و فەرمانەکانی‌یەتی.

جاری وا هەیە هەندێ کەس بێ ئاگا ئەبن لەو تاوانەی تاوان بارێك ئەیکات، کەسەیری سزادانی ئەکات بەزەیی پێدا دێتەوە، جا قورئان بڕیار ئەدا کە ئەوە پێچەوانەی ئیمان و باوەڕە، چونکە باوەڕ

---

(١) النسائي (٨/٧٦) وابن ماجة (٢٥٣٨) وابن حبان (٤٣٨١).

(٢) أحمد (٢/٧٠) وأبوداود (٣٥٩٧) والحاكم (٤/٣٨٣).

ئەوە پێویست ئەکات کە مرۆڤ خۆی پاك و خاوێن ڕابگرێ لە تاوانەکان، وە هەروەها باوەڕ و بەرزکردنەوەی تاکە کەس و کۆمەڵ پێویست ئەکات بۆ ڕەوشتی بەرزو خوی چاك،

خوای گەورە ئەفەرمووێ: ﴿الزَّانِيَةُ وَالزَّانِي فَاجْلِدُوا كُلَّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا مِائَةَ جَلْدَةٍ وَلا تَأْخُذْكُمْ بِهِمَا رَأْفَةٌ فِي دِينِ اللَّهِ إِنْ كُنْتُمْ تُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ وَلْيَشْهَدْ عَذَابَهُمَا طَائِفَةٌ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ﴾ (النور:٢).

واتە: زیناکەری کچ و کوڕ کە زەواجیان نەکردبێ هەریەکەیان سەد قەمچی لێ‌بدەن، وە بەزەیی پیا هاتنەوەیان هەڵتان نەنێ واز لە سزادانیان بهێنن یا سوکی بکەن، ئەگەر ئێوە باوەڕتان بەخواو ڕۆژی دوایی هەیە، وە ئەبێ کۆمەڵێ لە باوەڕداران سزادانەکەیان ببینن، بۆ ئامۆژگاریو پەند وەرگرتن.

چونکە بەڕاستی بەزەیی هاتنەوە بەکۆمەڵدا زۆر گرنگترە لەبەزەیی هاتنەوە بە تاکە کەسێکدا.

فَقَسا لِيَزدَجِروا، ومن يَكُ حازِماً فليقْسُ أحياناً علي من يرحم

واتە: توندو دڵ ڕەق بوو، بۆ ئەوەی پەند وەربگرن و بترسن، چونکە هەرکەس قایم و هوشیار بێ لە کاریدا، با هەندێك جار دڵ ڕەق بێت بەرامبەر ئەو کەسەی کە بەزەیی هەیە بۆی.

**تکاکردن لە تۆڵەدا:**

حەرامە کەس تکا بکات یاکارێك بکات کە حەددێك لە حەددەکانی خوا یەك بخرێت، چونکە بەرژەوەندی‌یەکی بەدی هاتوو لەدەست ئەچێت، وە پاڵ پێوە نانە بە خەڵکەوە بۆ تاوان کردن، وە ڕازی بوونە بەرزگاربوونی تاوانبارێك لە سەرەنجامی تاوانەکەی. ئەو تکایەش کاتێك قەدەغەیە کە کارەکە بگاتە دەست حاکم، چونکە تکاکردن لەو کاتەدا وا لەحاکمەکە ئەکات واز لە ئەرکە سەرەکی‌یەکەی بهێنێ، وە دەرگای پەك خستنی تۆڵەکان ئەکاتەوە.

بەڵام پێش ئەوەی بگاتە لای حاکم قەیناکە تاوان بار داپۆشرێ و لای حاکم تکای بۆ بکرێ.

ئەبو داود و نسائی و حاکم کەبە صەحیحی داناوە گێراویانەتەوە لە حەدیسی عەمری کوڕی شوعەیبەوە لەباوکی‌یەوە لەباپیری‌یەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (تعافوا الحدود فيما بينكم، فما بلغني من حد فقد وجب)[1] واتە: لەیەکتر ببورن لە تۆڵەدا، چونکە هەرچی گەیشت بەمەن بەجێهێنانی واجبە.

(١) أبوداود (٤٣٧٦) والنسائي (٨/٧٠) والحاكم (٤/٣٨٣).

وە ئەحمەد و خاوەن سونەنەکان تەخریجیان کردووە، وەحاکمیش بەصەحیحی داناوە لە حەدیسی صەفوانی کوڕی ئومەییەدا کە پێغەمبەر ﷺ کاتێ ویستی دەستی ئەوە ببڕێ کە کراسەکەی لێ دزی، خەڵك تکایان بۆ کرد پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: نەئەبوو ئەو تکایەتان کاتێ بکردایە کە هێشتا نەتان هێناوە بۆ من[1].

وە لە عائیشەوە کە فەرموویەتی: ژنێکی مەخزومی شتی لەماڵان ئەخواست و دووایی نەی ئەداوە، پێغەمبەر ﷺفەرمانی دا دەستی ببڕن، کەس و کارەکەی هاتنەلای ئوسامەی کوڕی زەید کەتکایان بۆ بکات، ئەویش هاتە لای پێغەمبەر ﷺ تکای بۆ کرد، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (یا أسامة، لا أراك تشفع في حد من حدود الله عزوجل) واتە: ئەی ئوسامە، نەت بینم لەحەددێك لە حەددەکانی خوای گەورە دا تکا بکەی. لە پاشاندا پێغەمبەر چووە سەر دوانگە و ووتارێکی داو فەرمویێ: (إنما هلك من كان قبلكم بأنه إذا سرق فيهم الشريف تركوه، وإذا سرق فيهم الضعيف قطعوه. والذي نفسي بيده، لو كانت فاطمة بنت محمد لقطعت يدها).

واتە: ئەوانەی پێش ئێوە بۆیە لەناو چوون ئەگەر دەوڵەمەندێك و خاوەن پلە و پایەیەك دزی بکردایە وازیان لێ ئەهێنا، بەڵام ئەگەر هەژارێك دزی بکردایە دەستیان ئەبڕی. بەو زاتەی گیانی منی بەدەستە ئەگەر فاطمەی کچی موحەممەد بوایە دەستم ئەبڕی) ئیتر دەستی ژنە مەخزومی یەکەی بڕی. ئەحمەد و موسلیم و نەسائی گێڕاویانەتەوە[2].

## کەوتنی تۆڵە بە (شبهة) گومان:

تۆڵە سزایەکە لەو سزایانەی زیان بەلاشەی تاوانبار و سومعەی ئەگەیەنێت، وە دروست نییە ڕەواکردنی حورمەتی کەس و بریندارکردنی ئیللا بەحەق نەبێت، ئەو حەقەش ناچەسپی ئیللا بەبەڵگەیەکی وا نەبێت کە گومان ڕێی پێ نەبات، چونکە ئەگەر گومان ڕێی پێ برد ئەوە ڕێگر ئەبێت لەو یەقین و دڵنیایی یەی کە حوکمەکان لەسەری دائەمەزرێ. وە لەبەر ئەوەیە تۆمەت و گومان ئیعتیباری نەبووەو کاری پێ نەکراوە، چونکە گومان جێگای هەڵەیە. لە نەبی هورەیرەوە هاتووە کە فەرموویەتی: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (إدفعوا الحدود ما وجدتم لها مدفعاً) رواه ابن ماجة[3].

---

(١) أبوداود (٤٣٧٦) والنسائي (٨/٧٠) والحاكم (٤/٣٨٣).

(٢) أحمد (٦/١٦٢) مسلم (١٦٨٨/٨و٩) والنسائي (٨/٧٣-٧٥).

(٣) إبن ماجة (٢٥٤٥).

واتە: تۆڵەکان لابەرن مادام ڕێگاتان بۆ دۆزیەوە.

وە لە عائیشەوە کە فەرموویەتی: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (ادرأوا الحدود عن المسلمين ما استطعتم، فإن كان له مخرج فخلوا سبيله، فإن الإمام لأن يخطئ في العفو خير له من أن يخطئ في العقوبة) رواه الترمذي[1].

واتە: تۆڵەکان لە موسڵمانان دووربخەنەوە هەتا ئەتوانن، جا ئەگەر ڕێگایەکی بۆ هەبوو ئەوە بەرەڵای بکەن، چونکە پێشەوا لەلێ بوردندا هەڵە بکات چاکترە بۆی لەوەی لە سزادا هەڵە بکات،

ترمذي گێڕاویەتیەوە، و باسی ئەوەی کردووە کە ئەو حەدیسە بە مەوقوفی هاتووە و وەقفەکەش ڕاسترە، وە ووتوویەتی: لەچەند کەسێکەوە گێڕراوەتەوە لە صەحابەوە خوا لێیان ڕازی بێت کە ئەوانیش وەك ئەوەیان ووتووە.

گومانەکان و بەشەکانی :

حەنەفیەکان و شافیعیەکان، باسی گومانەکانیان کردووە و هەریەکەیان ڕای خۆی هەیە وا لەخوارەوە ڕوونی ئەکەینەوە:-

ڕای شافیعیەکان:

شافیعیەکان ڕایان وایە کە گومان ئەکرێ بەسێ بەشەوە:

١-گومان لە شوێندا:

واتە شوێنی کردارەکە: وەك ئەوەی پیاوەکە چوبێتە لای ژنەکەی کاتێ بێ نوێژ بووە یا بەڕۆژوو بووە، یا لە دووای دواوە چوبێتە لای، ئەوە شوبهەکە لێرەدا لەجێی کردەوە حەرامەکە ئەوەستێ.

چونکە ئەو شوێنە پیاو خاوەنیەتی، وەمافی پیاوەکەیە کە بچێتە لای ژنەکەی، وە لە کاتێکدا پیاو بۆی نەبووە بچێتە لای ژنەکەی لەکاتی بێنوێژیدا یان لەکاتی بەڕۆژو بوون یان لەدواوە، بەڵام ئەوە کە پیاوەکە خاوەنی جێگەکەیە و خاوەن مافە، لەسەر ئەو شوێنە گومان دروست ئەکات، وە بوونی ئەو شوبهەیەش پێویست ئەکات کە حەد لابرێ، ئیتر بکەر باوەڕی بێ بە حەڵاڵ بوونی کردەوەکە یان بە حەرام بوونی وەك یەکە، چونکە بناغەی شوبهەکە نە بیروباوەڕ نیە، بەڵکو بناغەکەی شوێنی کردارەکەیەو زاڵ بوونی بکەرە بە سەریا لەڕوی شەرعەوە.

٢- گومان لە بکەردا:

[1] الترمذي (١٤٢٤).

وەك ئەوە کەسێك بچێتە لای ژنێك کە بۆی کرابێ بە بووك لەسەر ئەوە کە ژنیەتی، پاشان ڕوون ببێتەوە کە ژنەکەی نی یە. وە بناغەی ئەم شوبهەیە گومان و زانینی بکەرەکەیە بە شێوەیەك ئەو کارە ئەکات وا ئەزانێت کە حەرام ناکات، جا بوونی ئەو گومانە لای بکەرەکە شوبهەیەك دروست ئەکات کە حەددەکەی لە کۆڵ ئەخات، بەڵام ئەگەر بکەر کاتێ ئەو کارەی کردبێت زانیبێتی بەحەرامی ئەو شتە، ئەوە شوبهەو گومانی تێدا نی یە.

٣- گومان لە لایەندا:

مەبەست لەمە گومانە لە حەڵاڵ بوونی کردارەکەو حەرامی یەتی، وە بناغەی ئەم شوبهەیەش جیاوازی نێوان زانایانە لەسەر کردارەکە، جا هەر شتێك کە زانایان جیاوازیان هەبێ لەسەر حەڵاڵی یا حەرامی ئەو شتە ئەوە جیاوازی یەکە گومانەو حەددی پێ لائەبرێ، بۆ نموونە: ئەبوحەنیفە مارەکردنی ئافرەتی بەبێ سەرپەرشت بە دروست داناوە،

وە مالیك بەدروستی داناوە بێ شایەت، وە جەماوەری زانایان ئەو مارە برینە بەدروست دانانێن، وە ئەنجامی ئەو ژن هێنانە ئەوەیە کە حەد نی یە لەسەر چونەلا لەو مارە برینەدا کە جیاوازی هەیە لەسەر دروستی یەکەی، چونکە جیاوازی یەکە ئەبێ بە شوبهەو حەددەکە لائەبات، با بکەریش باوەڕی وابێت کە ئەوکارە حەرامە، چونکە باوەڕی ئەو لەخۆیدا کاریگەری نی یە، مادام زانایان جیاوازی یان هەیە لە حەڵاڵی و حەرامی دا.

ڕای حەنەفیەکان:

حەنەفی یەکان ڕایان وایە کە گومان ئەکرێ بە دوو بەشەوە:

١- گومان لە کرداردا:

ئەمەش شوبهەو گومانە دەرهەق کەسانێك کارەکەیان لێ تێك چوویێت، نەك ئەوانەی لێیان تێك نەچوو بێت، وە ئەم گومانە ئەچەسپێت دەرهەق کەسێك کە حەڵاڵی و حەرامی لێ تێك چوویێت، وبەڵگەیەکی بیستراو نەبێت کە حەڵاڵی دەربخات، بەڵکو شتێك کە بەڵگە نی یە بە بەڵگەی زانیوە، وەك کەسێك بچێتە لای ژنە سێ بەسێ تەڵاق دراوەکەی یان بائینەکەی لەسەر ماڵێك، لە عیددەکەیدا.

وە لێکدانەوەی ئەمەش ئەوەیە کاتێك لە بنەڕەتدا نیکاح نەماوە دەرهەق حەڵاڵ بوونەکە لەبەر بوونی یەك خەری حەڵاڵی شوێنەکە، کە تەڵاقدانە، بەڵام نیکاح ئەمێنێ دەرحەق بە جێگەکە، وە حەرامی یەکە لەسەر مێردەکانە و بەس، وە ئەو چوونە لایە حەرامە و زینایە، و تۆڵە پێویست ئەکات، مەگەر کابرا ئیددعای ئەوە بکات کەلێی تێك چووە، و وای زانیوە کە حەلاڵە، چونکە

گومانەکەی لەسەر جۆرێك لەبەڵگە داناوە کە ئەویش مانەوەی نیکاحە لەمافی جێگادا و حەرامی ئەو ژنانە بۆ کەسانیتر هەتا لەعیددەدا بن، وە وای زانیوە حەڵاڵی نیکاحەکەش هەر ماوەتەوە، ئەوە هەرچەندە ناشێ بۆ بەڵگە لە سەر ڕاستی، بەڵام چونکە گومانی ئەوی هەیە کە بەڵگەیە، تۆڵەی لەکۆڵ ئەخات وەك چۆن گومانەکانیتر تۆڵە لەکۆڵ ئەخەن. وە مەرج – بۆ بوونی گومان لەکاردا - ئەوەیە کە لەبناغەدا بەڵگە لەسەر حەرامی ئەو شتە نەبێت، وە تاوانبار باوەڕی بەحەڵاڵی ئەو شتە بێت – بەڵام ئەگەر بەڵگە هەبوو لەسەر حەرامی، یا باوەڕی بەحەڵاڵی کارەکە سەلێنراو نەبوو، ئەوە شوبهە نیە لە ئەسڵا. وە ئەگەر چەسپا کە تاوانبار بەحەرامی ئەو شتەی زانی بوو ئەوە تۆڵەی لەسەر پێویستە.

٢- گومان لە شوێنەکە:-

وە شوبهەی حوکمیشی پێ ئەوترێ، وە هەروەها شوبهەی (ملك)، وە ئەم شوبهەیە بە جۆرێکە کە گومان لە حوکمی شەرعدا هەبێت، دەربارەی حەڵاڵی و حەرامی، وە مەرجە بۆ ئەم گومانە کە لە حوکمێك لە حوکمەکانی شەرعەوە پەیدا بووبێت، ئەمەش بەدی دێت بە بوونی بەڵگەیەکی شەرعی کە نەفی حەرامی بکات، وە ئیعتیبار بە گومانی بکەرە کە نیە، کەوابێ یەکسانە کە بکەر باوەڕی بەحەڵاڵی ببێت، یا حەرامییەکە بزانێ، چونکە گومانەکە بە بەڵگەی شەرعی چەسپاوە نەك بە زانین و نەزانین.

کێ سزاکە بەجێ دێنێ؟ :

زانایان لەسەر ئەوە ڕێك کەوتوون کە ئەبێت حاکم یا جێگیرەکەی ئەو کارە بکەن، وە کەس بۆی نیە لەخۆیەوە ئەو کارە بکات. طەحاوی لەموسلیمی کوڕی یەسارەوە ئەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: پیاوێکی صەحابی ئەی ووت: (زەکات و تۆڵەو بەش کردنی ماڵی تاڵانی جەنگی و نوێژی هەینی ئەبێ سوڵتان بیکات)

طەحاوی فەرموویەتی: نازانین کەسێك هەبێت لە صەحابە پێچەوانەی ئەوە بوو بێت[1].

بەیهەقی ئەگێڕێتەوە لەخاریجەی کوڕی زەیدەوە لەباوکییەوە، وە هەروەها لە ئەبی زەنادەوە تەخریجی کردووە لەباوکییەوە لەو زانایانەوە کە کۆتایی بۆ لای قسەی ئەمان دەبێ لەمەدینەدا کە هەموویان ووتوویانە: (نابێت کەس تۆڵە بەجێ بهێنێ بەبێ سوڵتان نەبێت، مەگەر ئەو کەسە تۆڵە لە عەبدەکەی یا کەنیزەکەکەی بسێنێ کە زینایان کردبێ

(١) بەڵام ئیبنو حەزم ئەڵێت: دوانزە صەحابی پێچەوانەی ئەوەن).

وە كۆمەڵێ لە پێشینان بۆ ئەوە چوون، لەوانە شافیعی، كە گەورە ئەتوانی سزای بەندەكەی خۆی بدات، وە بەڵگەیشیان ئەوەیە كەلە عەلیەوە خوای لێ ڕازی بێت ئەگێڕنەوە كە كارەكەرێكی پێغەمبەر شتێكی لێ ڕوودا، پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێ كردم سزای بدەم، منیش بۆی چووم سەیرم كرد بێنوێژە هاتمەوە بە پێغەمبەرم ووت: فەرمووی: (إذا جفت من دمها فأقم عليها الحد، أقيموا الحدود على ما ملكت أيمانكم) رواه أحمد وأبوداود، ومسلم، و البيهقي، والحاكم[1].

واتە: كە خوێنی گیرساوە تۆڵەی لێ بستێنە، تۆڵە لەوكەسانە بسێنن كەبەندەو كەنیزەكتانن، ئەبوحەنیفە ووتوویەتی: گەورەكە ئەبێ كێشەكە بەرزبكاتەوە بۆلای سوڵتان خۆی تۆڵەی لێ ئەسێنێ.

**داپۆشینی تاوان شەرعی‌یە :**

جاری وائەبێت كە داپۆشینی تاوانباران چارەسەرێكی سەركەوتوانەیە، بۆ ئەو كەسانەی تووشی كردنی تاوان و گوناە ئەبن، چونكە جاری وا ئەبێت كەتاوانەكەیان كرد پەشیمان ئەبنەوە و تەوبەی نەصوح ئەكەن و دەست بە ژیانێكی پاك و خاوێن ئەكەن.

لەبەر ئەوە ئیسلام داپۆشینی داناوە لەسەر ئەو تاوانبارانەی تووشی تاوان ئەبن،وە پەلە نەكردن لە دەرخستنی كارەكەیان، لە سەعیدی كوڕی موسەییبەوە كە ووتویەتی: پێم گەیشتووە كە پێغەمبەر ﷺ بە پیاوێكی بەنی ئەسلەمی فەرمووە كە پێ‌یان ئەوت هەززال، كە هاتبووە لای شكاتی لەپیاوێك ئەكرد زینای كردبوو، ئەوەش پێش ئەوەی ئایەتی: ﴿وَالَّذِينَ يَرْمُونَ الْمُحْصَنَاتِ ثُمَّ لَمْ يَأْتُوا بِأَرْبَعَةِ شُهَدَاءَ فَاجْلِدُوهُمْ ثَمَانِينَ جَلْدَةً﴾ (النور:٤) بێتە خوارەوە.

(يا هزال لو سترته بردائك كان خيراً لك)[2].

واتە: ئەی هەززال ئەگەر بەكراسەكەت دات پۆشیایەو دەرت نەخستایە بۆ تۆ چاكتر بوو.

یەحیایی كوڕی سەعید ووتویەتی: ئەم حەدیسەم لە كۆڕێكدا ئەگێڕایەوە كە یەزیدی كوڕی نوعەیمی كوڕی هەززالی ئەسلەمی تێدا بوو، یەزید ووتی: هەززال باپیرەمەو ئەو حەدیسەش هەقە.

وە ئیبنو ماجە لە ئیبنو عەبباسەوە ئەگێڕێتەوە خوا لێی ڕازی بێت كە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (من ستر عورة أخيه المسلم ستر الله عورته يوم القيامة، ومن كشف عورة أخيه كشف الله عورته حتى يفضحه في بيته)[1].

---

(١) أحمد (١/٩٥) ومسلم (١٧٠٥/٣٤) وأبوداود (٤٤٧٣) والبيهقي (٨/٢٢٩) والحاكم (٤/٣٦٩).

(٢) أبوداود (٤٣٧٧و٤٣٧٨) ومالك في (الموطأ ١٦٤٠).

واتە: هەرکەس عەیبی برایەکی موسڵمانی داپۆشی خوا لە ڕۆژی قیامەتدا عەیبی دائەپۆشێ، وە هەرکەس عەیبی برایەکی موسڵمانی بڵاوکردەوە، خوا عەیبی دەر ئەخاو لەماڵەکەی خۆیدا ئابڕوی ئەبات.

وە ئەگەر داپۆشینی ئاوا شتێکی پەسەند بێت، ئەبێ شایەتی دانیشی پێچەوانەی (أولى) چاکتر بێت کە سەرچاوەکەی کەراهەتی تەنزیهە، چونکە شایەتی دان لە پلەی مەندوبدایە لەلایەن کردنەوە، وە کەراهەتی تەنزیهە، لەلایەنی وازهێنانەوە، ئەوەش بە نیسبەت کەسێکەوە ئاوایە کە خوی نەگرتبێ بە زیناوەو ڕیسوا نەبوبێ پێی، بەڵام ئەگەر حاڵەتەکە گەیشتبوە بڵاو بوونەوەو ڕیسوا بوونی، ئەوکاتە پێویستە شایەتی دانەکە باشتر بێت لە شایەتی نەدانەکە، چونکە ئەوەی یاسادانەری ئیسلام مەبەستییەتی چۆڵ کردنی زەوی‌یە لە تاوان و داوێن پیسی، ئەوەش بە تۆبەو پەشیمان بوونەوەی تاوانباران و سزادانیان بەجێ دێت، جا کاتێك حاڵەتی چاوچنۆکی لە زیناداو گوێ نەدان پێ‌و بڵاو بوونەوەی دەرکەوت، ئیتر ئەو چۆڵ کردنی زەوی‌یە کە مەبەستە بە هۆی تۆبەوە ئیحتیمالێکە نەبوونەکەی دەرکەوتوە، جا هەرکەس ئەو حاڵەتەی هەبێ ئەوە پێویستە هۆیەکەی تریان جێ‌بەجێ بێت بۆ چۆڵ کردنەکە، کە ئەویش سزادانە،

بە پێچەوانەی کەسێکەوە کە جارێك یا چەند جار زینا بکات‌و لە ترسا خۆی بشارێتەوەو پەشیمان بێتەوە، لەم حاڵەتەدا پەسەندە شاهید داپۆشێ.

### موسوڵمان ئەبێ گوناهی خۆی داپۆشێ:

بەڵکو پێویستە لەسەر موسڵمان خۆشی کە خۆی داپۆشی و ئابڕوی خۆی نەبا بە باس کردنی ئەو تاوانەی کە ئەیکات، یان دان پێدانانی لای حاکم بۆ ئەوەی سزای بدات لەسەری.

ئیمامی مالیك لە (الموطأ) دا ئەگێڕێتەوە لە زەیدی کوڕی ئەسلەمەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (یا أیها الناس، قد آن لکم أن تنتهوا عن حدود الله من أصاب شیئاً من هذه القاذورات فلیستتر بستر الله، فإنه من یُبْدِ لنا صفحته، نُقِم علیه کتاب الله).

واتە: ئەی خەڵکینە: ئێستا کاتی ئەوە هاتووە، واز لەحەددەکانی خوا بهێنن . . هەرکەس تووشی شتێك بوو لەو شتە پیسانە، با خۆی بە پەردەی خوا داپۆشێ، چونکە هەرکەس ڕاستی خۆی دەرخات بۆمان بەپێی کتێبی خوا تۆڵەی لێ ئەسێنن.

---

(١) ابن ماجه (٢٥٤٦).

**تۆڵە ئەبێتە بریتی و کەفارەت بۆ تاوانەکان :**

بەشی زۆری زانایان ڕایان وایە کە تۆڵە لە یەکێك سەندرا ئەبێتە بریتی و کەفارەتی ئەو تاوانەی کە کردوویەتی، وە لە ڕۆژی دوایىدا لە سەری سزا نادرێ، بە پێی ئەوەی بوخاری و موسلیم گێڕاویانەتەوە لە عوبادەی کوڕی صامیتەوە کە ووتوویەتی: لەکۆڕێکدا لەخزمەتی پێغەمبەردا ﷺ دانیشتبووین فەرمووی: (تبايعوني على أن لاتشركوا بالله شيئاً، ولاتزنوا، ولاتسرقوا، ولاتقتلوا النفس التي حرم الله إلا بالحق فمن وفى منكم فأجره على الله، ومن أصاب شيئاً من ذلك فعوقب به فهو كفارة له. ومن أصاب شيئاً من ذلك فستره الله عليه، فأمره إلى الله إن شاء عفا عنه و إن شاء عذبه)[1].

واتە: موبایعەم بکەن لەسەر ئەوەی کە هیچ شتێك نەکەنە هاوبەش بۆ خوا و زینا و دزی نەکەن و کەسێك نەکوژن کە خوا حەرامی کردبێ مەگەر بەهەق، جا هەرکەس پەیمانەکەی بردە سەر ئەوە پاداشی لەسەر خوایە، وە هەرکەس تاوانێکی کرد لەو تاوانانە و لەپاشان سزا درا لەسەری ئەوە ئەو سزایە ئەبێتە بریتی تاوانەکە، وە هەرکەس تاوانێکی کرد لەو تاوانانە و خوا دایپۆشی بۆی، ئەوە کاری بەدەست خوایە، ئارەزو بکات لێی خۆش ئەبێت و ئارەزو بکات سزای ئەدات،

وە بەجێهێنانی تۆڵە هەرچەندە بریتییە بۆ تاوانەکان لەگەڵ ئەوەشدا هەڕەشەیە بۆ ئەوەی کەس نەوێرێ کاری وەها بکات کەواتە بریتی و هەڕەشەیە بەیەکەوە.

**بەجێهێنانی تۆڵە لەزەوی جەنگدا (دار الحرب):**

کۆمەڵێ لە زانایان بۆ ئەوە چوون کە تۆڵە لە زەوی جەنگدا بەجێ ئەهێنرێ وەك چۆن لە زەوی ئیسلامدا بەجێ ئەهێنرێ بێ جیاوازی، چونکە فەرمان بە بەجێهێنانی فەرمانی گشتییە، تایبەت نییە بە جێگایەك جگە لەجێگایەکی‌تر.

وە ئەو زانایانەی بۆ ئەوە چوون

مالیك و لەیسی کوڕی سەعدە و ئەبوحەنیفە و جگە لە ئەبوحەنیفە ووتوویانە: ئەگەر سەرلەشکرێك زەویەکی بێ باوەڕانی داگیر کرد، نابێت لەو سەربازگەیەدا تۆڵە لەسەر هیچ کام لە سەربازەکان بەجێ بهێنێت، مەگەر لەبەردەم میسر یا شام یا عێراقا بێت، لەو کاتەدا تۆڵە لەناو سەربازگەکەیدا جێبەجێ ئەکات،

---

(١) البخاري (٤٨٩٣) ومسلم (١٧٠٩).

بەڵگەی ئەمانەش ئەوەیە کە تۆڵەسەندن لەو شوێنەدا پاڵ بە سزادراوەکەوە ئەنێت کە ڕابکات بۆ وڵاتی بێ باوەڕان، وە ئەو ڕایە لەپێشە، چونکە ئەوە حەددێکە لە حەددەکانی خوا، کە قەدەغە کراوە لەکاتی جەنگدا جێ بەجێ بکرێت، لە ترسی ئەوەی شتێ ڕوو بدات کە لەو خراپتر بێت. وە ئەحمەد و ئیسحاقی کوڕی ڕاهەویە و ئەوزاعی و گەلێکیتر لە زانایانی ئیسلام دانیان بەوەدا ناوە کەنابێت لەزەوی دوشمندا تۆڵە جێ بەجێ بکرێ، وە ئیجماعی صەحابەشی لە سەرە، وە ئەبو میحجەنی ثەقەفی خوا لێی ڕازی بێت خۆی پێ ڕاگیر نەئەکرا لە خواردنەوەی عارەق، وە لەجەنگی قادسیەدا خواردی‌یەوە، سەرکردەی سوپاکە، کەسەعدی کوڕی ئەبی وەققاص بوو بەندی کردوو فەرمانی پێوەند کردنی‌دا، جا کاتێ هەردوو سوپاکە دایان بەیەکدا ئەم شیعرەی ووت:

کفا حزناً أن تطرد الخيل بالقنا     وأترك مشدوداً عليَّ وثاقيا

ئەوەندە خەفەتە بەسە کە ئەسپەکان بە نیزەوە ڕاو بنرێن، و منیش بەجێ بهێڵرێم بە بەندکراوی. پاشان بە خێزانەکەی سەعدی ووت: بەرەڵام بکە، پەیمان بێت ئەگەر خوا بەساغی گێڕامی‌یەوە بێمەوەو قاچەکانم بخەمەوە ناو پەیوەندەکەوە، وە ئەگەر کوژراشم ئەوە بەزەیی‌تان پێمدا دێتەوە،

ئەویش کردی‌یەوە، خۆی هەڵدایە سەرپشتی ئەسپێکی سەعد کەناوی (البلقاء) بوو ڕمێکی گرتە دەست و هاتە دەر بۆ جەنگ، بەشێوەیەك جەنگا کە سەعد و سوپاکەی ئیسلامی پێ سەرکەوتوو بوو هەتا وایان ئەزانی فریشتەیە و هاتووە بۆ یارمەتی‌یان، کاتێ دوژمن شکا گەڕایەوە و پێوەندەکانی کردەوە قاچی، خێزانەکەی سەعد بەسەرهاتەکەی بۆ سەعد گێڕاوە، سەعدیش بەرەڵای کرد و سوێندی خوارد سزای نەدات لەبەر خاتری ئەو کارەساتەی بەسەر دوژمنی هێنا کە سوپای موسڵمانانی پێ بەهێز بوو، ئەبو میحجەنیش دوای ئەوە تۆبەی کرد لە عارەق خواردەوە.

جا دواخستنی حەددەکە یا خستنی لەبەر بەرژەوەندی‌یەکی بەهێز بوو، کە خێری زۆرتر بوو بۆ خۆی و بۆ موسوڵمانان وەك لەوەی حەددکە بەجێ بهێنرێ.

**قەدەغە کردنی تۆڵە بەجێهێنان لەمزگەوتدا لەبەر پاراستنی لە پیسبوون:**

ئەبو داود گێڕاویەتی‌یەوە لە حەکیمی کوڕی حیزامەوە خوا لێی ڕازی بێت کە ووتوویەتی: (پێغەمبەر ﷺ نەی ئەهێشت لە مزگەوتدا کەس بکوژرێتەوە و هۆنراوەی تێدا بووترێ و تۆڵەی تێدا بەجێ بێ)[1].

---

(١) أبوداود (٤٤٩٠).

**ئایا قازی بۆی هەیە بە زانستی خۆی حوکم بدات:**

ظاهیری‌یەکان ڕایان وایە کەلەسەر قازی فەرزە بە زانستی خۆی حوکم بدات لەخوێن و تۆڵە و سامان و زینا و سزادا، جا پێش ئەوەی ببێتە قازی زانیبێتی یا پاش ئەوە یەکسانە، وە ئەو حوکمەی بە زانستی قازی بێت بەهێزترە، چونکە ئەو جۆرە حوکمانە بەڕاستی و دڵنیابوونە لێی. پاشان بە ئیعتیراف کردنی تاوانبار، پاشان بە شایەت، چونکە خوای گەورە ئەفەرمووێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا كُونُوا قَوَّامِينَ بِالْقِسْطِ شُهَدَاءَ لِلَّهِ﴾ (النساء:١٣٥).

واتە ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە لەسەر دادپەروەری پایەداربن و لەبەر ڕەزامەندی خوا شایەتی بدەن.

وە بەپێی فەرمودەی پێغەمبەر ﷺ (من رأى منكم منكراً فليغيره بيده، فإن لم يستطع فبلسانه...الخ)[1]

واتە: هەرکەس لە ئێوە کارێکی خراپی بینی با بە دەستی بیگۆڕێ، ئەگەر نەیتوانی بەزمان ...) تا دوایی فەرموودەکە.

کەواتە بە صەحیحی هاتووە کە قازی ئەبێ عەدالەت جێ بەجێ بکات، وە ئەوە عەدالەت نی‌یە کە واز لە ستەمکار بهێنێ لەسەر ستەمەکەی‌و نەیگۆڕێ، وە بە صەحیحی هاتووە کە لەسەر قازی فەرزە هەر خراپەکاری‌یەك کە زانیویەتی بیگۆڕێ بە دەستی خۆی، وە هەرخاوەن مافێك مافی خۆی بداتی، ئەگینا ئەویش ستەمکارە.

بەڵام جەماوەری زانایان ڕایان وایە کە بۆ قازی نی‌یە بە زانین و ئاگاداری خۆی حوکم بکات، ئەبوبەکر خوا لێی ڕازی بێت فەرموویەتی: (لو رأيت رجلاً على حد لم أحده حتى تقوم البينة عندي) واتە: ئەگەر پیاوێکم بینی لەسەر تاوانێك بوو کە شیاوی تۆڵەیە تۆڵەی لێ ناسەنم هەتا شایەتێك شایەتی نەدا لە سەری لای من،

چونکە قازی هەر وەك کەسانی تر وایەو دروست نی‌یە ئەو شتەی ئەیبینی بێ لێت هەتا بەتەواوی بۆی ڕوون نەبێتەوە، بە بەڵگە و شاهید. وە ئەگەر قازی‌یەك تاوانی زیناکردنی دایە پاڵ کەسێك بەوە کە خۆی چاوی لێ‌بوو بەڵام بەڵگەی تەواوی نەبوو لەسەر ئەو کارە، ئەوە بە (قاذف) تۆمەت چی ئەژمێرێ و ئەبێ تۆڵەی لێ بسەندرێ جا کاتێك لەسەر قازی حەرام کرابێت ئەوەی ئەیزانێت بیلێت، ئەوە کار پێ‌کردنی لەپێشترە کە حەرام بێت، بنەمای ئەم ڕایەش فەرموودەی خوای گەورەیە

(١) أحمد (٣/١٠) ومسلم (٤٩/٧٨) وأبوداود (١١٤٠) وابن ماجة (١٢٧٥).

کە فەرموویەتی: ﴿فَإِذْ لَمْ يَأْتُوا بِالشُّهَدَاءِ فَأُولَئِكَ عِنْدَ اللَّهِ هُمُ الْكَاذِبُونَ﴾ (النور:١٣) واتە: جا کاتێك شایەتیان نەهێنا وە لەسەر قسەکەیان ئەوانە لای خوا خۆیان درۆزنن.

## ئارەق (الخمر)

### پلە پلە حرام بوونی ئارەق:

خەڵکی ئارەقیان ئەخواردەوە، هەتا ئەوکاتەی پێغەمبەر ﷺ کۆچی کرد لە مەککەوە بۆ مەدینە، پرسیار لەلایەن موسڵمانانەوە زۆر بوو، دەربارەی ئارەق و قومار کاتێ زیان و خراپەی ئەو دووانەیان بۆ دەرکەوتبوو، جا خوای گەورە ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە: ﴿يَسْأَلُونَكَ عَنِ الْخَمْرِ وَالْمَيْسِرِ قُلْ فِيهِمَا إِثْمٌ كَبِيرٌ وَمَنَافِعُ لِلنَّاسِ وَإِثْمُهُمَا أَكْبَرُ مِنْ نَفْعِهِمَا﴾ (البقرة:٢١٩).

واتە: پرسیارت لێ ئەکەن دەربارەی حوکمی ئارەق و قومار، تۆش پێیان بڵێ زیان و گوناهی گەورەیان تێدایە و هەندێ سوودی هەیە بۆ خەڵك، بەڵام گوناهەکەیان گەورەترە لە سوودەکەیان. واتە لەکردنی ئەو دووانەدا گوناهێکی گەورە هەیە چونکە زیانی ماددی و ئاینییان تێدایە. وە چەند سوودیشیان تێدایە. کە سوودەکان ماددین. ئەویش قازانج کردنە بەهۆی بازرگانی کردن بە ئارەقەوە، وە بەدەست هێنانی سامانە بەبێ ماندوو بوون بەهۆی قومارەوە.

لەگەڵ ئەمەشدا تای تەرازووی خراپەکەیان قورسترە لەو سودانەی کە تێیاندایە، وە ئەمەش پارسەنگ دانەوەیە بۆ لایەنی حەرامی نەك بە تەواوی حەرام کردن. لەپاش ئەوە حەرام بوون هاتە خوارەوە لەکاتی نوێژدا، بە شێوەیەکی شێنەیی بۆ ئەو کەسانەی کە خویان پێوە گرتبوو وە دایان نابوو بە بەشێك لە ژیانیان. خوای گەورە ئەفەرمووێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لا تَقْرَبُوا الصَّلاةَ وَأَنْتُمْ سُكَارَى حَتَّى تَعْلَمُوا مَا تَقُولُونَ﴾ (النساء:٤٣).

واتە: ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە بەسەر خۆشی نزیکی نوێژ مەکەون، بۆ ئەوەی بزانن لەنوێژەکەدا چی ئەڵێن.

وە هۆی هاتنەخوارەوەی ئەم ئایەتەش ئەوە بووە کە پیاوێك نوێژی کردووە بەسەرخۆشی ﴿قُلْ يَا أَيُّهَا الْكَافِرُونَ﴾ ی بەم شێوەیە خوێندۆتەوە: (قُلْ يَا أَيُّهَا الْكَافِرُونَ أعبد ماتعبدون...) هەتا کۆتایی سورەتەکە - بێ ئەوەی (لا)ی (نافیەکان) بڵێ لەکاتی خوێندنەوەدا - وە ئەمەش پێشەکیەك بووە بۆ حەرام کردنی بەتەواوی،

لەپاش ئەمانە حوکمی خوا هاتە خوارەوە بە حەرام کردنی بە تەواوی. کە ئەفەرمووێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِنَّمَا الْخَمْرُ وَالْمَيْسِرُ وَالْأَنْصَابُ وَالْأَزْلامُ رِجْسٌ مِنْ عَمَلِ الشَّيْطَانِ فَاجْتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ، إِنَّمَا يُرِيدُ الشَّيْطَانُ أَنْ يُوقِعَ بَيْنَكُمُ الْعَدَاوَةَ وَالْبَغْضَاءَ فِي الْخَمْرِ وَالْمَيْسِرِ وَيَصُدَّكُمْ عَنْ

ذِكْرِ اللَّهِ وَعَنِ الصَّلاَةِ فَهَلْ أَنْتُمْ مُنْتَهُونَ﴾ (المائدة:٩١).

واتە: ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە بەڕاستی ئارەق خواردن و قومار کردن و بت پەرستن و فاڵ گرتنەوە، ئەوانە هەمووی گوناه و شتێکی پیسن و لە جوان کردنی شەیتانن، جا لێیان دوورکەونەوە بە هیوای ئەوەی سەرکەوتووبن بە بەهەشت، بەڕاستی شەیتان ئەیەوێ بەهۆی عارەق و قومارەوە دوژمنایەتی و ڕق و کینە بخاتە نێوانتان، وە لەیادی خوا دوورتان بخاتەوە وە هەروەها لە نوێژکردن، جا ئایا ئێوە دووای ئەمانە وازیان لێ ناهێنن.

لەم ئایەتەدا ئاشکرایە کە خوای گەورە قومار و بتپەرستی و فاڵ گرتنەوەی عەطف کردۆتەوە بۆ سەر عارەق، وە بەسەر هەموویاندا ئەم حوکمانەی داوە:

١- رجس: واتە چەپەڵ و پیسە و لەلای خاوەنانی عەقڵ بێزلێ کراوە.

٢- لەکردەوەی شەیتانە وە لە ڕازاندنەوەو بیری خراپییەتی.

٣- جا کاتێ بەو شێوەیە بێت واجبە دووری لێ بکرێ بۆ ئەوەی ئادەمیزاد ئامادەبێ بۆ ڕزگار بوون و سەرکەوتن.

٤- ویستی شەیتان بە جوانکردی بۆ خواردنەوەی عارەق و قومار کردن بۆ ئەوەیە کە ئادەمیزاد بکەوێتە ناو دووژمنایەتی و کینە و ڕقەوە لەگەڵ کەسانی تردا، ئەمەش فەساد و خراپەیەکی دنیایییە.

٥- هەروەها ویستی شەیتان بۆ خواردنەوەی عارەق و قومار بۆ ڕێگرتنە لە یادی خواو بێ ئاگاکردنە لە نوێژ، ئەمەش خراپەیەکی تری ئایینییە.

٦- هەموو ئەوانە وا پێویست ئەکا کەئادەمیزاد دەست بەرداری ئەم شتە پیسانە بێت.

وە ئەم ئایەتە دووا ئایەت بووە کە هاتۆتە خوارەوە دەربارەی حوکمی ئارەق، کە فەرمان ئەکات بە حەرام کردنی بە شێوەیەکی قەطعي و براوە. وە عەبدی کوڕی حومەید لە عەطاء ەوە تەخریجی کردووە کە وتوویەتی: یەکەم شت کە هاتە خوارەوە دەربارەی حەرام بوونی ئارەق ئایەتی: ﴿يَسْأَلُونَكَ عَنِ الْخَمْرِ وَالْمَيْسِرِ قُلْ فِيهِمَا إِثْمٌ كَبِيرٌ وَمَنَافِعُ لِلنَّاسِ وَإِثْمُهُمَا أَكْبَرُ مِنْ نَفْعِهِمَا﴾ (البقرة:٢١٩).

جا هەندێ کەس وتیان: لەبەر سوودەکەی ئەیخۆینینەوە، وە هەندێکیتر وتیان: شتێك گوناهی تێدا بێت بێ سوودە. لەپاشاندا ئایەتی: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لا تَقْرَبُوا الصَّلاَةَ وَأَنْتُمْ سُكَارَى حَتَّى تَعْلَمُوا مَا تَقُولُونَ﴾ (النساء: ٤٣) هاتە خوارەوە، هەندێ کەس وتیان: ئەی خۆینینەوە و لەماڵەوە دائەنیشین، هەندێکیتر وتیان: خێر لەشتێکدا نییە لەو کە ڕێگربێ لە نێوان ئێمە نوێژ کردن لەگەڵ موسڵماناندا. نیتر ئایەتی: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِنَّمَا الْخَمْرُ وَالْمَيْسِرُ وَالْأَنْصَابُ وَالْأَزْلاَم

رِجْسٌ مِنْ عَمَلِ الشَّيْطَانِ فَاجْتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ، إِنَّمَا يُرِيدُ الشَّيْطَانُ أَنْ يُوقِعَ بَيْنَكُمُ الْعَدَاوَةَ وَالْبَغْضَاءَ فِي الْخَمْرِ وَالْمَيْسِرِ وَيَصُدَّكُمْ عَنْ ذِكْرِ اللَّهِ وَعَنِ الصَّلَاةِ فَهَلْ أَنْتُمْ مُنْتَهُونَ﴾ (المائدة:٩٠)هاته خوارەوە.

ئیتر لێی قەدەغەکردن، ئەوانیش دەستیان هەڵگرت.

ئەم حەرام کردنەش دووای جەنگی ئەحزاب بووە. لەقەتادەوە ئەگێڕنەوە کە خوا ئارەقی حەرام کرد لە سورەتی مائیدەدا دووای جەنگی ئەحزاب، جەنگی ئەحزابیش ساڵی چوارەم یا پێنجەمی کۆچی بووە

وە ئیبنو ئیسحاق باسی ئەوەی کردووە کەحەرام بوونی عارەق لە جەنگی بەنی نەضیردا بووە کە لە ساڵی چوارەمی کۆچی دا ڕووی داوە لەسەر ڕای بەهێز. دومیاطی لە سیرەکەیدا ووتوویەتی: حەرام بوونی ئارەق لە ساڵی حودەیبیەیدا ساڵی شەشەمی کۆچی بوو.

**توند و تیژی کردنی ئیسلام لەحەرام بوونی عارقدا:**

وە حەرام کردنی ئارەق ڕێك ئەکەوێ لەگەڵ ئامۆژگاری‌یەکانی ئیسلامدا کە مەبەستی بەدی هێنانی ئادەمیزاد و کەسایەتی‌یەکی بەهێزە لەلاشە و دەرون و بیرو هۆشیدا، وەهیچ گومانی تێدا نی‌یە کە ئارەق شەخصی‌یەت لاواز ئەکات و ڕاگرەکانی ناهێڵێ، بە تایبەتی ژیری و عەقڵ، شاعیرێك ئەڵێ:

شربت الخمر حتى ضل عقلي كذلك الخمر تفعل بالعقول

واتە:عارەقم خواردەوە تا عەقڵم لێ‌وون بوو، عارەق هەر ئەوە کاریەتی لەگەڵ عەقڵەکاندا.

جا کاتێ ژیری نەما ئادەمیزاد نەبێتە ئاژەڵێکی دڕەندە، وە ئەوەندە شەڕ و خراپەی لێ ڕوو ئەدات کە سنوری نی‌یە، ئیتر کوشتن و دوشمنایەتی وخراپەو بڵاوبوونەوەی نهێنی‌یەکانی خەڵك و خیانەت کردن بەنیشتیمان وهەموو ئەمانە لە شوێنەوارەکانی عارەق خواردنە.

وە ئەو شەڕانەش ئەگات بە خودی ئادەمیزاد، وە هاوەڵانی و دراوسێ‌یانی، وە بە هەموو ئەو کەسانەی بەختە خراپەکەیان ئەیان باتە نزیکی‌یەوە. لە عەلی‌یەوە خوا لێی ڕازی بێت: کە لەگەڵ حەمزەی مامیدا بووە، دوو وشتری پیری هەبووە ویستویەتی (إذخر) کە ڕووەکێکی بۆن خۆشە- لێیان باربکات لەگەڵ زەڕنگەرێکی جولەکەیەکداو بیفرۆشێتەوە بەزەڕەنگەرەکان بۆ ئەوەی بەنرخەکەی شایی فاطمە ڕەزای خوای لێ بێت پێك بهێنێ - کاتێ ویستی بێ گوێزێتەوە - وە حەمزەی مامی ئارەقی ئەخواردەوە لەگەڵ هەندێ ئەنصاریدا، کەنیزەکێکی لەگەڵدا بوو گۆرانی بۆ

ئەوت، كەنیزەكەكە هۆنراوەیەكی ووت كە بەو هۆنراوەیە هانی حەمزەی دا[1] كە هەردوو ووشترەكەوە سەربڕێ و لەجگەرەكانیان بخوات، حەمزە جۆشاو بەرزاییەكەی سەر پشتیانی بڕی و جگەرەكانیانی دەرهێنا، كاتێ عەلی ئەوەی بینی لای ناخۆش بوو خۆی پێ نەگیرا و شكاتی لەحەمزەكرد لای پێغەمبەر ﷺ، پێغەمبەر ﷺ چوو بۆ لای حەمزە، عەلی و زەیدی كوڕی حارثەی لەگەڵدا بوو، لێی توڕە بوو، دەستی كرد بەلۆمەكردنی، حەمزەش تەواو سەرخۆش بوو چاوەكانی سورهەڵگەڕابوو. تەماشای پێغەمبەری كرد ﷺ وە بەوو بەوانەی كە لەگەڵیدا بوون ووتی: ئێوە چین؟ مەگەر ئێوە بەرەی باوكم نین پێغەمبەر ﷺ كاتێ زانی سەرخۆشە پاشەوپاش گەڕایەوە خۆی‌و ئەوانەی لەگەڵیبوون چوونە دەرەوە[2].

ئا ئەوەیە ئاكارەكانی عارەق كاتێ یاری بە عەقڵی ئەو كەسانە ئەكات كە ئەیخۆنەوەو هۆشی‌یان لەدەست ئەدات، هەر لەبەر ئەوەیە كە شەرع ناوی ناوە دایكی پیسی‌یەكان. لە عەبدوڵڵای كوڕی عەمرەوە كە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (الخمر أم الخبائث)[3] واتە: ئارەق دایكی شتە پیسەكانە.

وە لە عەبدوڵڵای كوڕی عەمرەوە. كە فەرموویەتی: (عارەق دایكی داوێن پیسی‌یەكانە و گەورەترین گوناهە، هەركەس خواردی‌یەوە واز لەنوێژ دێنێ و سوواری دایكی و پووری ئەبێت) طەبەرانی لە (الكبير)دا لەحەدیثی عبدوڵڵای كوڕی عەمردا گێڕاویەتی‌یەوە[4]. وە لە حەدیثی ئیبنو عەبباس‌دا هاتووە بە لەفزی (هەركەس خواردی‌یەوە سواری دایكی ئەبێت)[5].

پێغەمبەر ﷺ وەك چۆن كردویەتی‌یە دایكی تاوانە پیسەكان، ئاواش تەئكیدی حەرامێتی كردوەو نەفرینی لە ئارەق خۆر و ئەوانەی پەیوەندیان بە عارەقەوە هەیە كردووە، وە بە دەرچوون لە باوەڕی داناوە . لە ئەنەسەوە هاتوە كە پێغەمبەر: ﷺ (لەعارەقدا نەفرینی لەدە كەس كردووە: ئەو كەسەی ئاوەكەی ئەگرێ، ئەو كەسەی داوای گرتنی ئاوەكەی ئەكات، ئەو كەسەی ئەیخواتەوە، ئەو كەسەی هەڵیئەگرێ، ئەو كەسەی بۆی هەڵئەگرن، ئەو كەسەی تێ‌ی ئەكات، ئەو كەسەی ئەیفرۆشێ، ئەو

---

(١) بخاري (٣٠٩١) مسلم (٢/١٩٧٩).

(٢) البخاري (٣٠٩١) ومسلم (٢/١٩٧٩).

(٣) صحيح الجامع (٣٣٤٤) والسلسة الصحيحة (١٨٥٤).

(٤) مجمع الزوائد (٥/٢٧٢).

(٥) مجمع الزوائد (٥/٦٧) وصحيح الجامع (٣٣٤٥).

كەسەی نرخەكەی ئەخوات، ئەو كەسەی ئەیكڕێ، ئەو كەسەی بۆی ئەكڕن). ئیبنو ماجە و(ترمذي) ڕیوایەتی‌یان كردوە وە (ترمذي) وتوویەتی: (حديث غريب)[1]

وە لەئەبی هورەیرەوە كە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (لايزني الزاني حين يزني وهو مؤمن، ولايسرق السارق حين يسرق وهو مؤمن، ولايشرب الخمر حين يشربها وهو مؤمن) رواه أحمد و البخاري ومسلم وأبوداود و الترمذي و النسائي[2].

واتە: زیناكەر كاتێ زینا ئەكات بێ باوەڕە، وە دز كاتێ دزی‌یەكەی ئەكات بێ باوەڕە، وە ئارەق خۆر كاتێ ئارەق ئەخوات بێباوەڕە،

وە سزای ئەوانەی لەم دونیا ئەیخۆنەوە دانراوە بەوەی كە لەو دونیای دیكەدا لێی بێ بەش دەبن، چونكە پەلەیان كردوە بۆ شتێك كە وەختی نەهاتووە، بۆیە سزا ئەدرێن بە بەش بڕان، پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (من شرب الخمر في الدنيا ولم يتب، لم يشربها في الآخرة، وإن دخل الجنة)[3] واتە: هەركەس لەدونیادا عارەق بخواتەوە و تۆبە نەكات هەتا ئەمرێ، لە ڕۆژی دوایی‌دا لێی ناخواتەوە، با بچێتە بەهەشتیشەوە.

حەرام بوونی ئارەق لە ئاینی مەسیحیدا:

وەك چۆن لە ئیسلام دا ئارەق حەرامە لە ئاینی مەسیحیشدا، هەرحەرامە. وە كۆمەڵەی قەدەغەكردنی ئەو شتانەی كە ئادەمیزاد مەست ئەكەن داوای فەتوایان كرد لەكۆمەڵێ لە زانایانی ئاینی مەسیحی لە میسر، ئەوانیش وەڵامیان دایەوە كە ئەمە كورتەكەیەتی:

(بەڕاستی كتێبە ئاسمانی‌یەكان هەموویان فەرمانیان كردوە بە ئادەمیزاد كە دووربكەونەوە لەو شتانەی سەرخۆشكەرن) وە هەروەها سەرۆكی كەنیسەی سوری ئورثوذكسی بەڵگەی هێناوەتەوە لەسەر حەرام كردنی سەرخۆشكەرەكان بە دەقەكانی كتێبی موقەددەس. پاشان ووتویەتی: بەكورتی هەموو ئەو شتانەی سەرخۆش كەرن لەهەموو كتێبە ئاسمانی‌یەكاندا حەرامن، ئیتر ئەو شتە لەترێ دروستكرابێ یا لەشتەكانی تر وەك جۆ و خورما و هەنگوین و سێو و شتی تر وەك یەكە.

(١) الترمذي (١٢٩٥) وابن ماجة (٣٣٨١).

(٢) أحمد (٢/٤٧، ٣٦٧)

(٣) أحمد (٢/٣٦٧، ٤٧٩) والبخاري (٢٤٧٥) ومسلم (٥٧) وأبوداود (٤٦٨٩) والترمذي (٢٦٢٥) والنسائي (٨/٦٤، ٦٥) وابن ماجة (٣٩٣٦).

وە لە شایەتەکانی (العهد الجدید) لەو بارەیەوە قسەی (پولس)ە لە نامەکەیدا کە ناردویەتی بۆ خەڵکی (أفسس) (٨٥): خۆتان سەرخۆش مەکەن بەو عارەقەی کە ئەبێتە هۆی بێ ئابڕوویی و سوکیەتی).

وە هەروەها قەدەغەی کردووە لەتێکەڵی سەرخۆش لە (إکوە: ١١) وە دانی بەوەدا ناوە کە سەرخۆشەکان میراتی فریشتەکانی ئاسمان ناگرن (غلاة: ٢١- إکوە ٦: ٩: ١٠).

**زیانەکانی ئارەق :**

وە گۆڤاری (التمدن الإسلامی) کە بە پێنوسی (دکتور عبدالوهاب خلیل)ە هەموو ئەو زیانە دەرونی و لاشەیی و ڕەوشتی‌یانەی کە لە عارەقدایە وە ئەو شوێنەوارە خراپانەی کە لێی پەیدا ئەبێ لەتاك و کۆمەڵدا کورت کردۆتەوەو وتوویەتی: ئەگەر پرسیارمان بکردایە لە هەموو زانایان ئیتر چ زانایانی ئاینی بێت، یا پزیشکی، یا ڕەوشتی، یا کۆمەلایەتی، یا ئابوری، وە ڕایان وەربگرین دەربارەی بەکار هێنانی سەرخۆشکەرەکان ئەوە وەلامی هەمویان یەك ئەبوو: وەلامێ: کە ئەویش قەدەغە کردنی خۆ خەریك کردنە بەو شتانەوە بە شێوەیەکی قەطعي و بڕاوەیی، چونکە زیانی گەورەو گران ئەبەخشن.

زانایانی ئاینی ئەڵێن: بەڕاستی ئەو شتانە حەرام کراون، وە تەنها لەبەر ئەوەشە کە دایکی هەموو کردەوە ناپەسندو حەرامەکانن. وە زانایانی پزیشکی ئەڵێن: بەڕاستی سەرخۆشکەرەکان لە گەورەترینی مەترسی‌یەکانە کە هەڕەشە لە جۆری ئادەمیزاد ئەکات، نەك تەنها بەوەی ڕاستەوخۆ تووشی‌یان ئەکات لە زیانە ژاراوی‌یەکان و هیچی تر، بەڵکو بە سەرەنجامە نالەبارەکانیشی، چونکە ڕێگا خۆشکەری مەترسی‌یەکە کە زیانی کەمتر نی‌یە لەوانەی تر، ئاگادارین ئەویش نەخۆشی سیلە،

وە ئارەق لاشە سست و لاواز ئەکات و وای لێ ئەکات بەرگری‌و توانای کەمتر بێت بەرامبەر زۆر لە نەخۆشی‌یەکان بە گشتی، وە کار ئەکات لە هەموو ئەندامەکانی لاشەی ئادەمیزاد بەتایبەتی جگەر، وە هەروەها عارەق زوو تێکدەرو لەناوبەرە بۆ کۆئەندامی دەمار. هەر بۆیە بە دوور نازانرێ کە لە گرنگترینی ئەو هۆکارانە بێت کە ئەبن بە هۆی زۆر لە نەخۆشیەکانی دەمار، وە لەگەورەترینی پاڵپێوەنەرەکانە بۆ شێتی‌یەتی و نەگبەتی و تاوانکردن، تەنها بۆ ئەوانە نا کە بەکاری ئەهێنن و بەس، بەڵکو بۆ نەوەکانی دووای ئەوانیشە، کەواتە هۆی بەدبەختی و نەداری و تەنگدەستی‌یە، وە میکرۆبی هەژاری و نەبوونی و سەرشۆڕی‌یە، وە لەناو هیچ کۆمەڵێکدا بلاو

نەبۆتەوە ئیللا لە ناوی بردون: لە ڕوی ماددی و مەعنەوییەوە، وە لە ڕوی لاشەیی‌و ڕوحی‌یەوە، وە لە ڕوی جەستەیی‌و عەقڵی‌یەوە.

وە زانایانی ئەخلاقی ئەڵێن: بۆ ئەوەی ئادەمیزاد پارێزگاری ژیری و گەورەیی و پاکی‌یەتی و شەرەف و پیاوەتی و جوامێری خۆی بکات نابێت شتێك وەربگرێ کە ئەو سیفەتە جوانانەی لەدەست بدات.

وە زانایانی کۆمەڵناسی ئەڵێن: بۆ ئەوەی کۆمەڵی مرۆڤایەتی لەو پەڕی یاسایی و ڕێك و پێکی‌دا بێت پێویستە تێك نەدرێ بە چەند کردەوەیەك کە زیان بەو یاسایە ئەگەیەنێ، ئەو کاتە ئاژاوەو سەر لێشێواوی بڵاوبێتەوە — کە ئەوەش جیایی و پەرتەوازەیی دروست ئەکات — وە ئەو جیایی و پەرتەوازەیی‌یەش دوژمنان سوودی لێ وەرئەگرن.

وە زانایانی ئابوری ئەڵێن: هەموو درهەمێك کەسەرفی بکەین بۆ سودی خۆمان ئەوە هێزە بۆ خۆمان و بۆ نیشتمانمان، وە هەر درهەمێك سەرفی بکەین بۆ ئەوەی زیانمان پێ بگەیەنێ، ئەوە خەسارەتێکە لە خۆمان و نیشتمانمان، ئەی ئەم ملیۆنەها دینارەی کە بەخۆڕایی ئەڕوات لە پێناوی خواردنەوەی سەرخۆشکەران بەهەموو جۆرەکانی‌یەوە کە ئەبێتە هۆی دواکەوتنمان لە ڕووی ماڵی‌و ڕەوشتی و پیاوەتیمانەوە؟!

جا لەسەر ئەو بنەڕەتە ئەبینین کە عەقڵ و هۆش پاڵمان پێوە ئەنێت بۆ دورکەوتنەوە لە خواردنەوەی ئارەق و ئەو شتانەی ئادەمیزاد سەرخۆش ئەکەن، وە ئەگەر حکومەت بیەوێ ڕای زانایانی شارەزاو پسپۆڕ لەو مەودایەدا وەربگرێت ئێمە بەسین بۆ حکومەت بۆ ئەو ماندو بوونە زۆرە لەو ڕێگایەدا، وە وەڵامەکەمان بۆ هێناوەتەوە بێ ئەوەی زەحمەتێك بکێشێ یان فلسێك سەرف بکات، چونکە زانایان هەموو لەسەر زیان بەخشی ئارەق ڕێکن، وە حکومەت لە گەل پێك دێت، گەلیش لە حکومەتەکەی ئەوێ کە زەرەرو زیانی لێ دوور بخاتەوە، چونکە ئەو بەرپرسە بەرامبەر ژێردەستەکانی.

وە بەقەدەغەکردنی عارەق و ئەو شتانەی ژیری و هۆش ئەبەن ئەندامانی کۆمەڵ جەستەی ساغ و بەتوانایان ئەبێت، و خاوەنی ورەی بەهێزو عەقڵی پێگەیشتو ئەبن، وە ئەمەش لە گرنگترین ئەو هۆکارانەیە کە ئاستی تەندروستی و وڵات بەرز ئەکاتەوە، وە هەروەها کۆڵەکەی یەکەمە بۆ بەرزکردنەوەی ئاستی کۆمەڵایەتی و ڕەوشتی و ئابوری، چونکە ماندوبوونی گەلێ لە وەزارەتەکان سوك ئەکات، بەتایبەتی وەزارەتی داد جا ئەوانەی کە زۆر هاتوو چۆ ئەکەن بۆ کۆشکە داگایی‌یەکان

و بۆ زیندانەکان کەم ئەبنەوە، دوای ئەوە زیندانەکان چۆڵ ئەبن‌و ئەبنە چەند شوێنێك سوودی‌یان لێ وەرئەگیرێ بۆ چارەسازی‌یە کۆمەڵایەتی‌یەکان.

ئائەوەیە شارستانی‌یەت و ئاوەدان کردنەوە، وە ئائەوەیە ڕاپەڕین. وە ئائەوەیە هوشیاری و پێشکەوتن. وە ئەوەیە تەرازو بۆ بەرەو پێش چوونی نەتەوەکان. ئائەوەیە هاوبەشی کردن و هاوکاری کردن بە خۆیی و حەقیقەتی.

واتە هەمووومان هاوبەشی و هاوکاری بکەین لەسەر لابردنی زەرەرو زیان. وە دەرگای کارکردنی بە پەلەو جددی بەرهەم هێنەر فراوانە: ﴿وَقُلِ اعْمَلُوا فَسَيَرَى اللَّهُ عَمَلَكُمْ وَرَسُولُهُ وَالْمُؤْمِنُونَ﴾ (التوبة:١٠٥) واتە: وە بڵێ – ئەی محمد – ئێوە کار بکەن، بە زویی خواو پێغەمبەرو باوەڕدارن کارەکانتان ئەبینن. (ووتاری گۆڤارەکە تەواو بوو).

ئەو زیانانەی باسکران سابتی کردووە بەشێوەیەك کە ڕێی گومانکردنی تێدا نەماوە، کە زۆر لەدەوڵەتە پێشکەوتووەکانی وەها لێ کردووە کە دژایەتی خواردنەوەی ئارەق و جگە لەو لەمادەدە سەرخۆشکەرەکانی تر بکەن.

وە لەپێش هەموو ئەو دەوڵەتانەوە کەهەوڵی قەدەغەکردنی ئەو شتانەی داوە ئەمریکا بووە.

لە کتێبی (تنقیحات)ی ئەبو ئەعلای مەودودیدا هاتووە:

حکومەتی ئەمریکا ئارەقی قەدەغە کردووە، وە دوری خستۆتەوە لەووڵاتەکەیدا، و هەموو هۆیەکانی شارستانی هاوچەرخی بەکارهێناوە، لە گۆڤارو محاضرە، و وێنەو سینەما بۆ ناشیرین کردنی خواردنەوەی ئارەق و دەرخستنی زەرەرو زیان و خراپی‌یەکانی.

وە ئەوەی دەوڵەت سەرفی کردووە لە پڕوپاگەندە دژی ئارەق داینەنێن کە لە (٦٠) ملیۆن دۆلار زیاترە، وە ئەو کتێب و پەخشنامانەی کە بڵاوی کردونەوە دژی ئارەق (١٠ بلێۆن) لاپەڕە ئەگرێتەوە، وە ئەو بڕە پارەیەی کە تەحەموولی کردووە لەپێناوی جێ بەجێ کردنی یاسای قەدەغە کردن لەماوەی چواردە ساڵدا لە (٢٥٠ ملیۆن جونەیە) کەمتر نی‌یە، کە (٣٠٠) کەسی تیادا ئیعدام کراوە، وە ٣٣٥ و٥٣٢ کەسی تێدا زیندانی کراوە، وە غەرامە سەندن گەیشتۆتە (١٦) ملیۆن جونەیهە، وە بایی (٤١٤) ملیۆن جونەیە سامان دەستی بەسەردا گیراوە، بەڵام هیچ کام لەمانە سودێکی نەبووە بۆ نەتەوەی ئەمەریکی تەنها ئەوە نەبێت کە حەزو ئارەزویان زۆرتر بوو بۆ عارەق و زیاتر سەرکێش بوون لە خواردنەوەیدا.

هەتا ساڵی (١٩٣٣) حکومەت ناچار بوو ئەو یاسایەی لابردو ئارەقی ڕەوا کردەوە لە وڵاتەکەیدا بە ئازادی. (قسەکەی ئەبوئەعلا تەواو بوو).

بەڕاستی ئەمریکا بەتەواوی نەتوان بوو لەوەی کە عارەق قەدەغە بکات لەگەڵ ئەو هەموو هەوڵ و تێکۆشانە لەسەریەکەی کە دای لە پێناویدا، بەڵام ئەو ئیسلامەی کە نەتەوەکەی لەسەر بناغەی ئاین پەروەردە کردووە، و لەدەروونی ئەندامەکانیدا باوەڕی ڕاستەقینەی چەقاندوە، و ویژدانی زیندوکردۆتەوە بە ئامۆژگاری‌یە باشەکان و پەیڕەوی و چاولێ کردنی جوان، هیچ کام لەوانەی نەکردووە کە باس کرا.

وە ئەوەندەش خۆی ماندو نەکردووە، بەڵام تەنها ووشەیەك بوو کە لە خواوە هات، ئیتر هەموو دەرونەکان وەڵامیان دایەوە بە تەواوی و بە گشتی.

بوخاری و موسلیم لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ئەگێڕنەوە خوا لێی ڕازی بێت کە فەرمویەتی: ئێمە ئارەقمان نەبوو، جگە لە (فضیخ) کە ئێوە وای پێ ئەڵێن[1]، ئەڵێ: من بە پێوە وەستابووم ئەو فەضیخەم ئەدا بە ئەبو طەلحە و بە ئەبو ئەیوب و چەند پیاوێك لە یارەکانی پێغەمبەر ﷺ لە ماڵی خۆمان، لەوکاتەدا پیاوێك هات ووتی: ئایا هەواڵەکەتان پێ گەیشتوە؟ ووتمان: نە، ووتی: ئارەق حەرام کرا، ئینجا ووتی: ئەی ئەنەس ئەو کوپەڵانە بڕێژە، ئەڵێ: ئیتر پرسیاریان لێ نەکردەوەو نەگەڕانەوە سەری دوای هەواڵی پیاوەکە[2]. بەڕاستی باوەڕ ئاوا ئەکات لە خاوەنەکەی.

**ئارەق چییە؟**

ئارەق ئەو شتە ئاوەکی‌یە ناسراوانەیە کە بە ڕێگای هەڵهاتن و ترشان ئامادە ئەکرێ لەهەندێ دانەوێڵە یا میوە، بەگۆڕاندنی ئەو نەشاو شەکرەی کە تیایەتی بە کحول بەهۆی هەندێ گیانەوەری بەچاو نەبینراوەوە کە توانای ڕژاندنی چەند ماددەیەکی تایبەتی هەیە کە بوونیان لە کرداری ترشانەکەدا زۆر پێویستە، وە بۆیە بەزمانی عەرەبی پێی ئەوترێ (الخمر) چونکە ئاوەزی ئادەمیزاد ئەگۆڕێ و دایئەپۆشێ و هەستی تێك ئەدات. ئائەوەیە پێناسە کردنی ئارەق لە ڕووی پزیشکی‌یەوە.

وە هەموو ئەو شتانەی کە هۆش ئەبەن بە ئارەق دائەنرێن، ئیتر ئەوشتەی کە لێی دروست ئەکرێ هیچ حیسابی بۆ ناکرێ، کەواتە هەرچی شتێك هۆش ببات لە هەرجۆرێك بێت بە پێی شەرع ئارەقە، وە حوکمی ئارەق وەرئەگرێ، لە ترێ بێت یالەخورما یا لە هەنگوین یا لە گەنم یا لە جۆ یالە هەر شتێکی تر بێجگە لەمانە یەکسانە، چونکە ئەمانە هەموویان ئارەقن و قەدەغە کراون،

---

(١) کە لە خورما دروستیان ئەکرد بێ ئەوەی ئاگری بەرکەوێ.

(٢) البخاري (٥٥٨٢) ومسلم (١٩٨٠/٤و٥).

لەبەر بوونی زیانی تایبەتی و گشتی، وەلەبەر ئەوەی ئادەمیزاد لە یادی خواو نوێژ دوور ئەخەنەوە، وە لەبەر ئەوەی دوژمنایەتی و ڕق و کینە ئەخەنە نێوان خەڵك.

یاسادانەری ئیسلام جیاوازی ناکات لە نێوان ئەو شتانەی لەیەك ئەچن و جیاوازی ناکات لە نێوان خواردنەوەیەکی هۆشبەر و خواردنەوەیەکی تری هۆشبەر، و کەمێك لە جۆرێکیان حەڵاڵ بکات و کەمێك لەجۆرەکەی تریان حەرام، بەڵکو وەك یەك سەیریان ئەکات، وە ئەگەر کەمی جۆرێکیانی حەرام کردبێ ئەوە کەمی لە جۆرەکەی تریش حەرام کردوە، وە بەڕاستی دەقەکان لەو بارەیەوە ئاشکراو صەحیحن، کە لێکدانەوەو گومان تێ کردن هەڵناگرن:

١-ئەحمەد و ئەبوداود لە ئیبنوعومەرەوە ئەگێڕنەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (کل مسکر خمر، وکل خمر حرام)[١].

واتە: هەموو هۆش بەرێك ئارەقەو هەموو ئارەقێکیش حەرامە.

٢- وە بوخاریو موسلیم ئەگێڕنەوە کە عومەری کوڕی (خطاب) خوا لیێ ڕازی بێت لەسەر دوانگەی پێغەمبەر ﷺ ووتاری ئەداو ئەیفەرموو: (ئەی خەڵکینە: بە ڕاستی حەرام بوونی ئارەق هاتۆتە خوارەوە، کە لە پێنج شت دروست ئەکرێ لە ترێ و خورماو هەنگوین و گەنم و جۆ، ئارەقیش ئەوەیە کە هۆشی ئادەمیزاد بەرێت)[٢].

ئەوەی گەورەی موسڵمانان ووتویەتی قسەیەکی جیاکەرەوەیە، چونکە ئەو زاناتر بووە بەزمانی عەرەبی و شارەزاتر بووە لە یاسای ئیسلام، وە نەقڵ نەکراوە کە هیچ کام لە صەحابە پێچەوانەی ئەو بوویێت لەو قسەیەدا کە وتویەتی.

٣- وە موسلیم لە جابیرەوە ئەگێڕێتەوە: کە پیاوێکی یەمەنی لە پێغەمبەری ﷺ پرسی دەربارەی شەرابێك کەلەیەمەن ئەخورایەوە لە زوڕەت --کابە- و گەنمە شامی دروست ئەکرا، پیێان ئەووت: (المزر) پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (أمسکر هو؟) قال: نعم، فقال ﷺ : (کل مسکر حرام . . إن على الله عهداً لمن یشرب المسکر أن یسقیه من طینة الخبال) قالوا: یارسول الله وما طینة الخبال؟ قال: (عرق أهل النار) أو قال: (عصارة أهل النار)[٣].

---

(١) أحمد (٢/٢٩،٣١) وأبوداود (٣٦٧٩).

(٢) البخاري (٤٦١٩) ومسلم (٣٠٣٢/٣٢،٣٣).

(٣) أحمد (٣/٣٦١) ومسلم (٢٠٠٢/٧٢) والنسائي (٨/٣٢٧).

واتە: (ئایا ئەو شەربەتە هۆشبەرە)؟ ووتی: بەڵێ، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (هەموو هۆش بەرێك حەرامە . . بەڕاستی خوا پەیمانی داوە هەرکەس هۆشبەر بخواتەوە (طینة الخبال)ی دەرخوارد بدات) ووتیان: ئەی نێراوی خوا (طینة الخبال) چییە؟ فەرمووی: (ئارەقی دۆزەخییەکانە) وە لە ڕیوایەتێکی تردا فەرمووی: (گوشراوی دۆزەخییەکانە).

٤- لە سوننەندا هاتووە لە نوعمانی کوڕی بەشیرەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (إن من العنب خمراً، وإن من التمر خمراً، وإن من العسل خمراً، و إن من البُرِّ خمراً، وإن من الشعير خمراً)[١].

واتە: لەترێ ئارەق دروست ئەکرێت، وە لە خورما ئارەق دروست ئەکرێت، وە لە هەنگوین ئارەق دروست ئەکرێتۆ وە لە گەنم ئارەق دروست ئەکرێت، وە لە جۆ ئارەق دروست ئەکرێت.

٥- وە لە عائیشەوە (خوا لێی ڕازی بێت) ووتوویەتی: (کل مسکر حرام، و ما أسکر الفَرَقُ منه فملء الکف منه حرام)[٢]. واتە: هەموو هۆش بەرێك حەرامە، وە هەرچی ئەوەندەی (فرق[٣])ێك لیێ خەڵك سەرخۆش بکات ئەوە پڕ چنگێکیش لیێ هەر حەرامە.

٦- وە ئەحمەد و بوخاری و موسلیم لە ئەبی موسای ئەشعەرییەوە ئەگێڕنەوە کە فەرمویەتی: ووتم ئەی نێرراوی خوا: دوو شەربەت هەبوو لەیەمەن دروستمان ئەکرد (بتع) کە لەهەنگوینە کاتێ هەڵدێ و ئەبێ بە خەمر، وە (مزر) کە لە زوورِات و جۆیە ئەکرێ بە شەراب هەتا هەڵدێ و ئەبێ بە خەمر ئە بوموسا ئەڵێت پێغەمبەر ﷺ قسەی کورت و پڕمانای پێ درابوو فەرمویی: (کل مسکر حرام)[٤]. واتە: هەموو هۆش بەرێك حەرامە.

٧- وە لەعەلییەوە خوا لێی ڕازی بێت کە پێغەمبەر ﷺ (جعة)ی لێ قەدەغە کردبوین (جعة)ش بیرەیە کە لە جۆ دروست ئەکرا. ئەبوداود و نەسائی گێڕاویانەتەوە.

ئەوەش ڕای جومهوری زانایانی فیقهییە لەصەحابەو تابیعی و زانایانی وڵاتانە، وە مەزهەبی ئەهلی فەتوایە، وە هەروەها مەزهەبی موحەممەدە لە هاوەڵانی ئەبیحەنیفە و فەتواش لەسەر ئەوە دراوە.

---

(١) أحمد (٤/٢٦٧) وأبوداود (٣٦٧٧) والترمذي (١٨٧٢) وابن ماجه (٣٣٧٧).

(٢) أحمد (٦/١٣١) وأبوداود (٣٦٨٧) والترمذي (١٨٦٦).

(٣) (فَرَق): پێوانەیەکە ١٦ ڕیتڵ ئەگرێت.

(٤) أحمد (٤/٤٠٢) والبخاري (٤٣٤٣) ومسلم (١٧٣٣/٧٠).

وە کەسیش جیاواز نەبووە لەمانەدا جگە لە فوقەهاکانی عێراق و ئیبراهیمی نەخەعیو سوفیانی ثەوری و ئیبنوئەبی لەیلا و شورەیك و ئیبنوشیبرمە و هەموو فوقەهاکانی کوفە، وە بەشی زۆری زانایانی بەصرە و ئەبی حەنیفە، چونکە ئەمان وتوویانە: کەم و زۆری ئەو ئارەقە حەرامە کەلە ترێ دروست ئەکرێ. بەڵام ئەو ئارەقەی کە لەشتی تر دروست ئەکرێ ئەوەندەی حەرامە کە ئادەمیزادی پێ سەرخۆش بێت، بەڵام کەمێك کە ئادەمیزاد پێی سەرخۆش نەبێت حەلاڵە، ئەو رایەش بەتەواوی پێچەوانەی ئەو بەڵگانەیە کە لە پێشەوە باس کرا.

وە لە ئەمانەتی عیلمی‌یە کە باسی بەڵگەکانی ئەو زانایانە بکەین، وا بە کورتی ئەوەی ئیبنوڕوشد لە (بداية المجتهد) دا ووتوویەتی ئەیهێنین: جەماوەری فوقەهای حیجاز و جەماوەری زانایانی حەدیث ووتوویانە: کەم و زۆر لەو شتانەی کە هۆش ئەبەن حەرامە.

وە عێراقی‌یەکانو ئیبراهیمی نەخەعی لەتابیعی‌یەکان، وە سوفیانی ثەوری و ئیبنوئەبی لەیلاو شورەیك و ئیبنوشیبرمە و ئەبوحەنیفە و هەموو فوقەهای کوفەو بەشی زۆری زانا بەصری‌یەکان ووتوویانە: ئەوەی حەرامە لە شەرابە هۆش بەرکاندا تەنها هۆش بردنەکەیە، نەك شەرابەکە خۆی. وە هۆی جیاوازی زانایان بەرەنگار بوونەوەی فەرموودەکان و قیاسەکانن لەم بەشەدا. حیجازی‌یەکان بۆ سەلماندنی بۆ چوونەکەیان دوو ڕێگایان هەیە:

(ڕێگای یەکەم): ئەو ئەثەرو فەرمودانەی لەم بارەیەوە هاتوون.

(ڕێگای دووەم): ناو نانی هەموو شەرابەکان بە (خمر).

لە بەناوبانگترین ئەو ئەثەرانە کە حیجازی‌یەکان دەستیان پێوە گرتووە، ئەوەیە کە مالیك گێڕاویەتی‌یەوە لە ئیبنوشیهابەوە لە ئەبی سەلەمەی کوڕی عبد الرحمنەوە لە عائیشەوە فەرمویەتی: لە پێغەمبەریان پرسی لەبارەی شەرابی (بتع) و (نبیذ)ی هەنگوین؟ فەرمووی ﷺ : (كل شراب أسكر فهو حرام) واتە: هەموو خواردنەوەیەك هۆش بەرێت و سەرخۆش بکا ئەوە حەرامە. بوخاری تەخریجی کردووە.

وە یەحیای کوڕی مەعین ووتوویەتی ئەم فەرموودەیە ڕاسترین فەرموودەیە کە لە پێغەمبەرەوە گێڕرابێتەوە دەربارەی حەرامی هۆشبەر[1].

---

(١) أحمد (٦/٩٦و٩٧) والبخاري (٥٥٨٥) ومسلم (٢٠٠/٦٧).

وە هەر لە عائیشەوە کە موسلیم تەخریجی کردووە لە ئیبنوعومەرەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (کل مسکر خمر، وکل خمر حرام)[1]. واتە: هەموو هۆش بەرێك ئارەقەو هەموو ئارەقێکیش حەرامە. ئەمە دوو فەرموودەی صەحیحن:

یەکەمیان هەموویان لەسەری رێك کەوتوون.

بەڵام دووەمیان ئیمامی موسلیم بەتەنیا بە صحیحی داناوە.

وە (ترمذي) و ئەبوداود و نەسائی تەخریجیان کردووە لە جابیری کوڕی عەبدوڵلاوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (ما أسکر کثیره فقلیله حرام)[2] واتە: هەرچی بەهۆی زۆر لێ خواردنەوە ئادەمیزاد پێی سەرخۆش ببێ، کەمەکەشی حەرامە. ئەمەش دەقێکە کە جیاوازی زانایانی لەسەرە.

بەڵام رێگای دووەم لە بەڵگە هێنانەوەکە کە هەموو شەرابەکان پێیان ئەوترێ (خمر) لەم بارەیەشەوە ئەوان – ئەهلی حیجاز - دوو رێگایان هەیە.

یەکەمیان: لە رووی سەلماندنی ناوەکانەوە بە رێگەی دەرهێنان (إشتقاق).

وە دووەمیان: لە رووی بیستنەوە.

ئەوەی لە رووی دەرهێنانەوەیە، ئەوان ووتویانە: ئاشکرایە لای زمانەوانەکان عارەق بۆیە پێی ئەووترێت (خمر) چونکە هۆش ئەبات و مێشك دائەپۆشی، لەبەر ئەوە پێویستە وشەی (خمر) لە لۆغەتا بە هەموو ئەو شتانە بووترێت کە هۆش ئەبەن.

ئەم رێگایە لە سابت کردنی ناوەکاندا جیاوازی هەیە تیایدا لە نێوان ئوصولی یەکاندا، وەلای خوراسانی یەکانیش پەسەند نی یە.

بەڵام رێگەی دووەم کە لە رووی بیستنەوەیە ئەوان ووتویانە: بەڕاستی هەرچەندە بۆ ئێمە سەلێنراو نی یە کە (نبیذ)ەکان لە لۆغەتا پێیان بوترێ سەرخۆشکەر (خمر) ئەوە لە شەرعدا پێیان ئەوترێ (خمر). وە بەڵگەشیان بۆ ئەوە حەدیسەکەی ئیبنوعومەرە کە لە پێشەوە باس کرا، وە هەروەها بەوەی ئەبی هورەیرە گێڕاویەتی یەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (الخمر من هاتین الشجرتین: النخلة و العنبة)[3] واتە: ئارەق لەم دوو درەختەیە: دارخورما و دارمێوە.

---

(١) مسلم (٢٠٠٣/٧٥) والدارقطني (٢٤٩/٤).

(٢) أبوداود (٣٦٨١) والترمذي (١٨٦٥) وابن ماجه (٣٣٩٣).

(٣) أحمد (٢٧٩/٢) ومسلم (١٣/١٩٨٥) وأبوداود (٣٦٧٨) والترمذي (١٨٧٥) وابن ماجة (٣٣٧٨).

وە هەروەها بەوەی ئیبنوعومەر گێڕاویەتی‌یەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (إن من العنب خمراً، و إن من العسل خمراً، ومن الزبيب خمراً، ومن الحنطة خمراً. وأنا أنهاكم عن كل مسكر)[1]. واتە: لە ترێ عارەق دروست ئەکرێ، وە لە هەنگوین ئارەق دروست ئەکرێ، وەلە مێوژ ئارەق دروست ئەکرێ، وە لەگەنم ئارەق دروست ئەکرێ.. وە من هەموو هۆشبەرێکتان لێ قەدەغە ئەکەم).

ئەوانە پاڵپشتی حیجازی‌یەکانە لە حەرام کردنی (نبیذ)ەکاندا، بەڵام کوفی‌یەکان بۆ بۆچونەکەیان ڕواڵەتی ئەم فەرمودەی خوایان بەدەستەوە گرتووە کە ئەفەرموێ: ﴿وَمِنْ ثَمَرَاتِ النَّخِيلِ وَالْأَعْنَابِ تَتَّخِذُونَ مِنْهُ سَكَراً وَرِزْقاً حَسَناً﴾ (النحل:٦٧) واتە: وە لە نیعمەتەکانی ئێمەیە بۆ ئێوە ئەوەی کە وەری لە بەری دار خورماو ترێ، و ئەیکەن بە شەرابی هۆشبەر — ئەمە پێش حەرام بوونی — و خواردنی باش.

وە بەچەند فەرمودەیەك کە لەو بابەدا گێڕاویانەتەوە، هەروەها بە قیاسی مەعنەوی.

جا بەڵگە هێنانەوەیان بە ئایەتەکە ئەوەیە کە ئەڵێن: ووشەی (السُّكر) هۆشبەرە، جا ئەگەر ئەو شتە خوددی خۆی حەرام بوایە خوا بە ڕۆزی چاك ناوی نەئەبرد.

وە ئەو ئەثەرانەی کە پشتیان پێ بەستووە لەم بەشەدا بەناوبانگترینیان لای ئەوان حەدیسەکەی ئەبی عەونی ثەقەفی‌یە، لە عەبدوڵڵای کوڕی شەددادەوە، لە ئیبنوعەبباسەوە، لە پێغەمبەرەوە ﷺ کە فەرمویەتی: (حرمت الخمر لعينها، والسكر من غيرها)[2]. واتە: ئارەق بەهۆی خودی خۆی حەرام کراوە بەڵام جگە لە عارەق ئەوانی تر هۆشبەری‌یەکەیان حەرام کراوە.

ووتویانە: ئەم دەقە بۆچونی تر هەڵناگرێ و نابێ بەشێوەیەکی تر لێك بدرێتەوە، بەڵام حیجازی‌یەکان بە لاوازیان داناوە، چونکە هەندێ لە گێڕەرەوەکانی لە جیاتی (والسكر من غيرها) (والمسكر من غيرها)یان گێڕاوەتەوە.

وە لەو ئەثەرانە حەدیسەکەی شورەیکی کوڕی سەماکی کوڕی حەربە بە ئیسنادی خۆی لە ئەبی بەردەی کوڕی نیارەوە ووتویەتی: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (إني كنت نهيتكم عن الشراب في الأوعية، فاشربوا فيما بدا لكم ولاتَسْكَروا) خرجه الطحاوي[3].

---

(١) أحمد (٤/٢٦٧) وأبوداود (٣٦٧٧) والترمذي (١٨٧٢) وابن ماجه (٣٣٧٩) من حديث النعمان بن بشير.

(٢) والنسائي (٨/٣٢١) وأحمد (٢/٢٥).

(٣) ابن أبي شيبة (٧/٤٦٩،٥١٨).

واتە: من لە پێشەوە خواردنەوەی شەرابی ناو کوپەڵە و مەشکەم لـی قەدەغەکردبون، جا لە هـەر شتێکدا پێتان باشە بیخۆنەوە، بەڵام خۆتان سەرخۆش مەکەن.

وە ئەگێڕنەوە لە ئیبنو مەسعودەوە کە ووتوویەتی: (من وەك ئێوە ئامادەی حەرام بوونی (نبیذ) بووم، لەپاشاندا ئامادەی حەڵاڵ بوونەوەی بووم، بەڵام ئێوە لە بیرتان چۆتەوەو من لە بیرم ماوە.

وە لە ئەبی موساوە کە فەرمویەتی: پێغەمبەر ﷺ من و موعاذی نارد بـۆ یەمـەن، پێمـان ووت ئەی نێرراوی خوا: لەیەمەن دوو جۆر خواردنەوە هەیە کە لەگەنم و جۆ دروستـی ئەکـەن: یـەکێکیان پێی ئەڵێن: (المزر). ئەوی تریان پێی ئەڵێن: (البتع). کامیـان بخۆینـەوە؟ پێغەمبـەر ﷺ فەرمووی: (إشربا ولا تسكرا) أخرجه الطحاوي أيضاً[1].

واتە: لە هەردوکیان بخۆنەوە بەڵام خۆتان سەرخۆش مەکەن.

جگە لەوانە چەند ئەثەرێکی تریـان باسـکردووە لـەو بـارەوە. بـەڵام بەڵگـە هێنانـەوەیان لـەڕووی (نظر) تێ‌ڕوانین و بیر کردنەوەوە ئەوەیە کە دەڵێن: قورئـان دەری خـستووە کـە هـۆی حـەرام بـوونی ئارەق ئەوەیە کەلە یادی خوایان دوور ئەخاتەوە و دوژمنایەتی و نـاکۆکی ئەخاتـە نێوانیانـەوە، وەك ئەفەرموێ: (إِنَّمَا يُرِيدُ الشَّيْطَانُ أَنْ يُوقِعَ بَيْنَكُمُ الْعَدَاوَةَ وَالْبَغْضَاءَ فِي الْخَمْرِ وَالْمَيْسِرِ وَيَصُدَّكُمْ عَنْ ذِكْرِ اللَّهِ وَعَنِ الصَّلَاةِ )(المائدة:٩١).

ئەو هۆیەش لە ئەندازەیەکدا دروست ئەبێ کە سەرخۆشکەر بێ، نـەك لـە کـەمتر لـەوەدا، کەواتـە پێویستە هەر ئەو ئەندازە حەرام بێت، مەگەر ئەوەی ئیجماعی زانایانی لەسەر بێت کە کەم و زۆری حەرامە.

ووتویانە: وە ئەو جۆرە قیاسە ئەخرێتە پاڵ دەق. هەروەها ئەو جۆرە قیاسەیە کە شـەرع ئاگـاداری ئەکات لەسـەر هـۆی داپۆشـینەکە کـە تیایـەتی. بـەڵام زاناکـانی ئـەم دواییـە لـە ئـەهلی (نظر) ووتویانە:

بەڵگەی حیجازییەکان لە ڕێگەی بیستنەوە بەهێزترە و بەڵگەی عیراقیەکان لە ڕێگـەی قیاسـەوە ئاشکراترە، جا ئەگەر ئەو شتە بەو شێوەیە بێـت کـە ووتوویانـە ئـەوە جیاوازییەکـە ئەگەڕێتـەوە بـۆ بوونی جیاوازییان لەزاڵ کردنی ئەثەر بەسەر قیاسدا، یا زاڵ کردنی قیـاس بەسـەر ئـەثەردا ئەگـەر بەرەنگاری یەك بوونەوە، ئەمـەش کێشەیەکە جیاوازی لەسەر هەیە.

---

(١) شرح مشكل الآثار (٤٩٧٣) والنسائي (٨/٣٠٠) وابن حبان (٥٣٧٧) وابن أبي شيبة (٨/١٠٠).

بەڵام ڕاستی ئەوەیە ئەگەر (أثر) دەقێکی چەسپاو بوو، پێویستە زاڵبکرێ بەسەر پێوانەدا (القياس). بەڵام ئەگەر لەفزەکە ڕواڵەتەکەی بۆچوونی تری هەڵگرت ئەوە لێرەدا بیر کردنەوە تێیدا لە گومانداية:

کە ئایا هەردووکیان بخاتە پاڵ یەك بەوەی لەفزەکە بە شێوەیەك لێکبداتەوە کە لەگەڵ قیاسەکەدا ڕێك بێ؟ یا ڕواڵەتی لەفزەکە زاڵ بکات بەسەر ئەوەدا کە قیاسەکە پێویستی ئەکات؟ ئەمەش ئەگۆڕێ بە پێی بەهێزی لەفزێك لە لەفزە ئاشکراکان، وە بە پێی بەهێزی قیاسێك لەو قیاسانەی کە بەرامبەری ئەوەستێ. وە ئەو جیاوازییە نادۆزرێتەوە بە سروشت و سەلیقەی عەقڵی نەبێت، وەك چۆن قسەی شیعرو پەخشان بە عەقڵ لە قسەی تر جیا ئەکرێتەوە، وە لەوانەشە سەلیقەکان وەك یەك بن تێیدا.. هەر بۆیە جیاوازی لەم جۆرەدا زۆرە، هەتا زۆر لە خەڵکی وتوویانە: (كل مجتهد مصيب) واتە: هەموو (مجتهد) هەوڵ دەرێك ڕاستی پێکاوە لەبۆچوونەکەیدا.

قازی ووتویەتی: ئەوەی بۆم ڕوونە — خواش ئەزانێ- فەرموودەکەی پێغەمبەر ﷺ کە فەرمویەتی: (كل مسكر حرام) هەرچەندە لەوانەیە مەبەستی ئەو ئەندازەیە بێت کە هۆش ئەبات نەك جۆری شەرابەکە، بەڵام ئەوەی دەرئەکەوێ ئەوەیە حەرامی یەکە ببەسترێ بەجۆری شتەکەوە زاڵترە بەسەر گوماندا لەوەی ببەسترێ بە ئەندازەکەوە، چونکە جێگای ئەوەیە ئەو قیاسە بەو شێوەیە کە کوفییەکان لێکیان داوەتەوە بەرەنگاری بێتەوە، چونکە دوورنییە کە یاسادانەر کەمێ سەرخۆشکەریش حەرام بکات لەگەڵ زۆرەکەیدا لەبەر نەهێشتنی بەهانە بۆ کردنەوەی دەرگای حەرام، هەروەها لەبەر تەئکید کردن تێیدا، هەرچەندە زیانەکە هەر لە زۆرەکەدایە.

وە بەڕاستی بە ئیجماع سابت بووە لەچۆنیەتی شەرعەوە کە جنسی ئارەقەکە بەپێی شەرع کە جۆری ئارەقەکە حەرامە نەك چەندێتی، کەواتە پێویستە هەرچی شتێك عیللەتی ئارەقی تێدا بێت بخرێتە پاڵ ئارەق، وە ئەوەی بڵێت جیاوازی هەیە لەسەریەتی بەڵگە بهێنێتەوە.

ئەمەو هەرچەندە ئەوان دان نانێن بە صەحیحی فەرمودەکەی پێغەمبەر ﷺ کە فەرموویەتی: (ما أسكر كثيره فقليله حرام)[1] چونکە ئەگەر دانیان پێدا بنایە نەیان ئەتوانی خۆیانی لێ دەرباز بکەن چونکە دەقێکەو لە شوێنێکدایە کە خیلافی لەسەرە، وە دروست نییە دەقەکان بەقیاسەکان موعارەزەو دژایەتی بکرێن، وە هەروەها شەرع ڕای گەیاندووە کە ئارەق زیان و سوودی هەیە. خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿قُلْ فِيهِمَا إِثْمٌ كَبِيرٌ وَمَنَافِعُ لِلنَّاسِ﴾ (البقرة:٢١٩).

---

(١) أبوداود (٣٦٨١) والترمذي (١٨٦٥) وابن ماجه (٣٣٩٣) من حديث جابر.

وە قیاس وابوو ئەگەر کۆکردنەوە لە نێوان لابردنی زیانەکەو بوونی سوودەکەدا مەبەست بوایە، کە زۆرەکەی حەرام بکرێت و کەمەکەی حەڵاڵ بکرێ.

بەڵام کاتێ شەرع حوکمی زیانەکەی زاڵکرد بەسەر سوودەکەیدا لە ئارەقدا، وە کەمیو زۆری قەدەغەکرد، پێویستە کار بەوشێوەیەش بێت لە هەموو ئەو شتانەدا کە هۆی حەرام بوونی ئارەقی تێدا بێت، مەگەر جیاوازییەکی شەرعی لەوەدا سابت بێت.

وە زانایان رێك کەوتوون کە شەربەت دروستکردن حەڵاڵە ئەگەر گۆڕانی بەسەردا نەهاتبێ بە پێی فەرموودەکەی پێغەمبەر: ﷺ (فانتبذوا، وکل مسکر حرام) واتە: شەربەت دروست بکەنو بزانن هەموو هۆشبەرێك حەرامە.

وە بەپێی ئەوەی سابتە کە پێغەمبەر ﷺ شەربەتیان بۆ دروست ئەکرد، بەڵام رۆژی دووەم و سێیەم ئەی رژاند. لەمەشدا جیاوازی یان هەیە لە دوو کێشەدا.

یەکەمیان: دەربارەی ئەو قاپ و قاپاخانەی شەربەتی تێدا دروست ئەکرێ.

دووەم: لە دروستکردنی شەربەت لە دوو شت بەیەکەوە وەك: خورمای کاڵ و گەیو، یاخورما و مێوژ -قسەکەی قازی تەواو بوو-.

**گرنگترین جۆرەکانی ئارەق:**

ئارەق بەچەند ناوێکی جیاجیا لەبازاڕەکاندا هەیە، وە ئەکرێت بەچەند بەشەوە بە پێی بوونی رێژەی سەدی کحول تێیدا. بۆ نمونە: براندی و، ویسکیو، رومو، لیکیرو جگە لەوانە، وە رێژەی کوحول تێیاندا ئەگاتە ٤٠٪ لەسەدا چل هەتا ٦٠٪ لەسەدا شەست. بەڵام رێژەکە لە جن، و هولاندی، و جنیفادا ئەگاتە ٣٣٪ هەتا ٤٠٪ . وەهەندێ جۆری تری وەك: بورتو، شری و، مادیرا. رێژەی کوحول تیایاندا ١٥٪ هەتا ٢٥٪ . وە عارەقە سووکەکان وەك کلارت و، هۆك و، شیمانیاو، برجاندی، رێژەی کوحول تیایاندا ١٠٪ هەتا ١٥٪ . وە جۆری بیرەی سوك لە ٢ هەتا ٩٪ کوحولی تێدایە وەك: ئیل و، بورترو ئیستوت و میونغ و شتی تر، وە گەلێك جۆری تری هەیە کە هەر ئەو رێژەیەی دوایی کوحولی تێدایە وەك (بوظە و، قەصەب کە بووبێت بە خەمرو گەلێکیتر.

**خواردنەوەی شەربەت پێش گۆڕانی و بوونی بەخەمر:**

دروستە خواردنەوەی شەرابێك کە نەگۆڕابێت بە پێی حەدیسەکەی ئەبی هورەیرە لای ئەبیداود و نسائی و ئیبنوماجە ووتوویەتی: کاتێ زانیم پێغەمبەر ﷺ بە رۆژوو بۆکاتی بەربانگی شەربەتێکم بۆ برد کەلە (دباء) کە دووا دروستم کردبوو، کاتێ بۆم هێنا سەیرم کرد بلقی هەڵئەدا فەرمووی:

(إضرب بهذا الحائط، فإن هذا شراب من لايؤمن بالله و اليوم الآخر)[1]. واتە: بیدە بەو دیوارەدا، چونکە ئەوە خواردنەوەی کەسێکە کە باوەڕی بەخواو ڕۆژی دوایی نەبێت.

وە ئەحمەد تەخریجی کردووە لە ئیبنو عومەرەوە، دەربارەی شەربەت کە فەرمویەتی: (هەتا شەیتان نەی بردووە لێی بخۆرەوە وتیان: شەیتانەکە کەی ئەیبات؟ فەرمویەتی: لە سێیەم ڕۆژدا[2].

وە موسلیم و جگە لەو تەخریجیان کردووە لە حەدیسی ئیبنوعەبباسەوە (کە خۆی شەربەتی بۆ پێغەمبەر ﷺ دروست کردوە لەمێوژ کە ئەو ڕۆژەو بەیانیو دوای بەیانی لیێ ئەخواردەوە هەتا ئێوارەی سێیەم. پاشان ئەی دا بەخزمەتکارەکەی کە بیخواتەوە یان بیڕژێنێ[3].

ئەبو داود ووتوویەتی: مانای ئەوەی ئەیدا بە خزمەت کارەکەی ئەوەیە کە پەلە ئەکرێت نەوەك خراپ بێت، گومانی خراپ بوونیشی دوای سێ ڕۆژ ئەبێت. وە موسلیم و جگە لەو تەخریجیان کردووە لە حەدیسی عائیشەوە (کە خۆی نیوە ڕۆیەك شەربەتی بۆ پێغەمبەر ﷺ دروست کردووە، کاتێ ئێوارە هاتووەو نانی ئێوارەی خواردوە لیێ خواردۆتەوە، جا ئەگەر زیادەی لێ بمایەتەوە ئەیرشت، پاشان شەو شەربەتی بۆ پێغەمبەر دروست کردووە، جا کە بەیانی ئەبۆوە لەگەڵ نانی بەیانی لیێ خواردۆتەوە، وە وتویەتی: بەیانی و ئێوارە قاپەکانی شۆردووە[4].

وە ئەم حەدیسە پێچەوانەی حەدیسەکەی ئیبنوعەبباس نییە کە لەپێشەوە باس کرا ئەو ڕۆژەو بەیانی و دوای بەیانی هەتا ئێوارەی سێیەم لیێ خواردۆتەوە، چونکە سێ ڕۆژەکە زیادەیەکە کە پێچەوانەی ئەم حەدیسەیان نییە، وە هەردوو حەدیسەکەش لە صەحیح دا هاتوون.

وە ئەوەی زانراوە لە سیرەتی پێغەمبەرەوە ﷺ کە هەرگیز ئارەقی نەخواردۆتەوە، نە لەپێش بوونی بە پێغەمبەر و نە لەدوای. بەڵام شەرابەکەی لەو شەربەتانە بووە کە تێك نەچوەو نەبوە بە خەمر وەك لە حەدیسەکاندا بەئاشکرا دیارە.

(١) أبوداود (٣٧١٦) والنسائي (٨/٣٢٥) وابن ماجه (٣٤٠٩).

(٢) إبن أبي شيبة في (المصنف ٣٩١٠).

(٣) أحمد (١/٢٣٣) ومسلم (٢٠٠٧/٧٩).

(٤) أحمد (٦/١٢٤) ومسلم (٢٠٠٥/٨٥) وأبوداود (٣٧١١) والترمذي (١٨١٧).

**ئارەق کاتێك ببێتەوە بە سرکە:**

لە (بدایة المجتد) دا ووتوویەتی: زانایان هەموو ئیجماعیان هەیە لەسەر ئەوە کە ئارەق کاتێك لەخۆیەوە ببێتەوە بە سرکە دروستە بخورێتەوە، وە جیاوازی هەیە لەوەدا ئەگەر بە قەصد بکرێت بە سرکە لەسەر سێ گفت:

١- حەرامە.

٢- کەراهەتی هەیە.

٣- خواردنەوەی ڕەوایە.

هۆی جیاوازییەکەشیان بەرەنگار بوونی قیاسە لەگەڵ ئەثەردا، وە جیاوازییەکە لە مانا و تێگەیشتنی ئەثەرەکەیە. ئەویش بەوەی کە ئەبو داودو موسلیم و (ترمذي) تەخریجیان کردووە لە حەدیسی ئەنەسی کوڕی مالیکەوە کە ئەبو طەلحە پرسیاری لە پێغەمبەر ﷺ کرد، دەربارەی چەند هەتیوێك کە ئارەقیان بە میرات بۆ مابێتەوە؟ فەرمووی: (بیڕژێنە) ووتی: ئەی نەیکەمەوە بە سرکە؟ فەرمووی (نەء).

جا هەرکەس لەو نەهێشتنە وا تێبگات کە بۆ بەستنی دەرگای بەهانەیە ئەوە نەهێشتنەکەی بە کەراهەت داناوە، وە هەرکەس ئەو نەهێشتنە بەبێ عیللەت تێ بگا ئەوە بە حەرام کردنی داناوە. وە لەوەوە دەرئەکەوێ کە دیسان حەرام کردن نییە لەسەر مەزهەبی ئەوەی ڕای وەهابێت کە قەدەغەکردن ناگەڕێتەوە بە تێکچوونی ئەو شتەی قەدەغەکراوە.

وە ئەو قیاسەی کە دژایەتی ئەکا لەوەی کە سرکەکە بە حەرام دابنرێ، ئەوەیە کە بە زەرورەت لە شەرعدا زاندراوە کە حوکمە جیاوازەکان بۆ شتی جیاوازن لە خودی خۆیاندا، وە خودی ئارەق خودی سرکە نییە، وە سرکەش بە ئیجماعی زانایان حەڵاڵە، جا ئەگەر خودی ئارەقەکە گۆڕا بۆ خودی سرکەکە پێویستە کە حەڵاڵ بێت بەهەر شێوەیەك گۆڕا بێت.

**سڕکەرەکان (المخدرات)**

ئا ئەوە حوکمی خوا بوو دەربارەی ئارەق، بەڵام ئەو شتانەیتر جگە لەخواردنەوەکان کە هۆش ئەبەن وەك: بەنج و حەشیشە و جگە لەمانە لە ماددە سڕکەرەکان، هەموویان حەرامن، چونکە هۆش بەرن. جا لە حەدیسەکەی موسلیم دا کە لە پێشەوە باسکرا هاتووە کەد پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (کل مسکر خمر، وکل خمر حرام) واتە: هەموو هۆش بەرێك ئارەقە و هەموو ئارەقێکیش حەرامە.

پرسیار کرا لە موفتی دیاری میصری شێخ عبدالمجید سلیم، ڕەحمەتی خوای لێ بێت، دەربارەی حوکمی شەرع بۆ ئەو شتانەی سڕکەرن و ئادەمیزاد پێی موعتاد ئەبێ پرسیارەکەش لەم بارانەوە بوو:

١- بەکارهێنانی شتە سڕکەرەکان.

٢- بازرگانی کردن پێیانەوەو وەرگرتنیان بۆ قازانجی تیجاری.

٣- چاندنی خەشخاش و حەشیشە بەمەبەستی فرۆشتن یا دەرهێنانی سڕکەرەکە تێیاندا بۆ بەکارهێنان یا بۆ بازرگانی.

٤- ئەو قازانجەی لەو ڕێگایەوە بەدەست هاتبێ ئایا حەڵاڵە یا حەرامە؟

بەرێزی بەم شێوەی لای خوارەوە وەڵامی دانەوە:

(١) بەکارهێنانی مادده سڕکەرەکان:

بەڕاستی کەس گومان ناکات کە بەکارهێنانی ئەم ماددانە حەرامن، چونکە ئەبنە هۆی زیان گەیاندن بە لاشەی ئادەمیزاد و خراپەیەکی زۆریان بەدواوەیە، چونکە ئەمانە هۆش و بیر تێك ئەدەن و لاشە لەناو ئەبن، وە چەندەها زیان و خراپەی تریان هەیە، کە ناکرێ شەریعەت ڕێ بدات بە بەکارهێنانی، لەگەڵ ئەوەدا کە شتی تری حەرام کردووە زیان و خراپەی لەمانە کەمترو سوکترە، وە لەبەر ئەوەیە هەندێ لە زانا حەنەفییەکان ووتویانە: (هەرکەس بڵێت حەشیشە حەڵاڵە زندیقە و تازە داهێنەرە لە ئاییندا).

ئەمە لەو زانایانەوە بەڵگەیە لەسەر حەرامێتی ئاشکرای ئەو شتانە، جا لەبەر ئەوەی بەشی زۆری ئەم ماددانە هۆش و عەقڵ ئەشارنەوەو دای ئەپۆشن، وە ئارەزو و خۆشیەکی وا ئەدەن بەو کەسانەی بەکاری ئەهێنن کە پاڵیان پێوە ئەنێت بۆ خواردن و بەردەوام بوون لەسەری، ئەچنە ناو ئەو شتانەی خوای گەورە حەرامی کردوون لە کتێبەکەیدا کە قورئانی پیرۆزەو لەسەر زمانی پێغەمبەرەکەیەوە ﷺ، ئەوانیش ئارەق و هۆش بەرەکانن.

شێخی ئیسلام ئیبنوتەیمیە لە کتێبەکەیدا (السیاسة الشرعیة) شتێکی فەرموە کە ئەمە کورتەکەیەتی: بەڕاستی حەشیشە حەرامە، ئەبێ ئەوەی کە ئەیخوات تۆڵەی لێ بسەندرێ وەك چۆن تۆڵە لە ئارەق خۆر ئەسەندرێ، وە حەشیشە پیسترە لە عارەق لەو ڕووەوە کە هۆش و میزاج ئەشێوێنێ، هەتا نێرەموکی و سەرشۆڕی و چەندەها خووڕەوشتی خراپ و ناشیرین لەپیاودا دروست ئەکات، وە هەروەها ئادەمیزاد دوور ئەخاتەوە لە یادی خواو نوێژ، ئەمیش ئەچێتە ناو ئەو شتانەی کە خواو پێغەمبەرەکەی حەرامیان کردووە لە ئارەق و سەرخۆشکەر لە لەفزدا یا لەمەعنادا.

ئەبو موسای ئەشعەری خوا لیٚی ڕازی بێت فەرمویەتی: ووتم ئەی نێرراوی خوا چی ئەفەرمویت دەربارەی ئەو دو شەرابەی دروستمان ئەکرد لە یەمەن (البتع) کە لە هەنگوین دروست ئەکرا هەتا ئەگۆڕا، و (المزر) کە لە گەنمەشانی دروست ئەکرا هەتا ئەگۆڕا؟ ئەڵێ: پێغەمبەر ﷺ ووشەی پڕماناو کۆتایی هێنەری پێ درابوو فەرمووی: (كل مسكر حرام) رواه البخاري ومسلم[1]. واتە: هەموو هۆش بەرێك حەرامە.

وە لە نوعمانی کوڕی بەشیرەوە خوای لیٚ ڕازی بێت ووتوویەتی: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (إن من الحنطة خمراً، ومن الشعير خمراً، ومن الزبيب خمراً، ومن التمر خمراً، ومن العسل خمراً، وأنا أنهى عن كل مسكر) رواه أبوداود و غيره[2].

واتە: ئەو شەرابەی لەگەنم و جۆو مێوژ و خورما و هەنگوین دروست ئەکرێت و ئەگۆڕێت ئارەقە، وەمن هەموو هۆش بەرێکتان لیٚ قەدەغە ئەکەم.

وەلە ئیبنو عومەرەوە خوا لیٚی ڕازی بێت ووتویەتی: پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (كل مسكر خمر، وكل مسكر حرام)[3].

واتە: هەموو هۆشبەرێك ئارەقە و هەموو هۆشبەرێکیش حەرامە.

وە لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە فەرمویەتی: (كل مسكر خمر، وكل خمر حرام) رواهما مسلم[4].

واتە: هەمو هۆش بەرێك ئارەقەو هەمو ئارەقێکیش حەرامە.

وە لە عائیشەوە خوا لیٚی ڕازی بێت پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (كل مسكر خمر وما أسكر الفَرَقُ منه فملء الكف منه حرام).

واتە: هەموو هۆشبەرێك حەرامە، وە هەرچی ئەوەندەی (فَرَق) ێك لیٚی خەڵك سەرخۆش بکات ئەوە پڕ بە چنگێکیش لیٚی هەر حەرامە.

(ترمذي) ووتویەتی: حەدیسێکی حەسەنە[5].

---

(١) البخاري (٤٣٤٣) ومسلم (١٧٣٣/٧٠).

(٢) تەخریجی ئەم حەدیسە باس کرا.

(٣) أحمد (١٦/٢) ومسلم (٢٠٠٣/٧٤) وأبوداود (٣٦٧٩) والترمذي (١٨٦١) والنسائي (٥٥٨٥).

(٤) تەخریجی ئەم حەدیسە باس کرا.

(٥) تەخریجی ئەم حەدیسە باس کرا.

ئیبنوسوننی لە پێغەمبەرەوە ﷺ ئەگێڕێتەوە لەچەند ڕویەکەوە کە فەرموویەتی: (ما أسكر كثيره فقليله حرام)[1] صححه الحافظ. واتە: هەرچی زۆر لێ خواردنەوەی پیاو سەرخۆش بکات کەمیشی هەر حەرامە،

وە لە جابیرەوە خوای لێ ڕازی بێت کە پیاوێك پرسی لە پێغەمبەر ﷺ دەربارەی خواردنەوەیەك لە وڵاتەکەیاندا کە لە گەنمەشامی دروستیان ئەکرد و پێیان ئەوت (المزر)، فەرموی: (أمسكر هو؟) واتە: ئایا هۆش ئەبات و مەست ئەکا؟ کابرا ووتویەتی بەڵێ، فەرمووی: (كل مسكر حرام، إن على الله عهداً لمن يشرب المسكر أن يسقيه من طينة الخبال، قالوا: يارسول الله وما طينة الخبال؟ قال: (عرق أهل النار) أو قال: (عصارة أهل النار) رواه مسلم[2].

واتە: هەموو هۆشبەرێك حەرامە، بەڕاستی خوای گەورە پەیمانێکی لەسەر خۆی داناوە کە هەرکەس لە دنیادا هۆشبەر بخواتەوە (طينة الخبال)ی دەرخوارد بدات، ووتیان: ئەی نێرراوی خوا (طينة الخبال) چییە: فەرمووی: (ئارەقی دۆزەخیانە) وە لە ڕیوایەتێکی تردا فەرمووی: (گوشراوی دۆزەخیانە).

وە لە ئیبنوعەبباسەوە خوا لێی ڕازی بێت پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (كل مُخَمِّرٍ وكل مسكر حرام) رواه أبوداود[3].

واتە: هەمو ئارەق‌و هۆشبەرێك حەرامە.

وە فەرمووده لەم بارەیەوە زۆرەو بەلێشاوە. پێغەمبەر ﷺ بە ووشە پڕ ماناکانی کە پێی درابوو هەموو ئەمانەی کۆکردۆتەوە کە مێشکی ئادەمیزاد دائەپۆشێ‌و هۆشی ئەبات، وە هیچ جیاوازی نەخستۆتە نێوان جۆرێك و جۆرێکی ترەوە، هەروەها جیاوازی نییە کە بخورێت یان بخورێتەوە، هەر حەرامە.

وە عارەق جاری وا هەیە ئەکرێت بە پێخۆر، وە حەشیشەش ئەتوانرێ بتوێنرێتەوە بە ئاو و بخورێتەوە، ئیتر بەوشێوەیە عارەق ئەخورێت‌و ئەخورێتەوە، حەشیشەش ئەخورێت و ئەخورێتەوە، وە هەموویان حەرامن، و پەیدا بوونیان دوای سەردەمی پێغەمبەرو پێشەواکانی ئیسلام هیچ ڕێ لەوە ناگرێت کە بچنە ناو گشتی‌یەتی فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ دەربارەی هۆشبەرەکان، چونکە لە

---

(١) أحمد (٢/٩١) وابن ماجه (٣٣٩٢) والدارقطني (٤/٢٦٢)، من حديث ابن عمر.

(٢) تەخریجی ئەم حەدیسە باس کرا.

(٣) أبوداود (٣٦٨٠).

دوای سەردەمی پێغەمبەر ﷺ چەند هۆشبەرێك پەیدا بووەکە هەمویان چوونە ناو ووشە پڕ ماناکانی قورئان و سوننەت. کورتەی قسەکەی ئیبنو تەیمیە کۆتایی هات.

وە چەندەها جار قسەی کردووە لەو بارەیەوە ڕەحمەتی خوای لێ بێت لە فەتاواکانیدا کە ئەمە کورتەکەیەتی:

«ئەم حەشیشە نەفرین لێکراوە لە خۆی و لەوانەی ئەیخۆن و بە حەڵاڵی دەزانن، کە ئەبێتە هۆی ڕق و تووڕەیی خوای گەورەو تووڕەیی پێغەمبەرەکەی و باوەڕداران، وە ئەو کەسە ئەخاتە بەر سزای توندی خوای گەورە، چەندەها زەرەرو زیان ئەگرێتەوە بۆ سەر ئاینی مرۆڤو عەقڵ و خوڕەوشتی. هەروەها میزاج تێك ئەدات هەتا خەڵکێکی زۆر پێی شێت بوون، وە ئەوەندە سوکیەتی و نەفس نزمی بەجێ ئەهێڵێ لە بخۆرەکەیدا کە عارەق بەجێی ناهێڵێ.

چونکە ئەو خراپانەی لە حەشیشەدا هەیە لەعارەقدا نیە، کەواتە ئەم لەپێشترە کە حەرام بێت، وە موسڵمانان هەموو لەسەر ئەوەن کە سەرخۆشکەر لەوانەدا حەرامە.

جا هەرکەس ئەوە بە ڕەوا بزانێت و بڵێ حەڵاڵە ئەبێ داوای لێبکرێ تۆبە بکاو پەشیمان بێتەوە، ئەگینا ئەبێ بکوژرێت بە هۆی هەڵگەڕانەوە لە ئیسلام، وەنابێ نوێژی لەسەر بکرێ و لەگۆڕستانی موسڵمانان بنێژرێت، وە هەروەها کەمێ لە حەشیشەش هەر حەرامە بەپێی ئەو دەقانەی کەهاتوون دەربارەی حەرامی عارەقو هۆش بەرەکان -تەواو-.

وە بە دوای شێخی ئیسلامدا قوتابی‌یە لێکۆڵەرەوەکەی ئیبنو قەییم ڕەحمەتی خوای لێ بێت ڕۆیشتووە و لە (زاد المعاد)دا کە ئەمە کورتەکەیەتی فەرمویەتی: بەڕاستی عارەق هەموو سەرخۆشکەرەکانی تریش ئەگرێتەوە، تراوبێ یا وشك، گوشرابێت یا کوڵاو بێت، پارووی ناڕەواو گوناهیش ئەگرێتەوە - مەبەستی حەشیشەیە - چونکە ئەمانە هەموو خەمرن بە دەقی فەرموودەی نێرراوی خوا ﷺ کە ڕاست و ڕێك و ئاشکرایە و سەنەدەکەی جێی تانە نی‌یەو مەتنەکەشی کورت و شی نەکراوە نی‌یە، چونکە فەرموودەی: (کل مسکر خمر)[1] بە صەحیحی هاتوە.

وە بە صەحیحی هاتووە لە یارەکانی پێغەمبەرەوە ﷺ خوایان لێ ڕازی بێت، کە لەهەموو کەس زیاتر شارەزای قسەو مەبەستی پێغەمبەر بوون ﷺ کە هەرچی عەقڵ داپۆشێ ئەوە خەمرە.

لەسەر ئەوە ئەگەر لەفزەکەی پێغەمبەریش ﷺ هەموو هۆشبەرێکی نەگرتایەوە ئەوە قیاسی ڕاست و ڕێك کە ئەسڵ و فەرعی تێدا یەکسانە لە هەموو لایەنێکەوە، حوکمی ئەکرد بە یەکسان

(١) تەخریجی ئەم حەدیسە ڕابورد.

بوونی هەموو جۆرە هۆشبەرەکان، کەواتە جیاکردنەوە لەنێوان جۆرێك و جۆرێکی تردا، جیاکردنەوەیە لەنێوان ئەو شتانەدا کەلەیەك ئەچن لەهەموو ڕوویەکەوە -تەواو-.

خاوەنی (سبل السلام) شەرحی (بلوغ المرام) ووتوویەتی: بەڕاستی هەرچی شتێك هۆشی بەرد لەهەرچی شتێك بوو حەرامە، با خواردنەوەش نەبێت، وەك حەشیشە.

وە لە (حافظ ابن حجر)ەوە نقلّ کراوە کە هەرکەس ووتی: (حەشیشە سەرخۆش کەر نیە بەلکو سڕکەرە، تاوانێکی گەورەی کردووە، چونکە حەشیشە ئەو زەوق و خۆشیە ئەبەخشێت کە عارەق ئەیبەخشێت.

وە لە (ابن البیطار)ەوە نەقلّ کراوە کە - یەکێکە لە پزیشکەکان - ئەو حەشیشەی کە لە میسردا هەیە زۆر سەرخۆشکەرە، ئەگەر ئادەمیزاد ئەوەندەی درهەمێك یان دوو درهەمی لێ بخوات. وە حەشیشە سیفاتی پیسی زۆر زۆرە، هەندێ لە زانایان (١٢٠) زیانی ئاینی و دونیاییان لێوە ژماردوە، وە هەر ئەو سیفاتە پیسانەی کە لەمدا هەیە لە ئەفیونیشدا هەیە کە پیسترو زیانی زۆر ترە. قسەکەی (إبن البیطار) تەواوبوو.

وە ئەوەی شێخی ئیسلام و قوتابیەکەی (ئیبنو قەییم) و جگە لەوان لە زانایان دەربارەی حەشیشە ووتویانە هەقێکە کە بەلگەی لەسەر هاتووەو ئادەمیزاد دلّنیا ئەکەن.

جا کاتێك بەڕاستی ڕوون بوەوە کە دەقەکانی (کیتاب و سوننەت) حەشیشە ئەگرنەوە، ئەوە دیسان ئەفیونیش ئەگرنەوە، کە زانایان دەریان خستووە زیانی لە حەشیشە زۆرترە، وە ئەو زیانانەی لە حەشیشەوە پەیدا ئەبن لە ئەفیونیشەوە زیاتر پەیدا ئەبن وەك لە پێشەوە لە (ابن البیطار)ەوە نەقلّ کرا.

وە هەروەها ئەو دەقانە هەموو ئەو سڕکەرانە دەگرێتەوە کە تازە داهاتوون و لەوەو پێش نەزانرابوون، چونکە هەروەك عارەقن کەلە ترێ دروست ئەکرێ لەوەدا کە ئەمانەش هەرعەقلّ و مێشك دائەپۆشن، وە ئەو زیان و خراپانەیان تێدایە کە لە عارەقدا هەن، وە لەعارق زۆرتر خراپەیان هەیە وەك لە حەشیشدایە. بەلکو خراپتر و گەورەترە، وەك بەچاوی خۆمان ئەمڕۆ ئەیبینین وە بە گوێ ئەیبیستین.

وە ناکرێ کە شەریعەتی ئیسلام هیچ لەو سڕکەرانە ڕەواو حەلاّلّ بکات، وە هەرکەس گفتی حەلاّلی هەرچی یەك لەمانە بدات ئەوا لەو کەسانەیە کە درۆ لەسەر خوا هەڵئەبەستێ، یا شتێك دەربارەی خوا ئەلّێن کە ئاگایی یان بەسەریا نی یە.

وە لە پێشەوە ووتمان: هەندێ لە زانا حەنەفی‌یەکان ووتویانە: (إن من قال بحل الحشيشة زنديق، مبتدع) واتە: هەرکەس فتوای دا بەحەلاڵی حەشیشە زندیق و تازە داهێنەرە لە ئاییندا.

جا ئەگەر کەسێك گفتی حەلاڵی حەشیشە بدات، زندیق و موبتەدیع بێت ئەوە ئەو کەسەی کە گفت ئەدا بە حەلاڵی شتێك لەم سڕکەرانەی کە تازە داهاتوون و زیانیان زۆرترو خراپەکەیان گەورەترە، دیسان زندیق و موبتەدیعە، بەڵکو لەپێشترە.

وە چۆن شەریعەتی ئیسلام شتێك لەم سڕکەرانە حەلاڵ ئەکات کە ئەوپەڕی زیان ئەگەیەنێ بەم نەتەوەیە بە تاك تاك و بە کۆمەڵ، لەڕوی ماددی و تەندروستی و ڕەوشتی‌یەوە، وەك لە پرسیارەکەدا هاتووە. لەگەڵ ئەوەدا کە بناغەو بنچینەی شەریعەتی ئیسلامی دامەزراوە لەسەر هێنانی بەرژەوەندی‌یە پوختەکان و نەهێلانی زەرەرو زیانەکان.

وە چۆن خوای گەورەی زاناو کار دروست عارەقێك حەرام ئەکات کە لە ترێیە بۆ نمونە: بە زۆرو کەمی‌یەوە، لەبەر ئەو زیانانەی کە تیایەتی، وە لەبەر ئەوەی گەمەکەی پاڵپێوەنەرە بۆ زۆرەکەی و هۆیەکە بۆی بەلام شتێك ڕەوا ئەکات لە سڕکەرەکان کە ئەو هەموو زیان و خراپەیەی تێدایە، بەڵکو زیانەکانی لە عارەق زۆرترو گەورەترە بۆ سەر لاشە و ئاوەز و ئاین و ڕەوشت و میزاج؟ ئەو قسەیە کەس نایکات مەگەر یەکێ نەزان بێت سەبارەت بە ئیسلام، یان زەندیقێکی بیدعەچی بێت وەك لە پێشەوە باسکرا. کەواتە بەکار هێنانی ئەو سڕکەرانە بەهەر شێوەیەك بێت بە خواردن و خورادنەوە بێت، یا بە بۆن کردن بێت یا بە دەرزی بێت حەرامەو هیچ جیاوازیان نی‌یە، وە ئەمەش شتێکی ئاشکراو دیارە.

**(٢) بازرگانی کردن بەمادده سڕکەرەکان و کردنیان بەهۆیەك بۆ قازانجی بازرگانی:**

بەڕاستی لە پێغەمبەرەوە ﷺ فەرموودەی زۆر دەربارەی حەرامی فرۆشتنی عارق هەیە، لەوانە ئەوەی کە بوخاری و موسلیم لە جابیرەوە خوا لێی ڕازی بێت ئەگێڕنەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (إن الله حرم بيع الخمر، والميتة، والخنزير، والأصنام)[1]. واتە: بەڕاستی خوا فرۆشتنی ئارەق و شتی مردارەوەبوو بەرازو پەیکەرو بتی حەرام کردووە.

وە هەروەها فەرموودەی زۆر لە پێغەمبەرەوە ﷺ هاتووە کە ئەمە ئەگەیەنن کە هەر شتێك خوای گەورە حەرامی کردبێ سوودی لێ وەربگیرێ کڕین و فرۆشتن و خواردنی نرخەکەشی هەر حەرامە.

---

(١) البخاري (٢٢٣٦) ومسلم (١٥٨١/٧١).

وە لـە وەڵامـی پرسـیاری یەکەمـەوە بۆمـان دەرکـەوت کـە نـاوی (خمـر) ئـارەق ئـەو سـڕکەرانە ئەگرێتەوە بەپێی شەرع وەکو چۆن ئەوەی کە هاتوە لەبارەی حەرامی کڕین و فرۆشتنی ئەو شتانەی کە خوا حەرامی کردوون، ئەبێتە بەڵگە لەسەر حەرامی کڕین و فرۆشتنی ئەو سڕکەرانەش.

وە ئەو کاتە بەتەواوی ڕوون ئەبێتەوە کە بازرگـانی کـردن بـەو مـاددە سـڕکەرانەوەو کردنیـان بـە پیشەیەك کە سوودو قازانج بهێنێ حەرامە، جگەلـەوەی کـە ئـەوە یارمـەتیدانـە لەسـەر شـتێك کـە گومـان نییە لەحەرام بوونەکەیـدا بـەپێی بەڵگـەی قورئـان کـە ئەفـەرموێ: ﴿وَتَعَـاوَنُوا عَلَـى الْبِـرِّ وَالتَّقْوَى وَلا تَعَاوَنُوا عَلَى الإِثْمِ وَالْعُدْوَانِ﴾ (المائدة:٢) واتە: هاوکاری بکەن لەنێوان خۆتانا لەسەر کردەوەی چاك و لەخواترسان، وە هاوکاری مەکەن لەسەر شتێك کە گونـاهو سەرپێـچی و دەرچوون بێ لە سنوری خوا. لەبـەر ئـەوە حـەق ئەوەیـە کـە جومهـوری زانایـان بـۆی چـوون لەحـەرام کردنـی فرۆشتنی شەربەتی ترێ بۆ ئەو کەسانەی ئەیکەن بەئارەق، وە هەروەها پوچەڵ کردنی ئەو مامەڵەیـە چونکە یارمـەتی دانە بۆ سـەرپێچی کردنی خوای گەورە.

**(٣) چاندنی خەشخاش و حەشیشە بەمەبەستی فرۆشتن و دەرهێنانی مـادە سـڕکەرەکانیان بـۆ بەکار هێنان یا بۆ بازرگانی کردن پێیانەوە.**

بەڕاستی چاندنی حەشیشـە و ئەفیون لەبەر دەرهێنانی ماددە سڕکەرەکە یان بۆ بەکار هێنان یان بۆ بازرگانی کردن پێیانەوە بێگومـان حەرامـە لەبەر چەند هۆیەك:

یەکەم: بەپێی ئەو حەدیسەی هاتووە کە ئەبو داود و جگە لەو گێڕاویانەتەوە لە ئیبنوعەبباسـەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ کە فەرمویەتی: (إن مَن حَبَس العِنَبَ أيام القطاف حتى يَبيعَه مِّن يتّخذه خمراً فقد تَقحَّمَ النار)[1]. واتە: بەڕاستی کەسێك ترێ کاتی لێکردنەوەی لێ نەکاتەوە بۆ ئەوەی بیفرۆشێ بەو کەسانەی کە ئەیکەن بە ئارەق ئەوە کەوتۆتە ئـاگرەوە. جـا ئەمـە بەڵگەیـە بـۆ حـەرامی چـاندنی حەشیشە و ئەفیون بۆ مەبەستی ناوبراو، بە بەڵگەی دەقی حەدیسەکە.

دووەم: ئەو کارە یارمـەتیدانە لەسـەر سەرپێچی کردنی فەرمانی خوا، ئـەویش بـەکارهێنانی ئـەو سڕکەرانەیە یان بازرگانی کردنـە پـێیانـەوە، وە وەك لـە پێشـەوە باسـمان کـرد یارمەتیـدان لەسـەر گوناهو سەرپێچییـە .

سێهەم: چاندنی ئەو شتانە بۆ ئەو مەبەستە ڕەزامەندییە لە جووتیارەکانە وە بە بەکار هێنانیان لەلایەن خەڵکەوەو بازرگانی پێوەکردنیان، وە ڕازی بونیش بەخراپە هەر خراپەیە.

---

(١) مجمع الزوائد (٤/٩٠).

ئەمەش لەبەر ئەوەیە ئینکاری خراپە کردن بەدڵ، کە بریتیەیە لە ڕق و کینە لەو خراپەیە بەدڵ، فەرزە لەسەر هەموو موسڵمانێك لەهەموو کاتێکدا، بەڵکو لە صحیحەکەی موسلیمدا هاتووە لە پێغەمبەرەوە: ﷺ (إن من لم ینکر المنکر بقلبه، لیس عنده من الإیمان حبةُ خردل)[1].

واتە: هەرکەس ئینکاری خراپە نەکات بەدڵ، دەنکە خەردەلێك باوەڕ لە دڵیا نییە.

وە هەروەها چاندنی حەشیشەو ئەفیون سەرپێچیەیە لەڕوویەکی تریشەوە، دوای ئەوەی (ولي أمر) سەرپەرشتی کەری موسڵمانان قەدەغەی ئەکات، بەپێی ئەو یاسایانەی کە دانراون بۆ ئەوە، چونکە گوێ ڕایەڵی وەلی ئەمر لەو شتەدا کە سەرپێچی کردن نەبێت لە خواو پێغەمبەرکەی پێویستە بە ئیجماعی موسڵمانان، وەك ئیمامی نەوەوی ڕەحمەتی خوای لێ بێت باسی کردووە لەشەرحی موسلیم دا لەبەشی گوێ ڕایەڵی ئەمیرەکان.

هەروەها ئەم ڕوەی دوایی ئەوتریێ لەبارەی حەرامی‌یەتی بەکارهێنانی سڕکەرەکان و بازرگانی کردن پێیانەوە.

(٤) ئەو سودەی لەو ڕێگایەوە بەدەست دێت:

لەوەوە کە باس کرا زانیمان کە کڕین و فرۆشتنی (مخدرات) سڕکەرەکان حەرامە کەواتە نرخەکەشیان هەر حەرامە:

یەکەم: بە پیێ فەرمودەی خوای گەورە کە فەرمویەتی: ﴿وَلا تَأْكُلُوا أَمْوَالَكُمْ بَيْنَكُمْ بِالْبَاطِلِ﴾ (البقرة:١٨٨).

واتە: با هەندێکتان ماڵی هەندێکتان وەرنەگرێت و نەخوات بەهۆی شتی باتڵ و پوچەوە. ماڵ وەرگرتنیش بە باتڵ لەسەر دوو شێوەیە:-

١- وەرگرتنی بە ستەم، یان بە دزی، یا بەخیانەت، یابە داگیرکردن، و ئەو شێوانە.

٢- وەرگرتنی بەرێگایەك کە قەدەغە بێت، وەك بردنەوەی بە قومار، یا بە ڕێگەی عەقدە حەرامەکان، وەك سوود (ربا)، وە وەك کڕین و فرۆشتنی ئەو شتانەی کە خوا سوودەکەی حەرام کردووە، وەك ئارەق کە سڕکەرەکانیش ئەگرێتەوە وەك کەمێ لەمەو پێش باسکرا. بەڕاستی ئەمانە هەموویان حەرامن با بەڕزامەندی خاوەنەکەشی بێت.

---

(١) مسلم (٥٠/٨٠).

دووەم: بەپێی ئەو فەرمودانەی کە هاتوون دەربارەی حەرام کردنی نرخی ئەو شتانەی کە خوا حەرامی کردووەو سوود وەرگرتن لێیان. وەك فەرموودەی: (إن الله إذا حرَّم شيئاً حرم ثمنه) رواه إبن أبي شيبه عن ابن عباس[1].

واتە: بەڕاستی خوا ئەگەر شتێکی حەرام کرد نرخەکەشی حەرام ئەکات.

وە لە (زاد المعاد) دا هاتووە کە ئەمە دەقەکەیەتی: جەماوەری زانایان ووتوویانە: ئەگەر ترێ فرۆشرا بە کەسێك ئەیکرد بە ئارەق نرخەکەی حەرامە، بە پێچەوانەی ئەوەوە کە بفرۆشرێ بە کەسێك بۆ خواردن. وە هەروەها چەك ئەگەر بفرۆشرێ بە کەسێك کە لەگەڵ موسڵمانێکدا بجەنگێ ئەوە نرخی ئەو چەکە حەرامە، بەڵام ئەگەر بفرۆشرێ بەکەسێك جیهادی پێ بکات لە ڕێی خوادا نرخەکەی حەڵاڵە و لە شتە پاکەکانە.

وە هەروەها قوماشی حەریر: ئەگەر بفرۆشری بەکەسێك کە لەبەری بکات و لەبەرکردنی بۆی حەرام بێت، ئەویش نرخەکەی حەرامە، بە پێچەوانەی ئەوەوە ئەگەر بفرۆشری بە کەسێك کە بۆی حەڵاڵ بێت – تەواو - .

جا ئەگەر ئەو شتانەی سوود وەرگرتن لێیان حەڵاڵ بێت کاتێك فرۆشران بە کەسێك کە لە سەرپێچی خوادا بەکاریان بهێنێ - بەپێی ڕای جەماوەری زانایان، کە هەقیشە- نرخەکەیان حەرام بێت بە پێی ئەو بەڵگانەی باس کران و جگە لەوانیش ئەوە نرخی ئەو شتەی سوود وەرگرتن لێی حەرام بێت، وەك سرکەرەکان، زۆر لەپێشترە بۆ حەرام بوونی.

وە کاتێك کە نرخی ئەو (مخدرات)ە حەرام بێت، ئەوە پیسەو سەرف کردنی لەڕێی خوادا- وەك صەدەقە و حەج- وەرناگیرێ، واتە ئەو کەسەی سەرفی ئەکات پاداشتی لەسەر وەرناگرێ.

موسلیم لە ئەبو هورەیرەوە ئەگێڕێتەوە خوا لێی ڕازی بێت کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (إن الله تعالى طيب لايقبل إلا طيباً، وإن الله تعالى أمر المؤمنين بما أمر به المرسلين) فقال تعالى: ﴿يَا أَيُّهَا الرُّسُلُ كُلُوا مِنَ الطَّيِّبَاتِ وَاعْمَلُوا صَالِحاً﴾ (المؤمنون:٥١) وقال تعالى ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا كُلُوا مِنْ طَيِّبَاتِ مَا رَزَقْنَاكُمْ وَاشْكُرُوا لِلَّهِ إِنْ كُنْتُمْ إِيَّاهُ تَعْبُدُونَ﴾ (البقرة:١٧٢).

ثم ذكر الرجل يطيل السفر أشعث أغبر، يمد يده إلى السماء يارب . . يارب . . ومطعمه حرام، ومشربه حرام، و ملبسه حرام، و غذي بالحرام، فأنّى يُستجاب لذلك؟)[2].

---

(١) إبن أبي شيبه (٦/١٠١).

(٢) مسلم (١٠١٥) والترمذي (٢٩٨٩).

واتە: خوای گەورە پاكەو شتێكیش پاك نەبێت وەری ناگرێت، وە خوا چ فەرمانێكی كردووە بە پێغەمبەركانی ئەو فەرمانەشی كردووە بە موسڵمانەكان، خوای گەورە فەرمویەتی: ئەی نێرراوەكان ڕۆزی چاك و حەڵاڵ بخۆن و كردەوەی چاك بكەن) وە ئەفەرموێ: (ئەی ئەو كەسانەی باوەڕتان هێناوە لەو خواردنە حەڵاڵانە بخۆن كە پێمان بەخشیونو سوپاس گوزاری خوا بكەن ئەگەر ئێوە تەنها ئەو ئەپەرستن). لەپاشاندا باسی كابرایەكی كرد كە سەفەرەكەی دورو درێژ ئەكات، و قژ هاڵوزاوو خوڵاوی، دەست بەرز ئەكاتەوە بۆ ئاسمان و ئەڵێ: ئەی پەروەردگار. ئەی پەروەردگار. وە خواردنی حەرامە و خواردنەوەی حەرامە و پۆشاكی حەرامە و بە حەرام بەخێو كراوە، جا چۆن ئەو كەسە پاڕانەوەی گیرا ئەبێت و لیێ وەرئەگیرێت.

وە لەو فەرموودەیەدا هاتووە كە ئیمامی ئەحمەد لە موسنەدەكەیدا لە ئیبنومەسعودەوە خوا لێی ڕازی بێت گێڕاویەتیەوە كە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (والذي نفسي بيده لايكسب عبدٌ مالاً من حرام، فينفق منه، فيبارك له فيه، ولا يتصدق فيقبل منه، ولا يتركه خلف ظهره إلا كان زاده في النار، إن الله لا يمحو السيء بالسيء، ولكن يمحو السيء بالحسن، إن الخبيث لايمحو الخبيث)[1].

واتە: بەو زاتەی گیانی منی بەدەستە هیچ كەس ماڵێك لە حەرام پەیدا ناكات، پاشان لێی سەرف بكات و خوا لێی پیرۆز كات، یا بیدات بە صەدەقە و لێی وەرگیرێ، وە دوای خۆی بەجێی بهێڵێ ئیللا ئەو ماڵە ئەبێتە خۆراكی لەناو دۆزەخدا، چونكە خوای گەورە خراپە بە خراپە ناسڕێتەوە، بەڵكو خراپە بەچاكە ئەسڕێتەوە، بەڕاستی شتی پیس پیسی ناسڕێتەوە.

وەلە كتێبی (جامع العلوم و الحكم)ی ئیبنوڕەجەبی حەنبەلی فەرموودەی زۆرو چەند ئەسەرێكی صەحابە (خوا لێیان ڕازی بێت) هاتووە لەو بارەیەوە. لەوانە ئەوەیە كە ئەبو هورەیرە لە پێغەمبەرەوە ﷺ ئەگێڕێتەوە كە فەرمویەتی: (من كسب مالاً حراماً فتصدَّق به لم يكن له أجرٌ وكان إصْره – يعني إثمه وعقوبته- عليه)[2]. واتە: هەركەس ماڵێكی حەرامی پەیدا كردو كردی بە صەدەقە، پاداشتی لەسەر وەرناگرێ، بەڵكو تاوان و سزای لەسەر ئەبێت.

وە لەوانە ئەوەی كە لە مورسەلەكانی (قاسم بن مخيمرة)دا هاتووە، كە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (من أصاب مالاً من مأثم فوَصَل به رَحِمَهُ، أو تَصدَّقَ به، أو أنفقه في سبيل الله، جُمِع ذلك جميعاً ثم قذف به في نار جهنم)[3].

---

(١) أحمد (١/٣٨٧).

(٢) ابن حبان (٣٣٦٨).

(٣) تهذيب الكمال (١١٨) وسير أعلام النبلاء (٥/٢٠٣).

واته: هەرکەس ماڵێکی حەرامی بەدەست هێنا، جا سیلەی ڕەحمی پێ بەجێ هێنا، یا کردی بەخێر، یا لە ڕێی خوادا سەرفیکرد، ئەوانە هەمووی لەسەریەك کۆ ئەکرێتەوە لە پاشاندا فڕێ ئەدرێتە ناو ئاگری دۆزەخەوە.

وە لە شەرحی (أربعين النووي) (مُلّا علي القاري) دا هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (إنه إذا خرج الحاج بالنفقة الخبيثة، فوضع رِجْلَه في الغَرْز -أي الركاب- وقال لبيك، ناداه ملك من السماء، لا لبيك ولا سَعْدَيك، وحجك مردود عليك)[1].

واتە: کاتێ حاجییەك بە نەفەقەی حەرامەوە دەرچێت بۆ حەج کاتێ قاچی خستە سەر جێ پێی زینەکەو ووتی: (لبيك) واتە خوایە وەڵامی بانگەوازەکەت ئەدەمەوە، فریشتەیەك لە ئاسمانەوە بانگی ئەکات: (لالبيك ولا سعديك) واتە نە پاداشتی وەڵام دانەوەکەت بۆ هەیە و نە خۆشبەختی، وە حەجەکەشت ئەدرێتەوە بەسەرو چاوتا.

ئەم فەرموودانە کەیەکتر بەهێز ئەکەن ئەبنە بەڵگەی ئەوەی کە خوا نە صەدەقە نە حەج نە هیچ خێرێك لە ماڵی حەرام وەرناگرێ. وە هەر لەبەر ئەوەیە زانایانی حەنەفی بڕیاریان داوە کە نەفەقەی حەج لە ماڵی حەرام حەرامە.

وەکورتەی ئەوەی ووتوومانە:-

یەکەم: بەکارهێنانی حەشیشە و ئەفیون و کۆکاین و ئەو جۆرە سڕکەرانە حەرامە.

دووەم: بازرگانی پێوە کردنیان و کردنیان بە پیشەیەك کە قازانج ڕابکێشێ هەر حەرامە.

سێهەم: چاندنی ئەفیون و حەشیشە بۆ دەرهێنانی مادە سڕکەرەکانی بۆ بەکار هێنان یا بازرگانی پێوە کردنیان حەرامە.

چوارەم: ئەو قازانجەی لە بازرگانی ئەم مادانەوە بەدەست دێت حەرام و پیسە، وە سەرف کردنیشی لەو کردەوە چاکانەدا کە هۆی نزیك بوونەوەیە لە خوا حەرامەو وەر ناگیرێ.

هەرچەندە درێژەم بە باسەکەم داوە لەو بارەیەوە کە لەوانەیە ببێتە هۆی بێزاری و ماندو بوون، بەڵام ئەوەم بەباشتر زانی بۆ ڕوون کردنەوەی حەق و دەرخستنی ڕاستی، تاوەکو ئەو گومانە لابچێ کە لای نەزانەکان دروست بووە، وە بۆ ئەوەی بزانرێ کە فتوادان بە حەڵاڵی ئەو مادە سڕکەرانە قسەی پڕو پوچن و سەر لێشێواندنی سەرلێشێواوانە. وە لەوەشدا کە وتومە پشتم بەستووە یا هەڵم بژاردووە لە کیتابی خواو سوننەتی ڕەوانەکراوەکەی و قسەی ئەو زانایانەیە کە لەگەڵ بناغەی

(١) الأصبهاني في الترغيب والترهيب (١٠٤٩) ومجمع الزوائد (١٠/٢٩٢).

شەریعەتی ئیسلامی پیرۆز ڕێك كەوتووە. باسەكە كۆتایی هات، سوپاس بۆ خوا كە نیشان دەری ڕێگای ڕاستە. وە درودی خوا لەسەر پێغەمبەری مەزن و یارو یاوەرانی بێت بە گشتی.

## (حد) تۆڵەی ئارەق خۆر

زانایان هەموویان لەسەر ئەوە ڕێكن كە تۆڵە سەندن لە ئارەق خۆر پێویستە، وە لەسەر ئەوەی كە تۆڵەكەی ((جَلْد) لێدانە.

بەڵام جیاوازیان هەیە لەسەر چەندێتی:

حەنەفی‌یەكان‌و مالیكی‌یەكان بۆ ئەوە چوون: كە ئەبێ هەشتا قەمچی لێ بدرێ، وە شافیعی بۆ ئەوە چووە، كە ئەبێ چل قەمچی لێ بدرێ، وە لە ئیمامی ئەحمەدەوە، دوو ڕیوایەت هەیە. وەلە (المغنی)دا هاتووە كە دوو ڕیوایەتی لەسەرە:

یەكەم: ئەوەیە كە حەددەكە هەشتا قەمچی‌یە.

مالیك و ثەوری و ئەبو حەنیفە و شوێن كەوتوانی لە زانایان هەر ئەوەیان ووتووە، چونكە ئیجماعی صەحابە لەسەر ئەو ڕایەیە، چونكە ئەگێڕنەوە كە عومەری كوڕی خەططاب ڕاوێژی بە خەڵك كرد دەربارەی حەددی ئارەق؟ عبدالرحمن ی كوڕی عەوف ووتی: (وەك سوكترینی تۆڵەكانی لێ بكە كە هەشتا دارە) ئیتر عومەر هەشتا قەمچی لە ئارەق خۆر ئەدا و بۆ خالید و ئەبی عوبەیدەشی نوسی لە شام كە لەسەر ئەوە كاربكەن.

وە ئەگێڕنەوە كە عەلی خوا لێی ڕازی بێت لە ڕاوێژەكەدا ووتی: ئەگەر سەرخۆش ببێ قسەی بێ جێ ئەكات، وە ئەگەر قسەی بێ‌جێی كرد: درۆو تۆمەت هەڵئەبەستێ، كەواتە تۆڵەكەی تۆڵەی تۆمەت چی‌یە). كە هەشتا قەمچی‌یە، جوزجانی و (دارقطني)، جگە لەوان گێڕاویانەتەوە[1].

وە ڕیوایەتی دووەم لە ئەحمەدەوە: ئەوەیە كە تۆڵەی عارەق خۆر چل قەمچی‌یە، ئەوەش هەڵبژاردەی ئەبی بەكرو مەزهەبی شافیعی‌یە، چونكە عەلی چل قەمچی دا لە وەلیدی كوڕی عوقبە، لەپاشاندا فەرمووی: پێغەمبەر ﷺ چل قەمچی داوە لە ئارەق خۆر، وە هەروەها ئەبوبەكر، بەڵام عومەر هەشتا داری لێداوە. وە هەموویان سوننەتن، وەمن ئەوەیانم لاخۆشترە) موسلیم ڕیوایەتی كردووە[2].

---

(١) مالك في الموطأ (٢/٨٤٢) ودارقطني (٣/١٥٧).

(٢) مسلم (١٧٠٧/٣٨).

وەلە ئەنەسەوە كە فەرمویەتی: پیاوێكیان هێنا بۆ لای پێغەمبەر ﷺ عارەقی خواردبۆوە، بە نەعل دەوری چل نەعلی لێدا، لەپاشاندا هێنایان بۆلای ئەبوبەكر، ئەویش هەروەهای لێكرد. لەپاشاندا هێنایانە لای عومەر ئیتر عومەر راوێژی بەخەڵك كرد دەربارەی تۆڵەی ئارەق خۆر، ئیبنوعەوف فەرمووی : كەمترینی تۆڵەكان هەشتایە. ئیتر عومەر هەشتا قەمچی لێدا[1].

وە كاری پێغەمبەر ﷺ حوججەیە و دروست نییە وازی لی بهێنرێت بۆ كاری كەسێكی تر، وە ئیجماعیش پێك نایەت لەسەر شتێك پێچەوانەی كاری پێغەمبەر ﷺ بێت وەهەروەها پێچەوانەی كاری ئەبوبەكر و عەلی بێت، كەواتە ئەو زیادەیەی عومەر لەسەر ئەوە دائەنرێ كە سزادانێكە دروستە ئیمام بیكات ئەگەر وەهای بەباش زانی. وە ئەوەی پارسەنگی ئەو قسەیە ئەداتەوە ئەوەیە كە عومەر لە پیاوی بەهێز كە سەرگەرم بێت لە شراب خواردنەوەدا هەشتا قەمچی ئەدا، و پیاوی لاوازیش ئەگەر ئەوەی لێ روبدایە چل قەمچی، بەڵام فەرمان بە كوشتنی ئارەق خۆر كاتێ دووبارە بۆوە كارێكە (منسوخ) سڕراوەتەوە.

لە قوبەیصی كوڕی ذوئەیبەوە كە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (من شرب الخمر فاجلدوه، فإن عاد فاجلدوه، فإن عاد فاجلدوه، فإن عاد فاقتلوه- في الثالثة أو الرابعة-) واتە: هەركەس ئارەقی خواردەوە قەمچی لێ بدەن، ئەگەر دووبارەی كردەوە قەمچی لێ بدەن، ئەگەر دووبارەی كردەوە بیكوژن -لەسەری سێهەم جاردا یاچوارەم جاردا-.

وە جارێك پیاوێكیان هێنا ئارەقی خواردبۆوە داری لێ دا، لەپاشاندا هەر هێنایانەوە ئەمجارەشیان داری لێدا، لەپاشاندا هەر هێنایانەوە داری لێداو، كوشتنی لابرد ﷺ، ئەویش روخستەیێك بوو.

**تۆڵە بەچی سابت ئەبێ ؟ :**

تۆڵە بەیەكێك لە دوو شت سابت ئەبێ :-

١- دان پێدا نان: واتە عارق خۆرەكە ئیعتراف بكات كە ئارەقی خواردۆتەوە.

٢- بەشایەتی دووشایەتی راست گۆ.

وە زانایان جیاوازیان هەیە لەوەدا كە تۆڵە بە بۆن بچەسپێ:

---

(١) أحمد (٣/١٨٠) ومسلم (١٧٠٦/٣٥) وأبوداود (٤٤٧٩) والترمذي (١٤٤٣).

مالیکییەکان بۆ ئەوە چوون کە تۆڵە پێویست ئەبێت ئەگەر دوو شایەتی ڕاست گۆ شایەتی بدەن لای حاکم کە بۆنی دەمی هاتووە، چونکە بۆن بەڵگەیە لەسەر خواردنەوە، وەك بەڵگەیەتی دەنگ و نوسین.

وە ئەبوحەنیفە و شافیعی بۆ ئەوە چوون کە بەبۆنی دەم تۆڵە ناچەسپێ، لەبەر بونی گومان چونکە چەند بۆنێك لەیەك ئەچن، وە تۆڵەکانیش بەگومان لائەبرێن، وە لەبەر ئەوە لەوانەیە تیکەڵی کرابێت یا بەزۆر دەرخواردی درابێت، وەلەبەر ئەوەی چەند شتی تر هەیە جگە لە ئارەق کە بۆ نیان لە ئارەق ئەچێت. وە ئەسڵیش ڕزگاربوونی مرۆڤە لە سزادان، وە یاسادانەریش چاوەڕێی لابردنی حەددەکانە.

مەرجەکانی بەجێ هێنانی حەد:

چەند مەرجێك هەن بۆ جێبەجێ کردنی حەددی ئارەق خواردن کە ئەمانەی لای خوارەوەیە:

١- ژیری: چونکە ژیری جێی بەستنی تەکلیفە، وە شێت لەسەر ئارەق خواردن سزا نادرێ، وە هەروەها کەم ئاوەزو نەفام.

٢- پێگەیشتویی: ئەگەر منداڵ ئارەق بخوات حەددی لەسەر نییەو سزا نادرێ، چونکە تەکلیفی لەسەر نییە.

٣-ئارەزوو: ئەگەر کەسێك بەزۆر ئارەقی دەرخوارد درا حەددی لەسەرنییە، ئیتر ئەو زۆرلێکردنە هەڕەشەی کوشتن بێت، یا لێدانی زۆر بێت، یاماڵ لەناوبردن بێت، چونکە زۆر لێکردن گوناهی لەسەر لابردوە. پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (رفع عن أمتي الخطأ و النسيان، وما استكرهوا عليه) واتە: تاوان لەسەر نەتەوەکەم هەڵگیراوە بەهۆی هەڵە و لەبیر چوون، وە ئەوەش کە بەزۆر پێیان کراوە. جا کاتێك گوناهەکە هەڵگیرابێت ئەوە تۆڵەی لەسەر نییە، چونکە تۆڵە بەهۆی گوناهو سەرپێچییە.

وە ناچار بوونیش ئەچێتە بازنەی زۆر لێکراوەوە، جا ئەگەر کەسێك ئاوی دەست نەکەوت و زۆر زۆر تینوی بوو کە ترسی لەناوچوونی لێ ئەکرا، وە ئارەقی دەست کەوت، ئەوە بۆی هەیە بیخواتەوە. وە هەروەها کەسێك برسی بوو برسییەکی زۆر کە ترسی مردنی لێ ئەکرا، چونکە لەو کاتەدا ئارەق پێویستییەو ژیانی لەسەر ئەوەستێ پێویستییەکانیش قەدەغەکراوەکان ڕەوا ئەکەن.

خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿فَمَنِ اضْطُرَّ غَيْرَ بَاغٍ وَلَا عَادٍ فَلَا إِثْمَ عَلَيْهِ إِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَحِيمٌ﴾ (البقرة:١٧٣) واتە: جا هەرکەس پێویستی ناچاری کردن بۆ خواردنی شتێك لەو قەدەغە کراوانە، بێ ئەوەی ستەم بکات لە خواردنەکەدا زیاد لە پێویستییەکەی خۆی، وە بێ ئەوەی لە سنووری خوا

دەرچێ لەوەدا كە بۆی ڕەوا كراوە، ئەوە هیچ تاوانی لەسەر نی‌یە لەوەدا، چونكە بەڕاستی خوا لێ بوردەیە بۆ بەندەكانی و میهرەبانە پێیان.

وە لە (المغني)دا هاتووە: (كە عەبدوڵڵای كوڕی حوذافە ڕۆمی‌یەكان بەدیل گرتیان، ستەمكارەكەی سەركردەكەیان لە ژوورێكدا بەندی كرد كە ئاوێكی لێ بوو تێكەڵ كراو بە ئارەق، وە هەروەها گۆشتی بەرازی برژاو، بۆ ئەوەی لە گۆشتی بەرازەكە بخوات و ئارەقەكەش بخواتەوە، سێ ڕۆژ لەو ژوورەدا بەجێی هێشت، ئەو كارەی نەكرد، پاشان دەریان هێنا لە ترسی مردنی ووتی: سوێند بەخوا، خوا بۆی حەڵاڵ كردبوم چونكە من ناچار بووم، بەڵام من لەوانە نەبووم كە ئێوە خۆش كەم بە ئاینی ئیسلام.

٤- پێ‌زانین بەوە كە ئەو شتەی ئەیخواتەوە سەرخۆشكەرە. چونكە ئەگەر كەسێك ئارەقی خواردەوەو نەیزانی ئارەقە، ئەوە لێی ئەبوورێ بەهۆی نەزانینەكەی و حەد لەسەری جێ‌بەجێ ناكرێ، بەڵام ئەگەر كەسێك هۆشیاری كردەوەو پێی ووت، وە ئەو هەر بەردەوام بوو لەخواردنەوەكەی، ئەوە ئەو كاتە بەهانەی نابێت، لەبەر لاچوونی نەزانی‌یەكەی و سووربوونی لەسەر سەرپێچی‌یەكە دوای زانینیشی، كەواتە شیاوی سزا ئەبێت و حەددی لەسەر بەجێ دێت.

وە ئەگەر شتێكی خواردەوە كە زانایان لەسەری جیاواز بوون كە سەرخۆشكەر بێت، ئەوە حەددی لەسەر بەجێ نایەت، چونكە جیاوازی گومانە، وە حەددەكانیش بە گومان لائەبرێن.

وە هەروەها حەد بەجێ نایەت لەسەر كەسێك ئاوی كاڵی ترێی خواردەوە ئەگەر تێك چوو وە هەڵهات و كەفی فڕێدا، كە زانایان ئیجماعیان لەسەر حەرامی‌یەكەی هەیە ئەگەر ئەو كەسە بە حەرامی‌یەكەی نەزانێت، وەك ئەوەی كەلەخاكی كافراندا بێت یان تازە موسڵمان بێت، چونكە نەزانینی دائەندرێ بەیەكێ لەو بەهانانەی كە تۆڵە لائەبەن، بەپێچەوانەوەی كەسێكەوە كە لەخاكی ئیسلامدا بێت، وە تازە موسڵمانیش نەبێت، چونكە ئەو حەددی لەسەر بەجێ دێت و بە نەزانی‌یەكەی وازی لێ ناهێنرێ، چونكە ئەوە لە پێویستی یەكانی ئاینە كە ئەبێت بیزانێت.

**بە مەرج نەگرتنی ئازادی و ئیسلامەتی لە بەجێ‌هێنانی حەددا:**

ئازادی و موسڵمان بوون مەرج نین بۆ بەجێ هێنانی تۆڵە، بەندەیەك ئەگەر ئارەقی خواردەوە سزائەدرێ، چونكە ئەو تەكلیفانەی خوا فەرمانی پێ كردون و ئەوانەی قەدەغەی كردون ئەویش ئەگرێتەوە.

مەگەر هەندێ شت نەبێت كە ئەو ناتوانێ پێیان هەڵبسێت چونكە بەكاروباری گەورەكەیەوە خەریكە، ئەو شتانەش وەك نوێژی هەینی و نوێژی جەماعەت.

وە خوای پاك و بێ‌گەرد فەرمانی داوە بە دورکەوتنەوە لە ئارەق، ئەو فەرمانەش بەرەو ڕوی ئازاد و کۆیلەکراوە، وەگرانیش نی‌یە لەسەر بەندە کە لی‌ی دوور بکەوێتەوە، وە زیانەکەشی چەندە ئەگات بە ئازاد، کۆیلەش ئەوەندەی پی‌ی ئەگات، وە لێرەدا جیاوازی نی‌یە نێوانیاندا تەنها لە سزادا نەبێت، چونکە سزای بەندە نیوەی سزای پیاوی ئازادە، بەو شێوەیە تۆڵەکەی بیست قەمچی ئەبێت یاچل قەمچی: بە پێی جیاوازی زانایان لە دانانی سزادا.

وە وەك چۆن ئازادی مەرج نی‌یە لەبەجێ هێنانی حەددا، هەروەها ئیسلامەتیش مەرج نی‌یە، وە خاوەن کتێبەکان لە جولەکە و گاور کە ڕەگەزنامەی ئەو وولاتە ئیسلامی‌یانەیان هەیەو لەگەڵیاندا ئەژین وەك قبطی‌یەکان لە میسردا، وە هەروەها ئەو خاوەن کتێبانەی کە بە پەیمانی کاتی و ئەمان لەگەڵ موسڵمانانا ئەژین وەك بێگانەکان، ئەم جۆرانە حەدیان لەسەر بەجێ ئەهێنرێ ئەگەر لە وولاتی ئیسلامدا ئارەقیان خواردەوە، چونکە چی بۆ ئێمەیە بۆ ئەوانیشە، وەچی لەسەر ئێمەیە لەسەر ئەوانیشە.

وە لەبەر ئەوەی ئارەق لە ئاینەکەی ئەوانیشدا حەرامە، وەك لە پێشەوە ئاماژەمان بۆ کرد، وە لەبەر شوێنەوارە خراپەکانی‌و زەرەرو زیانە زۆرەکەی لە ژیانی گشتی و تایبەتی‌دا، وە ئیسلام ئەیەوێ ئەو کۆمەڵە بپارێزێ کە لە ژێر سێبەری ئاڵای ئیسلامدان، وە ئەیەوێ بەجۆرێك ئاگاداری‌یان بکات پاك و بەهێز و یەکگرتووبن، کە لاوازی لەهیچ لایەکەوە نەچێتە ناویان، نە لەلایەنی موسڵمانەکانەوە، وە نە لەلایەنی جگە لە موسوڵمانانەوە، وە ئەمە مەزهەبی جەماوەری زانایانە، وە ئەو هەقەیە کە نابێت کەس لی‌ی لابدات.

بەڵام حەنەفی‌یەکان -خوا لی‌یان ڕازی بێت- ڕایان وایە کە ئارەق هەرچەندە بە ماڵ دانانرێ لای موسڵمانەکان لەبەر ئەوەی ئیسلام حەرامی کردووە، بەڵام لای خاوەن کتێبەکانی تر ماڵ و نرخی هەیە، جا هەر موسڵمانێك لی‌یان برژێنێ ئەبێ نرخەکەی بدات بە خاوەنەکەی، و خواردنەوەی ئارەقیش لای ئەوان ڕەوایە، ئێمەش فەرمانمان پێ کراوە کە واز لە خۆیان و ئایینەکەیان بهێنین، جا لەسەر ئەمە سزا نی‌یە لەسەر ئەو کەسەی کە ئەیخواتەوە لەخاوەن کتێبەکان. وە وای دابنێین کە حەرامیش بێت لە کتێبەکانیانا، ئێمە وازیان لێ ئەهێنین، چونکە خۆیان باوەڕیان بە حەرامێتی نی‌یە، وە مامەڵەی ئێمەش لەگەڵیان بەپێی ئەوەیە کە باوەڕیان پی‌یەتی نەك بە پێی هەق کە هەیە.

**بەکارهێنانی ئارەق بۆ دەرمان کردن:**

خەڵك لە سەردەمی نەفامی‌دا پێش ئیسلام ئارەقیان بۆ چارەکردنی نەخۆشی ئەخواردەوە، وە کاتێ ئیسلام هات لێی قەدەغەکردن کە تەداوی پێ بکەن و حەرامی کرد.

ئیمامی ئەحمەد و موسلیم و ئەبوداود و (ترمذي) لە طاریقی کوڕی سوەیدی جوعفیەوە ئەگێڕنەوە کە ئەو پرسیاری لە پێغەمبەر ﷺ کردووە، دەربارەی عارەق، ئەویش ﷺ لێی قەدەغەکرد ئەمیش ووتوویەتی: من تەنها بۆ دەرمان دروستی ئەکەم) پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (إنه ليس بدواء، ولكنه داء)[1]. واتە: بەڕاستی ئارەق دەرمان نییە بەڵکو دەردە.

ئەبوداود لە ئەبو دەرداوە ئەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (إن الله أنزل الداء و الدواء، فجعل لكل داء دواءً، فتداووا، ولاتداووا بحرام)[2]. واتە: خوا دەرد و دەرمانی ناردووە، وە بۆ هەرهەردردێك دەرمانێکیشی داناوە، ئێوەش دەرمانی نەخۆشەکانتان بکەن، بەڵام بەحەرام دەرمان مەکەن.

وە هەندێ جار لە پێش ئیسلامدا ئارەقیان ئەخواردەوە بۆ خۆپاراستن لە سەرمای ئاوو هەوا ئیسلام لەوەش ڕێی لێ گرتن.

ئەبوداود گێڕاویەتییەوە کە دەیلەمی حیمیەری پرسیاری لە پێغەمبەر ﷺ کردو ووتی: ئەی نێرراوی خوا ئێمە لە ووڵاتێکی سارددا ئەژین و کاری گران ئەکەین، وە ئێمە لەگەنم شەرابێك دروست ئەکەین و ئەی خوێنەوە بۆ ئەوەی هێزمان تێدا بێت بۆ کارەکانمانو بەرامبەر سەرمای ووڵاتەکەمان؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : (هل يسكر؟) واتە: ئایا سەرخۆش کەرە؟

ووتی: بەڵێ.

فەرمووی: دە لێی دووربکەونەوە.

کابرا ووتی: خەڵك وازی لێ ناهێنێ.

فەرمووی: (فإن لم يتركوه فقاتلوهم) واتە: ئەگەر وازیان لێ نەهێنا دژیان بجەنگن[3].

وە هەندێ لە زانایان ڕێیان داوە تەداوی بە ئارەق بکرێت، بەمەرجێ دەرمانی حەڵاڵی ئەو دەردە دەست نەکەوێت کە لەجێی حەرامەکە بێت، وە بەکار هێنەرەکە بۆ خۆشی بەکاری نەهێنێ، وە لەو ئەندازەیەش زیاتر بەکار نەهێنێ کە پزیشکەکە بۆی دیاری ئەکات، وەك چۆن ڕێ یان داوە ئارەق بخورێتەوە لە حاڵەتی ناچاریدا، وە زانایان نمونەی ئەوشێوانەیان هێناوەتەوە، بەوە ئەگەر کەسێك پارویەك بگیرێتە قوڕگی خەریك بێت بخنکێ و هیچ نەبێت بیکات بەسەریا جگە لە ئارەق، یا

(١) مسلم (١٩٨٤/١٢) وأبوداود (٣٨٧٣) والترمذي (٢٠٤٧) وأحمد (٤/٣١٧).

(٢) أبوداود (٣٨٧٤).

(٣) أبوداود (٣٦٨٣).

كەسێك خەریك بێت بمرێ لە سەرما هیچی دەست نەكەوێ، خۆی لەمردن پێ ڕزگار بكات جگە لە پیاڵەیەك ئارەق یا قومێك، یا كەسێك تووشی تەنگو چەڵەمەی دڵی ببێت و خەریك بێ بمرێت، وە خۆی بزانێت یا پزیشك پێی ڕابگەیەنێت كە هیچ شتێك نییە ئەو مەترسی‌یەی لەسەر لابەرێ جگە لە خواردنەوەی ئەندازەیەكی دیاری كراو لە ئارەق نەبێت. وە ئەمە لەبەشی ئەو پێویستی‌یانەیە كە قەدەغەكراوەكان ڕەوا ئەكەن.

## تۆڵەی زیناكردن (حد الزنا)

١- ئیسلام بانگەوازی ژنهێنان و شوكردنی كردووەو بایەخی پێداوە، چونكە هەر ئەو سەلامەتترین ڕێگایە بۆ شكاندنی غەریزەی جنسی، وە چاكترین هۆیە بۆ ئامادەكردنی نەوەیەك كە ژن و مێرد هەڵسن بە پەروەردەكردنیان و چاودێری كردنیان، وە بەچاندنی سۆزەكانی خۆشەویستی‌و میهرەبانی‌و چاكیەتی و بەزەیی و پاك داوێنی و شەرەف و سەربلندی و نەفس بەرزی. تاوەكو ئەو نەوەیەش بتوانێ هەڵسێ بە كارو باری خۆی، و هاوبەشی بكات بە هەوڵەكانی خۆی لەبەرز كردنەوەی ژیانا.

٢- وە وەك چۆن چاكترین شێوازی داناوە بۆ سەرف كردنی غەریزە ڕێگریشی كردووە لەهەر هەڵسو كەوتێك جگە لەڕێگای شەرعی، وە وروژاندنی ئەو غەریزەیەی بەهەر هۆیەك لە هۆیەكان بێت قەدەغە كردووە، هەتا لانەداو دەرنەچێ لەو مەنهەجەی كە بۆی دانراوە.

جا بۆیە بەرگری كردووە كە تێكەڵی ژن و پیاو و سەما كردن و وێنە گرتنی سەرنج ڕاكێش و گۆرانی وتنی خراپ و سەیركردنی گومان لێكراو، وە هەموو ئەوانەی كە غەریزە ئەوروژێنن و بەرەو داوێن پیسی بانگەواز ئەكەن، بۆ ئەوەی هۆكارەكانی لاوازی‌و توانەوە تەشەنە نەكاتە ناو ماڵ و خێزانەوە.

٣- وە زینای داناوە بە تاوانێكی یاسایی كە شیاوی گەورەترین سزایە چونكە سەرەنجامی خراپی هەیەو سەرئەكێشێ بۆ زۆر لە خراپەو تاوانەكان.

پاشان پەیوەندی‌یە پیس و بەربەرەڵاكان و (إتصال جنسی) ناشەرعی، لەو شتانەیە كە هەڕەشەی لەناوبردنی كۆمەڵ و بڕانەوەی ئەكات، لەگەڵ ئەوەشدا كە یەكێكە لە تاوانە پەست و ئابڕو بەرەكان.

خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَلا تَقْرَبُوا الزِّنَى إِنَّهُ كَانَ فَاحِشَةً وَسَاءَ سَبِيلاً﴾ (الاسراء:٣٢)

واتە: نزیك مەكەونەوە لە زیناو لە هۆكارەكانی، بۆ ئەوەی نەكەونە ناوی، چونكە بەڕاستی زینا كردەوەیەكی ئەوپەڕ ناشیرین و پیسترین ڕێگایە.

٤- چونكە زینا هۆیەكی ڕاستەوخۆیە بۆ بڵاوبونەوەی نەخۆشییە ترسناكەكان كە لاشەی ئادەمیزاد لەناو ئەبەن و بە ویراسەت نەقڵ ئەبن لەباوكانەوە بۆ منداڵان و منداڵی منداڵان، وەك نەخۆشی زوهەری و سیلان و قورحە.

٥- وە زینا یەكێكە لە هۆیەكانی تاوانی كوشتن، چونكە غیرەت شتێكی سروشتییە لە مرۆڤدا، وە كەم وایە پیاوی بەڕێزیان ئافرەتی داوێن پاك هەبێت ڕازی بێت بە لادانی جنسی، بەڵكو پیاو هیچ وەسیلەیەك نادۆزێتەوە كە ئەو نەنگ و عارەی پێ بشواتەوە كە گەیشتووە بە خۆی یا بەكەس وكاری جگە لە خوێن ڕشتن.

٦- وە زینا یاسای ماڵ تێك ئەدات و قەوارەی خێزان ئەهێنێتە لەرزەو پەیوەندی ژن و مێردایەتی ئەپچڕێنێ، كە لەوەوە پەروەردەی منداڵەكان خراپ ئەبێت و ئەبێتە هۆی: پەرتەوازە بوون و لادان و تاوان كردن.

٧- وە لە زینادا ڕەگەز و بنەماڵە ون ئەبێت، وە ئەبێتە هۆی تاپۆكردنی سامان بۆ جگە لە خاوەنەكانی لەكاتی میرات بردندا.

٨- وە لە زینادا هەڵخەڵەتاندنی مێردی تێدایە بە شتێك كە هی خۆی نییە، چونكە جاری وا هەیە لە ئەنجامی زیناكە منداڵ دروست ئەبێت، ئیتر پیاوەكە منداڵێك بەخێو ئەكات كەمنداڵی كەسێكی ترە.

٩-زینا پەیوەندییەكی كاتییە هیچ ئەنجامێكی باشی نییە، بەڵكو كارێكی تازەڵیانەی ڕوتە مرۆڤی پاك دووری لێ ئەكات.

كورتەی قسە ئەوەیە كە بە كردەوە سابت بووە بە شێوەیەك كە ڕێگای گومانی تێدا نییە كە زینا گەورەترین زەرەرو زیانی لێ ئەكەوێتەوە، وە لەگەورەترینی هۆكارەكانە بۆ فسادو هەڵوەشاندنی خوڕەوشت، وە هۆیە بۆ گوێزانەوەی كوشندە ترین دەردو نەخۆشی، وە پاڵنەرە بەلاوەكانەوە بۆ ژن نەهێنان و دۆست گرتن، ئینجا گەورەترین هۆیە بۆ ڕابواردن و دەست بڵاوی و داوێن پیسی.

لەبەر ئەوانە و گەلێ شتی تر ئیسلام سزای زینای بە توندترین سزا داناوە.

جا ئەگەر ئەم سزایە توند و تیژ دەرئەكەوێت، ئەوە شوێنەواری تاوانەكە زۆر لەوە زیان گەیەنەرترە بۆ سەر كۆمەڵ.

وە ئیسلام بەراورد ئەكات لە نێوان ئەو زیانەی ئەكەوێتە سەر تاوانبار و ئەو زیانەی ئەكەوێتە سەر كۆمەڵ، وە حوكم بەكردنی سوكترینیان ئەكات، وە ئائەوەیە دادپەروەری.

وە گومان لەوەدا نییە کە زیانی سزای زیناکەر هاوسەنگ ناکرێ بەو زیانەی کە تەکەوێتە سەر کۆمەڵ لە بڵاوبوونەوەی زیناو داوێن پیسی و برەودان بە گوناهو خراپەکاری.

بەڕاستی سزای زیناکەر ئەگەرچی خودی تاوانبارەکە پێی زەرەرمەند ئەبێ بەڵام لە بەجێ هێنانیدا پاراستنی گیان و ناموسی تێدایە، وە ئاگاداری کردنی ئەو خێزانانەی کە خشتی یەکەمن لە دروست کردنی کۆمەڵدا. بە چاك بوونی خێزانەکان کۆمەڵ چاك ئەبێت و بە خراپ بوونیشیان خراپ ئەبێ.

بەڕاستی نەتەوەکان بە خورەوشتی چاك و داب و نەریتی بەرزییانەوە هەمن، هەروەها بە پاك ڕاگرتنیان لە پیسی و ئالودەبون و خاوێنییان لە شۆڕبوونەوەو پەستییەتی. لەگەڵ ئەمەشدا ئیسلام – لەلایەکی ترەوە – وەك چۆن ژن هێنان و شوکردنی ڕەوا کردووە چەند ژنەشی ڕەوا کردووە بۆ ئەوەی لە حەڵاڵدا بێ نیازی هەبێ لە حەرام، وە بۆ ئەوەی بەهانە نەمێنێ بۆ تاوانباران.

وە بە ڕاستی ئیسلام ئیحتیاتی کردووە (واتە ژیری و هوشیاری بەکار هێناوە) لە جێبەجێ کردنی ئەو سزایەدا بەقەدەر ئەوەی کە زیانکارانی پێ چاوترسێن کردووە.

١- جا لەو ئیحتیاتە ئەوەیە کە حەددەکانی لابردوە بە شوبهەو گومان، وە هیچ حەددێك جێبەجێ ناکرێ ئیللا دوای دڵنیا بونێکی تەواو نەبێت لە ڕودانی تاوانەکەدا.

٢- وە بۆ سابت کردنی ئەو تاوانەو چەسپاندنی ئەبێ چوار شایەتی پیاوی ڕاستگۆو دادپەروەر هەبێ، وە شایەتی ئافرەتی تێدا وەرناگیرێ، وە هەروەها شایەتی فاسق.

٣-وە ئەبێت هەموو ئەو شایەتانە بەچاو کرداری زیناکەیان بینیبێت وەك میل لەناو کلداندا، وە وەك گوریس لەناو بیردا، وە ئەوەش سابت بوونی گرانە.

٤- وە ئەگەر وا دابنێین کە سیانیان بەو شێوەیە شایەتی بدەن بەڵام چوارەمیان بە پێچەوانەی ئەوان، یا یەکێکیان پەشیمان بووەوە لە شایەتییەکەی ئەوە حەددی (قذف) تۆمەت هەڵبەستنیان لێ ئەدرێ.

جا ئەو ئیحتیاتە کە ئیسلام دایناوە لە چەسپاندنی ئەو جەریمەیەدا بە جۆرێکە کە چەسپاندنی ئەو جەریمەیە بە شێوەیەکی قەطعي و بڕاوە ڕەت ئەکاتەوە کەواتە ئەو سزایە لە ترساندنو تۆقاندنەوە نزیکترە، وەك لە سابت کردن و جێبەجێ کردن

وە لەوانەیە کەسێك بڵێت: ئەگەر حەد لەو شتانە بێت کە بە دەگمەن جێبەجێ بکرێ، لەبەر گرانی چەسپاندنی بەڵگەکانی، ئەی کەواتە ئیسلام بۆچی دایناوە؟

وەڵامەکەی وەك وتمان: ئەوەیە کە ئیسلام کاتێ سەختی و توندو تیژی تاوانەکە تێبینی ئەکات هەزار حیسابی بۆ ئەکات پێش ئەوەی ئەنجام بدرێت. کە ئەمەش جۆرێکە لە هەڕەشە بە نیسبەت ئەو تاوانەوە کە پاڵنەر و هاندەری زۆری هەیە بۆ کردنی، بە تایبەتیش کە غەریزەو خوی جینسی لە غەریزە بەهێزەکانە، ئەگەر بەهێزترینیان نەبێت بە گشتی، وە گونجاوە کە ئەو غەریزە بەهێزە سزای بەهێزی بەرەوڕو بکرێت، چونکە ئەوە لە هۆیەکانی بەرگرییە لە هەڵچونی ئەو غەریزەیە.

**حەرام کردنی زینا بە شێنەیی و پلە پلە:**

زۆر لەزانایان ڕایان وایە کە دانانی سزای زینا پلە پلە بووە وەك لە حەرام بوونی ئارەق دا ڕووی داوە، وە وەك لەدانانی ڕۆژو گرتنیشدا هەر بەو شێوەیە بووە.

جا سزای زینا کردن لە سەرەتاوە ئازاردان بوو لەسەرەتاوە فەرمان بووە بە سەرزەنش و هەڕەشە کردن. خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿وَالَّذَانِ يَأْتِيَانِهَا مِنكُمْ فَآذُوهُمَا فَإِنْ تَابَا وَأَصْلَحَا فَأَعْرِضُوا عَنْهُمَا﴾ (النساء:١٦).

واتە: وە ئەو دووانەی کە ئەکەونە تاوانی زیناوە لە ئێوە، ئازاریان بدەن بە لێدان و هەڕەشە کردن، جا ئەگەر تۆبەیان کردو پەشیمان بوونەوە و خۆیان چاك کرد وازیان لێبهێنن.

پاشان حوکمەکەی پلە پلە بەرز بووەوە بۆ بەندکردن لە ماڵاندا. خوای گەورە ئەفەرمووێ: ﴿وَاللَّاتِي يَأْتِينَ الْفَاحِشَةَ مِنْ نِسَائِكُمْ فَاسْتَشْهِدُوا عَلَيْهِنَّ أَرْبَعَةً مِنْكُمْ فَإِنْ شَهِدُوا فَأَمْسِكُوهُنَّ فِي الْبُيُوتِ حَتَّى يَتَوَفَّاهُنَّ الْمَوْتُ أَوْ يَجْعَلَ اللَّهُ لَهُنَّ سَبِيلاً﴾ (النساء:١٥).

واتە: ئەوانەی کە داوێن پیسی ئەکەن لە ژنانی ئێوە، ئەوە داوای چوار شایەتی عادل لە موسوڵمانان بکەن لەسەریان، جا ئەگەر شایەتی‌یان دا لەسەریان، ئەوە لە ماڵەکاندا بەندیان بکەن هەتا ئەمرن یاخوا ڕێگایەکی تریان بۆ ئەکاتەوە.

لەپاش ئەوە فەرمانی خوا جێگیر بوو، وە ڕێگای بۆ کردنەوە، وە سزای زیناکەری کوڕ و کچی کرد بە سەد دار، وە سزای زیناکەری پیاو و ژنی دانا بە ڕەجم کردنیان هەتا مردن.

وە ئەو شێنەیی و پلە پلەیەش لەبەر ئەبوو تا کۆمەڵ بەرز بکاتەوە، وە بە نەرمی و میهرەبانی بەرەو پاکی و پاك داوێنی بەرێت، وە بۆ ئەوەی ئەو گواستنەوەیە کارێکی گران نەبێت لەسەر کۆمەڵ و لەئاینەکەیاندا تەنگی نەبێت، وە بەڵگەشیان حەدیسەکەی عوبادەی کوڕی صامیتە کە

ووتوویەتی پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (خذوا عني، قد جعل الله لهنَّ سبيلا: البكر بالبكر جلد مئة و نفي سنة، و الثيب بالثيب جلد مئة و الرجم) رواه مسلم، و أبو داود، و الترمذي[1].

واتە: لەمنی وەربگرن، خوا ڕێی بۆ کردنەوە: کوڕ بە کچ سەد دار و ساڵێك دەربەدەرکردن، پیاو بە ژن سەد دارو سەنگ باران کردن.

وە ئێمە ئەبینین کە ڕواڵەتی هەردوو ئایەتەکەی سورەتی (النساء) کە لە پێشەوە هاتن باسی حوکمی (سحاق ولواط) لێخشاندن و نێربازی ئەکات، کە حوکمەکەیان جیایە لە حوکمی زینا کە دانراوە لە سورەتی نورِدا.

جا ئایەتی یەکەم دەربارەی لێخشاندنە لە نێوان ژناندا (سحاق)

﴿وَاللَّاتِي يَأْتِينَ الْفَاحِشَةَ مِنْ نِسَائِكُمْ فاستشهدوا عليهنَّ أربعةً منكم فإن شهدوا فأمسكوهن في البيوت حتى يتوفاهن الموت أو يجعل الله لهنَّ سبيلاً﴾ (النساء: من الآية١٥)

وە ئایەتی دووەم دەربارەی نێربازییە:

﴿وَالَّذَانِ يَأْتِيَانِهَا مِنْكُمْ فَآذُوهُمَا فإن تابا وأصلحا فأعرضوا عنهما﴾(النساء: من الآية١٦)

١- واتە وە ئەو ژنانەی فاحیشە ئەکەن کە (سحاق)ە ئەویش لێ خشاندنی ژنە لەگەڵ ژندا. چوار پیاو بە شایەت بگرن لەسەریان، ئەگەر شایەتییان دا لەسەریان، لە ماڵەکاندا بەندیان بکەن بە شێوەیەك ئەو ژنە تەنهاو دوور بێت لەو ژنەوە کە لێخشاندنەکەیان لەگەڵ یەك کردووە، هەتا ئەمرێت، یاخوا ڕێگایەکیان بۆ ئەکاتەوە بە دەرچوون لەو تاوانە بە تۆبە، یان بە شوکردنیان، کە ئیتر پێویستییان بە سیحاق کردن نەمێنێ.

٢- وە ئەو دوو پیاوەی کە فاحیشە ئەکەن کە (لواط) ە تاوانی نێربازی ئەکەن واتە یەکێکیان لە دوواوە ئەچێتە لای ئەوی تریان، پاش سابت بوونی بە شایەتیدان ئازاریان بدەن و لێیان بدەن، جا ئەگەر تۆبەیان کرد پێش ئەوەی ئازاریان بەن و تۆڵەیان لەسەر بەجێ بهێنن، وە خۆیان پاك کردەوەو کردەوەکانیان چاك کرد وازیان لێ بهێنن و تۆڵەیان بەسەردا جێبەجێ مەکەن.

---

(١) أحمد (٥/٣١٣) ومسلم (١٦٩٠/١٢) وأبوداود (٤٤١٥) والترمذي (١٤٣٤) وابن ماجة (٢٥٥٠).

### ئەو زینایەی کە ئەبێتە هۆی (حد) تۆڵە:

هەموو (إتصال) جوت بوونێکی جینسی کە لەسەر بناغەیەکی ناشەرعی بێت، بە زینا دائەنرێت و سزا بڕیار دراوەکەی ئەکەوێتە سەر لەو ڕووەوە کە تاوانێکە لەو تاوانانە کە تۆڵەیان بۆ دانراوە.

وە ئەو زینایەش کە تۆڵە پێویست ئەکات ئەوەیە کە سەری زەکەری پیاو - یا بە ئەندازەی ئەوە ئەگەر قرتابوو - وون بێت لەناو لەشێکی حەرام کراودا، کە جێی ئارەزوی مرۆڤ بێت بە سروشت، جگە لە نیکاحی شوبهە، یا ناو هاتنەوەشی لەگەڵدا نەبێت.

بەڵام ئەگەر خۆشی وەرگرتن لە ژنێکی بێگانەی حەرام بێت لە شوێنەکانی تری جگە لە ناو لەشی، ئەوە تۆڵە دانراوەکە بۆ زینا پێویست ناکات، هەرچەندە ئەم کارەش پێویست بە هەڕەشەو تۆقاندن ئەکات.

لە ئیبنو مەسعودەوە خوالێی ڕازی بێت فەرموویەتی: پیاوێك هاتە لای پێغەمبەر (ﷺ) ووتی: ژنێکم لە خوار شارەوە گرت تێر لەگەڵیا ڕام بوارد هەتا ڕەحەت بووم، بەڵام زینام لەگەڵ نەکرد. وە من وام لەبەر دەستدا چێم لێ ئەکەی بە ئارەزووی خۆت لێم بکە. عومەر پێی ووت:

خوا دای پۆشیبووی ئەگەر خۆت داپۆشیایە، پێغەمبەر (ﷺ) هیچ وەڵامی نەدایەوە، پیاوەکە ڕۆیشت، پێغەمبەر ﷺ کەسێکی نارد بە شوێنیدا وبانگی کرد، پاشان ئەم ئایەتەی بۆ خوێندەوە کە ئەفەرمووێ:

﴿وَأَقِمِ الصَّلاَةَ طَرَفَيِ النَّهَارِ وَزُلَفاً مِنَ اللَّيْلِ إِنَّ الْحَسَنَاتِ يُذْهِبْنَ السَّيِّئَاتِ ذَلِكَ ذِكْرَى لِلذَّاكِرِينَ﴾ (هود:١١٤)

واتە: نوێژ بە تەواوترین شێوە جێبەجێ بکە لە دولای ڕۆژدا بەیانیو ئێوارە، وە لەکاتەکانی شەودا. بەڕاستی کردەوە چاکەکان گوناهە پێشوەکان ئەشواتەوە، وە ئەمە پەندو ئامۆژگاریيە بۆ ئەوانەی پەند وەرئەگرن.

پیاوێك لەو کۆمەڵە وتی: ئەی نێرراوی خوا ئەوە تایبەت بەوە، یا بۆ گشت کەسێکە؟! فەرمووی: بۆ گشت کەسێکە. موسلیم و ئەبو داود و ترمذي گێڕاویانەتەوە[1].

---

(١) مسلم (٢٧٦٣) وأبو داود (٤٤٦٨) والترمذي (٣١١٢) وابن حبان (١٧٢٨).

**بەشەکانی زیناکەران :**

زیناکەر: یا کوڕ ئەبێت یا کچ، یا ژن یا پیاو، وە هەریەکەیان حوکمی تایبەت بە خۆی هەیە.

**(حد) تۆڵەی کوڕ و کچ**

زانایان لەسەر ئەوە ڕێك کەوتون کە کوڕ و کچی ئازاد ئەگەر زینا بکەن سەد داریان لێ ئەدرێ، وەك یەك، بەپێی فەرمودەی خوای گەورە کە لە سورەتی نووردا هاتووە: ﴿الزَّانِيَةُ وَالزَّانِي فَاجْلِدُوا كُلَّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا مِائَةَ جَلْدَةٍ وَلا تَأْخُذْكُمْ بِهِمَا رَأْفَةٌ فِي دِينِ اللَّهِ إِنْ كُنْتُمْ تُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ وَلْيَشْهَدْ عَذَابَهُمَا طَائِفَةٌ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ﴾ (النور:٢)

واتە: کوڕ و کچی زیناکەر سزای هەریەکەیان سەد قەمچی‌یە، وە با بەزەیی پیا هاتنەوەیان نەتان گرێ لە جێبەجێ کردنی حوکمی خوادا کە حەددەکە بوەستێنن یان سوکی بکەن. ئەگەر ئێوە باوەڕتان هەیە بە خواو بە ڕۆژی دوایی، وە با کۆمەڵێك لە باوەڕداران ئامادەی سزادانیان بن، لەبەر ئامۆژگاری و پەند وەرگرتن.

**دارلێدان و دوورخستنەوەی زیناکەر لە یەك کاتدا :**

زانایان هەرچەندە ڕێ کەوتون لەسەر پێویست بوونی دار لێدانی زیناکەر، بەڵام جیاوازی‌یان هەیە لەوەدا کە دوور خستنەوەشی لەگەڵدا بێت:

١- شافیعی و ئەحمەد ووتویانە: دارلێدان و شاربەدەرکردنی ساڵێك لەسەر زیناکەر کۆئەکرێتەوە. بەپێی ئەوەی بوخاری و موسلیم لە ئەبی هورەیرە و زەیدی کوڕی خالیدەوە گێڕاویانەتەوە: کە پیاوێکی دەشتەکی هاتە لای پێغەمبەر (ﷺ) ووتی: ئەی نێرراوی خوا داوات لێ ئەکەم بەخوا کە هەر بە کتێبەکەی خوا حوکمم بکەی، لایەنەکەی تریش – کە لەو زانا تر بوو- ووتی: بەڵێ بە کتێبی خوا حوکممان بکەو ڕێم بدە با من قسە بکەم. پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: بڵێ. ئەویش ووتی: کوڕەکەم کرێگرتە بووە لای ئەم کابرایە و زینای لەگەڵ ژنەکەیدا کردووە، وە پێم ڕاگەیەنراوە کە ئەبێ کوڕەکەم ڕەجم بکرێ، وە من سەد سەر مەڕم داوە بەم کابرایە و منداڵەکەش. دوایی پرسیارم لە ئەهلی عیلم کردووە، پێیان وتم لەسەر کوڕەکەت سەد دارەو ساڵێکیش دوورخستنەوە، وە لەسەر ژنی ئەو کابرایەش سەنگ بارانە. پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: بەو زاتەی گیانی منی بە دەستە بە کتێبەکەی خوا حوکمتان ئەکەم، - منداڵەکەو مەڕەکان ئەگەڕێنەوە بۆخۆت. وە ئەبێ کوڕەکەت سەد داری لێبدرێ و ساڵێك دووربخرێتەوە - ئەی ئونەیس- پیاوێك بوو لەهۆزی ئەسلەم - بچۆ بۆ لای ژنی ئەو کابرایە، ئەگەر ئیعترافی کرد ڕەجمی بکە.

ئەڵێ: چوو بۆ لای ژنەکە ئیعترافی کرد. پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی دا ڕەجمیان کرد[1].

وە بوخاری ئەگێڕێتەوە لە ئەبی هورەیرەوە کە پێغەمبەر حوکمی کردووە لەسەر کەسێك کە (مُحصَن) نەبوایە واتە کوڕ بوایە یا کچ — وە زینای بکردایە، بەجێبەجێ کردنی حەد لەسەری و نەفی کردنی ساڵێك[2].

وە موسلیم تەخریجی کردووە لە عوبادەی کوڕی صامیتەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (خذو عني، خذوا عني، قد جعل الله لهن سبيلا: البكر بالبكر جَلْدُ مائةٍ و نفيُ سَنَةٍ، و الثيب بالثيب جَلدُ مائةٍ و الرَّجم).

واتە: لە منی وەربگرن، لە منی وەربگرن، وا خوا ڕێگای بۆ کردنەوە: کوڕ بە کچ سەد داری لێ ئەدرێ و ساڵێك دوورخستنەوە، پیاو بە ژن سەد داری لێ ئەدرێ و بەردەباران.

وە خولەفای ڕاشدین ئەو دورخستنەوەیان کردووەو کەسیش ئینکاری لێنەکردووە. ئەبو بکر خوا لێی ڕازی بێ خەڵکی دورئەخستەوە بۆ فەدەك، وە عومەر خوا لێی ڕازی بێت بۆ شام، وە عثمان خوا لیێ ڕازی بێت بۆ میسر، وە عەلی خوا لیێ ڕازی بێت بۆ بەسرە.

وە شافیعیەکان ڕایان وایە کە تەرتیب نیە لە نێوان لێدان و دورخستنەوەدا ئەو ئەمیرە ئارەزوی خۆیەتی کامیان پێش ئەخات.

وە بە مەرجیان داناوە کە دوورخستنەوە کە بۆ ماوەیەك بێت کەنوێژی تێدا کورت بکرێتەوە، چونکە مەبەست لەو دوورخستنەوەیە غەریب بوونە لەکەس و کار و نیشتمان، وە لە ماوەیەکدا کە کەمتر بێت لە ماوەی نوێژ تێدا کورت کردنەوە حوکمی ئەو شارەی هەیە، وە ئەگەر حاکم ڕای وابوو کە زیاتر دووربخرێتەوە، بۆی هەیە بیکات.

وە ئەگەر ژنەکە دوور بخرێتەوە، بەبێ مەحرەم دوور ناخرێتەوە، یا لەگەڵ مێرددا، وە ئەگەر لەگەڵیا نەچوو بە کرێ نەبێت ئەبێ کرێی بداتێ، وە ئەو کرێیەش هەر لە ماڵی ژنەکە ئەدرێت.

٢-مالیك و ئەوزاعی ووتویانە: پێویستە کوڕی زیناکەری ئازاد دوور بخرێتەوە، بەڵام کچی زیناکەری ئازاد دوورخستنەوەی لەسەر نیە، چونکە ئافرەت عەورەتە.

٣-وە ئەبو حەنیفە ووتویەتی: دوورخستنەوە و لێدان لەسەر کەسێك کۆناکرێنەوە مەگەر حاکمەکە بە بەرژەوەندی بزانێ، ئەو کاتە بۆی هەیە هەردووکیان دووربخاتەوە چەندە ڕای لەسەر بێت.

---

(١) البخاري (٦٨٥٩) ومسلم (١٦٩٧و١٦٩٨).

(٢) أحمد (٢/٤٥٣) والبخاري (٦٨٣٣).

## تۆڵەی (مُحصَنْ) ژن و پیاو

بەڵام (المحصن الشیب) ژن و پیاوی زیناکەر کە لەوەو پێش زەواجیان کردبێ، زانایان لەسەر ئەوە ڕێکن کە ئەگەر زینایان کرد پێویستە (رجم) بەرد باران بکرێن، هەتا ئەمرن، پیاو بێت یان ژن، وەبەڵگەشیان ئەمانەی لای خوارەوەیە:

١- لە ئەبی هورەیرەوە کە فەرموویەتی: پیاوێك هاتە لای پێغەمبەر (ﷺ) کە لە مزگەوت بوو، هاواری لە پێغەمبەر (ﷺ) کردو ووتی: ئەی نێرراوی خوا، من زینام کردووە، پێغەمبەر (ﷺ) ڕووی لێ وەرگێڕا. کابرا چوار جار قسەکەی دووبارەکردەوە. کاتێ چوار جار شایەتی لەسەر خۆی دا. پێغەمبەر (ﷺ) بانگی کردو پێی فەرموو: (تۆ شێتیت)؟ ووتی: نەء، فەرمووی: (ژنت هێناوە) ووتی: بەڵێ. پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (بیبەن ڕەجمی بکەن) ئیبنو شیهاب ووتویەتی: ئەو کەسەی گوێی لەجابیر بووە بۆی گێڕامەوە کە جابیر وتویەتی: من لەو کەسانە بووم کە ڕەجمیان کرد، لە (مصلی) نوێژگەکە بەرد بارانمان کرد، کاتێ بەردەکانی بەرکەوت هەڵهات و لە (الحرَّة) گرتمانەوە، لەوێ بەرد بارانمان کرد هەردوو شێخ بوخاری و موسلیم لەسەری ڕێکەوتون[1].

وە ئەوە بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە (إحصان) ژن هێنانی پیاو و شوکردنی ژن بە یەکجار دان پیانان سابت ئەبێ، وە وەلام دانەوە بە بەڵی دان پیانانە.

٢- وە لە ئیبنو عەبباسەوە کە ووتویەتی: جارێك عومەر ووتاری ئەدا فەرمووی: (خوای گەورە محمدی ناردووە بە حەق و کتێبی ناردۆتە خوارەوە بۆی، وە لەوەی کە بۆی نێرراوەتە خوارەوە ئایەتی ڕەجمە. ئێمە خوێندومانەتەوە و لێی تێگەیشتوین، وە پێغەمبەر (ﷺ) ڕەجمی کردووە و ئێمەش ڕەجممان کردووە. وە من ترسی ئەوەم هەیە پاش ماوەیەکی زۆر کەسێك بڵێت: ئێمە ڕەجم لە کتێبەکەی خوادا نابینین، جا گومڕا بن بە وازهێنان لە فەرزێك کە خوا ناردویەتیە خوارەوە، چونکە ڕەجم کردن حەقە لەسەر ئەو کەسەی کە زینا ئەکات لە ژن و پیاو ئەگەر (مُحصَن) بێت،[2] کاتێك بەڵگە ببێت لەسەری یا ئەفرەتەکە دوگیان بوو، یا خۆی دانی پێدانا. سوێند بە خوا ئەگەر لەبەرئەوە نەبوایە خەڵك بڵێن: عومەر لە کتێبی خوادا شتی زیادکردووە ئەم نوسیبەوە) هەردو شێخ و ئەبوداودو (ترمذي) و نەسائی بە کورتی و بە درێژی گێڕاویانەتەوە[3].

---

(١) البخاري (٦٨١٥و٦٨١٦) ومسلم (١٦٩١/١٦).

(٢) واتە: ئەگەر پیاو بێت ژنی هێنابێ، وە ئەگەر ژنیش بێت شوی کردبێ.

(٣) البخاري (٣٨٧٢) ومسلم (١٦٩١/١٥) وأبوداود (٤٤١٨) والترمذي (١٤٣١).

وە لە (نیل الأوطار) داهاتووە: کە سەنگ باران کردنی ژن و پیاوی زیناکەر واجبە و ئیجماعی لەسەرە، وە لەبەحردا لە دەرچووەکانەوە (خەوارج) گێڕراوەتەوە کە ووتویانە: واجب نیيە. وە هەروەها ئیبنو عەرەبی لێیانەوە ئەگێڕێتەوە.

وە هەروەها لە هەندێ موعتەزیلەوە ئەگێڕێتەوە وەك نەززام و هاوەڵەکانی، و هیچ پاڵپشتێك نیيە بۆیان ئەوە نەبێ کە دەڵێن چونکە لە قورئاندا باسی نەکراوە، وە ئەو قسەیەش پوچەڵە.

چونکە بە سوننەتی موتەواتیر چەسپاوە و زانایان لەسەری ئیجماعیان هەیە، وە بە دەقی قورئانیش چەسپاوە، بەپێی حەدیسەکەی عومەر کە لەناو کۆمەڵی صەحابەدا ووتویەتی: لەو ئایەتانەی هاتونە خوارەوە بۆ سەر پێغەمبەر (ﷺ) ئایەتی ڕەجم بووە، جا ئێمە خوێندومانەتەوە و لێی تێگەیشتون، وە پێغەمبەر (ﷺ) بەپێی ئەو ئایەتە ڕەجمی ژن و پیاوی زیناکەری کردووە، و ئێمەش دووای ئەو ڕەجمان کردووە[1]،

وە سڕانەوەی ئایەت سڕینەوەی حوکمەکەی ناگرێتەوە. وەك ئەبو داود تەخریجی کردووە لە حەدیسی ئیبنو عەبباسەوە.

وە ئەحمەد و طەبەرانی لە (الکبیر)دا تەخریجیان کردووەلە حەدیسی ئەبی ئومامەی کوڕی سەهلەوە لە عەجمائی پوری‌یەوە کە ووتویەتی: لەو ئایەتانە کە خوای گەورە ناردیە خوارەوە ئەم ئایەتەش بووە کە فەرموویەتی: (الشيخ و الشيخة إذا زنيا فارجموهما البتة بما قضيا من اللذة)[2] واتە: ژن و پیاوی بەتەمەن هەرکاتێك زینایان کرد ڕەجمیان بکەن بە قەطعي و بەبێ گەڕانەوە بە هۆی ئەو کارەوە کە کردویانە.

وە ئیبنو حیببان لە صەحیحەکەیدا تەخریجی کردووە لە حەدیسی ئوبەی کوڕی کەعبەوە بە لەفزی: سوڕەتی ئەحزاب ئەوەندەی سوڕەتی بەقەڕە ئەبوو، وە ئایەتی (الشيخ و الشيخة.. الخ)ی تێدابوو[3].

---

(١) تەخریجی ئەم حەدیسە ڕابوورد.

(٢) أحمد (٥/١٨٣) ومجمع الزوائد (٦/٢٦٥) والطبراني في المعجم الكبير (٢٥/٤٥٥) وتلخيص الحبير (٤/٥٨).

(٣) إبن حبان (٤٤٢٨).

**مەرجەکانی (إحصان)[1]:**

ئەبێ ژن و پیاوی زیناکەری (محصن) کە شیاوی ڕەجم کردن بن بەهۆی زیناوە ئەم مەرجانەی لای خوارەوەیان تێدابێت:

١- تەکلیف: واتە ئەو کەسەی کە کردەوەی زیناکە ئەکات پێ‌گەیشتو و ژیر بێت. چونکە ئەگەر ئەو کەسە شێت بوو یا منداڵ بوو حەددی لێ نادرێ. بەڵکو ئەتۆقێنرێ و تەعزیر ئەکرێ.

٢- ئازادی: چونکە ئەگەر پیاوەکە و ژنەکە کۆیلە بوون ڕەجمیان لەسەر نابێت بەپێی فەرموودەی خوای گەورە کە دەربارەی تۆڵەی کەنیزەك فەرمویەتی: ﴿فَإِنْ أَتَيْنَ بِفَاحِشَةٍ فَعَلَيْهِنَّ نِصْفُ مَا عَلَى الْمُحْصَنَاتِ مِنَ الْعَذَابِ﴾ (النساء:٢٥).

واتە: ئەگەر کەنیزەکەکان زینایان کرد نیوەی ئەو سزایەیان لەسەرە کە لەسەر ئافرەتانی ئازاد دانراوە.

وە وەك ئاشکرایە ڕەجم کردن بەش بەش ناکرێ (کەواتە هەر لەسەریان نی‌یە).

٣- چونەلا لە نیکاحی صەحیحدا: واتە: ئەو کەسەی کە زیناکەی کردوە پێش زیناکە ژنی هێنابێ بەشێوەیەکی صەحیح وە چوبێتە لای، با ئاویشی نەهاتبێتەوە.

بەڵام ئەگەر چوونە لاکە لە نیکاحێکی حەرام و فاسیددا بووبێت، ئەوە (الإحصان)ی پێ بەدی نایەت وە مانەوەی زەواجەکە سابت نابێ بۆ مانەوەی سیفەتی (إحصان)، جا ئەگەر یەك جار بە دروستی ژنی هێنابێت و چوبێتە لای ژنەکەی و لە پاشاندا پەیوەندی ژن و مێردایەتی‌یان بچڕابێت، دوای ئەوە زینا بکات لە کاتێکدا کە ژنی نەبێت ئەوە هەر بە (محصن) ئەژمێررێو ڕەجم ئەکرێت.

وە هەروەها ئافرەتیش ئەگەر مێردی کرد، پاش ئەوە تەڵاق دراو بە تەڵاق دراوی زینای کرد، هەر بە (محصنة) ئەژمێررێ و ڕەجم ئەکرێت.

---

(١) (إحصان) لە قورئاندا هاتووە بەمانای ئازادی (فعليهن نصف ما على المحصنات من العذاب) سورة النساء.

واتە: ژنە ئازادەکان. وە بەمانای پاك داوێنی: (والذين يرمون المحصنات) سورة النور. واتە ژنە پاك داوێنەکان. وە بە مانای زەواج کردن: (والمحصناتُ من النساء) سورة النساء. واتە ژنە شوکردوەکان.

**موسڵمان و بێباوەڕ یەکسانن لە حددا :**

وە وەك چۆن تۆڵە لەسەر موسڵمان پێویست ئەبێت کاتێ چەسپاو سابت بوو کە زینای کردووە، هەروەها پێویستە لەسەر ذیمی و هەڵگەڕاوە لە ئیسلام.

چونکە کافری ذیمی ئەو حوکمانەی بەسەر موسڵماناندا ئەڕوات بەسەر ئەویشدا ئەڕوات، وە چەسپاوە کە پێغەمبەر (ﷺ) دوو جولەکەی (مُحصن)ی ڕەجم کردووە کاتێ زینایان کردووە.

وە هەڵگەڕاوەش لە ئیسلام، حوکمی ئیسلام ئەیگرێتەوە، وە هەڵگەڕانەوەکە دەری ناکات لەوەی کە حوکمی ئیسلام بەسەریا جێبەجێ بکرێ.

لە ئیبنو عومەرەوە: کە جولەکە ژن و پیاوێك لە خۆیان هێنا بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ) کە زینایان کردبوو.

پێغەبەر (ﷺ) پێی فەرموون: (لە نامەکەی خۆتاندا چی ئەبینن؟)

وتیان: ڕوویان ڕەش ئەکرێت و نابڕوویان ئەبرێت.

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (درۆ ئەکەن. ڕەجم کردنی تێدایە، تەوڕات بهێنن و بیخوێننەوە ئەگەر ڕاست ئەکەن).

جا خوێنەرێکی تەوراتیان هێنا لە خۆیان و خوێندیەوە کاتێ گەیشتە سەر ئەو شوێنە دەستی خستە سەر، پێیان ووت: دەستت بەرزکەرەوە، ئەویش دەستی بەرزکردەوە ووشەکانی ئەدرەوشایەوە، ووتی: - یان ووتیان:- ئەی موحەمەد: بە ڕاستی ڕەجم کردنی تێدایە، بەڵام ئێمە لە نێوان خۆماندا شاردبوومانەوە) پێغەبەر (ﷺ) فەرمانی دا ڕەجمیان کردن.

ئیبنو عومەر ئەڵێ: چاوم لێ بوو پیاوەکە خۆی ئەدا بەسەر ژنەکەدا لە بەردەکان ئەی پاراست. بوخاری و موسلیم گێڕاویانەتەوە.

وە لە ڕیوایەتەکەی ئیمامی ئەحمەددا هاتووە: (کە خوێنەرێکیان هێنا لە خۆیان کوێر بوو پێیان ئەوت ئیبنو صوریا)[١].

وە لە جابیری کوڕی عبداللە وە ووتویەتی: پێغەمبەر (ﷺ) پیاوێکی ئەسلەمی و پیاوێکی جولەکەی ڕەجم کردوە. ئەحمەد و موسلیم گێڕاویانەتەوە[٢].

---

(١) أحمد (٢/٥) والبخاري (٧٥٤٣) ومسلم (١٦٩٩/٢٦).

(٢) أحمد (٣/٣٢١) ومسلم (١٧٠١).

وه لە بەرِرائی کوڕی عازیبەوە فەرموویەتی: (پیاوێکی جولەکەی ڕووڕەش کراوی حەد لێدراویان بەلای پێغەمبەردا ﷺ تێپەڕاند، ئەویش بانگی کردن و پێی فەرموون: (ئایا تۆڵەی زینا لە کتێبەکەتاندا بەو شێوەیە ئەبینن؟) ووتیان: بەڵێ (جا پیاوێکی لە زانایانی جولەکە بانگ کردو پێی فەرموو: تو ئەو خوایەی تەوراتی بۆ موسا ناردە خوارەوە، تۆڵەی زینا لە کتێبەکەتاندا بەو شێوەیە ئەبینن؟)

ووتی: نەء . وە ئەگەر بەو شیوەیەش سوێندت نەدامایە تۆڵەی ڕەجم کردنم پێ ڕانەئەگەیاندی. بەڵام زینا لەناو گەورەکانماندا زۆر بووە. وە ئێمە ئەگەر گەورەیەکمان بگرتایە وازمان لێئەهێنا، وە ئەگەر بێ دەسەڵاتمان بگرتایە تۆڵەمان لێ ئەسەند. ئیتر ووتمان: (وەرن با لەسەر شتێك ڕێك بکەوین لەسەر گەورەو بێ دەسەڵات بەجێی بهێنن. ئیتر ڕووڕەش کردن و دارلێدانمان دانا لە جێی ڕەجم کردن.

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (اللهم إني أول من أحيا أمرك إذ أماتوه).

واتە: خوایە من یەکەم کەسم ئەو فەرمانەت زیندو ئەکەمەوە کاتێ ئەمانە مراندویانە. ئیتر فەرمانی دا ڕەجمیان کرد.

جا خوای گەورە ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە:

﴿يَا أَيُّهَا الرَّسُولُ لا يَحْزُنْكَ الَّذِينَ يُسَارِعُونَ فِي الْكُفْرِ مِنَ الَّذِينَ قَالُوا آمَنَّا بِأَفْوَاهِهِمْ وَلَمْ تُؤْمِنْ قُلُوبُهُمْ وَمِنَ الَّذِينَ هَادُوا سَمَّاعُونَ لِلْكَذِبِ سَمَّاعُونَ لِقَوْمٍ آخَرِينَ لَمْ يَأْتُوكَ يُحَرِّفُونَ الْكَلِمَ مِنْ بَعْدِ مَوَاضِعِهِ يَقُولُونَ إِنْ أُوتِيتُمْ هَذَا فَخُذُوهُ وَإِن لَم تُؤْتَوْهُ فَاحْذَرُوا﴾ ( المائدة من آية:٤١).

واتە: ئەی ڕەوانەکراو با تۆ غەمبار نەکات ئەو کەسانەی کە پەلە ئەکەن لە ئینکاری پێغەمبەرایەتیت لەو مونافیق و دوو ڕوانەی کە ئیسلامەتی دەردەخەن لەکاتێکدا دڵیان خاڵییە لە ئیسلام، چونکە بەڕاستی من سەرت ئەخەم بەسەر ئەواندا. هەروەها تۆ غەمبار نەکات پەلە کردنی جولەکە بۆ ئینکاری پێغەمبەرایەتیت، چونکە ئەوان زۆر گوێ ئەگرن بۆ درۆ، وە ڕازین بەوەی کە ئەحبارەکانیان هەڵیئەبەستن، ئەوانە گوێ ئەگرن و جاسوسی ئەکەن بۆ کۆمەڵێکی تر کە هەر نەهاتونە لای تۆ، کەسانێك کە وشەکانی تەورات ئەگۆڕن دوای ئەوەی کە لێی تێ ئەگەن، ئەڵێن بەو کەسەی کە ئەیتێرن بۆ پرسیار کردن: بڕۆن بۆلای محمد، ئەگەر فەرمانی پێ کردن بە ڕوڕەش کردن و دار لێدان – هەروەك خۆیان گۆڕیویانە – ئەوە وەری بگرن، بەڵام ئەگەر فەتوای بۆ دان بە ڕەجم کردن ئەوە خۆتانی لێ لادەن و ڕازی مەبن.

پاشان خوای گەورە ئەم ئایەتانەی ناردە خوارەوە: ﴿وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللَّهُ فَأُولَئِكَ هُمُ الكافرون﴾ (المائدة: ٤٤).

﴿وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللَّهُ فَأُولَئِكَ هُمُ الظالمون﴾ (المائدة: ٤٥).

﴿وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللَّهُ فَأُولَئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ﴾ (المائدة:٤٧).

بەرڕاء وتویەتی: ئەم ئایەتانە هەموویان دەربارەی بێباوەڕان هاتونە خوارەوە. ئەحمەد و موسلیم و ئەبو داود گێڕاویانەتەوە[1].

**ڕای زانایان :**

خاوەنی (البحر) ئیجماعی زانایان ئەگێڕێتەوە لەسەر ئەوەی کە بێباوەڕی جەنگی ئەگەر زینا بکات ئەبێ داری حەددی لێبدرێ.

بەڵام بۆ ڕەجم کردنیان. شافیعی و ئەبو یوسف و قاسمیەکان بۆ ئەوە چوون کە ئەبێ پیاوی کافری (محصن) ڕەجم بکرێ ئەگەر پێگەیشتوو (بالغ)، و ژیر، و ئازاد بێت، وە بە شێوەیەکی دروست بەپێی باوەڕی خۆی ژنی هێنابێت.

وە ئەبو حەنیفەو محمد و زەیدیکوڕی علی و ناصر و ئیمام یەحیا بۆ ئەوە چوون: کە بێباوەڕ داری حەددی لێ ئەدرێ و ڕەجم ناکرێ، چونکە ئیسلامەتی مەرجێکە لە مەرجەکانی (الإحصان) لای ئەمان. وە پێغەمبەر (ﷺ) دوو جولەکەکەی بە پێی حوکمی تەورات کە خۆیان لەسەری ئەڕۆیشتن ڕەجم کرد.

وە ئیمام یەحیا ووتویەتی: (کافری ذیمّی وەك کافری حەربی وایە لە جیاوازی ڕای زانایاندا.

وە مالیك وتویەتی: کافری ذیمي تۆڵەی لەسەر نییە.

بەڵام کافری حەربی کە داوای ئەمانی کردووە، عیترە و شافیعی و ئەبو یوسف بۆ ئەوە چوون کە تۆڵەسەندنی لەسەرە و حەدی لێئەدرێ.

بەڵام مالیك و ئەبو حەنیفە و محمد بۆ ئەوە چوون: کە حەددی لێ نادرێ.

وە ئیبنو (عبدالبر) زیادەڕەوی کردوەو ڕێك کەوتنی زانایانی نەقل کردووە لەسەر ئەوەی کە مەرجی (الإحصان) کە ڕەجم کردن پێویست ئەکات ئیسلامەتییە.

بەڵام بە شوێن ئەوەدا هاتووە کە شافیعی و ئەحمەد ئەوە بە مەرج دانانێن.

---

(١) أحمد (٤/٢٨٦) ومسلم (١٧٠٠/٢٨) والترمذي (٤٤٤٨).

وە لەناو ئەو کەسانەدا کە ئیسلامەتی دائەنێن بە مەرج بۆ ڕەجم کردنی زیناکەری (محصن) ڕەبیعە شێخی مالیك- و هەندێ لە شافیعیەیەکانە[1].

کۆکردنەوەی دار لێدان و ڕەجم کردن :

ئیبنو حەزم و ئیسحاقی کوڕی راهویە و لە تابیعیەکان و حەسەنی بەصری بۆ ئەوە چوون: کە پیاوی زیناکەری (محصن) سەد داری لێ ئەدرێ، لە پاشاندا سەنگ باران ئەکرێ هەتا ئەمرێ. وە دارلێدان و ڕەجم کردنی لەسەر کۆئەکرێتەوە.

بەڵگەشیان ئەوەیە کە عوبادەی کوڕی صامیت گێڕاویەتیەوە: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (خذوا عني، خذوا عني، قد جعل الله لهنّ سبيلا: البكر بالبكر جلد مائة و نفي سنة، و الثيب بالثيب جلد مائة و الرجم). رواه مسلم، وأبو داود، و الترمذي.

وە لە عەلیەوە هاتووە خوا لێی ڕازی بێت: کە شوراحەی لە ڕۆژی پێنج شەممەدا دارکاری کرد و لەڕۆژی هەینی ڕەجم، وە فەرموویەتی: بە کتێبەکەی خوا دارکاری ئەکەم و بە فەرمودەی پێغەمبەر (ﷺ) ڕەجمی ئەکەم.

وە ئەبو حەنیفە و مالیك و شافیعی ووتویانە: زیناکەری (محصن) دار لێدان و ڕەجم کردنی لەسەر کۆناکرێتەوە، بەڵکو ئەوەی پێویستە تەنها ڕەجم کردنە.

وە لە ئەحمەدەوە دوو قسە ئەگێڕنەوە:

یەکەمیان: هەردووکیانی لەسەر کۆئەکرێتەوە. کە ئەمەش ڕاست ترین قسەیەتی و (خرقی)یش هەڵی بژاردووە.

دووەمیان: هەردوکیانی لەسەر کۆناکرێتەوە، بەپێی بۆچونی جەماوەر، وە ئەمەش ئیبنو حامید هەڵی بژاردووە.

وە بەڵگەشیان ئەوەبوو کە پێغەمبەر (ﷺ) ماعیز و ئافرەتە غامیدیەکە و دوو جولەکەکەی سەنگ باران کرد و داری لەکەسیان نەدا.

وە بە پێی ئەوەی کە بە ئونەیسی ئەسلەمی فەرموو: (فإنِ اعْتَرَفَتْ فارْجُمها)

واتە: ئەگەر دانی پێدانا ڕەجمی بکە، وە نەی فەرموو داریشی لێبدە، وە ئەمەش ئاخری دوو فەرمانەکە بوو، چونکە ئەبو هورەیرە گێڕاویەتیەوە – وە ئەو دەرەنگ موسوڵمان بوو بوو- کەواتە

---

(١) نيل الأوطار.

ئەمەیان (ناسخ) سڕەرەوەی دوو حەددەکەی پێشەوە بووە کە دار لێدان و ڕەجم کردن بووە بەسەر یەکەوە.

لەپاشاندا ئەبوبەکر و عومەر لە سەردەمی خەلافەتیاندا هەر ڕەجمیان کردووە و هەردوکیان لەسەر کەس کۆنەکردۆتەوە.

وە شێخی دەهلەوی ڕای وایە کە حەدیسەکەی عوبادەو حەدیسەکەی ئەبو هورەیرە موعاریزی یەك نین و ناسخ و مەنسوخیش نین، بەڵکو ئەو کارە بە دەستی حاکمە، وە ووتویەتی: ئەوەی لای من دیار و ڕۆشن بێت ئەوەیە کە دروستە بۆ ئیمام (حاکم) دارلێدان و ڕەجم کردن بەسەر یەکەوە بەجێ بهێنێ، بەڵام وەها پەسەندە کە تەنها ڕەجمەکە بکات، لەبەرئەوەی پێغەمبەر (ﷺ) خۆی تەنها ڕەجمی کردووە.

حیکمەت لەمەشدا ئەوەیە، کە سەنگ باران کردن سزایەکە بەسەر گیاندا دێت، وە ئەسڵی کۆتایی هاتنەکە کە پێویستە پێی دێتە جێ، ئیتر دار لێدان سزایەکی زیادەیە ڕێگا دراوە بە نەکردنیشی.

ئەوەیە لای من مەبەستی ئەوە کە تەنها ڕەجم کردن بێت.

مەرجەکانی (حد) تۆڵە :

بە مەرج گیراوە بۆ جێ بەجێ کردنی حەددی زینا ئەمانەی خوارەوە:

١- ژیری (عقل).

٢- پێگەیشتویی (بلوغ).

٣- ئارەزوو (اختیار).

٤- زانین بە حەرامیەتی.

چونکە منداڵ و شێت و زۆرلێکراو تۆڵەیان لێناسەندرێ، بە پێی ئەوەی عائیشە گێراویەتیەوە خوا لێی ڕازی بێت کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (رفع القلم عن ثلاث: عن النائم حتی یستیقظ و عن الصبي حتی یحتلم و عن المجنون حتی یعقل). رواه أحمد و أصحاب السنن و الحاکم، وقال: صحیح علی شرط الشیخین و حسنه الترمذي[1].

---

(١) أحمد (٦/١٠٠-١٠١) وأبوداود (٤٤٠٣) والترمذي (١٤٢٣) والنسائي (٦/١٥٦) وابن ماجة (٢٠٤١) وابن حبان (١٤٢) والحاکم (٢/٥٩).

واتە: پێنوس (تەکلیف) لەسەر سێ کەس هەڵگیراوە: لەسەر نوستوو هەتا هەڵئەسێ لە خەو، وە لەسەر منداڵ هەتا پێ ئەگات و باڵق دەبێ، وە لەسەر شێت هەتا فام ئەکاتەوەو چاك ئەبێتەوە.

وە ئەمما زانین بە حەرامێتی چونکە تۆڵە وا بە دووای کردنی حەرامەوە، وە ئەو کەسە کە نەیزانیبێت حەرامی نەکردووە.

وە پێغەمبەر (ﷺ) دووبارەی کردەوە بە ماعیز و پێی فەرموو: ئایا ئەزانی زینا چیە[1]؟.

وە ئەگێڕنەوە کە جاریەیەکی ڕەش پێستیان بردە لای عومەر خوا لێی ڕازی بێت، ووتیان: ئەمە زینای کردووە. ئەویش چەند قامچیەیەکی لێدا و پێی فەرموو: هیچ و پوچ زینات کردووە؟ ئەویش ووتی: لەگەڵ غەوشدا کردوومە بە دوو درهەم.

عومەر فەرمووی: ئێوە ڕاتان چیە؟ علیو عثمان و عبدالرحمن ی کوڕی عەوفی لابوو. علی خوای لێ ڕازی بێت فەرمووی: ڕام وایە ڕەجمی بکەیت.

وە عبدالرحمن فەرمووی: منیش ڕام ڕای براکەتە.

عثمان فەرمووی: من وای تێ ئەگەم کە زیناکردن بە شتێکی سوکەڵە ئەزانێ و بە خراپی نازانێ. وە تۆڵەی خواش لەسەر کەسێکە کە زانابێت بە فەرمانی خوا.

عمر فەرمووی: ڕاست ئەکەیت.

**حەد بەچی سابت ئەبێ :**

تۆڵە بە یەکێ لەم دوو شتە ئەچەسپێ:

١- دان پێدانان (إعتراف).

٢- بوونی شایەت.

**چەسپاندنی حەد بە دان پێدانان :**

دان پێدانان وەك ووتویانە سەروەری بەڵگەکانە وە پێغەمبەر (ﷺ) دانپێدانانی ماعیز و ئافرەتە غامیدیەیەکەی وەرگرت.

وە کەس لە پێشەواکانی ئیسلام لەوەدا جیاوازیان نیە، هەرچەندە جیاوازن لە ژمارەی جارەکانی ئیعتیرافەکەدا کە تۆڵەی پێ ئەسەپێ بەسەر زیناکەردا.

(١) أبوداود (٤٤٢٨).

مالیك و شافیعی و داود و طەبەری و ئەبو ثەور ووتویانە: بۆ سەپاندنی تۆڵە یەك جار ئیعتراف کردن بەسە. بەپێی ئەوەی ئەبو هورەیرە و زەیدی کوڕی خالید گێڕاویانەتەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی:

(أُغدُ يا أُنيسْ على إمرأة هذا، فان إعترفت فارجمها)

واتە: بڕۆ ئونەیس بۆ لای ژنی ئەو کابرایە، ئەگەر دانی پێدانا ڕەجمی بکە. ئیتر باسی ژمارەی ئیعترافەکانی نەکردووە.

وە لای حەنەفیەکان: ئەبێت چوار جار ئەو کەسە دانی پێدا بنێت لەچوار کۆڕی جیاجیادا.

وە مەزهەبی ئەحمەد و ئیسحاق وەك حەنەفیەکانە بەڵام ئەمان کۆڕی جیاجیا بە مەرج دانانێن، وە مەزهەبی یەکەم لەپێشترە.

پەشیمان بوونەوە لە ئیعتراف تۆڵە لەکۆڵ ئەخات :

شافیعیەکان و حەنەفیەکان و ئەحمەد بۆ ئەوە چون پەشیمان بوونەوە لە ئیعتراف تۆڵە لە کۆڵ ئەخات، بەپێی ئەوەی ئەبو هورەیرە گێڕاویەتیەوە کە لای ئەحمەد و (ترمذي) هەیە.

کاتێ ماعیز هەستی کرد بەردەبارانەکەی زیادی کرد ڕایکرد هەتا بەلای کابرایەکدا تێپەڕی لاشەویلگەی وشترێکی بە دەستەوە بوو، کێشای بە ماعیزدا، وە خەڵکەکەش دەستیان کرد بە بەرد باران کردنی هەتا گیانی دەرچوو، ئەوەیان بۆ پێغەمبەر (ﷺ) گێڕایەوە فەرمووی: (هلا ترکتموه؟!).

واتە ئەی بۆ وازتان لێ نەهێنا؟! (ترمذي) فەرموویەتی: فەرموودەیەکی (حسن)ە. وە لە چەند ڕوویەکی تریشەوە لە ئەبی هورەیرەوە گێڕراوەتەوە.

وە ئەبو داود و نەسائی تەخریجیان کردووە لە حەدیسی جابیرەوە بەو شێوەیە، وە ئەوەی زیادکردووە کاتێ بینی بەردەکانی بەرکەوت هاواری کرد: خەڵکینە بمگێڕنەوە بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ) چونکە هۆزەکەم کوشتمیان و فریویان دام، وە پێیان ڕاگەیاندوم کە پێغەمبەر (ﷺ) نام کوژێ. ئێمەش لە کۆڵی نەبوینەوە هەتا کوشتمان. کاتێ گەڕاینەوە بۆ لای پێغەمبەرو (ﷺ) ئەوەمان پێ ڕاگەیاند فەرمووی: (نەئەبوو وازی لێبهێنن و بۆمی بهێننەوە؟!!)[1].

(١) أبو داود (٤٤٢٠) والنسائي في الكبرى (٧٢٠٧).

**کەسێك دان بنێ بە زیناکردن لەگەڵ ژنێکدا و ژنەکە ئینکاری لێ بکاات :**

ئەگەر پیاوێك بڵێت زینام لەگەڵ فلانە ژندا کردووە و ژنەکە ئینکاری کرد، ئەوە تەنها پیاوەکە حەددی لێ ئەدرێ، وە ژنەکە حەددی لێ نادرێ، بەپێی ئەوەی ئەحمەد و ئەبو داود لە سەهلی کوڕی سەعدەوە گێڕاویانەتەوە: کە پیاوێك هاتە لای پێغەمبەر (ﷺ) ووتی: زینام لەگەڵ فلانە ژندا کردووە -ناوی ژنەکەی هێنا- پێغەمبەر (ﷺ) ناردی بە دووای ژنەکەدا، لەو بارەیەوە پرسیاری لێ کرد، ئەویش ئینکاری لێکرد، پێغەمبەر (ﷺ) حەددی لە کابرا داو ژنەکەی واز لێهێنا[1].

وە ئەو حەددەش حەددی ئەو زینایە بوو کە پێی لێنابوو، نەك حەددی (قذف) تۆمەت هەڵبەستن بۆ ژنەکە وەك مالیك و شافیعی بۆی چوون.

وە ئەوزاعی و ئەبو حەنیفە ووتویانە: تەنها حەددی (قذف)ی لێ ئەدرێ، چونکە ئینکاری کردنی ژنەکە ئەبێتە شوبهە و بەهانە.

وە ئەو ڕایە بەرپەرچ دراوەتەوە بەوەی کە ئینکاری کردنی ژنەکە لە زیناکردنەکە ئیعتیرافی پیاوەکە پوچەڵ ناکاتەوە.

وە هادەوییەکان و محمد، وە لە شافعیشەوە ئەگێڕنەوە، کە بۆ ئەوە چوون ئەو کەسە حەدی زینا و قەذفی لێ ئەدرێ.

بەپێی ئەوەی ئەبو داود و نەسائی گێڕاویانەتەوە لە ئیبنو عەبباسەوە (کە پیاوێك لە هۆزی بەکری کوڕی لەیث هاتە لای پێغەمبەر (ﷺ) دانی بەوەدا نا کە چوار جار زینای لەگەڵ ژنێکدا کردووە، پێغەمبەر (ﷺ) سەد داری لێدا، - وە ئەو هێشتا ژنی نەهێنابوو - لەپاشاندا داوای بەڵگەی لێکرد لەسەر ژنەکە. ژنەکە ووتی: ئەی نێرراوی خوا درۆ ئەکات. پێغەمبەر (ﷺ) هەشتا داری تری لێدا بە حەددی تۆمەت هەڵبەستن[2].

نەسائی ووتویەتی: ئەم حەدیسە مونکەرە، وە ئیبنو حیببان ووتویەتی: (بەڵگە هێنانەوە پێی پوچەڵە).

**سابت بونی زینا بە شایەت :**

تاوانبار کردن بە زینا شوێنەوارێکی خراپی هەیە بۆ سەر پیاو و ژن، ئەیان خاو کەرامەتیان ناهێڵێ، وە نەنگ و عار ئەخاتە شوێن خۆیان و خێزانەکانیان و نەوەکانیان. هەر بۆیە ئیسلام زۆر

---

(١) أحمد (٣٣٩) وأبوداود (٤٤٦٦).

(٢) أبوداود (٤٤٦٧) والنسائي في الكبرى (٧٣٤٨).

توند وتیژە لە سابت کردنی ئەو تاوانەدا هەتا رێ لەوانە بگرێ کە بێ تاوانەکان تاوانبار ئەکەن – هەر لە خۆیانەوە یان لەبەر بچوکترین دڵ ئێشاندن – بە نەنگ و عاری رۆژگارو ریسوایی هەمیشەیی، جا لەبەر ئەوە بۆ شایەت دان لەسەر زینا ئەم مەرجانەی داناوە:

یەکەم: ئەبێ شایەتەکان چوار کەس بن – بە پێچەوانەی شایەتی دان لەسەر مافەکانیتر- خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَاللَّاتِي يَأْتِينَ الْفَاحِشَةَ مِنْ نِسَائِكُمْ فَاسْتَشْهِدُوا عَلَيْهِنَّ أَرْبَعَةً مِنْكُمْ فَإِنْ شَهِدُوا فَأَمْسِكُوهُنَّ فِي الْبُيُوتِ حَتَّى يَتَوَفَّاهُنَّ الْمَوْتُ أَوْ يَجْعَلَ اللَّهُ لَهُنَّ سَبِيلاً﴾ (النساء:١٥).

واتە: ئەو ئافرەتانەی لە ئێوە فاحیشە ئەکەن، داوای چوار شایەت بکەن لەسەریان، جا ئەگەر شایەتییان دا، ئەوە لە ماڵەکاندا بەندیان بکەن هەتا ئەمرن، یا خوای گەورە رێگایەکیان بۆ ئەکاتەوە.

وە هەروەها فەرموویەتی: ﴿وَالَّذِينَ يَرْمُونَ الْمُحْصَنَاتِ ثُمَّ لَمْ يَأْتُوا بِأَرْبَعَةِ شُهَدَاءَ﴾ (النور:٤).

واتە:وە ئەو کەسانەی تاوانی داوێن پیسی ئەدەنە پاڵ بێتاوانان و چوار شایەت ناهێنن لەسەری، هەشتا داریان لێبدەن. جا ئەگەر کەمتر لە چوار کەس بن لێیان وەرناگیرێ.

ئایا ئەگەر کەمتر لە چوار کەس شایەتییان دا سزا ئەدرێن؟ :

حەنەفییەکان و مالیك، وە هەروەها بۆچوونی بەهێز لە مەزهەبی شافیعی و ئەحمەددا ئەوەیە کە ووتویانە: بەڵێ. چونکە عومەر خوا لێی رازی بێت ئەو سیانەی سزادا کە شایەتییان لەسەر موغیرەدا ئەوانیش: ئەبو بەکرە و نافیع و شیبلی کوڕی مەعبەد بوون.

وە ووتراوە: سزای (قذف) نادرێن، چونکە مەبەستیان شایەتیدانە نەك قەزفی ئەو کەسە. وە ئەم بۆچونە دوا خراوە لای شافیعییەکان و حەنەفییەکان و مەزهەبی ظاهری.

دووەم: پێگەیشتویی (بلوغ) بەپێی فەرمودەی خوای گەورە: ﴿وَاسْتَشْهِدُوا شَهِيدَيْنِ مِنْ رِجَالِكُمْ فَإِنْ لَمْ يَكُونَا رَجُلَيْنِ فَرَجُلٌ وَامْرَأَتَانِ مِمَّنْ تَرْضَوْنَ مِنَ الشُّهَدَاءِ..﴾ (البقرة: ٢٨٢).

واتە: داوای دوو شایەتی پیاوی موسوڵمانی پێ گەیشتوی ژیر بکەن، جا ئەگەر دو پیاو نەبوو، با پیاوێك و دوو ژن بن لەوانەی کە لێیان رازین بۆ شایەتیدان.

جا ئەگەر ئەو کەسە پێگەیشتوو نەبوو شایەتی وەرناگیرێ، چونکە لە پیاوان نییە، وە لەو کەسانەش نییە کە کەس بە شایەتییەکەیان رازی بێت، با بە شێوەیەکیش بێت کە شایەتی رێك و پێك بدات. وە بە پێی فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ) کە فەرموویەتی: (رُفِع القلم عن ثلاثةٍ، عن الصَّبِي حتى يبلُغ، و عن النائم حتى يستيقظ، و عن المجنون حتى يفيق).

واتە: پێنوس و تەكليف لەسەر سيان هەڵگیراوە: لەسەر منداڵ هەتا پێ‌ئەگات و بالغ ئەبێ وە لەسەر خەوتو هەتا هەڵئەستێت، وە لەسەر شێت هەتا چاك ئەبێتەوە.

وە منداڵ شياوى سەرپەرشتى كردنى ماڵى خۆى نىيە، كەواتە چۆن شايەتى لەسەر كەسى تر ئەدات. چونكە شايەتى لە بەشى (ولاية) سەرپەرشتى كردندايە.

سێيەم: ئاوەز- عەقڵ - چونكە شايەتى شێت و كەم ئاوەز وەرناگيرێ لەبەر فەرموودەكەى پێشوو، وە ئەگەر منداڵ شايەتى لێ وەرنەگيرێ لەبەر كەم ئاوەزى ئەوە وەرنەگرتنى شايەتى شێت و نەفام لە پێش ترە.

چوارەم: (عدالة) دادپەروەرى: بە پێى فەرموودەى خواى گەورە كە فەرموويەتى: ﴿وَأَشْهِدُوا ذَوَيْ عَدْلٍ مِنْكُمْ﴾ (الطلاق: من الآية٢).

واتە: دوو كەسى عادل و دادپەروەر لە خۆتان بكەن بە شايەت.

وە هەروەها فەرموويەتى: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِنْ جَاءَكُمْ فَاسِقٌ بِنَبَإٍ فَتَبَيَّنُوا أَنْ تُصِيبُوا قَوْماً بِجَهَالَةٍ فَتُصْبِحُوا عَلَى مَا فَعَلْتُمْ نَادِمِينَ﴾ (الحجرات:٦).

واتە: ئەى ئەو كەسانەى باوەڕتان هێناوە ئەگەر فاسقێك شتێكى پێ ڕاگەياندن لێى بكۆڵنەوە، نەك كۆمەڵێك گيرۆدە بكەن بە نەزانى. جا لەدوايشدا پەشيمان بن لەو كارەى كردوتانە.

پێنجەم: ئيسلامەتى: واتە شايەتەكە ئەبێ موسوڵمان بێت جا يەكسانە شايەتى لەسەر موسڵمان بدات يا لەسەر جگە لە موسڵمان، وە ئەمەش پێشەوايانى ئايين لەسەرى ڕێكن.

شەشەم: بە چاوبينين: واتە بە چاوى خۆى بينيبێتى فەرجى پياوەكە لەناو فەرجى ژنەكەدا وەك ميل لەناو كلداندا، يا وەك پەت لەناو بيردا، چونكە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووى: بە ماعيز: (لەوانەيە ماچت كردبێت، يا ئيشارەتت كردبێ، يا سەيرت كردبێت) وتى: نە. ئەى نێرراوى خوا. پێغەمبەر (ﷺ) بەبێ پێچ و پەناو بە ئاشكرا پرسيارى لێكرد كە ئايا ئەو كارەت لەگەڵدا كردووە؟ ئەويش وتى: بەڵێ[1].

فەرمووى: وەك چۆن ميل لە كلداندا ون ئەبێت، وە وەك پەت لە بيردا؟ وتى بەڵێ.

وە بۆيە سەيركردن ڕەواكراوە لەم حاڵەتەدا لەبەر پێويستى شايەتىيەكە وەك چۆن بۆ پزيشك و مامان ڕەواكراوە.

---

(١) أبوداود (٤٤٢٨) دارقطني (٣/١٩٦).

حەوتەم: بە ئاشکرا وتن: وە ئەبێ بە ئاشکراو ڕاست و ڕێك بوترێ بە لەفزی داخڵ کردن، نەك بە کیانایەت وەك لە حەدیسەکەی پێشەوەدا باس کرا.

هەشتەم: ئەبێت هەموویان لەیەك کۆڕدا شایەتی بدەن. جەماوەری زانایان ڕایان وایە کە مەرجی ئەم شایەتیدانە ئەوەیە کە لە یەك کۆڕدا بێت، و جیاوازی لە کات و شوێن دا نەبێت، جا ئەگەر جیا بە جیا هاتن و شایەتییان دا لێیان وەرناگیرێ.

وە شافیعیەکان و ظاهیرییەکان و زەیدییەکان ڕایان وایە ئەوە مەرج نییە بۆ شایەتیدان. وە ئەگەر هاتن بە یەکەوە یا بە جیاجیا لەیەك کۆڕدا، یان لەچەند کۆڕێکی جیادا شایەتییان دا، ئەوە لێیان وەرئەگیرێ، چونکە خوای گەورە باسی شایەتیدانی کردوەو باسی کۆڕی نەکردووە، وە لەبەر ئەوەی هەموو شایەتییەکی وەرگیراو وەرئەگیرێ کاتێ لەگەڵ یەکدا ڕێك بکەون، با لە چەند کۆڕی جیاجیاشدا بن، هەر وەك هەموو شایەتی دانێکی تر.

نۆهەم: نێرینەیی: وە بە مەرج گیراوە لە شایەتەکانی زینادا کە هەموویان ئەبێ پیاو بن، وە شایەتی ژنان لەم بەشەدا وەرناگیرێ.

وە ئیبنو حەزم ڕای وایە لە شایەتی زینادا شایەتی دوو ژنی موسڵمانی دادپەروەر وەرئەگیرێ لە جێی هەر پیاوێك. بەوە شایەتەکان ئەبنە سێ پیاو و دوو ژن، یا دوو پیاو و چوار ژن، یا پیاوێك و شەش ژن، یا هەشت ژن پیاویان لەگەڵدا نەبێت.

دەیەم: ماوەی زۆری بەسەردا نەچێت: بەپێی قسەکەی عومەر کە فەرموویەتی: هەر کۆمەڵێك شایەتییان دا لەسەر تاوانێك کە تۆڵە پێویست بکات ئەو کاتە شایەتییان نەدا کە ئیشەکە کرا ئەوە شایەتییان لە ڕق و کینەوە داوەو لێیان وەرناگیرێ.

جا ئەگەر شایەتەکان شایەتییان دا لەسەر زیناکردنێك دووای ئەوەی ماوەیەکی زۆری بەسەردا چوویێت و کۆن بوویێت، ئەوە ئەو شایەتییەیان لێ وەرناگیرێ لای حەنەفییەکان.

وە بەڵگەشیان ئەوەیە ئەگەر کەسێك ڕووداوێکی بینی ئارەزووی خۆیەتی شایەتی ئەدات لەبەر خوا، یان دای ئەپۆشێ، جا ئەگەر بێدەنگی لێکرد هەتا کۆن ئەبێت ئەوە وا دیارە لایەنی داپۆشینی هەڵبژاردووە، جا ئەگەر دووای ئەوە هات شایەتی لەسەردا ئەوە بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە ڕق و کینە هەڵی ناوە لەسەر ئەو شایەتییە. وە وێنەی ئەوە شایەتی لێ وەرناگیرێ، لەبەر تۆمەت و ڕق و کینە، هەر وەك عومەر فەرمووی، وە نەقڵیش نەکراوە کەس ئینکاری ئەو قسەیەی کردبێت، وە بەوە بووەتە ئیجماع.

ئەوەش کاتێك وایە کە بەهانەیەك نەبوبێت ڕێی گرتبێ لە دووا خستنی شایەتییەکە. جا ئەگەر بەهانەیەکی ئاشکرا هەبوو بۆ دوواخستنی شایەتییەکە وەك دوری شوێنەکە لە قازییەوە، یا نەخۆش کەوتنی شایەتەکەو ئەو جۆرە شتانە، لەم کاتانەدا شایەتییەکە وەردەگیرێ و پوچەڵ نابێتەوە بە کۆن بوون.

وە حەنەفییەکان کە ئەو مەرجەیان داناوە ماوەیان دانەناوە بۆ کۆن بوون، بەڵکو داویانەتە دەست قازی کە خۆی ماوەی بۆ دابنێ بەپێی بارو زروفی هەر حاڵەتێك لەبەر گرانی ماوە دانان و لەبەر جیاوازی بەهانەکان.

وە هەندێ لە حەنەفییەکان ماوەی کۆن بوونیان بە مانگێك داناوە، وە هەندێکیان بە شەش مانگ.

بەڵام جەماوەری زانایانی مالیکی و شافیعی و ظاهیری و شیعەی زەیدی، کۆن بوون لایان نابێتە هۆی وەرنەگرتنی شایەتی بەهەر هۆیەك بێت.

وە حەنبەلییەکان دوو ڕایان هەیە: یەکێکیان وەك ڕای ئەبو حەنیفە، وە ڕاکەی تر وەك ڕای جەماوەری زانایان.

**ئایا قازی بۆی هەیە بە زانستی خۆی حوکم بدات؟ :**

ظاهیرییەکان ڕایان وایە کە لەسەر قازی فەرزە بە زانستی خۆی حوکم بدات لەخوێن و تۆڵە و ماڵ و ناموس و حەددەکاندا. جا ئەوەش پێش بوونی بە قازی زانیبێتی یا دووای بوونی بە قازی، وە بەهێزترین حوکم ئەوەیە کە بە زانستی خۆی دابێتی، چونکە ڕاستییەکی بێ گومانە، پاشان ئەوەی بە ئیعتراف بێت، پاشان ئەوەی بە شایەتی بێت، چونکە خوای گەورە ئەفەرمووێ:

﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا كُونُوا قَوَّامِينَ بِالْقِسْطِ شُهَدَاءَ لِلَّهِ﴾ (النساء.من الاية:١٣٥)

واتە: ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە عەدالەت بەرپا بکەن و بە حەق شایەتی بدەن بۆ خوا.

وە بە پێی فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ) کە فەرموویەتی: (من رأى منكم منكراً فليغيره بيده، فإن لم يستطع فبلسانه..)[1]

واتە: هەرکەس لە ئێوە خراپەکارییەکی بینی با بە دەستی بیگۆڕێت، جا ئەگەر نەیتوانی با بە زمان بیگۆڕێ.

---

(١) أحمد (٣/١٠) ومسلم (٤٩/٧٨) وأبوداود (١١٤٠) وابن ماجة (١٢٧٥).

وە بە صەحیحی هاتووە کە قازی لەسەریەتی بە عەدالەت و دادپەروەری بجولێتەوە، وە ئەمە عەدالەت نی‌یە واز لە ستەمکار بهێنێ لەسەر ستەمکاری‌یەکەی بێنێتەوە و نەی گۆڕێ.

وە بە صەحیحی هاتووە کە فەرزە لەسەر قازی هەموو کارێکی خراپە بە دەستی خۆی بگۆڕی کاتێ پێی بزانێ، وە هەرکەس مافی خۆی بداتێ، ئەگینا ئەویش ئەبێتە ستەمکار.

بەڵام جەماوەری زانایان ڕایان وایە کە قازی بۆی نی‌یە بە زانینی خۆی حوکم بدات. ئەبوبەکر خوا لێی ڕازی بێت فەرموویەتی: (ئەگەر پیاوێك لەسەر تاوان ببینم کە حەد پێویست بکات حەددی لێ نادەم هەتا شایەتی نەدرێ لە سەری لای خۆم)، وە لەبەرئەوەی قازی وەك ئەندامێکی تری کۆمەڵە دروست نی‌یە ئەوەی بینیوێتی بیلێت هەتا شایەتی تەواوی نەبێت.

وە ئەگەر قازی تاوانی زینای دایە پاڵ کەسێك بەوەی بە چاوی خۆی لێی بینیبوو، لەکاتێکدا بەڵگەی تەواوی پێ نەبوو لەسەر ئەوەی کە ئەیوت ئەوە بە (قاذف) ئەژمێرێ و حەددی (قذف)ی بەسەردا ئەسەپێ کە هەشتا دارە. جا ئەگەر حەرام بێت لەسەر قازی ئەوەی ئەیزانێت بیلێت، ئەوە کار پێ‌کردنی لە پێش ترە بۆ ئەوەی حەرام بێت لەسەری.

وە بناغەی ئەم ڕایەش فەرموودەی خوای گەورەیە کە فەرموویەتی: ﴿ فَإِذْ لَمْ يَأْتُوا بِالشُّهَدَاءِ فَأُولَئِكَ عِنْدَ اللَّهِ هُمُ الْكَاذِبُونَ﴾ (النور:١٣). واتە: وە ئەگەر چوار شایەتی عادلیان نەهێنا لەسەر قسەکەیان ئەوانە لای خوا خۆیان درۆزنن.

**ئایا حەد بە دوگیان بوون (حامیلەیی) سابت ئەبێ؟ :**

جەماوەر بۆ ئەوە چوون کە سك پڕبوونی ڕوت تۆڵەی پێ ناچەسپێ، بەڵکو ئەبێت ئیعتراف یا شایەت هەبێت، بەڵگەشیان بۆ ئەوە ئەو فەرموودانەیە کە هاتن دەربارەی لاچوونی حەد بە گومان.

وە لە عەلی‌یەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) ئەگێڕنەوە کە بە ژنێکی دووگیانی ئەفەرموو:

(ئایا زۆرت لێ کرا؟) ووتی: نە. ئەویش فەرمووی: (لەوانەیە پیاوێك لە کاتی نووستندا هاتبێتە پاڵت).

ووتویانە: وە چەسپاندنی حەد ئەگێڕنەوە لە عومەرەوە کە قسەی ژنێکی وەرگرت کاتێ ووتی: خەوم قورسە و پیاوێك هاتۆتە سەرم، وە تا ئێستا نەم زانیوە کێ‌یە.

بەڵام مالیك و هاوەڵەکانی ووتویانە: ئەگەر ژنێك دوگیان بوو وە نەزانرا کە مێردی هەبێت، وە نەشزانرا کە زۆری لێ کرابێت ئەوە حەددی لێ ئەدرێ.

وتوویانە: ئەگەر ئافرەتەکە ئیددعای ئەوەی ئەکرد کە بە زۆر وای لێکراوە، ئەوە پێویستە نیشانەیەك بێنێت کە بیسەلمێنێ ڕاست ئەکات، وەك ئەوە کچ بێت و لەو کاتەدا خوێنی لێ بێت، یا خۆی ئاشکرا بکات بە شوێنەواری زۆر لێکردنەکە،

هەروەها ئەگەر ئیددیعای ژن و مێردایەتی کرد، ئەوە لێی وەرناگیرێ هەتا شایەت لەسەر ئەوە نەهێنێ.

وە بۆ مەزهەبەکەشیان قسەکەی عومەریان کردۆتە بەڵگە کە فەرمویەتی: (ڕەجم پێویستە لەسەر هەر کەسێك کە زینا بکات لە ژن و پیاو، ئەگەر موحصەن بێت: کاتێ شایەت هەبوو، یا سك پڕبوون هەبوو، یا ئیعتراف کردن هەبوو).

وە عەلی فەرمووریەتی:

(ئەی خەڵکینە زینا دوو زینایە: زینای نەهێنی و زینای ئاشکرا. زینای نەهێنی ئەوەیە کە شایەت شایەتی لەسەر بدات، وە شایەتەکان یەکەم کەس بن کە بەردەبارانی بکەن، وە زینای ئاشکرا ئەوەیە دووگیان بێت، یا ئیعتراف بکات.

وتویانە: ئەوە قسەی صەحابەیە، وە دەرنەکەوتووە کە کەس پێچەوانەی ئەو قسەیە بووبێت لەسەردەمی ئەواندا، وە بەوە ئەبێتە (إجماع).

**لاچونی حەد بە دەرکەوتنی شتێك کە پاکیەتی و بەرائەت حەتمی ئەکات:**

ئەگەر لە پیاوەکەدا یا لە ژنەکەدا شتێك دەرکەوت کە تەئکیدی ئەوە بکات کە زینا لەهیچ کامیانەوە ڕووی نەداوە، وەك ئەوە ئافرەتەکە کچێنی نەڕزیی بێت، یا فەرجی داخراو بێت، یا پیاوەکە ئالەتی پیاوەتی بڕابێت یا نەیئەتوانی بچێتە لای ژنان، ئەوە حەددەکە لە کۆڵ ئەکەوێت. چونکە پێغەمبەر (ﷺ) عەلی نارد بۆ کوشتنی پیاوێك کە زۆر ئەچووە لای ژنێك. ئەویش چوو بینی لەناو ئاوێکدا خۆی ئەشۆرێ عەلی دەستی گرت و هێنایە دەرەوە لە ئاوەکە کە بیکوژێ، سەیری کرد گونی بڕابوو، وازی لێهێنا و گەڕایەوە بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ) و پێی ڕاگەیاند.

**منداڵ بە شەش مانگی لە دایك ئەبێت:**

ئەگەر ئافرەتێك مێردی کرد و پاش شەش مانگ منداڵێکی تەواوی بوو ئەوە حەددی زیناکردنی لەسەر نیە

مالیك ووتویەتی: پێم گەیشتووە کە عثمانی کوڕی عەففان ژنێکیان هێنا بۆ لای کە دووای شەش مانگ لە شووکردن منداڵێکی تەواوی بووبوو. ئەویش فەرمانی دا بەردباران بکرێت.

عەلی کوڕی ئەبی طالیب ووتی: تۆڵەی لەسەر نییە، چونکە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَحَمْلُهُ وَفِصَالُهُ ثَلاثُونَ شَهْرًا﴾ (الاحقاف: من الآية١٥).

واتە: وە ماوەی حەملەکەی و لەشیر بڕینەوەکەی سی مانگە.

وە هەروەها فەرموویەتی: ﴿وَالْوَالِدَاتُ يُرْضِعْنَ أَوْلادَهُنَّ حَوْلَيْنِ كَامِلَيْنِ لِمَنْ أَرَادَ أَنْ يُتِمَّ الرَّضَاعَةَ﴾ (البقرة: من الآية٢٣٣).

واتە: دایکەکان لەسەریانە دوو ساڵی تەواو منداڵەکانیان بەخێو بکەن بۆ ئەو کەسانەی ئەیانەوێ ماوەی شیردان تەواو بکەن.

کەواتە حەمل بە شەش مانگیش ئەبێت، لەبەر ئەوە ڕەجمی لەسەر نابێت، جا عثمان ناردی بە دووای ژنەکەدا، سەیری کرد ڕەجم کرابوو.

کاتی بەجێهێنانی تۆڵە (حد) :

لە (بداية المجتهد)[1] دا هاتوو ووتویەتی: بەڵام کاتەکەی جەماوەری زانایان لەسەر ئەوەن کە نابێ بەجی بهێنرێ کاتی گەرمای زۆر و سەرمای توند، وە هەروەها بەسەر نەخۆشیشدا بەجێ نایەت.

وە کۆمەڵێکی تر ووتویانە لەوکاتانەشدا بەجێ دێت -ئەحمەد و ئیسحاق ئەمەیان وتووە- وە حەدیسەکەی عومەریان کردۆتە بەڵگە کە حەددی لە قودامە داوە لە کاتی نەخۆشیدا. ووتویەتی: وە هۆی جیاوازی لەسەر ئەم مەسەلەیە بەرەنگار بوونی ڕواڵەتە لەگەڵ ماناو مەفهومی حد، ئەویش ئەوەیە کە نابێت ئەو کەسەی حەددەکە بەجێ ئەهێنێ گومانی زۆری بێت کە گیانی حد لێدراوەکەی لە دەست بچێت.

جا هەرکەس بە شێوەیەکی تێکڕایی و بێ جیاکردنەوە سەیری فەرمانی بەجێهێنانی تۆڵە بکات ئەوە ئەڵێت نەخۆشیش حەددی لێ ئەدرێ. وە هەرکەس سەیری ماناو مەفهومی بکات لە تۆڵەدا ئەڵێت نەخۆش تۆڵەی لێناسەندرێ هەتا چاك نەبێتەوە. وە هەروەهایە بۆ کاتی زۆر گەرم و ساردیش.

شەوکانی فەرموویەتی: لە (البحر)دا ئیجماعی زانایان گێڕراوەتەوە لەسەر ئەوە کە کوڕ و کچ مۆڵەت ئەدرێن هەتا گەرمای زۆر و سەرمای زۆر لائەچێت، و نەخۆشیش ئەگەر هیوای چاك

(١) ج٢ ص٤١٠.

بوونەوەی لێ بکرێ، بەڵام ئەگەر هیوابڕاو بوو، ئەوە هادی و هاوەڵەکانی شافیعی ووتویانە: بە پەلی دارخورما کە پێی ئەوترێ (عشکول) لێی ئەدرێ ئەگەر بەرگەی بگرێ.

ناصر و موئەییەد باللە ووتویانە: لە نەخۆشییەکەیدا لێی نادرێ، با هیوا بڕاویش بێت لە چاک بوونەوە، وەوا دەرئەکەوێ قسەی یەکەمە بەپێی حەدیسەکەی ئەبی ئومامەی کوڕی سەهلی کوڕی حەنیف کە لەمەو دووا دێت:

بەڵام ڕەجم کراو ئەگەر نەخۆش بوو ئەوە عیترە و شافیعی و حەنەفییەکان و مالیك بۆ ئەوە چوون کە نەخۆش بێت یا هەر شتێکی تر بێت مۆڵەت نادرێ، چونکە مەبەست لە ڕەجمەکە لەناو بردنیەتی.

وە میروەزی وتوویەتی: لە کاتی گەرمای زۆر و سەرمای زۆردا دووا ئەخرێ، وە هەروەها لەکاتی نەخۆشیدا، جا زیناکەی بە بڕیاری خۆی چەسپابێ یا بە شایەت یەکسانە.

(الأسفرايني) ووتویەتی: تەنها بۆ نەخۆشی دووا ئەخرێ، بەڵام لە کاتی گەرما و سەرمادا دەم و دەست ڕەجم ئەکرێ، یا ئەوکاتەی تاوانەکەی ئەچەسپێ بە شایەت نەك بە دان پێدانان، یا بە پێچەوانەوە.

وە دووگیان ڕەجم ناکرێ هەتا سکەکەی لێ ئەبێتەوە و منداڵەکەی شیر ئەدات ئەگەر کەسی نەبوو شیری بداتێ.

وە لە عەلیەوە فەرموویەتی: کەنیزەکێکی پێغەمبەر (ﷺ) زینای کرد، فەرمانی پێدام کە داری حەددی لێ بدەم، ئەڵی کاتێ چووم سەیرم کرد تازە زەیستانە، ترسام ئەگەر دارکاری بکەم بیکوژم، بۆ پێغەمبەرم (ﷺ) گێڕاوە فەرمووی: (چاکت کرد وازت لێهێنا. وازی لێبهێنە هەتا چاك ئەبێتەوە)

ئەحمەد و موسلیم و ئەبوداد و (ترمذي) کە بە صەحیحی داناوە ڕیوایەتیان کردووە[1].

## چاڵ هەڵکەندن بۆ ڕەجم کراو:

فەرموودەکان کە هاتوون جیاوازن دەربارەی هەڵکەندنی چاڵ بۆ بەرد باران کراو، هەندێکیان بە صەراحەت باسی هەڵکەندنی چاڵ ئەکات بۆی، وە هەندێکیان باسی ناکات.

ئیمامی ئەحمەد ووتویەتی: بەشی زۆری فەرموودەکان هاتوون کە چاڵی بۆ هەڵناکەندرێ،

(١) أحمد (١/١٥٦) ومسلم (١٧٠٥/٣٤) وأبوداود (٤٤٧٣) والترمذي (١٤٤١).

وە لەبەرئەوەی فەرموودەکان جیاوازییان تێدایە، زانایانیش جیاوازن لەسەری مالیك و ئەبو حەنیفە ووتویانە: چاڵی بۆ هەڵناکەنرێ.

وە ئەبو ثەور وتوویەتی: چاڵی بۆ هەڵئەکەنرێ.

وە ئەگێڕنەوە لە عەلی‌یەوە خوا لێی ڕازی بێت: کاتێ فەرمانی دا بە ڕەجم کردنی شوراحەی هەمەدانی هێنایە دەرەوەو چاڵێکی بۆ هەڵکەند و خستی‌یە ناوی، وە خەڵك دەوریان داو بەرد بارانیان ئەکرد.

بەڵام شافیعی: ئارەزووی داوەتە دەست ڕەجم کەر. وە گێڕراوەتەوە لێ‌یەوە کە ووتویەتی تەنها بۆ ئافرەت چاڵ هەڵئەکەنرێ.

وە عیترە بۆ ئەوە چوون کە پەسەندە چاڵ بۆ پیاو هەڵکەنرێ هەتا ناوکی، وە بۆ ژن هەتا مەمکەکانی.

وە پەسەندە جلەکانی پێوە توند بکرێ بە شێوەیەك کە شەرمگەی دەرنەکەوێ لەکاتی تەپ و تل و هەڵسوڕانی کاتێ لەناو چاڵدا نەبێت.

وە زانایان لەسەر ئەوە ڕێکن کە ژن بە دانیشتنەوە نەبێت ڕەجم ناکرێ، بەڵام بۆ پیاو جەماوەری زانایان لەسەر ئەوەن کە بە پێوە ڕەجم ئەکرێ.

وە مالیك ووتویەتی: پیاویش بە دانیشتنەوە.

هەندێکی تر ووتویانە: پێشەوا ئارەزووی خۆیەتی

**ئامادەبوونی ئیمام و شایەتەکان لە کاتی ڕەجم کردنەکەدا:** [1]

لە (نیل لأوطار)دا ووتویەتی: خاوەنی (البحر) لە عیترە و شافیعی‌یەوە گێڕاویەتی‌یەوە کە ئیمام لەسەری نی‌یە کە ئامادەی ڕەجم کردن ببێت، وە ئەوەش حەقە، لەبەر نەبوونی بەڵگەیەك کە پێویست بوونی بگەیەنێ.

---

(١) ئەبو حەنیفە بۆ ئەوە چووە کە شایەت یەکەم کەس نەبێت لەڕەجم کردنی زیناکەری (محصَن) ئەگەر حەددەکە بە شایەتی دان سابت بوو — وە ئەبێ ئیمام مەجبوری بکات لەسەر ئەوە، چونکە ئەو کارە هەڕەشەی تێدایە لە ئاسانکاری و هاندانیشی تیایە بۆ سابت کردن — بەڵام ئەگەر حەددەکە بە ئیعتڕاف سابت بوو پێویستە لەسەر ئیمام یان جێگرەکەی کە دەست بکات بە ڕەجم کردن.

وە بە پێی ئەوەی لە حەدیسەکەی ماعزدا باس کرا کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی دا بە ڕەجم کردنی ماعیز و خۆی لەگەڵیاندا نەچوو. وە زیناکەش بە ئیقراری خۆی چەسپا وەك لە پێشەوە باس کرا. وە هەروەها ئامادەی ڕەجم کردنی ژنە غامیدی‌یەکە نەبوو (ﷺ) وەك هەندێ ئەڵێن.

لە (التلخیص)دا ووتویەتی: لە هیچ ڕێگایەکی دوو حەدیسەکەدا نەهاتووە کە خۆی (ﷺ) ئامادەی هیچ کامیان بووبێت، بەڵکو لە هەندێ ڕێگادا بەڵگەی ئەوە هەیە کە ئامادەنەبووە، وە شافیعی ئەوەی تەئکید کردووە.

وە وتویەتی: وە ئەمما ژنە غامیدی‌یەکە لە سونەنی ئەبی داود و جگە لەودا بەڵگە هەیە کە ئامادە نەبوبێت.

وە ئەگەر ئەوە بڕیار بدرێ دەرئەکەوێ کە پێویست نی‌یە شاهید و ئیمام ئامادەی ڕەجم کردنەکە بێت.

بەڵام لەبارەی پەسەندێتی‌یەوە، ئیبنو دەقیقی عید باسی ئەوەی کردووە کە زانایان بە پەسەندی ئەزانن ئیمامەکە خۆی دەست بکات بە ڕەجم کردنەکە ئەگەر زیناکردنەکە بە ئیعترافی خۆی چەسپابێت، وە شایەتەکان دەست ئەکەن بە ڕەجم کردن کاتێ زیناکردنەکە بە شایەت چەسپابوو.

**ئامادەبوونی کۆمەڵێك لە موسڵمانان لە کاتی حەددەکەدا:**

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿الزَّانِيَةُ وَالزَّانِي فَاجْلِدُوا كُلَّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا مِائَةَ جَلْدَةٍ وَلا تَأْخُذْكُمْ بِهِمَا رَأْفَةٌ فِي دِينِ اللَّهِ إِنْ كُنْتُمْ تُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ وَلْيَشْهَدْ عَذَابَهُمَا طَائِفَةٌ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ﴾ (النور:٢)

واتە:کوڕ و کچی زیناکار کە لەوە بەپێش زەواجیان نەکردبێ، هەریەکەیان سەد داری لێبدەن، وە نابێت بەزەیی‌تان پیایاندا بێتەوە لە حوکمی خوادا، ئەگەر ئێوە باوەڕتان بە خوا و ڕۆژی دوایی هەیە، وە با بۆ سزادانەکەیان کۆمەڵێك لە موسڵمانان ئامادەبن.

وە زانایان ئەم ئایەتەیان کردۆتە بەڵگە بۆ ئەوەی کە پەسەندە کۆمەڵێك لە موسڵمانان جێبەجێ کردنی حەددەکە ببینن.

بەڵام جیاوازی‌یان هەیە لە ژمارەی ئەو کۆمەڵەدا، ووتراوە: چوار کەسە، وە وتراوە: سێ کەسە، وە وتراوە: دوو کەسە، وە وتراوە، حەوت کەس و زیاتر.

## چۆنیەتی دارلێدان:

ئەبو حەنیفە و شافیعی بۆ ئەوە چوون ئەبێ لە هەموو شوێنێکی بدرێ جگە لە شەرمگەی (فرج) و دەم و چاوی و سەری.

مالیك ووتویەتی: پیاو ڕووت ئەکرێتەوە کاتی لێدانی هەموو تۆڵەکان، وە هەروەها لای شافیعی و ئەبی حەنیفەش، جگە لە تۆڵەی (قذف) وە بە دانیشتنەوە لێی ئەدرێ نەك بە پێوە[1].

ئەوەوی ڕەحمەتی خوای لێبێت ووتویەتی:

هاوەڵەکانمان ووتویانە: ئەگەر قامچی بەکارهات ئەبێ قامچی‌یەکی مام ناوەندی بێت لە قەوارەدا، لەنێوان داری تەڕ و دار دەستتدا. وە ئەگەر بە پەلی دارخورما لێی درا ئەبێ سوکەڵە بێت لە نێوان ووشك و تەڕدا بێت، وە لێدانەکەش ئەبێ مام ناوەندی بێت دەستی ئەوەندە بەرزنەکاتەوە لەسەری تێ‌پەڕبێت، وە ئەوەندەش نزمی نەکاتەوە، بەڵکو ئەبێت بەرزکردنەوەیەکی مام ناوەندی بێت.

## مۆڵەت دانی کوڕ و کچی زیناکەر:

کوڕ و کچ مۆڵەت ئەدرێن هەتا گەرمای زۆر و سەرمای زۆر لائەچێت، وە هەروەها نەخۆش ئەگەر هیوای چاك بوونەوەی لێ ئەکرا بەڵام ئەگەر هیوای چاك بوونەوەی لێ نەئەکرا. هاوەڵەکانی شافیعی ووتویانە:

بە پەلی دارخورما لێی ئەدرێ ئەگەر بەرگەی بگرێ.

ئەبو داود و کەسانی‌تر لە پیاوێکی ئەنصاری‌یەوە ئەگێڕنەوە: کە پیاوێك لەوان تووشی نەخۆشی‌یەکی گران بوو هەتا وای لێکرد پێستەکەی نوسا بە ئێسقانەکەیەوە. ڕۆژێك جاری‌یەیەك ئەچێتە لای ئارەزوی ئەجولێ و ئەی گرێ و زینای لەگەڵ ئەکا.

کاتێ خەڵك ئەچنە سەردانی بۆیان ئەگێڕێتەوە و ئەڵێ: پرسیارم بۆ بکەن لای پێغەمبەر (ﷺ) کە من زینام کردوە لەگەڵ جاری‌یەیەکدا، ئەوانیش بۆ پێغەمبەریان (ﷺ) گێڕایەوە، و ووتیان: کەسمان نەبینیوە ئەوەندە وێران بێت، ئەگەر هەڵی بگرین بیهێنین بۆ لات ئێسکەکانی لێك ئەبێتەوە، هەر پێستەکە و ئێسقانەکەی ماوە.

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی دا سەد شوڵ بە یەکەوە ببەستن و یەك جار پێی لێبدەن.

---

(١) (بداية المجتهد جـ ٢ ص ٤١٠).

**ئایا حەد لێدراو خوێنی هەیە ئەگەر مرد؟:**

کاتێ حەد لێدراو بمرێت بە لێدانەکە خوێنی نییە.

نەوەوی لە شەرحی موسلیم دا ووتویەتی: زانایان هەموو لەسەر ئەوەن ئەگەر یەکێك حەدی شەرعی لەسەر پێویست بوو ئیمام یا جەللاد حەددی شەرعی لێداو مرد نە خوێنی هەیە نە کەفارەت، نە لەسەر حاکم نە لەسەر جەللادەکە، وە نە لە (بیت المال)دا.

ئەوەی لە پێشەوە باس کرا حوکمی تاوانی زینا بوو، ماوەتەوە باسی هەندێکیتر لە تاوانەکان و حوکمەکانیان بکەین لەمەو دوا:

**(١)کردەوەی نەتەوەی لوط:**

بەڕاستی تاوانی (لواط) نێربازی لە گەورەترین تاوانەکانە، وە لەو فاحیشە پیس و تێك دەرانەیە کە تێکدەری خو و ڕەوشت و سروشت و دین و دونیایە، بەڵکو تێك دەری ژیان خۆشیەتی، وە خوای گەورە لەسەر ئەو تاوانە ئەوپەڕی سزای داوە. زەوی ژێرچوان بە نەتەوەی لوطەوە، وە بەرد بارانی کردن بە قوڕی ووشکەوە بوو لەتۆڵەی ئەو کردەوە پیسەیان دا. وە ئەوەی کرد بە قورئان کە ئەخوێندرێتەوە بۆ ئەوەی ببێ بە پەندو ئامۆژگاری. خوای پاك و بێ گەرد فەرموویەتی: ﴿وَلُوطاً إِذْ قَالَ لِقَوْمِهِ أَتَأْتُونَ الْفَاحِشَةَ مَا سَبَقَكُمْ بِهَا مِنْ أَحَدٍ مِنَ الْعَالَمِينَ، إِنَّكُمْ لَتَأْتُونَ الرِّجَالَ شَهْوَةً مِنْ دُونِ النِّسَاءِ بَلْ أَنْتُمْ قَوْمٌ مُسْرِفُونَ، وَمَا كَانَ جَوَابَ قَوْمِهِ إِلَّا أَنْ قَالُوا أَخْرِجُوهُمْ مِنْ قَرْيَتِكُمْ إِنَّهُمْ أُنَاسٌ يَتَطَهَّرُونَ، فَأَنْجَيْنَاهُ وَأَهْلَهُ إِلَّا امْرَأَتَهُ كَانَتْ مِنَ الْغَابِرِينَ وَأَمْطَرْنَا عَلَيْهِمْ مَطَراً فَانْظُرْ كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الْمُجْرِمِينَ﴾ (لأعراف:٨٠-٨٤)

واتە: ئەی محمد باسی نێرراوی خوا لوط بکە کاتێ بە نەتەوەکەی ووت: ئایا ئێوە ئەو کردەوە پیس و ناشیرینە ئەکەن؟ کە کەس لەم جیهانەدا پێش ئێوە نەی کردووە. ئێوە ئەچنە لای پیاوان لەبەر هەوەس و ئارەزوی خۆتان و واز ئەهێنن لە ژنەکانتان کە خوا بۆی حەڵاڵ کردون، بەڵکو ئێوە هەر نەتەوەیەکی زیادڕەو و دەرچوون لە سنوری خوا. وە وەڵامی نەتەوەکەی لوط بە تەنها ئەوە بوو کە ووتیان: ئەمانە دەربکەن لە شارۆچکەکەتاندا، چونکە ئەمانە کسانێکن کە خۆیان پاك ڕائەگرن، جا ئێمەش لوط و ئەوانەی لەگەڵیا بوون لە کەس و کاری ڕزگارمان کردن، جگە لە ژنەکەی، چونکە لەوانە بوو کە لەناو چوون، وە بارانمان نارد بەسەریاندا لە بەرد، سەیرکە سەرەنجامی تاوان باران چۆن بوو.

وە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَلَمَّا جَاءَتْ رُسُلُنَا لُوطاً سِيءَ بِهِمْ وَضَاقَ بِهِمْ ذَرْعاً وَقَالَ هَذَا يَوْمٌ عَصِيبٌ، وَجَاءَهُ قَوْمُهُ يُهْرَعُونَ إِلَيْهِ وَمِنْ قَبْلُ كَانُوا يَعْمَلُونَ السَّيِّئَاتِ قَالَ يَا قَوْمِ هَؤُلَاءِ بَنَاتِي

هُنَّ أَطْهَرُ لَكُمْ فَاتَّقُوا اللَّهَ وَلَا تُخْزُونِ فِي ضَيْفِي أَلَيْسَ مِنْكُمْ رَجُلٌ رَشِيدٌ، قَالُوا لَقَدْ عَلِمْتَ مَا لَنَا فِي بَنَاتِكَ مِنْ حَقٍّ وَإِنَّكَ لَتَعْلَمُ مَا نُرِيدُ،قَالَ لَوْ أَنَّ لِي بِكُمْ قُوَّةً أَوْ آوِي إِلَى رُكْنٍ شَدِيدٍ، قَالُوا يَا لُوطُ إِنَّا رُسُلُ رَبِّكَ لَنْ يَصِلُوا إِلَيْكَ فَأَسْرِ بِأَهْلِكَ بِقِطْعٍ مِنَ اللَّيْلِ وَلَا يَلْتَفِتْ مِنْكُمْ أَحَدٌ إِلَّا امْرَأَتَكَ إِنَّهُ مُصِيبُهَا مَا أَصَابَهُمْ إِنَّ مَوْعِدَهُمُ الصُّبْحُ أَلَيْسَ الصُّبْحُ بِقَرِيبٍ، فَلَمَّا جَاءَ أَمْرُنَا جَعَلْنَا عَالِيَهَا سَافِلَهَا وَأَمْطَرْنَا عَلَيْهَا حِجَارَةً مِنْ سِجِّيلٍ مَنْضُودٍ، مُسَوَّمَةً عِنْدَ رَبِّكَ وَمَا هِيَ مِنَ الظَّالِمِينَ بِبَعِيدٍ﴾ (هود:٧٧-٨٣).

واتە: كاتێ فریشتە نێرراوەكانمان هاتنە لای لوط پەژارە دای گرت بە هاتنیان، چونكە نەی ئەزانی كە ئەوانە نێرراوی خوان، ترسا لەسەریان لە قەومەكەی، وە وتی: ئەمڕۆ ڕۆژێكی ڕەش و گرانە، وە نەتەوەكەی بە پەلە هاتن بۆ لای كە فاحیشە بكەن لەگەڵ میوانەكانیدا، وە لە پێش ئەوەشدا ئەوان زۆر كردەوەی پیس و ناشیرینیان ئەكرد، جا لوط پێی ووتن: ئەی نەتەوەكەم ئەوە كچەكانمە مارەیان بكەن چونكە ئەوان پاك ترن لەوەی ئەتانەوێ، جا لەخوا بترسن و ئابڕوم مەبەن لای میوانەكانم. ئایا پیاوێكی ژیرتان تێدا نیەیە؟ ووتیان: تۆ زوو زانیوتە كە ئێمە ئارەزومان لە هێنانی كچەكانت نیەیە، وە بەڕاستی تۆ چاك ئەزانی ئێمە چیمان ئەوێت، كاتێك قەومەكە هەر سوربوون لەسەر كردنی فاحیشەكەو هیچی تریان قەبوڵ نەكرد، لوط پێیانی وت: ئەگەر تواناو دەسەڵاتم ئەبوو بە سەرتانا، یان خێڵێكم ئەبوو بم پارێزێ لە ئێوە، نەم ئەهێشت ئەوەی كە ئەتانەوێ بیكەن.

ئەوانیش ووتیان: ئەی لوط ئێمە نێرراوی پەروەردگاری تۆین، ناردوینی تا قەومەكەت لەناو بەرین، وە ئەوان دەستیان پێت ناگات، دەرچۆ لەم دێیە خۆت و كەس و كارت لە بەشی كۆتایی شەودا، وە كەستان ئاوڕ مەدەنەوە بۆ دواوە، ئیللا ژنەكەت نەبێت كە خیانەتی لێ كردی بەهۆی كوفرو دوو ڕوییەوە وە ئەو سزاو لەناو چونەی بە قەومەكەت ئەگات بەویش ئەگات، وە كاتی لەناو چونیشیان بەیانیە، ئایا بەیانی نزیك نیەیە؟ كاتێك فەرمانی ئێمە هات بە عەزاب دێیەكەیانمان سەرەو خوار كردەوەو بەردمان بەسەردا باراندن لە قوڕی ڕەقی پتەو، كە بە ڕیزو یەك لەدوای یەك بوو، نیشان كرابوون لای خوا بە نیشانەیەكی زانراو كە وەك بەردی سەر زەوی نەبوو، وە ئەو دێیانەی كە توشی ئەو عەزابە بوون دوور نیەیە لە ستەمكارانەوە.

وە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی داوە بە كوشتنی ئەوانەی ئەو كارە ئەكەن و لەعنەتی لێ كردوون.

أبو داود و (ترمذي) و نەسائی و ئیبنو ماجە ئەگێڕنەوە لە عیکریمەوە لە ئیبنوعەبباسەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (من وجدتموه یعمل عمل قوم لوط، فاقتلوا الفاعل و المفعول به)[1].

واتە: هەر کەستان بینی کاری نەتەوەی لوطی ئەکرد، بکەر و کارپێکراو بکوژن (هەردوکیان).

وە لەفزی نەسائی ئەفەرمووێ: (لعن الله من عمل عمل قوم لوط، لعن الله من عمل عمل قوم لوط، لعن الله من عمل عمل قوم لوط)[2].

واتە: سێ جار فەرموویەتی نەفرینی خوا لەو کەسەی کردەوەی نەتەوەی لوط ئەکات.

شەوکانی وتویەتی: چەندە پێویستە ئەو کەسەی کە ئالاوە لەو تاوانە پەست و سوکەوە بە شێوەیەك سزا بدرێ کە ببێتە پەندو عیبرەت بۆ هەموو کەس، وە بە جۆرێك تەعزیب بدرێت کە ئارەزوی ئەو فاسقە یاخی بوانە بشکێنێ. وە ئەو کەسەی داوێن پیسی ئەو نەتەوەیە دووبارە بکاتەوە کە کەس لە جیهاندا پێش ئەوان نەیکردووە، شایستەی ئەوەیە کە سزایەکی وەها توندو تیژ بچێژێ کە وەك سزای ئەوانە وابێت کە خوا کردنی بە ناخی زەوی‌دا و گەورە و بچووکی لەبن دەرهێنان.

وە بۆیە ئیسلام ئەوەندە توندوتیژی ئەکات لە سزای ئەم تاوانەدا لەبەر شوێنەوارە خراپەکانی و زیانەکانی‌یەتی لە تاکو کۆمەڵدا.

ئەو زیانانەش بە کورتی باس ئەکەین کە لە کتێبی (الاسلام و الطب)دا هاتووە:

١- نەمانی ئارەزوو بەرامبەر بە ئافرەت:

سروشتی نێربازی وەهایە پیاو دوور ئەخاتەوە لە ژن، وە جاری وا هەیە کە توانای چوونە لای ژنی نامێنێ، بەوەش گرنگ ترین وەزیفە لە وەزیفەکانی ژن هێنان پەك ئەخات، ئەویش خستنەوەی نەوەیە،

ئەگەر وادانرا کە پیاوێکی وەها ژن بهێنێ، ئەوە ئەو ژنە ئەبێتە قوربانی، نە ئارامی دەست ئەکەوێ وە نە ئەو خۆشەویستی و بەزەیی‌یە کە بناغەی ژیانی ژن و مێردایەتی‌یە، ئەو کاتە ژیان بەسەر ئەبات بە ئازارو ئەشکەنجەو بە هەڵواسراوی، چونکە نە خاوەن مێردە وە نە ئازادیشە.

(١) أحمد (١/٣٠٠) وأبوداود (٤٤٦٢) والترمذي (١٤٥٦) وابن ماجة (٢٥٦١).

(٢) النسائي في الكبرى (٧٣٣٧).

٢- کارتێ کردنی بۆ سەر (أعصاب):

ئەو خورەوشتە پیسە لەگەڵ دەروندا ئەجەنگێ، وە کار ئەکاتە سەر (أعصاب) دەمارەکانی بە تایبەتی، یەکێ لە سەرەنجامەکانی توشبوونە بە وەرچەرخانی دەروونی لە خو و ڕەوشتی ئەو کەسەدا، ئەو کاتە لە ناخی دڵیەوە وا هەست ئەکات کە بۆ ئەوە دروست نەبووە پیاو بێت، ئینجا ئەو هەستە ئەبێ بە (شذوذ) دەگمەنی، کە بە هۆی ئەوەوە هەست و شعوری نێربازەکە وەرئەچەرخێ بە شێوەیەکی غەریب، ئیتر ئارەزوی ئەبێت بۆ ئەوەی ڕەگەزەکەی خۆی، وە بیرە پیسەکانی ڕوئەکات بەرەو ئەندامی زاووزێیان.

لەوەوە ئەتوانی هۆی ڕاستەقینەت بۆ دەرکەوێ لە زیادە ڕەوی کردنی هەندێ لە لاوە ڕەوشت نزمەکان لە خۆ ڕازاندنەوە و لاسایی کردنەوەی ژنان بەوەی ئارایشتی جۆراو جۆر ئەکەن و هەوڵ ئەدەن خۆیان بە دیمەنێکی جوان دەربخەن، کوڵمیان سوور ئەکەن و برۆیان هەڵئەگرن و بە لەنجەولار ئەڕۆن و گەلێ خورەوشتی تر کە هەموومان ئەی بینین لە هەموو شوێنێکدا، وە زۆر جار بەرچاومان ئەکەوێت.

کتێبە پزیشکیەکان زۆر ڕوداوی سەیریان سابت کردووە کە پەیوەندییان بەو (شذوذ) ەوە هەیە من لێرەدا باسی ناکەم.

کارەکە هەر بەوەوە ناوەستێ کە نێرباز تووشی وەرچەرخاندنی دەرونی ئەبێت، بەڵکو شتی تریش هەیە کە لەم کارە ناشیرینەوە پەیدا ئەبێت، لە لاواز کردنی هێزەکانی دەرونی سروشتی لەو کەسەدا، و تووش بوونی بە چەندەها نەخۆشی عەصەبی و نەفسییەوە، کە لەزەت و خۆشی ژیانی لێ لەدەست ئەداو سیفەتی مرۆڤایەتی و پیاوەتی لێ دائەماڵێ، وە چەند برینێکی ویراسی تیا زیندو ئەکاتەوە، هەروەها چەند دەردێك تیا سەر هەڵئەدا کە شاراوە بوون و ئەو فاحیشەیە دەریان ئەخاتەوەو وای لێ ئەکات کە زاڵ بن بەسەریدا.

وە نمونەی ئەو نەخۆشییە عەصەبییە نەفسییانەش: نەخۆشییە گیرەوەکان و (الماسوشية) و (الفيتشزم) و جگە لەوانەش.

٣- کار تێکردنی لە مێشك :

وە لەگەڵ ئەوانەشدا نێربازی ئەبێتە هۆی خراپ بوونێکی زۆر لە هاوسەنگی عەقڵی مرۆڤ و شلەژانێکی گشتی لە ئەندێشەیاو مەیین لە تێڕوانینیداو لاوازیەکی ئاشکرا لە عەقڵ و ئیرادەیا. ئەوەش ئەگەڕێتەوە بۆ کەمی ڕژاندنی ئەو مادە ناوەکییانەی کە غوددەی دەرەقی ئەیان ڕژێ وە

هەروەها ئەو غوددانەی لەسەر گورچیلەکانن، وە جگە لەوانەش کە نێربازی کاریگەری ڕاستەوخۆیان تێ ئەکاو پاشان کارو ئەرکەکانی ئەو غوددانە ئەشێوێ و خراپ ئەبێ.

وە تۆ خۆت ئەبینی کە پەیوەندیەکی بەهێزو غەریب هەیە لە نێوان (نیورستانیا) و نێربازیدا، هەر بۆیە نێرباز دوچاری گەوجیەتی و حەپۆلەیی و پەرتەوازەیی بیرو ون بوونی عەقڵ و شارەزایی ئەبێت.

٤- نەخۆشی سوەیداء:

کاری‌نەتەوەی لوط یا هۆیە بۆ پەیدابوونی نەخۆشی سوەیداء یا ئەبێت بە هۆکارێکی بەهێز بۆ دەرخستن و زیندو بوونەوەی ئەو نەخۆشیە.

وە دۆزراوەتەوە کە ئەو کارە پیسە هۆیەکی زۆر کاریگەرە لەسەر ئەو نەخۆشیە لە ڕووی زیادبوونیەوە، وە لە ڕوی ئاڵۆزاندنی دیاردەکانیەوە، ئەوەش ئەگەڕێتەوە بۆ (شذوذ)ی وەزیفەیی ئەو کارە زشت و ناپەسەندەو کاریگەری خراپی بۆ سەر دەمارەکانی لەش.

٥-ئارەزو نەشکاندن بە نێربازی:

نێربازی نەخۆشیەکی شازە وە ڕێگاکەشی بەس نیە بۆ تێرکردنی سۆزی جینسی، چونکە لە بنەڕەتدا دوورە لە ژن و مێردایەتی کردنی سروشتی، هەڵناستێ بەڕازی کردنی کۆمەڵەی دەمارەکان، زۆر تەنگ هەڵئەچنێ بە جیهازی ماسولکەیی، کاریگەری خراپی هەیە بۆ سەر هەموو بەشەکانی لەش.

ئەگەر ئێمە سەیری فسیولوجی جیماع و ئەو وەزیفە سروشتیەی کە ئەندامەکانی تەناسولی ئەنجامی ئەدەن کاتی جیماع کردن بکەین، و بەراوردی بکەین لەگەڵ ئەوەی کە ڕوو ئەدات لە (لواط) نێربازیدا، ئەبینین جیاوازیەکی دوور هەیە لە نێوانیاندا، جگە لە شیاو نەبوونی ئەو شوێنەو نەگونجانی بۆ ئەو وەزعە شازە.

٦- شل بوونەوەی ماسولکەی کۆم و پچڕاندنیان:

ئەگەر لە ڕوویەکی ترەوە سەیری کاری نەتەوەی لوط بکەی ئەبینی هۆیەکە بۆ دڕاندنی ماسولکەی کۆم و لەناوچونی چنراوەکانی و شل بوونەوەی ماسولکەکانی و کەوتنی هەندێ لە بەشەکانی، بە شێوەیەك توانای ڕاگرتنی پیسایی نامێنێ، هەر بۆیە ئەبینی ئەو داوێن پیسانە هەمیشە پیسن بەو مەوادە بۆگەنە کە لێیان دەرئەچێ بێ ئەوەی هەستی پێ بکەن.

٧- پەیوەندی نێربازی بە خو و ڕەوشتەوە:

نێربازی فەسادێکی ڕەوشتی و نەخۆشی‌یەکی دەروونی ترسناکە، ئەبینی هەموو ئەو کەسانەی ئەو سیفەتەیان هەیە بەدڕەوشت و فاسیدن، ناتوانن چاکەو خراپە لەیەك جیا بکەنەوە، ویستیان لاواز و ویژدانێکیان نی‌یە کە بیان گێڕێتەوە، یەکێك لەوان مانیعی نی‌یە و سڵ ناکاتەوە کە پەلاماری منداڵ و بچوك بدات وەك دڕندە و توندو تیژی بەکار بهێنێ بۆ ئەوەی غەریزە فاسیدەکەی خۆی تێر بکات و چاوی نەترسێ لە ئەنجامدانی ئەو تاوانانەی کە زۆریان لێ ئەبیستین و ئەیان خوێنینەوە لە ڕۆژنامە گەڕۆکەکانداو جگە لەوانیش، وە درێژەی ئەو ڕوداوانە وا لە دادگاکان و کتێبە پزیشکی‌یەکاندایە.

٨- کاری نەتەوی لوط و پەیوەندی بە تەندروستی گشتی‌یەوە :

وە ئەو کارە لەسەر هەموو ئەوانەشەوە تێ گلاوەکانی تووشی سنگ توندی و دڵە تەپەو داخورپیان ئەکات، وە حاڵەتێکی لاوازی گشتی‌یان بەسەرا ئەهێنێ کە ڕوبەڕویان ئەکات بۆ توش بوون بە چەندەها نەخۆشی جۆراوجۆرەوە.

٩- کارتێکردن لە ئەندامەکانی زاووزێ (تناسل):

هەروەها ئەو کارە مەڵبەندەکانی دابەزاندنی سەرەکی لە لەشدا لاواز ئەکات و گیاندارە مەنەوی‌یەکانی لەناو ئەبات و کار ئەکاتە سەر پێکهێنانی مەوادەی مەنی، وە پاش ماوەیەکی کەم کارەکە ئەگات بەوەی کە توانای بنیات نانی ئەوەی نامێنێت، کە ئەوەش حوکم ئەکات بە قڕتێکەوتن بڕانەوەی لیواط کەرەکان.

١٠- گرانەتاو دوسنتاریا:

وە ئەتوانین بڵێین: کە کاری نەتەوەی لوط جگە لەوانەش هۆیە بۆ تووش بوون بە گرانەتا و دوسنتاریا و گەلێ نەخۆشی پیسی تر کە ئەگوێزرێنەوە بە ڕێگای پیس بوون بە مەوادەی پیسایی کە جۆرەها میکرۆبی تێدایە کە پڕن لە چەندەها هۆی دەردو نەخۆشی.

١١- نەخۆشیەکانی زینا:

شاراوە نی‌یە کە ئەو نەخۆشی‌یانەی بە هۆی زیناوە بڵاوئەبنەوە لەوانەیە بە هۆی (لواط)یشەوە بڵاو ببنەوە، وە تووشی ئەو کەسانە بێت کە ئەو کارە ئەکەن و هێرشێکی بەپەلە بکاتە سەریان و گیانیان بڕزێنێ و ڕۆحیان بچنێ.

لەوەوە کە باس کرا حیکمەتی یاسای ئیسلامان بۆ رون ئەبێتەوە لە حەرام کردنی کاری نەتەوەی لوطدا، هەروەها وردی حوکمەکانی ئیسلامان بۆ ئاشکرا ئەبێت لە سزادانی ئەو کەسانەدا کە لەو کارەوە ئەگلێن، وە لە فەرمان کردنی بە لەناو بردنیان و رزگار کردنی جیهان لە شەڕیان.

**ڕای زانایان دەربارەی حوکمی لواط :**

وە لەگەڵ ئیجماعی زانایان لەسەر حەرامێتی ئەم تاوانە، وە لەسەر واجب بوونی گرتنی تاوانباران بە توندی، جیاوازی‌یان هەیە لە دانان و تەقدیر کردنی ئەو سزایەی کە بڕیار دراوە بۆیان. وە بوون بە سێ مەزهەب:

١- مەزهەبی ئەوانەی ئەڵێن سزاکەیان کوشتنە بە شێوەیەکی ڕەها:

٢- وە مەزهەبی ئەوانەی ئەڵێن حەدەکەی حەدی زینایە. کوڕ داری حەددی لێ ئەدرێ و پیاو ڕەجم ئەکرێ.

٣- مەزهەبی ئەوانەی ئەڵێن ئەبێ (تعزیر) سزا بدرێن.

(مەزهەبی یەکەم):

هاوەڵەکانی پێغەمبەر و (ﷺ) ناصر و قاسمی کوڕی ئیبراهیم و شافیعی لە وتەیەکی‌دا ڕایان ئەوەیە: کە تۆڵەی کوشتنە با ژنیشی نەهێنابێت، ئیتر بکەر بێت یا کار پێ کراو بێت یەکسانە. وە بەڵگەشیان ئەمانەی لای خوارەوەیە:

١-لە عیکریمەوە لە ئیبنو عەبباسەوە کە ووتویەتی: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (من وَجَدتموه يَعْمَلُ عَمَلَ قوم لوطٍ فاقتلوا الفاعِل و المفعول به) رواه الخمسة إلا النسائي[1].

واتە: هەرکەسێکتان بینی کاری نەتەوەی لوطی ئەکرد بکەر و کار پێ کراو بکوژن.

خاوەنی (النیل) وتویەتی: حاکم و بەیهەقیش تەخریجیان کردووە[2].

وە (حافظ) ووتویەتی: پیاوەکانی جێی باوەڕن بەڵام جیاوازی تێدا هەیە.

٢- وە لە عەلیەوە ڕەزای خوای لێ بێت هاتووە کە ئەو کەسەی ڕەجم ئەکرد ئەو کارەی بکردایە. بەیهەقی تەخریجی کردووە.

---

(١) تەخریجی ئەم حەدیسە ڕابوورد.

(٢) الحاكم (٤/٣٥٥) والبيهقي (٨/٢٣٢).

شافیعی ووتویەتی: بەوە ئێمە ئەوكەسە ڕەجم ئەكەین كە ئەو كارە بكات ژنی هێنابێت یا ژنی نەهێنابێت.

٣- وە لە ئەبو بەكرەوە ڕەزای خوای لێ بێت هاتووە كە ئەو خەڵكی كۆكردەوە دەربارەی پیاوێك كە وەك ژن ئەچوونە لای. ئینجا پرسیاری لە هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) كرد، وە توندترینیان لە ڕوی قسەوە ئەو كاتە عەلی كوڕی ئەبی طالیب بوو ڕەزای خوای لێ بێت ووتی: (ئەوە تاوانێكە هیچ نەتەوەیك نەی كردووە جگە لە یەك نەتەوە نەبێت، وە خۆتان ئەزانن خوا چی بەسەر هێنان، لەبەرئەوە ڕامان وایە كە بیسوتێنن بە ئاگر). جا ئەبوبەكر نوسی بۆ خالیدی كوڕی وەلید فەرمانی پێ كرد بیسوتێنێ بە ئاگر.

بەیهەقی تەخریجی كردووە، وە لە ئیسنادەكەیدا (إرسال) هەیە وە شەوكانی ئیفادەی داوە كە ئەم حەدیسانە بە هەموویان هەڵئەستن كە بكرێنە بەڵگە.

وە ئەوانە جیاوازییان هەیە لە چۆنێتی كوشتنی ئەو كەسەی ئەو كارە ئەكات.

لە ئەبوبەكر و عەلیەوە ئەگێڕنەوە: كە ڕایان وابووە بە شمشێر بكوژرێ، لە پاشاندا بسوتێنرێ، لەبەر زلی تاوانەكەی.

عومەر و عثمان بۆ ئەوە چون كە ئەبێ دیوارێكی بەسەردا بڕوخێنرێ.

ئیبنو عەبباس بۆ ئەوە چووە كە لەسەر بڵندترین خانووی شارەوە فڕێ بدرێتە خوارەوە.

بەغەوی لە شیعبی و زوهری و مالیك و ئەحمەد و ئیسحاقەوە ئەگێڕێتەوە كە ئەبێ (رجم) سەنگ باران بكرێت.

وە لە نەخەعیەوە ئەگێڕنەوە: كە ئەگەر ڕاست بوایە زیناكەر دوو جار ڕەجم بكرایە، ئەوەی كردەوەی نەتەوەی لوطی ئەكرد دوجار ڕەجم ئەكرا.

وە (منذري) ووتویەتی: ئەبو بەكر و عەلی و عبدالله ی كوڕی زوبێر و هیشامی كوڕی عبدالملك ئەو كەسانەیان ئەسووتاند كە ئەو كارەیان ئەكرد

(مەزهەبی دووەم):

سەعیدی كوڕی موسەییب و عەطائی كوڕی ئەبی ڕەباح و حەسەن و قەتادە و نەخەعی و ثەوری و ئەوزاعی و ئەبو طالیب و ئیمام یەحیا و شافیعی لە وتەیەكیدا بۆ ئەوە چوون كە حەددی ئەو كەسە وەكو حەددی زیناكەرە، كوڕ داری حەددی لێ ئەدرێ و ساڵێك دەرئەكرێ، وە پیاو ڕەجم ئەكرێت.

وە بەڵگەیان هێناوەتەوە بەمانەی لای خوارەوە:

١- ئەو کارە جۆرێکە لە جۆرەکانی زینا چونکە داخلْ کردنی فەرجێکە لە فەرجکدا، کەواتە هەردوکیان بکەرو کارپێ کراو ئەچنە ژێر گشتێتی ئەو بەڵگانەی هاتووە دەربارەی زیناکەری (محصن) و زیناکەری (بکر)دا، وە پشتگیری ئەمە ئەکات فەرمودەی پێغەمبەر (ﷺ) کە فەرموویەتی: (إذا أتى الرَّجُلُ الرَّجُلَ فهما زانيان)

واتە: ئەگەر پیاو بچێتە لای پیاو بۆ داوێن پیسی هەردووکیان زیناکەرن[1].

٢- ئەگەر وا دابنرێ بەڵگە هاتووەکان دەربارەی سزای زیناکەر نایان گرێتەوە، ئەوە بە ڕێگای قیاس هەر ئەچنە پاڵ زیناکەر.

(مەزهەبی سێیەم):

ئەبو حەنیفەو موئەییەد باللە و مرتضی و شافیعی لەقەولێکی دا بۆ ئەوە چون کە بکەری ئەو کارە ناڕەوایە (تعزیر) سزا بدرێ، چونکە کارەکە زینا نییە و حوکمی زینا نایگرێتەوە.

وە شەوکانی مەزهەبی ئەو کەسانە پێش ئەخات کە ئەڵێن بکوژرێ، وە مەزهەبی دوایی بە لاواز داناوە چونکە پێچەوانەی بەڵگەکانە، وە موناقەشەی مەزهەبی دووەمی کردووە و ووتویەتی: بە ڕاستی ئەو بەڵگانەی کە هاتوون بۆ کوشتنی بکەرو کار پێ کراو بە ڕەهایی تایبەت کەرن بۆ گشتییەتی بەڵگەکانی زینا کە جیاوازی ئەکات لە نێوان کوڕو پیاودا ئەگەر وادابنرێ کە شمولی ئەوانە ئەکەن کە تاوانی نەتەوەی لوط ئەکەن، هەروەها ئەو بەڵگانە پوچەڵ کەرەوەن بۆ ئەو قیاسە باسکراوە ئەگەر وا دابنرێ شمولیان ناکەن، چونکە ئەو قیاسە ئیعتیباری نامێنێ، وەکو لە (أصول)دا بڕیار دراوە[2].

(٢) دەست پەڕ (الإستمناء):

بە دەست ئاوی خۆ هێنانەوە پێچەوانەی ئەدەب و خوڕەوشتی جوانە کە ئەبێت ئادەمیزادی لەسەر بێت وە زانایان جیاوازییان هەیە لە حوکمەکەیدا:

هەندێکیان ئەڵێن بە گشتی حەرامە.

وە هەندێکیان ئەڵێن لە هەندێ حاڵەتدا حەرامەو لەهەندێ حاڵەتی تردا پێویستە.

---

(١) البيهقي (٨/٢٣٣).

(٢) چونکە قیاس دروست نییە لە کاتێکدا کە (نص) دەقی کیتاب و سوننەت هەبێت.

وە هەندێکیان بۆ ئەوە چوون کە کەراهەتی هەیە.

ئەوانەی بۆ حەرامێتی چوون مالیکی‌یەکان و شافیعی‌یەکان و زەیدی‌یەکانن.

وە بەڵگەشیان بۆ حەرامێتی ئەوەیە کە خوای گەورە فەرمانی داوە بە پاراستنی (فرج) لە هەموو حاڵەتێکدا ئیللا بە نیسبەت خێزانی خۆی و کەنیزەك نەبێ.

جا ئەگەر کەسێك لەو دوانە دەرچوو بە دەست ئاوی خۆی هێنایەوە، ئەوە لەو زیادەڕەوانەیە کە تێ ئەپەڕێ لەو شتەی کە خوا حەڵاڵی کردووە بۆیان بۆ شتێك کە خوا حەرامی کردووە لەسەریان. خوای گەورە ئەفەرمووێ: ﴿وَالَّذِينَ هُمْ لِفُرُوجِهِمْ حَافِظُونَ.إِلَّا عَلَى أَزْوَاجِهِمْ أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُهُمْ فَإِنَّهُمْ غَيْرُ مَلُومِينَ. فَمَنِ ابْتَغَى وَرَاءَ ذَٰلِكَ فَأُولَٰئِكَ هُمُ الْعَادُونَ﴾ (المؤمنون:٥-٧)
واتە: وە ئەو کەسانەی پارێزگاری شەرمگەیان ئەکەن لەو شتانەی کە خوا حەرامی کردووە، مەگەر بۆ ژنەکانیان نەبێت، یا بۆ کەنیزەکەکانیان، ئەوە لەوانەدا لۆمەکراو نین کە خۆشی‌یان لێ وەربگرن، جا هەرکەس هەوڵی خۆشی وەرگرتن بدات بە جگە لە ژنەکەی یا کەنیزەکەکەی، وئەوە لەو کەسانەیە کە حەڵاڵ تەجاوز ئەکەن بۆ حەرام.

بەڵام ئەوانەی بۆ ئەوە چون کە لە هەندێ حاڵەتدا حەرامەو لە هەندێکی تردا پێویستە. حەنەفی‌یەکانن کە ووتویانە: دەست پەڕ کردن پێویستە ئەگەر ترسی تووش بوونی زیناکردن هەبوو بەبێ ئەو کارە لەسەر بنەمای: (ئەنجامدانی سوکترینی دوو زیان).

وە ووتویانە: حەرامە ئەگەر بۆ ئارەزوو ورووژاندن و خۆشی بێت،

وە ووتویانە: قەیناکە ئەگەر کەسێك زۆری بۆ هاتبێ، نە ژنی هەبێت نە کەنیزەك ئەویش بە مەبەستی ئەوە کە خۆی دامرکێنێتەوە.

بەڵام حەنبەلی‌یەکان ووتویانە: ئەو کارە حەرامە، مەگەر کەسێك ئەو کارە بکات لە ترسی تووش بوون بە زینا، یا لە تەندروستی خۆی بترسێ، وە نە ژنی هەبێت نە کەنیزەك و توانای ژن هێنانیشی نەبێت، ئەو کەسانە بۆیان هەیە ئەو کارە بکەن و هیچیان لەسەر نی‌یە.

بەڵام ئیبنو حەزم ڕای وایە کە دەست پەڕ شتێکی ناشیرینەو گوناهی تێدا نی‌یە، چونکە پیاو دەست بدات لە فەرجی خۆی بە دەستی چەپ ڕەوایە بە ڕای هەمووان، وە ئەگەر دەست لێدان ڕەوا بێت، لە ڕەوایی‌یەکە زیاتر شتێکی تر نی‌یە ئەوە نەبێت کە ئاو بێنێتەوە، ئەو کارەش حەرام نی‌یە لە ئەسڵا بە پێی فەرموودەی خوای گەورە کە فەرموویەتی: ﴿وَقَدْ فَصَّلَ لَكُمْ مَا حَرَّمَ عَلَيْكُمْ﴾ (الأنعام: من الآیة١١٩). واتە: وە بەڕاستی خوای پاك و بێگەرد هەموو ئەو شتانەی بۆ ڕوون کردونەتەوە کە لەسەری حەرام کردوون.

وە ئەو کارە لەو شتانە نىیە کە خوا حەرام بوونەکەی بۆ ڕون کردوینەوە، کەواتە حەڵاڵە بەپێی فەرمودەی خوای گەورە: ﴿خلق لكم مافي الأرض جميعا..﴾

واتە: هەرچی لە زەویدایە خوا بۆ ئێوەی دروست کردووە سوودی لێوەربگرن.

وە وتویەتی: بۆیە مەکڕوهە چونکە لە ڕەوشتە جوانەکان و خوە چاکەکانی ئادەمیزاد نییە.

وە بۆمان گێڕراوەتەوە کە خەڵك قسەیان لە دەست پەڕ کردووە جا کۆمەڵێك بە خراپیان داناوە کۆمەڵێکیش بە ڕەوا.

وە لەوانەی بە خراپیان داناوە ئیبنو عومەر و عەطاء بووە.

وە لەوانەی بە ڕەوایان داناوە ئیبنو عەبباس و حەسەن و هەندێ لە گەورە پیاوانی تابیعی بوون.

حەسەن ووتویەتی: لە کاتی غەزادا کە دوور ئەکەوتنەوە لە ماڵەکانیان ئەو کارەیان ئەکرد.

موجاهید ووتویەتی: ئەوانەی پێش ئێمە بە گەنجەکانیان ئەووت ئەو کارە بکەن لەبەر داوێن پاکی.

وە حوکمی ئافرەتیش لەو کارەدا وەك حوکمی پیاوە.

## (٣) لێخشاندن (سحاق):

لێخشاندن بە ڕای هەموو زانایان حەرامە، بە پێی ئەوەی ئەحمەد و موسلیم و ئەبو داود و (ترمذي) گێڕاویانەتەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (لاينظر الرجل إلى عورة الرجل، ولا المرأة إلى عورة المرأة، و لايفضي الرجل إلى الرجل في ثوب واحد، و لا تفضي المراة إلى المرأة في الثوب الواحد)[1].

واتە: نابێت پیاو سەیری شەرمگەی پیاو بکات، و نابێت ژن سەیری شەرمگەی ژن بکات، وە نابێت پیاو بە ڕوتی لەگەڵ پیاودا دانیشێ لەناو جلێکدا، وە نابێت ژن بە ڕووتی لەگەڵ ژندا دابنیشێ لەناو جلێکدا

لێك خشاندنیش چونە لایە بێ داخڵ کردن، لەبەرئەوە سزادانی هەیە نەك حەد وەك ئەوە وایە پیاوێك باوەشی بکات بە ژنێکدا بەبێ داخڵ کردن لە شەرمگەیدا.

---

(١) أحمد (٣/٦٣) ومسلم (٣٣٨) وأبوداود (٤٠١٨) والترمذي (٢٧٩٣).

(٤) چوونە لای ئاژەڵ :

زانایان هەموو لەسەر ئەوە کۆن کە چوونە لای ئاژەڵ حەرامە. وە جیاوازییان هەیە لە سزای ئەو کەسانەی ئەو کارە ناشیرینە ئەکەن.

لە جابیری کوڕی زەیدەوە ئەگێڕنەوە کە ووتویەتی: هەرکەس بچێتە لای ئاژەڵێك ئەبێ تۆڵەی زیناکردنی لەسەر بەجێ بهێنرێ.

وە لە عەلییەوە ئەگێڕنەوە کە فەرموویەتی: ئەگەر ئەو کەسە (مُحصَن) واتە ژنی هێنابوو ئەبێ ڕەجم بکرێت.

وە لەحەسەنەوە ئەگێڕنەوە کە فەرموویەتی: ئەو کارە وەك زیناکردن وەهایە.

وە ئەبو حەنیفە و مالیك و شافیعی لە قسەیەکیدا و موئەییەید باللە و ناصر و ئیمام یەحیا بۆ ئەوە چوون کە پێویستە ئەو کەسە تەنها سزا بدرێ چونکە ئەو کارە زیناکردن نییە.

وە شافیعی لە قسەیەکی تریدا بۆ ئەوە چووە کە ئەبێت ئەو کەسە بکوژرێت بەپێی ئەوەی عەمری کوڕی ئەبی عەمر گێڕاویەتییەوە لە عیکرەمەوە لە ئیبنو عەبباسەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (من وَقَعَ على بهيمة فاقتلوه و اقتلوا البهيمة) رواه أحمد، و أبو داود، و الترمذي، و قال: لا نعرفه إلامن حديث عمر و بن أبي عمرو[1].

واتە: هەرکەس چووە لای ئاژەڵێك بیکوژن و ئاژەڵەکەش بکوژن

وە (ترمذي) و ئەبو داود گێڕاویانەتەوە لە حەدیسی عاصمەوە، لە ئەبی ڕوزینەوە، لە ئیبنو عەبباسەوە کە ووتویەتی: (من أتى بهيمة فلاحد عليه) وذكر أنه أصح[2].

واتە، هەرکەس و چووە لای ئاژەڵێك حەددی زیناکردنی ناکەوێتە سەر.

وە ئیبنو ماجە ئەگێڕێتەوە لە ئیبنو عەبباسەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (من وقع على ذات محرم فاقتلوه، ومن وقع على بهيمة فاقتلوه و اقتلوا البهيمة)[3]

واتە: هەرکەس زینای لەگەڵ مەحرەمی خۆی کرد (ئەو ئافرەتەی پێی حەرامە)، بیکوژن، وە هەرکەس لاقەی ئاژەڵی کرد بیکوژن و ئاژەڵەکەش بکوژن.

---

(١) أحمد (١/٢٦٩) وأبوداود (٤٤٦٤) والترمذي (١٤٥٥).

(٢) أبوداود (٤٤٦٥) والترمذي (١٤٥٥).

(٣) إبن ماجة (٢٥٦٤).

شەوکانی ووتویەتی: فەرموودەکە بەڵگەیە بۆ ئەوەی ئاژەڵەکە بکوژرێ، هۆکەشی ئەوەیە کە ئەبو داود و نەسائی گێڕاویانەتەوە: بە ئیبنو عەبباس ووترا: ئاژەڵەکە بۆچی ئەبێ بکوژرێ؟ ووتی: من ڕام وایە شتێکی ناشیرین بێت کە گۆشتەکەی بخورێ، و ئیشی واشی لێ کرابێت.

وە لەپێشەوە باس کرا کە هۆیەکەی ئەوەیە کە ئەڵێن: ئەوە واو وای لێکراوە[1] .

وە عەلی و شافیعی لە یەکێك لەقسەکانیدا بۆ ئەوە چوون کە گۆشتی ئەو حەیوانەی ئەو کارەی پێ کراوە حەرامە، وە بۆ ئەوە چوون کە ئەبێ سەر ببڕێ.

وە قاسمی‌یەکان و شافیعی‌یەکان لە قسەیەکدا، هەروەها ئەبو حەنیفەو ئەبو یوسف بۆ ئەوە چوون کە کەراهەتی هەیە گۆشتەکەی بخورێ بە کەراهەتی تەنزیهی.

وە لە (البحر)دا ووتویەتی: ئەبێ ئاژەڵەکە سەرببڕێ هەرچەندە لەو ئاژەڵانەش بێت کە گۆشتیان ناخورێ. بۆ ئەوەی بەچکەیەکی ناتەواوی نەبێت، وەك گێڕراوەتەوە کە شوانێك لاقەی ئاژەڵێکی کردووە ئەو ئاژەڵە بەچکەیەکی ناتەواوی بووە -تەواو-.

ووتویەتی: بەڵام ئەو حەدیسەی کە پێغەمبەر (ﷺ) نەهی کردووە لە سەربڕینی ئاژەڵ بۆ خواردن نەبێت، ئەوە (عام) گشتی‌یەو بە حەدیسی ئەم باسە تایبەت ئەکرێ -تەواو-[2] .

**(٥) زینا لەگەڵ کردن بە زۆر**

ئەگەر ئافرەتێك بە زۆر زینای لەگەڵ کرا ئەوە حەددی لەسەر نابێت، چونکە خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿فَمَنِ اضْطُرَّ غَيْرَ بَاغٍ وَلا عَادٍ فَلا إِثْمَ عَلَيْهِ﴾ (البقرة: من الآية١٧٣).

واتە: جا هەرکەس ناچار بوو بۆ خواردنی شتێك لەو حەرام کراوانە، بەبێ ئەوەی ستەم بکات لە خواردنەکەدا لە پێویستی خۆی زیاتر، وە بەبێ ئەوەی تێ پەڕێ لە سنووری خوا لەوەدا کە بۆی ڕەوا کردووە، ئەوە تاوانی لەسەر نی‌یە.

وە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (رُفِعَ عن أُمَّتي الخَطَأُ و النِّسيان، و ما استكرهوا عليه)[3] .

واتە: هەڵەو لەبیرچونەوە لەسەر نەتەوەکەم لابراوە، وە هەروەها ئەوەش کە زۆریان لێ بکرێ لەسەری.

(١) ئەو باس کردنەش بۆ کەسانێکی تر سەرنج ڕاکێشە.

(٢) نیل الأوطار (ج٧ ص٩٠٠).

(٣) تەخریجی ئەم حەدیسە ڕابوورد.

وە لەسەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ) ئافرەتێك بە زۆر لاقەی کرا حەددی لەسەر لابرا.

وە ژنێك هاتە لای عومەر و بۆی باس کرد کە زۆری تینو بووە داوای ئاوی لە شوانێك کردووە ئەویش ئاوی نەداوەتێ هەتا ڕێی نەدا لە گیانی خۆیدا - ئافرەتەکەش ئەو کارەی کردووە، - عومەر فەرمویەتی: (ئەی عەلی ڕات چییە؟) ئەویش فەرمویەتی: ناچار کراوە، شتێکی دایە و وازی لێ هێنا.

وە یەکسانە لەمەدا زۆر بۆهێنانەکە بە ناچار کردن بێت — واتە زاڵ ببێ بە سەریاو تەعەددای لێ بکات- یان بە ترساندن و هەڕەشە کردن بێت و ژنەکە خۆی ناچار بێت خۆی بدا بە دەستەوە، وە کەس لە ئەهلی عیلم لەمەدا جیاوازی نییە، بەڵام جیاوازییان هەیە لە پێویست بوونی مارەیی بۆ ژنەکە.

مالیك و شافیعی بۆ ئەوە چوون کە مارەیی پێویست ئەبێت. وە مالیك لە (الموطأ)دا ئەگێڕێتەوە لە ئیبنو شیهابەوە کە عبدالملك ی کوڕی مەروان حوکمی دا بۆ ژنێکی زۆر لێکراو بە مارەییەکەی لەسەر ئەو کەسەی کە چۆتە لای.

وە ئەبو حەنیفە ووتویەتی: مارەیی ناکەوێ.

لە (بدایة المجتهد)دا ووتویەتی: (هۆی جیاوازی زانایان ئەوەیە کە: ئایا مارەیی لە جیاتی چوونە لایە یا بەخششێکە؟ هەرکەس بڵێت لە جیاتی چوونە لایە ئەوە لە حەرامی و حەڵاڵیدا پێویستی ئەکات، وە هەرکەس بڵێت بەخششێکە لە پیاوەوە بۆ ژن کە خوا تایبەتی کردووە بۆیان لە حەرامیدا پێویستی ناکات.

وە ڕاکەی ئەبو حەنیفە ڕاست ترە.

### (٦) هەڵە کردن لە چوونە لادا:

ئەگەر ژنێکیان گواستەوە بۆ پیاوێك کە ژنی خۆی نەبوو، وە پێیان ووت ئەوە ژنەکەی خۆتە، ئەویش چووە لایو وای زانی ژنەکەی خۆیەتی ئەوە تۆڵەی لەسەر نابێت، بە ڕای هەموو زانایان.

وە هەر ئەو حوکمەی هەیە ئەگەر پێی نەوترێ ئەوە ژنەکەتە، بەڵام لەسەر جێگەکەی ئافرەتێکی بینی وای زانی ژنەکەی خۆیەتی چووە لای، یان بانگی ژنەکەی خۆی کرد کەچی یەکێکی تر چوو بۆلای، ئەویش وای زانی ژنەکەیەتی کە بانگی کردوەو چوە لای.

ئەوە ئەو پیاوە لەهەموو ئەوانەدا حەددی لەسەر نییە.

وە هەروەهایە حوکم لە هەموو هەڵەیەکدا لە چوونەلای ڕەوادا، بەڵام هەڵە کردن لە چوونە لای حەرام کراودا، ئەوە حەد پێویست نەکات، جا هەرکەس ژنێکی حەرامی بانگ کرد بۆ جێگاکەی و یەکێکی تر هات ئەویش چووە لای وای زانی ئەوەیە کە بانگی کردووە ئەوە حەددی لەسەرە، بەڵام ئەگەر ئافرەتێکی حەرامی بانگ کرد، وژنەکەی هات بۆ لای ئەویش بچێتە لای و وا بزانێ ئافرەتە حەرامەکەیە کە بانگی کردووە، ئەوە حەددی لەسەر نیە، هەرچەندە گوناهبار بووە بە ئیعتیباری ئەوەی کە بە نیەت و گومانی حەرامەوە چۆتە لای.

مانەوەی کچێتی :

وە مانەوەی پەردەی کچێنی بە شوبهە دائەنرێ دەربارەی ئەو کەسەی شایەتی لەسەر دراوە بە زینا کردن، لای ئەبی حەنیفە و شافیعی و ئەحمەد و شیعە زەیدیەکان.

جا ئەگەر چوار کەس شایەتیان‌دا لەسەر ئافرەتێك بە زیناکردن، وە کۆمەڵێ ژنی جێی باوەڕ شایەتیان دا کە هێشتا کچە ئەوە ئەو ئافرەتە تۆڵەی ناکەوێتە سەر لەبەر شوبهە، وە شایەتەکانیش تۆڵەیان ناکەوێتە سەر.

(٧) چوونەلا لە نیکاحێکدا کە جیاوازی لەسەر هەبێت:

وە تۆڵە پێویست نابێت لە نیکاحێکدا کە جیاوازی هەبێت لە نێوان زانایاندا لەسەر دروستێتی ئەو نیکاحە، وەك زەواجی موتعە و ژن بە ژن و مارە بەجاش و ئەو ژن هێنانەی شایەت یا سەرپەرشتی‌کەری تێدا نەبێت،

وە هێنانی خوشکێك کە خوشکەکەی لە عیددەی تەڵاقی بائیندا بێت، وە هێنانی ژنی پێنجەم کە ژنی چوارەمی لەعیددەی تەڵاقی بائین‌دا بێت.

چونکە جیاوازی لە نێوان زانایاندا لەسەر دروستی ئەو ژن هێنانە بە شوبهە دائەنرێ لە چوونەلادا، وە تۆڵەش بە شوبهەکان لائەبرێت، بە پێچەوانەی زاهیریەکانەوە، چونکە ئەمان ڕایان وایە تۆڵە و حەدد لە هەموو چوونەلایەکدا پێویستە، ئیتر نیکاحەکەی باتڵ بێ یا فاسید بێت.

(٨) چوونەلا لە نیکاحی باتڵدا :

هەموو ژن هێنانێك کە زانایان ئیجماعیان هەیە لەسەر پوچەڵیەتی ئەو نیکاحە، وەك هێنانی ژنی پێنجەم زیاد لەسەر چوار ژن، یا هێنانی ئافرەتی خاوەن مێرد، یا عیددە کێشی کەسێکی تر، یا هێنانەوەی ژنی سێ‌بەسێ تەڵاق دراو پێش ئەوەی شویەکی تر بکاتەوە، ئەگەر چوونەلایان تیاکرا ئەوە زینایەو حەد پێویست ئەکەن، و هیچ ئیعتیبار بۆ نیکاحەکە دانانرێ و شوێنەواری نیە.

..............